ڕۆمان




بەختیار عەلی

# غەزەلنوس و باغەکانی خەیاڵ



ناوەندی رۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەرێوەبەری چاپ و بلاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەرێوەبەری هونەری: باسم رەسام

ناوی کتێب: غەزەلنوس و باغەکانی خەیاڵ
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: رۆمان
نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
نرخ: (١٥٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٠٥٦)ی سالی (٢٠١٤)ی پێدراوە.
ISBN: 978-1-63068-985-8



ناوەندی رۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

لە سەرەتای بەهاری ساڵی ٢٠٠٦ دا، پیاوێکی درێژ و باریک و ڕەنگ ئەسمەر، بە ئەرکێکی تایبەت و بەرپرسیارییەکی گەلەک نهێنی، چوو بۆ گوندێک لە ناو چیا زۆر عاسییەکانی باکووردا، فەرمانێکی تایبەت و ترسناکی پێبوو، دەبووایە ئیشێک جێبەجێبکات کە بە هیچ ئادەمیزادێکی دیکە جێبەجێ نەدەکرا. یەکێک بوو لەو ڕۆحە فێڵباز و فریودەرانەی هەمیشە خۆیان بێگوناه نیشاندەدەن، ئەو زەردەخەنە پڕ فریوەی سەر لێوی کۆمەکێکی گەورەبوو، بتوانێت خۆی بە هەزار جۆر بگۆڕێت. یەکێک بوو لەو لیبوکە بێوێنانەی، فێڵزانانە دەیتوانی یاری بە هەموو دڵێک و گەمە بە هەموو ڕۆحێک بکات. خەندە و خۆکەساسکردن و غەم چەکی کوشندەی ئەو بوون. ئەهریمەن لەو دۆخەدا بیدیبایە، خۆشحاڵ و بەختەوەر دەبوو، کە وەچەیەکی وەها هونەرمەندی دروستکردوە، پیاوێک دەزانێت لەسەر هەموو پەتەکان یاریبکات، بەڵام لە قووڵایی ڕۆحیدا نۆکەرێکی دڵسۆزە. ئا، خۆشی شەرم لەوە ناکات بڵێت، من نۆکەرێکی دڵسۆزی ئەوانەم کە بەخێومدەکەن و هێزم دەدەنێ. کە گەیشتە ئەوێ، سەیری لە قایمی و سەختی ئەو زەمینە هات. هەشت سەعات بوو بێوچان، بەدەم فیکە لێدانەوە، وەک شەیتانێک بە تێشوویەکی کەمەوە، بە بەختەوەرییەکی زۆرەوە بەو هەورازە دووروودرێژەدا سەردەکەوت. پێشتر ئەم جێگایەی نەبینی بوو، لەگەڵ هەموو ئەهریمەنکاری و بەدکانزایی خۆیدا، لەگەڵ ئەوەی ژیاننامەیەکی خراپی هەبوو، ویستی خۆی لەم کارە بدزێتەوە، لەبەرئەوەی ترسی هەبوو سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت.

کـەم و زۆر شـتێکی لەسـەر مەعدەنـی ئەوانـە دەزانـی کـە دەچێـت بـۆ ناویـان، ئەوانیـش شـتێکیان دەربـارەی کانـزا و خولیاکانـی ئـەو دەزانـی. بـەڵام هێشـتا دەروازەیـەک هەبـوو لێـوەی بڕواتـە ژووریٚ، هێشـتا ڕێگایـەک هەبـوو بتوانێت بەکاریبهێنێـت و ئومێدێکـی هەبـوو ئـەو ئیشـە بـە دروستی تەواوبکات کـە بـۆی هاتـووە. لـە دواجـاردا بـە وێنەیەکـی جوانـەوە ئەوانـی بە جێهێشـتبوو، بـەو وێنـە جوانەشـەوە دەگەڕایـەوە بـۆ ناویـان. کـە بـە ڕێگادا ڕووە و ئـەو شـاخە عاسـی و سەرکەشـە سـەردەکەوت، دڵنیابـوو، گەرچـی ژیانـی پـڕە لـە کـرداری بـەد و فێڵـی نامەردانـە، بـەڵام خـۆی کەسـێکی دڵـڕەق و ڕۆحێکـی ڕەش ڕەفتـار نییـە. لەگـەڵ هەمـوو خراپەکانیـدا، ژیانـی سـاتی باشیشـی تێدابـووە. سـات هەبـووە ویسـتوێتی شـتێکی دیکـە بێـت، ویسـتوێتی ڕۆحـی خـۆی لـە دەسـت ئەهریمـەن دەربهێنێـت و پاکیبکاتـەوە. بـەڵام دەیزانـی ئـەو هەرگیـز نەفسـێکی ئـازاد نەبـووە، خـۆی ڕۆژێـک لـە ڕۆژان شـەرمی لـەوە نەکـردوە بڵێـت مـن «نەفسـێکی ئـازاد نیـم». ئـەو گونـدەی ئـەو بـۆی دەچـوو، چکۆلانـە و نادیـار، لـە نـاو چیاکانـدا ونبووبـوو، جۆرێـک بـوو لـە بەندیخانـە و مەنفـا، چـواردەوری سـەرتاپا چیـای عاسـی بـوو، تەنیـا سـێ پیـاو لـەو گونـدەدا دەژیـان. یەکێـک بـوو لـەو گونـدە ڕوخاوانـەی دوای ڕاپەڕیـن کـەس ئاوەدانـی نەکردبـووەوە، موڵکێکـی کۆنـی «سـەحەر ئاغـا» بوو(کـە هەڵبـەت ئەمـڕۆ هەموومـان بـە نازنـاوی «بارۆنـی خەیاڵ»ـەوە دەیناسـین). موڵکێکـی عاسـی کـە جەنابـی ئاغـا لەبـەر سـەختی و دووری و کـەم بەرهەمـی فەرامۆشـیکردبوو. دواجـار میـر یـان بـارۆن «کـە یەکێـک بـوو لـەو پیـاوە بـە شـان و شـەوکەوتانەی لـە پـازدە سـاڵی ڕابـوردوودا بـە نهێنـی کاریگـەری لەسـەر زۆر شـتی ئـەم وڵاتـە هەبـووە» لەسـەر ڕاسـپاردەی سـەرۆک و بەپێـی لێبوردنێکـی تایبـەت، ئاوەدانکردنـەوەی ئـەو گونـدەی خسـتە ئەسـتۆی ئـەو سـێ پیـاوە کـە جگـە لـە یـادگار هیچـی دیکەیـان نەبـوو بـۆی بژیـن. دەبایـە ئـەو گونـدە دروسـتبکەنەوە، گرنـگ نەبـوو چەنـد

ساڵی پێدەچێت، گرنگ نەبوو چەند ماڵ و خانووی تیا دروستدەکەن، گرنگ نەبوو چۆن بینا و دیوار و پەنجەرەکان دروستدەکەن، بەڵکو گرنگ ئەوە بوو ئیشبکەن. مانگی جارێک لۆرییەکی ئاخچەمی گەورە لە سەر جادەیەکی قیر، لە دامێنی تەماوی و ساردی چیادا، بارێک بەرد و چیمەنتۆ و کەرەستەی جۆراوجۆری بینای دادەگرت و دەبایە ئەو سێ پیاوە، بە سێ هێستری پیر ئەو کەرەستانە بۆ نزیک ترۆپکی چیا سەرخەن و لەوێ ئیشبکەن. دەبایە شەو و ڕۆژ ئیشبکەن. سێ پیاوی ڕیشن و تۆزاوی و ڕەش داگەڕاوبوون. ئەو ڕۆژەی ئەو پیاوە نوێ و نامۆیە گەیشتە گوند، یەکەمجار «ماجەلانی ڕاستەقینە» کە ناوی ڕاستەقینەی خۆی زوهدی شازەمان بوو پێشوازیکرد، پیاوێکی سەرسپی و قژ درێژ و ڕیشهاتوو بوو، گەر مەسیح زۆر بەگەنجی نەمردبایە و تۆزێک بچووبایەتە ساڵەوە، لەوانەبوو دواجار جۆرە شێوە و ڕوخسارێکی وەهای ببایە، شازەمان گەرچی تەمەندار بوو، بەڵام گەلێک پتەو و هێزن بوو، لەو پیاوانە بوو لە پیریدا سیحریان لەسەر ئافرەت زۆرترە وەک لە گەنجی. وەستای ڕاستەقینەی ئەم شارە و دیوارسازێکی کارامەبوو. ئەو بە گومانەوە سەیری ئەم میوانەی کرد و بەرەو لای هاوڕێکانی پێشیکەوت. ئەوە سەرەتای ئەو یارییە سەیرەبوو کە دەبایە ئەو پیاوە پڕ فریو و گەمەیە بیکات. دەبایە بچێتە ڕۆحی ئەم سێ مرۆڤەوە و لە ناوەوە هەڵیانکۆڵێت و بیاننوسێتەوە، بۆ ئەوەی لەوەشدا سەرکەوتووبێت دەبایە لیبۆک بێت، فێڵزان و بێڕەحم و ساختەکاریش بێت... هەموو ئەو سیفەتە بەدانەش بە زیادەوە لەو پیاوەدا هەبوون، کە خۆی بە یاوەرێکی نزیکی شەیتان و برایەکی دڵسۆزی فریشتەش دەزانی. ئەم کتێبەی ئێمە چیرۆکی ئەو هەڵکۆڵینە ڕۆحییەیە کە ئەو پیاوە شەیتانئاسا و فریودەر و فێڵزانە لە ژیان و یادەوەری و خەیاڵی ئەو پیاوانەدا کردی، گەشتە درێژەکەیەتی بەدوای نهێنییەکدا کە تەنیا ئەو سێ پیاوە دەیانزانی.

چیرۆکی هەڵکۆڵین و دۆزینەکانی ئەو ڕۆحە شەڕانگێزە، دەمامککارەیە، کە فریودەری وەک خۆی دەگمەن و کەمهەڵکەوتە. ئەم کتێبە بەرەنجامی مانەوەیەکی درێژی ئەوە بۆ چەندەها مانگ، تا سەرەتای بەهاری ساڵی ٢٠٠٧ لەو چیا عاسیانە. هەروەها حیکایەتی کەمێک لەو ڕووداوانەشە کە دەکەونە دوای ئەو بەهارە. دەبێت بزانن ئەو پیاوە، نەفسێکی هێند مەکربازبوو، کە بەوردی و درێژی ئیشیکردوە. ئەوەی لە هەڵکۆڵینی ئەو سێ ڕۆحەدا دەستی نەکەوتووە، خۆی بەڕێگای خۆی بۆی گەڕاوە، ئەوەی ئەو سێ زارە نەیاندرکاندوە لە ڕێگای کڕینی زانیاری و کڕینی خەیاڵەوە تەواویکردوە، پیاوانی فێڵزانی وەکو خۆی خستۆتەکار تا لە ڕێگای جیاواز و سەرچاوەی جیاوازەوە زانیاری بۆ کۆبکەنەوە. بەوەدا خۆی لە قۆناغێکدا بەشێکی گرنگی ڕووداوەکان بووە، لە نزیکەوە هەندێ جەمسەری گرتووە کە مەبەستێتی. چۆن ئەم سێ پیاوە گەیشتنە ناو ئەو چیا عاسیانە، ئەوەیان چیرۆکێکە، گەر لە سەرەتاوە بەسەر هەموو حیکایەتەکەدا نەچینەوە لە هیچ تێناگەین. لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ کە دواجار بەسەر هەموو شتێکدا دەچێتەوە، تێدەگات ئەم حیکایەتە سەرەتای نییە، شتێکە ڕیشەکانی دەگەڕێتەوە بۆ پێش لە دایکبوونی پاڵەوانەکان، بەڵام لەگەڵ قووڵی ڕیشە سەیرەکانیدا، کەم و زۆر شتێکی لە ڕۆحی ئەم سەردەمەی من و تۆ تێدایە. بۆ نمونە، ڕۆحێکی لیبۆک و فێڵپەرستی وەک ئەو پیاوەی ئەم هەموو لاپەڕانەی نوسیوە، ناکرێت لە هیچ دەور و زەمانێکی دیکەدا لە وێنەی هەبووبێت. هەر ڕۆژگارەو شەیتان و فریشتەی خۆی هەیە، لە هەر دەور و زەمانێکدا شەیتان و فریشتە بە جۆرێک یاریدەکەن، لە دەور و زەمانەکانی دی ناچێت. لە کاتی یاریشدا شوێنی خۆیان دەگۆڕن، سەیرترین شت لە شەیتاندا ئەوەیە هەندێجار بۆ ئەوەی سەرکەوێت دەبێت وەک فریشتە یاریبکات، فریشتەش بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبێت، دەبێت وەک شەیتان ڕوخساری خۆی بگۆڕێت و تەڵغ و

تاریک دەرکەوێت.

بەداخەوە ئەم چیرۆکە لەو چیرۆکانەیە کە دەبێت بە تێکەڵاوی بگێڕدرێتەوە. لە کۆتایی هاوینی ئەمساڵدا کە بەڕێوەبەری ئاسایش لابرا، یەکێک لە یاوەرە نزیکەکانی، کۆمەڵێک فایلی زۆر گرنگ و نهێنی لە خەزێنەی ئاسایش دەرهێنا، تا دواتر لە لابەلابوونەوە سیاسییەکاندا دژ بە نەیارەکان و لە تۆڵەی هاوڕێ بێبەش و لێدراوەکانیدا بڵاویانبکاتەوە، فایلەکان تازە بە ڕێگایەکی نهێنی کە من سەری لێدەرناکەم، گەیشتبوونە لای بەڕێوەبەری ئاسایش، من لەو باوەڕەدانیم جەنابی بەڕێوەبەری ئاسایش یان هیچ کەسێکی دیکە تەواوی دۆسییەکەی لەم سەر بۆ ئەو سەر خوێندبێتەوە، بە تایبەت بەهاری ساڵی ٢٠٠٧ پڕبوو لە دەردی ڕاوکردنی تیرۆریستە ئیسلامییەکان. خۆشتان دەزانن لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ ـەوە فایل لە وڵاتی ئێمەدا بایەخێکی بێوێنە وەردەگرێت، مرۆڤ دەتوانێت قسە لە «چاخی زێڕینی فایل» بکات، سەردەمێکە دڵنیام لە مێژوودا وەک سەرەتای عیبادەتکردنی نهێنی و ئاشکراکردنی دەردەکەوێت، سەردەمێکە ڕاستی و درۆ بە جۆرێک تێکەڵاودەبن مرۆڤ ناتوانێت لە یەکیان جیابکاتەوە. ئەو یاوەرە دڵ بریندارە کە فایلە نهێنییەکان لە دۆڵابەکانی ژێر زەمینی ئاسایش دەردەهێنێت، بە ڕێکەوت هاوڕێیەکی نزیکی «شبر»ـە، ئەو کوڕە قژ زەردە جوانەی لە زۆر لاپەڕەی ئەم کتێبەدا تووشماندێتەوە، کوڕێکە بە دڵنیاییەوە خۆشتاندەوێت و دوای ئەم کتێبە حەز بەبینینی دەکەن. ئەوەی لە ڕێگای شبرەوە دەست ئێمە کەوتووە، کۆمەڵێک کاغەزی پەرتوبڵاو و کاسێتی دەنگ و وردە دۆکۆمێنتن، هەزاران لاپەڕەن کە ئەو ڕۆحە مەکربازە بە مەبەستی یاریکردن و فریودان بەکۆمەڵێک دەست و خەتی جیاواز نوسیونی. ئێستا دوای ڕێکخستنێکی زۆر، دوای پێڕستکردنی حیکایەتەکان بە جۆرێک بتوانین بزانین لە سەرەتاوە چی ڕویداوە،

دەستدەکەین بە پۆلێنکردن و ڕیزبەندکردنی ئەو لاپەڕە و دۆکۆمێنتە زۆرانەی کە لە بەردەستماندان، بەشێوەیەک مانابدەن و بخوێنرێنەوە. شتەکان چۆنن وا چاپیاندەکەینەوە، هێند هەیە چڕپاندەکەینە و کورتیاندەکەینەوە و ڕێکیاندەخەین و بەپێی تواناش ساڵڕۆژیان دەخەینە سەر. لە زۆر شوێندا کە دەزانین حەقیقەت بە تەواوی دیارنییە، ئێمەش گەڕان و پشکنینی تایبەتی خۆمان کردوە. ئەمە جگە لەوەی ئەو زمانەی کە تەواوی ڕاپۆرتەکەی پێنوسراوە، بە جۆرێک ئاڵۆز و تەماوییە، گێڕانەوە و دانانەوەی وەک خۆی هەمووان بە هەڵەدا دەبات، بۆیە بەر لە هەر شتێک دەبایە زمانی ئەو ڕاپۆرتنوسە بەدنیازە دەستکاریبکەین و تۆنە جیاوازەکانی پاکبکەینەوە کە بە ئەندازەیەک وازیکەر و بەدگوزارەیە تا ئێستا ئێمەش لە نیازی هەندێک یاری و لە مەبەستی هەموو گەمەکانی نەگەیشتووین. دەبایە بۆ نوسینی ڕوون و پێکانی مەبەست، ڕستەکان وەربگێڕینە سەر زمانێک بەو ئەندازەیە ئاڵۆز و فریودەر و پڕ نهێنی نەبێت، وای لێبکەین لەبری ئەوەی بۆنی ڕاپۆرتی ڕۆحێکی بەدکاری لێبێت، بۆنی ژیانی لێبێت، بۆنی چیرۆکێکی لێبێت کە حیکایەتخوانێکی دەنگ زوڵاڵی هەیە، کە شێواز و قسە و ڕوانینی لە هەموو گۆشەیەکەوە دەبینرێن. لەوەشدا خودا شاهیدمانە کە مەبەستمان تەنیا گەیشتن بووە بە حەقیقەت. لە سەرەتاوە دەمانویست چیرۆکێک بگێڕینەوە، دەقاودەق وەک ئەو ڕووداوانە وابێت کە بە شێوەیەکی مەجازی لەگەڵ لەدایکبوونە سەیر و ناوازەکەی غەزەلنوسدا دەست پێدەکات و بە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گوزەردەکات و ئێستاش کۆتاییان نەهاتووە. ئەو بەشانەی کتێبەکەمان کە تایبەتن بە بارۆنی خەیاڵ، ئیشی هاوڕێیەکی نزیکی بارۆنە کە بۆ حیسابی باڵێکی دیکەی حیزب، تەواوی قسەکانی بارۆنی لەسەر چەند کاسێتێکی بچوک تۆمارکردوە و بەجۆرێکی لابەلا وەک هەڵپێچێکی جیاواز و سەربەخۆ تێکەڵ بە فایلەکان کراون. نیازی ئێمە لە بڵاوکردنەوە

و دەرخستنی ئەم چیرۆکەدا، بەدیوێک ئاگادارکردنەوەی دونیایە لەو چیرۆکە سەیرەی بەشی زۆری ڕووداوە غەمگین و ترسناکەکانی دەکەونە دوای بەهاری ساڵی دووهەزاروچوارەوە. هەروەها گەشتێکی وردیشە لە ناو ئەو هۆ ترسناک و سەیر و تێکەڵاوانەدا کە نەیانهێشت گەڕەکێکی ئەفسانەیی و خەیاڵی لە شارەکەماندا دروست ببێت، کە دەشیا بتوانێت ئەم شارە پیس و ناچیز و بێهەیبەتەمان بکاتە خاوەنی یەکێک لە عاجباتییە نوێکانی دونیا. بەڵام بۆ ئەوەی لە هۆکارە ورد و قووڵ و ڕاستەقینەکانی تێکشکانی ئەو پرۆژەیە تێبگەین، دەبێت بچینە ناو وردەکارییەکانەوە، چونکە بە پێچەوانەی ئەو قسە باوەی کە دەبێژێت شەیتان لە وردەکارییەکاندا بەکارە، ئێمە باوەڕمان وایە گشتگیری و عمومیات لە ئیشی شەیتانە و فریشتەش لە وردەکارییەکاندا ئیشدەکات.

## یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

گەر ناوی خۆشم نەڵێم، هێند نابات هەموویان دەزانن من کێم... من وەک با لەسەر زەمینێکی بەریندا، وەک شەپۆلێکی زێڕینی بچوک لە گۆمێکی گەورەدا دێم و دەچم. ناوی من زۆر گرنگ نەبوو. ئەو شەوەی دەستم پێکرد، بڕیارمدا ناوی خۆم ئاشکرانەکەم، وەک یەکێک کە نیازێکی بەدی هەیە گوێبگرم، ئیشبکەم، بە پەنهانی بمێنمەوە. بەڵام هاوڕێیان سوێندتان بۆ دەخۆم شتەکان بەو جۆرە بگێڕمەوە کە ڕوویاندا. بینین پەیوەندی بە ئیشکردنی هەموو هەستەکانمی دیمانەوە هەیە، من توانیم بە دڵم، بە پەنجەکانم ببینم. توانیم بە کۆمەکی ڕۆحم، بە کۆمەکی بیستن و بۆنکردن و هەستکردنم، بە کۆمەکی ئەو پیاوانەی دەمناردن و ئەو چاوانەی وەک کۆتر بەرەڵامدەکردن لە هەموو ئەو

جێگایانەبم کە دەبایە لەوێبم. بەلام جێگایەک هەبوو دەستم پێیدا نەگەیشت... هەموو ژیانی من حەسرەتی نەگەیشتنە بەو شوێنە، غەمی دەربەدەربوونە لەو هەوار و ماڵ و دیارە. تۆ ئەی ئەوەی گوێم لێدەگریت، گەر دەتەوێت لە سەرەتاوە لەگەڵمدا بیت، باش گوێ لە مەرجەکانم بگرە. دەبێت وەک ئەندازیارێک وەها بیت کە لە بناغەی کۆشکێکی دێرینی ڕوخاودا کاردەکات، دەبێت سەرت لەو دونیایە نەسوڕمێت، دەبێت حیسابی چاکە و خراپەم لەگەڵدا نەکەیت... دەبێت ئامادەبیت لەسەر نەخشەیەکی چکۆلانە سەیری هەندێ هێڵکاری سادە بکەیت و چاوت لێکنێیت و بە خەیاڵ هەموو ئەو کۆشکە مەزنانە ببینیت کە دەکرا لەسەر ئەو پارچە کاغەزە خەوتووانە لە خەو هەستن. دەبێت هێزی ئەوەت هەبێت، کاتێک سەیری کەلاوەیەک دەکەیت، تێبگەیت ڕۆژێک لەڕۆژان پڕبووە لە باق و بریقی ژیان، کاتێک سەیری کەللەسەرێک دەکەیت بتوانیت بچیتە ناو خەونەکانییەوە، بزانیت چ ئومێدێکی هەبووە، پڕبووە لە چ نیازگەلێکی خراپ و چاک. دەبێت لە هەموو شێوەکانی سەفەردا شارەزابیت. بتوانیت ڕێزی نەخشە بگریت. دەبێت نەخشە وەک هێما و سەمبولی دونیای نوێ تەماشابکەیت... هەموو جۆرەکانی نەخشە. نەخشەی ئەندازیارەکان، نەخشەی جوگرافیانەسەکان، نەخشەی ڕێگا پێچاوپێچەکانی دەرون. من بە پێچەوانەی ئەو مەخلوقە خەیاڵیانە هەمیشە لەسەر نەخشە کارمکردوە، ئەوە جیاوازی گەورەی نێوان من و ئەوانەیە کە تەنیا خەیاڵیان هەیە. گەر دەتەوێت لەگەڵ مندا بیت، دەبێت لە گرنگی نەخشە تێبگەیت... کەمێک خۆت فێری نەخشەبکەیت. من چیم لە دەستبێت ئامادەم بۆتبکەم، بە مەرجێ تۆ بەڕاستی بتەوێت فێربیت. من بێزاربووم لەو درۆزنانەی دەیانەوێت فێربن و خۆیان ماندووناکەن، ئەوانە شێتمدەکەن، دەهری دەبم، ها... تێبگە، ئەوکاتانە دەسەلاتم بەسەر خۆمدا نامێنێت و

لەوانەیە هەندێک شتبکەم کە تۆ چاوەڕوانی ناکەیت. هەمیشە وابووە، هەمیشە کەسێک هەڵکەوتووە دەهریمبکات و بە جۆرێکی تر هەڵسوکەوتم کردوە کە نامەوێت. لە سەرەتاوە پێتدەڵێم ئەوانەی لە بنەڕەتەوە گەمژەن، زۆر لەوانە باشترن کە دەیانەوێت تێبگەن و ڕەنجی بۆنادەن. گەر تۆ لەوانەیت بڕۆ بەڕێی خۆتەوە، بەدرێژایی ژیانم بەدەست ئێوەوە ناڵاندوومە و نامەوێت چیتر ئازارتان بەدەستەوە بکێشم. من توڕەتر و فێلزانترم، لەوەش ئاڵۆزتر و نیاز پیسترم کە خەیاڵی ئێوە دەیگاتێ. گەر دەتانەوێت لەگەڵمدابن، هەموو شتێک دەگێڕمەوە تا بتوانن ببینن و حوکمبدەن. وەک پیاوچاکێکی حیکایەتخوان تەماشای من مەکەن، تێمبگەن و بەزەیتان بە حاڵمدا بێتەوە، ئیشی من لەوە قورسترە بتوانم پیاوچاکبم. من لە کەشتییەوانێک دەچم شەیتان ڕەوانەی دەریای ئومێدە سەخت و ئەستەمەکانی کردبێت. لەزەت لەوە دەبینم ئێوە و کەشتییەکانتان وەک من بە هەڵەدا بچن، لەزەت لەوە دەبینم نەگەنە ئەو شوێنانەی خەونی پێوە دەبینن. زۆرجار خۆم وەک مەلەوانێکی بێڕەحم دێتە بەرچاو کە لە لێواری حەوزێکی مەلەدا بەزەردەخەنەوە تەماشای خنکانی مەلەوانێکی منداڵکار دەکات. وەک چۆن ئێوە چێژ لە خنکانی من دەبینن، منیش چێژ لەوە دەبینم بتانبینم دەخنکێن. بەڵام وامەزانن هەرجارێک بە هەڵەداچوون و خنکان و سەرئاو نەکەوتنەوە، ئیدی ئەوە گوناهی منە. دڵنیام هەموومان زۆرجار بە هەڵەدا دەچین، چونکە پێویستە بە هەڵەدا بچین، دەبێت بە هەڵەدا بچین، بە هەڵەدا چوون بەشێکە لە ژیانی ئێمە، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە کەی و لە کوێدا بە هەڵەدا دەچین؟ گرنگ ئەوەیە نەزانین لە کوێدا تووشی فریو و هەڵەڕۆیی بووین، ئەمەیان لەپێناوی ئێوەدایە، گەر مرۆڤ هەموو هەڵەکانی خۆی بزانێت شێت دەبێت. من کەسێکی سەرڕاستم دەبێت لە سەرەتاوە بزانن کە من نیازم لەم حیکایەتەدا

پاک نییە. دیارە من دەزانم لە کوێوە دەست پێدەکەم و بۆ کوێ دەچم، بەڵام ئێوە لەو بارەیەوەهیچ نازانن... ئەوەش خۆشییەکی بێئەندازە گەورەم پێدەبەخشێت. بەڵام با دڵتان لەوە گەورەتر بێت، لێگەڕێن بەستەزمانێکی وەک منیش لەزەت ببینێت، ئاه ئەی لەزەتی بەد، چەند جاری دی دێینەوە سەرڕێگای تۆ. چەندجاری تر دەتکەینە بەهانەی خراپەکانمان. ئەوەی لەگەڵ مەکرباز و تەڵەکەبازێکدا سوار کەشتییەک بێت، دەبێت بزانێت لەزەت جێگایەکی گرنگی لە هەموو یارییەکەدا هەیە. لەزەتی ئەوەی لە ناو نەخشەکانی مندا دیلبن، هەمیشە لەسەر ئەو ڕێگایە بڕۆن کە من دیاریمکردوە، ئەو ڕێگایەی ساڵەهای ساڵ ویستم لێیدەرچم. هیچ شتێک لە ژیاندا لەوە خۆشتر نییە نەخشەیەکت هەبێت هەموو مەخلوقاتی خودا لە ناو ئەو نەخشەیەدا دیلبن، نەخشەیەک بگاتە خاکی خەیاڵ و حەقیقەت، نەخشەیەک تەنیا یەک کەس بۆی هەبێت لێیدەرچێت، یەک کەس... ئەو کەسەش تۆ بیت. ئێستا دوای تەواوبوونی زۆرشت، مەستەدەکەم حیکایەتەکە وەک شەڕی نێوان لەزەت و خەیاڵ وایە، لەزەتی دەستەمۆکردن و گرتن و ڕکێفکردنی دونیا، لەگەڵ سرکی و نامۆیی خەیاڵێکی غەمگیندا کە نایەوێت دەسەڵات و جوانی لەسەر یەک سفرە کۆببنەوە، دەیەوێت مرۆڤ بۆ هەتاهەتایە نامۆ و تەنیا بێت. خەیاڵێک نایەوێت دونیای کۆنی لە بیربچێتەوە، نایەوێت تاریکی ئێستا لە پێناوی ڕوناکی پاشەڕۆژدا لە بیربکات. ئاه هیچم لێمەپرسن، لەزەت لای من جۆرێکە لە لەبیرکردنی دەرد، لە فەرامۆشکردنی ژیان، لە ناشتنی پەیتاپەیتای هەموو ئەو شتانەی ناشیرینی دەست و دڵی خۆمان بەیادا دەهێننەوە. خەیاڵ شتێک نییە سەیریبکەیت و تێیبگەیت، خەیاڵ شتێکە دەبێت تامیبکەیت، لێوی لێبدەیت، دەستی لێبدەیت، ئەوەیە لەزەت. نەخشەکانیش وەهان، ئەو نەخشەیەی من باسیدەکەم پارچە کاغەزێک نییە لەسەر

مێژێکی گەورە ئاوەڵایبکەین و بیخوێنینەوە... شتێک نییە بەر لەسەفەر ئامادەیبکەین و بە قەڵەم بەسەریدا بڕۆینەوە، بەڵکو شتێکە خۆتی تیادەدۆزیتەوە... دەڕۆیت و سەیردەکەیت لە ناوەڕاستی ڕێگایەکی دوور و درێژدای، لە جێگایەکی نەزانراودایت و تووشی فریوێکی بەد بوویت دەتەوێت تا کۆتایی مل بنێیت و نەوەستیت. بەڵێ نەخشەکان چەندە ڕێئاسانیت بۆ دەکەن، هێندەش کوشندەن، کوشندەن کاتێک دەتەوێت ڕێگاکانت بە ئاڕاستەیەک بەریت و دەبینیت ڕێگاکان ناڕۆن. ئازیزان... زۆرجار نەخشەکان لە هێستریکی چەموش و نابەڵەد دەچن کە دەوەستن و ناکرێنەوە و ناڕۆن. زۆرجاریش ئەو شوێنە سەیرانەی تۆ دەتەوێت بیانهێنیتە سەر نەخشەکە، دەبنە جێگای سەرسەخت و دووردەست و نەگیراو کە بە هیچ نەخشەیەک دەستەمۆنابن.. ئیدی هەستدەکەیت لە بەردەرگایەکدایت ناکرێتەوە و ناکرێتەوە. لەوێدا تێدەگەیت، بۆ ئەوەی بڕۆیت و نەگەڕێیتە دواوە، دەبێت بکەویتە ڕوخان و وێرانکاری. بەدبەختە ئەو کەسەی وەک من ڕوو لە شارێک دەکات کە هەرگیز نایگاتێ... بەدبەختە. سیاچارەیە ئەو کەسەی وەک من نەخشەیەکی وەها داخراوی لە بەردەستدا بێت... سیاچارە. بەڵام سادەکاری و فریو و یەک ڕەنگییە گەر وابزانن من تەنیا گەڕیدەیەکی بێنگینم و نەگەیشتوومەتە نیازی خۆم. نا، چیرۆکەکان و نەخشەکان و خەیاڵەکان پێکڕا لەوەدا لەیەکدەچن کە لە کۆمەڵێک گرێی ڕەش و پلانی ورد و ئاڵۆزی ناکۆتا دروستدەبن. هیچ یەکێک لە ئێمە کە بەڕێگادا دەڕۆین نەخشەیەک لە گیرفانماندا نییە، بەڵکو کۆمەڵێک نەخشەی تێکەڵاو و پێکداچوو لەسەرماندایە، دەروونمان هیچ نییە جگە لە زەوییەکی خەت خەت کە ڕۆژانە نەخشەی نوێی لەسەر دروستدەکەین، زۆرجار نەخشە تازەکانمان لەسەر نەخشە کۆنەکان دەکێشینەوە، ئیدی بەجۆرێک هێڵەکان بەیەکدا دەچن ئاسان لە یەکدی

جیاناکرێنەوە. ئاه... بەڵام ئیتر بێدەنگ بە ئەی زاری زۆربڵێ و بەدگۆ، بێدەنگ بە و هیچ شتێکی دی ئاشکرامەکە کە نابێت ئاشکرابیکەیت، بێدەنگ بە و حیکایەتی خۆت بگێڕەوە، هەموو شتێک دەبێت لەوێدا ئاشکرابێت... بەڵام بیرتان نەچێت، هەمیشە تۆپێک هەیە کە خلدەبێتەوە، هەمیشە تۆپێک هەیە خلدەبێتەوە، تۆ دەیبینیت یان نایبینیت گرنگ نییە، وەک مێزێکی بلیارد، کە لە پاڵ تۆپە ڕاستەقینەکاندا چەند تۆپێکی نادیاریشت هەبێت. ئاه خودایە، من ئەو یارییە شێتمدەکات، بینیوتانە کە یاریکەرە باشەکان یاریدەکەن، وەک ئەوەیە هەمیشە چەند تۆپێکی خەیاڵی لەسەر مێزەکە بێت، وەک ئەوەی ئەو تۆپەی من و تۆ دەیبینین، ئەوتۆپە سپییەی بە «دارنوک» ـەکە دەیئاژون، تەنیا سێبەری کۆمەڵێک تۆپی خەیاڵی دیکەبێت کە ئێمە نایانبینین، ئەوانن لە بری ئەو شاتۆپە شتەکان وەها سیحراوی دەجوڵێنن. لێممەگرن، ژیان خۆی چییە جگە لە بلیاردێکی ئاوها، بە تۆپی ڕاستەقینە و خەیاڵی. هەر یەکەمان تۆپێکین تەنها یاخود دووان و سیان و چوار لە کونجێکدا، لە گۆڕەپانێکدا وەستاوین، لە ناکاو تۆپێکی بزوێن دێت، تۆپێکی بەهێز، تۆپێکی ڕاستەقینە کە کۆمەڵێک هێزی خەیاڵی و یاوەری خەیاڵیشی هەیە، دێت پەرشماندەکاتەوە، هەر یەکەمان بە ئاڕاستەیەک دەڕۆین، چاوەڕێدەکەین تا هێزێکی دی، تۆپێکی دژ لە ئاڕاستەیەکی ترەوە دێت و دەمانجوڵێنێت. مرۆڤ لەم مەملەکەتدا هیچ نییە جگە لە تۆپێکی بلیارد، کە دەبێت چاوەڕوانبکات و ببینێت، بە چ ڕوویەکدا خلدەبێتەوە. من حەزم لەو خلبوونەوەیە بوو. هەموو ژیانم خولیام بووە لەو تۆپە سپییەی بلیارد بچم، ببم بەو تۆپە، نا، هێند گێل و نەفام نیم حەزبکەم ببم بە دارنوکەکە. نا، من تۆپەکەم، ئەوە نیم کە یاریدەکات، ئەوەم کە یاری پێدەکەن... بەدرێژایی ئەم ژیانە ئەوە دەبینم، ئەو تۆپانە دەبینم کە بەر یەک دەکەون و دووردەکەونەوە، نزیکدەکەونەوە و لێکدەترازێن،

**دەڕۆن و لە چاڵێکی ڕەشدا وندەبن، هەندێکیان نایەنەدەرەوە و هەندێکیان دێن.**

**خودای باڵانشین کۆمەک بە ڕۆحم بکە، لە چاکە و لە گوناهدا یارمەتیدەرم بە... لە پیسی و پاکیدا دەستم لێبەرمەدە... هەرگیز حیسابی چاکە و خراپەم بۆ مەکە، بەڵکو بە گەورەیی و حیکمەتی خۆت تێمبگە.**

## ماجەلانی خەیاڵی یەکەمین لاشە دەبینێت
## «ماجیدی گوڵ سۆلاف، بەهاری ساڵی ٢٠٠٤»

نەمدەتوانی بوەستم و چیدی چاوەڕێبکەم، لەوکاتەوەی بەهمەن ناسر دەناسم هەمیشە دوادەکەوێت، هەردەم بەهانەیەکی هەیە بتوانێت بێدەنگمبکات. ناتوانم لێیزویربم، دوای چەند ساڵ کارکردن دەبێت لە هەڵە بچوکەکانی ببورم. هەندێجار چەند دوابکەوێت چاوەڕوانیدەکەم، چونکە دواجار دێت و جانتا چکۆلانەکەی دەکاتەوە و شتێکی نوێی پێیە. هیچ شتێک وەک چاوەڕوانی خەیاڵم ناکوژێت. ئەو ڕۆژە ئاواتم دەخواست نەمناسیبایە. ڕۆژێکیان لە پۆلەکەمدا وانەم بەو منداڵە کوێرانە دەگووتەوە کە ئاوڕمدایەوە لە دەرگای ژوورەکەدا وەستابوو و بە زەردەخەنەوە گوێی لێدەگرتم. کە تەواوبووم دەستی خستە سەر شانم و گووتی «ها، بەڕێز لە خۆڕا نییە پێتدەڵێن ماجەلان. تۆ لە سەفەرەکانتدا شتی سەیرت بینیوە». بە شەرمەوە گووتم «سەفەر؟ سەفەری چی؟ من سەفەرم نەکردوە، هەموو چیرۆکەکانی من بە خەیاڵن، ڕۆژێک لەڕۆژان لەم شارە نەچوومەتە دەرەوە، لەدەمێکەوەکەهاتوومەتەدونیاوە لێرەم،

لەلەدایکبوونمەوەئەم شارەم جێنەهێشتووە». ئەوکات نەمدەزانی پێیدەڵێن «غەزەلنوس»، چەند جارێک لە دوورەوە بینیبووم، بێئەوەی بزانم کێیە. خۆی پێناساندم و گووتی «لەلایەن تریفەوە هاتووم بۆ لای تۆ، من و تۆ دەبێت ببین بە هاوڕێ».

دوای ئەوە بووین بە دوو هاوڕێی نزیک.

ئەو چەند ساڵەی دوایی من و بەهمەن و تریفە پێکەوە لە سەر ئەو کتێبە گەورەیە لەگەڵ دەفتەرداره‌کاندا ئیشمانکرد. من لەوان منداڵتر و کەم ئەزموونتربووم، هەرچەند هەموومان بەشێکبووین لە لەشکرێکی گەورەتر، لە سوپایەکی گەورەی خەیاڵپەروەران. بەڵام من بەجۆش و خرۆشێکی گەورەوە، وەک شێتێک خۆی بهاوێتە دەریاوە، خۆم فڕێدایە پڕۆژەی نوسینی ئەو کتێبە گەورەیەوە کە دەبایە لەسەر مێژووی نوێی مەرگ لەم شارەدا بمانوسیبایە. کەس بە پڕۆژەی ئەو کتێبەی نەدەزانی، لەڕاستیدا هیچ کەسیش ڕاینەسپاردبووین جۆرە کتێبێکی وەها ئامادەبکەین. خولیایەکی شێتانەبوو، سەروەختێک چووبووە سەری غەزەلنوس و تریفە یابەحری و دواتر هەموومان ئیشمان بۆکرد، لە کۆتاییشدا وەک زۆر ماندووبوونی دیکەی ژیان، سەراپای ئیشمان بە فیڕۆ و هەموو ڕەنجمان بە باچوو. هەر یەکەمان ناوێکمان هەبوو، من ناوم ماجەلانی خەیاڵی بوو «سەرەتا تەنیا بە ماجەلان بانگیاندەکردم، بەڵام دوای دەرکەوتنی ئەو گەڕیدە گەورە و دونیاتەیکەرە مەزنە منیان وەک ماجەلانی خەیاڵی ناونایەوە، بۆ ئەوەی لەو عاشقە باڵابەرزەم هەڵاوێردن و وەک وێنەی پێچەوانەی ئەو بە دونیام بناسێنن». تریفە کچێکی ڕەشکەلە و چکۆلانە بوو، قژێکی ڕەشی زۆر درێژی هەبوو، جووتێک چاوی قەترانی ئێجگار جوان. بەهمەن ناسریش ئەوکات لە ژێر نازناوی غەزەلنوسدا تەواوی شار دەیانناسی. ئەوی ڕۆژ کە بووینە هاوڕێ، ئەو خاوەن شوێن و ناوی خۆی بوو، لە هەموو جێگایەکی ئەم شارەدا دۆست و هاودەردی هەبوو،

مێژوویەکی درێژی مەلەوانی لە بەحری خەیاڵدا بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، شاهێکی بێتەخت و تاج بوو، ژن و پیاوە پڕ خەیاڵەکانی ئەم شارە پیس و پۆخڵە، وەک ڕۆحێکی نزیک لە خۆیان تەماشایاندەکرد. بەوەدا من تاکە ڕۆحی تەنیا و تاکڕەو و بێدۆست بووم لە ناویاندا، هیچ جێگا و ڕێگا و گروهێکم نەبوو تیا نیشتەجێبم، بۆ ئەوەی بێکەس و بێهاودەم نەکەومەوە، لە ڕیزی نوسەرانی ئەو کتێبەدا وەریانگرتم.

بەڵام غەزەلنوس زۆر دوادەکەوێت، هەرگیز ناتوانێت کاتەکانی خۆی ڕێکبخات، هەندێجار پەلە و شپرزەیە، هەندێجاریش خاو و بێوزە و بێئاوەز، وەک ڕۆحلەبەرێکی ون لە نێوان سادەیی و مەزنی، خەیاڵ و حەقیقەتدا هاتوچۆدەکات، بەڵام هەمیشە شتێک لە ویقاری گەورەکان و لە ڕوخساری عاریفان لە سیمایدایە. ئەو ڕۆژە بۆ یەکەمجار بڕیارمدا بڕۆم و بەجێیبهێڵم، جانتاکەم هەڵگرت و ویستم لەو شەقامە ناشیرینە بپەڕمەوە، کە شپرزە و شێت لەتاکسییەک دابەزی و بە دەنگی بەرز گووتی «مەڕۆ، توخوا مەڕۆ، واهاتم». وەک هەمیشە نارێک لە جلەکانیدا، نارێک لە قژیدا، بەڵام سیحراوی لە نیگا و دڵڕفێن لە خەندە و قووڵ لە چاوەکانیدا. بە توڕەییەوە وەستام و گووتم «ئیتر من لەگەڵ تۆدا ئیش ناکەم، تۆ پیاوێکیت ڕێزی هیچ ناگریت، هیچ... ئەوە چۆن دەکرێت من ئەو هەموو کاتە چاوەڕێی تۆ بکەم؟». بە پاڕانەوە شیرینەکەی خۆی گووتی «نا واناکەیت، دەتناسم، تۆ دڵێکی گەورەت هەیە، تۆ قەت لە غەزەلنوسی برات زویرنابیت، نابێت لە غەزەلنوسێکی نەگبەت زویربیت. گەر لە من زویربیت، جارێکی دی تا مردن غەزەلنوسێکی دیکەی نەگبەت نابینیتەوە، شتی وا هەموو ڕۆژێک نایەتە ڕێت، هەموو ڕۆژێک مرۆڤ بۆی هەڵناکەوێت غەزەلنوسێکی بەدبەختی وەک من بناسێت. دوا ئەوە بوەستە شتێکم پێیە ساردتدەکاتەوە، دوێنی شەو شتێک ڕویداوە، شتێکی گرنگ... حەزدەکەیت بیبیستیت یان نا؟».

من لەو چەند ساڵەدا وەزیفەم نوسینەوەی ئەو دەفتەرانە بوو کە تریفە لە دەفتەردارەکانی وەردەگرت و دەیدایە دەستم. بەلام دواجار حەزم بە شتێک دەکرد ژیانی تیابێت، ترسی تیابێت، پڕ نهێنی بێت. غەمگین و دەستەپاچە سەیرمکرد و نەمدەزانی چی بڵێم. بێئەوەی چاوەڕوانی وەلامی من بکات گووتی «دەرسیم تاهیر درۆ ناکات، تێدەگەیت، تۆ هەر بڵێ درۆدەکات، بەلام ماجەلانی خۆشەویست، تۆ هەڵەیت. دەرسیم تاهیر درۆ ناکات. تۆ گومانی خراپت هەیە، ڕۆژێک نەمبینیوی چاوەڕوانی شتی باش لە خەڵک بکەیت، خەیاڵە خراپەکانت چالاکترن، دەمێکە ئەوەم پێگووتوویت، عەزیزم هەقە خۆت تۆزێک چاکبکەیت. ئاه، خوایە تۆ چەند خراپ بیر لە خەڵک دەکەیتەوە، چەند خراپ. هەندێجار دەڵێم، چۆن ئەم سەرە پڕگومانەت دەتوانێت لەگەڵ ئەو دڵە جوانەتدا بژی، چۆن ئەم گومانە زۆرەت لەگە ئەو خەیاڵە فراوانەتدا دەژی، چۆن ئەو لایەنە پڕ خەیاڵ و پاکەت بەرگەی ئەو لەخۆڕازیبوون و غرورەت دەگرێت... چۆن؟ تێناگەم».

من لە سەرەتاوە لەوە ترسام کە نابێت بازنەی ئیشەکانمان زۆر فراوانبکەین. تریفە یابەحری و ئەوانی تر وادەزانن من دەریاوانێکی ترسنۆکم، بەلام من ترسنۆک نیم، بەڵکو پێموایە ناشێت بەو جۆرە خەیاڵ تێکەلاوی ژیان بکەین، دیارە دەزانم خەیاڵ لە ژیان جیاناکرێتەوە، بەلام لە هەر شت گرنگتر، دەستوورەکانی ئەو تێکەلاوبوونەیە، گرنگ دەستوورەکانە. ئەو ڕۆژە چاوانی غەزەلنوس گەلەک ڕاستگۆبوون، بەلام قژی بە جۆرێک هەڵچووبوو، چەند جارێک ویستم دەستبەرم و شانەکەی گیرفانم دەربهێنم و بیدەمێ و تکای تیا بکەم تۆزێک دەمی دابخات و کەمێک قژی دابهێنێت. دیمەنێکی سەیرمان هەبوو، من بەو قاتە شەکەرییەی بەرمەوە، بەو کراسە ڕەشە بێملوانەوە، بەو قۆپچە تەلایی و بچوکانەوە کە لەسەر یەخە و سەردەستەکانم دەبریسکانەوە، قژم بە جۆرێک

شانەکردبوو، وەک «جۆنی دێپ» لە فلیمی «دۆزینەوەی نێڤەرلاند» دا، بەرێکی لەقەراغەوە بەرەو لای ڕاست داهێنابوو، بە جێڵێکی کەمێک بریقەدار سافمکردبوو، جانتایەکی دیبلۆماسی ڕەشم گرتبوو بە دەستەوە و وەک ڕێبوارێکی هێمن لەسەر شۆستەی وێستگەیەکی دوور چاوەڕوانی هاتنی شەمەندەفەرێک بکات، وەستابووم. ئەو لە پانتۆڵێکی نیلیدا، بە کراسێکی زەیتونی قۆڵکورتەوە، وەک هەمیشە غەمگین و ڕۆمانسی، بەو چاویلکە چکۆلانەیەوە، بەو قژە درێژ و بژەوە دەرکەوت. نمونەی نارێکی بوو، بەڵام نارێکییەکی جوان. هێدی هێدی سەری تاڵی سپی تێدەکەوت، تەمەنێکی بردبووە سەر، لە نازناوی غەزەلنوس بەولاوە خاوەنی هیچی تر نەبوو. نەمدەوێرا زۆر باسی وردەکارییەکانی ژیانی خۆی لەگەڵدا بکەم، لەو کەسانەبوو کە بیریاندەچێتەوە کەمێک بۆخۆیان بژین، ئەو پێنج ساڵەی دوایی بە چەشنێک لە ناو شتەکاندا نوقمبووبوو، هەستم بە ونبوونی دەکرد. ئەو ئێوارەیە کە خەریکبوو لەو شارە ناشیرینەدا، لەو شەقامە ناشیرینە بپەڕینەوە، پێیگووتم «کە تاریک داهات دەتبەم، شتێک دەبینیت لەوەوبەر نەتبینیوە».

لە یەکەم ڕۆژەوە کە ناسیم پێیگووتم، بەشێکی گەورەی ژیانی سەفەرکردنی بەردەوامە بە هەندێک دونیای نهێنیدا. پیاوێک بوو نەیدەتوانی خۆی ئاشکرابکات، وەک ئەو گوڵ و باڵندانەی ناتوانن لە تەلیسمی خۆیان تێبگەن، ئەویش لە تەلیسمی خۆی تێنەدەگەیشت. ئەوەی وایدەکرد غەزەلنوس کەسێکی ئاڵۆز بێت و ئاسان نەچێتە ناو تەفسیرەوە، ئەوەبوو نهێنی خۆی بە نهێنی دونیاوە گرێدابوو. لەگەڵ ئەوەشدا بە چەشنێک کەمتەرخەم و بێترس ئیشیدەکرد، منی دەخستە سەر سام و دڵەڕاوکێ. لە شارێکی پیسی وەک ئەم شارەی ئێمەدا، هەر کەسێک پڕبێت لە جوانی، بێئەوەی خۆی بیەوێت، خەڵکانێک پەیدادەبن هەوڵدەدەن تا قووڵترین جێگا ڕۆحی بپشکنن و بوونی گەمارۆبدەن و نهێنی جوانی وەک

مەترسییەکی گەورە بۆسەر ئاسوودەیی هەموو شتەکان نیگابکەن. لە بەرئەوە لەو ڕۆژەوەی دەیناسم، ترسم لە بێباکییەکەیەتی. گەرچی خۆی و غەزەلەکانی ژیانی ئێمەیان پڕکردبوو لە هیمەت، بەڵام خۆی سارد و کەمتەرخەم دەینواند. تریفە یابەحریش کچێکی بە هیمەتبوو، ئەو لە بواری ئافرەتانیشدا ئیشیدەکرد، واهەستدەکەم نەورەسی خوشکم ڕۆڵێکی گرنگی لەوەدا بینی بکەوێتە نێو ئەو دونیایەوە، دواتر گەشتەکەیان دەرەنجامگەلی وەها ئاڵۆزی هەبوو تا ئەمڕۆ نهێنییەکانی بە من شیناکرێنەوە... سەرەتا غەزەلنوس تەنیا بە پەروەردەو بەخێوکردنی منداڵانەوە خەریکبوو، دەیویست هەموو ژیانی خۆی بۆ ئەوان تەرخانبکات. من بەڕێکەوت هاتمە ناو ئەوانەوە، بەر لە ناسینی ئەوان بەرەنجی خۆم پۆلێکی چکۆلانەم بۆ منداڵانی نابینا دروستکردبوو. من کەسێکی پڕ خەیاڵم، بەس خودا دەزانێت ڕۆژانە چەند چیرۆک لەسەرمدا لەدایکدەبێت و دەمرێت. بە درێژایی ژیانم حەزم لە جلی جوان کردوە، حەزم لەوەیە قژم ڕێک بێت، قامەتم قنج بێت، ڕێکپۆشبم و بە ویقارەوە کتێبێک بخەمە بندەستم یان جانتایەکی دیبلۆماسی هەڵگرم و بە شاردا لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر پیاسەبکەم. لە منداڵییەوە حەزێکی کوشندەی سەفەرکردنم تێدایە، بەڵام بێپارەیی و بێکەسی بەم شارە ناشیرینەوە گرێیانداوم. تف لەم شارە... ڕێگام بدەن هەر کاتێک باسی ئەم شارەم کرد، ڕق و قێزی خۆم نەشارمەوە... تکایە ڕێگام بدەن. لەو ساڵانەی دواییدا هاوڕێکانم هەموویان ڕۆیشتن بۆ دەرەوەی وڵات و من بە تەنیا مامەوە. من بیرم لەوە کردەوە بە جۆرێکی دی سەفەریکەم، نەخشەیەکی خەیاڵیم دروستکرد، نەخشەی سەرزەمینێکی خورافی، نەخشەیەک تەنیا لەسەری مندا هەیە، نەخشەی سەرزەمینێک کە تۆڕێکی گەورەی ڕوبار و زێ و زەریاچە داپۆشیوە، چەند مانگێک خەریکی ئەوەبووم ئەو خاکە بەسەر ئێقلیمە خورافییەکانی خۆیدا دابەشبکەم، دەبایە دۆنم بە دۆنم و هەکتار

بە هەکتار لە خەیاڵدا بیخولقێنم. ماوەیەکی درێژ وای لێهات پەیوەندیم بەو سەرزەمینەوە لە پەیوەندیم بە ژیانەوە توندوتۆڵتربوو، کاتی خۆم وەک کرێکارێکی زەحمەتکێش بەسەر ئیشە سەختەکانی دروستکردنی ئەودا دابەشکرد. هەندێک ڕۆژ تا ئێوارەیەکی درەنگ تەنیا لەسەر دروستکردنی درەختەکان ئیشمدەکرد. لەسەر دیواری ژوورەکەم ئەو نەخشە گەورەیەم دەکردەوە و بست بە بست ڕووبەرە خەیاڵییەکانم ئاوەداندەکردەوە، لەو ماوەیەدا بە وردی هونەرەکانی نەخشەکێشان فێربووم، جیاوازی قووڵی نێوان جوگرافیاناسەکان و زەویناسەکان لە بواری نەخشەسازیدا تێگەیشتم، سەیری نەخشەی گەڕیدە کۆنەکانم کرد، ئەتڵەسی خەیاڵی گەڕاڵە دێرینەکانم بەسەرکردەوە، پێوەرە کۆن و نوێکانی نەخشەکێشانم لە سەر دەستی مامۆستایەکی پسپۆڕ خوێند. ڕۆژانە چەندین سەعاتم لە گەورەکردنی نەخشەکەمدا بەسەردەبرد، ئەو کاتەی دەمایەوە بە دروستکردنی کەشتییەکی خەیاڵی گەورەوە سەرقاڵبووم تا بتوانم بەناو ڕوبارە خەیاڵییەکانی ئەو سەر زەمینە خەیاڵییەدا سەفەربکەم. بۆ ئەوەی زۆر لە کەشتییەکەم دوورنەکەومەوە ئەو جیهانە خەیاڵییەم پڕکرد لە ڕوباری وەک درەخت پەلوپۆدار. شەوگارەکانی خۆم پڕکرد لە ئاسمانی ئەوتۆ لەگەڵ ئەو زەمینە نوێیانەدا بگونجێن، بە جۆرێ لە دروستکردنی شار و شارۆچکە و میللەتەکانی سەر ئەو نەخشەیەوە ئاڵام، پیاسەی ئێوارانم بیرکرد و ناسیاوەکانی خۆم و کەسوکارم بیرچووەوە، گەیشتمە دۆخێکی ئەوتۆ خزمەکانی خۆم بۆ نەدەناسرایەوە، هەر کەسێکم دەبینی وەک مەخلوقێکی خورافی ناو شارێک لە شارەکانی خۆم سەیرمدەکرد، تووشی بێخەوی و وڕێنەی ڕۆژانە و زیندەخەوی بێبڕانەوە هاتم. ڕۆژێکیان کە هەستمکرد هێدی هێدی لە سنووری شێتی نزیکدەبمەوە و خەریکە لە نێوان ژیان و خەیاڵدا سنوورەکان تێکەڵدەکەم، ئەوەندەم هۆش تێدابوو بیر لەڕێگایەک بکەمەوە دووبارە بمهێنێتەوە ناو دونیا. بەیانییەکیان چووم

بۆ ڕێکخراوی نابیناکان و بەشەرمەوە لەدەرگای دەرەوەم دا، پێشتر هیچ شتێکم دەربارەی ئەو ڕێکخراوە نەبیستبوو، بەڵام لە هاتوچۆکانی خۆمدا نیشتەجێی کارکردنیانم بینیبوو. کە چوومە ژوورێ، بەڕێوەبەرێکی گەنج پێشوازی لێکردم و بەسەبرەوە گوێی لێگرتم. کورتەی بیرۆکەکەم ئەوەبوو کە پۆلێکی چکۆلانە بۆ هەندێک منداڵی نابینا دابنێم و لەگەڵ خۆمدا گەشتێکی خەیاڵییان پێبکەم. ئەو کات گووتم لەبەرئەوەی نابیناکان لە ئێمە کەمتر دونیایان بینیوە، خەیاڵیان کەمترە، بەڵام لەبەرئەوەی لە دونیاشدا قووڵ نەبوونەتەوە ئاسانتر لە گەشتێکی خەیاڵیدا دەبنە هاوڕێت. لەبەرئەوەی گوێگرەکەم تەواو نەیدەزانی دەڵێم چی، بە شەرمەوە گووتی «دەتەوێت هەندێک نابینا لەگەڵ خۆتدا ببەیت بۆ سەفەر؟». من گووتم «بەڵێ، بەڵام سەفەرەکەی من سەفەرێکی خەیاڵییە، سەفەرێکە لە ناو حیکایەتێکدا، من چیرۆکی گەشتەکانم بۆ ئەوان دەگێڕمەوە و ئەوانیش کۆمەکمدەکەن، وەک ئەوەی هەموومان بە ئەرزێکی خەیاڵیدا بڕۆین، بە کەنار ئاوێکی درێژدا، ڕووبارێک کە کەس نازانێت لە کوێوە هەڵدەقوڵێت و دەڕژێتە کوێوە، من ناخودابم و ئەوانیش کارکەشتی و ڕێبوار... دەچین هەندێک دارستان و شاخ و شارۆچکە دەدۆزینەوە کە تەنیا بە خەیاڵ دەدۆزرێنەوە». بە غەمبارییەکەوە سەیریکردم و گووتی «وەک ئەوەی تۆ ماجەلان بیت؟». منیش بە خۆشحاڵییەوە سەرم لەقاند و بە زەردەخەنەیەکی گەورەوە گووتم «ئا... وەک ئەوەی من ماجەلان بم، ڕاستدەکەیت». پێکەنینەکەم شتێک لە سەرسامی و گێلێتیشی تێدابوو. ئەو ڕۆژە بە زەحمەتێکی زۆر ئەو پیاوە لە بیرۆکەکەی من تێگەیشت. من دەمویست گەشتە خەیاڵییەکانی خۆم، لەسەر نەخشە خەیاڵییەکانی خۆم لەگەڵ کۆمەڵێک منداڵی نابینادا ئەنجام بدەم، چونکە منداڵانی نابینا پێویستیان بە سەفەرە. هەڵبەت لە دونیایەکدا کە ئێمەش بە چاو نایبینین، دونیایەک بۆ ئەوان و ئێمە وەک یەکە،

هەمووما‌ن بە خەیاڵ تیا دەژین و تیا دەجوڵێینەوە. ئەو بیرۆکەیە کە ئێمەی چاوساغانیش لە گەشتێکدا ڕوو لە دونیایەک بکەین، تیایدا نادیدە و نابینابین، خەیاڵی ئەو بەڕێوەبەرە گەنجەی وەها وروژاند، دەیویست دەمودەست هەموو کوێرەکانی وڵاتم لە ژوورێکدا بۆ کۆبکاتەوە و من بەرەو خاکێکی نادیار پێشیانکەوم. لە سەرەتاوە پێمگووت چاوەڕوانی زۆر خەیاڵم دەکوژێت، لە بەرئەوە نامەوێت زۆر بوەستم تا تۆ وەڵامم دەدەیتەوە. بەڵام هەر زوو ترسی چاوەڕوانی تیاکوشتم و گووتی «لە خێراترین کاتدا هەموو شتێکت بۆ دەبڕمەوە و دەبێت بە سەرداریاشی کەشتییەکی تازە». وشەی «سەرداریاشی» وشەیەکی تازەبوو بۆ من، بەڵام پێمخۆشبوو بە «سەرداریاشی» بانگمبکەن. گەرچی کابرا سەرەتا زۆر بێخەیاڵ و گێژ دەینواند، بەڵام بیرۆکەکەی من وەها هێنایە خرۆش، بە خۆشحاڵییەوە گووتی «مامۆستا، دەتوانین وابکەین پۆلەکە پۆلێکی گەڕۆک بێت، وابێت نابیناکان بەڕاستی هەست بە جوڵە بکەن، هەستبکەن لە ئاودان و بەڕوبارێکی بێسەر و بێبندا دەڕۆن». کابرا بیری لەوە دەکردەوە کەرەفانەیەک بکرێت و بیبەستێت بە پیکابێکی چکۆلەوە و هەر کاتێک من ویستم فەرمان بە شۆفێرەکەی بدەم بجوڵێت و لەو ڕێگایەشەوە نابیناکان هەست بەشەپۆل و جوڵەی بێسرەوتی ئاو بکەن. ئەو بیرۆکەیە منیشی دڵشادکرد، چونکە دەمهێنایە پێشچاوی خۆم لەگەڵ نابیناکاندا دانیشتووم و واهەستدەکەم لە دەریادایین. دەمهێنایە بەردەمم کە پێمدەڵێن «ئەدمیراڵ ماجەلان، کوێمان لێوەدیارە؟»، منیش بەدەنگی بەرز دەڵێم پەلەمەکەن... هێی پەلەمەکەن، کەمێکی تر دەگەینە وشکانی و ئاوەدانی، ها هەر ئێستا زەوییەکی سەوز لە ئاسۆکانەوە دەرکەوت، ئیدی وا گەیشتین... هێی ئاوەدانی... ئاوەدانی... سەوڵەکان خاوکەنەوە و بەرەو ڕاست بجوڵێن.

بەڵام دەبێت بڵێم بە داخەوە ئەو پیاوە وەک زۆربەی ئەو لێپرسراوە

کوردانەی لە نێوان کۆتایی سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیستویەکدا قوونیان خستە سەر کورسی دەسەڵات، درۆزن بوو. دواتر نە کەرەفانەی بۆ کڕین، نە سەلکەتورێکی قوڕاویشی دایە دەستمان، بەڵام لە بینای ڕێکخراوەکەی خۆیدا ژوورێکی داینێ و نەهاتەوە بە لاماندا. دیارە من زویرنەبووم و یەک تۆزیش چییە دڵم گەردی نەگرت. بیرتان نەچێت ئێمە لەناوچەیەکی دونیادا دەژیاین، من لەسەر نەخشە خەیاڵییەکەی خۆم ناوم نابوو فشفشستان، شوێنێک بوو درۆکردن کەسی ناڕەحەت نەدەکرد. لە سێ چوار هەزار ساڵەوە درۆکردن بووبوو بە بەشێک لە کولتووری ڕۆژانە، ئەو مێژووە خەیاڵییەی من بۆ فشفشستانم دانابوو، پڕبوو لە خەلیفە و والی و خان و بەگزادەی درۆزن، پڕبوو لە شەڕە شمشێری درۆ لە نێوان ئەو میر و پادشاهانەدا کە بە درۆ شەڕیاندەکرد و خۆیان دەمران، یان خۆیان سەردەخست، بێئەوەی مردبن یان سەرکەوتبن. پڕبوو لە شەڕی ناوخۆی سەیر سەیر کە قوربانییەکانی شەهیدی ڕاستەقینەبوون، بەڵام شەڕەکانی تێکڕا درۆبوون. لە ڕاستیدا فشفشستان دەهێنێت مرۆڤ بیبینێت، دەهێنێت گەر لە وڵاتێکی زۆر دووریش بیت، پارەی بۆ کۆبکەیتەوە و بیبینیت، بەتایبەت چەند ساڵێکە ئەو سەر زەمینە عەزیزە پڕبووە لە فڕۆکەخانەی درۆ، کە هەموو ئادەمیزادێک دەتوانێت لە هێڵێکی ئاسمانی درۆ بلیتەکەی ببڕێت، سوار فڕۆکەیەکی درۆ ببێت و بڕێکی درۆ لە عومری عەزیزی خۆی لەوێ بباتەسەر.

بەڵام بابگەڕێمەوە بۆ ئەو ئێوارەیە کە چاوەڕوانی بەهمەن ناسرم کرد و نەهات. ئەو ئێوارەیەی من خەریکبوو بڕۆم و ئەو لە دوا چرکەدا شپرزە و قژ بژ لە تاکسییەکی پیس دابەزی. ئەوە یەکەمین شەوی ڕاستەقینەی من بوو لەگەڵ ترسدا، بەهمەن ئەو ئێوارەیە تا دەمی خۆرئاوابوون منی لە چایخانە و سەرشۆستە و نێوباغچەکاندا سەرقاڵکرد. لەگەڵ کەوتنی

تاریکیدا بەرەو قەراغشار بەرێکەوتین. دوای سەعاتێک ڕۆیشتنی ئارام و هەڵمژینی هەوای پیس، لە شەوەزەنگی گەڕەکێکی پیسدا، سڵاومان لە میوەفرۆشێکی درەنگکەوتووی شەو کرد کە بە خۆی و چرایەکی بچوکەوە سەر کوچەیەکی غەمگینی ئاوەدانکردبووەوە. لەوێ حەسەن تۆفانیشمان بینی لە تەنیشت ئەو میوەفرۆشە بێدەنگەوە لەسەر تەنەکەیەکی پیس دانیشتووە و ترێی تۆزاوی دەخوات.

ئەو شەوە لە شەوە بێدەنگەکانی ئاغای تۆفان بوو، هەندێجار هێند دەمدلێر و چەنەبازبوو، بواری مەخلوقێکی دی نەدەدا قسەبکات. بەو دەنگە منگنەی خۆیەوە کە بۆنی پیری لێدەهات بەردەوام دەیرپێسا. هەمان شەو لە سەر سیلەی هەمان کۆڵان، سەروفەسالی دەرسیم تاهیریش دەرکەوت، قومقمۆکەیەکی خێل کە وەک سەگێکی بە وەفا لەبەردەم ئەو ڕوخسارە ڕۆمانسییەی غەزەلنوسدا نوشتایەوە و دەستی ماچکرد و بێئەوەی کەس هیچی پێبڵێت پێشمانکەوت. گەنجێکی چکۆلەی قەڵەوبوو، تۆزێک لە بستەباڵاکان بڵندتربوو، بە خێراییەکی سەیر دەڕۆی، لە شتێکی خڕ دەچوو زەوی لەگەڵ جوڵە نهێنییەکانی خۆیدا خلیبکاتەوە. بۆ پیاوێکی بە ویقاری وەک من کە باریک و بۆشناخ لە قاتە ئینگلیزییەکەی خۆمدا وەک نەجیبزادەیەک ڕێمدەکرد، شورەییبوو لەدوای ئەم گیاندارە سەیرەوە بڕۆم. لووتێکی هێند زلی هەبوو سەری قورسکردبوو، ئیدی نەیدەتوانی ئاسان مل هەڵبڕێت و ڕوو بە ڕوو سەیربکات. پێشتر لووتێکی وەها زلم نەبینی بوو، شەو تاریک و سارد بوو، هێند ڕۆیشتین هەستمان بە بێزاری کرد. من جگە لە تاریکی هیچی ترم نەدەبینی. تا ئەوکات باوەڕم وابوو، تاریکی ڕووبەرێکی بۆش و بێمانایە، نە نهێنی تێدایە و نە پەردەی هیچ تەلیسمێکە، بەڵام ئەو شەوە زۆر شت لە ژیانی مندا گۆڕا. دەرسیم وەک جانەوەرێک عومری خۆی لە زوڵمەتدا بردبێتە سەر ئاشنا بەرێگاکان قەلەمبازی بەسەر کەند و کەلەبەرەکاندا دەدا و ئاوڕی لە

ئێمە نەدەدایەوە، دەبایە غەزەلنوس زوو زوو بیوەستێنێ و لەگەڵ خێرایی ئێمەدا کۆکیبکاتەوە. تۆفان خۆی تاریکەڕۆ بوو، لە کونەپەپوپەک دەچوو چاوانی بە هەموو پلە جۆراوجۆرەکانی زوڵمەت ڕاهاتبێت، منیش دەلیلێکی نهێنی لە ناخمدا شەوەزەنگی بۆ ڕوناکدەکردمەوە. بەلام غەزەلنوس لە ئێمە خاوتر و لەسەرەخۆتر دەڕۆیشت، لە هەر شتێک زیاتر سەرسامی ئەو ساردی و لەسەرخۆییەی بووم. دوای سەعاتێک ڕۆیشتن دەرسیم تاهیر وەک سەگێکی ڕەسەن دەستیکرد بە بۆنکردنی زەوی، من لە دلی خۆمدا گووتم ئەم سەگ جنسە سوودێکی باشی لە لووتە زلەکەی خۆی بینیوە، خەڵکی تر زۆرن شتی زلیان هەیە و سوودی لێنابینن. بۆ ئەوەی تورەییکەم بانگمکرد «هێی تۆ لووت زل، سوودێکی زۆرت لەم لووتە حیزبابەی خۆت بینیوە، دەتەوێت چی بۆنبکەیت؟ ها... بۆ وەک سەگ قوون بەرزدەکەیتەوە و زەوی بۆندەکەیت؟». دەمگووت «شالووتۆف خۆ گۆڕی باوکە سەگەکەت لەم خاک و خۆڵەدا نییە، بۆ ئێمەت خستۆتە ئەم وشکەلانە؟». بێئەوەی وەلاممبداتەوە هەندێجار دەوەستا و وەک یەکێک لە نەخشەیەکی گەورەی ناو سەری خۆی وردبێتەوە، بە وردییەکی سەیرەوە هەنگاوەکانی خۆی دەژمارد و لەگەڵ پنتێکی خەیاڵی دیکەدا کە ئێمە نەماندەبینی دەیپێوا. هێندی نەبرد لە شوێنێکدا وەستا و وەک جرجێکی ترساو بە چنگۆلە کورت و بەهێزەکانی کەوتە هەڵدانەوەی زەوییەکە. گەر دوو کرێکار بە خاکەناز خۆڵیان لابدایە فریای نەدەکەوتن، بە جۆرێک زەوییەکەی دەدڕی گومانم لە چاوی خۆم دەکرد، دەستی وەک دوو ئامێری ئاسنین لە بنەوەڕا خۆڵەکەیان ڕادەکێشا و هەڵیاندەدایەوە. من چاوەڕوانی دەرکەوتنی سندوقێکی پڕ زێڕم دەکرد، بەلام زێڕی چی، لە بری خشڵ و تەلا، بەشی سەرەوەی لاشەیەکی لە زەوییەکە دەرهێنا و بە خۆشییەوە گووتی ئەمە خۆیەتی. لەگەڵ قسەکانی ئەودا بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا بۆنی لاشەی ئادەمییەک چوو بەسەرمدا، ئەوە یەکەمجاربوو

ببینم لاشەیەک لە خاک بهێننەوە دەرێ. دیاربوو لاشەکە زۆر کۆن نییە و تازە کراوە بە ژێر گڵەوە. بێئەوەی گوێبدەمە پیسبوونی جلەکانم لێینزیکبوومەوە و لەبەر ڕوناکی لایتەکاندا سەیرمکرد. بینینی لاشە وەک بینینی تابلۆیەکی هونەری یان تەماشاکردنی یاقووتێکی دەگمەن شتێکە بیرناچێتەوە. مرۆڤ زۆر بۆنەی شیرین و تاڵ لە یاددەکات، دەموچاوی زۆر کچی جوانی بیردەچێتەوە، بەڵام بە دەگمەن بتوانێت بینینی لاشەیەک لە بیربکات. زۆربەی ئەو کەسانەی دەیانناسم لەگەڵ بینینی لاشەدا خەیاڵی فەلسەفی و پرسیاری تایبەت بە مانای ژیانیان لاورووژاوە، بەڵام لەو ساتەدا ئەز شتێکم لا نەورووژا... هیچ شتێک. تاکە شتێک بە زارمدا هات ئەوەبوو بڵێم «لێیگەڕێن ئاسوودە بخەوێت». بەڵام ڕاستیەکەی خۆشم نەمدەزانی مەبەستم چییە. لە یەکەم ساتی بینینی لاشەکەوە، هەستم بە ئولفەت و نزیکییەک کرد لەگەڵیدا. ئەو شەوە بە هەر چوارمان لاشەکەمان لە زەوی هێنایەدەرێ. گەنجێک بوو پانتۆڵێکی کاوبۆ و کراسێکی قۆڵکورتی پرتەقاڵی لە بەردابوو. بەڵام فیشەکێک لە مەڵاشووەوە چووبووە ناو سەرێ. فیشەکێک لە ناوکەوە ڕۆیشتبوو و لە پشتەوە هاتبووە دەرێ. کە تۆفان ئەو دوو برینە گەورەیەی بینی بە دەنگی بەرز گووتی «ئەمە ئیشی مەغۆلییە، تەنیا مەغۆلی بەمجۆرە کاردەکات، هەر ئەو لە نزیکەوە دەیانکوژێت، ئیشی خۆیەتی... مامۆستایان سوێند دەخۆم ئەمە دەستوخەتی جەعفەرە، جەعفەر مەغۆلی. هاوڕێی خۆم بووە، بەڵام تۆ بوەستە، من بزانم مەغۆلی حەوت ساڵ لە مەوبەر چوو بۆ هۆڵەندا... حەوت ساڵ لەمەوبەر، توخوا هاوڕێیان سەیرکەن بزانن گوللەی تری پێوەیە؟».

شالووت چەند جارێک لاشەکەی ئەمدیوە و دیوکرد و هیچی نەبینی. تۆفان خۆشی لە نزیکەوە سەیری دەموچاوی کوڕە بەستەزمانەکەی کرد و سەری مردوەکەی بە ملاولادا جوڵاند، چەند جارێک دەستی

دا لە سنگی و بە ئارامی دەستیگێڕا، بەڵام شتێكی ئەوتۆی دەست نەكەوت. هەستاو دەستی بە شەڕواڵەكەی سڕی و گووتی «فەخری عالەم، چ باسە؟ ئەگەر مەغۆلی هاتبێتەوە ئەوا خۆیەتی». غەزەلنوس چاوانی پڕبووبوون لە فرمێسك، من خۆم تێكنەدا و پرسیم «كەستان دەیناسن؟». غەزەلنوس بە دەنگێكی تاساو و دڵێكی پڕەوە گووتی « موراد جەمیلە، موراد جەمیل، چەند ڕۆژێكە دیار نییە، یەكێك بوو لە عاشقە بێسرەوت و خەیاڵییەكان». غەزەلنوس واقسەیكرد وەك ئەوەی قوربانییەكە زۆر باش بناسێت. من نەمدەزانی موراد كێیە، پێشتر ناوی وام نەبیستبوو، بە ئەسپایی گووتم «بەڕای ئێوە چەند ڕۆژ دەبێت مردوە؟». تۆفان بۆنێكی بەلاشەكەوە كرد و گووتی «لە سێ چوار ڕۆژ تێناپەڕێت، مەیتێكی تازەیە». بە دەنگێكی گەرمەوە گووتم «با ئاسایش خەبەرداربكەینەوە... ئاسایش دەبێت بزانێت؟». تۆفان سەری بادا و گووتی «ئاسایش ناتوانێت هیچی بۆ بكات... دوور نییە ئێمە لە مەسەلەكەوە تێوە بگلێین. بەڕای من تا كاتێكی تر داییۆشینەوە، بەڵكو بیرێكی وردتری لێبكەینەوە». من سەیری غەزەلنوسم كرد و گووتم «چۆن لەم حیكایەتە تێدەگەیت؟». دەمزانی ناتوانێت وەڵامبداتەوە، هەستمكرد ئێجگار غەمگین و ماندووە. بە ئارامی دەستم خستە سەرشانی و گووتم «خۆت زۆر سەغڵەت مەكە».

سەری خستە ناو دەستی و گووتی «دڵم پێی دەسووتێت، زۆر گەنج بوو».

من لایتەكەم لە حەسەن تۆفان وەرگرت و لە نزیكەوە سەیرێكی دەموچاوی قوربانییەكەم كرد... زۆر گەنج بوو.

# سەرەتا دێرێك غەزەل بوو

لەبەشی پێشوودا گوێمان لە ماجەلان گرت، برێک لە چیرۆکی خۆی و غەزەلنوس بگێڕێتەوە. ئیدی لەم سەفەرەدا ناوە ناوە دەوەستین بۆ ئەوەی گوێ لە ڕاز و نهێنی قارەمانەکانمان بگرین، ئەوانەی بە چیرۆکی خۆیان ئەم کتێبە دەنوسن. ئەم کتێبەی ئاوها سادە بە برگەیەک لە یادەکانی ماجەلان دەستمان پێکرد، لە ڕاستیدا ئاڵۆزتر و فرەدیوتر و گرێدارترە لەوەی سەرەتا حیسابی بۆ دەکەن. لە سەرەتاوە دەبێت بڵێین «ماجیدی گوڵ سۆلاف» کە لەم چیرۆکەدا وەک ماجەلانی خەیاڵی دەیناسین، جەمسەرێکی پێچەوانە و نیگارێکی ئاوەژووی «ماجەلانی ڕاستەقینە»یە، ئەو پیاوەی لە بەشێکی ئەم سەربوردە گەورەیەدا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت و بەشێک لە سزای ئەم چیرۆکەشی دەکەوێتە ئەستۆ. دیارە دەبێت پێشتان بکەوم و بڵێم ماجەلانی ڕاستەقینە لە چیرۆکەکەی ئێمەدا، دوور و نزیک پەیوەندی بە ماجەلان خۆیەوە نییە، ئەو دەریاوانە بەناوبانگەی بەدەوری زەویدا سوڕایەوە و لە ٢٧ ی ئەپریلی ١٥٢١ دا لە دورگەی ماتان لە فلیپین لە شەڕێکی بێمانادا تیاچوو. بەڵکو ماجەلان ناونانێکی مەجازییە بۆ پیاوێک گەلێک وڵات گەڕاوە، گەلێک سەرزەمینی بینیوە، گەلێک شەو، لە گەلێک دوورگەی سەیر و دووردەستی ئەم زەمینەدا لەگەڵ ژنانی جیاواز جیاوازدا خەوتووە، بۆن و بەرامەی گەلێک ڕەگەز و هۆزی سەیری لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە، بۆنی گەلێک درەخت و گژوگیای نەزانراو لە خەونە ئەفسوناوییەکانی ئەوەوە ڕژاونەتە ئەم چیرۆکەوە. بە کورتی ماجەلانی ڕاستەقینە بە پێچەوانەی ماجەلانی خەیاڵییەوە سەفەرەکانی خۆی لەسەر نەخشەی

ڕاستەقینە و لەگەڵ بوونەوەری ڕاستەقینەدا ئەنجامداوە. ئەم دابەشبوونە و گەلێک دابەشبوونی دیکەش وادەکەن هەر لە سەرەتاوە ئەم کتێبەی ئێمە تێکەڵێک بێت لە زۆر چەشنە کتێبی جۆراوجۆر. هەندێجار ڕۆمان بێت، هەندێجاریش لەو تابلۆیانە بچێت کە نیگارکێشە کلاسیکییەکان دروستیانکردون. هەندێجار سەفەرێک بێت وێڵ لە جوگرافیایەکی خەیاڵی و هەندێجاریش دەستنوسێک بێت خنکاو لە ناو تەپوتۆزی زەماندا، شتێک لە ڕۆحی باغپەرستە دێرینەکان و شتێکیشی لە خولیای ئەندازیارە نوێکان تێدابێت. بەڵام دواجار ئەم کتێبە کە خۆی بوونەوەرێکی فرەڕووە، هەم حیکایەتە هەم نیگارکێشان، هەم ڕێکییە و هەم ناڕێکی، هەم حەقیقەتە و هەم خەون. هەڵگری چیرۆکی ئەو کەسانەشە کە ڕۆحلەبەری فرەڕوون، هەم نیشتەجێن و هەم گەڕۆک، هەم خۆشبەختن و هەم غەمبار، هەم نین و هەم هەبوون، هەم دڵسۆزن و هەم بێبار. دەبێت بڵێم کەجۆرە کتێبێکی وەها، کتێبی ڕاستەقینەی پەژارە و نائاسوودەگین کە حەسرەت و پیری بۆ نوسەرەکانیان دەهێنن و غەمێکی قووڵ و ڕاستەقینەش بۆ خوێنەرەکانیان، کتێبێکن کاتێک لە نوسینیان دەبینەوە، هەستدەکەین لەگەڵیدا ماڵاواییمان لە چەندین فریشتە و ئەهریمەنی تایبەتی ناو ڕۆحی خۆمان کردوە، دەرگامان لە هەندێک تۆفانی تاریک و باغی پڕ نهێنی و ڕێگای نەکراوەی ناو تاریکستانەکانی دڵ کردۆتەوە.

لەم کتێبەدا سەرەتا بە ئاڵۆزترین مەخلوقاتی ناو چیرۆکەکە دەست پێدەکەین، بە غەزەلنوس، ئەو کورەی دەشێت لە هەندێک ڕووەوە وەسفکردنی سەخت و ناساندنی ئەستەم بێت، چونکە هەندێجار بە ساف و ڕۆشنییەکی بێوێنە دەدرەوشێتەوە و هەندێجار تەماوی و پڕتەلیسم دەنوێنێت. بوونەوەرێکە ڕەگەزێکی خەیاڵی و ئەفسانەیی

لە لەدایکبوونیدا هەیە. پێدەچێت کەسێک بێت هەر لە منداڵییەوە لە شەیتانەکان هەڵهاتبێت. تکایە... کاتێک دەڵێم لە شەیتانەکان هەڵهاتووە ڕاستە و ڕاست خەیاڵتان بۆ هیچ چەشنە چیرۆکێکی دینی نەچێت، چیرۆکی پێغەمبەرێک کە خراپەکاران دوای کەوتوون و ئەویش وەک ڕۆحێکی موبارەک زەمینا و زەمین پاکێتی خۆی هەڵگرتووە و لە پیسی و سپڵەیی و نامەردیان هەڵهاتووە. نا، بەڵکو مەبەستم چیرۆکی ڕاستەقینەی منداڵێکە لە هەفتەی یەکەمی لە دایکبوونیدا، بێشومار شەیتان و جنۆکە و بوونەوەری دەعجان و ڕوخساری ڕەموزن لەگەڵیدا لەدایکدەبن. حیکایەتی لەدایکبوونی غەزەلنوس یەکێکە لە چیرۆکە سەرسوڕهێنەکان. ئەو هەفتەیەی غەزەلنوس تێیدا لە کۆتایی پەنجاکاندا لەدایکدەبێت، دەیەها منداڵی دیکە لەگەڵیدا دێنە دونیاوە، هەموویان پێکڕا شێواو و ڕووقرنج و بەدفەساڵن. بەر لە لەدایکبوونی، ئەو مامانەی بڕیارە ئەو دەربهێنێت، دایک و بابی ئاگاداردەکاتەوە کە دەشێت منداڵەکەیان گێڕ یان ئەهریمەنڕوو بێت، چونکە هەفتەیەکە نە ئەو نە هیچ مامانێکی دی، منداڵێکی ئاساییان لە بنی بیری عەدەم و لە منداڵدانی ژنی ئەم شارە دەرنەهێناوە. بەڵام بە ڕێکەوتێکی سەیر و بە هەڵاوێردێکی خودایی، بە ڕەحمێک کە دەستکردی یەزدان و نیشانەی بەزەیی خودایە، غەزەلنوس وەک منداڵێکی فریشتەڕوو لە کیسێکی زیوینددا لەدایکدەبێت. تاکە منداڵی ڕاستەقینە و ئاسایی ئەو وەرزەیە کە بەجۆرێکی نائاسایی پڕە لە مەخلوقاتی شێواو و منداڵی دەعجان. وەک ئەوەی شەیتان وەرزێکی دوورودرێژ لەگەڵ هەموو ژنانی ئەم وڵاتەدا خەوتبێت، وەک ئەوەی لە شەوە هەر سارد و هەرە زەمهەریرییەکانی ئەم دەڤەرەدا، کاتێک ژنان بۆ شتێک دەگەڕێن گەرمیانبکاتەوە، ئەهریمەن بە یەکێک لە فێڵە باڵدارەکانی خۆی، هاتبێت و نوتفەی خۆی تکاندبێتە ڕەحمی خانمانی ئەم نیشتیمانە ئازیزەوە کە پێدەچێت

ساڵگەلێکی زۆر جگە لە منداڵی ئەهریمەنناسا زادەی دیکەیان نەبوویێت. مامانەکە کە دیمەنی گەش و چاوی پرشەوق و ڕوخساری بێخەوشی غەزەلنوسی چکۆلانە سەرسامیدەکات، بێئەوەی ئەو ڕووداوە ناوەختە دڵخۆشیبکات، بێئەوەی بەختەوەرییەک نیگاری بگەشێنێتەوە، وەک ئەوەی دووربینانە سەیری پاشەڕۆژ بکات، منداڵە چکۆلانەکە هەڵدەگرێت و بە دایکی دەڵێت «مرۆڤێکی تەواوە، باش هەڵیگرە، ئاگاداری بە، منداڵە جوانەکان دواتر پیاوی بەدبەخت و غەمگینیان لێدەردەچێت».

«مرۆڤی تەواو» ئەوە یەکەمین وشە و یەکەمین وەسفێکە غەزەلنوس لە ساتی یەکەمی لەدایکبوونیدا دەیبیستێت، گوزارەیەکە دواتر وەک نەفرەت دوای دەکەوێت و دەبێتە خولیای سەرەکی ژیانی. بە کورتی ئەو وەرزەی غەزەلنوس تێیدا لەدایکبوو، وەرزی لەدایکبوونی ڕەوزن و چرچەڵۆک و لەتەئادەمییەکان بوو. ئێستا وا هەستدەکەم غەزەلنوسی بچوک تاکە بوونەوەرێکی تەواو بوو لە ساڵگەل و وەرزەزەمانێکدا مرۆڤەکان نیوەناچڵ دەهاتنە دونیاوە. بەڵام کە دایک و بابی یەکەمین جار پێکەوە تەماشایانکرد، شتێکیان لەسەر سینەی بینی ناڕەحەتیکردن، شتێک لە نوسراوێکی هەڵکەنراو یان لە برینێکی درێژ دەچوو. ئەو مەلایەی بانگی بە گوێدا خوێند و ناوی بەهمەنی لێنا، کاتێک مەلۆتکە چکۆلانەکەی وەرگرت و بیسمیلایەکی قووڵی کرد، ئەو قوماتە شینەی کردەوە کە تێیدا کۆرپەیەکی بزۆک و بۆرەک، بەڕەنگی بێچووە کەروێشکێکی ترسنۆک دەست و پایەکی چکۆلانەی حەوادەدا، لەسەر سینەی ئەو خەتە درێژەی بینی کە تەنیا بە چاویلکە و تێڕامان، بە کۆمەکی خەیاڵ و هزر، بە یارمەتی ئاوێنە و گیراوەی تایبەت لە خەڵوز و خوێ دەخوێنرایەوە. مەلا دوای هەوڵێکی زۆر بە منجەمنجێکی ژێرلێو ئەو دێڕە شیعرەی خوێندەوە کە بە جۆرێکی سەرەوخوار و پێچەوانەوە لەسەر سینگی کۆرپەکە هەڵکەنرابوو. ئێستا دەڵێن ئەو شیعرە غەزەل بووە،

بە هێما و ئامارژەیەکی فەلسەفی قووڵەوە کە جگە لە پیاوە ئاینییەکان کەسی دی لە مانای تێنەگەیشتووە. غەزەلێک زوو لەسنگی ئەو منداڵەدا نوقمدەبێت و دەچێتە ژێرەوە و وەک نوقمبوونی کەشتییەک ژێر ئاو دەکەوێت و لە خوێن و گۆشتی ئەو کۆرپەیەدا وندەبێت و ساڵانێکی دی وەک فەیزێک لە هێزی عاشقانە لە ڕۆحییەوە دێتەدەرێ. ئەوانەی دواتر غەزەلنوس لە گەورەییدا دەبینن، بە خۆی و باڵا باریک و قژە بژ و چاویلکەکەیەوە، هەردەم کراسێکی زەیتونی لەبەردایە، پانتۆڵێکی کاوبۆی کاڵ و جووتێک کالەی سپی کە هەمیشە تازە دەنوێنێت، هەموو چیرۆکی ئەو دێرە لە بیرکراوەی غەزەلیان بیرچۆتەوە، کە ئەم گەنجە سەرمەست و نازکە بە ڕۆژگاری پیاوە کلاسیکییەکانەوە دەبەستێتەوە، بە دەور و زەمانێکەوە عەشقی خودا و عەشقی مرۆڤی بەچەشنێک تێکەڵاوبوون، کوفر و ئیمان دەیانتوانی بێئەوەی لە یەکدی ئاشکرابن لە تەک یەکەوە بژین.

ئەمرۆ وێنەی غەزەلنوس وەک گەنجێکی نوێ کە سەرقاڵی کۆمەڵێک کێشەی ئینسانی گەورە و ڕۆژانەیە، تەواو بەسەر نیگاری ئەو مەلۆتکەیەدا زاڵە کە پێدەچێت دواهەمین ڕەوانەکراوی ئەو شاعیرە کلاسیکیانە بووبێت بۆ زیندووکردنەوەی عەرشی ئەدەبیاتێکی بەباچوو. ئێستا پتر ڕەنگ و ڕووی دانایەکی دووربین یان شاعیرێکی هێمنی هەیە، بێئەوەی ڕوخساری خاڵی بێت لە ئامارژە بۆ پیشەی تر و خولیای دیکەش. واتە گەر بە نیگایەکی دیش لێیبڕوانین، دەشێت لە بەرچاومان ڕوخساری پزیشکێکی ئارام و بە ویقار و گەنجی هەبێت، لەو پزیشکە ڕوخۆشانەی مرۆڤ هەندێجار لە دەرەوەی خەستەخانە ڕێکەوتییاندەکات. بەڵام بەهەر چاوێک سەیریبکەین و بەهەر دڵێک بیبینین، ڕوخساری لە سیحری ئەو ئامارژە و مانا قووڵانە بێبەش نییە کە لەدایکبوونەوە هاوڕێی بوون و لە

منداڵییەوە یاوەرییانکردوە.

بەرلەوەی هیچ شتێک لەسەر ژیانی «بەهمەن ناسر سەعید» ناسراو بە غەزەلنوس باسبکەم، دەبێت لەوەدا کۆمەکمبکەن پێکەوە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە ئاخۆ «مرۆڤی تەواو»، چ مانایەکی هەیە؟. بیرتان نەچێت کە کتێبەکەی ئێمە خاڵی نییە لە کۆمەڵێک لادانی زۆر، لە پرسیاری ناوەخت کە ناچارماندەکەن بچینەوە نێو ژوورەکانی خۆمان و دەرگاکان دابخەین و لە بەر ڕۆشنایی مۆمێکی کزدا بیریان لێبکەینەوە. بەهەرحاڵ لێتان ناشارمەوە کە هەندێک فەسڵی تایبەتی ئەم کتێبە دەبێت لەبەر مۆمێکی کزدا بخوێنرێتەوە، نا لەبەر ئەو هەوا و هەوەسە کلاسیکییەی لە بەلاغەت و داڕشتنی نوسینەکەدا هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی خوێندنەوەی هەندێک بەشی ئەم کتێبە تووشی دوودڵی و بێباوەڕی و گومانمان دەکەن لەو شتانەی دەیانبینین و لەو دونیایەی تێیدا دەژین... ناچارماندەکەن بگەڕێینەوە ژوورەکانی خۆمان و لەو دیو دەرگا داخراوەکانەوە بیر لەوە بکەینەوە ئێمە چەندەمان لە ڕاستیدا و چەندەمان لە خەیاڵدا دەژی. من کە لە نوسین و ڕێکخستنی ئەم کتێبە بوومەوە، کەوتمە گومانەوە لە خۆم و ناچار بەسەر مانای ژیان و منداڵی و گەنجێتی خۆمدا چوومەوە. دەبێت لەسەرەتاشەوە لەمن ببورن من لێرەدا تەنیا حیکایەتخوانێکی بێناوم کە تا کۆتایی دەمامکی خۆم لانابەم و ڕوخساری خۆم ئاشکراناکەم. نا من ڕۆڵی خۆم بە ڕۆڵی حیکایەتخوان لە شانۆنامەکانی برێشتدا ناشوبهێنم، ڕۆڵی من پتر لە ڕۆڵی کۆنترۆڵی ئەو ئامێرە ئەلەکترۆنییە تازانە دەچێت کە دەتوانن لە جێگایەکدا فلیمەکە بوەستێنن و نەهێڵن هیچتان بەسەردا تێپەڕێت، ئەو ئامێرانەی دەتوانن دیمەنەکان پاش و پێشبخەن، بتانگێڕنەوە بۆ دواوە و بتانبەن بۆ پێشەوە، دیمەنەکانتان بۆ خێرابکەن و خاوییکەنەوە. ئاه، خۆزیا ڕۆژێک لە ڕۆژان حیکایەتخوانەکانی دونیا

بیانتوانیبایـە وەک کۆنترۆڵێکـی وردەکار و زۆرفەرمـان کاریانبکردایـە، ئـەو ئامێـرەی لەیـەک کاتـدا دەتوانێـت ژمارەیەکـی زۆر ئامێـر بکوژێنێتـەوە و دایانبگیرسـێنێت، کـەی ویسـتی دیمەنـەکان دەوەسـتێنێت و دەیانخاتـەوە گـەڕ، بـەڵام ئەسـتەمە ڕۆژێـک لـە ڕۆژان هیـچ حیکایەتخوانێـک بگاتـە ئـەو پلـە باڵایـە لـە میکانیکییـەت و دەسـەڵاتی ڕەهـا. ئەگەرچـی مـن زۆر هەوڵـدەدەم وەک ئامێرێکـی بێڕەحـم ئیشبکەم، ئـەو لاپەڕانـە ڕێکبخـەم کـە لـە بەردەستمدان، ئـەو قسـانە پۆڵێنبکـەم کـە زۆرجـار نارێـک و پەرتـەوازە لـە لاپـەڕە و کاسێت و چیرۆکـی زارەکییـەوە وەرمگرتـوون. ئیشـێکی زۆرم لە پێشدەمدایە کـە مـن گرنگـی و قورساییەکەی بـاش دەزانـم. دەمەوێـت وەهـا خەیاڵـم لای تەکنیکـی ئیشـەکەم بێـت، نـە حەقیقـەت ونبکـەم و نەتووشـی زیادەڕەویـش ببـم لـە تەسلیمبووندا بـە خەیـاڵ. بـەڵام لەگـەڵ هەمـوو ئـەو دەردەسـەرییەدا، لەگـەڵ هەمـوو ئـەو دەردەشـدا خاڵـی نیـم لـەو سـاتانەی وەزیفەکـەی خـۆم لـە یاددەکـەم و لەگـەڵ تەلیسـم و پرسـیارەکاندا دەڕۆم. ئێسـتا کـە واهەسـتدەکەم تێمدەگـەن و شـتێک لـە پـەژارەم حاڵیدەبـن، سـوود لـەم هەلـە وەردەگـرم و لـەم فاسـیلە کورتـەدا لێتـان دەپرسـم ئاخـۆ هیـچ کام لـە ئێـوە بیرتـان لـەوە کردۆتـەوە، مرۆڤـی تـەواو مانـای چـی؟. ناچـارم لـە سـەرەتاوە ئـەم پرسـیارە سـەخت و بێوەڵامەتـان لێبکـەم، بـۆ ئـەوەی بزانـن و تێبگـەن مـن وەک حیکایەتخـوان کوشـتەی چ دەردێکـم. خۆتـان دەزانـن ڕوونکردنـەوەی ئـەم مەسـەلەیە ئاسـان نییـە، کەمێـک سـەبرتان هەبێـت، تـا لـە نێـوان تەکنیکـی خـۆم و خواسـتەکانی ئێـوەدا ڕێگایـەک دەدۆزمـەوە. تـا مـن بـەوکارە هەڵدەسـتم و هەندێـک لـە گێڕانـەوەی ئـەم چیرۆکـە سـەیر و ئاڵـۆزەدا دەتانبەمـە پێش، ئێـوە بیـر لـەوە بکەنـەوە ئاخـۆ مرۆڤـی تـەواو دەبێـت چـی بێـت و کـێ بێـت؟.

***

ڕۆژێـک غەزەلنـوس لـە نـاو لەشـکرێک لـە منداڵانـی ئاژەڵڕەنـگ و دەعبانیـگادا هاتـە دونیـاوە، وەک منداڵێکـی تـەواو وەسـفیانکرد کـە چ خەوشـێکی ئینسـانی تێـدا نییـە، واتـە شـتێک لـە نیـگار و ڕوخسـاریدا نەبـوو ئاژەڵمـان بیربخاتـەوە، هەمـوو شـتێکی ئامـاژەیەکـی دروسـت و ڕاسـتەوخۆ بـوو بـۆ فۆرمێکـی ئادەمـی کـە پێشـتر هەمـووان وەک سـیفات و سـیمای ئادەمیـزاد قەبووڵمانبـوو. ئەوانـەی لـەو دەمـەدا غەزەلنوسـی کۆرپـەیـان بینیـوە، هەموویـان پـێ لەسـەر ڕوخسـارە مرۆڤانـە ڕاسـتەقینە و بێگەردەکـەی دادەگـرن، هەمـوو سـوورن لەسـەر ئـەوەی بڵێـن مرۆڤێکـی تـەواو بـوو. بـەڵام سـەیر و ناوازەیـی لەدایکبوونـی غەزەلنـوس ناگەڕێتـەوە بـۆ سـیفەتە کامـڵ و فۆرمـە ئادەمییـە بێگرێکـەی، بەڵکـو دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو چەمکـە خەیاڵـی و بێتەفسـیرەی دیکـە کـە چەندیـن سـاڵ دوای لەدایکبوونـی چیرۆکـە ڕاسـتەقینەکەی گەیشـتە دەسـتی خـۆی.

لەسـاڵی ١٩٧٥ دا کـە شۆڕشـی کـورد بەسـەرکردایەتی بەرزانییـەکان هەرەسدەهێنێت، لـە کاتێکدا دەیـان هـەزار جەنـگاوەری بەدبەخـت و نائومێد سـنوور بـەرەو ئێـران دەبـڕن، لـە بەیانییەکـی تەمـاوی کۆتایـی ئـازاردا چوارکـەس لـە تەمتومانـی ڕۆژێکـی سـارد و شـێداردا، بـە دەسـتەبەرەیەک (کـە لـە بەتانـی شـڕ و قـەدی باریکـی سـوورەچنار دروسـتیانکردوە) پیاوێکـی نەخـۆش لـە یەکێـک لـە مەرزەکانـەوە بـۆ بیمارسـتانێک لـە ئێـران دەگوێزنـەوە. پیاوێکـی ڕیش درێـژ و نەخۆشـە، پتـر گومانـی سیلی لێدەکرێـت، پەیتاپەیتـا خوێـن دەهێنێتـەوە و یـەک لەسـەر یـەک لەرزوتـای کوشـندە دەیگرێـت. ئەوانـەی کـە هەڵیانگرتـووە چـوار کـوڕی گەنجـن، دووانیـان کـوڕی ئـەو پیـاوەن و دووانەکـی دیکەشـیان خزمـی نزیـک و ناسـیاوی دڵسـۆزن. بـە نێـو بەفرانبـار و تۆفانێکـی دووردرێـژدا هاتـوون، بـە درێژایـی ڕێـگا بەهـەر کەسـێک دەگـەن پرسـیاری ئـەوەی لێدەکـەن ئاخـۆ کاغـەز و پێنوسـی پێیـە، بـەڵام لـە ڕۆژگارێکـی وادا و لـە دەڤەرێکـی

لەو جۆرەدا پەیداکردنی کاغەز و پێنوس کارێکی هەروا ئاسان نییە. پێدەچێت پیاوە نەخۆشەکە ململانێیەکی سەخت لەگەڵ مردندا بکات، بۆ ئەوەی خۆی بگەیێنێتە پارچە کاغەزێک تا شتێکی زۆر گرنگی لەسەر تۆماربکات. نە کورەکانی و نە ناسیاوە نزیکەکانی لە نهێنی ئەو داواکارییە سەیرە تێناگەن، هەر چواریان دەزانن ئەم نەخۆشەی چەندین ڕۆژە لە باران و لیتە و بەفردا هەڵیانگرتووە چەند ساڵێکە دەستی بۆ پێنوس و دەفتەر نەبردووە. ئەو نەخۆشە مەلا غەریبی هاجەرە کە لە ساڵانی سی و چلی سەدەی ڕابوردوودا، سەردەمانێک کە تازە ئامێری چاپ دێتە کوردستان و تازە ڕۆژنامە بڵاودەبێتەوە، کۆمەڵێک غەزەلیات بە ناوی «غەزەلیاتی غەریب»ـەوە چاپدەکات و بێئەوەی کەس بیناسێت لە ژێر نازناوی سوختەدا ناوبانگێک لە ناو مەلاکان و گوڵستانناسەکان و حافزخوێنەکاندا پەیدادەکات، کە هەر زوو سەرهەڵدانی مەوجی ئەدەبیاتی نوێ، خۆی و شیعرەکانی بیر دونیا دەبەنەوە و دەکەوێتە پەراوێزەوە.

هاجەر دوای تەرککردنی شیعر واز لە قەڵەم دەهێنێت و دەبێتە پیاوێکی ئاسایی، بەڵام وەک هەموو مرۆڤە ئاساییەکان شتێکی نائاسایی لە ڕۆحیدا دەمێنێتەوە، ئەو شتە سەیرەش بریتییە لە هێزی عاشقبوون بە بێدەنگی. لە تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵیدا دوور بە دوور حەز لە بەهاربانو دەکات کە ژنێکی سپیکەڵانە و سینەپڕ و شەرمنە. ئێواران لە سەربان لە کاتی جێ چاکردندا بۆ مێردەکەی، بەیانیانیش لە کاتی بازاڕکردندا، مەلای هاجەر، بەهاربانو دەبینێت. مەلا لەوانەیە کە بە بێدەنگ عاشق دەبن، لە جنسی ئەو پیاوانەیە کە ساڵەهای ساڵ دەسووتێت و ڕێگا نادات هیچ بوونەوەرێک ناخی بخوێنێتەوە، لە جنسی ئەو مرۆڤانەیە کە دەتوانن زۆر قایم دەرگای ڕۆحی خۆیان دابخەن و نەهێڵن هیچ بوونەوەرێک لە ناوەوەڕا دەرگاکەیان بشکێنێت. لەو سەردەمەدا کە شاردنەوەی عەشق فەزیلەت و دان بەخۆداگرتن لە بەردەم

فیتنـەی مەعشـوقدا هێمایـە بـۆ دەسـەڵاتی پیـاوە جوامێـرەکان، مـەلای هاجـەر چ ئیرادەیـەک لـە جەسـتە و شعوریدا هەیـە دەیخاتـە کار تـا ئـەو خۆشەویستییە ناوەخت و بێدەنگە لـە دڵـی خۆیـدا بخنکێنێـت. دەگەڕێتـەوە سـەر سازدانی سروتە دینییە سەختەکان و خۆگرێدانەوەیەکی شـێتانە بـە میحرابـەوە، بـە ڕۆژ هەندێجار بـۆ سـزادانی جەسـتەی خـۆی و بـۆ مراندنـی خەیـاڵ بـە کـەوا و سـەڵتەیەکی کۆنـەوە، بـە تەشـوێیەکی تیـژ و بڕبەنگێکـی گـەورە و چەقۆیەکـی دەم پانـەوە ڕوودەکاتـە دەرەوەی شـار، بـۆ ئـەوەی لـە درەختـەکان ئایەتـی قورئـان هەڵکەنێـت و لەسـەر بـەردەکان سـزای خـۆی بنوسـێت و لەشـی خـۆی لـە کاری بێهـودە و بێئامانجـدا ماندووبـکات. مـەلا لـەو وەرزەدا خـۆی تـا ئەنـدازەی مـردن سزادەدات، بـەڵام هەندێـک چەشـنە عەشـق هەیـە گـەر ڕێـگای سروشـتیان بـەرەو مەعشـوقە نەدۆزییـەوە، ڕێـگای ئەفسـانەیی دەگرنەبـەر، لـە ئیمـان بەهێزتـرن و لـە هێـزی عەقـڵ باڵاتـرن، ڕوناکیـان لـە سـنووری جەسـتەی ئینسـان تێدەپەڕێت، شـەبەنگێک دروسـتدەکەن و چـواردەوری خۆیـان بـە شـەوقێک ڕوناکدەکەنـەوە، کـە ئـەو شـەوقە هەندێجـار ڕوناکـی بەختـەوەری و هەندێجاریـش تیشـکی ترسـناکی غـەم و کارەسـاتە. عەشـقی مـەلای هاجـەر لـەو جـۆرە عەشـقە دەگمەنانـە بـوو کـە دەیتوانـی لـە خاوەنەکـەی جیاببێتـەوە و لـە دەرەوەی دەسـەڵاتی ئـەو بجوڵێتـەوە. شـەوێک لـە کاتێکـدا مـەلای سـوختە لـە پەنجـەرەی نهۆمـی دووەمـی ماڵەکەیـەوە سـەیری ئەسـتێرە دەکات، گەنجێکـی جـوان دەرگای ژوورەکـەی دەکاتـەوە و بـە هێمنـی دەسـتدەخاتە سـەر شـانی مـەلاو دەڵێـت مـەلا مەترسـە، مـن بەشـێکم لـە خـۆت، مـن ئـەو عەشـقەی تـۆم کـە لـە ڕۆحـی خۆتـدا خنکاندوتـە و دەتـەوێت بیکوژیـت. دوای گفتوگۆیەکـی فەلسـەفی دووروودرێـژ، مـەلا تێـدەگات، خۆشەویسـتی ئـەو بـۆ ئـەو ئافرەتـە سـپیکەلانە شـەرمنە چیتـر لـە دەسـەڵاتی ئـەودا نەمـاوە، بەڵکـو چۆتـە ئاسـتێکی دیکـەی وجـود و بۆتـە ملکەچـی کۆمەڵێـک ڕێسـا لـە دەرەوەی

توانای تێگەیشتنی ئەو. هەمان شەو لە کوچە خامۆشەکانی شاردا دوای ئەو کوڕە دەکەوێت و بۆی ناگیرێتەوە. مەخلوقێکی سەرکەشە لە مەیخانە تاریکەکانی خەیاڵی مەلادا درستبووە، بوونەوەرێکی خەیاڵییە لە خولیا تاریکەکان و ژوورە نهێنییەکانی وجودی ئەو ڕایکردوە، مەخلوقێکە دەچێتە ئەو جێگایانەی مەلا بە درێژایی ژیانی لێیانترساوە. چەندەها شەو مەلا بە پەتێکی ئەستوورەوە وەک ئەوەی ڕاوی گیاندارێکی ترسناک بکات، لە کوچەکاندا، لە گوزەرە تاریکەکاندا، لەدەوروبەری ماڵی بەهاربانو، لە مەیخانە چەپەک و لە کۆڕی قومارچییەکانی شەودا بە دوو چاوی توڕە و ئیرادەیەکی پۆڵایینەوە ڕاویدەکات. چەندەهاجار دەیگرێت و دەیبەستێتەوە، چەندەهاجار بە عەمودەکانی شار و بە درەختەکان و بە کۆڵەکەکانی بازاڕەوە شەتەکی دەدات، بە گۆپاڵی شوانێکی کێوی دارکاریدەکات، بە قامچی عەرەبانچییەکان دەیداتە بەر جەلدە، وەک ئاژەڵێکی یاخی پەتیدەکاتە مل و بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشێت. گەنجێکی بەرەڵایە بێوچان غەزەلی شاعیرە کورد و عەرەب و فارسەکان دەخوێنێتەوە، مەست و بێئاگا لە ئەدەبیاتی عەشقدا مەلەدەکات. مەلا چەندە ئازاری دەدات، هێندەش بۆی دەگری. چەند دەیبەستێتەوە، هێندەش حەز بە ئازادکردنی دەکات. دوای هەموو جەنگێکی دووردرێژ، دوای هەموو ململانێ و زۆرانێکی کوشندەی نێوان ئەو دوو بوونەوەرە، مەلا دۆڕاو و دەستەوەستان کۆت و پێوەندەکانی دەکاتەوە و پێیدەڵێت «بڕۆ... بڕۆ و مەیەرەوە». بەڵام شەوێک ئەو عەشقە بەرەڵا و چاونەترس و غەزەلگۆیە لەگەڵ بەهاربانودا دەگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەو ژنە شەرمن و سرکەدا کە غەزەلە عاشقانەکان مەستییانکردوە و بە کراسێکی شیفۆنی مۆرەوە خۆی داوەتە دەست ئەو کوڕە خەیاڵییەی کە بەشێکە لە مەلا و بەشێکیش نییە لەو. مەلا باوەڕناکات... بەڵام خۆیەتی، هەمان ئەو بەهاربانوە سپی و ئەفسوناوییەیە کە بە بەرچاوی مەلاوە ڕووتدەبێتەوە

و لەسەر ئاهەنگی خوێندنەوەیەکی بێوچانی غەزەلیاتدا لەگەڵ نیوە عاشقەکەی ئەودا دەخەوێت. خەوتنێک لە سەرجێکردنی تەقلیدیی ژن و پیاوی ئەو سەردەمە ناچێت کە بە ئەستەم شەرواڵ و دەرپێکانیان دادەکەنن و بە جلەوە خۆیان دەدەن بەسەر یەکدا، بەڵکو جۆرێکە لە سێکسکردن کە چەندین سەعات دەخایەنێت، دوو مەخلوق ڕووتدەبنەوە و هەموو ئەو دۆخە جنسییانە تاقیدەکەنەوە کە لە کتێبی کاماسۆترادا هەیە. هەر دووکیان دوو گیانلەبەری خەیاڵین لە دیوێکی خەیاڵی ژیاندا، خەوتنێکی خەیاڵی پێکەوە دەخەون. لەدوای ئەو شەوەوە ئەو دیمەنە دەیانجار دووبارەدەبێتەوە. تا ڕۆژێک مەلای هاجەر، لە کوچە و کۆڵانە تەسک و تۆزاوییەکاندا بەهاربانوی شەرمن بە زگێکی نوێ و نیگایەکی تازەوە دەبینێت. بانوی دووگیان بە نیگایەکی هێند نائاسایی سەیری مەلا دەکات، وەک ئەوەی ئاگاداری ئەو یارییە بێت کە نیوە خەیاڵییەکەی خۆی، شەوان لەگەڵ نیوە خەیاڵییەکەی مەلادا سازیدەکات، گەمەیەکی ئەفسوناوی و ئەفسانەییە کە بەرهەمەکەی منداڵێکی ڕاستەقینەیە کە ئێستا بەهاربانو لە دوورەوە «بەلادانی عەباکەی و دەرخستنی زگی» نیشانی مەلای دەدات. کاتێک غەزەلنوس لەدایکدەبێت، مەلا وەک شێت بە دەوری ماڵی بەهاربانودا دەسوڕێتەوە. حیکایەتی ئەو کۆرپەیەی دێڕێک غەزەل لەسەر سنگی نوسراوە، هێندەی تر مەلا لەو جەریانە خەیاڵییە دڵنیادەکاتەوە کە چەند وەختە ژیانی پڕکردوە. بەڵام ئەو هێند پڕ نهێنی و سەختگیرە تاسەرەمەرگ کەس هیچی لێنابیستێت. بەهاربانو منداڵەکەی خۆی ناودەنێت بەهمەن، ناسر سەعیدی باوکیشی کە فەرمانبەرێکی ساڵداری پەروەردەیە، بێئەوەی هەست بە هیچ شتێک بکات، کوڕەکەی دەگرێتە باوەش و گومانی لەوە نییە منداڵێکی لە گۆشت و خوێنی خۆی لە ئامێزگرتووە. دوای لەدایکبوونی بەهمەن ناسر، مەلای هاجەر لە دەست ئەو نیوە شاعیر و غەزەلخوێنەی خۆی ڕزگاری نابێت،

شەوگارانێکی دووروودرێژ دێتەوە وێزەی و غەزەلیاتی ناوازە و عەشقنامەی دووروودرێژی بۆ دەخوێنێتەوە، مەلا دەخاتە ژێر گوشارێکی توندەوە تا غەزەلیاتە نوێکانی بۆ تۆماربکات و لە دیوانێکدا بینوسێتەوە، بەڵام مەلای هاجەر تورە و بێزار لە فەیزی ئەو هەموو عەشقە، بڕیاردەدا تا مردن پێنوس نەگرێت بەدەستییەوە. لە حەسرەتی ئەو دۆخەی خۆی و بۆ ئەوەی هەموو شتێکی بیربچێتەوە، منداڵەکانی هەڵدەگرێت و ڕوو لە شارۆچکەیەکی دوور دەکەن، لەوێ خۆی فڕێدەداتە ناو زەریای بێئەمانی سیاسەتەوە، کە باشترین جێگایە مرۆڤ دڵی خۆی تیابخنکێنێت. جەنگ بۆ کوردستان و شەڕی بێوچان لەگەڵ کۆمۆنیستە کافرەکاندا بەجۆرێک هۆشیدەبەن، کاتێک بەئاگادێتەوە دەبینێت هەم تەمەنی ڕۆیوە و هەم ئەو نیوە عاشقەی خۆشی پیرکردوە کە زەمانێک پەرێشان و ئاوارەی کرد. ئیدی ڕۆژگارێکی درێژ ئەو گەنجە شاعیر و غەزەلخوێنەی ناو ڕۆحی جێدەهێڵێت و دەڕوات و تا مردن یەکتر نابیننەوە.

لە کۆتایی زستانی ساڵی ١٩٧٥ دا کاتێک مەلای هاجەر لە حەسرەت هەرەسی شۆڕش تووشی نەخۆشییەکی کوشندە دەبێت و بە ناو تۆفان و لافاودا بەرەو ئێران دەیبەن، دەیەوێت حیکایەتی ئەو کوڕە خەیاڵییە لەگەڵ خۆیدا نەباتە ژێر گڵەوە. بە درێژایی ڕێگا بەدوای پێنوس و دەفتەرێکدا دەگەڕێت، تا بەر لە کۆچ و ماڵاوایی چیرۆکی لەدایکبوونی غەزەلنوسمان بۆ بنوسێتەوە. لە ڕۆژێکی تاریک و باراناویدا ئەوانەی مەلای نەخۆشیان لە دەستەبەرەیەکدا هەڵگرتووە، لە کوێرە گوندێکی سەرسنوور لادەدەن، نەخۆشەکە دەبەنە ماڵێک و دەکەونە گەڕان بەدوای پێنوس و دەفتەردا، دوای ماوەیەک بە چوار دەفتەر و کۆمەڵێک پێنوسەوە دەگەڕێنەوە. مەلای سوختە لە کاتێکدا لە نێوان ژیان و مەرگدا جۆلانێدەکات، جارێک گوێ بۆ دەنگی بروسکە و بارانەکان

ڕادەدێرێت و جارێکیش وەنەوزی مەرگ دەدات، لە ساتەوەختێکی وا سەختدا، تین دەداتە ئێسکە پیر و ماندووەکانی خۆی، سەرینێکی گەورە دەخاتە ژێر دەستی و لە بەردەم چرایەکی بچکۆلەدا « کە وەک ژیانی ئەو بە ئاستەم نوزەی تێدایە» دەکەوێتە نوسینی نامەیەکی ترسناک و درێژ بۆ کەسێک هەرگیز نەیبینیوە و نایناسێت.

## سەرەتاکانی جەعفەری مەغۆلی و حەسەن تۆفان

من «حەسەن تۆفان» لەگەڵ جەعفەری مەغۆلیدا پێکەوە لە شانە حیزبییەکاندا گەورەبووین، ئەو ڕۆژەی مامۆستا «شەوبۆیان» بانگیکردین و مژدەی پێداین کە هەردووکمان بووینەتە ئەندامی گروپێک بۆ کوشتن و پاکسازی نهێنی، بەجووتە لە خۆشیاندا خەریکبوو باڵمان لێدەڕوا. ئەگەر یادگارییەکان خیانەتم لێنەکەن لە یادمە ئەو ڕۆژە مەغۆلی سەدجار لە من دڵخۆشتر و ڕووگەرمتر بوو. کاتێک لە بەردەم سمێڵە قولاپی و نیگا وەحشییەکانی مامۆستادا وەستابووین، مەغۆلی کە کورتەبنەیەکی، لچ ئەستووری، لووت پلیشاوە بوو، وەک بت، وەک سەربازێک فەرمانێکی گرنگ لە فەرماندار وەرگرێت، قیت خۆی ڕاگرتبوو. جامانە چڵکنەکەی لە ملیدابوو، بەشێوەیەک قنج و بە نیزام دیاربوو وەک مشکێک هاتە بەر دیدەم لە قەوارەی خۆی زیاتر ئاوسابێت و بەدەر لە سروشتی خۆی لەسەر دووپێ چەقی بێت. بەجۆرێک دڵشاد و سەرمەست بوو لام وابوو وادەزانێت بۆتە شاهی عەجەم. جەعفەری مەغۆلی بە خۆی دەگووت من بۆ پیاوکوشتن خولقاوم. ئەو ڕای وابوو وەرگرتنمان لە تاقمی ئیغتیالاتدا سەرەتای سەرکەوتنمان دەبێت بۆ پلەوپایە بەرزەکان. ئەوکاتیش وەک ئێستا بڕوای وابوو ئەو کەسانەی

لە هونەری کوشتن و پاکردنەوە و ڕێسافکردن نازانن تا دەتۆپن لە خواری خوارەوەی هەرەمەکەدا دەبن. من و ئەو وەک دوو کەس کە هیچ بەهرەیەکمان نەبوو، هیچمان لەو ڕۆشنفیکرە لوسکانە نەدەچوو کە بە ناز و نوزی زۆرەوە دەهاتنە ناو حیزب و زوودەبوونە هەموو شتێک، لەدەمانچەکانمان و بێدەماغی خۆمان زیاتر سەرمایەی ترمان نەبوو بەکاریبهێنین، دوو سەرمایەی بەنرخیشبوون، کە کەم کەس بەڕاست و دروستی قەدریان دەزانێت. من هەردەم گوێتوومە گەمژەیەکی دەمانچە بەدەست لەم وڵاتەدا دەتوانێت تا پلەی سەرەک کۆماری بڕوات، قسەکەشم زۆربەی کات ڕاست دەرچووە. من و مەغۆلی هەردووکمان گەمژەبووین، بەڵام دەمانزانی چۆن کاسبی بە بێعەقڵی خۆمانەوە بکەین. هەردووکمان لە مامەڵەی کارژۆلەیەکی چکۆلانەوە لە پیرە پیاوێک کە بابی تاقمە کچێکی شۆخی گەڕەک بوو، بووینە هاوڕێ... هەر دوو گەنجبووین... هەردوو بۆ سەیری کچە عەیارەکانی کابرا نەوەک بۆ کڕینی کارژۆلە چووبووین. کە لەیەکدی ئاشکرابووین، وەک دووکەس کە دەبنە خاوەنی یەک نهێنی، بووین بە هاوڕێ. ناسینی تەواوەتی من بۆ ئەو دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی کارکردنمان لە شانەی ئیغتیالاتدا، کە من بە شانەی کوشتنی نهێنی وەرمدەگێڕایە سەر کوردی و جەعفەری مەغۆلی بە زمانە بازاڕی و عەقڵە سادەکەی خۆی ناویدەنا «تیپی وەرزشی فتکردن». ئەوکات هەردووکمان لای کادێرێکی ناسراوی حیزب قوتابی بووین کە ناوە نهێنییەکەی «سابیر فەلەکزان» بوو. فەلەکزان سەرکردەیەکی خەباتی نهێنی و سیاسییەکی وردی ساڵانی هەشتابوو، ئەو لەو سەردەمانەدا بەرەوی بە قوتابخانەیەکی تایبەتی خۆیدا کە بەرنامەیەکی هەمەگیر و فرەدیوی هەبوو. دەبێت بڵێم یەکێک بوو لە باوکانی زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانەی ئەو دەم و عەیامە کە بە دید و بڕوای من گەلەک تاریک بوو، کەچی لای هاوڕێکانی دیکەم پڕ ژیان و

سەرشار لە خۆشی بوو. ئەوکات قوتابخانەگەلێکی زۆری کوشتن لە وڵاتدا لە ئارادا بوون، بەڵام کەس وەک ئەو شتەکانی نەدەخستە قاڵبی عەقڵ و تێڕامان و بیرکردنەوەوە. فەلەکزان پیاوێکی لاوازی چاویلکە لەچاوی زۆر چرچ بوو، خۆی لە ژیانیدا مێروولەیەکی نەکوشتبوو، مریشکێکی سەر نەبڕیبوو، بەڵام بە خۆی دەگووت تیورەسێنی شۆڕش. ئەوکات زۆر شتی لێ تێنەدەگەیشتم، بەڵام ئەوە حاڵی دەبووم کە دەیگووت، تەواوی ئەم ژیانە، تەواوی ئەم دونیایە لەسەر شتێک بەندە کە ناوی «بێدەنگییە». ئەو دەم لە نێوان سیاسەتبازانی ئەو دەورەدا دوو ڕێگا لە گۆڕێ بوو، ڕێگایەکیان من بە ئیجتیهادی خۆم ناومدەنا قوتابخانەی ئابڕوبردن، چونکە جەوهەری پروپاگەندەی سیاسیان لەسەر ئابڕوبردنی نەیاران بەندبوو. ڕێبازی دووەم کە ڕێبازێکی ترسناکتر بەڵام بە حورمەتتربوو، ناومنابوو ڕێگای کپکوژان، ئەوانەبوون نەیارەکانی خۆیان گەلەک بێدەنگ و لە هەلومەرجێکی تەمومژاوی ئاڵۆزدا لەنێودەبرد، بەجۆرێک گەلەک پرسیار بێوەڵام جێدەما و گەلەک گرێ بێکرانەوە و گەلەک نهێنی بێشیکار. ئەوان فەزایەکیان دەسازاند کوشتنەکان وەک جۆرە تەلیسمێک دەکەوتنەوە کە تێیدا کەس نەدەگەیشتە یەقین. من کە خۆم بە یەکێک لە دروستکەرانی ئەو سەردەمە دەزانی، ساڵانی سەرەتای پەروەردەی سیاسی خۆم لە بندەست فەلەکزاندا بردەسەر کە یەکێک لە ڕابەرە گەورەکانی سیاسەتی بێدەنگی بوو. من و مەغۆلی پێکەوە کارمان بۆ ئەو دەکرد، لە پاکردنەوەی هەندێک لە فاشیستەکاندا بەشداریمانکرد، ژمارەیەکی زۆر خائین و خۆفرۆشی وڵاتمان بە سزای گەل گەیاند. هەندێک لە نەیارەکانی فەلەکزانمان لە حیزبدا بێسەروشوێن کرد، چەندان کادێری پارتە سیاسییەکانی ترمان بۆ ئەو لەناوبرد، هەموو شتەکانیشمان بە بێدەنگییەکی بێوێنەوە ئەنجامدەدا. فەلەکزان ئەو هەموو ساڵە دوور و درێژەی خەبات، دوکانێکی بەرگدرونی هەبوو،

وەک ڕۆحێکی بێگوناه خۆی بەسەر مەکینەکەیدا دەنوشتانەوە و بەچاوە کزەکانی بەزەیی و سۆزی میوان و کڕیار و ڕێبوارانی ڕادەکێشا. بە جۆرێک بێجورم و کەمتین بوو، کەس خەیاڵی بۆ ئەوە نەدەچوو، بوونەوەرێکی وەها لاواز بتوانێت لە پشت ئەو هەموو ئیشە ئاڵۆز و خوێنینەوە بێت، وەها ڕیوەڵە و نەخۆش دیاربوو، مرۆڤ کە دەیبینی کسپە لە هەناوی دەهات و دەیگووت خودایە ئەمە چ مەخلوقێکی بەدبەخت و بێچارەیە. لەبەرئەو ڕوخسارە کەساسەی، لە سەختترین ڕۆژ و ئاڵۆزترین سەردەمیشدا، بێئەوەی تووشی هیچ گرفتێک ببێت، لە چاوی سیخوڕەکانی دەوڵەت ون و بەدووربینی هەواڵگرەکانی دەسەڵات نەدۆزرایەوە. دەبێت بڵێم ئەو زەمانیش فەلەکزان زۆر بە مەغۆلی سەرسامبوو. جەعفەری مەغۆلی شێوازێکی زۆر تایبەتی لە کوشتندا هەبوو، زۆر لە قوربانییەکان نزیکدەبووەوە، قسەی لەگەڵدا دەکردن، لەگەڵیاندا دەدوا، نوکتەی بۆ دەگێڕانەوە ئەوسا دەستی ڕادەکێشا و دەمانچەی لە ڕوودا بەرزدەکردنەوە و دەیکوشتن. هەمیشە دەمانچەکەی لە گیرفانیدا هەڵدەگرت. ئەو نەبێت تائێستاش کەسم نەبینیوە لە گیرفانیدا دەمانچە هەڵگرێت. بە هەر بیانوویەک بایە لە نێچیرەکەی نزیکدەکەوتەوە و لە نزیکەوەڕا فیشەکێکی دەنا بە ناوکییەوە، کە دەکەوت و دەمی بۆ هاوارکردن دەکردەوە، یەک فیشەکی دیکەشی دەنا بە مەلاشوویەوە. شێوازی مەغۆلی تەواو لە شێوازی من جیاوازبوو کە لە دووری پازدە تا بیست مەترەوە، بە دەستێکی بەهێز و ڕێک و نەلەرزەوە تەقەم لە سنگی قوربانییەکان دەکرد. بیرم نایەت هیچ جارێک گوللەی من جگە لە سینەی کوژراوەکان جێگای دیکەی پێکابێت، هەرگیز هەڵەم نەکردوە. هونەری کوشتن ئەوە نییە هەر جێگایەکی نێچیرەکەت لێدەرکەوت بیپێکیت، ئەوە دەستوخەتی پیاوکوژە کەم بەهرە وبێغیرەتەکانە. کوشتن بریتییە لەوەی سینەی دوژمنەکەت

بپێکیت، سینه و هیچی دیکه. له شێوەی من و مەغۆلی بترازێت، گەلەک شێوازیتر لە بازاڕدا بوون، شبر لەوانەبوو تەنیا تەقەی لە ناوچاوان دەکرد، ئەوانەی لە کۆتایی حەفتاکان و ناوەڕاستی ساڵانی نەوەدا نێوچاوانیان پێکرا، سەرجەمیان بە دەستی « شبر مستەفا» تیاچوون. بەڵام «تەقسیم» لە سەرەوە بۆ خوارەوە بە هێڵێکی ڕاست کوژراوەکانی گوللەباران دەکرد. «بێژنگ» کەمتر لە پەنجا فیشەکی بە نێچیرەکانییەوە نەدەنا، کوژراوەکانی دەستی ئەو وەک بێژنگێکی کون کونیان لێدەهات. ئەوانەی لەو بوارەدا کارماندەکرد پەنجا کەسێک بووین، ئیشمان لە ناوبردنی یەکدی و پاکردنەوەی نەیارە حیزبیەکان و دوژمنە نەتەوەییەکانمان بوو. هەر یەکەمان لە ڕێگایەک و لەبەردەستی کادێرێک و بۆ مەبەستێکی تایبەتی کارماندەکرد. من و مەغۆلی زیاتر پێکەوە ئیشەکانمان ئەنجامدەدا. ئەو بەردەوام دەستکێشێکی چەرمی گەورەی دەکردە دەستی و بە ڕەنگ و ڕوخسارێکی بێڕەحمەوە قسەیدەکرد. دەنگێکی ناسک و خۆشزەنگی هەبوو، ئەو دەنگە خۆشەی وایدەکرد بەقسە بتوانێت زۆر لە نێچیرەکانی نزیک ببێتەوە، کە گوێت لەو مۆسیقا هێمن و شاردراوەیەی دەنگی دەگرت، گومانی خراپت نەدەما و دڵنیادەبوویتەوە. بە هۆی ئەو سەروزمانە شیرینەوە دەیتوانی زۆر لە قوربانییەکانی بچێتە پێشێ. هەندێجار کە بێدەنگەی دەکرد و دەکەوتمە نیگای، نەدەچووە عەقڵم ئەو سەروفەساڵە ئاوساو و چاوە دەرپەڕیو و لچە گرمۆڵانە، دەنگێکی وەها جادووهێنیان لێهەستێت. هەرجارەی یەکێکمان تەقەی لە قوربانییەکە دەکرد. من دەستوەشێنتر و خێراترین بکوژی ناو بکوژان بووم. هێندەی کەسی نیازم دەردەکەوت، هەر بمدیبایە سینەی بەرابەرم دێت، بێئەوەی کات بەفیرۆبدەم لە چاوتروکانێکدا هەموو شتێکم تەواودەکرد. گەر یادەوەریم خیانەتم لێنەکات، بیرم نییە نێچیری خۆم ڕاچڵەکاندبێت و خستبێتمە گومان و

دوودڵییەوە. جارێک نەبووە بواری بیرکردنەوەم پێدابێت، گوناهترین شت ئەوەیە نێچیرەکەت بتوانێت بیر لە مردن بکاتەوە. ئەو ساتەی مرۆڤ تێیدا تەقەی کوشتن لە یەکێک دەکات، لەو هەناسە کورتەدا نە سیاسەت، نە ڕق، نە تۆڵە نامێنن، تەنیا شتێک کە تۆ بە نێچیرەکەتەوە گرێدەدات مردنە. گرنگترین شت لای من ئەوەیە نێچیرەکەم بمرێت و بواری ئەوەی نەبێت بترسێت، بەو فاسیلە درێژەدا نەڕوات کە لە نێوان یەقینی مردن و مردن خۆیدا دەوەستێت. مەغۆلی بە پێچەوانەی منەوە، جیاوازییەکی زۆری لە نێوان ڕاوەکەو و ڕاوی ئادەمیزاددا نەدەکرد. باوەڕی وابوو چۆن کەو هاوڕێکانی بۆ مردن بانگهێشتدەکات، مرۆڤیش دەبێت بەجۆرە خوێندن و قاسپەیەکی تایبەتی نێچیرەکانی تا ناو بۆسەکە ڕاکێشێت، ئەوسا کە هەردوولا دڵنیابوون، کە هەردوولا زانیان کەوتوونە ناو گێژەڵووکەیەکەوە کە سەرێکی سوڕاندنەوەی بە دەستی بکوژ و سەرەکی دی بەدەستی کوژراوەوەیە، ئیدی هەر یەکەیان ڕازی بەقەدەری خۆی، یارییەکە بەرەو کۆتایی ڕادەکێشێت. تا ساڵێک دوای ڕاپەڕینیش من هەر ئەندامی ئەو شانەی پیاوکوشتنەبووم. ڕۆژێک لیستێکی دوورودرێژ ناوی ئافرەتیان بۆ ناردین کە دەبایە یەک یەک بمانکوشتنایە. من لەوەوبەر ژنم نەکوشتبوو، ئێوارەیەک منیان نارد بۆ کوشتنی ئافرەتێکی شۆخ کە لەگەڵ مێردێکی زۆر گەنجدا لە ماڵێکی هەژاردا دەژیان. ئەزموونی ساڵانی پێشوو لە حیزبدا فێریکردبووم زۆر دەربارەی کوژراوەکان نەپرسم. ئەوە نەبوو فزوڵم نەبێت، وەلێ ئەزموون فێریکردم ناسینی نێچیرەکان ئێش و ئازاری زۆری بەدواوەوەیە. زانیاری زۆر وادەکات دەستت بلەرزێت، نەتوانیت دڵنیابیت و فیشەکەکانیشت جوان نەپێکن. هەروا زانین و نەزانینی ئەو زانیاریانە هیچ لە کارەکە ناگۆڕێت، دواجار دەمزانی گەر منیش نەیانکوژم، مەغۆلی یان تونچی یان فازیل قەندیل دەیانکوژن. خەڵکانێکمان هەبوون دەچوونە بنج و بناوانی حیکایەتەکان،

دەیانویست هۆی کوشتنەکان بزانن و بەهانەکانی بدۆزنەوە و لە قەناعەتەوە پیاوکوژبن، ئەوانە زۆربەیان بە ڕێکەوتی سەیر و لە شەوی تەماویدا ژیانی خۆیان دانا و تیاچوون. گەر ڕۆژێک بویتە پیاوکوژ هەوڵبدە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی نێچیر و قوربانییەکانت نەزانی، زانیاری زۆر دەربارەی مردووەکان ئیشەکە سەختتر و دەرەنجامەکان سامناکتر دەکات. ئەو ڕۆژەی چووم بۆ کوشتنی ئەو خانمە شۆخە، هەموو گیانم دەلەرزی، وەک ئەوەی پێشتر لە ژیانمدا کەسم نەکوشتبێت. ئێستاش لە بەرچاومە... ڕەخشێکی ناسک و باڵابەرزبوو، کە پێمخستە دەرگای ئەودیویماڵیان خەریکبوو تەشتێک جلی شۆراوی بە تەنافێکی نایلۆندا هەڵدەخست. جلێکی کوردی تەنکی لەبەردابوو، لە بنیدا ژێرکراسە ڕەشەکەیم وەک گوڵ دەبینی. بە درێژایی ژیانم زۆر شێت و شەیدای ئافرەت نەبووم، بەڵام کوشتنی ژنێکی وەهاش لەگەڵ هۆش و خەیاڵمدا نەدەهاتەوە. منداڵێکی چکۆلانەم بینی لەسەر پێپلەیەکی چکۆلانە قاپێکی خاڵی بەدەستەوەبوو دەگریا. لەو کاتەدا دەمانچەکەم دەرهێنا و دەستی خۆم درێژکرد، لە ئێستێکدا هێندەی ترپەی چرایەک بێت و نەبێت، هێندەی لێدانی دڵێک بێت و نەبێت، دوودڵییەک دایگرتم، بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا ویستم دەمانچەکەم داگرم و فەرمانێکی حیزب جێبەجێ نەکەم، لەوانەبوو نەیکوژم. بەڵام لە بەدبەختی من، مێردە گەنجەکەی لەو کاتەدا لە ژوورەوە هاتەدەرێ و منی بە دەمانچەکەوە بینی. نیگای ترساوی ئەو پیاوە، ئەو هاوارە خنکاوەی گەروی، ئەو پەشۆکانە سەیرەی کەوتە سەر ڕوخساری... وایانکرد لە چرکەیەکدا بێتوانایی و لاوازی خۆم ئاشکرابکەم و دەست بنێم بە پەلەپیتکەکەدا و ئەو ژنە شۆخە لە دڵەوە بپێکم. خوێنەکەی تا دوور پڕژا، گەرچی فاسیلەی دە مەترێک لەو دووربووم، بەڵام وەک چەپۆکێکم لێدات و پاڵم پێوەنێت، سەراپام بووە خوێن. ئافرەتەکە کەوت و من پەشۆکاو لە

جێگای خۆم لە عەردا چەقیم. تا ئەو ڕۆژە ڕێکەوتی ئەوەم نەکردبوو دلۆپە خوێنێک بگاتە جەستەم. مەغۆلی بەردەوام خۆی خوێناوی دەکرد، هەر کەسێکی بکوشتبایە، دەستەسرێکی لە خوێنەکەیدا نوقمدەکرد و بۆ یادگار هەڵیدەگرت. بەڵام من هەردەم فاسیلەیەکی وام وەردەگرت قوربانییەکان خوێنپژێنم نەکەن. عادەتم بوو خێرا شوێنکارم جێبهێڵم و وەک با بفڕم و وێڵبم، هێند خێرا دەردەچووم پێیاندەگووتم تۆفان. وەلێ ئەو ڕۆژە وەک یەکێک سیحرم لێبکات، شتێک قاچم بگرێت، ماوەیەک لە شوێنی خۆم نەجولام. سەدای فیشەکەکان بەچەشنێک گەورەبوون هەستم بە کاسییەک کرد، بۆنی باروتی گوللەکە ئەو حەوشەیەی پڕکردبوو. پیاوەکەیم بینی بە گریانەوە بەرەو ڕووم دێت، بینیم لەسەر پێپلەکە دەوەستێت و هاواردەکات. من کەمەکەمە چوومە سەر تەرمی ژنەکە کە لە خوێناوی خۆیدا گیانیدەدا. ئەو چاوە سەوزە گەورانەیم بینی کە بێمانا و بێپرسیار سەیریاندەکردم. بە خوێنەکەوە گەڕامەوە و لەبەردەرگاکەدا مەغۆلیم بینی پەلم ڕادەکێشێت و دەقیژێنێت. ئەوە دواهەمین ڕۆژی ئیشکردنی من بوو لەگەڵ حیزبدا. هەر ئەو ئێوارەیە وازم لەهەموو شتێک هێنا و لە هەموو گەمەیەک دەرچووم... دوای من مەغۆلی و تونچی و دانساز و حاجی کۆتەر تەواوی کارەکانی دییان جێبەجێکرد، لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکدا ژمارەیەکی زۆر ژن و کچیان لەم سەرە و سەری وڵاتدا کوشت. ئەوە یەکەمین جیابوونەوەی من بوو لە جەعفەری مەغۆلی. دواتر سیازدە ساڵ مەغۆلیم نەبینییەوە، کە بینیمەوە وام هەستکرد ئەگەرچی دونیا زۆر گۆڕاوە، ئەگەرچی زەمین و زەمان سووڕێکی کوشندە و بازێکی عاجباتیان داوە، بەڵام ئەو وەکو خۆیەتی و نەگۆڕاوە.

# کێشەی خانمی شەمس لەگەڵ کچە منداڵکارەکەیدا «سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٢»

«خانمی شەمس، خانمی شەمس... دەبێت تێبگەیت ئەم کچە خەیاڵی نییە، دەبێت تێبگەیت، من چەند ڕۆژە دەمەوێت تێیبگەیەنم کە هەندێک زیندەوەر هەیە زۆر بچوکن، زۆر زۆر بچوکن بە چاو نابینرێن، دەمەوێت تێیبگەێنم هەندێک زیندەوەری دیکەش هەن زۆر گەورەن، بە هەستەوەرە ئاسایی و بێتواناکانی ئێمە نادۆزرێنەوە، دەمەوێت تێیبگەێنم ڕووەک هەیە دەتوانن مرۆڤ بخۆن، بەڵێ دەتوانن مرۆڤ بخۆن، بەڵام کێشەی ئەم کچەی تۆ ئەوەیە کە خەیاڵی نییە. خانم گوێبگرە، من بە درێژایی هەفتەی پێشوو لە هەوڵی ئەوەدا بووم بەم خانمە بسەلمێنم کە هەندێک لە زیندەوەران بەبێ جووتبوون زاوزێدەکەن، بەڵێ بەبێ جووتبوون، خوای گەورە هەرچییەکم کرد ئەم خانمە چکۆلانەیەی تۆ لەوە تێنەگەیشت زیندەوەرەکان چۆن دەتوانن بەبێ جووتبوون زاوزێبکەن، یەعنی منی گەیاندە حاڵەتێک هەندێک وشە بەکاربهێنم کە جوان نییە پیاوێکی وەک من لە بەردەم خانمێکی بەحورمەت و پاکیزی وەک ئەودا بیخاتە سەرزوبان، دوائەوە ئێمە وانەی زۆر سەختترمان لە پێشە، گەر مەهناز خانی کچتان ئێستا لە زاوزێی هەندێک زیندەوەری دەریایی بچوک تێنەگات، نازانم سبەینێ چۆن لە کۆئەندامی زاوزێی مێشولە، سوڕی خوێنی تیمساح تێدەگات. چۆن دەتوانێت لە پەیکەری ئێسکی ئەو باڵندانە تێبگات کە پەنجا ملیۆن ساڵ لە مەوبەر ژیاون... خانمی بەڕێز بمبورە، بەڵام شتەکان بەو جۆرەن... بەو جۆرەن».

چەند ساڵێک بەر لەو ڕۆژەی ماجیدی گوڵ سۆلاف و دەرسیم تاهیر و بەهمەن ناسر یەکەمین لاشە دەربهێنن، مامۆستا سەعید بایۆ، مامۆستای

زیندەوەرزانی بەو جۆرە قسەی بۆ خانمی شەمس کرد، کە ژنی یەکێک لە پیاوە گەورەکان بوو. مامۆستایەک بوو تەمەنی لەسەرو پەنجا ساڵەوە بوو. کابرا ئەو ڕۆژە بەجۆرێک دەستپاچە و غەمگین دەینواند، گەر بتاندیبایە دڵتان بەحاڵی دەسووتا، بە جۆرێک بە دەست ئەو کچە جوانەی خانمی شەمسەوە گیری خواردبوو مەپرسن. هەر شتێک پەیوەندی بە زانین و فێربوون و بیرکردنەوەوە هەبایە، مەهناز سەری لێدەرنەدەکرد... کچێک بوو بێوێنە لە جوانیدا، بێوێنە لە تەمەڵیدا، بێوێنە لە بێدەنگیشدا. کەس نەیدەزانی چۆن گەیشتۆتە پۆلی پێنجی ئامادەیی، هەندێک مامۆستا سوێندیان بۆ خواردم تا ئەوکات خشتەی لێکدانی لەبەرنەبووە، هیچ شتێکی لەسەر بیردۆزەکانی ئەندازە نەزانیوە، لە زیندەوەرزانیشدا بە ئەستەم توانیوێتی حوشتر لە گوڵەباغ جیابکاتەوە.

خانمی شەمس بە مەراقێکی زۆرەوە تەماشای سەعید بایۆی دەکرد و نەیدەزانی چی بڵێت. خۆی ڕقی دنیای لەم مامۆستا ڕەزاگرانەبوو، بەڵام ئەمجارە هەستیدەکرد لەسەر هەقە، کچەکەی لە خۆگۆڕین و مەکیاجکردن و سەیرکردنی تەلەفزیۆن بەولاوە هیچی تری نەدەزانی. خانمی شەمس کە لە تەنوورەیەکی ڕەشی تەسکدا دانیشتبوو، دەستی دەخستە سەر مێزەکەی بەردەمی و بە مامۆستای دەگووت «جا مامۆستا ئەوە دەبێت چی بکەین، عیلاجی چییە؟». سەعید بایۆ پاڵیدەدا بە کورسییەکەوە و دەیگووت « خانم من پێمگووتی مامۆستایەکی دەوێت فێری خەیاڵی بکات. یەکێک وابکات هەستی بۆ ئەو شتانەش هەبێت کە لە بەردەمیدا ڕوونادەن، تێگەیشتنی بۆ ئەو شتانەش هەبێت کە مرۆڤ بە جەستە و ڕۆحی خۆی تێیاندا ناژی. واتە مەرج نییە مرۆڤ گوڵ بێت بۆ ئەوەی تێبگات گوڵ چۆن دەمرێت... مەرج نییە مرۆڤ زیندەوەرێکی ناو ئۆقیانوس بێت، بۆ ئەوەی ژیانی ناو دەریا تێبگات. خانم من زۆر

بەڕاستمە دەبێت بۆ مامۆستایەکی تایبەتی خەیاڵ بگەڕێن، کچەکەتان خەیاڵی نییە». خانمی شەمس بێئەوەی تێبگات مامۆستا سەعید باسی چی دەکات، گووتی «تۆ هیچ کەس دەناسیت، مامۆستای خەیاڵ بێت، چونکە نازانم من وانەی لەو جۆرەم نەبیستووە». سەعید بایۆ لە کاتی دەستبردندا بۆ چاکەی بەردەمی، کەمێک قاپی کولیچەکانی جوڵاند و سەیرێکی سەر ئەژنۆ سپییەکانی شەمسی کرد و بە ناڕەحەتییەوە گووتی « هەر کەس کە لەدایکدەبێت بەشی خۆی خەیاڵی هەیە، لەڕاستیدا من لە ناچاریدا وا دەڵێم، من پارە لە ئێوە وەردەگرم، بەڵام کچەکە هیچ فێرنابێت... هەر قوتابییەک من وانەم دابێتێ، دەستبەتاڵ نەگەڕاوەتەوە، خوا شاهیدە پێرار بیست و سێ قوتابیم چوونە کۆلیجی پزیشکی. ئاخر خانم لەسەر ناو و ناوبانگی من قورسە گەر خانمی مەهناز، ئەم کچە پاکیزەی ئێوە دەرنەچێت و لە زیندەوەرزانیدا بگەڕێتەوە، بۆ من گران تەواودەبێت، ئێوە خێزانێکی ناسراون، هەر شتێک لەمماڵەی ئێوەدا ڕوودات دەچێتە دەرێ، خەڵک هەموو دەڵێن ئەها سەعید بایۆ ساڵێک هاتوچۆی ماڵی سەیفەدین مارۆی کرد، ساڵێک لەگەڵ شەمس و مەهنازی کچیدا لە ژوورەوە بوون و دەریش نەچوو... ئەوکات چۆن شتەکان تەفسیردەکەن؟ ها چۆن؟... خانمی بەڕێز، من هیچ کەسێکم نەدیوە وەک مەهنازی خانی کچتان بێخەیاڵ بێت، من مەمنونی ئەم هەموو چا و کولیچە خۆشانەی دەستی تۆم، بەڵام بە کەسەرەوە پێتدەڵێم، گەر وا بڕوات ناتوانم بێمەوە بۆ ئێرە، چونکە هاتن و نەهاتنم سوودی نییە، من پارەی خۆڕایی بۆ لە تۆ بستێنم... ها بۆ لێتی بستێنم؟».

خانمی شەمس کەمێک لە دوا ڕستەکانی مامۆستا ترسابوو، لە دوای ئەوەی مێردەکەی بووبوو بە فەرمانبەرێکی باڵا و متمانەی سەرۆک و کادێرە گەورەکانی حیزبی بەدەستهێنابوو، دەوڵەمەندییەکی کوتوپڕ ڕووی

تێکردبوون، دەترسا منداڵەکەی دەرنەچێت و ژنە ناسیاوەکانی دەوروبەری بڵێن تەماشاکە دڵی نەهات مامۆستایەکی باش بۆ کچەکەی بگرێت. لە شتی وا زارەترەک دەبوو، دەبایە هەر شتێک دەکرێت بیکات تا کەس قسەی وای بەزاردا نەیەت. کچەکەی لە هەموو وانەکاندا خراپبوو، بەرزترین پلەیەک بەدەستی هێنابێت لە کوردیدا بوو کە جارێک لە جارەکان پەنجاوسێی وەرگرتبوو، لەوە بترازێت لە دەرسێکی تردا دەرنەچووبوو. دەبایە ئێستا لە سێی زانکۆ بایە. ئەگەرچی شەمس و باوکی هەموو شتێکیان بۆ دابینکردبوو، ژووری خۆی هەبوو، باڵکۆنی خۆی هەبوو، هاورێ کچەکانی دەیانتوانی هاتوچۆی بکەن، دەستگیراندارببوو، دەیتوانی لە ئسوڵدا بچێتەدەرێ، گوێی لە گۆرانییەکانی سیمۆن و بوڵند ئارسۆی دەگرت... بەڵام لە قوتابخانە دەرنەدەچوو. ئەوە یەکەمجاربوو ببیستێت یەکێک بڵێت «کچەکەتان خەیاڵی نییە». سەیفەدین مارۆی مێردی «کە لە تەشتێک بەزی ڕۆکراو دەچوو» بەردەوام بەڕۆبێکی درێژەوە بە سەرێکی ڕووتاوەی زلەوە، بە ورگێکی هەڵرژاوەوە بەماڵەکەدا دەسوڕایەوە و دەیگووت «ئەم کچە مێشکی نییە... پارەی تیا سەرف مەکە... مێشک بە پارە ناکڕدرێت». ئێستا شەمسی بەستەزمان نەیدەزانی جیاوازی نێوان ئەو دووانە چییە، گەر مرۆڤ مێشکی نەبێت لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ خەیاڵی نەبێت. لە دڵی خۆیدا تا ئەندازەیەک قسەکەی مامۆستا سەعید بایۆی پێڕاستتر بوو، کچەکە مێشکی هەبوو، بەشی خۆی شەیتان بوو، گەر بیویستبایە تا بڕی بێشەرمی عەیاربوو، گومانی ئەوەشی هەبوو هەتا لە پشت دەستگیرانەکەیەوە، شتێکی کەمی لەگەڵ کەسێکی تردا هەبێت، وەک ئەوەی دڵی بەیەکێکی تریشەوە بێت، بەڵام کێ... نەیدەزانی. بە گشتی جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ کچانی تەمەنی خۆیدا. گرنگترین شتیش بۆ شەمس ئەوەبوو قسەی نەیەتەسەر. کە گووتیان مامۆستا سەعیدی بایۆلۆژی لە هەموو کەس باشترە، بێ بیرکردنەوە، بڕیاریدا بانگیبکات

و تـکای لێبکات وانـەی تایبەتـی پێبڵێتـەوە. بـەڵام ئێستا بۆ یەکەمجار لـە ژیانیـدا ناچـارە بـەدوای مامۆسـتایەکدا بگەڕێـت بـۆ خەیـاڵ. «مامۆسـتای خەیـاڵ» ڕۆژێـک لـەڕۆژان شـتی وەهـای نەبیسـتبوو. کـە سـەعید بایـۆ ڕۆی، شـەمس خـان چـووە ژوورەکـەی خـۆی، سـەری خسـتە نـاو هـەردوو دەسـتی و دەسـتیکرد بـە گریـان، هیـچ شـتێک لـەوە ناخۆشـتر نییـە لەگـەڵ پیاوێکـی ناشـیرینی وەک سـەیفەدین مـارۆدا بژیـت و منداڵەکانیشـت تەمـەڵ بـن. لەگەڵ تێپەڕینـی عومـر و بەسـەرچوونی ڕۆژگاردا بـە ناشـیرینی سـەیفە ڕاهاتبـوو، دڵـی خـۆی بـەوە خۆشـکردبوو کـە ئەندامێکـی بـەرزی حیزبـە، بـەڵام بـەوە ڕانەدەهـات کچەکـەی نەبێتـە هیـچ. هیـچ شـتێک لـە دونیـادا لـەوە خراپتـر نییـە، منداڵەکـەت لـە قوتابخانـە دەرنەچێـت، هیـچ شـتێک. هەمـوو جارێـک وای بـە ژنەکانـی هاوڕێـی گوتبـوو. حەزیدەکـرد کچەکـەی بـە هەقـی خـۆی بچێتـە زانکـۆ، هـەر کۆلێژێـک بێـت گرنـگ نییـە، گرنـگ ئەوەیـە بەهەقـی خـۆی بچێتـە زانکـۆ.

ئـەو ئێوارەیـە کـە سـەیفەدین گەڕایـەوە، گەردەلوولێکـی گـەورە چاوەڕوانیدەکـرد، کابـرا هێشـتا خۆشـی لـەوە نەبینیبـوو کـە بۆتە بەرپرسـێکی بـەرزی حیـزب کەچـی ڕۆژ دوای ڕۆژ ژیانـی تاڵتـر دەبـوو. ئـەوە چ جـۆرە بەدبەختییەکـە مـرۆڤ تووشـیدێت، هـەرکات خـۆی ئامـادەدەکات لـەزەت لـە شـتێک ببینێـت، سـەرکەوتنێک تامبـکات، شـتێک ڕوودەدات، تـەواوی تـام و خۆشـی ژیانـی لێتێکـدەدات. ئـەو ئێوارەیـە هێنـد نەبـوو پێیخسـتبووە حەوشـی مـاڵ، خانمـی شـەمس بەپێـوە هەمـوو قسـەکانی سـەعید بایـۆی بـۆ گێڕایـەوە. سـەیفەدین لەسـەر ئـەم ڕەفتـارە، سـەدجار لەگـەڵ شەمسـدا بەشـەڕهاتبوو، هێنـدەی لـە دەرگاوە دەردەکـەوت، ژنەکـەی ڕاسـتە و ڕاسـت بێئـەوەی بـواری هەناسـەدانی بـدات، دەردی دونیـای بەسـەردا دەڕشـت. سـەیفەدین هەندێجـار تووڕەدەبـوو، هەندێجـار پێدەکەنـی، هەندێجـار دەگریـا، هەندێجـار بێدەنـگ سـەیریدەکرد و هیچـی نەدەگـووت. کێشـەی مامۆسـتای

خەیاڵ شتێکی تازەبوو، پێشتر کێشەگەلی لەو جۆرەی نەبیستبوو، لەمێژبوو مەسەلەی پەروەردەی منداڵەکانی بۆ خانم جێهێشتبوو، بەلام خانم دەیگووت هەر ئێستا دەبێت مامۆستایەکی خەیاڵ بدۆزینەوە... هەر ئێستا.

دوای شەوێکی پڕ دەنگەدەنگ و تووڕەیی، مارۆ درەنگ وەختێک تەلەفونی بۆ « سەرکەوت نەزمی» کرد و تکای لێکرد مامۆستایەکی بۆ بدۆزێتەوە خەیاڵی کچەکەی بەهێزبکات. کە زەنگی تەلەفونەکە لای سەرکەوت نەزمی لێیدا، ئەو لە ژێر جێگاوە، بەدەستووری مەهراجا هیندییەکان خاولییەکی گەورەی لەسەریەوە ئالاندبوو و سەیری فلیمێکی ڤیدیۆی عەرەبی دەکرد. سەرکەوت ئیشێکی دیاریکراوی نەبوو، کاسبێکی گەڕۆک بوو، هەموو شتێکی دەکرد. گەر بۆ ئوتومبێلی مۆدێل باڵا بگەڕابایتایە بۆی پەیدادەکردی، گەر کەڵەشێری شامیت داوابکردبایە پەیدایدەکرد، وەستای بەلۆعەت بویستبایە لە چەند سەعاتێکدا بۆی دەناردی، گەر پێشت بگووتبایە بۆ مامۆستایەکی باشی فیزیا پەکی نەدەخستی. هەموو ژیانی لە بازاڕدا بردبووە سەر، بەلام پێشتر شتێکی بە ناوی مامۆستای خەیاڵەوە نەبیستبوو، بەلام نەیدەویست بە نەزان دەرچێت، مەبەستیشی بوو خۆی لای تازە بەرپرسێک شیرینبکات کە دڵنیابوو درەنگ یان زوو ئیشی تێدەکەوێت. بێئەوەی خۆی تێکبدات گووتی «ئاسانە مامۆستا گیان، زۆر ئاسانە سبەی مامۆستایەکی خەیاڵ پەیدادەکەین». گەر سەرکەوت نەزمی وای نەگووتبایە، لەوانەبوو شتەکان بە جۆرێکی تر بڕۆن، لەوانەبوو کۆی ئەم چیرۆکە ڕێگا و ڕەوتێکی دی بگرێتەبەر. بەلام سەرکەوت بێئەوەی بزانێت مامۆستای خەیاڵ چییە، گفتی بە سەیفەدین مارۆدا و لەگەڵ ئەو گفتەشدا یەکەمین گەمەی شێتانەی ئەم کتێبەی ئێمە دەستی پێکرد.

## دووانەیەکی نەیار و خەیاڵی
## «لەدایکبوونی تریفەیابەحری لەکۆتایی ساڵانی شەستدا»

ڕۆژێک لە ڕۆژان جەوهەر زاهیر یابەحری برای تریفە زاهیر، بڕیاریدا بێئەوەی عەقڵ و لەشی بەکاربهێنێت، ببێتە ملیۆنێر. واتە بێئەوەی نە عەقڵی بە ڕاستی بخاتە کار و نە دەست و بازوو بوەشێنێت، ژیانێکی زۆر خۆش بژی، ببێتە خاوەنی هەموو شتێک، جوانترین ماشێنی هەبێت، کۆشکی گەورە دروستبکات، زیباترین ژن بهێنێت، گرانترین پۆشاکی دونیا بپۆشێت، لە خۆشترین نوسینگەدا دەوامبکات. دەبێت بڵێم بەر لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ کەس نەیدەتوانی خەونی وەها ببینێت، ئادەمییەک لە وڵات و مەملەکەتی ئێمەدا نەبوو جورئەتی هەبێت جۆرە بڕیارێکی وەها بدات، بەڵام لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری هەمیشە درەوشاوەی ئازادیدا، وڵاتی ئێمە پڕبوو لەو جۆرە پیاوانەی دەیانتوانی بێئەوەی عەقڵی خۆیان بخەنەکار، بێئەوەی بەڕاستی ئیشبکەن و ماندووببن هەموو خەونەکانی خۆیان بهێننەدی. جەوهەر لەگەڵ تریفە زاهیردا دووانە نەبوون، بەڵام وەک دووانە بە دونیا ناسێندران. کەس تا ئێستا چیرۆکی ڕاستەقینەی لەدایکبوونی تریفەی ساغ نەکردۆتەوە، پێشموایە ئەو حیکایەتە بە ڕادەیەک ئاڵۆز و تەلیسماوی و بێتەفسیرە، ڕوونکردنەوەی نەشیاو و ئەستەمە، ئەو دراوانەش کە ئێستا لە بەردەستی ئێمەدان بواری دۆزینەوە و درکاندنی ڕاستیمان پێنادەن. هێند هەیە لە ساڵی ١٩٦٨ دا چەند هەفتەیەک دوای کۆدیتای ١٧ ی گەلاوێژ، لە گەڕەکێکی کۆن و داڕوخاودا، لە شەوێکی پڕ مێشولە و لە ژێر پانکەیەکی ژەنگاویدا، لە سەر جێگایەکی نوقم لە ژان و عارەقدا، فەوزیە خانی ژنی زاهیر ئاغای یا بەحری، جەوهەر ئاغای یا

بەحری هێنایە دونیاوە. هەموو دونیا دەیزانی فەوزیە خان کە ژنێکی بەڕێز و بە حورمەتی نەوەزادی یاسەمییەکان بوو، دوای پێنج ساڵ شووکردن بێوەچە و بێمنداڵ مابووەوە، لەو پێنج ساڵەدا فەوزیە خان هەرچییەکی کردبوو، خودا بە منداڵێک ئاسوودە و بە پشتێک خۆشنوودی نەکردبوو. تا لە دوای سێهەمین ساڵی شووکردنییەوە، خۆی وەک درەختێکی بێبەر و مەخلوقێکی بێخێر و بێوەچاغ دەبینی. وەک هەموو ئەو ژنانەی منداڵانیان نابێت، غەم بە جۆرێک دایگرتبوو، بینینی هەموو کۆرپەیەک و دەرکەوتنی هەموو منداڵێک دڵی لە ڕیشەوە ڕادەچڵەکاند. وای لێهات منداڵبوون بوو بە گەورەترین خەیاڵ و خولیای ئەو ژنە چاک و داوێنپاکە. کە فەوزیە یاسەمی زگی پڕبوو، خەیاڵێکی گەورە دەبوو بە واقیع و خەونێکی بێکۆتا دەبوو بە ڕاست. بەڵام کێشەکە تەنیا غەمە گەورە و بێسنوورەکانی خانمی یاسەمی نەبوو، بەڵکو گرفتی گەورەی خێزانی یابەحری، ئەو ئیرەیی و حەسوودییە گەورەیە بوو کە لە منداڵییەوە لە نێوان زاهیری یابەحری و سەمیرە یابەحری خوشکیدا بەرقەرار بوو. خوشکەکە لە منداڵییەوە ئیرەییەکی زۆری بە برا نازدارەکەی دەبرد. سەمیرە لەو ژنانە نەبوو ئاسان تەسلیمی قەدەری ژنانەی خۆی بێت و بەو ناز و فەزڵە ڕازیبێت کە نێرانی خێزانی یابەحری لە دێر زەمانەوە هەیانبوو. ئەوە جەنگێکی سەرسەختی لە نێوان زاهیر و خوشکەکەیدا هەڵگیرساند، کە درێژکراوەی کۆمەڵێک جەنگی دێرینەی دیکە بوو لە نێوان نێر و مێکانی تایەفەی یابەحریدا. کینەی قووڵ و گەورەی زاهیر بۆ خوشکەکەی وایکرد سوێند بخوات هەرگیز نەیدا بەشوو و نەهێڵێت ڕۆژێک لە ڕۆژان بە وەچەی خۆی شاد بێت و منداڵی خۆی بگرێتە باوەش. لە ساڵی ١٩٦٣ ـەوە زاهیری یابەحری هەموو خوازبێنیکەرانی سەمیرەی بە جۆرێکی شێتانە و بێڕەحمانە ڕەتدەکردەوە. سەمیرە لەو ماوەیەدا لە ڕێگای نوشتەنووسەکانەوە، بە نهێنی دۆعای دەنووسی و

سیحریدەکرد، تا خودا وەچاخی زاهیر یابەحری برای کوێربکاتەوە و هەرگیز بە منداڵ و نەوەی خۆی شادنەبێت. ژیانی ئەو پێنج ساڵەی یابەحرییەکان جەهەنەم بوو. سەمیرە کە کچێکی شەڕانی و دڕ بوو، چەندین جار جەنگی ئاگرین و دۆزەخئاسای دژ بەو خانمە نازدار و بەحورمەتە بەرپاکرد کە بە بێدەنگی باری دیق و مەراقی ژیانی لە ناو یابەحرییەکاندا ڕادەکێشا. کاتێک سەمیرە یابەحری حیکایەتی زگپڕبوونی فەوزیە خانی یاسەمی بیست، وەختبوو شێت بێت. شەوگارانێکی درێژ خەوی لێنەکەوت. ئیرەیی وایکرد شەو و ڕۆژ بیر لەوە بکاتەوە چۆن ئەویش منداڵێکی ببێت، چی بکات بۆ ئەوەی درێژە بە وەچاغی خۆی بدات تا لە موڵک و ماڵی یابەحرییەکاندا مافی نەخورێت. دەیان شەو لە خەیاڵ و خولیای دروستکردنی وەچەیەکدا بوو کە زاهیری برا و جەلاد لەوی حەرامکردبوو. کەس بەدروستی نازانێت لەو ماوەیەدا چی ڕوویدا، بەڵام ئەو شەوەی کۆتایی هاوین کە فەوزیە خان کەوتەسەر ژان تا جەوهەر ئاغای یا بەحری لە دایکببێت، هەمان شەو لە هەمان سەعاتدا سەمیرە یابەحریش کەوتەسەر ژانێکی توند. بەدرێژایی ئەو ماوەیە کە فەوزیە دووگیان بوو هیچ کەس هیچ ئاماژەیەکی نائاسایی لە سەمیرە نەبینیبوو. ئەو شەوەی سەمیرە کەوتە سەر ژان، هەموو پێیانوابوو ئەوەش بەزمێکی دیکە و نمایشێکی دیکەی بەدە لە بەزم و نواندنە شەیتانی و شەڕانییەکانی ئەو. کە دکتۆریان هێنایە سەری، پزیشکێکی میسری زیرەک و وردەکار بوو، لە مێژبوو لەو شارەدا دەژیا. پاش پشکنینێکی ورد گەیشتە دەرەنجامێکی سەیر، سەمیرە هێشتا کچ بوو، پەردەیەکی پاکیز و ساغ و سەلامەت و جوانیشی هەبوو، بەڵام زگیشی پڕبوو... دیارە خۆشبەختییەکانی ئینسان هەمیشە هاوڕێی بەدبەختی و لکەی ڕەشی غەم و پەژارەن، زاهیری یابەحری کە سەر لە ئێوارە خەریکبوو لە خۆشیدا دەفڕی، خۆی بە خۆشبەختترین کەسی دونیا دەزانی، دوای

سالەهای سال سەبر و نائومێدی چاوەڕوانی ئەوە بوو وەچەیەکی تازە بۆ یابەحرییەکان بێتە دونیاوە، هەواڵی زگپڕبوونی خوشکە پاکیز و بەدنیاز و بەخیلەکەی خستییە بەحرێکی گەورەی بێقەرارییەوە. ڕاستە زاهیر ئاغا بیری نەدەهات ڕۆژێک لە ڕۆژان خوشکەکەی خۆشویستبێت، بەڵام نەشیدەویست بەو جۆرە کۆتایی بە ژیانی بهێنێت. ئەوە شەرم و شورەییەکی وەهابوو گاڵتەی لەگەڵدا نەدەکرا، عەیبەیەک بوو لکەیەکی وەهای دەنا بە مێژووی یابەحرییەکانەوە تا دونیا دونیایە لە بیرنەچێتەوە، بۆیە هەرچییەکی کردوە دەبایە خێرا ئەو دەرگایە دابخات و ئەو شەرمە داپۆشێت. زاهیر ئاغا بە پارەی ئەو زەمانە بڕە دراوێکی خەیاڵی بەخشی بە دکتۆرە میسرییەکە تا بەنهێنی سەرپەرشتی منداڵبوونی خوشکەکەی و ژنەکەشی بکات و نهێنییەکەش تا قیامەت هەڵگرێت و لەگەڵ خۆیدا بیباتە گۆڕەوە. بەو جۆرە فەوزیە یاسەمی و سەمیرە یابەحری لە دوو ژووردا لە تەنیشت یەکەوە، لە گەرمای هاوینی ساڵی ١٩٦٨ دا، لە ژێر دوو پانکەی گەورەدا، لە یەک ساتدا دوو منداڵیان بوو، یەکێکیان جەوهەر زاهیر بوو، ئەوی تریان تریفە زاهیر. دوو مەخلوق وەک دووانە بە دونیا ناسێنران، وەک کچ و کوڕێک لە منداڵدانی فەوزیە یاسەمیدا سازابن، هەردووکیان بە ناوی فەوزیە و زاهیر یابەحرییەوە شوناسیان بۆ دەرهات، بەڵام دوو بوونەوەربوون لە هەموو شتێکدا جیاواز. یەکێکیان بەرهەمی حەقیقەت بوو ئەوی دیان بەرهەمی خەیاڵ، جەوهەر کە لە دایکبوو سەری بۆ سەرەوە بوو، تریفە کە هاتە دونیاوە سەری بۆ خوارەوە بوو. جەوهەر لەگەڵ لەدایکبوونیدا دەستیکرد بە گریان، بەڵام تریفە پێکەنی. جەوهەر سپی بوو، تریفە ئەسمەر و توکن. جەوهەر چاوی کاڵ بوو، ئەو چاوانی قەترانی. لەوشەوەوە تا ڕۆژی مردنی، سەمیرە یابەحری لە ژوورێکی نهۆمی دووی ماڵی زاهیر یابەحریدا دیلبوو. سێ ساڵی یەکەم زاهیر دەرگاکەی لەسەر داخست نەبا

هەڵبێت، بەڵام لە ساڵی چوارەمدا فەوزیەی دڵچاک و میهرەبان، دوای چەند ڕۆژێک گریان مێردە سەرسەخت و بەدنیهادەکەی ڕازیکرد، دەرگای ژووری خوشکەکەی بکاتەوە و ئازادییکات. سێ ساڵ بوو فەوزیە یاسەمی سەمیرەی نەبینیبوو، سێ ساڵ بوو پێی نەخستبووە نهۆمی سەرەوە. دوای ئەو ماوە دوورودرێژە کاتێک زاهیری یابەحری دەرگاکەی کردەوە و فەوزیەی بردە بەردەم سەمیرەی خوشکی. فەوزیە لە بری سەمیرەی جاران، بوونەوەرێکی پیر و تێکشکاوی بینی کە هیچی لەو ژنە دڕ و دەمهەراشەی ڕابوردوو نەدەچوو، بەڵکو ئافرەتێکی زەلیل بوو لە سێبەری شتەکان و لە بۆنی ئادەمییەکان دەترسا. لەو سێ ساڵەدا سەمیرە یابەحری زۆر شتی بیرچووبووەوە، ترسێکی ناوەکی و بێپەی لە ناخیدا سەوزبووبوو نەیدەهێشت لەو ژوورە بێتەدەرێ. لە ماوەی ئەو چواردە ساڵەی دواییدا، بەر لەوەی سەمیرە یابەحری لە ئێوارەیەکی فێنک و خەیاڵاوی بەهاردا بە بێدەنگی بمرێت، فەوزیە یاسەمی، لە هەمان ژووردا وەک خوشکێکی دڵسۆز و لە خۆبوردوو خزمەتیکرد. سەمیرە هەموو ئەو تەمەنە، نیمچە شێت و نیمچە ئیفلیج لە دونیایەکی پڕ لە شێوە و نیگار و ڕەنگی خەیاڵیدا دەژیا. لەو کاتەوەی تریفەی بووبوو، لەگەڵ کۆمەڵێک ڕۆحلەبەری سەیردا دەژیا کە تەنیا خۆی دەیبینین.

فەوزیە خانی یاسەمی خۆی ئەو تەفسیرەی سەبارەت بە لەدایکبوونی تریفە لەزاری سەمیرە یابەحرییەوە بۆ گواستینەوە. تەفسیرێک پێدەچێت خانمی یاسەمی زۆر بڕوای پێبووبێت. لەو ماوەیەدا سەمیرە یابەحری لە ساتەکانی هۆش و لە چرکەکانی گەرمبوونی سۆزی هاودەردی و خوشکایەتیدا، بەردەوام فەوزیەی دڵنیاکردبووەوە کە ئەو لەگەڵ هیچ پیاوێکدا نەخەوتووە تا منداڵی ڕاستەقینەی ببێت، بەڵکو ئیرەیی وایکردوە پردێک لەگەڵ بوونەوەرە خەیاڵییەکاندا دروستبکات، شەوانە

لەگەڵ چەندین پیاوی خەیاڵکردا بخەوێت تا گەر بە خەیاڵیش بووە منداڵێکی ببێت. سەمیرە بە جۆرێکی هێندە چڕ و بە ئارەزووییەکی هێند گەرم خولیای منداڵبوون دەکات، لە ناکاو «بێئەوەی هیچ کەس بزانێت چۆن» ئەو خولیا و خواستە دەبێت بە حەقیقەت. وەک فەوزیە دەڵێت تریفە یابەحری لە فووی بوونەوەرە خەیاڵییەکان دروستبووبوو. بەرهەمی ئارەزووییەکی خەیاڵی بوو کە بە ڕێگایەک لە ڕێگاکان توانیبووی ببێتە ڕاست. دیارە وەک هەمیشە کەسانێک هەن باوەڕ بەم چیرۆکە ناکەن. گەرچی چەندین سەدەیەتەواوی بەشەرییەت باوەڕی بەلەدایکبوونی مەسیح لەفوویەکی خەیاڵییەوەکردوە. بەڵام من دەڵێم، بۆ میللەتێکی وەک ئێمە کە سەدان ساڵە تەنیا لە خەون و خەیاڵدا دەژین، هیواکانمان تەنیا بە خەیاڵ دێنەدی، تێگەیشتن لەجۆرە حیکایەتێکی وا ئاسان و سادەیە. من خۆم کێشەیەکی ڕاستەقینەم لە قەبووڵکردنی حیکایەتی لەدایکبوونی تریفە یابەحریدا نییە، زۆرجار گەر مرۆڤ توند و لە دڵەوە ئومێد بکات، چەند ئاواتەکانی ئەفسانەیی و هیواکانی خورافی دەرکەون، شتی نائاسایی و هێزی ئەفسونساز دێنە مەیدان ئەو ئومێدانەی بۆ دەهێننە دی. ڕێکەوتووە لە گەرمای هاویندا سەرم بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوە و داوای بارانێکم کردوە، بینیومە لە ناکاو هەوا تێکچووە و کەش گۆڕاوە و هەوری سەنگین بە خۆیان و دڵۆپە بارانی قورسەوە دەرکەوتوون و لە چەند ساتێکدا دونیا بۆتە تۆفان و ڕەهێڵە... ڕێکەوتووە لە دڵەوە حەزبکەم مرۆڤێک ببینم، دوای تەمەنایەکی قووڵ، لە ناکاو لە گۆشەی شەقامێکدا، لەسەرسوچی کوچەیەکدا دەرکەوتووە و باوەشم پێداکردوە و ئاواتەکەم هاتۆتەدی. من دەڵێم کێشەی مرۆڤەکان هەندێجار ئەوەیە ئاواتی قووڵ... زۆر قووڵیان نەماوە، ئاواتێک هێند لە قووڵایی ناخەوە بێتەدەرێ، دونیا ناچاربکات گوێی لێبگرێت. هەرکات مرۆڤ ئومێد و هیواکانی لە ناخی ناخەوە هاتنەدەرێ، هێزێکی ئەوتۆ ئەفسوناوی

وەردەگرن، دەتوانن سنووری یاسا فیزیکییەکان و لەمپەرە گەورەکان ببڕن. ئومێد تاکە شتێکە دەتوانێت مەتریالە ڕەقەکان بشکێنێت، یاسا زەمینییەکان و بەربەستە واقعییەکان بگۆڕێت و بیانهاڕێت. بەڵام کە ئومێدی وەها گەورە و قووڵمان نەما، دونیا لە شوێنی خۆی دادەنیشێت و بێغەم خۆی دووبارەدەکاتەوە. من پێموایە تریفە یابەحری دەستکردی ئەو ئومێدە ئاگرین و ئارەزووە بورکانییەی ناو ڕۆحی سەمیرە یابەحرییە، کە دواجار وەک نەخشی ڕاستەقینەی مرۆڤێک لە ڕەحمی ئەو ژنە پڕ ئومێدەدا چنراوە و هاتۆتەدی، ئەو هێندەی ئەتەمینێکی وردی خەیاڵە کە لە چنینێکی وردەکارەوە هاتۆتەدەر، کچێکی ڕاستەقینە نییە تا وەک کچانی دی بگیرێت و دەستەمۆبکرێت. دەبێت بزانین دواجار منداڵدانی ئافرەت ئاوێنەی خەونەکانێتی، زۆر خانم کە منداڵیان نابێت، وادەزانم هۆکەی ئەوەیە لە ناخی ناخدا، لە تاریکییە هەرە نەبینراو و دەیجورئاساکەی دەروندا لە شتێکی ئەم دونیایە یاخیدەبن، لە قەدەرێکی نوسراو، لە وەزیفەیەکی ئەزەلی کە دەبێتە هاومانای مردن و کۆیلەیەتی، چیدی خەون نابینن و ڕۆحیان بە ئومێدێک بارناکەن. بە کورتی ڕەحمی ئافرەت تەنیا بەشێکی ئۆرگانی لەش نییە، بەڵکو هەرێمێکی ئۆرگانی ڕۆحیشە. پیاوان ئەو هەرێمە گرنگەی ڕۆحیان دۆڕاندوە، لەبەرئەوە زۆرجار داهێنانی خۆیان، ئیشە ڕۆحییەکانی خۆیان بە دەست دەنوسنەوە، لێرەوە جیاوازی داهێنانی پیاو بەراورد بە خەلاقییەتی قووڵ و ژیانسازێنی ئافرەت، وەک جیاوازی نێوان بەرهەمێکە کە سروشت خۆی بیبەخشێت، لەگەڵ بەرهەمێکدا بە جووتکردن و کێڵان و ئارەقرێژی بێتەبەر. بۆیە لە سەرەتاوە پێتاندەڵێم من چیرۆکی خەلیقەت تەواو بە پێچەوانەوە تێدەگەم، ئەوە ژن نییە کە مەحکومە بە ژان و ئازارەوە بزێ و بێتەبەر، بەڵکو ئەوە پیاوە مەحکومە بە ڕەنج و ئارەقرێژی و هەوڵی بێسرەوت شتێک بخاتە سەر دونیا. ڕەحمی ژن بەشێکی گرنگی ڕۆحێتی، بەڵام ئێمەی

پیاوان کامەیە بەشە گرنگەکەی ڕۆحمان؟... ها، کامەیە؟. بۆیە پێموایە ئافرەت مەخلوقێکی تەواوترە لە پیاو، تاکە مەخلوقی ناو سیفری وجودە کە لەشی ئاوێنەی ڕۆحیێتی و ڕۆحی ئاوێنەی لەشێتی، ئیدی تێدەگەم چۆن منداڵدانی سەمیرە یابەحری، لۆژیکی ڕۆژانە و تێگەیشتنی سادەی ئێمەی تێپەڕاندوە و موعجیزەیەکی دروستکردوە کە بەرلەوەی موعجیزەی جەستەبێت، موعجیزەی ڕۆح و ئومێدەکانێتی. غەزەلنوس ساڵانێک دواتر بە گاڵتەوە تریفەی ناودەنا «کچی نوتفە خەیاڵییەکان»، لە ڕاستیشدا ئەو کچی نوتفە نەبینراو و سیحراوییەکانی خەیاڵ بوو.

تریفە تا گەورەش بوو هەر وایدەزانی لەگەڵ جەوهەر زاهیردا بەزگێک لە دایکبوون. لە منداڵییەوە هەردووکیان لە جەنگێکی کوشندە و بێبڕانەوەدا دەژیان، دوو ڕۆحلەبەری نەگونجاو کە بەرهەمی پێکدادانی دوو دونیای جیاواز بوون... ئەو ڕقە قووڵ و بۆماوەیەی نێوان سەمیرە یابەحری و زاهیری برای، بە کەناڵێکی نهێنیدا گواسترایەوە بۆ هەریەک لە تریفە یابەحری و جەوهەر یابەحریش، کە لە ڕاستیدا خوشک و برای یەک نەبوون، بەڵکو دوو جەمسەری پێچەوانە و دوو پۆڵی لەیەک هەڵهاتووی دوو دونیای بەیەک نەیاربوون. تریفە یابەحری لە منداڵییەوە بوونەوەرێکی خەیاڵاوی بوو، هێشتا منداڵ بوو کە سەری بەسەر بەرمیلی حەمامەکەدا شۆڕدەکردەوە و سەیری ئەو بوونەوەرە ئاوییە خەیاڵییانەی دەکرد کە تەنیا ئەو دەیبینین. جگە لەوەش بەردەوام نەخش و زەخرەفەی ئاڵۆزی لەسەر دیوارەکان دروستدەکرد کە فەوزییە وای هەستدەکرد نیگارەکانی دەفڕن و ڕادەکەن و دەجوڵێنەوە. ڕۆژێک خانمی یاسەمی وەختبوو بتۆقێت کە پەتێکی بینی سەرێکی لە هەوادا وەستاوە و سەرەکەی دیکەی بەدەستی تریفەوەیە، کچێک بوو دەیتوانی پەتپەتێن لەگەڵ هەندێک کەسدا بکات کە ئەو نەیدەتوانی بیانبینێت. دواجار یەکێک لەو ڕۆحلەبەرە خەیاڵیانە

دەستیگرت و بە قادرمەکانی نهۆمی دووەمدا بەرەو ژوورەکەی سەمیرە یابەحری سەریخست. سەمیرە بە قژێکی بژ و ئاڵۆزکاوەوە، بە نیگایەکی ساردەوە لێیڕوانی و دەمودەست تێگەیشت ئەم منداڵە کچە ڕاستەقینە - خەیاڵییەکەی خۆیەتی. دەبێت بڵێین سەمیرە یابەحری لەگەڵ هەموو تێکچوون و دابڕان و شێتییەکدا، هۆشی ئەوەی هەبوو دایکایەتی خۆی ئاشکرانەکات و منداڵەکەی تووشی جۆرە موسیبەتێک نەکات، کە دەیزانی جگە لەوەی ژیانی بە تەلیسمێکی بێتەفسیرەوە گرێدەدات سوودێکی دی نییە. جەوهەر زاهیر بە پێچەوانەی خوشکەکەیەوە، بوونەوەرێکی فێڵباز و نەخشەکێش بوو، باوکی زۆر بە سەلیقە وردەکەی و توانای لەسەر پلاندانان سەرسامبوو، لە منداڵییەوە ئارەزوویەکی بێوێنەی کۆکردنەوەی شت و وەدەستخستنی یاری گرانبەهای هەبوو. وەک تاقە وەچەی نێرینەی یابەحرییەکان، ئەو نازەی هەبوو هەموو ژیانی لە بەردەمدا بکرێتەوە و هەموو خەونێکی بێتەدی، ئەویش بە سروشتی سەمۆرەیەکی برسی دەیویست لە قەڵەمڕەوە بچوکەکەی خۆیدا دەست بەسەر تەواوی دونیادا بگرێت. منداڵێکی سورفلی قەڵەویچکە بوو بە چەناگەیەکی چاڵەوە، بە ڕوویەکی تووڕە و چاوێکی بزۆک و نیگایەکی شێتانەوە. زاهیر گەلەک سیفەتی باپیرە سورفلەکانی خۆی لە کوڕەکەیدا دەبینییەوە، ئەو باپیرە بڕۆ زەردە چاوبرسیانەی سەردەمانێک وەک لەشکرێک لە مێرولەی سپی، دەیاندا بەسەر ئەو قافڵە گێژانەدا کە لە بەغداوە کاڵایان بۆ هەرێمە سیحراوییەکانی باکوور دەگواستەوە، ئەو قافڵانەی گەرما گێژیکردبوون و خۆری باشوور سووتاندبوونی، هێندەی لە ئاران دەترازان و پێیان لە زەنوێران دەنا، چەتەکانی یابەحری ڕووتیاندەکردنەوە و دەستبەتاڵ و بارخاڵی دەیانناردنەوە بۆ بنەو هەواری خۆیان. جەوهەر یابەحری شتێک لەو ڕۆحە دونیاپەرست و سامانخوازەی چەتەکان لە خوێنیدا بوو، بەڵام دەبێت بڵێم کە برێک لە هۆشی پلاندانان و فریوبازیشی بۆ زیادکردبوو

کە ڕاستەوخۆ لە ڕۆحی ڕۆژگاری ئەمڕۆمانەوە وەریگرتبوو. بە کورتی جەوهەر یابەحری ڕۆحلەبەرێک بوو خاڵی لە خەیاڵ، بەجۆرێک لە دونیا و خواستە تێپەڕەکانیدا نوقمبوو، بە ئامێرێک دەچوو جگە لە غەریزە دڕ و کێوییەکان پەیوەندییەکی بە دیوەکانی تری مرۆڤەوە نەمابێت. لە منداڵییەوە جەنگێکی درێژ و بێڕەحم و پڕکینەی لەگەڵ خوشکەکەیدا دامەزراند. هەر زوو بە غەریزە بندۆز و وردبینەکەی خۆی گەیشتە دوو ڕاستی ترسناک کە تا ماوەیەکی درێژ هەمووان نیگا و بۆچوونەکانیان وەک دەمدرێژی منداڵێک و وڕێنەی زارۆیەک تەماشادەکرد، کە زیاد لە پێویست نازی دراوەتێ و پتر لەو تخوبەی ئەدەب بواری پێدەدا، زمان درێژدەکات. جەوهەر یابەحری لە منداڵییەکی زووەوە ڕایگەیاند کە تریفە یابەحری نە خوشکی ئەوەو نە کەسێکی ڕاستەقینەشە، بەڵکو هیچ نییە، بڵقێکی سپییە، کەفێکی تێپەڕە، هەوایەکی بەتاڵە و ڕۆژێک لە ڕۆژان وندەبێت و لە هەوادا ئاوادەبێت و لە وێنەیەکدا دەتوێتەوە.

زۆرجار ژیانی منداڵان هیچ نییە جگە لە نیگارێکی ئاوێنەیی و هەڵگەڕاوەی ژیانی باوکانیان، هەمان نمایشە لەسەر سەحنەی شانۆیەکی تر ئەنجامدەدرێت، هەمان تێکستە کە کۆمەڵێک ئەکتەری دی دەیخوێننەوە. زاهیر یا بەحریش هەرچۆنێک تەماشایدەکرد، لە ڕەفتاری کوڕەکەیدا مێژووی ڕابوردووی خۆی دەبینییەوە، سەیریدەکرد ئەو کینە ئەزەلییەی نێوان نێر و مێکانی ئەو تایەفە غەمگینە دووبارە لە پەیوەندی نێوان جەوهەر و تریفەدا سەرهەڵدەداتەوە. ساڵانێک زاهیر یابەحری هەوڵیدا خۆی لە تریفە نزیکبکاتەوە، درێغییەکی لە پەروەردەکردن و بەخێوکردنیدا نەکرد، هەرشتێک پێویستە بکرێت کردی، هەر واجبێکی باوکانە هەبوو ئەنجامیدا، بەڵام کچەکە بێباک و کەمتەرخەم لە دونیای خۆیدا دەژیا. لە قووڵایی دڵیدا ترسێکی گەورەی هەبوو کە جەوهەری کوڕی، هەمان چیرۆکی ئەو دووبارەبکاتەوە، زاهیر کە تادەهات لە

ژێر گوشاری تەمەندا دڵی نەرمتر و ڕۆحی پڕ سۆزتر دەبوو، ڕۆژێک بە دزی هەموو وەرەسەکانەوە، لای پارێزەرێک و بە شاهیدی چەندان هاوڕێی خۆی، سێیەکی سامان و موڵکی خۆی بۆ تریفە نوسی، نەبا لە دوای مردنی ئەو جەوهەری کوڕی هەموو شتێک زەوتبکات و بێئاگا و بێدەربەست ئەو کچە فڕێبداتە سەرجادەکان. کاتێک «دوای مردنی زاهیر» وەسێتەکە ئاشکرابوو، زنجیرەیەک ڕووداوی شێتانەی لێکەوتەوە، کە دواجار کۆمەڵێک دەرەنجامی سەیر و تراژیدی بۆ هەموو پاڵەوانەکانی ئەم چیرۆکە هێنا، کەئەو دەم کەسیان چاوەڕوانیان نەدەکرد.

## «حوسنی ماردینی» خاولییەکی کۆن پیشانی «عەتار» دەدات «سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٢»

دوای تەلەفونەکەی سەیفەدین مارۆ، «سەرکەوت نەزمی» بۆ بەیانی ڕۆژی داهاتوو کەوتە گەڕان بەدوای مامۆستای خەیاڵدا. ئەوە یەکەمجار بوو لە ژیانیدا بەدوای شتێکدا بگەڕێت نەزانێت چییە. لەو چەند ساڵەدا شتی سەیر و سەمەرەیان لێداواکردبوو. توانیبووی هەندێک شت پەیدابکات کە لە خەیاڵی کەسدا نییە، فەرووی پڵنگ، زوبانی شێر، گوڵی نەغمەخوان، بولبولی زمانزان، پەپولەی بۆنخۆش و سەدان شتی سەیر و سەمەرەی تر. لە بازاڕدا بە «عەتار» ناوبانگی دەرکردبوو، ئیشەکەی جۆرێک بوو لە عەتاری نوێ. وەک چۆن سەردەمانی زوو مرۆڤ بۆ وەدەستخستنی شتە نائاسایی و دووردەستەکان پەنایان بۆ عەتاران دەبرد، ئێستاش بۆ بەدەستخستنی شتە دەگمەنەکان خەڵکانێکی وەک سەرکەوت نەزمی و کەسانی دیکەی لەو شێوەیەیان ڕادەسپارد. خۆی نازناوی عەتاری وەک شەرەفێکی گەورە تەماشادەکرد، توانی

بووی لە زۆر لاوە پەیوەندی سەیر دروستبکات، مۆری باڵوێزخانەکانی دونیا و پاسپۆرتی لۆکی زۆربەی وڵاتانی دونیای لەلابوو، هەر شتێکی کردبێت زانیویتی چییە و بۆچی دەگەڕێت، بەڵام ئەو ڕۆژە بۆ یەکەمجار بێدەنگ دەسوڕایەوە و نەیدەزانی بۆ کوێ بچێت و لە کێ بپرسێت. ڕۆژێکی ئێجگار خۆشبوو، جەنجاڵی بازاڕ و هاتوهاواری دەستگێڕەکان نەیاندەتوانی فێنکی هەوا و خۆری نەرمدووی بەیانی بشێوێنن کە لە بری ساردی زستان هەوای بەهارێکی درەنگوەختیان بڵاودەکردەوە. بەڵام عەتاری هاوڕێمان لەزەتێکی زۆری لەو بەیانییە خۆشەنەدەبینی، بەجۆرێک غەمگین بوو هەرکەس دەیبینی دەیزانی بیر لە شتێک دەکاتەوە کە دەستخستنی قورس و ئامادەکردنی زەحمەتە. مەراقی وەک مەراقی پادشای حیکایەتە کۆنەکان بەڕوخسارییەوە دیاربوو. زۆربەی ئەوانەی دەیانناسی فێربووبوون دەموچاوی بخوێننەوە. کوڕێکی سەر زل بوو کەمێک پێشی سەری ڕووتابووەوە، جووتێک چاوی ڕەشی هەبوو، لووتێکی گرێدار، پێستێکی بۆرباوی خاڵاوی، ڕیش و سمێڵی دەتاشی و بەردەوامیش بۆ عارەقی لێدەهات. هەرکات شتێک بیجۆشاندایە، دوو دڵۆپ عارەقەی گەورە، وەک دوو دڵۆپ شەونم بە هەر دوو گوێیدا شۆڕدەبوونەوە. کە ناڕەحەت دەبوو گوێکانی دەنیشتنە سەر عارەق، هاوڕێ نزیکەکانی پێیاندەگووت «گوێ ئاونگ». ئەو ڕۆژە تا نزیکی نیوەڕۆ بێهودە بە بازاڕدا دەسوڕایەوە بێئەوەی بزانێت چی دەکات. هەرکات ئاوها نائارام و بێلەنگەربایە گرێکانی لووتی ئەستوورتر دەبوون، دەموچاوی تاریکتر و چاوانی دەرپەڕیوتر. گەرچی تا ئەوکات کەس شتێکی ترسناکی لێ نەبینیبوو، بەڵام لە ساتی پەشۆکاندا بە پیاوکوژێک دەچوو ئەمێستا لە لاشەی نێچیرێکی خۆی دوورکەوتبێتەوە. وەک زۆربەی خەڵکی ئەم شارە شتێک لە بێڕەحمی تێدابوو کە هەندێجار بە بێدەنگی و هەندێجار بە شەرم و جارجارێکیش بە تووڕەبوون دەیشاردەوە. ئومێدێکی گەورەی

هەبوو ببێتە پارەدارێکی گەورە، توانیبووی سامان و دارایی خۆی لە هەرەسە یەک لە دوای یەکەکانی بازاڕ بپارێزێت. بەڵام ترسی بەردەوام لە دۆڕان، دوودڵی لە تیاچوون و نوقمبوون لە بەردەم ئەو هێزە نادیار و سەیرانەدا کە ڕۆژانە لە شوێنی جیاواز جیاوازەوە وەک بورکان دەتەقینەوە ژیانیان تاڵکردبوو، ئەو دەوڵەمەندانەی لە ئەسپی سیاسەت دادەبەزین و خۆیان دەکرد بە قەیسەری و گوزەرە تاریکەکانی بازاڕدا، دەرونیان هەڵتەکاندبوو. بێئۆقرەیی پیاوێک دەژیا کە دەیەوێت ئەوەی هەیەتی بیپارێزێت و زیاتریبکات، ئەوە کارێکی کردبوو فێڵی نوێ و شێوەی تازەی خۆژیاندن فێربێت. ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر لە شتی سەیر و بازرگانی ناوازەوە دەئاڵا. ئەوڕۆژە لە دەمەو نیوەڕۆدا ترسی ئەوەی لێنیشت کە چیدی ئەو عەتارە بلیمەتە نەبێت کە هەموو شتی سەیر و سەمەرەی دونیای لا دەستدەکەوێت. لای نیوەڕۆ کاتێک حیساباتی تەواوی خۆی کرد، لە دوو کەس زیاتری لە بەردەمدا نەبوو ڕوویان تێبکات، یەکێکیان حوسنی ماردینی بوو، خاوەنی یەکێک لە کۆگا گەورەکانی شار، ئەوی تریان گەلاوێژ باهیربوو ژنی بەڕێوەبەری کارگەیەکی مافوورچنین، کە کچێکی خەیاڵچنی هەبوو سەرپەرشتی نەخش و نیگاری فەرشەکانی بۆ دەکرد. یەکەمین جێگا ڕووی تێکرد، لای حوسنی ماردینی بوو، کە دۆستێکی نزیک و ڕەقیبێکی نهێنی و زێرەوانکێشی بوو. هەندێک بە حوسنی خەیاڵ ناویاندەهێنا، چونکە پیاوێکی گەلەک پڕ حیکایەت و زێدە خەیاڵبازبوو. حوسنی خەیاڵ دوکانێکی خاولی فرۆشتنی هەبوو، لە خاولی بەولاوە هیچی تری تیانەبوو، هەندێک لە خاولییەکانیش بۆ فرۆشتن نەبوون، بۆ دەست لێدان نەبوون، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوەبوون سەیریانبکەیت و گوێ لە حیکایەتە دووردرێژەکانیان بگریت کە حوسنی بە لەزەتێکی بێئەندازەوە دەیگێڕانەوە. کاتێک عەتار لە بەر دوکانەکەیدا دەرکەوت و حوسنی گوێ عارەقاوییەکانی بینی تێگەیشت بۆ شتێکی

تایبەتـی دەگەڕێـت، ڕاسـتەوخۆ بـە دەنگی بەرز گووتـی « عەتار وەرە ژووریٚ، خاولییەکم لایـە ئەمیـری کوێت خـۆی پـێ وشـککردۆتەوە، حەریـری ئەسـڵە، شـتی وا لـە دونیـادا نییـە، لـە کـوڕی قائیـد فەیلەقـی سـێم کڕیوەتـەوە، باوکـی ڕایکـردوە... نەتبیسـتوە؟ چـۆن؟ ئـەو بێشـەرەفە هەفتەیەکـە لای جەماعەتـی خۆمانـە. وەرە، هـی ئەوەیـە بیبینیـت... وەرە ژووریٚ، چیتـە، ئەهـا، بـۆ قسـەناکەیت... دیسـانەوە بـاران لەگوێت باریـوە؟». ئـەو جـۆرە شـتانە عەتاریـان دەخرۆشـان، حوسـنی خەیاڵـی دەیزانـی چـۆن دەیگرێـت، دەیزانـی عەتـار خاولییەکـی وەهـا بـە پـارەی زۆر دەکڕێـت. پێشـتر دووجـار خاولـی گرانبەهـای بـە عەتـار فرۆشـتبوو، یەکێکیـان خاولـی حەمامـی کچـە عەرەبێـک بـوو، زەمانێـک لەوەوبـەر لـە تەلەفزیۆنـی بەغـداد بەرنامەیەکـی گەنجانـی پێشکەشـدەکرد، ئـەوی تریـان خاولـی ئەکتەرێکـی ئێرانـی بـوو، لـە دەورانـی شاهەنشـادا ناووناوبانگێکـی باشـی پچڕیبـوو، دوای مردنـی ئیمـام و هاتنەسـەرکاری خامنەئـی فورسـەتی هێنابـوو لـە ئێـران دەرچێـت، بـەڵام لـە سـەر مـەرز جانتاکـەی لێبەجێمابـوو، هەندێـک دەرپێـی ژێـرەوە و دوو خاولـی تێدابـوو، حوسـنی خەیـاڵ هەموویانـی بـە پارەیەکـی ناچیـز کڕیبـوو، دواتـر پارچـە پارچـە فرۆشـتبوونی و سـەروەت و سـامانێکی باشـی پـێ پەیداکردبوو. بـەڵام ئەمـڕۆ عەتـار مەراقێکـی تـری هەبـوو، بـە دەنگـە گڕەکەیـەوە کـە زۆر لایەقـی قیافـە و هەیکەلـی بـوو گووتـی «حوسـنی عەزیـزم، عەفوومکـە، ئەمـڕۆ بـۆ سـەیری خاولـی نەهاتـووم... هاتـووم پێویسـتیم بـە یارمەتـی تۆیـە، یەکێکـم بـۆ بدۆزیتـەوە وەک خـۆت خەیاڵـی هەبێـت و بتوانێـت ماوەیـەک مامۆسـتایی بـکات، کچـی برادەرێکـم هەیـە تەمەڵـە، دەبێت یەکێک وانەیەکـی پێبڵێـت بتوانێـت لـە دەرس و دەور تێبـگات». حوسـنی خەیـاڵ بـە سـمێڵە سـپییە ئەسـتوورەکانییەوە پێکەنـی و گووتـی «تـا هەفتەیـەک لەوەوبـەر پیاوێکـی عاقـڵ بوویـت، چـی قەومـاوە؟. مـن خاولـی فرۆشـم، چ کارم بـە وانـە گووتنـەوەوە هەیـە؟». سـەرکەوت لـە بـەر ئاوێنەیەکـی گەورەدا

گوێکانی وشککردەوە و گووتی «هیچ، دەڵێم ئامۆژگاریم بکە، ڕێنماییم بکە. کەسێکم بۆ بدۆزەرەوە کۆمەکمبکات، کاتم زۆر نییە و ناشزانم بچم بۆ کوێ؟». یەکەمجار بوو عەتار وەها غەمگین و دەستەپاچەبێت، حوسنی کەمێک ئاوی دایە و گووتی « دانیشە بزانم چیت دەوێت؟». هەناسەیەکی غەمی هەڵکێشا و بەڕوخساری یەکێکەوە شەرم لە داواکەی بکات، گووتی « مامۆستایەکی خەیاڵم دەوێت، دەبێت ئەمڕۆ تا ئێوارە مامۆستایەکی خەیاڵ بدۆزمەوە». حوسنی بە کەمێک تێڕامانەوە گووتی « بەڵام چ جۆرە خەیاڵێک؟ خەیاڵ شێوەی زۆرە، هەر شتە و خەیاڵی خۆی هەیە». عەتار بە پەرێشانییەوە دەستێکی پانکردەوە و گووتی «نازانم. چۆن بزانم چ جۆرە خەیاڵێکیان دەوێت؟ نازانم... خودایە لە کوێ بزانم، خەیاڵێک وابکات کچێکی تەمەڵ لە مەکتەب دەربچێت، لە دەرسەکانی تێبگات. مامۆستاکانی دەڵێن لەبەرئەوەی خەیاڵی نییە لە هیچ تێناگات، بۆ هەموو دەرسەکان مامۆستایان بۆ گرتووە، بەڵام هیچ ناچێتە مێشکی، ئێستا دەڵێن دەبێت خەیاڵی خۆی چاکبکات».

عەتار نەیدەزانی چی بڵێت، هەرگیز بیری لەو جۆرە شتانە نەکردبووەوە، تێنەدەگەیشت کێ سەیفەدین مارۆی خستۆتە سەر ئەم کەڵکەڵەیە، دوای ئەوە خەیاڵ خۆی چییە تا مامۆستای هەبێت؟ ئاە گەر ئیشێک بایە وەک ئیشەکانی تر، گەر شتێک بایە لە بابەت چاککردنی تەلەفزیۆن، شەحنکردنەوەی ماتۆڕی سەلاجە، دانانی تەنکی سەریان، چەند ئاسان بوو. ئێستا دوا هیوای ئەم خاولی فرۆشە زۆربڵێیەیە کە لەڕێگای خاولییەکانییەوە حیکایەتی دونیامان بۆ دەگێڕێتەوە. حوسنی وەک هەموو کاسبە سەبور و دڵفراوانەکانی بازاڕ سەری بادا و گووتی « بەهەرحاڵ ئەم سەگانە هەر ڕۆژەو شتێک دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی پارە بکێشنەوە، هەر ڕۆژەی حیکایەتێک دادەهێنن». پاش نیستێک گووتی« بەڵام ڕاستە... ئەوە ڕاستە. خەیاڵ دەتوانێت ئینسان لە بنەوە بگۆڕێت.

خەیاڵ دەتوانێت مرۆڤ بکاتە شتێکی تر، جۆرە خولیا و خەونێکی تری تیابچێنێت». عەتار بە پەرێشانییەوە گووتی «وامدەزانی، هیچ کەسێک ناتوانێت بەخەیاڵ بژی، من تا ئەمڕۆ وا تێگەیشتبووم مرۆڤ ناتوانێت بە خەیاڵ نان پەیدابکات. بەڵام پێدەچێت هەڵەبم... وانییە، لەوانەیە من هەڵەبم؟». ماردینی گووتی «خەیاڵ هەیە، مرۆڤ دەکوژێت، وای لێدەکات پەیوەندییەکی بە ژیانەوە نەمێنێتەوە، ئەمجۆرە خەیاڵە لە شێتییەوە نزیکترە وەک لە عەقڵ. بەڵام خەیاڵیش هەیە مرۆڤ زیندوودەکاتەوە، لە مردن ڕزگاریدەکات و ژیان دەکاتەوە بە بەر هۆش و هەستی مرۆڤدا».
عەتار سەری بادا و جارێکی تر ناوچاوانی سڕی و بەسەرسامی دەنگی هەڵبڕی « من وا تێگەیشتبووم خەیاڵ سەرمان لێتێکدەدات، ناهێڵێت زۆر باش لە دونیا تێبگەین». حوسنی کەمێک وەستا و گووتی «نا، زۆرجار گەر خەیاڵ نەبێت مرۆڤ لە هیچ شتێک تێناگات». دواتر کەمێک دەنگی نزمکردەوە و بە ئەسپایی گووتی « گەورەترین ترسی من ئەوەیە خەیاڵ لەمشارەدا خەریکە دەمرێت، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر هەستدەکەم خەیاڵ دەمرێت، عەتاری هاوڕێم من لە مێژە هەستم پێکردووە، لە مێژە، بەڕاست تۆ هەستی پێناکەیت؟». عەتار بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامیدایەوە «حوسنی هەست بەچی بکەم، ڕاستت دەوێت، لە ئەسڵا من نازانم خەیاڵ چییە. خۆت دەزانی کە پیاو لە بازاڕدا ئیشیکرد لە خەیاڵات دووردەکەوێتەوە. بیرم نییە ڕۆژێک لە ڕۆژان ساتێکم بۆ خەیاڵات و شتی وا تەرخانکردبێت. خۆت دەزانی ژیان قورسە، شت گرانە، پارە لە بەرز و نزمیدایە، ئەوانە هەموو کار لە خەیاڵ دەکەن. من ئەوەتەی لە دایکبووم لە بازاڕدام، لە ناو قەساب و سڵقفرۆشاندا چاوم کردۆتەوە. بەڵام دەزانم تۆ دەتوانیت یارمەتیمبدەیت، شتێک لە دڵمدا بۆ لای تۆی هێنام، تۆ تەنیا کەسێکی دەتوانیت کۆمەکم پێبکەیت». حوسنی بێئەوەی گوێ بگرێت گووتی «ڕاستدەکەیت بازاڕ خەیاڵ دەکوژێت، هەق بە تۆیە، ئاه بەڵام

ژیان خۆشی لە بازاڕێکی چەپەڵ و پڕ خۆڵ و خاشاک بەولاوە هیچی تر نییە. من دەڵێم بەڵکو خەیاڵ بتوانێت لە مردن ڕزگارمانبکات، لەم ژیانە تاڵە دوورمانبخاتەوە، عەتاری برام حیکایەتێکم هەیە لەوانەیە تۆ سوودی لێببینێت. من دەزانم تۆ بەشەرێکی کەم خەیاڵیت، بەڵام پیاوێکی زیرەکیت، عەقڵت باش ئیشدەکات، ئەو بەشەرانەی عەقڵیان باش ئیشدەکات دەتوانن لە خەیاڵیش تێبگەن».

عەتار دڵنیابوو کە حوسنی خەیاڵ لەسەرەتای ئەوەدایە چیرۆکێکی بۆ بگێڕێتەوە، هەر کات حوسنی بیویستبایە چیرۆکێک بگێڕێتەوە، دەنگی دیاربوو، جوڵەی دەستی دەگۆڕا، چرچ لەڕوخساریدا نەدەما. حوسنی دەستی برد لە ژێر بەستەیەکی گەورەی خاولییەوە کلیلێکی ژەنگاوی بچوکی دەرهێنا و بە پەیژەیەکی بچوکدا سەرکەوتە بەشی سەرەوەی دوکانەکەی و پاش کەمێک بە خاولییەکی گەورەوە هاتەخوارێ. خاولییەکەی لەبەردەم سەرکەوت نەزمیدا کردەوە، خاولییەکی دوو بەری گەورە بوو، پڕبوو لەو جۆرە نەخشە چینیانەی عەتار لەسەر فەخفورییە کۆنەکانی نەنکی بینیبوونی. دەستوخەتی چینییەکان شتێک نەبوو لەگەڵ دەستوخەتی تردا تێکەڵاوببکات، وەک پیاوێکی بازاڕ دەبایە سەنعەتی وڵاتان بە وردی بزانێت و شێوەکانیان بەڕاستی بناسێتەوە. لەم ساڵانەی دواییدا ئەو ئێرانییە کافرانە بازاڕیان پڕکردبوو لە کاڵای کەمبەهای چینی و کۆری، لە تایوان و هۆنگ کۆنگ و مالیزیاوە، لەڕێگای ئەو چینییە تسکەنانەوە کە بۆ بازرگانی و ڕابواردن دەچوون بۆ تایلاند، گرێبەندی گەورەیان مۆردەکرد و هەموو شتێکیان دەکڕی، هەر کاڵایەکی ستۆک کە لەم سەرە و سەری دونیادا بازاڕی نەبووایە بەپوڵێکی کەم دەیانکڕی، دەیانزانی ئەو تاجیرە کوردە بێویژدانانە زبڵیش دەکڕن و ساغیدەکەنەوە. ئاه خوای گەورە چەندجار ئەم مەسەلەیەی لەگەڵ بازرگانەکاندا باسکردبوو، بەڵام کێ گوێدەگرێت، مەگەر خوا بزانێت عەتار چ مەراقێکی

لەوە دەخوارد، مەگەر خوا بزانێت. خۆی لەو باوەڕەدا بوو جگە لە فەخفوری و پۆرسەلان و بلوور، جگە لەڕۆبی حەریر و شاڵی نەخشداری ئاوریشمین هیچ شتێکی چینی نییە شایستەی ئەوەبێت مرۆڤ پولێکی قەڵبی تیا خەساربکات. «چینییەکان ئەم مەملکەتە هەزار و داڕوخاوانە هێندەی دی ڕووتدەکەنەوە» هەر کاتێک بهاتبایەتە سەر قسە عەتار ئاوهای دەگووت. عەتار شێتی ئەو شتانەبوو کە لە خۆرئاواوە دەهاتن، شێتدەبوو گەر یەکێک بیویستبایە کاڵایەکی قەڵبی چینی بە زیمێنزی ئەڵمانی پێبفرۆشتبایە. ئەو نیوەڕۆیە کە حوسنی خەیاڵ، ئەو خاولییەی لەبەردەمدا کردەوە، لە دڵی خۆیدا گووتی ئەم کوڕی سەگە ئەم شتە عەجیبانە لە کوێ دەهێنێت؟. وەک هەموو ئەوانەی لە بازاڕدا ئیشدەکەن بەردەوام لە بۆسەدابوو بۆ ئەوانی دی، بەغیل و پڕ ئیرەیی بوو... لە مێژبوو حوسنی خەیاڵی دەناسی، بەڵام ئەو پیاوە چەندە سادە دەینواند، چەندە دەمبەخەندە و شیرین زوبان بوو، چەند ڕوو لەڕزق و شەکەرلەفز بوو، هێندە ئاڵۆز و سەیریش بوو. خودایە ئەو هەموو سەروەت و سامانەی لە کوێ بوو؟ عەتار هەموو جۆرە کاسبییەکی دەکرد و هێشتا پیاڕانەدەگەیشت، بەڵام ئەم کوڕی سەگە، ئەم سمێڵ سپییە ڕووخۆشە بەبێ ئەوەی وەک ئەم ماندووببێت، وەک پادشا دەژیا. کە حوسنی خاولییەکەی لە بەردەمدا کردەوە، وەک شتێکی عەنتیکە و سەرسوڕهێن هاتە بەرچاوی. شاکارێکی جوان و پارچەیەکی ڕەنگین و قەشەنگ بوو. لە قووڵایی دڵەوە تەمەنایکرد بیتوانیبایە بیکڕێت و لە نێو شتە ئەنتیک و ناوازەکانی خۆیدا هەڵیگرێت، بەڵام دڵنیابوو حوسنی نایفرۆشێت. دیاربوو سەنعەتێکی ئاسایی نییە، پارچەیەکی ناوازە و ئیشێکی دەگمەنی سەنعەتکارێکی کۆن بوو، سیحری دەهر و تۆزی زەمان ئاشکرا لەسەری نیشتبوون، ئەو تۆزەی عەتار لەسەر هەر شتێکی دونیا بیدیبایە شەیدای دەبوو. حوسنی بۆ ئەوەی زیاتر خەیاڵی عەتار بوروژێنێت و بۆی

بسەلمێنێت کە شتە ناوازە و ئەنتیکەکان لای ئەو زۆرترن، خاولییەکەی بەرزکردەوە و گووتی «عەتاری برام سەیری ئەم خاولییە بکە، ئەمە چیرۆکی جەنگێکی زۆر کۆن دەگێڕێتەوە کە کەس نازانێت لە چ زەمین و زەمانێکدا ڕوویداوە. من لە مێژە هەڵمگرتووە، نازانم چەند ساڵە هەمە، بەڵام هەردەم سەربوردەکەی لە خەیاڵمدا بووە. چیرۆکی سوپایەکی بێگانە کە دەچێتە شارێکی کۆنەوە، سەرگوزشتەی پادشایەکی گەنج کە نازانێت چی بکات، بەردەوام بێت لە پادشایەتی یان ببێت بە شاعیر؟ خۆی پادشایەکی گەنجە کە بەهرەیەکی گەورەی شاعیریشی تێدایە، چەند جارێک دەیەوێت واز لە تەخت و تاج بهێنێت و ڕووبکاتە شیعر نوسین و وەک قەلەندەرە کۆنەکانی ئەدەب، ڕوو لە هەرد و نزاران بکات، ئەشکەوت و لانەی چەپەک و گۆشەی لە عەوام دوور بکاتە هەواری خۆی، بەڵام گزیر و وەزیر... شالیار و مالیاری دەوروبەری ناهێڵن و پەشیمانیدەکەنەوە. واڕێدەکەوێت شاهەنشای گەنج لەگەڵ پادشاهێکی زۆر بە جاهوجەلالی تردا کە بەناوبانگترین شاعیری ئەو زەمانە لە دیوەخان و دەرباریدا دەژی، بچێتە شەڕێکی گەورەوە. گەنجەشای خوێن گەرم و بێئارام، بڕیاردەدات گەر بەسەر ئەو دوژمنە سەرسەختەی خۆیدا سەرکەوت و پادشاهی بەدیل گرت لەگەڵ ئەو شاعیرەدا بیانخاتە نێو کێبڕکێیەکی سادەوە تا بزانێت شاهی چاکترە یان شاعیری. بۆ ئەوەی هەریەک لە پادشا و شاعیریش باشترین شتی خۆیان پێشکەشبکەن، بە دەستوپێوەندانی دەڵێت هەر کامێکیان لەو پێشبڕکێیەدا بیباتەوە لێیخۆشدەبێت و هەریەکێک بیدۆڕێنێت لە ناوەڕاستی شاردا لە سەری دەدرێت. ئا... عەتار گیان، باش بیری لێبکەرەوە... ئیتر چی بێت لە تۆ نهێنی، دەبێتە شەڕ و کۆڵمەزێکی بێسەروبن، جەنگێکی درێژخایەن و خوێنین، دوای چەندین لێکە و تێکەی زۆر، شاهی گەنج خودا هیدایەتی دەدات و سەرسەخترین دوژمنی خۆی دەبەزێنێت و بەسەرکەوتووی

دەچێتە ناو قەڵا و قایمەماڵی دوژمنەوە. کە گەورەترین پادشای دەهر و ناودارترین شاعیری زەمان بە دیلی دەکەونە دەستی و بە زنجیرەوە بۆ پێشدەمی شاهەنشا راپێچیاندەکەن، گەنجەشا کە خۆی هەم شایە و هەم شاعیر فورسەتێکی بێوێنەی بۆ دێتەپێش بەراوردی تواناکانی شاهان و شاعیران بکات. لەگەڵ هەر یەک لەو دوو دیلە گەورەیەی خۆیدا گەشتێک بە شاردا دەکات. داواکەی ئەوەیە هەریەکەیان بە شێوەی خۆی ئەو شارەی بۆ وەسفبکەن کە تیاژیاون و تیا گەورەبوون، هەر یەکەیان بە ئەندازەی توانا و بەهرەی خۆی بەڵگە و بەهانەی بدەنە دەست تا لە خاپوورکردنی ئەو ئیمارەتە دوودڵ بێت و ئەو ئاوەدانی و قەڵایەی لا خۆشەویست بێت... عەتاری برام سەیرکە چ پادشاهێکی فێڵزان و وردبین دەبێت... بابەتێک هەڵدەبژێرێت بۆ ژیانی خۆیان و ژیانی خەڵک و پاشەڕۆژی مەملکەتیش گرنگ بێت».

هەر کەسێک بهاتبایە بۆ لای حوسنی دەبایە خۆی بۆ ئەو جۆرە حیکایەتانە ئامادەبکات. عەتار نەیدەزانی ئەم چیرۆکە پەیوەندی بە دەردەکەی ئەوەوە چییە، بەڵام بێچارە گوێیدەگرت. کەس نەبوو بوێرێت گوێ لە حیکایەتی حوسنی نەگرێت، خۆی دەیگووت «گوێنەگرتن لە حیکایەتەکانی من شوومە... ئینسان توشی بەڵای قورس دەکات». گەرچی عەتار باوەڕی بەو قسانە نەبوو، بەڵام لە گوێگرتن بەولاوە چارێکی دیکەی نەبوو. حوسنی دەیزانی تا ئەو کاتە عەتار لە مانای چیرۆکەکە تێنەگەیشتووە، دەیویست بە خێرایی ماناکە بدات بەدەستەوە، دیوێکی خاولییەکەی نیشاندەدا و دەیگووت «ئامۆزا گیان تەماشاکە، ئەم دیوەی خاولییەکە حیکایەتی گەشتی شاهی سەرووەرە لەگەڵ شاهی بەزیوو و شکستدا... ئینسان کە بیردەکاتەوە دەڵێت، حەتمەن شاهەنشا کە مەملەکەت مەملکەتی خۆیەتی، ماڵ ماڵی خۆیەتی لەهەر کەسێکی دی

باشتر دەتوانێت شار وەسفبکات، چونکە ئەوە دوا هەلە خۆی ئازادبێت و شارەکەشی دەستبکەوێتەوە. هەڵبەت پادشا هەموو زیرەکی و عەقڵی خۆی دەخاتەکار تا بەسەر شاعیردا سەرکەوێت و تاج و سەوڵەجانی خۆی وەرگرێتەوە... وانیە ئاغام؟ وانیە؟. سەیرکە عەتاری هاورێم... پادشا و دیلەکەی لەگەڵ یاوەران و پاسەواناندا لێرەوە دەستدەکەن بە گەشتەکەیان... سەیرکە عەزیزم، هەموو شتێک بە شێوەی نەخشە کێشراوە، لە هەموو وێستگەکانی گەشتەکەدا پادشا و دیلەکەی و یاوەرانی دروستکراونەتەوە، شاهی دۆڕاو لە هەموو وێستگەیەکدا ئاماژە بۆ جێگایەک دەکات، بەڵام لە وێنەکەدا جگە لە وێنەی ڕووت و قووتی ئەو جێگایە هیچی تر نابینین، یەعنی وەسفی پادشا خەیاڵی تیا نییە، شوێنەکان وەک خۆیان وەسفدەکات، بە درەخت دەڵێت درەخت، بە باغ دەڵێت باغ، بە دەریاچە دەڵێت دەریاچە. کە دەست بۆ خانوویەک درێژدەکات دەڵێت ئەمە خانووە و هیچی تر. دونیا بەوەسفی پادشا فەقیر و بێڕەنگە... عەتار ئەوەی خەیاڵی نەبێت دونیا بێڕەنگ دەبینێت... سەیرکە خاولییەکە وامان پێدەڵێت، خاولییەکە لەم دیوەیدا گەلەک لە نەخش و نیگاردا فەقیرە، وێنەی کەمتر و ڕەنگی کەمتر و جوانی کەمتری تێدایە. بەڵام سەیری ئەم دیوەی تر بکە، بڕوانە دیوی دووەمی خاولییەکە، ئەمەیان هەمان ئەو شارەیە بەوەسفی شاعیرەکە، هەمان نەخشەیە بەڵام ڕەنگینتر و دەوڵەمەندتر و پڕ نیگارتر... شاعیر وەسفی درەختەکان ناکات، بەڵکو وەسفی ژیانی باڵندەکانی سەریاندەکات، وەسفی نەخشەکان و یادگارییەکانی ئەو درەختانە دەکات، وەسفی ئەو عاشقانە دەکات کە لە ژێر دارەکاندا خەوتوون. وەسفی خانووەکان خۆیان ناکات، بەڵکو باسێکی خەیاڵی لەژیانی ئەوانە دەکات کە لە نێویدا دەژین، سەیری ئەم گۆشەیە بکە... سەیرکە ئەمە ماڵێکە خێزانێک بە بەختەوەری تێیدا دەژی، سەرتاپای نیگارەکە سروشتی بەهەشتێکی خەیاڵی هەیە کە بینین

و نیگاکردنی ئاسوودەیی دەبەخشێت. ئەمەماڵێکی دیکەیە دوو عاشق پێکەوە بە ئارامی تیا خەوتوون، ئەمە هەتیوخانەیەکە منداڵانی پڕکەسەر و دەردی تێدایە، بەڵام هێزی شاعیرانەی خەیاڵ وەها ورد و قەشەنگ نیگاریانی چنیوە، مرۆڤ مەست و سەرسام دەبێت. ئەمە دەریاچەیەکە پڕ لە ماسی سەیر سەیر کە شاعیر خۆی بە وەسف دروستیکردون... تێدەگەیت عەتار، ئەم خاولییەت بۆیە پیشاندەدەم بۆ ئەوەی جیاوازی نێوان ئەو دوو دنیایە ببینیت و سەیریانبکەیت، دونیایەک جارێک بە چاوی کەسێک کە خەیاڵی نییە و جارێک بە چاوی کەسێکی دی کە پڕ خەیاڵە... ئیتر دەبێت خۆت لە کۆتایی حیکایەتەکە تێبگەیت، خۆت بزانێت کێ شایەنی ئەوەیە بژی و کێ شایەنی نییە».

وەک ئەوەی عەتار لە مەبەستی حوسنی خەیاڵ تێگەیشتبێت، گووتی «ئاه حوسنی تۆ دۆستێکی زۆر باشی، کەواتە دەبێت شاعیرێک بۆ کچەکەی سەیفەدین مارۆ بدۆزینەوە. شاعیران مامۆستای خەیاڵن، وانییە... ئاخۆ لە مەبەستی تۆ گەیشتووم؟». حوسنی سەری بادەدا و دەیگووت «من یەکێک دەناسم، یەکێک دەناسم دەتوانێت بە کەڵکی دەردی تۆ بێت، پیاوێکی زۆر خەیاڵییە، غەزەلنوسی پێدەڵێن، چەند ساڵێکە لە شاردا ناو و شۆرەتێکی باشی بۆ خۆی سەندوە. دەردی تۆ لەوانەیە تەنیا لای غەزەلنوس چارەبکرێت، بیستوومە دەڵێن پیاوێکی خەیاڵپەروەر و دوورە دونیایە».

عەتار کەمێک ڕادەما و لەسەرەخۆ بیری لە قسەکانی حوسنی ماردینی دەکردەوە، کەمەکێک لە سەر وشەی «دوورە دونیا» دەوەستا، یەکەمجاربوو وشەی دوورە دونیا وەک ستایش و فەزڵ ببیستێت. خودایە، دەبایە لە زووەوە بیزانیبایە، کەسانێک شیفتە و شەیدای خەیاڵ بن، دەبێت خەڵکانێک بن سەروکارێکی زۆریان لەگەڵ دونیادا نەبێت، خەیالات وەها بیانبات بۆ دونیایەکی تر بفڕن و پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بە

زەوی ئێمەوە نەمێنێت. ئێستا تێدەگەیشت خەیاڵ مانای چی... ئێستا تێدەگەیشت.

***

دەمەو ئێوارەیەکی درەنگی هەمان ڕۆژ، عەتار بە خۆی و سەرە زل و عارەقاوییەکەیەوە، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ کەچەڵتر و بێمووتر دەینواند، گەیشتە بەردەم ماڵی گەلاوێژ باهیر. ساڵێک لە مەوبەر لە کاتێکدا خەریکی کڕینی فەرشێک بوو بۆیەکێک لە بەرپرسە گەورەکانی حیزب، ڕێگای کەوتە ئەو کارخانە چکۆلانەیەی مافوورەوە کە عەبدولقادری نیا و گەلاوێژ خانی ژنی دەیانبرد بەڕێوە. عەتار لە منداڵییەوە عەبدولقادری نیای دەناسی، «نیا» ناوی کۆگایەکی گەورەبوو کە سەید قادر شتی ئەنتیک و شوشەواتی بەنرخ و بابەتی کریستاڵی تیا دەفرۆشت، خۆشی هەر بە ناوی کۆگاکەوە بە سەیدقادری نیا بانگدەکرا. پاش چەند ساڵێک کە ئیشوکاریان باش بوو، سامان و پوڵێکی زۆریان چنگکەوت، ئەو کارخانە چکۆلە و پەککەوتەیەی مافووریان لە دەوڵەت کڕییەوە کە لە قۆناغێکی جەنگدا هەندێک لە کارخانە بچوکەکانی خۆی فرۆشت. ژن و مێردێکی ڕوخۆش و دەم بە پێکەنین بوون، لە کاتی پشوودا بەردەوام پێکەوە تاوڵەیان دەکرد، هەندێک شەو لە بری ئەوەی لە جێگاکەی خۆیاندا بخەون بەسەر تاوڵەکەدا خەویان لێدەکەوت. دەبێت بڵێم کەس نەبوو بە ئەندازەی گەلاوێژ خان تاوڵە بزانێت. هەندێک عەسر کە هاوڕێکانی خۆیان لە کارخانەی مافوورەکە کۆدەبوونەوە، گەر زار نامەرد نەبووایە لە هەموو ئەو پیاوانەی دەبردەوە کە سەریان لە قیرەقیرەی هەپی بەیاز و دوو شەشدا سپی کردبوو. ژنێکی چکۆلانەی لاوازبوو، بە جۆرێکی سەیر ڕوخساری خۆی پشتگوێ خستبوو، قژێکی ماش و برنجی هەڵچووی هەبوو ساڵە و ساڵ شانەی بەردەکەوت، خاتوونێکی نێربوو

پتر لە پازدەساڵ بوو یەکجاریش چییە مکیاجی نەکردبوو، بەیانیان تا سەعات دوو ئەو کارخانەکەی دەبردبەڕێوە، وابڕیاربوو ئێواران سەیدقادر جێگای بگرێتەوە، بەڵام کاتێکیش ئەو دەهات... گەلاوێژ هەر لە کارخانە دەمایەوە. لەگەڵ کچە ئیشکەرەکاندا نانی دەخوارد، لەگەڵ باجییەکاندا شوێنەکەی پاکدەکردەوە، دانی دەدا بەو مریشک و قاز و مراویانەی لە پشت کارخانەکەوە بە خێویدەکردن، ئێوارانیش لەگەڵ ئەو پیرەمێردانەی دۆستیاندا یان تاوڵەیدەکرد، یان خەریکی گەشاندنەوەی مەقەڵی و چاکردنی مەزەبوو. ئەو ئێوارەیە کە عەتار لە دەرگای دا بە ڕێکەوت لە ماڵبوو، دوای دەوامی خۆی بە تاکسییەکی کۆن گەڕابووەوە بۆ ماڵێ و یەک تەختە لەسەر پشت لێیکەوتبوو. کە دەرگاکەی لە عەتار کردەوە هێشتا خەو بەرینەدابوو. عەتار بەو سەر و بیچمەی خۆیەوە لە سەفیری مەملەکەتێکی دوور دەچوو ڕێگای هەڵەکردبێت، بۆ ئێستێکیش گەلاوێژ باهیر پێیوابوو ئەم پیاوە باڵابەرزە سەر ڕووتاوەیە، کە لە ئێوارەیەکی زستاندا هاتۆتە بەردەرگای ئەو، میوانی هەڵەڕێی یەکێک لە دراوسێکانە. عەتار هەرکاتێک لەبەردەم خەڵکی بەحورمەتدا قسەیبکردبایە شتێک لە شەرم و حەیای منداڵی تێدەگەڕایەوە. ئەو ئێوارەیە بە دەمێکی وشکەوە بە خانمی گەلاوێژی گووت «خۆمتان پێدەناسێنم، خانم، من ناوم سەرکەوت نەزمییە، کوڕی نەزمی بەگی بازرگانم، کۆن دوکانەکەمان لە پشتی گوزەری ئێوەوە بوو. نەزمی بەگ بە کونجیخۆر بەناوبانگ بوو، هەڵبەت دەزانن کێ دەڵێم، ها خانم، من کوڕی ئەوم... پار لە هەلومەرجێکی نائاسایی و قورسدا بە دیداری بەڕێزتان شادبووم، هەڵبەت سەردانێکی کورت بوو، پەیوەندی بە جێبەجێکردنی هەندێک کار و کاسبییەوە هەبوو کە لەگەڵ ئێوەی ڕێزداردا جێبەجێمانکرد، گەر منیشت بیرنەبێت ئاساییە، ئا لەوانەیە لە بیرت نەبێت، من سەرکەوت نەزمیم، خەڵک بە عەتار ناوم دەبەن... ببورە، ڕاستییەکەی من بۆ

مامۆستایەکی خەیاڵ دەگەڕێم و واهەستدەکەم زۆر پێویستم بە کۆمەکی ئێوەیە. ئێوە دواهەمین هیوای منن».

شتێک لە پاکی و بێگوناهی لە دەنگی عەتاردا بوو، بەشی ئەوەی دەکرد گەلاوێژ گومانی خراپی لێنەکات. بەڵام سەرەتا هیچ لە قسەکانی تێنەگەیشت. ئەو ژنێک بوو گەر لە یەکێک تێنەگەیشتایە تووڕەدەبوو، بەڵام کەمەکێ دانی بە خۆیدا گرت و گووتی «کوڕی خۆم دەزانیت ئێرە ماڵی کێیە و تۆ بۆلای کێ هاتوویت؟». عەتار بۆ ئەوەی هەڵەکەی خۆی چاکبکاتەوە، بە پەلە گووتی «دەزانم... بێگومان خانمی بەڕێز دەزانم، بەڕێزتان گەلاوێژخانن، کەس نییە ئێوە نەناسێت، من پار مافوورم لە ئێوە کڕی، ژمارەیەکی زۆر مافوور، بۆ شەیدا نەرویجی، ئەو بەرپرسە گەورەیەی لەوانەیەلەحکومەتی داهاتووی کوردستاندا ببێتە وەزیر... مافوورەکان بۆ ئەوبوون... بیرتە تۆ گووتت مافوورێکت دەدەمێ خەیاڵێکی ساف و پاک چنیبێتی، بیرتانە واتان بە من گووت، بەر لە یازدە مانگ لەوەوبەر سەرەتای زستانی پێشوو، خودایە، خانم چۆن لە بیرت نییە؟ ئەوکات شەیدا نەرویجی فەوجی هەبوو. تۆ نەتویست ڕاستەوخۆ مافوورم پێبفرۆشیت، گووتت بڕۆ بۆ لای ڕەحیمی فەرش، من پاڕامەوە و گووتم من مافوورەکانم بۆ شەیدا نەرویجی دەوێت، ڕاستەوخۆ لە کارخانەکە نەبێت نایکڕم، لای خۆت نەبێت نایبەم، تاقەتم نییە کەس دەستم ببڕێت. تۆ نەتدەزانی شەیدا نەرویجی کێیە، کەمێک تووڕەبوبوویت، لە منت پرسی شەیدا نەرویجی چ گەوادێکە؟. من گووتم خانم، چۆن نازانیت شەیدا نەرویجی کێیە... تۆ سەیری کەناڵەکانی تەلەفزیۆن ناکەیت، سەیری هەواڵەکانی سەعات هەشت و نیوی شەو ناکەیت، ڕۆژنامە کوردییەکانی مەملەکەت ناخوێنیتەوە؟. تۆ بەردەوام دەتگووت، نا سەرزل من سەیری تەلەفزیۆن ناکەم، سەیری هەواڵەکان ناکەم، سەیری ڕۆژنامەکان ناکەم. من گووتم خانم ئەوەندە تووڕەمەبە، من کڕیارێکی باشم، بەڵام تۆ هێمن

نەبوویتـەوە و هێمـن نەبوویتـەوە، تـا وەعـدم دایتـێ تاوڵەیەکـت بـۆ بێنـم لـە بـەردی مەڕمـەڕ، بـەڵام دواجـار ئـەو تاوڵەیـەم دەسـتنەکەوت، ئیـدی تاوڵەیەکـی تـرم بـۆ هێنایـت لـە سـتیلی یابانـی، تـۆ گووتـت هەرگیـز تاوڵـەی وات نەبینیـوە، زۆر دڵـت پێیخۆشـبوو، ئیتـر لەگـەڵ منـدا گوڕایـت و دڵـت چاک بـوو. دوایـی ئێمـە مافـوورە قەشـەنگەکانی تۆمـان کـڕی و ڕۆیشـتین، تۆ ناردتـەوە بـە دوامـدا و گووتـت گـەر ئیشـم هەبـوو پێتبڵێـم، مـن وەک کـوڕی تۆ وام و لـەو جـۆرە قسـانەی تـر کـە ئێـوە خۆتـان باشـتر دەیزانـن».

گەلاوێـژ خـان ئێسـتا هەمـوو شـتێکی بیردەکەوتـەوە. ئـەم کوڕە سـەرزلەی بیردەکەوتـەوە کـە سـاڵێک لەمەوبـەر کەمێـک لاوازتـر و قژپڕتـر دەینوانـد. عەتـار کـە دڵنیابـوو لـەوەی خانمـی نیـا دەیناسـێتەوە، گووتـی «بەڕێـز، سـاڵی پـار تـۆ ئـەو کچـەت پیشـانی منـدا کـە دادەنیشـێت و بـە خەیـاڵ گـوڵ و نیـگار و نەخشـی سـیحراوی سـەر فەرشـەکان دروسـتدەکات. بـە منتـان گـووت، جوانـی قاڵـی و مافـوورە ڕەنگینەکانـی ئێـوە دەگەڕێتـەوە بـۆ خەیاڵـی ئـەو کچـە. مـن بـۆ ئیشـێکی بچـوک و بـۆ ماوەیەکـی کـەم پێویسـتم بـە خەیاڵـی ئـەو خانمـە هەیـە، بـە کورتـی زۆر شـادومان دەبـم گـەر بەڕێزتـان ڕێگام بـدەن قسـە لەگـەڵ ئـەو کچـەدا بکـەم، چونکـە مـن عەوداڵـی یەکێکـم بۆ ماوەیەکـی کـەم ببێـت بـە مامۆسـتای خەیـاڵ».

پێدەچوو گەلاوێژخـان ئاسـان لـەم چیرۆکـی مامۆسـتای خەیاڵـە تێنەگات. دەبـوو عەتـار لـە نوکـەوە حیکایەتـی ئـەو کچـەی سـەیفەدین مـارۆ بگێڕێتەوە، باسـی ئـەوە بـکات مەسـەلەکە پەیوەنـدی بـە پاشـەڕۆژی کچـی بەرپرسـێکی بـاڵاوە هەیـە. وەک هەمـوو ئـەو کەسـانەی بـە جۆرێـک لـە قودسـییەتەوە نـاوی بەرپرسـە گەمـژەکان دەهێنـن، دەبایـە لـە کاتـی ناوهێنانـی سـەیفەدین مـارۆدا دەنگـی خـۆی بگۆڕیبایـە. بـەڵام شـتەکان وائاسـان نەبـوون، ئـەو کچـەی ئـەو باسـیدەکرد ترسـێکی زۆری لـە دەرکەوتـن هەبـوو، گەلاوێـژ باهیـر نەیدەتوانـی بڕیـاری وەهابـدات، وەڵامـی تـەواو و ڕاسـتەقینە دەبایـە لای

کچەکە خۆی بێت، بۆیە خانمی باهیر کاتێکی بۆ دانا سبەی بێت بۆ کارخانە و لەوێ ئەو خانمە ببینێت. دەبێت بڵێم ئەو کەسەی لە کارخانەی مافوور نیشیدەکرد و عەتار عەودالّی بوو تریفە یابەحری خۆمان بوو... ئاه ئازیزان سەیرتان لێ نەیەت، سەیرتان لێ نەیەت، هەر خۆی بوو... ئەو کچە باشەی بەئەسڵ و نەسەب وەچەزای یەکێک لە بنەماڵە خانەدانەکان بوو، بەڵام شتگەلێکی ئەوتۆ ترسناک روویاندا، تریفە یابەحری بەستەزمانیان فڕێدایە ئەو کارخانەیەوە. کورتەی حیکایەتەکە ئەوەیە لە دوای مردنی زاهیر یابەحری، شتەکان لە دەستی خانمی فەوزیە یاسەمی دەرچوون و جەوهەر یابەحری بووە دڕندەیەکی ئەوتۆ کە کەس نەیدەتوانی لەگەڵیدا بژی، ئیدی تریفە ماوەیەکی درێژ لە ماڵی جەوهەری برای هەڵهات و لەو کارخانە بچوکەی مافووردا دەژیا. گەر پەلەنەکەن و سەبرتان هەبێت کەمێکی تر تەواوی چیرۆکەکەتان بۆ دەگێڕمەوە... کەمێکی تر.

## نامەیەك بەر لە مردن
## « ئازاری ١٩٧٥»

بەڵام ئەی مەلا غەریبی هاجەر، چی بەسەرهات؟.

ئاه، مەلای هاجەر بەرلەوەی لە یەکێک لە خەستەخانەکانی شاری ورمێدا بمرێت، نامەیەکی دوورودرێژی، لەگەڵ کۆمەڵێک بەڵگەنامەی تردا دایە دەست کەسێک و تکای لێکرد بە هەر ڕێگایەک بووە بیگەیێنێتە دەست کوڕێک بە ناوی بەهمەن ناسرەوە. پێدەچوو مەلای هاجەر شەڕێکی دووردرێژی لەگەڵ مردندا کردبێت، تا ئەو نامەیە بەو دارشتنە بنوسێت کە خۆی دەیەوێت. دوای تەواوکردنی نامەکە، چەند سەعاتێک

لە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیەوە سەیری ئەو کۆترە غەمگینانەی کرد کە لەسەر درەختێک هەڵکورمابوون، دواجار بە بێدەنگی چاویلکەکەی داکەند و بە ئاسوودەییەکی ناوەخت و نائاساییەوە ڕۆحی بە فریشتەکان سپارد. مردنەکەی هاجەر دوای ئەو هەموو ڕێگا سەخت و درێژە، بۆ یار و یاوەرانی گەلێک تراژیدی و دڵتەزێن بوو، بەڵام بۆ مەلا خۆی کۆتایی گەشتێکی ترسناک و پشوویەکی درێژی دوای گەردەلوول بوو. ئەو ئاسیاوەی نامە و بەڵگەنامە نهێنییەکانی هەڵگرت، بە ڕێگایەکی درێژ و پێچاوپێچدا گەڕایەوە بۆ کۆنە هەواری مەلا، لە ڕێگای گەڕانەوەدا چەندەها جار بە کاری هێزێکی خەیاڵی لە شوێنی نیازی خۆی دووردەکەوتەوە و پێچی دەخوارد، ڕێگاکان بۆ سەر زەمینی تریان دەبرد و بە ئەرز و ئاسمانی خەیاڵیدا دەیانڕفاند. دوای سەفەرێکی سەخت و ماندووبوونێکی زۆر، گەیشتە ئەو شارە و ناونیشانی بەهمەن ناسری دۆزییەوە. وەک خۆی لە بارێکی ترسناک و ئەفسوناوی ڕزگاربکات، بێوچان و بێ ساتەوەختێک وەستان، ڕاسپاردەکەی برد بۆ بەهمەن کە لە حەوشی قوتابخانەی خۆیدا سەرقاڵی لەبەرکردنی شەڕە شیعرێکی «جەریر» و «فەرزدەق» بوو. کابرا بە هێمنی لە بەهمەنی لاواز و چاویلکەدار نزیکبووەوە و ئەو ڕاسپاردە پێچراوەیەی دایەدەستی و تکای لێکرد بە وردی بیخوێنێتەوە. بەهمەن بێئەوەی بزانێت چی لەو زەرفە پێچراوەیەدا هەیە وەریگرت و خستییە ناو جانتاکەیەوە و هیچی نەگووت. وەرگرتنی نامەکە کورتە ساتێکی کەمی برد و لە چاوتروکانێکدا تەواوبوو. شتەکان بەجۆرێک خێرا و بروسکەئاسابوون دواتر غەزەلنوس دڵنیانەبوو، ئاخۆ ئەو پەیامهێنەی نامەکەی دایە دەست بوونەوەرێکی ڕاستەقینەبوو یان خەیاڵی، نەیدەزانی ئەو دەور و تەسلیمە لە ڕاستیدا ڕوویداوە یان لە خەوندا. ساڵانێک دواتر چەندە ویستی ڕوخساری ئەو کابرایەی بێتەوە یاد کە لە حەوشی قوتابخانەدا نامەکەی لێوەرگرتبوو، بەڵام شتێکی یادنەمابوو... هیچ شتێک.

بەهمەن دەیزانی ڕۆژێک لە ڕۆژان لە جێگایەکی دوورەوە نامەیەکی بۆ دێت سەرتاپای ژیانی دەگۆڕێت. لەو ساتەوەی فامی کرابووەوە، هەموو شەوێک لە خەونەکانیدا پەیامبەرێکی خەیاڵی شتێکی لە دوورەوە بۆدەهێنا و دونیای ئەوی دەدا بەیەکدا. ئەو لەو جۆرە کەسانەبوو کە هەردەم چاوەڕوانی قاسید و پەیامهێنێکی خەیاڵین، بێت و ژیانیان بۆ بگۆڕێت. وەلێ لە نێو ئەو تەرز و شێوە خەڵکەدا غەزەلنوس لە ڕیزی ڕاستگۆکاندا بوو. هەندێک مرۆڤ هەن، هێندەی دێنە دونیاوە، چاوەڕوانی ئەوەن شتێکی کتوپڕ ڕووبدات و سەرلەبەر ژیانیان بگۆڕێت. زۆر کەس لەوانە دوای خولیایەکی پوچ دەکەون و نابنە خاوەنی هیچ شتێک و هەرگیزیش لە هیچ جێگایەکی دونیاوە هیچیان بۆ نایەت، ئەوانە لە چەشنە ڕاستگۆکەی ئەم توخمە لە ئادەمیزاد نین. تەنیا لەبەرئەوەی هیچ شتێکی دیان نییە خۆیانی پێوەسەرقاڵبکەن، چاو دەبڕنە نادیار و نمایشی چاوەڕوانی دەکەن. بەڵام چاوەڕوانکەرانی ڕاستەقینە، خاوەنی هەستێکی دوور و بۆنێکی زەمانبڕن. دەتوانن بۆنی ئەو سەردەمانەبکەن کە هێشتا نەهاتوون... بۆ پاداشتێک ناگەڕێن، عەوداڵی خەزنەیەکی زێڕین و خەڵاتێکی کوتوپڕ نین، بەڵکو دەزانن ئەوەی لە نادیارەوە دێت ڕیشەکانی لە ناو وجودی خۆیانەوە سەریهەڵداوە، ئەوان شێتی پاداشتێکی ناوەختی زەمان نیین کە کتوپڕ مەدالیایەکی گەورە بکاتە نەسیبیان، بەڵکو لە نادیاردا بۆ تەفسیرکردنی لایەنە تاریکەکانی خۆیان وێڵن و بۆ مانایەکی شاردراوەی ژیانیان عەوداڵن. غەزەلنوسیش یەکێک بوو لەو کەسانەی بێئەوەی هیچ بزانێت، پێیوابوو شتێکی نەزانراو و بێتەفسیر لە ژیانیدا هەیە کە ڕۆژێک قاسیدێک لە دوورەوە دێت و پێشچاوی بەرامبەر ئەو نهێنییانەڕۆشندەکاتەوە. نامەکەی مەلای هاجەریش ئەو بۆچوونانەی لا بەهێزتر و ئەستوورتر کرد. نامەکە چیرۆکی دووروودرێژی

ژیانی مەلا خۆی بوو، پڕبوو لە وردەکاری گەورە دەربارەی ڕابوردوو، سالآنی منداڵی و عاشقبوون و پیربوون. ئاشکرایە مەلای هاجەر هەموو حەرفێکی بە بڕوایەکی تەواوەوە نوسیوە، دوای دوودڵی ساڵەهای ساڵ لە ناخەوە گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی دەبێت هەموو شتێک بڵێت و هیچ شتێک نەشارێتەوە. لە دێر بەدێری نامەکەدا هەستێکی باوکانەی گەورە دەبینرێت، باس لەوەدەکات ئەو ڕۆژگارێک چ عاشقێک و چ غەزەلبازێکی گەورەبووە، بۆنێکی گەشی مردن و ڕەنگێکی تایبەت بە ئیشراقاتی کۆتایی لە هەموو برگەکانی نامەکە دەبارێن. پێدەچێت مەلای هاجەر کێشەیەکی زۆری هەبووبێت خۆی بگەێنێتە مەبەستی حیکایەتەکە و دوا قسەی خۆی بکات. هەڵبەت ئاشکرایە لە هەندێ شوێندا، ترسی مەلا، ترسی کەسێکە دەیەوێت کوڕەکەی خۆی بریندارنەکات، تا بتوانێت ئارام و بێهەڵا نهێنییەکی بۆ ئاشکرابکات کە لەوانەیە سەر لە بەری ژیانی بگۆڕێت و بیکاتە مرۆڤێکی دیکە.

زمانی مەلای هاجەر زمانی کەسێکە لە سی و چلەکانی سەدەی پێشوودا دڵی بە وشە شادبووە و لە نهێنی بەلاغەت ڕاماوە، ئیدی هەر بە بەلاغەتی ئەو زەمانە نامەیەکی پڕ لە وشەی عەرەبی دەنوسێت، کە تا ئەندازەیەک بۆ کوردپەروەرێکی سەختگیری وەک ئەو سەیر و ناکۆک دەکەوێتەوە. لە جێگایەکدا دەڵێت « سەختە بۆ پیرێکی وەک من کە قەدەمێک لە قەبر و نەفەسێ لە مردنەوە دوورم یاری بە حەیاتی کەس بکەم، بەڵام سەختیشە ئەم دونیای فانییە جێبهێڵم و تۆ بە من نەزانیت. دواجار من زیاتر لەوەی باوک بم، تارماییەکم دێم و ڕاستییەکت پێدەڵێم. ڕاستییە گەورەکانیش لە خەیاڵەوە نزیکن، ئەوە ئیحساس و تەجروبەی پیرێکی وەک منە، خەڵک تەنیا ڕووکەش و سەتحی ئەم عالەمە دەبینن، جیهان وەک حەقیقەتێکی گەورە ناناسن، ڕووکاری ئەم عالەمە ئاڵۆزە بە حەقیقەت تێدەگەن، بەڵام ئینسان ئاوێنەیەکی شکاوە

لەتێکی دەپەڕێتە ئەم حەیاتە، بەڵام لەتەکانی تری لە کوێن؟ لە چ عالەمێکدان؟ هەر خودا و فریشتەکانی دەزانن».

مەلای هاجەر، ڕێگایەکی پێچاوپێچ دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی لە بەهمەن ناسر و چیرۆکی لەدایکبوونی نزیک ببێتەوە و دەنوسێت « بەهمەنی عەزیزمان، من تا ئەمرۆم ڕاکێشاوە، ئێستا لە بەینی مردن و ژیاندا وەستاوم... لەحزەیەکی ئەستەم دەژیم و هێندەم نەماوە وەک هەر عەبدێکی بێقودرەت خوداحافیزی بکەم، دونیا بڕستی لێبڕیوم و غەم تاقەتی لێسەندوم، چەند ساڵێکە پیری لە گۆشت و ئێسقانم دەخوات و گەیشتۆتە ئاخرین تیکەی خۆی. ڕۆحم پەڕپوت و پوچ بووە، جەستەم هیلاک و ئارەزووم فەوتاوە. سرێک هەیە دەبێت تۆ بیزانیت، نهێنییەک لە ئەسراری مەرگ قووڵتر و لە تەلیسمی حەیات بێبنترە. شتێکە تۆ دەتوانی ئیمانی پێبهێنیت و دەشتوانیت بە وڕێنەی پیرێکی حیساب بکەیت کە لە بیمارستانی وڵاتێکی غەریبدا سەردەنێتەوە. شتێک هەیە بە درێژایی حەیاتم ئازاریداوم. ئێستا تۆ بەشی ئەوە گەورەبوویت تێبگەیت، بەر لە ئێستا هەر نوتقێکم بدایە دەبووە هەوا و هەر حەرفێکم بنوسیایە دەبووە هیچ... چونکە فەقەت ڕۆحلەبەرێک لەم حیکایەتە حاڵیدەبێت، کە لە عەشق تێبگات، مەعناکەی بفامێت. بەس خواش دەزانێت، ئاخۆ ئێستا تۆ لە عەشق تێدەگەیت یان نا؟. بەس خوا دەزانێت... خوا. من کە واجبێکی وا سەخت و ئەرکێکی وا عەجیب بەسەر دڵێکی تازە پشکوتووی وەک دڵی تۆیا دەدەم، ئاخۆ خۆم لە عەشق تێگەیوم؟ ئاخۆ ئادەمییەک و ئادەمزایەک هەیە لە عەشق تێگەیبێت؟ یاخو ئەوەش سرێکە لە ئەسراری ئیلاهی، قودسێکە لە ئەقداسی گەورە و جەلابوونی بە من و تۆ نامومکینە؟. بەهمەنی عەزیزمان... هەژدە ساڵ لەمەوبەر... هەژدە ساڵ لەمەوبەر لە شەوێکی ساف و ساماڵدا، سەرگەرمی نیگاکردن بووم لە بەحری ئەستێرە،

لە ناکاو گەنجێک کە بە نیگار و ڕوخسار لەو ڕەسمانە دەچوو کە نەقاشە کۆنەکان لەسەر بەرگی کتێبی شا و شازادەکان دەیکێشن، هاتە ژوورەکەم. گەنجێکی سەیر، هەر غەزەلێک من لەبەرم بوو، ئەویش لەبەری بوو، هەر شیعرێک من نوسیبووم ئەو چاکتر و باشتر دەیوتەوە، لە ئەوزانی شیعرا دەقیق و لە قافییەدا جووت و مکۆبوو، وەک بەشێ لە من خۆی بە من ناساند، وەک سێبەرێکی من و نیوەیەکی تری من خۆی نوان، وەک هەر گەنجێکی جوان لەخۆبایی و بێڕەحم بوو، بە منی گووت من نیوەکەی تری تۆم، ئەو نیوەیەی لە سەردابێکی تاریک و ترسناکدا دیلتکردوم. من نیوە خنکاو و بەدبەختەکەی تۆم. منیش باوەڕم پێکرد.

نازانم دڵی خۆمت چۆن بۆبکەمەوە، ئێمە وا خولقاوین هەر دەستمان بۆ عەشق برد شتێک دەشکێنین. بۆیە سەرت نەسوڕمێ، عاجباتی داتنەگرێ گەر لەم ئانوساتی دەور و تەسلیمەدا دەستی لەرزۆک و نەفەسی شکستەم، لەحوکمی ئەم دەردە نەیەن و شتی تر بشکێنن. کوڕی خۆم، ئەم سرەی من بە تۆی دەڵێم، هەژدە ساڵە وەک شوشەیەکی پڕ ئەسرار خستومەتە پشت دەیان شوشەی ترەوە و لەسەر ڕەفێکی بڵند خەواندومە. زۆر لۆمەم مەکە و عەیبم لێمەگرە، مەڵێ ئەم پیرە دڵپرە، چ حەیایەکی شڕ و چ ناموسێکی بەربادی هەیە. ئیحساسم وایە ئەو کەسانەی تا سەرەمەرگ ڕاستی ناڵێن، ترسنۆکن، بەڵام هێشتا لەوانە ئازاترن کە دەمرن و نهێنی خۆیان دەبەنە گۆڕەوە. وەک پیرێکی لەرزۆک، ئێستا دەبێت بە سەر پەیژەیەکی شکاودا سەرکەوم، کە پەیژەی ڕاڕایی و ترسنۆکی خۆمە، لەسەر ئەو ڕەفە بەرزە، کە ڕەفەی خەوف و سامی حەفتا ساڵەی عومری بەباچوومە، بەم پەنجە چرچەلۆک و بۆ ڕزین شەیدایانەم، شوشە لادەم و یەک یەک لەو حەوایەوە توڕیاندەم، شت بشکێنم و شت بشکێنم و شت بشکێنم.

ئینسان لە لەحزەی مەرگدا دەبێت سندوقی ئەسراری خۆی بکاتەوە، تا دواتر باش لە حوکمی ئیلاهی تێبگات. لە ساتی دەوروتەسلیمدا ئینسان دەبێت جورئەتی ڕوانینی لە زوڵمەتی نەفسی خۆی هەبێ، گەر وانەکا، ئەی لەسەرچی لەگەڵ واحیدولقەهارا قسەبکا؟. من ئێستا دەبێت نەزەرم تیژکەم و دەفتەری نهێنی خۆم داگرم و نامەی ڕەشی خۆم بکەمەوە. ئەو گەنجە هەر من بووم، من کە شەیدای ئافرەتێکی شەرمن و نەجیب و پڕحەیا بووبووم، هیچ کەس لە پیاوێک بەدبەختتر نییە کە حەز لە ژنێکی بەحەیا و حورمەت بکات، من کە مردم وەک میرولەیەکی تەڕ و نەخۆش غیرەت دەدەمە قەلب و قالبی شکاوم و بە سەیدی مەخلوقات دەڵێم کەس لەو عاشقە سیاچارەتر نییە کە خودا دەیخاتە بەر لەعنەتی حەزکردن لە ژنێکی شەرمن و ناموسباز. من لە ساڵانێکدا کە تەمەنم بەرەو ماڵاوایی دەکشا و نیازم بوو تاعەتم توندکەم و ئیمانم قایمتر قفڵدەم، لەو عومرەدا باری تەعالا و فەخری کائینات، دەردێکی بۆ ناردم ئێستاش لە ڕیشەوە چزەم دێ و لە هەناوەوە دود و گڕاوە دەپژنگێ و قوڵپ دەدات. ڕۆژێک لە خەو هەستام و سەیرمکرد عاشقم، عاشقی خانمێکی بە حورمەت و ناموسناس، کە ناوی بەهاربانو بوو، کە دایکی خودالێخۆشبووی ئێوەدەکات، ئەمشەو گۆڕی لە هەر شەو پڕ نورتر بێ. عەشق شەرەفی نییە، تەنها شتێک کە لەسەرو شەرەفەوەیە عەشقە. تاکە شتێکە شەیتان و خودا بەقەد یەک ئیشیان تیاکردوە... بە کوفر لێمی وەرمەگرە و بە ئیلحادی نەفسێکی بێچارە لێی مەڕوانە. عەشق شتێکە کوڕم، دوو دەموچاوی هەیە، دەموچاوێکیان شەیتان بەدڵ دروستیکردوە، هێزی خۆی تیا خەسارکردوە، فنونی ڕەشی خۆی تیابەکارهێناوە، سیحری خۆی خستۆتە ناوی. ئەوی تریان خوا بە عەزەمەتی خۆی تاشیوێتی، پێوەی ماندووبووە، سڕی خۆی تیادانـاوە، پاک و تەهوور خولقاندوێتی. هەموو

عەشقی دونیا وایە، نە خوا دەستبەرداری زەڕەیەک عەشق دەبێت و نە شەیتانیش دەستدەگێڕێتەوە، هەموو قەترەیەک عەشق نیوەی موڵکی خودایە و نیوەی موڵکی شەیتان. ئایەمی بەدبەختیش کە دەیخواتەوە نازانێت ژەهری هەڵقوڕاندوە یان شەربەتێکی ئیلاهی نۆشیوە... وەک پیرەمێردێکی بێحورمەت تەماشام مەکە، کە دەستی دەلەرزێت و نەفسی هەر پڕە لە تەماحی دونیا، من قەت عەبدی نەفس نەبووم، بەڵام ئەوەی زۆر دەرگای نەفس داخات، شتێکی تر و سڕێکی تر دێتە ڕێگای. نەفس سەڵتەنەتی خۆی هەیە، مەخلوقاتی خۆی و خەلقی خۆی هەیە. ئەوەی من هەموو عومرم لە دوای کوشتنی بووم، لەسەردابی ڕەشی خۆی لە شێوەی ئادەمییەک و گەنجێکی سیحربازدا هاتەدەرێ، کەسێک هەم حەقیقەت بوو هەم خەیاڵ، هەم من بووم و منیش نەبووم. بەڵێ کوڕم، تۆش... بەڵێ تۆش هەم لەو بوویت و لەو نەبوویت».

مەلای هاجەر، لە چەندین بڕگەی تێکەڵاو و دووروودرێژدا، دەیەوێت حیکایەتی دەرکەوتنی ئەو گەنجە شاعیر و غەزەلنوسە لە ڕۆحی خۆیەوە تەفسیربکات، بە دوودڵییەکی زۆرەوە، چەندین لاپەڕە دەربارەی ئەو ئەزموونە سەیر و ئیرۆتیکییە دەنوسێت کە نوسخەیەکی خەیاڵی بەهاربانو بە نیوەیەکی خەیاڵی مەلای هاجەرەوە دەبەستێتەوە. بە لەزەتێکەوە کە دەبایە لە پیرەمێردێکی نیوەمردووی وەک ئەو دووربایە، بە ئارەزوویەکەوە کە بۆنی ڕۆحی ئەو پیاوە داخراوەی لێنایەت کە عومرێکی شەرمنی لە بۆتەی حەیادا بردۆتەسەر، چەندین لاپەڕە لە سەر ئەو شەوە خەیاڵی و ئیرۆسییانە دەنوسێت کە دوو لەشی تینوو و دوو ڕۆحی کێوی تێیدا دەگەنە یەک. هەندێجار داوای پۆزشدەکات و هەندێجاریش تەواو بیریدەچێتەوە کە ئەو قسە لە دایکی بەهمەن دەکات. ئەوە فەرامۆشدەکات کە قسەوباسی ئەو دەربارەی ژنێکە، بەهمەن وەک

مەخلوقێکی پاک و بێئارەزوو سەیریکردوە. مەلا لە هیچ جێگایەکدا ئاماژە بە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان خۆی و بەهاربانودا نادات. کەسێکە بە خەیاڵ ژیاوە، بە خەیاڵ عاشقبووە، بە خەیاڵ لەگەڵ بەهاربانودا خەوتووە. حیکایەتێکە پیاوان و ژنانی ئەم وڵاتە پتر لە هەزار ساڵە تێیدا دەژین، هەزار ساڵە پیاوان و ژنانی ئەم مەملەکەتە تەنیا بە خەیاڵ لەگەڵ یەکدا دەنوون، لە دوورەوە حەز لە یەکتری دەکەن، بە نهێنی عاشق دەبن، وەک ڕاوکەر و ئاهو خۆیان لە یەکدی ئاشکراناکەن، نایانەوێت ئەمیان بە نهێنی دڵی ئەو بزانێت. سەدە لە دوای سەدەیە خەیاڵی خنکاو لە کوچە و شەقام و ژوور و هەیوانی ئەم مەملەکەتەدا کۆدەبێتەوە، سەدە لە دوای سەدەیە ئەو خۆگرتن و دڵخنکاندنە دەبێتە زانستێکی نهێنی قووڵ کە حەکیم و زانای خۆی دروستدەکات، سەدە لە دوای سەدە کۆڵانەکانی ئێمە دەبێتە سەحنەی خەیاڵ، سەر بەرماڵ و بەر میحرابەکانی ئەم نیشتیمانە دەبێتە شانۆی ئاه و هەناسەی ئەوتۆ کە پاڵەوانی تراژیدیا یۆنانییەکان و خوداکانی ئۆلۆمپ نەیانبینیوە. پێدەچێت ئەو هەموو خەیاڵە بەشێکی زۆری لە نەفسی تاریکی مەلا هاجەردا کۆبووبێتەوە، لە بنی بێقەرار و لە سەردابی قفڵدراوی دڵی ئەودا مۆڵبووبێت، پیاوێک ئەوپەڕی شەرم تێکەڵاوی ئەوپەڕی ئارەزوو دەکات، ئەوپەڕی دین تێکەڵاوی ئەوپەڕی شیعر دەکات، سەرپەڕترین ملکەچی بۆ مەرجەکانی دونیا، تێکەڵاوی سەرپەڕترین خەیاڵ دەکات. پێدەچێت ئەو دژایەتییە قووڵە، ئەو دووکەرتبوونە بێسنوورە بە جۆرێک لە ناوەوە مەلای هاجەریان لەتکردبێت، ڕۆحی مەلای هاجەر، وەک ڕۆحی ئەو سەردەمە، لە نێوان دوو مەخلوقدا دابەشبووبێت، یەکێکیان سەختگیر و خۆخنکێن، ئەویتریان ئازاد و بێشەرم و پڕ شیعر. یەکێکیان لەم دونیایەدا چەقیوە، گوێگری فرمایشت و مەرجەکانێتی، ئەویتریان لە دونیایەکی خەیاڵییەوە هاتووە، گوێگری هیچ فەرمانێک نییە. مەلای

هاجەر بە بەلاغەتێکی کلاسیکییەوە دەنوسێت « ئادەمیزاد تێکەڵاوێکی سەیرە لە مەخلوقاتی جیاواز، لە ناوەوە هەم وەحشە و هەم پەریزاد… من نە وەحشبووم و نە پەریزاد، من هیچیان نەبووم، بەڵام هەزاران شەوگارم لێرۆیوە کە تەنیا خەیاڵمکردوە، خەیاڵ کە خودا سزای لەسەر دانەناوە و ئادەمییەکانی تر نایبینن. لە گەنجی و سەباوە بە درێژایی ڕۆژ خۆم وەک زاهید و دەروێشێکی خودایی نیشاندەدا، تا دەخزامە ژێر جێگا جگە لە زیکری "یاخودا… یاخودا" هیچی دی لە دڵمدا نەبوو، بەڵام کە سەرم دەنایە سەر بالێفەکەم و دڵنیادەبووم عالەم نوستوە و خزم و کەس، ئەحباب و ئەغیار چاویان لە من نییە، هێندەی سکون دادەکەوت و خشپە و چرپەی کائینات دەبرا، شەبەقێکی تاریک لە هەناوی مندا دەکرایەوە، سەحنەیەکی تر دەهاتە سەرێ و ڕۆحم دەبووە مەسرەحی شتێکی تر. هەرچی نەفسێک بەڕۆژ دەمخنکاند، هەر تەماح و ئارەزوویەک بە ڕۆژ بێدەنگمدەکرد، لە شەکلی مەخلوقاتی عەجایەبدا دەهاتنەوە سەرێ، ئیحساسێکی سەیرم هەبوو کە قوەتێکی خیفی من بەرەو ئەرز و ئاسمانێکی تر جەزبدەکا، دەمبا بۆ شوێنێکی تر، لەوێ شتی سەیر دەبینم، حۆری و غیلمانی ڕووت، ئافرەت کە لە خەیاڵی بەشەردا نیین، خوان و خواردن کە خودا بەس لە جەنەتدا وەعدی بە بەشەرداوە، لەو کوچە تاریک و خفییانەدا، هەر ئاوێنەیەکم دەبینی لەویادا ڕوخسارم دەگۆڕا، جار دوای جار شکڵ و شەمایلی ترم وەردەگرت. وەک ئەوەی مەخلوقێکی موخەیەربم و خودا ئەو نازەی دابێتمێ بۆ شەکلی خۆم بگەڕێم. ئاە، خەیاڵم تا ئەو جێگایە دەیبردم، لە نێوان ڕوخساری ئادەمییەکاندا دەمتوانی ئەو هەیئەتە بگرم کە خۆم دەمەوێت. ئەو دەموچاوە بکەمە سەرم کە تەماحم لێیبوو. لەو شەوانەدا من بووم بە ساحێبی دیوانێکی غەزەلیات. وەقتێ جورئەتمکرد و قەسیدەکانم چاپکرد، کەس لەو باوەڕەدا نەبوو ئەم گەنجە شەرمن

و ڕوو لە خودایە، كتێبێكی وەها بنوسێت، كە خاڵی نەبوو لە سێبەری كوفر و لە نەغمەی فجور. ئەوە مەحسوڵی زوڵومات و تاریكی بوو، مەحسوڵی ژیانێكی تر بوو كە من بە خفییە تیادەژیام. بەڵام من هەر زوو هاتمەدەست و حاشامكرد ئەوە كتێبی من بێت، لە هیچ جێگایەک خۆم دەرنەخست و لە هیچ مەجلیسێكدا خۆم نەنواند، لە قووڵایی قەلب و لە نیهانی بەدەنا، ئیحساسم بوو ئەوە من نیم ئەو شیعرانەم نوسیوە، من نیم كە شەوان لە بەحری غەزەلدا نوقمدەبم. لە نێوان من و ئەو سەحنە سەیرانەدا كە لە دونیایەكی تردا ڕوویاندەدا تۆرانێک دروستبوو. منێک كە لەتێكم لە عالەمێک و لەتەكی ترم لە عالەمێكی تردا مەلەیدەكرد، بووم بە ئەسیری شەڕێک نەمدەزانی خۆم سەر بە كوێم و لە چ جەبهەیەكدا وەستاوم. عومرێک ئارەزوو دەیهێنام و شەرم دەیبردم، حەیا دەیگوشیم و خەیاڵ دەیفڕاندم، ناموس دەیخستمەوە سجنی بەدەنی خۆم و ئارەزوو وەک شێتێكی وەحشی بۆ خۆی جەزبیدەكردم. ڕۆژها دوای ڕۆژها و شەوها دوای شەوها زیاتر لەتدەبووم... بەڵام كێ هەیە لە ئێمە لەت نەبێت، كێ هەیە؟ كامە مرۆڤ لە ناوەوە بوونێكی دووفاق و ڕۆحێكی چەند سەری نییە، بابێت و بەردەبارانم بكات. ئێمە هەموومان مەخلوقی دوو دیوین، زۆرمان تەنیا یەک دیوی خۆمان دەبینین، چونكە جورئەت ناكەین لە ئاوێنەدا سەیری دەموچاوەكەی ترمان بكەین. شەوێک ئەو مەخلوقەی تری من هاتەدەرێ و بێحەیا و بێسڵ خۆی پێناساندم. وتی من هەر خۆتم، هەر خۆتم و هیچی تر. مەغرور و بادیهەوا و فیزن بوو، جوان بوو، بەڵام جوانی و جەمالی بۆنێكی تریان هەبوو. ئێستاش تێدەفكرم و دەڵێم بۆ نەمكوشت؟ بۆ نەمكوشت؟ خۆ ئەوە قەتل نییە و نابێتە جورم، ئیدی بۆ نەمكوشت؟. هەموو بەشەر، هەموو ئادەمییەكانی تر بە لەحزەو ساتی وادا عبوریانكردوە و بێئەوەی دوودڵبن، ئەو بوونەوەرە دەكوژن

و ئیحساسی ناڕەحەتی ناکەن، هەر کەس و دەمامکە پیری خۆی دەکاتەوە سەری و دەڕوات و پاش ئێستێک یادیشی نامێنێت. بەڵام من مەلا غەریبی هاجەر، کە ئێستا چەند قەدەمێک لە مردنەوە دوورم، دان بەو هەقەدا دەنێم و دەڵێم، من نەمتوانی ئەوە بکوژم کە خەڵکانی تر دەیکوژن. شتێکە کوشتنی هەقە، نەکوشتنی زنوبی پێوەیە و کەبائیر دەهێنێت. نازانم بەڵام خاترجەمم کە شەوگەلی بێحیساب و زۆرم هەبوو، کە من تێیدا خەنجەرداربووم و سیلاح بەدەست، دەمتوانی ئێستێبکەم و خەنجەر هەڵکێشم، سیلاح لە بەینی من و ئەو تارمایییە مەلعونەدا ڕاگرم. دەمتوانی دوای فجوری ئەو نەکەوم، بەڵام درۆدەکەم، جازیبە و سیحری لەوە قەویتر بوو لە فیکری شتی وادابم. وەک ئەوەی تینێکی لاموتەناهی هەبێت، بە میسلی ئەوەی شەپۆلانی بەحرێکی پڕ ئەسرار بێت منی دەبرد، زۆرجار نەدەستم ئیشیدەکرد و نەدەمم، کە دەهاتمەوە هۆش و لە حیسابی خەتورەتی خەیاڵی دەگەیشتم، نە جەلدی من و نە عەسای من سوودیان نەبوو. هەر دارێکم لەو دەدا، کسپەیەک لە هەناوی خۆم دەهات. هەر قامچییەکم لەو بێناموسە دەسرەواند، قامچییم لە ڕۆحی خۆم و بەدەنی خۆم دەسرەواند. ئێستا چەند بمەوێت بۆتی تەفسیربکەم، تەفسیری نییە، بەڵام تەئریخی بەشەریش، تەئریخی ئەو تارمایی و ئەشباحانەیە کە لە خەیاڵی ئینسان ڕایانکردوە، من سوێندت بۆدەخۆم کە لە عیقابی بێوچانی خۆمدا، درێغم نەکردوە. بەڵام دڵم بە جۆرێ ئارەزووی دایکی سیحرباز و بەرێزتانی دەکرد، گەر ئارەزووی ویساڵم لە قیامەتیشدا هاتۆتەدی دەبایە حاسڵیکەم. من بە هەموو زەڕەیەکی وجودم حەزم لێیبوو، حەزی لەو جۆرەش سەر بە لامەکان و لازەمانە. کە شەوێکی مانگەشەو ئەو گەنجە غەزەلگۆیە هات، لە ناخی شەوەکانی منەوە دەردەچوو، ئەو سیما و هەیئەتەی هەبوو کە دەشیا گەر موخەیەریم، من بۆ خۆمم هەڵاوێردایە. لە شەکڵێکی دڵخواهی من

دەچوو کە زۆر لەسەر سەحنەکانی شەو هەڵمبژاردبوو، فجوری ئەو بەشێک بوو لە فجوری پەنهانی ناو وجودی خۆم. کە شەوێک لەگەڵ نیوەیەکی خەیاڵی تری دایکی نەجیبتاندا دەرکەوت، من هەموو دونیام لێتێکچوو، بەر جۆرە دیوارێک کەوتم لە تاقەتی عەقڵی من و لە قودرەتی هۆشی من گەورەتربوو، ئیتر ئیمانم کەوتە خەتەر و دینم هاتە زەلزەلە. نەمدەزانی چیبکەم، سیحری ئەو هەموو شادییەی ویساڵ گێژیکردم و ترسی ئەو هەموو فجورەش لە توانای بەدەنم گەورەتر بوو. بەسەرێک لە بەهەشتابووم و بەسەرێک لە جەهەنەمدا، وەک دەڵێن غەریقی ئاو و ئاور بووم. تۆ لەو شەوانە دروستبوویت. ڕاستە تۆ لە ڕەحمێکی ڕاستەقینەی، دایکێکی ڕاستەقینە و وەک مەخلوقێکی خودا کردی تەواو لەدایکبوویت، لە هەفتەیەکدا هاتیتە دونیا، بەڕێکەوت هەفتەی لەدایکبوونی منداڵانی ناکامڵ و نوقستان بوو. بەڵام هیچ کەس نەیدەزانی تۆ منداڵێکی ڕاستەقینە نیت. تۆ کوڕی خەیاڵیت، منداڵی شەوە خەیاڵییەکانی منیت لەگەڵ بەهاریانودا، گەر تۆ کوڕی من نیت، چ شتێک تەفسیری ئەو غەزەلە دەکات کە لە منداڵیدا لەسەر سینەت نوسرابوو، لەسەر پێست و گۆشتی تۆ هەڵکەنرابوو؟

ئەی تیفلی ڕۆژ، تۆ بەرهەمی ئەنغامی شەوی
بەرهەمی ئەسراری من و بەرهەمی ئەسراری ئەوی
تۆ ناتیجی عەشقی، نە ڕکوع بە و نە سجود
بەرهەمی ئەسراری خەیاڵیت، بەرهەمی ئەلغازی وجود

ئەمە ئەو دێڕانەبوو کە غەیری من بەشەرێکی تر نایزانێت و لە مانای تێناگات، ئەو بەیتە کافرانەیەبوو کە ئەو گەنجە غەزەلگۆیە، شەوان دوای مەستی دەیوت. هەمان ئەو بەیتانەیە کاتێک لە جیماع

تێردەبوو ئیلقایدەکرد. ئەو مەلایەی تۆی ناونا، عالمێکی دین بوو، دۆستم بوو، پێکەوە لەسەر سوئالاتی ئیمان و مەکامینی شەرع جەنگ و جەدەلمان بوو. پیاوێکی حافیزو لئەسرار بوو، شتێک لە عەزاباتی دڵی منی دەزانی، قەسەممدا کە نهێنی ئەو شیعرەم بۆ بێنێ و ئەو بەیتەم بۆ تەدوینکات کە لەسەر گۆشتی نازکی تۆبوو. ئەو شیفرەشکێنێکی شارەزا و موفەککل ئەسرار بوو، ئەو نەبایە کەس تەلیسمی ئەو بەیتە و قافیەی ئەو سڕەی بۆ نەدەخوێنرایەوە. من ڕۆژێک تا ئێوارێ لەسەر پشکۆ دەسووتام، لەبەینی ئاگر و فرمێسکدا جولانێم بوو، کە بەو بەیتەوە هاتەوە بۆلام، من واوەیلام بوو. ئەو حایربوو لە ئەشکم و مەدهۆش بوو لە فیغانم، ئەو هێندەی دێڕی یەکەمی وت، من تەواوی بەیتەکانم بۆ ئیلقاکرد، بە غەم و کەرەبێکی زۆرەوە خوداحافیزیکرد و لە هیچ حاڵی نەبوو. کێ دەیتوانی تێبگات... کێ؟. تۆ کوڕی من بوویت، شاهیدیشم ئەو دێڕەیە کە لە خوێن و گۆشتی تۆدا غەرقبوو. من باوکی تۆم... باوکێکی خەیاڵی، تۆش کوڕی منیت، کوڕێکی خەیاڵی».

بەو چەشنە نامەکە دەڕوات و دوای چەندین حیکایەت کۆتایی پێدێت. نامەیەکی درێژە کە نوسینەوەی هەموو بەشەکانی لێرەدا نەشیاو و نەکردەیە، بەڵام دەبایە ئێوە هەندێک بڕگەی ببینن تا لە نزیکەوە لە تەواوی چیرۆکەکە ئاگاداربن. ئەو نامەیە ژیانی بەهمەن ناسر لە بنەوە هەڵدەتەکێنێت. ئاڕاستەی ڕوانین و جۆری تەماشاکردنی بۆ خۆی دەگۆڕێت، ئیدی بەهمەن ناسر دەبێتە مرۆڤێکی تر... لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ماوەیەکی دەوێت تا ببێتە خاوەنی نازناوی غەزەلنوس، کە ئەویش چیرۆکێکی تایبەتییە و لە هەلومەرجێکی دیکەدا دێتە پێش.

# تریفە یابەحری و مافوورەکان
# «ساڵی ١٩٨٦- ١٩٨٧»

دوای مردنی زاهیر یابەحری گەلێک ڕووداوی ناخۆش ڕوویاندا، کە تریفەیان ناچارکرد ماڵ بەجێبهێڵێت و ڕووبکاتە ئەو کارخانە چکۆلانەیەی مافوور. دوای مردنی سەمیرەی دایکی، قاتی سەرەوەی باڵەخانەی یابەحرییەکان چۆڵ بوو، دەبایە تریفەش خۆی بۆ تاقیکردنەوەی سەختی بەکەلۆری ئامادەبکات. ئەو بە ڕێنمایی فەوزیە یاسەمی گواستییەوە بۆ نهۆمی دووەم، تا لەوێدا بێقرە و دوور لە هەرا و هوریای جەوهەر خەیاڵ بخاتە سەر خوێندنەکەی. تا زاهیر یابەحری مابوو، هێزێک هەبوو جەوهەر حیسابی بۆبکات و لێیبترسێت، بەڵام شەوێک کە تەرمەکەی زاهیریان لە خەستەخانەوە هێنایەوە، یاساکانی یارییەکە سەر لەبەر گۆڕان، ئیدی هیچ شتێک نەبوو ئەو جانەوەرە ڕابگرێت کە مردنی باوکی کردبووی بە فەرماندار و داربەدەستی ماڵ.

دوای ئاشکرابوونی وەسیتەکەی زاهیر یابەحری، جەوهەری سورفل بە چاوەشێت و نیگا شەیتانییەکانییەوە، کە ئەوکات گەنجێکی شەهوەتباز و داوێن پیسی لێدەرچووبوو، وەک دێوانەیەکی بەرەڵای لێهات. جووتێک برۆی زەرد و ئەستووری هەبوو، باڵایەکی بەرز و گۆشتێکی پتەوی ماسولکەدار، خیزە و مرخەمرخی سنگی، ئاژەڵێکی شێتیان بیر مرۆڤ دەهێنایەوە کە لە دەشتێکی بەریندا لە دەست هەندێک ڕاوکەر هەڵبێت. هەواڵی وەسێتنامەکەی باوکی وەک تەورێکی تیژ بەر ڕۆحی کەوتبوو، گەر گوێزانێکی تیژیان بە دڵیدا بهێنایە هەر هێندە زامدار و هەر هێندەش خوێندەڵێن دەردەکەوت. فەوزیە یاسەمی لە زووەوە ئاگاداری نیهادی پڕ خراپەی کوڕەکەی بوو، بەڵام لەو باوەڕدا نەبوو ڕۆژێک

ئاوەها ببێتە گایەک بە هەموو هێزی خۆی، شۆق بە دیواری بەردین و بەربەستی ئاسنیندا بکێشێت، ببێتە بەرازێکی ئەوتۆ حورمەتی هیچ شتێکی مرۆڤانە نەگرێت. فەوزیە سالانێکی دووردرێژ زەجری نۆری بەدەست زاهیر یابەحرییەوە کێشابوو، تورەبوونە ناکاوەکانی ئەو مێردە بێمەزاج و کەم تاقەتە تووشی جۆرە غەمۆکییەکی قووڵیان کردبوو، لە ژنێکی پڕ ئیمانەوە کردبوویانە خانمێک باوەڕی بە هیچ نەبوو، ساڵ دوای ساڵ بڕوای بە خۆی کەمتر و کەمتر دەبووەوە، بە جۆرێک حەزی نەدەکرد چیتر تەماشای ڕوخساری خۆی بکات، کە ئێستا لەبری جوانییەکەی جاران، پەژارەیەکی بێبنی تیادەبینی. چیتر ئەو فەوزیە شۆخە نەبوو کە دونیا شیفتەی جوانی و ویقاری بوو، ئێستا خانمێک بوو غەم ڕۆژ دوای ڕۆژ دەیڕوخان و شەو دوای شەو تووشی بێخەوییەکی هەمیشەیی دەکرد، دوای مردنی مێردەکەی شتەکان خراپتر تێپەڕین و ڕووداوەکان خێراتر ڕوویان لە کارەسات کرد. هەفتەیەک دوای مردنی زاهیری مێردی، سەربوردی ئەوتۆ غەمبار هاتنە پێشێ و ڕووداوی ئەوتۆ سامناک ڕوویاندا، خانمی یاسەمی دڵنیابوو خێرێک لەو کوڕەش نابینێت، کە نازی تاقانەیی و سامان و موڵک شێتیانکردبوو. جەوهەر یا بەحری نەدەچووە عەقڵییەوە سێ یەکی ماڵ و سامانی باوکی بۆ ئەو کچە ڕەشتاڵە چکۆلانەیە بچێت، کە هەردەم هیچ و ناچیز تەماشایکردبوو. هیچ کات باوەڕی نەکردبوو ئەوە خوشکی خۆی بێت. وەک هەموو یابەحرییەکان بە گومانەوە سەیری ئافرەتی دەکرد، وەک مەخلوقێکی کرمئاسا و بێبەها کە شایستەی بەزەیی و ڕەحمەت نین. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو دڕی و سیفاتە ئاژەڵئاسایانەی جەوهەردا، گەر تریفە ئاوەها ڕێک و ڕاست بە ڕوویدا نەتاقابایەتەوە و بێ هیچ شەرم و پەرێزێک پێی نەگووتبایە « من خوشکی تۆ نیم، هیچی تۆ نیم، من کچی سەمیرە یابەحریم و لە دایک و بابی تۆ نەبووم» لەوانەبوو

شتەکان سادەتر بەڕێدا بچوونایە. سەمیرە یابەحری ماوەیەکی کورت بەر لە مردنی هەموو شتێکی بۆ کچەکەی باسکردبوو. فەوزیەی فریشتە و ڕووپاک زۆر هەوڵیدابوو ڕایگرێت و پەشیمانیبکاتەوە، بەڵام پێدەچێت شەهوەتی درکاندنی حەقیقەت لای مرۆڤەکان بەر لە مردن تین و تاوێکی تر بە خۆیەوە ببینێت. ماوەیەکی کەم بەر لە مردن، سەمیرە دەیزانی دەمرێت. ڕۆژێک بە وردی باسی ئەو مەخلوقە سەیرانەی بۆ فەوزیە کرد کە بەر لە مردن سەردانی هەموو کەسێک دەکەن و کۆمەڵێک هێما و ئاماژەی دەدەنێ. ئەو بەر لە دواهەمین کۆچ بە چەند هەفتەیەک، بە شێوەیەکی ورد ئانوساتی مردنی خۆی دەزانی، فەزڵی ئەوەشی دەگێڕایەوە بۆ تەمەنێک لە ئولفەت و خۆشەویستی لەگەڵ بوونەوەرگەلێکدا کە سەر بەم دونیایە نین. سەمیرە یابەحری بەر لە مەرگ ئارەزوویەکی کوشندە و قووڵی بۆ درکاندنی حەقیقەت و ئاشکراکردنی هەموو شتێک تیادروستبوو، وەک ئەوەی غەریزەیەک لە مرۆڤدا هەبێت کە دەشێت پێی بڵێین «غەریزەی گووتنی حەقیقەت بەر لە مەرگ»، شەوێک تریفەی کچی بانگکرد و پێیگووت کە تۆ کچی فەوزیە یاسەمی نیت و کچی منیت. تریفە بێئەوەی زۆر بچێتە بنج وبناوانی حیکایەتەکە باوەڕی پێکرد. دەبێت بڵێم خانمی تریفە لە قووڵایی دڵیدا دەیزانی ئەو لەگەڵ جەوهەر یابەحریدا دووانە نین، هەستێکی مرۆڤانەی هێند وردی هەبوو، دەیتوانی بێئەوەی کەس پێیبڵێت، دەرک بەو ڕاستیانە بکات. فەوزیە یاسەمیش ئەگەرچی هەموو عومری هەوڵیدابوو ئەو نهێنییە داپۆشێت، بەڵام لەو ژنە ناسک و دڵسادانە بوو کە هەرکات لەگەڵ ڕاستییدا ڕووبەڕووت بکردایەتەوە، نەیدەتوانی درۆبکات. لەو خانمە بە ویقار و پڕ ڕێزانەبوو کە دەیتوانی نهێنی هەڵگرێت، بەڵام نەیدەتوانی ڕێک و ڕاست لە ڕووی کەسدا زار بە درۆ هەڵهێنێت. کە تریفەی میهرەبان پرسیاری ئەو چیرۆکەی

لێکرد و سوێندی دا ڕاستی بڵێت، وەک یەکێک تەلیسمی عومری خۆی بەتاڵبکاتەوە، بە گریانەوە لەبەردەم تریفەدا ئەو ڕاستییەی درکاند و پێیگووت «تۆ کچی من نیت، بەڵام خودا دەزانێت... خودا بەگەورەیی خۆی لەو سەرەوە شاهیدە کە لە جەوهەرم خۆشتر دەوێیت و بۆ تاوێکیش لە ژیانمدا، بیرم لای ئەوە نەبووە کە تۆ کچم نیت». پێویستی نەدەکرد فەوزیە یاسەمی ئەو قسانەبکات، تریفە بە گریانەوە باوەشی پیاکرد و پێیگووت «تۆ هەتاهەتایە دایکی منیت... دایکی منیت... و لە تۆ زیاتر کەسم نییە». بێئەوەی درێژە بە چیرۆکەکە بدەین، دەبێت بڵێم بەسەرهاتی ئەو شەوە هێند دڵبزوێن و کاریگەر بوو بۆ کتێبێکی وەک ئەم کتێبەی ئێمە دەستنادات، کە وابڕیارە خۆی لە دیمەنی عاتیفی توند بپارێزێت. بە کورتی فەوزیە یاسەمی و تریفە ڕێکەوتن « زاهیری پیر» هیچ لە حیکایەتی ئاشکرابوونی نهێنییەکان نەزانێت، چونکە دڵی لەوە لاوازتربوو بەرگەی بەدبەختی وەها بگرێت.

پاش مردنی زاهیر بە هەفتەیەک ژیان لە ماڵی یابەحرییەکاندا بووە دۆزەخ. ئاشکرابوونی وەسێتەکەی زاهیر یابەحری کە لە ڕوی قانونییەوە کونبڕ و بێخەوش بوو، جەوهەری شێتکرد. ئەو دڕندەیە جورئەتیکرد و دەستی لە دایکیشی بەرزکردەوە، قسەی ناشیرینی کرد و سیفەتی ئەوتۆی خستە پاڵ یاسەمییەکان پێشتر کەس نەیوێرابوو جنێوی وا بە خێڵ و عەشرەتێکی پاک بدات. تریفەی بێگوناه و خەیاڵزاد گەرچی بە لەش زۆر چکۆلانەتر بوو، بەڵام بە ئیرادە هێند بەهێز و چاونەترس بوو، دەیتوانی بچێتە پێش ئەو کێوە گەورەیە و لە بەردەمیدا بوەستێت. تریفە پێیگووت «تۆ چ دڕندەیەکیت دەوێریت، هەفتەیەک دوای مردنی باوکت، باس لە میرات و پوڵ و پارە بکەیت... تەنیا حەیوان دەتوانێت وەک تۆ بێت». جەوهەر بە ڕادەیەک بێڕەحم بوو، بە قژ کێشیکردە دەرەوە و پێیگووت «یان بە

ئـارەزووی خـۆت دەسـت بـەرداری هەمـوو شـتێک دەبێـت، یـان سـەرت لێدەکەمـەوە، تـۆ قـەت خوشـکی مـن نەبوویـت، هیـچ نیـت جگـە لـە دەڵـە سـەگێکی دز کـە ڕۆژی تۆپینـت هاتـووە». بـوو بـە بـەزم و هاوارێـک، مەپرسـن. فەوزیـە یاسـەمی ئـەو ژنـە هێمـن و ئاغـرە پـڕ بـە حەوشـەکە دەیقیژانـد، جەوهـەر کـە وەک حەیوانێـک لرخـەی دەهـات، بـە قـژ ئـەو بەسـتەزمانەی تـا بـەردەم بەرمیلـی نەوتەکـە ڕادەکێشـا، بێئـەوەی قـژی ئـەو منداڵـە بێجورمـە بـەردات، دەبەیـەک نەوتـی دانـراوی پیـا دەکـرد و قەسـەمی دەخـوارد کـە بـە زیندوویـی دەیسـووتێنێت. خوشـکە بێچارەکـەش لـە بەردەسـتیدا دەکـەوت، فەوزیـەی بەحەیـا و شـەرم هێنـد دەیقیژانـد هەمـوو گـەڕەک دادەبارێـن، دراوسـێکان دەرگاکەیـان دەشـکان، جەوهـەری بێـدڵ و نابەشـەر قـژی تریفـەی بـەردەدا بـۆ ئـەوەی شـقارتەیەک لـە گیرفانـی دەربهێنێـت، کچـە بەسـتەزمانەکە ئـەو هەلـەی بەفرسـەت دەزانـی و لەبەردەسـتی هەڵدەهـات، دەچـووە سـەر پلەکـەکان و زەق و زۆپ بـە دەموچاویـدا دەیقیژانـد «جەوهـەری حەیـوان، مـن خوشـکی تـۆ نیـم، مـن لەدایـک و باوکـی تـۆ نیـم، مـن کچـی سـەمیرە یابەحریـم... تـۆ حەیوانـی». جەوهـەر هێنـدەی تـر شـێتدەبوو، پیـاوان و خەڵـک و خـوا دەنیشـتنە سـەری و دەیانگـرت، تریفـە کـە دەسـەڵاتی بەسـەر خۆیـدا نەمابـوو وەک باڵندەیەکـی برینـدار دەیقیژانـد و دەگریـا. پیـاوان بـە پاڵەپەسـتۆیەکی زۆر جەوهەریـان لـە دەرگای حەوشـە دەبـرد بـەو دیـودا، لەودیـو وەک گایەکـی هـار دەیبۆڕانـد، خـۆی ڕادەپسـکاند و تەکانـی دەدایـە خـۆی، بـە خوشـکە شـەریف و ئابڕوودارەکـەی دەگـووت «قەحبـە»، قسـە و قسـەگەلی ئەوتـۆ لـە زاری دەبارێـن، تـا ئـەو کاتـە کـەس لـەو شـارەدا شـتی وەهـای بـە خوشـکی خـۆی نەگووتبـوو. ژنـە دراوسـێکان لـەدەوری تریفـە کۆدەبوونـەوە کـە لەسـەر پلیکانـەکان دەگریـا. فەوزیەخـان لـە تەریقـی و حەیاچوونـدا لـە هـۆش خـۆی دەچـوو، لـە نـاو چیمەنـی حەوشـەکەدا دەکـەوت. ژنێـک

دەیقیژاند «وەی فەوزیە خان مرد، وەی بە قوربانت بم، وەی بەساقەی حەیاو حورمەتەکەت بم». پیاوانی دراوسێ ژمارەیان زۆرتر و زۆرتر دەبوو، بە هەمووان جەوهەر زاهیریان کێشدەکردە ماڵێکی دراوسێ، لەوێشەوە دەنگی ناڵەناڵی دەگەیشتە ئاسمان، دووبارە لە دەستیان دەربازی دەبوو، ئەمجارە ڕووی نەدەکردەوە حەوشی خۆیان. پیاوان بەدوایدا ڕایاندەکرد و ئەو وەک ڕەشەبایەکی شێت لە بەرچاو وندەبوو. ژنان بە پەلە جلە نەوتاوییەکانیان لە بەری تریفە دادەکەند، فەوزیە یاسەمی هۆشیدەهاتەوە بەر، کاتێک خۆی لەو دۆخەدا دەبینی شەرمەزار و شکستە لە ژێر باڵی ژنەکاندا دەچووە ژوورێ و زمانی هەڵنەدەهات، دەبێت ژنێکی وا پاک و بەشەرم لە کاتی وادا چی بڵێت؟. بەڵام ئەو تاقانە کوڕەی کە ڕۆژێک مایەی شادی و بەختەوەری ژیانی بوو وازی نەدەهێنا، دوای چەند سەعاتێک بە خۆی و دەمانچەیەکەوە دەگەڕایەوە. بەس خودا خۆی دەیزانی گەنجێکی منداڵکاری وەک ئەو دەمانچەی لە کوێ پەیداکردبوو. بەر لەوەی بێتە ژوورێ بە هات و هاوارێکی زۆر دەرگاکەی دەدایە بەر گوللە، ناڵەی فیشەکەکان هەموو گەڕەکەکەیان بە ئاگادەهێنایەوە. هەندێک پیاوی بەغیرەت دووبارە دەهاتنەوە دەست، سەرلەنوێ دەبووە بە هەرایەکی زۆر، سەرلەنوێ خەڵک و خوا دادەبارینەوە. فەوزیە یاسەمی و تریفە زاهیر هەردووکیان لە ژوورەوە دەرگاکانیان لە خۆیان دادەخست، جەوهەر بە خۆی و دەمانچەکەیەوە خۆی دەکرد بە حەوشەکەدا، پیاوان دەگەیشتنە سەری و تکایان لێدەکرد دەمانچەکەی دانێت، ئەو وەک گایەکی هار بە هەر چواردەوری خۆیدا هەڕەشەیدەکرد، گای هاری چی، وەک شەیتانێک مێشکی لەدەستدابێت و سەری هێسترێکی خستبێتە شوێن سەری خۆی. ناچار دراوسێیەکی موستەشار بە خۆی و پاسەوانەکانییەوە دەهاتە یارییەکەوە، فەوزیە لە ژوورەوە دەگریا و تریفە لە پەنجەرەکانەوە دەیقیژاند. جەوهەر بێئەوەی

سڵ لە هیچ بکاتەوە فیشەکی بە دەرگا و دیوار و پەنجەرەکانەوە دەنا، من دەڵێم لە بەرازێک دەچوو شێت بووبێت، ئێوەبڵێن لە سەگێک دەچوو هاری گرتبێتی. خودایە گەر ئەو موستەشارە نیشتیمانفرۆشە لووتی خۆی نەخستایەتە ئیشەکەوە و دەستی خۆی لەو شەوە شومە وەرنەدایە، کەس نەیدەزانی چی دەقەومێت، لەوانەیە ئەو کچە پاکەی کە بەشێکی چیرۆکەکەی ئێمەی دروستکردووە، ببووایەتە قوربانی ئەو جانەوەرە بێلغاوە. موستەشارە مل ئەستوورەکە لە فورسەتێک دەگەڕا پیاوەتی خۆی تیا دەربخات، بە خۆی و پاسەوانەکانییەوە خۆیان کرد بە حەوشەکەدا. کەس نەیدەزانی بۆ ئاغای موستەشار لەو شەوە درەنگەدا بە تەواوی چەک و عەتادی خۆیەوە ئامادەیە. بە ڕوخساری پیاوێک بیەوێت ترس بخاتە دڵی بەرامبەرەکەیەوە لە جەوهەری خوڕی «هێی کوڕە... هێی... ئەو هەرایە چییە ناوتەتەوە. پیاوێک پیاو بێت تەقە لە خوشک و دایکی خۆی دەکات... ئا چەکیبکەن و بیگرن... دەی هەر ئێستا». لە چاوتروکانێکدا پاسەوانەکان جەوهەر زاهیریان قۆڵبەستکرد و بردیان. ئەوە کۆتایی شەوێکی گرنگی ژیانی تریفە یابەحری بوو. لەو شەوەوە ئیدی جەوهەر زاهیر بوو بە مۆتەکەیەکی ترسناک و لە هەموو شوێنێکدا بەدوای تریفە یابەحرییەوە بوو. ڕۆژانی دواتر سەلماندیان جەوهەر بوونەوەرێکی ڕق ئەستووری ترسناکە، کە دەبێت مرۆڤ حیسابێکی ڕاستەقینە بۆ هەڵچوونە کوتوپڕەکانی بکات. چەند ڕۆژێک بێترس و خاترجەم خۆی و فەوزیە یاسەمی لە ماڵەوە مانەوە و دەیانویست کۆی ئەو دیمەنە ترسناکە وەک بەشێک لە شانۆگەرییەکی وەحشەتناک تەماشابکەن کە پەردەکانی دادراونەتەوە و کۆتایی هاتووە. بەڵام ڕۆژێک تریفە یابەحری و خانمی یاسەمی بۆ کڕینی هەندێک پێویستی چوون بۆ بازاڕ، ئەو لە بەردەم یەکێک لە قوماشفرۆشەکاندا بە خۆی و کێردێکی درێژەوە بۆیان دەرپەڕی،

بەرلەوەی دەستی بگاتە قژی تریفە، ئەو قیژاندی و لە چنگی هەڵهات. فەوزیە یاسەمی کە بەدرێژایی ژیانی دەستی بە حەیاو حورمەتی خۆیەوە گرتبوو، لە خەیاڵی ئەودا نەبوو ڕۆژێک بێت ئاوها لە ناوەڕاستی بازاڕدا ببێتە سینەما. جەوهەر لەو قەیسەرییە گەورەدا، بەو کێردە گەورەیەوە دوای تریفە کەوت کە لە کاوبۆیەکی شیندا خێراتر لە ئاسک ڕایدەکرد. خودایە خەڵکێک هەبوون تەنیا تەماشایاندەکرد و پێدەکەنین، هەردووکیان بە خێراییەکی ئەوتۆ تێیاندەتەقاند، کەس دەرفەتی ئەوەی نەبوو بپرسێت چییە؟ چی ڕویداوە؟. بیهێننە پێشچاوی خۆتان کچێک لە ناو بازاڕی ئەم شارە چاوچنۆک و بێشەرمەدا بە پانتۆڵێکی تەسکەوە ڕابکات، بقیژێنێت، بەسەر فەردە نۆک و جامە ماستدا بکەوێت، گوێی لێبێت ژنان پێی بڵێن «بێئابڕووە و براکەی لەگەڵ خەڵکدا گرتوێتی». بیهێننە پێشچاوی خۆتان کچێکی وا نازک تەنیا بۆ ئەوەی خۆی ونبکات، لە ناو هاتوهاواری خەڵکدا خۆی بکات بە مزگەوتێکدا، بچێتە ئاودەستی پیاوانەوە، سێ سەعات لە ئادابخانەیەکی پیسدا دەرگا لەسەر خۆی داخات، نەیەتەدەرێ، بۆنی پاشەڵی پیاوانی زۆرخۆری ئەو شارە بچێ بە لووتیدا کە دەستەدەستە دێن و دەڕۆن، گوێی لە شڵپ و هوڕی دەست و باو بۆرانی قوونیان بێت. ئاه ئەوە ئەزموونێکی هێند تاڵبوو تا مردن لە یادی ناچێتەوە. دواتر سەدجار ئەو چیرۆکەی بۆ کچانی مافوورخانەکە گێڕایەوە، سەدجار گەلاوێژخان دایدەنا و دەیگووت تریفە حیکایەتی مزگەوتەکەمان بۆ بگێڕەوە. هەر ئافرەتێکیش ڕوویبکردبایەتە کارخانەکە، دەبایە تریفە هەموو چیرۆکەکەی لە نوکەوە بۆ بگێڕێتەوە، دەبووایە هەمووان سەراسیمە بڕوانن و تێنەگەن، چۆن کچێکی وەها خۆی گەیاندۆتە ئاودەستی پیاوان لە مزگەوت. ئاه، بەڵام کە دەگەیشتە سەر ئەو بەشەی کە چۆن ئێوارێ گەڕاوەتەوە بۆ ماڵ، ئیدی دەگریا. لەگەڵ فرمێسک و

فیڤاندا باسیدەکرد چۆن فەوزیە یاسەمی لە داخی کورە تاقانەکەی «بەرخۆلەکەی باوان» «نێری نێرانی یابەحری» گریاوە، چۆن تووشی غەمێکی ئەوتۆ بووە خەریکبووە دەمی خواربێت، چۆن ئەو بەپەلە لە تاکسییەکی کۆن و پەڕپوتدا فەوزیەی گەیاندۆتە خەستەخانە، چۆن دکتۆرەکان گووتوویانە ئەگەر زوو نەهاتبایتایە دەمرد. ئینجا باسی سێ شەو و سێ ڕۆژ گریانی بێبڕانەوەی فەوزیە خانی دەکرد. تریفە بە دڵێکی پاکەوە ئەو سەربوردەی بۆ هەمووان دەگێڕایەوە، هەتا بۆ حەسەن تۆفانیش، کە خەندەی بەم قسانە دەهات. هەمیشە کە دەگەیشتە ئەوەی بڵێ ئیتر بڕیارمدا شوێنی منداڵی خۆم بەجێبهێڵم و ماڵاوایی لە خانەی یابەحرییەکان بکەم، فرمێسک وەک لێزمەی بەهار لە چاوانی دەبارین.

بەڵام دەبێت کچێکی وەک ئەو بۆ کوێ بچێت، جێگایەک هەم ژیانی تیا زامن بێت و هەم حەیاو حورمەتی؟.

گیرسانەوەی تریفە یابەحری لە کارخانەکەی عەبدولقادری نیادا دەگەڕێتەوە بۆ برایەکی پیاوچاکی فەوزیە یاسەمی، کە دۆستێکی دێرینەی ئاغای نیا بوو، چەند ساڵێک لەوەوبەر پێکەوە چەند دەستێک مەحبوس و گوڵبەهاریان کردبوو. ئەو بەباشی و دڵگەورەیی خۆی تەلەفونی بۆ کاک قادر کرد، ژنەکەی هەڵیگرت، نزیکی سەعاتێک قسەیانکرد. دوای ئەوە لەیەکتر ئاشکرابوون، شتەکان خۆشتر و باشتر بەڕێوەچوون. دەرکەوت خانمی نیا کۆنە ناسیاوێکی فەوزیە یاسەمییە، دە جار لە پرسە و پاشتێلانەدا یەکتریان بینیوە. کە پێکەوە لە تەلەفونەکەدا قسەیانکرد گەلاوێژخان دەیگووت ئەیەڕۆ تۆ ئەوە نیت لە حەفلەکەی ماڵی ئافتاوی ژنی ئەکرەمدا، کەوایەکی پولەکەی مۆرت لە بەرابوو، لەلای سەرەوە دانیشتبوویت. ئەی نەبوو لە تەعزێکەی

عوسماندا، ئامۆزاکەی شەفیقە خان لای مەلا گورونەوە بوویت، ئەی نەبوو کە کچەکەی عینایەت تەخەڕوجیکرد تۆ تاقمێکی زیوت بۆ هێنا... ئەی نەبوو... ئەی نەبوو. ئاوهابوو... بەڕێکەوت شتەکان هەموو بەڕێکی ڕۆیشتن، گەلاوێژ باهیر کە ئەسڵ و نەسەبی ئەو کچەی باش دەناسی، کە زانی بەستەزمانە ئەمساڵ تاقیکردنەوەی بەکەلۆری هەبووە و وازی لە هەموو شتێک هێناوە بۆ ئەوەی ژیانی خۆی بپارێزێت، دڵی نەرمتر و خۆشڕووتر بوو. کە هەموو چیرۆکەکەیان بۆ گێڕایەوە بێ دوودڵی گووتی وەک نوری چاوم هەڵیدەگرم، بابێت، خۆی حەزی لە چییە ئەوە بکات. خانمێکی میهرەبان بوو هێند دڵنەرم و خۆشخەندە قسەی لەگەڵ فەوزیە یاسەمیدا کرد، باوەڕی نەدەکرد. فەوزیەی بەستەزمان ئەو ماوەیە هێندە زەجری کێشابوو، وەختبوو باوەڕی بە بوونی مرۆڤی باش نەدەما. ئاخر ئەوەی ئەو لە کوڕی خۆی بینیبووی کەم نەبوو. کە تەلەفونەکەی داخستەوە گووتی سوپاس بۆ باری تەعالا، هێشتا خەڵکی وەها دڵڕوون و شیرین لەفز لە دونیادا ماون.

بۆ ڕۆژی دوایی تریفە یابەحری چوو بۆ کارخانەی مافوورەکە، هێندەی گەیشتە ئەوێ و تەماشای یەکەم مافووری کرد، خەیاڵێکی سەیر و بێوێنەی بۆهات.

***

تریفە یابەحری هێندەی یەکەمین مافووری بینی تێگەیشت دەتوانێت چی بکات. لە یەکەم سەعاتەوە وەک نیگارکێشی مافوورەکان خۆی بە هەموویان ناساند. بە خانمی گەلاوێژ و سەید قادری مێردیانی گووت «بەرهەمهێنانی مافووری سادە و ئاسایی چ سوودێکی بۆ ئێوە نییە، ئێوە کارخانەیەکی چکۆلەن، لە هەرێمێکدا ئیشدەکەن لەسەرتاسەری

دونیادا بە مافوور بە ناوبانگە. شازادە و ئەکتەرە ناودارەکانی دونیا دێن و لەم هەرێمەوە فەرش دەکڕن، جوانترین قاڵی و قەشەنگترین ڕاخەری دونیا بە ئاسانی لە سنوورەکانەوە دێن بەم دیودا. فەرشفرۆشەکان سەنعەتی وەستاکانی کاشان و تەورێز و کرمانیان لە دەستکردی ئێرە پێباشترە. بەرهەمی ئێوە کەمە و توانای ئیشتان سنووردارە، لەبەرئەوە دەبێت شتێک بکەن ناوازە و تایبەتی بێت، شتێک بێت جیابێت و بناسرێتەوە».

دەبێت بڵێم سەید قادر و ژنەکەی بە بۆچوون و بیرکردنەوەی تریفە بەختەوەربوون، لە سەرەتاشەوە خۆیان وا بیریاندەکردەوە، بەڵام نەیاندەزانی چی بکەن؟. ئێستا تریفە یابەحری، ئەو کچە خەیاڵزادە دەیگووت من دەتوانم خەیاڵتان پێشکەشبکەم، مافوورەکانمان لە ئێستا بەدواوە لە مافووری هیچ جێگایەکی دیکەی دونیا ناچێت، نە لە فەرشی کارخانەکانی تاران دەچێت و نە لە دەستکاری قاڵیبافەکانی خۆراسان. ئیتر لەو نەخش و نیگارە کلاسیکییە کۆنانە دووردەکەوینەوە کە هەندێکیان سەدان ساڵە دووبارەدەبنەوە. لە ئێستا بە دواوە فەرشی تر دروستدەکەین، مافووری بێوێنە و قاڵی ئەوتۆ هەر کەسێک لە دونیادا بیبینێت کارخانەی نیای بیربکەوێتەوە.

تریفە بە ئەندازەیەک چاونەترس و پڕ کاراکتەربوو، دەیتوانی دەنگی خۆی بەسەر هەمووانیدا زاڵبکات، بەڵام بە تەرزێک ناسک و ڕووشیرینیش بوو، هەموو دەیانزانی کەسێک نییە بیەوێت ئەوانی دی وەک ژێردەستەی ئەو بنوێنن. پێشنیارەکانیشی بە چەشنێک عاقڵانەبوون، نەدەکرا کەس بڵێت نابێت و ناکرێت. پلانەکەی وابوو، تەونە گەورەکان و ئامێرە سەرەکییەکان خەریکی ئیشی ئاسایی خۆیان بن، لەپاڵدا ئەو بەرپرسی فەرشێک بێت کە نەخشەکانی زادەی خەیاڵی خۆی بن. خانمی نیا ژنێکی گومانکاربوو «بە پێچەوانەی سەید قادری

نیاوە کە خۆی دەدایە دەم لافاو و نەیدەپرسی بۆ کوێم دەبەیت». دوای بیرێکی ورد و دوودڵییەکی زۆر، بیرۆکەکەی تریفە نەرمیکرد و گوتی «نمونەیەکم بدەرێ و دواتر دەڕوانین دەشێت چی بکرێت و چی بکەین». ئەو شەوە تریفە یابەحری نەخشەی یەکەمین مافووری خۆی کێشا «کچێکی وەک پەریزاد لە نزیک ئاوێک دانیشتووە و بە دوو چاوی پڕ خەیاڵەوە کتێب دەخوێنێتەوە، کوڕێکی شۆخیش لەسەر ئەسپێکی باڵدار بەرامبەری وەستاوە و تەماشایدەکات، ئاسمانی ژوور سەری کوڕەکە پڕە لە ئەستێرەی گەورە و درەختی خورافی، ئاوی دەریاچەکەش پڕە لە ماسی زێڕین کە بە سەرسامییەوە سەیری هەردووکیان دەکەن، فاسیلەیەک لە نێوان کوڕ و کچەکەدایە ناکۆتا و ئەبەدی دەنوێنێت، ڕەنگەکان هەستی دابڕان و بەیەکدی نەگەیشتن دەردەخەن. پولەکەی ماسییەکان یەکی لە ڕەنگێکن و شاڵشانی کوڕەکەش لە ڕیشاڵی بریسکەدارە، شتێک لە خەیاڵ و مەستی لە چاوی هەموو بوونەوەرەکاندایە، بایەکی قایم یاری بە قژی کوڕەکە و یاڵی ئەسپە شێتەکەی کردوە، بەڵام فەزای دەوری کچەکە ئارام و سرەوتە، لە ئاسۆکانیشدا هەمان بای هار یاری بە تیشکێکی غەمگین و پەرێشاندەکات».

ئەوە کورتەی بیرۆکەی ئەو فەرشە بوو کە تریفە دایڕشت. دەبایە لە ماوەیەکی کورتدا ئەو فەرشە دروستبکەن، تریفە هەموو خەیاڵی خۆی خستە ناو ئیشەکەوە. وەک ئەوەی ئەفسون بنوێنێت و خەیاڵ لە ئاسمان ڕاکێشێت، پڕ ئومێد دەینواند. ئەو خەیاڵە لافاوڕەنگەی ئەو، دەستوپەنجەی کیژە مافوورچنەکانی پڕکرد لە ئارەزوو، ئەوانەی ئیشیان لەگەڵدا دەکرد وایاندەزانی مەستن و با لە ڕۆحیاندا هەڵیکردوە، وەک ئەوەی شەپۆل بیانهێنێت و بیانبات بە خێراییەکی ئەفسوناوی

دەجولان. وردەکارییەکانی تریفە، کچە قالییافەکانی سەرسامکرد، وەک ئەوەی شتەکان لەسەر لەوحێکی خەیاڵی چنرابن و ئەو سانتیم بە سانتیم هەڵیانگرێت و بیانخاتە سەر ئەو مافوورە. چاوی لێکدەنا و ڕیز بە دوای ڕیز دەیزانی دەبێت ئامێرەکان چیبکەن و جۆلاکان چ دەزوویەک ڕاکێشن و لە مەودای سەرە دەرزییەکدا چ ڕەنگێک بڕواتە پاڵ چ ڕەنگێک و چ هێڵێک لە چ هێڵێک بترازێت. وەک ئەوەی هاریکاری دێرینی وەستا ئەرمەنییە کۆنەکان و خەلفەژنی پێشدەستی قالیچنە بەناوبانگاکانی تورکومانستان بووبێت، لە مافووری یەکەمەوە، ئەندازەی بابەت و تێکەڵاوی ڕەنگەکانی بەجۆرێکی هێند ڕێک هەڵدەسەنگاند، وەستا باشەکانی قالی و فەرشفرۆشە شارەزاکان ئاسان نەیاندەتوانی عەیب لە نیگارەکانی بگرن و لە نەخشەکانیدا گرێ بدۆزنەوە. ئیلهامی شتەکانی لە خەیاڵێکی سافەوە بۆدەهات، کە شەوان بەدەم خەویشەوە تیا دەژیا. ئەو ماوەیەی کاریکرد نەیهێشت کەس مافوورەکە ببینێت، دەیگووت «جوانی ڕاستەقینە شتێکە وەک بروسکە، دەبێت کەشوهەوا بڕەخسێت تا ئیشی خۆی بکات و گورزی خۆی بوەشێنێت». بە قاقاوە بە کچەکانی دەگووت «کچی دایکم، جوانی خۆ ئاو نییە، قوم قوم بیخۆیتەوە، جوانی ڕمێکی تیژە و ناگەهان دەتپێکێت، ئێمە دەبێت ئاوها خانمی نیا و عبدولقادری مێردی بپێکین».

تریفە بە پێوەری پیاوانی ئەم شارە جوان نەبوو، بەڵام ناسکییەکی هەبوو هەموو کەسی دەبزواند. هاتنی تریفە بۆ کارخانەی مافوورەکە هەمووانی دڵخۆشکردبوو، زۆرجار کچە کرێکارە بەدبەختەکانی دەخستە سەر هەوای پێکەنین و تریقەی بێبڕانەوە. هەموو دەیانگووت «بەر لە تۆ، ئێمە قەت پێنەدەکەنین». دوای ماندووبوونێکی سەیر و کارکردێکی بێوچان مافوورەکە تەواوبوو. ئەو بەیانییە کە دەبوایە مافوورەکە نیشاندەن، هەمووان خۆیان گۆڕیبوو و لە بەردەم ئیشەکەدا وەستابوون.

تریفە کەمێک ڕەنگزەرد و پەشۆکاو دەینواند، دەبایە یەکەمین کەس عەبدولقادری نیا تەماشای سەنعەتە ناوازەکە بکات. کاتێک لەبەردەم فەرشەکەدا وەستا، ئاغا نەیدەزانی چی بڵێت. مافوورەکە بێسنوور جوان بوو، پێشتر شتێکی لەو جۆرەی نەبینیبوو، بە خەیاڵی ئەو فەرش شتێک بوو لە زەخرەفەوە نزیکتربوو وەک لە نیگارکێشان. یەکەمجاربوو جۆرە نیگارێکی وەها ورد لەسەر فەرش ببینێت، گەرچی لە منداڵییەوە لە کۆگا و بازاڕدا سەرقاڵی کڕین و فرۆشتنی شتی ماڵ بوو، بەڵام خودی ئەم فەرشەی وەک وردە ئەتەمینێک دەبینی کە خەیاڵی فریشتەیەک بایدابێت نەوەک دەست و پەنجەی ئەم کچە سادە و غەمگینانە. چەندین جار دەستی لێدا و ئەمدیوە و دیوی کرد بۆ ئەوەی دڵنیابێت ئاخۆ ئەوەی دەیبینێت ڕاستە یان خەیاڵ، نیگارە یان فەرش، ئەتەمینێکی وردە یان قاڵییەکی ڕاستەقینەیە. بێئەوەی هیچ بڵێت، چەندجارێک بەدەوری مافوورەکەدا سوڕایەوە، چەندین جار سەری بادا و چەند جارێک هەناسەی هەڵکێشا... دوا جاریش بێئەوەی هیچ بڵێت، شوێنەکەی بەجێهێشت و ڕۆیشت.

حاڵی خانمی نیا لە عەبدولقادری مێردی باشتر نەبوو. وەک بینینی مافوورەکە گێژیکردبێت و نەتوانێت هیچ بڵێت، وەک کوتوپڕ تای لێهاتبێت و سەرئێشەی گرتبێت، دەستیگرت بە سەرییەوە و ئاهێکی لێدەرهات و دوو سێ جار گوتی «خوایە گیان... خوایە گیان» و بێئەوەی هیچ بڵێت، دوورکەوتەوە. ڕۆژێک تێپەڕی و کەس قسەی لەگەڵ تریفەدا نەکرد. ئەو شەوە تریفە یابەحری خەوی لێنەکەوت. بۆ ڕۆژی دوایی خانمی نیا و عبدولقادری مێردی بانگیانکرد و بەرابەر خۆیان لە کورسییەکی چەرمی گەورەدا دایاننا. سەرەتا عبدولقادر پێیگووت «کچم تریفە، دەزانم ئێستا حەزدەکەیت ڕای ئێمە لەسەر فەرشەکەت بزانیت، هەردووکمان ئاگادارین تۆ بە دڵ و بە گیان

ئیشت لەو مافوورەدا كرد، گلەییمان لە تۆ نییە، گلەییمان لە جوانی مافوورەكە نییە... بەڵام شتێكی تێدایە لە مافووری ئاسایی ناچێت... شتێكی سەیر كە ناتوانین بە تەواوی ناوی بنێین».

گەلاوێژخان دەستی بە نێوچاوانییەوە گرتبوو، گووتی «شتێكی تێدایە بە كەڵكی بازاڕ نایەت، زیاتر لە تابلۆی نیگار كێشان دەچێت. فەرش جۆرێكی ترە، فەرش بەبێ زەخرەفە نابێت، لەوەش بترازێت هەستدەكەم ئێجگار جوانە... هێندە جوانە مرۆڤ لێیبترسێت. هێندە جوانە مرۆڤ نازانێت چۆن نرخی لەسەر دانێت».

تریفە بە دەنگێكی گریاوەوە گووتی «من دڵنیام بۆ بازاڕ دەبێت، دڵنیام، بینێرنە بازاڕ و ببینن. خەڵكێك لێمانی دەكڕن».

سەید قادری نیا دەستی خستە سەرشانی و گووتی«تریفە تۆ بە هەڵە تێگەیشتوویت، ئێمە دەزانین بازاڕی دەبێت، دەزانین دەفرۆشرێت، بەڵام دەرەنجامەكەی چییە؟ تۆ بیرت لە دەرەنجامەكەی كردۆتەوە؟».

تریفە وەك ئەوەی لە هیچ تێنەگات سەیرێكی گەلاوێژخانی كرد و گووتی « تێناگەم، خانم گیان، هیچ تێناگەم».

گەلاوێژ پێیگووت «دڵنیام داوای فەرشی ترمان لێدەكەن، دڵنیام بەرپرسە بەرزەكان و موستەشارەكان و پیاوانی حوكومەت دوای ئەم نمونەیە دەكەون، ئیتر پێیان دەكرێتەوە و ژیانمان لێتاڵدەكەن. من و قادر، حەزناكەین ئەوانە ببینین، لە دەردی سەری زیاتر هیچیان بەدواوە نییە. دوای ئەوە خۆ تۆ تا دونیا دونیایە لێرە نامێنیتەوە، لەم كارخانە پیس و پۆخڵەدا دانانیشیت فەرش بۆ من دروستبكەیت. دەبێت بڕۆیت فریای ژیانی خۆت بكەویت، بە تەنگ دایكە داماوەكەتەوە بێیت. دوای ئەوە مافوورەكە شتێكی تێدایە لە تلیاك دەچێت، مرۆڤ گێژدەكات، بەرەو خەیاڵات ڕایدەكێشێت، بەرەو دونیایەكی تر، خوایە گیان، چیت بۆ باسبكەم... كچم هەموو كەس بەرگەی ئەو خەیاڵانە

ناگرێت».

تریفە ئێستا لە خۆشیدا پێدەکەنی، دڵنیابوو کێشەی فەرشەکەی ئەوە نییە ناچیز و ناڕێک بێت، بەڵکو ئەوەیە کە قەشەنگ و بێوێنەیە. بە جۆش و خرۆشی هەرزەکارێکەوە هاواریکرد «ئاسانە خانم، باوەڕت بێت زۆر ئاسانە، لێرە فەرش نافرۆشین، لە بەردەرگاکە دەنوسین فەرش نافرۆشین، یەکێک دەکەین بە وەکیل، هەر کەس هات دەڵێین فەرشمان نییە، پارەی زۆری دەخەینە سەر، با نرخەکەی لێرە لە نرخی بازاڕ بەرزتر بێت، باوەڕت بێت خانم ئاسانە، با ماوەیەک تاقیبکەینەوە و ببینین».

خانمی گەلاوێژ و سەید قادری نیا نەیاندەزانی چی بڵێن، حەزیاندەکرد سنووری بازاڕەکەیان گەورەبکەن، شتی نوێ بهێنن، زیاتر بفرۆشن و ئامێری تازەتر بۆ کارخانەکە بکڕن، بەڵام لەوە دەترسان بکەونە بەرچاوی ئەو هەموو دز و درۆزنەی لەم شارەدا بڵاوبوونەتەوە. دوای چەند ڕۆژ بیرکردنەوە، دوای ئەوەی مافوورەکەیان نیشانی چەند فەرشفرۆشێک دا، هەندێک هاوڕێی بەسەلیقە قسەی خۆیان تیادا کرد، گەیشتنە ئەو بڕوایەی دەستی تریفە ئازادبکەن و لێگەڕێن بێبەربەست مافوور دروستبکات. هەموو شتێک باش بەڕێوەچوو، زۆر شتی جوانیان بینی و زۆر شەوی شاد و خەیاڵیان بردەسەر. بازاڕیان بێوێنە و فرۆشتیان بێئەندازەبوو، کاڵایان گەیشتە دەڤەری دوور و سەر زەمینی دیکە، ساڵانێکی دووروودرێژ وایاندەزانی، ئەو بڕیارە باشترین و بوێرانەترین بڕیارە دابێتیان. بەڵام نا، دوای تێپەڕینی چەند ساڵێک، ئێوارەیەک سێ پیاوی بۆشناخ و هاوڕەنگ و سمێڵ ڕەش لە بەردەرگای کارخانەکەیان دابەزین، ئەو ئێوارەیە تێگەیشتن ئەو بڕیارە هەڵەی هەرە گەورەی زیندەگی و فریوی هەرە ترسناکی ژیانیان بووە.

## دواهەمین نامەی باران شوکور
## «هاوینی ٢٠٠٤»

لە ڕۆژێکی مانگی ئابی ساڵی دووهەزاروچواردا، بە خۆی و جانتایەکی کۆنەوە، لە پێشدەم ئوتێلی «بەفر و سەراب»دا لە تاکسییەک دابەزی، پیاوێکی درێژی باریک بوو لە پانتۆڵێکی تۆزاویدا، باڵای لەسەروو دوو مەترەوە بوو، قژێکی سپی درێژ و دەموچاوێکی ساف و پاک تاشراوی هەبوو، سەروسیمای هەموو تۆز و خۆڵی ڕێگا بوو. لەگەڵ پیسی و نارێکی جلەکانیدا، لەگەڵ لەڕ و لاوازی جەستەیدا شتێک لە ڕوخساریدا بوو پادشا و ئەمیرە کۆنەکانی بیر مرۆڤ دەهێنایەوە. لەوە دەچوو دیمەنی ئەو شارە گێژیکردبێت، کە لە تاکسییەکە دابەزی و جانتاکەی لە سندوقەکە دەرهێنا، چاوانی بە ئەندازەیەک کرابوونەوە، پێدەچوو هەر ئێستا شتێکی ترسناکی بینیبێت. بە ماندووبوونێکی زۆرەوە، وەک یەکێک لاشەیەک ڕاکێشێت، جانتاکەی بەرەو ناو ئوتێلەکە ڕاکێشا. دوای بیستوچوار ساڵ یەکەمجاری بوو بگەڕێتەوە. کە پاسپۆرت و بەڵگە ئینگلیزییەکانی دا بە خاوەن ئوتێلەکە، دەنگێکی غەمگینی لێوەهات، ورتەیەکی کورت و خنکاو. خاوەن ئوتێلەکە پیاوێکی چکۆلانەی سمێڵ باریک بوو، لەو سمێڵانەی لە نیوەدێرێکی قرتاوی سەر نامەیەکی بۆر دەچن. کابرا سەری هەڵبڕی، وەک بوونەوەرێکی ناسروشتی و مەخلوقێکی ناشیرین ببینێت زەردەخەنەیەکی پیسی گرت. شتێکی چەپەڵ لە ڕوخساریدا بوو، مەکرێکی تێکەڵاو بە گومان و دڵپیسی. هەر کاتێک یەکێک لەم کوردانەی ئەوروپای بدیبایە، نەیدەتوانی پێنەکەنێت، هەموو ئەوانی بە کۆمەڵێک ئاژەڵی گێژ دەزانی کە دەتوانێت بە کەیفی خۆی

گاڵتە بە عەقڵیان بکات. ڕقێکی گەورەی لێیان بوو. بە هاوڕێکانی دەگووت، تا بۆم بکرێت قوڵیان دەبڕم، ئەی چۆن، ئەوان چین؟ کۆمەڵێک جانەوەرن پارەی مفتیان دەستکەوتووە. بەڵام پێدەچوو پێشتر کەسێکی وەها درێژ و لاوازی نەبینیبێت، کەسی نەبینبێت بەو چەشنە قژدرێژ و ڕەنگ بزرکاوبێت. کابرای میوان نیگایەکی وا پەشۆکاوی هەبوو، دەتگووت ئێستا لە شەڕە تفەنگێکی سەخت هاتۆتەدەرێ. گەرچی بە ڕوخسار و ڕەنگی پێستیدا گەنج دیاربوو، بەڵام سەری تەواو سپی بووبوو. تا ئەو کاتە هەر کوردێکی گەڕاوە ڕووی لەو ئوتێلە کردبێت، هەموو لووتبەرز و فیزن بوون، هەموو دەیانەوێت وەک جۆرە «تەیرێکی دانسقە» سەیربکرێن. بەڵام ئەمەیان پەشۆکاوتر و ئاڵۆزتر دیارە. لەگەڵ ئەو هەموو قەد و قامەتە بەرزەیدا، لەگەڵ ئەو ویقارە نهێنی و دەسەڵاتە سەیرەی ناو ڕوخساریدا شێت و بێئارام دەنوێنێت. خاوەن ئوتێلەکە بە لاقرتێیەوە گووتی «خۆشهاتیتەوە، بۆ کوردستان... بیرماندەکردی، چەند ساڵە تۆ لە کوێیت؟». بێئەوەی گوێبداتە ئەو خەندە چەپەڵەی سەر ڕوخساری کابرا، بە کوردییەکی ساف گووتی «ژوورێکی هێمنم بدەرێ، ژوورێکی هێمن». لەگەڵ وشەکاندا بە جدییەتێکی زۆرەوە سەیری کابرای کرد. خاوەن ئوتێلەکە کەمەکێک سڵەمییەوە و گووتی « بەسەرچاو هێمنترین ژوورت دەدەمێ».

پاش ئێستێک بە هەمان دەنگی قووڵ و غەمبارەوە، پەنجەی لە ڕووی کابرادا بەرزکردەوە و گووتی «باش پاسپۆرت و بەڵگەکان هەڵگرە، دوایی تۆ خۆت بەرپرسیاری، لە هیچ شوێنێکی دونیادا پاسپۆرتەکەم وننەبووە، تێدەگەیت، نامەوێت شتەکانم لێرە ونببن».

دەنگی بە جۆرێک بەهێز و نیگای بە ئەندازەیەک پڕ ویقار و دەسەڵات بوو، کابرا خەندەکەی شاردەوە و کەمەکێک گەڕایە دواوە. دیاربوو لە خەندە بێمانا و پیسەکانی خۆی پەشیمانە. بەڕێزێکی زۆرەوە گووتی

«کەس هیچی لەلای ئێمە وننابێت، بەڕێزتان دەتوانن پاسپۆرتەکە هەڵگرن و شوناسنامەکە جێبهێڵن، دەمانبورن، ئێمە شتی کەسمان ناوێت، بەڵام ئاسایش هەندێک شەو دێن و شوناسنامەکان دەپشکنن، ئەوە پێشمەرجی ئەوانە. هەرکەس شوناسنامەی نەبوو، نابێت لە ئوتێلدا بخەوێت».

بێ ئەوەی سەیری کابرابکات، گووتی «بە ئاسایشەکان بڵێ، ئەوەی شوناسنامەی نەبێت ئەرزی خودا زۆر و زەبەندەیە تیا بخەوێت». کابرا دڵنیابوو، ئەم پیاوە کەسێکی ئاسان نییە. پێشتر میوانی لەم جۆرەی نەبینیبوو. خۆی بە ڕێزێکی زۆرەوە جانتاکەی بۆ هەڵگرت و بەرەو ژووری ژمارە ٢١٣ پێشیکەوت. ئەوە باشترین ژووری ئوتێلەکە بوو، پەنجەرەکانی گەورە بوون، دیمەنەکەی خراپ نەبوو، کەمتر لە ژوورەکانی دیش دەنگی ماشێن و وڕەی پاسی دەگەیشتێ. جانتاکەی بۆ هێنایە ژوورێ و بە حورمەتەوە گووتی «بەڕێزتان پشووی خۆتان بدەن، ئاوی گەرم هەیە دەتوانن خۆتان بشۆن، گەر خواردنیشتان ویست بۆتان داوادەکەم، ئەم ناوە پڕە لە چێشتخانەی باش».

بێئەوەی وەڵامیبداتەوە، سەیرێکی ژوورەکەی کرد و دەستێکی بە دیوارەکاندا هێنا و لە ژێر لێوییەوە گووتی « تۆ دەتوانیت بڕۆیت، دەتوانیت بڕۆیت، دەمەوێت بە تەنهابم، نامەوێت هیچ بخۆم».

کابرا بە ئارامی دەرگاکەی داخست و بەجێیهێشت. کە کابرا ڕۆیشت، بە هێمنی کراسەکەی داکەند و لەسەر لێواری قەرەوێڵەکە دانیشت، ئێستێکی کورت چاوانی لێکنا و هەناسەیەکی قووڵی وەک هەناسەی یۆگییەکان هەڵکێشا، پاشان بەدەنگی بەرز گووتی«چەندم کات دەوێت، بۆ ئەوەی بیدۆزمەوە؟ چەندم کات دەوێت ؟ هەفتەیەک، مانگێک، ساڵێک... ؟؟». لەسەرەخۆ زریزەی جانتاکەی ڕاکێشا، لە بن ئەتڵەسێکی شڕەوە کە پتر لە بیستوچوار ساڵ بوو بەردەوام پێی بوو. فایلێکی شینی ئەستووری دەرهێنا و کردییەوە، نامەیەکی لە فایلەکە

دەرهێنا و لەسەرەخۆ دایخستەوە. پارچە کاغەزێکی سادە بوو، یەکێک بە دەستوخەتێکی ورد شتگەلێکی زۆری لەسەر نوسیبوو. وەک هەموو جارەکانی تر، یەکەمجار سەیری دواهەمین لاپەڕەی کرد، سەیری ناوی پشت کاغەزەکە «باران شوکور»، ناوی خوشکەزا غەمگینەکەی، تەنیا کچەکەی «گولستان شازەمان»ـی خوشکی. ئەو تاکە کەسێک بوو لە نیشتیمانەوە نامەی بۆ دەنارد. لەو پێنج ساڵەی دواییدا پتر لە سێ وسێ نامەی بۆ نوسیبوو، هەمیشە نامەکانی وا دەستیان پێدەکرد «خاڵی خۆشەویستم، بێزاری خەریکە دەمکوژێت». هەر سێ وسێ نامەکەی بەو جۆرە دەست پێدەکات، هەمووش بەوە کۆتایی دێن لە دوا سوچی بەتاڵی نامەکەدا، لە جێگایەکدا کە بە ئەستەم شوێن ماوەتەوە، نوسیوێتی « خوشکەزای ناکامی خۆت - باران شوکور». هەمیشە نونی بارانەکەی خستۆتە سەر ئەلفەکە، کافی شوکورەکەی بەرزکردۆتەوە، ئەلفی یەکەمی بارانەکەش وەک ئەوەی بفڕێت، بەرزبۆتەوە. نوسینێکی سەیرە، لە هەر جێگایەکی دونیادا بیبینێت دەیناسێتەوە. دواهەمین نامەی پێنج مانگ لەمەوبەر پێگەیشت، لەو کاتەوە ئیدی دەنگ و سەنگی نییە. لەو پێنج ساڵەدا، ئەم تەنیا سێ نامەی زۆر کورتی بۆ نوسیبوو، دڵنیاش نەبوو ئاخۆ نامەکانی گەیشتوون یان نا؟ بەڵام باران وەک دڵنیابێت ئەوی بەرامبەر گوێی لێدەگرێت و دەیخوێنێتەوە، نامەکانی بە قووڵی و ڕاستگۆیی بۆ نوسیوە. کاتێک دڵنیابوو ئیدی نامەی دیکەی بۆ نایەت، بڕیاریدا بگەڕێتەوە و سۆراغیبکات. لەبەر هۆیەکی نەزانراو، لەبەر ترسێکی قووڵ و ناوەکی ڕۆژ دوای ڕۆژ سەفەرەکەی دوادەخست، هەندێک ڕۆژ لە بەیانییەوە تا ئێوارێ بە ڕۆخی دەریادا پیاسەیدەکرد و چاوەڕوانی هاتنی نامەیەکی تر بوو، ئێواران دەچووە سەر بەردێکی گەورەی نزیک کەنار و قسەی لەگەڵ زەریادا دەکرد، لەو بیستوچوار ساڵەدا فێربووبوو کە دەبێت قسە لەگەڵ شتێکدا بکات، لەگەڵ بەردێکدا، یان گوڵێک، یان

باڵندەيەک. بەر لەو نامانە پەيوەندييەكی بە كوردستانەوە نەمابوو، هيچ پەيوەندييەک، نەيويستبوو شتێک لەو وڵاتەوە ببيستێت، هەتا هاوڕێيەكی كورديشی نەبوو. لە سەردەمی كارەساتە گەورەكاندا سەراسيمە بەرابەر تەلەفزيۆنەكان دانيشتبوو، ئازارە گەورەكانی خەڵكی بينيبوو، وەک هاودەردیی لەگەڵ هەموو ئادەميزادێكدا غەمی خواردبوو. بەڵام هەردەم شەوان ڕۆيشتبووە دەرێ، لە هەوای ئازاد و لە ژێر هەور و ئەستێرەدا مەست بووبوو، هيچ شتێكی نەكردبوو، ڕێگای نەدابوو هيچ ئازارێكی نيشتيمان قووڵ ببڕێت و تيژ بە ڕۆحيدا تێپەڕێت، ئەو دەيتوانی چی بكات؟ هيچ. لە بڕوايەكی قووڵەوە بڕياريدابوو غەم بۆ وڵات نەخوات، وەک زۆر لەوانەی ساڵگەلێكی بێشومار تاراوگە دەكەون، بۆ ساتێک هەستی نەكردبوو شوێنێكی هەيە ناوی نيشتيمانە. بەدرێژايی ژيانی گاڵتەی بە نيشتيمانپەروەری هاتبوو. نيشتيمان ئەو جێگايەبوو كە ئەو ساتە تيا دەژيا، ئەو چركەيەبوو كە بە ئارامی هەناسەی تيا هەڵدەمژی. زۆربەی ڕۆژ قژی دەشت، ڕيش و سمێڵی دەتاشی، جلی چەرمی لەبەردەكرد و سوار ماتۆڕێک دەبوو و وەک شێت بەسەر ئۆتۆبانە دووردرێژەكاندا دەڕۆی. نيشتيمان بۆنی ئەو درەختانەبوو كە با لە كەنارەوە دەيهێنايە سەر ئەو ڕاستە ڕێگا ئەژديها ڕەنگانە. كوردبوون لای ئەو پيربوون بوو وەک قەرەجێک لە سەر شەقام و ئۆتۆستڕادەكانی ئەم دونيايە. كوردبوون مانای ترس لە ديوار، هەڵهاتنێكی ئەزەلی لە بەربەستەكان. كوردبوون مانای وەک شێت ماتۆڕەكەت لێخوڕيت و ئاوڕنەدەيتەوە، مانای بتوانێت وەک ديلێک لە دۆزەخ هەڵهاتبێت، پێ بە بەنزيندا بنێيت و نەپرسی لە دوای منەوە چی لە دۆزەخدا ڕوودەدات. كوردبوون مانای ئەوەی تووشی دەردێک بووبيت هەموو ژيانت هەوڵبدەيت دۆزەخ لە بير خۆت بەريتەوە، هەموو شتێكی كردبوو بۆ ئەوەی دۆزەخی بيربچێتەوە. بەر لە پێنج ساڵ لە مەوبەر كە يەكەم نامەی بارانی بۆهات، نۆزدە ساڵ بوو هيچ

هەواڵێکی بۆ خوشک و دایکی نەناردبوووەوە، دەیویست هەموو دونیا وا تێبگات کە مردووە، دەیویست ئەو تەمەنەی ماویێتی وەک گەڕۆکێکی شێت بژی، بیرە بکڕێت و بیخواتەوە و قوتوەکانی بە پێ پانکاتەوە و بە خۆی بڵێت من بەختەوەرم. کڵاوێکی سووری ماتۆڕسوارەکان بکاتە سەر و لەگەڵ بادا وەک ڕاکێتێکی دەرپەڕیو بەرەو نادیار دەرچێت، لە ماتۆڕەکەی دابەزێت و سوار کەشتییەک بێت و نەپرسێت بۆ کوێ دەچێت، گرنگ ئەوەیە هەستبکات لە دۆزەخ دووردەکەوێتەوە، دەچێت بۆ جێگایەک هیچ شتێکی تێدا نییە کە وڵات و کورد و نیشتیمانی بیربخاتەوە. بەختەوەرترین ساتەکانی ئەو ساتانەبوون کە دەیزانی بەردەوامە لە هەڵهاتن، خۆشبەختترین کەس لای ئەو مەخلوقێک بوو هەمیشە هەڵبێت، هەمیشە بۆ پێشەوە دەربازبێت، وەک ئەسپێکی شێت تەکانبدات و نەزانێت بۆ کوێ غاردەدات. کوردبوون بۆ ئەو غاردانێکی بێبڕانەوە بوو وەک ئەسپ، بازدانێکی گەورەبوو بۆ ناو نادیار. گرنگ ئەوەبوو ئازاد بێت، دیوارێک نەبێت دیلیبکات، زنجیرێک نەبێت لەم سەر ئەستێرەیە کێشیبکاتە ناو چوار دیواری خۆی تا دانیشێت و بیربکاتەوە، بپرسێت من کێم؟ چیم؟ لە کوێوە هاتووم؟. دوای بیستوچوار ساڵ ئێستا لەم ئوتێلە پیسەدا دادەبەزی و لەم کونجەسەیرەدا دەگیرسایەوە. ئاخ خوایە باران شوکور کێیە؟ کێ دەڵێت هەڵەیەکی کوشندە لە هەموو گەمەکەدا نییە؟ کێ دەڵێت خوشکەزای وای هەیە. بەڵام باران شوکور هەر کەسێکە گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە بۆ پێنج مانگە نامەی بۆ نانوسێت؟.

بە پەشۆکانێکی زۆرەوە، وەک بیەوێت لە شتێک تێبگات، دواهەمین نامەی دەرهێنا و دووبارە بەدەنگی بەرز خوێندییەوە:

«بۆ خاڵی خۆشەویستم

من بێزاری خەریکە دەمکوژێت

لە نامەی پێشووتردا هەموو شتێکم بۆ باسکردیت، شتەکان زۆر خراپ دەڕۆن، هەستدەکەم مێردەکەم بە هەموو شتێک دەزانێت. ئەگەرچی من نامەکانی ئەو کوڕەم هەموو سووتان، ئەگەرچی دواجار پێمگووت نامەوێت ئیتر بتبینم، ئەگەرچی هیچ ئافرەتێک نییە لە دونیادا بتوانێت بەو کوڕە بڵێت «نامەوێت بتبینم». بەڵام شتەکان زۆر ترسناک دەچنە پێشێ. دوێنێ شەو ئاگاداربووم مێردەکەم ئەو پیاوەی هێنا... مورتەزای شەیتان... خودایە، خاڵۆ، تۆ نازانیت، ئەوە چ پیاوێکی خراپە. پێشتر کچێکی هاوڕێم بۆی باسکردوم، ئەو مەخلوقە ناشیرینە سەروفەساڵی لەهەر ماڵێکدا دەرکەوێت کارەساتێک ڕوودەدات. ئەوە دووەم جاری بوو بێت بۆ ماڵی ئێمە، دوێنێ وەک سەگ شانی سامانی مێردمی ماچکرد و بە پێکەنینێکی ناشیرین گووتی «بارۆنی کولەکە ئێوە هەرچییەکم پێبڵێن، هەر فەرمانێک لە ئێوەوە دەرچێت، بەسەرسەر جێبەجێیدەکەم». ویستم بزانم باسی چی دەکەن، بەڵام نەمتوانی، دەرگا و پەنجەرەکانیان هەموو داخست، لە ژوورێشەوە پەردەکەیان دادایەوە، ورتەیەکم نەبیست، پێدەچێت لە ژوورێشەوە بە چرپە قسەیان کردبێت، جارجار گوێم لە قاقاکانی مورتەزای شەیتان بوو، کە زۆرجار لە خۆیەوە پێدەکەنێت. ئەوە دووجارە یەکێکی نەناسیاو نامەیەکم بۆ دەنێرێت و پێمدەڵێت «بڕۆ، باران خان بڕۆ... چونکە بارۆن و مورتەزای شەیتان دەیانەوێت بتکوژن... بڕۆ». خاڵە تۆ نازانیت مورتەزا چ پیاوێکی ترسناکە... لەچەند ئاهەنگ و داوەتدا بینیومە، لە خۆیەوە پێکەنیوە. خاڵە گیان لە دوا ئاهەنگدا بەردەوام سەیری منی دەکرد، شەوێکی ناخۆش بوو. دەبوایە بچووینایە بۆ یانەی «نەمام». ئەوە یانەیەکی گەورەیە، تورکێکی پیس و پۆخڵ

دەبیات بەڕێوە، کە نە خۆی و نەژنەکەی لەو تورکانە ناچن کە لە سەتەلایتدا دەیانبینم. کچێکی هاوڕێم تورکیای بینیوە، یەعنی شوویکرد بە کوڕێک و چوو بۆ ئەستەمبول، دواتر نازانم چی ڕوویدا، ڕۆژێک بە گریانەوە گەڕایەوە و ئەڵقەکەی ناردەوە بۆ ماڵی کوڕەکە. ئەو دەڵێت تورکەکان گەر مەکیاج نەکەن و عەدەسە دانەنێن جوان نین. ئای خوایە، خەریکە وەک هەمیشە سەری تۆ بە شتی پڕوپوچەوە دەێشێنم، بەڵام من لێرەدا لە ناو ئەم ژن و پیاوانەدا لە شتی پڕوپوچ زیاتر هیچ نابیستم. ئەو شەوە شەڕێکی گەورەبوو لەسەر ئەوەی تورکەکان جوانترن یان ئێرانییەکان، خودای گەورە پیاوەکان هەموو چرپەچرپیان دەکرد و پێدەکەنین، ئێمەی ژنەکان هەموو دەمانزانی دەڵێن چی، ئینجا ئێمەی ژنەکانیش هەموو چرپەچرپمان کرد و پێکەنین. من سەیری چواردەوری خۆم دەکرد و نەمدەزانی چی بڵێم، ژنێکی تێدابوو دەیگووت «وەی ئێوە چوزانن، من لە تاران ژیاوم، بەو خوایە کوڕی فارس لێیان جوانتر نییە». من بۆ ئەوەی زۆر گەمژە دیارنەبم، بەراوردی دوو گۆرانیبێژی کۆنی ئێرانی و تورکم بەیەکدی کرد، کچێک گووتی «ڕەزات خواتەوە چەند کۆنی، کەی مۆدی ئەوانەوە ماوە، ئێستا مۆدی مەنسور و تارکانە»... لێرە بە دەگمەن یەکێکی عاقڵ دەدۆزمەوە قسەی لەگەڵدا بکەم، هەموو دەڵێن کچ ئەو شتانەی ناوێت. هەموو دەڵێن من بەختەوەترین کەسم، مێردەکەم دەوڵەمەنترین پیاوە، کەچی بێزاری خەریکە دەمکوژێت. ئەو شەوە لە ئاهەنگەکەدا مورتەزای شەیتان زۆر سەیریکردم، هەر جارێک کە سەیریدەکردم پێدەکەنی، ئەو دانە زەرد و زەقانەی دەمترسێنێت. سەرەتا لەسەر مێزێکی تر دانیشتبوو، لەوێشەوە سەیریدەکردم، کچەکەی تەنیشتم چپانی بە گوێمدا «خوا ڕەحمبکات، مورتەزا زۆر سەیرتدەکات» هەموو ژنەکانی سەر مێزەکە بە چرپە بەیەکیان دەگووت کە مورتەزا زۆر سەیری من دەکات. ژنێکیان

دەستی خستە سەر دڵی و گووتی « توخوا وامەڵێن... لەوانەیە هیچ نەبێت، ئەو ددان سەگە ئەمانی نییە». من بە درێژایی ئەو شەوە ویستم سەیری نەکەم، بەڵام پاش ماوەیەک هاتە سەر مێزەکەمان، بە زەردەخەنە پیس و چەپەڵەکانی خۆیەوە بێئەوەی شەرم لە مێردەکەم بکات، بە دەنگی بەرز گووتی «باران خان، ئەمشەو زۆر جوانیت». خوایە گیان، خۆ ئێرە ئەورووپا نییە، کەس لێرە ناتوانێت لە ناو کۆمەڵێک خەڵکدا بە دەنگی بەرز بە ژنی کەس بڵێت «تۆ جوانیت». با من جوان بم، پیاو نابێت بە دەنگی بەرز پێمبڵێت «تۆ جوانیت». مێردەکەم هیچ قسەی نەکرد، هیچ، من وامدەزانی تورەدەبێت. جار بووە لەسەر شتی بچوکتر تورەبووە. کەچی گووتی «جوان دەبێت، بۆ جوان نابێت، خەریکە خوێندنەکەی بۆ دەردەچێت، دەڕوات بۆ ئینگلتەرە یان ئەڵمانیا». هەموو حەپەسان، هەموو سەیری منیان کرد، من نەمدەزانی بڵێم چی، خودا دەزانێت ئاگام لە شتی وا نییە، یەکەمین جار بوو شتی وابیبستم. مورتەزا بە دەنگێکی زۆر بەرز پێکەنی، بە ماناوە سەیریکردم و گووتی «ژنی بارۆنی کولەکە شایستەی هەموو شتێکە». من زۆر پەستدەبووم کە پێیاندەگووتم ژنی بارۆنی کولەکە. هەستمکرد شتێکی قورس بەر گەروم دەگرێت، هەموو سەیری منیان دەکرد و پێدەکەنین، من خەریک بوو دەستبکەم بە گریان. بۆ ئەوەی لە بەرچاوی ئەوان نەگریم، جانتاکەم هەڵگرت و چووم بۆ تەوالێتەکان. کە هەستام لەهەموو مێزەکانەوە سەیریاندەکردم، هەموو مێزەکان. کە بەلای ئەو پیاوە سەرخۆشانەدا تێپەڕیم، یەکی توانجێکیان تێگرتم. لە تەوالێتەکە بێئەوەی گوێبدەمە مەکیاجەکەم، بێئەوەی گوێبدەمە کراسە شیفۆن و گرانبەهاکەم گریام، زۆر گریام. کە ژنێکی تر هاتە ژوورەوە، بۆ ئەوەی زۆر گوێی لە هەنسکم نەبێت خۆم گرت، بەپەلە چاوم سڕی، بە پەلە ماسکاراکەم دەرهێنا، بە

پەلە خۆم بە جۆرێک بۆیەکردەوە کەس نەزانێت گریاوم. بەڵام هەر کەس سەیریبکردمایە دەیزانی گریاوم. ئەو شەوە ئیتر قسەم نەکرد. کە گەڕاینەوە مێردەکەم مەست بوو، کە مەستدەبێت دەتوانێت باشتر درۆبکات، پیاوەکانی ئێرە کە مەستدەبن باشتر درۆدەکەن، هەموو ئەو درۆیانەی بە هوشیاری بۆیان ناکرێت بە مەستی دەیکەن. لە ئوتومبیلەکەدا بەمنی گووت «خرپن گیان، ئەی چۆن، دەتنێرم بۆ ئەڵمانیا. هەموویان وا دەکەن، ژن و کچی خۆیان دەنێرن بۆ دەرەوە، تۆ بۆ وانەکەیت، خۆ تۆ لەوان کەمتر نیت، تۆ ناڵێیت خاڵێکم هەیە لە خاریج. چی دەکەیت، ماوەیەک بچۆ بۆ لای ئەو». من دەمزانی درۆدەکات، پێمگووت بۆ درۆم لەگەڵدا دەکەیت، بۆ؟ من ژنی تۆم. بە نازکی سەیریکردم و گووتی «وییشش بەبە گیان، چۆن دەتوانم درۆ لەگەڵ تۆدا بکەم». ئینجا بە خێرایی لێیخوڕیی... بە خێرایی، وەک ئەوەی تووڕە بووبێت، وەک ئەوەی گاڵتەی بە من بێت، گاڵتەی بە هەموو قسەکانم بێت، لە ناکاو ئوتومبیلەکەی وەستان و پڕ بە دونیا قیژاندی «ئەی تۆ چۆن دەتوانیت درۆ لەگەڵ مندا بکەیت، تۆ؟». من دەستمکرد بە گریان و هیچم نەگووت، نەمدەزانی چی بڵێم، نەمدەزانی ئەو ڕاستدەکات یان من؟. ئەو شەوە بە جیا خەوتین، لەو شەوەوە دەترسم. خاڵە گیان خۆزگە تۆ لێرە دەبوویت. ئێستا لێیدەترسم. هەر شتێکم بۆ ڕوونبێتەوە بۆت دەنوسم، هەر شتێک، هیوادارم لێم زویر نەبیت، دەزانم دێیتەوە، من دەزانم، گرنگ ئەوەیە بتبینم و باوەشت پیابکەم. غەم لە من مەخۆ، غەم لەم خوشکەزا غەمگینەت مەخۆ. ئەگەرچی هەندێجار زۆر هەست بە لاوازیی دەکەم، بەڵام هەندێجار هەستدەکەم زۆر بەهێزم. ئەگەرچی هەندێجار هەست بە ترس دەکەم، بەڵام هەندێجاریش هەستدەکەم لە هیچ ناترسم. دەبێت ئاگات لە خۆت بێت، لێرە دەڵێن ئەوروپا زۆر ساردە. هەندێجار لە سەتەلایتەکەدا

سەیری کەناڵەکانی ئێوە دەکەم، دەڵێم خوایە چەند خۆشە خاڵم لەو جێگا خۆشانە دەژی. لە بەر من ئاگات لە خۆت بێت، زۆر زوو نامەی ترت بۆ دەنوسم، بەلام هەر چییەک بوو نیگەران مەبە. وەعدم بەریێ نیگەران نەبیت. باشە؟. چاوانت ماچدەکەم. خوشکەزای ناکامی خۆت - باران شوکور»

سەدجار ئەو نامەیەی خوێندبووەوە، شتێکی ئەوتۆ گرنگی تیانەبوو. کاغەزێکی سادەبوو، کچێکی سادە نوسیبووی. نامەیەک بوو وەک هەموو نامەکانی دیکەی دونیا، بەلام هەر جارێک دەیخوێندەوە دڵی لەتدەبوو. لە رێگای نامەکانی ئەوەوە زانیبووی کە خوشکەکەی مردوە، کچێکی تەنیا بوو، نە دایکی هەبوو نە باوک و نە برا. رەنگە ئەو بێکەسییەی وایکردبێت هانا بۆ ئەو بەرێت. بەلام بۆ پێنج مانگە هیچ نانێرێت، بۆ؟. هەستا و لە پەنجەرەکەوە سەیری گۆشەیەکی بچوکی ئەو شارەی کرد، هیچ شتێکی لە شاری یادگارەکانی ئەو نەدەچوو، شارێکی تربوو. دەستێکی تری لە دیوارەکانی ژوورەکە دایەوە و بڕیاریدا کەمێک بخەوێت، ئێجگار ماندووبوو، پتر لە سی و شەش سەعات بوو بە تەواوەتی نەخەوتبوو. هەموو ژیانی لە سەفەردا بردبووە سەر، بەلام بیری نایەت هیچ کات وا ماندووبووبێت. خۆی نەیزانی چۆن خەوی لێکەوت، کە بە ئاگا هاتەوە سەری بە جۆرێکی سەیر بەلادا کەوتبوو، سەرەنجیدا سێ سەعاتە خەوتووە و بەردەوام لە خەویدا لەسەر دیوارێکی دوور و درێژ و بێکۆتایی ئیشدەکات. لە دڵی خۆیدا گوتی دەبێت سەرلەنوێ لێرەوە دەست پێبکەمەوە. ئیدی هێدی هێدی شەو دادەهات، دەبووایە هەستێت و بڕوات. دەبووایە نەوەستێت... بەلام نەیدەزانی بچێت بۆ کوێ و چ ئاڕاستەیەک بگرێت؟.

# دوای شۆڕش، باشترە مرۆڤ ماوەیەك بچێتەوە خەڵوەت
# «حەسەن تۆفان - دوای ڕاپەڕین»

دوای ئەوەی وازم لە حیزب هێنا و گەڕامەوە بۆ ماڵێ، ڕۆژێکیان یەکێک لە بەرپرسە بەرزەکانی حیزبی نەیار و ئەغیارمان کە دەمێک ساڵ بوو لە یەکدیمان دەکوشت، هات بۆ لام و گووتی «حەسەن تۆفان، تۆ باشترین تەقەکەر و ئازاترین چەک بەدەستی وڵاتی ئێمەیت، ئێمە دەزانین تۆ چ خزمەتێکی گەورەت کردوە، دەزانین خەڵکێکی زۆرت لەبۆ دوژمنانی ئێمە لە گۆڕناوە، هەر کەسێک تۆ تەقەت لێکردبێت، ناوەکەیمان لایە، ئێستا حیزبمان پێشنیارت بۆ دەکات، بێیتە ریزەکانی ئێمەوە، هەر شتێکیش داوا بکەیت ئێمە دەینێینە بانچاو». ئەوە سەرەتای سەردەمێک بوو، شبر دواتر ناویدەنا «سەردەمی کڕینی ئینسان». من بەو پیاوە گەورەیەم گووت «من بڕیارمداوە کەس نەکوژم، تازە بە کەڵکی سیاسەت نەماوم، دەمەوێت چەند ساڵێک لە ماڵی خۆمدا دانیشم و هیچ نەکەم». کابرا زۆری لەگەڵمدا گووت، تەماحێکی باشی خستەبەرم، نرخێکی بۆدانام لەو سەردەمەدا وەک پارەیەکی خەیاڵی سەیردەکرا، قسەکانی هەندێک وردە هەڕەشەشی تێدابوو. بەڵام بەندە گووتم «سەروەرم، من ئارەزوویەکم لە ئیشەکە نەماوە، ئێستا بازاڕ پڕبووە لە منداڵ و مەزن، بە پارەی لەوە کەمتر نەهەنگت لە بەحردا بۆ سەردەبڕن، هەق نییە ئێوە بەو جۆرە یاری بە بودجەی حیزب بکەن، دواجار پیاوکوشتن هەر پیاوکوشتنە، منیش مەعدەنێکی وەها دانسقە نیم، خەڵک زۆرن لە من باشترن، هەقی خۆیەتی بۆ ئەوانە بگەڕێن. من دەمەوێت واز لەم شەڕواڵە بهێنم و دوو سێ ساڵ بۆ خۆم بە بیجامەوە بژیم، لە منداڵییەوە حەزدەکەم چەند ساڵێک وەک خەڵک شەوانە شەڕواڵەکەم داکەنم و جلێکی تر لە بەربکەم،

کەمێک پشوویدەم و لەگەڵ دایکمدا خەریکی گوڵاو دروستکردن بم». کابرا گووتی « حەسەن تۆفان، تۆ پیاوێکی پیاوانەیت، گوڵاوی دایکیشت لە شاردا دانسقەیە، ئێمە دەزانین پیاوکوژ لەم شارەدا هەزاری بە فلسێکە، بەڵام دەزانین ئێوە خەڵکی خاوەن بڕوان، دەست و خەتی ئێوە شتێکی ترە، متمانە و ناوی ئێوە بۆ ئێمە شوێنێکی زۆر دەگرێت. هەموو کوشتنێک وەک دروستکردنی مەتەڵێک وایە، پرسیارێکە و دەبێت ئاسان شینەکرێتەوە، نهێنییەکە و دەبێت تەلیسمی نەشکێت و گرێی نەکرێتەوە، ئیشەکەی ئێوە جۆرێکە لە کاری هونەری کە عەقڵ و بیرکردنەوەی دەوێت. ئێمە ئیشی گەورە و کاری ئاڵۆزمان هەیە کە بە منداڵ و مەزن ناکرێن، کوشتن هەست و تێفکرینە، وەک دروستکردنی نیگارێک و نوسینی شیعرێک وایە، لوغزسازی و فاقەکارییە». کابرا لەو قسانەی زۆر بۆ کردم، بەڵام من هیچیانم نەبیست. کابرا تێنەدەگەیشت، بۆ من لە ناکاو گۆڕاوم و وازم لە هەموو شتێک هێناوە. منیش سەرسامی ئەوەبووم، کە چی درزێک کەوتۆتە ئاسمان، نرخی پیاوکوژێکی نەفامی وەک من چۆتە حەوا و بەهای مرواری و ئەڵماسم وەرگرتووە. دواتر زانیم کە ئێمە مەعشەری پیاوکوژانی پێش ڕاپەڕین، لە هەر گروە و تاقمێک بین، هەموومان دوای ڕاپەڕین شتێک لە زیری و غەمۆکیمان تێدا دروستبووە. هەموومان هەستمان وابوو حیزبی خۆمان بێقەدری بەرابەرکردوین، ئیدی ژمارەیەک لە پیاوکوژ و تفەنگچیانی ئەولا دزەیانکردبووە لای ئێمە، ئەوبەریش دەیانەویست تۆڵەبکەنەوە و ئێمە بە پارەی زۆر بکڕن و بمانبەنە بەری خۆیان. دەبێت بڵێم ئێمە لەو داشانە بووین کە ڕۆژێک لە ڕۆژان شوێنێکی نەگۆڕمان لە ناو یارییەکەدا نەبووە، دارتاشێک بووین هەم تەختی سوڵتان و هەم بلوێری منداڵیشمان دروستدەکرد. کارمان بەوەوە نەمابوو کێ کێ دەکوژێت، گرنگ ئەوەبوو سەنعەتەکە بمێنێت و ئیشەکە بگەڕێ. من نەمدەزانی ئەم پیشەیەی ئێمە لە چ ئانوساتێکدا

پەیوەندی بە هیچەوە نەماوە. برادەرەکانم وەک ئەو بەرگدرووە لاتانەیان لێهاتبوو کە کورتانی کەر و کەوای پادشاشیان دەدوریی. بەڵام من وازمهێنا و بە بێدەنگی ماڵاوایی لە هەموو شتێک کرد و چوومەوە بۆ لای دایکم و بە کەوگیرێکەوە بەدیار مەنجەڵە پڕ گوڵەباغەکانی ئەوەوە دانیشتم. لە ساڵانی شەڕی ناوخۆدا، من لە بری شەڕ و خەڵک کوشتن، لەگەڵ دایکمدا خەریکی دروستکردنی ئەو شوشە گوڵاوانە بووم کە دەیانکرد بە کوژراوەکانەوە. خۆشحاڵبووم دواجار شتێکی باش بۆ شەهیدەکان دەکەم. دەمگووت، گەر بێت و زەمەن بگەڕێتەوە دواوە، لەگەڵ دایکمدا تەنیا خەریکی گوڵاو دروستکردن دەبم. لەسەردەمی شەڕی ناوخۆدا هەندێک لە هاوڕێکانم نرخیان بە جۆرێکی سەیر فڕی، هەندێکیان لە پلەوپایەی سیاسیدا بەرزبوونەوە و وایان لێهات خەڵکی وەک من بە ئاسانی نەدەگەیشتە بەر قاپی ژوورەکانیان، هەندێکیان تێوەگلان و خەڵکانێکیان کوشت نەیاری وڵاتانی دیبوون و بۆ داڵدە و پەنا هاتبوونە شار و مەملەکەتی ئێمە، هەندێکیان هەر وەک جاران مانەوە و بوونە پیاوکوژی زۆر ڕیسوا کە بە پارەی زۆر کەم خەڵکی زۆر سادە و بەستەزمانیان دەکوشت. ساڵانی شەڕی ناوخۆ، هەندێکات باری دەروونیم تێکدەچوو، هەندێکاتی دیش باش و بەختیار و خۆشبەخت بووم. کاتێکی زۆرم لەگەڵ ئەو پیرێژنانەدا دەبردەسەر کە دەهاتن بۆ لای دایکم و لە زەمین و باغێکی خەیاڵییەوە گوڵیان بۆ دەهێنایین تا گوڵاویان لێبگرین. من سوودێکی زۆرم لە حیکمەتی ئەوان بینی، هەرکات تووشی غەمۆکی دەبووم گژوگیای ئەوتۆیان بۆ پەیدادەکردم و ئاوێتەی ئەوتۆیان بۆ دەگرتمەوە دەمودەست دەیکردمەوە بە مرۆڤێکی خۆشحاڵ و ڕوو بە خەندە. بۆنی ئەو گوڵانە منیان بەجۆرێکی سەیر بە ماڵی خۆمانەوە گرێدا، کە بە پێچەوانەی بۆنی پیسی دونیای دەرەوە، هێند سیحراوی بوو، وەها لە دڵمەوە ئاڵا، نەیهێشت بجوڵێم و وەک زنجیر

پێبەستیکردم. ئەو بۆنە خۆشانە، ئەو گوڵە سیحراویانە منیان کرد بە بوونەوەرێکی ماڵی. من و دایکم پارەیەکی کەممان دەستدەکەوت، بەڵام زۆر ئاسوودەبووین. هەندێک شەو نەفامی سوار سەرم دەبوو و بێهیچ بەهانەیەک دەکەوتمە گێڕانەوەی چیرۆکی پیاوکوشتنەکانی خۆم بۆ دایکم، ئەو لە ژێر بەتانییەکەوە سەری دەردەهێنا و دەیگووت «ئەم بوختانە گەورانە بۆ خۆت مەکە، ئەم درۆ زلانە چیین بۆ پیرێژنێکی وەک منی دەکەیت، عەیب ناکەیت». دایکم لە منداڵییەوە بە درۆزنێکی بێشەرم و حەیام دەزانێت. لەو چەند ساڵەدا «شبر» سێ جار سەری لێدام و هەواڵی هاورێکانمانی لەگەڵ خۆیدا هێنا. من وەها لە دونیا بڕابووم، نەمدەزانی لەسەر زەوی چ باسە. کاتێک دەستم لە حیزب هەڵگرت و وازم لە هەموو شتێک هێنا، تەلەفزیۆن و ڕادیۆکەشم بەخشی و بڕیارمدا ئیدی گوێ لە دەنگوباس نەگرم. نیوەی موسیبەتی ئەم دونیایە بەهۆی دەنگوباسەوەیە، خەبەر خوێندنەوە لە دونیادا هەڵگرن، بزانن زەوی دەبێت بە چ مێرگێکی سەوز و بەچ هەوارێکی ئاسوودە. ئەو ڕۆژە نەگبەتی مرۆڤ دەست پێدەکات کە یەکەمجار گوێ لە هەواڵەکان دەگرێت، ئەوە دەردی گەورەی ژیانی من بوو. گەر باوکی ڕەحمەتیم ڕادیۆی نەکڕیبایە، لەوانەبوو ببم بە پزیشک یان ئەندازیار یان هەر شتێکی گرنگی تر. من گوێگرتن لە دەنگوباس و ڕاکردن بەدوای هەواڵدا و تێکەڵبوونێکی عاتیفی توند لەگەڵ ڕووداوەکاندا کردمی بە پیاوکوژ. هێندەی ئەو کرمەت تیا جولا گوێ لە هەواڵەکان بگریت، بزانە تیاچوویت، ئیدی بڵێ ماڵاوا ئەی بەختەوەری. چیدی گرنگ نییە لە دونیادا چ باسە، گرنگ ئەوەیە تۆ بۆ هەتاهەتایە بەدبەختیت و لە مەراقی پڕوپوچدا دەمریت. بۆ ئەوەی ئەو دەردە چارەبکەم بە جۆرێک لە دونیای دەرەوە دابڕام، نەمدەزانی لە شەڕی ناوخۆشدا کێ براوەیە و کێ دۆڕاو. شارەکەمان چەند جارێک گیرا و بەردرایەوە، بەندە هەمیشە درەنگ هەواڵم دەبیست. تاکە سەرچاوەی

زانیاریم ئەو پیرێژنانەبوون کە ڕۆژانە دەهاتن بۆلای دایکم، من درەنگ تێگەیشتم هەندێک لەو پیرێژنانە ئەهلی خەیاڵ بوون، ئەو ڕووداوانەی دەیانگێڕایەوە، ڕووداوی سەردەم و زەمانی تربوون. ئەوان شتەکانیان بەجۆرێک لای من تێکەڵاوکرد، دواتر بۆم نەدەخرانەوە جێی خۆیان. کە پیرێژنەکان دەهاتن و دەمپرسی «دەنگوباس چییە؟». باسی کوشتنی مەلیک غازیان دەکرد، ڕۆژی هاتنە سەرکاری ڕەشید عالیان وەک ڕوداوی ئەو ئانوساتە دەگێڕایەوە، لە نەخۆشییە ژنانەکانی مەلیکە عالییە ئاگاداریاندەکردمەوە، باسی فەرهودی چلەکانیان دەکرد، ورد و درشتی کۆچی جوولەکە بەستەزمانەکانیان بۆ فەلەستین دەگێڕایەوە، پێکەوە بۆ شاهەنشای ئێران و دکتۆر موسەدەق دەگریان، جنێوی زۆر خراپیان بە بەکر سدقی دەدا. منێک کە هیچم لە مێژوو نەدەزانی، بووم بە قوربانی ئەو ڕووداوە سەیر و خەیاڵیانەی پیرێژنەکان بۆیان دەگێڕامەوە، لە کاتێکدا دونیا لە دەرەوە دەور و زەمانێک دەژیا، من لەگەڵ دایکم و هاورێکانیدا بە سەربوردی دەور و زەمانێکی ترەوە خەریکبووم.

«شبر مستەفا» سێ جار هاتە لام. هەر سێ جارەکە حیزب نادربوویان تا لە خەڵوەتی خۆم دەرمبهێنێت و بگەڕێمەوە بۆ کارکردن. ئەو بە لاندکروزێکی بەرزەوە دەهاتە بەرماڵی من، بەڵام من بە بیجامەیەکی دڕاوەوە دەچوومە پێشوازی. جارێکیان دەستێک جلی کەتافی قاوەیی تۆخی لەبەردابوو، باڵای بچوک و سمێڵی وەک جاران زەرد و بریقەداربوو، کراسێکی سپی زۆر جوانی لە ژێر چۆغەکەوە پۆشیبوو، قژی وەک مۆدێلی باوی ئەو زەمانە بۆ سەرەوە هەڵدابووەوە. کە منی بەو کەوگیرەوە بینی پێیگووتم «بوویت بە ژنی ماڵەوە، ئەمجارە کە هاتم دەرپێیەکی کوودەریت بۆ دەهێنم، بە حیزب دەڵێم خەنە و وسمەت بۆ بکڕێت». گەر جاران یەکێک وای بگووتبایە دەمکوشت، سەردەمێک

کەس نەیدەوێرا قسەی وا بە حەسەن تۆفان بڵێت، هەموو پیاوکوژەکانی ئەم وڵاتە حیسابێکی تایبەتیان بۆ دەکردم، بەڵام ئێستا تەواو، کەس لە من ناترسێت. بە زەردەخەنەیەکی ساردەوە بە شبرم گووت «هەقە حیزب کوودەری بۆ خۆی بکڕێت، ئەو لە من زیاتر پێویستی پێیەتی، من ئیشێکی بچوکی خۆم هەیە و پێیدەژیم». شبر دڵسۆزانە باوەشی پیاکردم و گووتی «هەموو دڵمان لاتە، پێمانخۆش نییە تۆ وا دووریت. سابیر ئێستا لە حیزبدا زۆر گەورەیە، ئەو قەدر و قیمەتی تۆی لایە، دەتوانێت لە زێرت هەڵکێشێت». لە ڕاستیدا تێنەدەگەیشتم بۆ هەموان دەیانویست من لە زێر هەڵکێشن، من لەوە بێبەهرە و نەفامتربووم بەو جۆرە کەس لە زێرم بگرێت. دواتر هەر شبر خۆی هەموو شتێکی بۆ ڕوونکردمەوە و گووتی «ئەوە سەرەتای سەرهەڵدانی کڕین و فرۆشتنی ئینسان بوو. لەو قۆناغەدا هەر هێزە و لیستێک ناوی درێژی ئامادەدەکرد و نرخی لەسەر دادەنان، دەڵاڵەکانیان دەهاتن و سەوای نرخی خۆتیان لێدەکردیت. گرنگ ئەوە بوو مرۆڤ ناوی بگاتە ئەو لیستەیە، خەڵکانێک پارەی زۆریان دەدا تا یەکێک بیانخاتە لیستەکەوە... بازاڕێک بوو وەک بازاڕی کڕین و فرۆشتنی کۆیلە کۆنەکان، کاسبییەکی تازە و بەدەستکەوت بوو، گرنگ ئەوەبوو یەکێک بدۆزیتەوە بتکڕێت. لیستەکان پڕبوون لە ناوی جیاواز جیاواز. لەو سەردەمەدا حیزب پێویستی بە هەموو کەسێک بوو، دەیانەویست سەرمایەیەکی بەشەری گەورە کۆبکەنەوە تا تەواوی سوچ و کەلێن و پەنای ئەم دونیایە بگرن، ئیتر هەموو شوێنێکیان داگیرکرد، ئیدی وای لێهات جگە لە خەیاڵ شوێنێک نەمایەوە نەیکڕن».

شبر هەواڵی کوژرانی هەندێک لە برادەرە کۆنەکانی بۆ هێنام، هەر ئەو پێی ڕاگەیاندم جەعفەری مەغۆلی دوای سووکە برینداریيەک سەفەریکردوە بۆ هۆڵەندا. هەوڵەکانی شبر بۆ ڕاپێچکردنەوەی من بۆ

دونیای جاران بێسوودبوون، بەندە لەسەر مانەوەم لە ماڵەوە سووربووم، مرۆڤ تا دونیای خۆی بچوکبکاتەوە ئاسوودەتر دەژی. لە ڕاستیدا من بەراورد بە جاران ژیانێکی خۆشترم هەبوو، بەڵام ئاسوودەیش شتێکە مرۆڤ زوو لێی وەڕسدەبێت. هەندێجار زۆر بیری دەمانچە دێرینەکەمم دەکرد، هەندێک شەو دەرمدەهێنا و بۆنم پێوەدەکرد، دەمخستە سەر سنگی خۆم، بە خەیاڵ تەقەم لە هەندێک جانەوەری ترسناک دەکرد کە لە تاریکیدا بۆم دانیشتون. بیری ئەو ڕۆژانەم دەکرد کە لە مەترسیدا دەژیام. ئەو هەستەی کە ئاسوودەیی هێدی هێدی لە بێمێشکی و گەمژەیم زیاددەکات، غەمگین و دڵتەنگی دەکردم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەنەبووم بگەڕێمەوە بۆ ژیانی جاران. نزیکی شەش ساڵی ڕێک، دەرگای خۆمم بە کێلونێکی ئاسنینی گەورە کڵۆمدا و نەمهێشت شتێکی ئەوتۆ دەربارەی من دزەبکاتە دەرەوە. دوای ئەو هەموو ساڵە ئێستا دەڵێم، بریا هەموو هاوڕێکانم، چەند ساڵێک بەو جۆرە بگەڕابانایەتەوە ماڵێ و دەرگای ژوورەکانیان بە کێلونی ئەستوور بگرتبایە. ئەگەرچی دەزانم ڕای من شتێکی هێند گرنگ نییە، بەڵام دوای شۆڕش مرۆڤ چەند ساڵێکی دەوێت تا لەگەڵ سەردەمێکی تردا دەسازێت. من بە ئەزموونە هەژار و بێنرخەکەی خۆم دەمزانی ئەوانەی سەردەمێک دەڕوخێنن و وێرانیدەکەن، ناتوانن سەردەمێکی تر دروستبکەن. چۆن تفەنگ لە ناکاو نابێتە گوڵ، ئەو کەسەی مرۆڤیش دەکوژێت لە ناکاو نابێتە باغەوان. من نزیکی حەوت ساڵ تەنیاییم پێویست بوو بۆ ئەوەی لە مێژوو بچمەدەرێ، مێژووی تایبەتی خۆم و مێژووی ئەو چەندین ساڵە خوێنینەی دیمەنەکانی بەردەوام لەسەرمدا دەخولانەوە. پیرێژنە گوڵفرۆشەکانی هاوڕێی دایکم کە لە باغێکی ئەفسوناوییەوە گوڵیان دەهێنا، بۆ لە بیرکردنی ئەو دەور و زەمانە خوێنینە، کۆمەکێکی زۆریان پێکردم. مرۆڤ چەندە کارامە و ڕاستگۆ بێت تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت

دەتوانێت لە مێژوودا بژی، دوای ئەوە دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی. لەسەفەری دووەمدا بە شبر مستەفام گووت «شبر، من و تۆ وەک برا واین، ئامۆژگارییەکتدەکەم گوێم لێبگرە، بڕۆرەوە بۆ ماڵی خۆتان و چەند ساڵێک دەرگاکە لە خۆت داخە و مەیەرەدەرێ، ئێمە گەر دەمانەوێت ببینەوە بە مرۆڤی ئاسایی پێویستیمان بە خەڵوەتێک هەیە. مرۆڤی شۆڕشگێر ئەو کەسەیە کە شۆڕش تەواوبوو بڕواتەوە بۆ ماڵێ و هەوڵبدات هەموو شتەکان لەیادبکات، من ئەو ڕۆژە کە ئەو ژنەم کوشت و گەڕامەوە بۆ ماڵی جەعفەر مەغۆلی، هەموو گیانم خوێن بوو. ئەو ڕۆژە گووتم، سەردەمی خۆش و جوان بە من دروستناکرێت. گووتم، ئێستا کاتی ئەوەیە بڕۆمەوە بۆ ماڵێ و پشوویدەم. ئیدی جلەکانم گۆڕی و هاتمەوە بۆلای دایکم. مرۆڤ بە شەڕواڵێکی خوێناوییەوە ناتوانێت پاشەڕۆژ دروستبکات. شبر تۆ وەک برای گیانی بە گیانی من وایت، بەقسەم بکە و بڕۆ خەڵوەتێک بۆ خۆت دروستبکە».

بەقسەی نەکردم، شەش مانگ دوای ئەوە لە شەوێکی تاریکدا، کەسێکی نەناس تەقەی لێکرد و لە ناوکەوەڕا بۆ خوارێ ئیفلیج بوو. ئێستا تەواوی ژیانی لەسەر عەرەبانەی کەمئەندامان دەباتەسەر، زۆرجار دەچم بۆ لای و دەیهێنمە ناو بازاڕ، هەندێجار دەگری و دەڵێت «دەبایە بە قسەی تۆ بکەم، دەبایە زوو وازبهێنم». کوڕێکی جوان بوو، زۆر زوو ژیانی وێرانبوو. هەر کاتێک خوشکەکەی کاری هەبێت، من لەگەڵیدا دەچم بۆ وەرگرتنی موچەکەی. جارێکیان لەو سەرە دووروودرێژەدا کچێکی چاوسەوزی ناسی، کە ئەویش خوشکێکی لەسەر عەرەبانە دەیهێنا مانگانەکەی وەرگرێت. زۆر حەزیان لەیەککرد. نە شبر دەیتوانی ئەو بهێنێت، نەئەویش دەیتوانی شووبکات، بەڵام خۆشەویستییەکی گەورە لە نێوانیاندا دروستبوو، ئەوە ماوەیەک دونیای بیر شبر بردەوە و بوو بە کەسێکی ناسکی دوور لە حیزب و سیاسەت. ساڵانی دواتر کە گەڕامەوە

بۆ دونیا و لەگەڵ غەزەلنوسدا بووم بە هاوڕێ، شبر یارمەتییەکی زۆری داین لەو ڕۆژگارانە تێبگەین.

## گەڕان بە دوای موراد جەمیلدا
## «ماجیدی گوڵ سۆلاف - بەهاری ٢٠٠٤»

ببورن، من ماجەلانی خەیاڵیم، کە لەسەرەتادا باسی دۆزینەوەی لاشەکەی موراد جەمیلم بۆ کردن. دەزانم ئێستا ئەو مردوە بەستەزمانەتان بیرچۆتەوە، بەجۆرێک لە وردەکاری ئەم چیرۆکەدا نوقمبوون خەریکە مەیتی ئەو کوڕە بەستەزمانە فەرامۆشدەکەن. وا نابێت... ئێوە چۆن خوێنەرێکن، یاخود بێئارام و کەم هەناسە و کورتبینن، یان لە بەشێکەوە تا بەشێکی دی شتەکانتان بیردەچێتەوە. هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم ئێوە لاشەکەی موراد جەمیل لە بیربکەن و وابزانن هەروا سەرپێی ناوی هاتووە. من دوای ئەو شەوەی لەگەڵ غەزەلنوس و تۆفان و دەرسیم تامیردا ئەو لاشەیەمان دەرهێنا، خەوم لێنەکەوت، لەوکاتەوە هەستدەکەم ئەو لاشەیە لێمەوە نزیکە و بەردەوام لەگەڵمدا دەڕوات. ئەو شەوە کە لە شوێن مەرگی ئەو دوورکەوتینەوە هەستێکی نادیار لە دڵمدا بوو کە من لە لاشەی خۆم دووردەکەومەوە. تا ئەو شەوەش من بەراورد بە هاوڕێکانم لە ژیان دوورتر و لە زیندەگی تۆراوتربووم، بە جۆرێکی دەردناسا خۆم تووشی ئەو سەفەرە خەیاڵییەی ناو ڕوبار و جەنگەڵ کردبوو. بەڵام بینینی ئەو لاشەیە منی هێنایەوە سەر زەوی و پڕیکردم لە دەرد و پەژارەی دونیایی، کە گەلێک لە دەرد و پەژارەی خەیاڵی بەسوێترن. من کە وەک لۆردێکی ئینگلیزی بە خۆم و چاکەتە درێژەکانمەوە بە شاردا دەڕۆیشتم و هەوا و فیزم دەفرۆشت، بینینی دەموچاوی ئەو

کوڕە گەنجە ماوەیەک خەیاڵی کوشتم و وانەکانی خۆم لە پۆلی منداڵە نابیناکاندا وەستان. کە دەخەوتم بەردەوام خۆم لە شوێنی ئەو لاشەیەدا دەبینی، لە نیهانی خۆمدا دەمگووت، سزای ئەوەی ئێمە لە شوێنی خۆی جوڵاندومانە، وەک مردوویەکی بێچارە ئاسودەییمان تێکداوە، دەبێت هەروا فەرامۆشی نەکەین و شتێکی بۆبکەین. حەزمدەکرد بۆ ئەوەی خۆم لە شێوە و بۆن و دەسەڵاتی بپارێزم بکەومە خزمەتکردنی. ڕۆژێک دوای دۆزینەوەی لاشەکە، هەموومان بە ئامادەبوونی تریفە یابەحری کۆبووینەوە. من وەها بێچارە و دەستەپاچەبووم نەمدەزانی چ جۆرە پێشنیارێک بکەم، ئەوان هەرگیز پێشنیارەکانی منیان قەبووڵ نەدەکرد، بیرم نایەت جارێک لە جارەکان کەس نرخی بۆ پێشنیارێکی من دانابێت. تریفە ئەو ڕۆژە پێچەوانەوەی نەریتی خۆی، تەنورەیەکی سووری لەبەرکردبوو، جووتێک بووتی سوور، چاکەتێکی سوور، سوراوێکی سوور، وام هەستکرد بۆ وێرانکردنی خەیاڵی من وادەکات. من لەوانەبووم کە ڕەنگی سوور خەیاڵی دەکوشتم. ئەو ڕۆژە بێدەنگ دانیشتم و خۆم وا نیشاندا مەسەلەکە بۆ من شتێکی زۆر گرنگ نییە. ئەز دەتوانم لە هەندێک باسوخواسدا، خۆم وەک کەسێکی بێمەبەست نیشانبدەم کە کاری بە شتەکانەوە نییە و تەنیا لە فزوڵێکی سارد و بێباکییەکی جەنتڵانەوە پرسیاردەکات. ئەوە یەکەمجاربوو حیکایەتی لاشەیەک ببێتە شوێن قسەی ئێمە. حەسەن تۆفان لە هەمووان وردتر سەیری شتەکانی دەکرد، خۆتان دەزانن پیاوکوشتن ئیشی دێرینەی خۆی بووە. دەم هەراشێکی منگن بوو، بە هەستێکی ڕاستگۆ و جوانەوە ترسەکانی خۆی دەخستەڕوو. ئەو پیاوکوژانە کە پەشیماندەبنەوە مرۆڤی زۆر قەشەنگیان لێدەردەچێت، هێندە جوان و ڕاستگۆ دێنەوە مەیدان، هەر کەسێک بیانبینێت لە ناخەوە دەڵێت ئاخ خودایە من بۆ پیاوکوژێکی دەستخەڕۆ و پەشیمان نەبووم، تا دواتر ئاوها جوان و پاک لەسەر زەوی بڕوێمەوە.

ئـەو ڕۆژە پێیگوتیـن «گـەر جەعفـەری مەغۆلـی دەسـتی لـە ئیشـەکەدا هەبێـت، دەبێـت دەسـت لـەوە بشـۆین هیچمـان بـە ئاسـانی دەسـتبکەوێت، ئـەوە یەعنـی گرێکـە لـەوە توندتـر و ئیشـەکە لـەوە سـەختترە بـە کۆمەڵـە نەشـارەزایەکی وەک ئێمـە بکرێتـەوە، ئـەوە مانـای دەسـتی زۆر گـەورە لـە مەسەلەکەدا هەیـە، جەعفـەری مەغۆلـی ڕۆژێـک لـە ڕۆژان کەسـی بۆ حیسابی خـۆی نەکوشـتوە. خـۆی کوڕێکـی بێوەیـە، کێشـەی لەگـەڵ کەسـدا نییـە».

تۆفـان لەوانـە نەبـوو ئاسـان کۆڵبـدات، مەیـل و ئارەزووەکانـی بـە جۆرێـک گۆڕابـوون خۆشـی بـاوەڕی نەدەکـرد. لـە پیاوکوژێکـی دەسـتبەکارەوە بووبـوو بـە جـۆرە مرۆڤێکـی دەسـت و دڵپـاک. حەسـەن بـەراورد بـە مـن پیاوێکـی زۆر نەخوێنـدەوار بـوو، هەتـا بـەراورد بـە غەزەلنـوس و تریفـەش شـتێکی ئەوتـۆی لـە زانسـت و ماریفـەت نەدەزانـی، بـەڵام دەمهەراشـییەکانی خاڵـی نەبـوون لـە هەندێـک دیـوی فەلسـەفی. نازانـم بـۆ ئـەو ڕۆژە ئاغـای تۆفـان منـی پێشـنیارکرد زانیـاری دەربـارەی مـوراد جەمیـل کۆبکەمـەوە. هەڵبـەت گـەر خـۆم پێشـنیاری لـەو چەشـنەم بکردبایـە کـەس نەیدەبیسـت، بـەڵام بـەوەدا حەسـەن تۆفـان کردبـووی هەمـووان قەبووڵیـان بـوو. هەسـتمکرد غەزەلنـوس زۆر مەبەسـتێتی دوای چیرۆکـی ئـەو مردنـە بکەویـن... لەگەڵ ئەو هەستەشـدا کـە مـن لـە دەسـت و نیـگا و سەرسـامییەکانی غەزەلنوسـدا دەمبینـی، ئـەو بـە زار هیچـی نەدرکانـد و ڕوو بـە ڕوو داوای هیچـی لـە مـن نەکـرد. ئـەو کات نەمدەزانـی ئـەم چیرۆکـە هـەر یەکەمـان دەباتـە سـەر بنـج و بناوانـی ڕۆحـی خـۆی. لەڕاسـتیدا مـن نەمدەزانـی چـۆن و لـە کوێـوە دەسـت پێبکـەم، بـەڵام وەک قەرزدارێـک لـە ژێـر منەتـی یەکێکـی دیـدا بناڵێنێـت، دەبایـە هـەر چییەکـم کـردوە و هـەر ڕەنجێکـم داوە بـەو کارە هەسـتم. خولیـام بـوو دواجـار لـە حیکایەتێکـەوە تێوەگلێـم لـە خـۆم گەورەتـر بێـت. لـە مێـژە حەزدەکـەم تێکـەڵاوی گێژمـە و کێشـەیەکی وەهابـم، ژیانـم بکاتـە فلیمێکـی قەشـەنگ. گەلێـک ئیرەییـم بـە حەسـەن تۆفـان و حیکایەتەکانـی دەبـرد، ژیانـی هەمـوو

ئەوانی دی لە ژیانی من پڕتر و زیندووتربوو. هەرکات بە دیار فلیمێکی تۆم هانکس، جۆرج کلۆنی، جیم کاری و تیم ڕۆبنز و ئەوانی ترەوە دادەنیشتم دەستمدەکرد بە گریان. ئاخر گەر دەرهێنەرێک بیویستبایە ژیانی من بکاتە فلیم دەبایە وێنەی چی بگرێت؟ وێنەی گەنجێک بگرێت کە پێیوایە لە جۆنی دێپ دەچێت، خۆی وەک گەنجێکی غەریبزەدەی قۆز نیشاندەدات کە بە چاکەت و پانتۆڵێکی هەمیشە ئوتوکراوەوە لە شارێکی پیس وپۆخڵدا لەوپەڕی دونیا شەو و ڕۆژ بەسێ چوار جادەی تۆزاوی و پیسدا بێهودە دەسوڕێتەوە. ژیانی من دەبایە شتێکی ترسناکی تێدابێت تا لە ژیانی مرۆڤەکانی تر بچێت.

ئەو ڕۆژە، وەک غەزەلنوس بیەوێت لە زەریای خەیاڵات دەرمبهێنێت و ڕێگای دونیایەکی دیکەم نیشانبدات، هەندێک زانیاری دەربارەی ژیانی موراد جەمیل خستە بەردەستم، من دەبایە لەوانەوە زانیاری دی دەربارەی مردنی ئەو کۆبکەمەوە. لەسەر ڕۆشنایی زانیارییەکانی غەزەلنوسدا، هەر زوو ئامۆزاکەی موراد جەمیلم ناسی کە زۆر لە کیڤن سپەیسی دەچوو لە فلیمی «ئەمێریکان بیوتی» دا. تەمەنی چل ساڵ بوو، بە نەزاکەت و شەرمن بوو، زۆر شتیشی لەسەر ئەو کوڕە دەزانی. بە خۆویست باسی هەموو شتێکی بۆکردم، هەتا هەندێک جلی مراد جەمیلی بۆ هێنام و گووتی «بۆ بەری تۆ دەبێت، بالاتان بە ئەندازەی یەک بوو». من وەک جۆنی دێپ لە فلیمی «دەروازەی نۆیەم» دا بە چاویلکەیەکی چکۆلە و ڕیشێکی کەمی ژێر چەناگە و جانتایەکی درێژەوە بەرابەری دادەنیشتم و گوێم لە چیرۆکەکانی دەگرت. سەرەتا وەک نوێنەری ڕێکخراوێکی جیهانی کە لەسەر خەڵکانی ونبوو کاردەکەن خۆم بە کەسوکاری موراد جەمیل ناساند، گووتم ئیشمان ئەوەیە تێبگەین بۆ هەندێک خەڵک ماڵ بەجێدەهێڵن و ناگەڕێنەوە. بۆ ئەوەی

باسی مردنی موراد نەکەم، بە جۆرێکی پێچاوپێچتر و ناڕاستەوخۆ وەسفی مردنم کرد و گووتم « ڕێکخراوەکەمان لەسەر تاسەری دونیادا لەدیاردەی ونبوونی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، دڵنیاین جۆرە پەیوەندییەکی نهێنی لە نێوان هەندێک مرۆڤ و هەندێک شێوە مەخلوقاتی دیکەدا هەیە کە تەکنیکێکی باڵایان هەیە، دەتوانن خۆشەویست و ئەزیزانی ئێمە بۆ لای خۆیان بەرن، لە دونیایەکی تردا دیلیانبکەن و نەتوانن بگەڕێنەوە». خزمەکانی موراد جەمیل تێنەگەیشتن، من بەو وەسفەم هەر باسی مردن دەکەم، بەڵام بەجۆرێکی دی و بە کەمێک ڕتوشەوە. ئەوان چیرۆکەکەی منیان وەک جۆرە هیوایەک تەماشاکرد و منیشیان وەک فریادڕەسێک بینی کە دەشێت بتوانم کوڕەکەی ئەوان لەدەست ئەو مەخلوقانە دەربهێنم و بیهێنمەوە بۆ ئەم دونیا. پێدەچوو شێوەی قسەکردنم و خۆ ئاڵۆزنیشاندان و نیگاکردنم، ئەو بەستەزمان و جەرگ سووتاوانەی خستبێتە سەر خەیاڵ و خولیایەکی وەها کە من هێزێکی لە ڕادەبەرم هەیە و تواناگەلێکم تیا پەنهانە مرۆڤی ئاسایی نییەتی. لە ئەنجامی پرسەکانمەوە گەیشتمە ئەوەی موراد جەمیل کوڕێکی بێئەندازە قەشەنگ بووە، گەنجێکی هەرزە کە جوانی خۆی بەشێوەیەکی سەرپەڕانە بە کارهێناوە، جۆرێک لە کازانۆڤا کە بێباکانە لە شارێکی وەک ئەم شارەدا تۆڕێکی گەورەی پەیوەندی لەگەڵ دەیان کچدا دروستکردوە، بێئەوەی بیر لە دەرەنجامە ترسناکەکانی بکاتەوە. بە قسەی ئامۆزاکەی، موراد ڕۆژێک بێ پرکێشییەکی عاتیفی نەژیاوە، لە چیرۆکێکی ترسناکەوە چۆتە ناو چیرۆکێکی تر، لە بەزمێکدا ئۆقرەی نەگرتووە و بازیداوەتە ناو بەزمێکی تر. کوڕە بەستەزمانەکە لەو بوونەوەرە خەیاڵیانەبووە کە پێیوابووە دەتوانێت هەموو ژنی دونیای خۆشبوێت، بڕێکی ئەوتۆ عاتیفەی تێدابووە وایزانیوە بەشی هەموو خانمانی ئەم ئەستێرەیە دەکات. لەوانەبووە کە ویستوێتی لە ناوەڕاستی کچگەلی ئەم شارەدا

بوەستێت و بەدەنگی بەرز پێیان بڵێت « دەتوانم هەمووتانم خۆشبوێت و هێشتا هەر دڵم پڕبێت لە سۆز». بە وێنەکانیدا گەنجێکی هێند جوان بووە، کچێک یان ئافرەتێک نەبووە بە خۆشەویستی ئەم فریشتە گەنجە بڵێت نا. بە قسەی ئامۆزا غەمگینەکەی « ئەوانەی کە حەزیان لێ نەکردوە، ئەوانەبوون کە خۆیان لەوە بە بچوکتر بینیوە، کوڕێکی وا حەزیان لێبکات». ڕۆژێک ئەم زانیاریانەم بردەوە بۆ ناو هاوڕێکانم، حەسەن تۆفان بە پێچەوانەی چاوەڕوانی منەوە، توڕەبوو و گووتی قسەکانی من هیچ نین جگە لە ڕاپۆرتێکی خەیاڵی کە لە ژێر کاریگەری فلیم و کتێبدا نوسیومە و سوودێکی بۆ تەفسیری ئەو دۆخە ئاڵۆزە نییە کە موورادی تیا کوژراوە. من گووتم، هەڵبەت ماوەیەکم دەوێت تا فێردەبم وەک ئەفسەرێکی هەواڵگر سەیری شتەکان بکەم و خۆم لە نیگای دەرهێنەرێکی ڕۆمانسی دووربخەمەوە، کە هەمیشە بەشێک بووە لە کاراکتەری من. جاری دووەم شتەکان باشتر تێپەڕین و دانیشتەکەمان خۆشتر و دۆستانەتربوو. ئەو جارە ئامۆزا دڵسۆزەکەی، ئەرشیفێکی زۆر گەورەی خستە بەردەستم کە بریتیبوو لە سەدان نامە، لە وێنەی دەیان کچ و ژنی جیاواز کە موراد بەر لە ونبوونی هەموویانی بە ئەمانەت لای ئاغای کیڤن سپەیسی دانابوو. ئەو کاتەی ئەو تەواوی ئەرشیفەکەی بۆ هێنام، پتر لە سێ هەفتە بوو موراد دیارنەمابوو. یەکەمجار ئەرشیفەکەم بێسوود بینی، زۆربەی وێنەکان بێناوبوون و زۆربەی نامەکان بێ بەروار. لە زۆر جێگادا کچەکان ناوی ڕاستەقینەی خۆیان نەنوسیبوو، نامەکانیان زۆربەی بەو ڕستە و کلێشە خراپانە نوسرابوون کە بەڕاست و دروستی تین و تاوی عاتیفەیان تیادەرناکەوێت. لە ڕۆژانی سەرەتای گەنجیمدا ئەو جۆرە نامانە وایان کرد بۆ هەتاهەتایە واز لە دڵداری بهێنم. دوو کچم خۆشویست، هەردووکیان ماوەیەک بەو نامە خراپانە دایانگرتمەوە، نامەکان بەڕادەیەک لەیەکدەچوون و بەجۆرێک پڕبوون لەو گوزارە

کڵێشەییانە، چیتر ئامادەنەبووم کاتی خۆم بەو قسە پڕوپوچانە بەبادەم کە کچان لەبەریەک دەیاننوسییەوە. بە گشتی لە دونیادا کەم کەس دەتوانن نامەی ڕاستەقینەی دڵداری بنوسن، عاشقەکانی موراد هیچیان لەو توخمە نەبوون، بەڵکو لە توخمی ئەو دوو کچەبوون کە کاتی خۆی دڵداریان بە من تەرککرد. من هیچ یەک لە خاوەنی وێنەکانم نەدەناسی، بیرم نەدەهات بە ڕێکەوتیش چاوم بە ڕوخساری ئەو خانمانە کەوتبێت. بەڵام دیاربوو ئامۆزا غەمبارەکەی هەندێک لە کچەکانی دەناسی و لە بەر ترس ئاشکرای نەدەکردن. کە لە دانیشتنێکی دیکەدا نامە و وێنەکانم برد بۆ ناو هاوڕێکانم، ئەمجارە حەسەن تۆفان ڕوخۆشتر و باشتر پێشوازی لێکردم و گووتی «ئەم ئەرشیفە شتمان زۆر بۆ ئاشکرادەکات، لەوانەیە نهێنی مردنی ئەو کوڕە لە کاغەزێک لەو کاغەزانەدا بێت». حەسەن بەوردی سەیری وێنەکانی کرد، ئەو لە من و تریفە دونیادیدەتر بوو، خەڵکی زۆرتر دەناسی، بەڵام پێشتر حەوت ساڵ چووبووە خەڵوەتەوە، یادەوەری لاوازبووبوو، خۆی زۆر هەوڵیدا و هیچ یەک لە وێنەکانی بۆ نەناسرایەوە، غەزەلنوسیش هیچی نەگووت. ئیدی حەسەن هەندێک لە وێنەکانی هەڵگرت و لەگەڵ خۆیدا بردنی، هاوڕێیەکی هەبوو لە خۆی خەڵکناستر بوو، کوڕێکی مووزەردی جوان بوو، لەسەر عەرەبانەیەکی کەمئەندامان دەسوڕایەوە. زۆرجار تۆفانم دەبینی لە نێوان مەزاتخانەکە و گوزەری هەلاجەکان و کوچەی فلیمفرۆشەکاندا هاتوچۆی پێدەکرد، هەمیشە دەستێک جلی پاکی لەبەردابوو، پێدەچوو سەردەمانێک کوڕێکی خۆشبەخت بووبێت. من ناویم نەدەزانی، بەڵام ڕۆژێک گوێم لێم بوو یەکێک لەوانەی لە مەزاتخانەکە ڕادیۆ دەفرۆشن، بانگیکرد «شبر... شبر، تەحسین تەسجیلێکی بۆ تۆ داناوە، وەرە بیبە».

کە حەسەن وێنەکانی برد دڵنیابووم دەیانبات بۆ شبر. بەڵام خۆم وا نیشاندا کە هیچ نازانم.

# زووری عەشق
## «ناوەراستی حەفتاکان»

غەزەلنوس «کاتێک نامەکەی مەلای هاجەری خوێندەوە» گەنجێکی زیرەک و بێدەنگ بوو، جووتێک چاویلکەی گەورەی لە چاودا بوو، قژێکی لوولی ڕەشی هەبوو، پێستێکی سپی و پاک، باڵای باریک و لاواز بوو، جۆرە جوانییەکی تێدابوو زیاتر خەڵکانی زیرەکی کێشدەکرد. لەو منداڵانە بوو گەر بتدیبایە دەتگووت «ئەها، ببێت و نەبێت، ئەمە لە ماتماتیکدا بەتوانایە». دەستەکانی باریک و درێژ بوون، پەنجەکانیشی هەروەها. کەم قسەیدەکرد، بەڵام گەر قسەی بکردبایە بەجۆرێک دەستی دەجوڵاند وات هەستدەکرد لە هەوای زوور سەری خۆیدا بۆ شتێک دەگەڕێت و بە وشە شتێک لە هەوادا دەچنێت. هیچ سیفەتێکی تێدا نەبوو وا لە مرۆڤ بکات بڵێت ئەمە لە پاشەڕۆژدا دەبێتە غەزەلنوس، لە شێوەدا پتر لەو کەسانە دەچوو کە لە زانستە سروشتییەکاندا بلیمەتن. نە لە باوکی دەچوو و نە لە بەهاربانوی دایکی، شتێکیشی لە مەلای هاجەر تێدانەبوو «کە وێنەکانی لە ئەرشیفی شۆڕشی ئەیلولدا، پیرەپیاوێکی ڕیش سپیمان نیشاندەدەنەوە، بە لچێکی ئەستوور و جووتێک برۆی زلەوە». کە نامەکەی پێگەیشت، پێنج ساڵ بوو دایکی کۆچیکردبوو. بەهمەن بەبێ دایک لە ماڵێکی گەلێک فراوان و پڕ ژووردا گەورەبوو. ماڵێکی وا بۆ کوڕێک و باوکێکی پیر، ڕووبەرێکی بەرین و گەورە بوو، پێدەچێت ئەو ڕووبەرە گەمەی نۆری بە ڕوانین و خەیاڵاتی کوڕەکە کردبێت. باوکی کلیلداری خەزێنەبوو لە پەروەردە، بۆن و بەرامەی ئەسیدەکان و ڕەنگی درەوشاوەی میتاڵە دەگمەنەکان

چاویان کزکردبوو، بەجۆرێک لە ناو کاغەز و لیستی دووروودرێژی هاتن و ڕۆیشتنی سولفات و کلۆر و یۆددا نوقمبوو، کاتی بۆ کوڕەکەی نەمابوو. بەهمەن هێند منداڵێکی بێسەرپەرشت و تەنیابوو، مەشق و شیکاری پرسیارەکانی قوتابخانەی لەسەر دیوارەکانی ماڵ ئەنجامدەدا. کاتێک باوکی هۆشیهاتەوە و سەری هەڵبڕی، عاجباتی لەوەهات سەرتاپای دیوارەکان، لە بنمیچەکانەوە تا خوارەوە، هەموویان شیکاری پرسیاری ماتماتیک و نوسینەوەی بیردۆزەکانی ئەندازە و تۆمارکردنەوەی هاوکێشە کیمیاییەکانن. ئەو وەرزەساڵێک بوو دیوارەکانی کردبووە ڕەشنوسی خۆی، بەڵام لە پاڵ شیکاری لۆگاریتمات و ئیعرابی عەرەبی و نوسینەوەی وشە بە وشەی وانەکانی ئینگلیزیدا، باوکی نیگاری چەندەها باغ و گوڵ و گوڵزاری بەرین و لالەزاری ڕەنگاوڕەنگیشی بینی کە بەهمەن دروستیکردبوون.

دوای گەیشتنی نامەکەی مەلای هاجەر، بەهمەن بە قۆناغێکی تێفکرینی قووڵدا تێپەڕی، لە ناکاو تەواوی وانەکانی فەرامۆشکرد و بڕیاریدا واز لە قوتابخانە بهێنێت. گۆڕانی بەهمەن بە جۆرێک سەیر و خێرابوو، کەس باوەڕی نەدەکرد، گەنجێکی وەها لە خۆڕا و بێ هیچ بەهانەیەک واز لە خوێندن بهێنێت. پێدەچێت نامەکەی مەلا غەریبی هاجەر هاوگفتی شتێکی دی بووبێت کە پێشتر لە ناوەوەی هەرزەکارەکەدا ئامادەبووە، یان وادەردەکەوێت ڕۆحی هەر لە سەرەتاوە بۆ بیستنی هەواڵێکی لەو جۆرە لەسەرپێ بووبێت. کە نامەکەی خوێندەوە خەیاڵی بۆ هیچ خەوشێکی ئەخلاقی نەدەچوو، نەیگووت دایکم بە حەرام منی لە پیاوێکی تر خولقاندوە، بەڵکو دڵخۆش و ڕووگەش خۆی بۆ جۆرە ژیانێکی تر ئامادەکرد، ژیانێک لەگەڵ ڕۆحی ئەم حیکایەتە تازەیەدا بگونجێت. باوەڕێکی تەواوی هەبوو کە ئەو زادەی خۆشەویستییەکی

ئەفسانەییە... لەبری ئەوەی کاتی خۆی بە زانستی بێهودەوە بکوژێت، لێبڕا ژیانی بۆ شتی گەورە تەرخانبکات. ڕۆژێکیان نامەیەکی بۆ مامۆستاکانی نوسی و پێیڕاگەیاندن کە ئیدی واز لە قوتابخانە دەهێنێت. منداڵانی ئەو سەردەمە زۆربەیان بە هۆکاری تەمەڵی و هەژاری لە خوێندن دووردەکەوتنەوە، پێشتر کەس بە نامەیەکی لەو جۆرە وازی لە خوێندن نەهێنابوو. نامەکەی کامڵبوون و کرانەوەی هوشیاری مرۆڤێکی پێوەدیارە کە بۆ مانایەک دەگەڕێت. لە نامەکەیدا نوسیوێتی «بەڕێزان خوێندن ڕۆحی من سڕدەکات و دەمکات بە پیاوێکی بێسوود، من لەم چەند ساڵەدا دەمویست لە ڕێگای ئێوەوە و لە ڕێگای وانەکانەوە فێری شتێکی سوودبەخش ببم. فێرببم چۆن حەزم لە ژیان بێت و بکرێمەوە، لە خۆ ئامادەکردن و لەبەرکردن و تێگەیشتندا کەمتەرخەم نەبووم، هەر ئەرکێک قوتابییەک پێیهەڵدەستێت بەوردی پێیهەستام، بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ زانستەکان لە بەرچاوی من نرخی خۆیان دۆڕاند، ئیدی حەزدەکەم دوای زانستێک بکەوم کە لێیدڵنیام و دەزانم سوودێکی بۆ مرۆڤ هەیە». کە غەزەلنوس ئەو ڕستانەی بۆ مامۆستاکانی نوسی، خۆشی تەواو لە ماناکەیان نەدەگەیشت، نەیدەزانی چ زانستێک دەشێت لەو زانستانە سوودبەخشتر بێت کە لە قوتابخانە دەیخوێندن.

گەر بە وردی بگەڕێینەوە بۆ ڕووداوە تاریکەکانی ئەو سەردەمە، دەتوانین تێبگەین بۆچی غەزەلنوس هێندە زوو ڕووی لە دونیای ڕاستەقینە وەرگێڕا و گەیشتە ئەو پنتەی تێیدا شتەکان بوون بە خەیاڵێکی ساف. لەو ساڵەدا کە غەزەلنوس وازی لە خوێندن هێنا شتگەلێکی ترسناک ڕوویاندا، شۆڕش هەرەسیهێنا، شکست بە جۆرێکی سەیر تێکەڵاوی ڕۆحی هەموو مەخلوقاتەکان بوو، بەهارێک تێپەڕی بێئەوەی کەس هیچ غونچەیەک ببینێت، ژیان بۆنی کۆتایی و زەوی بۆنی خەڵوزی کوژاوەی لێدەهات. کپییەک و بێڕەنگییەک کە لە کپی دوای سووتانی کێڵگەیەکی

گەنم دەچوو باڵی بەسەر خاکدا کێشا، مرۆڤەکان خەیاڵیان مرد و زەوییەکی بێفەڕ و زەمانێکی مسئاسا سەریان هەڵدا، سەدان هەزار مرۆڤ شکستی شۆڕشیان وەک شکستی تایبەتی خۆیان تەماشادەکرد. نەوەیەک هاتەپێشێ کە دەیویست زوو هەستێتەوە، «هەر نەوەیەکیش بیەوێت زوو لە شکست هەستێتەوە، نەوەیەکی ترسناکە». ئیتر خوێن و خەون بە جۆرێک تێکەڵاویوون بێوێنەبوو.

غەزەلنوس ویستی بێ زیان لەو جەنگە بێتەدەرێ، نامەکەی مەلای هاجەر بوار و دەربازێکی سەیربوو تا لەوێوە ڕووبکاتە خەیاڵ. لەو ساڵەدا تەنیا لە شتەکان وردەبووەوە، لەو بڕوایە دابوو هەموو مرۆڤێک دەبێت ساڵێک لە ژیانی تەنیا بۆ تەماشاکردن تەرخانبکات، تەنیا نیگارەکان و دۆخی شتەکان و ڕۆحی هەوائاسای بوونەوەرەکان لە خۆیدا بنوسێتەوە. لەو ساڵەدا وەک شێت بە کوچە سادە و سارد و بێماناکاندا دەگەڕا، شتەکان وەها کاڵ و بێڕۆحبوون لە بەرچاوی، نەیدەتوانی دونیا وەک جەهەنەمێکی گەورە نەبینێت. هەستیدەکرد لە هیچ جێگایەکی ئەم شارەدا ڕیشەی نییە. وەک ئەوەبوو لە هەوادا وەستابێت و هیچ شتێک نەیگرێت. لەو ڕۆژانەوە ویستی بۆ جۆرە سروشتێکی تر بگەڕێت، شوێنێک خۆی لە ناودا ونبکات و ئەو هەستە قووڵەی ونبوون نەیخنکێنێت. لەو ساڵەدا توانی بە مەشقێکی دووردرێژ، ڕووکاری ئەو دونیایە بگۆڕێت کە تیادەژیا، هەموو درەختەکانی بەخەیاڵ ڕەنگکرد، بۆنی دیکە و شێوەی دیکەی بەخشی بە گەڕەک و بازاڕ و بەردەرگاکان، شەقامەکانی پڕکرد لە ڕەنگی دیکە. بە خەیاڵ نەخشەیەکی تری کێشا و شارێکی تری دروستکرد، یەکەیەکە کوچەکانی ئەو شارەشی لە دڵی خۆیدا نوسییەوە، بەجۆرێک ئیدی لەسەر نەخشەیەکی تر و لە وێنەیەکی تری دونیادا دەسوڕایەوە. دیارە لەوە زیرەکتربوو بهێڵێت بکاتە سنووری

شێتی، ئەو هێزەی لە خۆیدا دروستکرد بتوانێت دونیای ڕاستەقینە ون نەکات. لە یەککاتدا دوو جیهان و دوو ڕوانگەی هەبوو، دەیتوانی بە خەیاڵدا بڕوات و دەشیتوانی بازبداتەوە بۆ دونیا، بۆ ناو بۆن و بەرامە ناخۆشەکان، بۆ سەرزەمینی ڕەنگە دێزەکان، بۆ ناو سێبەرە تاریکەکانی زەویی و خاشاکی خەراباتەکانی شار.

ئێوارەیەک لە ناو جیهانە ڕەنگاوڕەنگەکەی خۆیدا دەسوڕایەوە، جیهانێک ئاسمانەکەی ئەرخەوانی و زەوییەکەی نیلۆفەری و ئاسۆکانی زەردبوون. لە ناکاو دیمەنی گەنجێکی غەمگین وەستاندی، گەنجێک ڕوخسارێکی گەلێک پڕ ژانی هەبوو، بەڵام خەندەیەکی فریشتەیی لەسەر لێوی بوو، جلەکانی لە جلی بەگزادەیەکی ساڵانی بیست دەچوو، بەڵام قژ درێژی و لاجانە پانەکەی مۆدێلی ئەو سەردەمە بوو. لەو خوێندەوارە بێئۆقرانەی دەکرد کە بە دوای ئافرەت و ناوبانگدا ئاوارەدەبن، لە ساتێکدا دەرکەوت کە تێیدا غەزەلنوس لە بەحری ڕەنگەکانی خۆیدا وێڵ و لە شیفتەی بۆیەکردنی دونیادا ونبوو. خۆی وا نیشاندا چاوەڕوانی کەسێکی دیکە دەکات، بە خەندەیەکی تەماوییەوە یاری بە زریزەکەی دەکرد. کە بەهمەن گەیشتە ئاستی کوڕەکە، ئەو بە دەنگێکی ساف و قووڵ گووتی «نامەکەی مەلا غەریبی هاجەر ژیانی تۆشی تێکدا؟» . بەجۆرێک غەزەلنوسی ڕاچڵەکاند ڕەنگەکانی پێشچاوی فڕین و جوانییەکانی نێو نیگای کوژانەوە، ئاسمان ڕەنگی دێزی هەور و زەوی ڕەنگی بۆری خۆڵ و ئاسۆکان ڕەنگی شەویان گرت. دەنگێکی قووڵ بوو، ترسناک بوو، بەڵام پڕبوو لە خەیاڵ. بەهمەن ناسر بە ترسەوە لێیپرسی «تۆ کێیت؟» . گووتی «من دۆستتم» .

وەک لە خەودا بێت و یەکێک بە پەتێکی باریک بەدوای خۆیدا ڕایکێشێت، کەوتە دووی ئەو گەنجە کە بە حورمەتی ڕۆشنفیکرێکی

کۆنەوە داوای لێکرد لەگەڵیدا بڕوات. گەنجێکی باریک بوو لە ڕۆیشتنیدا خۆشحاڵ دەینواند، لەشی بەجۆرێکی هارمۆنی و ڕێک دەجولایەوە، پەلەکردنی دوور بوو لە شپرزەیی و ڕاڕایی، بە کەسێک دەچوو ڕوون و ئاشکرا ئامانجی خۆی بزانێت. بەهمەنی زۆر دوورنەخستەوە، پاش چەند کوچەیەک دەرگای ماڵێکی کۆنی بۆ کردەوە. بەهمەن هێندەی یەکەم هەنگاوی خستە ئەودیو دەرگاکەوە، بە توندی بۆنی سەردەمێکی تر هات بەسەریدا. پێکەوە چوونە ناو حەوشێکی کۆن، چوونە ناو دونیایەک بۆنی گڵی تەڕ و دیواری تلیساوە و زەمانی خوساوی لێدەهات. بە تەنافێکەوە کۆمەڵێک جلی کۆنی بینی، پێدەچوو دەیان ساڵ بێت ئەو جلانە بەو تەنافەوە بن، بارانی دەیان وەرز لێیدابن و خۆری چەندین ساڵ وشکی کردبێتنەوە. بایەکی ناوەخت لە حەوشەکەدا وەک پاسارییەکی دیل شێتانە دەسوڕایەوە. گەنجەکە سەیریکرد و گووتی «ئەمە ئەو خانوە دێرینەی مەلای سوختەیە، باوکی ڕاستەقینەی تۆ، ئەو عاشقە گەورەیەی لێرەدا ژیا و مرد».

گەنجەکە وەک بیر لە سەردەمێکی زۆر دوور بکاتەوە، گووتی «چەندین ساڵ لە مەوبەر مەلا غەریبی هاجەر لەگەڵ باوکی تۆدا، لەم حەوشەیەدا دەستیان دایە یەخەی یەک. ئەوە یەکەمجار بوو مەلای سوختە ئاشکرا لە ڕوویدا هەڵگەڕێتەوە، لە بن ئەو دارە گەورەیەدا بەرابەری وەستا و لێیاخیبوو. ئەوسا مەلای سوختە پلانی هەبوو تۆ بفرێنێت و بتهێنێت لێرەدا بەخێوتبکات. بەڵام هاجەر سوێندی خوارد گەر کاری وابکات لە سزادا چی کتێبێکی غەزەل لە دونیادا هەیە ئاگری تێبەردەدات، کێلی گۆڕی هەموو عاشقەکان دەشکێنێت، خۆی دەکوژێت و لەگەڵیشیدا مەلای سوختە دەکوژێت».

بەهمەن کە سەراسیمە سەیری ئەو دونیا داڕوخاوەی دەکرد، بە دەنگێکی کز پرسی «بەڵام تۆ کێیت؟ بۆ واقسەدەکەیت، وەک ئەوەی

تۆ لەو ڕۆژەدا لێرە بوبیت. تۆ مەلای سوختە لە کوێ دەناسیت؟».

بە شتێک لە خەمەوە گوتی «من هاوڕێی باوکت بووم، هاوڕێی مەلای سوختە، بەڕەحمەت بێت لەم پازدەساڵەی دواییدا هەموو ژیانی لێرەدا بردەسەر، لەدوای مردنی بەهاریانووەوە لەم ماڵە نەچووەدەرێ، تەواوی عومری لێرەدا غەزەلی ئیلقادەکرد، شەو و ڕۆژ غەزەلی دەخوێندنەوە. منداڵبووم کە ناسیم، ڕۆژێکیان بەدوای تۆپێکدا هاتمە ئەم حەوشەیە، ئەو وەک دەروێشێکی ڕیشن و قەلەندەرئاسا لە سەر کورسییەکی کۆن، لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا شیعری دەخوێندەوە، نزیکی سەعاتێک گوێم لێگرت، دەنگی لە دەنگی هیچ ڕۆحلەبەرێکی زیندوو نەدەچوو، نە پێشتر و نەدواتر شتێکم نەبیستووە سەدای گەروی ئەوی هەبێت. بێئەوەی ئەو ئاگاداربێت، من بێهۆش و مەجزوب نیگای ئەوم دەکرد. یادی بەخێربێت، پەیوەندی لەگەڵ جیهانی چواردەوری خۆیدا نەبوو. بەردەوام لە جیهانێکی تردا دەژیا، ئەو ڕۆژە کە منی بینی، دەستیبرد و جامێک ئاوی بۆ درێژکردم و گوتی تینوتە؟ بیخۆرەوە. کە لەو ئاوەم خواردەوە تووشی ئەفسونێک هاتم و خرۆشێک لە ناخەوە دڵی بە سۆزێکی گەرم پڕکردم، وامزانی تام لێهاتووە و لەشم سەرتاپای بۆتە هەست. منداڵ بووم، جەستەم لاوازبوو، دەستەکانم باریک و ڕۆحم ناکامڵ بوو، کاتێک لەو ئاوەم خواردەوە بۆ یەکەمجار هەستمکرد لەشم هەیە، گیانم لێوان لێوە بە ئارەزوو. ئیتر بووم بە هاوڕێی، دەهاتم و ئیشم بۆ دەکرد، غەزەلەکانیم تەدویندەکرد. پاداشم تەنیا ئەو جامە ئاوە ساردانە بوو کە تامی شەرابی بەهەشتیان دەدا، هەرکات ئەو ئاوەم دەخواردەوە ئارام و پڕ ئومێد دادەنیشتم و گوێم لەو سەدا قووڵ و فێنکەی دەگرت. تا گەورە نەبووم چیرۆکی خۆی نەگێڕایەوە... یەکەمین نهێنی کە درکاندی، نهێنی تۆ بوو».

بەهمەن ناسر لە ناوەڕاستی جێگایەکدا کە بۆنی ڕوخانی کوتوپڕ و تێکچوونی ناکاوی لێدەهات، سەیرێکی خۆی کرد، نەیدەزانی لە کویادا وەستاوە و ئەم کوڕە باسی چی بۆدەکات. بە نیگەرانییەوە سەیری دار و پەردوی ڕوخاوی شوێنەکەی کرد و گووتی «مەلای سوختە سالێک لە مەوبەر، لە خەستەخانەیەک لە ورمێ مرد».

گەنجەکە گووتی «نا، ئەوەی لە ورمێ مرد، مەلا غەریبی هاجەر بوو، مەلای سوختە دوای ماوەیەکی کەم لە بیمارستانی ئێرە مرد. ڕۆحێک بوون، بەڵام بووبوون بە دوو ئادەمیزادی جیاواز، لەبەرئەوە مردنیان یەک مردن بوو کە لە دوو شوێن و دوو کاتی جیاوازدا ڕوویدەدا. هەردووکیان دەرگای ئەمبەرەو بەری سەر یەک ڕیواق بوون. مەلای سوختە ئاگاداری هەموو شتێکی مەلای هاجەر بوو، دەبێت بڵێم ئەو نامەیەی بۆ تۆ زۆر تورەیکرد، وەک ئەوەبوو مەلا غەریب تا دوا چرکەسات هەر حاشا لە سوختە بکات، تا دوا هەناسەش ئومێدی وابوو، هاجەر بێتەوە هۆش خۆی و تێبگات مرۆڤ ناتوانێت شتێک بێت جیاواز لەوەی هەیە».

بەهمەن گووتی «مەلای هاجەر هەموو شتێکی بۆ من ڕوونکردۆتەوە».

گەنجەکە پێکەنی و گووتی «تێگەیشتن لەو دوو مرۆڤە ئاسان نییە. لەو چەند ساڵەی دواییدا، بەردەوام غەزەلیاتەکانی مەلای سوختەم تەدویندەکرد، لەو ساتەوە کە مەلای هاجەر دەستیکرد بە نامە نوسین بۆ تۆ، ئەویش لە هەمان ساتدا نامەیەکی بۆ تۆ نوسی، دەبێت تۆ گوێت لە سوختەش بێت، چیرۆکەکە لە نیگای ئەوەوە شێوەیەکی دیکەی هەیە».

غەزەلنوس پرسی «ئەو نامەیە لای تۆیە؟ ئێستا تۆ هاتوویت ئەو نامەیەم بدەیتێ... وانییە؟»

گەنجەکە پێش بەهمەن ناسر کەوت بۆ ژێرخانێکی بۆنخۆش، لە

کورسییەک و تەختێکی خەو بەولاوە هیچی دیکەی تیانەبوو، بۆنی کپی لێدەهات و ئاسمانی لێوەدیار نەبوو. گووتی «من ناوم سەراب بەهجەتە، باوکم لەساڵی شەست و حەوتدا لە شەڕدا کوژرا، ئێستا ماڵمان لە کۆلانی ئەودیوە، کوچەیەک لە پشتەوەین. کەس نەیدەزانی مەلای سوختە لێرە دەژیٚ من نەبێت، ئەو هەمیشە تەنیا بوو. دوای ئەوەی تۆ لەدایکبوویت، جەنگی نێوان سوختە و مەلای هاجەر گەورەتر بوو، هەردووکیان بە شێوەیەکی سەیر ئازاری یەکتریان دەدا. ڕۆژێک مەلای هاجەر گەیشتە ئەو بڕوایەی ئەم ماڵە چۆڵبکات، سوختە ماوەیەک دوایکەوت، دەیویست مەلای هاجەر بیکوژێت و ڕزگاری بێت، ئارەزوویەکی ڕاستەقینەی بۆ ژیان نەمابوو. بەڵام دیاربوو مەلای هاجەر ناتوانێت بیکوژێت، کوشتن ئاسان نییە. شەوێک سوختە شکست و نائومێد گەڕایەوە و لەم ماڵەدا ژیا، زۆربەی کاتەکانی خۆی لەم ژێرخانەدا دەبردەسەر، هەندێک شەو درەنگ دەچووە نهۆمی دووەم و تا دەمەو بەیان نەدەهاتەخوارێ، ئەویٚ ژووری خەوتنە سیحراوییەکانی خۆی بوو لەگەڵ بەهاربانودا. بەڵام بۆ ساتێکیش چییە، ڕێگای بە من نەدا بچمە ئەو ژوورەوە، تا نەمرد نەمتوانی ئەو دەرگایە بکەمەوە. کە دواتر سەرکەوتم و دەرگاکەم کردەوە تێگەیشتم چ هەڵەیەکی کوشندەم کردوە، تێگەیشتم بۆ ئەو ساڵەهای ساڵ ڕێگای نەدام سەرکەوم. پیاوێکی بەڕەحم بوو، بەر لەوەی لەگەڵ سێ هاوڕێمدا بیخەینە دەستەبەرەیەک و بیبەین بۆ بیمارستان، جارێکی تر بەرۆکیگرتم و ئاگاداریکردمەوە نەچمە ئەو ژوورەوە، تەنیا کەسێک بۆی هەبوو بچێتە ئەو ژوورەوە تۆ بوویت. بەڵام من فزوڵم هێندە توند و خەیاڵم هێندە برسی بوو، خۆم نەگرت. ڕۆژێک دوای مردنی سەرکەوتمە سەرەوە، بە هێمنی وەک دەرگای موسیبەتێک بکەمەوە دەرگای ئەو ژوورەم کردەوە، وەک ئەوەی بایەکی بەهێز لێمبدات، هەستم بە فێنکییەک کرد، هەستمکرد شتێکی

کوشـندە دڵـم دەبڕێـت، هێزێـک لـە ڕیشـەوە ڕامدەتەکێنێـت و بـە توندی بـەرەو خـۆی جەزبمـدەکات. بەهمـەن ناسـر، ئـەوەی بچێتـە ئـەو ژوورەوە مەحکومـە بـەوەی تـا هەتاهەتایـە غەریـب بێـت... لەویـادا ئـەو هەوایـە لـە مـرۆڤ دەدات کـە گیـرۆدەی سـیحری غەزەلـی دەکات».

بەهمـەن لـە هـەوای شـێداری ئـەو ژێرخانـەدا، چاویلکەکـەی داکەنـد و گووتـی «دەبێـت مـەلای سـوختە ویسـتبێتی مـن تووشـی ئـەو دەردەبـم... دەبێـت؟».

گەنجەکـە کەمێـک دەسـتی بـە قژیـدا هێنـا و گووتـی «مـەلای سـوختە بەدرێژایـی ژیانـی غەزەلەکانـی خـۆی بـۆ هیـچ کـەس نەخوێندبـووەوە، ئـەو غەزەلانـە بەشـێک بـوون لـە بەحرێکـی گـەورە کـە لـە سینەی ئـەودا شـەپۆلانیان دەدا. لـەم چەنـد سـاڵەی دواییـدا هەسـتی بـە شکسـتی خـۆی دەکـرد، دڵنیابـوو مـەلای هاجـەر توانیوێتـی بیبەزێنێـت و لـە بیـر دونیـای بباتـەوە. توانـای عاشـق بـوون تاکـە سـەرمایەیەکی ئـەو پیـاوە بـوو، لـە عەشـقێکی جاویـد و ئەبـەدی زیاتـر خاوەنـی هیچـی تـر نەبـوو، دەیویسـت ئـەو سـامانە بـۆ تـۆ جێبهێڵێـت، دواجـار دەیویسـت دوای مردنـی یەکێـک هەبێـت ئـەو ئـازارە بچێژێـت و لـە مانـای غەزەلەکانیـدا قووڵبێتـەوە، پێموایـە لـە تـۆ زیاتـر کەسـی تـری نەدەناسـی».

غەزەلنـوس بـە دەنگێکـی کـپ کـە بۆنـی ترسـی لێدەهـات، دەسـتی خسـتە سەرشـانی سـەراب و گووتـی «بـەڵام ئـەم ماڵـە دەڕوخێـت، ئـەم دیـوار و دار و پەردوانـە لـە کۆتاییـدان. سـەرتاپای شـوێنەکە بۆنـی تەپیـن و هەرەسـی لێدێـت، هەسـتدەکەم ئـەم شـوێنە دەور و زەمانـی تەواوبـووە».

سـەراب گووتـی «زیاتـر لـە شـانزە سـاڵە ئـەم جێگایـە فەرامۆشـکراوە، ئـەو جلانـەی بـە تەنافەکـەوەن، جلـی شانزەسـاڵ لـە مەوبـەرن، مـەلای هاجـەر بەیانییـەک زوو، لەگـەڵ شـەبەیخوندا ماڵەکـەی بارکـرد و ڕۆیشـت،

ئەو ساڵانەی سوختە لێرە دەژیا، دەستكاری هیچی نەكرد. نەیدەتوانی وەڵامی زۆر پرسیار بداتەوە. دوای مردنی سوختە، چەند مانگێك لەمەوبەر كوڕەكانی هاجەر هاتن و دەرگاكەیان شكاند. خانووەكە لە تاپۆ موڵكی ئەوانە، دوو هەفتە لەمەوبەر هاتنەوە، هەرچۆنێك بوو خۆم تێكەڵاویانكرد و دەربارەی نیاز و خواستیان پرسیارمكرد، واتێگەیشتم لە چەند ڕۆژێكی دیكەدا ئێرە دەڕوخێنن. هەستدەكەم لەوەدا لەسەر هەقن، شوێنێكە بە كەڵكی نیشتەجێبوون نایەت. بەڵام بەر لەوەی ئەم ماڵە بڕوخێت دەبایە تۆ بێیت و بیبینیت. ئەوە دواهەمین وەسیەتی ئەو بوو، هەر ئەو پێیگووتم، سەبریكەم و زوو نامەكەت نەدەمێ، هەردووكمان دڵنیابووین تۆ كاتێكی زۆرت دەوێت تا لە هەموو شتێك تێدەگەیت».

غەزەلنوس گووتی «دەمەوێت ئەو ژوورە ببینم. پێویستە ئەو ژوورە ببینم، هەموو ئەم چیرۆكە لەو ژوورەوە دەستی پێكردوە، لەو ڕۆژەوە كە مەلای هاجەر لە پەنجەرەكەی خۆیەوە لە نهۆمی دووەم سەیری بەحری ئەستێرەی دەكرد».

سەراب پێش غەزەلنوس كەوت و گووتی «تا نامەكەی سوختە نەخوێنیتەوە، لە دارشتنی چیرۆكەكەدا پەلەمەكە، مرۆڤ دەبێت بە وردی هەر دوو نامەكە بخوێنێتەوە و بەراوردیانبكات. بەوەدا تۆ دەبیتە خاوەنی هەر دوو نامەكە دەتوانیت وردتر بڕیاربدەیت».

سەراب بە هێمنی پێشیكەوت... لەسەرەخۆ دەرگای ئەو ژوورە پڕ ئەفسونەی بۆ كردەوە... وەك پێبخاتە ئۆقیانوسێكی ترسناكەوە، بەر لە بەهمەن یەكەم هەنگاوی نا. غەزەلنوس دەستی خستە نێوان ئەمبەرە و بەری دەرگاكە و وەك هەوای تەلیسمێك لێیدا، بۆنێكی بەهەشتی چوو بەسەریدا، بێئەوەی بزانێت چۆن، خۆی لە ناو تۆفانێك لە شنەبای فێنك و گەرداوێك لە گوڵاودا بینییەوە.

## ماجەلانی ڕاستەقینە و دیوارەکان

کە دوای بیستوچوار ساڵ لە ئوتێلی « بەفر و سەراب» دابەزیم و تێکەڵاوی ئەم شەقام و کوچانە بوومەوە، دەنگێک لە دڵمدا پێیگووتم «بڕۆ... جانتاکەت هەڵگرە و بگەڕێرەوە، تۆ چی دەکەیت لەم شارە پیسەدا». بەڵام من زۆرجار پێچەوانەی دەنگی دڵی خۆم، پێچەوانەی عەقڵی خۆم بڕیارمداوە، مرۆڤ دەبێت بتوانێت بە دڵی خۆی بڵێ «بێدەنگ بە ئەی دڵ»، بەسەر خۆیدا هاواربکات و بڵێت «بێدەنگ بە ئەی هۆش»... من ئەزموونێکی درێژ لە دەریا و لە وشکانیدا، سەفەرێکی درێژ بەمسەرە و سەری زەویدا، بە دوورگە گەورەکان و بە ئیمپراتۆرییەتە بچوکەکاندا، ئەو بڕوایەی تیا سەوزکردم کە من لەسەر ئەم زەوییە بیۆێنە و لەم خاکانەدا بێهاوتا و لەم دەڤەرەدا بێنەزیرم. بوەستن، من پێتان دەڵێم بوەستن، نا من بە ئێوە ناڵێم بوەستن... بەڵکو بەم دیوارانە دەڵێم کە هەردەم گەمارۆم دەدەن، ڕەنگە پێتان سەیربێت، یەکێک هاوار لە دیوارەکان بکات بوەستێت؟. دیوارەکان گەورەترین ئافەتی سەر ئەم ئەستێرەیەن، پتر لە با دەجوڵێن و خێراتر لە شەپۆل دەڕۆن. ئاه ئەگەر دیوار نەبایە، شەرم نەدەبوو، شەرەف نەدەبوو، موڵک نەدەبوو، جەنگ نەدەبوو. لێممەگرن دەزانم ئەمە لۆژیکی پیاوێکی عاقڵ نییە، بەڵام ڕاستییەکی سادە و لەبیرکراوە، ئێمەی مرۆڤ بۆ ئەوەی تۆزێک باران لێماننەدات ئەو هەموو دەردەمان بۆخۆمان دروستکرد. بەڵام دیوارەکان ناوەستن... دەیانبینم ئابلۆقەمدەدەن. من ڕۆژێک لە ڕۆژان باوەڕم بە بێدەنگی و نەجوڵانی شتەکان نەبووە،

هەموو مەخلوقاتەکانی تر و شتە بێنەفەسەکانیش دەجولێن... ئا، باوەڕم پێبکەن، هەموویان دەجولێن. گوێبگرن، من باس لە گۆڕان ناکەم، باس لە جوڵە و نەسرەوتن و ئارام نەگرتنی شتەکان دەکەم. من ئەو مرۆڤەم پتر لە هەمووتان زەویم لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر تەیکردوە، لە هەمووتان زیاتر گەڕاوم، هەزاران شەو بێئارام، بێسرەوت، بێجێگا لەم ئەستێرەیەدا بێهاودەم و بێئامانج سوڕاومەتەوە، سەدان شەو تا بەربەیان لە ژێر باران و لە ناو گەردەلوولدا بووم. من لە جوڵەی شتەکان و لە بزێوی ئەو بوونەوەرانە دەترسم کە نەگۆڕ و بێوزە دیارن و وەک شتگەلێک دەردەکەون کە ناجولێن. لە ڕاستیدا من لە هەموو ئەو شتانە دەترسم کە ناجولێن. من ئێستاش نازانم ئەو هەموو ڕۆیشتنەم، ئەو پیاسە دوورودرێژەم بە زەویدا، لە چی دووردەکەوتمەوە و بەرەو ڕووی چی دەڕۆیشتم. ئەی دڵ... ئەی دڵی بێقەرار، دوای ساڵانێکی درێژ، دوای ئەو هەموو ئۆقیانوس و کیشوەرە دوورانە، دوای ئەو هەموو گەشتە هێمن و شێتانەیە بەزەویدا، نازانم ئاخۆ لە شتێک هەڵدێم یان بە دوای شتێکەوەم لێم هەڵدێت. گەڕان و ڕاکردن ئەوە ژیانی منە، لە زەمانێکدا کەس بیری لە ئازادی نەدەکردەوە، سەربەستیم گرێدایەوە بە بازێکی شێتانەوە بۆ ئەو دیو... ئەودیوی هەموو شتێک. ئەی دڵ، من لە گەنجیمەوە وەک شێتێک لەدەریایەکی لە خۆی شێتتر بپاڕێتەوە هاوارمکرد بازدە ئەی پیاوی شێت.. بازدە. وەک ناحاڵییەک کە چاو دەنوقێنێت و لە لێوی خەرەندێکەوە بەرەو ناو زەریایەکی شێت و نائارام بازدەدات، بازمدا. هاوڕێم ژیان بازێکی کوێرانەیە، هیچ زیندەگییەکی گەورە نییە بازێکی کوێرانەی بۆ ناو تونێلێکی تاریک تێدا نەبێت. ژیان بریتییە لەوەی بچیتە لێواری خەرەندێک و چاو بنوقێنێت و بازدەیت. ئەی ئەوانەی گوێتان لێمە، ئەی ئەوانەی خۆشحاڵن بە عەزابم، بەختەوەردەبن کە تلانەوە و شپرزەییم دەبینن، پێتانخۆشە کوردێک دوای بیستوچوار

سـاڵ بەدبەخـت و باڵشـکاو بگەڕێتـەوە. گـەر ژیانتـان ئـەو سـاتەی تیا نییـە... سـاتێک چـاوت دەنوقێنیـت و بێئـەوەی بزانیـت لـە کوێـوە و بـۆ کـوێ بازدەدەیـت، لـە جێگایەکـەوە خـۆت فڕێدەدەیـت، بێئـەوەی بزانیـت چەنـد بـەرزە، چەنـد قووڵـە و بـۆ کـوێ دەچێـت، تـا زووە تەمەنـی خۆتـان بـە بازێکـی وا کوێـر و شـێتانە بڕازێنـەوە. بـەرزی ئینسـان لەوەدایـە لـە جێگایەکـەوە بازبـدات، نەزانێـت چەنـد بـەرزە، نەزانێـت بـۆ کـوێ دەچێـت و لـە چیـدا کۆتایـی دێـت.

لـە بیرمـە بیسـتوچوار سـاڵ لـە مەوبـەر لـە دیوارەکانـی ئـەم شـارە ڕامکـرد. ڕاکـردن لـە دیـوارەکان دەردێکـی گـەورەی منـە، ئـەو دەردەیـە کـە سـەرمای شـەوە تۆفانییـەکان و گـەرمـای ڕۆژە ترسـناکەکانی هاویـن نەیانتوانی لـە منـدا بیکـوژن. هەمـوو وەختێـک وەک شـێت لـە دیـوارەکان ڕادەکـەم، بـەڵام مـرۆڤ بێهـودە لـە دیـوار ڕادەکات... بێهـودە. ڕۆژێـک لـە شـارێکی دووردا ڕێمکەوتـە نـاو کەرنەفالێکـی گـەورە، لەوێـدا کاتێـک مەسـتانە سـەیری جوانـی و قەشـەنگی بێسـنووری ژیانـم دەکـرد، کاتێـک بـە پێکێـک شـەرابەوە سـەمامدەکرد، لـە بـەردەم کچێکـی ڕەشپێسـتی ئێجـگار جوانـدا بـە دەنگـی بـەرز گۆرانییەکـی خۆلێـۆم دەگووتـەوە، بـۆ چرکەیـەک گێژبـووم و وەختەبـوو هاوسـەنگیم لەدەسـتچێت و بکـەوم. بـۆ ئێسـتێکی زۆر کـورت شـتەکان لـە پێشـچاوم ڕەشـبوون و وامدەزانـی کوێربـووم، بـەڵام لـە نـاکاو شـەپۆلێکی گـەورەی هـۆش و خەیاڵـم تێکەڕایـەوە و تێکەیشـتم هەڵهاتنـی مـن بێهودەیـە. ژیـان خـۆی، بـە جوانـی و کامەرانییـە گەورەکانیشـەوە، بـە ئازادییەکانیشـەوە دیوارێکـی گەورەیـە، دیوارێکـە دەڕوات و نابڕێتـەوە، مرۆڤیـش ئاهوییەکـی ترسـاوە بـە ڕۆخـی ئـەو دیـوارەدا ڕادەکات. مـن لـەو سـەفەرە دووروودرێژانەمـدا گەڕیدەیەکـی زۆرم بینییـوە، خەڵکانێکـی تـری وەک مـن، کـە هەموویـان لـە دیـواری ماڵەکانـی خۆیـان، دیـواری شـارەکانیان، دیـواری نیشـتیمانەکەیان هەڵهاتـوون. مـرۆڤ ڕادەکات و پێیوایـە دیـواری کوچەکـەی خۆیـان، لـە

هەموو دیوارێکی دیکەی دونیا بەدترە. بەڵام کە زۆر بەسەر زەمینـدا دەگەڕێیت، کە دەست لە دیوارەکانی تر دەدەیت، کە عومرێکی درێژ خەریکی تاقیکردنەوەی دیوارەکان دەبیت، دوای ماوەیەک تێدەگەیت دیواری شارەکەی تۆش، وەک دیوارەکانی دیکەیە، خراپتر و بەدتر و ترسناکتر نییە، نا... دڵنیاتاندەکەمەوە کە خراپتر نییە، شتێکی ئاساییە، دیوارەو تەواو... لەبەر ئەوە دروستیکە و بێدەنگ بە و لە ناویدا نیشتەجێ بە. من ئەو ڕۆژە کە دەستم لە کەمەری ئەو خانمە بەردا، ئیشراقێکی ڕەش لە ناوەوە پێیگووتم کە ژیان پڕە لە دیواری سەیر و نەبینراو، هەتا لەو ساتانەدا کە هەستدەکەیت لە ترۆپکی ئازادیدایت و سەمادەکەیت، ئا لەو ساتەدا تەواو تێدەگەیت بۆهەر کوێیەک بڕۆیت دیوارەکان بەدواتەوەن. هاوڕێیان ئاوا سەیرممەکەن، ئێستا دوای بیستوچوار ساڵ گەڕانی بێوچان بەم سەر ئەستێرەیەدا دەگەڕێمەوە بۆ شاری منداڵیم. کراسێکی درێژم لەبەردایە، قژم وەک دەریاوانە پیرەکان سپی و خاو و درێژ هاتۆتەخوارێ، ڕیش و سمێڵم تاشیوە، بالام لەو کاتە بەرزترە کە ئێرەم بەجێهێشت، پێتان سەیر نەبێت گەر بڵێم من پێچەوانەی یاسا فیزیکییەکانی گەشەی ئادەمیزادەوە، تا چلوپێنج ساڵەش بەردەوام بالام بەرزدەبوو، ئێستا لەسەرو دوو مەترەوە ئارامگرتووە، باریکتر و غەمگینتر لە جاران دەنوێنم، چەندەها زمان دەزانم، لەچەندەها ڕشتەدا قاڵ و لە زۆربەی شارە گرنگەکانی دونیادا میوان بووم. تەمەنم بیستوچوار ساڵ بوو کە ئێرەم بەجێهێشت، دەستگیراندارببووم، عاشقبووم. تەنیا عەیبێکی گەورە لە ژیانمدا ئەوەبوو وەستای دیواربووم. لە هەژدە ساڵییەوە بووم بە وەستای دیوار، لە هەژدە ساڵییەوە. کە وازم لە قوتابخانە هێنا خۆم کرد بە لاڵ و وشەیەک چییە لەگەڵ هیچ ئادەمییەکدا نەمگۆڕییەوە، هەتا ئەو کچەش کە حەزی لێکردم، پتر حەزی لەو نامە ئاگرینانە دەکرد کە من دەمنوسی، ئەو بەدبەختە بە جۆرێک حەزی لە

نامەکانم بوو، بەلایەوە گرنگ نەبوو من ناتوانم زارم بە نوتقێکی ڕوون هەڵهێنم. بە هەرحاڵ عاشقێکی بێدەنگ سەدجار لە عاشقێکی زۆر بڵێ چاکترە. ئەزموونی دواتریشم پێمدەڵێت ژنان هەندێجار پیاوی بێزمان و کەمدوویان لە پیاوی تووڕە و زۆر بڵێ لا پەسەندترە. ئەو خۆڵاڵکردنە دواتر موسیبەتی گەورەی بۆهێنام، ڕۆژێک پیاوەکانی دیکتاتۆری گەورە هاتن و منیان بۆ دروستکردنی بەندیخانەیەکی نهێنی ڕاپێچا، لەو زەمانەدا ئەستەم بوو دیوارسازێکی دەستڕەنگین و لێزان و لاڵی دیکەیان دەستکەوێت، بۆ یەکێک دەگەڕان نەتوانێت حیکایەتەکان بگێڕێتەوە، شوێن و شێوەی بەندیخانەکان بۆ کەسێکی دیکە ئاشکرابکات. پێدەچوو هەموو وڵات بۆ وەستا و کرێکاری بێزمان گەڕابێتن. لە شەوێکی دەیجوردا منیان گرت، وامدەزانی وەک هەموو بێگوناهەکانی دیکە دەمکوژن، بەڵام هەر هەمان شەو لە ئوتومبیلێکی داخراودا لەگەڵ پێنج کرێکاری لاڵی دیکەدا بردیانین بۆ شوێنێکی نادیار و نهێنی، لەوێوە سەفەری من وەک وەستایەکی لێزان و دەستڕەنگینی بەندیخانەکان دەستی پێکرد. لە یەکەم شەوەوە زانیم بەندیخانەی تاریک و ترسناکم پێ دروستدەکەن. هەر ئەو شەوە تفم لە دەستەکانی خۆم کرد، بەڵام لەوە ترسنۆکتربووم بتوانم دەستێکم یان پەنجەیەکم بشکێنم، خۆم لە سەر دیوارێکی بەرزەوە بەردەمەوە و دەربازبم، ئەو کات باوەڕم بەم بازە شێت و مەستانانەی ئەمڕۆ نەبوو. شارە و شار من و کرێکارە لاڵەکانیان گێڕا، لە هەرجێگایەکدا تونێلێکی نهێنی و لە هەر کونجێکدا ژێرزەمینێکی پەنهانیان بویستبایە ئێمەیان دەبرد، لە دۆکۆمێنتە ڕەسمییەکانی دەوڵەتدا ناومان گروهی ئیشکەرە لاڵەکان بوو. من ئەو چەند ساڵە دەترسام شەوێک بەدەم خەوەوە بدوێم و نهێنیم ئاشکرابێت و دەمودەست بمکوژن، سەدان شەو لە ترسا نەدەخەوتم، ئەوە هێندەی تر کەنەفت و بێهێزی دەکردم. شەوان بە چاوی بەستراوەوە دەیانبردینە ئۆردوگا و سەربازگە و بنکەکانی

ئاسایشـەوە، دەیانبردینـە سالۆنە تاریـک و ترسـناکەکانی وەزارەتـی بەرگـری، وەک کۆیلـە دێرینـەکان ئیشـیان پێدەکردیـن و وەک سـەگ نانیـان دەداینـێ. مـن دیوارسـازێکی گەورەبـووم، ئێسـتا کـە بـەم قیافـەت و ڕوخسـارە بۆشـناخەوە دەمبینـن، کـە هەمووتـان وادەزانـن مـن کۆنتێکـی ئەورووپـی یـان دەریاوانێکـی دێرینـەم و لەسـەدەکانی ناوەڕاسـتەوە هاتـووم، بـە هەڵـەدا چـوون. ئـەز خۆمتـان پێدەناسـێنم، بـە خـۆم و نـاوە عاجباتییەکەمـەوە «زوهـدی شـازەمان». ئـەوە نـاوە ڕاسـتەقینەکەی منـە، ناوێکـی بێمانـا و بێئاهەنـگ و بێنەغمـە. بەڵـێ، مـن زوهـدی شـازەمان سـەردەمانێکی زۆر دیوارسـازێکی لاڵبـووم، خۆشـم نازانـم چەنـد پەنـاگای نهێنـی و چەنـد بەندیخانـەی تاریکـم دروسـتکردوە... ئەوانـە وایانکـرد ڕقـم لـە دیـوار بێـت. ڕۆژێـک سـەربازەکان ئازادیانکـردم و لـە پیکابێکـی سـەوزدا منیـان هێنایـەوە. ئـەوەی بەلامـەوە عاجباتـی بـوو، ئەوەبـوو دەسـتگیرانەکەم دوای چـوار ساڵیش هێشتا چاوەڕوانیدەکردم، بێهـودە کچێتـی بێگـەرد و سۆزی ئاگرینی خـۆی بـۆ مـن هەڵگرتبـوو. بـەڵام چیتـر نەمدەتوانـی لـە هیـچ ژوورێکـی ئـەم دونیایـەدا ئـارام بگـرم، تووشـی ئـەو دەردەبـووم کـە خـۆم لـە دیوارەکان بـە دووربگـرم، شـتێک لـە دڵمـدا پێیدەگووتـم دووبـارە دەمگـرن و ناچارمدەکـەن دیـوار لـە دوای دیـوار دروسـتیبکەم. خولیـای ئـازادی عومـری منـی لـە بنەوەڕا هەڵتەکانـد. دەسـتگیرانەکەم کچێکـی بەدبەخـت بـوو، ئـەو جـارە نەمویسـت هەمـوو شـتێکی بـە نامـە بـۆ ڕوونبکەمـەوە، بـۆ ئـەوەی خواحافیـزی لێبکـەم و بـۆ هەتاهەتایـە جێیبهێڵـم، ڕاسـتی خۆمـم لادرکانـد و گووتـم چ عەیبێـک لـە دەم و زمانمـدا نییـە و هـەردەم توانیومـە قسـەبکەم... هـەردەم، بـەڵام بـە ویسـت و ئیـرادەی خـۆم بێدەنگیـم هەڵبـژاردوە، ئێسـتا دەبێـت ماڵاوایـت لێبکـەم و بـڕۆم بـە دوای خۆمـدا بگەڕێـم. لـەو سـەردەمەدا بـە هـەر کەسێکت بگووتبایـە، دەمەوێـت خـۆم بدۆزمـەوە، ئاسـان بـاوەڕی پێدەکردیـت، دەور و زەمانێـک بـوو مـرۆڤ زیاتـر بـۆ خـۆی دەگەڕا، وەک ئێسـتا نەبـوو ئادەمییەکان

حەز لە خۆ ونکردن و خۆ لەبیرکردن بکەن. کچە بەستەزمانەکەی دەستگیرانم، شتەکانی سادە و ئاسایی وەرگرت و بە دڵێکی ساف و زەردەخەنەیەکی غەمبارەوە خواحافیزی لێکردم و گووتی «تامردن» منی بیرناچێتەوە. دوای ئەو خانمە چکۆلانەیە، هەرگیز کچێکی وەها سادە و دڵساف و بێگرێم نەبینییەوە، بەڵام یادم نییە ڕۆژێک لە ڕۆژان غەمێکی قووڵم بۆ خواردبێت، تا یادم نییە هەرگیز غەمێکی قووڵم بۆ هیچ ئافرەتێکی دونیا خواردبێت. دەبێت ڕاستی بڵێم ترسی قووڵی من لە دیوارەکان منی لە ناخەوە دوو کەرتکرد، هەمیشە خەیاڵم لای شتی تربوو، ئەگەرچی ئەو شتانەی پەیوەندیان بە ئافرەتەوە هەیە ڕووبەرێکی گەورەی خەیاڵی منیان داگیرکردوە، بەڵام هەردەم لەو دۆخە دەرونییە نالەبارەدا ژیاوم کە پێموابێت شتێکی گرنگتر لە غەم و دەردەکانی ئەوان لە ژیانی مندا هەیە. هەمیشە پێموایە ئەو بایەی لە سەر زەمینی خانمانەوە هەڵدەکات، من ناکوژێت. من شتێکی تر و نهێنییەکی تر دەمخنکێنێت، شتێکی تاریک و ڕەش کە لە ناو خۆمدایە. دوای بیستوچوار ساڵ خۆم و تارماییە تاریکەکەی خۆم گەڕامەوە، لەو بیستوچوار ساڵەدا لە ژێر زۆر دیواری گەورەی دونیادا خەوتم و دەریای گەورەم بڕی، ئەگەرچی بە درێژایی ژیانم لە دیوارەکان هەڵهاتووم، بەڵام ڕووم لە زۆر زەمین و لە زۆر ئاوەدانی دوورکرد بۆ ئەوەی سەیری دیوارە بە ناوبانگ و خورافییەکانیان بکەم، دەستیان لێبدەم و تاقیانبکەمەوە، بە زۆر خێڵ و نەتەوەی نەبیستراو تێکەڵاوبووم و هەزاران تەرز شەرابم نۆشی و لەگەڵ سەدان ئافرەتی جیاوازدا خەوتم. لەبەرئەوەی هەمیشە بە پەلە لە وڵاتێکەوە دەچووم بۆ وڵاتێک و لە زەریایەک دەپەڕیمەوە بۆ زەریایەک، بیرم نییە هیچ کات لە ژیانمدا دووجار لەگەڵ یەک ژندا خەوتبم. لەدوای ئەو خانمە چکۆلەیەوە هەرگیز عاشق نەبوومەوە، بەڵکو لە شارە دوور و لە ڕۆخە ساردەکانی ئەم زەمینەدا هەردەم یەکێکم دۆزیوەتەوە لەگەڵمدا

بخەوێت، بۆ یەک شەو، بۆ یەک سەعات، بۆ یەک یادگار. تا دواجار لەم شارە تۆزاویەدا، کە بە ڕووکەش پێناچێت ژنێکی تێدابێت، زۆر لە هونەری خەوتن و سەرجێکردن بزانێت، ئەو ژنە ئەفسوناوییەم ناسی، کە تێڕوانین و تێگەیشتنی منی لەسەر سێکسکردن گۆڕی، تا ئەوکات وامدەزانی نهێنی ئیشەکە لەوەدایە کە بەردەوام ئەو ژنە بگۆڕیت کە لەگەڵیدا دەچیتە ناو جێگا، سەرکەوتن ئەوەیە زۆرترین ژمارە لە خانم نەرمبکەیت. بەڵام لەم شارەدا کە گۆڕینی کچ و یاریکردن بە مەعشوقە ئاسان نییە، ئەو ژنە گەنج و بێئامانە فێریکردم کە نهێنی کارەکە لە گۆڕینەدا نییە، بەڵکو لە دووبارەکردنەوەدایە. لەزەتی هەرە گەورە لە یەکەمجاردا نییە، بەڵکو لە دووەمجار و سێهەم و چوارەمدایە. ئەو ژنە ناسک و لێزان و هێمنە تێیگەیاندم کە یەکەمجار هیچ نییە جگە لە تاقیکردنەوەیەکی بچوک، وەک ئەوە وایە پەنجەیەک بخەیتە ناو بەحرێکەوە و هیچی تر، تێیگەیاندم نهێنی و شادومانی و فرین لەو ئیشەدا پابەندی دووبارەکردنەوەیەتی لە هەلومەرجی شاعیرانەدا، ئاه چ شاعیرێکی گەورەبوو، چ شاعیرێک بوو. بەڵام دەبێت بێدەنگبم، چونکە ناتوانم پێتان بڵێم من و ئەو چیمان بەسەر هات، ناتوانم پێتان بڵێم.

## عەتار و دەرسیم تاهیر
## «سەردەمی شەڕی ناوخۆ»

لە گەرمەی شەڕی ناوخۆدا عەتار یەکەمین خانووی گەورەی خۆی کڕی، دەتوانم بڵێم، ئەو لە پێشەنگی ئەو کەسانەدا بوو کە بیریان لە دروستکردنی کۆشکی گەورە کردەوە، بڕێکی گەورەی سەرمایەکەشی خستە کڕینی زەوی و زاری ئەوتۆوە کە سەرەتا بێنرخ دیاربوون، بەڵام

بە مەزنەدەی ئەو پاشەڕۆژێکی باشیان هەبوو. نازناوی عەتار وەک کڕیارێکی گەورەی ئینسان دەگەڕێتەوە بۆ چەند ساڵێک دوای ئەو نیوەڕۆیەی لەگەڵ حوسنی خەیاڵدا بردیە سەر، دوو ساڵ دوای ئەو ئێوارەیەش «گوێ ئاونگ» پیاوێکی ئاسایی و کاسبێک بوو لە هێڵی کاسبانی دی و لە مۆراڵی بازاڕ دوورنەکەوتبووەوە. ناوبانگی عەتار وەک بازرگانێکی گەورەی ئینسان هەنگاو بە هەنگاو دەستیپێکرد، سەرەتا بێزیان و سادەڕۆ بوو، شتێکی تێدا نەبوو مرۆڤ لێیبترسێت، گەلەک درەنگ ڕوخساری دڕندانەی ئیشەکەی دەرکەوت و خۆشی کەوتە ئامێزی حیکایەتی سەیر سەیرەوە کە خەڵکوخوای بازاڕ تاماوەیەک باوەڕیان پێنەدەکرد. یەکێک لەو شتانەی عەتاری خستە سەر ئەم کەڵکەڵەیە ڕوخساری ئینسان بوو، ڕەنگە ئێستا ئێوە پێتان سەیربێت، یەکێک بتوانێت کاسبی بە سیمای ئادەمیزادەکانەوە بکات، بتوانێت ڕوخساریان بفرۆشێت، بەڵام عەتار کەسێک بوو دەیتوانی کاسبی بە هەموو شتێکەوە بکات. سیمای ئینسان شتێک بوو، وەکو هەموو شتەکانی دی بۆ فرۆشتن. سەرەتا لەوەوە دەستی پێکرد کە کۆمەڵێک ڕوخساری زۆر تایبەتی بۆ فیلمسازێکی ئێرانی دۆزییەوە، کە بۆ کۆمەڵێک دەموچاوی بێخەندە و غەمزەدە دەگەڕا. دەرهێنەرێک بوو لەسەر ئەکتەری ئاماتۆر کاریدەکرد، بۆ جۆرە سەروسیمایەک وێڵبوو پەژارەیەکی قووڵ و سێبەری کارەساتێکی بێبڕانەوەیان لەسەر بێت. برای دەرهێنەری ئێرانی وەک ئێمە عەتاری نەدەناسی، وەک ئێمە شارەزای بەهرە و تواناکانی ئەو نەبوو، باوەڕی نەدەکرد سەرزلێکی وەها بە لووتێکی گرێیاوی و پێستێکی وەها دێزەوە، تێبگات پیاوێکی هونەرمەند و هەڵاوێردکاری وەک ئەو بۆ چ جۆرە ئەکتەرێک عەوداڵە و لە چ ڕوخسارێک دەگەڕێت، بەڵام هێزی عەتار لەوەدا بوو دەیتوانی بە دروستی بزانێت تۆ چیت دەوێت، هەمیشە ئەو شتەی پەیدادەکرد کە نیازداران لەدووی بوون. عەتار ئەو ئێوارەیە تاقمە

دەموچاوێکی بۆ فیلمسازە ئێرانییەکە برد، ئاغای عەجەم گەشکەڕوو وەستا و نەیدەزانی چی بڵێت، گەر خۆی بگەڕابایە، بە چەندین مانگ ئەو سیما و قیافەتە غەماویانەی نەدەدۆزییەوە. ئەوە یەکەمین کاسبیکردنی عەتاربوو بە ڕوخساری مرۆڤەوە. دواتر چەندەها جار ڕوخساری مرۆڤی لە بازاڕەکاندا کڕی و فرۆشت، هەندێک سیمای بە پارەیەکی زۆر بە فۆتۆگرافیکی یۆنانی فرۆشتەوە کە فلیمێکی دۆکۆمێنتی لەسەر ژیانی بێئارایشت لە خۆرهەڵاتدا ئامادەدەکرد. وەک ئەوەی نەخشەی نهێنی ئەم شارە لە گیرفانیدا بێت، ئێوارەیەک لە ماوەی چەند سەعاتێکدا دەیان قەمووری بۆ پزیشکێکی پسپۆڕ پەیداکرد، کە دەربارەی کاریگەری هەتاو لەسەر گەشەی سروشتی مرۆڤ وانەی دەگووتەوە. دەتگووت خاوەنی سندوقی شتە سەیرەکانە، کەس نازانێت ئەو هەموو قەمووره شەرمن و نیوەڕووەی لە کوێوە هێنا کە پێدەچوو ساڵەهای ساڵ بێت ڕوناکیان نەدیبێت و هەتاویان بەرنەکەوتبێت. وای لێهات عەتار بوو بە یەکێک لە پسپۆڕە وردەکانی تێڕامان و تێگەیشتن لە سەروفەساڵی بەشەر. ئەو بە کاوەخۆ لەو کیمیا نهێنییە تێگەیشت کە لە پشت نیگا و تەماشاکردن و زەردەخەنەی مرۆڤەوەیە. کیمیایەک عەتار دەیتوانی بیگۆڕێت بۆ کاڵا و بیفرۆشێت. ڕووکاری ترسناکی ئیشەکەی ئەو ڕۆژە دەستی پێکرد، کە دەبووایە کۆمەڵێک گەنجی گەمژە و نەخوێندەوار بدۆزێتەوە، تا بیانکەن بە پاسەوانی یەکێک لە وەزیرەکان. لەو ڕۆژەوە وەک بازرگانێکی گرانبەهای ئینسان لە ناو سیاسییەکاندا ناوبانگی ڕۆی، وەک یەکێکی کارامە کە دەتوانێت پاسەوانی تایبەت بکڕێت و بفرۆشێت، بوو بە میوانێکی بەردەوامی سەر سفرەکانی ئەوان. لەسەرەتادا تەنیا ڕۆڵی دەلاڵ و میانەچی لە نێوان کڕیار و فرۆشیارەکاندا دەبینی، بەڵام ڕۆژێک کەوتە سەر کەڵکەڵەی کڕین بۆ خۆی. یەکەمین مرۆڤی ڕاستەقینە کڕیبێتی، منداڵێک بوو ناوی شەهرەیاری شوشە بوو، دەیتوانی ئەو دیو دیوارەکان

ببینێت، بە پارەیەکی خەیاڵی منداڵەکەی لە باپیری کڕییەوە، شوێنێکی تایبەتی بۆ تەرخانکرد، ئەوە لەو کاڵایانە بوو کە نەیدەفرۆشت و تەنیا بە پارەی بێوێنە دەیدایە کڕێ. کەستان لەوانەیە نەزانن ئەو منداڵە چ پارەیەکی بۆ عەتار پەیداکرد و چ پولێکی بەرهەمهێنا، عەتار تا نەبوو بە خاوەنی ئەو منداڵە چاوتیژە نەیدەزانی چەها مێردی دڵپیس لەم شارەدا هەیە، چەها ژنی ڕاڕاو دوودڵ هەیە، چەها سیاسی حیلەباز و بازرگانی فاقەچێن لە بازاڕدان. جارێکی دی کچێکی چکۆلانەی لە دایکی کڕییەوە « لە کاتی شەڕی ناوخۆدا لە شوێنێکی نهێنیدا شاردبیەوە و بە پارەی زۆر زۆر نەبایە دەرینەدەخست» . کچێک بوو، دەیتوانی پێت بڵێت لە چل و هەشت سەعاتی داهاتوودا دەژیت یان دەمریت، ئەودەمە شەڕکەرەکان زۆر پێویستیان بەجۆرە زانیارییەکی وا هەبوو تا هێزی جەنگ و غیرەتی پێکدادانیان هەبێت. بێکەڵکترین بوونەوەری کۆمەڵەکەی، دەرسیم تاهیر بوو، ئەو مێردمنداڵە لووتنەی دەیتوانی لە بازنەیەکی گەورەدا هەر لاشەیەک لە ژێر زەویدا بێت ببینێت و دەریبهێنێت. دەرسیم تاهیر یەکەمجار لە بن باڵی عەتارەوە دەرپەڕی و هاتەدەرێ. ئەو چیرۆکی ڕاستەقینەی منداڵەکانی عەتاری بۆباسکردین، باسی ئەو کوڕەی کرد کە دەیتوانی گوللە بوەستێنێت، ئەو کچەی گەر سەیری زەردەخەنەکانیت بکردبایە خەوت لێدەکەوت، ئەو کوڕەی لە شوێنی فرمێسکەکانیدا گوڵێکی بۆنخۆش دەڕوا، ئەو کچەی دەیتوانی بە دەست جنسی منداڵان لە زگی دایکیاندا بگۆڕێت. عەتار لە ڕێگای ئەو منداڵانەوە لە چەند ساڵێکی کەمدا پول و پارەیەکی بێشوماری خستە سەر یەک. عەتار وەک چۆن شتی عەنتیکەی کۆدەکردەوە، ئاوها ئادەمیزادانی سەیر و ناوازەشی دەکڕی.

دەبێت بڵێم کە ڕەفتاری عەتار لەگەڵ منداڵە بلیمەتەکانیدا ڕەفتارێکی جوان بوو، لەگەڵ ڕۆحی سەردەم و ئیقاعی ڕۆژگاردا دەگونجا، ئەو

منداڵــە بلیمەتانــەی کــە نەیاندەویســت لــە دایــک و باوکیــان جیاببنــەوە، پەیمانێکی کاری لەگەڵـدا مۆرکـردن و لای دادگا پێـی ئیمزاکـردن و لێگـەڕا تـا کاتـی پێویسـت و ڕۆژی ڕاسـتەقینەی بەرهـەم لای دایـک و باوکـی خۆیـان بـن. هەمـوو شـتەکانی لـە ژێـر ناونیشـانی گرێبەسـتی ئیشـکردندا تۆماردەکـرد. ئەو چەنـد سـاڵەی لـە ناو قەیسـەری و مەزاتخانـە و بـەر سینەماکاندا بردبوویـە سـەر، ئەزموونێکـی بـۆ دروسـتکردبوو کـە دەتوانێـت هەمـوو مرۆڤێـک بکڕێـت، دەیتوانــی لــە ســەرۆکی حیزبەکانــەوە، تــا بەرپرســەکانی ئاســایش، تــا داوەرەکانـی دادگا هەموویـان بەشـتێک نەرمبـکات، لای ئـەو هەمـوو مرۆڤێـک شـتێکی هەبـوو بتوانیـت لێـوەی بچێتـە نـاوەوە و نیـازی خۆتـی لێبسـتێنیت. ئیشـەکانی خەوشـێکی قانونیـان تێدانەبـوو. بـۆ ئـەو منداڵانـەی دیکـەش کـە لــە خەڵکــی ڕێبــوار و ڕاگــوزەر کڕیبوونــی، شــوێنی پــاک و جلــی نــوێ و حەوشـی تایبەتـی یاریکردنـی بـۆ دروسـتکردبوون. لای ڕێکخراوەکانـی منـداڵان و لــە بەشــی جەهێڵانــی دادگا مۆڵەتــی چاوەدێــری و سەرپەرشــتیکردنی وەرگرتبــوو. لــەوەش گرنگتــر عەتــار کاســبێکی شــێت و تووڕەنەبــوو، هەمــوو جارێــک کــە دەکەوتــە ســەواکردنی شــتێک، گــەر بیزانیبایــە بەرابەرەکــەی کەللەشــەق و بێســەبرە، خــۆی خەندەیەکـی دەسـتکردی دەگـرت و دەیگـووت «هەڤـاڵ، تووڕەمەبـە، بـازاڕ یەعنـی زەردەخەنـە، ئێسـتا زەردەخەنەیـەک بگـرە و دەبینیـت ڕێـک دەکەویـن». لەگـەڵ کاڵا ئادەمییەکانیشـدا ڕەفتـاری جـوان و بەڕێزبـوو، گرنگتریـن شـت لای ئـەو پـارە بـوو، زەردەخەنـە و ڕێزیـش شـتێک بـوون پارەیـان ڕادەکێشـا. لێـرەوە نەگلایـە ئـەو کاسـبییە خراپانـەی پیـاوە سـووک و بێبەهـرەکان تێیدەکـەون، وەک کڕیـن و فرۆشـتنی ئافـرەت، هێنـان و بردنـی سـۆزانییەکان بـە نـاوی سـکرتێرەوە، شـکاندنی شـەرەفی کچـان بـە بەهانــەی دامەزراندنیــان لــە ئیشــێکدا. دەبێــت بڵێــم لــەو ڕووەوە پیاوێکــی پـاک بـوو. بـەڵام وەک دواتـر دەبینـن دەسـتێکی ترسـناکی لـە گەلـەک شـتی تـردا هەبـوو، کـە دوایـی ئێـوەی بەڕێزیـش بەڕوونـی تێیاندەگـەن.

ئەگەرچی ئیشەکانی هەندێجار کارەساتیان دەنایەوە، بەڵام لە قووڵایی دڵیدا خۆی بێخەتا دەبینی... دونیا وابوو، ئەو هەموو هەوڵێکی دەدا شتەکان باش و لەسەرەخۆ بڕۆن، هەر دەردێک کە دروستدەبوو بە سادەترین و گونجاوترین شێوە لێیدەرچێت. لەگەڵ ئەوەشدا بەهرەی منداڵەکانی بەجۆرێک ترسناکبوون، لە ژێر مەرجی زۆر سەخت و بە گفتی زۆر قورس نەبایە نەدەچووە ژێرباری هەندێک ئیش، دڵنیابوو ئەو منداڵانە دەتوانن نهێنی ئەوتۆ بزانن کە فیتنەی گەورەی لە دوایە. دەشێت ژیانی ئەوانیش و خۆشی بکەوێتە ئەگەر و نەگەرەوە، ئیدی بۆ ئەوەی لە مەترسی کەمبکاتەوە و بڕی قازانجیش بالآبەرێت، نرخی ئەوتۆ خەیاڵی دانا کە تەنیا هەندێک پارەداری کەم پێیان دابیندەکرا. دەرسیم تاهیر بێخێرترین و سەرسەختترین کەسێک بوو لەوانەی عەتار پارەی پێدان، مێردمنداڵێکی لووتزل و ناشیرین بوو، ژیانی منداڵەکانی دیکەشی تاڵکردبوو. ساڵی ١٩٩٨ لەبەغداد لە سەربازێکی عەرەبی کڕییەوە. دەرسیم ئەوکات تەمەنی چواردەساڵ بوو، خڕێکی کورت، بەسەرێکی زل و ورگێکی خڕەوە، گەر لووتی نەبایە، لە پشیلەیەکی ڕەشی زۆرخۆر دەچوو، کوردی و عەرەبیشی بە تەواوی دەزانی. شەش ساڵان بوو لە یەکێک لە ئۆردوگاکاندا و لە شەڕێکی عەشایەریدا باوکی کوژرا، خۆی بە چاوی خۆی تەرمەکەی ئەوی بینی بۆ پێدەشتێکی دوور ڕایانکێشا، سێ پیاوی تووڕەبوون سوێندیان خواردبوو بیکوژن و گۆڕونیبکەن. گەر دەرسیمیان بدیایە ئەویشیان دەکوشت، بەڵام ڕێکەوت کۆمەکی منداڵەکەی کرد و لەدەست پیاوکوژان دەربازیبوو. دەرسیم لە خاڵێکی چاوبرسی و پارەپەرست بەولاوە کەسی دیکەی نەبوو، دوای کوژرانی باوکی چەند ڕۆژێک خاڵە بێعاتیفەکەی لە کادانێکدا گلیدایەوە و نەیهێشت دەرکەوێت، شەوێکیان دەرسیمی چکۆلە دەرگای کادانەکەی شکاند و بەرەو پێدەشتە ترسناک و پڕ گورگەکان تێیتەقاند، ئەو لە هەموو دونیادا تەنیا باوکی

هەبوو. بەو شەوە گەرمەی هاوین بەناو دڕک و داڵدا هەڵهات، چەندین ڕۆژ بەدوای لاشەی باوکیدا بۆنی زەویکرد، لەو کاتەوە هەستیکرد دەتوانێت لەدوورەوە بۆنی لاشەکانی ژێر زەوی هەڵمژێت و بیانبینێت، بەو چنگە چکۆلانانەی زەوی بدڕێت و گۆڕی مردووەکان هەڵداتەوە، لە دوو شەودا چەندین لاشەی دۆزییەوە، تا دواجار لە کەندێکی دڕکاویدا گەیشتە سەر لاشەی باوکی و دەریهێنا. کەخاڵی بە حیکایەتەکەی زانی تێگەیشت دەرسیم مەخلوقێکی ترسناک و نەفرەت لێکراوە، گەر لێرە بمێنێتەوە سەری خۆی و ئەویش دەخوات. بێئەوەی بواری بداتێ، هەر ئەو شەوە بردی بۆ لای نەقیبی ئیستیخبارات قەحتان سابیر و تەواوی حیکایەتەکەی بۆ گێڕایەوە. جەنابی نەقیب پێشتر نەیبیستبوو کەسێک لە دونیادا هەبێت بەو جۆرە مردوو بدۆزێتەوە. تەلەگرافێکی بەپەلەی نارد بۆ دەزگای بالای ئیستیخبارات لە بەغداد و تەواوی چیرۆکەکەی تیانوسی، هەمان شەو لە بەغداوە وەلام هاتەوە و دەرسیم تاهیریان بەرابەر پارەیەکی دیاریکراو لە خاڵی کڕییەوە، کە بێئەوەی منداڵەکە ماچبکات دایە دەست عەرەبەکان و بە خۆی و جامانە قیتەکەیەوە لە دەرگای ژوورەکەی نەقیب هاتەدەرێ.

دەبایە دەرسیمی بچکۆلە لەگەڵ هێزێکی تایبەتدا لە سنوورەکان و لە مەیدانەکانی جەنگدا، بۆ لاشەی ئەو سەربازە عێراقیانە بگەڕێت کە سالانی دووروودرێژی جەنگ لە بەرەکانی شەڕدا کرابوون بە ژێرگڵەوە. پتر لە پێنج ساڵ لە هەلومەرجی جیاواز و شوێنی جیاوازدا هەمان ئیشیکرد. هەموو منداڵی خۆی لە ناو بۆنی لاشەی سەربازی عێراقی و ئێرانیدا بردەسەر، لەباشوورەوەڕا بست بە بست و بازنە بازنە زەوی دەپشکنی. شەوان لەگەڵ سەگ و هێستری سوپادا دەیانخەواند، مرۆڤێکی لێدەرچوو هەستی بە پاکوتەمیزی و جوانی نەبوو، هەستی بە سووکایەتی نەدەکرد، وەک ئاژەڵێکی ملهوڕ لێیاندەخوڕی و ئازاریاندەدا. لە دوای

ساڵی ١٩٩٣ ـەوە، دەوڵـەت ئـەو گوردانـەی هەڵوەشـاندەوە و دەرسـیم تاهیـر وەک مەیتەرێکـی ئەسـپ لـە خزمـەت یەکێـک لـە ئەفسـەرە بەرزەکانی سـوپادا مایـەوە. لەگـەڵ ئەسـپەکاندا دەژیـا و لەنـاو ئەوانـدا نانـی دەخـوارد. بەهـۆی ئـەو بـۆ تەرسـەی لێیدەهـات، نەیدەوێـرا تەویلەکـە جێبهێڵێـت، بۆنێکـی وەهـا کوشـندەی هەبـوو، ئادەمییـەکان بۆیـان قەبـووڵ نەدەکـرا. کـە تەمەنـی بـوو بـە چـواردە و هێـدی هێـدی باڵقبـوو، وەک مەیمونێکـی بێشـەرم کـە هیـچ لـە حەیـاو حورمـەت فێرنەبـووە، شـەرمی لـە دەرخسـتنی هیـچ شـوێنێکی خـۆی نەدەکـرد. لـە دیسداشـە عەرەبییـە دڕاوەکانیـدا شـتی ناشـیرین و سـەرودەری خراپـی لێدەوەشـایەوە، خەریـک بـوو دەبـووە بارێکـی قـورس بەسـەر ئەفسـەرەکەوە. کابـرای پایـەدار، ڕۆژێکیـان بـە پەیامنێرەکـەی خۆیـدا، ناردی بـۆ حەمـام و جلـی نوێـی بـۆ کـڕی و شوشـەیەک عەتـری بەسـەردا ڕشـت و بـە جێبێکـی تایبـەت ڕەوانـەی نەقڵیاتـی باکـووری کـرد. کابـرا بڕیاریدابـوو بـە پارەیەکـی کەمیـش بێـت، بیداتـە دەسـت کوردێـک و خـۆی لێدەربازبـکات. دوو ڕۆژ کوردێکیـان نەبینـی ئـەم مەخلوقـە لووتـزل و ناشـیرینەی بـە فلسـێک بوێـت. سـێهەم ڕۆژ بـە ڕێکـەوت عەتـاری بەدبەخـت، لـەدوای سـاغکردنەوەی بـارە فەرشـێکی قاچـاغ، بـۆ جێبەجێکردنـی ئیشـێک چـوو بـۆ نەقڵیـات. پەیامنێرەکـە کـە دوو ڕۆژ بـوو بـۆ بـەدوای دەسـتکەوتێکدا عـەوداڵ بـوو، دواجـار لـە عەتـاردا نەسـیبی خـۆی دۆزییـەوە. دوای باسوخواسـێکی درێـژ، کـە تێیـدا فرۆشـیارە ماندووەکـە سـیفەتە دانسـقە و کەمهاوتاکانـی دەرسـیم تاهیـری ژمـارد، پارەیەکـی ناچیـزی وەرگـرت و خواحافیـزی لـە هەردووکیـان کـرد و بـە خـۆی و بێرییـە سـەربازییەکەیەوە شـاد و شـوکور لـە نەقڵیـات چـووەدەرێ. سـەرەتا عەتـار بـە تەواوەتـی نەیدەزانـی پـارەی خسـتۆتە کڕینـی چ جـۆرە ئادەمییەکـەوە، دڵخۆشـی خـۆی بەوەدەدایـەوە کـە ئـەو پارەیـەی لـە کڕینـی دەرسـیمدا خەرجیکـردوە پـارەی قەلێکـی خـرت نییـە. دەیزانـی گـەر سـوودی نەبێـت دەیبەخشـێتە ڕێکخراوەکانـی منـداڵان،

دەیدات بە هەتیوخانەکان، چیرۆکێکی بۆ دروستدەکات و لای بەڕێوەبەری ئاوارەکانی جەنگ خۆشەویستیدەکات. لە ڕاستیدا عەتار زۆر درەنگ زانی کە نەدەبایە دەرسیم تاهیر بکرێت، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو.

عەتار ماڵێکی زۆر خۆشی بۆ منداڵەکان تەرخانکردبوو، ئافرەتێکی دڵسۆز و بێدەنگ خزمەتیدەکردن، هەر کامێکیان کێشەی هەبایە خۆی ئامادەدەبوو، گەر نەخۆشبکەوتنایە پزیشکی بۆ دەبردن، لە وەرزی سەیراندا هەموویانی دەخستە ماشێنەکەوە و لە قەراغشار کەمپینێکی هاوینەی بۆ دەسازاندن. بەڵام دواجار هاتنی دەرسیم تاهیر ژیانی منداڵەکانی تێکدا، بە پیس و پۆخڵییەکەی، بە بێدەنگییەکەی، بە بێشەرمییەکەی، بەو بۆن ئەسپەی بەردەوام لێیدەهات، بە میزکردنە ناوەخت و نابەجێکانی، بەو لووتە زلەیەوە کەسەری بەلادا قورسکردبوو. منداڵێک بوو بە لەش لەوانی دی گەورەتر، بەڵام بە عەقڵ چکۆلانەتر. قسەی نەدەکرد، یاری نەدەزانی، گەر قسەشی بکردایە تەنیا باسی دوو شتی دەکرد لاشە و ئەسپ.

لەو ماوەیەدا عەتار زۆر هەوڵیدا سوود لە دەرسیم تاهیر ببینێت، ماوەیەک تەنیا لە سۆراغی ئەوەدا بوو، بزانێت کەس هەیە بیەوێت جێگا لاشەیەک بدۆزێتەوە؟ لە نێو بازاڕدا پرسیاریدەکرد، لە هاوڕێکانی، لە ناو سیاسی و دەوڵەمەندەکاندا. بەڵام زۆر بەلایەوە سەیربوو کەس لەو وڵاتەدا بە دوای لاشەدا نەدەگەڕا. مردووەکان یەکجار مردبوون و فەرامۆشکرابوون، یەکێک ناشتبوونی و دواتر بە تەواوی بیرچووبوونەوە. عەتار دەیزانی لەم شارە و لە شارۆچکەکانی دەوروبەریشدا بەردەوام خەڵک دەکوژرێت، دەیزانی ساڵانە کۆمەڵێک لاشە بە نهێنی دەکرێن بە ژێر زەوییەوە، تەماحی لەوە بوو لقێکی کاسبییەکەی بباتە ناو پەیداکردن و فرۆشتنی ئەو لاشانەوە، بەڵام هەرچییەکی دەکرد لە نهێنی ونبوونی لاشەکان و کەمتەرخەمی دونیا تێنەدەگەیشت. خەڵک زیاتر

لاشەکانیان دەشاردەوە و گۆڕونیاندەکردن، نەوەک بیر لە دەرهێنان و دۆزینەوەیان بکەنەوە. هەندێک لە هاوڕێکانی ئامۆژگاریانکرد، لەدەرگای هەر شتێک دەدات، لە دەرگای مەرگ نەدات، چونکە هیچ شتێک لە زیندووکردنەوەی حیکایەتی لاشەیەک ترسناکتر نییە. هەموو هاوڕێکانی گووتیان «عەتار، زۆر ئاساییە لە کوشتنی کەسێکدا بەشداربیت، بەڵام ئاسایی نییە کوژراوێک لە خەو هەستێنیت». عەتار زۆرباش لەو قسانە تێدەگەیشت، دوای نۆ مانگ بڕیاریدا دەرسیم تاهیر لە کۆڵ خۆی بکاتەوە و بیفرۆشێت. بەڵام بڕیارێکی بێمانابوو، چونکە کڕیاری دەستنەدەکەوت. تاکە چارەیەک لە خەیاڵیدابوو ئەوەبوو بیبات بۆ غەزەلنوس کە ئەو کات لە ماڵی خۆیدا بە کۆمەکی ڕێکخراوێکی بیانی هەندێک منداڵانی بێسەرپەرشتی بەخێودەکرد.

ئێوارەیەکیان عەتار دەرسیم تاهیری خستە پێشی ماشێنەکەیەوە و چوو بۆ لای غەزەلنوس. هەڵەیەک نەدەبایە بازارناسێکی وەک ئەو تێیبکەوێت. بەڵام لەگەڵ ئەو منداڵە لووتزلە بێخێرەدا دەکرا چیتر بکات؟... دەبوو چ ڕێگایەک هەڵبژێرێت و چ چارەیەکی هەبوو؟.

## مافوورە قەشەنگەکان و خانمە غەمگینەکانی

زۆر مافووریان چنی کە خەڵکانیان بۆ خەیاڵ ڕادەکێشا و بینەرانیان بەرەو چیرۆکی ئەفسانەیی دەبرد. هەر ئەو مافوورانەی ئەوبوون کارخانەی نیایان خستە ڕیزی کارخانە ناسراوەکانەوە، پڕبوون لە نیگار و نەخشی پێشتر نەبینراو. نێودارترین زنجیرە فەرشێک کە دەست و نەخشی تریفەی بە دەرەوە ناساند، زنجیرە مافووری «خوشکە غەمگینەکان» بوو. ئەوە سەدایەکی ئەوتۆی لە بازاڕدا هەبوو، خەڵکانێک لە وڵاتانی

دوورەوە هاتن و کڕیان.

هەندێ لە مافوورەکانی ڕەسمی کۆمەڵێک کچ بوون... جارێک لەسەر دەریا وەستابوون و بەدەموچاوێکی خەیاڵییەوە دەگریان، فرمێسکەکانیان بابردبووی و لە ئاسماندا دڵۆپ دڵۆپ بووبوون بە نەورەس. لە شوێنێکی دیکەدا هەمان ئەو کچانە لەسەر ترۆپکی چیایەکی سەخت، با یاری بە قژیان دەکرد و ئەشکیان بووبوو بە پاساری... لەمافوورێکی دیکەدا ئەو کچانە لە بەلەمێکدا گریابوون و فرمێسکیان لە ئاوەکەدا ماسی بوو... لە شوێنێکی دیشدا بەسەر هەندێک کتێبدا نوشتابوونەوە و فرمێسکیان لە هەوادا پەپولەبوو.

دوای ئەو زنجیرەیە، کۆمەڵە مافووری «کچ و کوکوختییەکان»، «ئەمیرەکانی شەو»، «کچە ڕاوکەرە مەستەکان»یان دروستکرد.

لە ساڵی ١٩٩٠ ەوە تا ساڵی ١٩٩٢، واتە لە ڕۆژگاری داگیرکردنی کوێتەوە تا دروستبوونی یەکەمین حکومەت لە کوردستان، کارخانەی نیا فرۆشێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام بە درێژایی ئەو دووساڵە ئیشیان نەوەستا، بەپێچەوانەوە لەسەردەمی فەرهود و تاڵانیدا، عەبدولقادری نیا دەستی گەیشتە هەندێک مەکینەی نوێ و پارچەی بەسوود و دوو هۆڵی تری بۆ ئامێرە تازەکان دروستکرد. لەو ماوەیەدا تریفە و کچەکان، وەک ئەوەی خەیاڵ دیلیکردبن شەو و ڕۆژ لە خولیای ئیشکردندا بوون، وەک ئەوەی خەوێکی موگناتیسیان لێکەوتبێت بەردەوام ئیشیاندەکرد. خەیاڵە ئەفسوناوییەکانی تریفە سەراپای کارخانەکەی بەدوای خۆیدا کێشدەکرد، وەک ئەوەی خودی ئامێرەکانیش تەسلیمی هەمان ئیقاع و تێکەڵی هەمان سیحربووبێتن، بەجۆرێکی مۆسیقی و بێتێکچوونی لە ناکاو بە باشی دەگەڕان. لەو دوو ساڵەدا تریفە لەگەڵ باجییەکی دیکەدا لە کارخانەکەدا دەخەوت. فەوزیە یاسەمی دایکی کە نەخۆشی

یەک لە دوای یەک ڕووی تێکردبوو، لەو ڕۆژە سەختانەدا «کە خەڵک لە ناوەڕاستی عێراق و باشوورەوە بەرەو کوردستان ڕایاندەکرد» هەراسان لەدەست جەوهەری کوڕی، ماڵی جێهێشت و چوو بۆ لای برایەکی خانەدانی خۆی لە بەغداد و دواتریش هەر لەوێ گیانی سپارد. سەرەتا فەوزیە خولیای وابوو تریفەش لەگەڵ خۆیدا بەرێت بۆ ئەوێ، بەڵام کە چیرۆکەکانی ئەوێی بیست و خۆی بە چاوی خۆی، ڕەفتاری پۆلیس و ئاسایشەکانی ئەوێی دەرهەق بە کچان و ژنانی ئەو شارە بەدبەختە بینی، هەموو شتێکی تێکدا و پێی باشبوو تریفە هەر لەسەر ئیشەکەی خۆی بمێنێتەوە. لەو ماوەیەدا کچانی کارخانەکە بێپشوو کاریاندەکرد، هەتا لە ڕۆژانی ڕاپەڕین و لە سەردەمی ڕەوە گەورەکەی خەڵکیشدا کەسەر لە بەری زەمینی هەژاند، ئەوان لە ئیشکردن نەوەستان. کار بە جۆرێکی سەیر فرێیدابوونە دەرەوەی مێژوو و لەمەملەکەتێکی تردا دەژیان. کچانی کارخانەکە سالانێکی درێژ لەزەتێکیان لە چنین و خۆشییەکیان لە ئیشەکەیان نەبینیبوو، بەڵام هاتنی تریفە بە خەونە پڕەکانییەوە، شادی خستبووە ناو ڕۆح و سەر دەستوپەنجەی ئەوانیش.

مرۆڤ لە هەر سەردەم و زەمانێکدا ئیشبکات، گەر ئیشەکەی خاڵی بوو لە خەیاڵ، واتە نزیکە لە مەرگ. هەر بۆیە تریفە بەو خەیاڵە پڕەوە هەمووانی لە ژیان نزیککردەوە. هەموو دەزانین کە خانمی یابەحری، منداڵی خۆی لەگەڵ بوونەوەرگەلێکی نەبینراودا بردبووەسەر، بەڵام پێدەچێت ئەو بوونەوەرە سەیر و نەبینراوانە تەنیا پاسەوانی منداڵی ئەوی خەیاڵزابووبێتن. هێندەی لە تەمەندا هەڵکشا و کەمێک گەورەبوو، لەگەڵ قورسبوونی وانەکانی قوتابخانەدا، لەگەڵ تێکەڵاوبوونی بە دونیای کتێب و خوێندنەوەی بێوچاندا، هەموو شتێکی ئەوانی بیرچووەوە. بەڵام لەبری ئەوان شەوانە پەیتا پەیتا خەیاڵاتی بۆدەهات، وێنەی سەیر سەیر کە دواتر هەندێکیانی لە دروستکردنی مافوورەکاندا بەکارهێنا.

شاری دەبینی لە خۆڵەمێش، کوچەی دەبینی لە بەردی ڕەش، ماڵی دەهاتە پێشچاو تاریک وەک تونێلێکی ئەبەدی. بۆ هەر کوێیەک دەچوو وێنەی تێکەڵاو لە غەم و سەرسامی نوقمیاندەکرد. مافوورەکان ئەو هەلەیان خستە دەست بەهرە کێوی و خەیاڵە ڕامنەکراوەکانی خۆی لە شوێنێکدا بنوسێتەوە. تا نەگەیشتە ئەو کارخانەیە، خۆی وەک نەخۆش دەهاتە بەرچاو کە وڕێنەیەکی سامناک بەخۆڕا ئازاریدەدا. چ شتێک لەوە دڵشکێنتر نییە نەزانی خەیاڵەکانی خۆت چی لێبکەیت، ئەویش نەیدەزانی سوودی ئەم هەموو خەیاڵە چییە کە بەشێوە و ڕەنگی جۆراوجۆر لە سەریدا سەمایاندەکرد. بەر لە مردنی زاهیر یابەحری باوکی، ماوەیەک پێویستی بە چارەسەری دەروونی هەبوو، ڕاستە کچەکە ئەسمەرێکی چکۆلانە و خۆشڕووبوو، بێئەوەی بێحورمەت و زۆرپوو دیاربێت لەگەڵ بێگانانـدا دەکرایەوە، کە کەسێکی غەریبی بدیبایە ڕاستە و ڕاست دەبووە هاوڕێی، گەلەک زووش دیوارەکانی لە نێوان خۆی و خەڵکدا هەڵدەگرت، هەردەم لەگەڵ خەڵکدا ڕووگەش و دەم پڕ خەندە بوو. بەڵام لە ماڵەوە تەنیا و غەماوی و ڕەشهەوا دەینواند، بەردەوام سەری پڕ بوو لە خەیاڵی خۆڵەمێشی. زۆرجار دەیگووت بۆنی ژیانی من لە بۆنی فانۆسێکی کوژاوە دەچێت، بۆی جەستەم بۆی ئاگردانێکە یەکێک لە ناکاو خامۆشیکردبێت. ڕێدەکەوت بە هەفتە توشی هێرشی ئەو خولیا و وێنانە ببێت کە لە جێگادا دەیانخست، بەچەشنێک هەستی دەگۆڕا پێیوابوو لە پێخەفێکدا خەوتووە هەمووی چیلکە و خاشاکە، ناو نوێنەکەی لێدەبوو بە سەرجێیەکی پڕ خۆڵەمێش، وەک بە لەشی تەڕەوە کەوتبێتە ناو کادانێکی گەورە و سەر تا خواری بووبێتە پوش، ڕایدەکردە حەمامە ساردەکە و سەیری لەشە لاوازەکەی خۆی دەکرد. بە کورتی خەیاڵەکان ئەشکەنجەیان دەدا، بەڵام لە کارخانەی مافوورەکە بەختەوەربوو، لەوێ وڕێنەکانی لەو

هەوا تاریکە هاتنەدەرێ و ڕوخساری ڕەنگاوڕەنگیان گرت.

لەگەڵ هەموو خۆشڕوویی خۆیدا، فەرشەکانی پڕبوون لە کچی غەمبار. بە دەگمەن فەرشێکی هەبوو کچێکی گریاوی تێدانەبێت. لە کارخانەی مافوورەکە چەندە لە خەیاڵ و قووڵایی ئەندێشە ئەفسووناوییەکانی خۆی تێگەیشت، هێندەش لە ژیانی کچە بەستەزمانەکانی کارخانەکە نزیکبووەوە. ئەو ئەزموونە بڕوایەکی لە تریفەدا چاند کە هیچ مرۆڤێک خاڵی نییە لە خەیاڵی قووڵ، بەڵام زۆربەی خەڵک کاتی ئەوەیان نییە دەستبەرن بۆ ناو ڕۆحی خۆیان تا بزانن چی تێدایە. هاوڕێکانی کۆمەڵێک کچ بوون بە چەند شەفتێکی جیاواز کاریاندەکرد، ئەو لە هەموو کاتەکاندا لەگەڵیاندا بوو، لەو ڕووەشەوە بارێکی قورسی لە کۆڵ گەلاوێژ خان کەمکردبووەوە، کە بەر لە هاتنی تریفە بەتەنیا غەمی هەموو کچەکانی دەخوارد. زۆربەیان خانمی غەمگین و چاو لە ئەشک بوون، کێشەکانیان شتێک نەبوو مرۆڤ بتوانێت چارەیبکات، زۆربەیان کچی هەژار و بەستەزمانی ئەو خێزانە لادێیانەبوون کە لە زەوی و زاری خۆیان هەڵکەنرابوون و دەبایە بژێوییەک پەیدابکەن. تریفە لە سەرەتای ئیشکردنیدا کۆمەڵێک کچی بێدەنگ و شەرمنی بینی کە وەک گوناهباربن، چاوشۆڕ و کزنیگا لەسەر ئامێرەکان دەستیان دەجولاند. ئەو ترسەی نێو چاویان و ئەو نیگا کزانەیان تریفەیان پەرێشانکرد، بەڵام فەزای کارخانەکە وەها ڕووتەن و ساردبوو جگە لە غەم هیچی تری لەو مەخلوقە لاواز و بێتینانەدا نەدەبزواند. بەیانیان، هاوڕێ بە کزەی ساردی زستان یان شنەی فێنکی هاوین بە خۆیان و لەچکێکی چڵکنەوە لە پاسێکی کۆن دادەبەزین و دەهاتن بۆ ئیش، شەوانیش بە دەستە و پەنجەی کوڕ و خوێن تێزاوەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵ. بۆنی عارەق و برسێتی لە لەچک و عەباکانیان دەهات. جگە

لە ئیشکردن بۆ سەید قادری نیا و شەڕکردن لەگەڵ یەکدا هیچی تریان نەدەزانی، بەڵام خۆشحاڵبوون کە لایەنی کەم وەک کارخانەکانی تر نێری شەڕواڵ پیس و پیاوی چاوچنۆکیان لەگەڵدا نییە. لە کارگەکانی ترەوە هەواڵی ئەو ژیانە تاڵەیان بۆدەهات کە کچان و ژنانی ئیشکەر تیاەژین، ئیشی زۆر، موچەی کەم، پیاوانی نەخۆش و کەڵەباب مەزەب. هەردەم دڵخۆشی خۆیان بەوە دەدایەوە، کە لێرە، لە بەردەستی خانمی نیادا، شەرەفیان سەلامەتە. دەبێت بڵێم کە هاتنی تریفە سەرلەبەر ژیانی کچەکانی گۆڕی. وەک خوشکێکی نازدار سەیریاندەکرد کە لەپاڵ هەندێک وردە ئێرەیی و کەمە ڕقدا، هەمووان لەسەر ڕێزگرتنی ڕێکبوون. لەگەڵ ئەوەشدا کەسیان نەیانوێرا خێرا دڵی خۆیان بکەنەوە. بەڵام ئاخر ئەو بێدەرەتان و بەدبەختانە دڵی خۆیان چۆن بکردبایەتەوە؟ چما بەستەزمانانە دەیانزانی دڵیان هەیە؟ دەیانزانی شتێک هەیە ناوی دڵکردنەوەیە؟. زۆری ویست تا تریفە یەک بە یەک ناسینی و خۆشیویستن، مەراقی ئەوان زۆر شتی لە تریفەدا گۆڕی. گەر ئەو کچانە نەبانایە لەوانەبوو تریفە لە کچێکی پڕخەیاڵ زیاتر هیچی تر نەبایە.

تریفە ڕۆژ بە ڕۆژ، و کەم بە کەم دڵی ئەوانی بۆ خۆی ڕاکێشا و پاش ساڵوەختێک تێکەڵی و دڵنیایی، هێدی هێدی بنی ئەو ئۆقیانوسی غەمەی بۆ دەرکەوت کە هەر کچێکیان لەگەڵ خۆیدا دەیگێڕێت. نابێت وابزانین کە تریفە یابەحری بەپلان شتی وەهای کردوە، بەڵکو خەیاڵ جورئەتی بەخشییە ئەو کچانە قسەبکەن، خەیاڵیش کیسەڵێکی خاوە، زۆری دەوێت تافێری فرین دەبێت. شتەکان سروشتی و خۆڕسک هاتن، کاتێک تریفە بیری لەوەکردەوە خولیاکانی بکاتە مافوور، هێدی هێدی دەنکە زێڕینەکانی خەیاڵی وەک بارانێک بەر ئەو کچانە کەوت، کە هێندەی مافوورێکیان تەواودەکرد شێتانە لەدەوری کۆدەبوونەوە

و لێپرادەمان و خۆشحاڵانە چەپڵەیان بۆ لێدەدا و بەشەرمەوە پێی سەرسامبوون. ڕۆژ دوای ڕۆژ و مانگ دوای مانگ پتر باوەڕیان بەم کچە پەیدادەکرد کە دەتگووت لە ئەستێرەیەکی ترەوە هاتووە. تریفە یابەحری لەکاتی ئیشدا وەک ئیلهامزەدەیەک، وەک باڵندەیەک بەدەم خەوەوە بفڕێت، هەموو لەشی سروشتی تارماییەکی وەردەگرت کە لە ئاستی ڕوودەستی شتەکان بەرزبووبێتەوە و لە زەوی بڕابێت. تریفە خۆی هیچی نەدەکرد، لەسەر کورسییەک دادەنیشت و چاوی لێکدەنا و خەیاڵیدەکرد، دەزوو دەزووش ئەو خەیاڵە وردەی دەگوازتەوە بۆ سەر مافوورەکان، بە قاڵیبافەکانی دەگووت چیبکەن و چی نەکەن، لە سەمفۆنیستێک دەچوو نۆتەکان پێشتر لەسەریدا نوسرابن، ئەوکاتانەی ئیشیاندەکرد، کچەکان بێویستی خۆیان نەیاندەتوانی لە کارهەستن. بەشێوەیەک لە خەوی تریفەدا نوقمدەبوون دەبوو بە خەوی خۆیان. هەموو دەیانبینی تریفە لەو سەر کورسییە کاڵتر و کاڵتر دەنوێنێت، دەبێتە خەیاڵ، دەبێتە بوونەوەرێک ئەودیوی دیارە. ئەوانەی شەفتی شەو لەگەڵ تریفەدا کاریاندەکرد، دەیانگووت سات هەبووە بەتەواوی ونبووە، لەوە دەرچووە جەستەی هەبێت و بۆتە خەیاڵێکی ساف.

من دەڵێم مرۆڤ خۆی بوونەوەرێکە هێند بوێر نییە خەیاڵبکاتەوە، هەردەم پێویستی بە یەکێک هەیە لە نزیکی بێت و بەردەوام خەیالاتی هەبێت تا ئەویش دەستبەرێ و دەرگای گەنجینەی فەنتازیاکانی خۆی بکاتەوە. ترس لە خەیاڵ شتێکە ڕیشەکانی قووڵ لە ڕۆحی مرۆڤدا چەقیوە، چونکە مرۆڤ نازانێت خەیاڵ بۆ کوێی دەبات، نازانێت چ دەرگایەکی لێدەخاتە سەر پشت، ترسی مرۆڤ لە خەیاڵ لە ترسی مرۆڤ لە دوپشک و ئەژدیها و گورگی برسی بەهێزترە. کچەکانی مافوورخانەی نیا هەموو گەنج بوون، تەمەنیان لە نێوان چواردە

و سـی سـاڵدا بـوو، سـیانیان ژن بـوون و شـوویانکردبوو، بـەڵام هـەر سـێکیان بەدبەخـت و چارەڕەشبوون. یەکێکیـان مێردەکـەی سەرخۆشـێکی بەدمەسـت بـوو کـە شـەوان لێیـدەدا و بەیانیـان بـە بەرچـاوی شـینەوە دەهاتـەوە بـۆ ئیـش، یەکێکـی دییـان مێردەکـەی نەخۆشـبوو، بەدەگمـەن لـە ژێـر بەتانییەکـەی دەهاتـەدەرێ، لـەو باوەڕەدابـوو کۆمەڵێـک دوژمـن لـە دەرەوە چاوەڕوانیدەکـەن بیکـوژن. سێهەمیان مێردێکی بـاش و دڵگـەورەی هەبـوو، بـەڵام لـە شـەڕدا دەسـتێکی پەڕیبـوو و نەیدەتوانـی کاربـکات. کـێ دەیگـووت ئەمجـۆرە بوونـەوەرە بەدبەختانـە دەتوانـن خەیاڵیـان هەبێـت، دەتوانـن بـە خەیـاڵ مەسـتبن و بوێـرن خـەو ببینـن. بـەڵام هاوڕێتـی تریفـە بـەرەو جیهانێکـی تـری بـردن، جیهانێـک تیایـدا غـەم دەیتوانـی تەنیا غـەم نەبێـت، بەڵکـو پەتـی گرێدانـەوەی ڕۆحـی ئـەم مەخلوقـە پـڕ ئازارانـە بێـت لەگـەڵ یەکـدا، ئـەم مەخلوقـە بێچـارە و بچوکانـە کـە ئێسـتا وەک چـۆن مەیخۆرێـک بـە ئەلکهـول ڕادێـت، لـەو سـاڵۆنە سـارد و پـڕ جیکەجیکـی ئامێـرەدا بـە خەیاڵاتـی تریفـە ڕاهاتبـوون، لەگەڵیـدا دەفڕیـن، هەسـتیان بـە ماندووبـوون نەدەکـرد، هەسـتیان بـە دەردەکانـی جەسـتەیان نەدەکـرد، ژانەکانـی مـاڵ و غەمەکانـی هەژاریـان لـە بیردەچـووەوە، خەیـاڵ زەوییەکـی بـۆ دروسـتدەکردن کـە مـن و تـۆی بەسـتەزمان نایبینیـن.

چیـدی مافوورەکانـی کارخانـەی نیـا کۆمەڵێـک زەخرەفـەی گێـژ نەبـوون کـە سـەمبولی قەڕنـە دوورەکان و دینـە بابچووەکانـی بـۆ دەهێنایـن، بەڵکـو ئیشـێک بـوو پـڕ لـە چاوەڕوانـی، دووربـوو لـە دووبارەبوونـەوە.

مانـگ لـە دوای مانـگ و سـاڵ لـە پشـتی سـاڵ، کچـەکان فێربـوون چیرۆکـی خۆیـان بـۆ تریفـە بگێڕنـەوە، فێربـوون خـەون ببینـن، خـەون تەنیـا بـە فیگـەر و نیـگار و فـەزای نـاو فەرشـەکانەوە نـا، بەڵکـو خـەون بـە ژیانـی خۆیـان و پاشـەڕۆژی خۆیانـەوە. نیـوەڕوان لەسـەر نانخـواردن

شەڕیان بوو کامیان لە نزیک تریفەوە دانیشێت و باسی خۆی بکات، تریفە بە زەردەخەنە گەورەکەی خۆیەوە، بەو قۆڵە باریکە ڕەشانەیەوە کە پڕبوو لە گەندەمووی ڕەش، دەستی دەخستە سەر دەستیان و دەیگووت «شلێر گیان بۆم باسکە، دەتەوێت چیم پێبڵێیت؟»، « نازنازی گوڵ، چ مەراقێکتە، وەها غەمباری، بیر لە چی دەکەیتەوە، خوشکە نەشمیلەکەی من، خوایە چاوت خەفەتێکی تێدایە بەرد دەتوێنێتەوە، تۆ بۆ وای گوڵی من»، «گزنگ گیان، کە بەردەوام ئاوا بێدەنگ و شەرمن دەتبینم دەڵێم خوایە ئەم کچە چۆن دەژی، تۆزێک چاوبکەرەوە».

بەکاوەخۆ توانی وایان لێبکات قسەبکەن، خەونەکانی خۆیان بگێڕنەوە، باسی ئەو شتە جوانانە بکەن کە حەزیان لێیەتی، باسی ئەو کوڕانە بکەن کە لە دڵەوە ئاواتیان بۆ دەخوازن... وایان لێهات چیتر بوونەوەری سارد و مردوو نەبوون، کە لە ژێر لەچکەکانیانەوە پیشاون و لە پشت شەرمیانەوە مردوون، بەڵکو ڕۆژ دوای ڕۆژ پەیوەندی ئەو کچانە بە ژیانەوە گۆڕا، دوای هەموو مافوورێک و دوای هەموو مەلەکردنێک لە خەیاڵدا ئازایەتی و جورئەت و بوێریان دەچووە سەرێ. سەید قادری نیا سەیری لێهات کە لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا ئیدی کیژەکانی ڕووگەشتر و دەم بە خەندەتر و ئازاتر دەبینی. هەڵبەت لە سیمای هەژاری و بەدبەختی پاک نەبوونەوە، بەڵام ئێستا دەیانتوانی شتگەلێک بکەن کە پێشتر نەیاندەوێرا. خەیاڵیش هیچ نییە جگە لە سەرپەڕترین شوێنی ئازایەتی، ئازایەتییەک کە دەشێت زۆرجار کوشندەبێت.

# نامەکەی مەلای سوختە

غەزەلنوس لەو ژوورەدا کە شنەبای عەشق لێیدا و هەوای سۆزێکی ئاسمانی هەڵیگرت، جۆرە عەشقێکی گەردونی و سەرتاسەری تیا سەوزبوو کە تا مردن لەگەڵیدابوو. زۆر کەمن ئەو مرۆڤانەی ئەو ساتە دەژین کە تیایدا عاشق دەبن. عاشقبوون بە مانا مرۆڤانە سادەکەی نا، وەک ئەوەی کتوپڕ هەستبکەیت دیلی مرۆڤێکی تریت و ناتوانیت لێیدەربازبیت و بیری لێنەکەیتەوە. بە مانا سۆفیست و دینییەکەشی نا، کە عەشق جۆرە پەیوەندییەکی قووڵە بە خالیق و وێنە جیاوازەکانییەوە، بەڵکو بە مانای ئەو هێزە گەورەیەی مرۆڤ والێدەکات خەمخۆری مرۆڤ بێت، مرۆڤ بەرەو پەیوەندییەکی قووڵ لەگەڵ ژیاندا بەرێت و وا لە مرۆڤ بکات بۆ مرۆڤەکانی دی بگری، ئیدی هەر مرۆڤێک بێت، لە هەر جێگایەک... عەشق بەو مانایەی بمانکات بە عاشقی ئازارەکانی ئینسان، بمانکات بە خاوەنی نیگایەک مرۆڤمان لە بەرئەوە خۆشبوێت، چونکە بوونەوەرێکی ئەشکەنجەکێشە، قوربانییەکی ئەزەلییە، بێهاودەردێکی هەتاهەتاییە.

غەزەلنوس دواتر کۆی ژیانی لەبەر ڕۆشنایی ئەو هەوایەدا تەفسیردەکرد کە لەو ژووری عەشقەدا بینیبووی، ئەو ساتەی بە ساتی ڕاستەقینەی لە دایکبوونی خۆی دەزانی، پێیوابوو هەموو مرۆڤێک دوو ڕۆژی لە دایکبوونی هەیە، ڕۆژێکیان تیادێتە دونیاوە، ڕۆژێکیان مانای لەدایکبوونی خۆی دەدۆزێتەوە. ئەزموونێک بوو لە دەرەوەی توانا بچوکەکانی زمان، هەوایەک بوو وەک ئەوەی لە هەموو سوچ و کەلێنێکی دونیاوە بێت و بڕژێتە جەستەیەوە، وەک ئەوەی لە قووڵایی زەمین و زەمانە دوورەکانەوە، چی عەترێک خەوتووە، هەڵیگرێت و لە ڕۆحی ئەودا خاڵیبکاتەوە. وەک ئەوەی بە هەموو ڕیشە قووڵەکانییەوە باغ هەڵگرێت و لە دڵیدا بیڕوێنێت، خۆر

بە هەموو تیشکەکانییەوە بەرێت و لەودا بیشارێتەوە، زەریا بچوکبکاتەوە بۆ شەپۆلێک و بیخاتە هەناویەوە، جەستەیەکی دیکەی باتێ، سەرلەنوێ بە ناو گێژەنێکدا بیبات و دووبارە لە دایکبیبێتەوە. جۆرە هەستێک بوو لە دەرەوەی توانای وشە و لە دەرەوەی هەر وەسفێک... شتێک بوو نە یادەوەری هەڵیدەگرت و نە هوشیاری تەفسیریدەکرد، ئەزموونێک بوو تەنیا خەیاڵ دەیتوانی هەندێک بەشی ئامادەبکاتەوە و هەندێک ساتی دروستبکاتەوە. لەو ساتەدا، لە گەرمەی ئەو گەرداوەدا غەزەلنوس لە ڕاستییەکی گەورەی ژیانی خۆی تێدەگەیشت، تا ئەو کات گەنجێکی سادە بوو بە هەڵە لە شتەکان تێگەیشتبوو، گەنجێکی چاوکزی نەفام بوو کە خراپ دونیای لە خۆی شێواندبوو، واتێگەیشتبوو بۆیەکردنێکی جوانی کوچە و کۆڵانەکان لە وەڕزیی و خراپەی دونیا ڕزگاریدەکات. دەیگووت ڕەنگکردنێکی دیکەی شەقامەکان، خەیاڵاندنێکی دی بۆ کوچەکان دەتوانن ژیانم بگۆڕن... نەفام بوو... نەفام... دوای شەوێکی درێژی تێفکرین، دوای خوماربوونێکی قووڵ بە هەوایەک کە ئیسکەکانی پڕدەکرد لە بۆن و بەرامەی شەرابێکی سیحراوی، گێژ بە قژە لوولەکەی خۆیەوە، مەست بە چاوە بچوک و چاویلکە تەنکەکانییەوە، وەک قامیشێک بای شەو بیشکێنێتەوە، دەنوشتایەوە و بە ئازارێکی سەختەوە دەیگووت «خەیاڵ... تێگەیشتنە لە حەقیقەت».

هەر ئەو شەوە غەزەلنوس نامەکەی مەلای سوختەی خوێندەوە، نامەیەک بوو بە هەمان زمانی نامەکەی مەلای هاجەر نوسرابوو. وەک ئەوەبوو هەمان کەس، بەڵام لە دۆخێکی دەرونی دیکەدا نوسیبێتی. بۆ ئەوەی کات زۆر نەگرین و خۆتان لە نزیکەوە ئاگاداری ئەم چیرۆکە سەیرەبن، باشترە نیگایەک لە هەندێک بەشی نامەکەی مەلای سوختەش بکەین. مەلای سوختە ئاوها دەست پێدەکات

«سەختە بۆ پیرێكی وەك من كە قەدەمێك لە قەبر و نەفەسێ لە مردنەوە دوورم یاری بە حەیاتی كەس بكەم، بەڵام سەختیشە ئەم دونیای فانییە جێبهێڵم و تۆ بە من نەزانیت. دواجار من زیاتر لەوەی باوك بم، تارماییەكم دێم و ڕاستییەكت پێدەڵێم. ڕاستییە گەورەكانیش لە خەیاڵەوە نزیكن، ئەوە ئیحساس و تەجروبەی پیرێكی وەك منە، خەڵك تەنیا ڕووكەش و سەتحی ئەم عالەمە دەبینن، جیهان وەك حەقیقەتێكی گەورە ناناسن، ڕووكاری ئەم عالەمە ئاڵۆزە بە حەقیقەت تێدەگەن. بەڵام هەرچییەك بێت ئینسان بوونەوەرێكی گەورەیە، ئەم زەمین و زەمانە ماڵی ئەوە، ئێرە عالەمی ئەو مەخلوقە جاویدەیە، ئێرە نیشتەجێی ئەو و مەكانی ئەبەدی ئەوە، كە ئینسان نەما وجود وەك حەیوانێكی خەوتووی لێدێت، نە هیچ شتێكی لامەحدود هەست بە ناموتناهیبوونی خۆی دەكات، نە هیچ كەینونەیەكی فەوقانی لە ئیمتیاز و علوی دەرەجاتی خۆی تێدەگات. ئەوە ئینسانە مەحدود و نامەحدود دەزانێت، بەرز و نزم جیادەكاتەوە، نرخ بە تەڵا دەدات و قیمەت لە خۆڵەمێش و خاشاك دەستێنێتەوە».

مەلای سوختە بەردەوام دەبێت و بە هەمان وشەكانی مەلای هاجەر دەنوسێت « بەهمەنی عەزیزمان، من تا ئەمڕۆم ڕاكێشاوە، ئێستا لە بەینی مردن و ژیاندا وەستاوم... لەحزەیەكی ئەستەم دەژیم و هێندم نەماوە وەك هەر عەبدێكی بێقودرەت خوداحافیزی بكەم، دونیا بڕستی لێبڕیوم و غەم تاقەتی لێسەندوم، چەند ساڵێكە پیری لە گۆشت و ئێسقانم دەخوات و گەیشتۆتە ئاخرین تیكەی خۆی. ڕۆحم پەڕپوت و پوچ بووە، جەستەم هیلاك بووە و ئارەزووم فەوتاوە. سڕێك هەیە دەبێت تۆ بیزانیت، نهێنییەك لە ئەسراری مەرگ قووڵتر و لە تەلیسمی حەیات بێبنترە. شتێكە تۆ دەتوانی ئیمانی پێبهێنیت و دەشتوانیت بە وڕێنەی پیرێكی حیسابیكەیت كە ئێستا نا ساتێكی دی سەردەنێتەوە.

شتێک هەیە بە درێژایی حەیاتم ئازاریداوم، ئێستا تۆ بەشی ئەوە گەورەبوویت، تێبگەیت، بەر لە ئێستا هەر نوتقێکم بدایە دەبووە هەوا و هەر حەرفێکم بنوسیایە دەبووە هیچ... چونکە فەقەت ڕۆحلەبەرێک لەم حیکایەتە حاڵیدەبێت، کە لە عەشق تێبگات، مەعناکەی بفامێت. بەس خواش دەزانێت، ئاخۆ ئێستا تۆ لە عەشق تێدەگەیت یان نا؟. بەس خوا دەزانێت... خوا. من کە واجبێکی وا سەخت و ئەرکێکی وا عەجیب بەسەر دڵێکی تازە پشکوتووی وەک دڵی تۆیا دەدەم، ئاخۆ خۆم لە عەشق تێگەیووم، ئاخۆ ئادەمییەک و ئادەمزایەک هەیە لە عەشق تێگەیبێت یاخو ئەوەش سرێکە لە ئەسراڕی ئیلاهی، قودسێکە لە ئەقداسی گەورە و جەلابوونی بە من و تۆ نامومکینە؟. بەهمەنی عەزیزمان... هەژدە ساڵ لەمەوبەر... هەژدە ساڵ لەمەوبەر لە شەوێکی ساف و ساماڵدا، سەرگەرمی نیگاکردن بووم لە بەحری ئەستێرە، لە ناکاو پیرێک لەدەرگای دام، پیرێکی ئاگرین و ڕووگرژ، پیرێک نیگای لە نیگای ئەو ئەهریمەنانە دەچوو کە نەقاشە کۆنەکان لەسەر بەرگی کتێبێک لە کتێبەکانی دۆزەخ دەیکێشن، پیرێکی سەیر، هەر غەزەلێک من لەبەرم بوو، ئەویش لەبەری بوو، هەر شیعرێک من نوسیبووم ئەو چاکتر و باشتر دەیووتەوە، وەک بەشێ لە من خۆی بە من ناساند، وەک سێبەرێکی من و نیوەیەکی تری من خۆی نواند، وەک دڵێکی وشکەنە و بەردسروشت بێڕەحم بوو، بە منی گووت من نیوەکەی تری تۆم، ئەو نیوەیەی سی و پێنج ساڵە لە سەردابێکی تاریک و ترسناکدا دیلتکردوم. من نیوە خنکاو و بەدبەختەکەی تۆم. منیش باوەڕم پێکرد.

نازانم دڵی خۆمت چۆن بۆبکەمەوە، ئێمە وا خولقاوین هەر دەستمان بۆ عەشق برد شتێک دەشکێنین. بۆیە سەرت نەسوڕمێ، عاجباتی داتنەگرێ گەر لەم ئانوساتی دەور و تەسلیمەدا دەستی لەرزۆک و نەفەسی شکستەم، لەحوکمی ئەم دەردەنەیەن و شتی تر بشکێنن. کوڕی

خۆم، ئەم سرەی من بە تۆی دەڵێم، هەژدە ساڵە وەک شوشەیەکی پڕ ئەسرار خستومەتە پشت دەیان شوشەی ترەوە و لەسەر ڕەفێکی بڵند خەوانومە. وەک پیرێکی لەرزۆک، ئێستا دەبێت بە سەر پەیژەیەکی شکاودا سەرکەوم، کە پەیژەی ڕاڕایی و ترسنۆکی خۆمە، لەسەر ئەو ڕەفە بەرزە، کە ڕەفەی حەفتاساڵەی غەزەلی بەباچوومە، بەم پەنجە چرچەلۆک و بۆ ڕزین شەیدایانەم، شوشە لادەم و یەک یەک لەو حەوایەوە توڕیاندەم، شت بشکێنم و شت بشکێنم و شت بشکێنم، ئینسان لە لەحزەی مەرگدا دەبێت سندوقی ئەسراری خۆی بکاتەوە، تا دواتر باش لە حوکمی ئیلاهی تێبگات. لە ساتی دەوروتەسلیما ئینسان دەبێت جورئەتی ڕوانینی لە ڕوناکی نەفسی خۆی هەبێ، گەر وانەکا، ئەی لەسەرچی لەگەڵ واحیدولقەهارا قسەبکا؟ من ئێستا دەبێت نەزەرم تیژکەم و دەفتەری ڕازی خۆم داگرم و نامەی ڕەنگینی خۆم بکەمەوە. ئەو پیرە هەر من بووم، من کە شەیدای ئافرەتێکی شەرمن و نەجیب و پڕحەیا بووبووم. هیچ کەس لە پیاوێک بەدبەختتر نییە کە حەز لە ژنێکی بەحەیا و حورمەت بکات، من کە مردم وەک میرولەیەکی تەڕ و نەخۆش، غیرەت دەدەمە قەلب و قاڵبی شکاوم و بە سەیدی مەخلوقات دەڵێم کەس لەو عاشقە سیاچارەتر نییە کە خودا دەیخاتە بەر لەعنەتی حەزکردن لە ژنێکی شەرمن و ناموسناس. من ئەوکات گەرچی لە تەمەندا هەرزەکار نەبووم، بەڵام ڕۆحی گەنج و هەوای عەشق بەشێکی گەورەی وجودم بوو، سەراپای ڕۆحم ستایشی مەعشوقە و غەزەلی میهری ئەو بوو. لەو دەمەدا کە ئەو پیرە شەڕانی و بەدنیگایە لە ژوورەکەمدا دەرکەوت، من باری تەعالا و فەخری کائینات ڕەحمەتێکی تێگرتبووم ئێستاش لە ناخەوە دەشنێم و لە هەناوەوە گوڵاو و عەتر و عەنبەر دەبارێنم. چەندین ساڵ لەمەوبەر، ڕۆژێک لە خەو هەستام و سەیرمکرد عاشقم، عاشقی خانمێکی بە حورمەت و ناموسناس، کە ناوی

بەهاریانو بوو، کە دایکی خودالێخۆشبووی ئێوەدەکات، ئەمشەو گۆڕی لە هەر شەو پڕ نورتربێت. عەشق شەرەفێکی گەورەیە کە تەبیعەت بە کەم کەسی دەبەخشێت، تەنیا شتێکە لە ویقاری و گەورەییدا هیچ شتێکی مەزن و لاموتەناهی نایگاتێ. عەشق تەنیا شتێکە کە سەنعەتی مرۆڤ خۆیەتی، تاکە شتێکە شەیتان دەستی تێیدا نییە و خوداش ڕابەڕ و مەرجەعی نییە. خودا خۆی مەعشوقە، مەعشوقی ڕاستەقینەش خۆی عەشقی خۆی دەستکرد دروستناکات، خودا بابەتی عەشقە نەوەک خالیقی بێت، گەر خۆی خالقی عەشق بێت، دەبێت بە مەعشوقێکی ساختە، وەک ئەوەی من سامانێک یان کوپەیەک تەلا لە خەزێنەی تۆدا بشارمەوە، تا دوایی تۆ بیدەیتەوە بە خۆم، لەبەرئەوە تەنیا نەفام و گەمژەکان وادەزانن عەشق دەستکردێکی ئیلاهییە، خودا گەمەکارێکی وا نابەڵەد نییە، عەشقت بداتێ تا عاشقی بیت... ئای خودایە، ئەمە چ سووکایەتییەکە بە خالق. عەشق تاکە شتێکە خودا و شەیتان دەستیان تێیدا نییە. شەیتان لەبەرئەوەی عەشق نایگرێتەوە، لەبەرئەوەی عەشق دوور و نزیک بەئیقلیمی ئەودا ناڕوات، بە خاکی ئەودا تێناپەڕێت، ناچێتەوە سەر حیلە و مەکری ئەو. هەر کەسێک ئیدیعای ڕابیتەی نێوان شەیتان و عەشق بکات، لە شەیتانەوە نزیکە نەک لە عەشق، شەیتانە و بۆ کوشتنی عەشق هاتووە، نەوەک عەشق بێت و دەستی شەیتانی پێوەبێت. هەر تەفسیرێک عەشق بباتەوە سەر خودا یان شەیتان، لە مەنزوری وەهاوە تەماشایبکات، هیچ نییە جگە لە موفەسرێک کە فنونی خۆی بۆ سووکایەتی بە ئینسان بەکاردەهێنێت. گەورەیی ئینسان و بچوکیشی تەنیا لە عەشقدایە، موحیبەت مقیاسی بەشەرە، مقیاسێک لە هەموو مقیاسەکانی تر گەورەترە، نە ئیمان مقیاسی ڕۆحی ئێمەیە، نە ئەخلاق، بەڵکو موحیبەت جەوهەری بەشەر و مقیاسی ئەوەل و ئەخیرێتی. خاڵیبوون لە مەحەبەت خاڵیبوونە لە هەموو شتێک. کوڕم

وەک پیرەمێردێکی بێحورمەت تەماشامەکە، کە دەستی دەلەرزێت و نەفسی هەر پڕە لە تەماحی دونیا. من هەمیشە عەبدی ئەو ئینسانەی ناو خۆم بووم، ئەوەی عەبدی ئەو ئینسانەی ناو خۆی نەبێت، ناتوانێت عەبدی خودا بێت. بەڵام ئێمەی بەشەر کە لاوازین و ناچیز تەماشای خۆمان دەکەین، هەمیشە شەیتانێکی ترسناک هەیە بە گوێماندا دەچپێنێت، خۆت فەرامۆشکە، خۆت فەرامۆشکە، خۆت فەرامۆشکە، لە خالیقدا بتوێرەوە، لە عەشقی ئیلاهیدا زەوەبانکە... زەوەبان. چونکە ئەو ساتەی ئینسان خۆی لە یاددەکات، دەبێتە هیچ. ئینسان کە عەشقی بۆ خۆی نەما دەبێتە گورگ، لە هەر شتێکدا زەوەبانیکرد ماهییەتی خۆی لەدەستدەدات، ماهییەتی ئینسانیش عەشقە، هیچ مەخلوقێکیش نییە بتوانێت کە خۆی دۆڕاند خودا بباتەوە. لێرەوە ئینسان دەبێت عەقڵ بخاتە گەڕ و هۆشی بێنێتە مەیدان، ئەوە خودا نییە داوامان لێبکات لە عەشقی ئەودا بتوێینەوە، ئەوە شەیتانە ئەو داوایەمان لێدەکات، خودا خۆشەویستی خۆی بە ناو خۆشەویستی ئینساندا بردوە، مەرجی مەحەبەتی خودا مەحەبەتی ئینسانە. بەڵام ئەو پیرە وەسواسناسەی ناو من، ئەوەی سەردەمێک نابەدڵ لەگەڵمدا غەزەلی دەگووت، کە خودا نیعمەتی عەشقی پێدام و بە نوری موحیبەت ئاوەدانیکردمەوە، ئەو هەراسان لە من، هەراسان لەو غەزەلیاتانەی دەمگووت، لەسەردابی ڕەشی خۆی لە شێوەی ئادەمییەک و پیرێکی ڕەقمەزەبدا هاتەدەرێ، کەسێک بوو هەم حەقیقەت بوو هەم خەیاڵ، هەم من بووم و منیش نەبووم، بەڵێ کوڕم، بەڵێ، بەڵام دڵنیابە تۆ لە من بوویت و لەو نەبوویت».

« بەهمەنی ئازیز. من وەک مەلایەک دەستم پێکرد، علومی سەردەمی خۆم خوێند، ناوی حەقیقیم مەلا غەریبی هاجەرە، وەک زۆربەی مەلاکان خلافێکی ئەوتۆم لە نێوان مەلایەتی و غەزەلیاتدا نەدەبینی. غەزەلیات فەنێکی مەعشەری مەلایان بوو کە لە کۆنەوە مابووەوە، کاتێک ناوی

مـەلای سـوختەم وەک لەقـەب هەڵبـژارد، تەقلیدێکـم ئیجرادەکـرد شـوعەرای پێش منیـش هـەر وایانکردبـوو، ڕۆژێـک ژمـارەی ئەشـعارم زیادیکـرد و دیوانی یەکەمـی خـۆم چاپکـرد. لەگـەڵ چاپکردنـی دیوانـی یەکەممـدا، بۆیەکەمجـار ئـەو وەسواسـە سـەیرانەم زیادیانکـرد و گەیشتنە پلەیـەک هاودەمـی خـەوف و سـامێکی بێبـن بـوون، وەک ئـەوەی شـەو و ڕۆژ تەورێکـی پەنهـان لـە نـاوەوە دووکەرتمبکات، وەک ئەوەی بیلا فاسـیلە چەقۆیەک زەڕە زەڕە دابەشـمبکات. هەسـتمکرد شـتێک لـە ناوەوەمـدا دابەشـدەبێت. نەمدەزانـی چییـە، هێزێـک بـوو دوو دیـو، وایدەکـرد دوو ژیـان بژیـم، لەسـەرێکەوە وەک هـەر مەلایەکـی دینـدار و خودانـاس خێزانـم پێکەوەنابـوو، لـە حورمـەت و نامـوس دەترسـام، لەسـەرێکی تریشـەوە فیتنـەی عەشـقێکی خەیاڵـی کـە نەمدەزانـی چییـە و لـە کوێـوە هەڵدەقوڵێـت، لەگـەڵ خۆیـدا دەیبـردم. لەلایـەک غەزەلخوێنێـک وەک بولبـول لـە ناومـدا دەیخوێنـد، بەلایەکـی دیـش مەلایەکـی بەویقـار بـە ڕوویەکـی جیدی و بـە جەبەروتـی ئیماندارێکـەوە لـە زیکردابـوو. شـەڕی نـاو مـن شـەڕی نێوان چاکـە و خراپـە، یـان ئەڤیـن و ڕق نەبـوو، نـا... بەهەمەنـی ئەزیـز، بێمێشـکن ئەوانـەی لـەت لەتبوونـی مـن بـە لـەت لەتبوونـی ئاسـایی بەشـەر لـە نێـوان چاکـە و خراپـەدا تەشـبیهدەکەن. هەمـوو ئینسـانێک لـە ئەعماقـی خۆیـدا لـە نێوان چاکـە و خراپـەدا لـەت لەتـە. ئـەوە لـە بەدیهیاتـە کـە ئینسـان لـە شـتێک چاکـە و شـتێک خراپـە دروسـتبووە، حیکمەتێکی تێدا نییـە ئینسـان تێبـگات کـە خێـر و شـەڕ لـە ڕۆحیدا شـەڕدەکەن، شـەڕی نـاو ناخـی مـن شـەڕی نێوان دوو مەخلوقـی جیـاواز نەبـوو، مـن و مـەلای هاجـەر لـە یـەک شـتدا جیاوازبوویـن، ئـەو پیاوێکـی ترسـنۆک و مـن ڕۆحێکـی ئـازاد بـووم. مـن لـە مێـژە نـەزەرم خسـتۆتە سـەر مەخلوقاتـی ئـەم مەملەکەتـە، لـە مێـژە تەئەمولیـان تیادەکـەم، بەڕێکەوتیـش ئینسـانێکم نەبینیـوە نمونـەی گوناهبـاری گـەورە بێـت، ڕۆحێـک هێنـد خەتاباربێـت شایسـتەی ئـەوە بێـت مـرۆڤ بڵێـت خودایـە ئەمـە نمونـەی ئـەو ئادەمیزادەیـە کـە تـۆ سـەقەرت بـۆ

ڕاخستووە و شایستەی جەهەنەمی تۆیە. من دڵنیام جەهەنەم هیچ نییە جگە لە تەشبیهێكی مەجازی، كە بۆ دەرخستن و تێگەیشتنی فیردەوس دروستبووە. ئینسان كائینێكی لەوە پاكترە شایەنی دۆزەخ بێت. هاجەر پیاوێكی خراپ نەبوو، هەموو حەز و ئارەزووەكانی منی هەبوو. بەڵام ساڵ دوای ساڵ ترسەكانی گەورەتربوون و هەفتە لە دوای هەفتە خەوفی زیاتری لێنیشت. تامن زیاتر شیعرم بگووتبایە، زیاتر عاشق بوومایە، ئەو زیاتر دەترسا، مودەتێكی درێژ لە گفتوگۆی ئەوەدابووین ئاخۆ من ئەوم ناچاركردوە ئیقلیم و هەواری خۆی جیابكاتەوە یان ئەو منی ناچاركردوە. زیاتر ئەو دەستی دەخستە هەناسەم، ئەو بە ناهەق خۆی بە ساحێبی هەموو شتێك دەزانی، ئەو دەچووە لای هاوسەرەكەم و لەگەڵیدا دەخەوت، هەموو ئەولادە شەرعییەكانی منی بە ئەولادی خۆی دەزانی، منی وەك ئاژەڵێكی بەرەڵا دەبینی كە لە كولبەیەكی شكاوی سەر عەردێكی بێئەتراف و پڕئافاقی ئەو بەربووم. خۆی وەك ڕەوزێكی ئیمان تەماشادەكرد كە خارێكی ڕەشی تیا ڕوواوە. هەندێك شەو من فورسەتم دەهێنا و وەك عاشقێكی غەزەلخوێن لە هاوسەرەكەم نزیكدەبوومەوە، وەك عاشقێكی سەوداسەر و لێزان لە فنونی بێسنووری جیماعدا لەگەڵیدا دەخەوتم، كە ئەو بەئاگا دەهاتەوە وەك بەورێكی بریندار لێدەهات، بە چڕنوك لە ئازای جەسەدم بەردەبوو، من جیماعە سارد و خێرا و كورتەكانی ئەوم دەبینی و دەمگووت مەلای هاجەر لەزەت لە ژیان بەرە، لەزەت لە جەسەدی خۆت وەرگرە، نیكاح بەم نەوعە زوڵمە لە تەبیعەت. بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ و ساڵ دوای ساڵ منی دووردەخستەوە، وەك سەگێك خۆی كردبێتە پاسەوانی خەزنەیەك منی تەراندە مەكانی وەها تاریك و چڕزوڵومات، گەر نوری عەشق نەبایە كوێردەبووم و بەسەر و بەسیرەشم دەدۆڕاند. ترس و خەوف تا دەهات زەفەریان پێدەبرد، عالەمیان وەها لێتەسككردبووەوە جێگایەك بۆ نور نەمابوو. شەوانگەلێكی زۆر بەسەر

شانمدا دەگریا، فیغان و بوکای دڵیان لە ڕیشە دەهێنا. دەیویست وەک من بژی، بڕواتە دەرێ، تەماشای جوانیبکات، لەزەت وەربگرێت، مەی بنوشێت، بەدیار ساقی و پیاڵەوە گۆرانی بڵێت، بەڵام نەیدەتوانی. لەو دەمەدا شەوان بە دزییەوە لە گووتنی غەزەلیاتدا بەردەوامبووم، بەڵام هەرچییەک من بە شەو دەمنوسی مەلای هاجەر بە ڕۆژ دەیدڕاند. هەر ڕەنجێک بە شەو دەمکێشا، ئەو بە ڕۆژ تێکیدەدایەوە. من دەمزانی ئیدی پێکەوە نازین، غەزەلخوێنێکی بێشەرم و خوداناسێکی وشکەڵۆک، هیچمان لەیەک ناچێت. زەمانێک هاتەپێشێ کە عەشقی بەهاربانو هەموو شتێکی لە نێوان من و مەلای هاجەردا پساند، من و بەهاربانو پێکەوە دژ بە ئیرادەی ئەو، تۆمان دروستکرد، دژ بە ئیرادەی ئەو و دژ بە ئیرادەی بەهاربانویەکی شەرمن و ناموسپەرست کە لە ناخدا ئەو ژنە عاشق و پڕجۆشەی ئازاردەدا. بەهمەنی ئازیز، هەموو یەکێک لە ئێمە لە ناوەوە لە کۆمەڵێک مەخلوقاتی جیاواز خولقاوین. ئینسان شتێکی پڕ ئەلوانە، تۆپێکە بە هەزار چەشنە بۆیە ڕەنگکراوە کە بە وردی بیسوڕێنیتەوە لە هەر جوزئێکی بچوکدا لەونێک و تەبیعەتێکی هەیە. گەمژەن ئەوانەی قسە لە تەبیعەتێکی سابت دەکەن، ئینسان لەشکرێکی گەورەیە لە مەخلوقات کە لە پێستی یەک کائیندا کۆبوونەتەوە... »

« دوای ئەوەی مەلای هاجەر کۆچیکرد، من وەک شەبەحێکی بێ مەئوا و ڕەش لەو ماڵەدا مامەوە، ژیانم جگە لە ڕەقسێکی بێ ئاخیرەت لە ناو ستایش و مەدیحی بێسووری حەبیبەدا هیچی تر نەبوو، شەو و ڕۆژ من بەم شوێنەدا دەگەڕام، لەیل و نەهار بۆنی ئەو شەوانەی لەگەڵ بەهاربانودا بردبوومەسەر لە زیهنمدا، لە ئەحاسیسی قووڵمدا جۆشیاندەدا. ئەو ژوورە بوو بە ژووری عاسیفە و بۆران و بەرقی عیشق. ساڵەهای ساڵ من و بەهاربانو لەم شوێنەدا لەم ماڵەدا کە بەزاهیر خەرابات و بە

باتین ڕیازی بەهەشت بوو پێکەوە خەوتین. وەک پاسەوان ئەم جێگایەم پاراست، وەک شەبەحێکی ترسناک خەڵکم هەموو لەم بەیت و مەئوای عیشقە تەراند. مەلای هاجەر هەراسان لە دەست ئەو هەموو مەنزەرەی فجورە هەڵهات، من و بانو، دوو شەبەحی ئەزەلی بووین و لێرەبووین. من دەستمدەدایە ئەو دەرگایە و بە پێخاوسی و فەقیری دەچوومە ئەو ژوورە، چاوەڕێمدەکرد تا دەهات، چ شتێک لە ئینتیزاری یار خۆشتر و ناخۆشتر نییە. بەر لە قدومی ئەو، ئەنواعی بۆن، ئەنواعی میسک و عەنبەر، عتوری عەتارەکانی چین و ماچین، بەسەر نەفسمدا دەباری. بای بەحرە دوورەکان و شنەی ئەو شەماڵە نازکەی لە موحیتاتی گەورەدا سەفینەی شێت نازک بەرەو ئەعماقی فێنک بابەخشدەکەن، منیان دەبرد، گوڵی هەموو جینانی دونیام تیا سەوزدەبوو. بەهەشتی لایەجوزی عیشق کە دوو دەرگای هەیە، یەکێکیان بۆ عاشقانی سادەیە و یەکێکیان بۆ عاشقانێک کە دڵیان بۆ موستەحیل لێدەدا، دەرگای دووەمی خۆی بۆ دەخستمە سەر پشت. عیشق مەملەکەتێکی دوو دەرگایە، دەرگایەکیان بۆ مەخلوقاتی بچوکە، بۆ بەشەرێکە کە بۆ مەلەکردنێک لە بەحری عیشقدا غەوسدەکەن و دێنەدەرێ، بۆ غەواسی نەفسکورتە کە جارێک دێن و خۆیان بە ئاوی عەشق تەڕدەکەن و دەڕۆن، دەرگای دووەم بۆ جۆرە غەواسێکی ترە کە یەکجار دەچنە ناو بەحری عیشق و ئیدی بێوەستان و بیلافاسیلە بەرەو بنی ئەم بەحرە دەڕۆن و بەبێ ڕاحەت تا دەمرن بۆ ئەعماقێکی بێبن پەلدەهاون. من لە دەرگای دووەمەوە ڕۆیشتم و ئیدی تا مردن لە بیحاری عیشقدا غەرق و لە هەوای موحیبەتدا فڕیم. ساڵەهای ساڵ لە غەزەل زیاتر پیشەم نەبوو، لە عیشق زیاتر خۆراکم نەبوو، لە کەلامی پڕ موحیبەت زیاتر بەروبوومم نەبوو، ڕۆژ دوای ڕۆژ دیوانی من گەورە و گەورەتر دەبوو، بە جۆرێک ئیحساسم وابوو هیچ ساحێب نەفەسێکی تر هێندەی من غەزەلی نەچڕیوە و ستایشی ئینسان

و موحیبەتی نەکردوە. ئێستا کە دەمرم تەنیا ئیرسێک بۆتی جێدەهێڵم ئەو هەموو غەزەلەیە، سەدان هەزار بەیت، کە تەنیا ستایشی یارناکات، بەڵکو مەدیحم مەدیحی ئادەمیزادە، مەدیحی جنسی بەشەرە، مەدیحی جەماڵی بێکەرانی ئادەمییە. دەبێت شەبەحێکی پیری وەک من لە غەزەل بەولاوە چی جێبهێڵێت... غەزەل لە دوای غەزەل، کە هەموویان لە چەندین جلدی گەورەدا نوسراون، لە سندوقی گەورە گەورەدا قوفڵی ئەسەراتیان لێدراوە، تۆ تاکە کەسێکی واریسی ئەو هەموو ئەشعارەی، تۆ تاکە مەخلوقێکی خودایت دەتوانیت دەست بۆ ئەو غەزەلانە بەریت. من بەنیئادەم نەبووم، من ئۆمەتی پێغەمبەرە نازدارەکانی خودا نەبووم، من غەزەلخوێن بووم و هیچی تر. بە شەکلێ لە بەحری مەحبوبەدا غەرقبووم، ڕێم نەبوو بەرەو نور سەرکەوم و بیر لە نەشیدکردنی ئەشعارم بکەمەوە. شیعری من لە بەحری ئەسراردا هاتەدی و لە زاری ڕۆحێکەوە چرا کە ڕێگای عالەم و مەعبەری زیندەگی ونکرد، من جگە لە بەستەیەک کلیل، جگە لە دەیان سندوقی پڕ غەزەل هیچم بۆ تۆ نییە، ئەوە نسیبی تۆیە، ئەوە تۆیت دەتوانیت ئەو ئەشعارانە بە دونیا بناسێنیت... ئەوە تۆیت... کە جلی من لە بەردەکەیت و ئەشعاری من بە ناو بەنی بەشەردا نەشردەکەیت»

نامەکەی مەلای سوختە لەوە درێژترە لە جۆرە کتێبێکی وەهادا جێگای ببێتەوە، لەوە قووڵتر و تاریکترە کە هەموو خوێنەرێک هێزی بەسەر نهێنییەکانیدا بشکێت. کە بەهمەن ناسر لە خوێندنەوەی نامەکە بووەوە، داینا و لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە سەیری دەریای ئەستێرەی کرد، بە خۆشەویستییەکی بێوێنەوە سەیری دونیای کرد، سەیری شنەی هەندێک درەختی دووری کرد، بۆنی ئەو دەریا دوورانەی مەحەبەت کە لە شوێنێکی دیکەی ژیانەوە دەهاتن چوو بەسەریدا. چاویلکەکەی داگرت

و دەستێکی بە قژیدا هێنا، هەستیکرد پەنجەی بە ناو هەوایەکی فێنکدا تێدەپەڕێت، بۆنی شێداری هەندێک باغی نزیکی کرد، هەستی کرد هەندێک باڵندە، خامۆشی شەو دەشکێنن و وەک نەیزەک بە ئاسماندا دەفڕن. بەڵام هەموو شتەکان فریوی خەیاڵ بوون، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دەستی خستە سەر دڵی خۆی، هەستیکرد خۆشی پارچەیەک خەیاڵە... خۆشی بۆنێکی ئەفسوناوییە و با بەرەو نادیار دەیبات.

## یەکەمین یەکتر بینینی غەزەلنوس و تریفە یا بەحری لە ماڵی سەیفەدین مارۆ «سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٢»

لە سەرەتای زستانی ساڵی ١٩٩٢ دا، کاتێک حوسنی ماردینی لەگەڵ عەتاردا بە سمێڵە سپییەکەی، بە پێکەنینە بەرز و ویقارە بازاڕییەکەیەوە لە بەر ماڵی غەزەلنوسدا دەرکەوت، دڵنیابوو بە ئەرکێکی باش و بە نیازێکی پاک هاتووە بۆ لای غەزەلنوس. بیرۆکەی مامۆستای خەیاڵ بۆ غەزەلنوسیش شتێکی نوێ بوو، بیرۆکەیەک بوو دوورنەبوو لە فەلەکی ژیانی ئەو، بەڵام سەیر و تازە هاتە بەر گوێی.

ئەوە یەکەمین جار بوو غەزەلنوس «عەتار» ببینێت، بیری نەدەهات ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕێکەوتی سەروکەللەیەکی وەها سەیری کردبێت. عەتار لە هاودەمی حوسنی ماردینیدا خۆی وەک پیاوێکی بچوک و شەرمن دەرخست، بەڵام لە دڵەوە دڵنیابوو گەر بیەوێت دەستباڵایی خۆی دەربخات دەتوانێت شتی بێوێنە بکات، ئەو زەفەری بە زۆر شت دەبرد کە ماردینی زەفەریان پێنابات، بەڵام ئەمڕۆ ئیشێکی وەها گرنگی بە ماردینی بوو، پێویستی نەدەکرد بێئەقڵی وەها بنوێنێت و ماردینی بخاتە

حاڵێکەوە کۆمەکی نەکات، هەر کاتێک ئیشێکی گرنگی بە کەسێک هەبووایە خۆی بۆ بچوکدەکردەوە، بەڵام لە ناخدا ئەوەشی بە فێڵێک لە فێڵەکانی گەورەیی خۆی دەژمارد. گەرچی خۆی بە مامۆستای شتە ناوازەکان دەزانی، پێیوابوو هیچ شتێکی عاجباتی نییە ئەو پسپۆڕی نەبێت، هیچ کەسێکی گرنگ نییە نەیناسێت، سەیری لێهات لە ژیانیدا ئەم غەزەلنوسەی نەدیوە. ئەوکات غەزەلنوس گەلەک قۆناغی سەیری بڕی بوو، قژێکی درێژی شپرزە و ڕیشێکی پڕی هەبوو، چیتر لەو گەنجە باریکە شەرمنەی جاران نەدەچوو، بەو نیگا و ڕیشەوە زیاتر بە شاعیرێکی وێڵگەرد یاخود دەروێشێکی نائومێدی دەکرد، نیگاکانیشی خاڵی نەبوون لەنیگای فیزیکناسێکی غەمبار کە لە لابۆرێکی گەورەدا گیری خواردبێت. شتێک لە هێمنی و کامڵی و قووڵی لە نیگایدا بوو، شتێک وای لێدەکرد لە هیچ ئادەمیزادێکی تر نەچێت، شتێک وایدەکرد کەس نەتوانێت ئاسان تێیبگات و بچێتە ناوی. ئاڵۆزنەبوو، بەڵام هێند سادە و ساف و بێگرێ هاتە بەرچاوی عەتار، کەمێک ترسا و هەستیکرد شتێک لە شوێنی خۆیدا نییە. پێشتر کەسێکی وەها سافی نەبینیبوو، کەسێک سەیری چاوی بکات و نیازێکی دونیایی تیانەخوێنێتەوە. ئەو بازاڕ فێریکردبوو، هەموو جوڵەیەکی مرۆڤ تێبگات، بە دەنگدا، بە نیگادا مرۆڤ هەڵسەنگێنێت، بەڵام غەزەلنوس بە ئەندازەیەک سادەبوو، عەتاری قفڵکرد. زانستەکانی ئەو، ئەو مەعریفەتەی لە بازاڕ کۆیکردبووەوە سوودیان نەبوو، لێرەدا و بەرابەر ئەم مەخلوقە نەیاندەخوارد کە پێدەچوو شارەزاییەکی زۆری لە بازاڕدا نەبێت. غەزەلنوس هێند خێرا بە بیرۆکەی مامۆستای خەیاڵ ڕازیبوو، عەتاری تووشی ترسێکی گەورەکرد. گەر بازاڕ و مامەڵەکردن و ڕەدوبەدەلی نێو کڕیار و فرۆشیارەکان ئاوهای لێبێت، ژیان دەبێت بە جەهەنەم. ئەو هەموو تەمەنی لە کۆکردنەوەی ئەو زانستەدا بەسەربردبوو، گەر ئەو زانستە نرخی نەمێنێت، ئەو هیچ

شتێکی دی نازانێت. لە ڕاستیدا مامەڵەکردن لەگەڵ غەزەلنوسدا بێمانا و دڵشکێن بوو، هەستیکرد هیچ شتێکی نەکردوە، بەهیچ جۆرێک هونەری خۆی تاقی نەکردۆتەوە، نەیتوانیوە بەو سەروسەودایە هیچ لەم پیاوە تێبگات، کە لە کراسێکی زەیتونی و بلوسێکی زەیتونیدا دانیشتبوو، بە جۆرێک ڕووخۆش بوو، پێدەچوو هەرئێستا لە دادگایەکی گەورە بێگوناە دەرچووبێت.

«مامۆستای خەیاڵ... مامۆستای خەیاڵ» غەزەلنوس چەند جارێک وایگووت و وەک یەکێک داوەتی سەفەرێکی کردبێت و ئەویش قەبووڵی بێت، گووتی باشە. بێئەوەی لە هیچی تر بپرسێت، بێئەوەی بڵێت سەیفەدین مارۆ کێیە؟ مەهناز خان کێیە؟ گرفتی چییە؟. حوسنی ماردینی کە تەواو لە پەشۆکانی عەتار تێدەگەیشت، دەیزانی لە نێوان دوو ڕۆحدا وەستاوە کە دوو جەمسەری پێچەوانەی دوو دونیان کە هەرگیز بە یەک ناگەن، جیهانی بازاڕ و جیهانی خەیاڵ. ماردینی بە سمێڵە سپییەکەیەوە وەها پێکەنی دیوارەکانی ئەو ژوورە سەیر و خاڵییەی غەزەلنوس لەرینەوە. ژوورێکی چۆڵ چۆڵ بوو، تەنیا هەندێک کورسی نایلۆنی تێدابوو، هەندێک کورسی و هیچی تر، لەودیوەوە گوێی لە دەنگە دەنگ و پێکەنین و گریانی هەندێک منداڵ بوو، تا ئەوکات نەیبیستبوو غەزەلنوس منداڵی هەبێت، بەڵام هێندەی بەتاڵی ژوورەکەسەرەنجی ڕاکێشا، دەنگی منداڵەکان سەرقاڵی نەکرد. ماردینی هەرجاریک پێبکەنیایە، لەسەدای دەنگی خۆی دەترسا و بە سەرسامییەوە سەیری ئەو فەزا کراوەیەی دەکرد و هیچی نەدەگووت. شتێک ڕووی نەدا شایستەی باس بێت و عەتار بیکات بە حیکایەتی خۆی. ئەفسوس سەد ئەفسوس کە ئەمڕۆ وەها بێتام تێپەڕی، ئەفسوس سەد ئەفسوس کە شتەکان وەها منداڵانە چوونە پێشێ. غەزەلنوس بێئەوەی هیچ پرسیارێک بکات، هیچ گرێ و گۆڵێک بخولقێنێت، ڕێکەوت سبەی شەو دوای کەوتنی

تاریکی، لەگەڵ ئەم پیاوە سەرزلەدا کە لە باڵوێزی جەهەنەم دەچوو بچێت بۆماڵی سەیفەدین مارۆ.
ئاە، گەر دواتر ئەو چاوپێکەوتنە سەیرەی لەگەڵ خانمی گەلاوێژی نیادا نەکردبایە، گەر ئەو ژنە خەواڵووە کەمێک نەیهێنایە و نەیبردایە، هەستیدەکرد ڕۆژێکی بێخێر لە عومری ڕۆیوە.

بۆ ڕۆژی دوایی تریفە یابەحری بە عەتاری گووت «من سەرقاڵییەکی زۆر و ئیشێکی بێوچانم لێرە هەیە، کارخانەی مافوورەکە ئێستا زۆر پێویستی بە منە، ئیشەکان بێ من ناڕۆن. زۆر زەحمەتە بتوانم ئیشێکی تر بکەم، بەڵام بوەستە، لەوانەیە ڕۆژانی هەینی، ئا لە ڕۆژانی هەینیدا کە پشوو دەدەین، بتوانم ئێواران وانەیەکی خەیاڵ بە مەهناز خان بڵێم... بەداخەوە لە ڕۆژانی هەینی بەولاوە، من ڕۆژێکی ترم نییە، سەیرمکە هەمیشە شتێکم هەیە بیکەم، ئیشی کارخانەکە بە جۆرێک زۆرە بە هیچی تردا ڕاناگەم، لەم وەختەشدا کە بازاڕمان تۆزێک جوڵاوە، نا بەڕێزم... سوپاستدەکەم، تۆ منت وەها لە بیربووە، بەڵام بێئەوەی زویربیت و دڵت بشکێت، من لە ڕۆژانی هەینی بەولاوە کاتی ترم نییە... دێم و دەبینم گەر حەزم بە ئیشەکە کرد، دەیکەم».
لە ڕاستیدا عەتار پێویستی بە یەک مامۆستای خەیاڵ هەبوو، بەڵام بۆ ئەوەی خۆی وەک کەسێکی هەمەچیزە دەرخات و پتر خۆی لە سەیفەدین مارۆ نزیکبخاتەوە، مەبەستی بوو دوو مامۆستای خەیاڵ بەرێت، مەبەستی بوو خۆی وا نیشانبدات هیچی بۆ سەخت نییە و شتێک نییە لەم دونیایەدا لە دەستی دەرچێت، جگە لەوەش دەیوست بزانێت ئەم مامۆستای خەیاڵانە چ جۆرە ئادەمیزادێکن و چی دەکەن. بێئەوەی خۆی ڕازی نیشانبدات، لەگەڵ تریفە یابەحریشدا ڕێکەوت کە ئێوارێی هەمان ڕۆژ، دوای کەوتنی تاریکی، لە کارخانەکەوە بیبات بۆ ماڵی سەیفەدین مارۆ.

بێئەوەی لە وردەكاری بێماناداً نوقم بین، دەبێت بڵێم غەزەلنوس لە ساڵۆنە گەورەكەی ماڵی سەیفەدین مارۆدا بۆ یەكەمجار تریفە یابەحری بینی. دیمەنی ئەو ساڵۆنە، ڕەنگی سووری مۆبیلەكان، بۆنی ئەو عەترانەی خانمی شەمس و مەهناز مارۆ دابوویان لە خۆیان هەرگیز لە یادەوەریان دەرنەچوو، ساڵەهای ساڵ دیمەنی ئەو ئێوارەیە دڕی بە شەپۆلەكانی خەیاڵ دەدا و دەهاتەوە سەرێ، چەند ساڵ دواتر كە تریفە یابەحری لە ڕۆژێكی تاریكی ماڵاواییدا دەستی خستە دەستی غەزەلنوسەوە و دەربارەی ئەو ئێوارەیە پرسیاری لێكرد، غەزەلنوس هەموو شتێكی لەبیربوو، بۆنی تێكەڵاوی عەتری تیرۆز و هاوای و فۆن مان شۆ، بۆنی ئەو گوڵە نایلۆنانەی لە سوچێكی ژوورەكەدا دانرابوون، ڕەنگی پرتەقاڵی پەردە تەنكەكان، گوڵی وردورد و زێڕینی سەر ئینجانە شینەكان، تیشكی شیری ئەو گلۆپە گەورانەی بە هەر چواردەوەری ساڵۆنەكەدا هەڵواسرابوون، مەلمەسی قەیفەی مۆبیلەكان، بۆی چەرمی دەسكەكانیان، ئەژنۆ سپییەكانی خانمی شەمس لە تەنورە تەسكەكەیدا، قژی خاو و شانەكراوی مەهناز مارۆ كە دەوری ئەمیرەیەكی شەرمنی دەبینی. هیچ شتێك... هیچ شتێك نەبوو لەو ساڵۆنەدا بیریان چووبێتەوە، هەتا هەردووكیان ئەو دوو تابلۆ گەورەیەشیان لە یادمابوو كە یەكێكیان وێنەی كەروێشكێك بوو بەرەو ناو ئاگرێكی داگیرساو ڕایدەكرد، بەرەو ناو كڵپە و نێڵەنێڵی جەنگەڵێكی گڕگرتوو، ئەوی دیشیان دیمەنی شەوێكی تاریك و بەلەمێكی فەرامۆشكراوبوو لە ڕۆخی ئاوێكی هێمندا.

خانمی شەمس ژنێكی سپیكەلانەی جوان بوو، سەیفەدین مارۆش سەر ڕووتاوەیەكی سەرزل، كە دادەنیشت لەشی وەك نایلۆنێكی تواوە بەسەر شوێنەكەدا دەڕژا، چەورییەكی زۆر كە لە ملاولای ڕانی و سمتی و كەمەرییەوە دەهاتنە خوارێ. بەڵام مەهناز مارۆ بوونەوەرێكی جوان بوو، لە پانتۆڵێكی ڕەش و تی شێرتێكی نیوقۆڵی سپیدا دانیشتبوو، قژێكی

خاوی زەردی هەبوو، لێوێکی دەنوکیی چکۆلانە، جووتێ چاوی کاڵ و کراوە لەسەر ڕوومەتێکی باریک و سپی. جوانی مەهناز مارۆ بە جۆرێک بوو، نە عەتار و نە غەزەلنوس کاتێکی ئەوتۆیان بە تەماشاکردنی تریفە یابەحرییەوە سەرف نەکرد، بەڵام تریفە لەو کچانە نەبوو ئەو شتانە بریندارییبکات. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بڵێم کە تریفە لە شەوی یەکەمەوە هەستی بە جۆرە نزیکایەتییەکی ڕۆح و خزمایەتی دڵ لەگەڵ غەزەلنوسدا کرد، نا غەزەلنوس بەو قژە لوولەیەوە، بەو چاویلکە بچوکەیەوە، لەو کوڕانە نەبوو لە نیگای یەکەمەوە حەیرانیان بیت، بەڵام شتێکی تێدابوو، نیگایەکی تایبەتی، سیحرێک کە لە مرۆڤە ناوازە و تایبەتییەکاندا هەیە، جۆرە جەزبێکە پەیوەندی بە جوانییەوە نییە بەڵکو هەندێجار لە جوانی بەهێزترە، شتێکە وەک درەوشانەوەی بڕوا وەهایە، وەک ئەوەی لە ناکاو هەستدەکەیت لەبەردەم شوشەیەکی سافدایت، لەبەردەم یەکێکدایت ڕۆشن دەدرەوشێتەوە، لە بەردەم کەسێکدایت جگە لە ڕوناکی هیچی دیکەت بۆ ناهێنێت. بەڵام دیمەنی سەیفەدین مارۆ و شەمسی ژنی تریفەیان ترساند، هەر لە یەکەم نیگایەوە بۆ ویقاری خانمی شەمس و چاوە سەیرەکانی سەیفەدینی مارۆ بڕیاریدا نەگەڕێتەوە ئەو ماڵە، هەڵبەت ئەو کات نەیدەزانی قەدەر بە چ ڕێگایەک و لەچ فەزایەکدا جارێکی تر ئەو دەهێنێتەوە ناو ئەم ژوورانە. کە گەڕایەوە بۆ کارخانەی مافوورەکە بە درێژایی شەو دەیویست غەزەلنوس لە خەیاڵی خۆی دەربکات، دەیویست بیری لێ نەکاتەوە بەڵام نەیتوانی، جۆرە ئامادەگی و سەیرکردن و وەستانێکی هەبوو تریفە یابەحری بۆی فەرامۆش نەدەکرا. ڕوخسار و قسەکردن و نیگاکردنی ئەو کوڕە بە جۆرێک بەسەریدا زاڵبوو وەخت بوو هەمان شەو تەلەفون بۆ عەتار بکات و ناونیشانی ماڵەکەیان بپرسێت، بەڵام شەرمێکی کچانەی قووڵ دەستیگرت و پەشیمانیکردەوە. ئاگاداربوو کە غەزەلنوس بە کەمێک بێبایەخی و فەرامۆشییەوە سەیری ئەوی کرد،

بەڵام گرنگ نەبوو، گرنگ ئەوەیە ئەو لە کەسێک دەچوو لە بێگوناهی هەڵکێشرابێت. لە کەسێکی ئاشنا دەچوو، یەکێک بوو تریفە دڵنیابوو دەیتوانی زوو داگیریبکات، چەندە دوور بێت دەستی پیابگات... دڵنیابوو ئەو کورە ڕۆڵێک لە ژیانیدا دەبینێت... بەڵام چ ڕۆڵێک؟ نەیدەزانی.

ئەو ڕۆژە دەستگیرانەکەی مەهناز مارۆش ئامادە بوو، کوڕێکی باڵابەرزی سمێڵ ڕەش، لەو گەنجانە بوو گەر بەیانیان چاکەت و پانتۆڵ بپۆشن، ئێواران دەبێت بیکەن بە جلی کوردی، گەر عەسر شەرواڵ و مراخانی لەبەربکەن، شەو دەبێت بیکەنەوە بە پانتۆڵ و کراس، لەو کەسانەبوو کە گۆڕینی خێرا خێرای جل و شێوە و ڕەنگی پۆشاکەکانی جۆرە گرێیەکی دەرونی و هەستێکی قووڵی نادڵنیایی ئاشکرادەکرد، شێوەی وەستان و سەیرکردنیشی ئەو جۆرە دوودڵییەی تێدابوو. ئاشکرا ئیدیعای ویقارێکی دەکرد کە تیا نییە، تەزبێحێکی درێژی بەدەستەوە بوو، بە جووتێک چاوی ڕەش و بڕۆی ئەستوورەوە سەیری هەموو میوانەکانی دەکرد و هیچی نەدەگووت. عەتار دەیناسی، ناوی نەجۆ ئەشکانی بوو، کۆنە پێشمەرگەیەک کە لە دوای ڕاپەڕینەوە بە پارەیەکی بێشومارەوە هاتبووە بازاڕەوە، لەگەڵ کۆمەڵێک بازرگانی دراو و بەرپرسی بە توانادا سەروکاری هەبوو، لەوانەبوو کە بۆ فرسەتی گەورە دەگەڕا، گەرچی ئێجگار قۆزبوو، بەڵام بە زەحمەت دەچووە دڵەوە. لەوانەبوو کە حیکایەتی ئەم مامۆستای خەیاڵە زۆر بێتاقەتی کردبوو، دەیویست لە نزیکترین کاتدا مەهناز بگوێزێتەوە و ببێتە ژنی، بەڵام خواستی ئاسنینی خانمی شەمس ڕێگای لێدەگرت. لەگەڵ ئەوەی هەندێجار ڕۆڵی پیاوی خاوەن قسەی دەبینی، بەڵام لەبەردەم ئەو ئیرادە ئاسنینەی شەمس خاندا کە بەرابەر نەجۆ بەجۆرە ناسکییەکی ژنانە دەیسەپاند، هیچی بۆ نەدەکرا، تەواو دەستەپاچە بوو. خانمی شەمس دەیویست هەرچۆنێک بووە کچەکەی زانکۆ تەواویکات، بەو مەرجە دابووی بە شوو. کردنەوەی ئەو زانکۆ

تازەیە کە بڕیاربوو لە وەرزەکانی داهاتوودا بکەوێتەگەڕ، هەموو خێزانە دەوڵەمەند و خاوەن ناوبانگەکانی شاری خستبووە هەلەکەسەما، ئێستا چۆن دەکرا کچەکەی ئەو تاقە منداڵێکی ئەم شارە بێت کە نەچێت بۆ زانکۆ، شتی وا چۆن دەبێت، خانمی شەمس مردنی لەوە پێباشتر بوو. دەبێت بڵێم کە مەهناز هیچ جۆرە هەستێکی تایبەتی بۆئەم کوڕە نەبوو کە تەنیا لە ناو کۆنە پێشمەرگە و پیاوانی بازاڕدا دەیتوانی قسەبکات. دوای شەش مانگ دەستگیرانی، دانیشتن و چوونە دەرەوەکانیان بە پەردەیەکی بێوێنەی شەرم و ڕێزی وشک داپۆشرابوو. هەرکات بەجووتە بۆ چێشتخانەیەکی تازە دەچوونەدەرێ، یاخود ئاهەنگێک یان سەیرانێکی بە کۆمەڵ کۆیدەکردنەوە، زۆربەی کاتەکان هەر دووکیان بێدەنگ بوون، مەهناز هەستیدەکرد لەگەڵ ئەودا پتر دادەخرێت و دەبەسترێتەوە. ڕاستە ئەشکانی جوانییەکی پیاوانەی هەبوو، بەڵام لەو کوڕە ناسکانە نەبوو کە خەیاڵی هەرزەکارانەی مەهنازیان تێردەکرد. نەجۆ یەکەمجار لە ئاهەنگێکی نەورۆزدا مەهنازی بینیبوو، یەکسەر بڕیاریدابوو خوازبێنی بکات، ئەوەی کارەکەی بۆ ئاسانکرد ئەو بەرپرس و هاوڕێ و دۆستە حیزبیانە بوون کە سەیفەدین مارۆیان دەناسی. مەهناز کە حیکایەتی داواکارییەکەی بیست، هیچی نەگووت، هەڵبەت دەیتوانی بڵێت نا، نامەوێت شووی پێبکەم، بەڵام شتێک لە شێوەی کوڕەکەدا بوو ڕەتکردنەوەی ئاسان نەبوو. کە کچەکانی هاوڕێی ڕەسمەکەیان بینی، گووتیان «مەگەر شێت بیت شووی پێنەکەیت، چەند کوڕی وا لەم شارەدا هەیە؟». باوکیشی دەیگووت پاشەڕۆژێکی ڕوناکی لە حیزبدا دەبێت، بەڵام خانمی شەمس لە سەرەتاوە نەیدەویست شوو بەم کوڕە بکات کە دەیگووت هێشتا بۆنی گەوری لادێی لێدێت. ڕاستە کوڕەکە هەرکات قات و بۆینباخی دەبەست هیچی لە ئەندازیار و دەوڵەمەندە شارییەکان کەمتر نەبوو، بەڵام خانمی شەمس دەیگووت کوڕێکی بێ شەهادەیە، نەخوێندەوارە،

سەروزمانی مەجلیسی ئەم زەمانەی نییە... دوائەوە شار پڕە لە کچی لادێی جوان کە لایەقی ئەون، کچی ئێمە کە بە ناز گەورەکراوە، بۆ ئەو نابێت.

دەبێت بڵێم کە خانمی شەمس لەسەر هەق بوو، گەرچی کچەکە خۆی بێباک و کەمتەرخەم سەیری مەسەلەکەی دەکرد، بەلام گەر گونجان و هەڵکردن بخەینە حیسابەوە، دەبایە نەجۆ ئەشکانی خاڵۆزایەکی خۆی بخوازێت کە شێتی نەجۆ بووبوو. بەلام نەجۆ بیری لە پاشەڕۆژ دەکردەوە، لە یەکێک لە بەرپرسە بەرزەکانی حیزب نزیک بوویووەوە، هێدی هێدی بە پارەکانی ئەوەوە و لەماوەیەکی کەمدا قاچێکی لەبازاڕدا داکووتیبوو، گەیشتنی بە کچی سەیفەدین مارۆ دەرگایەکی تری لێدەکردەوە، ئەمە جگە لەوەی کە کچەکە نوقوڵ بوو، چیتر هەرچییەکی دەکرد ئارەزووی لەو کچە لادێیانە نەمابوو کە سالانی پێشمەرگایەتی هەندێکی لێتاقیکردبوونەوە، سوێندی خواردبوو دەبێت ژنەکەی لەم کاوبۆ لەبەرە شاریانە بێت، لە هەرە جوان و ناسکەکانیشیان.

لەو ئێوارەیەوە نەجۆ ئەشکانی ڕقی لە غەزەلنوس هەڵگرت، بێهۆ، بێ هیچ بەهانەیەکی ئاشکرا. جۆرە ڕقێک هەموو مرۆڤێک جارێک لە ژیانیدا تاقیکردۆتەوە، ڕقێکە بەهانەیەکی دیاریکراوی نییە، بەلام لە ڕقی ئاسایی توندتر و کوشندەتر و تەمەن درێژترە. دەبێت بڵێم نەجۆ لەو جنسە ئادەمیزادانە بوو کە ڕقیان لەو کەسانەیە کە شتێک دەزانن ئەوان نایزانن و تێیناگەن، لەو بەشەرانەبوو کە تەنیا ڕوو لە یەکجۆرە کۆڕ و کۆبوونەوە دەکەن، لەگەڵ یەکجۆر ئادەمیزاددا دەتوانن بکرێنەوە، دڵیان بە یەک شێوە قسەوباس ڕۆشنی لێدەگەڕێت. ڕۆژێک پێشتر سەیفەدین مارۆی خەزوری بە تەلەفون باسی ئەو مامۆستای خەیاڵەی بۆ کرد، ئەو وەک دەستگیرانی کچە دەبایە خەبەری لە هەموو شتێک هەبێت، هەر مامۆستایەکیان بۆ گرتبوو ئەو لە نزیکەوە ئاگاداری هەموویان بوو،

بەڵام هیچ یەک لە مامۆستاکانی تر ترس و ئیرەییان تیا نەبزواندبوو، خودایە ئاخر ترسی لە کێ هەبووایە لە سەعید بایۆ، لە خەسرەوی جەبر، لە عەلە توان دوو، یان لە مەجە ئێکسیلانسی ئینگلیزی. نا، هیچیان سەرو ڕوخساری ئەوەیان نەبوو، نەچۆ ئەشکانی کوڕە قۆزەکەی هەرێمی سەد و سی وسێ، پێشمەرگە ڕێکپۆشەکەی ڕۆژانی سەختی شۆڕش، ئیرەییان پێبەرێت و بە شایستەی بەراوردیان بزانێت. بەڵام کە یەکەمجار ئەم غەزەلنوسەی بینی دڵی ڕاچڵەکا، هەڵبەت خۆی بە قۆزتر و لەبارتر دەزانی، دڵنیابوو بەرابەر بە قامەت و سمێڵ و چاو و برۆی ئەو غەزەلنوس هیچ نییە، بەڵام هەستیکرد شتێکی تێدایە کە نازانێت چییە، شتێکە لە دەرەوەی توانای زمانی ئەوە، جۆرە شتێکە لە دەسەڵاتی فەرهەنگی ئەودا نییە کۆیبکاتەوە. کە تەوقەی لەگەڵداکرد فێنکییەکی سەیر لە دەست و پەنجەکانیدا بوو، دڵنیابوو جۆرە مەلمەسێکی وەها ئافرەت ڕادەچڵەکێنێت، بەڵام جگە لەوە شێوەی سەیرکردنی و سروشتی هەڵکەوتنی دەموچاوی و ئەو گونجانەی لە نێوان دەنگ و ڕوخسایدا هەیە، تایبەتمەندییەکیان داوەتێ کە کەس ناتوانێت ئاسان چاوی لەسەرلابات. ئاە خوای مەزن دەبێت ناوی ڕاستەقینەی خۆی چیبێت؟ دەبێت مرۆڤێک هەبێت ناوی غەزەلنوس بێت؟. نەچۆ تا ئەو دانیشتنە تەواوبوو، سەیری مەهنازی دەکرد، سەیری ئەوەی دەکرد چۆن تەماشای غەزەلنوس دەکات، بەڵام هیچ شتێکی لە نیگای مەهنازدا نەخوێندەوە، لەڕاستیدا کەس نەیدەتوانی هیچ لە نیگای ئەو کچەدا بخوێنێتەوە؟ دەموچاوی شتێک بوو نەدەخوێنرایەوە. هەتا عەتار بە هەموو بلیمەتی خۆیەوە هیچی تیا نەخوێندەوە.

خانمی شەمس ئەو شەوە بەردەوام ئەوەی دووبارەدەکردەوە کە دەیەوێت کچەکەی بخوێنێت، سەیفەدین مارۆش بێئەوەی زۆر گوێبداتە

هەست و نەستی منداڵەکەی پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە کچەکە بێمێشکێکی گەورەیە و هیچی لێ سەوز نابێت. ئەوەی لای تریفە زۆر سەیر بوو ئەوەبوو، گەرچی قسەکانی باوکی زۆر بە ئێش و بریندارکەربوون، کەچی کچەکە دڵتەنگی و بریندارییی پێوە دیار نەبوو، گەرچی تەواوی دانیشتنەکە لەسەر بێمێشکی ئەو قسەدەکرا، بەڵام بۆ ساتێکیش چییە دەموچاوی نەگۆڕا. تریفە تێنەدەگەیشت ئاخۆ هۆکاری ئەو هێمنییەی دەگەڕێتەوە بۆ کەمهۆشی یاخود بۆ بڕوابەخۆبوونێکی گەورە. غەزەلنوس لەو دانیشتنەدا گووتی «خەیاڵ ماوەیەکی درێژی دەوێت تا پێدەگرێت، چونکە یاریکردن بە خەیاڵ هەر وا ئاسان نییە، دوو جۆر لە خەیاڵ هەیە، یەکێکیان کوشندەیە، لە بینینی حەقیقەت دوورمان دەخاتەوە، جۆرێکی دیش مرۆڤ دەگۆڕێتە سەر بوونەوەرێکی دی، وای لێدەکات لە یەککاتدا بتوانێت لە دوو دونیادا بژی، کارێکدەکات مرۆڤ زیاتر لە ڕاستی تێبگات» . غەزەلنوس مەبەستی نەبوو زۆر لەسەر شتەکان بڕوات، دانیشتنەکە کەسێکی وەهای تێدا نەبوو لە شەرحێکی قووڵ بۆ خەیاڵ تێبگات، بەڵام ئەو وشە کەمانە تریفەیان هەژاند، وەک ئەوەی نەیەوێت لەویادا هیچ بڵێت، وەک کۆی شوێنەکە بە جێگایەکی گونجاو بۆ جۆرە قسەوباسێکی وا نەزانێت، بە زەردەخەنەیەک لە زەردەخەنە گەورەکانی خۆی سەیری هەمووانی کرد و هیچی نەگووت. سەیفەدین مارۆ بە گشتی کۆی ئیشەکەی بە شتێکی بێسوود دەزانی کە شەمسی ژنی بە زۆر سازیکردوە. بەڵام دایکی دەیگووت، کچەکە پێویستی بە مامۆستایەک نییە توتیانە بایۆلۆژی و فیزیای بۆ باسبکات، بەڵکو پێویستی بە یەکێکە خەیاڵی بکاتەوە. دوای قسەوباسێکی زۆر ڕێکەوتن غەزەلنوس هەفتەی دووجار وانەی دادات، ئەوە دوا هەوڵ و تەقەلایەک بوو سەیفەدین مارۆ لەگەڵ مەهناز مارۆدا بیدات کە چارەنوسی وەک قوتابییەک تەواو لە مەترسیدابوو.

ئـەو شـەوە عەتـار نەبێـت هیـچ یـەک لـە سـالۆن نشـینەکانی ماڵـی سـەیفەدین مارۆ ئاسـوودە سـەری نەخسـتە سـەر سـەرین، هەموو پێیان وابوو شـتێک لـە ژیانیانـدا گـۆڕاوە، بێئـەوەی کەسـیان بزانـن چییـە. دەرکەوتنـی غەزەلنـوس لـەو ماڵـەدا شـتەکانی بەجۆرێکـی کتوپـڕ سـەرەو ژوور کـرد، وەک ئـەوەی سـیحرێکی نهێنییـان لێکرابێـت، هەموویـان بـە شـێوەی جۆراوجـۆر بیریـان لـەو دەکـردەوە. وەک ئـەوەی غەزەلنـوس هـەوای دونیایەکـی تـری هێنابێـت، هەموویـان تووشـی ڕاچەنینێکـی ناوەکـی بووبـوون. سـەیفەدین مـارۆ کـە سـاڵێک زیاتـر بـوو جگـە لـە چەقەچەقـی بەرپرسـە حیزبییـەکان و بۆڵەبۆڵەکانـی شـەمس هیچـی نەبیسـتبوو، لـە هەمـووان پەرێشـانتربوو، دواجـار دەترسـا ئـەم پیـاوە خەیاڵپـەروەرە شـتێک لـە مـاڵ و منداڵەکەیـدا بشـکێنێت کـە بـە زەحمەتێکـی زۆر و بـە چەندیـن سـاڵ ڕەنـج و ماندوێتـی فێریکردبـوون، ئـەو سـاڵەهای سـاڵ بـوو بـە ژن و منداڵەکـەی دەگـووت ژیـان کۆمەڵێـک جەنـگ و جەبـر و ڕاهاتنـە، ئێسـتا گـەر ئـەم غەزەلنوسـە دەرگای شـتێکی دی بخاتـە سـەر پشـت، تەنیـا خـودا دەزانێـت عاقیبەتەکـەی چـی دەبێـت. بـەڵام خانمـی شـەمس بـە پێچەوانـەوە، هەسـتیدەکرد کوڕەکە شـتێک لـە فێنکـی و کرانـەوەی لەگـەڵ خۆیـدا هێنـاوە، کـە لـە مێـژە لـە ژیانیـدا ونـە. حەزیدەکـرد کوڕێکـی ئاوهـا مێـردی کچەکـەی بایـە، حەزیدەکـرد خۆشـی لـە سـەرەتاوە ژیانـی ڕێچکەیەکـی وەهـای نەگرتبایـە و تووشـی مێردێکـی وەهـا نەبایـە، بـەڵام وای لێهاتبـوو نەیدەتوانـی بـێ سـەیفەدین مـارۆ پێشـبینی ژیانی خـۆی بـکات، وەک ئـەوەی هـەر لـە سـەرەتاوە لەگـەڵ ئـەودا لەدایکبووبێـت، سـەیفەدین چیـدی لـە مێـرد نەدەچـوو، بەڵکـو لـە نەخۆشـییەکی کۆنەمـاک دەچـوو کـە هـەر لـە ئەزەلـەوە تووشـیبووبێت. بـەڵام کـەس وەک تریفـە یابەحـری لـە نـاوەوە نەجوڵابـوو، تریفـە دوای چەنـد سـاڵێکیش لـەو ڕۆژە هێشـتا دڵـی خـۆی بـە بەردێـک دەشـوبهاند، کـە ئـەو شـەوە بـا لـە جێـگای

خـۆی جوڵاندوێتـی، هـەرکات حیکایەتـی ئـەو سـالۆنەی دەگێڕایـەوە، باسـی ڕەنگـی کراسـەکەی خانمـی شەمسـی دەکـرد، قسـەی لـە بۆنـی مۆبیلـەکان دەکـرد، لـەو هەسـتانە دەدوا کـە ڕەنگـی تابلـۆ و فـەرش و ئینجانـەکان لـە ناویـدا دروسـتیانکردوە، دەیگـووت «بـای ئـەو ئێوارەیـە دڵـی جوڵانـدم».
هـەر ئـەو شـەوەش مەهنـاز مـارۆ جـۆرە خەونێکـی تـری بینـی، خەونێـک لـە خەونەکانـی جـاران نەدەچـوو، بـۆ یەکەمجـار لـە ژیانیـدا لـە شـیرین خـەودا ڕاچڵەکـی و هەسـتی بـە تینوێتییەکـی گەورەکـرد، هەسـتیکرد پێویسـتی بـە هەوایـە، هەسـتیکرد دەبێـت پەنجـەرەکان بکاتـەوە، بـۆ یەکەمجـار لـە ژیانیـدا حەزیدەکـرد هـەوای پـاک هەڵمژێـت و بگـری، وەک ئـەوەی هەمـوو شـتێک لـە دونیـادا گۆڕابێـت، هەسـتی بـە داماوییەکـی گـەورە کـرد. لـە ژوورەکـەی چـووەدەرێ، بـە حەسـرەتێکی بێوێنـەوە دەمـی نـا بـە ئـاوی بەلۆعەکـەوە، کەمێـک دەموچـاوی خـۆی تەڕکـرد و دەرگای باڵکۆنەکـەی کـردەوە و خـۆی دایـە بـەر هـەوای ساردی شـەو، بـۆ یەکەمجـار هەسـتیکرد لـە ناخـی دڵـەوە ڕقـی لـە نەجـۆ ئەشـکانییە... زۆر ڕقـی لـە ئەشـکانییە... زۆر زۆر.

## گەڕانی بەردەوامی ماجیدی گوڵ سۆلاڤ
## بەدوای کاراکتەری لاشەکەدا
## هاوینی ٢٠٠٤

دەبووایـە لـە حیکایەتـی ئـەو لاشـەیە تێبگەیـن... ئیشـی ئێمەبـوو لـەو لاشـەیە تێبگەیـن. گەرچـی مـن حەقیقـەت خەیاڵـم دەکوژێـت، بـەڵام وەک ئـەوەی لاشەکەتەلیسـمی لێکردبـم، دەمویسـت بێسـرەوت دوای چیرۆکەکـەی بکـەوم. لـە ژیانـدا دوو شـت ئەفسـونی ڕاسـتەقینەیان لەسـەر مـن هەیـە، دوو شـت و هیچـی تـر، یەکێکیـان ئـەو شـتەیە کـە پێیدەڵێـن حەقیقـەت،

ئەوی تریشیان ئەو شتەیە کە پێیدەڵێن خەیاڵ. مێژوو، سیاسەت، خۆشەویستی، ڕق و هەموو شتەکانی دی ئەم گەردونە ملکەچی ئەو ململانێ گەورەیەن کە لە نێوان ئەو دووانەدا ڕوودەدات. ئەوە لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ تێگەیشتنی من بووە لە ژیان. مرۆڤیش مەخلوقێکە دەبێت لە ناوەڕاستی ئەو گێژەڵووکەیەدا بژی، دەبێت خەتێکی گەورە لە نێوان ئەو دوو دونیایەدا بکێشێت، شارستانییەت هیچ نییە جگە لەو هێڵە ئەستوورەی مرۆڤ لە نێوان حەقیقەت و خەیاڵدا دەیکێشێت، زانست هەر ئەو هێڵەیە، هەتا هونەریش زۆرجار تۆخکردنەوەی ئەو هێڵەیە. کەستان باوەڕدەکەن کە من ماجیدی گوڵ سۆلاف کە خۆشحاڵانە نازناوی ماجەلانی خەیاڵیم وەرگرتووە، ڕۆژێک کەوتبێتمە سەر کەڵکەڵەی پێشکەشکردنی کۆڕێک لەسەر سنوورەکانی خەیاڵ و حەقیقەت لە هونەردا، ها، کەستان باوەڕدەکەن؟. بەڵام من هەشت ساڵ لە مەویەر ویستم کۆڕێک لەسەر ئەو بابەتە پێشکەشبکەم، خۆم بە پارەی خۆم هۆڵێکم بە کرێگرت، لە هەموو جێگایەکی شاردا پۆستەر و نوسراوی تایبەتیم بۆ هەڵواسی، بەڵام هەتا یەک مرۆڤیش نەهات، هەتا یەک کەسیش چییە ڕووی نەکردە ئەو کۆڕە. لەو کاتانەدا تەنیا خەیاڵ مرۆڤ ڕزگاردەکات، من بێئەوەی گوێبدەمە هیچ، تەواوی هۆڵەکەم پڕکرد لە گوێگر، پڕمکرد لە کوڕ و کچی خەیاڵی کە بێچرپە گوێیان لە باسەکەی من دەگرت لەسەر هونەر. من لەوێدا گووتم، هەتا هونەریش کێشانی هێڵێکی ئەستووربووە لە نێوان خەیاڵ و حەقیقەتدا. من تاکە کەسێک بووم ئەو هێڵە ئەستوورەم دەپاراست، هەر یەک لە تریفە یابەحری و غەزەلنوس بەردەوام لە خولیای تێکدانی ئەو هێڵەدابوون، من بە جۆرێک لە جۆرەکان گیرم خواردبوو، بەڵام خۆشحاڵ و کامەران بووم گەر بتوانم لەگەڵ گەمەکانی ئەوانیشدا بڕۆم. من کەسێکم حەزدەکەم هەر دوو کیشوەرەکە تا دوورترین قووڵایی خۆیان بدۆزمەوە، تا ئەو

جێگایە بڕۆم لە بنکدا، لە دوا پنتدا کە خەیاڵ دەگاتە دوا سنووری خۆی و حەقیقەت دەگاتە دوا شێوەی خۆی. هەمووان سەیرکردنی من بەسەیرکردنی گەمژەیەک تێدەگەن کە دەیەوێت سەرسەختی بنوێنێت و خۆی لەبەرەی دژدا دروستبکات. چونکە واتێدەگەن خەیاڵ نزیکبوونەوەیە لە ڕاستی و ڕاستی نزیکبوونەوەیە لە خەیاڵ، واتێدەگەن گەر مرۆڤ لە یەککاتدا قاچێکی لەم جیهان و لەوی دیشدا نەبێت شێت دەبێت. ئەوان وەک من دژایەتی و جیاوازی لە نێوان ئەو دوو جەمسەر و دوو پۆڵە دژ و دوژمنەی بووندا نابینن، ئەوە زۆرجار تووشی شێتی و غەمۆکی و تەنهاییم دەکات. من ناتوانم وابم، زۆر هەوڵمداوە وابم، بەڵام ناتوانم. کاتێک دەبم بە ماجیدی گوڵ سۆلاف چیتر ماجەلانی خەیاڵی نیم، کاتێک دەشبم بە ماجەلانی خەیاڵی و لەسەر ئەو نەخشە خورافییەی خۆم سوار کەشتییەکەم دەبم ئیتر ماجیدی گوڵ سۆلاف نیم، من خەتەکانم پێ گرنگە، گەر مرۆڤ ئەو هێڵە لابەرێت، شێت دەبێت، هەموو شتە ترسناکەکانی خەیاڵ و گەمە کوشندەکانی نائاگاییمان دەڕژێتەوە ناو دونیا. کەستان فلیمی «ژۆمانژی» ڕۆبن ویلیامزتان بینیوە، یان فلیمی «ساتورا»، گەر ئەو هێڵە لە نێوان ڕاستی و خەیاڵدا نەپارێزین دونیا دەکەوێتە ناڕێکی و شپرزەییەکی وەها ترسناکەوە، وەک لەو دوو فلیمەدا دەیبینن. بیهێننە پێشچاوی خۆتان گەمەیەک هەیە و مرۆڤ دەبێت بە ڕاستی بیکات، وەک ئەو شەترەنجە ترسناکەی هاری پۆتەر لە بەشی یەکەمی ڕۆمانەکەی جوانا ڕۆڵینگدا دەیکات، کە هەم گەمەیە و هەم ڕاست، هەم سیحرە و هەم حەقیقەت.

کە من بڕیارمدا لە نوسینی کتێبی باغە خوێنینەکاندا بەشداربم، دەمزانی ئەو کتێبە بەرەو ناو جەرگەی ڕاستیم دەبات. من نادیارترین کاراکتەری گروپەکە بووم، ئەوکات غەزەلنوس وەک شاعیرێک ناسراوبوو،

تریفە یابەحری لەگەڵ گروپەکانی ژناندا ڕۆڵێکی لە دونیادا هەبوو، حەسەن تۆفان لە هەموو کونج و کەلەبەرێکی وڵاتدا دەیانناسی، ناوبانگی پشت و پەنایەکی گەورەبوو بۆی، بەڵام من کەس نەیدەناسیم. گەرچی ڕۆژانە چەندین سەعات پیاسەم بە شاردا دەکرد، بەڵام کەس نەیدەبینیم، بیرم نایەت لە هەموو ژیانمدا کەس سڵاوی لێکردبم، تاکە هاوڕێم ئەو منداڵە کوێرانەبوون کە ئەوانیش نەیاندەبینیم. ئەوەی ببم بە ئادەمیزادێکی بینراو و کەمێک لەزەتی مەترسی بچێژم شەیدایکردبووم. بیرۆکەی کتێبی مردن بیرۆکەی تریفە و غەزەلنوس بوو، ئەو و تریفە پێشتر لە ڕێگای کۆمەڵێک ڕوداوی ترسناکەوە، ئەزموونی تاڵ و ئازاری بێوێنەی کۆمەڵێک قوربانیان بینیبوو، شتەکانیان بەجۆرێک تاڵ و بەسوێ دەگێڕایەوە، من باوەڕم نەدەکرد. بە بڕوای من مرۆڤ بوونەوەرێکی درۆزنە، چونکە زۆرجار وەسوەسەی تێکەڵاوکردنی خەیاڵ و ڕاستی دەکەوێتە سەری. بەڵام تریفە و غەزەلنوس منیان وەک خەتخۆشێکی بێبڕوا تەماشادەکرد کە تا ئاقاری سووکایەتیکردن بە ئازاری مرۆڤ دەڕۆم. بیرۆکەی کتێبەکە شتێکی سادەبوو، دەبایە مێژووی مردن لە دوای ڕاپەڕینەوە بنوسینەوە، واتە شتێک بنوسینەوە کە کەس نەیدەوێرا بینوسێتەوە، من کتێبەکەم لای خۆمەوە ناونابوو «کتێبی هەزار لاشە»، هەڵبەت ئەو ناوە شتێکی مەجازی بوو بۆ ئەم شارە و بۆ هەموو شارەکانی تری ئەم هەرێمە، ناوێک بوو من بۆ ئەو کتێبەم دانابوو، هەر یەکەمان ناوێکمان بۆ ئەو کتێبە هەبوو، غەزەلنوس ناوی نابوو «باغی خوێن»، تریفە یابەحری ناوی نابوو «دەفتەری دۆزەخ». کتێبەکە لە سێ بەشی سەرەکی دروستبووبوو، بە ناوی فەسڵی خوێن و فەسڵی ئاگر و فەسڵی ئاو. فەسڵی خوێن بەشی ئەو مردووانەبوو کە دەکوژرێن، فەسڵی ئاگر بەشی ئەو مردووانەبوو کە دەسووتێن، فەسڵی ئاو بەشی ئەو مردووانەبوو کە دەخنکێن. ئیشی ئێمە ئەوەبوو کۆمەڵێک حیکایەت کۆبکەینەوە، بچینە

نـاو هـۆی مردنەکانـەوە، ژیانـی کـوژراوەکان و خەونەکانیـان بنوسـینەوە. مـرۆڤ گـەر لـە شـارێکی پـڕ مردنـدا بـژی، دەبێـت لـە مـردن تێبـگات، ناکرێـت تـا هەتاهەتایە چاوی خۆی بگرێت و نەوێرێت سـەیری مـردووەکان بـکات. بـەڵام گرنـگ ئەوەبـوو ڕاسـتی خەیاڵـم نەکوژێت و سـەر لـە سـەفەرە سـیحراوییەکانی خـۆم تێکنـەدات. غەزەلنـوس دەیگـووت «ئـەم کتێبـە هێـزی ئەوەمـان دەداتـێ سـەیری مردووەکانـی ئـەم شـارە بکەیـن، سـەیرکردنی مـردووەکان سـەیرکردنی حەقیقەتـە». غەزەلنـوس دەیویسـت گەشـتی دووروودرێـژی خـۆی بەسـەر زەمینـی خەیاڵـدا لـە ئامێـزی حەقیقەتـدا دوایـی بێـت، بـەڵام مـن کەشـتییە خەیاڵییەکـەی خـۆم بـە ئاڕاسـتەی سـەر زەمینـی حەقیقـەت نەسـەوڵاند... ئێسـتاش کـە دوورم لـەو کەشـتییە، هەسـت ناکـەم ئـەو لـەو ڕوبـارە خەیاڵـی و لـەو سـەر زەمینـە بێکەرانـەدا جگـە لـە خـەیاڵ ئاڕاسـتەیەکی دی هەبێـت و جگـە لـە سـەرکەوتنی بێوچـان بـە بـواری یـەک لـە دوای یەکـی چـەم و جەنگەڵـدا ڕێـگای تـری گرتبێتـە بـەر.

شـەوێک کـە لاشـەکەی مورادمـان دۆزییـەوە دەمـێ سـاڵ بـوو چیرۆکمـان کۆدەکـردەوە، دەفتەرداراەکانـی ئێمـە بـە کۆڵانەکانـدا دەگـەڕان و دەچوونـە ماڵـی مـردووەکان و حیکایەتـی کـۆچ و ماڵئاوایـی ئەوانیـان دەهێنایـەوە، بـەڵام پێشـتر هەرگیـز خۆمـان ڕێکامـان نەکەوتبـووە سـەر لاشـەیەکی غەمگیـن، لاشـەیەک بچێتـە خەونەکانمانـەوە و بـەردەوام داوامـان لێبـکات شـتێکی بۆبکەیـن. ئەمـڕۆ دەتوانـم سـوێندتان بـۆ بخـۆم کـە هاملێـت درۆی نەکـردوە و بەڕاسـتی تارمایـی ئـەو مـردووەی بینیـوە، چونکـە مـن لـەو چەنـد شـەوەدا چەندەهـا جـار تارمایـی مـوراد جەمیلـم بینـی، دەمبینـی لـە نـاو ماڵەکەمانـدا دەگەڕێـت، دەمبینـی لـەو بـەری شـەقامەکانەوە بانگمـدەکات، لـە کاتـی پیاسـەکانمدا هەندێجـار لـە تەنیشـتمەوە دەڕوات، هەندێجـار بـەرەو ڕووم دێـت. سـەرەتا وامدەزانـی هـەر مـن وام، هـەر مـن ئـەو تارماییـە دەبینـم، بـەڵام دواتـر تێگەیشـتم غەزەلنـوس و حەسـەن تۆفانیـش خاڵـی نیـن لـەو

خولیایە... ئەوانیش بەردەوام تارمایی ئەو کوڕە دەبینن. ئەو ڕۆژە کە حەسەن تۆفان وێنەکانی هێنایەوە، ڕۆژێکی سەیربوو بۆ من، حەسەن ناوی دوو کچی لە خاوەن وێنەکان هێنابوو، دوو کچ لەوانەی کە دەبایە من بیاندۆزمەوە و بە جۆرێک لە جۆرەکان زانیاریان لێدەربهێنم. بەوەدا من دەمزانی هەندێجار دەرهێنانی ئاو لە لمی بیابان لە دەرهێنانی زانیاری لە کچێک دەربارەی دڵدارییەکانی پێشووی خۆی ئاسانترە، ویستم خۆم لە گەمەکە دەربهێنم و تریفە یابەحری ڕاسپێرم کە وەک کیژێکی لەبار و دەم بەخەندە ئەو کارەم بۆ تەواوبکات، بەڵام هەر کاتێک پێویستم بە تریفە هەبووایە سەرسەختییەکی منداڵانە دایدەگرت و نەیدەکرد. تریفە ڕای وابوو لە بەرئەوەی من بێمێشکم و هیچ لە ئافرەت نازانم و لە خۆهەڵکێشێکی بێمایە زیاتر هیچی تر نیم کە بەردەوام بە جوانی خۆمەوە دەنازم، ئێستاش لەو ڕاستییە تێنەگەیشتووم کە لەم جۆرە حیکایەتانەدا ژن پتر بڕوا بە پیاو دەکەن نەوەک بە ژن، دڵیان بۆ کوڕێکی جوان دەکەنەوە نەوەک بۆ کچێک. من ئەگەرچی زۆرجار بە قسەکانی تریفە برینداردەبووم، بەڵام نەمدەگرتە دڵ، دڵنیابووم تریفە لە ناخەوە منی وەک برایەک خۆشدەوێت، ئەو هەندێجار ڕاگوزەر پێیگوتبووم کە دڵی منی لا مەبەستە، بەڵام زۆر زوو ئەو قسانەی بیردەچووەوە و لە یەکەم دەرفەتدا پیامدا هەڵدەشاخا. لە ڕاستیدا من پتر لە چوار ساڵ بوو لە تریفە یابەحری زیاتر کچێکی دیکەم نەدەناسی، لە ڕۆژێکەوە بڕیارمدابوو چیتر دڵداری نەکەم و دڵی خۆم بە عەشقەوە نەێشێنم، کەمتەرخەمییەکی قووڵم بەرابەر ئافرەت تیادروستببووبوو. کە حەسەن تۆفان وێنەی ئەو دوو کچەی خستە بەردەستم، خۆم وا نیشاندا کە قسە توندەکانی تریفە کاری تێنەکردوم. گەورەترین هێزی من ئەوەبوو کە دەمتوانی هەست و نەستی خۆم بشارمەوە و ویقاری خۆم نەدۆڕێنم. هەندێجار لە ناخەوە دەگریام، بەڵام لە ڕوخساردا شتێکم پێوە دیارنەبوو، نەمدەهێشت ئەو

ویقارە جوانەم بژاكێت. ئەو ڕۆژە كە تریفە قسە توندەكانی كرد، من خۆم بە وێنەكانەوە سەرقاڵكرد، دوو كچی جوان بوون، یەكێكیان ناوی سەلما نەجیب بوو، ئەوی تریان گوڵزار خالید، دوو ناوی بێمانا كە لە ناوی ئەو ژنانە دەچوو كە لەلای بەقاڵێكی دراوسێمان مانگانە بایعییان وەردەگرت. من بە هێمنی وێنەكانم هەڵگرت و گووتم ماوەیەكم بدەنێ، تا دەیاندۆزمەوە. وامگووت و بە ویقاری خۆمەوە هەستام و دانیشتنەكەم بەجێهێشت. بێئەوەی بهێڵم كەس بزانێت من چەند برینداردم.

سەلما نەجیب مامۆستای قوتابخانەیەكی ئامادەیی بوو. بێئەوەی شەرمبكەم بە جانتا دیبلۆماسییەكەی دەستمەوە، لە جلە ئوتوكراوەكانمدا لە پێشدەم قوتابخانەكەیدا وەستام و چاوەڕێمكرد، تەنیا چەند دەقیقەیەك بەر لە دەست پێكردنی دەوام، بە ناز و عیشوەی مامۆستایەكی جوانەوە گەیشتە قوتابخانە. من بە حورمەتێكی زۆرەوە لێی چوومە پێشێ و بە ئەدەبێكی بەرزەوە كە كەمجار ژنان لە پیاوانی دەبینن، خۆم پێناساند و گووتم لە ڕێكخراوێكەوە هاتووم كاری لێكۆڵینەوەیە لە چارەنوسی كەسانی بزربوو، پێویستم بەوەیە چەند ساتێك لە كاتتان بگرم. هێند پڕ ئەدەب قسەمكرد باوەڕی پێكردم و لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ ژووری مامۆستاكان. دیارە بەشی ئەوە هۆشم هەبوو پێیبڵێم كە دەبێت قسەكانمان دوو بە دووبن. بەوەدا ئەو سەرەتا هیچی لە بابەتەكە نەدەزانی، پێیوابوو هاتووم دەربارەی كەسێك لە یەكێ لە قوتابییە كچەكان پرسیاربكەم. كە تێگەیشت پرسیارەكان ئاڕاستەی ئەو دەكرێن، بە حەپەسانێكەوە سەیریكردم و نەیزانی بڵێت چی. من نەمویست مامۆستاكانی دی هیچ بزانن. بەرلەوەی بگەینە بەر ژووری پڕ ژاوەژاوی وانەبێژان دەرفەتم وەرگرت و خێرا وێنەیەكی موراد جەمیلم نیشاندا و گووتم خانم دەمەوێت دەربارەی ئەم كوڕە قسەت لەگەڵدا بكەم. كە وێنەكەی بینی ڕەنگی سپی بوو

و بە دەنگێکی غەمگین گووتی «لێرە؟ لێرە؟ لە ئێستادا؟ ناکرێت». دەنگی شتێک لە پاڕانەوەی تێدابوو، لە بولبولێک دەچوو قاچی بووبێت بە فاقەیەکی ئاسنەوە. ئەوە یەکەمجارم بوو ترسی کچێک ببینم لە حەیای خۆی، پێشتر شەرەفی ئەو ساتەوەختەم پێنەبڕابوو ئافرەتێک ببینم لە ترسی ئاشکرابوونی نهێنییەکی دەستی بلەرزێت، ویستم کەمێک لەسەری بڕۆم، بەڵام ئەو بەو ڕەنگە بزڕکاو و دەنگە لەرزۆکەی خۆیەوە گووتی «تکات لێدەکەم، من ئێستا ژنی مێرددارم، سبەی ئێواریٚ دوای دەوام لە شوێنی وەستانی پاسەکانی پشت بیمارستانی گەورە چاوەڕوانمبکە، لەویٚ کە سواربووم وەرە تەنیشتمەوە، ژمارە تەلەفونێکت دەدەمیٚ دەتوانیت بەو ژمارەیە قسەم لەگەڵدا بکەیت». من سەرم لەوە سوڕما چۆن بە خێراییەکی وا سەیر توانی بیربکاتەوە و هەموو شتەکان بەو جۆرە جەهەنەمییە ڕێکبخات، خودایە ئافرەت لەو شتانەدا چەندە لە ئێمەی پیاو زیرەکترن، ڕاستیتان دەوێت ئێمە لەو جۆرە کارانەدا بەراورد بە خانمان هیچ نین جگە لە کۆمەڵێک دەبەنگی گەورە. من کە نیازم نەبوو شتێک بکەم حەیای ئەو ژنە بریندار بێت، بە زەردەخەنەیەکی چەپەڵەوە دوورکەوتمەوە، بە زەردەخەنەی پیاوێکەوە ئامانجێکی پیسی پێکابێت. بە سەبرێکی زۆرەوە چاوەڕوانی ڕۆژی داهاتووم کرد. بۆ ڕۆژی دوایی وشە بە وشە زانیارییەکانی ئەوم جێبەجێکرد و لە پاسێکدا کە دەچوو بۆ گەڕەکێکی دوور لە تەنیشتییەوە سواربووم، لە پاسەکەدا بە زەردەخەنەیەکی گەورەوە سەیریکردم و پارچە کاغەزێکی نایە مستم. پێدەچوو لەزەتێکی زۆر لەو کارە ببینێت، وەک ئەوەی بیریٚ جاران و ساتە کۆنەکانی دڵداری بکاتەوە. دەبێت بڵێم کە نیگای سەلما خاڵی نەبوو لە سۆزێکی عاشقانە، لە خواستی ژنێک بیەوێت سەرلەنویٚ خۆی فڕێبداتە ناو چیرۆکێکی تازەی نەڤینەوە. من لە کاتی دابەزیندا وەک کوڕێکی لێزان بە چاو خواحافیزیم لێکرد و بە ئاڕاستەیەکی دیدا گەڕامەوە بۆ

ماڵێ. پارچە کاغەزەکەی تەنیا یەک ژمارەی تەلەفون و یەک سەعاتی دیاریکراوی لەسەربوو. من لەو کاتەدا تەلەفونم بۆ کرد، ژنێکی هاوڕێی هەڵیگرت، لە چەند ساتێکی کورتدا بۆیان بانگکردم، بەر لەوەی من هیچ بڵێم، بە دەنگێکیِ پڕ مەکر کە هیچی لە دەنگی ئەو مامۆستا ترساوە نەدەچوو کە لە سالۆنی قوتابخانەکەدا منی دواند، گووتی «من ژنم شوومکردوە، تاقەتی دڵداری و شتم نەماوە، نازانم بۆ وازم لێناهێنیت، بۆ بە منەوە گرتووتە؟». قسەکانی بەجۆرێک بوون وەک بڵێ «تێبگە... گەر تۆزێک لەگەڵمدا خۆت ماندووبکەیت، دەشێت لەگەڵتدا بێمە هەر بەزمێکەوە کە تەنیا خودا و پێغەمبەر سەرەنجامی دەزانن». بە هێمنی تێمگەیاند کە من جگە لە کۆمەڵێک زانیاری دەربارەی موراد جەمیل، هیچی دیم لەو ناوێت و جۆرە مەبەستێکی دیاریکراویشم نییە. وەک ئەوەی نائومێدبووبێت گووتی «ئاخر دەترسم کە باسی موراد جەمیلم بۆ کردی، دوایی داوای شتی تریش بکەیت».

من دڵنیامکردەوە کە هیچ شتێکی ترم ناوێت، بەڵام ئەو هەر بەجۆرێک قسەیدەکرد وەک ئەوەی من شتی ترم بوێت.

قسەکانی سەلما نەجیب زۆریان چوونە ناو کتێبی گەورەی مردنەوە، ئەو بە دەنگی ژنێک گەلێک ساتی شاعیری و جوان لەگەڵ مورادا ژیابێت قسەیکرد، دەنگی پڕبوو لە تەزووی یادگاری سیحراوی، هیچی دەربارەی مردنی موراد نەبیستبوو، منیش نەمویست غەمی بدەمێ و گووتم، کوڕە بەستەزمانەکە دیار نییە و ئێمە بۆی دەگەڕێین. ئەو یەکەم کەس بوو بە درێژی باسی ئەو ئەستێرانەی بۆکردم کە موراد بەجێیدەهێشت، بە کەمێک بێشەرمییەوە کە پێشتر لە دەمی کچان نەمبیستبوو گووتی «کە یەکەمجار لەگەڵ مورادا خەوتم، وامدەزانی ئاساییە، بەڵام دواتر کۆمەڵێک وردە ئەستێرە لەسەر لەشم دەرکەوت، کۆمەڵێک ئەستێرەی

ڕاستەقینە و درەوشاوە، لە زۆر شوێنی لەشمدا، موراد لە هەر جێگایەک، لەگەڵ هەر کچێک یان ژنێکدا بخەوتایە کۆمەڵێک ئەستێرەی لەدوای خۆی بەجێدەهێشت. لە نێوان مەمکیدا، لەسەر شانی، لە هەر جێگایەکی تردا کە تۆ خەیاڵت بۆی بچێت، هەندێجار ئەستێرەی لەسەر دیوارەکانیش بەجێدەهێشت، ئەستێرەی گەورە گەورە کە تاماوەیەک لە هەوای ماڵەکەدا دەمانەوە. من ئەستێرەکان وەڕزیان نەدەکردم، دوای گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە دەرگای ژوورەکەم دادەخست و خۆم ڕووتدەکردەوە و سەیری ئەستێرەکانم دەکرد. هەندێجار کە زۆر مەست و حەیران بوومایە ئەو ئەستێرانە چەند ڕۆژێک لەسەر لەشم دەمانەوە».

سەلمام وەک کچێکی ڕاستگۆ هاتە بەرچاو کە ئەگەر ژیان ناچاری نەکردبایە لەوانەیە وەک ئافرەتێکی ئازاد لە دەرەوەی پەیوەندی ژن و مێردایەتی بژیابایە. سەلما ئەو ڕاستییەی پێگووتم کە موراد هەمیشە لە مەترسیدا بووە، بەڵام خۆی کوڕێکی بێباک بووە، هەرگیز خەیاڵی لای مردن نەبووە، کوڕێک بووە خودا بۆ ئەوە دروستیکردوە بە جوانی خۆی شیرینترین یادگار لە دڵی دەیان کچدا بەجێبهێڵێت. بەڵام سەلما نەیدەزانی دوای شووکردنی ئەو موراد چی لێهاتووە. کە ئەو زانیاریانەم بۆ حەسەن تۆفان بردەوە زۆر گرنگ تەماشای نەکرد، ئەوەی بەلاوە گرنگ بوو بزانێت موراد لەو چەند مانگەی دواییدا پەیوەندی لەگەڵ کێدا هەبووە، بەسەرسەختییەکی بێماناوە گووتی چیرۆکە کۆنەکانی موراد نرخێکی گەورەیان نییە، ئەوەی مورادی کوشتووە پەیوەندییەکی ترسناک بووە کە لە دواهەمین ڕۆژانی ژیانیدا تیا ژیاوە. ئەوەی دەرگای نهێنییەکانی نیشاندام گوڵزار خالید بوو، ئەو ژنەی بۆ نەشتەرگەرییەکی کتوپڕی زراو لە خەستەخانە کەوتبوو. من نەخۆشییەکەیم بە هەل زانی و فرسەتم لێهێنا و لەسەر پێخەفی بیماری قسەم لەگەڵدا کرد، هێشتا

سۆندەکە لە لووتیدا بوو، بەڵام بە غەمی یەکێکەوە بۆ ساتێکیش مورادی لە یادنەکردبێت بە دەنگێکی نەخۆش چپاندی بە گوێمدا و گووتی «من هیچ نازانم، هیچ، یەخەی من بەردە. ژنەکەی بارۆنی مریشک بدۆزەرەوە، ژنەکەی ئەو هەموو شتێک دەزانێت».

بەو جۆرە من یەکەم کەسبووم دونیای بارۆنەکانم دۆزییەوە، ئەو دونیایەی چیرۆکی خەیاڵی ئێمە، دەستکردی ڕاستەقینەی ئەوانە.

## یانەی پیاوکوژە بێئیشەکان
## هاتنەدەرەوەی حەسەن تۆفان لە خەڵوەت لە ساڵی ١٩٩٨دا

دوای زیاد لەشەش ساڵ گۆشەگیری، شەوێکیان دایکم کۆچی دوایی کرد و لەگەڵ دوو سێ پیاوی دراوسێ و ژمارەیەکی بێشومار پیرێژندا بردمان بۆ گۆڕستان، ئەوە یەکەمجار بوو مردوویەک بمرێت و لە بری پیاوان تەنیا ژنان بیبەن بۆ گۆڕستان. پیرۆ دوای مردنی جگە لە کەرەستەی گوڵاو دروستکردنەکە و دەستەیەک کلیلی گەورە، هیچی دیکەی دوای خۆی جێنەهێشت، من سەرەتا نەمدەزانی ئەو کلیلانە چین. کە پیرۆ مرد، من بە چاوی پڕ فرمێسکەوە دەستمکرد بە گیرفانیدا، هەستم بە شتێکی سەیرکرد، تادەستم بە گیرفانی پیرۆدا دەبرد قووڵتر و قووڵتر دەبووەوە، هەرجارە و چەند کلیلێک دەهات بە دەستمەوە، گیرفانی پیرۆ لە کلیل زیاتر هیچی دیکەی تێدا نەبوو، من لە ژیانمدا ئەو کلیلانەم بە پیرۆی نەبینیبوو، نەمدەزانی کلیلی چیین و دەبێت چ دەرگایەک بکەنەوە. دواجار هەموو کلیلەکانم کرد بە ئەڵقەیەکی ئاسنینی گەورەوە و بێئەوەی بزانم سوودیان چییە، وەک دواهەمین یادگار و

پاشماوەی پڕ نهێنی ئەو ژنە ڕۆحسووک و پڕ خەیاڵە لە شوێنێکی گونجاودا هەڵمگرت. ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە دەڵێم گیرفانی هەموو مردوویەک کۆمەڵێک کلیلی وەهای تێدایە، گەر مرۆڤ بە لێزانی دەستبەرێت و بەسەلیقەوە پەنجەبجوڵێنێتەوە، دەتوانێت دەریانبهێنێت. مردنی «پیرۆزی گوڵاو» کە هاوڕێی گەورەی پیرێژنەکانی ئەم وڵاتە بوو، بۆشاییەکی گەورەی لە ژیانی مندا بەجێهێشت. دایکم ناوی پیرۆز بوو، بەڵام من لە منداڵیدا بە هۆی نەفامی و ناکامڵی زمانەوە هەر بە پیرۆ بانگمکردبوو، ئیدی لە ناو خزم و ناسیاودا بە پیرۆی گوڵاو ناوی ڕۆیشت. لە ڕۆژی ناشتنەکەدا سەراپای گۆڕستانەکە ڕەش دەچووەوە، سەدان پیرێژن کە هەموویان بۆنی گوڵاوی دایکمیان لێدەهات، تەواوی گردەکان و شوێنە نزیکەکانیان پڕکردبوو. دوای پرسەی پیاوان، چواردە ڕۆژی ڕێک من پێشوازی ئەو پیرێژنانەم کرد کە لە شوێنی جیاوازی دونیاوە بۆ سەرەخۆشی دەهاتن بۆ لام، هەندێکیان بۆنی دەور و زەمانی تریان لێدەهات و ڕۆحی ئاوارەی ڕۆژگاری تریان لەگەڵ خۆیاندا دەگێڕا. کەسیان منیان بە ناوی حەسەن تۆفان نەدەناسی، ئەوان پێیاندەگووتم «حەسەنی پیرۆی گوڵاو». هەموو پێکڕا ئەوەیان دووبارەدەکردەوە کە من کوڕی ئەوانم و ئیدی ئەوان دایکی منن، لە پڕێکدا بێشومار دایکم بۆ دروستبووبوو کە دڵسۆزانە دەیانلاواندم. دوای تەواوبوونی پرسەکە، ئیدی من جگە لەوەی لە ماڵ دەرچم و بگەڕێمەوە بۆ ژیان کاری ترم نەبوو. دوای زیاد لە شەش ساڵ، لە پاییزی ساڵی ١٩٩٨ دا بوومەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی و تێکەڵاوی دونیا بوومەوە. سەرەتا بە کۆمەکی دۆستێکم وەک پێشمەرگەیەکی خانەنشین ناونوسیانکردم و موچەیەکی کەمم دەستکەوت، چونکە دوای مردنی دایکم ئارەزوویەکم نەبوو درێژە بە گوڵاو دروستکردن بدەم، هەستمدەکرد ئەو حەوت ساڵەی لە گوڵاو دروستکردندا بردمەسەر ئیشی خۆیان کردو منیان لە ڕیشەوە گۆڕی و

کردیانم بە مرۆڤێکی تر. بۆ هەر کوێیەک بچوومایە ئەو بۆن گوڵاوە بە جۆرێک لە خەیاڵمدا چەسپیبوو، دەیگێڕامەوە بۆ ئەو سەردەم و ڕۆژگارەی بڕیاری پاکبوونەوەم تێدا دابوو. ئیدی ئاسایی بوو بگەڕێمەوە بۆ ناو خەڵک و درێژە بە ژیانی ئاسایی خۆم بدەم... وەک یەکێک ڕابوردوی خۆی بنێژێت، دەمانچە و ئەسبابی گوڵاو دروستکردنەکەم خستە ژێر زەمینیماڵەوە و بە قفڵێکی ئەستوور قفڵمدا و خۆم بۆ ژیانێکی تازە تەیار و پڕئومێد کرد.

سەرەتای گەڕانەوەم وەک قەلەندەرێکی گێژ بەردەوام بە شاردا دەسوڕامەوە، ئەو حەوت ساڵە زۆر شوێنی بیربردبوومەوە و زۆر شت لە پێشچاوم گۆڕدرابوو. لە ماوەی یەکەمدا هیچم نەکرد جگە لەوەی بە بازاڕدا بسوڕێمەوە و سەوای شت بکەم. هەندێجار دەچوومە دوکانێکەوە و سەوای هەموو شتەکانم دەکرد، لە نرخی هەموو شتێکم دەپرسی. ڕۆژێکیان لای داروفرۆشێک سەرقاڵی هەڵسەنگاندنی جۆرەکان و شێوەکانی گوڵاوبووم کە لە پشتەوە یەکێک دەستیکردە ملم و گووتی «برای غەریبم تۆ لە کوێی؟». یەکسەر دەنگیم ناسییەوە، فەرەی تونچی بوو، کە پازدە ساڵ لەوەوبەر لە بەردەم ماسیفرۆشەکاندا تەقەمان لە ئەفسەرێکی ئاسایشکرد و فەرە چووە سەر سەری و هاواریکرد «ئەو کوڕی قەحبەیەم کوشت... ئەو خوشک حیزەم کوشت». هاوارێک بوو زۆرجار دەهاتەوە گوێم، لە زۆر خەودا دەمبینییەوە، لە زۆر ساتی وریایدا بێهۆ دەهاتەوە بیرم. فەرە پیاوێکی بێڕەحم بوو، هەرکات بیرم لە دڵڕەقی و بێڕەحمی ئەو دەورووزەمانە بکردایەتەوە، دەموچاوی ئەوم دەهاتەوە یاد، لە ڕۆژانی شۆڕشدا زۆر ئیشی خراپی کردبوو، یەکێک بوو لەوانەی زۆر سڵم لێدەکردەوە. ئەو ناونیشانی شوێنێکی دامێ و گووتی شەوان برادەرە کۆنەکان هەموو لەوێ کۆدەبینەوە، تۆش وەرە بۆ ئەوێ.

شوێنەکە یانەیەکی گەورەی خواردنەوە بوو، سەر بە ئوتێلێکی گەورە

لە قەراغ شار، شۆفێرێکی پیر لە تاکسییەکی کۆندا منی گەیاندە ئەوێ. لە ساڵۆنی ئوتێلەکەدا گارسۆنێکی ئەسمەری بچکۆلانە، کە خاڵێکی زۆر گەورە لەسەر لووتی بوو، پێشمکەوت و بردمی بۆ ژوورێکی دی کە دەکەوتە دەستەچەپی ساڵۆنێکی خواردنەوەوە. یەکەمین کەس لەوێ بینیم فازیل قەندیل بوو، کە بە خۆی و پەرداخێکی پڕ بیرەوە پێشوازی لێکردم. پێشتر شوێنی وەها سەیرم لە ژیانمدا نەبینیبوو، هۆڵێکی گەورە بوو، پڕبوو لەو کەسانەی لە ئیفتیالاتدا چالاکبوون، لە حەفتا و هەشتاکاندا هەموویانم لە بۆنەی جیاواز و ڕێگای جیاوازەوە ناسیبوو، تەنیا ئەوانە نا کە لە حیزبی ئێمەدا کاریاندەکرد، بەڵکو ئەوانەش کە دوژمنی ئێمە بوون، تەقەیان لێکردبووین، بۆ حیسابی حیزبی تر و گروپی سیاسی تر چالاکبوون. تونچی لەگەڵ کوڕێکی قەڵەوی سمێڵ ڕەشدا قسەیدەکرد، کە منی بینی هەردوو دەستی بۆ کردمەوە و بە دەنگێکی بەرز هەمووانی بێدەنگکرد و گووتی «کوڕینە سەیرکەن کێ لێرەیە، سەیرکەن، شێخی گەورەمان، مامۆستا و حەکیمی هەموومان، حەسەن تۆفان». هەموویان منیان دەناسی، کەس نەبوو ڕۆژێک لە ئیفتیالاتدا ئیشیکردبێت حەسەن تۆفان نەناسێت. بەڵام من حەوت ساڵ بوو کەسیانم نەبینیبوو، سەیرم لێدەهات دوای ئەو هەموو ساڵە لە شوێنێکی وادا بیانبینمەوە. هەمووان پێشوازییەکی گەرمیان لێکردم، من وامدەزانی لەخەودام، تەنیا خەو دەیتوانی ئەو هەموو ڕوخسارە کۆن و ئەو هەموو پیاوە نەیارە لە یەک ژووردا کۆبکاتەوە. هەموو پێکڕا هەستیانکرد کە من کەمێک گێژ و سەراسیمەم؛ وەختە هەناسەم توندبێت. بۆ ئەوەی ڕێگای هەناسەدانم بۆ بکەنەوە کورسییەکی تایبەتیان نیشاندام و بە عادەتی دانیشتن لەسەر ئەو مێزانە تونچی و فازیل قەندیل هاتنە تەنیشتمەوە. من ڕوخساری هەردووکیانم وەک دوو ڕوخساری ناو خەو بینی، دوو دەموچاوی درێژیان هەبوو، دوو دەنگی گڕ

و بە تەزووی شەراب تەڕ. تونچی گووتی «حەسەنی برام، نازانیت چەند خۆشحاڵم کە لێرە دەتبینمەوە، ئێمە دوای تۆ ڕۆژی ناخۆشمان زۆر بینی، تا سەرەتای شەڕی ناوخۆش، قەدر و حورمەتێکمان هەبوو، ئیشمان هەبوو، بەڵام ئێستا ئێواران لێرە کۆدەبینەوە، ئێستا تاکە خۆشیمان ئەم ژوور و سالۆنەیە کە تیا دەخۆینەوە و چاوەڕێدەکەین».

فازیل قەندیل کەمێک مەست بوو، کە فەرەی تونچی بە دەموچاوە داکەوتوو و سمێڵە بۆر و لووتە کونجەکەیەوە قسەیدەکرد، ئەو وەک خەو ببینێت بە دەموچاوێکی هێمن و ڕۆمانسییەوە، بە دوو چاوی پڕ خەیاڵەوە سەیری بنمیچەکەی دەکرد. دواجار وەک تورەییەکی زۆر لە خۆیدا بخواتەوە، وەک ئێشێکی دووروودرێژ بخاتەوە ناو دڵی خۆی، بە لووت هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و بیرەکەی لەسەر مێزەکە دانا و گووتی «تونچی، هەموو شتێکی پێبڵێ، هەموو شتێک، حەسەن تۆفان کەسێک نییە من و تۆ شتی لێبشارینەوە، تۆفان هاوڕێی ئێمە بووە، دڵی ئێمەیە، نوری چاوی منە. پێیبڵێ کێیان هێناوە بۆ حیزب، چ حیز و لوسکەیەکیان کردوە بە پیاو».

تونچی وەک یەکێک بیەوێت هەواڵی وەفاتی ئازیزێکم پێبڵێت، کەمێک چووە دواوە و ئێستێکی کرد و دەستیگرتم و گووتی «ئێمە لێرە یانەیەکمان دروستکردوە، ناوی «یانەی قارەمانە بێئیشەکانە»، هەندێکمان بۆ گاڵتە و لاقرتی پێیدەڵێن «یانەی پیاوکوژە بێئیشەکان». هەڵبەت هەندێکمان چووینەتە سەر ئیشی تر، بەڵام هەندێکی ترمان بە ڕۆژ تا ئێوارێ دەخەوین و ئێواران دێین بۆ ئێرە و دەخۆینەوە، پێدەکەنین و گۆرانی دەڵێین و مەستدەبین. تۆفانی برام ئێمە هەموومان لێرەین، ئێرە وەک ماڵی خۆت و ئێمە وەک برای خۆت تەماشابکە. شوێنەکەمان ماوەیەکە ناسراوە، کەسێک ئیشی هەبێت دێت بۆ ئێرە بۆلامان، تێدەگەیت، گەر شتێکیان هەبێت دێن بۆ لای ئێمە، من و فازیلی قەندیل. من

و ئـەو هەمـوو شـتەکان دیاریدەکەیـن، ئیشـەکان دابەشـدەکەین، پـارەکان دیاریدەکەیـن، وادەکەیـن کـەس بێبـەش نەبێـت».

بەترسـێکەوە پرسـیم «یەعنـی تـا ئێسـتا خەڵـک دەکـوژن، وانییـە تـا ئێسـتا خەڵـک دەکـوژن؟؟».

فازیـل قەندیـل دەسـتی بـردەوە بۆ پەرداخەکـەی و گووتـی «مـەرج نییـە، ئێسـتا وەک جـاران نییـە. کوشـتن گـەر بـە فەرمانـی زۆر تایبەتـی نەبێـت، ناکرێـت. نـا بەڕاسـتیمە ئێسـتا وەک جـاران نەمـاوە، دەبێـت یەکێکـت لـە پشـتبێت، یەکێـک لـە سـەرزلەکان، لـە هـەرە هـەرە زلـەکان، گـەر وانەبێـت ئاسـان نییـە. ماوەیەکـە قانونـی یارییەکـە گـۆڕاوە. ئیـش هەیـە بـەڵام زۆر نییـە، بـە تـرس و لەرزێکـی زۆرەوە دەکرێـت، بـۆ شـتێکی پێویسـت نەبێـت حیـزب دەسـت بـۆ چـەک نابـات، بەڕاسـتیمە، شـتەکان گـۆڕاون... زۆر گـۆڕاون... کەسـمان چاوەڕانمـان نەدەکـرد وای لێبێـت».

من بە فزوڵێکی زۆرەوە پرسیم «ئەی ئێوە چی دەکەن؟؟».

تونچـی لووتـە کونجەکـەی خورانـد و گووتـی «هەندێکمـان لـە تەشـکیلاتەکانی تـردا جێمـان بۆتـەوە، هەندێکـی دیشـمان چووینەتـە نـاو سـوپا، بـەڵام ئێـرە شـوێنی سـەرەکی ئێمەیـە، ئێسـتا کـەس ناتوانێـت بـۆ حیـزب ئیشـبکات، دەبێـت بـۆ خەڵکی تـر ئیشـبکەیت، دەبێـت لێرە دانیشـیت و بخۆیتـەوە و گۆرانـی بڵێیـت تـا دێـن، تـا ئیشـێکت پێدەسـپێرن. حیـزب ئیشـی زۆر نەمـاوە، بـەڵام بـرادەرە حیزبییەکانمـان ئیشـیان پێمـان دەبێـت».

فازیـل دەسـتیکردە ملـم و بـە دەنگـی یەکێـک هێـدی هێـدی مەسـتی زەفـەری پێببـات گووتـی «حەسـەن تـۆ نـوری چـاوی منیـت، تێدەگەیـت، لـە عەزیزەکانیـت، لـە هـەرە عەزیـزەکان. ئـەوەی کاری پێمـان بێـت دێـت بـۆ لامـان، تێدەگەیـت، خـۆی دێـت بۆلامـان، بـەڵام کوشـتن هاتۆتـە کـزی. مـن دەزانـم حیکایەتەکـەی تـۆ دەزانـم، دەزانـم تـۆ ناتەوێـت جارێکـی تـر کـەس بکوژیـت، مەڵـێ چـۆن... بـەڵام بیسـتوومە، هەمـوو شـتێک دەزانـم.

ئێستا شتەكان ئاسانترن، كوشتنی تیا نییە، هەندێجار هەڕەشەیە، لێدانە، دەرپەڕاندنە، تەقە بەسەردا كردنە. سەگبابێك پارچەیەك زەوی هەیە لێی دەستێنیت، یەكێكی تر دوكانێك چۆڵ ناكات، تۆ بە شەق پێی چۆڵدەكەیت. یان ئیشێكی ترە كە مەسئولێك پێت دەسپێرێت، گواستنەوەی پارەیەكی زۆرە، دەركردنی عەرەبێكە بۆ ئەو دیو سنوور، دەركردنی كرێچییەكە. هەر رزقێكی ترە كە خوا لە لاوە بینێرێت. پارەشی تێدایە، خەریكە وردە وردە دەجوڵێت، شەش مانگ لەمەوپێش گیرفانمان قالۆنچە تێیدابوو، ئێستا باشترە، ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر دەبێت، ئیشەكە جوڵاوە، لە جارانیش پاكترە، زۆر لە جاران پاكترە. حەسەن باپێت بڵێم، بەچاوی عەزیزم، بە گۆڕی مردوم، هیچ مەبەستم نییە، ئیشیشم پێت نییە. هەر ئەوەیە تۆ لەگەڵماندا بیت بۆ ئێمە خۆشترە».

نەمزانی چی وەڵامی قەندیل بدەمەوە، وەستام و سەیرێكی دەوروبەری خۆم كرد، هەوای سالۆنەكە وەها پڕ دوكەڵ و بۆنی بیرە بوو، خەریكبوو دەخنكام. دەمووچاوەكان هەموویان درێژتر و سەیرتر، دەنگەكان دوورتر و بەسەداتر دەهاتنە گوێم. بەشی هەرە زۆری ئەوانەم دەناسی كە دەمبینین، بەڵام لە دڵیشەوە هەستمدەكرد كەسیان ناناسم و بایەكی غەریب منی هێناوە بۆ ئێرە. واژەوازێكی گەورە لەدەوری سەرم سەمایدەكرد، دەیەها پیاوبوون پیرێتی و سەرسپێتی دەستی لێوەشاندبوون، گەنجێتییەكی پوچیان بەجێهێشتبوو و بەرەو شوێنێكی نەزانراو دەچوون، هەندێكیان فێربووبوون قات لەبەربكەن، بەڵام قاتەكانیان جۆرێكی تر لە بەریاندا وەستابوو، لەو قاتانە نەدەچوو كە پێشتر من بینیبووم، زۆربەیان هێدی هێدی مەست دەبوون، جگەرە لەسەر جگەرە دەیانكێشا. دەنگەكان بە جۆرێك لەسەری مندا تێكەڵ دەبوون، وەك دەنگی دەهۆڵێكی ڕەق و گەورەیان لێدەهات كە بەبێ ئاواز گرمەی دێت. بێئەوەی هیچ بڵێم،

بێئەوەی بتوانم وەڵامی فازیل قەندیل بدەمەوە سەیرێکی درێژی هەردووکیانم دەکرد. ژاوەژاوێک دەچوو سەرمەوە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵدەبوو، ئیتر هیچم نەدەبیست، سەرم پڕدەبوو لە دەنگی تەقەی کۆن، لە یادگاری ئەو ناڵە و شریخانەی حەوت ساڵ لە یادەوەریمدا کپمکردبوون، هەناسەم پڕدەبوو لە بۆنی باروت، باروتی ئەو فیشەکانەی ئێمە تەقاندبوومان، سەیری دەستی خۆمم دەکرد و یەکەیەکە سەیری دەستی ئەوانی دیشم دەکرد، هەڵمی زەمانێکی مردوو و هالاوی قەرپێکی خوێناویم لە نێوان پەنجەکانیاندا دەبینی، دەستمدەگرت بە لێواری مێزەکەوە و هەڵدەستام، ئاگام لە تونچی و قەندیل نەدەما... لە ناکاو ئەو بۆن گوڵاوە دەهات بەسەرمدا... ئەو بۆن گوڵاوەی پیرۆ لە دوورەوە بانگیدەکردم و دەیبردم، بۆنێک بوو منی ڕادەکێشا... وەک دوای ئەفسونێک کەوتبم چاوم لێکدەنا و دەڕۆیشتم. هەستمدەکرد دەنگەکان دوامدەکەون، وەک بە زمانێکی تر قسەبکەن هیچ تێنەدەگەیشتم، کوڕێکی گەنجم لەبەردەرگاکە دەبینی، ئەو گارسۆنەم دەبینییەوە کە خاڵێکی گەورە بە لووتییەوە بوو، وەک بپاڕێمەوە دەمگووت بمبەرەوە بۆ ماڵێ. لەترێکم دەدا و یەکێک دەیگرتم. دەمزانی خەریکە دەکەوم، دەکەوتم و ئیدی هیچم لەبیر نەدەما... هیچ شتێک.

کە چاومکردەوە لە ماڵی شبر مستەفا بووم. کە لە هۆش خۆم چووبووم، کەس ماڵی منی نەزانیبوو، یەکێک تەلەفونی بۆ شبر کردبوو، ئەویش ڕایسپاردبوو بمبەنە ئەوێ. تا ئەوکات نەمدەزانی شبر لەسەر کورسییەکی کەمئەندامەکان دەجوڵێتەوە، ئەویش هیچ هەواڵێکی منی لانەبوو، کە هۆشم هاتەوە و شبرم بەو جۆرە بینی، دەستمکردە ملی و تێر بۆی گریام، ئەویش زۆر لە گەڵمدا گریا و گووتی «حەسەن ژیانی من هەر دەبایە وا دوایی بێت». کە شبرم بەو جۆرە بینی، لە غەمدا

چیرۆکی بورانەوەکەی خۆم لە یادکرد. شبر ئەو شەوە زۆر شتی لەسەر یانەی پیاوکوژە بێئیشەکان پێگووتم. لە دوای ڕاپەڕینەوە هێدی هێدی ئیشی ئەوان هاتبووە کزی، یانەی پیاوکوژە بێئیشەکان ناوێکی گاڵتەکار و بیرۆکەیەکی سەیری شبر خۆی بوو، تا هەموو هاوڕێکان کۆبکاتەوە و لەوێ بیر لە پاشەڕۆژی خۆیان بکەنەوە. ئەو بەچاوی پڕنەشکەوە، دەستی بە قژە درێژە زەردەکەیدا دەهێنا و دەیگووت« من بیرم لەوە دەکردەوە لەو یانەیەدا دووبارە بیر لە ژیانی خۆمان بکەینەوە، حیکایەتی خۆمان بنوسینەوە، ئیش بدۆزینەوە، کۆمەکی یەک بکەین، لە مەسەلە سیاسییەکاندا دەنگمان هەبێت، شاعیرەکان بانگبکەین شیعرمان بۆ بخوێننەوە، مۆسیقارە باشەکان بهێنین و مۆسیقامان بۆ لێبدەن، لە ڕێکخراوەکانی تردا چالاکبین و کۆمەک بە ئیشی باش بکەین. دەمویست نیگارکێشەکان بهێنم و فێری ڕەسممان بکەن، ماوەماوە بچینە باغچەکانی ساوایان و لە منداڵانەوە شت فێرببین، گەر کرا کۆمەک کۆبکەینەوە بۆ ژنهێنان و ماڵ دروستکردنی یەکتری، ئەوە خەونی من بوو... بەڵام هیچ شتێک سەری نەگرت، چونکە ئەوانە لووت لە هەموو شتێک دەژەنن، لە هەموو شتێک».

شبر چیدی ئەو کوڕە نەبوو کە جاران دەمناسی، هەستیدەکرد بە خۆڕا ژیانی خۆی و گەنجی خۆی دۆڕاندوە، نائومێدییەک و توڕەییەکی گەورە لە دەنگیدا بوو، هەموو ئەو ڕوداوانەی بەسەریدا تێپەڕیبوون لە ڕیشەوە هەڵیانتەکاندبوو، چیتر باوەڕی بە هاوڕێ کۆنەکانی خۆی لە حیزبدا نەمابوو. دوای بریندارbوونی چەند جارێک لە زەرفی سپیدا پارەیان بۆ ناردبوو، ئەو هەموو جارێک پارەکانی دابووەوە بە دەموچاویاندا و داوایکردبوو لێیگەڕێن، ئێستا موچەیەکی بچوکی کەمئەندامی هەبوو بەوە دەژیا. سەردەمێک خولیای ئەوەبوو ڕێکخراوێک بۆ هاوڕێ کۆنەکانی دروستبکات، کە زۆربەیان بێئیشبوون، بەڵام کە

ئـەو یانەیـەی دروسـتکردبوو، زوو لـە چنگیـان دەرهێنابـوو. ئـەو شـەوە دەیخـواردەوە و بێئـارام لەسـەر کورسییەکەی دەجـوڵاو قسـەیدەکرد، چـاوی پڕبووبـوو لـە فرمێسـک، لەوەوپێـش نەمدیبـوو شـبر لـە کاتـی قسـەکردندا بگـری. دەسـتی دەگـرت بـە چاوییـەوە و دەیگـووت «حەسـەن، ئەوانـە فێـری گریانیشـیان کـردم، تێدەگەیـت، ئێسـتا وام لێهاتـووە لـە خۆمـەوە دەگریـم. دەزانیـت چییـان کـرد؟ دوای هەفتەیـەک لـە دامەزراندنـی یانەکـە، تونچیـان بۆ نـارد، ئـەو دوپشـکە کـە حـەوت جـزووی جیـاوازی هەیـە، دەزانێـت چ کەسێک بـە چ جـۆرە ژەهرێـک دەمرێـت و بـەو ژەهـرە پێوەیـدەدات. پیـاوە بەرزەکانـی حیـزب، سـەرۆکەکانمان، ئـەوان تونچیـان بـۆ ناردیـن. جگـە لـە خۆیـان نایانەوێـت ڕۆحلەبەرێکـی تـر هەناسـە بـدات... بـە قسـە لوسـەکان و درۆ گەورەکانیـان هاتـن و هەمـوو شـتێکیان تێکـدا، تـا دنیـا دنیایـە ناهێڵـن کـەس لـە یارییەکـە بچێتـەدەرێ، ناهێڵـن... یـان دەبێـت حـەوت سـاڵ بچیتـە ژوورەوە و بیـر دونیـا بچیتـەوە وەک تـۆ کـردت یان ئەوان بـە جالجاڵۆکەکانیان چـواردەوەرەت دەتەنـن، دەسـت و قاچـت دەبەسـتن و تـا بـەر ئـەو کونـە ڕاتدەکێشـن کـە دەیانەوێـت. هەفتەیـەک نەبـوو مـن ئیشـمدەکرد... فازیلـی قەندیلیـان نـارد، هیدایەتـی گورجیـان نـارد، ڕۆسـتەمی عەزیـز ئاوارەیـان نـارد، خەلیـل کیسـەڵیان نـارد، فاتیحـی مەجیـد باجەڕیـان نـارد... هەرچـی هەیـە و نییـە لـەو سـندوقە پـڕ ژەهرەیانـدا دەریانهێنـا و کردیـان بـە گژمـدا. ئـەو یانەیەیـان وا لێکـرد ببێـت بـە شـوێنی ئیـش، ببێـت بـە مەیدانـی کار. وەک چـۆن خەڵـک بـۆ کرێـکار دەگەڕێـت و دەچێـت بـۆ مەیدانـی کرێـکاران، هـەر کـەس بـۆ پیاوکوژێـک بگەڕێـت دەچێـت بـۆ ئـەوێ. پاش مانگێـک مـن خـۆم و عەرەبانەکـەم لەسـەر جادەکـە بوویـن... تێدەگەیـت، مـن خـۆم و عەرەبانەکـەم فڕێیاندامـە دەرێ، ئینجـا بـە عەریـف بسـتەکدا پارەیـان بـۆ نـاردم، تێدەگەیـت، هـەر کات بیانەوێـت بتکڕنـەوە بـە عەریـف بسـتەکدا پـارەت بـۆ دەنێـرن، جارێـک و دوو و سـەد. ئێسـتا زۆر پێویسـتیان بـە

پیاوکوژی وەک من و تۆ نییە، زیاتر ژمێریار و موحاسیبەکان خەڵکیان بۆ دەکوژن... تێدەگەیت؟ ».

من گووتم « شبر گرنگ ئەوەیە خەڵک نەکوژن، تێدەگەیت، گرنگ ئەوەیە خوێنی تیا نەڕژێت، شتەکانی تر گرنگ نین».

من بەڕاستم بوو، بەلامەوە گرنگبوو خوێن نەڕژێت. ئەو گووتی « تۆ وادەڵێیت، هەقتە، بەڵام فیشەک هەموو شتێک نییە، زۆرجار فیشەک لە هەندێ کوشتنی تر بەڕەحمترە، دوائەوە وامەزانە خەڵک ناکوژن، وامەزانە».

شبر ئامۆژگاریکردم کە چیدی نەچمەوە بۆ ئەو یانەیە... ئەو شەوە کە لە ساڵۆنەکەی ماڵی شبر مستەفادا خەوتم هێشتا هەناسەم پڕبوو لە بۆنی گوڵاوەکانی دایکم، هەستمکرد ئەو گوڵاوە ناهێڵێت تێکەڵ بە ڕابوردوو ببمەوە. بۆ ڕۆژی دوایی شبرم بە کورسی کەمئەندامەکانەوە برد بۆ بازاڕ... لەو ڕۆژەوە من و شبر بووین بە دوو هاوڕێی زۆر نزیک، دوو هاوڕێ کە تەنیا مردن لە یەکمان جیادەکاتەوە.

## یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

ئێستا دووبارە نۆرەی منە قسەبکەم، ئەوان زۆریان گووت، وەک ئەوەی من لە دەرەوەی یارییەکەبم، وەک ئەوەی نەخشەی ئەم دونیایە هەندێک پیاوی بێنەخشە و بێنیاز کە خۆرسک ڕواون دایڕێژن، وەک ئەوەی مێزی بلیاردەکە تەنیا دارنوکی غەزەلنوسی لەسەر بێت و من تەنیا تۆپێکی سادە بم کە بێهودە لە ناو چێوەی مێزەکەدا دەسوڕێمەوە. نا، بیرتان نەچێت، من یەکێکم لە یاریزانە گەورەکانی یارییەکە، یەکێکم لەتۆپەگرنگەکان، هێند هەیە دەزانم کەی و لە کوێدا و لە چ تۆپێکی

دی دەدەم. ئێستا کەمێک بیرتان لای منیش بێت و گوێم لێبگرن. دوای دەستپێکردنی سەدەی بیست و یەک بە ماوەیەکی کەم، حیکایەتی دەفتەرێکی گەڕۆک کەوتە ناوانەوە، دەفتەرێک لە شاردا بە مەجازی ناویان نابوو «دەفتەری باڵدار». دەفتەرەکە بە شێوەیەکی کتوپڕ و سەیر لەو ماڵانەدا دەردەکەوت کە بەجۆرێکی تراژیدی خەڵکێکیان لێ مردوە، داوەتێکی پڕمانابوو تا هەر کەسە و بە شێوەی خۆی چیرۆکی مردنی ئەزیزانی خۆی لەناودا بنوسێتەوە. من لەڕێگای هەواداران و دڵسۆزانی خۆمەوە، چیرۆکەکەم بیست. گەرچی من باوەڕێکی زۆرم بە هێزی خەیاڵ هەیە، بەڵام سەرەتا تەواوی حیکایەتەکەم وەک خورافەتێک لەو خورافەتە ڕۆژانانە هاتە بەرچاو کە خەڵکی ئەم شارە، بێ هیچ شەرمێک دروستیدەکەن. بەڵام چیرۆکەکە بە جۆرێک بەربڵاوبوو نەدەکرا هەروا ئاسان پشتگوێ بخرێت، ئەوکات بەڕێوەبەری ئاسایش و دەزگاکانی هەواڵگری حیزب شتێکی ئەوتۆیان لەسەر مەسەلەکە نەدەزانی، لەبەرئەوە من زیاد لە کەسێکی دڵسۆزی خۆم بۆ سۆراغی ئەو مەسەلەیە خستە بازاڕەوە کە پێکڕا بوونی جۆرە دەفتەرێکی وەهایان سەلماند. هەر لە ڕێگای ئەو مرۆڤە دڵسۆزانەوە هەندێک خەڵکیشم بینی کە بەڕاستی خۆیان دەفتەرەکەیان بینیبوو و شتیشیان لە ناودا نوسیبوو. ئەوەی بەندە لە تەواوی حیکایەتەکە تێگەیشت «بە پێچەوانەی تێگەیشتنی عەوامەکانەوە»، مەسەلەکە پەیوەندی بە بوونی زیاد لە دەفتەرێکەوە هەبوو کە بە جۆرێکی نارێک بە تەواوی شاردا دەگەڕان، هەندێک خەڵکی نەناسراو و سەیریش دەیانگێڕا، کە هیچ کەس ئاسان نەیدەتوانی ڕەچەڵەک و شوێنی نیشتەجێبوونیان بزانێت. تەنیا مەبەستیشیان کۆکردنەوەی حیکایەتەکانی مردن بوو. من لە کۆبوونەوەی بیرۆی سیاسی حیزبی خۆمان و لە کۆبوونەوەی هاوبەشی حیزبە کوردستانییەکانیشدا حیکایەتی ئەو دەفتەرە باڵدارانەم

باسکرد، بەلام وەک هەمیشە بە چاوێکی سەیر و سارد و بێمانـاوە سەیریانکردم و هیچیان نەگووت. لەو سەردەمەدا ترس لە گەڕانەوەی هێزەکانی سەدام حوسەین یان دابەزینی سوپای تورک لە باکوورە بە جۆرێک گەورەبوو، بوون و نەبوونی وەها دەفتەرێک سەرەنجی کەسی ڕانەدەکێشا. بەڵام من لە دوای ڕاپەڕینەوە، مەترسی پشتگوێ خستنی ئەم وردە شتانەم دەزانی. هەڵبەت شتەکە مەترسییەکی ڕاستەوخۆی لەسەر ئاسایشی نەتەوەییمان نەبوو، بیرۆی سیاسی حیزبیش لە باشترین حاڵدا، تەواوی مەسەلەکەیان وەک گەمەی منداڵانەی هەندێک کەسی بێئیش سەیردەکرد، کە باشترە لێیانگەڕێین چی دەکەن بیکەن.

کە حیکایەتی ئەو دەفتەرانەمان بیست، تازە بە تازە لە سۆراغی قەسیدەکانی غەزەلنوسدا بووم. تا ئەو کات بیرۆکەیەکی ئەوتۆم لەسەر ئەو نەخشەیە نەبوو کە دەبایە بیکێشم و بەتەواویش نەمدەزانی چی دەکەم و سەرو کارم لەگەڵ چ جۆرە بوونەوەرێکدایە. بەلام ڕۆژێکیان زۆر سەیر و کوتوپڕ جەنابی سەرۆک بانگیکردم و پرۆژەیەکی لەگەڵدا باسکردم کە بەندە لە پەنهانی خۆیدا دەمێوو بیری لێکردبووەوە، بەلام جورئەت و ئازایی ئەوەم نەبوو بە دەنگی بەرز باسیبکەم. بەڵێ، سەرۆک بانگیکردم و پێیگووتم نەخشەیەکی وەها لە خەیاڵییایەتی کە لە بیست ساڵی داهاتوودا بناغەی گەڕەکێکی خەیاڵی دابمەزرێنێت، کە نمونەی خەیاڵی بەرز و ئەفسوناوی بێت، شتێک بێت، ببێتە ڕووکاری «ئەزموونە تایبەتی و دیموکراسییەکەی کوردستان» و بشێت کە میوانانی بیانی هاتن بە شانازییەوە نیشانیان بدەین و بڵێین «ئاغایان ئەمەیە کورد، گەر دەرفەتی دەستکەوێت موعجیزە دروستدەکات... موعجیزە». لەگەڵ ڕێزمدا بۆ جەنابی سەرۆک، دەبێت بڵێم کە ئەو بەدروستی نەیدەزانی باسی چی دەکات... نەیدەزانی چۆن برینی من دەکولێنێتەوە. ئەوکات سەرەتای سەدەی بیست و یەک بوو،

تازە گەڕەکی نوێمیران دروستدەکرا، هەندێک کۆشکی تەواوبووبوو، هەندێکیشی هێشتا لە کاردابوو. من بۆ سەرۆکم باسکرد کە چ ڕەنجێکم داوە، چ ماندووبوونێکم چەشتووە بۆ ئەوەی نەهێڵم نوێمیران ببێتە شوێنێکی داخراو و ئاسایی، بەسەرۆکم گووت «گەورەی هەموومان و ڕابەری مەزن، من ویستم لە جێگای ئەم گەڕەکە تازانەی ئێستا بناغەی بۆ دادەنێن، شتێکی تر دروستبکەم، شتێکی خەیاڵی، شتێک کە مرۆڤ پێیخستە ناوی، واهەستبکات، لە سەرزەمین دەرچووە و چۆتە ناو فەنتازیاوە... من ئێستاش لەوەدام بۆ ڕۆحلەبەرگەلێکی خەیاڵی بگەڕێم کۆمەکمبکەن و لە دروستکردنی ئەو شارەدا دەلیل و هاوکارم بن». من بیئەوەی بزانم چی دەکەم، ئەو فەرمانەم خستە ئەستۆی خۆم کە بیر لە دروستکردنی گەڕەکێکی خەیاڵی بکەمەوە. بەڵام حیکایەتی ئەو دەفتەرە باڵدارانە پشوویان لێ بڕیبووم. من لێتانی ناشارمەوە، خەیاڵ وەک هێزێک تێگەیشتووم، مردن و ئازار و تاریکی بیر مرۆڤ دەباتەوە. خەیاڵم بۆیە پێویستە تا ڕاستییەکی تر دروستبکەم، ڕاستییەک لە هیچ یەکێک لەو ڕاستییانە نەچێت کە ئێستا لەم شارەدا دەیبینم. خەیاڵ وەک جێگری حەقیقەت. بەڵام حیکایەتی ئەو دەفتەرانە زۆر ئازاریان دەدام، شتێک بوو لە دەستکردی جۆرە خەیاڵێکی تر، خەیاڵێک نایەوێت ڕاستی بیربهێنێتەوە. من گەلەک ورد کەوتمە دوای ئەوانەی کە دەشێت لە پشت ئەو دەفتەرە گەڕۆکانەوە بن، بەڵام هیچم دەست نەکەوت، پێدەچوو ئەوانەی ئەو کارەدەکەن هێند مەخلوقاتی خەیاڵی بن ئاسان نەدۆزرێنەوە. مرۆڤ بە ئاسانی ناتوانێت بوونەوەرێکی خەیاڵی بگرێت، بەڵام کە گرتیشی و نەیتوانی دەستەمۆیبکات... خوای گەورە ئەی دەبێت چی لێبکات؟

# ماجەلانی ڕاستەقینە تووشی هەندێك كێشە دەبێت «هاوینی ٢٠٠٤»

دوای هەفتەیەک لەو ئوتێلەدا زوهدی شازەمان هێدی هێدی چاویکرایەوە و بە کوچە و بازاڕەکان ئاشنابووەوە. خاوەن ئوتێلەکە دەیویست هەرچۆنێک بووە دڵی ڕازیبکات. بێهۆ ترسێکی نادیاری لەم پیاوە باڵابەرزە قژدرێژە هەبوو کە وردە وردە دەنگۆ و حیکایەتی سەیر و نەسەلمێنراوی لەسەر بڵاودەبووەوە. یەکێک دەیگووت کوڕی یەکێک لە خاوەن موڵکدارە گەورەکانە و بە هۆی مەسەلەی ئیرس و ناکۆکی گەورەوە لەسەر بەشە وەرەسەی خۆی هاتۆتەوە، یەکێکی دیش دەیگووت پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندە کە لە ژنی بێگانە وەڕزبووە و هاتووە کچێکی باش بدۆزێتەوە و لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ ئەورووپا، حیکایەتێکی دیکەشیان وەک سیخوڕێکی ئینگلیزی باسیدەکرد کە بۆ جێبەجێکردنی ئیشێکی نهێنی لێرەیە. خاوەن ئوتێلەکە یەک دوو جار چووە ژوورەکەی و شتەکانی پشکنی و هیچی ئەوتۆی نەدۆزییەوە، چەند جارێک دۆسییەی نامەکانی دەرهێنا و جگە لەوەی تێگەیشت خوشکەزایەکی هەیە ناوی باران شوکورە لە هیچی تر حاڵی نەبوو. نامەکان شتێکی ئەوتۆیان تێدانەبوو کابرا ڕوون و ئاشکرا تێیانبگات. ژیانی دووروودرێژی وەک خاوەن ئوتێلێک فێریکردبوو، ژووری میوانەکانی بپشکنێت و پارچە پارچە سەیری کەلوپەلەکانیان بکات، بێئەوەی هیچ ئاسەوارێک جێبهێڵێت. چەند جارێک ویستی خۆی لێنزیکبکاتەوە و شتێکی لێدەربهێنێت، بەڵام کابرا لەوە ڕەقتر و داخراوتربوو ئاسان خۆی بدات بەدەستەوە، لەو کەسانەبوو دیوارێکی ئەوتۆیان لە نێوان خۆیان و بەرابەرەکەیاندا دروستدەکرد، ئاسان نەدەشکێنرا.

کابرای ئوتێل دیقیدەکرد بۆ ئەوەی بزانێت ئەم کابرایە کێیە و چی دەوێت؟. بەڵام خۆشی نەیدەزانی چەند دەمێنێتەوە، نەیدەزانی دەبێت چی بکات، وەک ئەوەی چاوەڕوانی موعجیزەیەک بێت، تا ئەو ساتە هیچ کەسێکی نەوتۆی نەبینیبوو پرسیاری باران شوکوری لێبکات. دەبایە بە وریاییەوە نزیک ببێتەوە، دڵنیابێت کە باران سەلامەتە، دڵنیابێت هیچ ڕووینەداوە، ئاه، ئەی ئەگەر شتێکی بەسەر هاتبێت؟ نا، نەیدەتوانی ئەگەری وا دابنێت.

ئەو شەوە کە گەڕایەوە بۆ ئوتێلەکە یەکەمجار ژنی خاوەن ئوتێلەکەی بینی، ژنێکی چکۆلانەی ئەسمەر و چاوڕەش. ئافرەتێکی گەنج کە بە دوو نیگای پڕ شەوقەوە سەیریکرد. بلوسێکی شینی کەمێک تەنک و تەنورەیەکی مۆری لەبەردابوو، بە ڕوخساریدا خوێندەوارتر و شاریتر لە ئیشکەرانی دیکەی ئوتێلەکە دەینواند، لەوانەبوو کە چاویلکەیەکی ڕەش دەکەن بە ناو قژیاندا. خانم کە کلیلەکەی دایە، خەندەیەک لەسەر لێوی بوو. ژنێکی جوان بوو، بەڵام شتێک لە شێوەی مەکیاجکردنەکەیدا زوهدی شازەمانی ڕاچڵەکاند، کە کلیلەکەی وەرگرت، هەستیکرد خانمەکە مەبەستی بوو دەستی بەر دەستی بکەوێت. شازەمان سەرەتا وایدەزانی تەنیا کچێکی ئیشکەرە و ئەو پێشتر ڕێکەوتی نەکردوە، بە پێچەوانەی عادەتی خۆیەوە کە پیاوێک بوو بێدەنگی هەڵدەبژارد، پرسی«خانم تۆ لێرە ئیشدەکەیت؟». بە چرپەوە وەک ئەوەی نهێنییەکی پێبڵێت، گوتی «من ژنی ئەوم». بە شێوەیەک گوتی، وەک ئەوەی دڵنیابێت ئەو جۆرە قسەکردنە، لەو یەکتر بینینە سەرەتایی و کورتەدا بە خێرایی کۆمەڵێک گرێدەکاتەوە و هەندێک بەربەست دەشکێنێت. چرپەیەکی ناسک و قووڵ بوو، لەو بیستوچوار ساڵەدا زوهدی شازەمان دەنگی هیچ

ئافرەتێکی کوردی نەبیستبوو بەو چەشنە ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵدابکات، ئەو ناسکییە ناوەختە تەزوویەکی سەیری تیادروستکرد. بیستوچوار ساڵ بوو تەنیا بە ڕێکەوت لە زاری ئافرەتەوە گوێی لەم زمانەبووبوو، هەر جێگایەک کوردان تیا مۆڵیان ببەستایە ئەو نەدەچوو، هەتا گوێی لە مۆسیقا و گۆرانیٔ کوردیش نەدەگرت. ئێستا ئەو ڕستە کورتە، ئەو دەنگە کچانە ناسکە کە بە ئولفەت و دۆستایەتییەوە دوانی شتێکی تیا گۆڕی، سەری بەرزکردەوە و بێئەوەی پێبکەنێت یان تەعبیرێکی دیاریکراو لەسەر ڕوخساری بێت، گووتی « ئەها، تۆ ژنی ئەویت» . ئەو دەستێکی بە قژیدا هێنا و بە چرپەیەکی سووکتر لەوی پێشوو گووتی «نا، ئەی چۆن من ژنی ئەوم، ژنی خاوەن ئوتێلەکەم» .

ئەم شارە لەو شارە کەمانەی دونیایە کە ژیانی شەوی تێدا نییە، بەڵام لەگەڵ چۆڵی و بێژیانی شەقامەکانیشدا گەرمای ئاب کارێکیدەکرد هاتنەدەرەوەی شەوان خۆشتر بێت. ئەو چەند ڕۆژە بێئەوەی هیچ دەروازەیەکی دەستبکەوێت بەردەوام دەگەڕا، زۆر شوێن دەگەڕا، لە هەندێک چاخانەدا دادەنیشت و گوێیدەگرت، بەڵام نە هیچی دەستکەوت و نە هیچ سەرەداوێکی بۆ دۆزرایەوە. بەو قژە درێژ و چاوە گەش و گەورانەوە، بەو ڕوخسارە پاک و نیگا قووڵانەوە، دەچووە هەر شوێنێک ڕاستە و ڕاست ئیرەیی و گومانی دەبزواند. پیاوێکی جوان بوو، بەڵام لەو جوانیانەی خەڵکی سادەی ئەم شارە لێیدەترسن. ئەو شەوە دوای ئەوەی بە عادەتی هەمیشەیی خۆی بەر لە خەوتن قژە درێژەکەی بەست، سەری خستە سەر سەرینەکە و هەستیکرد چرپەی ژنی خاوەن ئوتێلەکە لە گوێیدا دەزرینگێتەوە. ژیانی پڕبوو لە چرپەی ژنان، بەڵام ئەمجارەیان شتێکی تربوو، شتێکی تر. هەستیکرد هێدی هێدی نوقمدەبێت و وندەبێت... نەیتوانی بخەوێت، هەناسەیەکی هەڵکێشاو و لەخۆی پرسی

«ئەی پیاوی غەریب و بەدبەخت بۆ کوێ دەچیت... بۆکوێ دەچیت و چیت دەوێت؟»... لەو چەند ساڵە زۆرەی غەریبیدا فێربووبوو بەو زمانە قسە لەگەڵ خۆیدا بکات، بەڵام خۆشی نەیدەتوانی وەڵامی خۆی بداتەوە.

بینینی ژنی خاوەن ئوتێلەکە هۆیەکی گەورەبوو بۆ ئەوەی لەو ئوتێلەدا بمێنێتەوە، لە ماوەی ئەو هەفتەیەدا چەند جارێک بیری لە گۆڕینی ئوتێلەکە کردبووەوە، بەڵام ئەو چرپە ناسکە وەستاندی، هەندێجار ئافرەتێکی جوان و ناسک ئەوە دەهێنێت مرۆڤ شارە و شار و کیشوەراو کیشوەر بۆی بڕوات. هەندێجار مرۆڤ تەنیا لە پێناوی یەک ئافرەتدا بە جێگایەکی دونیاوە دەنوسێت، خوو بە شارێک یان شارۆچکەیەکەوە دەگرێت و تەواوی دونیا فەرامۆشدەکات، ئەو ماوە کەمەی لەو شارەدا بەسەریبردبوو، ئەزموونێکی تاڵ بوو، شارێک بوو جگە لە دەنگی ئوتومبێل و قیڕەقیڕی شۆفێر و دیدەی پاسی نەفەربەر هیچی دیکەی تیانەبوو. بەڵام چرپەی ئەو ژنە ناسکە، سیحر و ئەفسونێکی ئەوتۆی تێدابوو لە جێگای خۆی وەستاندی، وەک ئەوەی پێیبڵێت ئەم شارە لە ژێرەوە بەحرێکی قووڵتر و پڕنهێنیترە. چرپەیەکی کوشندەبوو، وەک ئەوەی هەرچی فریو و نازکییەک لە ئافرەتی دونیادا هەیە لەو چرپەیەدا کۆبووبێتەوە. چرپەیەک بوو دەیتوانی لەم شارەدا دیلیبکات. گرنگ نەبوو لەگەڵ چەند ژنی دونیادا خەوتووە، لە کچە ئەسمەر و تورت و لێوپڕەکانی سانتیاگۆوە تاقیکردبووەوە تا ئەو چینییە قژ ڕەشە بێمەمکانە کە هەردەم بە توکەبەرە نەرم و قوونە سفتەکانیانەوە بۆنی جۆرە بەهاراتێکی چینیان لێدەهات کە ئەو حەزی پێنەدەکرد. لەوکاتەوەی لەم ئوتێلە دابەزیبوو هەستیدەکرد ئەم پیاوێکی لەوە بێشەرمترە بتوانێت لە شارێکی وا بە حەیا و حورمەتدا بژی. لە هەموو سەفەرەکانیدا خۆی لەو شارانە دەپاراست کە بە حەیا و حورمەتن. لە قووڵایی دڵیدا دڵنیابوو کە

گەرمترین ئافرەتانی دونیا و شێتترین و مەستترینیشیان لەم شارە تۆزاوی و بەشەرەفانەدا دەژین، بەڵام دۆزینەوە و پێگەیشتن و ناسینیان هێند سەختە، تەنیا بەو پیاوانە دەکرێت کە لە ناو هەمان بازنەی شەرم و شەرەفدان، بە هەمان شێوەش شێت و مەست و داغن. ئەو لەو پیاوانە نەبوو کە هەوڵ بۆ ئافرەتی دووردەست و سەرسەخت بدات، هەمیشە بۆ ئافرەتی سووکەدەست و تێپەڕ گەڕابوو، بۆ ئەوانەی پێیدەگوتن «کۆتری یەک شەوە». بۆ سۆزانییەکان، بۆ ئەوانەی شەو لەسەر شەقامەکان دەوەستن تا شۆفێرەکان هەڵیانگرنەوە، بۆ ئەو ژنانەی لە پشووی ساڵانەدا لە ڕۆخە گەرمەکانی دونیادا، بێ پیاو، بێ هاوڕێ دەسوڕێنەوە و بەچاویاندا دیارە بۆ شەوێکی ڕەنگین وێڵن. زۆربەی ئەزموونەکانی لەگەڵ کچانی بەجێماوی بارەکان و ژنی ماتۆڕسواری وێڵگەردی وەک خۆیدا بوو. بەڵام بیری نایەت چپەیەکی وەهای بیستبێت، وەک ئەوەی هەموو ژیانی بەدوای دەنگێکی وا فیتنەکار و فریودەرەوە بووبێت، وەک ئەوەی بۆ ژنێک گەڕابێت مەستییەک لە دەنگیدا بێت، مەستی ئەلکهول نەبێت، بەڵکو مەستی خانمێک بێت کە یاریدەکات... یاریدەکات و هیچی تر. تا ئەو کاتە بە ڕابوردووی خۆی شاد و بەختەوەربوو، هەستیدەکرد زۆر زیاتر لە پیاوانی دیکەی دونیا ژیان و شادی وەرگرتووە. دواجار کوردێکی وێڵگەڕ بە سوار ماتۆڕێکەوە، دەبێت چیتری دەستبکەوێت؟ جگە لە سۆزانییە بەجێماوەکانی نیوەشەو، جگە لەو ئافرەتانەی بۆ شەوێک دەگەڕێن ئازاری ژیانیان بیربەرێتەوە. ئاه «کوردێکی وێڵگەڕ بەسەر ماتۆڕێکەوە» ئەو وێنەیە لە ناخی دڵەوە زۆر ئازاری دەدا، ئێستا هەستیدەکرد چۆتە تەمەنێکەوە ناتوانێت بەردەوامبێت، هەندێجار هەستیدەکرد کە درۆدەکات ئەو بە دوای باران شوکوردا نەگەڕاوەتەوە، بەڵکو ماندووبوون و پیرێتی و بێکەسییەکی کوشندە هێناویانەتەوە، وەک کوردێک کە بەدرێژایی ژیانی خیانەتی لە خۆی کردوە، ئێستا هاتۆتەوە بۆ ئەوەی سزای خۆی

وەرگرێت... سزایەک کە لە مێژە دەزانێت چاوەڕوانیدەکات... بەڵام چ جۆرە سزایەکە؟ نەیدەزانی.

شەو درەنگ هەستا و گەڕایەوە بۆ سالۆنە بچوکەکەی پێشدەم پێشەنگدەری ئوتێلەکە، یەکەم شەو بوو هەست بە گەرمای ئاب نەکات، بە پێچەوانەوە زۆر سەرمای بوو، نەیدەزانی سەرمایەکی ڕاستەقینەیە، یان تەنیا جۆرە هەستێکی نادیارە کە پیاوێک لەسەرەتای پیرێتیدا هەستی پێدەکات. لە سالۆنی ئوتێلەکەدا ئەو پاسەوانە ڕیوەڵە ئەسمەرەی بینی بە سمێڵێکی بژ و ژاکاو و دوو چاوی ماندووەوە، لە بەردەم تەلەفزیۆنەکەدا ئەبڵەق سەیری کەناڵە ئیرۆتیکییەکانی دەکرد. بێئەوەی شەرم لەو بکات یان کەناڵەکە بگۆڕێت، سەیریکرد و هیچی نەگووت. نەیدەزانی بۆ وای هەستکرد کە سێبەری ئەو ژنە لە ژوورەکەدا ئامادەیە، بە دەنگی یەکێکی نەخۆش لە پاسەوانەکەی پرسی «خاوەن ئوتێلەکە لێرەیە؟». ئەو وەک ئارەزووی وەڵامدانەوەی نەبێت، زۆر بە کورتی گووتی «نە، لێرە نییە». زوهدی شازەمان بە هەمان دەنگی نەخۆش دووبارە پرسیاریکرد «ئەی خانمی خێزانی... ئەویش لێرە نییە؟». کوڕەکە سەرسام سەیریکرد و گووتی « مەبەستت ئەفسانە خانە؟». زوهدی شازەمان سەری لەقاند و گووتی «مەبەستم ئەوە». وەڵامیدایەوە «نا... ئەفسانە خانیش ئەم شەو لێرە نییە».

مەبەستی بوو بزانێت ناوی چییە. ئێستا دەیتوانی لە ئەفسونی ناوەکەشی ڕامێنێت. ئەو شەوە زۆر بە زەحمەت خەوی لێکەوت، بۆ ڕۆژی دوایی کە بەئاگاهاتەوە سەرتاپای گیانی عارەق بوو، بیری نەدەهات خەونی بینیبێت، بەڵام هەستی بەسەر ئێشەیەکی کوشندەکرد، دوای دوشێکی خێرا، بە خۆی و قژە تەڕەکەیەوە گەڕایەوە بۆ سالۆنی ئوتێلەکە. خاوەن ئوتێلەکە بە چاکەتێکی ڕەشی کۆن و سمێڵێکی قەیتانی باریک و خەندەیەکی پیسەوە کە ددانە زەردەکانی پیستریان

کردبـوو، چاوەڕوانیدەکـرد. بـە دەنـگ و ڕوخسـاری کەسـێکەوە بەدبەختـی خەڵـک شـادومانیدەکات، گووتـی «یەکێـک لـە ئاسایشـەوە، هاتـووە بۆ لات». زوهـدی شـازەمان سـەیری سـاڵۆنەکەی کـرد و پیاوێکـی بچکۆلـە و پانـی لـە قاتێکی مەدەنـی ئوتوکـراودا بینـی. ئەفسـەرێک بـوو هەمـوو شـتەکانی پـان بـوون، لەشـی، سـەری، دەموچـاوی، لووتـی، دەسـتی، قوونـی. قاتێکـی نیللی و بۆینباخێکـی سـووری بەسـتبوو، گرێـی بۆینباخەکـەی تـا نزیـک خنـکان لـە ملیـدا توندکردبـوو. لـەو ئەفسـەرانەبوو کـە وادەزانـن هەندێـک لـە گەمـە منداڵانەکانیـان دەتوانێـت هەمـوو مەخلوقێـک بترسـێنێت، بێئـەوەی پێبکەنێت تەوقەیەکـی سـاردی کـرد و گووتـی « دوو چامـان بـۆ بهێنـن». زوهـدی شـازەمان بێئـەوەی هیـچ قسـەیەک بـکات لـە سـەر یەکێـک لـە قەنەفـەکان دانیشـت. کابـرا بـە دەنگێکـی قرخـن گووتـی «مـن نەقیـب سـەمەدم، لـە ئاسایشـەوە هاتـووم، یـەک دوو پرسـیاری چکۆلـەم هەیـە و دەڕۆم».

زوهـدی شـازەمان سـەیرێکی درێـژی کـرد و هیچـی نەگـووت. کابـرا وەک لـە نیـگا ڕاسـپۆتینییە تیـژ و بڕندەکانـی بترسـێت، سـەری دانەوانـد و گووتـی «کاک زوهـدی پێدەچێـت خەڵکێـک گومانـی لێتـان هەبێـت، ئـەو ڕاپۆرتانـەی لەسـەر تـۆ هاتـوون بـاش نیـن، کـەس نازانێـت تـۆ کێیـت، لـەم شـارەدا چـی دەکەیـت و لـەم ئوتێلـەدا ئیشـت چییـە؟». زوهـدی شـازەمان گووتـی «مـن زوهدیـم، زوهـدی شـازەمان، هیـچ ناکـەم، ئـەم شـارە شـاری منداڵیمـە، لێـرەدا ژیـاوم و گەورەبـووم، هاتوومەتـەوە دوای یادگارییەکانـم بکـەوم، بۆنیانبکـەم. لەبەرئـەوەی کەسـم نەمـاوە، خێزانێـک شـک نابـەم بچمـە لای، لـەم ئوتێلـەدا دابەزیوم».

کابـرا وەک بیـر لـە پرسـیارێکی قـووڵ بکاتـەوە، گووتـی «بەڵگـەت چییـە، کـە تـۆ خەڵکـی ئـەم شـارەیت؟». زوهـدی شـازەمان بـە جیدییەتێکـی زۆرەوە، بـە نیگایەکـی خاڵییـەوە لـە ئاسـەواری هـەر خەندەیـەک گووتـی «بەڵگـەم ئەوەیـە کـە زۆر ڕقـم لێیەتـی. مـرۆڤ ڕقـی لـە شـاری خـۆی

نەبێت ناتوانێت بیستوچوار ساڵ ئاوارەبێت، بیستوچوار ساڵ جێیبهێڵێت و بڕوات. ئەوانەی هەموو ژیانیان لەسەفەردان، کەسانێکن ڕقیان لە شاری خۆیانە».

کابرای ئاسایش کەمێک وەستا و گووتی«بەڵگەی ترت نییە؟».

زوهدی گووتی «بەڵێ، بەڵگەکەی ترم ئەوەیە، کە گەڕاومەتەوە. مرۆڤ چەندە دونیا بگەڕێت، دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ شاری خۆی، ئەوە ناشیرینترین نەخۆشی ئینسانە. مرۆڤ ناتوانێت ئەو شارەی بیربچێتەوە کە بە منداڵی تیاژیاوە، ئەوە ناشیرینترین دەردێتی».

کابرای ئاسایش وەک نرخێک بۆ قسەکانی دانەنێت، وەک نەیەوێت تێبگات، بەو لووت بەرزییە ئاسایی و هەمیشەییەی ئەفسەرانی ئاسایشەوە گووتی «دەمانەوێت ژوورەکەت بپشکنین؟». زوهدی بەسەرسوڕمانەوە کەمێک سەیریکرد و گووتی «لە جانتایەک زیاتر هیچی ترم نییە، لەو کاتەوەی لە سنوور هاتووم بەودیودا هەژدە جار پشکنیوتانە، دەتانەوێت کتێب لەسەر دەرپێ کورتەکانم بنوسن، بۆ هێندەی دەردەهێنن و دایدەنێنەوە؟». نەقیب سەمەد بۆینباخەکەی زیاتر توندکرد و بە ڕوویەکی گرژەوە گووتی « واجیبمانە». زوهدی بە هێمنی گووتی «گەر دەرپێ کورتەکانم خەتەرن، چاکترە جانتاکەم بەرن بۆ ئاسایش، من دێم لەوێ لە پێیاندەکەم». ئاسایشەکە بێئەوەی گوێ لە قسەکانی شازەمان بگرێت، دوای هەندێک چرپەچرپ لەگەڵ یاوەرێکی گەنجدا کە ئەوساتە خۆی کردبوو بە ژووردا، بێئەوەی هیچ بڵێ هەستا و لەگەڵ خاوەن ئوتێلەکەدا بە ئاڕاستەی ژوورەکەی ئەو ڕۆیشت. پاش ئیستێک بە دۆسییەی نامەکانەوە گەڕانەوە و نەقیب سەمەد لەو دیو دەرگای ساڵۆنەکەوە، وەک قسە لەگەڵ یەکێک لە وێنەکانی سەر دیوارەکەدا بکات گووتی «کاک زوهدی دڵتەنگ مەبە، تۆ هیچی دیاریکراوت لەسەر نییە، ئیشی ئاسایشە لەگەڵ هەندێک غەریبەدا پرسیار و وەڵامی هەبێت.

ئێستا دەنێرین ئەم نامانە کۆپیبکەن و تۆش دەتوانیت ئەو شتە بکەیت کە دەتەوێت». زوهدی گوتی «ئەو نامانە نامەی تایبەتین، منیش گوناهێکم نەکردوە، بەچ مافێک کۆپیدەکەن؟». نەقیب سەمەد لە کاتێکدا بەرەو دەرەوە هەنگاویدەنا، بە پێکەنینەوە گوتی « تۆ نازانیت، ئاسایش مافی هەیە هەموو شتێک کۆپیبکات. هەموو شتێک. هیچ کەسیش نییە لە دونیادا گوناهی نەکردبێت».

ئەو ڕۆژە کە نەقیب سەمەد ڕۆی، ئیدی نەگەڕایەوە، زوهدی شازەمان دڵنیابوو نامەکانی تیاچوون. هەستیشیکرد شتێک هەیە ئەو تێیناگات. دوو ڕۆژ تێپەڕی و هیچ شتێک ڕووینەدا، بەڵام ڕۆژی سێهەم دوو شتی گەورە لە ژیانی زوهدی شازەماندا ڕوویاندا کە سەرلەبەر ژیانیان گۆڕی.

## غەزەلنوس و ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان
## «کۆتایی ساڵانی حەفتا و سەرەتای هەشتاکان»

غەزەلنوس لەو ژوورە ئەفسوناوییەی عەشقدا، چەندین سندوقی پڕ غەزەلی دۆزییەوە. لە شەوێکی تاریکدا بە ئوتومبیلی هاوڕێییەک هەموو ئەو شیعرانەی گواستەوە بۆ ماڵی خۆیان، دەیەها سندوقی پڕ غەزەل، کە دەکرا مرۆڤ هەموو عومری خۆی لە خوێندەوە و تەفسیریاندا بباتەسەر.

بەهمەن ناسر لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ـەوە لەگەڵ غەزەلەکانی مەلای سوختەدا چووە ژووری، شەش ساڵ کتێب کتێب و دیوان و دیوان چەندێ دەرەقەت هات و چەندێ توانی ئەو غەزەلانەی لەبەرکرد. لەو شەش ساڵەدا کەمتر پەیوەندی بە دونیاوە هەبوو، لەو ساڵانەدا باوکی

بێئەوەی هیچ بڵێت، بێئەوەی ڕێگری لێبکات، بێئەوەی دەربارەی ئەو سندوقە سەیر و تۆزاوی و کۆنانە هیچ پرسیارێکی لێبکات لێگەڕا لەو ماڵەدا بژی، تەنیا جارێکیش لێی نەپرسی بۆ ناچیتەدەرێ، لێی نەپرسی لە چ گێژاوێکدا نوقمیت و ئەو کتێبە سەیرانە باسی چیدەکەن، بەڵکو وەک پاسەوانێک ئیشی ئەوەبێت لەقەڵایەکی کۆندا قارەمانێکی نەخۆش بپارێزێت، خزمەتیکرد. پەیوەندی ناسر سەعید بە کوڕەکەیەوە، لە هەموو شتێک دەچێت لە پەیوەندی باوک و کوڕ نەبێت، باوکێکی بێدەنگ کە جگە لەوەی دەیەوێت کوڕەکەی ئەو سەفەرە درێژە لەگەڵ کتێبەکاندا تەواوبکات خواستێکی تری نییە. ئەو هەموو ساڵە باوکە بێدەنگ و کوڕە شەیداکەی جگە لە هەندێک وشەی کەم، هیچی دی ناگۆڕنەوە، لەو ماوەیەدا ناسر سەعید ئیشی ئەوەیە هەر سەرچاوەیەک غەزەلنوس لە تێگەیشتنی قەسیدەکاندا پێویستی بێت، بیکڕێت و پەیدایبکات و بیهێنێتەماڵەوە. غەزەلنوس لەو شەش ساڵەدا وەک خۆی دەیگووت «بوو بە غەواسێکی ناو بەحری کلاسیک».

غەزەلنوس پێویستی بەو هەموو ساڵە هەبوو تا بتوانێت عاشق بێت، عاشق بەو مانایەی کە خۆشەویستی مرۆڤ بە هیچ مەرجێکەوە گرێ نەدەیتەوە. ئەو کاتەی غەزەلنوس لە خەڵوەتی خۆی هاتەدەرێ، سەردەمێکی سیاسی تاریک و ترسناک بوو، غەزەلنوس لە چەند مانگی سەرەتای خەڵوەتشکێنیدا یەکەمین ئەزموونی عەشقی خۆی ژیا. ئەو دەمودەست دوای شکاندنی خەڵوەت و کۆتاییهێنان بە گۆشەگیری، عاشقی کچێک بوو ناوی «نێرگز فورات» بوو. کچێکی قژ ڕەشی ئەسمەر بوو بە لێوێکی ئەستوور و جووتێ چاوی شینەوە، ئەوە یەکەمین عەشقی غەزەلنوس بوو.

بێئەوەی لە شتە بچوکەکاندا وێڵبین و سەروەر ونبکەین، دەبێت

بڵێین، سەرەتا غەزەلنوس هێزی غەزەلیاتەکانی خۆی لەگەڵ نێرگز فوراتدا تاقیکردەوە، کە دیارە وەک زۆربەی کچانی دڵ ناسکی ئەم شارە لەو دۆخە عەقڵی و ڕۆحییەدا نەبوو لە قووڵایی غەزەلەکان تێبگات. غەزەلنوسی دۆستمان سەرەتا دوای فێربوونی عەشق و مەستبوون بە ئەدەبیاتی ستایشی مەعشوق، دەیویست بە جۆرێک لە جۆرەکان بەو ڕێگایەدا بڕوات کە مەلای سوختە و بەهاربانو پیاڕۆیشتن، بەوەشدا خۆی بە بەرهەمێکی خەیاڵی دوو مەعشوقی خەیاڵی دەزانی، تەیکردنی ئەو ڕێگایەی ئاسان و بێگرێ دەبینی. بە کورتی لەو دەمەدا بەهمەن ناسر وەک زۆربەی شیعرشەیدایانی دونیا کە بەڕاستی دەچنە ناو بەحری عەشقەوە، ئەو هێزە ڕۆحی و ئامادەگییە ویژدانییەی تێدابوو چیرۆکێکی جاوید و شێتانەی ئەوین بژی. نێرگز فورات سەرەتا لەبەردەم ئەو جۆرە غەزەلە نەبیستراوەدا، بێئەوەی بزانێت غەزەل مانای چییە بووەهاوڕەوتی ئەو شیعرانە. هیچ ئافرەتێکی دونیا نییە بە غەزەل شادومان نەبێت، بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە تا چەند پێی مەستدەبیت و ئەو مەستییەش چەند دەتگرێت؟ زۆربەی ئافرەتان غەزەلیان تا ئەو شوێنە پێ قەبووڵە کە لەگەڵ هاتنەدی ئارەزووەکانی دیکەدا بێت. ئەو کچانەی عەشقیان تەنیا وەکو عەشق دەوێت، جنسێکی کەمن لە ئادەمیزاد. دەبێت بۆ ئینساف بڵێین ئەو جۆرە ڕەگەزە لە نێو پیاوانیشدا دەگمەن و کەم وێنەیە. ئەوە ڕاستییەکی تاڵ و پشتشکێنە بۆ خوداوەندە جۆراوجۆرەکانی عەشق گەر بزانن، عەشق بێهیچ یاوەرێک، وەک شۆڕەسوارێکی تاقانە بە دەفتەرێک لە غەزەلیاتەوە، وەک ئەسپسوارێک جگە لە تیری عاتیفە هێزی تری نەبێت، دیاردەیەکی کەمبین و فرە دانسقەیە. بەڵام غەزەلنوس جگە لەوەی ئیرسێکی گەورەی ئەدەبیاتی عەشقی بۆ بەجێمابوو، یەکێکیش بوو لەو شۆڕەسوارە تەنیایانەی لە هێزی ئەڤین بەولاوە هێزی تری نەبوو. ئێستاکێ زەحمەتە مرۆڤ بەتەواوەتی تێبگات کە لە چ ئان و

زەمانێکدا جۆرە عەشقێک هەبووە خاڵـی لـە هیچ نیازێک جگـە لـە خولیـای عەشـق خـۆی. پێدەچێـت لـە سـەردەمی زوودا، لـە ڕۆژگارە زۆر کۆنەکانـدا، دەور و زەمانێـک کـە دونیـا تاکـە تاکـە مەخلوقاتـی وەک لاس و غەزالـی دروسـتدەکرد، جـۆرە سـوچ و کەلێنێـک لـە سیسـتم و سروشـتدا هەبووبێـت، ئەمجۆرە عاشـقانە لێـوەی دزەیانکردبێتـە دونیـاوە. غەزەلنـوس سـەرەتا لـەو شاسـوارە کلاسیکییانە دەچێت کە عەشق بـە تەنیا دەخەنـە جەنگـەوە. کە لەگـەڵ نێرگـز فوراتـدا بـووە دۆسـت، جگـە لـە ئەڤیـن هیچـی تـری نەبـوو، لـە کاتێکـدا کچـەی بەسـتەزمان جگـە لـە عەشـق شـتی تریشـی دەویسـت، دەیویسـت ماڵـی هەبێـت، شـوویکات، منـداڵ دروسـتبکات و مێردەکـەی لـە پێشـی ماشـێنێکی بخـات و بیبـات بـۆ شـارانی تـر و زەوی و خاکـی دیکـەی نیشـانبدات. داواکارییە سـادە و دونیاییەکانی کچەکە، غەزەلنوسـی بەجۆرێکی سـەیر تووشـی نائومێـدی و پەشـۆکان کـرد، کـە شـێتانە و عاریفانـە لـە عەشـقدا نوقمبـوو. ئـەو خواسـتە سـەیرانەی نێرگـز فـورات غەزەلنوسـیان بـە جۆرێکـی سـەیر گێڕایـەوە بـۆ دونیـا، بـۆ سـەر زەمینـی شـتە بێڕەحمـەکان، بـۆ ئـەو شـوێنەی حەقیقـەت دەموچـاوی ناشـیرینی خـۆی لـە دەرەوەی هـەر فەنتازیـا و خەیاڵێـک نیشـاندەدات. دوورکەوتنـەوەی غەزەلنـوس لـە نێرگـز فـورات، دوورکەوتنەوەشـی بـوو لـەوەی خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـە گشـتی لـە خۆشەویسـتی یـەک ئادەمیـزادا کورتبکاتـەوە. هیـچ شـتێک لـەوە ترسـناکتر نییـە، مـرۆڤ تـەواوی خۆشەویسـتی خـۆی بخاتـە بەردەسـتی یـەک مرۆڤـەوە، یـەک مـرۆڤ کـە دواتـر دەشـێت تـەواوی ئـەو خۆشەویستییە وەک یاریچەیەکـی منداڵانـە تەماشـابکات و لـە باڵکۆنـی بـەرزی ماڵێکـەوە تورپیدات و بیشـکێنێت. خۆشەویسـتی سـامانێکی ئەوتۆیـە مـرۆڤ دەبێـت وەک چـۆن خەزنەیەکـی تـەلا بەسـەر زیـاد لـە کونـج و جێـگا و کەلێنێکـدا بەشـدەکات، دەبێـت لـە زۆر شـت و زۆر شـوێن و زۆر ئامانجـدا بیشـارێتەوە. پێدەچێـت غەزەلنـوس دوای خوێندنـەوەی مـەلای سـوختە، دوای قووڵبوونـەوە لـە مانـای

خۆشەویستیدا، دوای هەرەسی یەکەم ئەزموونی خۆشەویستی خۆی، لەو ڕاستییە تێگەیشتبێت کە لە عەشقدا ئەوەی بۆ مامۆستا ڕاستە بۆ قوتابی ڕاست نییە، مەلای سوختە ئەو ڕاستییەی فێری غەزەلنوس کرد کە هیچ شتێک لەسەر زەوی وەک عەشق جیاواز و فرەڕوو نییە. بەوەدا ئەڤین نە سەرچاوەیەکی خودایی و نە کانگایەکی ئەهریمەنانەی هەیە، سەنعەتێکە مرۆڤ دەبێت بە دەستی خۆی بیتاشێت و شێوەی بداتێ و بیخاتە جێگای خۆی، ئیدی بە ئەندازەی جیاوازی مرۆڤەکان، عەشقیش ڕەنگی جیاوازی هەیە. غەزەلنوس دوای نێرگز فورات لەو ڕاستییە تێدەگات، عاشق ئەو کەسە نییە کە مەعشوقەی خۆشدەوێت، هەموو ئادەمیزادێک دەتوانێت یەکێکی دی خۆشبوێت، هەموو مرۆڤێک دەشێت بۆماوەیەک عاشق بێت، هەتا ترسناکترین مرۆڤەکان دەشێت جارێک لە جاران عاشق بووبن. گرنگ ئەوەیە لە عەشقی یارەوە چۆن بەرەو عەشقی نەیار دەگوازیتەوە. گرنگ لە مەحەبەتدا ئەوە نییە مرۆڤ چۆن دەیبەخشێت بە یەکێک، گرنگ ئەوەیە چۆن دابەشیدەکات، عەشق وەک جۆگەلەیەک وایە گرنگ نییە تا بنی درەختێک ڕایکێشیت، گرنگ ئەوەیە وەک خەتێک بە ژێر هەزاران داردا بیبەیت، بە ناو دەیان پێچ و بەرەو هەزاران گیای پەشموردە و ڕووەو چەندین گوڵی سیس ڕایکێشیت، مەرج نییە هەموو درەختێک بزانێت چۆن ئاوی عەشق دەخواتەوە و هەموو گوڵێک بتوانێت بە خۆشەویستی بکرێتەوە. غەزەلنوس لەو باوەڕەدا بوو کە پەیوەندی نێوان ئەو و مەلای سوختە وەک پەیوەندی نێوان گوڵێک وایە کە تۆوی ئەڤینی هەڵگرتووە لەگەڵ بایەکدا کە ئەو تۆوە بە زەویدا دەبات. سوختە ئەو باغە گەورەیە بوو کە بێشومار تۆوی غەزەلی دروستدەکرد و بەهمەن ناسر ئەو بایەبوو کە دەبایە ئەو تۆوانە هەڵگرێت و بەدونیادا پەخشیانبکاتەوە. ئەو ڕۆژەی نێرگز فورات لەبەر شتگەلێک کە سەر بە باغی عەشق نەبوون، دڵی غەزەلنوسی شکاند و

عاتیفەی بیمارکرد، تێگەیشت، ئەو ناتوانێت بایەکی شێت بێت، ناتوانێت گەردەلوولێک بێت بێ هەق و بێ پرسیار عەشق پەخشان و تەخشان بکات. لەو ڕۆژەوە غەزەلنوس، مەلای سوختەی وەک ئەقلیدیسی موحیبەت تەماشادەکرد کە لە هەموو کتێبەکانیدا بیردۆزەکانی عەشقی نوسیوە، ئەو بیردۆزە زۆرانەی گۆشە جیاوازەکانی ڕۆحی ئینسانی تێدا پێواوە و هێڵە ئاڵۆزەکانی دەرونی تیادا نەخشکردوە. خۆشی بەو ئەندازیارە دەزانی کە دەبێت دەستپێبکات و شارێکی پڕ شوری موحیبەت لەو بیردۆزانە دروستبکات. بەڵام نەیدەزانی چۆن دەست پێبکات، گەر ئەو بایە و دەبێ تۆوی موحیبەت هەڵگرێت، چۆن دەبێت هەڵیبگرێت و لە کیس دونیای نەدات؟ گەر ئەو ئەندازیارە و دەیەوێت شاری موحیبەت دروستبکات، دەبێت لە ژێر چ ئاسمانێک و لە چ پارچە زەوییەکەوە دەست پێبکات؟. نێرگز فورات کە ژیانێکی کورت و پەیوەندییەکی تێپەڕ و زوومردی لەگەڵدا دروستکرد، هەر زوو ئاشکرابوو کە درەختێک نییە عەشق گەشەی پێبدات، زەوییەک نییە غەزەلنوس دەروازەی ئەو شارەی پێدروستبکات. غەزەلنوس ساڵانێک دواتر کە تەواوی گۆڕانکارییە ڕۆحییەکانی خۆی بۆ ماجیدی گوڵ سۆلاف باسدەکرد دەیگووت «من دوای نوشوستی یەکەم عەشقم تێگەیشتم، من مەلای سوختەنیم لە خەڵوەتە ئەبەدییەکەی خۆیدا، بەڵکو سوختەم کە دێتەدەرێ بۆ دونیا، سوختەم کە قاچ و دەست پەیدا دەکات و لەم دونیایەدا دەگەڕێت».

غەزەلنوس باوەڕی وابوو ئەگەرچی عەشق بەبێ خەیاڵ نەکردە و نەشیاوە، بە هەمان شێوەش خەیاڵ بەبێ عەشق ترسناک و کوشندەیە.

***

کەس بە دروستی نازانێت، کێ یەکەمجار قاچی بەهمەن ناسری بۆ

ناو ئەو یانەی مەی و شەرابنۆشینە ڕاکێشا، کێ بەهەمەنی کرد بە کڕیاری کۆڕی شەوانەی ئەو مامۆستا و فەرمانبەرە بچوکانە کە وێستگەی سەرەتای سەفەری دووردرێژی غەزەلنوس بوو بە جیهاندا. غەزەلنوس دوای جیابوونەوەی لە نێرگز فورات لەگەڵ هاوڕێیەکی چکۆلانەدا کە سمێڵێکی ڕەشی قۆقز و لووتێکی چکۆلانە و جووتێک چاوی زەردی هەبوو ئێواران لەو یانانەدا دەردەکەوت. لە گەنجێکی بێئەزموون دەچوو، بیەوێت شوێنێکی لە ڕیزی ئەوانەدا هەبێت کە خۆیان بە دانا و زانای هەموو شتێک دەزانن. غەزەلنوس هەر دەبایە لەوێوە دەست پێبکات، لە جیهانی ئەو مرۆڤە بێئومێد و بچوکانەوە کە ژیانیان مەستی و دیسانەوە مەستی و هەمیشە مەستی بوو. یەکەمین قەسیدەی ناو غەزەلیاتەکانی سوختەی بۆ ئەو پیاوە مەستانە خوێندەوە. سەرەتا چەند شەوێکی بێدەنگی لەو یانەیەدا بردەسەر، دواجار شەوێکی باران لە ژێر کاریگەری دەنگی لێزمە و بۆنی شەرابدا کەوتە سەر هەوای خوێندنەوەی یەکێک لە غەزەلەکان. کە دەستی بە ئیلقای چەند بەیتی یەکەم کرد، یاوەرە چکۆلانە و سەرزل و سمێڵ ڕەشەکەی باوەڕی نەدەکرد بەهەمەن شیعری وەها سەیر و نازک بزانێت، قەسیدەکانی هۆشی دەهێنایەوە بەر مردوو، هەستی وەها لەو مەستانەدا دەگێڕا دەیخستنە سەر جۆرە خەیاڵێک پێشتر تامیان نەکردبوو. ئەو شەوە باران بە جۆرێکی شێتانە دەباری، غەزەلنوس قەسیدەکانی دەخوێندەوە و پیاوە بێکەس و مەستەکانی شەو باڵیان دەگرت، وەک ئەوەی بفڕن لەگەڵ وشەکاندا تێکەڵ دەبوون و دەستیان دەجوڵاند، ئەویش بە وێنەی سەرەڕۆیەکی بێهۆش کە خۆشی لە دەرخستنی مەستی و شێتێتی خۆی ببینێت، وەک یەکێک چاکەتی ویقار داکەنێت و توڕیداتە ژێرپێی، بە هەموو هاوار و ناڵینی ناو غەزەلە ئاگرینەکانەوە هۆڵی گەرمی یانەکەی جێدەهێشت و بێهۆ، بێئەوەی کەس لە حیکمەتی ئەم شێتییە تێبگات، ڕایدەکردە ناو چیمەنی

حەوشەکەوە بۆ بەر باران. عومرێک بوو حەزیدەکرد شێتی خۆی لە بەر باراندا تاقیبکاتەوە. ئێستا شەوی ڕاکێشانی مەستی و بێهۆشی بوو تا ئەوپەڕی، دەیویست لە ژێر ئەم بارانەدا قەسیدەکانی خۆی بخوێنێتەوە و تەماشابکات چۆن وشەکانی خەڵک مەستدەکەن. یاوەرە سمێڵ ڕەشەکەی یەکەمین کەس بوو بۆ ژێر ڕەهێڵە و تۆفانی شەو دوایکەوت، بەڵام دەنگی غەزەلنوس هێدی هێدی هەموو مەستەکانی ڕاکێشا، ئەوانەش کە هێشتا کەمێک هۆش و ویقاریان مابوو خۆیان نەگرت و بەرەو ژێر بارانەکە دوایکەوتن. مەستەکانی ئەو شەوە، ئەو پیاوانەی قەسیدەکان خستبوونییە سەر هەوای عەشقێک کە لە ئەزەلەوە خودا لە دڵیاندا خەواندبووی، لە ژێر بارانەکەدا مەستانە دوای ئەو دەنگە گڕ و پڕ عەشقەی ئەو گەنجە تەڕە کەوتبوون کە جۆرە کلاسیکیاتێکی دەخوێند کەسیان نەیانبیستبوو، کەس بە تەواوەتی نازانێت کامە لەو فەرمانبەرە مەست و موچەخۆرە هەژارانە دەنگی بەرزکردەوە و هاواریکرد «غەزەلنوس بەردەوام بە، بەردەوام بە، من ئامادەم هەموو شەو تا هەڵهاتنی سوبح لە ژێر باراندا بوەستم و گوێت لێبگرم».

ئەوە یەکەمجار بوو مەخلوقێک بەهمەن ناسر بە «غەزەلنوس» بانگبکات. پێشتر هەتا بەهمەن ناسر خۆشی ناوی غەزەلنوسی نەبیستبوو. ئیدی لەو شەوەوە کەس نەیپرسی ناوی ئەم کوڕە شەیدایە چییە کە بەحرێک لە کلاسیکیات لە سینەیایەتی، لەو بەر بارانەدا بەهمەن ناسر مرد و غەزەلنوس لەدایک بوو. لەو ڕۆژەوە بە «غەزەلنوس» ناسرا و بەو ناوەوە بانگیاندەکرد، لەگەڵ تێپەڕینی کات و بەسەرچوونی زەمانیشدا ناوی ڕاستەقینەی خۆی بوو بە جۆرە یادگارێکی کۆن و شێوە مێژوویەکی دێرین کە خۆی نەبێت کەس یادی نەمابوو. دەبێت بڵێین کە بەهمەن ناسر کاتێک ئەوەی قەبووڵکرد فەرمانبەرە شەونشین و موچەخۆرە شەرابپەرست و مامۆستا مەیزەدەکان بە غەزەلنوس بانگیبکەن لە قووڵایی

دڵیدا دڵنیابوو، ئەو دەرکەوتەیەکی دیکەی مەلای سوختەیە. لەو ڕۆژەوەی لەو ژوورە تەلیسماوییەی عەشق هاتەدەرێ، دڵنیابوو مەلای سوختە بە هەموو هێز و تینوتاوی خۆیەوە لە ژێر پێستی ئەودا جێگیربووە، ئەو شەش ساڵەش کە لەگەڵ قەسیدەکاندا ژیا، بە جۆرێک لە وشەکان و بەیتەکاندا ونبوو، خۆی تەنیا وەک پاسەوانی خەزنە نوسراوەکانی مەلا نەدەبینی، بەڵکو خۆی بە هەڵگری ڕۆحیانەتی ئەو دەزانی. ئەو کوڕی مەلای سوختە نەبوو، ئەو خودی مەلای سوختەبوو، ئەو کوڕی بەهاربانو نەبوو، بەڵکو خودی بەهاربانو بوو.

لە ڕیزی ئەو موچەخۆرانەدا کەسانێکی لێزان و شارەزا لە کلاسیکیاتدا هەبوو کە ئەو قەسیدە سەیرانە خستنییە سەر خولیای دۆزینەوەی نوسەری ڕاستەقینەی ئەو بەیتانە. لە کتێبخانە کۆن و لە بەیازە دڕاوە دێرینەکاندا کەوتنە پشکنین و هیچیان دەست نەکەوت، دواتر یەک دوو نمونەی قەسیدەکان کەوتە بەر دەستی ئەو دکتۆرانەی زانکۆ کە ئیدیعای شارەزابوونیان لە کلاسیکیاتدا دەکرد، ئەوانیش شتێکی ڕۆشنیان لێدەرنەهێنا و قسەیەکی ڕوونیان دەربارەی نەبوو. کەس باوەڕی نەدەکرد ئەو شاکارە قووڵانە دەستکردی گەنجێکی وەهابێت، هەموو خۆیان دەجەڕاند لە بەیازێکدا، لە جێگایەکدا سەرچاوەکانی بدۆزنەوە. بەڵام هەرچییەک بێت، ئەو شەوە غەزەلنوسی گۆڕی بۆ ئەو ڕۆحە ئاوارەیەی ئیرسی عاشقە خەیاڵییەکانی بە زەویدا دەگێڕا. لەو یانە چکۆلانەیەی فەرمانبەراندا، شەو دوای شەو هەمووانی مەستدەکرد. ئەو موچەخۆرە بەستەزمانانە لە غەزەلەکانی ئەودا بە خەیاڵ ئەو سەرزەمینی عەشقە دەژیان کە بەڕاستی نەیانبینیبوو. یەکەمین گوێگران و عاشقانی ئەو غەزەلە سیحراویانە، ئەو سەرخۆش و عارەقخۆرانەبوون کە خێزان و دایک و باوک نەفرەتیان لێکردبوون، ژنەکانیان بێنرخ و هیچ تەماشایاندەکردن،

منداڵەکانیان لێیاندەترسان و قیژیان لە بۆنیان دەهاتەوە، شەوان کە بە بۆینباخە خوار و دەمە لیکاوی و چاوە گێژەکانیانەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵێ، هەمووان وەک جانەوەرێک سەیریاندەکردن کە شایستەی ڕێز نیین. بەڵام لە نێو ئەو مەخلوقە نەفرەت لێکراوانەدا بوونەوەری ئەوتۆ جوان هەبوو کە غەزەلنوسیان سەرسامکرد، ئەو ماوە کەمەی ئەو لەگەڵ پیاوە مەستەکاندا بردییەسەر، سەرەتای مامەڵەکردنی ئاڵۆز و پڕکێشەی غەزەلنوس بوو لەگەڵ وێنە بێشومارەکانی مرۆڤدا. زۆربەی ئەو فەرمانبەرە چاکەتخوار و ڕیش هاتوو و ددان زەردانە، زۆربەی ئەو پیاوە شێواو و نارێک و ئەلکهولیکانە کە بە ڕوخسار و بۆن و دەنگ لە مەخلوقاتی ترسناک دەچوون، لە ناوەوە مرۆڤی نائومێد و زوڵم لێکراو و شکستبوون کە بچوکترین غەزەل دەیخستنە جۆش و کەمترین سۆز دەیخستنە گریان.

لە ڕۆژگاری شەڕی هەشت ساڵەی ئێراندا «ئەو شەڕەی ڕوخساری جیهانی بۆ هەتاهەتایە گۆڕی»، غەزەلنوس کۆڕ و کۆبوونەوە بەناوبانگەکانی خۆی گێڕا و گەشتە بەناوبانگەکانی خۆی ئەنجامدا، لەو کۆڕانەدا غەزەلەکانی مەلای سوختەی دەخوێندەوە. کاریگەری شیعرەکان بەجۆرێک بوو خەڵکی لە هۆش دەبرد. وەک یەکێک لە گەورەترین غەزەلنوسانی گەورەی مێژوو، ناو و ناوبانگی بە نێو خەیاڵبازان وشیعردۆستاندا ڕۆیشت. لەو کۆڕانەوە پەیوەندی بە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانەوە دروستکرد، سەیری لێدەهات ئەو هەموو ڕۆحە خەیاڵپەروەرە لەو شارە تاچیز و ناشادەدا هەبێت، بە دیوانەکانی غەزەلەوە دەچووە سەر سەکۆکان و غەزەلە سیحراوییەکانی دەخوێندەوە، شیعرەکان توانای عەشق و خەیاڵیان لە مرۆڤدا بێئەندازە گەورەدەکرد، لە سەر هەر سەکۆیەک دادەبەزی، گەنج و پیرە خەیاڵپەروەرەکان گەمارۆیاندەدا، ئەو کەسانە دەوریان دەگرت کە

تەنیا دوای بیستنی ئەو شیعرانە تێدەگەیشتن عاشقن، ئەوانەی شیعرەکان بەجۆرێک مەستیدەکردن دەم و دەست ئامادەبوون تێشوو بۆ سەفەری خەیاڵ ئامادەبکەن و بەرەو سەر زەمینی پەنهان بڕۆن و نەگەڕێنەوە. لەو کۆڕانەوە، جەمعییەتی عاشقە خەیاڵییەکانی ناسی، ئەو مرۆڤانەی سەرتاپا عەشقبوون بەڵام مەعشوقەیان نەدەدۆزییەوە. هیچ شوێنێک لە دونیادا بە ئەندازەی ئەو شارە عاشقی بێ مەعشوقی تێدانەبوو، ئەو مرۆڤانەی هەستیاندەکرد تواناییەکی بێسنووری عەشقیان تێدایە، بەڵام هیچ مرۆڤێک لێیان وەرناگرێت و کەس پێویستی بە میهر و مەحەبەتی ئەوان نییە. یانەی دەنگخۆشە سیحراوییەکانی ناسی، ئەوانەی کاتێک گۆرانیان دەچڕی تەواوی شتە حەقیقییەکان دەبوون بە سێبەر و لەبری ئەوان زەوی تر و خەونی تر و نیگاری تر لە خەیاڵدا سەوزدەبوو. عاشقە ئەبەدییەکانی ناسی کە مردن و خۆشەویستیان لە هاوکێشەیەکی سەیردا پێکەوە گرێدەدا، بووە هاوڕێی ڕاوچی پڵنگە خەیاڵییەکان، بووە دۆستی ئەو ماسیگرە خەیاڵیانەی دوای ماسییەکی سەوز کەوتبوون کە هیچ تۆڕێکی ئاسایی نەیدەتوانی ڕاویبکات، لە هەموو شوێنێک غەزەلەکانی خۆی دەخوێندەوە، لە جەنگەڵەکاندا، لە دارستانە دوورەکاندا، لەسەر بەلەمەکان، لە ناو جووتیارەکاندا. لەهەر شوێنێکیش ئەو غەزەلی خۆی چڕیبێت، لەمپەر و ئەستەنگە سەختەکانی بەردەم خەیاڵ شکاون و مرۆڤەکان شتگەلێکیان بینیوە کە پێشتر نائاشناو و نەبینراوبووە. بە هێزی ئەو قافییە سیحراویانە، بە هێزی ئەو وشانە، ماسیگرەکان ئاسانتر بە ڕووی ئاوی خەیاڵدا دەڕۆیشتن، کوچە نهێنییەکانی دارستان پتر ڕوناک دەبوونەوە. هەر ڕۆحلەبەرێک گوێی لە غەزەلەکان دەبوو، وەک نامەیەکی نهێنی و ئاماژەیەک لە قەدەرەوە تێیدەگەیشت، وەک ئەوەی خەیاڵی ناو ئەو قەسیدانە بانگەوازێکی خودایی و ئیلهامێکی ئاسمانی بێت بە تایبەت بۆ ئەو هاتبێتەخوار. لە ساڵانی شەڕدا غەزەلنوس شارە

و شار و کوچە و کوچە گەڕا، ئیشی ئەوە بوو ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان بدۆزێتەوە، ئەو مرۆڤانەی لە دونیای ڕاستیدا هیچیان چنگ نەدەکەوت و ئیدی بەرەو زەریای بێسنووری خەیاڵ دەڕۆیشتن. تۆڕێکی گەورەی لە نێوان ئەو مرۆڤە سەیرانەدا دروستکرد، زەوی و زەمانە جیاواز و پارچەپارچەکانی خەیاڵی لەیەک نزیککردەوە، هەندێجار دەیویست هەموو سەر زەمینە خەیاڵییەکان بدات لە یەک، دارستانە خەیاڵییەکان و باغە خەیاڵییەکان بکات بە یەک هەرێم، جۆبارە چکۆلەکانی خەیاڵ بخاتە سەر یەک و ڕوباری ئەفسانەییان لێدروستبکات. خەیاڵ لەو سەر زەمینەدا، کۆمەڵێک هەرێمی پەرتەوازە و جیاواز و دوور لە یەکبوو، پڕبوو لە ترس، لە کوچەی تاریک و نەدۆزراوە، لە خواستی نهێنی کە غەریزە ڕەشەکانی مرۆڤ دەیانجوڵاند، ئەو ویستی بیانگۆڕێتە سەر ڕێگایەکی کراوە و ناکۆتا بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێت بێسنوور بە خەیاڵدا سەفەربکەن. قەسیدە خەیاڵییەکانی مەلای سوختە وەک چرای سەر منارەیەکی بەر دەریا وەهابوو، کە لە هەموو زەمین و زەمانێکەوە کەشتی ڕادەکێشا، شەوقێکی هێند بە تینی هەبوو، ڕۆحلەبەرە خەیاڵییە خەوتووەکانی لە قووڵاییە هەرە دوور و تاریکەکاندا لە خەو هەڵدەستان. بەڵام دەبێت بڵێین، مرۆڤ گەر خۆی دڵێکی پڕ خەیاڵی نەبایە لە غەزەلنوس تێنەدەگەیشت، غەزەلەکانی ئەو تەنیا کاتێک هێز و ئاسەواریان دەردەکەوت کە ڕۆحلەبەرێکی خەیاڵی دەیبیستن.

لەو دەور و زەمانەوە غەزەلنوس وەک پیاوێکی ڕیشن، بە قژێکی لوول و دەروێشئاساوە، بە دەستێک جلی زەیتونی کاڵەوە، بە هەگبەیەکەوە کە هەندێک کۆپی دیوانەکانی غەزەلی تێدابوو دەگەڕا. لە سەر سنوورەکان تێکەڵ بە بەتالیۆنی ئەو پێشمەرگە خەیاڵیانە بوو کە بۆ کوردستانێکی خەیاڵی شەڕیاندەکرد، کوردستانێک تەنیا لە خەوە سەیر و ڕوناکەکانی ئەواندا هەبوو، ئەو شەهیدە غەمگین و خەیاڵیانەی ناسی کە بۆ باغێک

دەگەڕان ئاشتی و ئاسوودەییەکی ئەبەدی تێدابێت. شیعری بۆ ئەو باغەوانانە خوێندەوە کە درەختەکانیان میوەی پڕ ڕۆشنایی دەگرت، هەموو ئەو ڕۆحلەبەرانەی ئەو لەو گەشتانەدا ناسینی، کەسانێک بوون وەک خۆی، نیوەیان لە حەقیقەت و نیوەیان لە خەیاڵ دروست بووبوو.

غەزەلنوس ڕۆژێک بە دەم غەزەل خوێندنەوەوە گەیشتە دەشت و تەلانێکی سەوز، وەک دەرویشی دەوروزەمانە دوورەکان، گۆپاڵێکی درێژی پێبوو، بە خۆی و هەگبەیەکی کۆنەوە بەڕێگادا دەڕۆیشت، ریشی تا سەر سنگی هاتبوو، قژێکی لوول و قەترانی تاسەر شانی بەردابووەوە. لە ناکاو ژنێکی بەتەمەن هاتە سەر ڕێگای و گووتی « ها غەزەلنوس بۆ کوێ دەچێت؟»، غەزەلنوس بەدەستووری پاڵەوانی ناو حیکایەتە ئەفسانەییە کۆنەکان گووتی « داپیرە، چۆن دەزانیت ناوم غەزەلنوسە ئاوهاش دەزانیت بۆ کوێ دەچم». پیرێژنەکە گووتی «کەواتە دوامکەوە، ژنێک هەیە ئیحتیاجی بە هاودەستی تۆیە». غەزەلنوس چوار شەو و چوار ڕۆژ بە بێدەنگ دوای ئەو داپیرەیە کەوت. بە خاکی گەلێک سارد و بەسەر زەمینی زۆر گەرمدا ڕابووردن، بە باغی گەلێک سەوز و بە چیمەنی زۆر پەژموردە و بێئاودا تێپەڕین، بە گونددا ڕابووردن نوقمی وشکەساڵی بوو، بە ئاوەدانی بە خوڕەم و پڕپێزیشدا گوزەریانکرد. دواجار گەیشتنە گوندێکی زۆر بێدەنگ و فەرامۆشکراو، گوندەکە تەنیا لە چەند ماڵێکی چکۆلانە و نزم و داڕوخاو پێکهاتبوو. لە یەکێک لەو ماڵانەدا غەزەلنوس ژنێکی چکۆلانە و نەخۆشی بینی لەسەر جێگایەکی چکۆلانە و پەڕپووت کەوتبوو. دۆشەکێکی دڕاو، لێفەیەک بە متیلێکی بۆر و سەرینێک لە سوورمەی مۆر و هەڵوەشاو، هەموو شتێک سارد و کۆن و بێڕەونەق دەینواند، پیرێژنەکە گووتی «تۆم هێناوە بۆ کۆمەکی ئەم ژنە. ئەمە زەیستانێکی نەخۆشە، ڕەنگ و ڕووی دیارە کە دەمرێت. هەفتەیەکە منداڵێکی زۆڵی بووە، برازای منە، باوکی دەمێکە ئەمری

خـوای جێهێنـاوە، خوشـکێکی بەشـووی هەیـە، مێردەکـەی بزانێـت ئەویشـی پێـوە دەکوژێـت، حـەوت ڕۆژە کوڕێکـی بـووە، بەرلـەوەی بمرێـت ویسـتی تـۆ ببینێـت، لەترسـی خوشـکەکەی نەبووایـە، سەرشـینی وام نەدەگرتـە خـۆم، قەحبـەی وا».

ئافرەتێکـی گەنـج بـوو، ئاسـەواری جوانییەکـی مـردوو بـە ڕوخسـارییەوە بـوو، جوانییـەک لەوانـەی ژیانـی سـەخت و کارەسـاتی لـە ناکاو دەیانکوژێت. گەرچـی جلـی کیژێکـی گوندەکـی لەبەردابـوو، بـەڵام خانمێکـی کەساسـی شاری بـوو، ڕەنگـی بەجۆرێکـی ترسـناک زەردبووبـوو، لـە ژێـر لێفەکەیـەوە سـەری دەرهێنـا و سەرسـامانە گووتـی «غەزەلنـوس تـۆ لێرەیـت، تـۆ لێرەیـت، چـۆن لێرەیـت؟». وا قسـەیکرد وەک ئـەوەی زۆر لـە مێژبێـت غەزەلنوس بناسێت. لەسـەرەخۆ و بەزەحمەتێکی زۆرەوە خـۆی لـە جێگاکـە ڕاستکردەوە و گووتـی« لـەو باوەڕەدا نەبـووم ڕۆژێـک لـە ڕۆژان بتبینمەوە». غەزەلنـوس بـە وردی سـەیریکرد، جگـە لـە ژنێکـی نەخـۆش و ڕەنگزەرد کـە هیـوای ژیانـی لێناکرێـت هیچـی دیکـەی تیانەبینـی، بـە ئەندازەیـەک لاوازبـوو ئێسـکەکانی پەنجـە و مەچەکـی یەکەیەکـە دەژمێـردران، گووتـی «خانـم تـۆ ئێجـگار نەخۆشـیت، دەبێـت بتبەیـن بـۆ بیمارسـتان، بـۆ لای پزیشـک، بـۆ لـەم ژوورە تاریکـەدا کەوتوویـت؟». کچەکـە بـە زەحمـەت هەناسـەی بـۆ دەدرا. بـە هێمنـی وەڵامـی غەزەلنوسـی دایـەوە «نا، ناکرێـت، ناتوانـم بچـم بۆ خەستەخانە، نامەوێت پزیشـک ببینـم، من کەسـێکی مـردوم، دڵنیـام». غەزەلنـوس گووتـی «چـۆن دڵنیایـت، چـۆن، هیـچ کەسـێک نابێـت ئاسـان تەسـلیمی مـردن بێـت. تـا تـۆ دەژیـت و هەناسـەدەدەیت شـتێک نییـە نـاوی مـردن بێـت». کچەکـە بەجۆرێکـی سـەیر دەلـەرزی، وەک چەندیـن ڕۆژ نانـی نەخواردبێـت لاواز و بێگیـان دەینوانـد. بـە کەساسـی گووتـی «غەزەلنـوس پێـم خـۆش بـوو هاتیـت، لـەو بڕوایـەدا نەبـووم پـورم بتدۆزێتـەوە، مـن دوو

ساڵ لەوەوبەر لە كۆڕێكدا گوێم لە غەزەلەكانی تۆبوو، ئەو غەزەلانەی تۆ ژیانی منیان گۆڕی» . غەزەلنوس وەک سەبری ئەو قسانەی نەبێت وەڵامیدایەوە «تۆ زۆر نەخۆشیت، زۆر، دەبێت بچیت بۆ لای پزیشک، هیچ قسەیەک نەکەیت، هەستیت و من بتبەم بۆ لای پزیشک» . کچەکە گووتی« دەتەوێت ئابڕووی هەموو خزمەکان و خوشکەکانم بەریت، ئەوکات هەموو دونیا دەزانێت من منداڵێکی بێباوکم بووە، منداڵێک باوکی نییە، دوائەوە من بڕۆم بۆلای پزیشک و نەڕۆم هەر مردوم. غەزەلنوس، من مردوم، من شوێنێکم لەم دونیایەدا نەماوە، گەر زیاتر بژیم نازانم چیبکەم، تاکە ئومێدێکم ئەوەیە پەناگایەکی باش بۆ کوڕەکەم بدۆزمەوە» . غەزەلنوس بە ناڕەحەتییەوە، پرچە دەروێشانەکەی بادا و گووتی«تۆ دەڵێیت چی، چۆن دەبێت وا قسەبکەیت، چۆن دەبێت وەها حورمەتی ژیانی خۆت بگریت. نابێت وا بڵێیت، من دەتوانم باوكی ئەو منداڵە بدۆزمەوە، بیدۆزمەوە و وابکات منداڵەکەی خۆی بەخێوبکات، وابکەم خۆی چاکبکات و تۆ بهێنێت و پێکەوە بژین» . ژنەکە کەمێک پاڵینا بە سەرینە مۆرەکەوە و گووتی «غەزەلنوس من چەندین ڕۆژە مردوم، بەڵام نەمویست دونیا جێبهێڵم، بۆ ئەوەی تۆ ببینم، هیچ کەس ناتوانێت باوکی ئەو منداڵە بدۆزێتەوە، هیچ کەس، لەبەرئەوەی من لەگەڵ یەکێکدا دروستمکردوە کە ئاگای لێ نییە، لەگەڵ کەسێکدا لە خەیاڵدا لەگەڵیدا خەوتووم، تەنیا لە خەیاڵدا، ئەو ئاگادار نییە. من و ئەو سێ ساڵ یەکترمان خۆشویست، بەڵام پێکەوە نەخەوتین، قەت پەنجەمان بەر پەنجەی یەکتری نەکەوت. من سوێندت بۆ دەخۆم کە پێکەوە نەخەوتووین، بەڵام کەس باوەڕم پێناکات، من هەموو شەوێک بە خەیاڵ لەگەڵیدا بووم، هەموو شەوێک، ئەم کوڕە بەرهەمی خەیاڵی منە، من غەزەلەکانی تۆم دەخوێندەوە و بیرم لەو کوڕە دەکردەوە، هەموو شەوێک بەر لەوەی بخەوم ئەو غەزەلانەم دەخوێندەوە، من زیاد

لە هەفتەیەکە مردوم، دەستم لێبدە، من وەک ئاسن ساردم، گەر بمبەیت بۆ لای پزیشکەکان دەبیتە گاڵتەجاڕ، تێدەگەیت، من ئێستا لاشەیەکم حەوت ڕۆژە ماڵاوایم لە دونیا کردوە».

غەزەلنوس دەستی دا لە دەستی کچەکە، لاشەیەکی سارد و بێخوێن بوو. وەک باوەڕنەکات گوتی «تۆ منداڵێکت بووە خۆشەویستی دروستیکردوە، عەشقێکی گەورە دروستیکردوە. خانم تۆ ژنێکی مەزنیت دەتوانێت شورای موعجیزە بشکێنێت». کچەکە سەیری غەزەلنوسی کرد و سەری نزیککردەوە و گوتی «ئەو غەزەلانە وادەکەن مرۆڤ شێتبێت، مەدهۆشانە عاشق بێت. غەزەلنوس لەم دونیا گەورەیەدا تەنیا تۆ تێدەگەیت من باسی چیدەکەم، تەنیا تۆ دەتوانیت ئەو منداڵە بەخێوبکەیت، ئەوە منداڵی غەزەلە، ئەوە منداڵی تۆیە، نابێت جێیبهێڵیت». دەنگی ژنەکە پاڕانەوەیەکی قووڵی تێدابوو، نەیدەزانی ئەو خانمە بەڕاستێتی یان هەردووکیان لە خەوندان، نەیدەزانی ئاخۆ ئەوە خۆیەتی تێکەڵ بە خەونی ئەو ژنەبووە، یاخود ئەو ژنەیە هاتۆتە خەونی ئەو، بەڵام دڵنیابوو یەکێکیان لە دونیای حەقیقەت و ئەویتریان لە دونیای خەیاڵدان. غەزەلنوس گوتی«بەڵام خانم من دەتوانم چی بۆ ئەو منداڵە بکەم، چی؟». کچەکە بە غەمگینی گوتی «نازانم، بەڵام گەر تۆ ئەو منداڵە هەڵنەگریتەوە دەمرێت، لە تۆ زیاتر هیچ کەسێکی نییە، نە باوکی هەیە نە دایک، ئەم پیرێژنە ئەو زەحمەتەی کێشا و هات بەدوای تۆدا تا تۆ ئەو منداڵەی لە کۆڵبکەیتەوە. من چوار مانگە لە شار ڕامکردوە و هاتووم بۆ لای ئەو... چوار مانگە». غەزەلنوس گوتی«ئەو لە هەر کەس باشتر دەتوانێت منداڵەکە بەخێوبکات، من دەتوانم کۆمەکیبکەم، دڵنیابە من کۆمەکیدەکەم». کچەکە چپاندی «بێدەنگ بە، بێدەنگ، گەر بزانێت تۆ منداڵەکە نابەیت دەیخنکێنێت، تێدەگەیت، بێدەنگ بیت باشترە، من هەفتەیەکە شیری مردوو بەو کوڕە دەدەم، شیرێکی خەیاڵی

لەم مەمکە بێڕۆحەم بۆ ئەوەی بژی. ئێستا بزانێت، تۆ ئەو کوڕەت ناوێت دەیکوژێت، ئەمشەو دەیخنکێنێت و دەینێژێت، ئەوە پورمە، چوار مانگە دەیەوێت من بکوژێت، تێدەگەیت، ئەو کوڕە ببە و بڕۆ. تێدەگەیت ببیە و بڕۆ». غەزەلنوس، جارێکی دی دەستی لە دەستی ئەو کچەدا و بە ئەسپایی گوتی «تۆ بەڕاستی مردویت، هەست بە ترپەی دڵت ناکەم، هەستی پێناکەم». کچەکە دەستی ڕاکێشا و گوتی «غەزەلنوس وەرە گوێ لە دڵم بگرە، وەرە و گوێی لێبگرە». غەزەلنوس سەری نا بە سنگی ئەو کیژەوە و هاواریکرد«خوای گەورە، خانم تۆ جەستەیەکی سارد و سڕیت، سارد و سڕ». کچەکە بە کەمێک توڕەییەوە گوتی « پێویستە ئەو منداڵە ڕزگاربکەیت، ئەو منداڵە چاوەڕوانی تۆیە، تێناگەم بۆ لەوە تێناگەیت. دوائەوە تۆ دەبێت ئەو منداڵە ببینیت، دەبێت ببینیت، پوریێ پوریێ، پوریێ». بە دەنگێکی زۆر بەرز کە لە دەنگی مردوو نەدەچوو، بانگی لەپیرێژنەکە کرد. داپیرە مرچ و مۆنەکە وەک ئەوەی گوێی لە هەموو قسەکان بووبێت بە خۆی و مەلۆتکەیەکی بچوکەوە هاتە ژووریێ، منداڵەکەی خستە باوەشی ئافرەتەکە و گوتی «منداڵەکەت بگرە، برسییەتی. داڕزێی بۆ چ دایکێکیت، کوڕەکە برسییەتی». منداڵێکی چکۆلانەی فریشتەڕەنگ بوو، پێستێکی سپی و جووتێ چاوی چکۆلانە و قژێکی نەرم. بەپێچەوانەی دایکەکەوە لە منداڵێکی برسی و ماندوو نەدەچوو، پێدەچوو هەر ئێستا لە ڕووبارێکی پاکدا شۆرابێت. غەزەلنوس کە بینی لە دڵی خۆیدا گوتی «وادیارە لە باغێکی سیحراوییەوە هاتووە». کە گرتی بەدەستییەوە هەستێکی سەیری هەبوو، وەک ئەوەی ئەو ساتە ژیابێت، وەک ئەوەی پێشتر بە جۆرە ساتێکی وەهادا ڕابوردبێت، وەک وشەکانی مەلای هاجەر لە ناکاو بگەڕێنەوە خەیاڵی و لە ڕۆحیدا دووبارە بدرەوشێنەوە. بە پەلە مەلۆتکەکەی کردەوە، ویستی بە ڕووتی تەماشایبکات، ویستی دەست لە پێستە سپی و ناسک و سیحراوییەکەی

بدات. لەو کاتەدا سنگی منداڵەکەی بینی، موچڕکێکی قووڵ و تەزوویەکی سارد بە گیانیدا تێپەڕی، نەدەیزانی هەڵەیە یا ڕێشکەو پێشکەی چاو، ڕاستە یان خەیاڵێکە زادەی ماندووبوونێکی زۆر و کەمخۆراکییەکی درێژە، بەڵام بە ڕۆشنی دەیتوانی بیبینێت، بە ڕۆشنی. بەیتێک شیعر کە وەک برینێکی قووڵ لەسەر سنگی ئەو کۆرپەیە هەڵکەنرابوو:

ئەی تیفلی ڕەش، ئە تۆ گوڵ بـــوویت ئە من سووت
ئەی ناتیجی غەزەل، لە من عەشـــق و لە تۆ ڕووت
تۆ بەرهەمی شمشاڵی خەیاڵی، بەرهەمی ئەنغامی وجود
زاهیر بە وەکو باغ و دەرکەوە وەکو یاقـــووت

ژنە گەنجەکە ئاگاداری سەرسوڕمان و حەپەسانی غەزەلنووس بوو، سەیریکرد و گووتی « ئێستا دەبینیت، ئەمە برای تۆیە، برای تۆ. بەڵام تۆ دەتەوێت فرێی بدەیت. ئەمە لە تۆوە نزیکە، لە تۆوە نزیکە، چەند خۆت لە خۆتەوە نزیکیت، هێندە لە تۆوە نزیکە». غەزەلنووس بۆ ئێستێک وەک تاساو وابوو، وەک ئەوەی دونیا لەدەوری خول بخوات، وەک کۆی شتەکانی چواردەوری بڕوخێن، گێژ و سەراسیمە سەیری ئەو ئافرەتە نەخۆشەی کرد و هیچی نەگووت. ژنە گەنجەکە منداڵەکەی لە دەست غەزەلنووس وەرگرت و دەستیکرد بە پێچانەوەی مەلۆتکەکە و گووتی « ئێستا تێدەگەیت، تۆ بەتەنها نیت، دەبینیت خەڵکانێکی تر هەن خەیاڵ و غەزەل تێکەڵاوی هەموو ژیانیان بووە، لەوانەیە تۆ نەتدیبێت، بەڵام جنسێک لە مرۆڤ هەیە، کە وەک تۆ دەستکردی غەزەلن، چەند وەختە بە زەویدا دەگەڕێیت و مرۆڤی خەیاڵی دەبینیت، بەڵام ڕۆژێک هەستت نەکرد خەڵکێکی دی هەن وەک خۆت منداڵی غەزەلن، عەشق

دروستیکردون. مرۆڤ کە بەڕاستی نەتوانێت لەگەڵ مەحبوبی خۆیدا بخەوێت، باغێکی سیحراوی و خەیاڵی هەیە ڕوودەکاتە ئەوێ و لەوێ مەعشوقی خۆی دەبینێت. بمبورە غەزەلنوس، مرۆڤ ئەگەر بێمێشک نەبێت لەوە تێدەگات. خەڵکێک هەن بێمێشکن، گەمژەن، وادەزانن کە دوو دڵدار بەڕاستی پێکەوە نەخەوتن، ئیتر پێکەوە نەخەوتوون. ئەوە درۆیە، هەموو عاشقەکانی دونیا بە خەیاڵ پێکەوە دەخەون، بەڵام بمبورە غەزەلنوس، هەندێجار هەستدەکەم تۆش زۆر گەمژەیت، هێندە گەراویت ناتوانێت تێبگەیت. هەموو کەسێک شوێنێکی خۆی هەیە، لەوێ هەموو ئومێدەکانی دێنەدی، من لەوێبووم، تێدەگەیت سەدان شەو لەوێ بووم، سەدان شەو، سەدان شەو. بەڵام تۆ زۆر ماندوویت، غەزەلنوس زۆر ماندوویت. تۆ ئەم ماوەیە زۆر شوێنت بینی، بینینی زۆر خەیاڵت ماندوودەکات... دەبێت ئاگات لە خۆت بێت».

بە هێمنی سەری بەرزکردەوە و گووتی «ئێستا ئەم منداڵە لە تۆ زیاتر کەسی نییە، ناتوانێت تا هەتاهەتایە دانیشێت و بیربکەیتەوە. دەبێت ئەو برا بچوکەی خۆت هەڵگریت و بڕۆیت، لە بیریشت نەچێت ئەو منداڵە لە تۆ زیاتر کەسی نییە».

غەزەلنوس تا ئەوکات نەیدەتوانی قسەبکات، کچەکە گووتی «بیرکردنەوەی زۆر مرۆڤ دەگۆڕێتە سەر کەسێکی ڕاڕا، تۆ ڕێگایەکی زۆر درێژت لەبەرە، منیش دەبێت بڕۆم، تۆ و ئەمانەتی ئەو کوڕە، هەر خۆت ناوی بنێ، مردووەکان نابێت زیندوەکان ناوبنێن... بەڵام پێتبڵێم، بڕۆ بۆ لای ئەفسانە، تێدەگەیت، بچۆ بۆ لای ژنێک ناوی ئەفسانەیە لە ئوتێلی بەفر وسەراب، ئەو یارمەتیت دەدات... ئەو یارمەتیت دەدات، بەڵام بیرت نەچێت ئەوە منداڵی تۆیە... لە تۆ زیاتر کەسی نییە».

غەزەلنوس بێدەنگ مەلۆتکەکەی وەرگرت و بە هێواشی نای بە

سنگییەوە، لە دەرەوە بایەکی سارد هەڵیدەکرد، شەو هێدی هێدی دەکشا و بێکۆتایی دەینواند، بێئەوەی ورتەبکات منداڵەکەی بەخۆیەوە نوسان و ئەو ژوورەی بەجێهێشت. ئەوکات ناوەڕاستی پاییزی ساڵی هەشتا و هەشت بوو، سەرمایەکی ناوەخت و زوو وادە هەڵیکردبوو، غەزەلنوس بێئەوەی بوەستێت، بێئەوەی لە ڕێگا و با و شەو بترسێت، بە خۆی و کۆرپەیەکەوە گەڕایەوە بۆ شار، ئەوە یەکەمین منداڵی غەزەل بوو ئەو بیبینێت، یەکەمین مەخلوقی ڕاستەقینە و هاوشێوەی جنسی خۆی بوو.

## پەریناز لە گوڵێکی ژەهراوی دەخوات
## «ماجیدی گوڵ سۆلاف ــ هاوینی ٢٠٠٤»

من یەکەم کەس بووم باسی بارۆنەکانم وروژاند. پێشتر غەزەلنوس و تریفە یابەحری ناوی «ئاغا، میر، خواجایان» بیستبوو، بەڵام وشەی بارۆنیان بەرگوێ نەکەوتبوو. نەمدەزانی ئاخۆ حەسەن تۆفان شتێک دەربارەی ئەوان دەزانێت یان نا، هێند ناوی بارۆنەکانم هێنا بێوەستان سەیری ڕوخساری ئەوم کرد، وەک موچڕکێک یان لەرزێکی کتوپڕ لە هەناویدا ببینم وەهابوو. ئێوارەیەکیان هەر سێ هاوڕێ گەورەکەی ژیانم، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ تارمایی موراد جەمیل لەسەر هۆشمان گەورەتر و تاریکتر دەبوو، بڕیارماندا بۆ بارۆنەکان بگەڕێین. دوای دانیشتنێکی دوورودرێژ، وەک ئەوەی موراد جەمیل پادشایەکی نەخۆشبێت و سێ فەرزەندی دڵسۆزی هەبێت و بەدوای داڕوویەکی دەگمەندا بکەونە ڕێ، هەر سێکمان ڕێکەوتین تا کۆتایی دوای چیرۆکی ئەو کوڕە بکەوین و تاسەر دۆزینەوەی بکوژەکانی نەوەستین. دەبێت بڵێم کە غەزەلنوس بەردەوام بە جۆرێکی بێمانا و سەیر دەیگووت «خۆتان مەخەنە

تەهلوکـەوە، بـۆ مـن یـاری بـە ژیانـی خۆتـان مەکـەن. تـا ئـەو شـوێنە بـڕۆن کـە دەزانـن مەترسـی گـەورەی تێدا نییـە». ئـەوکات تێنەگەیشتم بۆ غەزەلنـوس واهەسـتدەکات ئێمـە ئـەو ئیشـە بـۆ ئـەوە دەکەیـن؟ هەسـتێکی بێمانابـوو کـە هەمووانـی ئـازاردەدا. لـە ڕاسـتیدا ئیشـکردن لەسـەر ڕابوردووی ئـەو مـردووە بـۆ مـن شـتێکی تایبەتـی و ڕۆحـی خـۆم بـوو، وەک جـۆرە قولاپێـک وابـوو منـی لـە دونیایـەک دەردەهێنـا و دەیخسـتمە نـاو دونیایەکـی تـر... سـەرەتا دەمویسـت بـە تەنهـا هەمـوو ئیشـەکە ئەنجامبـدەم، بـەڵام کـە سـەیری چـاوی ئەوانـی دیـم کـرد، هەسـتمکرد گرێکان بەجۆرێـک ئاڵـۆزن و کێشـەکان بـە ئەندازەیـەک قورسـن، لێـرە بـەدواوە و مـن بـە تەنیـا لـە هێزیـان نایـەم. هەمـوو پێیـان وابـوو مـن کەسـێکی کارامەنیـم، دەیانزانـی هەمیشـە خەیاڵـم لای ئـەو فلیمانەیـە کـە بـوون بـە بەشـێکی گـەورەی ژیانـم، خەیاڵـم لای ئەوەیـە چـۆن ڕۆژێـک لـە ڕۆژان بـڕۆم بـۆ هۆلیـۆد، لـەوێ بیرەیـەک لەگـەڵ مـۆرگان فریمانـدا بخۆمـەوە، لەگـەڵ کامیـرۆن دیـازدا بـە ماشـێنێکی سـەر بەتـاڵ لـە تەکساسـەوە وە بچـم بـۆ کالیفۆرنیـا، لەگـەڵ جولیـا ڕۆبەرتـدا لـە چێشتخانەیەکی شـیکاغۆدا نـان بخـۆم. گـەڕان بـە دوای بارۆنەکانـدا ئیشـی مـن بـوو، بـەڵام هەمـوو دەیانزانـی هیـچ سـەرە داوێکـم بەدەسـتەوە نییـە، نازانـم لـە کوێـوە دەسـت پێبکـەم، پەیوەنـدی هێنـد قـووڵ و بەربڵاویشـم نییـە بیکەمـە پـرد. هەمـووش دەیانزانـی هەندێجـار بـە شـێوەیەکی بێمێشـکانە خـۆم دەخەمـە مەترسـییەوە، لـەزەت لـەوە دەبینـم خـۆم فڕێدەمـە تەهلوکـەوە، خۆشـییەکی گـەورە دەچێـژم کـە دەبینـم کەوتوومەتـە دۆخێکـی وەهـا پەشـێو و مۆلەقـەوە خەریکـە نهێنییەکانـم ئاشـکرادەبن و دەبێـت شـتێک بکـەم پێسـتی خـۆم دەربازبکـەم. نـاوی بارۆنـەکان جۆرێـک لـە گەورەیـی و شـکۆی تێدابـوو، هەموومانـی ترسـان. هەسـتی ئـەوان بـە مەترسـی، لـە هەسـتی مـن قووڵتـر و وردتربـوو، بـە تایبـەت حەسـەن تۆفـان کـەزوو بۆنـی مەترسـیدەکرد و دروسـت دەیزانـی

لە چ خاڵێکدا مرۆڤ پێ دەخاتە هەرێمێکی نائاساییەوە، دەیزانی هێڵە سوورەکان لە کوێدان. وشەی بارۆنەکان، وەک نزیکبوونەوە وابوو لە بازنەیەکی نادیار و نائاسایی، شتێکی نوێ بوو، کە نەدەکرا مرۆڤ ئاسان وەریبگرێت. گەرچی تەواوی گروپەکە ئەرکێکیان بە من نەسپارد بەڵام بڕیارمدا چیم لە دەست بێت بیکەم، نەدەبوو هەمیشە وەک کەسێکی سووکبار و بێسوود دەربکەوم کە ئیشە سادە و ساکارەکان ئەنجامدەدەم، ئەوە لەگەڵ وێنەی مندا نەدەگونجا کە خۆم وەک ڕۆحێکی سەرکەش و کێوی و ڕامنەکراو دەبینی. وشەی «بارۆنی مریشک» تەنیا سەرەداوی دەستم بوو. سەرەتا لە ناو مریشکفرۆشەکانەوە دەستم پێکرد، من بە دەگمەن ڕێمدەکەوتە ناو باڵندەفرۆشەکان، هەمیشە شێوەڕەفتاری ئەو فرۆشیارانە تووشی لەرزوتای دەکردم، ئەو شێوازەی دەستیان بۆ ناو قەفەزەکان درێژدەکرد و باڵندەکانیان ڕادەکێشا، ئەو جۆرەی پێیان دەخستە سەرباڵیان و چەقۆ کولەکانیان بەملیاندا دەهێنا، ئەو هەموو خوێنەی لەسەر شۆستەکان جێیاندەهێشت، پێکڕا کۆمەڵێک دیمەن بوون نەمدەتوانی ئاسان تەماشایانبکەم. هیچ یەک لە مریشکفرۆشەکان نەیاندەزانی وشەی بارۆن مانای چی. هەوڵمدا بە زمانێکی سادە لێیان بپرسم، کێ بەناوبانگترین بازرگانی مریشکە، بەڵکو لەو ڕێگایەوە دەرگام بۆبکەنەوە و بگەمە بەر قاپی نهێنییەک. لە ڕاستیدا کەس نەیدەزانی کێ بە ناوبانگترین بازرگانە، زۆربەیان فرۆشیاری چکۆلانەبوون لە هەندێک کێڵگەی تایبەتی مریشک بەخێوکردن باڵندە بەستەزمانەکانی خۆیان دەکڕی. یەکێکیان پێیگووتم، باشترە لەو مریشکفرۆشانە بپرسم کە مریشکی بەستوو دەفرۆشن، بازرگانە گەورەکانی مریشک ئەوانەن، نەوەک ئەم فرۆشیارە چکۆلە و ناچیزانە کە بەدیار قەفەزێک باڵندەوە دادەنیشن. دوای گەڕانێکی زۆر دوکاندارێکی جامانە بەسەر، بە خۆی و سمێڵێکی کاکەییەوە، بەپێچەوانەوەی فرۆشیارە دەنگ وشک و

بێخەندەكانی ئەم شارە، ڕوخۆش و پڕ خەندە و سەرشار بە ژیان پێیگووتم «برام بۆی مەگەڕێ، كەس لە بازاڕدا ناوی بارۆنی مریشكی نەبیستووە، ئەو ناوە لە دەستكردی خەڵكی ناو بازاڕ ناچێت... ئەوە ئیشی یەكێكە شتێك لە دونیا تێدەگات، بڕۆ و لە جێگایەكی تر بپرسە». ئەو شەوە نائومێد گەڕامەوە بۆ ماڵێ و نەمدەزانی بچم بۆ كوێ، بەردەوامیش ئەو لاشە جوانەی موراد جەمیل لە پێشچاوم بوو، كە پێدەچوو تیامدا بپاڕێتەوە شتێكی بۆ بكەم. دڵنیابووم هاوڕێكانم بە زانیاری زیاترەوە دەگەڕێنەوە، ئەوان ڕێگای تر و كوچەی ئەوتۆ شارەزان كە من زەفەریان پێنابەم. لەو هەست و تێفكرینەشدا هەڵە نەبووم، لە كاتێكدا من نەگەیشتمە ئەنجامێك، ئەوان هەر سێكیان بە كۆمەڵێك زانیاری گرنگەوە گەڕانەوە. ناوی بارۆنەكان ناوێكی تازەبوو، لە سەرەتای بەهاری دووهەزاروچوار دا كە تەرمەكەی مورادمان دۆزییەوە، بارۆنەكان هێشتا لە قۆناغی دروستبوون و گەورەبووندا بوون. وەك هەمیشە حەسەن تۆفان لە هەمووان زیاتر زانیاری پێبوو، وەك هەمیشەش هەموو زانیارییەكانی خۆی نەدەدركاند، من هێندە تێگەیشتم كە بارۆنەكان گروهێك دەوڵەمەندن لە سیاسەتمەدار و بازرگان و موڵكداری گەورە دروستبووە كە پێكەوە كاردەكەن، هەر كەسەیان لە شتێكی ژیان بەرپرسن، زۆربەی شەوان پێكەوە دادەنیشن، پێكەوە دەخۆنەوە، پێكەوە ئیشدەكەن، پێكەوە سەیراندەكەن و پێكیشەوە حوكمدەكەن، ئەم شارە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە دەستی ئەواندابوو. دیارە ئەو جۆرە زانیارییە هێندە سەیر و سەرەتایی بوو سوودێكی ڕاستەقینەیان بۆ ڕوونكردنەوەی مردنی موراد جەمیل نەبوو، من لەو كاتەدا گورزی خۆم وەشاند و تۆڵەی خۆم لە ئاغای تۆفان كردەوە و وشە بە وشە پێمگووت «بەڕێز حەسەنی پیرۆز، هیوادارم لێم زویر نەبێت، بەڵام واهەستدەكەم ئەم زانیاریانەی تۆ سوودێكی ڕاستەقینەی

بۆ تێگەیشتن لە کۆچی دوایی موراد جەمیلی جوانەمەرگ نەبێت، کە وەک بەڕێزتان دەزانن ئێمە بەدوای ڕوونکردنەوەی وردەکارییەکانی کۆچی ئەوەوەین و هیچی تر». دەمزانی ئەو شێوە قسەکردنەی من ڕۆحی حەسەن تۆفان دەردەهێنێت، وەها وەڕز و بێتاقەتی دەکات، دڵی دەربێت و هەناسەی بۆ نەدرێت، هەندێجار دانی بە خۆیدا دەگرت و هەندێجاریش وەک تووشی بەڵایەکی گەورە بووبێت، بە دەموچاوێکی گریاوەوە سەری بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە و دەیگووت «ئاخ، خوایە... ئێستا چی لێبکەم». ئەو ڕۆژە حەسەن تۆفان پاش بێدەنگییەکی کەم، دەستی بۆ دەستنوسی کتێبە گەورە و بەناوبانگەکەمان برد کە من بە خەتێکی جوان دەمنوسییەوە و گووتی «گەر دەمانەوێت ئەم کتێبە تەواوبکەین، گەر دەمانەوێت مێژووی مردن لەم شارەدا بنوسینەوە، مێژووی ڕاستەقینەی مردن، دەبێت بڕۆینە ناو بارۆنەکانەوە، تێدەگەن یانی چی بڕۆینە ناو بارۆنەکانەوە، یانی نابێت لە مردن بترسین، دەبێت یەکێکمان هەبێت لە مردن نەترسێت و بچێتە ناو کونی ئەژدیهاکەوە».

من بێئەوەی بیربکەمەوە گووتم «من دەچم، من لە هەمووتان بێباکتر و چاونەترسترم». حەسەن تۆفان گووتی «بۆ ئەم ئیشە یەکێکمان دەوێت بێباک نەبێت و چاونەترسیش نەبێت، واتە یەکێکمان دەوێت لە تۆ نەچێت، پیاوێکی لە تۆ عاقڵترمان پێویستە».

هەر کەسێکی دیکەبووایە دەمودەست لەوێدا کۆبوونەوەکەی جێدەهێشت، بەڵام من بریندار و دڵپێکراو، گووتم «حەسەنی پیرۆ، چۆنت پێخۆشە باوابێت، بە ئارەزووی دڵی خۆت دەتوانیت بریندارمبکەیت، بەڵام من ئامادەم بچم و بەو جۆرەش کاربکەم کە ئێوە دەتانەوێت، هەق نییە ئاوها سووک و بێمایە سەیری من بکەن، من دواجار کەسێکم دەتوانم شتی گەورە ئەنجامبدەم».

مـن هەڵێکـم دەویسـت تـا توانـا و بەهـرەی خـۆم وەک کەسـێکی سـەرکەش و چاونەتـرس بسـەلمێنم. بـەڵام غەزەلنـوس قسـەکانی پێبڕیـم و گووتـی «گـوڵ سـۆلاڤی بـرام، ئێمـە تـۆ ناخەینـە مەترسـییەوە، هیـچ یـەک لـە ئێمـە دەسـت نـادات بـۆ ئـەو کارە، ئـەوەی دەبێـت لـە نـاو بارۆنەکانـەوە زانیاریمـان بـۆ بهێنێـت، پێویسـتە یەکێـک بێـت لـە بارۆنـەکان، دەبێـت یەکێـک بێـت لـە خۆیـان».

غەزەلنـوس لەسـەر هـەق بـوو، بـەڵام ئـەوە کارێکـی نەکـردە و ئەسـتەم بـوو، چـۆن دەمانتوانـی لـە نـاو بارۆنەکانـدا کەسـێک بدۆزینـەوە هەواڵـی بارۆنەکانمـان بـۆ بهێنێـت، ئـەوە خەونێکـی تربـوو لـە خـەوە بێماناکانـی غەزەلنـوس.

لـە ڕاسـتیدا ئـەوکات لـە هیـچ تێنەدەگەیشـتم، ئێمـە ئـەوکات لـە بـەردەم دەرگایەکـی داخـراودا بوویـن.

مـن غەمگیـن و نائومێـد پشـووەکەی خـۆم پچـڕان و گەڕامـەوە بـۆ سـەفەرە خەیاڵییەکانـم لەسـەر نەخشـە خەیاڵییەکـەی خـۆم. هەسـتمکرد ئـەو بێتواناییـە گەورەیـەی لـە دونیـای ڕاسـتییەکاندا هەمـە دەتوانـم لـە دونیـای خەیاڵـدا قەرەبوویبکەمـەوە، بـە جۆرێـک لـە جـۆرەکان سەرداریاشـی کەشـتییەکی گەورەبـووم کـە بـە زەوییەکـی بێسـنوور و ئەفسـوناویدا دەمگێـڕا، هەرچـی لاوازییـەک لـە دونیـای شـتە ڕاسـتەقینەکاندا هەسـتم پێدەکـرد بـە گەشـتە خەیاڵییەکانـم پڕمدەکـردەوە.

***

لـەو کاتـەوەی لەگـەڵ منداڵـە کوێرەکانـدا دەسـتم بـەو سـەفەرە خەیاڵییـە کردبـوو ژیانـم لـە جـاران ئاسـوودەتر و ڕوونتربـوو. ڕێگایەکـی ڕاسـتەقینەی

خۆم هەبوو، لە ڕێگای هیچ ئادەمیزادێکی دی نەدەچوو. کەشتییەکی خۆم هەبوو بە ئازادی بە ڕوبارێکی درێژ و بێبڕانەوەدا سەوڵمدەدا، کەناری ئەو ڕوبارە پڕبوو لە شانشین و وڵاتی خەیاڵی، کە بە ڕەنجێکی ورد چنیبووم. ئەو ڕۆژە کە گەڕامەوە بۆ ناو منداڵە کوێرەکانم هەموو چاوەڕوانیاندەکردم، دواجار کە گەشتەکەمان وەستان لە ڕۆخی شارێکدا بووین گڵۆپەکانی وەک گڵۆپی ئاسایی نەبوون، بەڵکو کۆمەڵێک باڵندەی ڕوناکبوون بەسەر ئاسمانی ئەو شارە گەورەیەدا دەسوڕانەوە، کۆمەڵێک باڵدار شەوان لە دارستانەکانەوە هەڵدەفڕین و وەک کۆمەڵێک چرای گەورە دادەگیرسان و دەفڕین و تا هەڵهاتنی خۆر نەدەنیشتنەوە. من و منداڵەکانم کە هەریەکەیان دەریاوانێکی چکۆلانە و کەشتییەوانێکی شارەزای لێدەرچووبوو، لە شەوێکی ئەنگوستە چاودا لە ڕۆخی ئەو شارە سیحراوییەدا دەوەستاین و لەنگەرمان بە کەشتییەکەمان دەگرت، لەو گەشتەدا هەمووان منیان بە ماجەلانی گەورە بانگدەکرد. لەو سەفەرانەدا من سێ دەست جلی هەڵبژاردەم هەبوو، کە بە نۆرە لەبەرم دەکردن، یەکێکیان لە جلەکانی ڕای دانتۆن دەچوو لە فلیمی «تۆڵەی ساندۆکان» دا، دەستەجلەکەی دیم لە جلەکانی ئەنتۆنی کوین دەچوو لە فلیمی «کاروان» دا، شتێکی تێکەڵاو بوو لە مۆدێلی خۆرهەڵاتی و خەیاڵی خۆرئاوایی، دەستەجلی سێهەمیشم وەک سیپاڵی ژیرار دیپاردیۆ وابوو لە فلیمی «داگیرکردنی بەهەشتدا» دا، کە باس لە گەشتی دۆزینەوەی ئەمریکا دەکات لەلایەن کریستۆف کۆلۆمبسەوە... بەڵێ من بەو سێ دەستە جلەوە بۆ سەزەمینی خەیاڵ دادەبەزیم. لە زۆربەی شارەکاندا شوناسی خۆم ئاشکرانەدەکرد و وەک کەشتیارێکی سادە خۆم نیشاندەدا کە هەندێک منداڵی کوێر بە دونیادا دەگێڕم. لەو سەفەرە خەیاڵی و سەیرانەماندا کە ماوەیەکی درێژبوو ئێمەی بە ڕۆخی درێژترین ڕوباری دونیادا دەبرد، گەیشتینە گەلێک شاری سەیر و بە زۆر کوچەی

بێوێنـەدا گەڕاین. لـە سـەفەری سـەر ئـەو نەخشـە خەیاڵییـەوە تێگەیشـتم دوو جـۆر شـار لـە دونیـادا هەیـە، جۆرێکیـان چەشـنە شـارێکە ناتوانیـت بچیتـە نـاوی، هەتـا کـە دەشـچیتە نـاوی، هەرگیـز نەچوویتـە نـاوی، هەمیشـە لـە دەرەوەیـت، هەمیشـە بـە دەوری شـوراکانیدا دەسـوڕێیتەوە، هەمیشـە دووریـت و پێـت تێنەخسـتووە، شـارێکی دیکـەش هەیـە کـە هەرگیـز ناتوانیـت لێیدەرچیـت، یەکجـار دەچیتـە نـاوی و بـۆ هەتاهەتایـە لـە ناویـدا بـە زینـدانی دەمێنیتـەوە، بـۆ هـەر جێگایـەک بچیـت تـۆ هەمیشـە لەوێیـت، دەتوانیـت تێکـەڵ بـە شـوێنی تـری بکەیـت، دەتوانیـت بیخەیتـە نـاو شـاری گەورەتـرەوە، دەتوانیـت وەک قاڵبـی کێـک شـاری دیکـەی بخەیتـە سـەر، بـەڵام بتوانیـت لێـی دەربازبیـت؟ ئـەوە کاری نەکردەیـە. ئـەو ئێوارەیـە مـن و کەشـتییەوانە کوێرەکانـم گەیشـتبووینە شـارێک لـەو شـارانەی ڕێـگات پێدەدەن بیانبینیـت، بـەڵام هەرگیـز ڕێـگات پێنـادەن بچیتـە ناویـان، هەمـوو ئـەو شـارانەی کـە وندەبـن فۆرمێکـی بازنەییـان هەیـە، شـەقامەکانی بـە جۆرێکـی ترسـناک دەخولێنـەوە، تـۆ پێتوایـە لەسـەر هێڵێـک دەجوڵێیتـەوە کـە لـە دەرەوە بـەرەو نـاوەوە دەتبـات، بـەڵام بـە پێچەوانـەوە هەمیشـە تـۆ لەسـەر هێڵێـک دەسـوڕێیتەوە کـە لـە نـاوەوە بـۆ دەرەوە دەتبـات. چەشـنە شـارێکە لۆژیکێکـی هەیـە جیـاوازە لـە لۆژیکـی گەڕیـدە و ڕێبـوارەکان، لـە کاتێکـدا گەڕیـدە و گەڕاڵـەکان لەسـەر بازنەیەکـی سـپرنگ ئاسـا بـەرەو نـاوەوە دەڕۆن، ئـەو جوڵەیـە بـۆ خـودی شـار ئاڕاسـتەیەکی پێچەوانـەی هەیـە، لێـرەوە لـە کاتێکـدا تـۆ پێتوایـە تـۆ بـەرەو نـاوەوە دەڕۆیـت شـار پێـی وایـە تـۆ بـەرەو دەرەوە دەڕۆیـت، بەوەشـدا تـۆ هەرگیـز ناگەیتـە نـاوەوە، ناتوانێـت فێڵبکەیـت و بـەرەو دەرەوە بڕۆیـت تـا شـار بـەرەو نـاوەوە بتبـات، لێـرەوە تـا هەتـا هەتایـە تـۆ لـە دەرەوەیـت. بـە پێچەوانـەی شـارە خنکێنەرەکانـەوە، ئـەو شـارانەی مـرۆڤ زینداندەکـەن و کـەس ئاسـان لـە داویـان دەرناچێـت. شـارگەلێکن تـۆ پێتوایـە بـۆ دەرەوە دەڕۆیـت، بـەڵام

شار بۆ ناوەوە دەتبات، لێرەوە تۆ چەند بۆ دەرەوە بڕۆیت پتر خۆت لە ناوەوە دەدۆزیتەوە. ئیدی من و کەشتییەوانەکانم لە یەک کاتدا لەناو ئەندازەیەکی ئەستەم و نەکردەدا دەسوڕاینەوە، بەسەرێک بێئەوەی بچینە شارێکەوە لێیدەردەچووین بۆ شارێکی تر، بەسەرێکی تریش بێئەوەی لە شارێک دەرچووبین لە شارێکی دیدا بووین. هاوکێشەیەکی خەیاڵی سەخت و قورس بوو کە دەبایە من و هاوڕێکانم پێکەوە پیابڕۆین و پێی ڕابێین. ڕاستە دواجار هەموو ئەو شارانەی ئێمە ڕوومان تێدەکردن تەنیا لەسەر نەخشە خەیاڵییەکەی من بوونیان هەبوو، بەڵام دەبێت بزانن خەیاڵێکی مەحکەم و چنراو ئەندازەیەکی هەیە ئاڵۆز و سەخت و دەرەبیردۆز، ماتماتیکی خەیاڵ هەندێ مەرج و بیردۆزی هەیە قورستر لە ماتماتیکی ئاسایی. من بەسوار ئەو کەشتییە خەیاڵییەوە تێگەیشتم کە خەیاڵ ئازادی ڕەها نییە، دونیای خەیاڵ دونیاییەکی ئێجگار پڕ مەرج و ئەندازەییە، من تا ئەو کاتەی دەستمکرد بە داڕشتنی نەخشە خەیاڵییەکەی خۆم، لام وابوو هەرێم و کیشوەرە خەیاڵییەکان، سەرزەمینی ئازادی ڕاستەقینەن، بەڵام نا، سەرزەمینی خەیاڵ شوێنێکی بێئەندازە نییە، جێگایەک نییە بتوانیت چیت دەوێت تیا ئەنجامبدەیت، خەیاڵ هەندێجار لە حەقیقەت جەبرگەراترە. زۆرجار هەستمکردوە بە کۆمەکی خەیاڵ دەتوانین لە حەقیقەت تێبگەین، بەڵام بە کۆمەکی حەقیقەت ناتوانین لە خەیاڵ تێبگەین. من لە ڕۆژی یەکەمی ناسینی غەزەلنوسەوە، کەوتمە بەرەیەکی دییەوە، من پێموایە خەیاڵ زۆرجار وەک حەقیقەت ترسناکە، حەقیقەت بەروارد بە خەیاڵ زەمینێکی ئارام و لەسەرەخۆ و کەمکێشەیە، بەڵام ئەزموونی من لەو گەشتە درێژەدا بە ڕۆخی ڕوبارێکدا کە هەرگیز کۆتایی نایەت، فێریکردم کە خەیاڵ زەمینێکی پڕ بوونەوەری سەیر و مرۆڤی پێشبینی نەکراوە، مرۆڤ لە جیهانی ڕاستەقینەدا درەخت وباڵندە و ئەستێرەکان دەناسێت، فێری جۆرە

سیستمێکی ژیان و مامەڵەکردن بووە، بەڵام لە خەیاڵدا هەموو شتەکان دەگۆڕێن، هەموو شتەکان بە مرۆڤ نامۆن، نازانیت کەی پێتخستۆتە ناو خاکێکی ترسناک و کەی لە ڕوباری سام و ترسەوە بەرەو ڕۆخێکی شاد و دڵنیا پەڕیوییتەوە، زۆربەمان ئاسان بە ناو تاریکی و زوڵوماتی حەقیقەتدا تێدەپەڕین، بەڵام بە دەگمەن دەتوانین لە زوڵوماتی خەیاڵ تێبگەین. هەمووجار کە لەگەڵ دەریاوانە چکۆلەکانمدا دەکەوتینە گەشت، لێیاندەپرسیم سەرداریاشی بۆ هێندە لە تاریکی دەترسیت، ئەی ئەم زەوییە خەیاڵیانە خۆت دروستت نەکردون؟ پرسیاری کەشتیکارە کوێرە چکۆلانەکانم ئەگەرچی زۆر دووبارەدەبووەوە، بەڵام هەموو جار مایەی سەرسامی و تێڕامان بوو بۆ من. من هەندێجار دەمگووت «کەشتیدۆستانی خۆشەویست، سەوڵ بەدەستە ئەفسانەییەکانی من، مرۆڤ کە بە خەیاڵ جێگایەک دروستدەکات، سەرەتا تەنیا چێوەی ئەو جێگایە دەکێشیت، خەتێکی سادە دەکێشێت و ڕەنگرێژی دەکات، دەسەڵاتی من بەسەر خەیاڵمدا هەندێجار لە سنووری ئەو هێڵەدا دەوەستێت، ئیتر چی لەو دیو ئەو هێڵەوە هەیە نازانم... هەندێک خەڵک هەن خۆشبەختن، خەیاڵی گەلەک فراوان و گەورەیان هەیە، بەڵام هەموو شتێک دەبینن، تا کۆتایی چ باغێک هەیە چاویدەکەن و چ گوڵێک هەیە دەیناسن، بەڵام خەیاڵی سەرداریاشییە بەدبەختەکەی ئێوە جۆرێکی ترە... تاریک و ئاڵۆزترە. تۆ دەتوانیت هەموو شتێک دروستبکەیت، بەڵام بەردەوام ڕووبەرێکی گەورە بۆ شتی نادیار و کتوپڕ دەمێنێتەوە، مرۆڤ ناتوانێت بە عەقڵ مەترسییەکانی خەیاڵ لە ناوبەرێت. شتە خەیاڵییەکان لە ناکاو دێنەدەرێ. من لەوانەم کە نازانم پێشوەخت چی شتێک لە خەیاڵمدا نوستوە، دەتوانم شارێک بە خەیاڵ دروستبکەم، بەڵام ناتوانم هەموو کوچەکانی ئەو شارە و هەموو کۆڵانە تاریکەکانی زامنبکەم، دەتوانم دارستانی خەیاڵی گەورە دروستبکەم، بەڵام لەو دارستانانەدا

چ جانەوەرێـک دەژی، چـی ڕوودەدات، چـۆن دەکرێـت بـە نێـو تاریکـی و چڕستانی ئـەو جەنگەڵـەدا بڕۆیـن، ئەوەیـان جـۆرە ڕێسـا و یاسـایەکی هەیـە مامۆسـتا سـیاچارەکەی ئێـوە ناتوانێـت دەستنیشـانیبکات. زۆرجـار مـرۆڤ نازانێت لـە خەیاڵـدا بۆچی دەگەڕێت، چاوەڕوانـی چی دەکات، لـە ڕۆژگاری زوودا ئـەم دۆخەیـان ناودەنـا ئیلهـام یـان غەیببینـی. ئیلهـام ئـەو سـیفەتە کوتوپـڕ و سـەیر و ناوەختـەی خەیاڵـە کـە لـە نـاکاو پەلاماردەدات، ئینسـان سـەرەتا تەنیـا شـێوەی دەرەوەی خەیـاڵ دەبینێـت، بـەڵام کـەس نازانێـت لـە ناوەڕۆکـە تاریـک و قووڵەکەیـدا چـی تێدایـە».

مـن ڕوومدەکردە منداڵـە نابینـاکان و دەمگـووت «سەوڵبەدەسـتە ئازاکانی مـن، ئـەی ڕێبوارانـی ڕێـگای خەیـاڵ، مرۆڤـەکان دوو جـۆرن، جۆرێکیـان ناتوانـن پێبخەنـە سـەر خاکـی خەیـاڵ، ئەوانـە خەڵکانێکـی سـەلامەتن، بـەڵام بێبەشـن لـە جوانـی خەیـاڵ، لـە تامکردنـی ئـەو مەترسیانەی خەیاڵ، خەڵکانێکیـش وەک ئێمـە کـە سـوار کەشـتییەک دەبیـن و دەمانبـات، بـەڵام لـە کـوێ دەگیرسـێینەوە؟ چ شـارێک چاوەڕێمانـدەکات؟ چ شـێوە و چ هەسـتێکی نەبیسـتراو و نەبینـراو دەژیـن؟ نازانیـن. هیـچ نادیارێـک لـە تاریکـی و زوڵوماتیـدا ناگاتـە نادیـاری خەیـاڵ».

مـن لەوانەبـووم کـە باوەڕیـان وایـە خەیـاڵ هێزێکـی ئـازادە، دەبێـت لێیگەڕێیـن چـۆن دەمانبـات بمانبـات، خۆمـان بدەینـە دەسـت نهێنییەکانـی، هەڵبـەت مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی تامـی خەیـاڵ بـکات پێویستی بـە عەقـڵ هەیـە، خەیـاڵ بێهۆشـی نییـە، نائاگایـی و مەسـتی نییـە، بـەڵام ئـەوەی چاوەڕوانـی ئەوەبیـت عەقـڵ هەمـوو شـتێکی نـاو خەیـاڵ بخوێنێتـەوە، بزانێـت چـی تێدایـە، ئـەوە وێرانکـردن و کاولکردنـی سـەرزەمینی خەیاڵـە، مـن لـە سـەرەتاوە جیاوازییەکـی گـەورەم لـە نێوان کەسـانی عاقڵ و ڕۆحـی خەیاڵزادا دەکـرد، مـن ڕۆحێکـی خەیاڵـزاد بـووم، نەزانـا بـووم و نـە دانـا، حەسـەنی

پیرۆ ڕاستیدەکرد کە هەردەم لە بێئەقڵی من دەترسا. من بۆ ئەوەی خەیاڵزایەکی ڕاستەقینەبم، دەبایە نەزانم ئەو کەشتییە بۆ کوێم دەبات، هەمیشە چاوەڕوانی ڕەحمەت و نەفرەتی خەیاڵ بم، دەبایە ئەوانەی لەو کەشتییە شێتەدا لەگەڵمدا سواردەبن نەزانن چی چاوەڕوانیاندەکات، خەیاڵ نابێت لە حیکایەتێک بچێت کە بیستووتە، بەڵکو دەبێت چیرۆکێک بێت نەتوانی پێشبینی کۆتاییەکەی بکەیت. ئێستا هەستدەکەم ئەوە جیاوازی هەرە گەورەی نێوان من و غەزەلنوس بوو، ئەو لە سەرەتاوە کۆتایی ژیانی خۆی دەبینی، من لەوەدا لەو بەختەوەرتر بووم و وەک کوێر هیچم نەدەبینی. سەفەرەکانی من لەسەر ئەو کەشتییە لەبری دونیای ڕاستەقینەبوون، زۆرجار هەستمدەکرد غەزەلنوس پتر لەوەی خەیاڵزابێت عاشقە. من هەمووجار بە بێزارییەوە دەمگووت غەزەلنوس تۆ شەمەندەفەرت هەیە، شەمەندەفەرێکی زۆر درێژ کە پڕتکردووە لە مەخلوقاتی خەیاڵی، ئێمەی ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان هەموومان میوانی ئەو شەمەندەفەرەی تۆین، ئەم شەمەندەفەرەی تۆ لەسەر دوو سکە دەڕوات، دوو ئاسنەڕێی درێژ و بێکۆتایی، ئاسنەڕێیەکی شەمەندەفەرەکەی تۆ خەیاڵە و ئاسنەڕێکەی تریان حەقیقەتە، شەمەندەفەرەکەی تۆ لە دێوێک دەچێت دوو لاقی هەبێت، لاقێکیان خەیاڵییە و لاقێکیان ڕاستییە، ئەم دێوەی تۆ ناتوانێت دەستبەرداری هیچ یەک لەو دوو لاقە بێت، گەر بێت و یەکێک لەو دوو لاقە لابدەیت، دێوەکەی تۆ دەکەوێت و هەموو شتێک دوابیدێت، بەڵام من جۆرە ئادەمیزادێکی ترم. من وەک تۆ شۆفێری شەمەندەفەرێک نیم کە لە سەر دوو سکە دەڕوات، من کەشتییەوانم، کەشتییەکەی من لاقی نییە، خۆی کەشتییەکی خەیاڵییە، لە ئاوێکی خەیاڵیدا مەلەدەکات.

تا ئەو جێگایەی مەخلوقاتە خەیاڵییەکان تەنیا لە خەیاڵدا هەن، مەترسییەک لە گۆڕێ نییە، تا ئەو جێگایەی سنووری سەر زەمینی

خەیاڵ بەسەر زەمینی حەقیقەت تێکەڵ نەبووە شتەکان ئاسایین، بەڵام لە یەکدانی ئەو دوو دونیایە کارەساتی لێدەکەوێتەوە. من ئەگەرچی لەگەڵ ئەوانی دیدا لە هەموو شتێکدا بەشداربووم، بەڵام من لەو مەخلوقانەم کە مەترسییم لەسەر دونیا نییە... من لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییە بێوەیەکانم، کەشتی من کەمتر خەڵک سواریدەبوو، کەمتر دەبینرا و کەمتر هەستی پێدەکرا.

ئەو شەوە کە لەگەڵ کەشتییەوانە بچکۆلە و کوێرەکاندا بە دەوری ئەو شارەدا دەسوڕامەوە، ڕێگایەکمان نەدەبینی لێوەی بڕۆین، خەیاڵ زۆرجار سوڕانەوەیە بەدەوری جوغزێکی بۆشدا، سوڕانەوەیەکی بازنەیی و ئەبەدییە بەسەر یەک خولگەدا کە تا هەتاهەتایە گێژتدەدات و بوارت پێنادات لێیدەرچیت، باڵندە داگیرساوەکان بەسەر سەرماندا دەفڕین، بەڵام ئەو شارە دەروازەیەکی پێنەدەبەخشین. گەر جێگایەکی خەیاڵی بواری نەدا ڕووی تێکەیت، بە هێمنی بگەڕێوە و سەرسەختی لەگەڵدا مەنوێنە، زۆرجار مرۆڤ لە ڕێگای کۆڵنەدان و سەرسەختییەوە دەتوانێت حەقیقەت بدۆزێتەوە، بەڵام سەرسەختی و کۆڵنەدان لەگەڵ خەیاڵدا سوودیان نییە، خەیاڵ دەرگایەکە یان خۆی دەکرێتەوە یاخود هیچ هێزێک نییە بیکاتەوە، من زۆرجار توانا گەردەلوولئاساکانی خۆم بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی ئەو دەرگا داخراوانە بکەمەوە، بەڵام هەرکاتێک دەرگایەکی خەیاڵت لێ عاسی بوو، هیچ مەشکێنە، بڕۆ و ئیدی ڕوو لەو پنتە مەکەرەوە. من لە بەردەم دەرگاکانی ئەو شارەدا کە نەمدەزانی لە کوێوە بۆی بچم، هەستمکرد ئەو سەرسەختییەی لە شیکردنەوەی کڵافەگرێکانی مەرگی موراد جەمیلدا دەمنواند ناتوانم بینوێنم، ڕاستە من لێرەدا سوڵتانی ئەو کیشوەرە بووم، بەڵام سوڵتانێک نییە بتوانێت سەرسەختی و کەللەڕەقی لەگەڵ شاخێک لە شاخە عاسییەکانی

مەملەکەتەکەیدا بنوێنێت. لە بەردەم دەرگای ئەو شارەدا کە وەک شێت بۆ دەروازەیەکی کراوە دەگەڕاین بڕۆینە ناوی، هەستمکرد حەقیقەت چەندە سەخت و عاسییە خەیاڵیش هەمان شێوە ناوالآو نەکراوەیە. نائومێدی من لە دۆزینەوەی حەقیقەتی مردنی موراد جەمیلدا، ئێستا هاوڕێی نائومێدیم بوو لە تێکەڵبوون و شکاندنی دەرگاکانی ئەم شارە خەیاڵییە، کە شارێکە تاریک بە کۆمەڵێک قوللەی بەرز و باڵندەی وەک چرا داگیرساوەوە.

نائومێدی لە هەر شت زیاتر خەیاڵم دەکوژێت، نائومێدی و مردنی خەیاڵ یەک شتن. ئەو شەوە بۆ ئەوەی منداڵە کوێرەکان زیاتر هەست بە بێتوانایی من نەکەن، بۆ ئەوەی نەڵێن لەمە زیاتر لە بەردەم دەرگای ئەم شارەدا ڕامانمەگرە، بۆ ئەوەی لێمنەپرسن ئەی تۆ خۆت سوڵتانی ئەم ڕوبار و نەخشە گەورانە نیت؟ تۆ نیت ئەم شارەت لێرەدا لەسەر ئەم نەخشە مەلعونە دروستکردوە؟ هەر خۆت نیت بست بە بستیت لێرەدا خولقاندوە؟ ئێستا چۆن ناتوانیت بڕۆیتەوە ناوی؟ ڕۆیشتم و لەو ڕێگایە دوورکەوتمەوە. گەر پرسیاری وایان لێبکردمایە دەبایە پێیان بڵێم ئەزیزانی ماجەلان، ئێوە لێتان تێکچووە، خەیاڵ یادەوەری نییە، ئەوە ڕاستییە کە یادەوەری هەیە نەوەک خەیاڵ، مرۆڤ هەرگیز دووجار ناتوانێت بچێتە ناو شارێکی خەیاڵییەوە. ئەوە درۆیە کە هیراکلیتس دەڵێت مرۆڤ ناتوانێت دووجار بچێتە یەک ڕوبارەوە، ڕوباری حەقیقەت دەکرێت مرۆڤ دەیانجار بچێتە ناوی و هەمیشەش هەمان ڕوبار بێت، ئەوە ڕوباری خەیاڵە کە هیراکلیتس باسیدەکات. من چەندەهاجار لەگەڵ هاوکارە چکۆلە و بێنەزموونەکانی خۆمدا تاقیمکردۆتەوە، شارێکی خەیاڵیمان چۆڵکردوە و دواتر گەڕاوینەتەوە ناوی، هەرگیز ئەو شارەمان نەدۆزیوەتەوە، هەرگیز... مرۆڤ یەکجار دەتوانێت بچێتە ناو شارێکی خەیاڵییەوە، با ئەو شارە لەسەر نەخشەیەکی خەیاڵیش بێت کە تۆ

دروستتکردوە، شارەکانی خەیاڵ هەتا کاتێک دیلیشتدەکەن، هەتا کاتێک وەک شێت بەدەوری یەک کوچەدا دەتبەن و دەتسوڕێننەوە، هەمیشە شتێکی نوێیان هەیە، هیچ کات ناتوانیت بچیتەوە ناو هەمان کوچە، خەیاڵ هەمیشە توند دەستکاری هەر نەخشەیەک دەکات کە تۆ کێشاوتەوە. من لە ئەزموونی خۆمەوە قسەدەکەم، ئەزموونم وەک ماجەلانی خەیاڵی ئەو پیاوەی بە خەیاڵ کیشوەرێکی ئەفسانەیی دروستکردوە، تاقیمکردۆتەوە من هەرگیز ئەو نەخشەیەم وەک خۆی نەبینیوەتەوە، هەر نەخشەیەک بۆ خەیاڵ بیکێشیت دواتر شتێکی تری لێدەردەچێت، شتێک کە چاوەڕوانت نەکردوە. بە کورتی من نەخشەیەکی خەیاڵی گەورەم هەبوو کە لەسەری دەڕۆیشتم، نەخشەیەکی زۆر ورد و گەورە، بەڵام ئەوە من بووم کە لەسەر ئەو نەخشەیە دەڕۆیشتم، خەیاڵ خۆی لەسەر نەخشەیەکی تر دەڕۆیشت، ئەو نەخشەیەش لە دەرەوەی هێزی من یاسای خۆی هەبوو.

ئەو شەوە بۆ ئەوەی درێژە بە نائومێدییە گەورەکانم نەدەم، پاشەکشێم بە سوپا چکۆلانەکەم کرد و سوار کەشتییەکەم بوومەوە.

لەسەر ئەو کەشتییە، هەندێجار هەستمان بە ئازادی و خۆشبەختی دەکرد، هەندێجاریش لە کۆمەڵێک پیاوی هەڵهاتوو دەچووین کە لە ڕوبارێکی شێتدا لە کۆمەڵێک هێزی ترسناک هەڵدێین، هەندێجاریش بە کۆمەڵێک زیندانیمان دەکرد هەندێک پاسەوانی خەیاڵی لە کەشتییەکی چکۆلانەدا بەرەو دوورگەیەکی نەزانراو و دوور بمانبەن. بەڵام هەردەم هەستمانکردوە کە ئێمە کۆیلەی شارگەلێکی زۆرین، ئەو شارانەی خەیاڵ کە چووبووین و بۆ هەتاهەتایە ئێمەیان دیلکردبوو بانگیاندەکردین، ئەو شارانەی لە سەرەتاوە گووتم دامێنت دەگرن و ئازادت ناکەن، ئەو شوێنانەی تۆ واهەستدەکەیت جێتهێشتوون و بەڵام هەرگیز جێت

نەهێشتوون، ئەو شوێنانەی ڕاتدەكێشنەوە، فێڵت لێدەكەن... تۆ بەرەو جێگایەكی دیكە، بەلكە ڕوبارێكی تردا بەرەو جۆرە سەرچاوەیەكی نادیاری دیكە لێدەخوڕیت، دەبینیت شوێنێك بانگتدەكات، شوێنێك بەر لەوەی لەسەر نەخشەكان بوونی هەبێت لە سەری خۆتدایە، لە خەیاڵی خۆتدایە، كاتێك دەچیتە پێشێ و لەنگەردەگریت، دەبینیت هەمان ئەو شارەیە كە دیلیكردویت، كە فریویداویت، شارێكە فێڵت لێدەكات و بە شێوەی جۆراوجۆر خۆی دەگۆڕێت. هەموو ئەوانەی لەسەر نەخشەی خەیاڵی سوڕاونەتەوە، دەزانن مانای چی ببیت بە دیلی شوێنێكی خەیاڵی. دیلبوون بۆ شارە خەیاڵییەكان ئەوە نییە هەردەم لەهەمان شوێن و هەمان كوچەدا خۆت ببینیتەوە، بەڵكو ئەو هەستە ئاشكرایەیە كە جێگایەك فێڵت لێدەكات، ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت بۆ ئەوەی بتگرێت، خۆی جواندەكات بۆ ئەوەی نەهێڵێت دەربازبیت، خۆی لە هەر خۆ دووبارەبوونەوەیەك دەپارێزێت بۆ ئەوەی تۆ هەستبكەیت دەڕۆیت، لە شوێنی جیاواز و كاتی جیاوازدا دێتەوە ڕێگات. بەڵێ... دیلی لە خەیاڵدا بریتی نییە لە وەستان لە جوغزێكدا، بەڵكو ئەو هەستە سەیرەیە بە ڕۆیشتن لە كاتێكدا تۆ وەستاویت.

ئەو شەوە بەناو جێگایەكی زۆر تەنگەبەری لكە ڕوبارێكی زۆر بەر تەسكدا داگەڕاین، هەمووان ترسمان لەمبەرەو بەری ڕوبار هەبوو، ڕێدەكەوت لەو گەشتە سەیرانەماندا لەوبەری ئاوەوە، خەیاڵی زۆر فریودەر بانگمانبكات، بەڵام ئەو كەسەی لەسەر زەوی خەیاڵ بجوڵێتەوە نابێت فریوی هەر شێوە و هەر بانگ و هەر ئاماژەیەك بخوات. لە جێگایەكی ڕوباردا، لەدوورەوە كۆمەڵێك چرامان بینی، لە جێگایەكی بێدەنگدا لەنگەرمان گرت، منداڵە نابیناكان گەرچی هەموو ژیانیان لە تاریكی بەولاوە جێگایەكی تریان نەبینیبوو، كەچی هەركات من باسم لە زوڵمەتی جەنگەڵ و تاریكی نیشتووی سەر سینەی ئاو دەكرد

ئەوان پێکڕا ترس دایدەگرتن، من بەوەدا دەمزانی تاریکی ناو خەیاڵ لە تاریکییەکانی دیکە جیاوازترە، ئەو منداڵانە بە تاریکی ڕاستەقینە ڕاهاتبوون، بەڵام تاریکی خەیاڵیان نەبینیبوو، لەبەرئەوە وەک من لێیدەترسان. ئەو شەوە لە کەشتییەکە دابەزین و ڕۆشنایی گوندێکی نزیکمان بینی و پێکڕا بەپێ بەرەو ڕووی ڕۆیشتین، گوندێکی پاک و پڕ خانووی نوێ بوو، لە ڕێگای کۆمەڵێک ئاسکی زامدارەوە کە بە برینداری بەرەو ڕوومان ڕایاندەکرد تێگەیشتین گوندەکە بەشێکە لە خاکی شکارستان، خاکی ئەو ڕاوکەرانەی هەمیشە لەگەڵ نێچیرە کوژراوەکانیاندا دەژین.

تا دەڕۆیشتین پتر ڕاوکەرمان دەبینی بە خۆیان و تفەنگە درێژ و جلە سەیرەکانیانەوە دەهاتن و دەچوون، زۆربەیان غەمگینبوون، بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە سەیربوو، ئەو نێچیرە بریندارانەبوون کە بە کوچەکاندا دەسوڕانەوە، ئەو ئاسکانەی بە خوێنەوە دەگەڕان، ئەو کەروێشکانەی لە نێوان باغ و چیمەنەکاندا یاریاندەکرد و ئەو کۆترە کوژراوانەی لەسەر شانی ڕاوکەرەکانیان نیشتبوونەوە. لەو شارەدا زۆربەی ئەو جانەوەرە سەیرانەمان بینی کە مرۆڤ بە درێژای مێژوو ڕاویکردون، ئەوە یەکەمجاربوو منداڵە نابیناکانم وا بەڕوونی هەندێک باڵندە و ئاژەڵ ببینن، ئەو باڵندە و ئاژەڵانەی من لە فلیمەکاندا بینیبووم و ئەوان نەیانبینیبوون. سەیرمان لێهات کاتێک تێگەیشتین هیچ ڕۆحلەبەرێک نەماوە مرۆڤ ڕاوی نەکات، لە زەرنەقوتەوە بیگرە تا شێر و پڵنگی زۆر دڕ. لەو شارۆچکەیەدا ماسیگرەکانمان بینی بە خۆیان و تۆڕەکانیانەوە، ماسییەکانمان بینی لە ڕوباری گەورە گەورەدا مەلەیاندەکرد، بە تەنیشت ئاوێکی بێکەراندا ڕۆیشتین، شوێنێک لە کۆتایی زەریایەکی گەورە دەچوو، لەوێدا نەهەنگی غەمگینمان بینی لە ئاوەکان سەریاندەردەهێنا و سەیریاندەکردین، چاویان هێندە سەیر و نیگایان وەها پڕ غەمبوو،

کەشتییەوانە بچوکەکانی من گریان. ئیدی ئەوە کێشەی هەرە گەورەی زۆربەی شوێنە خەیاڵییەکانە، تۆ بە حیسابی جێگایەکی چکۆلانە دەچیتە ناوی، بەڵام هێدی هێدی دەکرێتەوە، پڕدەبێت لە ڕوباری تر، پڕدەبێت لە دەریا، لە کوچەی ئەوتۆ کە کۆتایی نایەت، سەرشاردەبێت بە نەخشەی گەورەتر و سەیرتر کە هەرگیز لە کاتی ئاساییدا لەسەر ئەو نەخشە بنەڕەتییەی تۆ دیارنین. بۆیە سەفەری خەیاڵ هیچ وەخت لەسەفەری ڕاستەقینە ناچێت، لەسەفەری ڕاستەقینەدا مرۆڤ دەزانێت بۆ کوێ دەچێت، بەڵام لەسەفەری خەیاڵدا تاکە شتێک بکرێت لێی دڵنیابیت ئەوەیە ئایا دەڕۆیت، یان وەستاویت. هەتا زانینی ئەوەش ئاسان نییە، ئاە، هیچ شتێک لە سەفەرێکی خەیاڵدا ئاسان نییە. هەموو گەشێکی ڕاستەقینە بەسەر زەمینی خەیاڵدا، گەشتێکی خاو و بە کاوەخۆ و هێمنە، ئەو ماوەیەی بۆ بینینی هەموو دونیا دەمانەوێت، هەزارانجار لەو ماوەیە کەمترە کە بۆ بینینی تەواوەتی یەک شاری خەیاڵی پێویستمان پێیەتی. ئەو شەوە لەو شارەدا هەندێک ماسیگر داوەتی ماسی خواردنیان کردین، من خۆم کەسێکی ماسی خۆر نیم، بەڵام ماسی خەیاڵ جۆرە تامێکی تری هەیە، لە ڕۆخی ئاوێکی هێمن لەگەڵ کۆمەڵێک ڕاوکەری پیردا خۆشترین ماسی ژیانمان خوارد، خواردنێک کە ئێوە هەرگیز ناتوانن بیخۆن، چونکە ئەوەی نەوێرێت سوار کەشتییەکی خەیاڵی ببێت و لەگەڵ سەرداریاشییەکی وەک مندا بەرەو نادیار سەرکەوێت، تامی خۆراکە خەیاڵییەکانیش ناکات. دەبێت پێتان بڵێم کە ئەو ڕۆژانەی سوار کەشتییەکە دەبووین، من و منداڵە خەیاڵییەکانم بەدرێژایی ڕۆژەکە هیچ جۆرە خواردنێکی ڕاستەقینەمان نەدەخوارد. دڵنیابووین، ئەم کەشتییە دەمانباتە شوێنی ئەوتۆ کە خوانی خەیاڵی تێدایە. ئێمە لەو سەفەرانەدا گەلێک میوەی خەیاڵی و سەوزەی نەبینراو و داوەتی ئەفسانەیمان خواردبوو، هەمیشە لە خەیاڵدا

سفرەیەکی ئاوەڵا هەیە کە دەتوانیت لەسەری دانیشیت. ئێمە ئەو شەوە کاتێک گازمان لەو ماسییە خەیاڵیانە دەگرت، پەرینازی چکۆلانە کە تاکە گیاخۆری تیپەکەمان بوو، هەندێک گوڵی چکۆلانەی دەخوارد، هەندێک گوڵ کە بەدرەختێکی سەیرەوە بوو، درەختێکی تاقانە و غەمگین، وەک ئەوەی شەیتان بۆ فریودانی ئێمە لەوێدا ڕوواندبێتی. درەختێک بوو، گوڵە سپییەکانی لە گوڵی دارچوالەیەکی سەروەرزی بەر دەچوون، بەڵام بێگومان دارچوالە نەبوو. لە کاتێکدا ئێمە سەرقاڵی دەرهێنانی ئەو دڕکە خەیاڵی و نازکانەبووین لە ماسییەکان، پەریناز لە ناکاو زگی دایە ژانێکی کوشندە، ژانێکی نائاسایی، من ئەوەتەی هەم لەوە دەترسم ڕۆژێک درەختێکی ژەهراویمان تووش بێت و هەمووومان بکوژێت، چونکە دەزانم دارستانەکانی خەیاڵ پڕن لە درەختی ژەهراوی. ئازارەکانی پەریناز وەها توند و ترسناک بوو، من دەستەپاچە و بێکار ماوەیەک سەیرمدەکرد، هەموو واماندەزانی دەمرێت، من ترس دەستی بەستبووم و زمانی گرتبووم، سەیرم لێهات کاتێک ئەو ماسیگرە خەیاڵیانەم بینی، پەریناز هەڵدەگرن و بەرەو کەشتی گەڕانەوەمان دەیرفێنن، ئەوان ڕادەکەن و ئێمەش بە دوایاندا. من لەگەرمەی ڕاکردندا هۆشم دەهاتەوە بەر خۆم، دەمزانی دەبێت بەپەلە پەریناز بگەێنمە خەستەخانە، من بەرپرسی ئەم منداڵە کوێرانەبووم، بەڵام لە ڕاستیدا باوەڕم نەدەکرد ژەهرێک بە خەیاڵ بیخۆیت بەڕاستی ژەهرخواردتبکات. کە گەیشتینە کەشتییەکە من بەرەو باشوور پێچم پێکردەوە و وەک شێت بەرەو دوا گەڕامەوە، مرۆڤ هەرگیز نازانێت چۆن و لە کوێدا لەو نەخشەیە دێتەدەرێ، بەڵام هێند لەو ئەفسونی خەیاڵە دابەزین، پەرینازمان بینی بەڕاستی بیمارە. وەک یەکێک فەرزەندێکی خۆی لە مردن ڕزگاربکات، بە منداڵەکاندا هەواڵم بۆ کەسوکاری نارد و بەدەست هەڵمگرت و بە پەلە گەیاندمە بیمارستان، کە گەیشتینە ئەوێ پەریناز هێشتا ژیانی

تیا مابوو، بەڵام کەس نەیدەزانی دەژی یان دەمرێت. بە پارەوی بەشی چارەسەری خێرادا باوەشمکرد و فڕاندم، لەگەرمەی پاکردندا، هەستمکرد کەسێکی تر لە تەنیشتمەوە رادەکات، کەسێکی نەناس، کەسێک رۆژێک لە رۆژان نەمبینیوە. لە کاتێکدا هەردووکمان بە پارەوەکەدا رامانەکرد، ئەو پیاوە بە قەڵافەت و نەناسە پێیگووتم «من ناوم «میر سەفین» ـە، خەڵکانێک بە «بارۆنی بوکەشوشە» بانگمدەکەن، مەترسە، من لەگەڵتدام، من خاڵی پەریناز من کۆمەکتدەکەم». من بەدەم راکردنەوە گووتم «زۆر سوپاس بۆ لوتفت. هەڵبەت پێویستیم بە یارمەتی دەبێت». من خێراتر رامدەکرد و تەواو حاڵی نەدەبووم ئەو دەیگووت چی. لە بەر پەریناز «کە لە نێوان ژیان و مردندا دەگەڕا» ئاگام لە هیچ نەمابوو، بەڵام ئەو راکردنە خێرایەی ئەو پیاوە، ئەو سەرە کەچەڵە بێتووکەی، ئەو ریشە سپییە بریقەدارەی، ئەو دەنگە پڕ مۆسیقایەی لە خەیاڵ و گوێمدا مایەوە. شەوێ کە سەرم خستە سەر جێگاکەم بۆ ئەوەی بخەوم، لە ناکاو راچڵەکیم و ناوەکەیم بیرکەوتەوە «بارۆنی بوکەشوشە... بارۆنی بوکەشوشە... بارۆنی بوکەشوشە». وەک ئەوەی کەوتبێتمە ناو چاڵێکی تاریکەوە، وەک ئەوەی دەملووشێک قووتمدا، هەستێکی تەڵخ و قورس لەسەر دڵم نیشت. هەستمدەکرد هێزێک بە خێراییەکی گەورە بەرەو خوار رامدەکێشێت، بەرەو ناخێکی زۆر دوور و تاریک، بەرەو جێگایەک کە نازانم کوێیە.

ئەو شەوە خەوتم و خەونم بە بارۆنی بوکەشوشەوە بینی، کە شان بە شانی من لە ساڵۆنی درێژی بیمارستانەکەدا بە خۆی و ریشە سپییە بریقەدارەکەیەوە رایدەکرد و قسەیدەکرد.

## زانیارییەکانی شبر دەربارەی بارۆنەکان

لـەو ڕۆژەوەی لەگـەڵ شـبردا بووینـە هـاوڕێ، هەوڵمـدەدا بیـر لـە ڕابوردوونەکەینـەوە. مـن و ئـەو ڕابوردوویەکـی هێنـد پـاک و سـەرفەرازمان نەبـوو، بیکەینـە بابەتـی گفتوگۆ. هـەردووک ڕقمـان لـە ڕابـوردووی خۆمـان بـوو، بـەڵام ئـەو نەفـرەت و پشـتهەڵکردنە لـە ڕابـوردوو لای مـن بـەرەو گۆشـەگیرییەکی سـەخت ڕاپێچیکردبـووم، کەچـی بـۆ شـبر هێنـد قـورس و پرسـوێ نەبـوو. شـبر بـۆ هـاوڕێ و کەسـانی نزیکـی خـۆی کوڕێکـی دڵسۆزبوو، کەمجار لـە هـاوڕێ و دۆستەکانی دادەبڕا. هەڵبـەت ئـەو چەند سـاڵەی دوایـی زۆر لـە دۆسـتە نزیکەکانـی بووبـوون بـە بەرپرسـی بـەرز و کەسیان بیریـان لای ئـەم کـوڕە قـژزەردە چاوکاڵـە نەبـوو کـە بێکەس لەسـەر عەرەبانەیـەک دەسـوڕایەوە. لـە حیزبـدا هێنـدەی دوو هەفتـە ونبویـت و سەروفەسـاڵی خـۆت دەرنەخسـت ئیـدی کـەس حیسـابت بـۆ نـاکات. ئـەوکات مـن خۆشـحاڵانە یارمەتـی شـبرم دەدا، کۆمەککـردن بـەو کـوڕە بووبـوو بـە بەشـێکی ژیانـم، زۆربـەی ڕۆژ لـە بەهـار و هاویـن و پاییـزدا، ئێوارانـی شـاد و پـڕ تیشـک، کاتێـک سـێبەری فێنکی پێش مەغریـب ئومێدی بـۆ دەهێنایـن، پاڵـم بـە عەرەبانەکـەی ئـەوەوە دەنـا و دەمگێـڕا. شـبرۆک هێنـدە قسـەخۆش و ڕووکراوەبـوو، ناسـیاوییەکی بەربـڵاوی بـۆ خـۆی پەیداکردبـوو، خەڵـک تێنەدەگەیشـتن مـن بـەم دەموچـاوە مۆنـەی خۆمـەوە، چـۆن هاوڕێـی ئـەو کـوڕە ڕووخۆشـەم کـە دونیـا دەلاوێنێـت و بێـڕۆح دەهێنێتـە زمان و بە ڕاسـت و چەپـدا قسـەی شـیرین بڵاودەکاتـەوە. پێشـتر ئادەمیزادێکم نەبینیبـوو بـە ئەنـدازەی ئـەو بگۆڕێـت، بـوو بـوو بـە ئادەمیزادێکـی کـراوە و ئامـادە بـۆ لێبـوردن. دیـارە لـە نـاو بـازاڕدا خەڵکانێکـی زۆر هەبـوون منیـان نەدەناسـی، زۆربـەی خەڵـک سـەردەمانێک نـاوی حەسـەن تۆفانیـان بیسـتبوو، بێئـەوەی

بزانن کێیە، ئێستاش ئەو سەردەمە بۆ هەتاهەتایە بەسەرچووبوو، من هەر کەسێکم بناسیبایە تکام دەکرد بە حەسەن پیرۆ بانگمبکات، نەمدەویست کەس ناوی تۆفانم لێبنێت، چیدی لە هەوڵی ئەوەدا بووم ڕوخساری خۆم لە پیاوکوژێکی بەناوبانگ و ناسراوەوە بگۆڕمە سەر شێوەی کەسێکی بێدەنگ کە هەست و نەستێکی ئاشکرای نییە. لە ڕاستیدا زۆرکەم لە جەنجاڵی بازاڕ و قەرەباڵغی گەورە نزیکدەکەوتمەوە. ئێواران کە شبرم دەگێڕا، زۆربەی کات تا ئەو جێگایەی مەبەستی بوو دەمگەیاند و لەگەڵ دۆستەکانی خۆیدا جیمدەهێشت و دەڕۆیشتم. ژیانم بێدەنگییەکی گەورە و ئارامییەکی بێسنوور باڵی بەسەرا کێشابوو، دەگەڕام و هەستمدەکرد کەس لەم شارەدا نامناسێت. ئەو خەڵکانەی من لەگەڵیاندا گەورەبووم یان لە جەنگدا کوژران، یان بۆ هەندەران ڕۆیشتن، یاخود بووبوون بە پارەدار و دەسەڵاتدار و منیان نەدەناسی. ئەو بێدەنگییە سەرسامیدەکردم، حەزمدەکرد تا بتوانم ئەو هێمنییە قووڵتر و قووڵتر بکەمەوە. لەو سەردەمانەدا هەستمکرد توانایەکی سەیرم تیا دروستبووە، توانایەک هیچ ئادەمیزادێک نییەتی من نەبێت، دەمتوانی بیستنم دابخەم و بیکەمەوە، چۆن خەڵکی بە ئارەزووی خۆیان دەتوانن قسەبکەن و بێدەنگبن، من دەمتوانی بە ئارەزووی خۆم گوێبیگرم و گوێنەگرم. دەمتوانی گوێی خۆم داخەم و لە بێدەنگییەکی بێسنووردا نوقمببم. زۆرجار لەو چایخانە لاتەریکانەدا دادەنیشتم و چەناگەم دەخستە سەر سنگم و بەسەعات لە هێمنییەکی گەورەدا نوقمدەبووم، لەو ساتانەدا جگە لە بۆنی گوڵ لە هیچی دیدا نەدەژیام. زۆر ڕۆژ هەبوو حەزمدەکرد مرۆڤێک هەبێت قسەی بۆ بکەم، بەڵام کەس نەبوو. شبر هاوڕێی لە من زۆرتر بوو، لە من زیاتر شارەزای دونیا بوو، ئەو هێشتا ئارەزوویەکی قووڵی هەبوو بزانێت لە دونیادا چی دەگوزەرێت، من بە پێچەوانەی ئەوەوە ئارەزوویەکم نەمابوو بزانم لەم مەملەکەتەی

ئێمەدا چی دەقەومێت و چی ڕوودەدات، دەترسام هەر تێوەگلانێکی نوێ گیرۆدەی سیاسەتم بکاتەوە، خۆم وەک یەکێک دەهاتە پێشچاو کە بە پەڕەشوت لە ئاسمانەوە کەوتۆتەخوارێ و هاتۆتە شارێکەوە کە ناتوانێت لەگەڵیدا ببێتە دۆست. کە وا دەڵێم مانای ئەوە نییە کە من لەم شارەدا نامۆم و بەس، لە ڕاستیدا من لە هەموو دونیا نامۆم، لە ئادەمیزاد نامۆم و لە خۆم نامۆم. لە دوای کۆچی دوایی دایکم و گەڕانەوەم بۆ دونیا، هێشتا هەر بێدەنگ و غەریببووم. ڕەنگە تا ئێستا زۆربەتان چەندجار پرسیارتان کردبێت، پیاوکوژێکی وەک من، مەخلوقێکی بێسوود و لە کارکەوتووی لە وێنەی حەسەنی پیزۆ، چکۆلە و دێز و ناشیرین و منگن چی کردی بە هاوڕێی خەڵکانێکی ناسکی وەک تریفە یابەحری و غەزەلنوس؟. خۆم دەزانم، من جگە لە تفەنگی ژەنگاوی سەردەم و زەمانێکی تر، هیچی دی نیم. لە کۆنە پیاوکوژێکی لێکەوتەی حیزب بەولاوە هیچی دی نیم. زۆرشەو لەگەڵ شبردا قسەمان لەوە کردوە، ئێمە چەقۆی کولی ناو مۆزەخانەیەکی داخراوین، کەرەستەیەکی کۆنی تاوانین کە هێشتا خوێنی قوربانییەکانمان لەسەرە و کەس نەیسڕیوین. ئێوە هەقتانە وابڵێن. من کەسێکی لەوە خراپتربووم شایستەی ئەو جۆرە مەعشەرە ناسک و میهرەبانە بم، بەڵام ژیانی منیش وەها ڕۆی، گوڵاوە ئەفسووناوییەکەی پیزۆ منی وابرد کە دەبایە لە ناو ئەو ڕۆحلەبەرە ساف و پاکژانەدا بگیرسێمەوە.

بێئاگای خۆم بووم بە یەکێک لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان. لە ڕاستیدا مرۆڤ نازانێت چۆن دەبێتە ڕۆحلەبەرێکی خەیاڵی، شەوێک لە شەوان هەندێ پیریژنی ڕوخۆش هاتن بۆلام و گووتیان حەسەنی پیزۆ تۆ دایکت قوتابخانەیەکی گەورەی گوڵاو دروستکردن بوو، کلیلی زۆربەی باغە عاسییەکانی دونیا لای ئەو بوو، هەموو کلیلەکانیشی بۆ تۆ بەجێهێشت، ئێستا تۆ بتەوێت و نەتەوێت کلیلداری دەیان باغیت کە بێ

تـۆ گوڵەکانیـان دەمرێـت، ئێسـتا وەرزی ئـەو گوڵانەیـە و سـاتی گرتنـی گوڵاوە لـەو باغانـە، گـەر تـۆ ئـەو دەرگایانەمـان بـۆ نەکەیتـەوە، دەیـان جـۆر گوڵـی خەیاڵـی دەمـرن. مـن هیـچ لـەو پیرێژنـە ڕوخۆشـانە تێنەگەیشـتم کـە هەموویـان بـە جلـی ڕەش و لەچکـی ڕەش و کۆڵوانـەی ڕەشـی سەرشـانەوە هاتبـوون بـۆلام. شـەوێک لـە شـەوە تاریـک و ئەنگوسـتەچاوەکان مـن لەگـەڵ کۆمەڵێـک پیرێژنـی ڕوخـۆش و دەم بـە خەنـدە و سـوحبەتچیدا کەوتمـە ڕێـگا بـۆ جێگایەکـی نەزانـراو، پێموایـە هەمـوو سـەفەرە سـەیرەکانی مـرۆڤ لـەو هەنـگاوەوە دەسـت پێـدەکات، کـە بـە ئاڕاسـتەیەکی نەزانـراو دەینێـت. بـۆ ئـەوەی ببیـت بـە ڕۆحلەبەرێکـی خەیاڵـی دەبێـت سـەرەتا ئـەو هەنـگاوە بنێیـت، جارێـک لـە جـارەکان ڕێگایـەک بگریتەبـەر کـە نازانیـت بـۆ کـوێ دەچێـت. مـن باوەڕێکـی زۆرم بـەو پیرێژنانـە هەبـوو، بـەڵام نەمدەزانـی چ نهێنییەکیـان لـە ژێـر سـەردایە، مانـای ئـەو کلیلانـەش کـە دایکـم جێیهێشـتن گینگڵیـان پێـدەدام. دەمزانـی جگـە لـەم پیرێژنانـە هیـچ کەسێکی دی نییـە ئـەو نهێنییـەم بـۆ واڵابکات. ئیتـر دەبایـە هێـز بدەمـە خـۆم و کلیلەکانـم لـە جێگایەکـی نهێنـی دەربهێنـم و دوای ئـەو پیرێژنـە جوانانـە بکـەوم کـە بـەردەوام باسـی کۆمەڵێـک باغـی سیحراویان بـۆ دەکـردم، گـەر بێـت و مـن فریایـان نەکـەوم دەمـرن و وشـکدەبن. ئـەو شـەوە پیرێژنـەکان منیـان بـەرەو گەڕەکێـک بـرد کـە پێشـتر هەسـتم نەدەکـرد ئـەم شـارە شـوێنی وەهـای تێدابێـت، نـاوی «هەزاربـاغ» بـوو. پێشـتر نـاوی ئـەو گەڕەکـەم نەبیسـتبوو، گەڕەکێکـی گـەورەبـوو، پـڕ لـەو پیرێژنانـەی شـەو و ڕۆژ گوڵاویـان دەگـرت، بۆنـی کوچەکانـی پڕبـوو لـە بـۆن عەترێـک مەسـت و شـەیدای دەکـردی. لـە سـەرەتای کوچـە بۆندارەکانـدا کۆمەڵێـک پیرێژنـی تـر پێشـوازیان لێکـردم، هەموویـان بـە جۆرێـک لـە جـۆرەکان لـە پیـرۆزی گـوڵاو دەچـوون، ئـەوان بـەرەو باغێکـی گـەورە پێشـمکەوتن، لەویـادا ئـەو گوڵـە سـەیرانەم بینـی کـە ڕەنگـە تەنهـا لـە بەهەشـتدا هەبـن. مـن لـە سـاڵانی گۆشـەگیریدا هەندێـک

لەو گوڵانەم بینی بوو، بەڵام بەوەدا پیاوێکی گوڵناس نەبووم، ژیانم دوور لە دونیای ڕەنگین و قەشەنگی لالەزار و باغچەکان بردبووە سەر، هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان لە پیرۆم نەپرسی، ئەرێ پیرۆ گیان ئەم گوڵانەت لە کوێ بوو، نەمپرسی ئەمە چ باغێکە ئەم هەموو گوڵە عاجباتییانەی لە خۆگرتووە. ئەوە یەکەمین شەوی ژیانی من بوو بە ڕونی تێبگەم، لە پشت ئەم ژیانە سادە و ئاساییەوە، من ماڵێکی دیکەم هەیە دەتوانم پەنای بۆبەرم. دیمەنی ئەو باغە سیحراویانە لە ژێر شەوقی مانگەشەودا بەجۆرێک سەرسامیکردم، حەزمدەکرد هەرگیز نەیەمە دەرێ، هەرگیز ڕوو لە جێگایەکی تر نەکەم. هەر کاتێکیش گەیشتیتە جێگایەک و ویستت نەیەیتەدەرێ، ئەوا دڵنیابە پێتناوەتە سەر زەمینی خەیاڵ. پیرێژنەکان منیان گەیاندە بەر هەندێک دەرگای داخراو، کە دەبایە بە کلیلەکانی خۆم بیانکەمەوە، دوای تاقیکردنەوەی یەک بە یەکی کلیلەکان، هەموو دەرگا داخراوەکانی ئەو باغە خەیاڵییەم کردەوە، لەگەڵ پیرێژنەکاندا چوومە گوزەری پێچاوپێچی ئەو گوڵستانە گەورانەوە، گوڵی وەها سەیرم بینی هیچ شاعیرێکی دونیا بە خەون نەیبینیوە. باغەکان وەها جوانبوون دەکرا مرۆڤ تا مردن بە ناویاندا بگەڕێ و هەست بە ماندووبوون نەکات، لەو باغانەدا من ڕابوردووی خۆم بیرچووەوە، پێشتر هەستم نەدەکرد بشێت باغی وەها گەورە دەرگا لە حەسەن تۆفان بکاتەوە. ئەو شەوە سەرەتای ئاوارەبوونی من بوو لە باغی پیرێژنە خەیاڵییەکاندا، باغی ئەو دایکە پیر و پاکانەی بەهەشتێکی نهێنیان بۆ خۆیان دروستکردبوو، لەوێوە بەشی هەموو ئەم شار و مەملەکەتانەی نزیکمان گوڵاویان دروستدەکرد. لەو شەوەوە من بووم بە یاوەری ئەو خاتوونە سەنگین و سەلارە پیرانە کە لە جیهانێکی پڕ گوڵ و گوڵزاردا منیان دەگێڕا و هەر شەوەی دەرگای باغێکیان پێدەکردمەوە و هەر جارەی جۆرە گوڵێکیان پێ ئاودەدام. هەر ئەو پیرێژنە سەروزمان

شـیرینانەش منیـان بـە غەزەلنـوس ناسـاند. غەزەلنـوس یەکێـک بـوو لـەو پیـاوە زۆر دەگمەنانــەی گەیشـتبوونە ئـەم باغـە. مـن لەوێـدا غەزەلنوسـم ناسـی، لەویـادا بـووم بـە هاوڕێـی ئـەو. غەزەلنـوس لـە ژیانـی جەنجاڵـی خۆیدا وەک بەناوبانگترین غەزەلخوێنـی وڵات بڕێکـی زۆر ڕۆحلەبـەری خەیاڵی ناسـیبوو، یەکێـک لەو ڕۆحلەبەرانـە «گوڵسـتان خـان» بـوو، کـە بەرپرسـی چەندین باغـی ئـەم گوڵسـتانە بـوو. گوڵسـتان خـان کچێکـی ئێجگار جوانـی دەبێـت کـە سسـتەری خەسـتەخانەیە و بـەردەوام بـۆن گوڵاوێکـی سـەیر لـە پـرچ و هەناسـەی دێـت، بۆنێکـی وەهـا هـەر کەسێک بەلایدا دەڕوات دەم و دەسـت عاشـقی دەبێـت. بۆنێـک نەخۆشـەکان لـە دەردێـک چاکدەکاتـەوە و دەردێکـی تریـان دەداتـێ. کچەکـە نـاوی سـەبرییە، جوانـی نیگاکانـی و بـۆی پـرچ و هەناسـەی سـاڵانێک دەبێتـە سـەردێڕی گـەورەی گۆرانیبێـژان و بابەتی یەکەمـی حەیرانبێژانـی ئـەم دەڤـەرە. ژمارەیـەک خەڵـک هێنـد شـێتانە عاشـقی سـەبری دەبـن دەیانەوێـت لـە بـەر پێیدا بمـرن و دەیانیـان شـەوان وەک پاسـەوان لـە بەرقاپـی ماڵەکەیدا بخـەون، کچەکە سـەری لـێ تێکدەچێت و نازانێـت چـۆن لەدەسـتیان هەڵبێـت و بـەرەو کـوێ سـەری خـۆی هەڵگرێت. بـۆ ئـەوەی لـە نەفرەتـی ئـەو هەمـوو عەشـقە ئـازاد بێـت، بـۆ ماوەیـەک خـۆی لـە نـاو گوڵەکانـی گەڕەکـی هەزارباغدا دەشـارێتەوە. ئەگەرچـی پیرێژنەکانـی هەزاربـاغ ناهێڵـن منداڵەکانیـان بێتـە ئـەم کوچەیـە، چونکـە هـەر گەنجێـک ڕوو لـەم باغانـە بـکات، بـە جۆرێـک شـێت و شـەیدای گوڵـەکان دەبێـت، ژیانـی بیردەچێتـەوەو دونیـای ڕاسـتەقینە فەرامۆشـدەکات. بـەڵام سـەبری کـە لـە منداڵییـەوە بـۆن گـوڵاوی نـاو ڕەحمـی دایکـی گرتـووە، پیرێژنـە بەڕەحمـەکان وەک کچێکـی بەدبەخـت تەماشـایدەکەن کـە دەبێـت دەردی جوانـی بکێشـێت. بـۆ ئـەوەی سـەبری لـە گۆرانیبێـژ و و شـاعیر و عاشـقە بێشـومارەکانی بشـارنەوە، ماوەیـەک لـە نـاو گوڵـە خەیاڵییەکانـدا داڵـدەی دەدەن. بـەڵام ئـەو باغانـە بەجۆرێـک سـیحراوین گـەر مـرۆڤ زۆر لـە ناویانـدا

مایەوە، ناتوانێت جارێکی دی بەرگەی بینینی شتە ئاساییەکان بگرێت و بگەڕێتەوە بۆ دونیا. سەبری کە بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام لە باغەکاندا دەژی، ئیدی ناتوانێت بێتەوە دەرێ و دەبێت بەبەشێک لە باغەکان... کچەکە تاقانەی گولستان خانیشە، نوقمبوونی کچە لە بەحری بێسنووری گوڵدا، مەراقێکی گەورە تووشی دایکی دەکات کە وەک هەر دایکێکی دی حەزی لێیە کچەکەی شووبکات و ببێتە خاوەنی مێرد و منداڵێکی پاک و ئاسایی. هەرچی هەوڵێک گوڵستان خان دەیدات بۆ هێنانەوەی سەبری و دەرهێنانی لە سنووری گوڵزارەکانی هەزارباغ بێسوودە، ئەو بەردەوام لە ناو باغەکاندا دەسوڕێتەوەو دەڵێت « شوو ناکەم». دواجار پیرێژنەکان هەوڵدەدەن سەبری بە شتێکی سیحراویتر لە سیحری گوڵەکان ڕاکێشنەدەرێ. تاکە شتێک کە لە ئەفسون و سیحریدا بەرتەقای جوانی و ئەفسونی گوڵەکانە، شیعرەکانی غەزەلنوسە. پیرێژنە گوڵاوسازەکان کە زۆر لەسەر پاراستنی نهێنی ئەم باغانە سوورن، ناچار حەقیقەتی خۆیان وەک کۆمەڵێک مەخلوقاتی خەیاڵی لای غەزەلنوس ئاشکرادەکەن و بەرەو گەڕەکی هەزارباغ پێشیدەکەون. غەزەلنوس کە دەگاتە ئەو باغانە بەجۆرێک سەراسیمە و سەرسام دەوەستێت، وەک ئەوەی کەوتبێتە خەیاڵێکەوە قووڵتر لە هەر خەیاڵێکی پێشینەی تر. ئەویش وەک من، چەندین جار بەڕۆژ بەلای هەزارباغدا تێپەڕیبوو، بەڵام وەک هەزاران هەزار خەڵکی دیکەی ئەو شارە نەیدەزانی ئەم گەڕەکە ناچیزەی لە کاتی ئاساییدا بە گەڕەکی سێباغ دەناسرێت، شەوان کاتێک دونیا دەخەوێت، دەگۆڕێت و جوانی ڕادەپەڕێت و دەبێتە گوڵستانێکی گەورە. لەو باغەدا غەزەلنوس بۆ یەکەمجار سەبری بینی... تا ئەو کات وایدەزانی سەبری تەنها کچێکە لە دەستکردی خەیاڵی گۆرانیبێژە میللییەکانە. چیرۆکی غەزەلنوس و سەبری چیرۆکێکی درێژە کە دواتریش باسدەکرێت. بەڵام گرنگ ئەوەیە من لە کۆتاییەکانی

سەدەی بیستدا، لە شەوێكی تاریک و فێنكی هاویندا كاتێک پیاسەیەكی دوور و درێژم بە باغە خەیاڵییەكاندا دەكرد، لە پێچی یەكێک لە كوچەكانی گوڵستاندا گوێم لە قەسیدەیەكی ئەفسوناوی غەزەلنوس بوو، كە لە ژێر شەوقی مانگەشەودا بۆ سەبری دەخوێندەوە. ئەو شەوە كە لە ناو بۆن و بەرامەی ئەو گوڵانەدا گوێم لەو قەسیدانە بوو، هەستمكرد شتێک قووڵ لە ژیانمدا گۆڕاوە، گوێگرتن لە غەزەلنوس دەرفەتێكی گەورەی پێبەخشیم ڕۆحی خۆم بناسم، من تا ئەو ساتەی گوێم لەو غەزەلانە نەبووبوو لە بوون و نەبوونی ڕۆح دڵنیانەبووم. ئەو شەوە بە نهێنی تا درەنگ گوێم لە غەزەلنوس گرت، بەربەیان خۆم لێئاشكراكرد و گووتم تا مردن ناتوانم ئەم شەوەم بیربچێتەوە، تا مردن لە ژێر كاریگەری ئەو غەزەلانەدا دەژیم و سیحری ئەو شیعرانە لە دڵم ناچنە دەرەوە. دیارە ئێستا هەموو سەیرتان لێدێت پیاوكوژێكی وەک من كە زۆركەم سەروكارم لەگەڵ شیعردا هەبووە، ئاوها بكەومە ژێر سیحری ئەو قەسیدانەوە. لە ڕاستیدا شیعرەكانی غەزەلنوس و بۆنی گوڵەكان و جوانی مانگەشەو و هێمنی هاوینەی ناو باغ پێكرا ئەو ئەفسونەیان دروستكرد كە من لاواز و كەمتین لە پێشدەمیدا دەركەوتم، بەڵام دواتر وام هەستكرد شیعرەكانی غەزەلنوس سیحری شتەكانی دەوروبەری پێكرا هەڵمژیبوو، لەو ساتەدا بۆنی گوڵەكان و تریفەی مانگ و هێمنی ناو باغچەكە تەنیا لە ڕێگای غەزەلەكانەوە دەردەكەوتن. من لە كازیوەی ئەو ڕۆژەوە بوومە هاوڕێی غەزەلنوس، هەر ئەو بەیانییە سەربوردی خۆم لە نوكەوە بۆ گێڕایەوە. حیكایەتی من بەجۆرێک مایەی سەرسوڕمانی بوو تا ماوەیەكی درێژ باوەڕی پێنەدەكردم. پێش من پیاوكوژی دیكەی نەناسیبوو، هەرگیز باوەڕی نەدەكرد من یەكێک بم لەوانەی دەستم لە كوشتنی ژناندا هەبووە. بەڵام دەبووایە هەموو شتێكی لا بدركێنم، بڕیارمدابوو ڕابوردووی خۆم لە ڕۆحێكی وەها پاک نەشارمەوە، لەو

شەوی غەزەلەوە ئەو کوڕە قژلوولە غەمگینە بوو بە نزیکترین هاوڕێم. ئێستا دەڵێم گەر غەزەلنوس حەقیقەتی منی نەزانیبایە ئەستەم بوو لە ناو چەندین ڕۆحلەبەری خەیاڵییدا، من بۆ نوسینی ئەو کتێبە دەربارەی مێژووی مردن هەڵبژێرێت. ئەو شەوە کە پێکەوە تەرمەکەی موراد جەمیلمان دەرهێنا هەستمکرد بە ڕاستی وەک یەکێک لە خۆیان حیسابم بۆ دەکات، وەک یەکێک لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییە ڕاستەقینەکان. من کە چوومە ناوەوە زوو تێگەیشتم غەزەلنوس زۆر پێویستی بە منە، گەرچی غەزەلنوس شارەزایەکی وردبوو، ژیانی ئەم شارەی وەک کتێبێک سەیردەکرد کە بەرگی پێشەوەی حەقیقەت و بەرگی دواوەی خەیاڵە، لەگەڵ ئەوەی ئێجگار شارەزای هەردوو دونیاکە بوو، بەڵام هێزی ئەوەی نەبوو وەک من بڕواتە ناوەوە، بۆ ئەو جێگایەی ماشێنەکانی مردن ئیشدەکەن. من کوڕی ڕاستەقینەی ئەو دونیایە بووم، لەو دونیایەدا گەورەبووبووم، برغو بە برغو شارەزای مەکینەکان بووم، دەمزانی چۆن ئیشدەکەن و کەی ئیشدەکەن. غەزەلنوس لە من زیاتر دونیای دیبوو، بەڵام ئەو دونیایەی ئەو بینیبووی لەو دونیایە نەدەچوو کە من بینیومە، ئەو ڕۆژێک لە ڕۆژان لە نزیکەوە تێکەڵاوی دونیای سیاسەتبازانی کورد نەبووبوو، لەو باوەڕەدام کە سەردەمانێک وەک خەڵکی زۆر پاک و نیشتیمانپەروەر سەیری هەموویانی دەکرد، وەک دەیان هەزار خەڵکی دیکەی ئەم وڵاتە دوای ڕاپەڕین تووشی نائومێدی و غەمۆکی بووبوو. لە دوای ڕاپەڕینەوە بەردەوام بە دوای سەر زەمینێکی خەیاڵیدا گەڕابوو، پێموایە حەزیکردبوو هەموو کوردستان وەک کوچەکانی هەزارباغی لێبێت. من بەش بەحاڵی خۆم تێناگەم، چۆن ڕۆشنفیکرانی ئەم وڵاتە خولیای وا دەپەڕێتە سەریانەوە لە شارێکی وێرانەدا، شارێک کەسانی وەک فازیل قەندیل و تونچی تیادەژین، لە هەموو کونجێکەوە چاوەڕوانی دەرکەوتنی هەزارباغ بکەن، چاوەڕوانی سەرهەڵدانی لالەزارێک بکەن وەک غەزەلنوس

دەیگووت«گوڵاوەکەی بەشی هەموو بەشەرییەت بکات». من هەمیشە گووتوومە، هەندێجار ڕۆشنفیکران دەبنە بێمێشکترین خەڵکی دونیا، ئەوان گەر وەک من تونچی و هیدایەتی گورجیان دەناسی هەرگیز چاوەڕوانی شتی باشیان لەم شارە نەدەکرد. کە غەزەلنوسم لەو باغەدا بینی، یەکەمین شت پێمگووت ئەوەبوو « هێمنی ئەم باغە لەگەڵ دونیادا تێکەڵاو مەکە». لەو ڕووەوە من لە ماجەلانی خەیاڵییەوە نزیکبووم، ئەو کوڕە لە خۆباییە، کە وەک لۆردێکی ئینگلیزی بۆشناخ خۆی دەگۆڕێت و قسە لە کەشتییەکی خەیاڵی دەکات کە بەسەر زەمینێکدا دەڕوات دوورە لە دونیای ڕاستەقینە. من ماجیدی گوڵ سۆلاقم زۆر درەنگ ناسی، ڕاستە ئەو وەک هەموو ڕۆشنفیکرەکان گەنجێکی لە خۆبایبوو، بەڵام دەمانێک دادەنیشتم و پەڕە لە دوای پەڕە چیرۆکەکانی خۆم لە ناو کتێبی مێژووی مردندا دەگێڕایەوە ئەو بە دەستوخەتە قەشەنگەکەی خۆی بۆی چاکدەکردم و بۆی دەنوسیمەوە. گەنجێکی بێمایە و بێزەرەر بوو، تەنیا بە خەیاڵی خۆیەوە دەنازا، بەڵام دەبێت بڵێم ماجەلانی خەیاڵی دەستوخەتێکی هێند جوانی هەبوو، هەرکەسێک سەیری بکردبایە ڕاستەوڕاست دەکەوتە خەیاڵەوە، لەو دواییەدا هەندێجار بە گاڵتەوە ناومدەنا «بارۆنی خەت »، بەڵام ئەو بەردەوام تکای لێدەکردم بە «سەرداریاشی» بانگیبکەم. ئەگەرچی لە هەمووان تەنیاتر و لاتەریکتر و پەرەوازەتر دەردەکەوت، هەموو خراپ سەرکۆنەمان دەکرد، بەڵام ئێستا هەستدەکەم ئەو ڕاستەقینەترین ڕۆحلەبەری خەیاڵی دونیا بوو، هەتا لە غەزەلنوسیش ڕاستەقینەتر و خەیاڵیتر بوو.

ئەو ڕۆژەی ماجیدی گوڵ سۆلاف گەڕایەوەو ناوی بارۆنی مریشکی لەسەر پارچە کاغەزێکی سپی نوسیبوو، من هەستمکرد هێدی هێدی پێدەخەینە ناو هەرێمێکی ترسناکەوە. ئەو ناوە ڕاستەوخۆ فەلەکزانی

ڕیوەڵـەی بەیاداهێنامـەوە. لـە ناوەڕاسـتی سـاڵانی هەشـتادا فەلەکـزان نامەیەکـی پێچـراوەی دامـێ بیبـەم بـۆ سـەرکردەیەکی گـەورەی نـاو چیـاکان. وەک عادەتـی هەمیشـەیی خـۆم، لـە ڕێـگا نامەکەیـم کـردەوە و خوێندمـەوە، لەسـەری سـەرەوە نوسـیبووی «بارۆنـی گەورەمـان، سـڵاوێکی کوردانـە و شۆڕشـگێڕانە». ئـەوە یەکەمینجـار بـوو لـە ژیانمـدا ئـەو نـاوە ببیسـتم، بۆیـە کاتێـک ماجیـدی گـوڵ سـۆلاف نـاوی بارۆنـی مریشـکی خسـتە بەردەسـتم، هەسـتم بـە مەترسـییەکی گەورەکـرد. دیـارە دەبایـە خـۆم دەرنەخـەم و ترسـی پەنهانـم لەوانـی دیکەشـدا نەڕوێنـم. مـن نەمدەزانـی وشـەی بـارۆن یانـی چـی، ئـەوکات بـۆ ئـەوەی کردنـەوەی نامەکـە ئاشکرانەبێت لـە کەسـم نەپرسـی وشـەی بـارۆن مانـای چـی. دوای ئـەو هەمـوو سـاڵە کـە ئـەو نـاوەم بیسـتەوە، ترسـی ئـەو سـەردەمە و سـێبەری ئـەو دونیـا کۆنـەم هاتـەوە بیـر کـە بـەردەوام لێـی هەڵدەهاتـم.

گەرچـی مـن غەزەلنوسـم لـە نـاو باغـە خەیاڵییەکانـدا ناسـی، بـەڵام لەبـەر هۆیەکـی نادیـار هەسـتمدەکرد مـن هەرگیـز ڕۆحلەبەرێکـی خەیاڵـی نیـم، هەسـتمدەکرد خراپـی و پیسـی مـن لـەوە قووڵتـرە ببـم بـە یەکێـک لـەو ڕۆحلەبەرانـە، دەبایـە ڕێگایەکـی سـەخت بگـرم تـا هەسـت بـە پاکبوونـەوە بکـەم. کـە شـەوێک لەبـەردەم غەزەلنـوس و ماجیـدی گـوڵ سـۆلاف و تریفـە یابەحریـدا سـوێندم خـوارد لـە ڕێکخسـتن و پاراسـتنی کتێبی گـەورەی مەرگدا بەشـداربیکەم، دەمزانـی ئـەوە تەنیـا ڕێـگا و تاکـە دەرفەتـی منـە خـۆم بـە هاوڕێـی ڕاسـتەقینەی ئـەوان بزانـم. دەبایـە هەموومـان لـە کۆکردنـەوەی زانیارییەکانـدا کۆمـەک بەیـەک بکەیـن. ئـەوەی مەسـەلەکانی ئاڵۆزکـرد، ئـەو منداڵـە لـووت زلـە بـوو کـە دەیتوانـی مـردووەکان لـە ژێـر زەویـدا ببینێـت و دەریانبهێنێـت. کـە لاشـەکەی مـوراد جەمیلمـان دەرهێنـا، دەمزانـی چیرۆکـی ئـەم لاشـەیە ئیـدی لێناگەڕێـت ئاسـوودە بژیـن. لەگـەڵ بیسـتنی نـاوی بارۆنی مریشـکدا بـووە خولیایەکـی گـەورەم بزانـم ئەو چ جۆرە ئادەمیزادێک و ژنەکەی

ج جۆرە خاتوونێکە. تاکە لەنگەر و کۆمەکم لەو دۆخ و بارە سەختانەدا شبر بوو. شبر لە نزیکەوە ئاگاداری دونیا بوو، کەم شتی گرنگ هەبوو نەیبیستێت. کاتێک بابەتەکەم لا وروژاند و باسی بارۆنی مریشکم لەگەڵداکرد، لە هەیوانە سپی و پاکەکەی خۆیاندا بەتانییەکی دابوو بە قاچیدا و گوێی لە گۆرانییەکی زۆر کۆنی «سێلدا باگچان» دەگرت. کە ناوی بارۆنی لە من بیست، تەسجیلەکەی خامۆشکرد و کەمێک سەرسام گووتی« بارۆنی مریشک؟ تۆ بارۆنی مریشک لە کوێ دەناسیت؟»، من نەدەبایە ڕاستی بڵێم، شبر تا ئەو کاتە هیچ شتێکی لە پەیوەندی من و ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان و سەفەرەکانی من بە گوڵزارەکانی هەزارباغدا نەدەزانی، لەبەرئەوە گووتم هاوڕێیەکم کێشەیەکی هەیە و دۆستێکی ئامۆژگاریکردوە داوای کۆمەک لە ژنی بارۆنی مریشک بکات. شبر گووتی «سەیرم لەوە دێت ناوی بارۆنەکان وەها بڵاوبووبێتەوە، چونکە نازناوی بارۆن جۆرە ناوێکی تایبەتییە کۆمەڵێک خەڵکی تایبەتی لە ناو خۆیاندا بەکاریدەهێنن». من قسەکانی شبرم بە هەل زانی و پرسیم «شبر دەبێت وشەی بارۆن مانای چی بێت؟ پێشتر ئەم وشەیەم بەر گوێ نەکەوتووە و هیچ لە ئەسڵ و فەسڵی نازانم؟». شبر بە زەردەخەنە گەشەکەی خۆیەوە گووتی «هۆ و حەسەنی پیرۆ، بارۆن نازناوی پیاوە گەورەکانە، جۆرە پێشناوێکی ئەوروپییە، ئەوان سەردەمانی زوو بەکاریاندەهێنا، وشەیەکە بۆ خەڵکی خانەدان و شکۆمەند بەکاردێت. وشەکە بە جۆرێکی سەیر هاتۆتە دونیای ئێمەوە، لەم چەند ساڵەی دواییدا کە سەروەت و سامان زۆربووە، خەڵکانێک کە فەرمانڕەوای ئەم وڵاتەن، فێربوون بە یەکتری دەڵێن بارۆن. سەرەتا نازناوێک بوو بۆ پێکەنین. تۆفان تۆ خۆت دەزانیت، ئەوان بە هەموو شتێک پێدەکەنن، بە هەموو شتێک. یەکەمجار بەیەکیان دەگووت میر یان بەگ یاخود میرزا، دواتر کە ئەو نازناوە کەوتە ناوانەوە، شەوان کە دادەنیشتن، کە

دەکەوتنە نوکتە گێڕانەوە لەسەر یەکتری، بۆ گاڵتەکردن ناوی بارۆنیان لە یەکدەنا. یەکەمین کەس کە ناوی بارۆنیان لێنا «غەنی کرمانج» بوو. تۆ دەزانیت غەنی کرمانج کێیە؟ دەیناسیت... زۆر چاکە. جاران لە حیزبدا بەرپرسی کاروباری ڕێکخستن بوو، پێیاندگووت دکتۆر غەنی، دوای ڕاپەڕین، کە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا بە هەندێک هێڵی زۆر نهێنی و تایبەتی لە تورکیاوە کەوتە هێنانی ئارد، حیزب دەیپاراست و شەریکی لە حیزبەکانی تریشدا هەبوو. لە ماوەیەکی کەمدا ملیۆنەها دۆلاری کۆکردەوە، شەوان کە بە کۆمەڵ دادەنیشتن و سەرخۆش دەبوون، هاوڕێکانی بۆ گاڵتە پێکردن ناویان دەنا «بارۆنی ئارد». ئەوەی من بزانم بارۆنی ئارد یەکەمین کەسە نازناوی وەهای هەبێت. من لە مێژە غەنی دەناسم، پیاوێکی ڕقاوییە، لەوانەیە ئەو نازناوە زۆر ئازاری دابێت، بە تایبەت دەڵێن ناوەکە تا سەری سەرەوە ڕۆیشتوە، خەڵکانێک دەڵێن هەتا سەرۆک خۆی لە کۆبوونەوە گەورەکاندا بە ناوی بارۆنی ئاردە وە غەنی بانگکردوە. بە هەرحاڵ هەرچۆنێک بێت، ئەم نازناوە وەک پزیسک لە پوش بەربێت، خێرا کڵپەیکرد و بڵاوبووەوە، هێدی هێدی بووە نازناوێکی ڕاستەقینە. لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دەوڵەمەندەکاندا، ئەوانەی لە یەککاتدا دەسەڵاتی حیزب و حکومەت و بازاڕیان بەدەستەوەیە، یانەی بارۆنەکانیان دروستکرد، کە شوێنێکی داخراوە، جگە لە دەستەیەکی باڵا لە پیاوانی گەورەی حیزب و خاوەن کۆمپانیاکان و بەڕێوەبەرە گەورەکان و پەرلەمانتارەکان و وەزیرەکان کەس بۆی نییە بچێتە ناوی. تۆفانی برام مرۆڤ ئاسان ناگاتە دونیای بارۆنەکان، مرۆڤ دەشێت جارێک بەلایدا تێپەڕێت، بۆ کۆمەکێک لە دەرگای یەکێکیان بدات، ئیشی لای یەکێکیانی هەبێت و یەکێکی دیان بکاتە واسیتە. بەڵام ئەوەی بەتەواوەتی تێبگەیت لە دونیای بارۆنەکاندا چی دەگوزەرێت، بۆ خەڵکانی کلۆڵی وەک ئێمە ئاسان نییە... گەیشتن بە دورگەی واق

واق، سەرکەوتن بەسەر قوللەی قافدا لە گەیشتن بە دونیای بارۆنەکان و هەڵدانەوەی نهێنییەکانیان ئاسانترە».

دواهەمین وشەکانی شبر زۆر منیان ترساند، وام هەستکرد ئەو شتێک دەزانێت و سوسەی نهێنییەکانی منی کردوە و بە ئارامی و ویقارەوە ئاگادارمدەکاتەوە، سەیری چاوانیم کرد، غەمێکی قووڵی تێدابوو، وەک ئەوەی ئاگادارمبکاتەوە، وەک ئەوەی بزانێت چ شتێک لە خەیاڵی مندایە، وەک ئەوەی تێگەیشتبێت، منیش وەک هەزاران مرۆڤی تری ئەم وڵاتە، گینگڵی ئەوە دەدەم شورای ئەو دونیایە ببڕم و بەسەر دیواری نهێنییەکانیاندا سەرکەوم. لێمپرسی«شبر من و تۆ هاوڕێین، پێمبڵێ تۆ چۆن ئەو وردەکاریانە دەزانیت».

توند بەتانییەکەی لە خۆیەوە پێچاو بەزەردەخەنەیەکی دۆستانەوە سەری هەڵبڕی و گووتی «تۆفان من کوڕێک دەناسم خزمەتچی بارۆنی ئاردە، ساڵەهای ساڵە ئیشکەر و قاپشۆر و سفرەڕاخەری ئەوە. تێدەگەیت، ئەوان چینێکی گەورەی خزمەتکار و ئێشکچی و پاسەوانیان لە دەوری خۆیان دروستکردوە، حەسەنی تۆفان تۆ لەوانەیە باوەڕنەکەیت، ئەو لەشکرەی خزمەتی بارۆنەکان دەکات، دەیانجار لەوە گەورەترە کە من و تۆ دەیزانین، لە تۆ وایە من و تۆ لەم شارەدا دەژین؟ نا حەسەن، من و تۆ دوو قەرەقۆزی پەککەوتەین لە پەراوێزی ئەم دونیایەدا کەوتووین. من و تۆ گەر بچینە قووڵایی ئەم شار و مەملەکەتەوە، نایناسینەوە، زۆر ئێوارێ کە تۆ جێمدەهێڵیت و تەنیا ڕوو لە کونجی چایخانەیەک دەکەیت، دڵشاد و خۆشبەخت دەبم، حەزدەکەم تۆ لەم چیرۆکانە بە دووربیت. من و تۆ تازە لەوە دەرچووین خەڵکی ئەم شارەبین. هەر ئێوارەیەک دەچمەدەرێ واهەستدەکەم شارەکەی دوێنێ نییە، ڕۆژ دوای ڕۆژ دەگۆڕێت،

کوچەکان دەگۆڕێن، شەقامەکان و خانووەکان و ڕۆحلەبەرەکانی... هەموو بەردەوام دەگۆڕێن. حەسەن گوێبگرە، من پیاوێکی زانا نیم، بەڵام خۆت دەزانیت من لە گەنجیمدا یەکێک بووم لە مارکسییە سەرسەختەکان، ئێستا دەمێ ساڵە کتێب ناخوێنمەوە، من و هاوڕێکانم زۆربەمان وازمان لە کتێب خوێندنەوە هێناوە، بەڵام هەندێک شتت پێدەڵێم کە ڕاستین. گەر ڕۆژێک بێ من تێکەڵی ئەو دونیایە بوویت و تووشی گێچەڵی گەورە هاتیت. بزانە لەمشارەدا هەزاران خەڵک هەن خزمەتکاری بۆ بارۆنەکان دەکەن. کەسانی وەکو من و تۆ بێکەسین. بە قسەی من دەکەیت خۆت لە دونیای ئەوان بپارێزە، چۆن دوور بە دوور دەژیت، هەروابە. ئێستا لە من ناترسن، بەڵام حەسەن تۆ هێشتا بەپێوەیت، هێشتا نەکەوتوویت».

هەستمکرد شبر بۆنی شتێک دەکات، دەزانێت من خەریکە پێدەخەمە دونیایەکی پڕ مەترسییەوە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەستە کاڵ و بێدەلیلەشدا، هیچم بۆ نەدرکاند. دڵنیابووم گەر شتێک بڵێم بەجۆرێک دەمترسێنێت کار لە ئیشکردنم دەکات، دەبایە لە نهێنی مردنی موراد جەمیل تێبگەین. من ئەو ئێوارەیە شبرم بە بازاڕدا گەڕان، ئێوارەیەکی فێنک و خۆش بوو، بەڵام شبر بەجۆرێکی سەیر بێتاقەت و وەڕس بوو، تا ئەو کاتە کەم دەیخواردەوە، ئەو ڕۆژە پێیگووتم «بمبە بۆ لای شەهابی فەل». من نابەدڵیم نەکرد و تابەر مەیفرۆشییەکەی شەهاب پاڵم پێوەنا، کە غەم دایدەگرت سووکتر دەبوو، جورمی خۆی نەدۆڕاند، دەبووە پارچەیەک خەفەتی بابردەڵە. ئەو ئێوارەیە بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا دوو بوتڵ عارەقی تورکی کڕی، پێشتر هەندێجار بیرەی دەخواردەوە، بەڵام ئەوەی بیەوێت سەربکاتە سەر خواردنەوەی قورس شتێکی تازەبوو، من دەمزانی تەندروستی ڕێگای پێنادات، لەشی بەرگەی کحولی زۆر

ناگرێت. ئەو ڕۆژە قسەم نەكرد، بەڵام هەستمكرد ترسێكی گەورەی لە چارەنوسی من هەیە، ئەوە یەكەمجاربوو هەستبكەم مرۆڤێك غەمی مان و نەمانی منی هەبێت. بە بوتڵەكانەوە منی برد بۆ گەڕەكێكی قەراغشار. من بێئەوەی هەست بە ماندووبوون بكەم پاڵم پێوەدەنا. ئێوارەیەكی ئێجگار سیحراوی بوو، شنەبایەكی فێنك یاری بە قژە زەردەكەی شبر دەكرد، كوڕێكی هێند جوان بوو، ڕیش و سمێڵێكی زەرد و قژێكی وەها ئاڵتونی هەبوو، كچێكم نەدەبینی تەماشای جوانی ئەو نەكات. كە بە كوچە و كۆڵانە كۆنەكاندا دەمبرد خەڵكی یەكتریان بانگدەكرد بۆ ئەوەی سەیربیكەن، من نەمدەزانی كە دەگری. لە ڕێگا وەستام بۆ ئەوەی لە دوكانێك ساردییەكی بۆ بكڕم، شوشەی بیبسییەكەم دایە دەستی و سەیرمكرد دەگری. شبر لەو ئێوارە خۆشەدا بەزەیی بە خۆی و مندا دەهاتەوە. من فرمێسكەكانم بۆ سڕی و پێمگووت «شبر مەگری، ئەوە ناهێنێت». پێیگووتم « حەسەن، ژیان ناهەقە، زۆر ناهەقە، وانییە؟». بە هێمنی سەریم ماچكرد و گووتم «شبر گیان، ژیان زۆر ناهەقە، ئینسان خۆشی زۆر ناهەقە».

ئەو ئێوارەیە دڵنیابووم شبر بەڕاستی دەیەوێت من بپارێزێت، دەزانێت كە مەكینەیەكی ترسناك و گەورە هەیە من نایناسم، وێنەی من لەسەر دونیا هێشتا وێنەی ڕۆژگاری جارانە. شبر مەبەستی بوو پێمبڵێت حەسەنی پیرۆی تۆ هەڵەیت، دونیا بە جۆرێك گۆڕاوە تۆ تێیناگەیت. ئەو مەكینەیەی جاران من و تۆ ئیشمان لەسەر دەكرد و لە ناویدا بووین، ئەوە نەماوە. ئێستا ماشێنێكی زەبەلاح و سەیرتر و ئاڵۆزتر ئیشدەكات، كە تۆ تێیناگەیت. شبر نەیدەویست ڕاستەوخۆ وام پێبڵێت، بەڵام بە فرمێسكەكانی تێیگەیاندم و ئاماژەیەكی لەو جۆرەی دامێ.

# وانەی خەیاڵ وەك وانەكانی تر نییە... مەهناز خان
# زستان و بەهاری ساڵی ١٩٩٢

«دەرسی خەیاڵ وەک دەرسەکانی تر نییە... مەهناز خان. خەیاڵ لە هێزە هەرە گەورەکانی دونیایە، مرۆڤ ئەو ساتە دروستدەبێت کە خەیاڵ دروستدەبێت، حەقیقەت سەرەتا لە خەیاڵدا هەیە، مەهناز خان لە تۆ وایە مرۆڤ لەسەرەتای سەرەتاوە باغچەی هەبووە؟. بێگومان نا. هەموو شتێکی ئەم دونیایە بەرهەمی خەیاڵە، ئەم باغچەیەی ئێوە سەرەتا لە خەیاڵدا هەبووە، ئەم گوڵانە سەرەتا لە ناو سروشتدان، بەر لەوەی مرۆڤ دەستبەرێت و بەڕاستی بیانهێنێت بۆ ئێرە، بۆ ناو ئەم باغە، بە خەیاڵ دەیانهێنێت و دەیانڕوێنێت. گەر باغێکی خەیاڵی لەسەرماندا نەبێت، ناتوانین باغێکی ڕاستەقینە دروستبکەین. هەندێک هەن دەیانەوێت باغێکی ڕاستەقینە دروستبکەن، بەڵام لەبەرئەوەی باغێکی خەیاڵی لە سەریاندا نییە ناتوانن دروستیبکەن. مرۆڤ سەرەتا بە خەیاڵ خانوو دروستدەکات، بە خەیاڵ ئامێرەکان دادەهێنێت. مەهناز خان، زانست سەرەتا خەیاڵە، هەتا جەنگ سەرەتا خەیاڵە، خۆشەویستی سەرەتا خەیاڵە، خودا سەرەتا خەیاڵە، هیچ شتێک نییە سەرەتا خەیاڵ نەبێت، هەتا بەر لەوەی وشە هەبێت خەیاڵ هەیە».

غەزەلنوس لە باغەکەی ماڵی سەیفەدین مارۆدا بەو جۆرە باسی خەیاڵی بۆ مەهناز دەکرد. مەهناز بە کراسێکی زەردەوە بە جۆرێک لە ناو ڕەنگی زەردی چیمەنەکەدا نوقمبوو، بە ئەستەم چاو لە باغە پەژموردەکەی جیادەکردەوە. کچە بەستەزمانەکە پێشتر وانەی وەها سەیری نەبیستبوو، وانەیەک لە یەکەم دێڕییەوە مرۆڤ لە بێزاری

ئازادبکات و فێری شتە سەرەتاییەکانی ژیانی بکاتەوە، ئەو شتە زۆر سادە و سەرەتاییانەی کە هێندە سادە و سەرەتایین هیچ ئادەمیزادێک نایزانێت. ئەو شتانەی مەهناز لە منداڵییەوە دەیویست فێریانبێت و نەیدەزانی چۆن؟. غەزەلنوس دەیگووت « مەهناز خان، بۆ ئەوەی مرۆڤ سەرەتا فێری خەیاڵ بێت، دەبێت فێری شتە سادەکانی تر بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت خەیاڵبکاتەوە، دەبێت بتوانێت ببینێت، بۆنبکات، لەمسی هەبێت. هیچ شتێک لە بۆنکردنی تەواوەتی گوڵێک زەحمەتتر نییە، هەرکات فێربووین بۆنی گوڵ بکەین، مانای وایەفێربووین خەیاڵ بکەین. یەکەمین لێشاوی گەورەی هەست، یەکەمین لێشاوی خەیاڵیشە».

مەهناز لە وانەی یەکەمەوە هەستیکرد ژیانی شتێکی گەورەی کەمبووە، هەستیکرد تا ئێستا لەسەر ئەم ئەستێرە نەژیاوە و ڕۆژەکانی بەتاڵ و خاڵی ڕۆیشتوون، هەستیکرد تێنەگەیشتنی لە مەکتەب دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنی لە شتە سادە و ئاسانەکانی دونیا، تەمەڵی لە بایۆلۆژی و فیزیک و ماتماتیکدا دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنی لە باغەکەی ماڵی خۆیان، دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنی لە درەختە بچوکەکەی حەوشەکەیان، لە منداڵە تەنهاکانی کۆڵان، لە چۆلەکە برسییەکانی بەر پەنجەرەکەی خۆی. لەوانەی یەکەمەوە هەستیکرد ئەو چەند لە هیچیدا ژیاوە، لە دونیایەکدا ژیاوە بێئەوەی لە مانای ئەو شتانەی دەورووبەری تێبگات. غەزەلنوس پێیدەگووت « مەهناز... بۆ ئەوەی تێبگەیت دەبێت حەقیقەتە سادەکان بە خەیاڵ بانگهێشت بکەیتەوە، تۆ ناتوانێت تەنیا بە چاو گوڵی حەوشەکەی خۆتان ببینیت، بەڵکو پێویستت بە خەیاڵە، حەقیقەت شتەکان دەگۆڕێتە سەر شتی یەک دیو و سادە. کە باسی خەیاڵت بۆدەکەم مەفرە بۆ دوور، خەیاڵ سەرەتا نیشتنەوەیە لە باغەکەی ماڵی خۆتاندا، نیشتنەوەیە لەلای یەکەمین چڵە گیا و لەلای نزیکترین پاساری، دواتر هەر ئەو شتە بچوکانە خۆیان دەتبەن بۆ شوێنی زۆر

دوور».

کاریگەری غەزەلنوس لەسەر مەهناز سەیفەدین سەیر و سەرسوڕهێنەربوو، لە ماوەیەکی کەمدا کچەکە تووشی کرانەوەیەکی قووڵ و گەورە هات. گۆڕانی لە وانەکاندا جێگای باوەڕنەبوو. سەعید بایۆ بەرەوپێشچوونی کچەکەی وەک موعجیزەیەکی بایۆلۆژی تەماشادەکرد. مەهناز بە خێراییەکی سەیر کرایەوە و بەهرە و توانایەکی ناوازەی دەرخست. وانەکانی خەیاڵ لە هەمان کاتدا وانەی عەقڵ و سۆز و هەستیش بوون، کچەکە تەنیا نەبوویوو بە قوتابییەکی بە توانا کە بە خێراییەکی گەورە لە وانە قورسەکاندا دەچووە پێش، بەڵکو بوویوو بە کچێک کە کاتێکی زۆری لەسەیرکردنی باغ و سروشت و هەور و ئاسماندا دەبردەسەر، نەک هەر ئەوە، بەڵکو مەهناز مارۆ عاشقبوو، بەشێوەیەکی سەیر و شێتانە و نهێنی و بێدەنگ حەزی لەم مامۆستا بێوێنە و قەشەنگەی خەیاڵ کردبوو، کە هەردەم بە چاویلکەیەکی چکۆلانەوە، بە قژێکی شێتەوە، بە ڕیشێکی دەروێشانەی ڕەشەوە دەردەکەوت و دەریایەک لە سەرسامی دەهێنا. مەهناز لە یەکەم شەوەوە کە غەزەلنوسی بینی، حەزی لێکرد، حەزی شێتانەی کچێکی هەرزەکار کە لە ناکاو هەستدەکات ڕۆحێکی گەورە و خەیاڵێکی بێسنوور و هەناسەیەکی شاعیرانەی بێپەی بەر دەرگای ڕۆحی گرتووە. لە یەکەم شەوەوە کە پەنجەرەی ژوورەکەی کردەوە، کە دەرگای باڵکۆنەکەی خستە سەر پشت، هەستی بە ڕقێکی گەورە کرد بەرابەر نەجۆ ئەشکانی، هەستیکرد ڕیشەی ئەو ڕقەی دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێک لە هەستی سەرەتایی بەرابەر غەزەلنوس. ڕاستە ئەو کچێکی تەمەڵ بوو، ڕاستە هەموو وەک بێمێشک سەیریاندەکرد، بەڵام لەو شەوەوە کە غەزەلنوسی بینی، کە ئەو مامۆستا سەیرەی خەیاڵی بینی، لە هەست و نەستی خۆی تێگەیشت. پێشتر هەمیشە بەرابەر بڕیارەکانی خۆی دوودڵ بوو، بەڵام ئەمجارە دڵنیابوو چی دەوێت. لەو شەوەوە هیچ

دەرفەتێکی لەدەست نەدەدا بۆ ئەوەی لەگەڵ نەجۆ ئەشکانیدا شەڕبکات. خانمی شەمس لە هەر کەس زیاتر ڕەفتاری کچەکەی پێ سەیربوو، ئەو دەیزانی گەر کیژە بەستەزمانەکە هەست و نەستێکیشی هەبێت، ئەوا لە ژێر گوشاری زۆری مامۆستا و دایک و باوک و خزمەکانیدا ناتوانێت ئاشکرایبکات. ئەوەی ئێستا دەیتوانی لەگەڵ ئەشکانیدا شەڕبکات شتێکی تازەبوو، نیشانەی گۆڕانێکی ڕاستەقینەبوو کە دیار نەبوو بەچ ئاڕاستەیەک دەجوڵێت و بەرەو کوێ دەڕوات. دوای دە وانەی خەیاڵ، تەنیا ئاستی خوێندن و شێوەی بیرکردنەوەی مەهناز نەگۆڕابوو، بەڵکو تەواوی کاراکتەری بەرەو گۆڕان دەچوو. چیتر خۆی بەشێوەی جاران ڕێک نەدەخست، ئەو بایەخە زۆرەی سەروەختێک بە قژ داهێنان و ئوتوکردنی جلەکانی دەدا، لە ناکاو بەجۆرێک سەیر و توندڕەوانە بووبوو بە فەرامۆشی و خۆلەبیرکردن. ڕۆژێک مەهناز بە قژێکی کوڕانەی کورتەوە لە سالۆنی قژ بڕینەکەی هاوسێیان گەڕایەوە، ماوەیەک بوو وەک جاران جلی ئاسایی دەقگرتووی کچانە و وەک کیژانی هاوتەمەنی مۆدێلی نوێی لەبەرنەدەکرد، لە ماوەی دوو مانگدا هەموو شتێک گۆڕا، لە کچێکی شیکەوە کە کوڕانی گەڕەک ناویان دەنا «کچی بوردە»، بووە کیژێک یاخیبوون و چاوقایمییەکی گەورە لە جلوبەرگ و ڕەفتاریدا بوو.

سەیفەدین مارۆ خۆی بە ئیشی ئەم مامۆستای خەیاڵە سەرسامبوو، بەڵام نەیدەزانی چۆن شتەکان هەڵسەنگێنێت، لەسەرێکەوە زیرەکبوونی لە ناکاوی کچەکە شتێکی دڵخۆشکەربوو، بەڵام لەسەرێکی تریشەوە گۆڕانێکی کتوپڕ و شێتانە و بێدەنگی دەبینی کە نەیدەزانی لە کوێدا دەگیرسێتەوە. لەبەرهۆیەکی نەزانراو چیرۆکی ئەم مامۆستایەی خەیاڵی لە هاوڕێکانی خۆی شاردەوە. بەپێچەوانەی شەمسەوە کە بە شانازییەوە باسی باشبوون و زیرەکبوونی کچەکەی دەکرد، سەیفەدین هەستیدەکرد،

کچەکەی بە جۆرێکی هێند خێرا دەگۆڕێت عاقیبەتی دیار نییە. نەجۆ ئەشکانی لە هەمووان زیاتر بریندار‌بوو، لەگەڵ دەرکەوتنی ئەم مامۆستای خەیاڵەدا مەهناز تەواو لەگەڵیدا گۆڕابوو، لە زۆربەی چوونە دەرەوەکاندا بێدەنگ و بێزار تەماشایدەکرد و هیچی نەدەگووت. سەرەتا کە مەهنازی دەستنیشانکرد هەستی بە شتێک لە ساردی و کەمتەرخەمی کردبوو، بەڵام بەگشتی وادیار نەبوو کە بە هاوسەرگیری و شووکردن ناڕازی بێت. بێدەنگی دووردرێژ و شەرمی قووڵی نێوانیان وایدەکرد نەتوانێت زۆر لێی نزیک ببێتەوە... پێش ئەوەی سەروفەسالّی ئەم غەزەلنوسە دەرکەوێت، کاتێک دەچوو بۆماڵیان هەستیدەکرد بینینی ئەم خۆشحاڵیدەکات، گەر جلێکی تازەی بکڕیبایە دەیپرسی «ها، نەجۆ جوانە لەبەرمدا؟». گەر ریستۆرانتێکی تازە بکرابایاتەوە دەیگووت «ها نەجۆ حەزدەکەیت بێیت لە گەڵمدا؟». بەڵام ئێستا بێئەوەی پرس بەو بکات، بێئەوەی زەوقی ئەوی بەلاوە گرنگ بێت، قژی وەک کوڕێک کورتدەکاتەوە و لێیشی ناپرسێت. بەدیوەکەی تردا فەرامۆشکردنی مەهناز بۆ ئەو، بە بایەخێکی بێوێنە بۆ ئەو مامۆستا ڕیشنەی خەیاڵە وەرگەڕابوو، لەبەر خاتری ئەو دەیویست زیرەک بێت، دەیزانی گەر زیرەک نەبێت، دایکی ناهێڵێت چیتر غەزەلنوس ببینێتەوە. ئاشکرابوو، مەهناز هەموو شتێک دەکات بۆ ئەوەی غەزەلنوس ببینێتەوە، نەجۆش بەغەریزەی نێرێک و عاشقێکی بریندار هەستی بە هەموو شتێک دەکرد.

مەهناز ئێستا دەیویست ئازابێت، غەزەلنوس بەردەوام پێیدەگووت «بۆ ئەوەی خەیاڵ بکەیتەوە، دەبێت ئازا بیت... خەیاڵ و ئازایەتی یەک شتن». ئازایەتیش ئێستا ئەوەبوو بە نەجۆ ئەشکانی بڵێت «شووت پێناکەم». کچەکە لە ماوەیەکی کەمدا خەیاڵی بە جۆرێکی سەیر گەورەبووبوو، غەزەلنوس خۆشی باوەڕی نەدەکرد. لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا کۆمەڵێک ئافرەت هاتبوونە سەر ڕێگای کە بەشێوەی جۆراوجۆر

خۆشیانویستبوو، بەڵام ڕۆژێک لە خەیاڵی ئەوەدا نەبوو کچێکی وەک مەهناز مارۆ ئەوی خۆشبوێت. دواجار ئەو مامۆستا بوو، مامۆستای کچێکی دەستگیراندار کە چەندین ساڵ لەو منداڵتربوو، هەر هەڵەیەکی چکۆلانە ژیانی کچە بەستەزمانەکەی وێراندەکرد. بەڵام مەهناز چەندە ڕقی لە سەروسمێڵە ڕەش و قیافەتە سەربازی و زمانە بێبەهرەکەی نەجۆ دەبووەوە، هێندەش غەزەلنوسی خۆشدەویست. ئێستا بە هۆی ئەو توانا گەورانەیەوە لەسەر خەیاڵ دەیتوانی دونیا بگۆڕێتە سەر شوێنێکی تر. ژوورەکەی خۆی شەوان دەبوو بە باغێکی بێسنوور، دەیتوانی هەموو ماڵەکە پڕبکات لە بولبول، لە باڵندەی سەیر سەیر کە خۆی بە خەیاڵ دروستیدەکردن. غەزەلنوس هەردەم پێیدەگووت «قورسترین شت یەکەمین باڵندەی خەیاڵییە، کە مرۆڤ توانی یەکەم باڵندەی خەیاڵی دروستبکات، دوای ئەوە هەموو شتێکی تر ئاسانە». مەهناز زۆر زوو یەکەمین باڵندەی خەیاڵی خۆی دروستکرد، بەجۆرێک ئالودەی ئەو جیهانە خەیاڵییە بوو، گەر ئەو خواستە قووڵەی نەبایە بۆ بینینی غەزەلنوس لەوانەبوو جارێکی دی نەگەڕێتەوە بۆ دونیای شتە ڕاستەقینەکان. ئەو لە هەموو کەس باشتر خۆی دەناسی، ڕۆژێک لە ڕۆژان کچێکی دەبەنگ نەبووە، هەموو وادەزانن کچێکی دەبەنگە، خۆشی بەردەوام خۆی وا نیشاندەدات، هەموو بە کچێکی جوانی بێ مێشک سەیریدەکەن کە هیچ نازانێت. بەڵام بە درێژای ساڵی ڕابوردوو، بە تایبەت لەوکاتەوە کە نەجۆ ئەشکانی بووبوو بە دەستگیرانی، ئارەزووی فێربوونی هیچ شتێکی نەمابوو. کچێک دڵنیابێت ژیانی لە وێنەیەک دەچێت پێشتر ئەوانی دی هەموو شتێکیان تیاکێشاوە، ئیدی ئارەزووەکانی دەمرن. تا غەزەلنوس نەهاتبووە ژیانییەوە، هەستیدەکرد ژیانی سفرەیەکی ئامادەیە و ئیشی ئەو ئەوەیە بێتە سەر سفرەکە و بخوات و هەستێتە سەرپێ، چ پێویستییەکی بەوە نەبوو گوێ لە سەعید بایۆ و مەجە ئێکسلاند بگرێت. بەڵام ئێستا

نـا، ئێسـتا هەسـتدەکات ژیانـی زۆر بچـوک و هەژاریـووە. هەسـتدەکات تـا ئـەو کاتـە گوڵـی نەبینیـوە، باڵنـدەی نەبینیـوە، باغـی نەبینیـوە. ئێسـتا دەیویسـت فێربێـت، هەمـوو شـتێک بزانێـت، چیتـر ڕقـی لـەو وێنەیـەی خـۆی بـوو، وێنـەی کچێکـی جوانـی هەمیشـە ڕێکپـۆش و جـل ئوتوکـراو، شـیک و ناسـک، دەسـتگیراندار و مسـۆگەر، کـە بەدەنگێکـی باریـک و دەسـتکردەوە تەنیـا ئیشـی ئەوەیـە بەخێرهاتـن و خوداحافیـزی لـە میوانەکانـی دایـک و باوکـی بـکات... کچێـک بڕیـارە تـا مـردن لـە هەمـوو ئاهەنگێکـدا، لـە هەمـوو چوونـە دەرەوەیەکـدا، لـە هەمـوو داوەت و سـەیران و نانخواردنێکـدا لەگـەڵ نەجـۆ ئەشـکانیدا بێـت، ئـەو پیـاوەی تەنیـا سـیحری ژیانـی شـانازیکردنە بـە قـژە ئاڵتونـی و درێژەکـەی ئەمـەوە، دەبێـت لـە هەمـوو شـوێنێکدا وەک کچێـک دەرکەوێـت کـە یەکێـک لـە کـوڕە بۆشـناخ و پـارەدار و بازاڕناسـەکانی بـۆ خـۆی سـەندوە. سـەرەتا وایدەزانـی ژیـان بـەو جۆرەیـە، بـەڵام هاتنـی غەزەلنـوس شـتێکی نیشـاندا کـە کچەکانـی دیکـە ناتوانـن بیبینـن. مرۆڤ کـە دونیـای خەیاڵـی بینـی ناتوانێـت بـە کەسـانی وەک نەجـۆ ئەشـکانی کـە لـە باسـی خـواردن و پـارە و سیاسـەت بـەولاوە هیـچ شـتێکی دی نازانـن ڕازیبێت. هـەر شـەوێک بیـری لـە نەجـۆ ئەشـکانی بکردایەتـەوە، دەبایـە پەنجەرەکـە بکاتـەوە و هـەوا هەڵمژێـت. ئێسـتا بـەردەوام شـەوان پەنجـەرەکان دەکاتـەوە، هەسـتدەکات بوونـەوەرە خەیاڵییـەکان لەودیـو پەنجەرەکـەوەن، شـەو بـەو قـژە کوڕانـە تازەیـەوە دەچێتـە باڵکۆنەکـە، نەتەلەفـون بـۆ هاوڕێکانـی دەکات و نـە گـوێ لـە گۆرانـی دەگرێـت، تاکـە شـتێک دەیـکات ئەوەیـە بیـر لـە غەزەلنـوس دەکاتـەوە، بیـر لـە گوڵـە خەیاڵییەکانـی خـۆی دەکاتـەوە، خەیاڵـی لای ئـەو بولبولـە ئەفسوناویانەیە کـە لەسـەریدا دەخوێنـن. ئێسـتا دڵنیایـە ناتوانێـت لەگـەڵ نەجـۆ ئەشـکانیدا بـژی، گـەر شـوو بـەو پیـاوە بکات خەیاڵـی دەمرێـت. هیـچ شـتێک وەک دیمەنـی ئـەو سمێڵە ڕەش و بـرۆ ڕەش و ویقـارە سیاسـییەی ئـەو خەیـاڵ ناکوژێـت. ئـەوە قسـەی خاتـوو شەمسـی

دایکی بوو، کە خۆ ڕەقکردن و وەستانی نەجۆی بە «ویقاری سیاسی» ناودەنا. هەر ڕۆژێک نەجۆ ئەشکانی ببینیایە، بە زەحمەت دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ ژوورە خەیاڵییە بچوکەکەی خۆی.

دوای شەش مانگی بەردەوام مەهناز یەکێک بوو لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان. غەزەلنوس سالانێک دواتر کە باسی مەهناز ماڕۆی دەکرد، دەیگووت «یەکێک بوو لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییە تەنیاکان، لەو ڕۆحلەبەرە خەیاڵیانەی خۆیان دروستدەبن و لە هیچ گروە و کۆمەڵێکدا ناتوێنەوە...». لە ماوەی ئەو شەش مانگەدا غەزەلنوس چەندین جار هەوڵیدا مەهناز تێکەڵاوی هەندێک لەو ڕۆحلەبەرە خەیاڵیانە ببێت کە ئەو دەیناسین، بەڵام مەهناز نەیدەتوانی بە هیچ کۆمەڵە ئادەمیزادێکەوە بچەسپێت، دونیا خەیاڵییەکەی مەهناز ژوورەکەی بوو، ئەو دەیگووت «هەندێ مرۆڤی خەیاڵی هەن، جیهانە خەیاڵییەکەیان لە سنووری ماڵی خۆیان تێناپەڕێت، مەهناز لەوانەبوو».

لەگەڵ سەرەتای خۆئامادەکردندا بۆ تاقیکردنەوە گەورەکانی کۆتایی ساڵ، مەهناز ئێوارەیەک بە نەجۆ ئەشکانی گووت نامەوێت شووت پێبکەم. شەوێک پێشتر لە داوەتی یەکێک لە ناسیاوەکانی نەجۆدا لە کاتێکدا ئەو بە دەنگی بەرز باسی شەڕ و ململانێی هەمیشەیی نێوان دوو حیزبە سیاسییە گەورەکەی وڵاتی دەکرد، مەهناز بە پێچەوانەی چاوەڕوانی هەموانەوە « کە پێکڕا فێربووبوون گوێیان لە دەنگی نەبێت» گووتی «نەجۆ ئەشکانی، لەم باسانە زیاتر هیچی تر نازانیت، ناتوانیت لەم قسە پڕوپوچانەی سیاسەت بەولاوە باسی هیچی تر بکەیت؟».
قسەکانی هێند ڕاستەوخۆ و ڕەق و بریندارکەربوون، ئەشکانی بۆماوەیەک وەها وڕبوو نەیدەزانی سەیری کوێ بکات. سەختبوو بۆ نەجۆ لەناو

خزمەکانی خۆیدا، لە جێگایەکدا لە هەر شوێنێکی دی زیاتر ویقاری خۆی بەلاوە گرنگ بوو بشکێنرێت. ئەو شەوە کە مەهنازی بردەوە، بە جۆرێک تورەبوو، خەریک بوو ماشێنەکەی دەدا بە عەمود و دار و دیوارەکانی رێگادا، بەلآم مەهناز وەک کارێکی بە تورەیی ئەوەوە نەبێت، لە پێشەوە وەک خانمێکی بە ویقار دانیشتبوو و نیگارێکی وەها خەیاڵیشی هەبوو، دەتگووت نوقمی نەشئە و ڕۆشنایییەکی خودایی بووە. کە گەیشتنە بەردەرگا، لە کاتێکدا نەجۆ ئەشکانی کەفی دەردەدا، مەهناز بە ئارامییەوە دەستی خستە سەر دەستی و گووتی « نەجۆ، گوێبگرە، من و تۆ بۆ یەک نابین، کە لەگەڵ تۆدا دەبم ناتوانم خەیاڵ بکەمەوە، دەمبوریت، بەلآم گەر وازم لێبهێنیت، تۆش خۆشتر دەژیت».

مەهناز مارۆ لە ژیانیدا وەها ئازا نەبووبوو، هەمووان وەک ترسنۆکێک سەیریاندەکرد، بەلآم ئێستا دەیتوانی تا گەیشتنە سەر سنووری مەرگ ئازابێت. چەندین هەفتەبوو بڕیاری خۆی دابوو، لە نێوان مەرگ و نەجۆ ئەشکانیدا، مەرگی هەڵدەبژارد. ئێستا شەوان کە هەڵدەستا و بە ماکسییە ئەرخەوانییەکەیەوە دەچووە باڵکۆنەکە، بیری لە مردن دەکردەوە، مردنێک لە سەیفەدین مارۆی باوک و لە نەجۆ ئەشکانی دووربخاتەوە، ئێواران زۆرجار لەو باغچە خەیاڵییەی خۆیدا ناچاردەبوو، گوێ لە باوکی و نەجۆ بگرێت، قسە بێبڕانەوەو دووبارەکانیان لەسەر سیاسەت ببیستێت. ئێستا هەرکات گوێی لە باسی سیاسەت دەبوو، دەیویست بڕشێتەوە و بمرێت. جگە لە غەزەلنوس کەسی تر لە ژیانیدا نەبوو باسی گوڵ بکات، باسی ئەو ڕۆحانە بکات کە شەوان لە ژێر تریفەدا گەورەدەبن و بەیانیان دەمرن، جگە لە غەزەلنوس هیچ کەسێکی تر نەبوو فێری هونەری نزیکبوونەوەی بکات لە باڵندەکان. چەند سەیربوو کە دەیبینی غەزەلنوس دەتوانێت کوکوختییەکان ڕازیبکات لەسەر دەستی بنیشنەوە. دڵنیابوو غەزەلنوس ناتوانێت تا هەتاهەتایە لەگەڵیدا بێت، ئەوە گەورەترین غەمی ژیانی

بوو، چۆن دەتوانێت جارێکی تر بێ ئەم باغە خەیاڵی و باڵندە سەیرانە بژی، چۆن دەتوانێت هەستەکانی بگێڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە هێشتا غەزەلنوسی نەبینیبوو. دووجار بە دزی سیفەدین مارۆ و بە مۆڵەتی خاتوو شەمس لەگەڵ غەزەلنوسدا چووبووە دەرەوە، دوو تاقمی خەیاڵی بینی بوو، دوو گروپ لەو مرۆڤە خەیاڵیانەی هەر دەستەیەکیان لە جۆرێکی تایبەتی خەیاڵدا قاڵ و بلیمەتن. بەڵام ئەو ڕۆحێکی تەنیا بوو، لە شەمسی دایکی بەولاوە کەسی تری نەبوو، ئارەزوویەکی نەبوو تێکەڵ بە هیچ ڕۆحلەبەرێکی تر بێت، خۆی دونیایەکی هەبوو، دەترسا گەر لە ماڵ بێتەدەرێ ئەو دونیایەی لە دەست بچێت. لەگەڵ ئەو ترسەشدا هەموو شتێکی دەکرد بۆ ئەوەی غەزەلنوس لە ژیانیدا بمێنێتەوە، هەموو شتێک. چەند ڕۆژێک بەرلەوەی بە نەجۆ ئەشکانی بڵێت باواز لەیەکدی بهێنین، شەوێک بە درێژایی بیری لە خەوتن دەکردەوە لەگەڵ پیاوێکی وەک نەجۆدا، یەکەمجاربوو لە ژیانیدا بیر لە لەشی ڕووتی پیاوێک بکاتەوە، ئەو هەستەی کە دەستی نەجۆ دەکەوێتە سەر لەشی، شێتیدەکرد، مردنی لەوە پێ چاکتربوو لەگەڵ نەجۆدا ڕووتبێتەوە. بەڵام دەبێت خەوتن لەگەڵ غەزەلنوسدا چۆن بێت، چ سیحرێک و چ خەیاڵێک بێت؟.

دەبایە بەرلەوەی بچێتە تاقیکردنەوەی کۆتاییەوە هەموو شتێک لەگەڵ ئەشکانیدا ببڕێنێتەوە. دەیزانی سەیفەدین مارۆ هەرشتێک قەبووڵبکات، ئەوە قەبووڵ ناکات. دەیزانی گەر سەرەتا لای خاتوو شەمس ئەو مەسەلەیە باسبکات، لەوانەیە شتەکان وەها خراپ بشکێنەوە لەدەست دەربچن و دواتر نەگیرێنەوە. بەڵام بۆ خۆی تاقی نەکاتەوە؟ بۆ ئازایەتی خۆی نەخاتە بەر ئەزموونێک کە درەنگ یان زوو دەبێت پیابڕوات؟. ئێستا دەبایە بڕیاربدات، دەبایە بچێتە بەردەمی سەیفەدین مارۆ و بڵێت من شوو بە نەجۆ ئەشکانی ناکەم. ئیتر دوای ئەوە هەرچییەک

ڕوودەدات... بـە جەهەنـەم.

سـەیفەدین مـارۆ شـەوان تـا درەنـگ خەریکی تەلەفونکردن بـوو. تا یەکەم هەڵبژاردنـی گـەورەی وڵات، ماوەیەکی زۆر کەمـی لەبەردەمدا مابـوو، حیـزب ڕایسـپاردبوو لـە دیاریکردنـی لیسـتی هەڵاوێردانـدا بەشـداریبکات، سـەیفەدین چەنـدە لـە ماڵـەوە پیاوێکـی ڕەق و بێسـەبر و زوو هەڵچووبـوو، لـە دەرەوە زمانێکـی دیبلۆماسـی و نـەرم و بەشـێوازی هەبـوو. چەنـد شـەو مەهنـاز چاوەڕوانبـوو، بـەڵام باوکـی کاتـی بـۆ هیـچ شـتێک و هیـچ کـەس نەبـوو. شـەوێکیان دوای چەندیـن سـەعات تەلەفونـی دووروودرێـژ، مەهنـاز بێئـەوەی گوێبداتـە هیـچ شـتێک، چـووە ژوورە تایبەتییەکـەی باوکـی، ئـەو ژوورەی لەوێـوە قسـەی لەگـەڵ سـەرانی حیـزب و کاندیـدە تازەکانـی هەڵبژاردنـدا دەکـرد، هـەر لەوێـوە دکتـۆر و ئەندازیـار و پارێزەرەکانـی دەخسـتە سـەر کەڵکەڵـەی خـۆ کاندیدکـردن بـۆ یەکەمیـن هەڵبژاردنـی ئـازاد لـە مێـژووی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا «وەک سـەیفەدین مـارۆ لـە بـەردەم نەجـۆ ئەشـکانی و خانمـی شەمسـدا، بە دڵنیایـی و فەخـرەوە دانـی پیادەنـا». دوای چەندیـن سـاڵ ئـەوە یەکەمجـار بـوو مەهنـاز شـەوێکی وا درەنـگ و بـۆ ئیشـێکی تایبەتـی بچێتـە ژوورەکـەی باوکـی. سـەیفەدین مـارۆ ئەزموونێکـی سیاسـی ئەوتـۆی هەبـوو بزانێـت، مـرۆڤ چ وەختێـک شـتێکی گرنگـی بـۆ گوتـن هەیە. بیری نەدەهـات لـەو چەنـد ساڵەی دواییـدا دانیشـتنێکی هاوڕێیانـەی لەگـەڵ کچەکەیـدا ئەنجامدابێـت، هۆکەشـی هێنـدەی ئـەو دوورەپەرێـزی و بێدەنگییـە گەورەیـەی مەهنـاز بـوو، کەمتەرخەمـی و سـەرقاڵی سـەیفەدین نەبـوو. بەگشـتی لـە ژن و منداڵـدا خـۆی بـە کەسـێکی بەدبەخـت و بێبەرهـەم حیسـابدەکرد. بـەردەوام هەسـتیدەکرد ژنەکـەی هێنـدەی ئافرەتێکی زۆربلێـی خۆهەڵکێشـە، خانمێکـی کۆمەڵکـەر و گرفتشـکێن نییـە، کچەکەشـی زۆر بێهـۆش و کـەم عەقـڵ و سـاکار دەهاتـە پێشـچاو، بـەڵام دڵـی خـۆی بـەوە

خۆشدەکرد، بڵێت منداڵی ئەم سەردەمە پێکڕا وەهان. سەیفەدین مارۆ دڵی بەم مامۆستای خەیاڵەش نەدەکرایەوە. جۆرە پیاوێکی دەگمەن بوو، پێشتر ڕێکەوتی تەرزە مەخلوقی وەهای نەکردبوو، نە لە سیاسییەکان دەچوو، نە لە دکتۆر و ئەندازیارەکان، لە خەڵکی ناو بازاڕ و لە گۆرانیبێژەکانیش نەدەچوو. هەتا وەک ڕۆشنبیرەکانیش نەبوو، ڕۆشنبیران شتێکی ترن، ئەم دەیانناسێت، زۆربەیان بە یارمەتی کەم ڕازیدەبن، سەرە گەورەکانیان حیزب مسۆگەریکردون و خستونییەتە بنگڵی خۆیەوە. لەو کاتەوە کە بووبوو بە سەرۆکی لیژنەی هەڵبژاردنی کاندیدەکانی پەرلەمان هەرکەسێکی دەبینی بەچاوی ئەوەوە تەماشایدەکرد ئاخۆ بۆ پەرلەمان دەستدەدات یاخود نا؟. دڵی بەوە خۆشبوو، کە ماوەیەکی دیکە، خولێک یان دووانی دیکە نەجۆ ئەشکانی زاوای کاندیدێکی باش دەبێت بۆ پەرلەمان. قیافەتی، دەم و سمێڵی، شێوەی ڕاوەستان و ڕێز دەربڕینی هەموو هی پەرلەمان بوون. سەیفەدین مارۆ زۆر دڵی بەو زاوایەی خۆشبوو، بۆ مەهناز مێردێکی نمونەیی بوو. ئەو شەوە کە مەهناز چووە ژووری، خەیاڵی بۆ هەموو شتێک دەچوو، ئەو قسانە نەبێت. لەو باوەڕەدا نەبوو، کچێکی وا منداڵ بەو جۆرە چاوڕووی کرابێتەوە، لە بەردەم باوکیدا بێترس بڵێت من ئەم کابرایە بە کەسێک نابینم، شایستەی ئەوە بێت لەگەڵیدا ڕووتببمەوە و بخەوم. جۆرێک بوو لە بێئەدەبی، لە بێحورمەتی بێوێنە و لە ئەندازەبەدەر. ئەو شەوە سەیفەدین خەوی لێنەکەوت، تا بەیانی لەناو نوێنەکاندا لوولدەبوو و دەکرایەوە، دەکرایەوە و لوولدەبوو. بە پێچەوانەی مەهنازەوە کە بە قژە کورتەکەیەوە، بەو بیجامە ساتانە سفت و لووسەوە، خۆشبەخت وەک یەکێک بارێکی گەورەی لە ئەستۆی خۆی داگرتبێت، ژوورەکەی مارۆی جێدەهێشت. دەبایە ڕوون و ئاشکرا بڵێت کە شوو بە نەجۆ ئەشکانی ناکات، دوو مانگ بوو دەیویست ئەم ڕستەیە ئاشکرابکات و نەیدەتوانی،

هەتا نەیدەتوانی لای غەزەلنوسیش ئەو قسانە بکات. بەڵام ئێستا تەواو، تا هەتاهەتایە تەواو، سەیر لەوەدابوو کە تەواوی جەنگ و جەدەل و هەراکە کەوتە ڕۆژی دواتر. بڕیارەکە بۆ خانمی شەمسیش وەک بروسکە وەها بوو، وەک دۆعایەکی ناوەخت کە دەست و دەمی مرۆڤ دەبەستێت و ئیفلیجیدەکات. ئەو ڕۆژە بە تەلەفون مامۆستاکانی ئاگادارکردەوە، کە لەبەر هۆیەکی خێزانی هەموو وانە تایبەتییەکان دوادەکەوێت و دەخرێنە کاتێکی تر. ڕاستە خانمی شەمس سەرەتا دژی شووکردنی مەهناز بوو بە نەجۆ ئەشکانی، ڕاستە دڵی بەو کوڕە نەدەکرایەوە، ڕاستە کچەکەی خۆی بە شایستەی کەسێکی باشتر دەزانی، بەڵام ئێستا بۆ ساڵێک زیاتربوو دەستگیرانی بوو، پێکەوە لە چەندەها بۆنەدا دەرکەوتبوون، پێکەوە گەڕابوون و شەو درەنگ هاتبوونەوە ماڵێ، کوڕەکە هەموو شتێکی کردبوو، ئاڵتونی تەواو، ماڵی تەواو، یەک بە یەکی مەرجەکانی ئەویشی قەبووڵکردبوو. بەهانەیەک نەبوو پەشیمان بینەوە، هیچ بەهانەیەک نەبوو. دوائەوە قسەی خەڵک، ئەو هەموو حیکایەتەی کە بڵاودەبێتەوە، ئەو هەموو پرسیارەی کە دەکرێت، ئەو هەموو عەیبەیەی جێدەمێنێت. نا چیتر نەدەکرا مەهناز پەشیمان ببێتەوە، پەشیمانی هەروا ئاسان نییە، دوائەوە بۆ پەشیمان ببێتەوە، هەمووان بە دیمەنی نەجۆ ئەشکانی و سەردانی ئێوارانی ڕاهاتبوون. مەهناز قسەیەکی گونجاو و بەهانەیەکی ڕاستەقینەشی نییە. خانمی شەمس هیچ لە قسەکانی مەهناز تێنەدەگەیشت، دەربارەی ئەوەی بینینی نەجۆ خەیاڵی دەکوژێت... هیچ تێنەدەگەیشت... هیچ. خەیاڵ خۆی چییە، تا بینینی نەجۆی بەستەزمان بیکوژێت؟

سەیفەدین مارۆ ئەو ڕۆژە دەبایە تا درەنگ لەگەڵ هەلاوێردەکانی هەڵبژاردندا تەلەفونبکات، کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ سکرتێری سەرۆکدا بۆ کاروباری هەڵبژاردن هەبوو، دانیشتنێکی لەگەڵ بەرپرسی پروپاگەندەدا

هەبوو، دەبایە لەگەڵ دوو خانمدا سەبارەت بە کاندیدە ژنەکان قسەبکات. ڕۆژێکی ئێجگار جەنجاڵ بوو، ئێجگار. بەڵام بەردەوام خەیاڵی لای مەهناز و قسەکانی ئەو بوو. هەواڵی پەشیمانبوونەوەی کچەکەی دوای ساڵێک لە دەستگیرانی، کاریگەرییەکی خراپی لە ناو حیزبدا دەبێت، نەیارەکانی بەکاریدەهێنن بۆ ئەوەی ناوبانگی بزڕێنن، نەجۆ دەبێت بە دوژمنی، خەڵکانێک ناوی کچەکەی دەخەنە بازاڕەوە. دەبایە هەرچییەکی کردوە کچەکە لەو ئارەزووە کتوپڕ و بێمانا و بێعەقڵانەیە ڕزگاربکات. ئێستا دڵنیابوو کاریگەری ئەو «مامۆستای خەیاڵە سەگبابە» لەسەری کوشندەیە، لە سەرەتاوە دەبایە بە هاتنی ئەو گەنجە ئاڵۆز و سەیر و فیتنەکارە ڕازی نەبێت، کە ڕیشێکی وەک ڕیشی دەروێشەکان هێشتۆتەوە و خۆی ناوناوە غەزەلنوس. دەبایە پیاوێکی لەوە عاقڵتربێت ڕێگا بە مامۆستایەکی خەیاڵ بدات پێبخاتە ماڵەکەی. سەیفەدین کە بەیانی چووەدەرێ، دەیزانی بەزمی گەورە دەکەوێتە ئێوارەوە، ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە. خانمی شەمسیش دڵنیابوو کە سەیفەدین هەروا ئاسان لێناگەڕێت کوڕێکی وەک نەجۆ ئەشکانی لە دەست بچێت، هەموو گوشارێک دەکات تا مەهناز پەشیمانبکاتەوە، بڕیاریدابوو لەو کارەشدا ڕێگری نەکات. هەر بەیانی زوو ڕێک و ڕاست بە کچەکەی گووت « گەر باوکت سەریشت ببڕێت، کارم پێوە نییە، ئەوەندەم لەسەرە چەقۆکەی بۆبهێنم». مەهناز بێئەوەی بترسێت، گووتی «گەر بمدات بە نەجۆ ئەشکانی، پێویست ناکات سەرمبڕێت، چونکە بێسەربڕین کوشتوومی».

هیچ شتێک لەگەڵ مەهناز مارۆدا سوودی نەبوو. هێزێک نەبوو لەم دونیایەدا پەشیمانیبکاتەوە.

ساڵانێک دواتر غەزەلنوس بۆ ماجیدی گوڵ سۆلاڤی گێڕایەوە « ئێوارەیەکیان چووم بۆ ماڵی مەهناز مارۆ، وەک ئێوارەکانی تر بێئاگا لە

هیچ شتێک و بێخەیاڵ لە هەر غەمێک، سادە و ساکار ڕۆیشتم، خانمی شەمس لە ساڵۆنە گەورەکەی خۆیاندا پێشوازی لێکردم. خاولییەکی دا بەسەر ئەژنۆیدا و بە هێمنی بەرابەرم دانیشت، گووتی مامۆستا بمبورە، لەمڕۆوە ئیتر دەرسەکانی خەیاڵ تەواوبوون، من و سەیفە هەستدەکەین وانەکانی تۆ کارێکی خراپی لە کچەکە کردبێت، باوکی پێیوایە وازهێنانی لە نەجۆی دەستگیرانی پەیوەندی بەم دەرسانەوە هەبێت کە لە تۆی وەردەگرێت. وەک ئەوەی کچەکە پەڕیبێتە دونیایەکی ترەوە، ئاگای لە خۆی نەماوە و بەردەوام قسەی سەیردەکات.

من ئەو ڕۆژە قسەم نەکرد، دەمزانی هەرچییەک بڵێم بێسوودە، هیچ یەک لە خانمی شەمس و سەیفەدین مارۆ نەیاندەتوانی تێبگەن من دەڵێم چی، مرۆڤ گەر خۆی ڕۆحلەبەرێکی خەیاڵی نەبوو، چەند باسی خەیاڵی بۆ بکەیت تێناگات. دوو ڕۆژ دوای ئەوە ئێوارەیەکی درەنگ کچێک نامەیەکی مەهناز مارۆی بۆ هێنام، نامەی دڵێکی گەنج و تێکشکاو، بە گریانەوە نوسیبووی منی خۆشدەوێت و لەبەر من وازی لە نەشکانی هێناوە، ناتوانێت بێ من بژی و دەبێت هەرچییەکم کردوە ڕزگاریبکەم، چونکە گەر من نەبینێت خەیاڵی دەمرێت. من نەمدەزانی چیبکەم؟ هیچ شتێک لەوە ناخۆشتر و غەمگینتر نییە، کچێکی منداڵکار و گەنج تۆی خۆشبوێت. هیچ ئازارێک لەم سەر زەمینە وەک ئەو ئازارە نییە، پیاوێک بیت و کیژێکی ناسک خۆشی بوێت و تۆ لە بەر هەزار هۆ و هەزار ڕێگری بێمانا نەتوانیت خۆشتبوێتەوە. من ئەوکات بەخیلیم بە نەجۆ نەشکانی دەبرد، نەمدەزانی دەتوانم چی بۆ ئەو کچە بکەم، نەمدەزانی چۆن دەکرێت کۆمەکیبکەم. مرۆڤ نابێت هەست و نەستی کچێکی گەنج بە گاڵتە وەربگرێت، من ئەوکات ئەو ئەزموونە گەورەیەم نەبوو. ئێوارەی ئەو ڕۆژە نەجۆ نەشکانی بە جووتێک چاوی سوورەوە، بە هەستێکی ڕقاوییەوە، بە لمۆزی بەرازێکەوە هاتە بەر دەرگام، منی

بەوە تاوانبارکرد کە مەهنازم لە خشتە بردبێت، ئەمانەتی مامۆستایەتییم خستبێتە ژێرپێمەوە و قوتابییەکی بەستەزمانی خۆمم فریودابێت. من بەو پەڕی توند و تورەییەوە تۆمەتەکانم دوورخستەوە و گووتم ئاگام لە هیچ حیکایەتێک نییە. بەڵام کۆپییەکی ئەو نامەیەی مەهناز بۆ منی نوسیبوو، لای ئەویش بوو، هەر ئەو کچەی کە مەهناز نامەکەی پیاناردبوو، کۆپییەکی نامەکەشی بە نەجۆ ئەشکانی فرۆشتبووەوە. بەلامەوە گرنگ نەبوو ئەو چی دەزانێت یان نازانێت، ئەوکات تەنیا خەیاڵم لای مەهناز بوو، من بە ئەشکانیم گووت واز لە کچە بەستەزمانەکە بهێنە، دڵنیام ئەو کچە منی خۆشناوێت، بەڵام ڕقی لە تۆیە، هێندە ڕقی لە تۆیە ناچار بۆ کەسێکی تر دەگەڕێت، بیکات بە پشت و پەنای خۆی. گەر دەتەوێت ئەو بەستەزمانە تووشی دەردی گەورە نەکەیت، لێیگەڕێ با جارێکی تر لەسەرخۆ و بە هێمنی خۆی بدۆزێتەوە. نەجۆ ئەشکانی گوێی لە قسەکانی من نەبوو، ئەو لەو مەخلوقانەبوو کە بەهرەیەکی کەمی خەیاڵیشیان نییە، لەوانەی گەر شتێک ئاسان نەهات بە دەستیانەوە بە زۆر دەیسێنن. ئیدی ماوەیەک من هیچ ئاگایەکم لە مەهناز مارۆ نەما، لەو ماوەیەدا ویستم لە ڕێگای هونەرەکانی خەیاڵەوە بیدۆزمەوە، بەڵام سودێکی نەبوو. دەمزانی ڕێگای ئەوەیان لێبەستوە بچێتە قوتابخانەش. ئیدی مەهناز مارۆم لەم دونیا ڕاستەقینەیەدا بە یەکجار و بۆ هەتاهەتایە ونکرد و نەمبینییەوە».

دوورکەوتنەوەی غەزەلنوس لە خانمی مەهناز مارۆ دەرەنجامی کوشندەی هەبوو، لە ماوەیەکی کەمدا هەمووان زانیان کچەکە بە شێوەیەکی شێتانە عاشقی ئەم مامۆستای خەیاڵەبووە، سەعید بایۆ لەهەر کەس پەشیمانتر بوو کە لە سەرەتاوە جۆرە پێشنیارێکی وەهای کردبوو، کێ دەیزانی شتەکان بەو جۆرە دەشکێنەوە؟. حەزی مەهناز لە غەزەلنوس بەجۆرێک

بوو، داوایکرد گەر ڕێگاییدەن غەزەلنوس ببینێت، ئامادەیە شوو بە نەجۆ ئەشکانی بکات، بەڵام نە عورف و نە عەقڵ ڕێگایان بە شتی وەها نەدەدا. بە پێچەوانەی چاوەڕوانی مەهنازەوە دایکی و سەیفەدین مارۆ ئێجگار دڵڕەق و خاڵی لە هەر نەرم و نیانییەک بڕیاریاندا کچەکە لەبری ئەوەی تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ ئەنجامبدات و بچێت بۆ زانکۆ، شوویکات و بە زوترین کات بڕواتە ماڵ و مێردی خۆی. ئەوە دوا بڕیاری سەیفە بوو کە شەمسیش بە ناچاری و ملکەچی قەبووڵیکرد. هیچ کەس بە تەواوی حیکایەتی دواهەمین ڕۆژەکانی ژیانی مەهناز مارۆ نازانێت، دایک و باوکی قسە لە تەنهاییەکی قووڵ و بێدەنگییەکی ترسناک دەکەن، مەهناز هیچ شتێک ناڵێت، هیچ شتێک ناکات. چوار سەعات بەر لەوەی نەجۆ ئەشکانی، بە خۆی قیافەتە سەربازی و سمێڵە ئەستوورەکانییەوە، بە جلی کۆنی پێشمەرگایەتییەوە «کە تایبەت بۆ ڕۆژی زاوابوونی هەڵگرتبوو» بگاتە بەر دەرگا، لە چیمەنەکەی خۆیاندا، ئاگر لە خۆی بەردەدات و هیچ خۆڵەمێشێک دوای خوای جێناهێڵێت، هیچ کەسێک دوای سووتانی مەهناز ئێسکێکی سووتاو، یان پاشماوەی جەستەیەکی خەڵوزین نادۆزێتەوە، وەک ئەوەی کچەکە هەوا بردبێتی، وەک ئەوەی لەشی لەو ماوەیەدا بووبێت بە هەندێک ئێسک و پروسک و پەڕوباڵی خەیاڵی. شەمس و سەیفەدین مارۆ هەردووکیان دەیبینن کە لە ناوەڕاستی چیمەنەکەدا خۆی دەسووتێنێت، بەڵام نە بۆنی بۆکڕوزی جەستەیەک دەکەن، نە دوای ئاگرەکە خۆڵەمێشێک دەدۆزنەوە. هەموو خەڵک پێیانوایە حیکایەتی خۆ سووتانی مەهناز هیچ نییە جگە لە درۆیەکی گەورە بۆ داپۆشینی شتێکی عەیبتر و شەرمینتر، دەنگۆیەک بڵاودەبێتەوە کە مەهناز لەگەڵ کوڕێکی تردا ڕایکردبێت بۆ دەرەوەی وڵات. بەڵام ئەو شتانەی دوای مردنی مەهناز ڕوویاندا واناڵێنن، دوای تێپەڕینی پرسەکە بەچەند ڕۆژێک، ماڵی مارۆ، پڕدەبێت لەو گوڵە

خەياڵيیانەی بەهەموو لايەكدا دەڕوێن، پڕدەبێت لەو باڵندە سەيرانەی كەس نەيبينيون، پڕدەبێت لە دەنگی مەخلوقاتی سەير كە دەنگی گۆرانيان لە ناو ڕاڕەو و ژوورەكاندا دەنگدەداتەوە، گيايەكی دڕندە و كێويش بەسەر زەوييەكەدا دەكشێت، خانمی شەمس و سەيفەدين چەند ئەو گوڵانە لە ديوارەكان دەكەنەوە، چەند ئەو باڵندانە دەردەكەن، چەند ئەو گيايانە لە ڕيشە دەردەهێنن، سوودی نييە. خانووەكە دەهێننە سەر فرۆشتن، عەتار وەك يەكەمين كڕيار دێت و لە بينينی ئەو هەموو گوڵ و گيا و باڵندەيە سەرسامدەبێت، وەك ئەوەی لە نەفرەتێك بترسێت، بە پەلە دەكشێتە دواوە و هيچ نرخێك لەسەر شوێنێكی وەها سەير دانانێت. لە ماوەيەكی كورتداماڵی سەيفەدينی مارۆ بەجۆرێك دەگۆڕێت هيچ كەسێك ناتوانێت تيا بژی. سەيفەدين و خێزانەكەی دەگوازنەوە بۆ خانوويەكی دی لەوپەڕی شار. ماوەيەك هيچ كەس ئەو خانووە ناكڕێت و نايگرێت، بەڵام دوای ماوەيەكی كەم ڕۆژێك كڕيارێكی سەير دێت و ئەو خانووە بە نرخێكی بەرز دەكڕێتەوە.

## ڕۆژێكی سەير لە ژيانی ماجەلانی ڕاستەقينە «ڕۆژێكی ئايی ساڵی دوو هەزار وچوار»

زوهدی شازەمان لە ڕۆژانی دی زووتر بە ئاگاهاتەوە، هێشتا خۆر تەواو نەكەوتبوو، سەرەتا لە جێگاكەيدا هەستی بە جوڵەيەكی سەيری پەردەكان و فێنكييەكی ناوەخت كرد، كە لەگەڵ گەرمای كوشندەی شەودا نەدەگونجا، هەستيكرد هەوايەكی زۆر بەهێز لە پەنجەرەكانەوە دێتە ژوورێ، هەوايەك لەگەڵ خۆيدا فێنكييەكی سيحراوی دەمەوبەيانی دەهێنێت. ئەو چەرچەفێكی سپی تەنكی دابوو بەسەر خۆيدا، بيری بوو

شەو کە خەوت پەنجەرەکانی داخست تا هەوای فێنکیسازەکان کەمێک ژوورەکە ساردبکەنەوە. کە سەری هەڵبڕی هەستی بەشتێکی سەیر کرد، بێدەنگییەکی نائاسایی و قووڵ کە لە بێدەنگی ڕۆژانی دی نەدەچوو، وەک ئەوەی بوونی شتێکی دی یان ئامادەگی تەنێکی گەورە ئەو جۆرە بێدەنگییەی سەپاندبێت. وەک لە ترسی جانەوەرێکی زەبەلاح ڕاچڵەکێت، قژی لادا و لە جێگای خۆی ڕاستبووەوە. پیاوێکی باریک و لاواز و درێژ لە کورسی بەرامبەر سیسەمەکەدا دانیشتبوو، پیاوێک لەوەوبەر نەیبینیبوو، کەسێکی ناشیرین بوو بە دوو دەستی دەماراوی زۆر درێژەوە، پێشتر لە ژیانیدا ڕێکەوتی دیمەنی وەهای نەکردبوو، لە ناکاو ڕاچڵەکێت و مەخلوقێکی غەریب بەرابەری بێت. هەستی بە ترسێکی کتوپڕ کرد، لەچەند چرکەیەکی کورتدا عارەقێکی سارد بە لەشیدا هاتەخوارێ، گەر ئەو عارەقە ساردە نەبایە پێیوابوو کە هێشتا خەوتووە و مەخلوقێکی درێو دەبینێت لەوانەی جارجار دزەدەکەنە ناو خەونەکانییەوە. بەڵام بە ڕوونی گوێی لەو دەنگە گەرم و خۆشحاڵەی کابرا بوو گووتی «بەڕێز زوهدی شازەمان... زوهدی شازەمان، مەترسە و مەشڵەژێ، مەترسە و مەشڵەژێ... هەموو شتێک سادە و ئاساییە، سادە و ئاساییە، وەک بەیانییەکی بەهار، وانییە، سەیرکە، لە پەنجەرەکەوە سەیرکە، ئێجگار فێنکە، وەک بەیانییەکی بەهار وایە، کەمجار بەیانی وا جوان ڕێک دەکەوێت، هەوا سیحراوی بێت، شار بێدەنگ بێت، فێنکی دڵبکاتەوە، سەیریکە، فێنکی چەند دڵدەکاتەوە». زوهدی بە زەحمەتێکی زۆر خۆی کۆکردەوە و گووتی «تۆ کێیت؟ چۆن ئاوها بێپرس دێنە ژوورەکەی من؟ ئێرە کوێیە، ئوتێلە یان خومخانەیە، کێ ئێوەی ناردۆتە ئێرە، کێ؟ نابینیت ئێرە ژوورێکی یەک نەفەرییە، نابینیت؟». پیاوەکە وەک ئەوەی گوێی لە قسەکانی زوهدی نەبووبێت «هی هی هی هی» پێکەنینێکی سەیر پێکەنی و گووتی «زوهدی شازەمان هی هی... دەڵێیت

چی، من زۆر حەزم لە بەیانیانی هەینییە، شێتی بەیانیانی هەینیم، ئاه حەزم لەم کش و ماتییە سەیرەیە، حەزم لێیەتی، من مەخلوقێکی بێخەوم، حەزم لە بەیانییە، حەزم لە بەیانییە، بەتایبەت کە ئاوها هێمن بێت، هەوا ساف بێت، شەقامەکان چۆڵ بن، مرۆڤ بەدەرەوە نەبێت، وییی، بەیانیانی هەینی لە مانگی ئابدا، بەیانیانی هەینی، تۆ نازانێت ئەوە چ خۆشە... چ خۆشە... چ خۆشە». زوهدی گووتی «تۆ کێیت؟ من کارم بە بەیانییەوە نییە، دەمەوێت تێبگەم تۆ چی دەکەیت لەم ژوورەدا؟ ». کابرا گووتی «چۆن کارت بە بەیانییەوە نییە، مرۆڤ لە بەرخاتری هەندێک بەیانی خۆش دەژی، ئاخ ئەگەر بەیانی خۆش نەبێت، هیهی هیهی ژیان دەبێت بە جەهەنەم. هەر ئینسانە و بۆ شتێک دەژی، من بۆ بەیانیانی هەینی دەژیم، بەیانیانی هەینی خۆشترین کاتی ژیانمە، سیولالا، گەر بەیانی هەینی نەبێت، شەوانی شەممان تامیان نییە».
زوهدی بە توڕەییەوە گووتی «باشترە هەر ئێستا بڕۆیتە دەرێ، من دەمەوێت بەیانیان بخەوم، هەر کەسێک هەیت، بڕۆرە دەرێ، گەر کاریشت بە منە، دەتوانیت کاتێکی تر بێیتەوە، من ئێستا دەمەوێت بخەوم».
پیاوە ناشیرینەکە گووتی «خەوتن؟ بەڕێز زوهدی شازەمان، خەوتن؟ لە ڕۆژێکی وادا، لە بەیانییەکی وا خۆشدا، لە ساتێکی وا هێمندا؟». زوهدی شازەمان بەسەرسامییەوە پرسی «پێدەچێت لە ئاسایشەوە تۆیان ناردبێت؟ گەر لەوێوە ناردویانیت قسەبکە، دواجار دەمەوێت بزانم تۆ کێیت و چیت دەوێت؟». پیاوەکە بۆ یەکەمجار هەستایە سەرپێ، پیاوێکی درێژ بوو، بالای لە قامەتی زوهدی خۆیەوە نزیکبوو، هەردووکیان دوو مەخلوقی باریک بوون، بەلام زوهدی بە قژێکی درێژی ڕێک و ئەو بە قژێکی کورتی زۆر ناڕێکەوە. کابرا لەشێکی پێچخواردوی زۆر ناشیرینی هەبوو، شەپۆلانێک و کورپییەک لە جەستەیدا بوو ناشیرینتری کردبوو، لەگەڵ بالا زۆر بەرزەکەیدا شتێکی لە چەمینەوە و قەمووری تیادەبینرا،

لایەکی شانی بە جۆرێکی سەیر داکەوتبوو، هەرکەس بیدیبایە هەستی دەکرد یەکێک لە دەستەکانی لەوی دیکەیان درێژترن، دانە دەرپەڕیو و شاش و زەردەکانی، لێوە بەرز و پوکە سوورەکانی، ڕوخساری جانەوەرێکی ناوازەیان پێبەخشیبوو. بە پێکەنینە سەیرەکەی خۆی گوتی «زوهدی شازەمان، من دەزانم تۆ ئیشت بە منە؟، تۆ لەوپەڕی دونیاوە هاتوویتەوە، بە دوای مندا بگەڕێیت؟ وانییە، تۆ بە دوای مندا هاتوویتەوە؟». زوهدی وەک ئەوەی لەم پیاوە نائومێدبووبێت، گووتی « گەر ناوی خۆتم پێ نەڵێیت، گەر نەزانم چ کارەیت، ئێستا ئەم ژوورە و ئوتێلەکەش جێدەهێڵم؟ تێناگەم ئەمە چۆن ژیانێکە لەم ئوتێلەدا؟ چۆن ژیانێکە؟». پیاوەکە لەسەر هەمان ڕیتمی پێکەنین گووتی« نا، نامەوێت ئازارت بدەم، من مورتەزام، مورتەزای شەیتان، تۆ بەدوای مندا ناگەڕێیت؟». زوهدی وەستا و سەیرێکیکرد و گووتی «مورتەزا؟... مورتەزای شەیتان؟». کەمێک بیریکردەوەو گووتی«ئاوها، تۆ مورتەزایت، ئێستا دڵنیام ئەو ئەفسەرە دەبەنگەی ئاسایش، هەموو نامەکانی منی داوە بە تۆ، وا نییە، هەموو نامەکانی منی داوە بە تۆ؟ چەند پوچ و بێمانایە». زوهدی شازەمان ئێستا جیدیتر دەینواند، قژی بە شتێک بەست و وەک چاوەڕوانی شتێک بکات گووتی «کێ دەڵێت من بە دوای تۆدا دەگەڕێم؟ من بە دوای تۆدا ناگەڕێم، من بەدوای باران شوکوردا دەگەڕێم، من کارم بە تۆ چییە، تۆ کێیت تا بەدواتدا بگەڕێم؟». مورتەزای شەیتان لە شوێنی خۆی دانیشتەوە و وەک یاری بە زوهدی شازەمان بکات گووتی «ئەگەر باران شوکور نەدۆزیتەوە، دواتر بۆ من دەگەڕێیت؟ وانییە؟ من هەموو نامەکانم خوێندەوە، نامە جوانەکانی خانمی باران شوکور، ژنی بەڕێزی بارۆنی کولەکە، کە لە ژێرەوە لەگەڵ گەنجێکی جواندا دەستی تێکەڵکردبوو، هیهیە هۆ هیهی». زوهدی شازەمان گووتی« تۆ دەزانیت باران لە کوێیە؟ وانییە دەزانیت؟».

مورتەزا بە پێکەنینە شەیتانییەکەی خۆیەوە گووتی «وابڵێیت لێت زویردەبم؟ زۆر زویردەبم، زوهدی شازەمان. تۆ پیاوێکی عاقڵیت، وانییە؟ عاقڵیت یان هیچ تێناگەیت؟...». لەو ساتەدا وەک لەسەر کورسییەکە سەمابکات، خۆی بادەداو چەندین جار ئەو ڕستانەی دووبارەدەکردەوە. زوهدی تەماشایدەکرد و دەیزانی سەروکاری لەگەڵ مەخلوقێکی فێڵباز و لیبۆکێکی ترسناکدایە. بەرابەری وەستا و گووتی «مورتەزا بەڕاست تۆ نامەکانی باران شوکورت خوێندۆتەوە؟ بەڕاست؟». مورتەزا دەوەستا و کەمێک یاری بەدەموچاوی دەکرد و دەیگووت « هیهی هیهی. من خوێنەرێکی زۆر باشم، حەزم زۆر لە خوێندنەوەیە، هەندێجار دەچم بۆلای هاوڕێکانم لە ئاسایش، دۆلابی فایلەکان دەکەمەوە، ئیفادەی تاوانبارەکان دەخوێنمەوە، هی هی، زوهدی شازەمان، هیچ شتێک لەوە خۆشتر نییە کە مرۆڤ خۆی بێگوناه بێت و گوێ لە تاوانباران بگرێت، هی هی. من حەزم لە خوێندنەوەی کتێب نییە، بەڵام حەزم لە خوێندنەوەی فایلەکانە، لە ئاسایش، لە دادگا... تەحا تەحا... ڕۆژێکی زۆر خۆشە، ڕۆژێکی زۆر خۆشە، بۆ من لە هەموو کاتێک خۆشترە». زوهدی شازەمان وەک هەوڵبدات، بیوروژێنێت و لەو مەزاجە دایگرێت گووتی « نامەکان وەک جانەوەرێک باسی تۆ دەکەن، وەک کەسێکی ترسناک، وەک ڕۆحلەبەرێکی ناشیرین. کە ئێستا خۆشت دەبینم، مەبستەدەکەم تۆ زۆر لەوەسفەکان ناشیرینتریت، زۆر ناشیرینتریت». مورتەزا بێئەوەی هیچ شتێک لە مەزاجی گۆڕابێت گووتی« شازەمانی برام گوێبگرە، هەموو وام پێدەڵێن. باران خان، زۆر خراپ سەیری منی دەکرد، ژنان هەموو خراپ وەسفی من دەکەن، بەڵام من حەزم لێیە خەڵکێک لێم بترسن، حەزم لێیە، گرنگ ئەوەیە من دەستم پاکە، بێگوناهم، گرنگ ئەوەیە، گرنگ ئەم دەستەیە، تێدەگەیت هی هی هی هی... کە دەستت پیس نەبوو، شتەکانی تر باشن، وانییە، هەموو شتێک باشە». زوهدی بەرابەری

وەستا و گووتی «هێشتا ناتناسم، نازانم، بەڵام بە شێوە لە جانەوەر دەچێت؟». مورتەزا بە قاقایەکی بەرزەوە هەڵدەستا و دەیگووت « مورتەزا ناناسیت، مورتەزا پەپولەیە. من قەت خراپ نەبووم، قەت». زوهدی شازەمان دەیگووت « تۆ دەزانیت باران لە کوێیە؟ وانییە؟ دەزانیت». مورتەزا لە ناکاو دەگۆڕا، دەنگی جیدیتر و گەرمتر دەینواند و دەیگووت «زوهدی شازەمان، بۆیە من لێرەم، تا لە تۆ بپرسم، باران شوکور لە کوێیە؟ قەسەم بەم بەیانییە جوان و فێنکەی جومعە، قەسەم بە خۆشی ئەم سپییدەیە، بۆیە لێرەم، ئەو پیاوە باشە ناردومی، من لەو پیاوە بێئەدەبانە نیم کە سەعات شەشی بەیانی هەڵکوتنە سەر خەڵکی خەوتوو، هیهیهی، ئەو پیاوچاکە بە زۆر ناردمی، دەزانی مەبەستم کێیە، ها دەزانی؟ مەبەستم بارۆنی کولەکەیە، ئەو شەو هات بۆ لام و پێیگووتم، کە دەبێت بێم، شەو زۆری لێکردم، سەبری لێبڕابوو، لە تەیرێکی برینـدار دەچوو، لەو ڕۆژەوەی کە ژنەکەی دیار نییە لە تەیرێکی سەربڕاو دەچێت، لای هەموو خەڵک درۆدەکات، لای هەموان دەڵێت بارانم ناردوە بۆ ئەڵمانیا، هیهیهی ئەوەندەی درۆکردوە، خۆی بەزەیی بە خۆیدا دێتەوە، ئێستا خەڵک بزانن تۆ خاڵی باران شوکور لێرەیت، دەبێت بە حیکایەت؟ سیولالا... سیسی، بەس خوا دەزانێت دەبێت بە چ مەحشەرێک. ئەو بەستەزمانە لای هەموو خەڵک گووتوویێتی، من ناردومە بۆ لای خاڵی. بەستەزمانە درۆ دەکات، درۆدەکات، ئەوەندەی درۆکردوە ناتوانێت سەیری ئاوێنە بکات، دەزانیت چ شورەییە گەر بزانن ژنەکەی هەڵهاتوە، ڕایکردوە، دیارنەماوە؟ خۆت دەزانیت گەر ژنی بارۆنی کولەکە هەڵگیرابێت، دەبێت بە چ حیکایەتێک لە شاردا. بەستەزمانە تەحەمولێکی هەیە بە ئەیوبەوە نییە، من ناوم ناوە بارۆنی سەبر، بارۆنی تەحەمول، بارۆنی ئیرادە... بەڵام دوێنی شەو کە هات بۆلام، لە تەیرێکی سەربڕاو دەچوو، کەس بارۆنی کولەکە وەک من ناناسێت، من

دەیناسم، دەیناسم، زۆر باش دەیناسم. داماوە لە ژندا بەختی نییە، وەک من، وەک من. هەر پیاوێک لە ژندا بەختی نەبێت بەدبەختە، با بارۆنی کولەکەش بێت، با پادشاش بێت... هەر بەدبەختە».

مورتەزای شەیتان بە هەردوو دەست هەڵدەسوڕا، باڵە خوار و درێژەکانی لە هەوای ژوورەکەدا سەمایاندەکرد، یەکەمجاربوو جیدی دەینواند، بەڵام لەوانەبوو کە مرۆڤ نازانێت ڕاستدەکەن یان درۆ. زوهدی شازەمان بە غەمێکەوە سەیریدەکرد و دەیگووت «ئەی کەواتە باران شوکور لە کوێیە؟ لە کوێیە؟». مورتەزای شەیتان دەستی ڕادەوەشاند و دەیگووت « مێردە بەستەزمانەکەی لە تەیرێکی بریندار دەچێت، لە چۆلەکەیەک دەچێت واشە لێیدابێت، بەستەزمانە بەسەر زەوییەوە نییە، چەندین مانگە بەسەر زەوییەوە نییە، چەندین مانگە ئاگای لە دونیا نییە. هیهی هیهی، بە ویژدانێکی نارەحەتەوە درۆدەکات، بێئەوەی گوناهی هەبێت هەست بە گوناه دەکات. من کە نامەکانی باران شوکورم دەستکەوت، یەکسەر بردم بۆی، بێئەوەی بوەستم، نامەکانم لە نەقیب وەرگرت و بردم بۆی، هیهی هیهیە، سیولالا، نەقیب دەناسم، خوای گەورە، واهەستدەکەم من هەموو دونیا دەناسم، هەموو دونیا. گەر دەتبینی ئەو کاتەی نامەکانی کردەوە و سەیریکردن، گەر دەتبینی. وەک تەیرێکی بریندار بۆنی بە کاغەزەکانەوە دەکرد، هۆن هۆن وەک ژنێک دەگریا، هیهیهی هیهیهیە... قەسەم بەم بەیانی جومعەیە وەک ژنێک دەگریا، بۆنی بە کاغەزەکانەوە دەکرد و دەیگووت باران گیان تۆ لە کوێی، پیاوێکی تر نییە وەک بارۆنی کولەکە، تێدەگەیت. پیاوێکی تری وەک ئەو لەم دونیایەدا نییە. فریشتەیەکی تەواوە، مەلاکێکی بێ باڵە و لە ئاسمان بەربۆتەوە، دەیزانی کە باران پەیوەندی لەگەڵ ئەو کوڕەدا هەیە، هیهیە بەڵام سەبریدەکرد، تەحەمولی هەبوو. کە نامەکانم بۆ برد، بەلایەوە گرنگ نەبوو چی تیانوسراوە، ئەو قسە سارد و سووکانەی بارانی بۆ گرنگ

نەبوو. گرنگ بوو بۆنی نامەکان بکات، سەیری دەست و خەتەکەی بکات، ناوەکەی ماچبکات... قەسەم بە هەرچی ئەسحابەیە، هیهی هیهی ئەو پیاوە بەستەزمانە نامەکەی بارانی بەرزکردەوە و ماچیکرد، ناوەکەی ماچکرد، سێ و سێ جار، لە هەر سێ و سێ نامەکەدا ناوەکەی باران شوکوری ماچکرد. هیهی... من لە ژێرەوە سەیرمدەکرد و پێدەکەنیم، هەر کەسێکی تر بووایە تفیدەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی بارۆنی کولەکە فریشتەیە، لە جنسی مەلەکە، سێ و سێ جار ناوی ژنە خیانەتکارەکەی ماچکرد. هەموو هیوای ئەوەیە تۆ شوێنی ئەو بزانیت، تۆ بڵێیت، من دەزانم باران شوکور لە کوێیە. ئەو بۆ ئەو ساتە دەژی، بەستەزمانە لە تەیرێکی باڵشکاو دەچێت. نیوەی سەروەت و سامانی خۆیت دەداتێ، تۆ پێی بڵێی باران شوکور لای منە، نیوەی زیاتریش... هیهی، من بەقەد ئەو باش نیم، بەڵام ئەو لە جنسی بەنی ئادەم نییە. مەلایکەتی ئاسمان بیبینن خۆشیاندەوێت، بەڵام باران خان ڕقی لێبوو، هیهی. من کە نامەکانم بینی یەکسەر بۆم برد، نەقیب سەمەد ناسیاومە... وەخت بوو شێت بێت، سیولالا، من چوومە ژێربالی، دەستم گرت، گووتم بارۆنی سەبر دان بە خۆتدا بگرە، بارۆنی تەحەمول خۆت بە پێوەڕاگرە و بوەستە، هەموو شتێک باش دەبێت. هیهی هیهی... پیاوێکی سەیرە کە دەڵێیت هەموو شتێک باش دەبێت، یەکسەر واهەستدەکات هەموو شتەکان باشدەبن، هەموو شتەکان».

مورتەزای شەیتان بە قەد و قامەتە خوارەکەیەوە هەستابوو، لەشی بە لەشی ئاژەڵێک دەچوو بای خواردبێت، ترۆپکی چەماوەیەک لە پشتییەوە دەستی پێدەکرد، لە کەمەریدا دەگەیشتە نزمترین شوێنی خۆی، لە سەر قوونی کەمێک بەرزدەبووە و لە ژێر ئەژنۆکانیدا دەچووەوە قووڵی. سەرتاپای لەشی لە زیکزاکێکی نارێک دەچوو، بەڵام دەنگی ساف و کاریگەربوو، دەنگێک بوو دەیتوانی هەناسەی ڕۆحێکی مەکرباز

بگوازێتەوە. زوهدی شازەمان کە لەمێژبوو تێکەڵاوی ئەمجۆرە دونیایە و ئەمشێوە ئادەمیزادانە نەبووبوو، ئەزموونی زۆری لەگەڵ دونیادا بەشی ئەوەی نەدەکرد، ڕاست و درۆ لە قسەکانی مورتەزادا جیابکاتەوە. وەک ئەوەی فریوی مورتەزای شەیتانی خواردبێت گووتی «دەتوانم بارۆنی کولەکە ببینم؟ مَن دەمەوێت بارۆنی کولەکە ببینم، مـن هیچ شتێک دەربارەی باران نازانم، هیچ شتێک، هەتا لە ژیانمدا وێنەیەکیشیم نەبینیوە، تێدەگەیت، نازانم بۆ، بەڵام هیچ کات وێنەیەکی خۆی بۆ نەناردم، زۆرجار هەستدەکەم کەسێک لەم دونیایەدا نییە ناوی باران شوکر بێت، هیچ کەس نییە ناوی باران شوکور بێت، هەمووی خەیاڵێکی بێمانایە، مۆتەکەیەکە، سێبەرێکە لەسێبەرە ترسناکەکانی ڕابوردوو کە ڕاوم دەنێت».

مورتەزای شەیتان بە خەندەی پیاوێکی چەپەڵەوە تەماشای زوهدی شازەمانی دەکرد، کە لەسەر لێواری قەرەوێڵەکە وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بدوێت قسەیدەکرد، مورتەزا وەک ئەوەی پلەیەک لە مەکری خۆیدا سەرکەوێت، گووتی «من گووتم، من بەدرێژایی دوێنێ شەو بە بارۆنی کولەکەم گووت، عەزیزی من بارۆن، دڵی من بارۆن، ئەم شازەمانە پیاوێکی بەستەزمانە، پیاوێکی خەتەر نییە. لەوانەیە بۆ هاوینەهەوارەکان هاتبێتەوە، لەوانەیە سەر لە شوێن یادێکی منداڵی بدات، لەوانەیە هیهی هیهی بۆ لای ژنێک هاتبێت. ئینسان ژنی جوان لە بیرناکات، هیهی من خۆم ژنی جوانم بیرناچێتەوە، هیهی بیرم ناچێتەوە. ئاخ گەر ئینسان بیری نەبووایە، گەر بیری نەبووایە، سیولالا، چەند خۆش دەژیا. کێ چوزانێت تۆ بۆچی هاتوویت؟ گەر ئەو نامانە نەبووایە، گەر لە ئاسایش ئەو مەلعونە ئەوەندە فزوڵ نەبووایە، ئەو نەقیبەی ئاسایش کە حەزی لەسەیرکردنی دەرپێ کورتی ئەوانەیە کە لەخاریجەوە دێن. حەزدەکات لە سەیتەرەکان بوەستێت، خۆی بکات بە ئوتێلەکاندا و جانتاکان هەڵبداتەوە

و سەیری دەریێ کورتەکان بکات، نەخۆشە هیهی هی، بە شەرەفم نەخۆشە. بارۆنی کولەکە نازانێت، هیچ نازانێت، ماوەیەکە لە هەموو شتێک دەترسێت، لە پاسارییەک دەچێت داڵ لێیدابێت، من پێیدەڵێم، من پێیدەڵێم و ئەو گوێم لێناگرێت».

زوهدی شازەمان گووتی «دەمەوێت بارۆن ببینم، دەبێت ببینم، من بەدوای باران شوکوردا هاتوومەتەوە، بۆ هاوینەهەوار نەهاتوومەتەوە، بۆ هیچ نەهاتووم، دەمەوێت بزانم باران شوکور لە کوێیە؟ بارۆن مێردی باران شوکورە، دەبێت ئەو بزانێت لە کوێیە؟ وانییە، تۆ نامەکانت خوێندۆتەوە. تێدەگەیت بۆ وا دەڵێم».

مورتەزا بە دەنگێکی خنکاو لە پێکەنیندا دەیگووت« قەسەم بە هەرچی ئەستێرەی ئاسمان هەیە، قەسەم بە فەلەکە بەرزەکان کە ئەو هەموو جورمە عاجباتییانە لەسەریان دەسوڕێنەوە، قەسەم بە هیهیهی هیهی بە... هیهی... بە نور کە لەدوورەوە دێت، بە تیشک کە کەس سەرچاوەی نازانێت، قەسەم بە بەیانیانی هەینی لە مانگی ئابدا. بارۆنی کولەکە هیچ نازانێت، هیچ».

زوهدی دەیگووت «منیش نازانم، منیش نازانم، بەڵام دەبێت یەکێک هەبێت بزانێت، وانییە... واز لەم پێکەنینە شوومەی خۆت بهێنە، کە دەنگی هەندێک تەیرم بەیادا دەهێنێتەوە کە نەگبەتی دەهێنن. ئەم پێکەنینەیە وادەکات لە جنۆکەیەکی بەدفەساڵ بچیت... ناتوانیت پێنەکەنیت، ناتوانیت؟ پێمبڵێ من دەتوانم بارۆنی کولەکە ببینم یان نا؟ دەتوانم یان نا؟».

مورتەزای شەیتان وەک ئەوەی شەپۆلێکی گەورەی خۆشی ڕاپێچیبکات، پێکەنین بەر گەروی دەگرت، پێکەنین دەیخست بە زەویدا، لەسەر تەختی ژوورەکە لە قاقادا کلافەدەبوو. قاچە نارێکەکانی لە حەوادا

جووتەیان لە هەوادەدا، دەستەکانی وەک دەست و قاچی قالۆنچەیەک کەوتبێتە سەرپشت دەجوڵانەوە، زوهدی وەک سەیری لیبۆکێک بکات، بێئەوەی بزانێت بەچی پێدەکەنێت لە مورتەزای شەیتان ڕادەما. مورتەزا وەک خۆی لە سەحنەی شانۆیەک بکێشێتەوە، هەڵدەگەڕا و بە چنگۆڵان، بە دەم قاقاوە لەسەر هەر چوارپەل ژوورەکەی جێدەهێشت. بێئەوەی هیچ بڵێت، بێئەوەی هیچ گفتێک بە زوهدی شازەمان بدات، دەڕۆیشت و وندەبوو.

شازەمان لە ژوورەوە هەستیدەکرد پێکەنینی ئەم مەخلوقە ناشیرینە، پێکەنینێکی جەهەنەمی سەیرە، بۆنی شەیتانی لێدێت... بۆنی شەیتان و هیچی تر.

کە مورتەزا ڕۆیشت، ماوەیەک نەیدەزانی چی بکات، نەیدەزانی بەدوایدا بڕوات یان لێیگەڕێت. شتێک لە غەریزە زیرەک و هەستە ژێرەوانکێکانیدا دەیگووت «لێیگەڕێ بڕوات... لێیگەڕێ». دڵنیابوو، ئەم پیاوە جارێکی تر دێتەوە، تەفسیری بۆ ئەم دەرکەوتنە سەیر و لە ناکاوە نەبوو. شتەکان وەک خەو هاتنە پێشچاوی، پێشتر جۆرە بوونەوەرێکی وەها ناشیرینی نەبینیبوو. نەیدەزانی چ جۆرە مرۆڤێکە. بەڵام دڵنیابوو لەگەڵ بینینی ئەودا سەفەرەکەی چۆتە قۆناغێکی نوێوە. ئەو ڕۆژە تا ئێوارە بێئاراستە پیاسەیکرد، بازاڕە کۆنەکانی شار و قەیسەرییە تازەکان هەموو گەڕا. وەک پیاوێکی بێناز و بێبەرنامە و بێئومێد لە چەندین چاخانەی چکۆلانەدا چایخواردەوە. بەدرێژایی ژیانی پیاوێکی بێنیاز و بێئومید و بێئاراستەبووە، بەدرێژایی ژیانی هەر ڕێگایەکی گرتبێتە بەر وەک یەک بووە. ئێستا دەبێت بوەستێت و چاوەڕێبکات، لەو ڕۆژەوەی هاتبووە ناو ئەم شارە هەستێکی سەیری هەبوو کە شتەکان بەرەو لای ئەو دێن. هەموو گەڕانەکانی خۆی بێهودە و کەم مانابوون، دەبایە بوەستێت و چاوەڕوانبێت تا شتەکان خۆیان بەرەو ڕووی دێن.

***

کە ئێوارە گەڕایەوە بۆ ئوتێلەکە، ژنی خاوەن ئوتێلەکە لە سالۆنەکەدا لەگەڵ خانمێکی دیکەدا قسەیدەکرد، زوهدی شازەمان خۆی وا نیشاندا کە نایبینێت. کلیلەکانی وەرگرت و بە هێمنی ڕوویکردە ژوورەکەی خۆی، هێشتا پێی نەخستبووە ناو دەرگای ژوورەکەی، خانمی ئەفسانە لە دواوە و بە چپەیەکی ئەفسوناوی گووتی «دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم». دەنگی هەمان ئەو سیحرەی سەرەتای تێدابوو، هەمان ئەو فریوەی یەکەمین سات کە لە پێشەنگدەری ئوتێلەکەدا بینی، دەنگی هیچ ئافرەتێک پێشتر وەها کاری تێنەکردبوو. بێئەوەی ئەو لاوازییەی خۆی دەربخات گووتی «فەرموو دەتوانیت، قسەم لەگەڵدا بکەیت». ژنەکە بە هەمان سووکی پرسی «دەتوانم بێمە ژوورەوە؟». شازەمان گووتی «گەر تۆ بتەوێت بۆ نا، دەتوانیت».

زوهدی شازەمان لە ژوورەکەدا پتر جوانی ئەو ژنەی بینی، خانمێکی باریکەلەی چاوڕەش بوو. بەدەنگێکی ناسک، کە بە مەبەست ناسکتری دەکردەوە گووتی « بمبورە، بەڵام ئەمڕۆ بیستم کە ئەم بەیانییە مورتەزای شەیتان لێرەبووە. ئەم بەیانییە بیستم. بەیانی زوو ویستم بێم بۆلات، بەڵام تۆ لە ژوورەوە نەبوویت، بە ڕاستی من خەمی تۆمە، نازانم ئێوە ئەم پیاوە دەناسن یان نا؟». قسەکانی خانمی ئەفسانە سەیربوو، هاتنە ناوەیەکی خێرابوو، شتێک لە خەمخۆری لە دەنگی ئەو ژنەدابوو دەیهێنا مرۆڤ بۆی بمرێت، زوهدی شازەمان لە ژیانیدا ئافرەتێکی خەمخۆری نەدیبوو، ئێستا ئەو دەنگە دەیتوانی نوقمی گێژاوێکی بێوێنەی بکات. وەک یەکەمجاری بێت قسە لەگەڵ ئافرەتێکدا بکات، هەستی بە کەمێک شڵەژان کرد. مرۆڤ چەند ئەزموونی لەگەڵ ئەو جنسەدا هەبێت،

هەندێجار رێکەوتی ئافرەتێک دەکات دەیگێڕێتەوە بۆ سەر سفر، وەک ئەوەی پێشتر خانمێکی لەسەر ئەم ئەستێرەیە نەدیبێت، وەک ئەوەی هەرچییەک تا ئەو کاتە فێری بووە بێمانا و بێکاریگەر بێت. یاری پیاو لەگەڵ ژندا لە مارو پەیژەیەکی بێمانا دەچێت، تۆ چەند خۆت بە شارەزا و خۆگرتوو دەربخەیت، لە ناکاو خانمێکت لێ پەیدا دەبێت، لە سەری سەرەوە بەرەو خواری خوارەوە دەتگێڕێتەوە. بە جۆرێک مرۆڤ دەتوانێت بڵێت سیزیف پیاوێک نییە کە بەردێکی گەورەی بە شانەوەیە بەرەو ترۆپکێکی بەرز سەریدەخات، سیزیف بەدبەختێکە کە ئافرەتێکی لەسەر شانە دەیگەیێنێتە سەر لوتکە و لەوێوە لەدەستی هەڵدێت و دەبێت دواجار بەدوایدا ڕابکات و سەر لەنوێ سەریبخاتەوە. زوهدی شازەمان لەگەڵ بینینی ژنی خاوەن ئوتێلەکەدا تووشی ئەو دۆخەبوو، تا ئەو کاتە چی لە ئافرەت دەزانی هەمووی بوو بە هەوا و دەبایە لە سفرەوە دەست پێبکاتەوە. بەسەرسامییەوە پرسی «خانم تۆ لە کوێ مورتەزای شەیتان دەناسیت؟». ئەفسانە گووتی «من ناوم ئەفسانەیە، گرنگ نییە لە کوێ دەیناسم، گرنگ ئەوەیە تۆ ئاگاداری بیت». زوهدی لەسەرەخۆ ڕێگای بۆ کردەوە و لەسەر کورسییەکە دانیشت، کەمجار خانمێکی بینی بوو وەها درەوشانەوەیەکی تایبەتی هەبێت. جەستەیەکی ناسکی چکۆلانەی هەبوو، لەگەڵ باریکی و چکۆلانەیی جەستەیدا جوانییەکی وەها زاڵی هەبوو، مرۆڤی شەیدادەکرد. وەک ئەوەی بزانێت ئامادەگی ئەو چ کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر شازەمان هەیە، بە عەیارییەوە قژی هەڵدایەوە و گووتی «بێگومان تۆ هاوڕێی ئەو نیت، من دەزانم تۆ هاوڕێی ئەو نیت، تۆ هاوڕێی کەس نیت لەم ئوتێلەدا. بەزەییم بە تۆدا دێتەوە، تۆ شایستەی جێگایەکی باشتریت». هەمیشە بەچپە قسەیدەکرد. شازەمان بەرامبەری دانیشت و گووتی «خانم تۆ لە کوێ من دەناسیت؟ کێ دەڵێت من شایستەی شوێنێکی باشترم؟ نامەوێت

بچم بۆ هیچ ئوتێلێکی تر، لایەنیکەم لەم ئوتێلەدا ژنێکی جوانی وەکو تۆ هەیە مرۆڤ ببینێت، ئوتێلەکانی دی چی لێیە؟» ئەفسانە بێئەوەی لەسەر ناوەڕۆکی قسەکان بوەستێت، وەک بیەوێت بەخۆلادانی یەکەم پتر لەم پیاوە نزیکبێتەوە، بەو دەنگە چرپەئامێز و سیحراوییەی خۆی گوتی «مورتەزای شەیتان پیاوی یەکەمی بارۆنەکانە، تێدەگەیت؟ هەر ژنێک بارۆنەکان بناسێت، ئەویش دەناسێت، من خۆم زۆر نایناسم، خەڵکێک دەناسم کە زۆر باش دەیناسن، شتی سەیری لێدەگێڕنەوە، لەوانەیە تۆ باوەڕنەکەیت، ئەوانەی لە خاریجەوە دەگەڕێنەوە باوەڕ بە زۆر شت ناکەن». زوهدی بە سەرسامییەوە گوتی «بەڵام من نازانم بارۆنەکان کێن؟ زانیارم لەسەر کوردستان لەو شتانە تێناپەڕێت کە بەگشتی لەدەنگوباسدا باسدەکرێن، ئارەزوویەکی زۆریشم لە سیاسەت نییە، سیاسەت زەلکاوێکی گەورەیە». ئەفسانە قاچی خستە سەر قاچی و گوتی «زانیم تۆ نایاننناسیت، زانیم بارۆنەکان ناناسیت؟ لێرەش هەموو کەس نایاننناسێت، هەموو شتێکی ئەم شارە بەدەست ئەوانە». دەنگی بە جۆرێکی سەیر نزمکردەوە و بە چرپە گوتی «مێردەکەشم ئیش بۆ ئەوان دەکات، تێدەگەیت، ئەم ئوتێلە هی خۆی نییە». زوهدی شازەمان پرسی«تۆ بارۆنی کولەکە دەناسیت؟». سەری بادا و گوتی «ناویم بیستووە، بەڵام نایناسم، گەر بتەوێت دەتوانم بپرسم، دەتوانم». زوهدی شازەمان کەمێک وەستا و گوتی «حەزدەکەم یارمەتیمبدەیت، بەڵام حەزدەکەم بشزانم بۆ دەتەوێت یارمەتیمبدەیت؟». خانمی ئەفسانە بەپەلە گوتی «لەبەرئەوەی تۆ غەریبیت، لەبەرئەوەی چەند ڕۆژە هەموو دەیانەوێت بزانن تۆ چی دەکەیت، تۆ نازانیت هاتویتە چ شارێکەوە، وانییە؟ تۆ زۆر لە مێژە ئێرەت نەبینیوە، وانییە؟ زۆر دەمێکە؟». زوهدی بە ماندوێتییەکی زۆرەوە گوتی «بەس تەنیا خودا دەزانێت چەند ساڵە من ڕۆیشتووم، ڕاستت دەوێت واهەستدەکەم لێرە نەژیاوم،

تاکە شتێک لە بیرمە مەلمەسی دیوارەکانە، مەلمەسی دیوارەکان». ئافرەتەکە بە هەموو نازکی خۆیەوە پرسی «چی؟ دیوارەکان؟ بۆ دیوارەکان؟». زوهدی چاوی لێکنا و گووتی «لەبەرئەوەی پەیوەندییەکی سەیرم بە دیوارەکانەوە هەیە، لێیاندەترسم... هەستدەکەم بۆ لای ئەوان گەڕاومەتەوە». ئەفسانە بەوێنەی ڕۆحێک بیەوێت لێرەدا نەوەستێت و پتر لەمپەرەکان بشکێنێت، دەستێکی هێمنی خستە قژییەوە و گووتی « بیستوومە کە تۆ بۆ باران شوکور دەگەڕێیت؟ ڕاستە، ڕاستە کە تۆ بۆ باران شوکور دەگەڕێیت؟ ڕاستە یان درۆیە؟». یەکەمجاربوو دەنگی جیدییەتێکی گەورەی تێدابوو. هیچ شتێک لەم دونیایەدا لە ئافرەتێکی ناسک جوانتر نییە کە لە ناکاو دەبێتە بوونەوەرێکی جیدی. زوهدی سات دوای سات پتر گیرۆدەی دەبوو، بەسەرسامییەوە پرسی «تۆ چۆن حیکایەتی باران شوکور دەزانیت، چۆن؟». ئەفسانە بە چرپەوە گووتی «گوێم لێبوو، نەقیب سەمەد قسەی بۆ مێردەکەم دەکرد، گوێم لێبوو کە باسی باران شوکوریان کرد، من سەیرم لێهات، سەیرم لێهات، چونکە ئێمەش بۆ باران شوکور دەگەڕێین». زوهدی بەسەرسامییەوە پرسی «ئێوە کێن؟». ئەفسانە تەواو خۆی لە زوهدی نزیککردەوە و بەچرپەوە گووتی «زانیم نامانناسیت، زانیم، من زانیم». زوهدی گووتی «چۆن بتانناسم، من پیاوێکی غەریبم، کەس ناناسم، هیچ کەس. ئاشناییم بەم شارە زۆر لەوە کەمترە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە». وەک نهێنییەکی گەورە بدرکێنێت گووتی «من سەر بە کۆمەڵەی ژنە سەرگەردانەکانم، ژنە پەژموردە و غەمگینەکان، ئێمە بەشێکین لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان، من سەرەتا تۆم بینی وامدەزانی یەکێکیت لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان». زوهدی وەک لە شتێک بترسێت، کەمێک کشایەوە دواوە و گووتی «بەڵام ئێوە بۆ لە باران شوکور دەگەڕێن، چ کارتان بە باران شوکورەوە هەیە؟ خوای گەورە، حیکایەتی ئەم کچە چییە؟ وردە وردە دڵم تەواو

دەکەوێتە مەترسییەوە». ئەفسانە بە هەمان سووکی و سادەیی گووتی «چۆن وادەڵێیت، چۆن؟ باران یەکێک بوو لە ئێمە، کچێک بوو تازە وەرمانگرتبوو، ژنی یەکێک لە بارۆنەکان بوو، من لە سەرەتاوە دژی وەرگرتنی بووم. من ڕقم لە ژنی بارۆنەکانە، هەموو دەیانەوێت خۆیان بەدبەخت و غەمبار نیشانبدەن، بەڵام درۆدەکەن، سەرەتا وامدەزانی ئەویش درۆدەکات، زۆر نەبوو هاتبووە ناو جەمعییەتی ئێمەوە، من زۆر نەمدەناسی، بەڵام لە ناکاو ونبوو، بێئەوەی کەس هیچ شتێک دەربارەی بزانێت، هەموو چەند وەختە بەدوایدا دەگەڕێین، یەکێک لە مەرجەکانی ئەو کۆمەڵەیە ئەوەیە کە ژنەکان مشووری یەک بخۆن... ئاگایان لە یەکتر بێت». زوهدی پرسی «دەتوانیت پێمبڵێیت ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان چیین، ژنانی سەرگەردان کێن؟ من ئەم شتانەم نەبیستووە». ئەفسانە بە سادەیی گووتی « دەزانم نەتبیستوە، بەڵام مەترسە هیچ نییە، ئێمە کۆمەڵێک ژنی غەمگینین کە خەیاڵات کۆیکردوینەتەوە، هەریەکەمان لە پاڵ ژیانی ناخۆشی خۆماندا، ژیانێکی خەیاڵیمان هەیە، تێدەگەیت، ژیانێکی خەیاڵی، هەموو ڕقمان لە مێردەکانمانە، زۆربەمان نەزۆکین، تێدەگەیت؟ زۆربەمان منداڵمان لە مێردەکانمان نابێت». ئینجا دەنگی زۆر زۆر نزمکردەوە و بە ناسکترین چرپەی دونیا گووتی « لەبەرئەوەی نامانەوێت منداڵمان لەو جانەوەرانە ببێت، باران شوکوریش وابوو، ئێمە کۆمەڵێک ژنی نەزۆکین کە بە خەیاڵ دەژین».

شتەکان بۆ زوهدی شازەمان سەیرتر و ئاڵۆزتربوون لەوەی چاوەڕوانیدەکرد. وەک کەوتبێتە گێژەنی کۆمەڵێک شتەوە کە لە مانایان ناگات بەئەفسانەی گووت « تۆ ژنێکی قەشەنگیت، ژنی خاون ئوتێلێکی گەورەیت، بۆدەبێت بەدبەخت بیت؟». ئەفسانە بێئەوەی پێبکەنێت یان خەندەبگرێت، گووتی «لەبەرئەوەی ئەمە ئەو پیاوە نییە کە دەمەوێت لەگەڵیدا بژیم، ئەمە ئەو شەقامە نییە کە دەمەوێت ئیشی تیابکەم،

ئەمانە ئەو هاوڕێیانە نین کە دەبێت من خزمەتیانبکەم، ئەمە ئەو شوێنە نییە کە دەمەوێت سەرپەرشتیبکەم، ئێرە ئەو باغەی لێ نییە کە دەمەوێت بۆی بچم، ئێرە ئەو کتێبەی لێ نییە کە دەبێت بیخوێنمەوە. من لێرە مەیتێکم بەسەر ئاوەوە، بیستوچوار سەعات دەبێت ژنێکی بەڕێز بم... هیچ ئادەمیزادێکی عاقڵ نییە بتوانێت ڕۆژ بیستوچوار سەعات بەڕێزبێت، بەڵام لێرە هەمووماں مەحکومین بەوە... تێدەگەیت؟ تێدەگەیت مرۆڤ هەموو ژیانی مەحکوم بێت بەوەی بەڕێز بێت... مانای چی؟. چی شتێک لە دونیادا لەوە خراپترە تا هەتاهەتایە لە جەهەنەمدابیت و ویقاری خۆشت تێکنەدەیت، لە جەهەنەمدا بیت و خۆشت بەختەوەر نیشانبدەیت. من دەزانم لەمن بەدبەختتر هەیە، بەڵام منیش بەدبەختم، منیش بەدبەختم... هەر ژنێک لەگەڵ ئەو پیاوەدا نەژی کە خۆی دەیەوێت، لەو شوێنەدا نەبێت کە خۆی دەیەوێت، لەو خێزانەدا گەورە نەبێت کە خۆی دەیەوێت، بەدبەختە». زوهدی قسەکانی پێبڕی و گووتی «تۆ لەوە جوانتریت بەدبەخت بیت». ئەفسانە وەک پەلەی بێت، وەک لە شتێک بترسێت، وەک ئەوەی هەست بە زیادەڕەوی بکات گووتی «ئەوە گرنگ نییە من چیم، نەهاتووم باسی بەدبەختی خۆم بکەم، باوەڕت بێت بۆ ئەوە نەهاتووم من دەمەوێت بزانم، تۆ بەدوای باران شوکردا دەگەڕێیت یان نا؟». زوهدی گووتی «چیت لێبشارمەوە، باران شوکور خوشکەزای منە، چەندین مانگە دەنگی نییە، لە من زیاتر کەسی نییە... هاتوومەتەوە سۆراغیبکەم». ئیدی ئەو لە شوێنی خۆی هەستا و گووتی «دەمبوریت، دەمبوریت، من کاتێکی زۆرم نییە، بەپرتاو هاتم و ویستم تێبگەم، گرنگ بوو بزانم تۆ چی بارانیت، دەبوایە بزانم. دوایی پێتدەڵێم دەبێت چیبکەین، دوایی، ئێستا دەبێت بڕۆم، دەبێت بڕۆم». لە بەر دەرگاکە بە هێمنی و بەچپە سیحراوییەکەی خۆیەوە گووتی « شەوان دەرگاکە دامەخە، تکایە. لە هەر دەرفەتێکدا بێت

دێمەلات، گەر ویستیشت نوتێلەکە جێبهێڵیت پێشتر ئاگادارمبکەرەوە، نەڕۆیت بەرلەوەی ئاگادارمبکەیتەوە».

کە ژوورەکەی بەجێهێشت، زوهدی هەستیکرد لەوسەری دونیاوە بۆ بینینی ئەم ژنە هاتووە. هاتۆتەوە بۆ ئەوەی لەم نوتێلە ناچیز و پیس وچەپەڵەدا بەم خانمە سیحراوییە بگات. لەوساتەدا حەزێکی سەیری تیابوو جارێکی تر نامەکانی باران شوکور بخوێنێتەوە، بێویستی خۆی دەستی برد نامەکان دەربهێنێت، تا جانتاکەی نەکردەوە بیری نەکەوتەوە نامەکانی باران ئێستا لای بارۆنی کولەکەیە.

## لە یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

هەموو دونیا ململانێیەکی سامناکە لە نێوان خەیال و دەسەلاتدا... ئاوها لە جیهان گەیشتووم، بەلام من هەوایەکی شیتانە چووبووە سەرمەوە کە هەموو ئەم پێناسەیە هەلەیە، پێم پێمەکەنن، نەبا ویقاری خۆم لەدەستبدەم، خەیال دەسەلاتە و دەسەلات خەیال. خەیالی بێدەسەلات، هیچ نییە جگە لە کەفێکی سارد و سپی کە ژیان دەیبات و نایگێڕێتەوە، دەسەلاتی بێخەیالیش، حوکمێکی سارد و خالی لە خەونە. دەسەلاتێکی بێخەیال و کویلەیەکی خەیالاوی بەیەکدەچن، هەریەکەیان هێزێکی گەورەیان کەم و کەرەستەیەکی کارایان لێدوورە. ئێوە تێبگەن و تێنەگەن وەکو یەکە، من پێویستیم بە خەیالی هەموو مرۆڤە خەیالدارەکان هەبوو، ئەوەی بیەوێت شتێکی جوان لەسەر زەوی دروستبکات دەبێت سل لەوە نەکاتەوە بۆ هەموو خاوەن خەیالێک سوژدە بەرێت. من ناوی دەنێم شەڕ لە نێوان نەخشە و

خەیاڵدا. ڕۆژێکیان چووم بۆ لای حوسنی خەیاڵ، ئەو خاولیفرۆشە ڕووخۆشەی خاولی ناوازەی هەبوو. شەوێک لە شەوانی مەستی، ئەو عەتارە بەدمەزەبە چیرۆکی ئەو خاولییە مەلعونەی بۆگێڕامەوە، ئەو خاولییەی حیکایەتی سەرکەوتنی خەیاڵ بەسەر دەسەڵاتدا دەگێڕێتەوە. تکام لەو پیاوە کرد، لێیپاڕامەوە، ویقار و هەیبەتی خۆم خستەلاوە، ئەو خاولییەم نیشانبدات. خۆم وەک نەجیبزادەیەکی ئەم شارە دەرنەخست، گەرچی کوڕی وەچاغزادەکان و ئاغا بە حورمەتەکان بووم، گەرچی یەکێک بووم لە سیاسییە گەورەکان، بەڵام ئەوکات هێشتا سیمایەکی نەناسراو و دەموچاوێکی کەم بینراو بووم. ئەوانەی بۆ ئەسڵ و ئوسوڵ دەگەڕان، ناوی منیان بیستبوو، بەڵام خەڵکانی ڕەشۆکی و مسکێنی نێو کوچە و بازاڕ منیان نەدەناسی، خۆگۆڕین و خۆونکردن ئارەزووی نهێنی و گەورەی من بوون. لەم شارەدا مرۆڤ بە یەک دەموچاوەوە ناژی... سوێند دەخۆم گەر دەمامک نەبێت، مرۆڤ ڕیسوا دەبێت. من لە گەنجییەوە فێربووم دەمامک لەسەر بکەم، حەقیقەتی خۆم دەرنەخەم، بە ناوی جیاواز و بە جلی جیاواز و بە دەمامکی جیاوازەوە ڕوو لە مەیدانە جیاوازەکانی ژیان بکەم. بەجۆرێک خۆم دەگۆڕی کەس منی نەدەناسییەوە. جارێک وەک بازرگانی ئەسپ و ڕەشەوڵاغ، جارێکیش وەک قاچاخچییەکی بێدەنگ ڕوومدەکردە ناو خەڵک. ئەو ڕۆژەی چووم بۆ لای حوسنی خەیاڵ، وەک کۆندۆز و ئەنتیکناسێک خۆم ناساند، بەزەحمەت ڕازیمکرد ئەو خاولییەم نیشانبدات، گووتم لە شارێکی دوورەوە هاتووم و لەسەر خەیاڵ لە ئەدەبیاتی دێریندا دەنوسم، بێئەوەی بهێڵێت نیگاری بکێشم یان وێنەی بکرم، ئەو پارچە دەستکردەی خەیاڵی پیشاندام. خاولییەکی ئێجگار قەشەنگ بوو، زۆر سیحراوی و دڵهەژێن. ئەو شەوەی حوسنی خەیاڵ ئەو خاولییەی پیشاندام، وەک ئەوەی فریوی دەردێکی هەتاهەتایی بخۆم کەوتمەوە

ناو گێژاوی ئەو پرسیارە قوولانەی لە گەنجییەوە دەمهێنن و دەمبەن. دەسەڵات یاخود خەیاڵ؟ ئەوە پرسیارە ئەبەدی و ترسناکەکەی منە. ئەو ڕۆژەی حوسنی خەیاڵ ئەو خاولییە عاجباتی و ناوازەیەی نیشاندام، من چیرۆکەکەم بە جۆرێکی تر خوێندەوە، هەستمدەکرد ئەو جەنگە گەورەیە هەرگیز لە ڕاستیدا ڕووی نەداوە، سەرتاپای ئەو شەڕە شتێکە لە خەیاڵی ئەو پادشا شاعیرەدا بەڕێوەچووە. شەڕێکە تێیدا نیوە شاعیر و ناسکپەرستەکەی ناو پادشا، نیوە دەسەڵاتدار و حوکمڕانەکەی کوشتووە. بەڵام چی دەبێت گەر مرۆڤ شاعیر بێت و دەسەڵاتداریش بێت؟ ئەو خاولییە شتێک بوو دەیتوانی ژیانی من بۆ هەتاهەتایە وێرانبکات. لە مێژبوو من بە دەست ئەو پرسیارانەوە دەمناڵاند. هێدی هێدی و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تێدەگەیشتم، خەیاڵ تەنیا کاتێک مانای هەیە کە لەسەر پلانێکی گەورە ئیشبکات.خەیاڵ چییە گەر دەسەڵاتێکی گەورەی لە پشت نەبێت؟ من دەبوو بە ئارامی ئیشبکەم، هیچ شتێک وەک پلان و نەخشەی دوورودرێژ پڕ ئەشکەنجە نییە، بەڵام ئەوەی بیەوێت هێزێکی گەورەی هەبێت، دەبێت بە وردی پلان دانێت، هەم نەرم و نیان بێت و هەم ئارام. هەم دڵڕەق بێت و هەم بەسۆز. دەبوو دواجار من نەخشەیەکم هەبێت و هەموومانیش لە ناو ئەو نەخشەیەدا بن. وامەزانن گەر یەکێک کوڕی وەچاغزادەکان بوو، ئیدی دەرد و ئازاری نییە. من وەک شێت دەموچاوی خۆم دەبەست و بەشاردا دەگەڕام، لە پیاوە داناکان و مامۆستاکان و خەڵکی سادە و ڕەشۆکیشم دەپرسی «گەر تۆ هێز و دەسەڵاتت هەبێت چی دەکەیت؟». هەموو ئادەمیزادێک بۆ ئەوەی بتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، پێویستی بەخەیاڵە. خەیاڵ لە دەسەڵات بستێنەوە، وەک کوێری لێدێت، نازانێت چۆن بڕوات و بۆ کوێ بڕوات. من ڕۆژێک لە پلینیۆمێکی حیزبدا، گووتم « هاوڕێیان، هەڤاڵانی من،

ئێمە کوێرین نەوەک لەبەرئەوەی نابینین، بەڵکو لەبەرئەوەی خەیاڵمان نییە». نا ئێوەش بە هەڵە تێمەگەن، وامەزانن من شیفتە و شێت و شەیدای خەیاڵم. ئەوانەی بەبێ دەسەڵات خەیاڵبازیی دەکەن، سامانێکی بێسوودیان هەیە، هێزێکیان هەیە تەنیا خۆیانی پێ وێراندەکەن. من هیچ خۆشەویستییەکم بۆ ئەوانە نییە کە وزەیەکی گەورەی خەیاڵیان هەیە و نایخەنە خزمەتی هێزێکی لە خۆیان گەورەترەوە. من ڕێزم بۆ سیحرباز و فاڵگرەوە و ئەستێرەدۆزەکان و فەلەکناسی سوڵتانەکان لە وانە زیاترە. لێمەگرن... نا لێمەگرن، بەڵام پێتان دەڵێم، خەیاڵ دەبێت ملکەچی ڕەهای هێز بێت، خزمەتکاری بچوکی بێت، بەردەستی بێت، ئەوسا مانای هەیە. خەیاڵ لەوانەیە بە تەنیا بتوانێت جارێک لە جاران ڕۆحی یەکێک ڕزگاربکات، بەڵام لەگەڵ دەسەڵاتدا دەتوانێت بەهەشت دروستبکات... بەهەشت. خودای گەورە کۆمەکم بە و دەست بە باڵمەوە بگرە. بۆنی بەهەشت لەسەر زەوی، ئەوە من شێتدەکات... گەر ئینسان لەسەر زەوی بۆ بۆنی بەهەشت نەگەڕێت، دێوانەیە، دێوانەی تەواوەتی و ئەبەدییە. کە یەکەمجار ئەو خاولییەم بینی هەستمکرد چ حیکایەتێکی ترسناکە، ئاخر چ شتێک لەوە ترسناکترە بۆ دونیا شا و شاعیر ببێتە شەڕیان و شاعیر بیباتەوە و جیهان بێ شا، بێ سەمبولی گەورەی دەسەڵات بژی، ئاخر دەبێت شتێک لەم دونیایەدا هەبێت لەوە ترسناکتر؟ کە من لە مانای قووڵی ئەو چیرۆکە ڕامام، جوانی و سیحری نەخشەکانم لە بیرچووەوە... هەفتەیەکی دووردرێژ بیرمکردەوە، ویژدانی خۆم دەکردە حەکەم، دواجار ئامادەبووم، بەڵێ ئەزیزانی من بۆ هەموو شتێک ئامادەبووم. ئێوارەیەک درەنگ هەر لە جلی ئەو کۆندۆزە ئەنتیکەپەرستەدا چوومەوە بۆ لای حوسنی خەیاڵ، وابڕیاربوو گەر ئەو خاولییەم نەداتێ بیکوژم، هێزی ئەوەم تێدابوو، دەیان گوللە بنێم بەو جەستە سپی و سەرە زللەیەوە، هێزی ئەوەم

هەبوو بینێرم بۆ جەهەنەم و هەموو دوکانی خاولی فرۆشییەکەی ئاگر تێبەردەم. سەرەتا وەک دوو کاسب قسەمانکرد کە لەسەر نرخی کالایەک ڕێناکەون. نەیدەویست ئەو خاولییە مەلعونە بفرۆشێت... نەیدەویست. خۆی وا نیشاندا کە دەیەوێت تا مەرگ ئەو خاولییەی لەگەڵدا بێت. من بە سەبری دێرینەی خۆم لەگەڵیدا جوڵامەوە، سەرەتا هەزار بە هەزار سەردەکەوتم، دواتر دەهەزار دەهەزار. تەماحی مولک و ماڵم خستە بەر، تەماحی سەفەر و ژنی جوان و سۆزانی گەنج، بەڵام هیچیان سوودیان نەبوو. نەمدەویست کاربگاتە ئەوەی دەمانچەکەم دەرخەم. بەڵام دواجار بێسەبری و توڕەیی و شێتێتیم دەرکەوتن و هەموو شتێکیان تێکدا. نەدەبوو ئەم خاولییە ترسناکە تا قیامەت لە دوکانی ئەو پیاوەدا بێت و پیشانی هەموو ئادەمیزادێکی بدات. پێدەچوو ئەو نیازی منی وەک گاڵتەی هەرزەکاران وەرگرتبێت، لە گەرمەی قسەکردندا پێمگووت « ئاغای خەیاڵ، حیسابی خۆت ڕابگرە و سەرت لێنەشێوێت. من وازی ناکەم و گەمەم نییە، بە هەر نرخێک بووە ئەو خاولییەم دەوێت». ئەو قووڵ سەیری چاوی کردم و تێگەیشت شتەکان سەواو مامەڵە و گەمە نییە. بە ترسێکەوە دەستی خستە سەر خاولییەکە و گووتی سەد هەزار دیناری سویسری دانێ و بیبە. گەر داوای زۆرتریش بکردایە دەمدا. من دەبایە ئەو خاولییە مەلعونە هەڵگرم و بیشارمەوە... چ گوناهێکی گەورەیە شاعیران شاکان بکوژن... نا ئەزیزان، من خەوم بەوەوە دەبینی شا لەگەڵ شاعیردا پێکەوە دانیشن و خەیاڵات بگۆڕنەوە. ئەو شەوە ئەو خاولییەم هەڵگرت و لە جێگایەکی قایمدا شاردمەوە، جێگایەک من نەبێت هیچ ئادەمیزادێک نەیدەزانی.

# چیرۆکی بارۆنی بوکەشوشە
# ئەیلولی دوو هەزار و چوار

لە ڕۆژانی دواتردا بارۆنی بوکەشوشەم زیاتر ناسی، پتر ئەو ڕۆحەم لە ناکۆکییە سەیرەکانی خۆیدا بینی و هەستمکرد ئەو نوێنەری بەشێکی سەیر و دەرەعەقڵی دونیای ئێمەیە، ئەو دیوەی کە مرۆڤ چەند بیەوێت تەفسیریبکات هەمیشە لە زمان ڕادەکات و لە ڕاڤەکردن عاسیدەبێت. تاکە وشەیەک بتوانم بارۆنی پێ وەسفبکەم ئەوەیە ڕۆحێکی هەمە دیوی سەیربوو، کۆکەرەوەی گەلێک سیفەتی سەیری ناو کۆی بارۆنەکان بوو. بەدیوێکدا لە شاهەنشای ناو شانۆنامەکانی شکسپیر دەچوو، بەدیوێکیشدا بوونەوەرێکی جەنگەڵنشین دیاربوو، دەکرێت بڵێم شتێک لە ڕۆحی ئەو کوردە کۆنانەیشی تێدابوو کە لەسەدە کۆنەکاندا ژیاون و لە جەنگەڵ و دارستان و شاخ و ڕاو زیاتر هیچیان نەزانیوە، بەڵام ویقاری بازرگانە لێزانەکانیشی هەبوو، کە دەشێت مرۆڤ لە سەفەرێکی دووردا لەسەر کەشتییەک بیانبینێت. بارۆن لە ڕوانینی منەوە خاڵیش نەبوو لە خەیاڵی ئەو پیاوە ئازایانەی بە دوای زێڕ یان ئەڵماس یان هەر کانێکی نهێنی دیکەدا خۆیان فرێدەدەنە تەهلوکەوە. ئەو لە ڕەوتی ژیانیدا لەبەرەی زۆر دوور و جودا لە یەکدا جەنگی بوو. ماوەیەک لە سوپادا لە گوردانی تۆپ هاوێژەکاندا خزمەتیکردبوو، لە پێشمەرگایەتیدا پلەو پایەی بەدەست هێنابوو. بارۆن شاعیریش بوو، بەو مانایە نا کە دیوانی شیعری هەبێت، بەڵکو بەو مانایەی مرۆڤ شیعر بدوێت و شیعر بژی، من کە یەکەمجار بینیم نەمدەزانی بڵێم ئەم ڕۆحلەبەرە لە کوردێکی پاشماوەی سوپای ئیمارەتە غەمگینەکان دەچێت یاخود دەوڵەمەندێکی ترسناکی

دوای ڕاپەڕینە کە دەزانێت لەژێر هەزار چەشنە ڕەنگ و شێوە و وشەوە خۆی بشارێتەوە. بوونی لە ناو بارۆنەکاندا وەک شتێکی سەیر و ناوازە هاتە بەرچاوم، سەرەتا واتێگەیشتم بوونی ئەو لەوێدا هەڵەیەکی گەورەیە، بەڵام دڵم بە جۆرێکی سەیر ڕاچڵەکی کە زانیم ئەو بە ڕاستی بارۆنەکانی خۆشدەوێت. ئەو بە ئەسڵ لە بەگزادەکان بوو، وەک ئەوەی ئەمیرە گەورەکانی کورد تەماشای خۆی دەکرد، فەلسەفەیەکی ئاغایانە و ڕۆحێکی پەترياریکی سەیری هەبوو، کە من هێدی هێدی ناسیم و تێیگەیشتم.

ڕۆژێک بارۆن داوەتیکردم و من خۆشحاڵانە داوەتەکەیم قەبووڵکرد، لەو پارەدارە بێترسانەبوو کە هەموو کەسیان داوەتی سەرسفرە و خوانی خۆیان دەکرد. لە دانیشتنی یەکەمدا سفرەیەکی سەیری ڕازاندبووەوە، زیاتر و گەورەتربوو لە سفرەی دووکەس، لێمپرسی «جەنابی میر سەفین حەزدەکەم بزانم تۆ بۆ ناوی بارۆنی بوکەشوشەت هەیە، بۆ جۆرە ناوێکی وەهایان بەسەردا بڕیویت، تۆ کێیت و بارۆنەکان کێن؟». ئەو قاتێکی ئاوریشمین و کراسێکی شینی بریقەداری لەبەردابوو، پیاوێکی شیک کە ڕیشە سپی و سەرە ڕووتاوەکەی نەدەبووە ڕێگری ئەوەی ژنان شیفتەی ویقار و دەم وقسەی بن. بەو زمانە پڕ لە نەغمە و ئاوازەوە ئەو قەدەرگەراییە سەیرەی خۆی بۆ ئاشکراکردم، بە ویقارێک تەنیا لە لۆرانس ئۆلیفییەم بینیبوو گووتی «ڕۆحەکان وەک پەپولە وەهان، گیانەکان گەڕۆکن، ڕۆحی ئینسان ڕۆحی بولبولێکی پاکە. بولبول گەر لە قەفەزدا بێت یان لە ئاسمانێکی ئازادا بفڕێت، هەر بولبولە. ئیدی وەهایە و قەدەرە، پێشهاتێکە نازانین تاریکە یان ڕوناک، چارەنوسێکە تێناگەین سیاهە یان سپی، کە زەوی دەچەرخێت و لەگەڵیدا قەدەری ئێمە خولدەخوات، هەر یەکەمان لە جێگایەکدا دەوەستین و لە شوێنێکدا دەوەرین، ئێمە هەمیشە لە گێژاوێکداین

کە فرێماندەدات، ئەمشەو خولانەوەی دونیا دەمانخاتە سەر ڕێگایەک و سبەی شەو دەمانخاتە سەر ڕێگایەکی تر، ئەمڕۆ لەسەر سفرەیەکین و بەیانی لەسەر سفرەیەکی تر، ئێستا ئێمەین کە لە گۆشتی ئەوانی دی دەخۆین و سبەینێ یەکێکی دییە کە لە گۆشتی ئێمە دەخوات، ئینسان خۆی شوێنی خۆی لەم گەردونەدا هەڵنابژێرێت، ئەوە گەردونە شوێنمان دەداتێ، من بارۆنی بوکەشوشە بم یان کۆترێکی غەمگین کە ئێستا بەسەر باغێکی زەرددا دەفڕێت، ڕۆحێکم وەک ڕۆحەکانی تر دەسوڕێمەوە، من و مێرولە بێچارەکان لە چاوی ئەم سروشتە کوێر و بێسنوورەدا وەک یەکین، دەنگی هاواری وەحشێکی ترسناک و جوانترین غەزەل لە گوێی ئەم گەردونەدا وەکو یەکە، گوێ بە ناوەکان مەدە و یاری خۆت بکە. هەمیشە دەڵێم یاری خۆت بکە، یاری خۆت بکە. لە چ سفرەیەکەوە نزیکی دانیشە و لێی بخۆ، ئەو یارییە بکە کە لێتەوە نزیکە. گەر کەوتیتە ناو بارۆنەکانەوە بارۆن بە، گەر کەوتیتە جەنگەوە جەنگاوەر بە، گەر کەوتیتە بەحرەوە کەشتییەوان بە، گەر باڵیشت هەبوو، مەل بە یان فریشتە. لە هەر جێگایەکی ببە، ئەوە تۆ نیت لەوێیت، ئەوە دەستێکە تۆی لەویا داناوە، من و تۆ ئێستا وەک یەکین و نزیک لە یەکین، بەڵام دوورین و دوورین و دوور. مرۆڤەکان بەر یەکدەکەون، بەڵام چارەنوسەکان نا. هیچ هێزێک نییە لەم گەردونەدا تۆ بکاتە بارۆنی بوکەشوشە و من بکاتە ماجیدی گوڵ سۆلاف، هیچ هێزێک نییە قفڵی من بشکێنێت و ڕۆحی تۆ بخاتە جەستەمەوە، من و تۆ بەیەکدەگەین، وەک چۆن دوو باڵندەی بێمێشک و بێنیاز و بێخەیاڵ بەیەکدەگەن، بەڵام ژیانمان بەیەک ناگات. گەر مەحکومبووین بە جەنگ با بەڕەحمەوە یەک بکوژین. مرۆڤ تەنیا دەستی بەسەر یەک شتدا دەشکێت، یەک شت، ڕەحم. کە کەوتیتە جەنگەوە چ چارێکت هەیە گەر جەنگاوەرنەبیت کە کەوتیتە ئاوەوە

چ چارێکت هەیە گەر مەلەوان نەبیت، کە کەوتیتە بازاڕەوە بازرگان بە، گەر پێویست بوو بکوژیت تا نەکوژرێیت، ئەی عەزیزم بکوژە، بەڵام بەزەییت لە یاد نەچێت، بکوژە بەڵام ئەوەت لە بیر نەچێت کە دەبێت بۆ کوژراوەکان بگریت، گەر توانیت نەهێڵیت ئازاریان بگات، مەهێڵە ئازاریان بگات. ئەوەی کە ئێستا من دەمرم و تۆ نامریت، تۆ دەمریت و یەکێکی دی نامرێت، تۆ دەبیتە کوژراو و من بکوژ، من دەبمە ڕاوکەر و تۆ نێچیر، شتێکە من و تۆ دیاری ناکەین... بازنەیەکی گەورەیە و سوڕدەخوات، گێژاوێکە و هەر یەکەمان فڕێدەداتە سەر خانەیەک، وەک چۆن سەربازێکی شەترەنج ناتوانێت بپرسێت من بۆ فیل نیم، بۆ شالیار نیم، بۆ ئەسپ نیم، منیش بۆم نییە بپرسم من بۆ بارۆنم و تۆ بارۆن نیت».

من ماجیدی گوڵ سۆلاف دەمزانی ناتوانم شوێنی خۆم لەگەڵ هیچ مەخلوقێکی ئەم دونیایەدا بگۆڕمەوە، بەڵام لەو باوەڕەدانەبووم مرۆڤ گەر کەوتە ناو دڕندەکانەوە، دەبێت ئەویش بلورێنێت. وەک یەکێک لە یەکەم ڕستەوە نهێنی خۆی بدرکێنێت، گووتم «ئەوە قەدەر نییە، کوڕێکی گەنج بکوژیت کە پەیوەندی لەگەڵ ژنێکدا هەیە، وانییە، ئینسان دەتوانێت تەسلیمی قەدەری وانەبێت؟». بارۆن دەستێکی بە ڕیشە پڕ ویقارەکەیدا هێنا، بە گومانەوە سەیریکردم، نیگای نەرمی تیابوو نە خۆشەویستی و گووتی«بەدبەختین گەر وەک کۆترێکمان لێبێت وابزانێت دارستان بەهەشتە. بەدبەختین گەر تێنەگەین چ خوێنێکی دووروودرێژ ڕژاوە. بەدبەختە ئەو کەسەی بە مرۆڤ دەڵێت نەکوژێت و نەکوژرێت، ئێمە تەنیا ئەوەمان لەسەرە مرۆڤمان خۆشبوێت، بەڵام پێی بڵێین مەکوژە، گوناە مەکە، دزی مەکە، درۆ مەکە، ئەمە تێگەیشتنی خوداکانە، تۆ بۆ هەمان داوای خوداکان لە من دەکەیت؟ خوا مرۆڤی وەک فریشتە دروست نەکردوە، بەڵام داوای لێدەکات فریشتەبێت. تۆ

بۆ داوای وا دووبارە دەکەیتەوە؟. ماجیدی گوڵ سۆلاف من چوومەتە جەنگەوە و مرۆڤم کوشتوە، بەلام بوکەشوشەشم فرۆشتووە و منداڵانم شاد و بەختەوەرکردەوە. من باوەڕم بە بێگوناهی نییە، شتێک نییە لەم سەر ئەستێرەیە بێگوناه بێت، لێرە تاوانبار و بێتاوان نییە، بەڵکو براوە و دۆڕاو هەیە».

دەمزانی تێگەیشتنی تەواوەتی لە بارۆنی بوکەشوشە ئاسان نییە. سەرەتا واتێگەیشتم کە ئەو بارۆنێکی ڕاستەقینە نییە، وامدەزانی دەکرێت بەکامی دڵ پلانەکانی خۆمی پێبڵێم، من ڕۆژی یەکەم دیوە فریشتە ئاساکەی بارۆنم بینی، بەلام کە چەند جارێک دواتر بەو قاتە ئاوریشم و پێڵاوە ئیتاڵییە بریقەدارانەوە بینیم، هەستمکرد میر سەفین، میرێکی ڕاستەقینەیە، میرێکە لەوانەی پڕن لە هێز و شکۆی میرێتی و سەرشارە لە هەوای بەگزادەیی. بۆ یەکەمجار لە ماشێنەکەی ئەودا سوار ئوتومبیلێکی گرانبەهای گەورەبووم، تا ئەو کات من تەنیا سوار پاسە نەفەربەرەکانی شار بووبووم. بیرتان نەچێت من پێکەڕێکی گەورە بووم، گەر حیسابی ئەو ماوانەم بکردبایە کە بەپێ لە سنووری ئەو شارەدا سوڕاومەتەوە، بەبێ دوودڵی کۆی میل و مەوداکانی لەو ماوەیە زیاتربوون کە مارکۆپۆلۆ یان هەر گەڕاڵێکی تری دونیا بڕیویێتی. چۆن باڵندەیەکی بچوک لەقەفەزەکەی خۆیدا ئەمبەرەو بەردەکات، منیش سەرتاپای عومرم وەک ئەو باڵندە بچوکانەی ناو قەفەز لە نێوان جادەکانی ئەم شارەدا ئەمبەرەوبەرم کردبوو. سەیرم لێهات کە بارۆنی بوکەشوشە سوار ئوتومبیلەکەی کردم، ئەوە یەکەمجارم بوو ئادەمیزادێک بانگمبکات سوار ئوتومبێلەکەی بم، من گەرچی لەوانەبووم کە دەشێت بە نەوەی دوای ڕاپەڕین ناوم بهێنن، بەلام هەتا بۆ جارێکیش لە ژیانمدا سوار ئوتومبیلێکی وەها نەبووبووم. هەموو ژیانم بەپێ دەمکووتا و بەپێ دەهاتم و دەچووم. بارۆن سەیری لێهات کە

زانی تا ئەوکات لە پاس بەولاوە ماشینێکی دیکەی گەڕۆکم لەسەر زەوی بەکارنەهێناوە، باوەڕی نەدەکرد مرۆڤی وەک من لە دونیادا هەبێت، چەندین جار سەری بادا و نەیدەزانی باوەڕم پێبکات یاخود نا. کە زانی لەم شارە نەچوومەتە دەرەوە پتر پێم سەرسامبوو. ئەوەی پاڵی پێوەنا ببێتە هاوڕێم و بە نزیکیم خۆشحاڵ بێت، ئەو پەروەردە سینەماییە زۆر و شارەزاییە بێوێنەیەی من بوو لە دونیای فلیمدا. من لە سینەمادا وەها شارەزابووم، وای هەستدەکرد من درۆدەکەم، بڕێک لە عومرم لە هۆلیۆد ژیاوم یاخود سینەمام لە یەکێک لە پەیمانگاکانی فلیمسازی تەواوکردوە. کە سوار ئەو ئوتومبێلە سەیرەی ئەو بووم تێگەیشتم مانای چی مرۆڤ بارۆن بێت، تێگەیشتم بۆ کاتێک مرۆڤ لەو دونیایە نزیکدەکەوێتەوە نایەوێت جارێکی دی لێیدەرچێت و بێتەدەرێ. من دەبایە لەگەڵ بارۆندا لە پەرێزدا بم و بەپەلە دیوارەکان نەشکێنم و بەشێوەیەک خۆم نزیک نەکەمەوە گومانم لێبکات. ویستم ببمە دۆستی، بێئەوەی وابزانێت مەبەستێکم هەیە. پێمگووت « جەنابی بارۆن من دەستوخەتێکی جوانم هەیە، جوانترین دەستوخەتی دونیایە. لە ئیشی ڕاگرتنی حیساباتدا کەمە بەهرەیەکم هەیە، بۆنامکەیتە دەفتەرداری خۆت؟». بارۆن بە پێکەنینەوە گووتی« سێ کچم لەلایە ئیشی دەفتەرداریم بۆدەکەن، دەستوخەتیان زۆر جوانە و خۆشیان لە دەستوخەتیان جوانترن. چ پێویستیم بە تۆیە کاری وام بۆ بکەیت؟ گەر دەتەوێت ببین بە هاوڕێ بیر لە ئیش مەکەرەوە لای من، هەر کەس لای بارۆن ئیشبکات، دەبێت بە ئیشکەری بارۆن، حەزدەکەم تۆ هاوڕێم بیت».

بە سووکییەکی گەورەوە باسی ئەو کەسانەی کرد کە لەلای ئیشدەکەن. گووتی« کە مرۆڤ بارۆن بوو، دەبێت ئیشکەرەکانی ڕێزی بارۆنی لێبنێن، گەر ببیت بە ئیشکەرم وێنەکەت لە پێشچاوم دەگۆڕێت».

مـن هیچـم نەگـووت، گرنـگ ئەوەبـوو بڕۆمـە نـاو بارۆنەکانـەوە، لەوێـش بارۆنـی مریشـک بناسـم و هەوڵبـدەم دەمـم بگاتـە ژنەکـەی تـا سـەبارەت بـە مـوراد جەمیـل قسـەی لەگەڵـدا بکـەم... ئـەوە گەورەتریـن ئامانجـی مـن بـوو. لـە کاتێکـدا بـارۆن بـە شـەوقەوە ماشـێنەکەی لێدەخـوڕی مـن لێمپرسـی «بـارۆن، تێمناگەێنیـت، تەنیـا تـۆ بارۆنیـت یـان خەڵکـی تریـش هـەن وەک تـۆ بارۆنبـن؟». بـە لاچـاو سـەیریکردم و گووتـی «بارۆنـەکان ترۆپکـن، لوتکـەن، ڕوناکیـان هەیـە و دەشسـوتێنن، گـەر دەتەوێـت دەتوانـم بتبـەم بـۆ ناویـان، ڕوخـۆش و گەشـن، دەم بـە پێکەنیـن و مەشرەبخۆشـن، شـتێک نیـن جیاوازبـن لـە مرۆڤەکانـی تـر. پێدەکەنـن و جنێـودەدەن و سەرخۆشـدەبەن و پاشـقول لـە یەکدیـش دەگـرن. هێنـدە هەیـە، سـامان و دەسـەڵاتیان زۆرتـرە. لاوازەکان بـە سروشـتی خۆیـان ڕقیـان لەوانەیـە کـە خاوەنـی سـامان و دەسـەڵاتن، وەک جنسـێک لێیاندەڕوانـن لـە باغـی ئینسـاندا نەڕوابـن. لاوازەکان ڕقیـان لـە هێـز و ویقـاری هێـزە. مـن خـۆم کـوڕی میـرەکان بـووم، حەزمدەکـرد ببـم بە ئەفسـەری تۆپخانە و شـەڕبکەم، نـاو ئاگـر ببینـم، پەلاماربـدەم. «هێـزی خـۆت تاقیبکـەرەوە ئـەی ئادەمـی» ئـەوە دروشـمی مـن بـووە، ماجیـد سـۆلاف «بـەردەوام وا بانگیدەکـردم» گـەر لـە نـاو گەورەکانـدا جێـگات نەبـووەوە، مەبـەرە پشـیلەیەکی سـپلە، لێگـەڕێ گـەورەکان لـەزەت لـە گەورەیـی خۆیـان ببینـن. لێگـەڕێ... مەپرسـە گـەورەکان چـۆن گەورەبـوون، ئـەو پرسـیاری لاوازەکانـە».

مـن هیچـم نەگـووت، سەرسـام بـووم کـە بـارۆن ئـەو جـۆرە بـڕوا سـەیرانەی هەیـە. نەمدەویسـت وەک پیاوێـک دەربکـەوم کـە بـڕوای سیاسـی ئەوتـۆم هەیـە سـەرودڵی بارۆنـەکان دەگرێـت. لەسـەرەخۆ گووتـم «جەنابـی بـارۆن تـۆ بەشـێوەیەکی هێنـد جـوان بـاس لـە بارۆنـەکان دەکەیـت، پـڕ بـە دڵ حەزدەکـەم بیانناسـم. بـەڵام نازانـم کەسـێکی وەک مـن تـا چەنـد بـە کەڵکـی ئـەوە دێـت لـە سـەر مێـزی ئـەو پیـاوە بەرزانـە دانیشـێت؟».

بارۆن وەک حەز لەو جۆرە گەمانەبکات، گووتی «تۆ لە بارۆنێکی ڕاستەقینە دەچیت؟ سوێند دەخۆم سیمای بارۆنێکی سەدەی نۆزدەت هەیە، سوودێکی گەورەت لە تەماشاکردنی فلیمەکان بینیوە، هیچ یەک لە بارۆنەکان وەک تۆ ویقاریان نییە، دڵنیام بەم ڕوخسارەوە دەتوانم وەک بارۆن بەوانی ترت بناسێنم،، ها، دەڵێیت چی، ناوت دەنێم بارۆنی حیکایەت». بۆ ساتێک من تروسکەیەکی شادی بە ڕۆحمدا تێپەڕی، بەڵام زۆری نەبرد دەستیکرد بە پێکەنین و گووتی« فێڵی وا بەسەر میرەتازەکانی ئەم شارەدا تێناپەڕێت. کەڵەکی وا بەسەر میر و وەچاغزادەی هیچ شار و مەملەکەتێکی تریشدا ناگوزەرێ. تۆ بارۆن نیت، بارۆنەکان لەو ڕووەوە غەریزەیەکی ڕەوشەنیان هەیە، دەزانن کێ بە ڕاستی میرە و بۆتە میر، کێش نەبووە. مەسەلەکە تەنیا ناوێک نییە مرۆڤ وەریگرێت، بەڵکو ئەخلاق و ڕەفتارێکیشە لە ڕۆحدا دروستدەبێت».

دواتر گووتی« نا، واناکەم، وەک میوانێک بەوانت دەناسێنم، وەک حیکایەتخوانێک کە بە چیرۆکەکانت دەتوانیت سەرسامانبکەیت. بەڵام دەبێت زۆر بیری لێبکەیتەوە، ئەوەی بچێتە نوێمیران بە ئاسانی ناتوانێت بێتەدەرێ».

ئەوکات تێنەدەگەیشتم مەبەستی چییە، بێئەوەی بیربکەمەوە، گووتم «شەرەفێکی گەورەیە بێمە ئەو دونیایەوە، شانازییە بۆ کەسێکی بچوک و ناچیزی وەک من پێبخەمە دونیای ئێوەوە».

بەدەم لێخوڕینی ماشێنەکەوە گووتی « شەرەفە ،یاخود نەفرەتە، دوایی دەردەکەوێت، دوایی. ئێستا هیچ مەڵێ، بەلاغەتی مردوو و حەرفی بێگیان چووزانن تەعبیر لە شتێک بکەن کە نەبینراوە. کۆترێک کە بەسەر درەختێکەوە دەنیشێتەوە چووزانێت گوللە چاوەڕوانیدەکات یان ڕۆشنایی، هەندێجار ئاو زۆری دەوێت تا ماسییە مردووەکانی

خۆی دەناسێتەوە، شەو زۆری دەوێت تا ئەستێرە خەوتووەکانی خۆی دەدۆزێتەوە. نیازی تاریک لە دڵتدا هەڵمەگرە. من بە هەموو میرەکانی هاورێم دەڵێم «خواجا و شاسوارە خۆشەویستەکانی برام، دەرگاتان بۆ هەر کەس کردەوە، پێیبڵێن، نیازی تاریک لە دڵیدا هەڵنەگرێت...».
هەیە وەک گەدا دێت بۆ دونیای میرەکان و وەک بارۆن دەڕواتە دەرەوە، هەیە وەک بارۆن دەڕوات و وەک گەدا دەگەڕێتەوە. دەسەڵات و سامان وەک جوانی وەهایە هەم بەختەوەرتدەکەن و هەم شێتتدەکەن. زۆرن لەوانەی وەک فێڵبازێک دەخزێنە ناو بارۆنەکان و وەک سەگێکی تۆپیو کۆتاییاندێت. ئەمە جەنگە جەنگ، هەر کەسێک لە جەنگدا دەستی بلەرزێت دۆڕاوە، کە دێیت بۆ ناو بارۆنەکان کەس ناتوانێت بتپارێزێت، تەنیا خۆت دەتوانیت ڕەحم بە خۆت بکەیت. لە ناو بارۆنەکاندا مرۆڤ دەبێت خۆی ڕەحم بە خۆی بکات».

من هیچ شتێک لەو قسانەی بارۆن تێنەگەیشتم، بێئەوەی بزانم دەڵێم چی، گووتم« بارۆنی بوکەشوشە، بمبە بۆ ئەوێ، بمبە بۆ ناو بارۆنەکان، هەستدەکەم من بە هەڵە لەم دونیایەدا لە دایکبووم».

بە حەسرەتەوە سەیریکردم و گووتی « تۆ دەبایە لە ناو میرەکاندا لە دایک ببیت، بەڵام لەوێ لە دایک نەبوویت، هەر کەسێکیش لەوێ لەدایک نەبێت واتە میر نییە. ئەوەت بیر نەچێتەوە کە تۆ میر نیت، وەسوەسەی وا نەچێتە سەرتەوە».

کەمێک بێدەنگ بوو گووتی «دەبێت ئیشێکت بۆ بدۆزمەوە بگونجێت و لایەق بێت، دەبێت سەبرت هەبێت، سەبر».

من بە ئەسپایی گووتم« سەبرم دەبێت، جەنابی بارۆن سەبرم دەبێت».

# غەزەلنوس و ئەفسانە و هەزارباغ
# کۆتایی ساڵانی هەشتا

لە کۆتایی ساڵانی هەشتاکاندا باوکی غەزەلنوس، ناسر سەعید بە یەکێک لەدەردە نەزانراوەکانی پیریێتی مرد و ئەو ماڵە گەورەیەی بۆ ئەو جێهێشت، لەو چەند ساڵەدا غەزەلنوس سندوقە بێشومارەکانی غەزەلی لەو ژێر زەمینە گەورە و کاشیکراوەی ماڵەوەدا هەڵگرتبوو. سندوقی چی؟ هەر یەکەیان دەروازەی زەریایەک بوون لە غەزەل. لەو هەموو ساڵەدا هەموو ڕۆژێک غەزەلی لەبەر کردبوو. سەدان هەزار بەیت غەزەلی لە بەربوو، بەڵام نەگەیشتبووە کۆتایی. ڕۆژ دوای ڕۆژ لەگەڵ هەر دیوانێک و هەر غەزەلێکدا کە دەیخوێندەوە، دەگەیشتە ئەو بڕوایەی مەلای سوختە ئەو کتێبانەی بەتەنیا نەنوسیوە، بەڵکو ڕۆحی هەموو مەخلوقاتی دڵ بە عەشق لە زەوی و ئاسماندا، لە دەریا و وشکانیدا کۆمەکیانکردوە. ڕۆژ دوای ڕۆژیش کە کاریگەری ئەفسوناوی غەزەلەکانی دەبینی، هەستیدەکرد ئەو کتێبانە سەمبولێکی گەردونین بۆ خەیاڵێک کە هەمیشە پاک و عاشقانە دەمێنێتەوە. ئەو دوای گەڕانەوەی لەگەڵ ئەو کورپەیەدا، منداڵە چکۆلانەکەی ناونا «خەیاڵوان». چەند هەفتەی یەکەمی بەخێوکردنی خەیاڵوان سادە و ئاسان هاتە پێشچاوی، بەڵام قسەکانی ئەو کچە زەرد و نەخۆشەی سەبارەت بە «ئەفسانە» ناوێک لە یادنەکرد کە دەشێت یارمەتیبدات. دوای مانگێک، غەزەلنوس ئێوارەیەک منداڵە چکۆلانەکەی لای ژنی هاوڕێیەکی دانا و خۆی چوو بۆ ئوتێلی «بەفر و سەراب». ئوتێلێکی دوو قاتی چکۆلانە بوو، کە لە کۆتایی ساڵانی چلدا بۆ پێشوازی ئەو جووتیارانە دروستکرابوو کە لەلادێوە بۆ فەحسی توتن و بینینی نهێنی و سیحری شار دەهاتن، لە سەرەتای حەفتاکاندا جارێکی

تـر بۆ پێشـوازی سـەیرانکەرە عەرەبـەکان نوێکرابـووەوە، لـە هەشتاکانیشـدا بـۆ پشـووی ئـەو سـەربازانەی لـە بەرەکانـی جەنگـەوە دەگەڕانـەوە گەورەتـر و خۆشـتر کرابـوو. ئـەو ئێوارەیـە کـە غەزەلنـوس چـووە ئوتێلەکـە، خانمـی ئەفسـانە لەگـەڵ باجییەکدا لەوانـەی ژوورەکان پاکدەکەنـەوە هەندێـک بەرگـە پشـتی شـۆڕاوی ڕێکدەخسـت. ئەفسـانە لـە کۆتایـی سـاڵی هەشـتاو هەشـتدا تەمەنـی بیسـت و دوو سـاڵ بـوو، نزیکـی پێنـج سـاڵ بـوو شـووی بـەو خـاوەن ئوتێلـە کردبـوو. گـەر بهاتبایـە و یەکێـک شانسـی هەبایـە و ئەفسـانەی لـەو دوو ڕۆژە جیـاوازەدا بدیبایـە، جارێـک ئـەو ئێوارەیـەی کـە غەزەلنـوس چـوو بـۆلای و جارێکیـش ئـەو ئێوارەیـەی زوهـدی شـازەمانی بینـی، هەسـتیدەکرد ئـەو خانمـە لـەو شـازدە سـاڵەدا، جگـە لـەوەی جوانتـر و سـیحراویتر بـووە، نـە پیربـووە و نەگـۆڕاوە. غەزەلنـوس لـە یەکـەم ئێـوارەوە ناوینـا «خانمـی چرپـە ئەفسـوناوییەکان». ئـەو پێشـتر غەزەلنوسـی بینیبـوو. بێئـەوەی شـەرمبکات دەسـتیگرت و بـردی بـۆ سـاڵۆنی نانخواردنـی میوانـەکان، بـە چرپـەوە پێیگـووت «دەزانیـن هەمـوو دەزانیـن کە نەشـمیل مـردوە، پێمەڵـێ، هیچـم بۆمەگێـڕەوە، منداڵەکـەش لای تۆیـە، دەزانـم... دڵـم لای ئـەو منداڵـە چکۆلانەیەیـە، غەزەلنـوس دڵـم لایەتـی، پێمبڵـێ نـاوت نـاوە چیـی؟» «نـاوی خەیاڵوانـە». نـاوی منداڵەکـە لای ئەفسـانە نـاوازە و بێوێنەبـوو. ئەفسـانە باسـی ئـەو چیرۆکـەی بـۆ کـرد کـە نەشـمیلی گەیانـدە سـەر پێخەفـی مـەرگ. خـۆی بـە یەکێـک لـە هـەرە کەسـە نزیـک و دۆسـتە قایمکارەکانی ئـەو خاتوونە نیشـاندا، وەک شـتێکی سـەیر بدرکێنێـت بـە غەزەلنوسـی گـووت «سـاڵانێک لەوەوبـەر نەشـمیل منـی بـردە نـاو «جەمعییەتـی ژنـە پەژموردەکان»ـەوە. ئـەوە یەکەمجـار بـوو غەزەلنـوس نـاوی ئـەو جەمعییەتـە ببیسـتێت. هـەر ئەفسـانە پێیگـووت ئـەوان هەفتـەی جارێـک کۆدەبنـەوە و باسـی ئازارەکانـی خۆیـان دەکـەن، قسـە لـە شاسـواری خەیـاڵ و خەونەکانیـان دەکـەن، بـاس لـەو شـوێنە سـیحراوی و زەمانـە قەشـەنگ و هەرێمـە ڕۆمانسـیانە دەکـەن

کە دەیانەوێت بۆی بچن و تیا بژین. هەر ئەو ڕۆژە خانمی ئەفسانە، غەزەلنوسی بۆ خوێندنەوەی هەندێک غەزەل بۆ ناو خانمانی پەژموردە داوەتکرد. ئەوە سەرەتای تێکەڵاوبوونی ڕاستەقینەی غەزەلنوس بوو بەو ژنە غەمگینانەی کە پڕبوون لە خەیاڵ و حەسرەت و ئومێد. غەزەلنوس لەو چەند ساڵەدا چەندەها جار غەزەلی بۆ خوێندنەوە. لە ڕێگای ئەو ئافرەتانەوە ئەو منداڵە خەیاڵیانەشی ناسی کە لە پەیوەندییە خەیاڵی و ناشەرعییەکانی ژنانی ئەم شارە دروستبووبوون. خەیاڵوانی چکۆلە و گرۆز دواهەمین منداڵی ئەو وەچە سیحراوییە نەبوو کە یەکی دێڕێک غەزەل لەسەر سنگیان بوو، بەڵکو گەلەک منداڵی خەیاڵی دیکەی بەدوادا هات.

جەمعییەتی ژنانی سەرگەردان گەورەترین جەمعییەتێک بوو غەزەلنوس دیبێتی، لەو چەند ساڵەدا بە چەندەها گروپی خەیالکاری بچوک گەیشتبوو، بە چەندەها باغدا سەفەریکردبوو، بەسەر شاخی بەرزدا سەرکەوتبوو کە ترۆپکەکانیان لە خەیاڵدا دوایی دەهات، لە هەموو جێگایەکی نیشتیمان مرۆڤی پڕ خولیا و خەیاڵی بینیبوو، جەمعییەتی بچوکی گەنجان و شاعیران و خەیاڵپەرستانی بینیبوو، بەڵام هیچیان وەک ئەم جەمعییەتە گەورە و بێسنوور دیارنەبوون. هەندێک لە ژنانی ئەو جەمعییەتە دایکی منداڵگەلێکی خەیاڵی بوون کە لە عەشقی ناکام دروستبووبوون. هەندێکیان لەبارێکدا بوون دەیانتوانی منداڵە خەیاڵییەکانی خۆیان بەخێوبکەن، بەڵام هەندێکی دیکەیان دەبایە کۆرپەکانی خۆیان بگەێننە دەست ژنانی تر تا منداڵەکانیان بپارێزن و لە مردن ڕزگاریانبکەن، لە ماوەیەکی کەمدا غەزەلنوس لە ڕێگای جیاواز و بەشێوەی جیاواز... لە باغی جیاواز و لە کوچەی جیاوازەوە بووە خاوەنی کۆمەڵێک لەو منداڵە خەیاڵیانە کە جگە لە ماڵی غەزەلنوس شوێنێکی دیکەییان لە دونیادا نەبوو. ئەو شەوەی مەهنازی ناسی، باوکی سێ منداڵی

خەیاڵی بوو، کە کچانی نەناسراو لە عاشقی نەناسراو دروستیانکردبوون. هەموو ئەو منداڵە حەرامزادانە، بەرهەمی تەسلیمبوون و توانەوەی دایکە غەمگینەکانیان بوون لە ساتە خەیاڵی و بێسنوورەکانی عەشقدا. بۆ غەزەلنوس سەیربوو ببینێت ئەو ژنانەی لە ئامێزی مێردەکانیاندا منداڵیان نابێت، لەڕێگای حەزە نائاسایی و ناشەرعییەکانیانەوە دەتوانن منداڵی بەو چەشنە سیحراوی و جوان دروستبکەن. ڕۆژێک لەگەڵ خانمی چرپە ئەفسوناوییەکاندا گەڕا، وەک ئەوەی بە دوای بەهاریانووی دایکیدا بگەڕێ، وەک ئەوەی لە بینینی ئەو ژنانەدا بۆ ڕابوردووی خۆی عەوداڵ بێت، حەزیدەکرد تێبگات، بۆ جگە لە خۆشەویستی هێزێکی دیکە نییە فەڕ و بەرەکەتی منداڵبوون لە هەندێک لە خانمانی ئەم دونیایەدا بخولقێنێت. ئەفسانە هەندێک لەو خێزانانەی نیشانی غەزەلنوسدا کە ئەو کۆرپە حەرام و خەیاڵیانەی عەشقیان لە خۆگرتووە. ئەفسانە بە چرپەکانی خۆی گووتی « ڕق وادەکات پیاوان یەکتری بکوژن، بڕۆن بۆ جەنگ، بەڵام ژنانیش نەزۆک و غەمگین دەکات». پێنج ساڵ بوو شووی بەو خاوەن ئوتێلە کردبوو، لە شەوی یەکەمەوە پلانی دانابوو بیکوژێت و نەیدەتوانی. غەزەلنوس لە ڕێگای ئەوەوە ئەو ژنە غەمگینانەی بینی کە لە کەناری شێتی نزیکبوون و لە سەر سنووری دێوانەگی دەژیان، ئەو ژنانەی لە کۆبوونەوەی جەمعییەتی ژنە خەیاڵییەکاندا جگە لە فەنتازیاکانی عەشق جۆرە فەنتازیایەکی تریان نەبوو، هەندێکیان بە ئەندازەیەک ڕقیان لە مێردەکانیان بوو، تووشی وڕێنەی تاریک و مۆتەکەی دڵخنکێن بووبوون. غەزەلنوس تاکە پیاوێک بوو بۆی هەبێت دانیشێت و گوێ لەو قسە نهێنیانەی نێوان ژنانی ئەم شارە بگرێت. هەمیشە لە ژووری تاریک و کونجی فەرامۆشکراودا یەکدیان دەبینی، لە جێگای ئەوتۆدا هیچ پیاوێکی ئەم دونیایە گوێی لە ڕازەکانیان نەبێت، زۆربەیان بە ئەندازەیەک ڕەنگ زەرد و نەخۆش دیاربوون بۆنی مردنیان

لێدەهات. ژنانی هەمەچیزەبوون، لە ژنی پیاوانی زۆر هەژارەوە کە نانی ڕۆژیان نییە تا ژنی دەسەڵاتدار و پارەدارەکان، لە ژنانی نەخوێندەوارەوە تا خانمانی شاعیر و شانۆکار، پێکڕا بوونەوەری غەمگینبوون کە بۆ چەند ساتێک ئارەزووی ڕاستەقینەی خۆیان باسدەکرد. لە ناو ئەو ژنانەدا غەزەلنوس تێدەگەیشت ئەو لە هەرێمێکی دونیادا دەژی، شتە سادەکان لە هەمانکاتدا شتە هەرە خەیاڵییەکانن، شتە ئاساییەکانیش شتە هەرە ئەفسانەیی و دووردەستەکانن. لەو کۆبوونەوە داخراوانەدا، هەموو بە بازنەیەکی گەورە لە دەوری مۆمێک دادەنیشتن، هەندێکیان ڕووی خۆیان ئاشکرادەکرد و هەندێکیان بە نیقاب و پەچەوە قسەیان لە تاریکترین خواست و خەیاڵیترین ئارەزووی خۆیان دەکرد، هەندێکیان بە جلی جوان و هەندێکیان وەک تەدارەکی تایبەت بۆ سروتێکی نهێنی خۆیان دەگۆڕی. هەندێکیان نەیاندەتوانی قسەبکەن، لە بری قسە سەمایاندەکرد یان دەگریان. خەیاڵ دواهەمین ماڵی ئەوان بوو، گەر ئەو خەیاڵانە نەبایە، دەبوونە دڵێکی ترسناک و دەستێکی کوشندە. لە دوا بەشی پرۆگرامەکاندا، دوای ئەوەی ژنان تەواوی ئازارەکانی خۆیان باسدەکرد و هەموو ئەو ڕستانەیان دەدرکاند کە لە زمانی ڕۆژانەدا حەرام و لە قسەی ئاساییدا قەدەغەن، ئەو وەک وزەبەخشێکی گەورە دەهات و قەسیدە سیحراوییەکانی خۆی دەخوێندەوە. غەزەلەکان هێندەی تر خولیا و ماخۆلان و شێتی تیا دروستدەکردن، وەک ئەوەی بیانباتەوە سەر ئەو کانگا ڕاستەقینەیەی لێوەی هاتوون، بیانباتەوە سەر ئەو دونیایەی تەنیا دونیایەکە ئەوان بۆی دەگەڕێن، بە جۆرێک بە غەزەلەکان مەستدەبوون، غەزەلنوسیان وەک نوێنەری ڕۆحی ئەو پیاوە خەیاڵی و سوارچاکە ئەفسانەییانە دەهاتە بەرچاو کە لە منداڵییەوە بۆی دەگەڕێن و نایگرن. جیهانی ئەو خانمە ڕەنگ زەردانە گەرچی هەژارتر و نهێنیتر و داخراوتر لە دونیاکانی تر دەینواند، بەڵام بۆ غەزەلنوس دوورتر و

نائاساییترین باغی سەر ئەم ئەستێرەیە بوو. ئەوێ جێگایەک بوو لە هەر شوێنێکی تری دونیا زیاتر دەیتوانی دڵی کچە پڕ ئازارەکانی تیا ببینێت، تێبگات چۆن تەسلیمی ساتە سیحراوییەکانی ئەڤین دەبن و جەستەیان بۆ شنەبای خەیاڵ دەکەنەوە. «خانمی ئەفسانە» باسی ئەو دیوە تاریکەیَ ڕۆحی ژنانی بۆکرد کە لەم تاریکییەدا نەبێت، لەناو ئەم جەمعییەتە نهێنییەدا نەبێت، ناتوانێت بێتەدەرێ و ڕوناکی ببینێت. نیوەیەک پڕە لە خۆشەویستی و ڕقی حیساب نەکراو، لە ئازار و خۆشی کە ملکەچی هەمان ئەو یاسا و ڕێسایانە نین کە دیوە ئاشکراو و بینراوەکەی مرۆڤ دەبەنبەڕێوە، بەو چرپە ئەفسوناوییە کە لە چرپەی ژنی خاوەن ئوتێلێک نەدەچوو، بەڵکو لە هەناسە و گەروی ژنێک دەچوو ژیانی لە خوێندنەوەی شیعردا بردبێتە سەر، باسی ئەو باغە نهێنییانەی کرد هەر ژنێک لە دڵی خۆیدا هەڵیدەگرێت، باسی ئەو جەهەنەمە تاریک و ئازارە قووڵانەی لە دەهلیزە داخراو و بێڕێگا و بێکلیلەکانی ناوەوەی ئافرەتدا هەیە. هێدی هێدی غەزەلنوس تێدەگەیشت کە جگە لە عەشقی زۆر و غەمی زۆر، هیچ ڕێگایەکی دی مرۆڤ ناگەێنێتە ئەوسەری خەیاڵ.

هەر لەو ساڵانەدا ژنێک بە ناوی گوڵستان خان غەزەلنوسی برد بۆ هەزارباغ، لەوێ بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا لەوپەڕی دڵەوە عاشق بوو، لە هەزارباغ «سەبری» ناسی، ئەو خانمە خەیاڵییەی لە مێژبوو لەو باغە بێسنوورە نەهاتبووەدەرێ، گۆرانیبێژەکان نەوە لە دوای نەوە گۆرانیان بە جوانی ئەودا گووتبوو، جوانییەکی جاویدان و نەمر کە هەموو شەوێک بۆنی گوڵەکانی ئەو باغە سیحراویانە دووبارە دەیانگەشاندەوە. کیژێک لە ترسی عاشقە بێشومارەکانی چووبووە ئەو باغانەوە و ئیدی لەو سەرزەمینە سیحراوییە نەترازابوو. شەوێک غەزەلنوس بە ئومێدی هێنانەوەی بۆ دونیا، بە خولیای جیاکردنەوەی لەو لالەزارە بێسنوورە، چووە ناو باغەکان. سەرەتا غەزەلەکانی خۆی بە زمانی یەکێک بۆ خوێندەوە شەیداییکات

و بیخاتە نێو بێهۆشی و خولیایەکەوە کێشیبکاتەوە سەر زەمین، بەڵکو بە غەزەل کەمە کەمە خەوێکی سیحراوی لێخات و بەدەم خەوەوە لە دەرگا ئەفسوناوییەکانی هەزارباغ بیهێنێتەدەرێ. بەڵام شەو دوای شەو و غەزەل بە دوای غەزەل سیحر لە ساحیر وەرگەڕا و وای لێهات غەزەلنوس نەتوانێت ئەو جوانییە فەرامۆشبکات، لە ماوەیەکی کورتدا غەزەلنوس خۆی بە عاشقی بینییەوە. ئەگەرچی ئەو گەورەترین غەزەلخوێن بوو، هەموو پێیانوابوو ئەوەی دەیخوێنێتەوە لە خوێنی دڵی عاشقانی دونیا هاتۆتەدەرێ، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئەو ساتەی لە گوڵستانەکانی هەزارباغدا سەبری بینی بەڕاستی عاشق نەبووبوو. پێدەچوو قەدەر هەڵیگرتبێت، دواجار لە دەرەوەی ئەم دونیا ڕاستەقینەیەی ئێمە، لە گوڵزارێکی خەیاڵیدا کچێکی خۆشبوێت کە لە مێژبوو گوڵەکان کردبوویان بە مەخلوقێکی خەیاڵی. کچێک هەرگیز ناتوانێت ماڵی لەگەڵدا دروستبکات، ناتوانێت لەگەڵیدا بچێتە ژێر ساباتێکەوە، ناتوانێت لە ژێر خۆری شارەکانی من و تۆدا، لە کوچەی گەڕەکە غەمگینەکانماندا پیاسەیەکی لەگەڵدا بکات، کیژێک بەجۆرێک تێکەڵ بە لالەزار بووە، بە ئەندازەیەک نوقمی تریفە و گوڵ بووە، ژیانی لە دەرەوەی باغە خەیاڵییەکان نەکردەیە. غەزەلنوس لە یەکەم شەوەوە تێدەگات ئەم کچە تەنیا لە نێو ئەم باغەدا دەژی، لە دەرەوەی ئەم گوڵە خەیاڵیانە دەبێتە تۆز و سەراب، ئەو نمونەی ئەو کچە خەیاڵییەیە کە تا ئەبەد پێیناگەیت و نایگریت. شەو لە دوای شەو دەگەڕێتەوە و غەزەل بۆ ئەم خانمە ئاهوئاسایە دەخوێنێتەوە کە هەندێجار دەستەمۆ و نیان و غەزەلمەیلە، هەندێجاریش سرک و هەڵاتوو و بێسووکنایە. سەبری هەندێجار غەزەلەکان ڕایدەگرن و دەوەستێت، هەندێجاریش هەڵاتی و نەگیرە و هەڵدێت. غەزەلنوس بەدوای ئەو خانمەدا زۆر کوچە و زۆر کونجی هەزارباغ دەگەڕێت، یەکەمجار هەستدەکات مانای چی مرۆڤ لە ناوەوە بۆ ئافرەتێک بسووتێت. شەوان درەنگ منداڵە

چکۆلانەکانی خۆی دادەپۆشن و دەچێت بۆ هەزارباغ، بەیانیانیش بەر لەوەی خۆر هەڵبێت و کەڵەبابی بەیانیان بخوێنن دەگەڕێتەوە. هەزارباغ هەرێمێکە دەرگاکانی تەنیا لە شەودا دەکرێنەوە، بەڕۆژ چەند کوچەیەکی هەژارە کە پڕە لە گەنجانی شەڕواڵ لەپێ و کچانی شەرمن و ترسنۆک، دەگووترێت لە کۆن زەماندا سێ باغی چکۆلانە لەوێدا هەبووە، دواتر لەگەڵ کشانی شار و گەورەبوونی ماڵنشینەکاندا بوون بە ژێر شەقام و چیمەنتۆ و ئەسفەلتی ڕەشەوە. ئێستا ئەو سێ باغە شەوان کە ئێمەی ئادەمیزادانی بێخەیاڵ دەخەوین، بە دیوێکی تری دونیادا دەکرێنەوە و دەبنە لالەزارێکی بێکۆتا، کلیلی دەرگا خەیاڵییەکانیشیان تەنیا لای ئەو پیرێژنە ڕەشپۆش و غەمگینانەیە کە گوڵەکان ئاودەدەن و چەپکیاندەکەن و گوڵاویان لێدەگرن. سەیری تاکە کچێکە کە بەڕۆژ باغەکان نایکەنە دەرەوە، تاکە کچێکە کاتێک خۆر هەڵدێت و هەزارباغ ئاوادەبێت ئەویش لەگەڵ گوڵەکاندا دەڕوات و ئاوادەبێت، کە شەودێت و باغ هەڵدێتەوە ئەویش دێت و هەڵدێتەوە. سەیری جۆرە جوانییەکە لەسەروو پێوەرەکانی ئێمە و جەبرە سەختەکانی ژاکان و پیربوونەوە. غەزەلنوس بە هەموو هێزی غەزەلی خۆی ناتوانێت دەستمۆییبکات، ئازارێکی سەخت و سوێیەکی ترسناکی عەشق دەچێتە دڵییەوە، ئەو پیاوەی لەسەر زەوی کچان و خانمان لە پێشدەم غەزەلەکانیدا دەشکێن و بەلادا دەکەون، لە عەردی خەیاڵدا عاشقی جوانییەکی جاویدان و سرک دەبێت کە غەزەل بە ئاسانی نایگرێت، لەوێدا هەموو ژانی ئەڤین و دۆزەخی موحیبەت دەچێژێت، ئەو غەزەلانەی غەزەلنوس لە هەزارباغ دەیانخوێنێتەوە ئەو غەزەلانەنین کە لە کتێبەکانی سوختەدا لەبەریکردون، یەکەمجار غەزەلنوس بۆ عەشقی خۆی غەزەلسەرایی دەکات و قەسیدەی خۆی دەخوێنێت. سەرەتا باوەڕناکات، وادەزانێت ئەو قەسیدانەی وەک عاشقێکی شێت لە کوچەی گوڵە جاویدانەکاندا دەیخوێنێت، بەشێکن لە غەزەلەکانی سوختە. کە

ڕۆژ دەبێتەوە بەپەلە دەگەڕێتەوە ناو کتێبەکانی غەزەل و بەراوردی سرودەکانی شەوی خۆی و دەقەکانی سوختە دەکات، دەبینێت ئەوەی لە باغاتی گوڵدا خوێندویّتی لە غەزەلەکاندا نییە، دروستکراوی دڵی خۆی و خەیاڵی عاشقانەیەتی. لەو شەوانەدا لە ژێر تریفەکانی هەزار باغدا تێدەگات لە ناو هەموو مرۆڤێکدا غەزەلنوسێکی شاردراوە هەیە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان سرودی خۆی دەچڕێت و ناچێتەوە سەر غەزەلی کەس.

## گەڕان بۆ بارۆنەکان
## «حەسەن تۆفان ــ تەموز و ئابی ٢٠٠٤»

ڕۆژێک هەموو شتێکم لای شبر درکاند و پێمگووت من بەشێکم لە کۆمەڵێک خەڵک کە ناومان ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانە. خەڵکانێکین هەر کەسەمان پارچە زەوییەک و جێگایەکی تایبەتیمان لە دونیایەکی تر هەیە کە لە خەیاڵی خۆماندایە، باسی هەزارباغ و گوڵە ئەفسوناوییەکانم بۆ شبر کرد، باسی غەزەلنوس و شیعرە سیحراوییەکانی کە هەر کەس بیانبیستێت ڕوو لە جێگایەکی نەزانراو و هەست بە مەستییەکی نەبیستراو دەکات. قسەم هێنایە سەر باسی ڕوبارە خەیاڵییەکەی ماجیدی گوڵ سۆلاف کە لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێک منداڵی کوێر بەرەو سەرزەمینی خەیاڵ دەبات. شبر سەرەتا ڕای وابوو گاڵتەدەکەم و تەنیا بۆ گەرمکردنی دەمەتەقێ دونیایەکی ترم بۆ خۆم دروستکردوە کە تەنیا لە خەیاڵدا هەیە. من بێنەوەی ڕوخساری خۆم تێکبدەم، بە دەنگە منگن و قووڵەکەی حەسەنی پیرۆزەوە، پێمگووت، ئیشمان ئەوەیە مێژووی مردن لە دەساڵی ڕابوردوودا بنوسینەوە، باسی ئەو هەزاران ژنەم کرد کە سووتان، ئەو هەزاران گەنجەی لە ڕێگاکان ونبوون و

خنکان، کوژراوەکانی شەڕ، دواتریش ئەو کوشتن و خۆکوشتنە زۆر و لە ناکاوەی لەم شارەدا ڕوودەدەن. شبر سەیری لێهات، منێکی سەردێزی شەڕواڵ لەپێ لە دونیای وا جوانەوە ئالآبم. بەڵام من بەتکاوە داوای یارمەتیم کرد و پێمگووت دەبێت زانیاری زۆرترمان دەربارەی بارۆنەکان و سەرانی حوکمڕان هەبێت و ڕۆڵیان لە کۆی دیمەنەکەدا بزانین. شبر سەرەتا پێیوابوو قسەکانم بوارێکی خەیاڵین بۆ پەڕینەوە لە پوچی و سادەیی ژیانی ڕۆژانەی خۆم. بەڵام بە وردی بۆم ڕوونکردەوە کە ئێستا لەسەر تەلیسمی لاشەیەکی نەزانراو ئیشدەکەین، لاشەی کوڕێک ناوی موراد جەمیلە، باسی ئەوەشم کرد یەکێک لەو سەرەداوە بچوکانەی لە بەر دەستماندایە دەمانباتەوە بۆ ناو بارۆنەکان. کە قسەم هێنایە سەر بارۆنەکان، شبر هەڵوێستەیەکی کرد و بە نیگەرانییەوە گووتی «ماوەیەکە هەستمکردوە تۆ خۆت دەخەیتە تەهلوکەیەکی گەورەوە، خۆت دەخەیتە شەڕێکەوە لە توانای تۆدا نییە». دڵنیامکردەوە و گووتم«شبر، ئێمە ناچینە شەڕەوە، ئێمە کتێبێک دەنوسین کە تا دونیا دونیایە تەواو نابێت، ڕۆژێک لە ڕۆژان چاپ ناکرێت، هەموو ژیانمان خەریکبین ناتوانین بەشێکی بچوکی حیکایەتەکانی مردن بنوسینەوە. کێ دەتوانێت چیرۆکی ئەو هەموو ئافرەتە بنوسێتەوە کە سووتان و دەسووتێن؟ مرۆڤ دەتوانێت هەندێک حیکایەت بنوسێتەوە، هەندێک حاڵەت، ئەوەی ئێمە دوایکەوتووین خەیاڵە، ئەو کتێبەش کە دەینوسین کتێبێکی خەیاڵییە، دواتر ئەو کتێبە تەنیا بۆ ئێمەیە، بۆ ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانی خۆمانە، بۆ منداڵەکانمانە، بۆ ئەو کچانەیە کە ئەگەر سەد ساڵی تر بە ئازادی لەدایکبوون بزانن ئەو ئازادییەی ئەوان لەسەدەی بیست و یەکدا هەزاران ئافرەت بە ئاگر کڕیویانە. مەترسە... شبر... ئەوە پرۆژەیەکی تازە نییە، سەرەتا غەزەلنوس دەستی پێکردوە، دواتر تریفە یابەحری. بۆ ئەوە نییە ناوبانگی پێدەربکەین، یان باسی پیاوکوژەکان بکەین و ناویان

بهێنینە ناوانەوە، ئەو کتێبە بۆ خۆمانە، بۆ ئەو وەچە خەیاڵپەروەرانەی دوای ئێمەیە کە خەیاڵ زۆرجار ڕاستیان لێوندەکات، بۆ ئەوەیە خەیاڵ کارێک نەکات ڕاستیمان بیربچێتەوە. ڕاستی و خەیاڵ هەر دووکیان یەک بازنەن، لە هەر جێگایەکەوە دەست پێبکەیت دەگەیتە ئەوی تریان، ڕاستی لەوپەڕی خەیاڵەوە دەست پێدەکات. وەک چۆن خەیاڵیش لەوپەڕی ڕاستییەوە دەست پێدەکات، بە هەر ڕێگایەکدا تا ئەوسەر بڕۆیت دەگەیتە پێچەوانەکەی، ئێمەش دەمانەوێت بازنەکە تەواویکەین... گەر ئەو کتێبە نەنوسین یانی لە ناوەڕاستی خەیاڵدا دەوەستین، مانای بازنەکەمان تەواو نەکردوە». ئەوە یەکەمجاربوو شبر من ببینێت واقسەدەکەم. دەیزانی بڕێک لەو وشە و ڕستانە لە کەسانێکی لە خۆم زیرەکترەوە فێربووم. شبر گەرچی هەستی بە مەترسییەکان دەکرد، بەڵام شتەکان سەیر و سەرەنجڕاکێش هاتنە بەرچاوی، لە ساتێکدا وا هاتە بەردیدەم وەک بپرسێت، ئەی بۆ ئەو لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان نییە؟. من بۆ ئەوەی جۆرە غەمێکی وای تیا دروست نەکەم گووتم «شبر تۆ تەنیا کەسێکی لەم دونیایەدا دەتوانم ئەم ڕاستییەت پێبڵێم و ئەم نهێنییەت لا بدرکێنم، تۆ ئێستا بوویت بە تەنیا مرۆڤێک کە ڕۆحلەبەرێکی خەیاڵی نیت و چیرۆکی ئێمە دەزانیت. بۆیە پێتدەڵێم تا بزانیت تۆ چ هاوڕێیەکی گەورەی منیت... تا ئاگاداربیت من چەند پێویستم بەتۆیە». قسەکانم شبری دڵشادکرد، لەسەر کورسی کەمئەندامییەکەی تۆزێک وەرچەرخا و بەدەنگێکی هێمن گووتی «حەسەنی پیرۆز، بۆ تۆ وادەزانی من لە ژیانی خۆم دەترسم،؟ برام، لەو ڕۆژەوەی کەوتمە سەر ئەم عەرەبانەیە خۆم بە زیندوو حیساب ناکەم، تا بەمجۆرە پەکم نەکەوت، نەمدەزانی ئێمە چەندە بچوکین، چەند شتێکی بێنرخین، ماوەیەک بەکارماندەهێنن و دوایی فڕێماندەدەن. پیرۆز، من لە تۆ دەترسم. شتێکت پێدەڵێم باش بیری لێبکەرەوە، خۆت دەزانی من لە دوای ڕاپەڕینەوە ماوەیەکی

درێـژ ئیشـم لەگەڵـدا کـردون، خەڵـکم بـۆ کوشـتون، شـەڕم بـۆ کـردون. ئـەوان دوو شـتیان زۆر خۆشـدەوێت هێـزی خۆیـان و پاکیـان. ئێسـتا وەک جـاران سـەیری هێـز ناکـەن، سـەردەمێک کـە ئێمـە پێشـمەرگەبووین، لـە شـانە حیزبییەکانـدا ئیشـماندەکرد، هێـز شـتێکی تـر بـوو، ئەوەبـوو دەسـت لـە داگیرکـەران بوەشـێنین، خەڵـک بهێنینـە ڕیزەکانـی شۆڕشـەوە، بسـتێکی کوردسـتان لـە چڵکـی فاشیسـتەکان پاکبکەینـەوە، ئـا هێـز ئـەوکات شـتێکی لـەو جـۆرە بـوو، پیـرۆ ئێسـتا هێـز ئەوەیـە هەمـوو شـتێکی ئـەم دونیایـە هـی ئـەوان بێـت، لـە خانـووە جوانەکانـەوە بـۆ بـازاڕە گـەورەکان، لـەو شـارە بچوکانـەوە کـە ئێسـتا دروسـتیدەکەن بـۆ سـەیرانگا خۆشـەکان، بـۆ بینـا بـەرزەکان، بـۆ بورجـەکان، بـۆ ئۆتومبێلـەکان، بـۆ ژنـە جوانەکانـی ئـەم شـارە، بـۆ شـاعیرەکان، بـۆ ئەوانـەی مۆسـیقا لێـدەدەن، بـۆ ئەوانـەی دەنوسـن. هەمـوو شـتێک... حەسـەنی پیـرۆ... هەمـوو شـتێک. مـن پێتدەڵێـم، ئـەوان هەمـوو کەسێکیشـیان دەوێـت، ئامـادەن هەمـوو کەسێک بکـڕن، هەمـوو کەسـێک. حەسـەنی پیـرۆ مـن دوای ڕاپەڕیـن ئیشـم زۆر بـۆ کـردن، هەمـوو کەسـێکیان دەوێـت، لەوانـەوە کـە پێـش نوێژیدەکـەن تـا ئەوانـەی لەشـیان دەفرۆشـن، نرخـی گۆتـرەش لەسـەر ئادەمیـزادەکان دادەنێـن. ئـەم وڵاتـە دەبێـت هـی ئـەوان بێـت لـە ڕۆژنامەکانـەوە بیگـرە بـۆ یاریـگاو حەوزەکانـی مەلـە، لـە چاپخانەکانـەوە تـا چێشـتخانەکان، لـە سـاڵۆنەکانی قژبڕینـەوە تـا زانکـۆکان، لـە هەندێـک لـەو لۆتییـە ترکەنانـەوە کـە ئاهەنگیـان پێسـازدەکەن تـا مامۆسـتاکانی زانکـۆ، لـەو لیبۆکانـەوە کـە دروسـتیانکردون خەڵـک بهێننـە پێکەنیـن تـا فرمێسـکی ژن و کچـی شـەهیدەکان، دەبێـت هەمـووی هـی ئـەوان بێـت. هەمـوو شـتێکیان دەوێـت حەسـەنی پیـرۆ، هەمـوو شـتێک. ئـەو سـۆزانیانەیان دەوێـت کـە لـە وڵاتانـی تـرەوە دەیانهێنـن، کچـە پاکیـز و داوێـن پاکەکانـی ئێرەشـیان دەوێـت، جبـەی مـەلاکان و سـتیانی سـەماکەرەکان، پیاوکوژێکـی وەک تونچیـی دەکـڕن و

ناسکترین مۆسیقاژەنیش. تەنیا لەو ڕێگایەوە دەژین و دەتوانن مانایان هەبێت. ئەوە جۆرە ژیان و ڕێکخستنێکە من و تۆ تێیناگەین، نازانین چۆن ئیشدەکات، بەڵام حەسەنی پیرۆز بەو جۆرەیە. حەسەن، بەڵام پاکی خۆشیان ئێجگار خۆشدەوێت، شێتی ئەوەن هەمیشە ئەو پیاوە پاک و خەباتگێڕ و خۆشەویستەبن کە مێژوو کردارەکانیان تۆماردەکات. من دەیانناسم، تۆ لەدوای ڕاپەڕین خۆت دوورخستەوە و ڕۆیشتیت، بەڵام من دەیانناسم، لە هیچ کەسێک نابورن لکەداریانبکات، پێیانوایە بەهەشتێکی گەورەیان بۆ خۆیان و ئێمەش دروستکردوە، قەبووڵی ناکەن کەس یاری بەو وێنەیە بکات».

نەمدەزانی ئەو وێنەیەی شبر نیگاریدەکات تا چ ئەندازەیەک ڕاستە. من بە جۆرێک لەو شارەدا غەریببووم، نەمدەزانی چی ڕوودەدات، گەرچی شەش ساڵ زیاتربوو دەگەڕام بەڵام لە هیچ تێنەدەگەیشتم، زۆر مەبەستم نەبوو لە ژیانی نهێنی ئەو شارەدا قووڵببمەوە، خەڵکانێک هەن دەیانەوێت بە دەهلیزە نهێنی و شاردراوەکەی شاردا بڕۆن، خەڵکانێکیش هەن دەیانەوێت بە کوچەو بلوارە خەیاڵییەکانیدا گوزەربکەن، شبر لە جۆری یەکەم و من لە جۆری دووەم بووم، ئەو زۆر باوەڕی بەو دونیایە نەدەکرد کە من تیادەژیام و منیش زۆر باوەڕم بەو دونیایە نەدەکرد کە ئەو تیادەژیا، بەڵام ئێستا هەر دووکمان ناچاربووین شەقامەکانمان لە یەکتر نزیکبکەینەوە، ڕێگاکانمان وا ئاڕاستەبکەین لە جێگایەکدا یەکتر ببرین.

ئەو ڕۆژەی من و شبر قسەمانکرد، نزیکی شەش ساڵ بوو یانەی پیاوکوژە بێئیشەکانم نەبینیبوو، هەندێجار لە کوچە و بازاڕەکاندا یەکێک لە هاوڕێ دێرینەکانی سەردەمی زووم دەبینییەوە و سڵاوێکمان لە یەکدی دەکرد و دەڕۆیشتین. ئەو ڕۆژە کە بۆ شبرم درکاند پێویستیم بە زانیاریی لەسەر بارۆنەکان هەیە، لەگەڵ هەموو گومانێکدا گووتی« دەبێت بڕۆین

بۆ یانەی پیاوکوژە بێئیشەکان، ئەوێ تاکە جێگایەکە هەندێک زانیاریمان دەستبکەوێت، بەڵام نابێت وادەرکەوێت کە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەچینە ئەوێ، تێدەگەیت، نابێت. دەبێت سەبرت هەبێت».

یانەی پیاوکوژە بێئیشەکان بەراورد بە شەش ساڵ لەوەوبەر گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتبوو، جێگاکە بە شێوەیەکی سەیر ڕازێنرابووەوە، پارەیەکی زۆر لە دیکۆر و ئەساسدا سەرفکرابوو، کاتێک من و شبر ڕۆیشتین هێشتا شەو دانەهاتبوو، جگە لە یەک دوو کەس کە لە سوچێکدا دەیانخواردەوە کەسێکمان نەبینی. کچێکی گەنج پێشوازی لێکردین و گووتی گەر شوناسنامەی تایبەتیمان نەبێت ناتوانین دابنیشین، تا نەمانگووت، ئێمە هاوڕێی نزیکی تونچی و حاجی کۆتەرین وازی لێنەهێنایین. مۆسیقایەکی هێمنیان خستبووە سەر و جێگاکەیان ناونابوو «سوارانی زۆزان». پێدەچوو شبریش ماوەیەکی درێژبێت نەهاتبێت، بەڵام بە ئەسپایی گووتی «حەسەنی پیرۆ، لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا دونیا زۆر گۆڕاوە، ئێستا هەموویان گوێ لە مۆسیقا دەگرن، هەندێکیان گۆرانیبێژی خۆیان هەیە، پارەی خەیاڵی دەدەن بە هەندێک دەنگخۆش کە لە دەرەوەی مەملەکەتەوە دەیانهێنن، با پێت بڵێم، هەندێکیان بگرە تیپی مۆسیقای تایبەتیان هەیە». من گووتم «بەجەهەنەم هەر چییەک دەکەن، بە جەهەنەم، بەس خەڵک نەکوژن». ئەوە ئەو ڕستە سەیرەبوو کە من بەردەوام دووبارەمدەکردەوە. ئەو شەوە دوای دانیشتنی ئێمەهێدی هێدی یانەکەپڕبوو لەناسیاوی دێرین و هاوڕێی کۆن. ئەوان پێشوازییەکی گەورەیان لێکردین، هەموویان بەڕادەیەک بەو سەردانەی ئێمە سەرسامبوون باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەدەکرد. هەموو گۆڕابوون و بە جۆرێکی ترسناک قەڵەوبووبوون، زۆربەیان قاتی ڕەش و کراسی سپییان لە بەردابوو. هەموو مێزەکان پڕبوون، من کەسانێکی زۆرم بینی کە پێشتر نەمبینیبوون و نەمدەناسین، لێگەڕام شبر بەسەروو زمانە

شیرین و لەفزە شەکەرینەکانی خۆی زانیاریم بۆ کۆبکاتەوە، ئەو بە خۆی و عەرەبانەکەیەوە، بەو سەر و ریشە زەرد و زێڕینەوە، بە خۆی و شوشەیەک بیرەوە سەر مێزەکان دەگەڕا، لەگەڵ هەموویاندا قسەیدەکرد، قاقای لێدەدا. هەندێجار لە دوورەوە بانگیدەکردم و بەدەنگی بەرز بەسەر هەموو مێزەکاندا هاواریدەکرد و دەیگووت «حەسەن تۆفان ئاگات لێیە، بە شەرەفم ئەم شوێنە بە هەشتی سەر ڕووی زەمینە، ناوی سوارانی ڕۆزانە. سوارانی ڕۆزان گوێت لەم شیعرەی خلە مێروە " ئێرە شوێنی سوارانی ڕۆزانە کوا ژنی کەللە گەرمی ئاران ـــ شەوی ڕشتنی بادەیە، مەیکە بە گرمە و باو بۆران"» . من دەمێ ساڵ بوو خلە مێروم دەناسی، پیرێک بوو لەگەڵ شۆڕشدا گەورەبووبوو. خەباتی دووردورێژ هیچ شتێکی ئەوتۆی بۆ نەکردبوو، بەهرەیەکی گەورەی تێدابوو بۆ گووتنی شیعری بێمانا، دواجار ئەو شیعرە پڕوپوچانە کردبوویان بە کاراکتەرێکی ناودار و لە مەجلیسی بەرپرس و سیاسەتمەداراندا شوێنێکی گەورەی بۆ خۆی کردبووەوە، هەندێجار بە پارەی زۆر ئەو شیعرە بێبەهایانەی دەنوسی، وەک شبر دەیگووت لە ماوەی دەساڵدا بە ئەندازەی هەموو شاعیرانی کورد لە بابەتاهیری هەمەدانییەوە تا ئەمڕۆ دەوڵەمەندبووبوو. خلە مێرو شەوان لەو یانەیەدا سەرخۆشدەبوو و ئیدی ستایش و هیجای دەهۆنییەوە، من ڕشانەوەم بە شیعرەکانی دەهات. ئەو شەوە چەندەها مەخلوقاتی وەک خلە مێروم بینییەوە کە دەمێ ساڵ بوو نەمبینیبوون. شبر زۆر ئاسان دەیتوانی بگەڕێتەوە ناویان، وەک ئەوەی کلیلێکی سیحراوی پێبێت، لەگەڵ ئیفلیجی و پەککەوتەبوونیشیدا هێشتا ئەفسونێکی گەورەی لەسەر هەمووان هەبوو. تونچی وەک چاوەڕوانی ئێمەبکات شتێک بڵێین، جگە لە حورمەت و ڕێز و خۆشەویستی شتێکی تری نەنواند، بەڵام دەمزانی لە ناخەوە دەپرسێت و گوماندەکات. شبر شەوی یەکەممانی ناودەنا شەوی بەزم، ئەو شەوە من تاکۆتایی لە سەر کورسییەکەی

خۆم نەجولّام، قاپێک فستق و قاپێک لەبلەبیم خوارد و هیچی تر، بەلّام شبر بێباک دەیخواردەوە، شەو درەنگ کە گەڕاینەوە بۆ ماڵێ، من هیچم چنگ نەکەوتبوو، بەلّام شبر گووتی «لەوێبوون، بارۆنەکانیش لەوێبوون، بارۆنی هەنگوین و بارۆنی ڕەش، هەردووکیان لەوێبوون. کە بارۆنەکان لەوێبوون مانای شتێک ئەنجامدەدەن، هەرگیز بە تەنیا و بەبێ ئیش نایەن بۆ ئەو جێگایە. زۆربەی ئیشەکان و ڕێکەوتنەکان لەو یانە مەلعونەدا ئەنجامدەدرێت، بە لەعنەت بێت بۆ چ جێگایەکە، بە لەعنەت بێت.». من بەسەرسامییەوە پرسیم «شبر پێمبڵێ، بۆ ئەو کارانە بە پیاوانی خۆیان ناکەن، گەر دەیانەوێت شتێک بکەن، لە کێ دەترسن؟ خۆیان پیاویان هەیە، دەست و دایەرەیان هەیە. وانییە، ئەوە کەی قسەیە تۆ دەیکەیت... وانییە؟»، شبر گووتی «حەسەنی پیرۆز لە کەیەوە وا گەمژە بوویت، کەس ئێستا ئیش بە پیاوی خۆی ناکات، تێدەگەیت، هێندە نەفام و کەم دەرک نین، وەها دەستی خۆیان دەرخەن. دەستێکی نهێنی شتە گەورەکانی ئەم وڵاتە ئەنجامدەدات، تۆ گەمژەیت یان بێئاگا، شتێکی موقەدەس لەم وڵاتەدا هەیە ناوی نهێنییە، زۆرجار وانیشاندەدەن کە هەموو شتێکیان دیار و ئاشکرایە، هەندێجار کەمێک لە قوونی خۆیان دەردەخەن و دەڵێن سەیرکەن ئێمە هیچی شاردراوەمان نییە. کوڕی پیرۆز، تۆزێک لە دەرپێکانیان دەهێننە خوارەوە و دەڵێن سەیری دیموکراسییەت بکەن، ئەوە دیموکراسییەتە نایبینن. بەلّام لەم وڵاتەدا یەک شتی پیرۆز و موبارەک هەیە، ئەویش نهێنییە، نهێنی دینی ئەم وڵاتەیە، سیازدە ساڵە لەم وڵاتەدا یەک دین لەسەروو هەموو شتەکانەوەیە، ئەویش نهێنی پەرستنە. تۆڕێکی گەورە هەیە وەک گێژی ئاو وایە، ناهێڵێت هیچ تاوانێکی گەورە ئاشکرابێت. بڕۆ بۆ بەندیخانەکان، بڕۆ بۆ ئەوێ، ئەوسا دەزانیت من باسی چی دەکەم، جگە لە تاوانباری بچوک، جگە لەوانەی لە خوارەوە گوناە دەکەن

کەسی تری لێ نییە... ». شبر بە ئەندازەیەک تورەبوو، ترسام لێم زویربووبێت، بەڵام لە قسەکانی ئەوەوە تێگەیشتم کە نهێنی ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان بەراورد بە نهێنی بارۆنەکان زۆر ناچیز و بچوکە. شبر بە جۆرێک ڕقی لێیان بوو گەر ئەو تورەییە ترسناکەی خۆی بەو جۆرە خاڵی نەکردایەتەوە دەمرد. ڕۆژێکیان پێمگووت «شبر بۆ وا لە حیزب تورەیت، ڕاستت دەوێت، گەر بتەوێت ئەوان ڕێزت لێدەنێن، پارەی باشت بۆ دەبڕنەوە، ماڵت بۆ دروستدەکەن، هەمووی سوچی خۆتە؟». پێکەنی و گووتی « کێ دەڵێت لەوان تورەم، کێ دەڵێت؟ حەسەنی پیزۆ، من لەوە بچوکترم بتوانم لەوان تورەبم. من لەوە تورەم کە پازدە ساڵ خەڵکم دەکوشت و وامدەزانی خزمەتی مەسەلەیەک دەکەم، تێدەگەیت، لەوە تورەم، پازدەساڵ ئیشمدەکرد و دواتر تێگەیشتم هیچ مەسەلەیەک لە گۆڕێ نییە. من ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕێزم بۆ خۆم نەما، حەسەنی پیزۆ، کە مرۆڤ ڕێزی بۆ خۆی نەما ئیدی مردوە. تۆ مەخلوقێکی سەیری، پیزۆ سوێند دەخۆم کەسی وەک تۆ لەم دونیایەدا نەبێت، لەوانەیە لە هیچ ئەستێرەیەکی تریشدا نەبێت، نازانم بە ڕاستی تۆ چیت؟. وادەزانی من نازانم مافم هەیە، تێدەگەیت؟ وادەزانی نازانم هەقی ڕاستەقینەی خۆمە ماڵێکم هەبێت تیا بژیم، موچەیەکم هەبێت برسی نەبم؟ نازانم. من بەچی دەزانێت بە حەیوان یان چی؟. بەڵام ئەوان ئەوە نازانن، تێدەگەیت، ئەوان کە موچەکەی خۆشت دەدەنێ ناڵێن ئەوە بەری ڕەنجی خۆتە، بەری ماندووبوونی خۆتە، ئەوان پێیانوایە دەتکڕن... حەسەنی پیزۆ، وابیردەکەنەوە». وەک لە بێدەنگی من بسڵەمێتەوە گووتی « کە موچەت دەدەنێ ناڵێن ئەوە پاداشتی خەباتی خۆتە بۆ خەڵک و نەتەوە، وا ناڵێن. دەڵێن ئەوە نرخی دەستەکانتە، ئەوە نرخی قاچتە، نرخی ئەو دەمەیە کە دەبێت ئیدی دایبخەیت و قسەنەکەیت...». هەستمکرد هیچ هێزێک نییە شبر والێبکات جارێک دی حیزب قەبووڵبکاتەوە، هیچ

هێزێـک.

چەنـد شـەوێکی دی لەسـەر یـەک گەڕاینـەوە بـۆ ئـەو یانەیـە، شبر هەمـوو شـەوێک هەمـان گەمەیدەکـرد، دەچـووە سـەر هەمـوو مێـزەکان و قسـەی لەگـەڵ هەمووانـدا دەکـرد، بیـرەی دەخـواردەوە و مەسـت دەبـوو. شـەوێکیان کـە گەڕاینـەوە بەسەرسـامییەوە گووتـی «حەسـەنی پیـزۆ، جەعفـەری مەغۆلـی لێرەیـە، تێدەگەیـت، جەعفـەری مەغۆلـی لێرەیـە. مـن ئەمشـەو زانیـم کـە جەعفـەری مەغۆلـی ماوەیەکـی درێـژە لێرەیـە». ئـەوە سـەیرترین هەواڵێـک بـوو لـەو وەرزەدا بیبیسـتم. هاوامکـرد «شـبر، دەمەوێـت بیبینـم، پێویسـتە بیبینـم». بـە پێکەنینـەوە گووتـی «چـۆن دەتوانیـت بیبینیـت، ئـەو لەنـاو بارۆنەکانـدا دەژی؟... تێدەگەیـت لـە کـوێ؟ لەنوێمیـران، کەسـانی وەک مـن و تـۆ ناتوانیـن بچینـە ئـەو گەڕەکـە، ئـەوە شـوێنێکی تایبەتییـە کـە دامـاوی وەک مـن و تـۆ نایگاتـێ». شـبر ڕاسـتی دەکـرد، کـەس بـە ئاسـانی نەدەگەیشـتە نوێمیـران... بـەڵام دۆزینـەوەی جەعفـەری مەغۆلـی بـوو بـە خولیـای گـەورەم. لـەو شـەوەوە دڵنیابـووم کـە درەنـگ یـان زوو مەغۆلـی دەبینمـەوە، بـەڵام چـۆن و لـە کـوێ نەمدەزانـی.

## ئای چ باغێکی قەشەنگت هەیە... مەهناز خان
## «غەزەلنوس - زستانی ساڵی ١٩٩٣»

لـەدوای مردنـی مەهنـازەوە بۆنـی لاشـەی سـووتاو بەرۆکـی غەزەلنوسـی بەرنەدەدا. شـەوان بەردەوام لەسـەر ئەو بۆکڕوزە سـارد و ترسناکەی جەستەی ئادەمییـان بـە ئاگادەهاتـەوە، بۆنێـک شـەو دوای شـەو دووبارەدەبووەوە، لـە هـەر جێگایـەک بایـە ئـەو بۆنـە دەهاتـە ژووریّ و سـرەوتی لێدەبڕی، چەنـدە دەرگاکانـی کڵۆمدەکـرد و پەنجەرەکانـی دادەخسـت و پەردەکانـی دادەدایـەوە،

کەچی ئەو بۆنە هەر هەراسانیدەکرد. لە هێزێکی گەورە و نهێنی دەچوو بانگیبکات و بیەوێت شتێکی پێبڵێت. دەیزانی ئەو بۆنە هیچ نییە جگە لە ڕۆحی سووتاوی مەهناز کە بە ژیانی ئەودا دەسوڕێتەوە. ڕۆژانی دیدار کە بیمارستانەکانی شار دەرگایان بۆ میوانان دەخستە سەرپشت، ئەو بۆ ئەوەی لە نهێنی ئەو بۆنە تێبگات، دەڕۆیشتە بیمارستانە گەورەکان، خۆی دەکرد بە بەشی سووتاوەکاندا، لە قاوشە کۆن و پیسبۆکاندا دەسوڕایەوە، هەر ڕۆژێکیش ئەو گەشتە ڕۆحتەزێن و دڵسووتێنەی بکردبایە، دەیان کچی نەخۆشی دەبینی لەسەر قەرەوێڵەکان ئازارێکی ئەفسانەیی و لە وزەبەدەریان دەچەشت.

ئەو دەمەی مەهناز مارۆ مرد، غەزەلنوس جگە لەو ماڵە گەورەیەی باوکی کە خۆی و منداڵە خەیاڵییەکانی تیا دەژیان، دوو خانووی گەورەی دیکەشی هەبوو کە ئیرسی باپیرانی بوون. دوای تێپەڕینی شەش مانگ بەسەر مردنی مەهنازدا، چیرۆکی ئەو باغە ئەفسووناوییە سەیرەی کە ماڵی بە سەیفەدینی مارۆ و شەمسی ژنی چۆڵکرد، یەکێک بوو لەو چیرۆکە سەیر و بەربڵاوانەی لە هەموو جێگایەکی شاردا باسدەکرا، چیرۆکەکە دەماودەم گەیشتەوە غەزەلنوس. ماڵەکە وەک شوێنێکی سوکنا بە خێو و تارمایی ناوبانگی ڕۆیشت، پێشتر هیچ خانوویەک لە گەڕەکە دەوڵەمەندەکانی شاردا بەو جۆرە باس نەکرابوو، چونکە ئەو گەڕەکانە خەڵکێکی خوێندەوار و پارەداری تیا دەژیا کە پێیانوابوو تۆزی خورافەتیان لە خۆیان تەکاندووە، بەڵام وەرگەڕان و تێکچوونی ئەو ماڵە بۆ باغێکی ڕامنەکراو، چیرۆکێکی درۆ نەبوو، هەموو کەس بە چاوی خۆی دەیبینی.

سەیفەدین مارۆ کە دوای مردنی کچەکەی ماندوو و کەفتەکار دەینواند، سەیری لێهات کە ئێوارەیەکی درەنگ وەختی زستانی ساڵی نەوەدوسێ دەبایە کتوپڕ لە ساڵۆنی ماڵە تازەکەیدا پێشوازی غەزەلنوس بکات

کە بە ڕیش و چاویلکە و ویقارە بۆهیمییەکەیەوە بێ هیچ ڕێکەوتنێکی پێشوەخت، بۆ دیدارێکی گرنگ هاتبوو. مارۆ لە ناخی دڵدا ئەم مامۆستا غەمگینەی خەیاڵی بە گوناهبار دەزانی، ئێستا هەموو دونیا دەیزانی کە مەهناز بەر لە مردنی عاشقی ئەم پیاوە دەروێشناسا سالوکە بووە. لە قووڵایی دڵیدا حەزیدەکرد سەر بەو باڵە مەدەنییەی حیزب نەبایە کە باس لە ئاشتی و مافە بنەڕەتییەکانی خەڵکی سڤیل دەکەن، ئاواتی دەخواست لەو باڵە سەربازییەبایە کە تەنیا باوەڕیان بەتۆڵەیە، لە دڵەوە حەزیدەکرد نەجۆ ئەشکانی ڕۆژێک تۆڵە لەم پیاوە بکاتەوە کە دەرگای دۆزەخی لە خۆی و ماڵ و منداڵی خستە سەر پشت. سەیفەدین مارۆ کە لای هەموو کەس خۆی وەک کۆتری ئاشتی نیشاندەدا، نەیدەویست لە چاوی هەوادارانی دیموکراسییەت و لایەنگرانی حیزبەوە وەک پیاوێکی توندڕەو دەربکەوێت، بە ناچاری دانی بە خۆیدا گرت و ئازارەکانی خۆی لە دڵیدا پەنهانکرد و بە ویقاری پیاوێکەوە کە خۆی وا دەردەخات هەرگیز عەقڵی خۆی لە دەست نادات و ناهێڵێت عاتیفە بیشکێنێت، پێشوازی لە غەزەلنوس کرد. دەبێت بڵێم خانمی شەمس دوای خۆسووتاندنی مەهناز مارۆ، بە پێچەوانەی سەیفەدینەوە، هەموو دەرد و نەگبەتی خێزانەکەی دەگێڕایەوە بۆ نەجۆ ئەشکانی و بێڕەحمی لە ئەندازە بەدەری سەیفەدین مارۆ. بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا بیری لەوە کردەوە سەیفە جێبهێڵێت و چەند ساڵێک بخزێتە کونجێکەوە و بۆ کچەکەی بگری. وەلێ فشاری کەسوکار، دەنگەدەنگی ژنانی ناسیاو، نەهی شێخ و مەلا پەشیمانیانکردەوە. دوای مردنی مەهناز سەرۆکی حیزب کۆشکێکی پێشکەش سەیفەکرد لە ساڵانی نەوەدەکاندا بێوێنەبوو. مارۆ بە خۆی و ورگییەوە بوویوو بە یەکێک لەو ئیداری و سیاسەتمەدارانەی لە ناو حیزیدا شوێنێکی بەرچاوی هەبوو، کەمەکەمە خەریک بوو دەبووە بەرپرسی تەواوی بودجەکان، خۆی فایلی حیساباتی گومرگی لەگەڵ سەرۆکدا تاوتوێدەکرد، خۆی سەرپەرشتی

ئـەو عەقاراتانـەی حیزبـی دەکـرد کـە کـەم کـەم گەورەدەبـوون و لـە ڕێـژە نەدەهاتـن. سـەیفەدین لـەو ماوەیـەدا تەنیا موڵکـی کڕیبـوو، بـۆ خـۆی و بـۆ حیـزب، بـەڵام موڵکـی نەفرۆشـتبوو. سەرسـام بـوو کە تێگەیشـت غەزەلنـوس هاتـووە خانـووە دێرینەکـەی لێبکڕێت. شـەش مانـگ بـوو بۆ کڕیارێـک دەگەڕا و دەسـتی نەدەکـەوت، بـەڵام ئێسـتا ئـەم دوژمنـە ناشـیرینە، ئـەم سـالوکە بـە کراسـە زەیتونـی و چاویلکـە بچوکەکانییـەوە هاتـووە ئـەو خانـووە بکڕێت. نەیدەزانـی بڵێـت چـی، گـەر بـەم کڕیـارە ڕازی نەبایـە، دەیزانـی ئاسـان کەسـی تـری چنـگ ناکەوێت، لـە دونیـادا کڕیارێـک نییـە خانوویەکـی وەهـای بوێـت ژوورەکانـی پڕبـن لـە گـژ و گیـا، لـە درەخـت و باڵنـدە، پەنجەرەکانـی دانەخرێـن، بۆنـی دارسـتانێکی شـێت لـە دەرو دیـواری بێـت، پڕبێـت لـە جـۆرە شـەوقێکی تێکـەڵاو لـە ڕەنگـی خـۆر و تریفـە. بـەڵام بـە سـەرێکی دیـش هێنـدەی ڕق لـە غەزەلنوسـە، فرۆشـتنی هـەر شـتێک بـەو غەمگیـن و دڵگرانـی دەکات. لـە ناخـی دڵیـدا واتێگەیشـت غەزەلنـوس نایەوێـت ئـەو خانـووەی لێبکڕێـت، بەڵکـو هاتـووە مەهنـازی بـە مردوویـی لێبکڕێتـەوە. بێئـەوەی هیـچ گفتێکـی تەواوبـدات، بـە شـێوەیەکی دۆسـتانە ماڵاوایـی لـە غەزەلنـوس کـرد، بـە جۆرێکـی دیبلۆماسـی بـۆی پێکەنـی و گووتـی لەگـەڵ شەمسـی خێزانمـدا بـە وردی تاوتوێیدەکەیـن. «ئـەوکات وشـەی تاوتـوێ تـازە پەڕیبـووە سـەر زمانـی سیاسییەکان، سـەیفەدین مـارۆ بـە ڕاسـت و بـە هەڵـە بەکاریدەهێنـا». سـەیفە لـەو پیاوانەبـوو لـە ڕاگەیاندنـی حیـزب بـەولاوە گوێـی لـە هیچـی تـر نەدەگـرت، بڕیاریدابـوو تەنیـا بـاوەڕ بـەو شـتانە بـکات کـە حیـزب دەیڵێـت، لەبەرئـەوە هەرچـی وشـەیەکی نـوێ بهاتبایاتـە ڕاگەیاندنـی حیزبـەوە، یەکەمیـن کـەس ئـەو بەکاریدەهێنـا.

کـە غەزەلنـوس ڕۆی، شـەمس لـە دڵـی خۆیـدا بڕیاریـدا ئەگـەر ئەمجـارە کوشـتوویانە دەبێـت کارێـک بـکات ئـەو خانـووە بـۆ غەزەلنـوس بێـت، ئەگـەر کچەکـە بـە زیندوێتـی بـە عەشـقی خـۆی نەگەیشـت دەبێـت بـە مردوویـی

پێیبگات. دڵنیابوو غەزەلنوس بەم کرینە، ئەو هەڵە کوشندەیە دەسڕێتەوە کە لە دواهەمین ڕۆژەکانی ژیانی مەهنازدا کردی، کاتێک فەرامۆشیکرد و بێباکانە تەسلیمی چارەنوسێکی ڕەشی کرد، کچە هەرزەکارێکی عاشق کە خۆشەویستییەکی بێئومێد شێتیکردبوو، مرد و هیچ کەسێکیش لەم دونیایەدا تێینەگەیشت، هیچ کەسێک. کە غەزەلنوس ڕۆی، شەمس وەک خۆی بۆ جەنگ تەیارکردبێت، چووە بەردەمی سەیفە و وەک فەرمانێکی بڕاوە و ترسناک دەربکات گووتی « ئەو خانووە دەفرۆشیت بەو کوڕە، هیچ نەبێت پیاوێکی هێندە بە هۆش و ئینسافە نایەوێت یادگاری کچەکەت بکەوێتە دەستی کەسێک نرخی نەزانێت» . سەیفە بێئەوەی هیچ بڵێت، لەسەرەخۆ خۆی گۆڕی و ویستی بچێتە دەرەوە. کاتێک بۆ بەستنی بۆینباخەکەی، چووە بەردەم ئاوێنەی ژووری نوستنەکە، لە دڵەوە دەگریا... بێویستی خۆی دەگریا. هەرگیز برینی مردنی مەهناز لە دڵیدا ساڕێژ نەبووبوو، هەموو دونیا دوای مەهناز هیچ نەبوو جگە لە درۆیەکی گەورە کە خۆی پێ هەڵدەخەڵەتاند، هەندێجار کە لەگەڵ سەرۆکدا دادەنیشت خاتیرەیەک یان وێنەیەکی مەهناز بە بەردەمیدا ڕادەبورد و هەموو خۆشی دونیای دەکوژاندەوە. ئێستا هەندێک ڕۆژ بە دزی شەمسەوە دەچووەوە بۆ ئەو ماڵە کۆنە، لەوێدا لە بەردەرگای ژوورەکەی ئەودا دەوەستا و مەهنازی دەهێنایەوە پێشچاوی خۆی... لە ناو درەخت و گیا و باڵندەکاندا دەوەستا و دەگریا. بۆ ئەوەی لەو خولیا جەهەنەمییە ڕزگاری بێت، هەرچییەکی کردوە دەبایە ئەو خانووە بفرۆشێت. دڵنیابوو کوشتنی غەزەلنوس ئاسوودەی ناکات، گەر بیزانیبایە لە ناوبردنی ئەم پیاوە ئاسوودەیدەکات، دەیکوشت، بەڵام دڵنیابوو ئاسوودە نابێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەیویست بیکوژێت، ئەوە وەک خواستێکی نهێنی هەر لە ڕۆحیدا بوو. ئێوارەیەکی ساردی زستان بوو بە تەنیا پیاسەیەکی بە ئوتومبیلەکەی کرد، دوو مانگ بوو بێ

پاسەوان نەدەچووە دەرێ، بەڵام ئێستا حەزیدەکرد بە تەنیا کەمێک بڕوات. ماوەیەک بوو بە هۆی قەڵەوی بەردەوامەوە تووشی دڵ ئێشەی کتوپڕ دەبوو، لە ناو ماشێنەکەیدا عارەقەی دەردەدا و خاودەبووەوە و لە ماندوویێتی و غەمدا وەک پیاوێکی نیوەهۆش ئوتومبیلەکەی وەک عەرەبانەیەکی کۆن کە کۆمەڵێک ئەسپی نەخۆش ڕایکێشن، دەئاژوو. ئەو ڕۆژە وەک تەسلیمی قەدەرێک بێت، وەک لە هەموو شتێک ڕابکات، وەک دڵنیابێت ناتوانێت لەسەراب و پوچی دەربازی بێت، بە خۆی و ئەو ورگە ناشیرینەوە کە قەدەر بۆی بڕیبووەوە بڕیاریدا ئەو خانووە بدات بە غەزەلنوس و ئیدی وابزێ وەک ئەوەی لە ژیانیدا کچێکی نەبووبێت ناوی مەهناز بووبێت. سیاسەت فێری ئەوەی کردبوو چۆن بۆ پێشەوە ڕابکات، ئێستا دەیویست قاچە کورت و گۆشتن و سستەکانی هەڵگرێت و بە گریانەوە ڕابکات، تا دەتوانێت ڕابکات، بۆ جێگایەک بتوانێت ببێتە کەسێک بە ڕابوردوویەکی ترەوە.

دوو ڕۆژ دوای ئەوە، کلیلەکانی دایە دەست غەزەلنوس و بڕیاریدا تا هەتاهەتایە ژیانی خۆی بۆ حیزب تەرخانبکات. غەزەلنوسیش هەر دوو موڵکەکەی خۆی فرۆشت و کلیلەکانی ئەو ماڵەی لە سەیفەدین مارۆ وەرگرت و لە شەوێکی زستانی ساڵی نەوەدوسێدا بۆ یەکەمجار چووە ئەو ماڵەوە. غەزەلنوس دەیان جێگای عاسی و دەیان کوچەی خەیاڵی و دەربەندی پڕ تەلیسمی بڕیبوو، هەستی بە ترس نەکردبوو، بەڵام ئێستا لە حەوشی ئەو ماڵەدا سامێکی بێوێنە دایگرت. بایەکی خێرا لە دەرەوە یاری بە دونیا دەکرد، وەک دەستێک بەرەو ژوورەوە ڕایکێشێت، تەوژمێکی گەورە بەرەو ناوەوە بردی. ساڵۆنەکە بووبوو بە نیشتەجێی گیا و درەخت، چەندین باڵندەی ئارام و خەوتووی لە ناو درەختەکاندا بینی، هەمان ئەو باڵندە خەیاڵییە سەیرانەبوون کە لە وانەکانی خەیاڵدا ئەو و مەهناز بە یەکەوە دروستیانکردبوون، هەمان ئەو

گوڵە دڕندە و گەورانە بوون کە دواجار بۆنە خەیاڵییەکەیان مەهنازی بۆ شوێنی نادیار ڕاکێشابوو. سەرتاپای ماڵەکە وەک جەنگەڵێک وەهابوو، لە دوورەوە هاتبێت و بە پەلامارێکی کوتوپڕ ئەو ماڵەی داگیرکردبێت و نەیەوێت چۆڵیبکات. پلەکەکانی قاتی سەرەوە ڕووەکێکی شێت و پەلکێش گرتبوونی، تیشکێکی مات لەسەرچاوەیەکی نادیارەوە هەموو شتێکی ڕۆشندەکردەوە، بە هێمنی بە ناو گیاکاندا تا ژوورە کۆنەکەی مەهناز سەرکەوت. چەندین مانگ لەوەوبەر ژوورێکی ئاسایی بوو وەک هەر ژوورێکی تری دونیا، ژووری ناسکی کچێک هێند نەبوو لە دونیای منداڵی ترازابوو و پێیخستبووە جیهانی گەورەکانەوە. کەچی گەورە بێڕەحمەکان، ئەوانەی تێناگەن گەنجێتی و منداڵی چییە، بەو جۆرە ترسناکە پێشوازیان لێکردبوو. مامۆستاکان لەوێدا مەهنازیان چەوساندبووەوە، بچوکیانکردبووەوە، تواناو هۆشیان ئیفلیجکردبوو. غەزەلنوس کە دەرگای ئەو ژوورەی کردەوە، لەبری ژوور، باغێکی بێسنووری بینی، باغێکی ڕۆشەن و دابڕاو لە دونیا، پڕ گوڵی پەمەیی گەورە گەورە، جێگایەکی بێوێنە لە جوانیدا کە وەک ئەوەی تەلیسم و ئەفسانە بێت تا ناکۆتا درێژ دەبووەوە، ئەوە باغی خەیاڵە ئەفسوناوییەکانی مەهناز بوو کە دوای مردنی خۆی لەویادا بەجێمابوو. کە غەزەلنوس بەو باغەدا گەڕا لە خۆی پرسی دەبێت سەعید بایۆ و مامۆستاکانی دی زانیبێتیان باغێکی وا سیحراوی و خەیاڵی لە دڵی مەهنازدایە؟ دەبێت چەند مرۆڤی وەک مەهناز هەبێت کە لە دەرەوە بێبەهرە دیارن و لە ڕۆحیاندا باغی وەها سیحراوییان هەڵگرتووە؟ غەزەلنوس بە درێژایی شەو لەو باغە خاڵی و غەمگینەدا سوڕایەوە، باغێک بوو پڕ لە گوڵی درەوشاوە، پڕ لە باڵندە کە تا هەتاهەتایە دەفڕین و دەیانخوێند. غەزەلنوس هەستیکرد ئەم باغە سیحراوییە بەرتەقای موڵکی هەموو زەمینە. لەوێدا دەیتوانی نزیک لە ڕۆحی مەهنازەوە بژی، دەیتوانی تا هەتا هەتایە سەیری جوانی ئەو کچە

بکات، جوانییەک دوای خۆی لە وێنەی باغێکدا جێبهێشتبوو. دڵنیابوو مەهناز ئەو باغەی بۆ ئەو بەجێهێشتووە... لە ڕۆژی سووتانی ئەوەوە ئاسوودەگی نەبینیبوو، بە ئەرکێکی ڕۆحی گەورەی دەزانی لەم باغەوە نزیک بێت، ئەمە باغی ئەو بوو، باغی غەزەلنوس بوو، گەورەترین دیاری بوو لە هەموو ژیانیدا مەخلوقێک پێشکەشیکردبێت. دیارییەک وەک موڵکێکی ئەفسوناوی دەمێنێتەوە.

بیرۆکەی کتێبی مردن لە سەری غەزەلنوسدا یەکەمجار لەناو ئەو گوڵە پەمەییە گەورانەدا، لە نێوان ئەو گەڵا سەوز و پان و بۆندارانەدا لەدایکبوو. لەو باغەدا هەستیکرد دەبێت چیرۆکی مەهناز و ئەم باغە بنوسێتەوە. دوای ئەو بۆنە ترسناکانەی سووتان ئێستا ئەم باغە گەورەیە بانگیدەکات و خۆی بۆ دەکاتەوە. دڵنیابوو ئەم لالەزارە پەمەییە، بەشێکە لە ڕۆحی ئەو، بەشێکە لە جیهانی ئەو کچە ناسک و پاکە و دوای مردن بۆ ئەوی بەجێهێشتووە. ئێستا دڵنیابوو هەموو مرۆڤێک باغێکی وەهای لە ناودایە، بەڵام کەم مرۆڤ هەن بتوانن باغچەکەی ناو خۆیان بۆ ئەوانی دی جێبهێڵن. مەهناز ئەمسەرەوسەری حەقیقەت و خەیاڵی نیشاندەدا، داوای لێدەکرد وەک چۆن بۆنی مردنی بۆ هەڵگرتووە، ئەو باغەشی بۆ هەڵگرێت. ئێستا دڵنیابوو مەهناز بەم باغە گەورەیە، پێیدەڵێت «غەزەلنوس تەماشاکە، تۆ باسی خۆشەویستی خەیاڵی دەکەیت، من خۆشەویستی ڕاستەقینەت نیشاندەدەم».

ئێستا دڵنیابوو بەبێ خۆشەویستی ئەستەمە مرۆڤ بتوانێت لە خەیاڵەوە بێتەوە بۆ ڕاستی و لە ڕاستییەوە بچێتەوە بۆ خەیاڵ، ئەو سەردەمانێکی درێژ تەنیا گەڕیدەی خاکە بێپەیی و عەردە بێکەرانەکانی خەیاڵ بوو، ئێستا لە نێو گوڵە ئەفسانەییەکانی باغی مەهنازدا دەوەستا و لە ژێر کاریگەری ئەو سیحرە سەیرەدا کە خەیاڵ لە ڕۆحیدا جێیدەهێشت، بڕیاریدەدا شتێک بۆ ئەم دونیایە بکات. دەبایە ئەو ڕێگایە

تەواویکات کە لە خەیاڵەوە دەستی پێکردبوو، دەبایە حەقیقەتی ئەم باغە بنوسێتەوە. بەڵام دەبایە لە کوێوە دەست پێبکات؟ نەیدەزانی.
تا ئەو شەوەی لەگەڵ تریفە یابەحریدا و لەو باغەدا یەکتریان نەبینی و پێکەوە بڕیاریانِدا کتێبێک دەربارەی مردن بنوسن... درێژترین کتێبی دونیا... نەیدەزانی دەبێت چی بکات.

## شەوێك لەگەڵ ئەفسانەدا
## «ماجەلانی ڕاستەقینە - ئابی ٢٠٠٤»

چاوەڕوانی ئەوەبووم مورتەزای شەیتان دەربکەوێت، بەڵام دەرنەکەوت. پێنج ڕۆژی سارد و بێدەنگ تێپەڕین. وەک ئەوەی بیەوێت یاری بە دڵم بکات... ئاە ئەی دڵەی سەبوور، ئارام بگرە... دڵنیابووم ئەوان نازانن من کێم، جگە لەو زانیاریانەی خاوەن ئوتێلەکە دابووی بە ئاسایش هیچی دیان لەسەر من نەدەزانی، چاکترە هیچ شتێک لەسەر من نەزانن. لەبەرئەوەی لەم مەملەکەتەدا گەر مرۆڤ وەک خاوەن نهێنییەکی گەورە دەرنەکەوێت، کەس حورمەتی ناگرێت. گەر نهێنییەکم نەبێت، هەمووان بە پیاوێکی بچوک و بێحورمەت لەقەڵەممدەدەن، بە چاوی سووک سەیرمدەکەن. بەڵام من جگە لە دەنگی ئەو ئافرەتە سیحربازە کە بەردەوام چرپەکانی لە گوێمدا دەزرینگانەوە، نهێنی گەورەم نەبوو. ئەی ئومێدی بەباچووم، دەشێت باران شوکوریش نهێنی بێت؟ دەشێت؟ بەڵام نازانم، هیچ شتێک تێناگەم و هیچ شتێک نازانم. لەو پێنج ڕۆژەدا دووجار ئەفسانەم لە پێشەنگدەری ئوتێلەکەدا بینی، هیچ جارێک قسەی لەگەڵدا نەکردم، هەموو شەوێک دەرگای ژوورەکەم بە کراوەیی جێدەهێشت و چاوەڕوانمدەکرد، بەڵام هیچ شتێک ڕووینەدا. لەم سەر زەمینەدا هیچ

لەوە ترسناکتر نییە ژن و پیاوێک بەرابەر یەکتری بوەستن و هیچ شتێک لە نێوانیاندا ڕوونەدات، ئەوە ئیدی قیامەت و کۆتایی دونیایە، دەبێت شتێک ڕووبدات، شتێک، هەر چییەکە گرنگ نییە، بەڵام دەبێت شتێک ڕووبدات. من بە دڵەی سەبووری خۆم گووت چاوەڕوانبکات، تێمگەیاند کە شتێک ڕوودەدات... شەوی شەشەم، لە نزیکی سەعات سێی بەیانیدا لەسەرەخۆ دەرگاکەی کردەوە و هاتە ژوورێ، بۆنێکی ئەفسوناوی هەبوو، لە هیچ شوێنێکی دونیادا ئافرەتێکم نەبینیبوو، بۆنێکی وەها سەیر و هەژێنی هەبێت. چراکەی دانەگیرساند و لەسەر لێواری قەرەوێڵەکەم دانیشت. نیمچە ڕووت لە ناو جێگاکەمدا چاوەڕوانمدەکرد، هەستم بە دەستە ناسک و ئەفسوناویەکانی کرد لەسەر شانم، دەستی ژنێک پەنجە لە هەر شتێک بدات دەیکات بە پارچەیەک خەیاڵ. کە دەستی لێدام، وەک لە ئەستێرە دروستبووبم درەوشامەوە. وەک ئەوە بوو هەست بە تەوژمێکی ئەفسوناوی بکەم بە ناو ڕۆحمدا، وەک یەکەمجاربێت ژنێک لەسەر ئەم ئەستێرەیە دەستم لێبدات، جۆرە ساردییەک و خاوبوونەوەیەکی تەلیسماوی لەشی داگرتم. بە ئارامییەکی بێوێنەوە دەستیم گرت، هەردووکمان بێدەنگبووین. هەموو ئەوانەی شارەزای ئافرەتن دەزانن ئەو بێدەنگییە چییە، دەزانن ئەوە قورسترین و سەختترین ساتی دونیای ژن و پیاوە، لەو بێدەنگییەدا ئەوەی قسەدەکات نێر و مێ خۆیان نین، بەڵکو شتێکی ترە، هەندێجار دەڵێم ئەوە نهێنی وجودە لەو بێدەنگییەدا وەستاوە، هەندێجاریش دەڵێم، نا... نا، ئەوە دووری و ترس و شەرمە زمانمان گرێدەدات، هەر دوو ڕۆحلەبەرێک ئەو ساتە ببڕن دەتوانن پێکەوە دوور... زۆر دوور بڕۆن، من ئامادەی ئەوە بووم بۆ دوور بڕۆم، زۆر دوور، دوورتر لەو جێگایەی عاشقەکان باسیدەکەن، من بە دوای هەناسەی ئەو ژنەدا تا قووڵایی جەهەنەمیش دەڕۆیشتم. من لە مێژبوو ئەم وڵاتەم ونکردبوو، نەمدەزانی چی ڕاستە و چی هەڵە، بێئەوەی کاتی ئەوەم

هەبێت بیر لە هیچ بکەمەوە، هەستمکرد بە ئەندازەیەک لێم نزیکە گوێم لە دەنگی هەناسەیەتی. نازانم چ یەکێک لە ئێمە هەوایەک زیاتر هاتە پێشیٚ بەجۆریٚ ڕێگا بۆ یەکەمین ماچ خۆشبکات. هیچ شتێک لەم سەر ئەستێرەیە لە یەکەمین ماچ ئەفسوناویتر نییە، لەگەڵ یەکەمین ماچدا شەریعەت و دەستووره ترسناکەکانی دونیا بێدەنگدەبن. هەموو شتێک دەوەستێت و ئیدی ناوەوەی مرۆڤ، قووڵایی دڵی، ئارەزووە ڕاستەقینەکانی قسەدەکەن. یەکەمین ماچی نێوان من و ئەفسانە لەو ماچانەبوو کە ژیان دەگۆڕن، وادەکەن دونیا پێش ئەو ماچە و دوای ئەو ماچە هەمان شت نەبێت. من گووتم ئەی دڵ بێدەنگ بە و ئەی لەش هاواربکە. باسی ناسکی لێوی ناکەم، باسی ئەو تەزووە ساردانە ناکەم کە ڕۆحی ئەوی بە منەوە گرێدا، باسی ئەو دەستە باریک و قامکە گوڵئاسایانەی ناکەم کە هێنای بە قژمدا، باس لەوە دەکەم کە یەکەم ماچ، یەکەمین تاقیکردنەوەیە دوو لەش پیادەڕۆن، لەو ماچەدا ئاشکرادەبێت چەند دەتوانن تێکەڵاوی یەک بن، چەند دەتوانن لەیەکەوە نزیکبن. لەو ساتەدا کە هێشتا فاسیلەیەکی زۆر کورت لە نێوان لێوانماندا بوو، فاسیلەیەک نە بە کات و نە بە پێوانە حیساب ناکرێت، فاسیلەیەکە تێیدا لێوەکان بەریەکدەکەون و ناکەون، من ناوی دەنێم مەودای ڕۆح، جێگایەکە هێشتا گۆشتی ئادەمییەکان تەواو لە یەکی نەداوە، بەڵام ڕۆحەکان بەخێرایی یان بەرەو ڕووی یەکدەڕۆن، یان لە یەکدی جیادەبنەوە. ئا لەو فاسیلەیەدا هەستم بە ڕاکێشان و جەزبێکی فشارهێن و بێپەروا کرد، دڵنیابووم لەو سەری زەوییەوە بۆ ئەم ماچە هاتوومەتەوە. وەسفکردنی خودی ئەو ماچە ڕەنگە سەختترین شتی ژیانی من بێت. ئاه، دەزانم ئێوە وا تێدەگەن من لە وەسفی ئەو ماچەی نێو تاریکیدا زیادەڕۆییدەکەم، واتێدەگەن ماچێکی ئاسایی ناو تاریکیتان وەک موعجیزەیەک بۆ وەسفدەکەم، بەڵام ئێوە هەڵەن، هەڵەن. مرۆڤ لە مێژووی خۆیدا هەرگیز

نەیتوانیوە بە قووڵی باسی یەکەمین ماچی خۆی بکات، نە نوسەرە گەورەکانی ئەم سەر زەمینە، نە ئەفسانەکانی مرۆڤ، نە فلیمە سیحراوییەکان، هیچیان ئەفسونی ئەو ساتەیان بە قووڵی نەگواستۆتەوە. شەو بوو، من و ئەو ماچماندەکرد، من و ئەو خیانەتمان دەکرد، ئەو هەستەی کە خیانەتدەکەیت سیحراویترین هەستی ناو مرۆڤە. ئەو دەیزانی خیانەت لە چی دەکات، بەڵام من نەمدەزانی، ئەو خیانەتی لە مێردایەتی و پاکی دەکرد، بەڵام من خیانەتم لە هەموو ئەو ڕابوردووە سەیرەی خۆم دەکرد، کە خاڵی بوو لە هەر پردێک لە نێوان ڕۆح و لەشمدا. بەدرێژایی ژیانم لەگەڵ هەر ئافرەتێکدا خەوتبێتم، لەشم لە جێگایەک و ڕۆحم لە جێگایەکی تر بووە، هەمیشە گووتوومە ئەی ڕۆح بڕۆ و لێم دوورکەوەرەوە، بڕۆ و جارێ ڕوخساری خۆت دەرمەخە. تا ئەو شەوە بە ڕۆح لەگەڵ هیچ ژنێکی دونیادا نەخەوتبووم، لە ژیانمدا ڕۆحی خۆم نەبردبووە ناو پێخەفەوە. بەڵام ئێستا نا، یەکەمین ماچی من لەگەڵ ئەفسانەدا، لەو ماچانەبوو کە مرۆڤ لەگەڵیدا خۆی دەدۆزێتەوە. گەر بیستوچوار ساڵ لەمەوبەر ئەم ژنەم بدیبایە ئەم وڵاتەم چۆڵ نەدەکرد، بیستوچوار ساڵ بوو بە سوار ماتۆڕەکانەوە لەسەر شەقامە دووروردرێژەکانی دونیا بۆ نیشتیمانێک و بۆ ئافرەتێک دەگەڕام، ئەو شەوە کە ژنی خائینی ئەو خاوەن ئوتێلەم ماچکرد، هەستمکرد ئافرەتێکم دۆزیوەتەوە کە لە ئەزەلەوە بۆی دەگەڕێم، هەستمکرد ئەم بوونەوەرە چکۆلانە و ناسکە خودا بۆ منی دروستکردوە و ئەم خاوەن ئوتێلە ناشیرینە دزیوێتی، هاودەمی منە و ئەو فڕاندوێتی. ئێوە نازانن مَن باسی چیتان بۆدەکەم، ئەو خانمێک بوو سیحری هەموو ژنی دونیا لە مەلمەسی ناسکی دەستیابوو، دەستدانێکی بچوک لە مەمکەکانی وەک دەستدان وابوو لە سیحری هەموو گەردون. چرپەکانی لە گەرووییەکی کەمێک نوساوەوە دەهاتنەدەرەوە، نوسانێک سەیرترین مۆسیقای تێدابوو. جاویدانە

ئەو مرۆڤەی ماچ وەها ببیات فرێیداتە دەرەوەی زەمان. من نازانم چۆن مرۆڤ لە ماچەوە بەرەو شێوەکانی تری عەشق دەگوازێتەوە، لەگەڵ هەر ئافرەتێکدا خەوتبێتم ئاگاداربووم، هەستمکردوە هوشیار و بەخەبەرم، گەر لە پێخەفدا بەئاگا و هۆشمەند بوویت، ئەوا سیحری یەکەمین ماچ وەها بێهۆشی نەکردویت زەمین و ئەفلاکت پێفەرامۆشبکات. من ئەو شەوە تاکە شەوی ژیانم بوو لە پێخەفدا خۆم لەبیرکەم، هێندە دەزانم لەسەرەخۆ، بە ئیشێکی ورد و دووروودرێژ ڕووتبووینەوە، شتێک لە نێوان لەشی من و لەشی ئەودا بوو لە عەشق قووڵتربوو، وەک گێژەنێکی ڕەنگین، بەڵام پڕکێش و تابنبەر. من و ئەو سیحری ئارەزوویەکی گەورە کێشیدەکردین، ئەوەی ببینە دوو لەش تا ئەندازەی خەیاڵ یەکتری بدەینە دەست یەک. من بەبێهۆشی دەمتوانی لەشی ئەو لە تاریکیدا ببینم، ئەو ئارەزووەی لەشی من و ئەوی دەدا لەیەک لە عەشق بەهێزتربوو. من زوهدی شازەمان هەرگیز باوەڕم بە عەشقی یەک لایەنەی جەستە یاخود ڕۆح نەبووە، عەشق شتێکە نە تەنیا بە جەستە و نەتەنیا بە ڕۆح ناکرێت، بەڵکو تاکە شتێکە هەردوو هێزە ترسناکەکەی ناو مرۆڤ تیایدا دەبێت بە جۆرێکی بێوێنە تێکەڵبن. لە خۆشەویستیدا گەر لەش نەیەتە ناو گەمەی ڕۆحەوە، ڕۆحەکان وندەبن و ناگەن بەیەک، گەر ڕۆحیش نەخزێتە ناو گەمەی لەشەوە، ئەوکات لەشەکان بێزاردەبن و دووردەکەونەوە. عەشق تاقینابێتەوە تا لەش بەیەک نەگات، ڕۆح بە تەنیا هێزی ئەوەی نییە خۆشەویستی بپارێزێت. هەڵەیە مرۆڤ وا تێبگات مرۆڤ تەنیا لە پەیوەندی ڕۆحەوە دەست پێدەکات و دواتر دەگاتە جەستە. نا، زۆرجار بە پێچەوانەوە دەبێت سەرەتا لەش قسەبکات، تا ڕۆحەکان بتوانن پرد هەڵبەستن و لەیەکدی نزیکببنەوە. بە ڕای من گەورەترین دوژمنانی ڕۆح ئەوانەن کە ڕقیان لە جەستەیە. من ئەو شەوە کە لەگەڵ ئەفسانەدا ڕووتبوومەوە، کە دەستم بەر ئەو پێستە ئەسمەرەی کەوت، کە لێوم

گەیشتە عاسیترین جێگاکانی لەشی، کە تامی هەموو جوانییە ئەفسانەییەکانی ڕژایە سەر پەنجەم، کە بە ئارامی وەک کردنەوەی گوڵێک لە چڵێکی خەوتوو هەڵمگرت، وامدەزانی مانگ هەڵدەگرم، دەست لە تیشک دەدەم، پەنجەم بەر گەورەیی خالیق دەکەوێت. ڕووتبوو، پڕبوو لە ئارەزووییەکی ڕامنەکراوی ژنانە، ئارەزوویەک سنووری عەقڵ دەبەزێنێت و وەک خەیاڵێکی بێسنوور لە چاوی دەتکێت. هیچ شتێک لەم دونیایەدا لەو خەیاڵە قووڵتر و جوانتر و سافتر نییە کە لەکاتی پێکەوەخەوتندا لە چاوی ژنێک دەتکێت. هیچ شتێک لەو ئارەزووە سیحراویتر نییە کە لە ناکاو لە پەنجەکانتدا وەک تەزووییەکی ئەهریمەنکرد لە خەو هەڵدەستێت، هیچ شتێک لەو وشانە عاسیتر نیین کە لە نێوان لێوێکی تینوو و لەشێکی ئامادە و کراوەدا دروستدەبێت، شتێکە ناخرێتە ناو پیت و لە هیچ دەنگێکی دونیادا جێگای نابێتەوە. چەند هەوڵبدەم تامی ئەو خانمە پڕ چرپەیەتان بۆ باسبکەم، سیحر و ئارەزووی ئەو ژنە خائینەی خاوەن ئوتێلەکە بگێڕمەوە فێڵتان لێدەکەم، من و ئەو بە جۆرێک پێکەوەخەوتین هیچ زمانێکی سەر ئەم ئەستێرەیە ناتوانێت وەسفیبکات. یەکەمجاربوو هەستبکەم دەستدان لە ڕووتی ئافرەت مرۆڤ بۆ پلەیەکی بالاتر سەردەخات، لە ئاستێکی ڕۆحەوە بەرەو ئاستێکی بالاتر بەرزیدەکاتەوە. لەشی لە حەریرێک دەچوو، بە سیحری باغێکی دوور ڕەنگکرابێت، بۆنێکی هەبوو، مرۆڤ دەبێت هەموو گوڵی دونیا بۆنبکات، تا تێبگات ئاخۆ دەتوانێت ئەو بۆنە بدۆزێتەوە، دەنگێکی نەرم و نوساوی هەبوو، کە مرۆڤ دەبێت گوێ لە مۆسیقای هەموو دونیا بگرێت، تا بزانێت ئاوازی وەها ئەفسوناوی لەهیچ ئامێرێکەوە دێتەدەرێ. هەستمکرد ئەوە یەکەمین جارە لەگەڵ ژنێکی سەر ئەم ئەستێرەیەدا دەخەوم، پێشتر هەرچییەکم کردبوو، جۆرە خۆخاڵیکردنەوەیەکی میکانیکی و جۆرە عیشقبازییەک بوون بە ڕۆحێکی مردوو، بەڵام لەگەڵ

ژنی خائینی خاوەن ئوتێلەکەدا ئەوسەری خەیاڵم بینی، چوومە جێگایەک هیچ ئادەمیزادێک نەیبینیبوو. ئاه ئەی دڵ بێدەنگ بە... ئەی زار سرەوتی خۆت مەدۆڕێنە و ئارام بە.

کە تەواوبووم تەزووە سیحراوییەکانی لەشی ئەو ژنە ماوەیەکی درێژ لە لەشمدا بوو. دوای تەواوبوون بریسکەی سەیری ئەو تکە عارەقانەی سەر جەستەی وەک یاقووت سەرتاپای لەشی ڕوناککردبووەوە، هەموو شتێکی برۆنزی دەینواند. بە هێمنی وەک کەروێشکێکی ماندوو لەتەنیشتمەوە خەوت، لە مەخلوقێک دەچوو دوای جەنگێکی موبارەک خەوتبێت، وەک بێهۆشێک لە ناو گژو گیای باغچەیەکی تاریکدا کەوتبێت، بە نەرمی دەستی خستبووە سەر دڵی خۆی. دەترسام ڕۆژ هەڵبێت و مێردەکەی بەمجۆرە لە پێخەفی مندا بیدۆزێتەوە، بەڵام دڵم نەهات خەبەریبکەمەوە... ئامادەبووم بمرم و خەبەری نەکەمەوە. بێئیرادەی خۆم هەندێک لە دڵۆپە ناسکەکانی عارەقم لە دەوری ناوکی بە لێو سڕی، دەمویست عارەقەی جەستەی تامبکەم، ڕەنجی ئارەزووەکانی تامبکەم، چێژ لە ماندووبوونە پاکەکەی ببینم. تا دونیا ڕوناکبووەوە تەنیا تەماشای جەستەیم دەکرد، لەسەر پێخەفەکەم دادەنیشتم و لە لەشیم دەڕوانی، سانتیم سانتیم لەو سیحر و درەوشانەوە قووڵەی جوانی ئەو وردەبوومەوە. تا ئەوکات چەند جەستەی ڕووتم بینی بوو، هیچیان لە ڕێکی و هارمۆنییەتی و گونجاندا نەدەگەیشتنە ئەم لەشە چکۆلانە و لاواز و پڕ ئارەزووەی ئەفسانە. دەمویست تادەمرم هیچ نەکەم و تەنیا سەیری ئەو ڕووتییە سیحراوییەی ئەو بکەم، ئەو هەستەی من لە ناو جەستەیدا بووم، لە ناو قووڵایی ژنێتی و شەرمیدا بووم، لە ناو تەڕێتی وجود و شیلەی ژیانیدا بووم جۆرێک لە شانازی تیا دروستدەکردم. کە دەستێکی ناسکم بەسەر کەمەریدا دەهێنا، کە بە سەری پەنجە بە هێمنی ڕانە چکۆلەکانیم دەلاواند، کە بە دەستێکی گەورە ئەژنۆکانیم دەکردەوە، حەزمدەکرد

ڕۆژێک بێت بتوانم ئەو شەوە سەرتاپای بنوسمەوە، بتوانم حیکایەتی ئەو شەوە لەگەڵ ژنی خائینی خاوەن ئوتێلەکەدا بۆ هەموو دونیا بگێڕمەوە. بەڵام دەمزانی ئەستەمە مرۆڤ بگاتە ئاستێکی ئەوتۆ لە زمان و خۆشەرحکردندا، ئەو ساتە بە هەموو تەزوو و هەڵچوون و فڕینەکانیەوە بنوسێتەوە، هیچ پەڕەیەکی دونیا نییە بتوانێت بەرگەی وەسفێکی وەها بگرێت و نەسووتێت.

دوای سەعاتێک خەو، لە ناکاو خەبەری بووەوە. بێئەوەی هیچ بڵێت، بێئەوەی هەست بە پەشۆکان و ترس بکات، زۆر لەسەرەخۆ خۆی گۆڕی، بە ئارامییەوە جلەکانی ژێرەوەی لە بەرکرد، دەرپێ و ستیانێکی پەمەیی شێوە حەریری لە بەردابوو. زولفی بە جۆرێکی سەیر پەشۆکابوو، نیوە ڕووت لە بەردەممدا وەستا، وەک ئەفسونی خۆی لە چاومدا بخوێنێتەوە، بە ئەسپایی ماچیکردم و بەو دەنگە نوساوەی گووتی « دەبووایە وابووایە». تێنەگەیشتم مەبەستی چییە، هیچی دیکەشی نەگووت، تەواو خۆی گۆڕی، چەند جارێک دەستی بە قژیدا هێنا و بە ئەسپایی دەرگای ژوورەکەی کردەوە و چووەدەرێ. من وەک بێهۆشەکان، وەک ئەوانەی دەبورێنەوە خەوتم، کە بە ئاگا هاتمەوە خۆرئاوا بووبوو. ڕۆژێک بەسەر من و ئەفسانەدا تێدەپەڕی کەچی لەشم هێشتا گەرمی لەشی ئەوی تیابوو. خۆم شت و چوومە سالۆنەکە، لەوێبوو، دەستێک جلی نوێی ئێجگار قەشەنگ و گرانی لە بەردابوو، قژی وەک تاجێکی گەورە بەرزکردبووەوە، وەک هەمیشە بینینی مەستیکردمەوە، یەکەمجارم بوو هەستبکەم لە شێتییەوە نزیکم، زۆر زۆر لە شێتییەوە نزیکم، زۆر.

## تریفە یابەحری و غەزەلنوس
## ساڵانی ١٩٩٥ و ١٩٩٦

ڕۆژێک لە ڕۆژان تریفە یابەحری و غەزەلنوس لە بیمارستانی شاردا ڕێکەوتی یەکیان کرد. ئەو یەکدی بینینە سەرەتای نزیکبوونەوەی ڕاستەقینەی تریفە یابەحری و غەزەلنوس بوو. تریفە تا ئەوکات هیچ شتێکی لەسەر چارەنوسی مەهناز مارۆ نەبیستبوو، هەواڵی مردنی ئەو کچە بەستەزمانە، لە دڵەوە غەمگینیکرد. غەزەلنوس بە دەنگێکی ماندوو، وەک یەکێک ئازارێکی نهێنی لە ناوەوە بیخوات، یەکەیەکە دەردەکانی خۆی بۆ تریفە گێڕایەوە، باسی ئەو دوکەڵ و بۆکرۆزە سەیرانەی بۆ کرد کە ژیانی بەر نادەن، باسی گەشتی هەفتانەی خۆی بە بیمارستاندا و ئەو ژنە سووتاوانەی سەریان لێدەدات. بە کەساسییەکەوە کە ئێجگار جوانتر و ناسکتری دەکردەوە گووتی « لەم مەملەکەتەدا سیاسەت، عەشق، بیرکردنەوە، ئومێد، شەرەف، هەموو پێکڕا لە بیمارستاندا تەواودەبن... دوا وێستگەی گەشتی مرۆڤ ناو پێخەفەکانی ئەم بیمارستانەیە». تریفە یابەحری کە ئەو ڕۆژە سەردانی کیژێکی مافوورچنی نەخۆشی دەکرد، بە بینین و دەنگ و قسەی ئەم کوڕە وەها مەستبوو، وەک نەشتەرێکی پڕ مەی برینداریبکات وەها بوو. کەس نازانێت چۆن گەیشتنە ئەوەی پێکەوە سەردانی ژنانی سووتاو و خەڵکانی بیمار بکەن. تا ئەو کاتە تریفە یابەحری زۆرجار ئەو هێزە سەیرەی لە خۆیدا بینیبوو ئارامی و هێوری ببەخشێتە ئازارە کوشندە و قووڵەکان، بۆ ناکرێت ئێستا کەمێک ئاسوودەیی بدات بەم هەموو دەردەدارانە. خواستی ئەوەی لەم کوڕەش نزیکبێتەوە لە ناوەوە ڕایدەکێشا، بێئەوەی شەرم ئیفلیجیبکات غەزەلنوسی بۆ سەیرکردنی مافوورە خەیاڵییەکانی خۆی داوەتکرد و گووتی بەختەوەر دەبێت گەر بێت و هونەرەکانی خەیاڵی ئەو ببینێت. کاتێک غەزەلنوس یەکەمجار چوو بۆ کارخانەی نیا، بینینی ئەو وێنە و نەخشە سیحراوییانەی تریفە سەرسامیانکرد، وای هەستکرد لە زۆر شوێن و لە زۆر فەرش و لە زۆر جێگادا یابەحری هەمان ئەو نیگار و مەخلوقات

و شوێنانەی ڕەسمکردۆتەوە کە ئەو بە خەیاڵ بینیونی و بە ناویاندا تێپەڕیوە، بەلایەوە ئاسایی بوو کە زانی فەرشەکانی یابەحری گرانبەهاترین فەرشی شارن، هەتا لەو فەرشە فارسییە ڕەسەنانەی کاشانیش گرانترن کە باشترین وەستاکانی دونیا بە ئاوریشم دەیچنن. بینینی ئەو فەرشانە هۆیەکی گەورەبوو غەزەلنوس هەوڵبدات زیاتر لە نهێنی ئەو کچە تێبگات. چەند سەفەریکردبوو، چەند بە دونیادا گەڕابوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە هیچ شوێنێک ڕێکەوتی قاڵی و مافووری وەهای نەکردبوو. کە پێکەوە دانیشتن تێگەیشت مافوورەکانی خانمی یابەحری خەڵکانێک دەیکڕن پارەداری گەورە و بەرپرسی سیاسین. حەیفی لەوەهات کە مافوورە خەیاڵییەکانی تریفە وەها خەڵکێک لەسەری دادەنیشن بێخەیاڵترین بوونەوەری دونیان. تریفە تا ئەو کات هیچی لە دونیای ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان نەدەزانی، نەیدەزانی غەزەلنوس هاوڕێی ئەو مرۆڤە دوو کەرتانەیە کە نیوەیان لە حەقیقەتدایە و نیوەیان لە خەیاڵدایە. کاتێک بە هێمنی باسی دروستکردنی مافوورەکانی بۆ غەزەلنوس کرد، باسی ئەو سروت و فەزایەی کرد تێیدا فەرشەکان دروستدەبن، غەزەلنوس بەسەرسامی سەیریکرد و گووتی «خانم تۆ لە کارخانەیەکی خەیاڵیدا ئیشدەکەیت». ئەو ڕستەیە بۆ یابەحری وەکو ڕاچەنینێکی ترسناک وابوو، تا ئەو کات کارخانەکەی وەک شوێنێکی ئاسایی و بەشێک لە دونیا بینی بوو، بەڵام وەک ئەوەی لە ناکاو چاوی لەسەر ڕاستییەکی ترسناک بکرێتەوە شێوەی شتەکان لە پێشچاوی گۆڕان، لە وێنەی سمۆئاغای پاسەوانەوە کە هیچ نەبوو جگە لە ئاغایەکی خەیاڵی، تا وێنەی ئیشکەرە غەمگینەکان کە بەردەوام نوقمی خەیاڵی بێهودە و ناکام بوون، وەک کۆمەڵێک کەسی خەیاڵی هاتنە پێشچاوی. تریفە یابەحری سەیری چاوە غەمگینەکانی غەزەلنوسی کرد، سەیری ئەو قژە دەروێشئاسایەی کرد، سەیری ئەو ڕیشە ڕەشەی کرد. دواجار وەک کچێک بۆیەکەمجار هەست بە تروسکەی عەشق بکات

گووتی « غەزەلنوس، تۆ چیدەکەیت؟... حەقیقەتم بیردەبەیتەوە؟» .

ئەو ڕستەیە پردی ڕاستەقینەی تێکەڵاوبوونی ئەو دوو مرۆڤە بوو. کە لەو ساتەوە تامردن دەکەونە سەر خولیای خەونێکی نەکردە و ئەستەم، خەونێک دەشێت یەکێک بێت لە سەختترین خەونەکانی مرۆڤ لە مێژووی دوور و نزیکی خۆیدا، خەونی هەموو ژن و پیاوە گەورەکانی دونیا، خەونی هەموو شاعیر و پێغەمبەرەکان، خەونی ئەوەی بوونەوەرێکی خەیاڵی بیت و حەقیقەتیشیت بیرنەچێتەوە.

لەو ڕۆژە بەدواوە هەر یەک لە تریفە یابەحری و غەزەلنوس چەندین جار یەکدیان بینییەوە، غەزەلنوس هەندێجاری دیکە سەردانی کارخانەکەی کرد. پێکەوە سەردانی سەدان ژن و کچی دەردەداریان کرد، سەردانی دەیان خەڵکی بیمار و بێچارە کە لە چاوەڕوانی مردندا لەسەر قەرەوێڵەکانیان دەتلانەوە، تریفە دەست و پەنجەیەکی هێند سیحراوی هەبوو، کاتێک دەستی لە دەستی نەخۆشەکان دەدا، بۆ ماوەیەکیش بایە ئازارەکانیان هێوردەبووەوە. ئەوە سەرەتای ئەو پەیوەندییە ئاڵۆزو تەلیسماوییە بوو، کە بناغەی ئەم چیرۆکەی داڕشت کە ئێمە لە سەرەتاوە باسیدەکەین... هەستدەکەم لەو ڕۆژانەوە غەزەلنوس عاشقی خانمی یابەحری بوو، لەو کاتەوە کە سەیری ئەو میهر و سۆزەی لە چاویدا کردوە، کە سەرەنجی ئەو ئارامی و ئاسوودەگییەی داوە، کە بیماران بەدەست و پەنجەی ئەو هەستی پێدەکەن. چاری نەبووە، هیچ چارێکی نەبووە، جگە لەوەی خۆشیبوێت.

بەڵام چۆن چیرۆکەکەمان گەیشتە ئەوەی تریفە یابەحری و غەزەلنوس ماوەیەکی درێژ پێکەوە لە ژێر سەقفێکدا بژین، ئەوەتان بەمجۆرەی خوارەوە بۆدەگێڕمەوە.

لـە سـاڵی حەوتەمـدا جەوهـەر یابەحـری شـوێن و حەشـارگای تریفـەی دۆزییـەوە. لـەو حـەوت سـاڵەدا دونیـا زۆر گۆڕابـوو، فەوزیـە یاسـەمی سـاڵانە جارێـک یـان دووان سـەردانی تریفـەی کردبـوو، ئەوانـە خۆشـترین سـاتەکانی ئـەو دەمـەی تریفەبـوون کـە جارێکـی دی لـە باوەشـی پـڕ میهـری فەوزیـە یاسـەمییدا منداڵـی خـۆی وەک بەهەشـتێکی ون دەدۆزییـەوە. لـەو حـەوت سـاڵەدا جەوهـەر یابەحریـش بووبـوو بـە کەسـێکی تـر، چیتـر ئـەو شـێتە زنجیرپسـێنەی جـاران نەبـوو کـە بەوێنـەی گایەکـی هـار پەلاماربـدات، تێکەڵاوبوونـی بـە کاسـبە تـازەکان و خـاوەن قازانجـە نوێکان، حـەزی گەورەی بـۆ سـەرکەوتن و بەرزبوونـەوە، جۆرێـک لـە ئارامـی و هێمنییـان بەسـەردا سـەپاندبوو. دەیزانـی ویقـار و سـەبر و زمـان لوسـی بەرهەمیـان لـە تووڕەیـی و هێـرش و شـەڕانگێزی زیاتـرە. ڕۆژێـک کـە هـات بـۆ کارخانەکـە، مەبەسـتی نەبـوو شـتێکی خـراپ بـکات، چیتـر ئـەو کـوڕە نەبـوو لـە ناوەڕاسـتی بـازاڕدا چەقـۆ لـە خوشـکەکەی هەڵکێشـێت، بەڵکـو ڕێوییەکـی سـووربوو کـە یـاری ئاڵۆزتـر و بازرگانـی گەورەتـری دەکـرد. کاتێـک لـە ڕێـگای هاوڕێکانییـەوە چیرۆکـی فەرشـەکانی تریفـەی بیسـت، حەزیدەکـرد خـۆی نیشـانبدات و تـرس و سـامی خـۆی تاقیبکاتـەوە. لـەو سـاڵەوەی لەگـەڵ سیاسـەتمەدارەکاندا تێکەڵبوویـوو یەکەمیـن وانەیـەک فێریانکـرد ئەوەبـوو ترسـاندن لـە کوشـتن باشـترە، سـام دروسـتکردن لـە خوێنڕشـتن خێراتـر بەردەگرێـت. جەوهـەر لـەو شـەش سـاڵەدا سـامانێکی گـەورەی دروسـتکردبوو، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا هەمیشـە چـاوی لەسـەر ئـەو چەنـد دۆنمـە زەوییـە بـوو کـە باوکـی بـۆ تریفـەی جێهێشـتبوو. ئـەو بەشـێک بـوو لـە تۆڕێکـی گـەورە کـە چـەک و تفـاق و کەرەسـتەی سـەربازیان بـە نهێنـی لـە باشـووری عێراقـەوە بـەرەو ئێـران دەردەکـرد، لـە ئێرانـەوە بـاری گـەورە گـەورەی هەمەڕەنگیـان بـەرەو باشـوور دەگوازتـەوە، کەسـانی گەورەیـان لـە پشـت بـوو، بـە ماشـێنی زۆر

نوێ هاتوچۆیاندەکرد. ئەو ئێوارەیە کە لە کارخانەکەدا دەرکەوت، نیازی نەبوو هیچی دەستکەوێت، تەنیا قولاپێکی هەڵدەدا. هەڵسوکەوتی زۆری لەگەڵ سیاسیەکاندا فێری قولاپ هەڵدانی کردبوو. تریفە سەرەتا کە جەوهەری بینی خورپەیەکی کوشندەی تێگەڕا و ویستی هەڵبێت، بەڵام دەنگێک لە دەروونیَدا پێیگووت تریفە یابەحری لە چی دەترسیت، چیت هەیە بیدۆڕێنیت؟. ئەو ساڵە دووروودرێژانەی خەیاڵ لە ناوەوە دڵێکی تریان بۆ دروستکردبوو. دوائەوە لەو کارخانەیە زیاتر دەیتوانی بەرەو کوێ هەڵبێت؟ هیچ جێگایەکی نەبوو.

هەموو دەیانزانی تریفە یابەحری موڵکێکی زۆری هەیە، بەڵام شوێنی خراپی زەوییەکان و دۆخی خراپی خۆی دەرفەتێکی پێنەدەبەخشی سوود لەو موڵکانە ببینێت، ئێستا هێندەی نیگاری ناو مافوورەکان ماڵ و موڵکی ڕاستەقینەی ئەوبوون، هیچ پارچە زەوییەکی دونیا موڵکی ئەو نەبوو. تریفە لەو ڕۆحلەبەرە کەم و دەگمەنانە بوو کە هیچ سامان و تەلایەک، بەئەندازەی چنینی مافوورێک دەرفەتی ئازادبوون و فرین و مەستبوونی پێشکەش نەدەکرد. لای ئەو هەموو سامانە گەورەکانی دونیا کلیلی خەزنەیەکی خەیاڵیان نەدەهێنا کە چاوی مرۆڤ بەسەر زەوی و زەمانێکی تردا دەکاتەوە. ئەو ڕۆژە کە تریفە یابەحری جەوهەری بینییەوە هەستی بەهێزێکی گەورە کرد لە خۆیدا، هەموو کات ئەو کچێکی بەهێزبووە، بەڵام هەمیشەش ترسێکی نادیاری لە مردن، لە دڕندەیی، لە خەنجەری ناکاوی نێو تاریکی هەبوو. ئەو شەوە لەبەردەم دەستشۆری کارخانەکەدا سەیری دەموچاوی خۆی کرد، کچێکی ماندووبوو، بەڵام چیتر ئەو مرۆڤە نەبوو کە پەژارە و پەشۆکانی لە ناکاو ئیفلیجیاندەکرد. ئەو خانمە ڕەشهەوا و فێکرتووەی جاران نەبوو، کە سەرئێشەی کوشندە دەیگرت و نەیدەزانی لەم دونیایەدا دەبێت چی بکات. کارەساتی گەورەی مرۆڤ ئەوەیە کە نەزانێت چی بکات، هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە بێت

ژیان شتێکی پێشکەشبکات و ئەم بە دوای هێڵەکان و داوەکان و شوێن پێکانیدا ڕابکات. ئیدی دەیزانی بۆچی دەژی، ئەوە لە هەر شتێکی تر گرنگتر بوو، ئەو بۆ ئەم کچە بەدبەختانەی کارخانەکە دەژیا، بۆ ئەم کرێکارە ئافرەتە بەدبەختانە دەژیا، کە داڵدە و پەنایەکیان لەسەر ئەم ئەستێرەیە نەبوو، بۆ ئەو خەیاڵە سیحراویانەی خۆی دەژیا کە دەیتوانی بەختەوەرییەکی قووڵ و هەمیشەیی لە ناخی ئەم ژنە بەستەزمان و غەمگینانەدا بڕوێنێت. گەر جەوهەر یابەحری زەوییەکانی دەوێت دەتوانێت هەموویان بەرێت، هەر هەموویان و تەنیا پارەیماڵێکی بۆ بەجێبهێڵێت، یەک خانوو و هیچی تر.

بۆ جاری دووەم کە جەوهەر یابەحری بە ناوی کڕینی فەرشەوە گەڕایەوە بۆ کارخانەکە، بێئەوەی سڵی لێبکاتەوە یان بترسێت، مۆڵەتی لێخواست و لە ژوورە چکۆلەکەی خانمی نیادا دوو بە دوو دانیشتن. شەش ساڵ زیاتربوو ڕوو بە ڕوو سەیری چاوی یەکتریان نەکردبوو، هەردووکیان دوو دوژمنی گەورەی یەک بوون، دوو جەمسەری جیاواز کە هێزێک لەم سەر ئەستێرەیە نەبوو بتوانێت کۆیانبکاتەوە، وەک دوو دوژمن کە دوای جەنگێکی درێژ لەسەر مێزێک دوا هەق و حیسابی جەنگ دەبڕێننەوە، بەرامبەر یەکتری دانیشتن و دوا حیسابی خۆیان کرد. هەموو شتێک خێرا و ئاسان ڕۆیشت، تریفە یابەحری بەرابەر نرخی خانوویەکی گەورە دەستبەرداری هەموو موڵکە گەورەکانی خۆی بوو، کە لە ڕاستیدا گەر دەست کراوەبایە دەیتوانی بە قازانجی زۆر گەورەتر بیانفرۆشێت. بەڵام لەو ساتەدا پێویستی بە بڕە پارەیەکی گەورە بوو، پارەیەکی زۆر بە یەکجار بێتەدەستی.

هەڵبەت دەستبەرداربوونێکی ئاسان نەبوو، وەک ئەوەبوو تریفە خیانەت لەو خەونە دێرینەی سەمیرە یابەحری دایکی بکات کە بۆ پاراستنی بەشە

مافی مێکانی عەشرەتی یابەحری تریفەی هێنابووە دونیاوە، وەک ئەوە بوو شکستی ژنان لەو تایەفە مەلعونەدا ڕابگەیێنێت، بەڵام نا... لەگەڵ هەموو ترسی زۆر و سامی کەڵەکەبووی ناو دەمار و دڵدا، دڵنیابوو ئەو بەشێوەیەکی دی دەتوانێت هێزی لە بن نەهاتووی ژنانی یابەحری و ژنانی ئەم شارە بسەلمێنێتەوە، دڵنیابوو. ئەو ڕۆژە جەوهەر زاهیر مەست بە سەرکەوتنێکی گەورە لە کارخانەکە چووەدەرێ و دەستی لە ژیانی تریفە کێشایەوە. ئیدی لەو ڕۆژەوە یەکدیان نەبینییەوە، هەتا لە پرسەی خانمی فەوزیە یاسەمی دایکیشدا لە پایتەخت کەس نەیتوانی ئاشتیانبکاتەوە و پێکەوە بیانخاتەوە سەر یەک سفرە. بەڵام ونبوونی سێبەری جەوهەر ئاغای یابەحری لە ژیانی کچە چکۆلە و ناسک و ئەسمەرەکەی ناو چیرۆکەکەماندا، مانای ئەوە نییە کە پیاوانی هاوشێوەی ئەو، ئەوانەی دەیانەوێت سەراپای دونیا موڵکی ئەوان بێت، واز لە خانمەکەمان دەهێنن و دەست لە ڕاوکردنی بەردەدەن. ساڵانێک دواتر کە تریفە یابەحری و کیژانی هاوڕێی لە بەردەم شەهرەیاری شوشەدا و چەکدارەکانی وسوو ئاغادا وەستان، تریفە ڕوونتر تێگەیشت، زەوی پڕە لەو جۆرە پیاوانەی سێبەری یەکن و پێکڕا تەواوکەری ئەو سەفەری ڕاونان و ڕاوکردنەن کە جەوهەری برای لە منداڵییەوە لەگەڵیدا دەستی پێکردبوو.

ڕەنگە ئێستا هەمووان بپرسن چی وای لە تریفە یابەحری کرد تەواوی ماڵ و سامانی خۆی وەها ئاسان بەهەدەربدات؟ بۆ ویستی ژیانی خۆی بەرابەر شتێکی وەها کەم لە چنگ سێبەری ترسناکی جەوهەر دەربهێنێت؟. تریفە ئەو چەند ساڵەی لە کارخانەکەدا ئیشیدەکرد، جگە لە ئازاری ژنان و بێکەسی و بێشوێنیان چیرۆکی تری نەدەبیست، گەورەترین هێزی پیاو ئەوەبوو کە هەموو شوێنەکانی ئەم شارەیان داگیرکردبوو، کوچەکان و ماڵەکان و شەقامەکان سەرتاپا موڵکی ئەوان بوون. لەو کاتەوە دەیویست ماڵێک دروستبکات و بیخاتە بندەستی

ئەو ژنانەوە کە شوێنیان نییە، کە بێچارە و بێئومێدن. هێندەی هەقی خۆی لە جەوهەر یابەحری وەرگرت، بە کۆمەکی سەید قادری نیا خانوویەکی گەورەی کڕی. تریفە ئیشێکی زۆری لەو خانووەدا کرد، بۆ ئەوەی ببێتە پەناگای ئەو کچە بێکەسانەی جێگایان نییە خۆیانی تیا بشارنەوە. لەڕێگای خانمی نیاوە پەیوەندی بە ڕێکخراوە کاراکانی ژنان کرد و ماڵە تایبەتییەکەی خۆی خستە خزمەت ئەو لێقەوماوانەوە کە لە مێرد و کەسوکار هەڵدێن. ئەزموونی دووردرێژی لەگەڵ ئازاری کچانی مافوورچندا هێنابوویانە سەر ئەو بڕوا قووڵەی دەبێت ژیانی خۆی بۆ جۆرە کارێکی وەها تەرخانبکات.

نابێت ئەوەشمان بیربچێت کە مافوورەکانی تریفە ناوبانگیان وەها بە دونیادا ڕۆیشت، کاری کارخانەی نیا بە هۆی خەیاڵی زێڕینی ئەوەوە لەگەڵ تێکچوونی زەمان و ناخۆشی دەوران و هەژاری خەڵکیشدا هەر لە برەودا بوو، خەیاڵەکانی تریفە یابەحری بە قاچاخ دەگەیشتە دیوەخانی سوڵتان و سەرۆک و ئەمیرەکان. هەر ئەو ناوبانگەش دواجار بووە مایەی نەهامەتی و خۆکاولی تەواوی کارخانەکە. ئەو فرۆشە زۆرەی مافوورەکان بەدەستیانهێنا و ئەو سامانە گەورەیەی لە دوای ساڵانی نەوەدوەوە پەیدایکرد، لەبری ئەوەی ببێتە مایەی خۆشبەختی، بەدبەختییەکی گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. لە یەکێک لە ڕۆژانی بەهاری نەوەدو شەشدا، ئێوارەیەکی درەنگوەخت، سەید قادری نیا لە پەنجەرەی بیرۆ تازەکەی خۆیەوە لە کارخانەکە تەماشای دەرەوەی دەکرد، سێ پیاوی پارەدار و بەرپرس و دەست ڕۆیشتووی ئەو شارەی بینی لە ماشینێکی تازە دابەزین و بەرەو ڕووی کارخانەکە هاتن. لەو ساتەدا کە لە پەنجەرەکەوە سەیری ئەو سێ پیاوەی دەکرد، کە لە ژێر نەرمە بارانێکی بەهارەدا بەرەو لای ئەو هەنگاویاندەنا، بیریکردەوە کە نەدەبایە

ئەم چەند ساڵە ڕێگا بە تریفە یابەحری بدات هێند خەیاڵی ئەفسوناوی بهێنێتە ئەم کارخانە چکۆلە و ناچیزەوە، بەڵام چیتر کار لە کار ترازابوو. بە هەنگاوی ئەو پیاوانەدا، بە نەرمە ڕەوتیاندا، بەو ویقارە دەستکردەی لە هەنگاوەکانیاندا بوو تێگەیشت بۆچی هاتوون. سێ پیاوی گەورەبوون هاتبوون ئیشێکی گەورە جێبەجێبکەن، کاتێک هاتنە ژوورێ فەرمانیاندا کەس نەیەتە ژوورێ و دەرگاکان بۆ کارێکی نهێنی دابخرێن. وەک سێ کەس کە مەشقێکی زۆریان لەسەر حورمەت و ڕێزنواندن وەرگرتووە ڕەفتاریانکرد، شتێک لە ئاکاری جەنتڵمانی نوێ و لە هەوای ئاغا کۆنەکان لە دانیشتن و وشەکارییاندا بوو. سێ سمێڵی قەترانیان هەبوو، پێشی سەریان کەمێک ڕووتابووەوە، زەردەخەنە و جوڵەی دەست و شێوەی سەیرکردنیان زۆر لە یەکتری دەچوو، گەر شێوەی لووت و درێژی چەناگەیان نەبایە، مرۆڤ دەیگووت هەرسێکیان بەیەک سک بوون یان دەستوخەتی نیگارکێشێکی نەشارەزا لەسەر یەک وێنە کۆپیکردونەتەوە. بەڕێزێکی زۆرەوە قسەیان لەگەڵ سەید قادری نیادا کرد، بە یەک شێوە زمان، وەک ئەوەی پێکڕا یەک جۆر کاسێتیان قووتدابێت سەید قادریان وەک پیاوێکی نیشتیمانپەروەر ستایشکرد. قادری نیا دەیزانی مردن لەم وڵاتەدا بەمجۆرە ئاوازانە دەست پێدەکات. ئەو شارەزاییەکی زۆری لە بازاڕدا هەبوو، زۆربەی کاسبە خۆکردەکانی شار دۆستیبوون. لە مێژبوو دەیزانی هەموو قولاپێکی ئەم پیاوانە پارچەیەک شیرینی پێوەیە، سەرەتا شیرینییەکە دەردەهێنن و دواتر قولاپەکە ئاشکرادەبێت. بە ترس و غەمێکی زۆرەوە گوێی لێگرتن، لە پێش ڕاپەڕیندا لەوە دەترسا پیاوانی ئاسایشی بەعس تۆمەتێکی درۆی بۆ دروستبکەن و تیابچێت، بەڵام لە دوای ڕاپەڕین و هەڵبژاردنەکانەوە بەردەوام بیری لەم ئێوارەیە کردبووەوە. دەیزانی درەنگ یان زوو ڕۆژێک لە ئوتومبیلەکانیان دادەبەزن و بەو هەنگاوە سەیر و نەگۆڕانەوە، بەو سەرو سمێڵە بەویقارەوە دێنە

ژووریٚ و پێیدەڵێن دەرگاو پەنجەرەکان داخات و گوێبگرێت. لە بەهاری ساڵی نەوەدودووەوە بەردەوام ئەو خەوەی دەبینی، بەڵام هیچ جارێک ترسەکانی خۆی لای گەلاوێژیش ئاشکرانەکردبوو. ئێستا خۆی بەرابەر ئەو پیاوانە دەبینییەوە، کە پێشتر چەندین جار هاتبوونە خەونی. بە زمانێکی پڕ ماناو پێچ و پەنا تێیانگەیاند کە حیزب ئاگاداری هەموو شتێکی ناو کارخانەکەیە، بەڵام کارخانەکە شتێکی تێدا نەبوو سەید لێی بترسێت. دڵنیابوو یاریدەکەن، ئەو جۆرە یاریکردنە هونەرێکی سەختە کە ماوەیەکی درێژی دەوێت تا مرۆڤ فێری دەبێت، لەوڵاتانی دی خەڵکانێک وەک زانست دەیخوێنن، بەڵام لێرە خۆیان بە هۆی ئەزموونی دووردرێژەوە فێری دەبن. یەکێک لە سێ پیاوەکە گووتی «حیزب بە هەموو شتێک دەزانێت، لە چۆنێتی کڕینی خوری و بەن و ڕەنگەوە تا شێوەی دروستکردنی مافوورەکان، تا یەکەیەکە کرێکارەکان، تا دەگاتە چۆنێتی بەکارهێنانی ئێوە بۆ بازاڕ و ئەو ڕێگایانەی مافووری پیادەنێرن بۆ دەرەوە، هەموو شتێکمان لە ئاستی زۆر بەرزدا خستۆتە بەر باس و لێکۆڵینەوەوە». سەید قادری نیا دەیزانی قسەکردن و نەکردن وەک یەکە، ئیدی بەرامبەریان دانیشت و چاوەڕوانی دواهەمین ڕستەی ئەوانی کرد. پاش چەندەها چیرۆک و هێنان و بردنی سەیر، دوای تێکەڵاوکردنی چەندان قسەی خۆش و هەڕەشەی ژێرەوانکێ، دوای باسکردنی هەوڵی حیزب بۆ چاککردنی ژێرخانی ئابووری و گەورەکردنی سنووری پیشەسازییە خۆماڵییەکان، هاتنە سەر ئەو داوایەی حیزب دەیەوێت کارخانەکە بە هەموو شتەکانییەوە بکڕێتەوە، بە کرێکار و ماشێن و بینا و بیرۆکانییەوە. لە مێژبوو هاوڕێکانی سەید قادری نیا ئاگاداریانکردبووەوە کە تا زووە کارخانەکەی بە نرخێکی باش بە یەکێک بفرۆشێت، چونکە درەنگ یان زوو بە جۆرێکی قانونی زەوتیدەکەن و هیچیشی بۆ ناکرێت. بەڵام هەرکاتێک بچووبایەتە ناو ساڵۆنی مافوورەکانەوە،

تریفـە یابەحـری لـە سـاتی خەیاڵکردنـدا ببینیایـە، ئـەو کچـە غەمگیـن و بێکەسـانەی تەماشـابکردبایە کـە ژیـان و ئاسـوودەییان گرێـدراوی ئـەم ئیشـەبوو، بیرۆکـەی فرۆشـتنی کارخانەکـەی لـە مێشـکی خـۆی دەردەکـرد. بینینـی ئـەو فەرشـە خەیاڵکردانـە، ئـەو دەسـت و پەنجـە مەسـتانە، ئـەو کڕیـارە دڵگەرمانـەی مافوورەکانـی یابەحـری سـەری لێدەشـێواندن و نرخـی خەیاڵیـان دەگـووت، هەمـوو بەهانـەی گەورەبـوون سـەید قـادری نیـا نەچێتـە ژێربـاری ئـەو قسانەوە، نەیدەزانـی دوای ئـەو کارخانەیـە چـی بـکات و چـۆن بـژی. بـە ڕێزێکـی زۆر و حورمەتێکـی بێوێنـەوە بـە سـێ میوانەکـەی گـووت، ئـەم کارخانەیـە هەمـوو ژیانـی منـە، ناتوانـم دەسـتبەرداریبم و بیفرۆشـم. سـێ پیاوەکـە ئەزموونێکـی زۆریـان لـە کڕیـن و فرۆشـتندا هەبـوو، ماوەیـەک بـوو بۆیەکێـک لـە بەرپرسـە باڵاکانـی حیـزب ئیشـیاندەکرد، هەرگیـز قسـەیەکی ناشـیرین و توندیـان بـە کارنەهێنابـوو، هەڕەشـەکانیان هەمیشـە لـە ژێـر توێکڵـی شـیرین و لـە چێـوەی قسـەی ناسـکدا دەپێچایـەوە، ئیشـی ئـەوان دوورنەبـوو لـە پاکـی و ڕەوشـتی بـەرز. کـە کار دەگەیشـتە قسـەی تونـد ئـەوان دەچوونـە دواوە و خەڵکانێکـی تـر لەسـەر شـانۆ دەردەکەوتـن. ئـەوان پسـپۆڕی قسـەی خۆشـبوون، نەدەبایـە هەرگیـز لـە ویقـاری خۆیـان دەرچـن، هەوڵیانـدەدا بـە بەرامبەرەکەیـان بڵێـن، مەسـەلەکە لەگـەڵ ئێمـەدا ببڕێتـەوە باشـترە، نـەوەک لەگـەڵ کەسـانێکدا کـە هەمـان ئـاکار و ڕێزیـان نییـە. خۆیان وا نیشـاندا کـە قسـەکانی سـەید قـادری نیـا گەلـەک ئاسـایی و سروشـتییە و تێگەیشـتنی تـەواویان بـۆ هەمـوو هەسـت و نەسـتە ناسـکەکانی سـەید هەیـە، بـەڵام پێیانگـووت دەبێـت وردتـر بیربکاتـەوە و لـە مەسـەلەکە پتـر ڕابمێنێـت، چونکـە ئـەوان هیـچ نیـن جگـە لـەوەی فەرمانێـک لـە دەسـەڵاتێکی بەهێزتـر و گەورەتـرەوە دەگوازنـەوە کـە شـێوەی دیکـەی بـۆ ڕازیکـردن لەلایـە.

کـە ئـەوان بـە هێمنـی و ڕێـزەوە بیرۆکەیـان بەجێهێشـت، سـەید قـادر دڵنیابـوو، بـۆ هەتاهەتایـە کارخانەکـەی لەدەسـتچووە، بـەڵام نەیدەویسـت

هەروا ئاسان و کەمتەرخەم هەموو شتێک بدات بەدەستەوە. دوای چەندین ڕۆژ دیسان ئەو پیاوانە گەڕانەوە، بە هەمان زمانی جاری پێشوو قسەیانکرد، بە حورمەت و پڕ ڕێزبوون، بەڵام کە هەستان گوتیان «کاکە سەیی، باش بیری لێبکەرەوە، لە چەند ڕۆژی داهاتوودا شتەکە لە دەست ئێمە دەردەچێت. دوایی خەڵکی خراپتر دەکەونە ئیشەکەوە و هەموو لایەکمان لکەداردەبین... ئەمشەو سێ و دووی دڵی خۆت بکە و بە ئومێدی خودا دەگەیتە بڕیارێکی ڕاست و دروست، کە کەسمان شەرمەزارنەکات». لەگەڵ هەموو ئەو قسانەدا سەید قادری نیا سووربوو لەسەر بڕیاری خۆی. دە شەو دواتر هەندێک چەکداری نەناسراو، سەید قادریان لەبەردەم ماڵی خۆیاندا فڕاند و لە ناو هەندێک دار و درەختی باشووری شاردا دوای ئەزییەتدانێکی زۆر نیوە مردوو بەجێیانهێشت. بەڵام سەید قادر بڕیاریدابوو تا ئەو جێگایەی دەتوانێت و هێزی بەسەر گەمەکەدا دەشکێت شەڕبکات. دەیزانی کەس نییە لەم جۆرە شەڕەدا سەرکەوتووبێت، بەڵام گرنگی شەڕ ئەوە نییە دەیبەیتەوە یاخود دەیدۆڕێنیت، گرنگ ئەوەیە بزانیت گەر نەیکەیت، دوژمنەکەت دوای تۆ تا کوێ دەڕوات. جەنگاوەری ڕاستەقینە بەرگری لە خۆی ناکات، بەڵکو بەرگری لە دوای خۆیەوە دەکات. تا ئەوکات شەڕەکانی سەید قادر لە سنووری زار و تاوڵە و هاتوهاواری مەرز و قاپووت و گوڵبەهاردا گیریانکردبوو، ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو شەڕ بۆ شتێکی گەورەتر بکات، بۆ ئەم کارخانە چکۆلانەیە، بۆ ئەم کیژانە کە دەبێت بیانفرۆشێت. بیرێکی جەهەنەمی هات بە خەیاڵیدا، بێئەوەی بترسێت، دەبایە ئەمجارە بە دەستی خۆی زارەکان هەڵدات. شەوێک بەسەر و گوێلاکی بەستراوەوە، لە کاتێکدا هەموو ئێسکەکانی ژانیاندەکرد، هاوڕێ پیرەکانی خۆی کۆکردەوە، هەموو ئەو ڕیش سپی و پەککەوتانەی لە چاکەت و پانتۆڵی خوار و کورتدا بەردەوام تاوڵەیاندەکرد و بەدەم چا

خواردنـەوەوە شـەوانى بێكۆتايـى زسـتان و هاوينيـان بـە يـارى دەگوزەرانـد. پتـر لـە بيست پيرەمێردبوون كـە هەندێكيـان خانەنشـين و پەككەوتـەى مـاڵ و ئەوانـى ديكەشـيان كاسـبى پيـر، تاوڵەچـى چاوكـز، كۆنـە هاورێـى دێرينـى سـەيد بـوون. هەموويـان لەوانەبـوون لـەو چەنـد سـاڵەدا چەنـد جارێـك هاتبوونـە ئـەو شـوێنە و لـە سـەيرانەكانى پشـت كارخانـە و لـە پێشـبڕكێ درێـژ و بێكۆتاييەكانـى تاوڵـەدا بەشـداريانكردبوو. سـەيد قـادر دڵنيابـوو ئـەم پيرەمێردانـە ناتوانـن شـتێكى گەورەبكـەن، بـەڵام دەتوانـن لـەو شـەڕەدا كۆمەكيبكـەن. ئـەو شـەوە پێكـڕا، بيسـت پيرەمێـرد بـە يارمەتـى يەكتـر بەياننامەيەكيـان نوسـى، ڕۆژى دوايـى سـەدان دانەيـان كۆپيكـرد و بـە كوچـەو كۆڵانەكانـى شـاردا بڵاوياندەكـردەوە. بەياننامەيـەك چيرۆكـى كارخانـەى نيـاى دەگێڕايـەوە، لـە سـەرەتاوە تـا دەگاتـە هەوڵـى زەوتكردنـى. پيرەمێـردەكان ئێجـگار چاپووكانـە ئـەو كارەيانكـرد، بـە خۆيـان و پشـتە كـۆم و ددانـە ڕزيـو و تاقمـە شـلەكانيانەوە، بەخێراييەكـى ئەوتـۆ كـە لـە تەمەنـى ئـەوان چـاوەڕوان ناكرێـت، وەك ئـەوەى بـا هەڵيانگرێـت و تينێكـى ئەفسـانەيى چووبێتـە قاچيـان دەيـان دانەيـان لـەو بەياننامەيـە بـە ديوارەكانـدا هەڵواسـى و خسـتيانە ماڵانـەوە. لەگـەڵ بەيانـى ڕۆژى دواتـردا شـار لەسـەر چيرۆكـى كارخانـەى نيـا بـە ئاگاهاتـەوە. سـەيد قـادر دڵنيابـوو، كـە گـەورە پيـاوان لێـى نابـوورن، ئاشـكرابوو لەگـەڵ بڵاوبوونـەوەى هەواڵەكـەدا دەگەنەسـەرى، پێشـوەخت تريفـە يابەحـرى بانگكـرد و هەمـوو چيرۆكەكـەى بـۆ گێڕايـەوە، هەتـا نـاوى هەمـوو پيرەمێـردە سەرسپييەكانيشـى لادركانـد و وەك هاورێـى گـەورە و دڵسـۆزى ڕاسـتەقينە وەسـفيكردن. چەنـد سـەعاتێك دواتـر هێزێكـى نەناسـراو سـەيد قـادرى نيـاى بـەرەو جێگايەكـى نەزانـراو بـرد. لـە چەنـد ڕۆژێكـى كەمـدا خانمـى گەلاوێـژى نيـا، كـە هيـواى گـەورەى بـەوە بـوو دەسـتبەرداربوونى ئـەو لـە كارخانەكـە مێردەكـەى ئازادبـكات، بـە ناچـارى و لەگـەڵ لافـاوى فرمێسـكدا عەقـدى فرۆشـتنى كارخانەكـەى بـۆ ئـەو سـێ

سمێڵ ڕەشە مۆرکرد و بە پارەیەکی ناچیز دەستبەرداری هەموو شتێک بوو، بەڵام قادری نیا نەگەڕایەوە.

لەو نێوەندەدا تریفە یابەحری و کچانی کارخانەکە هەستیانکرد هێزێکی دێوئاسا فڕاندوونی و بەرەو قووڵایی تاریکییەکی گەورە دەڕۆن. هەوڵی بێوچانی پیرەمێردەکان بۆ ڕزگارکردنی سەید قادر بێ ئەنجام بوو، گروپی پیاوە سەرسپییەکان چەندەها بەیاننامەی دیکەیان نوسی و بڵاویانکردەوە، بەڵام بەرپرسەکان وەک هەمیشە حاشایان لەوە کرد ئاگایان لە مەسەلەکە بێت. ئەو سەردەمە سەرەتای داڕشتنی دەسەڵاتێکی نوێ بوو لە بازاڕدا، سەید قادر یەکێک بوو لە قوربانیانی ئەو شەپۆلە گەورەیەی هەموو شتێکی لەپێش خۆیدا ڕادەدا. سێ سمێڵ ڕەشەکە بەردەوام بە خانمی نیایان دەگووت «نەدەبایە هەڵەی وابکات، ئەو کەسانەی ئێمەیان نارد حەزیان لە ئیشی وا نییە، هاوڵاتی باش کەسێکی عاقڵە، عاقڵیش واتە هاوڵاتی باش. حیزبی باش پێویستی بە هاوڵاتی عاقڵە، هاوڵاتی باشیش پێویستی بە حیزبی عاقڵە. حیزبی عاقڵ دەبێت بەشدار بێت لە عاقڵکردنی هاوڵاتیاندا، کۆمەڵگای عاقڵیش بەبێ حیزبی عاقڵ ناژی، کەواتە سزای هاوڵاتی بێعەقڵ بەشێکە لە کرداری دروستبوونی کۆمەڵگای عاقڵ، ئیشی حیزبی عاقڵیش پاراستنی کۆمەڵگای عاقڵە، کە هاوڵاتی بێعەقڵ نەتوانێت تیا ئاسودە بێت، بۆ ئەوەی زۆرینەی عاقڵ ئاسوودەبن، دەبێت کەمینەیەکی بێعەقڵ ئاسوودە نەبن، خانمی نیا شتەکان هەموو سادە و ساکارن... وانییە؟». خانمی نیا بێئەوەی هیچ تێبگات، دەیگووت «وایە، وایە، ئێوە ڕاستدەکەن، بەڵام گەر بەریبدەن، دەبێت بە هاوڵاتییەکی عاقڵ». پیاوە سمێڵ ڕەشەکان دەیانگووت «مرۆڤ دەبێت بەر لە گرتن عاقڵ بێت... خانمی نیا وایە یاخود وانییە؟».

دوا جار خانمی نیا هەستیکرد لە بازنەیەکی خاڵی و پوچدا

دەسووڕێتەوە.

پیرەکان وەک هەنگ کاریاندەکرد. کەس لەو باوەڕەدا نەبوو ئەم کەنەفت و چرچەڵۆک و پەککەوتانە، بە ملە کوڕ و چاویلکە گەورە و چاوە کزەکانیانەوە لە پشت ئەو هەموو بەیاننامەیەوە بن. گوڕ و تینێکی گەورەیان تێکەڕابوو، هێزێکی سەیر پاڵی پێوەدەنان ئیشبکەن، بەڵام ڕەنجی ئەوانیش وەک ڕەنجی زۆر خەڵکی دی کە دەیانویست شتێک لەم شارەدا بجوڵێنن بێسوودبوو. ئەو ڕۆژەی بەرپرسە تازەکان، کارخانەی مافوورەکەیان وەرگرت، ناردیان بە دوای تریفەدا و گووتیان «خانمی یابەحری تۆ نازانیت ئێمە چەند خۆشحاڵین کە تۆ دەبینین، ئێمە هەر چییەکمان کردوە، بۆ ئەوە بووە نرخی زێڕ لەسەر خەیاڵی تۆ دانێین، هەر پارەیەکمان خەرجکردوە، بۆ ئەوەبووە ئەو خەیاڵە جوان و بەر فراوانەی تۆ ببێتە موڵک و ماڵی ئێمە. گوێمەدەرە پارە، خەیاڵی تۆ بە پارە ناکێشرێت و بە دراو حیساب ناکرێت، مافووری سیحراویمان بۆ بچنە، ئێمەش دەیبەین و دەیگەێنینە دەرباری پادشا و ئەمیرە گەورەکان، بۆ هەموو مافوورێکی جوان تۆ خەڵاتێکی گەورەت هەیە، ژیانێکت بۆ دروستدەکەین ژنی شاهەنشاکانی ئێران و خاتوونی سوڵتانە تورکەکان بەو جۆرە نەژیابن، دەتوانیت کەنیزەکت هەبێت و بەردەستان لێرە و لە ماڵیش لە پێشدەمتدا کاربکەن، هێند هەیە خەیاڵی خۆت بخەرە کار و فەرشی نوێ و ناوازەمان بۆ بچنە». بەڵام تریفە یابەحری لە ڕۆژی یەکەمەوە هەستیکرد ناتوانێت کاربکات، لە سەعاتی یەکەمەوە بە خاوەنە نوێکانی کارخانەی گووت نایەوێت کاربکات. ئەوە یەکەمجاربوو هەستبکات کەسانێک هەن دەیانەوێت خەیاڵی لێبکەن، ئەو لەو کارخانەیەدا خۆی دۆزیبووەوە، لە ناو ئەو مافوورەدا شوێنە دوورەکانی دونیا و نیگارە ئەستەمەکانی جیهانی بینیبوو، کەچی ئێستا هەستیدەکرد خەیاڵی ئیشناکات. دوای فرۆشتنی کارخانەکە هەموو شتێک

گۆڕابوو. هەڵبەت ژانێکی بێسنوور بوو بۆ ئەو، حەسرەتێکی گەورەبوو ئەو کچە بەستەزمان و بێکەس و بێپەنایانە جێبهێڵێت، کە جگە لە ئیشکردن تا مردن چاری دییان نەبوو. بەڵام هەستیدەکرد گەر خەیاڵی خۆی بەم پیاوە کوشندانە بفرۆشێت، دەمرێت، تووشی نەخۆشییەکی ترسناک دەبێت، سەری پڕدەبێت لەو درندە و مۆتەکە سامناکانەی شەو و ڕۆژ لێناگەڕێن بخەوێت و هەناسە بدات. کە لە دەرگای سەرەکی کارخانەکە چووە دەرێ، دڵنیابوو ناتوانێت ئاسوودە بژی، بە هەموو هێزی خۆی دەیویست ژیانێکی نوێ دەست پێبکات. لەگەڵ کیژێکی بێکەسی کارخانەکەدا چووە خانووە تازەکەی خۆی و چەند هەفتەیەک پشوویدا، نەیدەزانی چۆن درێژە بە ژیانی بدات و دەبێت چی بکات. هەر لەو ماوە کورتەدا سەروفەساڵی عەتار دەرکەوتەوە. ئەمجارە خۆی وەک ڕەوانەکراوی خاوەنە تازەکانی کارخانەکە پێشکەشکرد، سوێندی خواردبوو هەموو ڕێگایەک دەگرێتە بەر تا خانمی یابەحری سازبکات و بیگێڕێتەوە بۆ ئیشکردن. ڕۆژانی دواتر تریفە خۆی لە ژێر فشارێکی ترسناکدا بینییەوە، عەتار وەک تاعونێکی ڕەش بەدوایەوە بوو، هەر لەو دەمەدا چەندەها کڕیاری تر و کارخانەی تر و پیاوی نەناسراوی دی دەرکەوتن کە هەموو دەیانویست خەونەکانی تریفە یابەحری پاوانکەن و لە کاسبییە سەیر و کاڵا ناوازەکانی خۆیاندا سودی لێببینن. بۆ ئەوەی لە هەموویان ڕابکات، بۆ ئەوەی نەکەوێتە ئەو چاڵە تاریک و تونێلە بێبنەوە کە لە هەموو لایەکەوە زارای بۆ واڵا کردبوو، دەبایە بڕوات و ونبێت. هەر لەو دەمەشدا تریفە یابەحری سەرەتای ئەو دەردە ترسناکەی تیا دەرکەوت کە دواتر ژیانی لە بنەوە هەڵتەکاند، لەو سەردەمەدا ترس لەوەی بخورێت، بوو بە مۆتەکەیەکی گەورەی ژیانی. لە ساڵی نەوەدو شەشدا کاتێک شەڕی ناوخۆ گەیشتە چڵەپۆپەی خۆی، لەسەردەمێکدا هەزاران مرۆڤ ڕایانکرد و نیشتیمانیان بەجێهێشت، تریفە

یابەحری و غەزەلنوس پێکەوە دەستیان بە ئەزموونێکی سەیر و ناوازە و دووروودرێژ کرد، کە شتێک بوو لە نێوان عەشق و خۆکوژیدا، ئەزموونێک لە لاپەڕەکانی دیدا بە وردی هەندێک بەشی بچوکی دەگێڕمەوە.

## ئەو ڕۆژەی کە بووم بە حیکایەتخوانی منداڵی بارۆنەکان «ماجیدی گوڵ سۆلاڤ - حوزەیرانی ٢٠٠٤»

چیرۆکی ڕاستەقینەی من لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد کە لەگەڵ بارۆنی بوکە شوشەدا چووم بۆ گەڕەکی بارۆنەکان. نیوەڕۆیەکیان بە ئوتومبێلە گەورەکەی هات بەدوامدا و گووتی ئیشێکم لە نوێمیران بۆ دۆزیوەتەوە. نوێمیران ناوی ناسراوی گەڕەکی بارۆنەکان بوو لە سەر نەخشەکانی شارەوانی و لە ڕاگەیاندنی ڕەسمیدا. من خۆشحاڵانە قژم وەک کوڕە پادشایەکی غەمگین داهێنا، جوانترین جلی خۆم پۆشی و وەک بچم بۆ پێشوازی شاژنێکی گەنج، لەگەڵ بارۆندا سواربووم. بارۆن بە جلوبەرگ و خۆگۆڕینی من سەرسام بوو، لایەنیکەم وەک هیچ پیاوێکی دیکەی ئەو شارە خۆم نەدەگۆڕی، قاتەکانم بەجۆرێک لەگەڵ باریک و ڕێکی جەستەمدا دەگونجان دەکرا ڕێکپۆشترین کوڕی دونیا ئیرەیم پێببەرن. لێتانی ناشارمەوە کە بێباکی من بەرابەر بە کچان، بەشێکی دەگەڕایەوە بۆ سەرسامیم بە جوانی خۆم. ڕاستە ئەوانەی هاوڕێی نزیکی من بوون، بەردەوام گومانیان تیا دروستدەکردم، بەڵام هەر کات خۆم لە ئاوێنەدا دەبینی، هەستم بە سیحری نیگا و جوانی ڕوانینەکانم دەکرد. دڵنیابووم دەتوانم دواجار لە ناو بارۆنەکاندا سوود لەم ڕێکپۆشی و قەشەنگییە ببینم تا بگەمە شتێک ئەوانی دی ئاسان نایگەنێ. نوێمیران کە من ناومنابوو بارۆنستان گەڕەکێکی ئێجگار گەورە و نوێ بوو لە ناوەڕاستی شاردا.

لە نێوان ئەو گەڕەکە و بەشەکانی دیکەی شاردا، زەوییەکی بازنەیی گەورەیان جێهێشتبوو خاڵی لە هەر جۆرە ڕووەک و گیاندارێک. بازنەیەکی گەورە کە هیچ شتێکی تیا سەوز نەدەبوو، ئەو دەشتە تەخت و بێگیانە وەک دیوارێکی ئەستوور، گەڕەکی بارۆنەکانی لە سەرجەمی دونیا جیا دەکردەوە. جگە لەو بازنە سارارەنگە، تەلبەندێکی ئەستووریش دونیای بارۆنەکانی لەدونیا دابڕیبوو. بەڵام لەڕاستیدا نەگەیشتنی خەڵک بە نوێمیران بەهۆی ئەو تەلبەندەوە نەبوو، بەڵکو بە هۆی ترسێکەوە بوو لە سەرەتاوە دەستێکی نەناس دەربارەی ئەو جێگایە دروستیکردبوو. من بەر لەوەی ناوی بارۆنەکانیش ببیستم شتێکم لەسەر گەڕەکی نوێمیران بیستبوو، خەڵکانێک کە دەچوونە ئەوێ بە جۆرێک شیفتەی ژیان و شێوەی کۆشکەکان و ئەندازەی ماڵەکان و ئەتەکێتەکانی خواردن و خەوتن و عەشقبازی دەبوون تا هەتاهەتایە لەوێ دەمانەوە و دەبوونە بەردەست و ئیشکەر و خزمەتکاری بارۆنەکان، یاخود نیوەشێت بە خەیاڵ و خولیای گەیشتنەوە بە پلەوپایەی جێنشینانی نوێمیران دەگەڕانەوە. گەڕەکێکی ئێجگار گەورەبوو، مرۆڤ دەبایە بڕواتە ناوەوە تا هەستی پێبکات. ئەو ماوەیەی من لەوێ ژیام سەدان ماڵی گەورەم ژمارد کە بە جۆرێکی ئەندازەیی هێند ئاڵۆز ڕێکخرابوون ژماردنیان ئاسان نەبوو. لەوەش سەختتر ئەو باغچە دووبارە و وەک یەکانەبوو کە بۆ ونکردن و سەر لێتێکدانی نابەڵەد و نەشارازەیان دروستکرابوون. ئەوەی وایدەکرد چوونە ناو ئەو گەڕەکەوە سەخت بێت، ئەو حەسرەتەبوو کە لە دڵی خەڵکانی بێتوانادا دروستیدەکرد، سەردەمێک هاتوچۆیَ نێوان نوێمیران و گەڕەکەکانی تری شار ئاساییبوو، بەڵام ئەوەی ترسی خستە دڵی بارۆنەکانەوە ئەوە بوو، هەموو ئەو کەسانەی کە دەهاتنە ئەم گەڕەکە خەونیان بەوەوە دەبینی لەوێدا جێگایان ببێتەوە. سیحری شەقام و کوچەکانی، جوانی خانمەکانی، شێوەی باغچەکانی، هێزێکی ڕاکێشانی

ئەوتۆیان هەبوو مرۆڤی شێتدەکرد. ئەو خواستە گەورەیە، سەردەمێک وەک هیستریایەکی بەربڵاوی لێدێت و بارۆنەکان ناچاردەکات، نوێمیران بە تەلبەندێک لە دونیا جیابکەنەوە. هەر بارۆنەکان خۆیان ئەو بازنە وشک و بێگیانەیان کێشا، کە وەک شورایەکی ئەستوور جیهانی ئەوانی لە ئێمە دابڕی. دوای ساڵی دوو هەزار «ئەو ساڵەی من غەزەلنوسم تیاناسی» بارۆنستان بوو بە خاکێکی جیاواز و سەربەخۆ کە جگە لە سیاسییە گەورەکان و ئەندازیارە پارەدارەکان و بازرگانە ناودارەکان نیشتەجێی کەسی تر نەبوو. نرخی زەوی لەو ناوچەیەدا بە جۆرێک زیادیکرد، خەڵکانی ئاسایی لەو هەرێمە تەکینەوە و ڕوویان لە شوێنی دیکە کرد. کە وەزیر و پەرلەمانتار و ڕاوێژکارەکانی حکومەت لەو ناوەدا نیشتەجێبوون، ئەوە بەهانەیەکی بەهێزبوو، گەڕەکەکە نرخێکی سیاسی وەربگرێت و پاراستن و جیاکردنەوەی ببێتە بەشێک لە ستراتیژی کاری ئاسایش و شارەوانی. ئەو چیرۆکانەی دواتر دروستیانکرد سەبارەت بە گەڕبوون و نەخۆشکەوتن و مردنی ئەوانەی دەیانەوێت دزەبکەنە ئەو گەڕەکە، دەستکردی ئەندازیارە نهێنییەکانی نوێمیران خۆی بوو. ئەو ڕۆژە کە من لەگەڵ بارۆنی بوکەشوشەدا کەوتمەڕێ، ترسێکی نهێنی و ئارەزوویەکی ترسناک لە دڵمدا بوو. زانیارییەکانم لەسەر نوێمیران کەم و تەماوییبوو. بارۆنی بوکەشوشە بە دەنگێکی گڕ و قووڵ پێیگوتم « ماجید سۆلاف، ئیشەکەی تۆ شتێکی قورس نییە، دەبێت حیکایەت بۆ کچ و کوڕێکی منداڵ بگێڕیتەوە. یەکێکیان کچی بارۆنی سێبەرە و ئەوی دییان کوڕی بارۆنی مەیکەدەیە. من دەمێ وەختە ئاگادارم، منداڵەکان هەر دووکیان غەمۆکی و بێکەسن، ئەم نوێمیرانە مەلعونە بۆ منداڵان جێگایەکی خۆش نییە. بۆ پیاوان خۆشە، بۆ ژنان بەهەشتە، بەڵام بۆ منداڵان نا، جێگایەکی خۆش نییە. ئێستاش نازانم چ شتێک منداڵان دڵخۆشدەکات؟ گەرچی بیست ساڵە بوکەشوشە فرۆشم و گەورەترین

بازرگانی یاری مندالآنم لەم هەرێمەدا، بەلآم ئێستاش بە ڕوونی لە دڵی مندالآن تێناگەم... ڕاستتدەوێت بەر لەوەی بێمە نوێمیران باشتر لە مندالآن دەگەیشتم، ئەوەی دێتە ئەم گەڕەکە مندالّی خۆی بیردەچێتەوە، من زۆر ورد سەرەنجمداوە، دانیشتوانی ئەم گەڕەکە کەسیان مندالّی خۆیان لە یاد نییە... تۆ ماجید سۆلاڤ پێمبڵێ، مندالّی خۆتت لە بیرە؟». لەسەرەخۆ، بە هێمنی وەلآممدایەوە گووتم «جەنابی بارۆن، هەستدەکەم من گەورەنەبووم. لە دایکبوونمەوە تا ئێستا وەک خۆمم. دیارە، جەنابی بارۆن مەبەستم قەد و قامەت و بالآ نییە، بەڵکو شێوەی سەیرکردن و تێگەیشتنمە لە دونیا. هەر کات مرۆڤ تەنیا بوو لە نێوان سەردەمی مندالّی و گەورەیدا جیاوازییەکی ئەوتۆی بۆ ناکرێت، چونکە مندالآن بە گشتی تەنهان، بەڵێ جەنابی بارۆن، مرۆڤ بە تەنیایی لە دایکدەبێت... جەنابی بارۆن، گەر ڕاستت دەوێت، تەنیایی جەوهەری ئینسانە. دەرد و مەینەتییە گەورەکانی مرۆڤ ئەوکات دەست پێدەکات کە مرۆڤ گەورەدەبێت و دەیەوێت ئەو تەنیاییە بشکێنێت. بەلآم بەڕێزم، لەبەرئەوەی من تا ئەمرۆ تەنیام، هەستدەکەم هێشتا مندالّم و جیهانی دێرینەی خۆم جێنەهێشتووە. سەیرکە جەنابی بارۆن، ئێمەی بەنیئادەم هەر لە مندالّی دەترازێین، دەکەوینە سەر خولیای دلّداری و عەشق و ئەو جۆرە خواستە پڕوپوچانەی تر. بەڵێ جەنابی بارۆن... من مندالآن باش دەناسم، وەک چۆن فیتەرێک دەزانێت ماشێنێک بەچی ئیشدەکات و چۆن دەکەوێتە کار، منیش بەو شێوەیە لە دونیای مندالّ شارەزام. مندالآن بە تەنیایی خۆیان کامەرانن. ترس لە تەنیایی سیفەتی پیر و گەورەکانە. بەڵێ... جەنابی بارۆن... مرۆڤ تا مندالّە لە تەنیایی ناترسێت، بەڵکو تەنیایی خۆشترین مالّ و نیشتەجێیەتی. ئەوە دەردی خۆشەویستییە وادەکات مرۆڤ لە تەنیایی خۆیدا ئارام نەگرێت، جەنابی بارۆن عەشق دەردێکی پیسە، کە مرۆڤ عاشق بوو واتە دەیەوێت

تەنیا نەبێت. جەنابی بارۆن قسەیەک لە من وەرگرە، لە منداڵی تەنیا مەترسە، ئەوان ژیانی ڕاستەقینەی خۆیان دەژین، لە پیاوانی تەنیاش مەترسە ئەوانیش هێشتا منداڵن و گەورە نەبوون، لەو کەسانە بترسە کە لە تەنیایی دەترسن».

بارۆن ئەو ڕۆژە چاکەتێکی سپی و کراسێکی ڕەشی لە بەرکردبوو، جووتێک پێڵاوی قاوەیی نوێی لە پێدا بوو، پێدەچوو تا نیوەڕۆ لە گەرماوێکی تایبەتیدا لەشی خۆی نەرمکردبێت، بۆ عەترێکی لێدەهات نە هێند بەهێزبوو تەواو هەستی پێبکەیت، نە هێند بێبۆش بوو هەستی پێنەکەیت. ماشێنە پاپۆڕئاساکەی بە جۆرێک خۆش و پشووهێن بوو، دەمویست تا ڕۆژی قیامەت نەگەینەجێ و دانەبەزم. کاتێک سەبارەت بە منداڵان قسەمکرد، وەک پێشتر بۆچوونی وەهای نەبیستبێت، کەمێک بیریکردەوەو گووتی «منداڵان دەیانەوێت یاریبکەن، وانییە، دەیانەوێت یاریبکەن یان نایانەوێت؟».

ئەو جۆرە بەلاغەتە سادە و ساکارە، بەزاری بارۆن نامۆبوو. من گووتم« منداڵان کاتێک یاریشدەکەن تەنیان، ئەوە ئێمەین منداڵان ناچاردەکەین بە کۆمەڵ یاریبکەن، ئەوان کاتێک بە تەنیاش یاریدەکەن لەزەت دەبینن... جەنابی بارۆن... خۆشترین یاری ئەو یاریانەیە کە مرۆڤ بە تەنیا دەیکات».

بێئەوەی زۆر لەسەری بڕوات، وەک ئەو پێداگرتنەی من لەسەر تەنیایی ماندوویبکات گووتی «ئیشی تۆ ئەوەیە چیرۆک بۆ ئەو دوو منداڵە بگێڕیتەوە، دەبێت چیرۆکەکانت وەها جوان بن، دونیایان لە بیرببات‌ەوە و بکەونە جیهانێکەوە حەزی لێبکەن، ئەوە سەنعەتی تۆیە کارێکبکەیت دواتر هەموو شەوێک داوای چیرۆکە ئەفسووناوییەکانت بکەن، تۆ لەمڕۆوە حیکایەتخوانی منداڵانی نوێمیرانیت... ماجید سۆلاف من لەلای بارۆنەکانی دۆستم، ستایشێکی بێوێنەی تۆم کردوە، بارۆنەکان بۆ

شتی پێویست نەبێت ناهێڵن غەریبەیەک بچێتە ماڵیان، ئەو دوو منداڵە نامۆن و غەمۆکین، پێویستیان بە هاوڕێ هەیە... لەبەرئەوە زۆر لەسەر تەنهایی مەڕۆ».

نوێمیران جێگایەک بوو، وەها ئاسنین و کۆنکرێت ئاسابوو، دەبایە من وەک ماجەلانی خەیاڵی خۆمی لێنەدەم و خواستی پشکنینیم نەبێت، بەڵام خولیای کۆمەککردن بە موراد جەمیل لە خوێنمدا بوو. بۆ ئەوەی هەستبکەم لە گۆشت و خوێنم، دەبایە وەها پرکێشییەک بنوێنم و بە گژ سەر زەمینێکی وەها ڕاستەقینەدا بچم. ئەوەتەی سەرنشینی ئەم کەلاوە گەورەیەم کە بە زۆر ناوی شاریان لێناوە، من هەموو ژیانم لە سەر شەقامە پیسەکانی ئێرەدا بردۆتە سەر، کەچی ئەوەتا هیچ ئادەمیزادێک نامناسێت، لەدوای هاتنە دەرەوەم لە قوتابخانە بووم بە گەڕۆکێکی بێئیش، ئێستا دەمەوێت شتێک بکەم ڕۆحی تیا بێت، دەمەوێت ژیانم وا لێبکەم لە ژیان بچێت. نازانم لەگەڵ هەموو ئەو نەفرەتەشدا، لەگەڵ ئەو هەموو ئاسن و قەرمید و بەردەدا کە ئەو گەڕەکەیان دروستکردبوو، وام هەستکرد ئەم نوێمیرانە گەورەیە بەرهەمی خەیاڵە، بەڵام خەیاڵی هەندێک مەخلوقی نیوە شێت و نیوە شاعیری وەک من و غەزەلنوس نا، بەڵکو خەیاڵی کەسانێک کە لە ئێمە بەهێزترن، ئامێریان هەیە، چیمەنتۆ و کۆنکرێت و شیش و ئەسفەلتیان هەیە، کرێکار و ڕەنجبەر و کۆیلەی شادومانیان هەیە، دەتوانن خەیاڵە دڕندە و شێتەکانی خۆیان لەسەر زەوی دروستبکەن. کە ماشێنەکە لە بەشە ڕوتەڵ و بێڕوخسارەکەی شارەوە گەیشتە بەردەم پاسەوانە چکۆلە و کاسکێت لەسەرەکان، وەک ئەوە وابوو لە سنووری وڵاتێکەوە بچێتە سنووری وڵاتێکی دی، پاسەوانە نەجیبەکان ئێمەیان ڕانەگرت و بارۆن بە خێراییەکی وەها لێیخوڕی، وامدەزانی ئێستا نا ساتێکی دی وەک ئوتومبیلەکەی ڕۆبن ولیامز لە

فلیمی «فلۆپەر» دا دەفڕین. بارۆن دەرفەتێكی جێنەهێشت بە وردی ئەو ڕێگایە ببینم، كە چووینە نێو ماڵەكانی بارۆنستانەوە من لەسەرسامی زیاتر هیچی ترم نەبوو، گەیشتن بەو جێگایە خەونی زۆر كەس بوو، وەك گەیشتن وابوو بە سەرزەمینی ئەفسانەیی پادشا كۆنەكان، دەرگا و پەنجەرەی ماڵەكان زیاتر لەوەی سەرەنجی شارێكی نوێ خولقاوم پێببەخشن، دیكۆری ئەفسانەیی هەندێك لە فلیمە كۆنەكانیان بە یاداهێنامەوە. نیوەڕۆیەكی گەرم بوو. گەرچی جوانی ماڵەكان و زەخرەفە سەیرەكانی زۆر ڕایانگرتم، بەڵام هەستمكرد هێشتا هیچ لەو میعمار و بیناسازی و فۆرمە ستاتیكییانەی ئەوێ حاڵی نەبووم. باوەڕم بەوە نییە نیوەڕوانی گەرم لە ژێر هەتاوی زەق و زۆپدا سەیری دونیا بكەم، بۆ ئەوەی لە جێگایەك تێبگەم دەبێت ئێواران ببینم یاخود شەو، یان بە ماوەیەك بەر لە كازیوە و شەفەق، بەڵام نیوەڕوان نا. هەتاوی زۆر سیحری شوێن دەمرێنێت و ڕەنگەكان دەكوژێت، من لەوانەم كە باوەڕم بە هەتاو نییە. هەموو جێگایەكی دونیا غەمێكی قووڵ و تایبەتی خۆی هەیە، هەتاو ناهێڵێت ئەو غەمە ببینین. هەموو ئەو میللەتانەی زۆر لە بەر هەتاودا ژیاون، كامەرانی و ئازاریان ئاسان بۆ لەیەكدی جیاناكرێتەوە. كەس لە خۆی پرسیوە بۆ دونیا لە ساتی خۆرئاوابووندا دەگاتە ڕۆمانسیترین و جوانترین ساتی خۆی؟ چونكە لەو ساتەدا زەوی لە ژێر ڕەحمی هەتاو و لەژێر منەتی تریفەدا نییە، لەو ساتەدا زەوی خۆیەتی، ئا لەو كاتەدا سەیری درەخت و ئاو و هەور و جەنگەڵ بكەن، سەیری شارەكان بكەن، سەیری مەزرا و باغ و جۆیبارەكان بكەن، تەنیا لەو ساتەدا ڕووە ڕاستەقینە و غەمگینەكەی دونیا بە ڕوونی دەردەكەوێت، هەتاو جۆرێكە لە كۆمەكی ئیلاهی تا بەردەوام ئەو غەمە نەبینین كە لەسەر هەموو گەڵایەكی جیهان و لە ناو هەموو دڵۆپە ئاوێك و لە هەموو گزنگێكی وردایە... من بۆ ئەوەی لە نوێمیران تێبگەم، دەبایە

لە ژێر هەتاودا نەیبینم، دەبوو بوەستم و چاوەڕوانبم.
بارۆنی بوکەشوشە شەرەفێکی گەورەی لێنام و بردمییە ماڵی خۆی. تا نەچوومە کۆشکی بارۆن تێنەگەیشتم بۆ بینینی ئەم شوێنە مەترسییەکی گەورەی لەسەر خەیاڵی ئادەمیزاد هەیە. کۆشکێک بوو هەموو ئەو ڕەگەزە خەیاڵیانەی تێدابوو کە ئەندازیارەکانی ئەم مەملەکەتە پێیگەیشتبوون، ئاشکرابوو ئەو گروپە لە ئەندازیار بە شێوەیەکی سەیر کەوتوونەتە قەفەزی ئارەزووی بارۆنەکانەوە. میری بوکەشوشە بەرەو سالۆنێکی ئێجگار گەورە پێشمکەوت، لەوێدا گەورەترین چلچرای دونیام لە سەقفەکەدا بینی. سالۆنەکە لە شێوەی بازنەیەکی گەورەدا بوو کە بە دوو چەشن قەنەفەی شاهانە پڕکرابووەوە، بە ئەندازەیەک فێنک بوو، وەک ئەوەی ئەندازیارەکان لوولەیەک لە هەوای بەهەشتیان بۆ ئەم سالۆنە ڕاکێشابێت. بێئەوەی هیچ بڵێم ماوەیەک تەنیا لە دەوروبەرم دەڕوانی، لەو شتە ئەنتیک و سەیرانە ورددەبوومەوە کە پێشتر لەخەیاڵەکانی خۆشمدا نەمبینیبوون. لە سوچێکی سالۆنەکەوە پلیکانێک بەرەو سەرەوە بەرزدەبووەوە، لە پلیکانەی سیحراوی ناو تابلۆکانی مۆریس ئیشەر دەچوو، وادیاربوو تا فەزایەکی قوللەئاسا بڕوات و لەوێدا لە سالۆنێکی دیکەدا تەواو بێت کە لەسەرەوەڕا بە جۆرێکی بازنەیی بەسەر تەواوی ڕووبەری ماڵەکەدا دەکشێت و بەسەر هەموو شاریشدا دەڕوانێت. سالۆنەکەی میر سەفین وەک زۆربەی سالۆنەکانی دیکەی بارۆنستان، هەم باغچە بوو هەم شانۆ، هەم ژوور بوو هەم مۆزەخانە. پڕبوو لە کەلای سەیر کە پێشتر لە هیچ جێگایەکی دونیادا نەمبینیبوو، حەوزی ماسی کە سەدان ماسی ورد و ڕەنگاوڕەنگیان تێدابوو، چەندین پەیکەری سپی و برۆنزی کە وەک پەیکەرە یۆنانییە دێرینەکان دروستکرابوونەوە، هەندێک مافوور کە بە ئەندازەیەک قەشەنگ بوون، مرۆڤ حەزیدەکرد ئەژنۆدادات و بەسەعات تەماشای وردەکاری نیگارەکانیان بکات. بارۆن لە

ماڵەكەی خۆیدا قیت تر و گورجتر هاتە بەرچاوم. وەک چۆن حەقیقەتی من وەک ماجەلانێکی خەیاڵی تەنیا لەسەر كەشتییەكەم دەردەكەوت، ویقاری ڕاستەقینەی بارۆنی بوكەشوشەش تەنیا لەم ساڵۆنەدا تەواو دەدرەوشایەوە. هەموو مرۆڤێک لە لانكی ڕاستەقینەی خۆیدا لە شێر دەچێت، میر سەفینیش لە ساڵۆنە گەورەكەی خۆیدا لە شێر دەچوو.

بارۆن وەک بزانێت بیر لە چیدەكەمەوە، گووتی «چی تێدەگەیت؟ وەک ئەوەی هاوینێکی گەرم بێت، وەک كاتێک بێت گوڵ بە هەتاو بمرێت و ئێمە لەسەر كانییەكی جاوید دانیشتبێتین و فێنكی بمانخوات؟. هەموو نەزانێک وادەزانێت ئەوەی لە بورجێكی وەها جواندا بژی، چاوی لە جیهان دوورە و دڵی لە مەخلوقاتی تر غافڵە و هەناسەی لە هەناسەی ئادەمیزادان ناچێت. بەڵام ماجید سۆلاڤ، مرۆڤ لێرەوە جوانتر دونیا دەبینێت، ئەم قەڵا چكۆلانەیەش قەڵغانی منە. ئەم ماڵە شوێن جەنگی منە لەگەڵ دونیادا. ئەوەی لە شێر بترسێت ناتوانێت دەستەمۆیبكات و تێیبگات، ئەوەی لە ئاو بترسێت ناتوانێت مەلەی لە ناودا بكات، ئەوەی لە تیشک بترسێت ناتوانێت هاوینی خۆشبوێت. منیش لەم شارە ناترسم. من دونیام فەرامۆش نەكردوە، واتێمەگە كە لە جۆرە كۆشكێكی وەهادا بوویت، ئیدی لە دونیا غافڵ و لە غەم ڕەخساویت. من دونیام بۆ لە بیرناكرێت. چاوەڕوانی چیت، ئێمە لێرەدا بخەوین؟ سیاچارە و بێپاشەڕۆژە ئەو بارۆنەی كە تێناگات لە پشت تەلبەندەكانی ئەم گەڕەكەوە چی ڕودەدات».

قسەكانیم وەک گەمەی پیاوێک تەماشاكرد لێزانانە دەتوانێت بەلاغەت بەكاربهێنێت. ئێستا بە دڵنیاییەوە قاچی خستبووە سەر قاچی و بەرامبەرم دانیشتبوو، هێدی هێدی سیگارێكی گڕدەدا و مژی قووڵی دەكێشا، باڵابەرز و پڕ ڕێز دەینواند، كەسێک بەسەر و سیما پیر بوو، بەڵام بە جوڵە و لەش لە هەر گەنجێک چاپوكتر بوو. پیاوێكی

خۆدار کە پشووی زۆر و خۆشی ژیان نەیخستبوو، لە ئاژەڵێکی پتەو و تۆکمە دەچوو کە بشێت بۆ شەڕی گەورە لە قەفەز بەریدەیت. تا ئەو کات سەرەنجی ئەو هەموو ئەنگوستیلە زێڕانەی دەستیم نەدابوو، بەڵام دواجار پتر لە دە ئەنگوستیلەم لە پەنجەکانیدا بینی، هەر یەکەیان جۆرە نەخشێک و شێوە نقێمێکیان هەبوو. بۆ ئەوەی نەهێڵم گومانم لێبکات، خۆم وا نیشاندا پەلەمەو جۆشێکی زۆرم بۆ بینینی منداڵەکان هەیە. بەڵام بۆ ئەوەی میریش نائومێد نەکەم گووتم « ماڵەکەت ئەندازیارێکی زیرەک و دەستڕەنگینی هەبووە، کە چی هونەرێکی زانیوە لێرەدا بەکاریهێناوە». میر سەفین بە پێکەنینەوە گووتی «هەروابووە، دونیا بێدادە. ئەندازیارەکان هەردەم بەروبومی باغێک بۆ خۆیان دەبەن کە خەڵکی دی دەیچێنێت. هەموو کەس وادەزانێت ئەم گەڕەکە بەرهەمی ئەندازە و خەیاڵی ئەندازیارەکانە، بەڵام وانییە شارە تازەکان، کۆشکە بێوێنەکان، باڵەخانە نهۆمدار و بڵندەکان، یەکەمین جار لە سەری ئێمەدا دروستدەبن. وەک چۆن ئەوەی باران دروستدەکات ئاسمان نییە و دەریایە، ئەوەی کۆشکێکیش دروستدەکات، هێزی هێڵکاری و زیرەکی ئەو نەخشانە نییە کە ئەندازیارێک دەیکێشێت، بەڵکو ئەو خەونەیە کە لە منداڵییەوە لەسەری خاوەن کۆشکەکاندا خەوتووە. خەیاڵی کۆشک دروستکردن لە منداڵییەوە لە مرۆڤدا سەوزدەبێت. پێش ئەوەی ئەم گەڕەکە لە سەر نەخشەی ئەندازیارەکان بەرزبێتەوە، لە خەیاڵی ئێمەدا خولقاوە، پێش ئەوەی ئەم ماڵە کاری ئەندازیارێکی زیرەک بێت، کاری خولیاکانی منە. من لە منداڵیمەوە ئەم ماڵەم لە خەیاڵی خۆمدا دروستکردبوو، بۆ ئەوەی کۆشکێکی جوانت هەبێت، سەرەتا پێویستیت بە خەیاڵە».

قسەکانی کەمێک ڕایانچڵەکاندم، سەیربوو بەلامەوە بارۆن وەک ڕۆحلەبەرێکی خەیاڵی قسەبکات. من لە بیرکردنەوەدا بووم کە بارۆن داوەتیکردم سەیری باڵندە و گوڵەکانی بکەم، بەوەدا من خەیاڵم لای

ئەوە بوو چۆن ئەو ئێوارەیە دەبەمەسەر، لە نێوان وەسفی گوڵ و ستایشی باڵندەکاندا هەموو دەرفەتێکم بەکاردەهێنا لە ڕووی دەروونییەوە خۆم بۆ شتە چاوەڕواننەکراوەکان ئامادەبکەم، میر سەفین هەستی بە ماندوویێتی و گێژیم کرد و گووتی ئێستا دەتبەمە جێگایەک پشوویدەیت. دوای ناساندنی گوڵ و توتی و کەنارییەکان، دەرگای ژوورێکی بۆکردمەوە و گووتی ئەمە ژووری ئەلبومەکانی منە. یەکەمجاربوو لە ژیانمدا شتێک ببیستم ناوی ژووری ئەلبوم بێت، ژوورێکی زۆر گەورە بوو، دیوارەکانی سەراپا بە وێنەی گەورە ڕازابووەوە، وێنەکان نیگاری بارۆن بوون لەگەڵ سەرۆک و سیاسی و وەزیرەکاندا. ژوورەکە سێ ڕەفی درێژیشی تێدابوو، دەیان ئەلبومی نیگار لەسەر ئەو ڕەفانە دانرابوون. ناسیاوی من لەگەڵ بارۆندا هێشتا تویژاڵی و ڕووکەش بوو، زۆر خۆشم لەوە هات مەرحەمەتیکرد و منی بردە یەکێک لەو ژوورانەوە کە جێگایەکی گرنگی خۆی و خانەوادەکەی بوو. تا ئەو کاتە نەمدەزانی بارۆن خولیایەکی وەها زۆری وێنەگرتنی هەیە. ڕەفێکیان وێنە کۆنەکانی بنەماڵەکەیان و کۆمەڵێک نیگاری ناوازەبوو کە مێژووی هەندێکیان دەگەڕایەوە بۆ سەدەی نۆزدە. دوو تاقەکەی دیش، ئەو وێنانەبوون کە بارۆن لە ژیانی خۆیدا گرتبوونی، لە منداڵییەوە تا ئەمڕۆ، دەیان ئەلبومی گەورە کە هەموویان بەپێی ساڵڕۆژ پۆلێنکرابوون. بارۆن لە گەنجیدا کوڕێکی مورەشی قژ درێژ بوو، بەردەوام لە شارە گەورەکانی دەوروبەر وێنەی گرتبوو، وەک زۆربەی گەنجی ئەو سەردەمە بڕێکی زۆری وێنەکانی لەسەر خواردنەوە و مێزی یانەکان بوو. بارۆن نیگاری کچ و کوڕەکانی خۆی نیشاندام کە زۆربەیان ئێستا لە دەرەوەی وڵات بوون. ئەو دووجار ژنی هێنابوو، پازدە منداڵی هەبوو کە ئێستا بەسەر زەویدا دابەشبووبوون، هەندێکیان لە ئەمریکا و هەندێکیان لە وڵاتە جیاوازەکانی ئەورووپا و چەندانێکیشیان لە ئوستراليا دەژیان، من و بارۆن لەو ژوورەدا چەند

جارێک قاوە و چامان خواردەوە و بەردەوام خەریکی سەیرکردنی وێنەکان بووین، پێدەچێت بارۆن لەگەڵ هەموو میوانێکی نوێدا ئەو کارەیکردبێت. نیشاندانی ئەو وێنانە بەشێکبوون لە سروتی ڕێزلێنان و نزیکبوونەوە لای بارۆن، شانازییەکی گەورەی بە ژیانی خۆیەوە دەکرد، ڕابوردووی خۆی وەک ڕابوردوویەکی ناوازە نیشاندەدا، ژیانی وەک ڕوبارێکی نەوەستاو نیگاردەکرد کە ڕۆژەکانی پڕن لە سێبەری ئیش و لە تارمایی پەیوەندی و لە وێستگەی پڕ لە بڕیاری گەورە گەورە. من زوو هەستم بەوەکرد بارۆن بە ستایش و سەرسامی من خۆشحاڵ دەبێت، کەسێک بوو بۆ ئەوە دەژیا ئەوانی دیکە سەرسامبکات، دەبایە ڕێزێکی زۆر و مەدهۆشییەکی گەورە نیشانبدەیت تا وانەزانێت تۆ نرخ بۆ ئەو ژیانە جەنجاڵ و دڵە دونیاگەڕەی ئەو دانانێیت، ئەو ڕەوشە پڕ سەرکێشییەی ژیانی کە لە کوڕی تاقانەی دارتاشێکەوە کردبووی بە بارونێکی گەورە، لای خۆی سەفەرێکی سەندبادئاسای گەورەبوو کە دەبایە بنوسرێتەوە، من بۆ ئەوەی خۆم نزیکبکەمەوە، بەردەوام دەمگووت «جەنابی بارۆن تۆ کەسێکی زەجری زۆرت کێشاوە، مەینەتییەکی زۆرت بینیوە، ماندووبوویت، شتەکان ئاسان نەبوون». ئەو بە ویقارێکی شاهانەوە دەیگووت «هەن زێڕن و دەوەرێن و دەبن بە خۆڵەمێش و خاشاک، هەن لە مەعدەنی ترن و دەتوانن ببن بە زێڕ. هەن لە دایکدەبن و چنگیان پڕە لە تەڵا، بەڵام کە دەمرن کێلی گۆڕەکانیان لە بلۆکی شکاوە، هەشن لە دایکدەبن برسین و کە دەمرن تابووتەکەیان لە زێڕە. من لە جۆری دووەمم، ئەوەی دەزانێت چۆن لە سەرزەمینی ڕەق تەڵا دەربهێنێت».

دەمەوئێواری بارۆن منی لەگەڵ خۆیدا بردە دەرێ و پیاسەیەکی گشتی بە «نوێمیران» دا پێکردم، گەڕەکێکی لەوە گەورەتربوو کە من چاوەڕوانمدەکرد. دوو یانەی گەورەی نیشاندام، یەکێکیان لەم سەری نوێمیران و ئەوی تریان لەوسەری بوو، یانەیەکیان ناوی «یانەی نەمام»

بوو ئەوی دیکەیان ناوی «مرواری» بوو. بارۆنەکان و خێزانەکانیان پتر دەچوون بۆ ئەو دوو یانەیە، باسی لە کۆمەڵێک مەزرا و خانووی هاوینەش کرد کە لە دەرەوەی شار بۆ پشوو دروستیکردون. بارۆن پێیگووتم «نوێمیران گەرەکێکی گەورەیە، سنوورێکی دیاریکراوی نییە، لە ناواخندا سەیرتر و گەورەترە وەک لە شێوەی دەرەکی و ڕووکاری دەرەوەدا دەیبینیت. کتێبێکی سیحرە لە داخراندا بچوک و لە کرانەوەدا گەورەیە. ژیان لەنوێمیران وەک ژیان وایە لە ناو مەتەڵێکدا، حیسابێکە ڕێکەوت ڕۆڵێکی گەورەی تیادەبینێت، هیچ کەس ناتوانێت دڵنیابێت کە یەکێک لە دەرگاکان دەکاتەوە چی دەبینێت. لێرە هەموو دەرگاکان بە جۆرێک لە جۆرەکان تەلیسماوی و سەر بە دونیای نهێنین. تەنیا ئەو کەسانە ئاسوودەدەبن کە نایانەوێت مەتەڵەکان شیبکەنەوە. وەک چۆن نهێنی ئاسمان بە تێگەیشتن لە نهێنی تەنیا ئەستێرەیەک ناشکێت، نهێنی ئێرەش بە شکاندنی تەلیسمی تەنیا مرۆڤێک یان تەنیا ماڵێک ناشکێت... ئێرە وەک تیبە نییە، دەزانیت تیبە کوێیە. ها، وامەزانە بارۆنی برات گێل و هیچ نەدیدەیە، باسی ئەو شارە مەلعونەت بۆدەکەم کە ئۆدیبۆس چوو و لەوێ ژۆکاستای دایکی خۆی مارەکردەوە، ئەو دێوە گەورەیەی پێش شارت لە بیرە، ها، لەبیرتە، خۆ ئەمە حیکایەتێک نییە کەس نەیبیستبێت. تۆ کە شارەزایەکی وەها زۆرت لە سینەمادا هەیە، دەزانیت ئۆدیبۆس کێیە، دڵنیام دەزانیت، ئەو مەتەڵەت لە بیرە کە هەر کەس هەڵینەهێنێت «سفێنێکس» ئەو شێرئادەمە ترسناکە کە لەسەر بەردێکی زل دانیشتووە دەیکوژێت. نا برای من، ئێرە تیبە نییە، لێرە دڕندەیەکی تر حوکمدەکات، لێرە بە پێچەوانەوە هەر کەس وەڵامی مەتەڵەکان بزانێت دەکوژرێت، هەر کەسێک مەتەڵەکان شیبکاتەوە لەوانەیە تیابچێت. شوێن هەیە بە مەتەڵەکانی ناوی دەژی و دەمێنێتەوە، نوێمیران لەو شوێنانەیە. نە شەرمە و نە کوشتنی خۆرە، نە نهێنییە و نە شکاندنی زوڵمەتگاهی

شەوە، نوێمیران نیشتیمانی نهێنییە وردەکانە. هیچ کەس بە دروستی نازانێت نهێنی گەورەی ئەم گەڕەکە چییە، بەدبەختە ئەوەی بۆ نهێنییەکی گەورە دەگەڕێت، هەموو شتەکان نهێنی بچوک بچوکن. نوێمیران مانای هەزار دەرگا لە پشت هەر دەرگایەکەوە هەزار تەلیسم، لە کۆی ئەو تەلیسمانە شتێکی نوێ دروستبووە، دونیایەکی تر... ئەوەیە نوێمیران».

تێنەگەیشتم بۆ بارۆن ئەو زانیاریانەم دەداتێ، بەلام هەستمکرد بارۆن دەیەوێت هەر لە سەرەتاوە دڵچنۆکی و نیهاندۆزیم بکوژێت، نەبا زۆر ئەو حەرامانە ببڕم کە تووشی دەرد و گێچەڵی گەورەم دەکەن. هەر لەو گەشتە گشتی و خێرایەدا بە کۆڵانە بێدەنگەکانی قەڵای بارۆنەکاندا میر سەفین، بەدەستێکی شۆفێری دەکرد و بەدەستێک جگەرەی دەکێشا و قسەیدەکرد، گەلەک بە سادەیی گووتی « گوناه، گوناهی بارۆنەکان نییە، لە هەر شوێنێک مرۆڤ مەحکوم بێت بە ئەخلاق، سەرتاپای ژیان دەبێتە نهێنی. مرۆڤ بۆ ئەوە دروستنەبووە، بوونەوەرێکی بە ئەخلاق بێت». پاش ئێستێک گووتی « دوای عومرێکی درێژ گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی، نهێنی ئەو شتە نییە کە مرۆڤ لەوانی دی دەشارێتەوە، بەڵکو ئەو شتەیە کە مرۆڤ لە خۆی دەشارێتەوە، خەڵکی ئەم گەڕەکە بەر لەوەی شتەکان لە دونیا بشارنەوە لە خۆیانی دەشارنەوە... لەبەرئەوە هەموومان زۆر بەختەوەرین». هەستمکرد بارۆنی بوکەشوشە دەیەوێت کەسێک لە دەرەوەی ئەم جیهانە، لە دەرەوەی هاوڕێ و کەسە نزیکەکانی خۆی، یەکێک لە خواری خوارەوەی دونیا گوێی لە بۆچوونەکانی بێت، زۆر مەبەستی بوو من شتێک لە بۆچوونەکانی سەبارەت بە دونیا بزانم. زۆرجار بێدەنگ دەبووم و گوێمدەگرت، خۆم وەک گەنجێک نیشاندەدا کە زۆر خۆشحاڵە کەسێکی بە ئەزموونی وەک بارۆنی دەستکەوتووە قسەی بۆ بکات. گەرچی هەستم نەدەکرد بارۆنم خۆشبوێت، بەلام هەستم نەدەکرد ڕقیشم لێی بێت. قسەکانی سەبارەت بە نهێنی بۆ من سەیر و دوومانا

بوون، من وا تێگەیشتم ترسی بارۆنەكان لە خۆیان، وادەكات لە هەموو شتێک بە گومان بن. لەسەرەخۆ و بەشەرمەوە بەبارۆنم گووت«میری ئازیزمان، گەر وابێت ئەوا مرۆڤ تاكە بوونەوەرێكە دەتوانێت درۆ لەگەڵ خۆیدا بكات، پێتوانییە كە هیچ بوونەوەرێكی تر جگە لە مرۆڤ ئەو توانایەی تیا نییَە كە درۆ لەگەڵ خۆیدا بكات؟». بارۆن گووتی « هەر كات نهێنییەک ئاشكرادەبێت، مرۆڤ دەبێت ڕوو بە ڕوو سەیری ڕوخساری خۆی بكات. هەیبەت شكێنە مرۆڤ ناچاركەیت سەیری خۆی بكات، هەموو ئەو كەسانەمان خۆشدەوێت، كە ناهێڵن ناخی خۆمان ببینین، هاوڕێتی ئەوەیە ڕێكامبدەیت پتر لە خۆم ونبم... هەر كاتێک ئەو هەڵە كوشندەیەت كرد و بوویتە مایەی ئەوەی بارۆنێكی ئەم شارە سەیری ناو دڵی خۆی بكات، سەیری نهێنییەكانی خۆی بكات، بزانە تیاچوویت، دەبێت بڕۆیت و ئەم ولاتە بەجێبهێڵیت». لەم قسانەی بارۆن زۆر ترسام، بەڵام دەمزانی تازە ناتوانم پاشەكشێبكەم. ئوتومبیلەكە هەندێجار هێند خاو دەڕۆی، گەلای بابردوو پێشماندەكەوت، باغەوانێكمان بینی چیمەنەكانی ئاودەدا، كۆترێكمان بینی دوودڵ بوو لە نیشتنەوە، پاسارییەكمان بینی سەیری پاسارییەكی تری دەكرد. پاش كەمێک، لە بەردەم ماڵێكی ئێجگار ئەفسانەیی و گەورەدا وەستا، دیوارەكانی بەردی سپی و ڕەنگی پەنجەرەكانی شەرابیبوون. خانوویەكی سێ نهۆمی گەورە كە پێدەچوو شەیتان خۆی ئەندازیاری بووبێت. لەگەڵ هەموو جوانییەكەیدا شتێكی شەڕانی تێدابوو، شتێک ڕاستەوخۆ نە لە دیكۆر و نە لە كەرەستەی تەلارەكەدا بەدەرنەدەكەوت، شەڕانگێزییەكی شاردراوە و نادیار، كە پێدەچوو بە تەنیا من هەستی پێبكەم. بارۆنی بوكەشوشە بەدەنگێكی گڕ و خاڵی لە هەر نەغمەیەک، وەک گۆڕی كەسێكم نیشانبدات گووتی ئێرە ماڵی بارۆنی سێبەرە. من هەنگاوی یەكەمم بەرەو دەرگاكە نا، هەستمكرد سێبەرەكانمان زۆر لە پێش خۆمانەوە دەڕۆنە ژوورێ.

ناوی ڕاستەقینەی بارۆنی سێبەر، مەهدی خوداداد بوو، لەو کەسانەبوو کە لە دوای ساڵی نەوەدوحەوتەوە دەوڵەمەند بووبوون.سەرەتا تەنیا بەردەستی یەکێک لە بەر پرسە گەورەکانی حیزب بوو، لەوانەبوو کە بازاڕی بۆ دەکردن، لە نانەوخانە نانی بۆ دەهێنانەوە، ئوتومبیلی دەشت، دواتر بووبوو بە یەکێک لە پارەگێڕەکان. کەسێکی سورفلی چکۆلانە بوو بە دەموچاوێکی گۆشتن و پڕ گرێوە، لە پیتەر ئەستینۆف دەچوو لە فلیمی «سوڕانەوە بە دەوری زەویدا لە هەشتا ڕۆژدا» لەگەڵ پێرسی برۆسناندا زەمانێک کە برۆسنان تازە ئەستێرەی دەدرەوشایەوە و هێشتا ڕۆڵە ئەفسووناوییەکانی خۆی لە زنجیرە فلیمەکانی جەیمس بۆندا نەبینیبوو. بەڵام مەهدی خوداداد دەوڵەمەندبوونی بەهانایەوە نەهاتبوو. چاکەت و پانتۆڵێکی ڕەشی بریقەداری لە بەردابوو، ورگێکی وەها دەرپەڕیوی هەبوو، هیچ جلێکی جوانی دونیا ڕاستی نەدەکردەوە، قژێکی خاوی چەور بەسەریەوە بوو کە هێند خراپ ڕەشی کردبووەوە، هەر کەس بیدیبایە دەیزانی خراپترین جۆرە بۆیەی هیندی و پاکستانی بەکاردەهێنێت. بارۆنی بوکەشوشە گوتی «بۆیە ناویان ناوە بارۆنی سێبەر، چونکە هەندێک وا هەستدەکەن بە ئاسان بۆتە بارۆن، لە هیچەوە دروستبووە، لە بەر سێبەرەوە هاتووە، وەک ئێمە ڕەنجێکی دووردرێژی نەکێشاوە، عارەقەی نەڕشتووە. بەڵام هەندێکی دی وەک پیاوێکی ژێرەوانکێ سەیریدەکەن کە لە ژێرەوە، لە دونیای سێبەر و تاریکیدا کاردەکات».

بارۆن پێشوازی گەرمی لێکردین، خولقێکی زۆری قسەکردنی هەبوو، هێند لە باڵکۆنە قەشەنگەکەیاندا دانیشتین لەگەڵ بارۆنی بوکەشوشەدا کەوتنە باسکردنی ئەو ئەگەرە زۆرانەی دوای ڕوخانی دیکتاتۆر هاتوونە دەست، لە قسەکانیاندا تێگەیشتم ژمارەیەک بارۆن هەندێک لە بەردی ناوازە و ئاسەواری سەیری مۆزەخانەکانی باشووریان دەستکەوتووە و بە

پارەی خەیاڵی فرۆشتوویانەتەوە بە ئێران. بەڵام لە ناکاو بابەتەکانیان گۆڕی و کەوتنە باسی پڕۆژەیەکی گەورەی ئاوەڕۆ، کە بارۆنی سێبەر بەتەمایە لەگەڵ یەکێکی دیدا جێبەجێیبکات. وەک گوێگرێکی شەرمن خۆم لە باسەکان وەرنەدا و بە هێمنی سەیری دەست و قاچی بارۆنی سێبەرم دەکرد کە لە کاتی قسەکردندا دەیجولاند، پێشتر کەسێکم نەبینیبوو وەک ئەو لە کاتی قسەکردندا هێندە قاچی بجوڵێنێت، ئادەمیزادەکان زۆربەیان نیوەی سەرەوەیان دەجوڵێنن، بەڵام بارۆن، بە جۆرێکی کۆمیدی و خۆنەویست یاری بە قاچی دەکرد. میر بە هەموو ویقاری خۆیەوە بەرابەر مەهدی خوداداد دانیشتبوو و بە وردی گوێیدەگرت. ئاغای «سێبەر» سەرەتا بایەخێکی وەهای بە من نەدا، گەرچی قسەکانیان لەگەڵ میر سەفیندا گشتی و هەمەکاتەبوو، شتێک نەبوو پێویست و زووکاربێت، لەگەڵ ئەوەشدا وەها خێرا دەستی دەجولاند و بە ئارەزوویەکی وا گەرم باسی لە شتەکان دەکرد، وامدەزانی لە شتگەلێک دەدوێت بۆ ئەو زۆر ترسناک و گرنگن. لە نێوان قسەکاندا دووجار کوڕێکی گەنج بە جووتێک چاوی شین و قژێکی درێژ و کاڵەوە، کاکاو و بسکویت و جۆرە شیرینییەکی دیکەی بۆ هێناین کە پێموابوو لە خورما و گوێزی هیندی و بادەم دروستکراوە، ئەو شیرینییە هێند بە تام بوو ئومێد و چاوەڕوانی و هیوای تیا دروستکردم، هەندێک تام هەن وەها دڵت خۆش دەکەن دواتر حەزدەکەیت زۆر بژیت.

باڵکۆنەکەی بارۆن بە چەشنێک شاعیری و هێمن بوو، پڕبوو لە دەنگی بولبولە خۆشخوانەکانی ئێوارانی هاوین، من دەمویست زۆرترین ماوە لێرە دانیشم و لەو شیرینییە خۆشە بخۆم و گوێ لە دەنگی بولبولەکان بگرم. وەک ئەوەی بارۆنی سێبەر بزانێت من گوێ لە بولبولەکان دەگرم، گووتی«خودایە ئەم بولبولە مەلعونانە، خودایە لە دەست ئەم بولبولە مەلعونانە، هەموویان هەڵهاتووی قەفەزن، هەموویان لە قەفەزەکان هەڵدێن

و دەڕۆن و لە دەرەوە لەسەر درەختەکان دەخوێنن، بۆ هەر کوێ بفڕن دێنەوە بۆ نوێمیران، لە بەهاردا ڕادەکەن و تا دەخوێنن دەخوێنن و دوایی دەمرن. من لە بولبول تێناگەم، ڕاستیت دەوێت جەنابی میر من هیچ لە بولبول تێناگەم». من بەلامەوە سەیر نەبوو پیاوێکی وەها لە بولبول تێنەگات، دواتر زانیم بە گشتی بارۆنەکان لە بولبول تێناگەن. دوای ماوەیەکی درێژ، ڕوویکردە من و گووتی « کەواتە تۆ حیکایەتخوانەکەمانیت، پێمبڵێ، تۆ چ جۆرە حیکایەتێک دەگێڕیتەوە؟». پرسیارەکەی کتوپڕ و لە ناکاو بوو، من کەمێک ڕاچڵەکیم. هەمووتان دەزانن ئەوە چ پرسیارێکی بێمێشکانەیە، تەنیا ئەوانە دەیکەن کە هیچ لە حیکایەت نازانن. بێئەوەی بیربکەمەوە بە هێمنی گووتم« جەنابی میر، حیکایەتی ئەو فریشتە پاکانەی کە لە ئاسمانەوە دێن و ماوەیەک لەسەر زەوی دەمێننەوە، حیکایەتی پەپولەیەکی ڕەش کە لە نێوان دوو باغدا شەڕێکی گەورە هەڵدەگیرسێنێت، حیکایەتی «هەنگوینی خەیاڵ» کە هەر کەس بیخوات شێوە و ڕەنگی دەگۆڕێت و لە سیماو ڕوخساری پەرییان نزیکدەبێتەوە، حیکایەتی کچێکی نەخۆش کە ناوی فرمێسکە و بەردەوام لەگەڵ ئەو مراویانەدا قسەدەکات کە لە گۆمی ئەشکی ئەودا مەلەدەکەن... ئەوانەو سەدان حیکایەتی تریش». ئاغای سێبەر کەمێک ڕیشی خوراند و گووتی «حیکایەتی خەیاڵی شتێکی باشە، بەڵام حەزدەکەم منداڵەکانم فێری بینینی دونیا بن، فێری ڕەوشتی بەرزبن، فێری خۆفیداکاری بن و نیشتیمانەکەی خۆیان خۆشبوێت». لەو ساتەدا هەستێکی سەیرم تێدابوو پێڵاوەکانم داکەنم و بیدەم بەسەری بارۆنی سێبەردا، من ڕقم لەهەموو ئەو پیاو و ژنانەیە کە زۆر باسی نیشتیمان دەکەن. لە منداڵیمەوە دەزانم هەموو ئەوانەی زۆر باسی نیشتیمان دەکەن، لەوانی دی زیاتر ئەگەری خیانەت و دڵڕەقی و بێویژدانیان تێدایە. بەڵام بە نەزاکەت و ڕێزەوە گووتم«جەنابی بارۆن، منداڵان بەر لەوەی فێری

خۆشەویستی نیشتیمان بن، دەبێت فێری خۆشەویستی ژیان ببن، دەبێت فێربن پەپولەیان خۆشبوێت، حەزیان لە دەنگی بولبول بێت، جەنابی بارۆن، نیشتیمان لە کۆمەڵێک شتی بچوک درستبووە، مرۆڤ گەر ئەو شتە بچوکانەی خۆشنەوێت نیشتیمانیشی خۆشناوێت». پێدەچێت قسەکانم بۆ بارۆن سەیر و تازە بووبێت، بەڵام هەستمکرد هەڵەیەکی گەورەم کردوە، نەدەبایە لە یەکەم ڕستەوە بەو چەشنە تۆوی گومان سەوزبکەم. بەڵام خۆشبەختانە کابرا لەوە گێل و کاڵفامتربوو لەو قسانە تێبگات. سەیرم لێهات بارۆن قسەیەکی توندی بەرابەر نەکردم، دواتر تێگەیشتم بارۆنەکان ترسێکی گەوەیان لەو خەڵکانە هەیە کە پێیاندەڵێن ڕۆشنبیر، دیاربوو ئەویش منی لە ڕیزی ئەواندا حیسابکردوە. پێدەچوو لە ساتی یەکەمەوە بێویستی خۆم، وەک ڕۆشنبیرێک خۆم وێناکردبێت. بارۆنی سێبەر دوای ئەو قسانە ڕووی لێوەرگێڕام و بە شتێک لە گەرمی و خێراییەوە، وەک ئەوەی شتێک وشەکان لە گەرویدا ڕاوبنێت بە میر سەفینی گووت «بە هەر حاڵ، منداڵەکانم حەزیان لە هەموو چیرۆکێکە، بارۆن منداڵی ئێمە و ئەوان نابێت بە یەک، وا نییە، وانییە نابێت بە یەک، نابێت بەیەک». ئەوە بەهانەیەکی دی بوو، ئەم پیاوەم خۆشنەوێت، ئەو مرۆڤانەی منداڵی خۆیان بە منداڵانی دیکە بەراوردەکەن ترسناکن، دەشێت هەمیشە لە بۆسەدابن بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆیان لە جیهان بستێنن. من حەزمدەکرد زوو بەو منداڵەم بناسێنن کە دەبایە چیرۆکی بۆبگێڕمەوە. من ڕۆحێکی غەمگینم تەنیا لەگەڵ منداڵاندا ئارام و ئاسوودە دەبم. بەڵام هەردوو بارۆن بێئەوەی گوێبدەنە من، بەردەوام قسەیاندەکرد، ناوی کۆمەڵێک سیاسی و بازرگانیان دەهێنا من نەمدەناسین، هەندێجار ناوی یەکێک لە کۆمپانیاکان دەپەڕییەوە ناو ڕستەکانیانەوە، هەردووکیان دڵنیابوون من سەر لەو قسانە دەرناکەم. کە ئێوارێ ڕووی لە تاریکی کرد، بارۆنی سێبەر بەو قامەتە خڕچەشنەی خۆیەوە، پێشمکەوت بۆ

قاتـی سـەرەوە، ماڵەکـەی بارۆنیـش سـەرتاپا فـەرش و هۆرتـەی گرانبەهابـوو، خامۆشییەکی قـووڵ و بێدەنگییەکـی سـەیر باڵـی بەسـەر تەواوی کۆشـکەکەدا گرتبـوو. بـارۆن لەسـەرەوە دەرگای ژوورێکـی گـەورەی کـردەوەو پێکـەوە چووینـەژوورێ. سـەرەتا بـە هـۆی تاریکییـەوە هیچم نەبینـی، لـە نـاکاو وەک تیشـک بـە لێشـاوێکی گـەورە پەلامارمانبـدات، چەندەهـا گڵـۆپ داگیرسـان، پێشـتر لـە ژیانمـدا ژوورێکـم نەبینیبـوو هێنـدە زۆر گڵۆپـی تێدابێـت، تـا چەنـد چرکەیـەک بـەردەوام گڵـۆپ دادەگیرسـا، بـۆ ئێسـتێک ڕوناکـی هێنـد زۆربـوو مـن دەستمگرت بـە چاومـەوە، لـە ناوەڕاستی ژوورەکـەدا وەسـتام و ئـەو منداڵـەم لـە دەسـتێک جلـی سپیدا بینـی، کراسـێکی سـپی و کاوبۆیەکـی کچانـەی سـپی. لەسـەر قەراغـی قەرەوێڵەکـەی دانیشـتبوو، کەمێـک تـوڕە و غەمگیـن دیاربـوو، هیـچ شـتێکی لـە باوکـی نەدەچـوو، دەموچاوێکـی باریـک و سـاف و سـپی هەبـوو، قژێکـی نەرمـی زۆر ڕەش، جلەکانـی و ڕوخسـاری بەجۆرێـک سپیبوون دیمەنێکـی ترسـناکیان پێبەخشـیبوو، بەڵام نیـگای هێمن دەینوانـد. ژووری منداڵەکـەش لـەوە خۆشـتربوو لـە ژووری منـداڵان بچێـت، پڕبـوو لـە دۆڵابـی گـەورە کـە پێکـڕا لـە تەختـەی زۆر گـران و نایـاب دروسـتکرابوون، قەرەوێڵەکەشـی لـە دیکـۆر و شـێوەدا لـە شـێوەی دولفینێکـی بچکۆلـەدا نەخشـکرابوو. هەسـتمکرد بینینـی بارۆنـی بوکەشوشـە منداڵەکـەی دڵخۆشـکردوە، بـە نیـگا و سـەیرکردنەکانیدا دیاربـوو بـاوەڕی بـە بـارۆن لـە بـاوەڕی بـە باوکـی گەورەتـرە. گەرچـی بـارۆن پیاوێـک بـوو هیچـی ئەوتـۆی لـە منـداڵان نەدەزانـی، بـەڵام بـە هـۆی دیـاری و یارییەکانییـەوە منـداڵان خۆشیاندەویسـت. ئاغـای سێبەر منـی بـە منداڵەکـەی خـۆی ناسـاند، کچێکـی نـۆ سـاڵ بـوو بـە نـاوی «نەونیـگا»وە، بـارۆن بـە نەونـەو بانگیدەکـرد. جووتێـک چاوی سـەوز و گـەورە و سـیحراوی هەبـوو، لـە چـاوی پشـیلەیەکی ڕەش دەچـوو لـە تاریکیـدا بدرەوشـێتەوە. بـارۆن وەک هەمـوو ئـەو پیـاوە بێمێشـکانەی ئـەم وڵاتـە کـە نازانـن قسـە لەگـەڵ منداڵـدا بکـەن، دەمـی

پانکردەوەو گووتی «کاک ماجید حیکایەتی خۆشت بۆدەکات». منداڵەکە بە چاوەگەشەکانی سەیریکردم و هیچی نەگووت، نە ئەو هەستی بە شتێکی تایبەتی کرد و نە من. ترسناکە منداڵان لە ساتی یەکەمەوە رقیان لێتبێت، دواتر زۆر بە زەحمەت دەتوانیت شتەکان ڕاستبکەیتەوە. لە ڕاستیدا منداڵان زۆر پاک و بێگوناه نین، هەموویان بە جۆرێک لە جۆرەکان جۆرە حوکمێکی پێشوەخت و کینایان لە دڵدا هەیە. کە «نەونیگا» سەیریکردم لەوە دەترسام پێشوەخت رقی لێمبێت، بەڵام شتێکی ئەوتۆ تایبەتیم لە چاویدا نەخوێندەوە. پێم سەیربوو کە بارۆن بەر لە خوداحافیزی بە ئەسپایی بە منی گووت، نەونیگا کچی ئەو نییە، بەڵکو برازای ژنەکەیەتی کە لە ڕووداوێکی نادیاردا تیاچووە... منداڵەکەش دوای مردنی باوکی تووشی کۆمەڵێک دۆخی دەرونی سەخت بووە کە مرۆڤ دەبێت زۆر ئاگاداری بێت.

پاش ئێستێکی کەم ئەوان ڕۆیشتن و من و ئەو پێکەوە لە ژوورەکەدا ماینەوە. دوو سەعاتم هەبوو لەگەڵ نەونیگادا بیبەمەسەر. لەگەڵ ڕۆیشتنی ئەواندا خامۆشییەکی گەورە باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا، ئەوەی لە ماڵی بارۆنی سێبەردا سەیربوو ئەو بێدەنگییەبوو، بێدەنگییەکی هێند قووڵ و دەستسالار بوو مرۆڤ دەترسا. بۆ ئێستێک وەک شتێک ئیفلیجکردبم، سەیری ئەو منداڵەم کرد و لە شوێنی خۆم نەجولام. پاش تۆزێک ئەو گووتی «تۆ بەڕاستی ناوت ماجیدە، بەڕاستی، یان گاڵتەدەکەیت؟». ئەوە منی تۆزێک ئارامکردەوە و گووتم «بەڕاستی ناوم ماجیدە، بەڕاستی». بە چاوە سەیرەکانی گووتی « تۆ چەند حیکایەت دەزانی؟». چوومە تەنیشتییەوە و گووتم «هەزار حیکایەت. لەوانەیە زیاتریش... بەتەواوی نازانم؟ کەس ناتوانێت بزانێت چەند حیکایەت دەزانێت، کە دەستدەکەین بە ژماردنی حیکایەتەکان، وردە وردە چیرۆکی تریشمان بیردەکەوێتەوە کە حیسابمان نەکردون». بە شەرمەوە گووتی «بەڵام من دوو حیکایەت

دەزانم، دووان و هیچی تر. پورە نەرمینم دەڵێت، دوو حیکایەت بۆ کچێک لە تەمەنی مندا زۆر کەمە». من دەستێکی بچوکم بە قژیدا هێنا و گووتم «من دڵنیام تۆ لە دوو حیکایەت زیاتر دەزانیت، دڵنیام». بە خەفەتێکەوە گووتی «نا من بەس حیکایەتی سەندرێلا دەزانم، لەگەڵ حیکایەتی «ئاونگی کچی پادشا»... لەوە زیاتر، هیچ شتێکی تر نازانم. من سەیرمکرد و بە دڵنیاییەوە گووتم «نا تۆ حیکایەتی زۆرتر دەزانیت، مرۆڤ زۆر شت دەزانێت کە وادەزانێت نایانزانێت. زۆر شتیش نازانێت کەچی وادەزانێت دەیانزانێت، ئێمەی مرۆڤ وەهاین».

بەسەرسامییەوە سەیریکردم، چاوەکانی بە ئەندازەیەک جوان بوون، مرۆڤی دەترسان. من لە سەفەرە خەیاڵییەکانیشمدا، چاوێکی وەها پاک و ساف و بریسکەدارم نەبینیبوو. بە ئەسپایی پرسی «ئەی تۆ حیکایەتێک دەزانیت، کە من دەیزانم و کەچی وادەزانم نایزانم؟». تۆزێک وەستام و سەیری بوکەشوشەکەی تەنیشتیم کرد و گووتم «بێگومان، حیکایەتی ئەو بوکەشوشەیە، کە یەکێکە لە حیکایەتە خۆشەکان، تۆ دەیزانیت و کەچی وادەزانیت نایزانیت». سەیری بوکەشوشەکەی کرد و گووتی «مەبەستت هیسۆیە؟». من بە کەمتەرخەمییەکەوە شانم هەڵتەکاند و گووتم «هەڵبەت مەبەستم هیسۆیە». بە خەفەتێکەوە سەیریکردم و بە ئەسپایی بۆ ئەوەی بوکەشوشەکە گوێی لێنەبێت گووتی «بێدەنگ بە، هیسۆ باوکی مردوە، نابێت بزانێت». من گووتم «ئاە، باوکی مردوە؟ چۆن مردوە، بۆ پێیناڵێیت کە باوکی مردوە؟». بەچرپەوە گووتی «باوکی لە ئەسپ کەوتۆتەخوارێ، تێدەگەیت؟ باوکی لە شەڕدا لە ئەسپ کەوتۆتە خوارێ و مردوە». گووتم «ئەی هیسۆ ئێستا چی دەکات؟». بە ئەسپایی گووتی «هیچ ناکات، بە ڕۆژ دەچێتە بەر ئەو پەنجەرەیە و چاوەڕوانی باوکی دەکات، من ناهێڵم کەس پێی بڵێت، تێدەگەیت، هەتا تۆش بۆت نییە پێی بڵێیت، پورە نەرمینیش بۆی نییە

پێی بڵێت». بە ئەسپایی گووتم «گەر تۆ حەزنەکەیت، من پێیناڵێم، بەڵام دەتەوێت تا کەی پێی نەڵێیت؟». بوکەشوشەکەی گرتە باوەش و گووتی «تا هەتاهەتایە». من دەستم بەسەریدا هێنا و گووتم «زۆرباشە پێی ناڵێین، تێدەگەیت؟ پێی ناڵێین، من و تۆ پێکەوە نامەی بۆ دەنوسین، تێدەگەیت دڵخۆشیدەکەین، دەڵێین ئەوە نامەی باوکتە، دیاری بۆ دەنێرین، دەڵێین باوکت چووە بۆ وڵاتێکی تر، تا بتوانێت لەوێوە دیاریت بۆ بنێرێت». زەردەخەنەیەکی گەورە کەوتە سەر ڕوخساری و بە گەرمییەوە گووتی «دەڵێین باوکت چووە ئاڵتون بدۆزێتەوە، تێدەگەیت چووە ئاڵتون بدۆزێتەوە». خۆشبەختانە هەستمکرد لێم نزیکدەبێتەوە. من گووتم «دەبینیت، تۆ حیکایەتی هیسۆ بە تەواوەتی دەزانیت، ئیتر پورە نەرمین ناتوانێت بە ئاسانی پێتبڵێ تۆ حیکایەت کەم دەزانیت، ناتوانێت، تۆ ئێستا سێ حیکایەت دەزانێت». بەسەرسامییەوە گووتی «بەڵام ئەوەی هیسۆ حیکایەت نییە، باوکی هیسۆ بە ڕاستی مردوە». منیش پێمگووت «دەزانم، بەڵام کە تۆ دەیگێڕیتەوە دەبێت بە حیکایەت، هەر وەختێک تۆ بە جوانی شتێک بگێڕیتەوە، ئەوە حیکایەتە... گرنگ نییە ڕاستییە یان نا». بە گومانەوە سەیریکردم و گووتی «بەڵام نامەوێت حیکایەتی هیسۆ بۆکەس بگێڕمەوە، گەر پورە نەرمین بزانێت، هیسۆم لێدەسەنێت، چونکە ئەو دەڵێت، من نابێت قسە لەگەڵ هیسۆدا بکەم، هیسۆ بوکەشوشەیە، ڕۆحی لە بەردا نییە». من نەمزانی بڵێم چی، گووتم «نەونیکا، گوێبگرە، من ئەمشەو دوو چیرۆکت فێردەکەم، دوو چیرۆک، دەتوانیت سبەی هەردووکیان بۆ پورە نەرمین بگێڕیتەوە، من هەر شەوێک بێم دوو چیرۆکت فێردەکەم، پاش ماوەیەکی تر تۆ لە پورە نەرمین چیرۆک زیاتر دەزانیت». بە خۆشحاڵییەوە سەیریکردم و گووتی «ئیتر دەتوانم بە پورە نەرمین بڵێم کە بۆنی پیازی لێدێت، دەتوانم پێشی بڵێم لەو حیکایەت زیاتر دەزانم، دەتوانم واشی لێبکەم

بگـری». مـن سـەیرمکرد و پێمگـووت «بەڵـێ، دەتوانیـت وای لێبکەیـت بگـری».

زۆربـەی منداڵانـی نوێمیـران غەمگینبـوون، زۆربەیـان وەک نەونـەو چیرۆکێکـی نهێنـی لـە دڵیانـدا بـوو، تەلیسـمێک و گرێیـەک لـە ژیانیانـدا هەبوو کـە نەیاندەویست کـەس بیکاتـەوە و بیزانێـت... دواتـر کـە لـە دونیـای ژن و پیاوانـی نوێمیرانیـش نزیکبوومـەوە، بۆم دەرکـەوت نوێمیـران گەڕەکێکـە سـەرتاپای لـە نهێنـی دروسـتبووە.

ئـەو شـەوە دەسـتمکرد بـە گێڕانـەوەی یەکەمیـن چیرۆکـی خـۆم بـۆ نەونیـگا...

بـەو جۆرە بـووم بـە حیکایەتخوانـی منداڵانـی بارۆنـەکان، لـە ماوەیەکـی کەمـدا چیرۆکەکانـم لـە نوێمیرانـدا دەنگیاندایـەوە، ئـەو حـەزە بێسنوورەی منـداڵان لـە حیکایەتەکانـم دەرگای هەمـوو نوێمیرانی بۆ خسـتمە سـەر پشـت، وای لێهـات لـە ئێـوارەوە بـە سـەر ماڵـی بارۆنەکانـدا دەگـەڕام. کۆشـکی هیـچ بارۆنێـک لـە کۆشـکی ئـەوی دی نەدەچـوو، هەمیشـە لەبـەردەرگا ئیشـکەرێک یـان خزمەتچییـەک دەرگای لێدەکردمـەوە و بـە نـاو سـاڵۆن و ڕاڕەوێکـی درێـژدا منـی دەبـردە قاتـی سـەرەوە، منداڵانـی نوێمیـران هەموویـان تێکـڕا لـە قاتـی سـەرەوە دەژیـان. دەمێـک دەچوومـە ماڵـی بارۆنـەکان، کۆشـکەکانیان وەهـا خامـۆش و بێدەنگبـوون، ترسـم لێدەنیشـت. چەندیـن هەفتـە کارمکـرد و یـەک ئافرەتیشـم لـە نوێمیرانـدا نەبینـی، وامدەزانـی ئـەم گەڕەکـە گەورەیـە تەنیـا پیـاوان و منـداڵان تیادەژیـن، ڕێـگای منیـان وا ڕێکخسـتبوو نەچێتـە سـەر ڕێـگای هیـچ ژن و کچێکـی ئـەو گەڕەکـە، وەک ئـەوەی یەکێـک بـە نەخشـەیەکی ورد هەمـوو ڕێـگای هاتوچـۆی منـی کێشـابێت. تـا شـەوێکیان بارۆنـی بوکەشوشـە داوەتیکـردم و لـەو داوەتـەدا جوانتریـن ژن و کچانـی بارۆنسـتانم بینـی و لەوێـدا ژنـی بارۆنـی مریشکیشـم ناسـی.

## لە شەوگاری ئەم شارە ڕامام و خوێنم بینی
## «حەسەن تۆفان - مایس و حوزەیرانی ٢٠٠٤»

یەکەمجار غەزەلنوسم لە بەهاری ساڵی ١٩٩٨ دا ناسی، ئەوکات ئەو لە مێژبوو بە هەزارباغدا دەسوڕایەوە. غەزەلنوس زۆر بە ئاسانی دەرگای ماڵی خۆی بۆ خەڵکی غەریب دەکردەوە، لەدوای ڕاپەڕینەوە ماڵەکەی ناونابوو بنکەی منداڵانی بێسەرپەرشت. خۆی دەرامەتێکی وەها گەورەی نەبوو، کۆمەڵێک ڕێکخراوی بیانی لە بەخێوکردنی منداڵەکاندا کۆمەکیاندەکرد. ماوەیەک بەر لەوەی دەستبکەین بە نوسینی ئەو کتێبە گەورەیە، ئێوارەیەک چووم بۆ ماڵی غەزەلنوس و منداڵە خەیاڵییەکانی ئەوم بینی. بەخێوکردنی دە منداڵی کچ و کوڕ لە ئەستۆی غەزەلنوس بوو، پیرێژنێک و پیرەمێردێکی چکۆلانە لە بەخێوکردنی منداڵەکاندا کۆمەکیان دەکرد. زارۆ خەیاڵییەکانی جوانترین منداڵی دونیا بوون، هەموویان شتێک لە نیگاری فریشتە و کەمێک لە عەتری ئاسمانیان پێوەبوو، ئەو هەردەم بە شانازییەوە دەیگووت «ساف خەیاڵن و پاک عەشقن». بەیانیان شۆفێرێکی پیر بە پاسێکی کۆن دەهات بەدوایاندا و دەیبردن بۆ خوێندنگا، هەمیشە بە هاتوهاواری زۆر و بە سەروسەدای بێوێنە ئەو ماڵەیان پڕ کردبوو لە دەنگ. کە دەرسیم تاهیرم لە ناویاندا بینی سەرسامبووم، ئەو تەنیا لەوانی دی گەورەتر و ناشیرینتر نەبوو، بەڵکو بۆنێکی خراپیشی لێدەهات. گەنجێکی سەرزل کە بەجۆرێکی بێمانا شەرمن و ترسنۆک دیاربوو، جوڵە و ڕۆیشتنی لە ئەسپ دەچوو نەوەک مرۆڤ، لووتی بە ئەندازەیەک بوو مرۆڤ لە تەماشاکردنی دەترسا. هەوڵەکانی غەزەلنوس بۆ ڕاهێنان و فێرکردنی تێکڕا مایەپووچ و بێسوودبوون، ئەم کوڕە لە دۆخێکدا نەبوو هیچ فێرببێت. ڕۆژێک

کەسێک بە ناوی عەتارەوە دابوویە غەزەلنوس و لەو کاتەوە غەزەلنوس سەرپەرشتیدەکرد. تاکە بەهرەی ئەوەبوو دەیتوانی گۆڕ هەڵکەنێت و لاشە بدۆزێتەوە. بەر لەوەی لاشەی موراد جەمیل بدۆزێتەوە، کەسمان باوەڕمان بە تواناکانی نەدەکرد، غەزەلنوسیش بە گومان بوو لە هێزی ئەو، بەڵام دۆزینەوەی ئەو لاشەیە، سەرەتای بڕوای بەتینی من بوو بە بەهرە سەیر و توانا نهێنییەکانی ئەو. دوای دۆزینەوەی لاشەکەی موراد داوام لە غەزەلنوس و هاوڕێکانی دیکەم کرد، تا تەلیسمی موراد جەمیل شینەکەینەوە بە دوای هیچی دیکەدا نەگەڕێین، ئێمە گروپێکی لەوە بچوکتربووین بتوانین لە یەک کاتدا دوای کۆمەڵێک حیکایەت بکەوین، دوائەوە ئیشەکەش لەوە پڕ مەترسیتر بوو کە حیسابمان بۆ کردبوو. ئەو شەوەی دەرسیم لاشەکەی لە پێشچاومان دەرهێنا، من لەو باوەڕەدا نەبووم ژیانمان بەو جۆرە بگۆڕێت، پێش ئەو لاشەیە هەر یەکەمان کۆمەڵێک حیکایەتی لەبەردەستدا بوو، زۆریان پڕ تەم و سەرشار لە نهێنی بوون، بەڵام ڕووی ترسناکی مەرگ ئەو کاتە دەست پێدەکات کە مرۆڤ لاشەیەکی نەناسراو دەدۆزێتەوە. هیچ شتێک لەلاشەیەکی نەزانراو سیحراویتر نییە. ساڵگەلێک کە پیاوکوژبووم، هەرگیز نەچووبوومە سەر قوربانییەکانم، بەردەوام لە دوورەوە تەقەمدەکرد و وەک با هەڵدەهاتم، ئەگەرچی خەڵکانێکی زۆرم کوشتبوو، بەڵام دوو بە دوو لەگەڵ لاشەیەکدا نەمابوومەوە، بە دیار کوژراوێکەوە نەوەستابووم. من پیاوێک بووم لە لاشەکان هەڵدەهاتم بۆیە ناویان نابووم تۆفان. دوای دۆزینەوەی لاشەکەی مورادیش من شتەکانم ئاسایی وەرگرت، بەڵام هێدی هێدی هەستمکرد ئەو مردووە کاریگەرییەکی سەیری لەسەرم هەیە، هەستمکرد شەوان دێتە خەوم، چەند شەوێک بۆ ئەوەی لە مۆتەکە و نیگاری ترسناکی ئەو دەربازیم هەڵدەهاتم بۆ هەزارباغ، بەڵام ئەو مەیتە بەدوامەوە بوو. دواجار مرۆڤ چەند دڵڕەق و بێڕەحم بێت، چەند ژیانی لە کوشتن و

خوێنڕشـتندا بردبێتەسـەر، مردوویەکـی بـۆ پەیـدا دەبێـت وازی لێناهێنێـت. مـوراد جەمیـل لـەو مردووانەبـوو کـە دەسـتبەرداری مـرۆڤ نابـن و دەبێـت دوای چیرۆکەکەیـان بکەویـت. ئادەمیـزادەکان هەمـوو دەمـرن و دەکوژرێـن، ئـەوە چارەنوسـی مرۆڤـە، بـەڵام لـە نـاو ئـەو لێشـاوە ئەبەدییـەدا، مردوویـەک لـە نـاکاو لـە نێـوان هەمووانـدا دەردەکەوێـت و مردنـی وەک تەلیسـم و سـیحرێکی جیـاواز و بێبـن دەردەکەوێـت، وەک ئـەوەی چـی نهێنییـەک لـە دونیـادا هەیـە لـە مردنـی ئـەودا خـۆی قفڵدابێـت. مـن زۆر بیـرم لێکردۆتـەوە، هەمـوو مردنێـک لـە سـندوقێک دەچێـت. مـردن هەیـە سـندوقێکی کراوەیـە و دەتوانیـن ئاسـان سـەری هەڵبدەینـەوە و تەماشـای ناوەکـەی بکەیـن، دەتوانیـن دەسـتبەرین و لـە بنـی ئـەو سـندوقەدا هەموو نهێنییـەک دەربهێنین، بـەڵام مردنیـش هەیـە سـندوقێکی داخـراوە، گـەر سـندوقەکەش بشـکێنین نهێنـی زیاتـر و زیاتـر دەدۆزینـەوە کـە بۆمـان تەفسـیرناکرێت. ڕاسـتە مـن پیاوکوژبـووم، لەسـاڵانی هەشـتادا خەڵکانێـک زۆر کوشـتەی چەکـی مـن بـوون، لـە نێـو ئەوانـەدا خەڵکانێکـی خراپـی تێدابـوو کـە شایسـتەی مـەرگ بـوون، یاخـود بـە بیرکردنـەوەی شۆڕشـگێڕانەی ئـەو سـەردەم و زەمانـە بـە شایسـتەی مردنـم دەزانیـن، خەڵکانێکیشـی تێدابـوو بێگونـاە بـوون، هێنـد هەیـە بـە جۆرێکـی دی بیریـان لـە شـۆڕش و ژیـان دەکـردەوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا هەسـتم نەدەکـرد هیـچ یـەک لـەو مردوانـە ڕامدەگـرن و وادەکـەن بیربکەمـەوە. هەمـوو شۆڕشـێک لەگـەڵ خۆیـدا کۆمەڵێـک مرۆڤـی لـەو جـۆرە دروسـتدەکات، کـە دەکـوژن و ناگەڕێنـەوە سـەر تەرمـی کـوژراوەکان. دوای مردنـی دایکـم مـن بـە جۆرێـک لـەو گوڵسـتانە گەورەیـەدا نوقمبووبـووم، بـە جۆرێـک سـەرقاڵی کردنـەوە و داخسـتنی دەرگا نهێنییەکانـی هەزارباغ بـووم، خەریکبـوو لـە یادمدەکـرد چـی لـەم دونیایـەدا هەیـە. بـەڵام ئـەو لاشـەیەی مـوراد جەمیـل منـی ناچارکـرد بگەڕێمـەوە دونیـا، وەک ئـەوەی لاشـەی مـن بێـت و ئیشـی مـن بێـت ئـەو کەسـە بدۆزمـەوە کـە کوشـتومی. هەندێـک مـردن

وەک ئاوێنە وایە، کاتێک سەیریدەکەین خۆمانی تیا دەبینین. من لەو شەوەوە هەستمدەکرد لە ژێر گوشاری ئەو مردووەدام. ئاه، هەندێجار بینینی لاشەیەک لە خوێندنەوەی هەزار کتێب زیاتر کار لە ژیانی مرۆڤ دەکات، من لەو شەوەوە سەراپای تێڕوانینم گۆڕا و دەمگووت دەبێت شتێک بۆ ئەو لاشەیە بکەین.

من ئومێدم ئەوەیە کەس ڕێگای نەکەوێتە سەر لاشەیەک، بەڵام گەر ڕێگاتان کەوتە سەر جەستەیەکی وەها جوان، نابێت هەڵبێن و پشتی تێبکەن، دەبێت تاکۆتایی لەگەڵیدا بڕۆن.

ماوەیەک بەسەر دۆزینەوەی لاشەکەدا ڕۆیشت و ئێمە هیچ شتێکی گرنگمان چنگ نەکەوت. بە ئەرکی خۆمانم زانی، لاشەکە بگوازینەوە بۆ جێگایەکی لایەقتر و بە نهێنی لە سوچی گۆڕستانێکی بە حورمەتدا بینێژین، ئەوە کەمترین شتێکە مرۆڤ بتوانێت بۆ لاشەیەکی بێکەسی بکات. ئێوارەیەک ویستم بێئاگای غەزەلنوس، لاشەکە بگوازمەوە بۆ گۆڕستانی گەورەی شار و بە نهێنی لە ناو گۆڕەکاندا جێگایەکی بۆ بکەمەوەو بە جۆرێکی بە حورمەتانە بیخەمەوە ژێر خاک. ئێمە تازە دەستمان لەوە شتبوو پۆلیس و ئاسایش شتێک بدۆزنەوە. هەموو دڵنیابووین بکوژانی موراد جەمیل گەر بیت و بە دەردی خودا نەمرن و تووشی بەڵای دی نەبن، تا هەتاهەتایە بە ئازادی دەسوڕێنەوە. شەوێک گەڕامەوە بۆسەر گۆڕی ئەو مردووە غەمگینەی لە کەندەڵانێکی چەپەکی قەراغشاردا نێژرابوو، شوێن لاشەکەم هەڵدایەوە بەڵام هیچی تێدا نەبوو، هیچ شتێک. وەک شێتم لێهات، وەک ئاژەڵێکی نائومێد زەویم بە چواردەوری خۆمدا هەڵدەکەند، بەڵام سوودی نەبوو. ئاشکرا یەکێک دوای ئێمە دووبارە گۆڕەکەی هەڵدابووەوە و لاشەکەی دەرهێنابوو. من هەندێک وردە جل و ئاسەواری دیکەم لە جێگاکەدا دۆزییەوە کە ئاشکرا لە کاتی گواستنەوەی لاشەکەدا کەوتبوون، لە هەموویان گرنگتر پارچەیەک

قوماشی کراسە پرتەقاڵییەکەی بوو. وندبوونی تەرمی موراد جەمیل تەلیسمێکی گەورەی تربوو کە هاتە ناو حیکایەتەکەوە. کە چیرۆکەکەم بۆ غەزەلنوس گێڕایەوە بێئەوەی بایەخ بە چیرۆکەکە بدات بە جۆرێکی پڕ خەیاڵ سەیریکردم و هەندێک شتی لەبەر خۆیەوە گووت کە ئەوکات هیچی لێ تێنەگەیشتم. ئەوەم وا تەفسیرکرد کە غەزەلنوس هێندەی مەراقی دۆزینەوەی نهێنی کوشتنەکەیەتی، مەراقی لاشەکەی نییە.

وندبوونی ئەو لاشەیە بووە خولیایەکی کوشندەی من، واتێگەیشتم ئەوەی مورادی کوشتووە یەکەمین جار نەیتوانیوە لاشەکەی بشارێتەوە، بەڵکو خێرا لەو کەندەڵانەدا کردوێتی بە ژێر گڵەوە، دواتر پاش ماوەیەک لە بەر هەر هۆیەک بێت، لاشەکەی گواستۆتەوە بۆ جێگایەکی دی، جێگایەک کەس دەستی نەگاتێ. شەوێکیان بۆ یەکەمجار دوای چەندەها ساڵ دەمانچەکەمم دەرهێنایەوە و کەوتمە ئەو دەشت و دەرانەی قەراغ شار. ئەو چەند شەوەی پێشتر لە یانەی پیاوکوژە بێئیشەکاندا بردمەسەر، ئەو هەستەیان تیا دروستکردم کە بە شەو شتگەلێکی ترسناک لەم شارەدا ڕوودەدەن، شت گەلێک کەس نایبیستێت و نایبینێت، ئەوانەشی دەیبیستن و دەیزانن بێدەنگی لێدەکەن. بێئەوەی بە هیچ کەس بڵێم، شەوان بەرەو ئەو پێدەشتە ساردانەی نزیک شار دەکەوتمە ڕێ، دڵنیابووم گەر دان بە خۆمدا بگرم، گەر سەبرم هەبێت، شتێک دەبینم. من چەند شەوێکی دی لەگەڵ دەرسیم تاهیردا چوومەدەرێ و ڕووبەرێکی زۆری دەشتایی و ڕووتەنە خۆڵاوییەکانی نزیک شارمان پشکنی، بەڵام هیچی تازەمان دەست نەکەوت. دەرسیم بە چنگە بلدۆزەرئاساکانی بە خێرایی چەندەها جێگای هەڵکۆڵی، لە هەندێ جێگادا کەلاکی هەندێک ئاژەڵ و ئێسکی بەجێماوی سەگێک و کۆمەڵێک کەللەسەری مانگامان دۆزییەوە، بەڵام نەگەیشتینە شتێک پەیوەندی بە ئیشەکەی ئێمەوە هەبێت. ئەو ماوەیە هێند شەوان دەرسیمم هێنابووە دەرێ، بێخەوی

و ماندوێتییەکی زۆر لەسەر ڕوخساری بوو. گەنجێک بوو نەیدەتوانی بڵێت نا، هەر شتێکمان پێبگوتبایە دەیکرد و زۆر کەمیش قسەیدەکرد. بەجۆرێکی سەیر گوێڕایەڵی غەزەلنوس بوو، هەستمدەکرد لە دڵەوە خۆشیدەوێت، گەر غەزەلنوس لێی زویرببایە تووشی توڕەیی و هەڵچوون و نائارامییەکی گەورە دەبوو. بەوەدا زۆرجار خراپ لەگەڵ منداڵەکانی دیکەدا دەجوڵایەوە، غەزەلنوس زویریدەکرد و زۆر پیاهەڵدەشاخا، لەگەڵ ئەوەشدا هاوکارێک و دۆستێکی نزیکی ئەو بوو، زۆر ڕۆژ ئەو نانی دەکڕی، ئەو وردەشتی بۆ منداڵان دەهێنایەوە. ئەو ماوەیەی من شەوان دەمبرد بۆ پشکنینی دەوروبەری شار، گوێڕایەڵ و بێچرپە بوو، هەموو شتەکانی وەک خۆی دەکرد، هەستمدەکرد جۆرە توانایەکی نهێنی لە ناخیایەتی گەر مرۆڤ باش ئاڕاستەیبکات، لەوانەیە شتێکی دیکەی لێدەرچێت. کە زەوی دەدڕی لە ئامێرێکی گەورە دەچوو، بەڵام دواتر ماندووبوونێکی سەیری پێوە دیاربوو، زۆرجار ئامۆژگاریم دەدایە کە لەسەرخۆ ئیشبکات، بەڵام لە زوو هەڵهاتنی خۆر و ئاشکرابوونی بەیانی دەترسا. هەردەم بەر لە ڕوناکبوونەوەی دونیا دەمگێڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، کە دەگەیشتینەوە ماڵی غەزەلنوس، وەها ماندووبوو سەرتاپای ڕۆژەکە یەک تەختە دەخەوت.

دواجار بڕیارمدا بە تەنیا و بێ دەرسیم تاهیر ڕووبکەمە قەراغ شار. شتێکی تاریک و ڕەش، خواستێکی نهێنی بۆ تێگەیشتن لەم شارە پیس و پۆخڵە دەیبزواندم. چەندەها شەو بێهودە سوڕامەوە، لەو دیو شەقامە کەمەربەندییەکەی شاردا بۆسەم دادەنا. چوار شەوی یەکەم شتێکی ئەو تۆم نەبینی، لە شەوی پێنجەمدا لە کەندەڵانێکدا خەوم لێکەتبوو لەسەر دەنگی وڕەوڕی ماشێنێک بەئاگاهاتمەوە، ماشێنێک لایتەکانی کوژاندبووەوە و بە هەموو دەشتدا سەردەکەوت، دوو سەد مەتر دوور لە من وەستا و دوو کەس دابەزین و دەرگای پشتەوەی

ماشـێنەکەیان کـردەوە و یەکێـک بەدەنگـی بـەرز هاواریکـرد «کـوڕی حیـز دابـەزە». هاوارەکـە وەهـا بڵنـد و بەرزبـوو وامدەزانـی ئـەوە شـەو خۆیەتـی دەقیرپێنێـت. لەبـەر ڕۆشـنایی مانگـە شـەوەکەدا بینیـم کوڕێکـی گەنجیـان داگـرت و کەوتنـە لێدانـی. یەکێـک لـە نـاو ماشـێنەکەوە گووتـی «کـوڕی قەحبـە، دایـک حیـز، خوشـک لـە بـاوەش، کـە پێمگووتـی لێیدەردەچیـت، یەعنـی لێیدەردەچیـت، تێدەگەیـت، لێیدەردەچیـت... کـوڕی حەیـوان، ئیتـر تووشـی سەرئێشـەمان ناکەیـت». کوڕەکـە بـۆ ئێسـتێک لـە بەرچـاوم ونبـوو، دڵنیابـووم لەسـەر زەوییەکـە کەوتـووە. بـە وردی نازانـم لێدانەکانیـان چەنـدی خایانـد، بـەڵام ماوەیەکـی درێـژ لـەو کوڕەیـان دا، لـەو ماوەیـەدا گوێـم لـە دەنگـی پیاوێکـی دی بـوو کـە پێدەکەنـی و دەیگـووت «ئاغـا گیـان، ئەزیەتـی مـەدە، قەسـەم بـەم تاریکییـە پاکـە، قەسـەم بـە ڕۆشـنایی سوبح کـە تۆزێکی دی تـەواوی دونیـا ڕووناکدەکاتـەوە، ئـەم کـوڕە بەقسـەمان دەکات. ئاغـام، مـن هەسـتدەکەم بەقسـەمان دەکات، ئەمـە کەسـێکی دڵپـاک و بەحورمەتـە، زۆر بـە ناموسـە، تابڵێـی سـاحێبی نەزاکەتـە...». پیاوێکـی درێژبـوو، دەنگـی لـە تاریکییەکـەدا لـە دەنگـی هەمـووان بەرزتـر بـوو، بـەردەوام پێدەکەنـی و لـەو جـۆرە قسـانەی دەکـرد، زۆر لـەو قسـانەی کـرد، باسـی جوانـی سـوبحی کـرد، سوێندی بـە بولبـول و عەندەلیبەکانـی بـاغ خـوارد، سوێندی بـە بۆنـی کەنێـرە و ڕێحانـە خـوارد، وەهـا ناسـک قسـەیکرد سـەیرم لـەو سـەروزمانە شـیرینەی هـات. ئەوانـی دی جنێویـان بـە کوڕەکـە دەدا و ئـەو بـەو شـێوەیە دڵنەوایـی دەدایـەوە. جارجـار یەکێـک لـە نـاو ماشـێنەکەوە دادەبـەزی و هەندێـک شـەقی لـە کوڕەکـە هەڵـدەدا و دەیگـووت «گـەر بـە خۆشـی خـۆت لێیدەرنەچیـت، یـەک هەفتـەی تـر فلیمـی خوشکەکەشـت بـۆ لێـدەدەم، تێدەگەیـت... تەنیـا دوو ڕۆژت هەیـە لێیدەرچیـت و هەمـوو ئەوانـی تریـش ڕازیبکەیـت، تێدەگەیـت». ماوەیەکـی زۆر درێـژ لـە کوڕەکەیـان دا، بـە درێژایـی ئـەو ماوەیـە چرکەیەکـم لێنەبیسـت، دوای ئـەوەی ماندووبـوون،

سوار ئوتومبیلەکەیان بوونەوە و ڕۆیشتن. من لەو ماوەیەدا چەند جارێک خەیاڵی ئەوە کەوتە سەرم خۆم بهاومە ناو مەسەلەکەوە، بەڵام نەمدەتوانی پێشبینی دەرەنجامەکان بکەم، دەترسام شتەکان ڕێگایەک بگرنەبەر دواجار بە من نەگیرێتەوە و ئەو کوڕە بەدبەختەش تیا بچێت. وەستام و چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد شتەکان ڕەوشی سروشتی خۆیان وەرگرن. کە ئەوان ڕۆیشتن و ماشێنەکەیان گەیشتە سەر شەقامەکە و جارێکی دی لایتەکانی ڕۆشنبوونەوە، من خۆم گەیاندە ئەو گەنجە بەستەزمانە، کە پێدەچوو ئازارێکی زۆر بەسەر و سنگی گەیشتبێت. کوڕەکە ئێجگار بێجورم و چکۆلەبوو، تێنەگەیشتم چۆن بەرگەی ئەو لێدانەی گرتووە. سەیری لێهات لەو شەوە تاریکەدا، لەو دەشتە کاکی بە کاکی و ڕووتەنەدا، یەکێک دەم و دەست بگاتە سەری و یارمەتی بدات، پێدەچوو بەتەمای مردن بووبێت و هیوایەکی بە ژیان نەمابێت. من هەڵمگرت و سەریم خستە سەر ڕانم و دڵسۆزانە لێمپرسی «چیت بۆ بکەم؟». بە هێواشی گووتی «بمبە بۆ ماڵی خۆت، بۆ جێگایەک پشوویدەم، ئاو بخۆمەوە». دام بە کۆڵی خۆمدا و لە لێواری شەقامی گەورەوە دوای چاوەڕوانییەکی زۆر بە تاکسییەکی خەواڵووی دەمەوبەیان گەیاندمە ماڵەوە. ئازارێکی کوشندە لە زگیدا بوو، ویستم بیبەم بۆ بیمارستان، بەڵام تکایەکی زۆر و نائاسایی تیاکردم نەیبەم، گووتی برینەکانی کوشندە نین و لە بیمارستان تووشی دەردەسەری گەورە دەبێت. منیش بێئەوەی هیچ پرسیارێکی لێبکەم وازم لێهێنا بخەوێت. بە شێوەیەک شەکەت و ماندووبوو، هەشت سەعاتی بێوچان خەوت، کە بە ئاگاهاتەوە دووی پاش نیوەڕۆ بوو. من خواردنم ئامادەکرد و سفرەیەکی فەقیرانەم ڕازاندەوە، لە دەموچاو شتندا کۆمەکمکرد و پێمگووت « بە برایەکی خۆت حیسابم بکە و چ شتێک بەمن دەکرێت من کۆمەکتدەکەم».
دیاریبوو گەنجێکی وەفاناسە و بەڕێزێکی زۆرەوە گووتی، تامردن ئەو فەزڵ

و یارمەتییەی منی لە یادناچێت. بێئەوەی من هیچ بڵێم خۆی حیکایەتی خۆی گێڕایەوە و گووتی ئەمە دووەم جارە لێیدەدەن، ئەوانەشی لێیانداوە پیاوانی قەیسەرن. بە قسەی ئەو قەیسەر شابازرگانی شارەکەیە نزیکایەتییەکی زۆری لە حوکمڕان و پیاوانی دەسەڵاتەوە هەیە، هاوڕێی زۆربەی بەرپرسە گەورەکانە. مەسەلەکە ئەوەیە قەیسەر کە شەریکی دوو بەرپرسی زۆر پایەدارە بە پارەیەکی ناچیز بازاڕێکی کۆنی کڕیوەتەوە، ئەوە سێهەمین گوزەرە کە دەیکڕێتەوە، ئەمجارە دەیەوێت هەموو دوکاندارەکان دەربکات بۆ ئەوەی بیڕوخێنێت و شتێکی نوێی لە جێگادا بەرزبکاتەوە، ئەم و هەندێ دوکانداری دیکە سوێندیان خواردوە دەرنەچن. بەڵام دوای ئەو لێدانەی دوێنێ شەو دڵنیابوو گەر دەرنەچێت دەیکوژن. من نەمزانی چۆن ئامۆژگارییبکەم. لێمپرسی «ئەوانە دەناسیت کە لێیان دایت؟». گووتی «بیانناسم و نەیانناسم سوودی نییە، ئەوان هیچ نین، کرێکارن، ئیشی خۆیان دەکەن و پارە وەردەگرن». ئەو ڕۆژە بە غەمێکی زۆرەوە ماڵاوایم لەو کوڕە گەنجە کرد و چووم بۆ لای شبر و تەواوی حیکایەتەکەم بۆ گێڕایەوە. شبر بەلایەوە سەیر نەبوو. بە پێکەنینەوە سەیریکردم و وەک گاڵتە بە عەقڵی من بکات گووتی «هەموو ڕۆژێک شتی لەوە خراپتر ڕوودەدات... هەموو ڕۆژێک، حەسەن تۆفان تۆ لە مێژە لەم شارەدا ناژیت».

من لەو ڕۆژەوە بڕیارمدا بەردەوامبم، دەبایە بزانم چی لەم شارەدا ڕوودەدات، لاشەکەی موراد جەمیل بەردەوام بەرەو ئەو دەشتاییە ڕایدەکێشامەوە، شەوان هەستمدەکرد لاشەکە بە ژیانمدا دەسوڕێتەوە، دەبووایە بزانم و ببینم و تێبگەم. لە شەوی بێدەنگ و ترسناکی ئەم شارەدا شتی سەیر و عاجباتی ڕوویاندەدا. لەو شەوە سەیرانەدا، ئافرەتێکم بینی کوشتیان و لاشەکەیان لەگەڵ خۆیاندا برد، کوڕێکم بینی بە بلۆک سەریان پانکردەوە و لاشەکەیان سووتاند، کۆمەڵێک

منداڵم بینی پیرەمێردێک بە بەرد دەکوژن، خەڵکی تریشم بینی دەهاتن و لە چۆڵەوانیدا دەگریان، دزی بچوک و ناچیزم دەبینی کە پارچە ئاڵتونی دزراویان دەهێنا و دەیانشاردەوە، ژن و پیاوم دەبینی لە ناو ئەو بەردەڵانەدا بەدەم ترس و لەرزێکەوە کە دەماری دەتەزاند ڕایاندەبوارد، کچ و کوڕم دەبینی دەهاتن و بێئەوەی پەنجە بۆ یەک ببەن بەسەر شانی یەکدا دەگریان و دەڕۆیشتن. هەستمکرد لەو شەوانەدا بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی فریشتەش لە نێوان زەوی و ئاسماندا دەبینم، خودا خۆی دەبینم دادەبەزێت و سەردانێکی کوچە خەوتووەکانی ئەم شارە دەکات و دەڕوات. هەموو شتێکم بە چاوی بینەرێکی غەمگین تەماشادەکرد، نەمدەتوانی دەست لە هیچ وەردەم، نەمدەتوانی هیچ بگۆڕم. من لەو شەوانەدا تێگەیشتم کە گەورەترین دڕندەیی و بێڕەحمی ئەم دونیایەی ئێمە لەوەدایە، گەر مرۆڤ دەست بۆ چەک نەبات ناتوانێت هیچ بگۆڕێت، بەڵام من ناشیرینی دونیام زیاتر پێ قەبووڵ بوو لەوەی بە چەک بیگۆڕم، چەکیش هیچ نییە جگە لە تاوانێک کە مرۆڤ دەیخاتە سەر تاوانەکانی دیکە. لەو شەوانەدا چۆن ماجەلانی خەیاڵی سەیری فلیمە سەیر و عاجباتییەکانی خۆی دەکرد، منیش سەیری فلیمی ترسناکی ئەم دونیایەم دەکرد، منیش وەک گوڵ سۆلاف تەنیا بینەرێکبووم لە سینەمایەکی گەورەتر و سەیرتر و کراوەتردا. هەندێک شەو هێندەم خەو دەهات، بەو ئێسکە ڕەق و ئیرادە ئاژەڵڕەنگەی خۆمەوە، لە تەپوتۆزی نزیک ئەو شەقامە بازنەییە مەلعونەدا شەکەت و بێبڕست، وەنەوز گێژیدەکردم و وام هەستدەکرد هەموو ئەو شتانە بەدەم خەوەوە دەبینم. بەڵام هەندێ شەویش بە ئەندازەیەک وریابووم فێنکی دەمەوبەیان و سەرمای بەر لە کۆتایی شەو بەختەوەریاندەکردم. گەر کارەبا هەبایە هیچ شتێک لە دونیادا بە ئەندازەی بینینی ئەو هەموو گڵۆپە داگیرساوەی شار لەلام جوان نەبوو... بەڵام بینینی ئەو هەموو خوێنەی ناو شەو

غەمگینیکردم. جاران وام هەستدەکرد ئەم شارە بە خەوتوویی جوانە، بەڵام ئێستا نا، هەستدەکەم بە خەوتوویش پڕە لە تارمایی و جنی ڕەش، بە خەوتوویش پڕە لە خوێن و غەم.

## مەعشوقەیەکی ڕاستی لە باغێکی خەیاڵیدا
## یان مەعشوقەیەکی خەیاڵی لە باغێکی ڕاستیدا؟
## «غەزەلنوس و تریفە یابەحری لە دوای ساڵی ١٩٩٦ وە»

کە تریفە یابەحری لە بەهاری ساڵی ١٩٩٦ دا ونبوو، عەتار وایدەزانی لەگەڵ قافڵەیەکی قاچاخدا دەرچووە بۆ دەرەوەی وڵات. ئەو بە حوکمی ئەوەی نزیکایەتییەکی زۆری لەگەڵ هەموو قاچاخچییەکاندا هەبوو، ئاگاداری ئەو گروپانەبوو کە بە شەو ڕێکدەخران و لە شارەوە بەرەو ئەستەمبول دەکەوتنە ڕێ. چەند هەفتەیەک بێپشوو تەواوی قاچاخچی و پێشکاروانەکانی بەسەرکردەوە و پرسیاری ئەو کچە چکۆلانە چاو ڕەشەی لێکردن. بەڵام هەوڵەکانی بێسوودبوون، کەس زانیارییەکی ئەوتۆی نەدەزانی، ئاخر لەم شارەدا چەند کچی ئەسمەر و چکۆلە و چاوڕەش هەبوو؟ سەد هەزار؟ نازانم لەوانەیە زۆرتریش. جگە لەوە ئەوانەی کە بۆ ئەستەمبول دەکەوتنە ڕێ، زۆربەیان شوناسی نادروست و ساختەیان پێبوو، کەس ناوی ڕاستەقینەی کەسی نەدەزانی.

لەو دەمەدا کە عەتار بۆ تریفە یابەحری دەگەڕا، خانمی یابەحری لەماڵی غەزەلنوسدا بوو. لەو ماوەیەدا پێکەوە چووبوونە بیمارستانەکان، پێکەوە گوڵیان بۆ ئەو کچە نەخۆشانە بردبوو کە لەسەر قەرەوێڵەکانی بیمارستانی گشتی بێهاودەم و هاوغەم مێش تێیدابوون. ئەو نزیکییە شتێک لە ئولفەتی لە نێوانیاندا دروستکردبوو، لە هەوای سەرەتای

مەحەبەت دەچوو. کێشەی هەرە گەورەی غەزەلنوس ئەو عەشقە سیحراوی و قووڵەی بوو بۆ شازنی هەزارباغ، کە وەک نهێنییەکی گەورەی ژیانی دەیپاراست، شتێک بوو نەیدەویست تریفە یابەحری بیزانێت، نەدەبایە هیچ ژنێکی ئەم دونیایە بە حیکایەتی ئەو خۆشەویستییە نهێنییەی بزانێت لەگەڵ کچێکدا کە هەمووان بە ڕەمزێکی خەیاڵی ناو گۆرانی گۆرانیبێژە کوردەکانی ساڵانی زووی دەزانن. ئەو ڕۆژەی تریفە یابەحری لە کارخانەی مافوورەکە هاتەدەرێ بە جۆرێک تەنیا و تێکشکاو بوو، هەموو دڵێک بۆی دەسووتا. خۆی بەبوونەوەرێکی ڕووت دەبینی کە کەسێک نییە بیپارێزێت، ئەو پیاوانەی کارخانەکەیان کڕیبوو ئاسان لێنەدەگەڕان بڕوات، ترسێکی گەورەی هەبوو وەک سەی قادری نیا بیڕفێنن و وەک کۆیلە کاری پێبکەن، ترسی هەبوو بیخۆن «ماوەیەک بوو لەو فۆبیا سەیرەدا دەژیا کە جانەوەرێکی گەورە لە ناو تاریکییەوە سەیریدەکات و دەیەوێت بیخوات».

شەوێکی باران بوو چوو بۆ ماڵی غەزەلنوس، ترسەکانی بەجۆرێکبوون، جگە لای غەزەلنوس لە هیچ جێگایەکی دی دونیا ئارامی نەدەگرت، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا شتێکی ئەوتۆی لەسەر ئەم پیاوە پیشنە نەدەزانی کە بە غەزەلە سەیر و خەیاڵییەکانی دونیای پڕکردبوو. پێشتر بیری لەوە نەکردبووەوە کە دەخوازێت و لە خەیاڵیایەتی شووبکات، وەک کچانی تر عومرێکی لەوەدا بەسەر نەبردبوو، بیر لە سیفاتی مێردی پاشەڕۆژ بکاتەوە. لەو کچانەبوو کە زۆر کەم بیر لە شووکردن و پیاو و سۆز دەکەنەوە. دەبێت بڵێم ئێمە لە وڵاتێکداین لەو جۆرە ئافرەتە ئاسنینانەی زۆر تێدایە، لەو ژنە ڕەقانەی گەر بمرن ئامادەنین بچوکترین هەوای سۆز لە ڕوخسارياندا دەرکەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا تریفە لەو خانمە کەللەڕەق و بنزگ بەردینانە نەبوو، بەڵام ژیانی وەها ڕۆیشتبوو ڕێکەوتی پیاوێک نەکات ژنێتی لە خەو هەستێنێت. زۆربەی ئەو خانمانەی

ئاوهـا سـارد و ڕەنـگ زەرد و خێوئاسـا زەوی تەیدەکـەن، خەڵکێکـن دواجـار کەسێک نەبووە لـە خەویـان هەستێنێت، ئـەوە تووشـی سـەهۆڵبەندانی دڵ و بەتەختەبوونـی لەشـی کـردون، وەک چـۆن مـرۆڤ دەبێـت ماندووبێـت تـا بێهۆشـێک دەهێنێتـەوە سـەرخۆی، دەبێـت پیاویـش ئاوهـا ماندووبێـت تـا لەژێرەوەڕا پشـکۆی خامۆش و سووتەکئاسـای ژنێتی لەوانەدا دەگەشـێنێتەوە، هەندێـک پیـاو هـەن دەتوانـن خامۆشـترین خۆڵەمێش داگیرسـێننەوە، بـەڵام زۆربـەی پیـاو ئـەو سـەبرەیان نییـە، ڕاسـتەوخۆ مەخلوقێکیـان دەوێـت بۆیـان ڕووتبێتــەوە و هەمـوو هونەرەکانـی پێکەوەخەوتــن بێشـەرمانە بزانێــت و ماندووبوونـی نەوێـت. وەلـێ دەبێـت بزانیـن، مـرۆڤ تەنیـا بەسـەبر دەگاتـە ئـەو پلەیـە، بـە سـەبری زۆر. تریفـە لـەو کارخانەیـەدا جگـە لـە مەسـتی و خەیـاڵ هیچـی دی نەژیابـوو، لەبـری ئـەوەی بیـر لـە لەشـی خـۆی و عەشـقی خـۆی بکاتـەوە، خەیاڵـی لای ئـەو پاڵەوانـە مەسـتانە بـوو کە لـە مافوورەکاندا بـۆ ئومێـد و بەختــەوەری و وەفـا و خۆشەویسـتی دەگریـان. دڵـی لای ئـەو کچانەبـوو کـە هـاوکار و هاودەمـی بـوو، ئـازاری ئـەوان بـە چەشـنێک دەیبـرد خـۆی لـە بیردەچـوەوە. ئـەو چەنـد سـاڵەی کارخانەکـە سـاڵانی نزیکبوونەوەی بـوو لـە ئـازاری ئـەو کچـە کرێکارانـەی، ماندووبوونـی کارخانەیـان لـە چـاو دۆزەخـی ماڵـدا بەبەهەشـت دەزانـی. هـەردەم دایـەن و برینپێـچ و لەلەیـان بـوو، ڕەنگـە ئـەو ژنانـە خۆیـان نەبـن کـەس نەزانێـت تریفـە چەنـد بـە تەنـگ ئێـش و ئازاریانـەوە هاتـووە. هەمـوو دەردی خۆیـان دەبـردە بەردەمـی ئـەو، تـا وای لێهـات تریفـە سـاتێکی نەبـوو تەماشـای ژیانـی خـۆی بـکات. ئەوانـەی مـەراق و کێشـەکانی خەڵکـی دەیانبـات زۆرجـار دەکەونـە ناهەقـی دەرهـەق بـە مرۆڤەکـەی نـاو خۆیـان، بـەڵام هەمـوو دەزانیـن دادپەروەرتریـن مـرۆڤ ئەو کەسـەیە کـە دەرهـەق بـە خـۆی بێڕەحمـە. تریفـە کـە لـەو کارخانەیـەش هاتـەدەرێ هـەردەم بیـری لای ئـەو خانمـە غەمگیـن و کەساسـانە بـوو. ئـەو ڕۆژەی دەیویسـت لـە عەتـار هەڵبێـت چـوو بـۆ لای یەکێـک لەو ژنـە چالاکانەی

لە کۆمەک و یارمەتیدانی ژناندا دەستبەکاربوون، کلیلی خانووە تازەکەی خۆی خستە بەردەمی و گووتی «من ماوەیەک دەبێت لە پێش چاو نەمێنم، هەندێک کێشە و دەردی تایبەتی خۆم هەیە، هەر کات ویستتان کەسێکی بەدبەخت حەشاربدەن ئەوە کلیلی ماڵی منە، خۆتان چۆنتان پێ باشە وابکەن». ئەو ڕۆژەی کە تریفە کلیلی ماڵەکەی خۆی دانا و ویستی خۆی ونبکات، لە ڕاستیدا نەیدەزانی بۆ کوێ بچێت. ئێوارەیەک درەنگ چوو بۆ لای غەزەلنوس، پێیوابوو وەک سەرەتا ئەو دەشێت کۆمەکیبکات و جێگایەکی بۆ بدۆزێتەوە. دەترسا خۆی لای گەلاوێژی نیا یاخود لای کیژانی تری قاڵیچن حەشاربدات، کێ دەیزانی ژیانی ئەو بەستەزمانانە چۆنە؟ دوائەوە عەتاریش لەوە شەیتانتر و فێڵچنترە لەو جێگایانەدا نەیدۆزێتەوە. غەزەلنوس دواهەمین هیوای ڕاستەقینەی بوو، دڵنیابوو کەس خەیاڵی بۆئەم پیاوە ڕیشنە ڕۆمانسی و خەیاڵزادەیە ناچێت. لەو کاتەوەی غەزەلنوسی ناسیبوو زۆرجار ئارەزووی ئەوەی هەبوو ماڵەکەی ببینێت. مەسەلەکە تەنیا فزولێکی کچانە نەبوو، بەپێچەوانەوە هێزێکی نهێنی و ناوەکی و قووڵ ئەو حەزەی تیا سەوزدەکرد. کە گەیشتە لای غەزەلنوس لەو باوەڕەدا نەبوو لە جێگایەکی وەها سەیردا بژی، ماڵی غەزەلنوس لە دەرەوە بچوک و خەوتوو و سادە دەینواند، لە یەکێک لە هەرە کۆنترین گەڕەکەکانی شاردا بوو، جێگایەک ماڵەکان هێشتا تۆزی ئەمارەتە دێرینەکانیان لێهەڵدەستا، شار لەوێدا هێشتا بۆنی ئەسپسواری دێرین و بۆنی تاعوون و بۆنی باجگرە عوسمانییەکانی لێدەهات. تریفە کە پێی خستە کۆڵانەکەیانەوە هەستی ئەوەی هەبوو دەگەڕێتەوە بۆ دوور، دەچێتەوە بۆ سەردەمە دێرینەکان، بۆ ڕۆژگاری فەقێی عاشق و مەلای لە ئیلاهیاتدا خنکاو. بەڵام کە بەرەو ماڵی غەزەلنوس هەنگاوینا هێزێکی لە خۆی گەورەتر و سەیرتر دەیڕفاند. لەبەردەرگاکەدا تەماشای خۆی کرد، لە یەکێک نەدەچوو بێگوناە بێت و

بۆ کۆمەک بگەڕێت، بەڵکو بە خانمێکی دەکرد دوای سەفەرێکی پڕ لە کاری حەرام بە شەرمەوە بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی. پێشوازی غەزەلنوس پێشوازییەکی گەرم بوو، گەرچی هاتنی کوتوپڕبوو، بەڵام وەها دیاربوو وەک ئەوەی ڕێکخرابێت و نوسرابێت و یەکێکی دی بە وردی ئامادەیکردبێت. ماڵی غەزەلنوس و باغەکەی لە ناوەوە شتێکی دی بوون، ئێجگار پڕ شکۆ و سیحراوی دەیاننواند. لە دەرەوە کە لێت دەڕوانی تەنیا یەک دوو درەختی سەوز دیاربوو، بەڵام لە ناوەوە گوڵەکان و دارەکان شکۆی خۆیان و هەیبەتی شاهانەی خۆیان هەبوو. وەک ئەوەی لە شکۆی باغەکەی شەرمبکات، وەک لە بیری چووبێتەوە ئەویش لە ئەوەی یەکێک لە خێزانە ناودارەکانە، بە ترس و شەرمێکی گەورەوە لە ژووری میوانەکەدا دانیشت و سەیری لەو هەموو منداڵە فریشتە ڕەنگە هات کە بەدەوریدا ڕایاندەکرد و دەیانقیژاند و هاواریاندەکرد. کە ئەو هەموو منداڵەی بینی واهاتە خەیاڵی کە غەزەلنوس چەندین ژنی هەبێت و حیکایەتی ژیانی خۆی بە دروستی بۆ ئەو نەگێڕابێتەوە. لەو کاتەوەی ئەو کوڕەی دیبوو، ئەو جۆرە هەستە سەیرەی هەبوو، هەستێک کە وەسف ناکرێت، وەک ئەوەی لە ناکاو هەوایەکی سارد ناخت بگرێت. ئەوکات نەیدەزانی خۆشەویستی چییە، عەشق تا ئەوساتەش لای ئەو نرخێکی ئەخلاقی بوو کە وەک کچێکی گەنج دەبایە بەرگری لێبکات، بەڵام پێشتر ئەزموونێکی عاشقانەی ڕاستەقینەی نەدیبوو. ئیدی دونیایەکی عەجیبە خەڵکانێک هەن نازانن عەشق چییە و دەبن بە پاسەوانی، خەڵکانێکیش هەن عاشقن و دەبن بە جەلادی. بەڵام دڵنیابوو ئەو ئێوارەیە شتێکی ناسروشتی لە دڵیایەتی، شتێک کاتی دەوێت تا بە تەواوەتی بزانێت چییە. هەڵبەت خۆشەویستی وەک دەرد وایە، نزیکایەتی و خزمایەتییەکی زۆری لەگەڵ نەخۆشیدا هەیە، ئەو چەند مانگەی دوایی کە چەند جارێک غەزەلنوسی بینی بوو، کە پێکەوە سەیری مافووره خەیاڵییەکانیان

کردبوو، هەموو جارێک ئەو هەستە ساردەی هەبوو، شتێکە وات لێدەکات حەزبکەیت بەتانییەک لە خۆتەوە بپێچیت و خۆت داپۆشیت، هەستێکە وەک سەرمای پێش داگیرساندنی ئاگرێکی گەورە وەهایە لە ناختدا. تریفە ئەو ڕۆژە کە لە ژووری میوانە خاڵی و سادەکەی غەزەلنوسدا دانیشت، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد دایکی منداڵەکان دەرکەوێت و بەخێرهاتنی بکات، بەڵام هیچ کەس دیارنەبوو. لە ناکاو هەستی بە ئولفەت و ماڵخۆیی کرد، وەک ئەوەی جارێکی دیکە لەم ماڵەدا بووبێت، وەک ئەوەی گەڕابێتەوە بۆ جێگایەک کە جێگای ڕاستەقینەی خۆیەتی. خودایە چەند سەرسامبوو کە چیرۆکی ئەو منداڵانەی لە دەمی غەزەلنوس بیست، لەو کاتەدا بروسکەئاسا کۆی ژیانی خۆی بەبەردەمیدا ڕابورد، تێگەیشت ئەوەی ئەوی بەرەو ئەم ماڵە هێناوە دەستی ڕێکەوت نییە، بەڵکو هێزی چارەنوسە. تریفە لە سەر کورسییەکی سادە لە هۆڵەکەی ماڵی غەزەلنوسدا دادەنیشت و بە چاوی پڕ فرمێسکەوە گوێیدەگرت، غەزەلنوس حیکایەت دوای حیکایەت چیرۆکی ئەم منداڵانەی دەگێڕایەوە کە بەرهەمی عەشقی خەیاڵی بوون، کچ و کوڕی کۆمەڵێک دایکی بێچارەبوون کە لەگەڵ خەونەکانی خۆیاندا خەوتبوون، بە حەرام عەشقبازی خەیاڵیان کردبوو، دواجار ئەم منداڵە بێکەسانەیان دروستکردبوو کە ئەگەر غەزەلنوس نەیگرتبانایەتە خۆی لەوانەبوو خۆیان و دایکیشیان بکوژرێن. غەزەلنوس بۆ ئەوەی منداڵەکان لە کوشتن و سەربڕین ڕزگاربکات جار دوای جار لەم بنکەی تەنهاییەی خۆیدا ئەم کوڕ و کچە فریشتەئاسا و خەیاڵیانەی گرتبووە خۆی، نەوەیەکی حەرامزادەبوون کە نیوەیان لە جوانی و نیوەیان لە نەفرەت دروستبووبوو. جگە لە غەزەلنوس کەس نهێنی ڕاستەقینەی ئەوانی نەدەزانی. تریفە یابەحری تا کۆتایی گوێیدەگرت، بە چاوی پڕ ئەشکەوە بەسەر دەستی غەزەلنوسدا دەنووشتایەوە ماچیبکات، پێیدەگووت «تۆ فریشتەیت، تۆ

لەجنسی مرۆڤ نیت، تۆ وەک ئێمە گوناهت نییە». وەک شێت یەکێک لە منداڵەکانی هەڵدەگرت و دەگریا، وەک شێت یەکەیەکە دوای ئەو منداڵە بچوک و گەورانە دەکەوت و دەگریا، خۆی بە خوشکی هەموویان دەزانی، بەدەم فرمێسکەوە دێر دێر حیکایەتی خۆی دەگێڕایەوە، حیکایەتی زکپڕبوونی دایکی بەو، چیرۆکی لەدایکبوونی بەبێ باوک لە ژنێکی نەخۆش، ژیانی وەک کچێکی بێکەس لەگەڵ جەوهەر یابەحریدا. شتەکان بۆ غەزەلنوس سەیر و سیحراوییبوون، ئەو لەو کچانەبوو کە وزەیەکی سەیری گێڕانەوەی هەبوو. تا ئەو کات کچێکی وەها کامڵی نەبینیبوو، بەرهەمی ئەو عەشقە ناکام و ئارەزووە خەیاڵیانە بێت کە لە بری ئەوەی بمرن و ببن بە سەراب، لە شێوەی مرۆڤێکی خەیاڵیدا دەردەکەون. هەر لەو شەوە سەیرەدا غەزەلنوس بەسەر دەستە سیحراوییەکانیدا دەنوشتایەوە و ماچیدەکرد و دەیگووت« تریفە یابەحری شووم پێبکە و ببە بە هاوڕێی ژیانم». کەس نازانێت داوایەکی واسەیر و کوتوپڕ لە چییەوە هاتووە؟ دەبێت ڕیشەکانی لەو کولتوورە لە ناکاو و پەلەیەوە هاتبێت کە نێرانی ئەم وڵاتە چەندین سەدەیە دەیگرنە بەر؟ ئەو کولتوورەی پیاوێک لە ناکاو دەچێتە بەردەمی خانمێک و داوای پەیوەندی لێدەکات، داوای هاوسەری لێدەکات و لە هەمان ئان و ساتیشدا وەڵامێکی ڕۆشن و ڕوونی دەوێت؟ یان لە شەیدایی غەزەلنوس و سەرسامییەوە بە تریفە یابەحری سەرچاوەی گرتووە، یان لە هەوڵێکی جوامێرانەی پیاوێکی مەردەوە هاتووە کە بەڕاستی ویستوێتی ئافرەتێک لە میحنەتێکی ڕاستەقینە و گەورە دەربهێنێت؟. هەموو ئەو منداڵانەی ئەو شەوە هاتنی تریفە یابەحریان لە نزیکەوە دی، تەواوی وردەکارییەکانی ئەو چەند سەعاتەیان لە یادە، هەموو ئەو ساتەیان لە بیرە کە غەزەلنوس وەک ئەوەی جنۆکەیەکی ڕەش دەستی لێوەشاندبێت، یاخود بووبێت بە داوی یەکێک لە خەیاڵە بێپەروا و باڵدارەکانی تریفەوە، لە

بەردەمیدا کڕنوشدەبات و دەڵێت «ئاسمان و هێزە سەیر و نادیارەکانی دونیا تۆیان ناردوە، من و تۆ بە ڕێکەوت یەکترمان نەبینیوە، تۆ ئەمشەو هەروا ئاسان ڕووت لە ماڵی من نەکردوە، من وەچەی غەزەلنوسەکان و تۆ کچی خەیاڵە ناکامەکان، تامردن هاوڕێت دەبم. پێویستیم بە تۆیە و تۆش پێویستت بە منە، تۆ ئەو نیوە خەیاڵییەی منیت کە فرپویت و کەوتوویتە سوچێکی تری دونیاوە». سالانێکی درێژ مندالان ئەو قسە سەیرانەی غەزەلنوسیان دەگووتەوە... ئەو تۆن و شێوە گووتنەیان وەک خۆی لاساییدەکردەوە، کوڕەکان دەچوونە بەردەم کچەکان و کڕنوشیان دەبرد و بە لاقرتییەوە دەیانگووت « ئەم شەو خەیاڵ تۆی ناردوە، تا ڕزگارمبکەیت و ڕێگام بدەیت ڕزگارتبکەم».

ڕووداوەکانی ئەو شەوە بە هەر جۆرێک گوزەریانکردبێت، نیشانەی ئەوەن کە تریفە یابەحری و غەزەلنوس لەو ساتەوە زانیویانە کە بەبێ یەک ناتوانن بژین، هەموو دەزانین ئەوەی ئەوکات بەیەکییەوە بەستوون خۆشەویستی نەبووە، بەڵکو هێزێکی لە خۆشەویستی گەورەتر و ئالۆزتر و قووڵتر بووە کە خەیاڵە. خۆشەویستی بەبێ خەیاڵ وەک ڕێکەوتنی دوو دوکانداره لەسەر تێکەڵکردنی دوکانەکانیان. ئەوەی سیحری خەیاڵ پێکیانەوە دەبەستێت، پەیوەندییان درێژتر و خۆگرتردەبێت، خۆشەویستی ڕووت، زوو پیردەبێت و دەمرێت. بەلام دوو بوونەوەر کە دوو خەیاڵی ناکۆتایان هەبێت، هەستبکەن هەردووکیان بە ڕێگایەکی درێژدا هاتوون و ئەو ڕێگایە لە دووری دوورەوە بە جۆرێک ئاراستەی وەرگرتووە بگاتە یەک، هەر یەکەیان تێشوویەکی درێژی ئازار و خەیاڵی پێبێت و بیەوێت نیشانی ئەوی دیکەی بدات، ئەوکات دەکەونە ناو دەریایەکی ناکۆتاوە کە تەنیا مەرگ دەتوانێت کۆتایی پێبهێنێت، خەیاڵ یەکێتییەکی قووڵتر و پتەوتر لە خۆشەویستی لە ناو ئادەمیزادەکاندا دروستدەکات.

ئەو کاتەی یەکتریان ناسی غەزەلنوس کوڕێکی پڕ ئەزموونتر و دونیا

دیدەتر بوو، تریفەش خەیاڵێکی دڕ و سافتری هەبوو، بەڵام هەردووکیان نەیاندەزانی چۆن درێژە بە ژیانیان بدەن، مرۆڤ چەند خەیاڵی بەهێز و بەرین بێت، پێویستی بە حەقیقەتێک هەیە بۆی بژی. لەو شەوەدا دوو کەس بە یەکدەگەیشتن و هەر یەکەیان بەشێوەی خۆی بۆ ڕاستییەکی گەورە دەگەڕا. تریفە پێیوابوو لەوماڵەدا خێزان و قەبیلەی خۆی دۆزیوەتەوە، دوای پیربوون و نەخۆشکەوتنی فەوزیە یاسەمی ئەو کچێکی بێکەسبوو. بەڵام ئێستا دڵنیابوو کە ئەو هەمیشە یەکێک بووە لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان. غەزەلنوس باسی ئەو دابەشبوونە ترسناکەی خۆی بۆ دەکرد لە نێوان خەیاڵ و حەقیقەتدا، بەو شەوە دەستیدەگرت و وەک شێت دەیبرد بۆ باغی مەهنان، پێکەوە دەرگای ئەو خانووە خەیاڵییەیان دەکردەوە، غەزەلنوس ئەم جێگایەی وەک کەعبەی خۆی تەماشادەکرد. تریفە بەو باغەدا دەگەڕا، دەستی لە گوڵە پەمەییەکان دەدا، بۆنی ڕۆحی کچێکی دەکرد گوڵستانێکی بێسنووری جێهێشتبوو. تریفە ئەو باغەی وەک خەیاڵێک دەبینی کە پەلاماری حەقیقەت دەدا، ئێستا کە بۆنی بەو گوڵانەوە دەکرد، دەیزانی هەموو خەیاڵێک دەبێت بە جۆرێک لە جۆرەکان پەلاماری حەقیقەت بدات، دەبێت هەموو مرۆڤێک بڕێک لە خەیاڵی خۆی لە ناو جەرگەی حەقیقەتدا سەوزبکات، ئیدی لە شێوەی گوڵێکدا بێت، لە شێوەی باغێکی چکۆلەدا بێت، یاخود لە شێوەی منداڵێکی خەیاڵیدا بێت. غەزەلنوس لە ناو گوڵ و باڵندە و تریفەکانی مەهنازدا کەمێک پەشۆکاو دەردەکەوت، نەیدەویست ڕاستەوخۆ وانیشانبدات کە پێشنیاری هاوسەرێتی لەلایەن ئەوەوە بەرەنجامی غەمخۆرییەتی بۆ ژیانی تریفە، یاخود بە هۆی ترسی ئەوەوەیە لە سەرگەردانبوونی خانمێک کە وەک دوورێکی دەگمەن و یاقووتێکی بێوێنە دەیبینی. بڕیاری هاوسەرێتی لەگەڵ تریفەدا بڕیارێکی شێتانەبوو، هەموو مرۆڤە عاقڵەکان بەجۆرێکی شێتانە ژندەهێنن و شوودەکەن، ئەوە تەنیا

کەسانی دونیاپەرست و قازانجپێون بە وردی هەموو شتێک هەڵدەسەنگێنن و بڕیاری هاوسەری دەدەن. ژنهێنان شتێکە هەمیشە بڕێک لە شێتی و هەڵەشەیی و بیروەلاوەنانی دەوێت، گەر مرۆڤ زۆر وردەکار پێوانەکاری بکات، ناتوانێت هاوسەرگیری بکات. غەزەلنوسیش یەکێک بوو لەو پیاوە شێتانە کە زۆربەی ڕەوشی ژیانی بێبیرکردنەوە تەیکردبوو، خەیاڵزایەک بوو کە خەیاڵ و خولیای لە ناکاو دەیهێنا و دەیبرد، وازهێنانی لە قوتابخانە شێتانەبوو، خەڵوەتی شەش ساڵەی لە ناو غەزەلدا شێتانەبوو، بازدانی بۆ سەر مینبەرەکانی شیعر شێتانەبوو، سەفەری بە کیشوەری خەیاڵدا شێتانەبوو، لەخۆگرتنی بۆ منداڵە بێباوکەکان شێتانەبوو، بوونی بە مامۆستای خەیاڵ شێتانە بوو، کڕینەوەی بۆ ماڵی سەیفەدین مارۆ شێتانە بوو، حەزی بۆ سەبری شێتانەبوو... هەموو شتێکی شێتانە بوو، بەڵام شێتییەکی پڕ ویقار، شێتییەک مرۆڤ بە ئومێدەوە گرێدەدات. ئیدی بۆدەبێت ژنهێنانی، بوونی بە مێرد و باوک شێتانە نەبێت؟. بەڵام چۆن دەتوانێت لە سەعاتێکی جۆش و داخبوونی دڵ و هەستانی سۆزدا بڕیاری وەها گەورە بدات، کەی ئەوە لەگەڵ ئەو ویقارە دەروێشییەی ئەودا دەگونجێت کە شێتانە غەزەل دەخوێنێتەوە و جیهان بە خۆی مەستدەکات؟. نا ئەوەی غەزەلنوسی ئازاردەدا، ئەو عەشقە ئەستەم و ناکام و هەڵهاتووەی ئەو بوو بۆ سەبری، بۆ گوڵستانەکانی هەزارباغ. عەشقی هەرە گەورەی ژیانی ئەو سەبری بوو، کە بوونەوەرێکی شەوانە و سەرابی و نەگیراوە، بوونەوەرێکە جگە لە ئیلهامی غەزەل، جگە لە پەیوەندی بە هەموو کانگایەکی نەمری خەیاڵەوە، ڕێگایەکی بۆ ئەم سەر زەمین و دونیایە پێ نییە. سەبری ئەو خانمە ئەفسانەیی و نەگیراو و خەیاڵییەیە کە هەموو پیاوێکی دونیا لە خەونە تاریک و نهێنییەکانیدا ڕاویدەکات، ئەو ئافرەتە ئەفسانەییەیە کە مرۆڤ دەبێت بەش بەش لە ناو هەموو ئافرەتانی دیکەی دونیادا بیدۆزێتەوە، سەبری نمونەی

ئەو ژنە بوو کە عاشق نابێت، بەڵکو تەنیا عاشقی دەبن، لەبەرئەوە موڵکی هیچ یەک لە عاشقانی نییە. ئەوە نهێنی گەورەی دڵی بوو کە دەبایە تا هەتاهەتایە بیشارێتەوە. سەختە مرۆڤ بە ئافرەتێک بڵێت تۆ دەکەمە هاوسەرم لەبەرئەوەی بڕێک لەو سیفەتانەت تێدایە کە لەو خانمە خەیاڵییەی ناو باغچەکانی ڕۆحمدا هەیە، هیچ پیاوێک بە جۆرە زمانێکی وەها لەگەڵ مێینەیەکدا قسە ناکات. بەڵام پێدەچێت غەزەلنوس هێند بە خەیاڵی تریفە و کاراکتەر و ژیانی سەرسامبووبێت، بڕێکی زۆری ئەو سیفەتە سەیر و خەیاڵیانەی تیا بینیبێت کە لەو خانمە نمونەییەی ناو باغەکانی خەیاڵیدا هەبووە.

تریفە لەو کچە ئەسمەرە ڕۆح سوکانە بوو کە مرۆڤ ڕاستە و ڕاست حەزدەکات ببێت بە هاوڕێیان. لەو کچانەبوو بە دیتنی شتێک لە هێمنی و بڕوا و مەستبوونت تیا دروستدەبوو، لەوانەی گەر پەنجەیەک بدات لە دەستت، ئازارێکی گەورەشت هەبێت هێور دەبێتەوە و لەسەرەخۆ ژانەکانت ئارامدەبنەوە. شتێک لە چاوە ڕەشەکانیدا بوو کە ڕاستەوخۆ خەفەتی دەبرد و ئاسوودەیی بانگدەکرد. هەموو ئەو ژنانەی تر کە هاتبوونە سەر ڕێگای غەزەلنوس ژنبوون، قەشەنگبوون، پڕ خەیاڵ بوون، بەڵام هیچیان بوونەوەرێک نەبوون بە سەیرکردنی چاویان ڕۆح لە ئازارەکانی پاکبێتەوە. تریفە لەو ژنانە نەبوو کە سیحریان بەسەر هەموو جەستەیاندا دابەشدەبێت، بەڵکو لەو کچە چکۆلە بێجورمانە بوو کە دەبێت لە نزیکەوە سەیری چاوی بکەیت. هەموو سیحری لەو چاوە ڕەشە سەیرانەیدا بوو کە لە ناکاو زیرەکی و بریسکە و غەمخۆرییەکیان تیادەردەکەوت دەگمەن و ڕۆحهەژێن بوو. غەزەلنوس هەرجارێک یابەحری بینی بوو، سەرەنجی ئەو چاوە سەیرانەی دابوو، سەرەنجی ئەو دەستانەی دابوو، گەر دەیخستنە سەر شانی هەر کەسێک وەها پڕ سۆزبوون، تیشک و شەبەنگی ناو ڕۆحی ڕاستەوخۆ لە سیمای دەردەدارەکاندا وەک ئاسوودەگییەکی قووڵ

دەردەکەوتــەوە. لــەو ماوەیــەدا کــە پێکــەوە دەچــوون بــۆ لای خەڵکانــی نەخۆش، ئـەو دەسـتانەی تریفـە، ئـەو پەنجـە باریکانـەی، ئـەو چاوانـەی کـە لـە نـاکاو بـە سـۆزێکی سـەیر دەدرەوشانەوە، غەزەلنوسـیان ماندووکردبـوو. ئـەو لەگـەڵ جەمعییەتـی ژنانـی سـەرگەردان و پەژمـوردەدا هـەزاران ژنـی لـەم شارەدا بینیبـوو، ژنانـی سـەدان جـار لـە تریفـە جوانتـر و غەمگینتـر، بـەڵام هیـچ کات چاوێکـی وەهـا ئـارام و پـڕ خەیـاڵ و بێنیـازی نەبینیبـوو، چاوێـک جگـە لـە مەحەبـەت نیگایەکـی تـری بـۆ دونیـا تیـا نەبێـت، دەسـتێکی دیکـەی وەهـای نەبینیبـوو. غەزەلنـوس دەیزانـی پیاوانـی دی وەک ئـەو ئـەو سـیحرەی تیانابینـن. پیاوانـی ئـەو شـارە، سـیماو پێسـت و مەمـک و سـمتی ئافـرەت شـێتیاندەکات، بـەڵام کەسـێک حـەز لـە دەسـتی کچێـک بـکات، حـەز لـە پەنجـە باریکەکانـی بـکات، تیشـکێکی نهێنـی نـاو چـاو شـێتیبکات، ئـەوە شـتێکی دەگمـەن بـوو.

تریفـە لـەوە زیرەکتربـوو تێنـەگات غەزەلنـوس بەو سەرسـام و مەدهۆشـە، بـەڵام هێشـتا شـێتانە عاشـقی نییـە. بیرۆکـەی زەماوەندکـردن شـتێکی کتوپـڕ و قـورس، بـەڵام بزوێـن و خەیاڵئەنگێـز بـوو. لـە قووڵایـی دڵیـدا حەزیدەکـرد شـوو بـە غەزەلنـوس بـکات، بـەڵام وەک سەرسـەختییەکی کچانـە ڕاپیپێچێـت، وەک ئـەوەی بـۆ شـتێکی قووڵتـر و خەیاڵیتـر بگەڕێـت، ڕەزامەنـدی شـێتانە و پەلـەی خـۆی ئاشـکرانەکرد. ئـەو شـەوە تـا درەنـگ پێکـەوە لـە باغـی مەهنـازدا مانـەوە، هەوڵەکانـی غەزەلنـوس بـۆ ڕازیکردنـی تریفـە یابەحـری بێسـوودبوون. ئەگەرچـی ئەزموونێکـی لـە خۆشەویسـتیدا نەبـوو، بـەڵام غەریزەیەکـی قووڵـی کچانـە وای لێدەکـرد بڵێـت «تەنیـا ئـەو عەشـقانە نەمـرن کـە ناگـەن بـە یـەک». قەناعەتێکـی دێریـن و سـۆفیانە و کلاسـیکی بـوو کـە ئێسـتا جوانییەکـی زیاتـر و سـەیرتر و کتوپـڕی دەدا بـە تریفـە. ئـەو شـەوە لەگـەڵ هەمـوو دەردەکانیـدا، واهەسـتیکرد شـتەکان خێـرا و ئاسـان تێدەپـەڕن، بـەڵام تێگەیشـتنی ئـەو بـۆ خۆشەویسـتی قورسـتر و ئاڵۆزتـر بوو.

خۆی گەلێک سووک دەهاتە پێشچاو، گەر لە شەوێکی وەهادا شوویکات. دواتر حیکایەتەکە بۆ هەیبەت و ویقاری کچانەی قورس دەکەوتەوە، وەک ئەوەی لە شەوێکی لێقەوماندا ڕوویکردبێتە ماڵی کەسێک و هەر لەو شەوەشدا لەبەر ترسی وێڵی و بێکەسی شوویکردبێت. ئەو لە مێژە ئەو هەستە سەیرەی بۆ غەزەلنوس هەبوو، لەو شەوە دوورەوە کە لە ماشێنەکەی عەتاردا یەکیان بینی، لەو کاتەوە بە ئومێدە بیبینێتەوە. بەڵام ئێستا شتەکان وەها ئاسان دەهاتن، هیچ خەیاڵبازێکی ڕاستەقینەی نەدەخستە سەر هەوا و جۆش و خرۆش، خەیاڵبازی ڕاستەقینە بە عەشقی وەها ئاسان ڕازی نابێت. تریفە شتەکانی ئاڵۆزتر و قورستر دەویست. لەدەمی منداڵییەوە، لە سەردەمێکەوە کە لەگەڵ مەخلوقە نەبینراوەکاندا یاریدەکرد، گەڕان بۆ شتێکی ئەستەم و خەیاڵی لە دڵیدا بوو. هیچ گەمەیەک لەوە عاشقانەتر نییە، ببیتە عاشقێکی نەگیراو، کە بۆ مەعشوقێکی نەگیراو دەگەڕێت.

ئێستا دوای چەندین ساڵ کە مرۆڤ بیر لەو ڕۆژە دەکاتەوە، وەک ئەوە وایە دەستێکی نهێنی پاڵی بە غەزەلنوسەوە نابێت لە سەرەتاوە دەستپێکردنێکی تراژیدی دەست پێبکات. ئەو هەموو ژیانی لە غەزەلدا بردبووە سەر، دڵنیابوو خۆشەویستی شتێکە لە سەرکەوتندا دەمرێت و لە نوشوستیدا دەژی. ئەو لە هەموو جێگایەک ناوی وەک عاشقێکی جاوید ڕۆیشتبوو. ئێستا کە بیر لەو خولیا کتوپڕ و سەیرەی دەکەینەوە، لە شەوێکی وەهادا، لە میوانێکی وا ناسک و شەرمن داوای هاوسەری بکات. هەقمانە بپرسین؛ کێ دەڵێت غەزەلنوس هەر لە سەرەتاوە نەیزانیوە کە تریفە یابەحری مەخلوقێکی سەرابی و نەگیراوە؟ ئەو لەو پیاوانە بوو کە پیشەیان ئەوەیە سەراب بدۆزنەوە و دوایبکەون. من واهەستدەکەم غەزەلنوس دواجار ویستوێتی خۆی بە خۆشەویستی ناکام و ئەستەم گەمارۆبدات... بۆیە هەمان ئەو شەوە تریفەی بردوە بۆ باغی مەهناز تا

نیشانیبدات عەشقی ناکام چ سیحر و جوانییەکی ئەبەدی بەجێدەهێڵێت، چ باغ و لالەزارێک سازدەکات و چ خەیاڵێکی ناکۆتا دەخولقێنێت. غەزەلنوس ویستوێتی لە عەشقدا هەرگیز نەگاتە کۆتایی. ئەو شێتییە کتوپڕ و خۆفرێدانە لە ناکاوەی بۆ بەرپێی تریفە یابەحری ڕێگایەک بووە بۆ ئەوەی درێژە بە غەزەلەکانی بدات، بەجۆرێک لە جۆرەکان دڵنیابوو سەروکاری لەگەڵ چ بوونەوەرێکی سەختدایە. ویستوێتی لە عەشقێکی ئەفسانەیی و ئەستەمەوە بازبدات بۆ عەشقێکی ئەفسانەیی و ئەستەمی تر. ڕەنگە لەساتی یەکەمەوە دڵنیابوبێت کە تریفە یابەحری هەمان یاری لەگەڵدا دەکات، هەمان گەمەی ئومێد و نائومێدی کە عاشقان شێتدەکات. هەر دووکیان کەم تا زۆر نهێنی گەمەکەیان زانیوە، زانیویانە تەنیا کاتێک دەتوانن تا هەتاهەتایە پێکەوەبن کە دەستیان نەگاتە یەک. ئەوەی عەشق پلەیەک لە زەوییەوە بەرەو ئاسمان بەرزدەکاتەوە ئەوەیە لە مەعشوقەدا بۆ دیوە ئەستەم و خەیاڵییەکەی بگەڕێت. مرۆڤ لە هەموو چەشنەکانی خۆشەویستیدا بۆ ئەو کەسە ڕاستەقینەیە ناگەڕێت کە لە بەردەمیدایە، بەڵکو لە ناو ئەو کەسە ڕاستەقینەیەدا بۆ بوونەوەرێکی دیکەی خەیاڵی دەگەڕێت. خۆشەویستی سەرەتا تەنیا بینینی ئەو بوونەوەرەیە، سەرەنجدانی تارمایی ئەو مەخلوقەیە کە لە ژێر پەردەیەکی ئەستوورەوە دەجولێتەوە، عەشق کە گەورەدەبێت ئەو پەردەیە هێدی هێدی تەنک و تەنکتر دەبێتەوە، بەڵام کە دەمرێت ئەو پەردەیە هێدی هێدی ئەستور و ئەستورتر دەبێت، ئیتر چیتر مرۆڤ ئەو مەخلوقە خەیاڵییەی ناو ئەوی دی نابینێت.

ئەو کات کە لە باغی مەهنازدا دەسوڕانەوە، هەر دووکیان سەیری چاوی یەکیان کرد و قووڵ ئەو ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەیان بینی، هەرکاتێک نێر و مێیەکی سەر ئەم زەوییە سەیری چاوی یەک دەکەن، بۆ ئەو بوونەوەرە خەیاڵییەی ناو یەکدی دەگەڕێن، وەلێ کەمجار دەیدۆزنەوە.

تریفە یابەحری سووربوو لەسەر ئەوەی دەبێت هەموو شتێک تەنکتر بێت، سووربوو لەسەر ئەوەی هەر دووکیان گەمەکە تا دوورترین جێگا ڕاکێشن. عەشق یارییە، بەڵام یارییەکی قورس. ئەوانەی عەشق زۆر ئاسان دەکەنەوە دەیکوژن. تریفە یابەحری وا بیریدەکردەوە.

ئەو شەوە کە تریفە نوست، هەستێکی سەیری هەبوو، هەستێکی تێکەڵاو لە خۆشی و ئازار، یەکەمین جاریوو لە ژیانیدا لە ماڵێکی گەورەدا لەگەڵ پیاوێکی غەریبدا بنوێت، پیاوێک لە جێگایەکی نەزانراوی ئەو ماڵەدا وەکو ئەو خەوتبوو. تا بەربەیان بیری لەو پێشنیارە سەیر و کتوپڕەی غەزەلنوس دەکردەوە. دڵنیابوو لە ناو ئەم غەزەلنوسەدا مەخلوقێکی تر هەیە کە ئەم دەیبینێت و نایبینێت، دەردەکەوێت و دەڕوات. ئەو ئەم مرۆڤە نەبینراو و خەیاڵییەی خۆشدەوێت، نەوەک ئەم کەسەی لە گۆشت و خوێن و ئێسک دروستبووە و لە بەردەمیایەتی. دەبوو بگاتە ئەو کەسە، بگاتە ئەو مەخلوقە خەیاڵییە. بەیانی کە هەستا هەموو بیرکردنەوەکانی شەوی بە غەزەلنوس گووت. لەو ڕۆژەوە ڕێگای ئەو پەیوەندییە سەیرەی نێوان تریفە و غەزەلنوس درێژ بووەوە، هەر دووکیان چاوەڕوانی ئەو ساتە سیحراوییەی ئاشکرابوونیان دەکرد... ساتێک مرۆڤ نازانێت پێیدەگات یاخود نا؟.

تریفە یابەحری وەک بەرپرسی سەرەکی منداڵە بێسەرپەرشتەکان لەو ماڵەدا مایەوە. ئەو ڕێکخراوە بیانییانەی کە دەرامەتی بەخێوکردنی ئەو منداڵە هەتیوانەیان گرتبووە ئەستۆ، شادومانبوون ئافرەتێک سەرپەرشتی خانەکە بکات. ماڵەکە چەپەک و دوورەزار بوو، ئەوانەی دەهاتنە ئەوێ خەڵکانی تایبەت و بڕواداربوون، بەوەدا شوێنەکە وەک بنکەی کۆمەڵێک منداڵی بێدایەن سەیردەکرا، مانەوەی تریفە وەک سەرپەرشتیار و بەخێوکەر و دادەی منداڵەکان ئاسایی و بێگرێ چووە ڕێوە. ئەو ماوەیە غەزەلنوس زۆربەی کات لە ژێر زەمینەکەدا خەریکی غەزەلیات بوو، ڕیشێکی درێژتر و

قژێکی دەروێشئاساتر و نیگایەکی لە جاران غەمگینتری هەبوو، ماوەیەک بوو تەنیا غەزەلەکانی لە بەر نەدەکرد، بەڵکو خۆشی غەزەلی دەنوسی. بەیانیان کە لە هەزارباغ دەگەڕایەوە، غەزەلەکانی شەوی تۆماردەکرد کە لە لالەزارەکاندا بە ئیلهامێکی نهێنی بۆیدەهات. هەندێجار بە خۆی و کراسە زەیتونییەکەیەوە دەهاتەسەرێ و تا ماندوودەبوو کۆمەکی بە منداڵەکان دەکرد و یاری لەگەڵدا دەکردن، هەندێجاریش هەندێک لە غەزەلەکانی خۆی بۆ تریفە یابەحری دەخوێندەوە و مەست و دێوانەی دەکرد. لەیەککاتدا نزیک یەک و دووریش لە یەک دەژیان. ئەوە یاسای گەورەی هاوسێتی و هاوڕێییەتیان بوو. ڕۆژ دوای ڕۆژ ئاگرێکی چکۆلانە لە ناخیاندا گەورەدەبوو، ڕۆژ دوای ڕۆژ هەستیاندەکرد شتێک لە ناوەوە ئازاریاندەدا، هەر دووکیان بۆ ئەو ئازارە دەگەڕان، ئەو ئازارە تاکە نیشانەی ئەوە بوو کە نزیکن لەیەک و بۆ یەک دەژین. ئەوە ئەو پێوانە کلاسیکییەی ئەڤین بوو کە هەردووکیان لە باوانیانەوە بۆیان مابووەوە «عەشق گەر تاسەر ئێسقان ئازارت نەدا، ناتوانێت کامەرانتبکات».

غەزەلنوس هێدی هێدی ڕوخساری دەروێشێکی شێتی وەردەگرت، ئێستا لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا وەک دێوانەیەک دەردەکەوت، وەک جاران تەنیا غەزەلی نەدەخوێندەوە، بەڵکو هەندێجار غەمگین و ئەشکبار دەینواند. شەوان هەمیشە دەچوو بۆ هەزارباغ، تریفە یابەحری ماوەیەکی درێژ ئاگاداری ئەو گەشتە شەوانانەی غەزەلنوس نەبوو، ئەو هەموو شەوێک منداڵەکانی بەسەر دەکردەوە، دایدەپۆشین، ئاوی دەدانێ، دەستیدەدا لە دەموچاویان. شەوێکیان «مراوی ئاوی» نەخۆشبوو. مراوی کچێکی چکۆلانەبوو، ناوی ڕاستەقینەی خۆی هەرمین بوو، بەڵام لە منداڵییەوە هەمووان بە مراوی ئاوی بانگیاندەکرد، شیرین و پەریئاسا بوو. کچەکە تایەکی وا زۆری هەبوو مرۆڤ دڵی بترسێت. تریفە یابەحری هەموو ئەو ماڵە بە دوای غەزەلنوسدا گەڕا تا لە خەو بێداریبکاتەوە و کچەکە بەرێت

بۆ بیمارستان، بەلام نەیدۆزییەوە. شەوانی دیش دیسانەوە ئەو چیرۆکە دووبارەبووەوە. تریفە یابەحری دڵنیابوو غەزەلنوس زۆربەی شەوان دەچێت بۆ جێگایەکی نادیار، لە شوێنێکی دیکە و لەسەر زەمینێکی خەیاڵیدا وندەبێت. ئەو پیاوە لە پاڵ نهێنییە گەورەکانی ژیانیدا خاوەنی نهێنییەکی تاریکتربوو کە تریفە ئاسان بۆی تەفسیر نەدەکرا.

غەزەلنوس ڕۆژ دوای ڕۆژ لە نێوان دوو عەشقی خورافی و ئەستەم و بێحاسڵدا دابەشدەبێت.

ئێستا کە بیری لێدەکەینەوە خەیاڵئەنگێز و باوەڕنەهێنە، ژن و پیاوێکی گەنج کە هەر دووکیان بە جۆرێک لە جۆرەکان شەیدای یەکن، بەلام ماوەیەکی درێژ لە ماڵێکدا دەژین، پێکەوە کاردەکەن، بەلام دەست بۆ یەک نابەن، لێویان بەر لێوی یەک ناکەوێت، لەزەت لەوە دەبینن کە دووربن، دەستیان نەگاتە یەک و ئازاربچێژن. ئاشکرا دوا ئومێدیان ئەوە بووە بگەنە پلەی سوتان، دوا ئاواتیان ئەوەبووە ئەزموونی سۆفییە کۆنەکان دووبارەبکەنەوە. لە دوو ڕۆح نەدەچوون سەر بەم سەردەمە بن، دوو جەستەی نامۆبوون بەم شارە و بەم سەر زەمینە. غەزەلنوس بۆنی کتێبە کۆنەکانی غەزەلی لێدەهات، بۆنی ئەو لاپەڕە زەردانەی مەلای سوختەی لێدەهات، وەکو ئەوەبوو مەحکوم بێت بەوەی وەک شاعیرە کۆنەکان بژی، وەک عاشقە دێرین و قەلەندەرەکان عومر بەڕێبکات، تریفەش ئەوەی مافوورچنە خەیاڵییە کۆنەکان بوو، لە کچی سەر فەرشە خەیاڵییەکانی خۆی دەچوو... ئەو کچانەی عاشقیان دەبین و نایانگرین.

ئەمرۆ دوای ئەو هەموو ساڵە وا تێدەگەین، خولیای تریفە یابەحری بۆ عەشقی سوتێنەر، بۆ حەسرەتێک کە تێرنابێت، ڕەنگە پەرچەکردارێکی ڕۆحی بووبێت بەرابەر سەردەمێک کە هێدی هێدی شار تێیدا پڕدەبوو لە خواستی ژیانی پڕ لەزەت و ئاسان. سەردەمێک هیچ مرۆڤێک نەیدەویست کاربکات، وڵات پڕبوو لە پیاوی بێئیش، لە دەیان هەزار جووتیار کە

کێڵگەکانیان بەجێدەهێشت و لە کۆمەڵێک شار و شارۆچکەی تاریک و نوتەکدا لەسەر ورەوڕی دینەمۆ، شەو و ڕۆژ نانیاندەخوارد و سەیری سەتەلایتیان دەکرد، مرۆڤ سیحری زەوی لە یادکرد و سروشت بەهایەک و ئیش نرخێکی نەما، خەڵک هەموو پێکڕا شادومان بوون، هەموو پێکڕا ئاسوودە لە سایەی دەسەڵاتێکدا دەژیان هەولێیدەدا بێئیشی خۆی وەک ئیش نیشانبدات. سەردەمێک، دەروازە و سەرەتای ئەو ڕۆژاگارانەی دواتر بوو کە پارەی زۆر، خواردنی زۆر، لە ئاسمانەوە دەباری. خەڵکانێک دروستبوون کە تەنیا شێتی ئوتومبیلی ڕەونەقدار بوون و شەویش لە ناو ئوتومبیلەکانیاندا دەخەوتن. خەڵکانێکی تریش تا تووشی دڵپەشێوی دەبوون و دەمردن سەیری فلیمە ئیرۆتیکییەکانیان دەکرد، کە تازە بە تازە بە لێشاو ڕوویدەکردە ئەو شارە. لە شاردا هەندێک گروپی سەیر و ڕەفتاری پێشتر نەبینراو دەرکەوت. ئەو گروپە پەیدابوون کە گەنجێکی لە خۆبایی بە ناوی «میزپاشا»وە سەرکردایەتیدەکردن، پەلاماری کتێبخانەکانیان دەدا و میزیان بە کتێبەکاندا دەکرد. گروپی ئەو گۆرانیبێژە دەنگ ناخۆشانە سەریانهەڵدا کە کەچەڵێکی کاسکێت لەسەر بەناوی «بولن بولن» پێشەنگیان بوو، لە هەر جێگایەکدا گۆرانیان بگووتایە سەدان ڕۆحی مەیموونئاسا لەدەوریان سەمایدەکرد. ئەو یانە و چێشتخانە تایبەتانە کرانەوە کە مرۆڤ دەیتوانی لەوێ تا وەک بەرازی لێدێت بخوات. شەقامەکان بە شەو پڕدەبوون لە بۆنی ڕشانەوەی ئەو سەرخۆشانەی هەموو شاریان وەک ئاودەستخانەکانی ماڵی خۆیان سەیردەکرد، خەڵک لەو شارەدا دەیانخوارد و دەڕشانەوە، دەیانخوارد و دەڕشانەوە. شەوان بای ڕووەو باشوور، دوکەڵی ئاگردانی پیاوە مەست و بخۆرەکانی لە چیاکانەوە دەگێڕایەوە و لە ناو شاردا ئەو دوکەڵە مرۆڤی دەخنکاند. ئێواران سەدان هەزار سەیرانکەر دەچوونە قەراغشار و بەرابەر یەک دادەنیشتن و وەک لە کێبڕکێیەکی ترسناکی خواردندابن،

یەک پیشانی یەکتریان دەدا کە دەتوانن چەند زۆر بخۆن. مرۆڤ بۆ هەر جێگایەک دەچوو ئادەمیزادێکی بە لەفەیەک گۆشتی گەورەوە دەبینی. تریفە یابەحری کە ئەوکات چەند ساڵ بوو لە بەحری خەیاڵدا تەنیا مافووری قەشەنگی چنیبوو، لەم دونیا تازەیە تێنەدەگەیشت. لەو دەمەدا کە خەریکی مامەڵەی کڕینی خانووەکەی بوو، بۆ هەر لایەک دەڕۆیشت خەڵکی دەبینی لە ڕاڕەوی دائیرە و لەسەر مێزی ئیشەکانیان بە پارووی گەورەوە دانیشتوون، ژنانی قەڵەوی دەبینی بە گوویی پڕەوە، فایلی تاپۆ و باج و موڵکدارییان لە نێوان ژوورەکاندا دەهێنا و دەبرد. وڵاتێک بوو لە ژووری سەرۆکەکانەوە، لە هۆڵی پەرلەمانەوە تا ناو کتێبخانەکان و هۆڵی زانکۆکان هەمووی بۆنی چێشتخانەی لێدەهات. هەندێک لەسەرکردەکانی وڵات و ئەندامی بیرۆی سیاسی حیزبەکان وەها ئاوسابوون، مرۆڤ دەترسا ڕۆژێک با وەک میزەڵان بیانفڕێنێت بۆ ئاسمان. هەر لەو ساڵانەدا گروپێکی ئیسلامی بچکۆلە دەرکەوت کە شێخێکی بە حورمەت سەرۆکیان بوو، مرۆڤیان سەردەبڕی و گۆشتەکەیان دەخوارد. هەموو شتێک لەو شارەدا دەخورا و هەموو شتێکیش لەدەوری خواردن دەسوڕایەوە، جگە لە بیرکردنەوە لە خواردن ئادەمییەکان بیریان لە هیچی تر نەدەکردەوە. تریفە یابەحری سەیری لێهات کە دەیبینی، شۆفێری تاکسییەکان هەموو بەدەستێک سوکان دەگرن و بە دەستێک لەفە دەخۆن، پۆلیسە قەڵەوەکانی هاتوچۆ لە فولکەکاندا دەوەستان و پێکڕا بابۆڵەی گەورەگەورەیان بەدەستەوەبوو. تاکە هونەرێک کە باوکان فێری کوڕەکانیان دەکرد، ئەوە بوو چۆن شیش لێبدەن و چۆن لەفە بپێچنەوە، تاکە هونەرێک کچان لە دایکیانەوە فێردەبوون ئەوە بوو چۆن چێشت لێبنێن و پیاوان بە مەزاقی گۆشت سەرشێتبکەن. سەردەمێک کە خانمی یابەحری لەگەڵ غەزەلنوسدا چوو بۆ بیمارستان، سەیری لێهات کە دەیبینی پزیشکەکان بە لەفەوە دەچن بۆ ساڵۆنی نەشتەرکاری و بە

لەفەوە دێنەدەرێ. لە بەر خواردن مرۆڤەکان ئەوەیان لە بیرکرد کە دەبێت باغچەکانیان ئاوبدەن، شار وشکییەکی گەورە و درەختەکان ئافاتی سەیر ڕووی تێکردن. لە هەموو جێگایەکدا خوان دەڕازێنرایەوە و سفرە دەکرایەوە، تریفە سەیری هەر جێگایەکی دەکرد دەیبینی شێوازی خواردن و ڕەفتاری بخۆری تەواوی دونیای گرتۆتەوە. مرۆڤەکان قسەیان لەگەڵ یەکدا نەدەکرد، بەڵکو یەکتریان دەخوارد، کوڕ کچی خۆشنەدەویست، بەڵکو دەیخوارد، ژن مێردی خۆشنەدەویست بەڵکو دەیخوارد، فرۆشیار کڕیارەکانی دەخوارد و کڕیاریش فرۆشیارەکان. ئەو ڕۆژەی سەی قادری نیا بانگیکرد و حیکایەتی فرۆشتنی کارخانەکەی بۆ گێڕایەوە دڵنیابوو سەی قادر خوراوە. بەیانیان کە دەچووە ناو کرێکارەکانی مافوور و سەیری چاوی ژنەکانی دەکرد، دڵنیابوو، مێردەکانیان شەو دەیانخۆن، لەو دەمەدا فۆبیا و ترسی خواردن لە تریفە یابەحریدا دروستبوو. بەو ترسە گەورەیەوە چوو بۆ لای غەزەلنوس، ئومێدەواربوو ئەو کوڕە نەیخوات. کە غەزەلنوس پێشنیاری هاوسەری بۆ کرد، تریفە یابەحری هێشتا لەو ترسەدا دەژیا. ئەو شەوەی بڕیاریدا مەسەلەی شووکردن بە غەزەلنوس دوابخات، دەیویست بکشێتەوە بۆ جێگایەکی خەیاڵی، بۆ ئەو دیو پەرژینێکی نەبینراو، بۆ جێگایەک بتوانێت سەیری دونیا بکات و نەخورێت.

تریفە زۆر زوو لەگەڵ منداڵەکاندا ڕاهات. ئەو کات پتر لە نۆ منداڵ لەو ماڵەدا دەژیان، سەیری لێهات پیاوێک بە تەنیا توانیبێتی ئەو هەموو منداڵانە بەو چەشنە وەها گەورەبکات، ڕاستە بەردەوام باجییەکی چکۆلە و پیرەمێردێکی ڕوخۆش لەوێبوون بۆ کۆمەکی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا غەزەلنوس ڕەنجی زۆری دەدا کە لەسەروو تاقەتی مرۆڤەوە بوو. تریفە لە یەکەم شەوەوە بەر لە خەوتن منداڵەکانی دادەنا و حیکایەتی بۆ دەکردن. منداڵەکان هەندێکیان وردبوون، تەنیا سێ لەوانە هێدی هێدی خەریکبوو

دەرسکان و گەورەدەبوون، خەیاڵوان و بولبول و باخان... بولبول کوڕێکی نابینابوو هەمووان بە «بولبولی کوێر» بانگیاندەکرد. باخانیش کچێکی چاو کاڵ و سپیکەلەبوو کە بە ئەندازەیەک لە بوکەشوشە دەچوو، دەبایە دەستی لێبدەیت تا بزانیت مرۆڤە و زیندووە. خەیاڵوانیش منداڵێکی هێمن و غەمگین بوو، بەردەوام بۆنی گوڵی دەکرد و بێهۆشدەبوو، ئەوە گەورەترین دەردی ژیانی بوو، ڕۆحی هێند ناسک بوو بەرگەی بۆنی گوڵی نەدەگرت. هەر سێکیان بە زوویی بوون بە هاوڕێی تریفە. گەر منداڵەکان لە قوتابخانە یاخود لە باغچەی ساوایان بوونایە، غەزەلنوس هەمیشە بەیانیان دەخەوت، دەمەو نیوەڕوان بە قژێکی دەروێشئاساوە هەڵدەستا، دەبایە بەردەوام بە ئاوی سارد خۆی بشوات بۆ ئەوەی خەبەری ببێتەوە، عەسرانیش بە قژ و ڕیشێکی تەڕەوە دەکەوتە ناو بەحری غەزەلیاتەوە. شەوێکیان سەرکەوتە سەرەوە بۆ لای تریفە یابەحری، ئەو شەوە بۆ یەکەمجار ئەو شەڕە گەورەیە دەستی پێکرد کە دەتوانین بە شەڕی غەزەل ناویببەین، غەزەلنوس هێدی هێدی دەگەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئەم ئافرەتە چکۆلانەیەی خۆشدەوێت، دەبایە ڕۆژانە غەزەل بۆ تریفە یابەحری بخوێنێتەوە، غەزەلەکانی خۆی، ئەو غەزەلانەی لە خوێنی دڵی تکابوون. دەبایە تریفە شەو و ڕۆژ لەگەڵ هێزی ئەو غەزەلانەدا لە جەنگدا بێت، لەگەڵ هەموو غەزەلێکدا هێزێکی گەورە بەرەو ئامێزی ئەو پیاوە پاڵی پێوەدەنا. بەڵام نەدەبوو وەکو ژنانی تر عاشق بێت، دەبوو لەو کاتەدا کە پێویستی بە نزیکییە دووربکەوێتەوە، نا لە بەرئەوەی ناوێرێت جەستەی خۆی بخاتە یارییەکی وەهاوە، بەڵکو لەبەرئەوەی مەعشوقە دەبێت تا هەتا هەتایە وەک خەیاڵێکی ئەفسانەیی و ئەستەم بمێنێتەوە. مەعشوقە کەسێک نییە لە بەردەمتدا، بەڵکو نیگارێکە لە خەیاڵتدا، کۆی غەزەلەکانی غەزەلنوسیش بەو ڕێگایەدا دەڕۆیشتن. تریفە ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر هەستیدەکرد کە غەزەلنوس هەمان یاریدەکات، یاری

هەڵهاتـن بـە جەسـتە و نزیکبوونـەوە بـە ڕۆح. هەندێجـار پێکـەوە دەچـوون بـۆ باغـی مەهنـاز، ڕوویـان لـە نـاو گوڵـە پەمەیـی و جاویـد و بۆنـدارەکان دەکـرد. ڕۆژێـک لـە ڕۆژان غەزەلنـوس لـە نێـوان درەختەکانـی ئـەو باغـی حەسـرەتەدا پێیگـووت دەیەوێـت چیرۆکـی مەهنـاز مـارۆ و باغـە ئەفسانەییەکەی بکاتـە کتێبێـک، لـە شـتێکدا بینوسـێتەوە و بـۆ منداڵەکانـی بەجێبهێڵێـت. «بـەڵام ئـەی هـەزاران کـوژراو و مـردووی تـر، ئـەی ئەوانـەی لـە جەنگدا دەکوژرێـن، ئـەی ئـەو کوردانـەی لـە ئاوەکانـی سـەفەردا دەخنکێـن، ئـەی ئەوانـەی حەسـرەتی کتوپـڕ دەیانکوژێـت، ئـەی ئەوانـەی بـە مردوویـی بەسـەر زەویـدا دەڕۆن، ئـەی ئـەو نەخۆشـە بێئومێـد و بێدەرمانانـەی لەسـەر قەرەوێڵەکانـی بیمارسـتان کەوتـوون، ئـەی ئـەو پیرانـەی دەمـرن بێئـەوەی هیـچ لـەم سـەر زەمینـە حاڵـی بووبێتـن، ئـەی ئـەو کیژانـەی دی کـە لـە مسـەرەوە بـۆ ئەوسـەری وڵات لـە نـاکاو گڕدەگـرن، ئـەی ئـەو کوڕانـەی بێهۆیەکـی دیاریکـراو خۆیـان دەکـوژن، ئـەی ئـەو لاشـە نادیاریانـەی نـاو بـە نـاو دەردەکـەون؟». لـەو باغـەدا بیرۆکـەی ئـەو کتێبـە خەیاڵییـە گەورەیـە لەدایکبـوو، کتێبێـک لـە هەمـوو کتێبەکانـی دونیـا گەورەتربێـت، کتێبێـک کـە هەرگیـز کۆتایـی نایـەت، چیرۆکێـک چیرۆکـی هەمـوو ئادەمیـزادەکان لـە خۆبگرێـت.

تریفـە یابەحـری ئێجـگار سەرسـامبوو بـەو بیرۆکەیـە. ئـەوەی کتێبێـک بنوسـن هەرگیـز دوایـی نەیـەت. کتێبێـک درێژتریـن کتێبـی دونیـا بێـت، هەتاهەتایـە مرۆڤـەکان تیابنوسـن و کۆتایـی نەیـەت، کتێبێـک بـەردەوام هەڵیدەیتـەوە و نەگەیتـە دواهەمیـن لاپـەڕە، چونکـە هەمیشـە کەسـێک لـەم شـارەدایە بـە ئەشـکەنجەوە دەمرێـت، ئەشـکەنجەیەک کـە سروشـت و خـودا نەیاننـاردوە، بەڵکـو مـرۆڤ دروسـتیکردوە. ئـەو بیرۆکەیـە وەک ڕێگایەکـی گـەورە وەهابـوو، بـۆ ئـەوەی خۆیان لـە ئازاری ئەڤیـن دووربخەنـەوە. چەندەها ڕۆژی دی بیریـان لـەوە کـردەوە کـە دەبێـت تیپێکـی گـەورە بسـازێنن، دەبێـت ئەوانـە بدۆزنـەوە کـە لـە نوسـینی ئـەو کتێبـەدا کۆمەکیاندەکـەن. ئیـدی

غەزەلنوس دەبایە بگەڕێت و بگەڕێت. ئەو لە گەڕانی خۆیدا گەلەک هاوڕێی زۆری دۆزییەوە، تخوبی ئیمپراتۆرییەتە خەیاڵییەکەی گەورەبوو... بوو بە خاوەنی هەرێمێک تەماحی تێبکەن.

***

با لێرەدا کەمێک بوەستین و بتانگێڕمەوە بۆ سەرەتای کتێبەکەم بۆ ئەو شوێنەی پرسیارێکم لێکردن و هەروا سادە و ساکار و بێوەڵام بەجێمهێشت، پێمگووتن لەگەڵ خۆتاندا بیر لەو پرسیارە بکەنەوە کە دەشێت «مرۆڤی تەواو کێ بێت؟». داوامکرد سەبرم لێبکەن تا تەکنیکی رێکخستن و گێڕانەوەکان وەها رێکدەخەم، بتوانم لە جێگایەکدا وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە. هەستدەکەم ئێرە شوێنێکی باش بێت کەمێک راتانبگرم و پێکەوە لە وەڵامی ئەو پرسیارە ئەبەدییە رابمێنین، کە لە مێژە مرۆڤەکان و کۆمەڵگاکان ئازاردەدات. هەرکات بیر لەو شەوە دەکەمەوە کە تێیدا تریفە یابەحری پێشنیاری هاوسەری غەزەلنوسی ڕەتکردەوە، هەستدەکەم هەر یەک لە تریفە یابەحری و غەزەلنوس هەردووکیان لە قووڵاییدا، کوشتەی ئەو گەڕانە بوون بۆ مانای «مرۆڤی تەواو». لە هەر شوێنێکی دونیادا کە شتەکان دەڕوخێن و پێوەرەکان دادەبەزن و ئادەمییەکان لە ئاژەڵی نەوسن نزیکدەبنەوە، لەو شوێنانەدا هەردەم خەڵکگەلێک پەیدادەبن پتر بۆ کەماڵ و هەستپڕی دەگەڕێن، دەیانەوێت پڕسۆز و ئەڤینبەخش بن. لەو ساتانەی مێژوودا کە زۆرینەی مرۆڤەکان خۆیان تاڕادەی مێش و مەگەز، بەراز و گورگ نزمدەکەنەوە، ژیانیان بچوکدەبێتەوە بۆ سەر هەندێک پنتی تەسک و خەیاڵیان نامێنێت و زەینیان راستی وەرناگرێت و چاویان ئەودیوی شتەکان نابینێت، لەو ساتانەدا مرۆڤگەلێک لەدایکدەبن کە کەماڵی خۆیان لەوەدا دەبینن، فراوان و بێسنوور و هەمەدەست و باڵداردڵ بن، کەسانێکن ڕۆحیان لە

فرین ناوەستێت و بێوەستان لە ناو پێچاوپێچەکانی وجوددا دەسورێنەوە. مەخلوقگەلێکن، وەڵامی بچوکبوونەوەی مرۆڤ و تەسکبوونەوەی جوگرافیای خولیاکانی بەوە دەدەنەوە هەوڵبدەن لە هەموو جێگایەکی دونیادا بن، لەم سەری خەیاڵ و لەو سەری حەقیقەتدا بژین، لەم سەری تەنیایی و لەو سەری تێکەڵی و هاودەردیدا بسورێنەوە، بێسنوور خۆیان بن و بێسنووریش بۆ ئەوانی دی لێرەبن، تەنیابن و تێکەڵ بن، خود بن و جیهان بن، درەختێکی بچوکی قەراغ جۆگە بن و تەواوی دارستانەکەش بن. غەزەلنوس کەسێک بوو دەیویست لە یەککاتدا ئەو سەری سنووری خەیاڵ و ئەوسەری سنووری حەقیقەت پێکەوە بژی. دەیویست لەو کاتەدا کە لە حەقیقەتدا نوقمدەبێت، لە خەیاڵیشدا مەلەبکات. لەوکاتەدا کە ئەوپەڕی جوانی و تەلیسم و زیندوێتی خەیاڵ دەژی، ئەوپەڕی تاڵی و تاریکی و ژینکوژی حەقیقەتیش ببینێت. مرۆڤی تەواو لای غەزەلنوس ئەوەبوو کە حەقیقەت و خەیاڵ لە ناویدا دەتوانن سەیری یەکبکەن. نا، ناڵێم پێکەوە ئاسوودەبژین، یان پێکدانەدەن، یان لەگەڵ یەکدا نەجەنگن، بەڵکو دەڵێم سەیری یەک بکەن. مرۆڤی ئاسایی کەسێکە حەقیقەت لە ناویدا ناوێرێت سەیری خەیاڵ بکات، حەقیقەت ئاسان دەتوانێت خەیاڵ بکوژێت، مرۆڤی خەیاڵیش مرۆڤێکە ناوێرێت زۆر توخنی ڕاستی بکەوێت، دونیای ڕاستەقینە وەک وێستگەیەکی شەمەندەفەر تەماشادەکات کە لێوەی بەرەو خەیاڵ دەڕوات، بەرابەر دونیا بێباک و کەمتەرخەم دەردەکەوێت. بەڵام مرۆڤی تەواو هەردووکیانە، هەردوو بوونەوەرەکەیە، هەردوو مەخلوقەکەیە کە بەرابەری یەک دادەنیشن و چاودەبڕنە یەک و قسەدەکەن. خۆشەویستیش لای مرۆڤی تەواو ئەوەیە کە مەحبوبە بوونەوەرێکی ڕاستەقینە بێت و بتوانێت وەرگەڕێت و ببێتە بوونەوەرێکی نەگیراو و خەیاڵی، هەروەها بوونەوەرێکی خەیاڵی بێت و بشێت و بتوانێت ببێتە حەقیقەت. مەعشوقە لای مرۆڤی تەواو کەسێکە کە مرۆڤ نازانێت

ڕاستییە یان خەیاڵ، بوونی هەیە یاخود وەهمە، لێرەیە و دەیبینین یاخود تەنیا لە خەوندایە. لێرەوە ژیانی مرۆڤی تەواو و عەشقی مرۆڤی تەواو، ژیان و عەشقێکی ئەستەمە.

تریفە یابەحری لەو ساتەدا کە ئەڤینی غەزەلنوس ڕەتدەکاتەوە، دەزانێت گەر ببێتە ژنی غەزەلنوس، دیوە خەیاڵییەکەی خۆی دەخاتە بەر گەمەیەکی ترسناکەوە و دەبێتە بوونەوەرێکی دونیایی، دەبێتە کەسێک لە گۆشت و خوێن و جەستە... بەڵام تریفە لەو کیژانە نییە بتوانێت ڕۆڵی جۆرە دڵدارێکی وەها ببینێت، ئەو لە ئەندێشەی ئەوەدایە چۆن ببێتە مەعشوقەیەکی خەیاڵی... کە پێدەچێت لای ئافرەت باڵاترین پلەی بە مەعشوقەبوون بێت.

## یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

ڕۆژێک بۆ یەکەمجار مافوورێکی خانمی یابەحریم بینی، پێی سەرسامبووم، سەرەتا وامدەزانی دەستکردی قاڵیچنە سیحربازەکانی ئێرانە. دواتر بۆم دەرکەوت کە بەرهەمی کارخانەیەکی بچوک و چەپەکی خۆماڵییە. هێندەی چاوم بەو فەرشە کەوت تێگەیشتم کەسێک دروستیکردوە، سەرقاڵی خەیالات و پەروەردەی تێرامانی شاعیرانەیە. لە زۆر شوێنی دی، پەنجە سیحراوییەکانی ئەو مافوورچنەم بینییەوە، لە زۆر ماڵی پارەدار و لای گەلەک بەرپرسی بە مەقام فەرش و ڕاخەری ئەو دەستە ئەفسووناویەم بەرچاوکەوت. من بووم لە نیهانی خۆمدا گووتم دەبێت، ئەو دەستەی ئەم مافوورانە دروستدەکات، ئەو خەیاڵەی بیریان لێدەکاتەوە، ئەو ئامێرەی دەیانچنێت، موڵکی من بن. من پێویستیم بەوە بوو خەیالاتی هەموو دونیا کۆبکەمەوە، نازانم کەی

ئەو خولیایە چووە سەرمەوە ببم بە یەکەم کڕیاری خەیاڵ. نا مەڵێن خەیاڵ شتێکە ناکڕدرێت، بە درێژایی مێژوو هەر مرۆڤە و خەیاڵی خۆی دەفرۆشێت، یەکەم شتێک مرۆڤ لە مێژووی خۆیدا فرۆشتبێتی خەیاڵە. پیاوانی ئاین لە خێڵە سەرەتاییەکاندا، ئەوانەی پێکولکەری دین بوون، سەرەتا جگە لە خەیاڵ هیچی دیان نەبووە بیفرۆشن، دین سەرەتا بریتیبوو لە هونەری فرۆشتنی خەیاڵ. من کە ئەو مافوورانەم بینی تێگەیشتم ئەمشارە ڕۆحێکی نەفرین و دڵهەژێنی خەیاڵ گرتویتی. پێشتر بەو چەشنە لە هیچ کوچەیەکدا بەر هێز و تەوژمی خەیاڵ نەکەوتبووم، گەلەک کتێبی کۆنیشم لەسەر ئەم شارە خوێندەوە، لە یاداشتی گەڕاڵ و گەڕیدە کۆنەکانەوە تا دەگاتە سەر ئەو مێژووە تازانەی هەندێک مێژوونوسانی کورد لەسەدەی بیستدا نوسیبوویان. پێناچێت مێژووی دوور و نزیکی ئەم شارە شتێکی ئەوتۆی لەسەر خەیاڵ تێدابێت. هەر شارێکیش ئاشکرا شتێک لەسەر خەیاڵاتی خۆی نەدرکێنێت، لە ژێرەوەڕا شتی ترسناک تیا ڕوودەدەن. وامەزانن من کەسێکی بێباکم کە قسەی بێمانا فڕێدەدەم، من کوچە بە کوچە و گوزەر بە گوزەر ئەم شارە گەڕاوم، لە ڕوکەشدا ئەم شارە ئاسەوارێکی خەیاڵی تێدا نییە. من هەمیشە پرسیومە دەبێت خەیاڵ چوو بێت بۆ کوێ. وامەزانن من لەوانەم کە دەمەوێت پەیکەر بۆ خەیاڵات دروستبکەم، نا، من لەگەڵ هەموو حەز و سەرسامی و ڕێزێکمدا بۆ خەیاڵ، لەو کەسانەم کە لە خەیاڵ دەترسن. خەیاڵ لەو شتانەیە کە مرۆڤ تا دەیبینێت و ئاگاداریێتی ئاسایی و قەشەنگە، بەڵام کە دیارنەما، کە بە شارێکدا پیاسەتکرد و شوێندەستی خەیاڵت نەبینی، ئەوا بترسە. هیچ شتێک لە خەیاڵ ترسناکتر نییە کاتێک دەبێت بە هێزێکی نهێنی. من لەگەڵ دەفتەری سیاسی حیزب و لەگەڵ جەنابی سەرۆکیشدا دوو بەدوو قسەم لەسەر ئەم مەسەلە ترسناکە کرد. گەر تێنەگەین ئینسانەکان ئاشکرا خەیاڵ لە

چی دەکەنەوە، پاشەڕۆژێکی تاریک و ترسناک چاوەڕێماندەکات. خەیاڵ لە ژێرەوە دەبێتە خولیای ترسناک، دەبێت بە وەسوەسەی کوشندە، بە ئارەزوویەکی حەرام کە کەس لە کەنار و بنی دەریاکەی تێناگات. کە زۆر بەم شارەدا پیاسەدەکەم، کە سەرەنجی گومەز و منارە و قەلاکانی دەدەم، کە بە قەیسەرییە سارد و پەشۆکاوەکانیدا دەگەڕێم، هەست بەو خۆشاردنەوە ترسناکەی خەیاڵ دەکەم. خەیاڵ لەم شارەدا بەردەوام لە ژێرەوە ئیشدەکات. من شەو کە لەگەڵ ژنە قەشەنگ و سپیکەلە و بالابەرزەکەی خۆمدا دەخەوتم، هەستم بە هیچ خەیاڵێک نەدەکرد، لەشی سارد و بێخەیاڵ و بێئەفسون دەهاتە بەرچاوم، جارێک تاقیمکردەوە لەگەڵ ژنی بەرەڵای کۆنە دۆستێکی گەنجیمدا خەوتم، کە یەک بە هەزاری ژنەکەی خۆم جوان نەبوو، لەگەڵ ئەودا شتەکان جۆرێکی تر و تامێکی تریان هەبوو. من چووم بۆ لای مەلایەکی ناسیاو کە زۆر ئیمانم بە دەستپاکی و خودا ناسی هەبوو، هەموو حیکایەتەکەم بۆ گێڕایەوە، پێمگووت خەیالات مرۆڤ بەرەو حەرام دەبات، بەرەو بیرکردنەوەی خراپ. ئەم شارە خەیاڵی تیا نییە، پێمبڵێ مامۆستا خەیالاتی مرۆڤەکان کە وندەبن دەچن بۆ کوێ؟. مەلای فرەزانستم پێیگووتم «هەموو خەیاڵەکان دەچنە ژێرەوەو دواتر وەک شەهوەت و ئارەزووی خراپ دێنەوە دەرێ، وەک هێزێک کە دەستەمۆناکرێت و دەستی بەسەردا ناگیرێت». بەلام لەگەڵ ئەوەشدا گووتی« خەیاڵی خنکاو و شاردراوە، لە خەیاڵی ئازاد و بەرەڵا باشترە». مەلاکان و سیاسییەکان پێیانوایە ئەمشارە بەم ڕوخسارە بێخەیاڵ و شەرمن و کۆنەیەوە کەمتر وەسوەسەی خراپ و خولیای حەرام دروستدەکات. بەلام من دەزانم خەیاڵ نامرێت، وەک شێرپەنجەیەکی بەد و بێدەرمان لە ژێرەوە گەورەدەبێت و گەورەدەبێت. من دەمویست هەموو خەیاڵبازەکان بکرم و بیانناسم و بیانکەم بە دۆست. گەر سەریشی نەگرت لەسەر

زەوی بیانسڕمەوە. من بووم ڕۆژێک ئەو سێ پیاوە دڵسۆزەم نارد کارخانەی مافوورەکەم بۆ بکڕنەوە، سێ کەس لەوانەی دەزانم لە سەواو مامەڵەدا دەستکراوە و لێزانن. سەرسەختی ئەو خاوەن کارخانە بەدبەختە تووشی بەڵای گەورەی کرد. من لەگەڵ کوشتندا نیم، تا ئەگەمە بەردەم یەکێک کە وەک بارگیرێکی چەموش سەرسەختی دەنوێنێت... تا لەگەڵ کوشتندا نیم. بەڵام کە گەیشتە ئەوەی یەکێک وەک بارگیرێکی چەموش سەرسەختی بنوێنێت، ئیتر ڕەحم لە دڵمدا نامێنێت و خۆم بۆ جڵەو ناکرێت و شتی خراپم لێدەوەشێتەوە. تا دوا جاریش کە عەبدولقادری نیا هەر نەیویست پەرە و پەیمانی فرۆشتنی کارخانەکە مۆربکات، من لەبەردەمیدا دەستمکرد بە گریان و ویستم بەریدەم، چونکە وەک کەسێک ڕێزم بۆ ژیانی مەخلوقاتەکان هەیە، دەمەوێت بە ئاسوودەیی لە وڵاتێکی قایم و ڕێکدا بژیم، کوردستانێکی ئارام بۆ هەموومان، ئەوەیە ئومێدی من... لەبەرئەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان نەمویستووە کەس بمرێت. مرۆڤ مادام زمان و پارەی هەیە، واتە دەتوانێت هەموو شتێک بێ کوشتن بیاتبەڕێوە. مرۆڤ تا ئامادەبێت پارەی زۆرتر سەرفبکات، کەمتر پێویستی بە چەقۆ و تفەنگ هەیە. هیچ شتێک وەک پارە مێژووی لە توندوتیژی زیاد پاک نەکردۆتەوە. بەڵام هەراو هوریای شەریکە بێمێشکەکان، دەنگەدەنگی هەندێک لەوانەی لەدەفتەری سیاسی ئاگاداری مەسەلەکەبوون، ترس لەوەی قسەکان بەجۆرێک بکەونەوە جەنابی سەرۆک لکەداربێت، ئەوانە قادری نیایان کوشت و لەو گۆڕستانە نهێنییەدا ناشتیان. بەر لەوەی کار لە کار بترازێت دوا هەوڵم لەگەڵ قادری نیادا دا و بێسوود بوو. پێمگووت ئێستا خوێنی خۆت لە گەردنی خۆتە، من هەموو شتێکم لەگەڵدا کردی. لەو ساتەدا کە قادری نیایان کوشت، سێ پیاوە دڵسۆزەکەی من سووک و هەرزان کارخانەکەیان لەو ژنە سەرسپییە مەکربازە

کڕییەوە کە دوای مردنی پیرەمێردەکەی مێردی عەقڵیش و خەیاڵیشی لەدەستدابوو. بەڵام دەردی ڕاستەقینەی من ئەوکات دەستی پێکرد کە تریفە یابەحری لەو کارخانەیە هەڵهات، وەک جانەوەرێکی وریا بە هەر داوێکی دوور و نزیک، وەک باڵدارێکی کێوی کە لە دوورەوەڕا شێوەی ڕاوکەر و نەیار دەخوێنێتەوە، بێئەوەی تۆزێک بوەستێت خۆی لەو کارخانەیە کێشایەوە، دەبایە تەواوی دونیای بەدوادا تەیکەم. هەرچەند مردنی قادری نیا دەستەکانی شلکردم، لەبەردەم سەرۆکدا گریام. بەڵام پێویستبوو تریفە یابەحری بدۆزمەوە، دەبووایە داینێم و ببینم بە چ خەیاڵێک و بە چ هێزێک دەتوانێت ئەم موعجیزانە دروستبکات. شەوێک چووم بۆ لای عەتار، لێیپاڕامەوە تریفە یابەحریم بۆ بدۆزێتەوە. خەڵاتی گەورە و تەماعی قورسم خستە بەری. دەمزانی ئەو هەموو شتێک دەکات. پێمگووت «توندوتیژی و ڕق و بێڕەحمی نەبێت، هەموو کارێک بکە». من کە کارخانەکەم کڕی مەبەستم کڕینی خەیاڵەکانی تریفە یابەحری بوو، ئیشێکم بەو ئامێرە بێڕۆح و قاڵیبافە بێبەهرانە نەبوو، کە لەسەر کەتەلۆگی ئامادە ئیشیاندەکرد و بێخەیاڵ مافووریان دەچنی. چەند هەفتە من و عەتار عەوداڵی دۆزینەوەی ئەو کچەبووین کە وەکو ئاسمان هەڵیکێشێت و زەمین قووتی بدات ونبوو. هیچ جێگایەک نەما بۆی نەگەڕێین و نەماندۆزییەوە. عەتار «شەهرەیاری شوشە»شی بەکارهێنا و نەگەیشتە هیچ. ڕۆژێکیش کە زانیم تریفە یابەحری لە کوێیە، من ئیدی کارخانەی مافوورەکەم فرۆشتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا وەک شێت بەدوای کڕینی خەیاڵی ئەوەوە بووم. من بەردەوام لەسەر نەخشەیەکی ورد دەڕۆیشتم، دەمویست هەموو خەیاڵ و خولیای ئەم شارە دواجار بێن و بڕژێنە ئەو نەخشەیەی منەوە... بەردەوامیش دەمگووت «ئەی خودای مەزن، لە چاکەو خراپەدا پشتم بە و کۆمەکم کە».

# حەسەن تۆفان و مورتەزای شەیتان
# «سەرەتای هاوینی ٢٠٠٤»

سەرەتای هەشتاکان سەرەتای ئیشکردنم بوو وەک گەنجێکی چالاک لە شانەکانی ئیغتیالاتدا، ئەو کاتە تاریکی و تەمتومان و نهێنی قبیلەگای من بوون، لەو سەردەمەدا زۆر سەرەنجی ڕوخساری پیاوکوژەکانم نەدەدا، دەبێت ڕاستی بڵێم، ئەوکات ڕوخساری مرۆڤ شتێکی گرنگ و سەرەنجڕاکێش نەبوو، ڕوخسارەکان وەک یەک و بێ سیحر و بێ جیاوازی بوون لەلام. لەگەڵ تێپەڕینی زەماندا پتر لە دەموچاوی هاوڕێ کۆنەکانم ڕادەمام، خەڵکانێکیان تێدابوو بە کردەوە خوێنڕێژ و بە ڕوخسار وەک فریشتە وەهابوون، هەندێکیشیان بە هەردوو ڕووکاردا دیمەنێکی ترسناکیان هەبوو. من خۆم لە هیچیان نەدەچووم، غەزەلنوس پێیدەگوتم من پیاوکوژێکی خەیاڵیم. لەگەڵ ناسینی غەزەلنوسدا ئەو هەوڵە سەیرانەی ئەو بۆ پاکردنەوەی ڕۆحم دەستی پێکرد، سەرەتا من تەنیا گوێم لەو غەزەلانە دەگرت کە لە هەزارباغدا بۆ سەبری دەخوێندەوە. شەوان کە ڕووم لەو نێو گوڵزارە دەکرد، لە نابەینی پێچاو پێچە ئاڵۆزەکانی باغدا خۆم حەشاردەدا و لەناو ئەو بۆ عەترە زۆرەدا بە نهێنی گوێم لە غەزەلەکانی دەگرت. گوێگرتن لە غەزەلنوس وەک سەفەرکردن وابوو بۆ سەردەمە کۆنەکان، بۆ ڕۆژگارێک باغات نرخی هەبوو، شیعر بە مەستی لە لالەزارەکاندا دەخوێنرایەوە، شاعیرەکان بەهای گوڵیان دەزانی. کە لەو باغەدا گوێم لەو شیعرانە دەگرت، ئارەزوویەکی سەیرم بۆ شەراب و مەی تیا دروستدەبوو، مرۆڤ وای لێدەهات بە مەستییەوە بۆ مەستی بگەڕێت.

شەوان کە هێندی هێدی لە بەربەیان نزیکدەبووینەوە، لە پەناگای خۆم دەهاتمەدەرێ و وام دەردەخست تەنیا پیاسەی ڕێکەوت بۆ ئەو کوچەیە هەڵیگرتووم. غەزەلنوس لەو باوەڕەدابوو، ئەو دەساڵەی من لە شانەکانی ئیغتیالاتدا گوزەراندومە، ساڵی خەیاڵین، ساڵگەلێکن بۆ ئازاردانی خۆم دروستمکردون، من هیچ نیم جگە لە پیاوکوژێک بە خەیاڵ. ئەو خولیایە سەرەتا شێتیدەکردم، بەڵام غەزەلنوس باوەڕیوابوو، کە من لەم باغەدا حەقیقەتی خۆمم دۆزیوەتەوە و نابێت ونیبکەم، بە بڕوای ئەو من بە درێژایی ژیانم گوڵاوساز بووم، هەرچی حیکایەتی کوشتن و خوێن و دڵڕەقی هەیە، لە ئاوازی نیوەیەکی خەیاڵکرد و شەڕانگێزی منە کە تەنیا ئازاری نیوە باشەکەم دەدات. من ڕۆژێک وەک شێت چووم بۆ لای شبر و داوای کۆمەکم لێکرد، ئەوکات شبر هیچی دەربارەی غەزەلنوس نەدەزانی، پێمگووت « شبر وەسوەسەیەک لە دڵمدایە دەبێت بۆتی بدرکێنم، من هەندێجار واهەستدەکەم هەرگیز پیاوکوژ نەبووم، واهەستدەکەم ئەو دە ساڵە تەنیا خەیاڵبوون، من لەو دەساڵەدا دەستم بۆ ڕۆحی هیچ ئادەمیزادێک نەبردووە، هیچ کەسێکم نەکوشتووە، هەر چی شتێک لە دڵمدا هەیە، تەنیا خەیاڵە، خەیاڵە و هیچی تر، منیش هیچ نیم جگە لە پیاوکوژێکی خەیاڵی». شبر قسەکانی منی لاسەیر بوو، گووتی « حەسەنی پیزۆ، مرۆڤ ناتوانێت ڕابوردووی خۆی بگۆڕێت... دەتوانێت دژی بێت، بەڵام ناتوانێت تەواو بیسڕێتەوە». بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەی ئەوەی من پیاوکوژێکی خەیاڵیم، هانیدەدەدام بە ئاڕاستەیەکی دی بڕۆم. لەڕاستیدا هیچ کات تاسەر نەمدەتوانی لەگەڵ ئەو قسانەدا بڕۆم. ماوەیەک شەوانە ئەو دەمانچە کۆنەم دەردەهێنا و سەیرمدەکرد، ئەو دەمانچەیە مایەی دڵنەواییم بوو، هەمیشە دوا بەڵگەی دەدامێ کە من پیاوکوژێکی ڕاستەقینەم، هێندە سووک و سادە و دۆستانە لە دەستمدا بوو، وەک

ئـەوە بـوو بیـری پەنجەکانـم بـکات.

مـن تێنەدەگەیشـتم غەزەلنـوس چـۆن ئـەو هەمـوو ڕەحـم و بەزەیـی و خەیـاڵ و ئەڤینـەی کۆکردۆتـەوە، مـن نەمدەتوانـی وابـم... نەمدەتوانـی دونیـا و باغچـە و ڕوناکـی و ئەسـتێرەم وەهـا خۆشـبوێت، کەسـێک بـوو هەمـوو شـتێکی ئـەم دونیایـەی بـە هێزێکـی بێوێنـەوە خۆشدەویسـت، مـن ئـەو مـاوە درێـژەی گوێـم لـە دەنگـی دەگـرت تێدەگەیشـتم کـە تیـن و تـاوی غەزەلەکانـی تەنیـا لـە مانـا و شـێوەی بەیتەکانـدا نییـە، بەڵکـو لـەو ڕاسـتگۆییە قووڵـەوە سـەرچاوە دەگرێـت، کەلـە دڵیـەوە هەڵدەقـوڵا. هەندێجـار وامدەزانـی یەکێـک لـە ئاسمانەوە قسـەم لەگـەڵ دەکات، یەکێـک لـە هـەرە دوورتریـن جێـگای ئاسـمانەوە. دواتـر زانیـم، زۆربـەی ئەوانـەی گوێیـان لـە غەزەلنـوس دەگـرت، بێویسـتی خۆیـان سـەیری ئاسـمانیان دەکـرد. زۆرجـار کـە بـەو باغـەدا دەگەڕایـن باوەڕمدەکـرد کـە غەزەلنـوس ڕاسـتدەکات، مـن پیاوکوژێکـی خەیاڵیـم. شـەوێک وام هەسـتکرد شـبریش پیاوکوژێکـی خەیاڵییـە، ئەویـش وەک مـن کوشـتەی وەهمەکانـی خۆیەتـی. گەرچـی مـن چەندیـن جـار جـێ گوللەکانـم لـە سـەر جەسـتەی بینیبـوو، بـەڵام دەمگـووت هەمـوو ئەوانـەش جـێ گوللـەی خەیاڵیـن.

دوای ونبوونـی لاشـەکەی مـوراد جەمیـل، ژیانـم لـە نێـوان هەزاربـاغ و پێدەشـتە تاریـک و شـەقامە سـاردەکانی شـاردا دابەشـبوو، لەوکاتـەوەی حیکایەتـی ئـەو کتێبـە کەوتبـووە کەلەمـان، ئیشـێکی زۆرم لەگـەڵ ئـەو دەفتـەردارە چکۆلانانـەدا دەکـرد کـە پێویسـتیان بـە نەخشـە و پلانـە وردەکانـی مـن هەبـوو، بـۆ ئـەوەی بێتـرس بگەنـە شـوێنی مەبەسـت و بگەڕێنـەوە. ئـەو کات بـۆ سـۆراغی بارۆنـەکان و بـە ئومێـدی بینینـی جەعفـەری مەغۆلـی هەفتـەی دوو شـەویش لەگـەڵ شـبردا دەچوویـن بـۆ یانـەی پیاوکـوژە بێئیشـەکان. شـەوێکیان لەحەوشـی یانەکـەدا لەگـەڵ دوو دۆسـتی دێرینـدا قسـەمدەکرد، لـە پشـتەوە گوێـم لـە دەنگێـک بـوو گووتـی

«ئەوە خوایە، چ بەستەزمانە، چ بێکەسە، قەسەم بە تامی مەی هێندەی خواردۆتەوە لە زەوی بڕاوە، قەسەم بە زرینگەی جامی بادە ئاگای لە خۆی نییە. با پێکڕا دۆعای بۆ بکەین، خودا ڕەحمی پێبکات و بێتەوە هۆش خۆی». هەمان ئەو دەنگەبوو کە چەند شەوێک پێشتر لە پێدەشتەکەدا دڵنەوایی گەنجەکەی دەدایەوە، شێوەی قسەکردنی هێند تایبەتی و سەیر و بێباکانەبوو، دەمودەست ناسیمەوە، دڵنیابووم هەڵەم نەکردوە... ئەو بوو، هەمان ئەو پیاوەی کە لە تاریکیدا سوێندی بە دەنگی بولبول و عەندەلیبەکان دەخوارد. کە ئاوڕمدایەوە، پیاوێکی باڵابەرز بینی لە دەستێک جلی کوردیدا، جووتێک سمێڵی نارێک و بژی هەبوو. برۆ ئەستوورەکانی برۆی هەندێک لە پیاوکوژە دێرینەکانی هێنایەوە یادم. شبر بە ئەسپایی پێیگووتم «ئەوە مورتەزای شەیتانە، یەکێکە لە ترسناکترین خزمەتکاری بارۆنەکان، پەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ ئەورەحمان نەجیبدا هەیە کە ئێستا بە بارۆنی پۆرسەلان دەناسرێت». بارۆنی پۆرسەلان بازرگانێکی گەورەی شوشەبوو، بیرۆیەکی لە تاران و بیرۆیەکی دیکەی لە دوبەی هەبوو، لە حیزبدا پلەی زۆر بەرزبوو. بە کۆمەکی کەسانی وەک مورتەزا و بە یارمەتی ئەو تۆڕە گەورەیەی لە نێو حیزبەکاندا چنیبووی، تەواوی بازاڕی شوشەی لە وڵاتدا داگیرکردبوو، بازرگانە بچوکەکانی پلیشاندبووەوە، بە لێدان و هەڕەشە و مەرجی قورس یەکە یەکە دەریکردبوون، هەر کەسێک بە مەرجەکان و دەستوورەکانی ئەو ڕازی نەبایە، بە شێوازی خۆی ڕازیدەکردن. سەیرم لێهات کە شبر گووتی مورتەزا دۆستێکی نزیکی جەعفەری مەغۆلییە و جەعفەر یەکێکە لە پشت و پەنا گەورەکانی ئەم پیاوە. بەوردیش باسی ئەوەی کرد کە گومانێکی زۆر دەکرێت، کە مورتەزا لە پشت هەندێک لەو ژنکوژیانەوە بێت کە بەردەوام لەم شارەدا ڕوودەدەن. مورتەزا لەگەڵ ڕوخۆشییەکەیدا شتێکی ترسناک لە

دەنگ و نیگا و سەیرکردنەکانیدا بوو، گەرچی قسەی خراپ لە دەمی نەدەهاتەدەرێ، گەرچی پێدەکەنی، بەڵام نەیدەتوانی لە دێوەزمە و دەعجانێکی سامناک نەچێت. بەقسەی شبر، مورتەزا سەرەتا ئەکتەرێکی شانۆی سەرکەوتوو بووە، دواتر لەسەردەمی دیکتاتۆردا لەسەر ئەوەی کۆمەکی بە هاوڕێیەکی کردوە، ژنەکەی خۆی بە چەقۆ بکوژێت، شەش ساڵ چۆتە زیندان، دوای بەربوونی بە هۆی خزمایەتی بارۆنی پۆرسەلانەوە لە شەوانی ئەم یانە تاریک و سەیرەدا کە خراپترین مەخلوقاتی ئەم شارەی کۆدەکردەوە، لە ناو دوکەڵی جگەرە و بۆنی عارەق و هەناسەی شەراباوی ئەم پیاوانەدا کە شەو و ڕۆژ باسی پارە و قەحبە و بەرپرسە بالاکان و شەڕی ناو باڵەکانی حکومەت و حیزب دەکەن، ڕێگادەگرێت و شوێنی خۆی دەدۆزێتەوە. ئێستا هەمووان وەک سەگی تایبەتی بارۆنی پۆرسەلان سەیریدەکەن. ئەو کات مورتەزا لە ناو گروهی «بلیارد»دا زۆر دەردەکەوت و سەروکارێکی زۆری لەگەڵ ئەواندا هەبوو. بۆ ئەوەی بزانن گروهی بلیارد چییە دەبێت شتێکی کەم لەو دابەشبوونە ناوەکییەی ناو یانەکە حاڵیببن. ئەو ماوەیەی من ژیانی نێو ئەو ئادەمیانەم لە نزیکەوە بینی، هەستمکرد لەناو یانەکەدا جۆرە دابەشکردنێکی نهێنی کار هەیە. جۆرە ڕیزبوونێک لە بەرزەوە بۆ نزم لە گۆڕێیە، بچوکترین و نزمترین تاقم گروهی «خەسیوەکان» بوو، ئەوانە زۆربەیان خزمەتکار و ئیشکەر و پاسەوان و ڕۆژنامەنوس و هەواڵدزی بەردەستی میرەکان و بارۆنەکان بوون، هەر کەس تازە تێکەڵ بە یارییەکە ببووایە لە پلەی خەسیوییەوە دەستی پێدەکرد و کەمە کەمە بەرەو سەرەوە سەردەکەوت، شبر گووتی «حەسەنی پیرۆ یەکەمجار کە مرۆڤ دەچێتە ئەو گروپەوە، لەوێدا بە کارێکی ورد و نەشتەرکارییەکی زیرەک عەقڵ و خەیاڵ و ڕەحمی دەخەسێنن... دواتر پلەیەک و ناوێکی دەدەنی، ئەو پلەیە مەرجی هەموو سەرکەوتنەکانی

دواتــره». لـەوان باڵاتـر و گرنگتـر گروپێـک بـوون ناویـان گروپـی «ڕازیانـە» بـوو، ناوەکـە سـەرەتا بـۆ مـن بێمانـا و سـەیربوو، دواتـر تێگەیشـتم ئـەو گروپـە ئیشـیان ئەوەیـە بـەدوای ئـەو بیرۆکـە سـەیر و خولیـا ڕەشـانەدا بگەڕێـن کـە لـە بـازاڕدا سـەرهەڵدەدەن، سـەروکاریان لەگـەڵ هەندێـک خەڵکیشـدا بـوو لـە دەرەوەی سـنوور، نـاوی کاڵای سـەیر و سـەمەرەیان بـۆ دەنـاردن. خۆیـان پـارەدار نەبـوون، بەڵام دراو لـە هـەر دەرگایەکـەوە بهاتبایەتـە ئـەم وڵاتـەوە دەیانزانـی. گوێیـان هەڵدەخسـت، بۆنیاندەکـرد، هێنـدەی بیزانیبایـە هـەر کەسـێک بیرۆکەیـەک یـان پرۆژەیەکـی نـاوازەی هەیـە، بـە پەلـە هەواڵیـان بـۆ بارۆنـەکان دەهێنـا و ئەوانیـش بـە کۆمەکـی کۆمەڵێـک گروپـی چکۆلـە، لـە ژێـر گوشـاری هەڕەشـەدا یـان دەبوونـە شـەریک یاخـود تـەواوی پرۆژەکەیـان داگیردەکـرد، لەبەرئـەوەی بـەردەوام لـە بـازاڕدا بـوون، بۆنـی کاری و زەنجەفیـل و بەهـارات و ڕازیانەیـان گرتبـوو، ئیدی ئـەو ناوەیـان بەسـەردا بڕابـوو. گروپێکـی دی هەبـوو ناویـان تیپـی «بلیـارد» بـوو، ئـەو گروپـە یەکێـک بـوو لـە ترسـناکترین تاقمەکانـی یانەکـە، ئیشـێکی سـەیر و ئاڵۆزیـان هەبـوو، نرخیـان بەرزدەکـردەوە و دەیانشـکاند، پارەیـان باڵادەفـڕان و نزمدەکـردەوە، نرخـی موڵـک و عەقاراتیـان دەگـۆڕی، بـە پـلان و بەرنامـە بەهـای شـوێنیان دەشـکاند و بەرزدەکردەوە، نرخـی بەنزینیـان دەگـۆڕی، نرخـی ئۆتومبیلیـان دەشـکاند، سـنووریان دەبەسـت و دەیانکـردەوە، یەکێـک بـوون لـە هـەرە بەهێزتریـن کەسـانێک کـە ڕاسـتەوخۆ فەرمانیـان لـە دەفتـەری حیـزب و ئەندامـە بـاڵاکان و بارۆنـە زۆر زۆر گەورەکانـەوە وەردەگـرت. شـبر پێیگووتـم «زۆربـەی ئەوانـەی دەبـن بـە بەرپرسـی گـەورە، دەبـن بـە بەڕێوەبـەری گـەورە، بـە ئەندامـی ئەنجومەنـە جۆراوجـۆرەکان، بـە فەرمانبەرانـی دەسـت ڕۆیشـتوو، لێـرەوە دەسـت پێدەکـەن، لـەم گروپـەوە دێنـەدەرێ و دواتـر بەپێـی توانایـان تـا پلـەی وەزیـری بەرزدەبنـەوە... ئەمانـە هەمـوو وڵات

وەک سەرمێزێکی بلیارد تەماشادەکەن، ئارەزوویان لە هەر تۆپێک بێت لێیدەدەن، هەموومان بەجۆرێک لە جۆرەکان کۆمەڵێک تۆپی چکۆلانەی سەر مێزی ئەوانین». ئەم تاقمە ئێواران کە دەهاتن بۆ یانەکە ویقارێکی زۆریان دەنواند، وەک سیاسەتمەدار ڕەفتاریان دەکرد، مرۆڤ بەخێلی بە حیشمەت و هەیبەتیان دەبرد. بەڵام دواتر هێندەیان دەخواردەوە میزیان دەکرد بە خۆیاندا و دەڕشانەوە. سەیر بوو بەلامەوە ئەم پیاوانەی بەردەوام بۆنی میز و جگەرە و عارەقیان لێدەهات دەتوانن ڕۆڵێکی وەها گرنگیان لە حوکمکردنی ئەم شارەدا هەبێت. زۆرجار مورتەزا لەسەر مێزی ئەوانە دادەنیشت... هەندێ شەو کە مەستدەبوو دەچووە سەر مێزەکان و سەمایدەکرد. هەرجارێک دەمبینی، دیمەنی ئەو شەوەم دەهاتەوە یاد، ئەو وشانەم دەهاتەوە بەر گوێ کە لە تاریکیدا بیستبووم. بەردەوام بە دوو چاوی حەپەساوەوە تەماشامدەکرد، زۆرجار دوور بە دوور سەیری یەکترمان دەکرد و بۆ یەکتر پێدەکەنین، من نەمدەزانی ئاخۆ منم چاوەدێری ئەو دەکەم یاخود ئەوە چاوەدێری من دەکات. شەوێکیان هەستمکرد مورتەزای شەیتان زۆر لێمدەڕوانێت. دڵنیابووم ترسێکی بێوێنە لە چاویایەتی... لەو شەوەوە هەستمکرد لێم هەڵدێت و تەماشام ناکات، بەڵام چۆن واشەیەک بۆ کەروێشکێکی بچوک و ترسنۆک دادەبەزێت ئاوها دوای کەوتم، لە یاری و نواندن و خۆڕەنگکردنەکانی نەترسام... وەک چۆن یەکێک بەدوای ڕەنگی ڕاستەقینەی حەربایەکدا ڕادەکات، دوایکەوتم و هەموو ئومێدم ئەوەبوو وای لێبکەم ڕەنگی ڕاستەقینەی ڕۆحی خۆی ببینێت... وای لێبکەم هەستبکات، ئەویش تۆپێکی بلیاردە... تۆپێک ئەمجارە من لە دوورەوە دێم و خۆمی پیادەکێشم.

# گەڕانەوەی عەتار

ئەو کاتەی غەزەلنوس و تریفە یابەحری بۆ خەڵکانێک دەگەڕان لە ئامادەکردنی درێژترین کتێبی مێژوودا کۆمەکیانبکەن، گەلەک مەخلوقاتی ناوازە هاتنە ژیانیانەوە. سەرەتا ئەو دوو برایە لە ژیانیاندا دەرکەوتن کە لە هەرێمێکی دوورەوە هاتبوون و دەیانگووت بە دوای ئیلهامێکدا دەگەڕێن درێژە بە ئیشەکانیان بدەن. دوای گەشتێکی درێژ بە ناوچەکانی باکووری خۆرهەڵاتدا ڕوویان لەم شارە کردبوو، توانایەکی گەورەیان هەبوو زەوییە وشک و خاکە بەیارەکان سەوزبکەن، دوو برا بوون ماوەیەک لە هەر کێڵگەیەکدا بمانایەتەوە دەیانکردە لالەزار و سەوزەوار. پیاوانێک بوون هێزێکی سیحریان لەسەر سروشت هەبوو. لە هەر جێگایەکدا بوونایە دەبوو بە باغ. لە سەرەتای نەوەدەکانەوە بەشداری ئاوەدانکردنەوەی گەلەک گوندیان کردبوو، هەر وەرزەو لە گوندێکدا نیشتەجێدەبوون، ئیشیان ئەوە بوو بە سۆز و مەحەبەتەوە سەیری کێڵگەکان بکەن، سەیری درەختەکان بکەن، گیا و گوڵ بە نیگا بلاوێنن، بۆ ئەوەی سەوزببێتەوە. هەمیشە چەند هەفتەیەکی پێدەچوو تا بەری نیگاکانی خۆیان دەبینی، بەڵام چاویان هەڵەی نەدەکرد و بەرهەمیان مسۆگەر و دابینبوو. یەکێکی نەناسراو، ئەو برایانەی ناردبوو بۆ لای غەزەلنوس تا ئیلهامی زیاتر وەرگرن، تا لەوێ نیشتەجێبن و لە گوند و کێڵگە و مەزرا وێرانەکانی قەراغ شارەوە دەست بە سەوزکردنەوەی دونیا بکەن. کە لە حەوشەکەدا دەرکەوتن، کەمێک ماندوو و چەپەڵ دیاربوون، ڕیشهاتوو و سەرگەردان دەیاننواند، غەزەلنوس و تریفە پێشوازیانکردن، گەرماویان بۆ سازکردن و لەسەر سوفرەی خۆیان دایاننان، غەزەلنوس شیعری خۆی بۆ خوێندنەوە و بە غەزەل هێز و تین و تاوێکی تری پێبەخشین. ژوورێکی

چەپەکیان دانێ و لێگەڕان خۆیان بکەنەوە و جلی سەر کار و نێو باغ بگۆڕن و پشوویدەن. هاتنی ئەو دوو برایە بە جۆرێکی کتوپڕ ژیانی غەزەلنوس و تریفە یابەحری پڕکرد، ڕۆژانێکی زۆر هەر چواریان پێکەوە لە دەشتاییەکان و گوندەکان و مەزراکانی نزیک شاردا ونبوون، بۆ باغی بێحاسڵی جووتیاری هەژار و کێڵگەی بێبەری خەڵکانی بێدەرەتان دەگەڕان، سەوزیبکەنەوە. لەو ڕۆژەوە برا سەوزەکان کە هەمووان بە برایانی دولبەر دەیانناسین، هەر کات لە سەوزکردنی باغێک دەبوونەوە دەگەڕانەوە بۆ لای غەزەلنوس، ماوەیەک پشوویاندەدا و پیاسەیاندەکرد و بە شاردا دەگەڕان، گوێیان لە غەزەل دەگرت و وزەی نوێیان دەکردە بەر ڕۆحیان.

لەو سەردەمەدا غەزەلنوس و تریفە یابەحری هەستیانکرد هاوڕێی زۆر قەشەنگیان هەیە، لە زۆر شوێنی دونیاوە دۆست ڕوویان تێدەکات، سنووری ئیمپراتۆرییەتە خەیاڵییەکەیان بێوێنە گەورەدەبێت، غەزەلەکان لە هەموو شوێنێکی شار و هەرێمە نزیکەکانەوە خەڵکیان ڕادەکێشا. لەو ماوەیەشدا خانووەکەی تریفە یابەحری بووبوو بە یەکێک لە سەنتەرە گرنگەکانی حەشاردانی ژنان، بە ڕوکەش نیشتەجێی ژن و مێردێکی تەمەندار بوو، بەڵام لە ژێرەوە پەناگای هەندێک لەو خانمە ڕاکردووانە بوو کە جێگایەکیان نەبوو خۆیانی تیابگرنەوە. لە یەکێک لە ڕێکخراوە سەربەخۆکانی ژنانەوە، کیژێک بە ناوی «نەورەسی گوڵ سۆلاف» کرابووە سەرکار و نهێنیپارێزی ئەو ماڵە. کچێکی باریکەلەی نەشمیل بوو بە قژێکی کاڵ و جووتێک چاوی گەشەوە، تریفە یابەحری بۆ یەکەمجار ماجیدی گوڵ سۆلافی لە ماڵی ئەودا بینی، نەورەس و ماجیدی گوڵ سۆلاف، خوشک و برایەکی ناکۆکبوون و لەگەڵ دایکێکی ڕوخۆش و دەم بە خەندەدا دەژیان. کچ و دایکەکە ماجیدیان وەک شێتێکی بێسوود سەیردەکرد کە هەموو کاتی خۆی لەسەیرکردنی فلیم و دروستکردنی نەخشەیەکدا دەباتەسەر کە نە مانای هەیە و نە کۆتایی. برایەکی دیکەیان هەبوو دەمێک ساڵ بوو لە

سکۆتلەندا دەژیا، مانگانە بە پۆستێکی تایبەت کۆمەڵێک فلیم و گۆڤاری ئینگلیزی تایبەت بە سینەمای بۆ ماجید دەنارد. خێزانێکی کەم دەرامەت بوون بە خانەنشینییەکی کۆنی باوک و بە موچەیەکی کەمی نەورەس و کۆمەکێکی بچوکی برا ئاوارەکەیان دەژیان. ماجیدی گوڵ سۆلاف جگە لەوەی خۆی وەک لۆردێکی ئینگلیزی دەگۆڕی و پیاسەیدەکرد، کارێکی دی نەبوو، بەدرێژایی ژیانی بێئیشبوو، تا ئەو کات هاوڕێیەکی نەبوو، کوڕێکی بێکەس لەوانەی مرۆڤ هەمیشە بە تەنیا دەیانبینێت. کە تریفە یابەحری بۆ یەکەمجار چووە ماڵی نەورەس، ماجید هێند نەبوو دەستیکردبوو بە وانەدادانی ئەو منداڵە کوێرانە. هەر لە سەرەتاوە تریفە، گوڵ سۆلاڤی وەک کوڕێکی کەمێک بەدهەوا و خۆویست هاتە بەرچاو کە لەگەڵ هەموو خراپییەکیدا شتێک لە ناسکی و سیحریشی تێدایە. کوڕەکە هەر لە بۆشناخی و ویقاردا زیادەڕەوی نەدەکرد، بەڵکو جۆرێک لە کاریزما و هێزی نهێنیشی تێدابوو، کە مرۆڤ ئاسان تێنەدەگەیشت لە چییەوە سەرچاوەیان گرتووە. دوای چەند هاتوچۆیەکی دۆستانە نەورەسی گوڵ سۆلاف و تریفە یابەحری بوون بە دوو دەستە خوشکی دڵسۆز و بەوەفا بۆ یەک، دوو کچ دەیانتوانی هەموو نهێنییەک لای یەکتری بدرکێنن و ڕازەکانی قووڵایی دڵی خۆیان بۆ یەکدی باسبکەن. ڕۆژێک تریفە و نەورەس، دەرگای ژوورە داخراوەکەی ماجیدیان کردەوە، لەو دیو ئەو دەرگایەوە تریفە دونیایەکی تری بینی، هێندەی چاوی بەو نەخشە سەیرەی ماجید کەوت، تووشی جۆرێک سڕبوون هات. ماجید درێژترین نەخشەی خەیاڵی دونیای لەسەر دیوارەکانی ئەو ژوورە دروستکردبوو. نەخشەیەکی ئەبەدی و بێکۆتا بوو کە دەکرا تا هەتاهەتایە پڕبکرێت لە شار و گوند و دەشت و دەری خەیاڵی. ناوی جێگاکان هێند سەیر و شاعیرانە بوون، تریفەیان سەرسامکرد «زەمینی بەور» «بەحری گومان» «ڕێگای خەون» «شاری چاوەڕوانی» «شاخی ئومید» «کەناری کۆتران» «کەمانستان» «پەروانەی شین»

«باغی خۆکوشتنی ئەستێرە» «گۆمی سەوسەن» «شارۆچکەی شکۆفە» «جۆگەی غەم» «باغی پڵنگ» و دەیان ناوی سەیرتر. تریفە لە سەیرکردنی ئەو نەخشەیەوە تێگەیشت کە سەروکاری لەگەڵ مەخلوقێکی خەیاڵیدایە، مەخلوقێک کە دوور لە دونیا و بێئاگا لە هەموو بوونەوەرە خەیاڵییەکانی دیکە دەژی. ژوورەکەی لەپاڵ ئەو نەخشەیەدا، پڕبوو لە سەدەها فلیمی ڤیدیۆ و کتێبی ئینگلیزی و عەرەبی و کوردی، کە بە فۆرمی کتێبخانەیەکی قەشەنگ ڕێکخرابوون، شوێنەکە بەجۆرێک پاک و شیک بوو، مرۆڤ ئارەزوویدەکرد زۆرتر تیا بمێنێتەوە. کە خانمی تریفە یابەحری لەو ژوورە هاتەدەرێ دڵنیابوو دونیایەکی تایبەتی و دەگمەن و نائاسایی بینیوە. لەگەڵ گەڕانەوەیدا بۆ ماڵ، چیرۆکی ئەو نەخشە سەیر و خەیاڵییەی بۆ غەزەلنوس گێڕایەوە، گەنجێک کە نەخشەیەکی ناکۆتای جیهانێکی تر لەسەریایەتی کە سەرتاپای خەیاڵە. حیکایەتی ئەو نەخشەیە بە جۆرێک غەزەلنوسی ورووژاند، دەیویست هەر ئەو ساتە بڕوات و سەیری ئەو نەخشەیە بکات. ڕۆژێک دواتر، تریفە یابەحری بولبولی کوێری برد و لەو قوتابخانە خەیاڵییەی ماجیدی گوڵ سۆلاڤدا ناونوسیکرد، هەڵسوکەوتی گوڵ سۆلاڤ لەگەڵ خانماندا بە جۆرێک پڕ ویقار و بەرێزبوو، زیاتر سەرەنجی خانمی یابەحری ڕاکێشا. وانەکانی گوڵ سۆلاڤ سەفەرکردن بوو لەسەر کەشتییەکی خەیاڵی بەخاکێکی ناکۆتا و نەبڕاوەدا. ئەو ڕۆژە کە بولبولی کوێر بۆ یەکەمجار چووە قوتابخانە خەیاڵییەکەی ماجیدی گوڵ سۆلاڤەوە، تریفە وەک لەسەر ئاگر بێت چاوەڕوانی هاتنەوەی کرد، لەگەڵ گەڕانەوەی بولبولدا، بە وردی هەموو حیکایەتەکەی پێگێڕایەوە، بەڵام بولبول بە جۆرێک مەست و ورووژاوبوو، نەیدەتوانی ئاسان هەموو شتێک بگێڕێتەوە. منداڵەکە بە ڕاستی گەشتێکی ڕاستەقینەی بەسەر زەمینێکی تردا کردبوو، بۆ یەکەمجار هەستیدەکرد شتگەلێکی بینیوە کە لە تاریکی کوێریدا پێشتر نەیبینیون، بە وردی وەسفی هەندێک باغ و

ئاو و لالەزاری دەکرد، باسی باڵداری خورافی و ئەسپی فرەسەر و ماری زمانزانی گێڕایەوە کە تەنیا لە دارستانە دوور و خاکە نەبینراوەکاندا هەن. ئەوە غەزەلنوسی پتر خرۆشان و زیاتر وای لێکرد بیر لە هاوڕێتی ماجید بکاتەوە: ڕۆژێک لە دەرگای پۆلە خەیاڵییەکەی ماجیدی گوڵ سۆلاڤدا دەرکەوت، گەلەک ئاسان لە زمانی یەکدی تێگەیشتن و زۆر خێرا بوون بە دۆستی یەک. دوای پیاسەیەکی درێژ، غەزەلنوس بۆ یەکەمجار هەندێک لە غەزەلەکانی خۆی بۆ خوێندەوە. مرۆڤ چەند بەدمەوا و لە خۆڕازیبایە ئەو غەزەلانە شتێکی نهێنی و قووڵیان تیا دەبزواند. کاریگەری غەزەلەکان لەسەر دڵی گوڵ سۆلاڤ وەها گەورەبوو، لەوێدا دەستی کردە ملی غەزەلنوس و گووتی «بە کۆمەکی ئەم غەزەلانەی تۆ دەکرێت سنووری نەخشە خەیاڵییەکەی خۆم بێئەندازە گەورەبکەم».
هەر ئەو ڕۆژە بێ وەستان و دوودڵی غەزەلنوسی بۆ بینینی نەخشە خەیاڵییەکەی خۆی داوەتکرد. گوڵ سۆلاڤ پێشتر دەرگای ژووری خۆی بۆ کەس نەکردبووەوە، هیچ کەس پێشتر بە ئاگاداری و ڕەزامەندی ئەو چاوی بەو نەخشەیە نەکەوتبوو، کەچی بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا داوەتی غەزەلنوسی کرد و هەموو نەخشەکەی خستە بەردەم. جۆرە داوەتێکی وەها وەک بەستنی پەیمانێکی قووڵ و ڕاگەیاندنی هاوڕێتییەکی ئەبەدی وابوو. ئەو سەر زەمینەی گوڵ سۆلاڤ دروستیکردبوو، سەدانجار لەو دەڤەرە خەیاڵیانە گەورەتربوو کە غەزەلنوس بینیبووی، بەڵام غەزەلنوس دڵنیابوو هەردووکیان بە چەند دارستان و پێدەشت و باغ و دەریاچەی وەک یەکدا تێپەڕیوون. دڵنیابوو خەیاڵ کیشوەرێکی ڕاستەقینەیە، هەموو ئەوانەی پیا گوزەردەکەن زۆرجار هەمان شت دەبینن، بەڵام هەرگیز... هەرگیز ڕێکەوتی یەک ناکەن.

***

دوای چوار ساڵ نەورەسی گوڵ سۆلاف، تریفەی بردەوە بۆ ماڵی خۆی. بۆ ناو ئەو کچە پەژموردانەی بە نهێنی لە خانووەکەی ئەودا دەژیان. ڕۆژێک ئەو پێیخستەوە ئەوێ، پڕبوو لە بۆنی ئەشک، لە کچی وەک تارمایی، لە مەخلوقاتێک باوک و برا و مێرد بە خەنجەر و چەقۆ و چەکی دیکەوە بە دوایاندا دەگەڕان. کۆمەڵێک ئافرەت ئەم خانووە نهێنییە نەبێت، بستێک زەوی دی نەبوو بیانگرێتە خۆی. تریفە خۆی بە بەختەوەرترین کچی ئەم دونیایە دەزانی، کە توانیوێتی ڕۆحی ئەم بەدبەختانە ڕزگاربکات. کچانێکی بێهیوا و ترساو کە ئەم ماڵە دواپەناگایان بوو، ئیدی زوو زوو دەگەڕایەوە بۆ ناو ئەو کیژانە، هەندێک شەو لەگەڵیاندا دەخەوت. کۆمەڵێک بوونەوەری دیلبوون کە دەبایە تا هەتاهەتایە دیلبن. هەر لە یەکەم ڕۆژەوە تریفە کەوتەوە سەر خولیای ئەوەی دووبارە تەونێکی چنینی مافوور پەیدابکات و ئەو کیژە دڵتەنگانە فێری قاڵی و مافوورچنین بکات، دڵنیابوو ئەوە تاکە شتێکە بتوانێت لە ڕێگایەوە خۆیشی و ئەوانی دیش بەختیاربکات. نەورەسی گوڵ سۆلاف سەیری لێهات کە بینی تریفە پاش ماوەیەکی زۆر کەم تەواوی ژێر زەمینی ئەو ماڵەی بۆ جۆرە کارێکی وەها ڕێکخستووە و ئامێرگەلێکی سادەی لەوێدا داناوە و کەرەستەی تەون و جۆلایی دامەزراندوە و دەتوانێت هەر ئێستا دەست بە مافوور چنینبکات.

ئەو وەرزە لە ساڵی یەکەمی سەدەی نوێدا، ئارام و بێدەردەسەر دیاربوو، دۆستی زۆر ڕووی دەکردە ماڵیان و ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان هەردەم لە گەورەبووندا بوون. تریفە ویژدانی ئاسوودە و ڕۆحی پڕ لە شادومانی ئیشکردن بوو، ژیانی یاریکردنی بەردەوامبوو لەگەڵ منداڵەکاندا، بە تەنگەوەهاتنێکی دایکانە بوو بۆ فێرکردن و پاراستنیان، شەوانەش بە سەعات لەگەڵ نەورەسی گوڵ سۆلافدا بە تەلەفون قسەیدەکرد، بەختەوەربوو کە ژیانێکی پڕی هەیە، هەمیشە شتێک هەیە

بیکات. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو دڵنیایی و ئاسوودەییەدا هەستی بە زیادبوونی ترسەکانی خۆی دەکرد، هەستیدەکرد بەردەوام جانەوەرێک بەدوایەوەیەتی و دەیەوێت پەلاماربیدات. شەوانێک کە لە حەشاری ماڵەکەی خۆی دەهاتەدەرێ و دەیویست بگەڕێتەوە بۆ لای منداڵەکان، لە ڕێگای گەڕانەوەدا ئەو ترسە سەرەتایی و تاریکەی وەها زیادیدەکرد، دەبایە بە خێرایی خۆی فڕێبداتە تاکسییەکەوە و بەپەلە بگەڕێتەوە. ترسەکە تەنیا بۆ خۆی نەبوو، بەڵکو وا هەستیدەکرد جانەوەرێک هەیە دەیەوێت منداڵەکانیش بخوات، دەیەوێت غەزەلنوس بخوات، دەیەوێت نەورەسی گوڵ سۆلاف و کچ و ژنە ڕاکردووەکان هەمووی بخوات. ترسەکانی بەردەوام سروشتی سەیر و شێوەی پێشبینییەکی تاریکیان وەردەگرت. بەیانییەک وەک دەنگێکی ڕەش لە ناویدا هاواربکات، هەستا و بە غەزەلنوسی گووت دەبێت کتێبەکانی غەزەل بشاریتەوە، دەبێت کتێبەکانی غەزەل ببەیتە جێگایەک دەستی هیچ ئادەمیزادێک نەیگاتێت، دەبێت لەم ماڵە دووریبخەیتەوە، من خەوم بینیوە، تێدەگەیت، خەوم بەو کتێبانەوە بینیوە دەسووتێن، خەوم بینیوە، دەبێت ئەو کتێبانە ببەیت بۆ شوێنێک لە خۆت زیاتر هیچ ئادەمیزادێک نەیزانێت، نابێت منیش بیزانم و نابێت هیچ کەسێکی دیش بیزانێت.

داواکەی تریفە هێند سەیر و توند بوو، نەدەکرا غەزەلنوس گوێی لێنەگرێت. ڕۆژێک غەزەلنوس بڕیاریدا زۆربەی دەستنوسەکانی خۆی بگوازێتەوە بۆ جێگایەکی نادیار، بۆ شوێنێک ئەوکات جگە لە خۆی هیچ ئادەمیزادێک نەیدەزانی. بەڵام تەنیا دوای چەند ساڵ لەو ڕۆژە دەرکەوت، هەستەکانی تریفە یابەحری چەند دووربین و ورد و تیژنیگا بوون.

***

چوار ساڵ دوای شاردانەوەی «کتێبخانەی غەزەل»، لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٣ دا، چەند مانگێک بەر لە دۆزینەوەی لاشەکەی موراد جەمیل، عەتار بە خۆی و سەروفەساڵە تایبەتییەکەیەوە دەرکەوت، ئێستا سەری زلتر و نیگاکانی چلێستر و غەمگینتر دیاربوون. ئێوارەیەک بێ هیچ وادەیەکی پێشوەخت و ئاگادارییەکی پێشینە، تویێتا تازەکەی خۆی لە بەردەرکی ماڵی غەزەلنوسدا وەستان و هاتە ژوورێ. پیاوێکی چکۆلانە و ڕیوەڵەی تری لەگەڵدا بوو کە ساڵانێک لەمەوبەر شاگرد قەسابێکی لەڕ و نەخۆش بوو. ئێستا زیاد لە حەوت ساڵ بەسەر هەڵهاتنی تریفە یابەحریدا لە کارخانەی مافوورەکە تێپەڕیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بینینەوەی عەتار دڵی خانمی یابەحری ڕاچڵەکاند. پێدەچوو عەتار زۆرشت بزانێت، دۆزینەوەی تریفە یابەحری لەم ماڵەدا سەرسامیکرد، زەردەخەنەیەکی وەها پیس و بەمانای گرت، خانمی یابەحری ترساند و لە دڵەوە ڕایچڵەکاند... ئەو ڕۆژە تریفە یابەحری تێگەیشت عەتار هەمیشە و هەمیشە تا مردن بەدوایەوەیەتی. غەزەلنوس لە مێژبوو عەتاری نەبینیبوو، دوای وەرگرتنی دەرسیم تاهیر، بەڕێکەوت یەکجاری دی لای حوسنی خەیاڵ سڵاویان لەیەککردبوو. بەڵام ئەو پیاوە چکۆلانەیەی هاودەمی ئەوی باش دەناسی، ئەویان «خەسیو عەزیز» بوو، لە شاگرد قەسابەوە هێدی هێدی سەرکەوتبوو تا بووبوو بە موڵکفرۆشێکی گەورە. خەسیو ئێستا لە بازاڕی عەقاراتدا هێرش و ڕمبازێنی خۆی هەبوو، بازرگانە گەورە و ڕاستەقینەکان حیسابیان بۆ دەکرد، شارەزایەکی بێوێنەی زەوی و زار و کێڵگە و باغ و دەڤەرە کشتوکاڵییە گرنگەکان بوو، یەکێک بوو لەوانەی لە ژێرەوە پارەوپوڵی لە بنەهاتووی سیاسەتمەدارێکی گەورەی دەگێڕا. ئەو ئێوارەیە پێدەچوو بۆ کارێکی زۆر تایبەتی و گرنگ هاتبێتن. عەتار دەستی خستە سەرشانی غەزەلنوس و گووتی «غەزەلنوسی برام، مامۆستای گەورەی خەیاڵ، بە کارێکی گرنگ هاتووینەتە ماڵی

تـۆ، هیـوادارم دڵمـان نەشـکێنیت، ئێمـە ڕاسپاردەی پیاوێکمـان پێیـە، کـە نایەوێـت ئاشـکرا خـۆی دەرخـات. ئـەم بـرا عەزیـزەم کـە نـاوی «عەزیـز هاوشـارییە»، بەرپرسـی موڵـک و ماڵـی ئـەو پیاوچاکەیـە. بـە هیـوای ئـەوەی لەسـەر نرخێـک بگیرسـێینەوە کـە هەمـووان ڕازیبـکات». عەتـار لـە مـاوەی ئـەو چەنـد ساڵەدا گەشـەیەکی بێوێنـەی بـە دیپلۆماسییەتی کڕیـن و فرۆشـتنی خـۆی دابـوو. تۆڕێکـی تایبەتـی و نهێنـی لـە هەواڵگـر و خەبەرنـاس پێکهێنابـوو لـە هێـز و متمانـەدا بەرتەقـای دەزگا دەوڵەتییەکانـی پۆلیـس و ئاسـایش دەبـوو. وەک هەمیشـە گـوێ ئاونگییەکانـی تـەڕ و سـەر کەپـووی دڵۆپێـک عارەقـی ڕەشـی پێوەبـوو، دەبایـە لەگـەڵ دەسـت پێکردنـی مامەڵـە و حیسـابدا زوو زوو دەستەسـڕێک دەربهێنێـت و نێوچاوانـی وشـکبکاتەوە، سـاڵ دوای سـاڵ زیاتـر سـەری دەڕووتایـەوە، بـەرەو ئـەوە دەچـوو لـە ماوەیەکـی کورتـدا تاڵـە موویـەک چییـە بەسـەرییەوە نەمێنێـت. عەتـار بـە هەمـان لێزانـی خۆیـەوە گووتی«هەمـوو دەزانیـن تـۆ کتێبخانەیەکی گـەورەی غەزەلیاتــت هەیــە، ســاڵگەلێکی زۆرە تــۆ لــەم کتێبخانەیــە دەخوێنیتــەوە، خەیاڵاتـی جـوان دروسـتدەکەیت، بیسـتوومە کـە تـۆ بـە شـیعر بەدبەختـی دەگۆڕیـت بـۆ خۆشـبەختی و غـەم دەکەیـت بـە جـۆرە گوڵاوێـک کـە ڕۆح ئاسـوودەدەکات، مـن خـۆم لـە بـواری شـیعر و ئەدەبیاتـدا دەسـت سـپی و بێبەهـرەم، لەڕاسـتیدا دەرەقەتـی ئەدەبیـات نایـەم، سـەری لێدەرناکـەم و لـە نرخـی تێناگـەم. دیـارە هەرچییـەک لـە دونیـادا بکڕێـت و بفرۆشـرێت ئیشـی تیادەکـەم. عەزیـزم کاسـبی مەکینـەی ژیانـە، مەکینـەی ژیانـە... لای بـرا بچوکتـان کاسـبی لەسـەروو عەشقیشـەوەیە. کاسـبی نەبێـت بازاڕیـش نابێـت، کـە بازاڕیـش نەبـوو ژیـان نابێـت، مـن دەڵێـم بازاڕیـش وەک ئـەدەب مەحەکـە، مەحەکـی گەشـە و پەرەسـەندنە. میللەتێـک بـازاڕ و ئەدەبیاتـی نەبێـت دەمرێـت... بـازاڕ و ئەدەبیـات، ئـەوە پێوانـەی هەمـوو شـتێکە. عەفوومکـە لەوانەیـە ئێـوە بۆچوونێکـی ترتـان هەبێـت، کـە بێگومـان مـن

زۆر خۆشحاڵانە گوێی لێدەگرم، بەڵام بەندە زۆر ناووناوبانگی غەزەلیاتی ئێوەی بیستووە، لێرەو لەوێ غەزەلی جەنابتان بەر گوێمان کەوتووە. بەڵام عەزیزی من، نرخی زێڕ لای زەڕەنگەرە، ئەمڕۆ ئێمە لەسەر داوای یەکێک لە پیاوە چاکەکانی ئەم شارە، کە گەنجێکی بە لوتف و ڕۆشنبیر و ئەدەبدۆستە، لێرەین تا شتێک لەو کتێبخانە گەورەیەی ئێوە لە بواری غەزەلیاتدا بکڕینەوە. بەڵێ عەزیزی من ئەو کتێبخانە گەورە و دەگمەن و بێوێنەیەی غەزەلیات کە بیستوومە دەڵێن سامانێکی نەتەواویەتی گەورەیە و دەبێت لە شوێنێکی گرنگدا بپارێزرێت، ئەمە پێشنیاری پیاوچاکێکە کە حەزدەکات تۆ زەنگینبکات و ئەدەبەکەش لە بەڵای کتوپڕ و ناگەهان بپارێزرێت، پیاوێک لەبەر هەندێک ئیعتیباراتی تایبەتی خۆی نایەوێت دەربکەوێت و کەس بیناسێت، بەڵام هەموو دڵنیاین چ مەبەستێکی پاک و چ نیازێکی ڕاستگۆیانەی هەیە».

غەزەلنوس بیری لەوە نەکردبووەوە هیچ کەسێک هەبێت بیەوێت کتێبخانەی غەزەلەکەی لێبکڕێتەوە، پێشنیارەکە کتوپڕ و سەیر و شوێن گومان بوو. ئەو کتێبانە موڵکی ئەو نەبوون تا بتوانێت بیانفرۆشێت، لە سەرەتاوە هەستیکردبوو ئەو غەزەلانە موڵکی هەموو ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانە، موڵکی ئەو ژمارە ئادەمیزادە کەمەیە کە تا ئێستا شیعر دەتوانێت مەستیانبکات، جنسێک هێدی هێدی بەرەو کەمبوونەوە دەڕوات، موڵکی ئەوانەیە کە دەتوانن چاو بنوقێنن و خەون بە دونیایەکی ترەوە ببینن، با ئەو دونیایە ئەستەم و نەکردە و ئەفسانەیی بێت، بەڵام مرۆڤ هەمیشە پێویستی بەوەیە لە پاڵ ئەم دونیایەدا دونیایەکی تری هەبێت، نە لەبەرئەوەی دەبێت بەرەو ئەو جیهانەی دی ڕابکات، بەڵکو لەبەرئەوەی بەبێ ئەو جیهانەی دی ناتوانێت لەدونیای خۆی تێبگات. ئەو غەزەلانە دەلیلی غەزەلنوس بوون بۆ ناو ئەم شارە، بۆ کوچە تەسک و تۆزاوییەکانی، بۆ ژیانی غەمگینی ژنان، بۆ ئەو خەونانەی لە قووڵایی

پیاواندا خەوتـوون. بەبـێ ئـەو غەزەلانـە نەیدەتوانـی لـە پیسـی و خوێـن و ئـازاری ئـەم شـارە تێبـگات، لـە کـوڕە ناکامەکانـی نزیـک ببێتـەوە، بـۆ کچـە عاشـقەکانی بگـری، لەگـەڵ پیرەمێـردە سەرسـپییەکانیدا ببێتـە هـاوڕێ، پیرێژنـەکان بـڕوا و متمانـەی پێبکـەن. ئێسـتا چـی دەبێـت گـەر ئـەو غەزەلـە سیحراویانە بکەوێتـە دەسـت کەسـێکی جادووباز کـە تەنیـا ڕۆح فریـودەدات و دڵ ئەشـکەنجەدەدات؟ چـی دەبێـت ئـەم غەزەلانـە بکەوێتـە دەسـت یەکێـک کـە دەیەوێـت لـە ڕێـگای خەیاڵـەوە حەقیقـەت لـە بیـر مـرۆڤ بەرێتـەوە؟ سیحری خەیـاڵ ئەوەیـە کـە تێماندەگەیێنێـت لەسـەر چ زەوییـەک دەژیـن، چـی دەبێـت ئـەم غەزەلانـە بکەوێتـە دەسـتی کەسـێک نەیەوێـت لـە موحیبـەت تێبـگات؟ بکەوێتـە دەسـت عاشـقی درۆزن، کـە هێنـدەی خۆیـان مەبەسـتە، عەشـقیان لا گرنـگ نییـە؟ چـی دەبێـت گـەر غەزەلـەکان بکەوێتـە دەسـت کەسانێک کـە بەرتەقـای خەیـاڵ میهـر و موحیبەتیـان نییـە؟ ئـەو لـە مـاوەی ئـەو چەنـد ساڵەدا هەمـوو شـتێکی کردبـوو، غەزەلـەکان کۆمـەک بـە مـرۆڤ بکـەن ڕوونتـر خەیاڵبـکات، زیاتـر لـە ئەڤیـن نزیکببێتـەوە، پتـر ڕۆحیـان بـۆ یەکتـر بکەنـەوە و هێـزی خۆشەویسـتیان تیابێـت. ئـەی چـی دەبێـت گـەر یەکێـک بیەوێـت ئـەم غەزەلانـە بسـوتێنێت، ئـەم غەزەلانـە داگیربـکات و ڕاوی مەعشـوقەی پێبـکات؟. چـی دەبێـت گـەر بەکاریبهێنێـت بـۆ ئـەوەی هێـزی پـێ دروسـتبکات؟ ئاخـر خەیـاڵ دەتوانێـت هێزێکـی وەهـا گەورەبێـت، دونیـا سـەر لەبـەری بگۆڕێـت. ئێسـتا چـۆن دەتوانێـت ئـەم دوو مرۆڤـە تێبگەیێنێـت کـە داوای کڕینـی شـتێک دەکـەن کـە نافرۆشـرێت؟. غەزەلنـوس لـە ژیانیـدا چاوەڕوانـی ئـەوەی نەکردبـوو یەکێـک بیەوێـت غەزەلەکانـی بکڕێـت، بـەڵام ئێسـتا دڵنیابـوو مرۆڤێکـی نادیـار هەیـە کـە بـەدوای خەیاڵەکانیەوەیەتـی. بـە هێمنـی بێئـەوەی تـوڕە بێـت و خـۆی زویربـکات بـە عەتـاری گـووت «عەتـاری ئازیـزم، مـن تێدەگـەم، ئێـوە کاسـبێکی زیـرەک و فرەبەهـرەن. تێدەگـەم بـازاڕ و قەیسـەری شـاری ئێمـە وەک باغـی مەیمونـی لێهاتـووە کـە

هەموو کەسێکی عاجباتی و هەموو جانەوەرێکی بەجوڵە دەتوانێت کلکی تێوەردات. ماوەیەکە بازاڕ بە جۆرێکی ترسناک گەورەبووە، مرۆڤ گەر دوکاندار نەبێت شەرم لە حاڵی خۆی دەکات. من دەزانم شاری ئێمە هەموو شتێکی تیادەفرۆشرێت، هەموو شتێک، لەسەرەسۆدەوە تا مرۆڤ. بەڵام عەتاری عەزیز، هاوشاری برا، هەندێک شت نافرۆشرێن، هەندێک شت هەن بە مانای مرۆڤەوە گرێدراون. ئایا ڕۆماننوسێک ڕۆمانەکەی خۆی دەبەخشێتە کەسێک کە نازانێت وشەکان و قارەمانەکان و ئازارەکانی لە کوێوە هەڵقوڵیوون؟ هێزی هەندێک شت لەسەرچاوەکەیدایە، لەوەدایە لە دەستی کێدایە. من نیازێکم نییە بەیازی غەزەلەکانم بفرۆشم، چونکە نافرۆشرێن، من تەنیا دەتوانم بۆ خەڵکێکی عاشقی دوای خۆم جێیانبهێڵم. کتێبخانەی غەزەل شتێکە گەر عاشق نەبیت و دەستت بەر کتێبەکانی بکەوێت، دەبنە تۆز و غوبار، کتێبخانەکەی من جۆرێکە تەنیا من دەتوانم دەست بۆ لاپەڕەکانی بەرم، ڕاسپاردەی مەخلوقێکە کە ئەمانەتی خۆی خستۆتە گەردنی من... لە بەرئەوە عەتاری برام بەو پیاوە دڵپاک و دەستپاکە بڵێ، کتێخانەکەی من کتێبخانەیەکی خەیاڵییە کە بۆ فرۆشتن نییە، مرۆڤ دەتوانێت گوێ لە غەزەلەکانی بگرێت، بەڵام ناتوانێت بیکرێت، مرۆڤ ناتوانێت غەزەل بکڕێت، بەڵکو دەتوانێت تیا بژی».

ئەستەمبوو عەتاری سەرزل و گوێ بە ئاونگ لەگەڵ خەسیو عەزیزدا لە قسەکانی غەزەلنوس تێبگەن. پێیانوابوو، کێشەی هەرە گەورەی پێشدەم هەر مامەڵەیەکی دونیا ڕێکنەکەوتنی ئادەمیزادەکانە لەسەر نرخ. لای عەتار هیچ شتێک نەبوو لەم سەر زەوییەدا بۆ فرۆشتن نەبێت، هێند هەیە مرۆڤ دەبێت نرخی تەواوی لەسەر دانێت. خەسیو عەزیز لە شەڕواڵ و مراخانییە تەسکەکەیدا وادەردەکەوت بودجەیەکی بەرز و کراوەی خرابێتە بەردەست، لە پێشنیاری باغی سادە وە دەستی پێکرد تا گەیشتە ئەوەی دەڤەری گەورە و مەزرای هەزاران فەدانی

پێبەخشێت، لە خەزنەی پڕ پارەوە تا سندوقی پڕ گەوهەر و مرواری پێشنیاریکرد و سوودی نەبوو. خەسیو عەزیز پتر لە ڕەوانەکراوی سوڵتانێک دەچوو هاتبێت خوازبێنی کچەشازادەیەک بکات. ئەو ڕۆژە کە دڵشکاو لە ماڵی غەزەلنوس هاتنەدەرێ، پێیانگووت «ئەو پیاوە ئەدەب دۆستە بە جۆرێک عاشقی غەزەلەکانی تۆ بووە، دەستبەرداری هیچ ڕێگایەک نابێت، پەشیمانی تۆی پێ بکرێت». غەزەلنوس دەستی خستە سەرشانی هەردوو دەلاڵە غەمگینەکە و گووتی «بەو پیاوچاکە بڵێن کە شیعر موڵکی هیچ ئادەمیزادێک نییە، کەس ناتوانێت شیعری هەبێت، کەس ناتوانێت غەزەل لەسەر خۆی تاپۆبکات، تەنیا دەتوانێت شیعر و غەزەل و خەیاڵ بەکاربهێنێت تا دونیای لێوننەبێت و خۆی وننەکات».

## ماجیدی گوڵ سۆلاف بۆ یەکەمجار بارۆنی خەیاڵ دەبینێت
## ماجیدی گوڵ سۆلاف - هاوینی ٢٠٠٤

وەک گووتم، شەوێکیان بارۆنی بوکەشوشە داوەتی ئاهەنگێکی گەورەی کردم و چووم بۆ ناو بارۆنەکان. بارۆنی بوکەشوشە دەیزانی من لەو جۆرە ئاهەنگانەدا سەرودەرم نییە و دەشێوێم و دەست و قاچی خۆم وندەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەواڵەکەی پێگووتم، زۆر پێیداگرت بچم و لەوێ ئامادەبم. ئاهەنگێکی خێزانی گەورە بوو کە بارۆن بەبۆنەی گەڕانەوەی کوڕێکییەوە لە ئەوروپا سازیکردبوو. تەڵەیەک بوو لە تەڵە زێڕینەکانی بارۆن تا کوڕەکەی ناچاربکات، کچی یەکێک لە میرە گەورەکان هەڵبژێرێت و نیشانەیبکات. ئەودەم ئەو جۆرە ئاهانگانە باوبوون، ئەوانەی کوڕیان لە هەندەرانەوە دەگەڕانەوە، بۆنەی وایان دروستدەکرد تا کوڕەکانیان بتوانن دڵخوازی خۆیان بدۆزنەوە. زۆربەی

ژنـان و کچانـی نوێمیـران لەوێبـوون، هەمـوو جوانتریـن و سـەیرترین جلـی خۆیـان لەبەرکردبـوو. چەنـد وەخـت مـن لـەو شـارە پیـس و پۆخڵـەدا ژیابـووم، تـا ئـەو کاتـە نەمدەزانـی جـۆرە ئاهەنگـی وا گـەورەی تیـا سـازدەکرێت. بـۆ ئـەوەی وەک گەمژەیـەک دەرنەکـەوم و زۆر نەکەومـە بەرچـاو کەمێـک درەنـگ چـووم بـۆ یانـەی «مـرواری» کـە ئاهەنگەکـەی لێسازدەکرا. کە گەیشتمە سالۆنەکە پڕبوو لە میوانی بۆندار و بە پرشـە و ورشـە، بـەڵام هێشـتا خزمەتچییـەکان دەسـتیان بـە خزمـەت و تیپـە مۆسـیقییەکان دەسـتیان بـە گۆرانـی نەکردبـوو. شـوێنێکی سـەیر و بۆنەیەکی بێوێنەبـوو بـۆ مـن، پێشـتر لـە هەمـوو ژیانمـدا هێنـدەم کـچ و ژنـی جـوان ئاوهـا بەسـەر یەکـەوە نەبینیبـوو. هەمـوو بـە ویقارێکـی زۆرەوە لەسـەر مێزەکانـی خۆیـان دانیشـتبوون، هێشـتا میکیاجەکانیـان نـوێ و بۆنـی عەترەکانیـان تیژبـوو، سـەرتاپای سالۆنەکە بۆنـی جـۆرە گوناهێکـی نادیـاری لێدەهـات. «بارۆنـی بوکەشوشـە» کـە منـی بینـی ئامێـزی بـۆ کردمـەوە و بـە گەرمـی پێشـوازی لێکـردم و بـە گوێیـدا چرپانـدم «کـوڕی خـۆم، ئێوارەیەکـی خـۆش بـژی». بـە عەقڵـی ئەوکاتـم خۆشـحاڵبووم کـە بارۆن بـە کـوڕی خـۆی بانگیکـردم. بـە هێمنـی بارۆنـم جێهێشـت و وەک کەسـێکی نابەلـەد و دەسـتەپاچە، لـە دوا ڕیـزی هۆڵـە گەورەکـەدا لەسـەر مێزێـک دانیشـتم. داوەتەکـە کەسـانی دەسـتخاڵی وەک منـی کـەم تێدابـوو، زۆر بەیـان لەگـەڵ ژن و کچـی خۆیانـدا هاتبـوون، پیاوانـی بێئافرەتـی وەک مـن یاخـود لـە پێشـی پێشـەوە یـان لـە پشـتی پشـتەوەی سـالۆنەکەدا دانیشـتبوون، بـە جۆرێـک دەبایـە لـە سـەرەتاوە دیاربیـن کـە ئێمـە بێهاوسـەر و هاودەمـی ئافرەتیـن. جـۆرە جیاکردنەوەیەکـی نامرۆڤانەبـوو، دەرکـردن و بەلاوەخسـتنێکی گەورەبـوو، بـەڵام سـوودێکی هەبـوو، هەندێـک لـە ژنـان و کچـان زیاتـر تەماشـایان دەکردیـن. لەگـەڵ ئـەو پەراوێزنشـینییەدا، چونکـە جوانتریـن جلـی خـۆم لەبەرکردبـوو، قـژم بـە سـەیرترین شـێوە داهێنابـوو،

لـە نێـو هەمـوو گەنجەکانـی سـاڵۆنەکەدا، نامـۆ و نـاوازە دەردەکەوتـم. لـە سـەرەتاوە کوڕێکـی گەنـج لـە تەنیشـتمەوە دانیشـت، کـە پێدەچـوو ئەویـش تەنیـا بێـت، بـە دەنگێکـی غەمگیـن، بـەڵام دڵنیـا و زبـر، خـۆی پێناسـاندم نـاوی «پێـرس» بـوو، «پێرسـی ئەندازیـار». بـە نیگایەکـی کەمێـک گومانـاوی و ناپاکـەوە سـەیریکردم و گـووتـی «تـۆ کـوڕی حیکایەتەکانیـت، وانییـە، کـوڕی حیکایەتـەکان؟». نەمزانـی مەبەسـتی چییـە، بێئـەوەی وەڵامیبدەمـەوە گـووتـی «مـن دەتناسـم، مـن بـاش دەتناسـم، مـن بارۆنـی دەریاچـە مامـە، دەزانـم تـۆ شـەوان حیکایـەت بـۆ منـداڵان دەگێڕیتـەوە، دەزانـم، پێویسـت نـاکات بترسـیت، پێویسـت نـاکات». مـن بەسەرسـامییەوە سـەیرمکرد و گـووتـم « ناترسـم، بـۆ بترسـم؟». گـووتـی «منیـش لـە بارۆنـەکان نیـم، هێنـد هەیـە، ئەندازیـاری کارەبـام، ئیشـیان بـۆ دەکـەم. واتدەزانـی مـن لـە بارۆنەکانـم، هـا واتدەزانـی مـن لەوانـم، دەزانـم کـە تـۆ واتدەزانـی منیـش لەوانـم، بـەڵام مـن لـە بارۆنـەکان نیـم، مـن ئیشـیان بـۆ دەکـەم، مۆلیدەیـان بـۆ دادەنێـم و بۆیـان چاکدەکـەم، کارەبایـان بـۆ دابیندەکـەم، هەمـوو شـتێکیان بـۆ دەکـەم، منیـش وەک تـۆ وام، دەتوانـم بچمـە نـاو ماڵـی بارۆنەکانـەوە». زەردەخەنەیەکـی پڕمانـا و پیسـی گـرت و بـە چپـە گـووتـی «منیـش دەتوانم بچمـە هەموو ژوورەکان، هەمـوو ژوورەکان، دەتوانـم بچمـە حەمـام و تەوالێتەکانیـش». بـە هێمنـی دەسـتی خسـتە سەرشـانم و گـووتـی «مـن براتـم، بـرا، لـە هـەر کـەس دەترسـیت لـە مـن نەترسـیت، تێدەگەیـت، بـە برایەکـی خۆتـم دابنـێ. منیـش ڕقـم لێیانـە، بـەڵام دەبێـت ئـاگات لـە خـۆت بێـت، زۆر ئـاگات لـە خـۆت بێـت». مـن تەماشـامکرد و هیچـم نەگـووت. ئـەو چپانـدی بـە گوێمـدا «سـەیرکە بارۆنـی توتـی دەبینیـت، ئـاە دەزانـم تـۆ نایناسـیت، تـۆ کـەس ناناسـیت، تـۆ تازەیـت. بارۆنـی توتـی، یەکێکـە لـە دەوڵەمەنتریـن بارۆنـەکان. سـەرۆک چـی بڵێـت وەک توتـی دەیڵێتـەوە، لەبـەر ئـەوە ناویـان نـاوە بارۆنـی توتـی.

ئەی بارۆنی ئاسک؟ ئاه، من بە بارۆنی ئاسک سەرسامم. دەزانی بۆ ناویان ناوە بارۆنی ئاسک؟ نازانیت. لە بەرئەوەی کەسێکی تر لە دونیادا نییە بتوانێت وەکو ئەو بتوانێت ئاسک ڕاوبکات. گەورەترین ڕاوکەری ئاسکە، بە ڕاکردنەوە ئاسک دەگرێت، من نەمبینیوە بەڵام بیستوومە، دەڵێن دەتوانێت سوار پشتیان بێت و دەستەمۆیانبکات و شتی تریش». ئەو دەیویست شتێک بڵێم، من بۆ ئەوەی هیچ گومانێک دروست نەکەم، گووتم «ئەی بارۆنی چینی کوا، دەمەوێت بارۆنی چینیم پیشانبدەیت؟». لەو کاتەدا کە قسەمان دەکرد، هێدی هێدی دەنگەدەنگ و غەڵبەغەڵبێکی زۆر دەکەوتە ساڵۆنەکە، تیپی مۆسیقاکە کەمەکەمە ئامێرەکانیان تاقیدەکردەوە، دەنگی ناسکی هەندێک کچ و دەنگی پێکەنینی دوو ژنی قەڵەو لە بەردەمماندا نەیاندەهێشت تەواو تێبگەم چی ڕوودەدات. کە پرسیاری بارۆنی چینیم لە پێرس کرد کەمێک سەری خوران و گووتی «هم، بارۆنی چینی، بارۆنی چینی نابینم، ئەو یەکەم کەس بوو ڕێگای بازرگانی لەگەڵ چیندا کردەوە، بەڵام پیاوێکی هیچە. ئاه تۆ نایناسیت سەرێکی دێز و جوتێک چاوی بچوکی هەیە، لە کوپەیەکی شکاو دەچێت بە کەتیرە نابێتیانەوە بەیەکەوە». شێوەی بارۆنی چینیم بەلاوە گرنگ نەبوو، دەمویست سوود لە ئێوارەکە وەرگرم تا سەرەداوێکم دەستکەوێت بمگەێنێتە ژنەکەی بارۆنی مریشک. ئەو ئێوارەیە پێرس زۆربەی بارۆنەکانی نیشاندام، ژیانی زۆربەیانی دەزانی، لە هەواڵی دەوڵەمەندبوون و سەرچاوەی سامانەکانیاندا پسپۆڕبوو. من هەرگیز شتێکی وام نەدرکاند گومانم لێبکات. هێدی هێدی ئاهەنگەکە دەستی پێدەکرد و ویقار و بێدەنگی سەرەتا نەدەما. لەسەرەخۆ جارجار بە هەیبەتێکی میرانەوە قومێکم لە بیرەکەم دەدا، خۆشحاڵ و وریابووم، نەدەبایە شتێک بکەم ئەو شوێنە بدۆڕێنم کە بە دەستم هێنابوو. ویقار هێزی من و بەشێکی

گەورەی فەلسەفەی ژیانم بوو، هەستمدەکرد لەگەڵ گەرمبوونی ئاهەنگەکە و خاوبوونەوەی کۆتەکان و تەنگبوونەوەی شەرمدا ژمارەیەکی زۆر لە کچان و ژنانی ناو هۆڵەکە سەیرمدەکەن. هەندێک لە پیاوان هەر لە سەرەتاوە وەها سەرخۆشبووبوون، نەمدەزانی دوایی بەچی دەگیرێنەوە و چۆن دێنەوە هۆش خۆیان. دەنگی مۆسیقاکەش وەها بەهێز و دڵ تێکدەر بوو، جەستەکان تەنیا دەیانتوانی بە خواری و ناڕێکی، بەدەرچوون لە فۆرمی ئادەمی لەسەر جۆرە مۆسیقایەکی وەها هەڵپەڕن. پێرس هێدی هێدی دەیخواردەوە و غەمگین دەبوو، دیاربوو لەو بەدمەستانەیە کە دەخۆنەوە و بە غەم و دەردەکانی ژیانەوە دەیگرن. بەڵام لەگەڵ زۆری بادە و مەینۆشیشدا هێشتا هۆشێکی کراوە و داگیرساوی هەبوو. زوو زوو بە منی دەگووت «وامەزانە، کە برازای بارۆنی دەریاچەم ئیتر تەواو، بارۆنی دەریاچە؟ ە.. ە... گەوادی وا، چ سوودێکی بۆ من هەبووە؟ شەو و ڕۆژ لە ناو موەلیدە و بۆنی بەنزین و گرمەگرمی دینەمۆدا کاسبووم... ە... بارۆنی دەریاچە، بارۆنی دەریاچە. سەعۆلی خلە بەڕۆن، مامی عەزیزم، خۆی ناوناوە میری دەریاچە، ئاغای سەر ئاوەکان، بارۆنی بەحر... بیرۆی هەیە، هاها... سەعۆلی خلە بەڕۆن سکرتێرەی هەیە... ڕاستت دەوێت من حەزم لە سکرتێرەکەی کردوە، پیشانت بدەم، ها حەزدەکەیت بیناسیت، حەزدەکەیت؟» . کچێکی باریکەلەی ئێجگار ناسکی لە کاوبۆیەک و تیشیرتێکی سووری کاڵدا پیشاندام و گووتی «ئەوە سکرتێرەکەی بارۆنی بەڕۆنە... سەیریکە و خۆت قسەبکە، من هیچ ناڵێم» . لەکاتێکدا ئەو سکرتێرەکەی بارۆنی بەڕۆنی نیشاندەدام، کچێکی دی لە تەنیشت سکرتێرەکەوە بوو بە شێوەیەکی بەردەوام و عاشقانە سەیری منی دەکرد. کچێک بوو باریک و کەڵەگەت، قژێکی زەردی کورتی هەبوو کەمێک لوولیکردبوو، جووتێک چاوی ئێجگار کاڵی پێوەبوو، وێنەی ئەو چاوانەم تەنیا لە سینەمادا بینیبوو. سوێندتان بۆ

دەخۆم لە «جێسیکە لانگ» دەچوو لە فلیمی «پۆستەبەر دووجار لە زەنگ دەدات». هەمان سەیرکردن، هەمان درەوشانەوەی ئیرۆتیکی، هەمان سیحر کە ئەژنۆی مرۆڤ دەشکێنێت. جۆرە کچێک بوو من لە خەونەکانمدا دەمبینی. سەیرکردنەکانی هێند قەشەنگ و خەیاڵیبوون، وامدەزانی ئەو کچەم لە جێگایەک لە جێگاکانی ناو ئەو مەملەکەتە گەورەیەی خۆمدا بینیوە، وام هەستدەکرد ڕۆژێک لە کەشتی دابەزیوم و لە جێگایەکی نادیار، لە نزیک جەنگەڵێکی گەورەوە بەم کچە گەیشتووم. بەڵام خەیاڵ بوو، خەیاڵێکی پڕوپوچ، هەرگیز نەمبینیبوو. لەو کچانەبوو کە هێند جوانن ناوێریت خەونی ئەوە ببینیت لێیان نزیکببیتەوە. لەگەڵ گەرمبوونی ئاهەنگەکەدا، لە کاتێکدا من و پێرسی ئەندازیار چەند جارێک جێگای خۆمان گۆڕی، هەڵدەستاین و دادەنیشتین، دەڕۆیشتین و دەگەڕاینەوە، لە مێزی خواردنەوەکە نزیکدەبووینەوە، قاپی گەورەی زەلاتەمان تێدەکرد، ڕیزی هەڵپەڕکێکەرەکانمان تێکدەدا، بەدرێژیی ئەو کاتە، لەناو جەنجاڵی هۆڵەکەدا، هەستمدەکرد ئەو کچە زیاتر لەوانی دی بۆم دەگەڕێت و سەیرمدەکات. لە پێرسم پرسی «ئەو کچە دەناسیت کە لەگەڵ سکرتێرەکەی مامتدا وەستاوە؟ ئەو کچە کراس پەمەییە، ئەوەی تەوقەیەکی سپی بە قژیەوەیەتی؟». پێرس گووتی«ئەها مەبەستت تیشکان تاهیرە، ئەوە کیژێکی تازەیە، دەڵێن لە ماڵی بارۆنی مەدەنیدا ئیشدەکات. بەقسەی من دەکەیت، پرسیار لە کچی وا ناکەیت، بارۆنی مەدەنی لە هەموو پیاوانی نوێمیران ژنبازترە، تێدەگەیت، لە هەموویان ژنبازترە، لە مەسەلەی ئافرەت و سۆزانی و ژنی خراپدا شارەزاترین پیاوی ئەم شارەیە، ئەم شارەی چی، بڵێ ئەم مەملەکەتە، لە بەسرەوە قەحبەی خۆی هەیە تا دەگاتە سەر بۆسفۆر. خەڵکێکی تایبەتی هەن ئیشی بۆدەکەن. پێیوایە جنس بەشێکە لە شارستانییەت و مەدەنییەت، لەبەرئەوە ناویاننـاوە بارۆنی مەدەنی. تا ئیستا ژنی

نەهێناوە. ئەوەی من دەیزانم، ئەم تیشکانە کچی هاورێیەکی خۆیەتی، بە قسە کچی بازرگانێکی کوردە لەوانەی لە دوای ڕاپەڕینەوە چوونەتە بەغدا، باوکی لە کاتی گرتنی بەغدادا لەلایەن ئەمریکییەکانەوە کوژراوە. تەنیا ئەم کچەی هەبووە کە بارۆنی مەدەنی کردوێتی بە دایەنی خوشکەزایەکی چکۆلانەی هەشت ساڵانە بە ناوی «سێوان» ـەوە. لە ڕاستیدا نازانم ئەو حیکایەتە ڕاستە یان نا، بەڵام بەو جۆرە بیستوومە».
سێوان یەکێک بوو لەو منداڵانەی من حیکایەتم بۆ دەکرد، تا ئەو کات دووجار حیکایەتم بۆکردبوو، بەڵام هیچ کەسم لەو ماڵەدا نەبینیبوو. بێئەوەی بتوانم ئەو کچە قژزەردە لە خەیاڵی خۆم دەربکەم، لە دەرفەتێکی گونجاودا پرسیم «برای ئەندازیار، کەسێک هەیە ناوی بارۆنی مریشک بێت، تۆ ناوی وات بیستووە؟». پێرس پێکەنی و گووتی «ئەوە بارۆنی مریشکە، ئەوەیە». پیاوێکی باریک و زۆر کەڵەگەت و سەر ڕووتاوەی پیشاندام کە سەرو سمێڵی وەها ڕەشکردبوو، لە دەوڵەمەندی نێو فلیمە تورکییە کۆنەکان دەچوو. لە ناوەڕاستی ڕیزێک ژنی ئاڵوواڵادا دەستی گرتبوو هەڵدەپەڕی. پێرس بە کەمێک گێژییەوە گووتی «کێ هەیە بارۆنی مریشک نەناسێت، نیوەی ئەم شارە موڵکی بارۆنی مریشکە». من بۆ ئەوەی وادەرنەکەوم نیازێکم هەیە، گووتم «ڕاستت دەوێت، من ناوبانگی ژنی بارۆنی مریشکم بیستووە، هەڵبەت وەک ژنێکی بەڕەحم و باش، حەزمدەکرد ببینم، هەر ئەوەندە، ئیدی هیچ دەربارەی ئەو خێزانە بەڕێزە نازانم».

زۆر خواردنەوە هێدی هێدی کاری لە ئەندازیارەکە دەکرد، بە خاوی سەری هەڵبڕی و گووتی «ژنی بارۆنی مریشک، ئەو کراس شینەیە، ئەو ژنەی لەوسەر لەگەڵ دوو کچی گەنجدا دانیشتووە، کەوایەکی پولەکەی لە بەردایە».

ئەو شەوە بۆ یەکەمجار ژنی بارۆنی مریشکم بینی، لە دوورەوە بە

ژنێکی باریک و غەمگین دەچوو، چەند ساڵێک لە مێردەکەی گەنجتر دیاربوو، لە ژن و کچەکانی دی کەمتر تێکەڵاوی ئاهەنگەکە دەبوو. ئەو شەوە شا دەرفەتی من بوو بگەمە ژنی بارۆنی مریشک، لەوانەبوو تا ساڵێکی دیش هەلی وەها نەڕەخسێت و ڕێکەوتی وەها نەیەتە دەستم. پێرس زۆر خێرا و لەسەریەک دەیخواردەوە، چەند جارێک پێمگووت کە ئەو جۆرە خواردنەوەیە خراپ مەستیدەکات، بەڵام گووتی لە شازدە ساڵییەوە وا بێمێشکانە دەخواتەوە و ئێستا ناتوانێت خۆی چاکبکات. دەمزانی لە ماوەیەکی کورتدا چیتر توانای قسە و بیرکردنەوەی نامێنێت، من کەمە کەمە لە پێرس دوورکەوتمەوە بۆ ئەوەی دەرفەتێک بهێنم و لەگەڵ ژنی بارۆنی مریشکدا قسەبکەم. بێئەوەی شتێکی ئەوتۆ لە هەڵپەڕکێ بزانم چەند سوڕێک تێکەڵاوی بازنەکان بووم و هاتمەدەرەوە، هەر جارەی دەچوومە دەستی کەسێکەوە، ماوەیەکی درێژیش لە هیچ دەستێکدا نەدەمامەوە. لە ناوەڕاستی ئاهەنگەکەدا، هەستمکرد ژنی بارۆنی مریشک دەیەوێت هەڵپەڕێت، دەنگی گۆرانیبێژەکە هێند ناخۆش و بێویقار بوو، گۆرانییەکانی هێندە سادە و گەمژەدووبوون، مرۆڤ دەبایە بە هەڵپەڕکێ دەنگی گۆرانیبێژەکە لە خەیاڵی خۆی دەرکات و لە بیر خۆی بەرێتەوە. لەبەرئەوە هەموو بەشێوەیەکی شێتانە هەڵدەپەڕین، بە جۆرێک قاچیان دەدا بە زەوییەکەدا دەترسام چلچراکانی سەقفەکە بکەوێتە خوارێ. هەستمکرد ئەو هەڵپەڕکێ هیستیرییە هەمووانی وەها مەستکردوە، کەس ئاگای لە خۆی نییە. لە یەکێک لە سوڕەکاندا فورسەتم هێناو چوومە دەستی ژنی بارۆنی مریشکەوە. هێندە دەستیمگرت بە پەلە گووتم « خانم من کارێکی گرنگم بە تۆیە، کارێکی زۆر گرنگ، پەیوەندی بە چیرۆکی مردنی موراد جەمیلەوە هەیە » . هێند ئەو قسانە لە زارم ترازان، هەستم بە پەشۆکان و ڕاچڵەکانێکی قووڵ لە لەشیدا کرد، دەستی ساردییەکی کتوپڕی

تێگەڕا و بێدەنگییەکی کوشندە گەرووی گرت. بەڵام وەک بترسێت، وەک هەڵبێت، پاش ئێستێکی زۆر کورت دەستی بەردا و هەڵپەڕکێکەی بە جێهێشت و گەڕایەوە سەر مێزەکەی خۆی. من بێئەوەی بشڵەژێم و ویقاری خۆم تێکبدەم، لە سەر هەڵپەڕکێ بەردەوامبووم. هەستمکرد لە دوورەوە بە چاوێکی ترساو سەیرمدەکات، ئا لەو ساتەدا بەجۆرێک دڵم بۆی سووتا، حەزمدەکرد هەرچییەکم کردوە کارێکبکەم ئارامیبکەمەوە، بە تایبەت ژنێکی گەلەک غەمگین و پاک هاتە بەرچاوم، بە جوانییەکی تراژیدییەوە، جوانییەک هەستدەکەیت غەم دروستیکردوە نەوەک سروشت یان خۆشبەختی. دڵنیابووم لە نیازم تێنەگەیشتووە، ترسێکی بێهۆ و بێبەهانەی تیا درستبووبوو. من ئەوکات هیچ شتێکم لەسەر پەیوەندی ژنی بارۆنی مریشک لەگەڵ موراد جەمیلدا نەدەزانی هیچ شتێک. لە بەرئەوە نەمزانی وشەکانم چییان لای ئەو بەجێهێشتووە. لە خەیاڵی ئەوەدا بووم کە بەجۆرێک لە جۆرەکان خۆم بگەێنمەوە ئەو، بەڵام لە ناکاو دوو شتی سەیر ڕوویاندا، هەر دووکیان تەواوکەری یەکبوون و هەردووکیشیان پێکەوە ژیانی منیان سەر لەبەر گۆڕی. دوای دوو سوڕ هەڵپەڕکێی زۆر گەرم، گەڕامەوە بۆ لای پێرس کە نیوەهۆش لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو، لە دونیا بڕابوو و بەدەنگێکی زۆر نزم مەستانە گۆرانی بۆ خۆی دەگووت. لەگەڵ دانیشتنمدا ئەو کچە قژ زەردەی لە جێسیکە لانگ دەچوو بە مەبەست بە بەردەممدا هات و لە ژێرەوە، بە دوو پەنجە سڵاوی لێکردم و بە زمانێکی ناسک و بە دەنگێکی ئەسپایی گووتی «کوڕری حیکایەتە خۆشەکان، چۆنیت؟». وایگووت و بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵامەکەم بکات تێپەڕی. مەبەستی بوو تەنیا پردێکی بچوک دروستبکات، پردێک کە دەشێت دواتر مرۆڤ ئاسان ئیشی لەسەربکات و بەهێزتر دایڕێژێت. دوای چەند چرکەیەکی کورت لەوە لە کاتێکدا هێشتا سەیری ئەو گوڵە سپییە جوانەم بە قژی ئەو کچەوە دەکرد،

کوڕێکی گەنج هاتە بەردەم و گووتی «بەڕێز ماجیدی گوڵ سۆلاف، بمبورە دەبێت کەمێک لە ئاهەنگەکە دووربتبخەمەوە، میری خەیاڵ لە ژوورێکی تایبەتدا لە قاتی سەرەوە چاوەڕێتدەکات... زۆر حەزدەکات بتبینێت».

* * *

نازانم، ئاخۆ کەس لە ئێوە ئەو هەستە ژیاون، دوای ئەوەی پێتان خستۆتە ژوورێکەوە، هەستبکەن ژیان و چارەنوستان سەراپای گۆڕابێت. من دڵنیام ئەو جۆرە هەستانە دەگمەنن، بەڵام شەوێک کە پێمخستە ئەو ژوورە تایبەتەی بارۆنی خەیاڵەوە جۆرە هەستێکی وام تیا دروستبوو. پێشتر ناوی بارۆنی خەیاڵم نەبیستبوو. ژوورەکەی لە قاتی سەرەوە بەجۆرێک گەورە و فراوانبوو لە ژووری کابتنی کەشتییەکی ئەفسانەیی دەچوو. تەواوی یانەی مرواری موڵکی ئەوبوو. قاتێکی ڕەشی ئاوریشمی لەبەردابوو، کراسێکی قاوەیی تۆخ. لە هەموو ئەو بارۆنانە گەنجتر بوو کە بە دیداریان گەیشتبووم. کەسێکی باریکبوو بە جووتێک برۆی ڕێک و درێژەوە، سمێڵی نەبوو، بەڵام خاڵێکی ڕەشی سەر لێوی بێوێنە قۆزی کردبوو، لەوانە دەچوو کە ماوەیەکی زۆر لە خۆرئاوا ژیاون و دواتر خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندی ئێرە فریویداون و گەڕاونەتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەو ڕوخسار و شێوە نیگارە فەرەنگییەدا، ئەو لە خۆرئاوا نەژیابوو. وەک خۆی دەیگووت کوڕی هەمیشەیی ئەم شارەبووە. ئەو شەوەی منی بانگهێشتی ژوورەکەی خۆی کرد، هەستم بە هیچ نەکرد، نەمدەزانی چۆن بیردەکاتەوە و بیر لە چی دەکاتەوە. یەکێک بوو لەو ڕۆحانەی گەر چاکەکاربن یان خراپەکار بە ئاسانی تێیاننناگەیت. سەرەتا وام هەستکرد بۆ ئەوە بانگیکردوم لەسەر هەندێک لەو حیکایەتانە قسەم لەگەڵدا بکات کە بۆ منداڵانی نوێمیرانیان دەگێڕمەوە. بە

نازنـاوی «چیرۆکنوسـی منداڵانـی نوێمیـران» پێشـوازیکردم. هێـدی هێـدی ئـەو جـۆرە ناوانـە بەسـەرمدا دەبـڕان، خەڵکـی لـەو گەڕەکـەدا منیـان بـە «حیکایەتخوانـی منداڵـی بارۆنـەکان» بانگدەکـرد. بـەڵام بارۆنـی خەیـاڵ وەهـا گـەرم پێشـوازیکردم، ڕووگیـر و دەسـتەپاچەبووم. گووتـی «مـن ناوبانگـی چیرۆکەکانـی تـۆم لـە منداڵانـی نوێمیرانـەوە بیستووە. هەموویـان تـۆ وەک فریشـتەیەک تەماشـادەکەن لـە ئاسمانەوە هاتبیـت». لـە ڕاستیدا مـن حیکایەتخوانێکـی بـاش نەبـووم، جگـە لـە منـداڵان نەمدەزانـی لەگـەڵ کەسـی تـردا ئـازا و ئازادانـە قسـەبکەم. ئێسـتاش دەڵێـم منداڵانـی نوێمیـران هێنـدەی حەزیـان لـەو نهێنییانـە دەکـرد کـە لەگـەڵ منـدا بەشـیاندەکرد، حەزیـان لـە خـودی حیکایەتـەکان نەدەکـرد. بارۆنـی خەیـاڵ بـە نـاوی «سـەحەر ئاغـا»وە خـۆی پێناسـاندم، هەندێـک لـە بەرپرسـە حیزبییـەکان بـە «میـر سـەحەر» بانگیاندەکـرد، لـە باپیـرە دەرەبەگەکانییـەوە زەوی و زارێکـی بێشـوومار و بێحیسـابی بـۆ بەجێمابـوو، لـە زۆر شـوێنی شـاردا زەوی و موڵکـی گـەورەی هەبـوو، لـە حیزبـدا پلەوپایەیەکـی بەرچـاوی گرتبـوو. ئـەوکات نەمدەزانـی لەبەرچـی ناویـان نـاوە بارۆنـی خەیـاڵ، خـۆی گووتـی حـەزی هـەرە گـەورەی خوێندنـەوەی حیکایەتـی سـەفەرە خەیاڵییەکانـە، بـەراورد بـە بارۆنەکانـی دیـش، خوێندەوارتـر دیاربـوو. پێکـەوە باسـمان لـە سـەفەرە خەیاڵییەکانـی گیلڤـەر کـرد، حیکایەتـی زۆربـەی گەشـتە گەورەکانـی جـۆل ڤێرنـی خوێندبـووەوە، هەردووکمـان تەبابوویـن لەسـەر ئـەوەی «فۆرێسـت گامـپ» جوانترین فلیمـی ساڵانی نەوەدەکانـی هۆلیـۆدە. تەبابوویـن لەسـەر ئـەوەی کـە ئەدەبیاتـی سـەفەر، یەکێکـە لـە سیحراویترین لقـی ئەدەبیـات. بـە غەمگینییـەوە گووتـی «مـرۆڤ حەقیقەتـی خـۆی تەنیـا لـە گەشـتدا دەخوێنێتـەوە، بـەڵام هەمـوو گەشـتێک نـا». هێـدی هێـدی هاتینـە سـەر باسـی سـەندبادی دەریـاوان، ئاماژەیەکـی ڕاگـوزەری دا بـە ماجـەلان و گەشـتە سـەیرەکانی و خولیـا شـێتانەکەی بـۆ سـوڕاندنەوە بـە

دەوری زەویدا. بە دەنگێکی پڕمانا لێیپرسیم «بەڕای تۆ، چەند جۆرە زەوی دیکە هەیە، مرۆڤ بەدەوریدا بسوڕێتەوە؟». گووتم«جەنابی میر سەحەر، هەر مرۆڤە و زەوییەکی نهێنی لە ناخیایەتی کە دەتوانێت بە شێوازی خۆی بەدەوریدا بسوڕێتەوە». بە نیگایەکی خەیاڵییەوە لێیپرسیم «واتە هەموو کەسێک کیشوەرێکی دوور و نەدۆزراوە لە ڕۆحیایەتی؟». لەسەرەخۆ گووتم «وادەزانم وەها بێت وەک ئێوە فەرمووتان، هەموو مرۆڤێک کیشوەرێکی دوور و نە دۆزراوە لە ناخیایەتی، بەڵام هەمیشە لە نێوان ئێمە و ئەو کیشوەرەدا دەریایەکی بەرین و تاریک هەیە... دەریایەکی بەرین و تاریک». هەناسەیەکی غەمگینی هەڵکێشاو گووتی « هەموو کەسێکیش ناتوانێت ئەو دەریایە ببڕێت، وانییە، ناتوانێت». منیش بە هەمان حەسرەتەوە گووتم« بەڵێ، جەنابی بارۆن، کەمن ئەوانەی دەتوانن بیبڕن». بەجۆرێکی کتوپڕ لێیپرسیم «تۆ دەتوانیت یارمەتیمبدەیت، ئەو دەریایە ببڕم، دەتوانیت؟». لەوساتەدا هەستمکرد بارۆنی خەیاڵ زۆر زیاتر شت لەسەر من دەزانێت، لەوەی دەریدەخات. ساتێکی بێدەنگی و تەماشاکردنی قووڵ کەوتە نێوانمان، ئەو سەیری منی دەکرد و من سەیری ئەوم دەکرد. بۆ ئەوەی زۆر نەمترسێنێت گووتی «هەموو کەسێک پێویستی بەیەکێکە لە بڕینی ئەو دەریا تاریکەی ناو خۆیدا کۆمەکیبکات». بۆ ئەوەی زیرەکانە بابەتەکە بگۆڕم گووتم «میر سەحەر، زۆر کەس هەن، تەماحیان لە داگیرکردنی دەریای ناو ڕۆحی ئەوانی ترە، گەر هەر مرۆڤە بایەخێکی گەورە بە دەریای ناو ڕۆحی خۆی بدات، گەر وابکات، هەموو کەس دەتوانێت ئەو دونیا خنکاوەی ناو ڕۆحی خۆی بدۆزێتەوە». وەک ئەوەی هەر دووکمان بە ئامارژە لە یەکدی گەیشتبێتین، وەک ئەوەی ئەو چەند وشە قووڵ و کاریگەرە بۆ ئەمشەوە جەنجاڵە بەس بێت، بارۆن بێدەنگی منی بە هێمنی وەرگرت و پرسیارە سەیرەکەی خۆی دووبارە نەکردەوە،

دواجـار بـە حورمەتێكـی زۆرەوە پێشـمكەوت و داوای لێبوردنـی لێكـردم و پەیمانـی دامـێ كـە بەزوویـی یەكـدی دەبینینـەوە. بەرلـەوەی بچمـەدەرێ گووتـی «مامۆسـتا، مـن لـە نوێمیـران بەرپرسـی ئاسایشیشـم، هـەر كارێكـت هەبـوو دوودڵ مەبـە، عەزیـزم لـە خزمەتـدام». نەمزانـی ئاخـۆ دوا ڕسـتەی هەڕەشـەیە یاخـود پێشـنیارێكی دۆسـتانە، بـە هێمنـی سـەیرمكرد و گووتـم «جەنابـی بـارۆن وادەكـەم... دڵنیابـە وادەكـەم».

كـە گەڕامـەوە بـۆ سـاڵۆنەكە بـە جۆرێـك شـپرزە و سـەرتێكەڵ بـووم هیـچ شـتێكم بـە ڕوونـی نەدەبینـی، ڕوخسـارم وەهـا پـڕ پرسـیار و شـپرزەییم وەهـا سـالار بـوو، كاتێـك لـە بـەر ئاوێنـەی تەوالێتەكانـدا تەماشـای خۆمـم كـرد، لـە جۆنـی دیـپ دەچـووم لـە هەندێـك لـە دیمەنەكانـی فلیمـی «فـرۆم هێـڵ» لەگـەڵ «هیسـەر گـرام» دا، ئـەو فلیمـە خوێناوییـە كـە مـرۆڤ تووشـی خـەوی ناخـۆش و ترسـناك دەكات. سـەرم بـە جۆرێـك دەخولایـەوە نەمدەتوانـی كـەس ببینـم، نەمتوانـی جێگاكـەی خـۆم بدۆزمـەوە، لەسـەر كورسـییەكی خاڵـی دانیشـتم و لێگـەڕام دەنگـی ترسـناكی گۆرانیبێژەكـە ئازارمبـدات. وەك ئـەوەی كۆمەڵێـك چـاو سـەیرمبكەن و چاوەدێرمبـن، وەك ئـەوەی هەموویـان بـە نهێنـی مـن بزانـن ترسـێكی سـەیر دایگرتـم، دەمویسـت هەڵبێـم و نوێمیـران بـۆ خۆیـان و منداڵەكانیـان بەجێبهێڵـم. لـە نـاكاو بارۆنـی بوكەشوشـە هاتەبەردەمـم و بـە نیگایەكـی سـەیر و پـڕ مانـاوە سـەیریكردم و لێیپرسـیم « ماندوویـت، كوڕی خـۆم ماندوویـت؟»، بـە ئەسـپایی گووتـم «جەنابـی بـارۆن، مـن ئەمجـۆرە ئاهەنگانـەم زۆر نەبینیـوە، ڕانەهاتـووم شـەو تـا ئـەم كاتانـە گـوێ لـە مۆسـیقای وا بـەرز بگـرم. گـەر لوتـف بفەرمـوون و بـە یەكێكـدا تـا دەرەوەی نوێمیـران بمبـەن، لەوێـوە خـۆم ڕێـگا شـارەزام و دەگەڕێمـەوە، سوپاسـتاندەكەم، ئێـوە هـەردەم لووتفتـان هەیـە، هێنـد هەیـە كەمێـك خواردنـەوەی زۆر تووشـی سـەر ئێشـەی كـردوم... هەسـتدەكەم بـە جۆرێكـی بێمانـا گێـژ و ناجـۆر كەوتـووم». میـر سـەفین،

بەسەرسامییەوە گووتی «خواردنەوەی زۆر ؟... خواردنەوەی زۆر؟... بە دوو پەرداخ بیرە دەڵێیت خواردنەوەی زۆر؟». ئەوکات زانیم بە درێژایی ئاهەنگەکە چاوەدێریانکردوم. گەر چاوێکی وردەکار هەموو شتێکی منی بۆ بارۆنی بوکەشوشە نەگێڕاوەتەوە، بارۆن لە کوێ دەزانێت، من تەنیا دوو پەرداخ بیرەم فڕکردووە. ئەو شەوە کە گەیشتمە دەرەوەی نوێمیران وامدەزانی لە جەهەنەم هەڵهاتووم، حەزی بێسنوورم بۆ سەرکێشی و تەهلوکە لاواز و بێتین کەوتبوو، پێموابوو بارۆنەکان هەموو شتێکی نێو ڕۆحی من دەبینن و دەتوانن بمخوێننەوە. هەزار پرسیارم لە خۆم دەکرد، کە نەمدەتوانی وەڵامی هیچیان بدەمەوە. بۆ دەبێت بارۆنی خەیاڵ منی بانگکردبێت؟ بۆ باسی ماجەلانی لەگەڵدا کردم؟ بۆ ویستی من کۆمەکیبکەم دەریا خەیاڵییەکەی ناو دڵی خۆی ببڕێت؟ دەبێت ژنی بارۆنی مریشک کێ بێت؟ دەبێت هیچ شتێکی لای بارۆنی خەیاڵ و بارۆنی بوکەشوشە درکاندبێت؟.

تا ئەوکات هیچ شتێکم لای هاوڕێکانم نەدرکاندبوو، ئەمشەو هەستمکرد یارییەکە وردە وردە خەریکە ترسناک و ئاڵۆز دەبێت... بۆ ڕۆژی دوایی لە ماڵی غەزەلنوس کۆبووینەوە و بە شانازییەوە گووتم هاوڕێیان من بێئاگای ئێوە ماوەیەکە دەڕۆم بۆ ناو بارۆنەکان، ئیشێکی گرنگم لە نوێمیران دەستکەوتووە و تێکەڵ بە منداڵانی ئەو گەڕەکە بووم. وەها بە شانازییەوە قسەمکرد، خۆشم و ئەوانی دیش سەرسامبوون، پڕ فەخر و شکۆ خۆم دەرخست، شەرممکرد باسی ترسەکانی خۆم بکەم، وا خۆم نواند کە نییەتم وەهایە تا نهێنی کوشتنی موراد جەمیل نەدۆزمەوە لە نوێمیران نەیەمەدەرێ.

بەڵام لە ناخی دڵدا، لە تاریکایی دەروندا، حەزمدەکرد هەڵبێم و بڕۆم بۆ جێگایەکی تر.

## بینینی بارۆنی کولەکە
## «ماجەلانی ڕاستەقینە ـ هاوینی ٢٠٠٤»

ناتوانم لێرە ماتۆڕ لێبخوڕم... مرۆڤ بۆ ئەوەی ماتۆڕ لێخوڕێت، پێویستی بە شەقامە، شەقامی ڕاستەقینە. جیاوازی نێوان شەقامی ئاسایی و ڕاستەقینە ئەوەیە، شەقامی ڕاستەقینە ئەو هەستەت پێدەبەخشێ لە ئاسمانیت، ئازادیت، سنوورێک ناتگرێت، ڕێگایەک هەیە دەیگریت و وەک شێت دەڕۆیت و بەربەستێک ناتوەستێنێت. ئەو هەستەت هەیە کە تا ئەوسەری گەردون لە بەردەمتدا کراوەتەوە و تۆ دەتوانیت پیابفڕیت. ئاه ئەی شەقامە بێکۆتا و گەورەکان، ئۆتۆسترادە بێکۆتاییەکان، خێراڕێ دوورودرێژەکان... ئێوە منتان لە خۆرئاوا گیرکرد، بیست وچوار ساڵە ئەو هەستەم هەیە کە دەفرم، ئاوڕ لە هیچ نادەمەوە، بێباک لێدەخوڕم و تەواو، ئەزیزان لێخوڕینی ماتووڕ لە گوێگرتن لە مۆسیقا دەچێت، هەمان ڕیتمی بێسرەوت، هەمان شنەبای بەرەو ڕوو، هەمان بەرزی و نزمی و لاربوونەوە، زۆرجار هەمان کەوتن و پەڕین و مردنیش. بەڵام ئەم شارە بەدبەختە، بە شەقامە تەسکەکانییەوە، بەو هەزارەها ئوتومبیل و ماشێنە کۆنەوە کە ڕێگاکانیان گرتووە، دەتگرێت و ناهێڵێت بڕۆیت. ڕاستیتان دەوێت هەموو شارەکانی دونیا ناشیرینن، بەڵام هەندێک شار هەیە ڕاتناگرن و دەتوانێت خێرا پیا تێپەڕیت و بڕۆیت، هەندێک شاریش ڕیتمی ڕۆیشتن لە نێویدا بە جۆرێک خاو و پڕگرێیە، هەردەم دەبێت بوەستیت و تەماشابکەیت، لە کاتێکدا من ژیانی خۆم وا بەرنامەکردبوو، نەوەستم و تەماشانەکەم. وەلێ ئادەمیان بەدبەخت و بێدەربازن، دواجار هەر مرۆڤە و شتێک هەیە ڕایدەگرێت و دەیوەستێنێت. لەشی ئەفسانە بۆ من ئەو قولاپە نهێنییە بوو کە لە ئاوی خۆم دەریهێنام و بەرەو

دەریایەکی دیکەی بردم، ئێستا شەو و ڕۆژ بیر لە لەشی ژنی خائینی خاوەن ئوتێلەکە دەکەمەوە. هەستدەکەم ونبوونی باران و لەشی ئەفسانە، منیان بەم شارەوە گرێدا. دوو ئافرەت کە یەکێکیانم نەبینیوە، نازانم لە چی دەچێت، نادیار و نەگیراوە، ئافرەتێکیش بێشەرم هەموو لەشی خۆیم دەداتێ و بێسنوور لەگەڵمدا دەکرێتەوە. ئەم دووانە بەجۆرێک سەریان لەمن شێواند، بۆ هەتاهەتایە منیان بەم زەوییەوە گرێدا. هیچ شتێک وەک ئافرەت پیاو بە شوێنەوە نابەستێتەوە، نەفرەتی ئافرەت و نەفرەتی شوێن یەک شتن. گەر ژن نەبێت، پیاوان جەستەیەکی گەڕۆکن کە لە هیچ جێگایەک سرەوت ناگرن.

ئەو ڕووتییە نەرم و نیانەی ئەفسانە، ئەو کەمە زبرییە سیحراوییەی سەر پێستی، ئەو دابەشبوونە ناهاوییەکەی ساردی و گەرمی لە جەستەیدا، منیان دێوانەکرد. تەماشاکردنێکی چاوە خەواڵووەکانی هەموو ڕوناکی و تاریکییەکانی ناخمیان تێکدا، بیستنی وشەیەک لەو دەنگە نوساوەی هێمنی و سەقامگیری منی شێواند. لەگەڵ هەر ئافرەتێکدا خەوتبێتم هەستم نەکردوە وەها تاریک یان بەو جۆرە دەدرەوشێمەوە، هەستم نەکردوە لەشی ئەوان شوێنی وەها دوور و نەبینراو لە ڕۆحمدا ڕۆشندەکاتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەفسانەدا تیشکی ناو ژیانم دەجوڵا، زۆر جێگای ڕوناک لە ڕۆحمدا وەک شەوەزەنگ دەردەکەوت و جێگای نوێ و هەرێمی تازە ڕوناکدەبوونەوە. کاتێک پێکەوە دەخەوتین هەستمدەکرد، ڕەشەبای ئەم شارە لە جەستەمدا لەدایکدەبێتەوە، بۆنی کوچەکان لە خەو هەڵدەستن، مەخلوقاتی نوێ دەڕوێن، باڵندەی تازە دەبینم، ئەستێرەی گەورە بە ناو سەرمدا تێدەپەڕن، نەیزەک بەر جەستەم دەکەوێت، هەوا جۆرە دەستێکی دیکەی هەیە، ڕەشەبا ڕزگارمدەکات، شەپۆل لە نزیکمەوە دەدوێت و گوڵ لە دڵمدا دەیکات بە تۆفان. نا وامەزانن ئەوانە هەستی شاعیرانەی پیاوێکی دوورە شیعرە کە دواجار بە شیعر وەسفی هەستێک

دەکات کە بە وشەی ئاسایی ناکرێت، ئەوانە ڕاستیبوون، من تیادەژیام و دەمبینی... ناتوانم پەیوەندی خۆم و ئەفسانە بە خۆشەویستی ناوببەم، من و ئەو یەک وشە باسی خۆشەویستیمان نەکرد. لەشی ئەو شوێنی لەدایکبوونەوەی هەستەکانی من بوو، خۆشەویستی نەبوو، بەڵکو دۆزینەوەی کیشوەرێکی تر بوو، وەک ئەوەی لەوپەڕی خێراییدا لە ناکاو هەستبکەیت خۆت و ماتۆڕەکەت لە ئاسمانن، هەستبکەیت فڕیویت و لەسەر دەریاچەیەک، مێرگێک، شارێکی ئەفسوناوی وەستاویت، هەستبکەیت لە ناکاو لەسەر ماتۆڕەکەت بوویت بە مەخلوقێکی تر، جۆرە دەستێکی تر و چاوێکی تر و بۆنێکی ترت هەیە... ئەفسانە عەشق نەبوو... پیاوێکی وەک من کە بەسەر لەشی سەدان ئافرەتدا تێپەڕیووم ناتوانم قسە لە خۆشەویستی بکەم، دەتوانم تەنیا قسە لە شەیدابوون و دۆزینەوە و سەرسامیبکەم. من زۆر شار و دورگە و ڕۆخی سیحراوی دونیام بینیوە، بەڵام هیچیان ئەو سروشتە مێخەکبۆ و بوغردئاسایەی لەشی ئەو ژنە خائینەیان نەبوو. شەوێکیان لەگەڵیدا خەوتبووم، هەستمکرد بۆنی باغ دەکەم، بۆنی زەوییەک دەکەم دیواری تێدا نییە، مرۆڤ هەر دەڕوات و دەڕوات و ناگاتە کۆتایی. هەستمکرد لەشی ئەم ژنە خائینە تاکە کوچەی ڕاستەقینەی ئەم شارەیە. ئەفسانە لای من تەنیا ژنێک نەبوو کە دەکرا عاشقی بم، بەڵکو ڕۆحی ئەم شوێنە بوو، ئەو هەناسەیە بوو کە لە گوڵی مردووی ناو باغەکانی ئەم شارەدا دەمبینی، ئەو باڵەبوو کە باڵندە غەمگینەکانی سەر ئوتێلەکە پێیدەفڕین. هەرکات لەگەڵیدا دەخەوتم لەگەڵ زوڵومات و نهێنی و ئارەزووە تاریک و کوژراوەکانی ئەم جێگایەدا دەخەوتم، لەشی ئەو، هەموو ئەو باغ و بۆن و مەلمەسەی هەڵگرتبوو کە سەدان ساڵ بوو لێرەدا نێژرابوون. کە لەگەڵیدا دەخەوتم دەمزانی ئاوات و ئارەزووی هەزاران پیاو دەهێنمەدی کە ساڵەهای ساڵ هاتبوون و بەم ئوتێلەدا تێپەڕیبوون و ئەفسانەیان بینیبوو، ئەویش

کە لەگەڵمدا دەخەوت وەک ئەوەبوو لەگەڵ تینوێتی هەموو پیاوانی دونیادا بۆ سۆز و ماچ و جەستە بخەوێت. دڵنیابووم ئەفسانە دەزانێت، من کاتێک بە کوچە و شەقامە نارێکەکانی ئەم شارەدا دەگەڕێم، بە خەیاڵی خۆم وادەزانم ئەم شارەم بینیوە. ئەو دەیویست بەو سیحر و ئەفسونەی لەشی خۆی پێمبڵێت، کوچەی هەرە ڕاستەقینەی ئەم شارە، ئەم ئارەزووە خنکاوانەی لەشی منە. جیاوازی نێوان لەشی ئەفسانە و لەشی ئافرەتەکانی دیکەی دونیا ئەوەبوو کە تامی لەشی ئەو تامی دۆزینەوەی باغێکی نهێنی هەبوو... لەشی ئەفسانە باغێکی گەورە بوو، بەڵام تا دەتکردەوە پتر بۆنی ئەفسوناویت دەدۆزییەوە. هەر باغێک لەمێژبێت داخرابێت، کە دەیکەیتەوە دەبینیت بووە بە شوێنی گوڵ و میوەی نەبینراو.

ئێوارەیەکیان کۆمەڵێک ڕۆژنامەی زۆرم کڕی و گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم، ئەو ماوەیە هەموو ڕۆژنامە بێماناکانی ئەو وڵاتەم دەخوێندەوە. هیچ شتێک بەئەندازەی خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەکی خراپ، بۆ تێگەیشتن لە هەرەسی ڕۆحی شارێک باشتر نییە. مرۆڤ تا ڕۆژنامەکان نەخوێنێتەوە نازانێت چۆن نەفامی و گەمژەیی لەم شارەدا بڵاوبوونەتەوە، من لەوانە نیم کە لەزەت لە خوێندنەوەی گەمژەیی دەبینن، بەڵام لە هاوینی گەرمی ئەو شارەدا نەمدەزانی چیبکەم، بە دەگمەن ئەفسانەم دەبینی، کە یەکدیشمان دەبینی هەردووکمان بێدەنگبووین و هیچی ئەوتۆمان نەدەگووت. من شەو و ڕۆژ چاوەڕوانی دەرکەوتنەوەی مورتەزای شەیتانم دەکرد، لە دووڕیانێکی سەیردا دەژیام، سیحری ئەفسانە و ئەو لەزەتە خەیاڵیانەی لەگەڵ ئەودا دەمبینی لەوە گەورەتر بوون بتوانم ئاسان جێیانبهێڵم و بڕۆم، بەڵام نەشمدەتوانی پێشنیاری ئەوەی بۆ بکەم لەگەڵمدا هەڵبێت و پێکەوە بچین بۆ وڵاتێکی تر. هەستمدەکرد ئەو سیحرەی من بە ئەفسانەوە گرێدەدات، تەنیا لەم شارەدا کاردەکات و

مانای هەیە. بۆنی قووڵایی ئەم شارە لە لەشی ئەو ژنە دەهات، بۆنی ئەو خەیاڵە خەوتووانەی دەیانەوێت لە خەوهەستن لە مەمک و ناوک و ڕانە ئەسمەرەكانی دەهات. گەر من لە شوێنێکی دیکەی دونیادا لەگەڵ ئەفسانەدا بخەوتبامایە، لەوانەبوو ئەو لەزەت و ئەفسونەم لێنەدیبایە. وەک چۆن سیحری زیندانییەک زۆرجار بە زیندانەكەیەوە گرێدراوە، سیحری ئەفسانەش بەم شارەوە گرێدرابوو. کە بۆنی لەشی ئەوم دەکرد، بۆنی باغە خەوتووەكانی ئەو شارەم دەکرد.

دواجار ئێوارەیەک مورتەزای شەیتان بە خۆی و قاتێکی خۆڵەمێشییەوە دەرکەوت، پڕبوو لە خەندەی ناشیرین، پێیگووتم «ئێستا دەتوانم بتبەم بۆ لای بارۆنی کولەکە». بێئەوەی بیربکەمەوە، خۆشحاڵ و پڕ لە چاوەڕوانی دوایکەوتم. بە دەم گۆرانی گووتنەوە پێشمکەوت، وەک یەکێک لەسەر پەتێکی باریکی سێرک بڕوات لەنجەولاری دەکرد، هەندێجار ئاوڕێ لێدەدامەوە و بە دەنگێکی بەرز پێدەکەنی. ماوەیەکی درێژ بە ناو بازاڕ و کوچە و کۆڵانێکی زۆردا منی کێشکرد، هەمیشە لەبەرخۆیەوە گۆرانی دەگووت، فیکەی لێدەدا، خۆی بەختەوەر نیشاندەدا. بەڵام لەگەڵ ئەو بەزم و نواندنەشدا بەراورد بەو بەیانییەی کە خۆی کرد بە ژوورەكەمدا کەمدووتر و ئاڵۆزتر دەهاتە بەرچاوم. هەستمکرد بۆیە گۆرانی دەڵێت تا زمانی خۆی بگرێت و شتێک نەدرکێنێت. لەگەڵ هەموو ئەو ڕوخسارە پڕ بزەیەیدا سەرقاڵ و خەیاڵپڕ دیاربوو، ئاشکرا لە کاتی گۆرانی گووتندا بیری لە شتی تر دەکردەوە، مرۆڤ کەمجار دەتوانێت لە کاتی گۆرانی گووتندا بیر لە شتی دی بکاتەوە، بەڵام دڵنیابووم، مورتەزا دڵپەشێو و نائاسوودەیە و بیردەکاتەوە. دوای سەعاتێک ڕۆیشتن، منی برد بۆ جێگایەک، پێدەچوو گەنجینەیەکی کۆن بێت و لە مێژبێت کەس ڕووی تێنەکردبێت. خانوویەکی کۆنی گڵ کە وەها بەد داکەوتبوو، پێدەچوو بەرگەی بارانی ئەم زستانە نەگرێت. بەنێوان گەلێک ژووری داڕوخاودا

ڕۆیشتین. ڕاڕەوێکی درێژمان تەیکرد و لە پشتەوەڕا حەوشەیەکمان بینی کە دوو ژووری سادەی چیمەنتۆی لەسەربوو. لە یەکێک لەو دوو ژوورەدا بارۆنی کولەکە چاوەڕوانی منی دەکرد. گەنجێکی سپیکەلەی سمێلڕەش بوو، جووتێک چاوی بچکۆلە و لووتێکی بچکۆلانەتر و دوو گوپی ئەستوور ڕوخساری مەغۆلییەکی غەمگینیان پێبەخشیبوو، دوو دەستی زۆر گەورەشی هەبوو، لە ژیانمدا ئادەمیزادێکم نەبینیبوو چەپۆکانی وا گەورەبێت، بە قامەتێکی درێژ و قژێکی خاو و کورتەوە لە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. پیاوێک بوو هیچی لەو وێنەیە نەدەچوو کە مورتەزای شەیتان بۆ منی نیگارکردبوو، بارانیش لە هەموو نامەکانیدا باسی ئەوەی نەکردبوو چۆن شووی بەم پیاوە کردوە. لە زۆبەی نامەکاندا بە پیاوەکەم یان «شووە بەدبەختەکەم» ناوی دەهێنا... پێشتر چەندین نیگار و وێنەم لە خەیاڵی خۆمدا بۆ کێشابوو، بەڵام هیچیان دروست نەبوون و وەک ئەو دەرنەچوون. کە چوومە ژوورێ، زەرفی نامەکانی باران لەسەر مێزەکە دانرابوو. تەوقەیەکی لەگەڵدا کردم و جێگایەکی نیشاندام، پەرداخێک و بوتڵێکی ئاوی مەعدەنی خستە بەردەستم. گووتی «کەواتە تۆ خاڵی بارانیت؟». بێئەوەی هیچ بڵێم خۆی بە من ناساند و گووتی «خۆزیا لە شوێن و کاتێکی تردا یەکترمان بناسیایە». ویقارێکی دەستکرد لە دەنگیدا بوو. مورتەزای شەیتان ویستی هەستێت و بڕوات، بارۆن داینا و گووتی «مورتەزای ئازیز، بۆ کوێ؟ خۆت دەزانێت بێ تۆ من هیچم بۆ ناکرێت». بە کەمێک غەمەوە گووتی « گەر باران لێرەبایە، بە بینینی تۆ خۆشحاڵ دەبوو». من بە ساردییەکەوە گووتم «جەنابی بارۆن، من هاتووم تا بزانم باران لە کوێیە؟ لەوسەری دونیاوە گەڕاومەتەوە تا بزانم باران لە کوێیە؟ وابزانم تۆ لە هەر کەس زیاتر دەتوانیت یارمەتیم بدەیت». ئەو دەست پێکردنە ساردەی من، کەمێک بارۆنی ترساند و بە گومانەوە سەیری دەوروبەری خۆی کرد و گووتی «من؟ من ناتوانم

یارمەتیت بدەم... منیش نازانم باران لە کوێیە؟ ها، جەنابی زوهدی شازەمان، لێگەڕێ، ئەوە لکەیەکی ڕەشی گەورەیە بە ئابڕوومەوە، لێگەڕێ، من نازانم چی بکەم و چی بە خەڵک بڵێم... هێندەم خەیاڵ هەبووە گووتوومە ژنەکەم بۆ خوێندن سەفەری ئەڵمانیای کردوە... ئەوەندەم خەیاڵ هەبووە». دڵنیابووم درۆدەکات، شتێک لە دەنگ و دەست و نیگایدا بوو پێیدەگووتم بارۆنی کولەکە درۆدەکات. بە هێمنییەوە پاڵمدایەوە و گووتم «باران ژنی تۆ بوو، دەبێت بزانیت چی لێهات... دەبێت بزانیت». بارۆن بە پەشۆکانەوە گووتی «شەوێکیان گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو باران نەمابوو... هەموو ئەم شارەم بەدوادا تەیکرد و نەمدۆزییەوە، هەڵبەت دەبێت لەگەڵ ئەو کوڕە نامەردەدا ڕایکردبێت، دەبێت وایکردبێت، دەبێت حورمەت و ڕێز و شەرەفی منی خستبێتە ژێر پێیەوە، دەبێت خۆشەویستی منی بۆ هەتیوێکی دەستبڕ فرۆشتبێت کە پێش باران نیوەی ژن و کچی ئەم شارەی لە خشتەبردبوو... تۆ بە من بڵێ، خاڵی ئازیز تۆ بە من بڵێ، چۆن دەتوانم بیدۆزمەوە». من بە ساردییەوە سەیرمکرد و گووتم «جەنابی بارۆن تۆ بارانت کوشتووە یان نا؟». لەو کاتەدا مورتەزای شەیتان خۆی هاویشتە ناو حیکایەتەکەوە و گووتی «شازەمانی عەزیز... شازەمانی برام، تۆ چۆن وادەڵێیت، بارۆن و کوشتن... بارۆن فریشتەیە، کوشتن؟ خودای گەورە، کوشتن؟ تۆ چۆن بیر لە شتی وادەکەیتەوە... کێ دەڵێت باران خان کوژراوە؟ ها کێ دەڵێت باران خان کوژراوە؟ چۆن خەیاڵتان بۆ شتی وادەچێت؟».
هەستمدەکرد هەردووکیان نمایشێکی گەورەم لەگەڵدا سازدەکەن. بێئەوەی بترسم گووتم «سەیرکە جەنابی بارۆن، گەر باران هەڵبهاتایە، گەر بیویستایە خۆی بکوژێت، گەر سەفەری دەرەوەی وڵاتی بکردبایە، منی ئاگادار دەکردەوە. باران یان لە جێگایەکدایە کە دەستی بە کەس ناگات، یاخود نەماوە، یەکێک کوشتوویەتی و کردوێتی بە ژێر گڵەوە.

خۆت ئەم ڕۆژانە ڕۆژنامەکان دەخوێنیتەوە، دەزانیت ئەمجۆرە حیکایەتانە چەند زۆرن... تێدەگەیت لەم دوو ڕێگایە زیاتر ڕێگای تر نییە». بارۆن گووتی «ئەگەرێکی تریش هەیە، ئەویش خوشکەزاکەی ئێوە لە جێگایەکی ئەم دونیایەدا، لەگەڵ دەنکە تازەکەیدا بە جۆرێک نوقمی خۆشی و کەیف بووە، ئێمەی بیرچۆتەوە... ئەو ئەگەرەش هەیە». بە توڕەییەوە گووتم «دڵنیام وانییە، دڵنیام... لەوانەیە حەزی لە یەکێکی دی بووبێت، بەڵام ئەو وێنەیەی تۆ لەسەر باران دەیکێشیت ڕاست نییە». مەبەستم بوو بارۆن توڕەبکەم، بەڵام مورتەزای شەیتان وەک هەمیشە لەو ساتانەدا خۆی دەخستە ناو قسەکان و نەیدەهێشت بارۆن لە ڕاستەڕێ دەرچێت. مورتەزا گووتی «شازەمانی عەزیز... هیهی. هۆ و شازەمانی عەزیز، هیهیهی تۆ لە دەرەوە بوویت، خودا شاهیدە کە تۆ هێشتا لەم شارە حاڵی نەبوویت. هێندە دڵپاک و خۆشنیازیت کەس ناناسیت، تۆ دڵێکی واسافت هەیە بە زەحمەت لە خەڵکی ئەم دونیا تازەیە تێدەگەیت. قەسەم بە هەر هەورێکی پاک کە ئێستا بەسەر ئەم شارەدا دەڕوات، تۆ لە دونیایەکی تردا ژیاویت و هیچ لەم شارە تێناگەیت، خانمی باران... ئاە، خانمی باران. تۆ نازانیت بارۆن چەند ئەو ژنەی خۆشدەویست، نازانیت چۆن لە هەوا دەیپاراست و چۆن ئیرەیی بە نەسیم دەبرد گەر بەریبکەوتبایە، ئوە خوای عالەم، تۆ خەیاڵت بۆ شتی زۆر خراپ دەڕوات. نازانیت کە مەحەبەتی بارۆن بۆ خانمی باران بە ئەندازەیەک بوو، بیریدەکردەوە بە کێشی خۆی ئاڵتونی بۆ بکڕێت و بیکات بە دیاری بۆی. من ئێستاش تێناگەم ئەوە چ سادە و ساکارییەک بوو، چ بەدبەختییەک بوو ژنێکی سەنگین و سەلاری وەک ئەو دوای فریوی دەمڕووتێکی وا بێنەزاکەت کەوت کە جگە لە دەموچاوێکی جوان و زمانێکی لووس زیاتر ساحێبی هیچی دی نەبوو... ژن هەندێجار مایەی بەدبەختین، بۆ خۆیان و بۆ پیاوە بێچارەکانیان. ئێستاش ناچێتە

مێشکمەوە مرۆڤ چۆن دەتوانێت بارۆن بە منداڵێکی وەها بێنەزاکەت و کەم ویقار بەراوردبکات. تۆ بارۆن ناناسیت، بارۆن ناناسیت». من پرسیم «گەر وایە، گەر ئێوە ئەو کوڕە دەناسن کە باران پەیوەندی لەگەڵدا هەبووە، لە ئەو چ باسە، ها دۆستان لە ئەو چ خەبەرە؟». بارۆنی کولەکە سوور هەڵگەڕا و گووتی «ئەویش سەروشوێنی نییە، من ماوەیەکی درێژ سەرقاڵی سۆراغکردنی بووم و هیچم دەستنەکەوت... هیچ». بە ئارەزووییەکی گەورەوە پرسیم «دەتوانم بزانم ناوی چییە... دەتوانن پێم بڵێن ناوی چییە؟ تا منیش بکەومە سۆراغی... من نازانم ناوی چییە... نازانم؟». بارۆن بە پەشۆکانەوە گووتی « چ سوودێکی هەیە ناوی بزانیت... چ سوودێکی هەیە... ماوەیەکی درێژە من و ئاسایش و خێزانەکەشی بە دوایدا دەگەڕێین و هەواڵمان لێی نییە، کەسێکی بێسەروشوێنە... لەو شەوەوە کە باران ونبووە، ئەویش بێسۆراغە و دیارنییە... حیکایەتەکە ڕوون و ئاشکرایە، هەردووکیان پێکەوە هەڵهاتوون... پێکەوە ڕوویان لە شارێک، لە وڵاتێکی تر کردوە... ». بە سەبرەوە گووتم «بەڵام جەنابی بارۆن، گەر ناوی ئەو کوڕە بزانم، لەوانەیە بتوانم بیدۆزمەوە، لەوانەیە». دوای کەمێک گومان و دوودڵی گووتی «ناوی موراد جەمیلە... تێدەگەیت، ناوی موراد جەمیلە». هێند بە ڕقەوە ناوی ئەو کوڕەی هێنا، من کەوتمە گومانەوە، خەریکبوو زیاتر قسەبکات، مورتەزای شەیتان پەڕییەوە نێوانمان و گووتی « قەسەم بە خودا، قەسەم بە هەوای پاک، قەسەم بە گوڵی خەوتوو، یەکێک بوو لەو گەنجە سەرکەشانەی کە کێشەی گەورەی لەم شارەدا دروستکرد، یاری بە ناوبانگ و شەرەفی زۆر خێزانی نەجیبزادە و ڕەسەن کرد. یەکێک بوو لەو مەلعونانەی کە خودا بەهرەیەکی ڕەشی پێبەخشیبوو، تێناگەم و نازانم و تەفسیرم بۆی نییە، گەر بڵێم ئافاتێک بوو، دواجار بارانی برد و ڕۆیشت. وەک دەستێکی شەیتانی، ئای خوایە گیان وەک

دەستێکی شەیتانی پیس و نمەک نەناس کە دێت و لە ماڵەکەتدا شتێکی بە نرخ دەبات... ». من بە گومانەوە سەیری هەردووکیانم کرد و گووتم « لەوانەشە یەکێک باران شوکور و موراد جەمیلی پێکەوە کوشتبێت، لەوانەیە... ئەوەش ئەگەرێکە لە ئەگەرەکان». مورتەزا گووتی «تکایە... تکایە بەڕێز شازەمان، تکایە لە بەردەم بارۆندا قسەی وامەکە، تۆ هیچ شتێک دەربارەی دڵی ئەم پیاوە نازانیت، ئای خوایە، ئای خودایە، قەسەم بە دەنگی بولبولی بەربەیان، قەسەم بە ترپەی دڵی کوکوختی و کۆتر، سیولالا... عەزیزم... سیولالا... تۆ هیچ لە مەحەبەتی ئەم پیاوە تێناگەیت، بمبورە، بەڵام گەر مردن شتێکی هەقیش بێت، ئەو بۆ باران مردن بە هەق نازانێت». بە سەرسەختییەکی گەورەوە قسەکانم بە مورتەزا بڕی و پەنجەم بەرزکردەوە و گووتم «جەنابی بارۆن، من دەست لە خوشکەزاکەم هەڵناگرم، لەوسەری دونیاوە هاتوومەتەوە تا تێبگەم». نەمدەزانی دەتوانم چیبکەم، بەڵام نائومێدییەکی قووڵم لە چاوی بارۆندا بینی، هەستمکرد بارۆن منی بۆ ئێرە بانگکردوە تا گەمەیەکم لەگەڵدا بکات، بەڵام بە هۆی نەزانی و نەبوونی کارامەییەوە، بە هۆی ڕقێکی نهێنییەوە، نەیدەتوانی گەمەکە تا کۆتایی ڕاکێشێت. وەک گەنجێکی ترساو هاتە بەرچاوم کە دەیویست من لە شتێکی ترسناکدا بێلایەنبکات. نەمدەزانی شوێنی مورتەزای شەیتان لەو گەمەیەدا چییە، بەڵام زۆر لە چاوە بچکۆلەکانی بارۆن ترسام.

ئەو شەوە کە گەڕامەوە بۆ ئوتێلەکە هەستمکرد تارماییەکی چکۆلانە و ڕەش بەدوامەوەیە. نەمدەزانی بارۆن دەتوانێت چی بکات، بڕیارمدا بکەومە گەڕان بە دوای موراد جەمیلدا، بەڵام بەر لەوەی دەست بە گەڕانبکەم، ئەو ڕوداوە ڕوویدا کە بۆ ماوەیەک منی لەو شارە دوورخستەوە.

# یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

گرنگ ئەوەیە کەس نەتناسێت، بە جۆرێک خۆت بگۆڕیت کەس نەزانێت تۆ چ جۆرە خەیاڵێکت لەسەردایە، گەڕان بەم شارەدا ئاسان نییە، گەرچی ئەمشارە شوێنێکی یەک نەتەوە و یەک دینە، بە دەگمەن خەڵکی غەریب و نەناس ڕووی تێدەکەن، لە ڕووی ڕێژەی تاوان و دزی و خراپەوە شارێکی ئاسایی و بێترسە، کەچی بۆ هەر جێگایەک دەچیت، کۆمەڵێک چاو بە گومانەوە سەیرتدەکەن. واهەستدەکەم خەڵکی ئەم شارە پێکڕا دەرهەق بەیەک خۆیان بە نامۆ دەزانن، بە دەگمەن مرۆڤێک دەبینیت متمانەی تەواو ببەخشێتە ئەوانی دی. لەو ڕۆژانەدا کە خۆم دەگۆڕی و وەک نەناسێک بە شاردا دەگەڕام، ترسێکی تاریک لە دڵمدا بوو کە لە سوچێک لە سوچەکاندا یەکێک ئامبازی سەرم دەبێت و بە خەنجەرێکی ژەهراوی دەمکوژێت. خەیاڵی ئەوەی من بە خەنجەرێکی ژەهراوی دەمرم، خولیایەکی بێمانای منداڵی منە، ئێستاش تێناگەم، بۆ واهەستدەکەم وەک خەلیفە عومەر بە خەنجەرێکی ژەهراوی دەکوژرێم. ڕەنگە ئەوە کاریگەری خراپی وانەکانی دین و مێژوو بێت کە ئەو وێنە ترسناکانەیان لەسەری مندا سەوزکردوە. گەرچی دوای گەورەبوونم بوومە پیاوێکی سکولار و تا پلەیەکی باڵا لە یەکێ لە حیزبە عەلمانییەکاندا بەرزبوومەوە، بەڵام لێتان ناشارمەوە کە خەیاڵم هەردەم پڕبووە لە خولیا و ترسی دینی. ئەوەی بەپلەی یەکەم پاڵی پێوەنام ببمە سکولار، بڕوایەکی فەلسەفی قووڵ نەبوو، بەڵکو ترس بوو لە دەنگی مەلاکان، لە دۆعای بەربەیان و هاواری تەراویح و بانگ و سەڵای بەیانیانی جەژن. باوکم پیاوێکی

دینداربوو کە ئومێدیدەکرد ببمە یەکێک لە سەرکردەکانی ئیسلام، هەڵبەت گەر بمایەو منی لە ئامێزی ئەو هەموو پیاوە قات لەبەر و ئەفەندییەسکولارەدا بدیبایەتەوە، گەلەک خەفەتبار و غەمگین دەبوو. من لە مێژە دەمویست باوکم لە بیربکەم، زۆرجار واهەستدەکەم گەر خۆم نەدەمە دەست ئەو پرۆژە خەیاڵیانەی ناو سەرم، ناتوانم ئەو نیگا غەمگینەی ئەو فەرامۆشبکەم، کە لە ودیو قەبرەوە تێمدەگرێت. دڵنیام « خوای غەریقی ڕەحمەت بێت و گۆڕی پڕ لە نور بێت » ئێستاش دەشێت ئومێدی ئەوەبێت چاک ببمەوە و ڕوو لە ئیمان بکەمەوە و ببم بە ڕابەرێکی دینی ناسراو. ئەو ترسەی کە لە تاریکیدا یەکێک بە خەنجەر دەمکوژێت، بەشێکی درێژکراوەی ئەو ترسەی ناو ڕۆحم بوو بەرابەر باوکم. هەندێک شەو دوورونزیک هەندێک پاسەوانی تایبەتیم دوای خۆم دەخست، بە جۆرێک بتوانن بمپارێزن و سەریشم لێنەشێوێنن. گەلەک چاوم لە هەموو کوچەیەکدا بلاوکردەوە و زۆر گوێی تایبەتیم هەڵهەسارد هەواڵم بۆ بهێنن، بەڕێوەبەری ئاسایش و فەرماندەی گشتی پۆلیس و لێپرسراوانی هەواڵگر لە حیزبدا هاوڕێمبوون و ئامادەبوون بۆ هەموو کۆمەکێک. هەریەکەیان تەمانایاندەکرد من کارێکیان پێبسپێرم، هەموو دەیانزانی من چەند لە سەرۆک نزیکم و چەند دڵی منی دەوێت، بەڵام بە دەگمەن دەیانزانی من بۆ چ جۆرە هەواڵێک عەودالم. ئەو دونیایەی من بۆی دەگەڕام و ئەو زەوییەی من بۆ دۆزینەوەی وێڵبووم زۆر لە دورگە دوور و عاسییەکانی ناو ئۆقیانوس تاریکتر و ترسناکتر بوو. دواجار لە ڕێگای گەنجێکی تۆسیرام خۆرەوە، لەوانەی بۆ پەیداکردنی پارەی شوشەیەک دەرمان هەموو شتێک دەفرۆشن، چیرۆکی ئەو عاشقە ئەبەدییانەم بیست کە کۆدەبنەوە و لەسەر چەند بەیتێکی ئەفسوناوی هەندێ سروتی عاجباتی عەشق و سەمای

دەرویشانە بەڕێوەدەبەن. ئەو دێڕە پەراکەندە و سەیرانە بەجۆرێک کاریگەر و دڵهەژێنبوون منیان خستە سەر خولیای گەڕانێکی دوورودرێژ بۆ غەزەلی تر. هەستدەکەم ئەو غەزەلانە لە سەرەتاوە هێزێکی ڕاکێشانی گەورەیان هەبووبێت کە هەموو کەسێکیان خستبێتە سەر خولیای بیستنی هەرچی زۆرتر و زۆتری غەزەلە. سیحری خەیاڵ ئادەمییەک دروستدەکات، هەرگیز ماندوونابێت لەوەی بیبیرکردنەوە تا کۆتایی بڕوات، بەوەدا خەیاڵ کۆتایی نییە، ئیدی ڕۆحێکی تێرنەخۆر دروستدەکات کە سنوور و مەودا ناناسێت، من لەگەڵ بیستنی ئەو چەند بەیتە پەراکەندانەی غەزەلدا کەوتمە سەرشەوقی ئەوەی غەزەلی زیاترم هەبێت. پێشتر ناوی غەزەلنوسم بیستبوو، بەڵام نەمدەزانی کەسێکی چ کارەیە. پیاوانی دەوڵەت و سیاسەتمەدارانی ئێمە هەرگیز تێنەگەیشتوون ڕۆڵی قەسیدەبازێک، ئەدەبنوسێک دەشێت چ گەورەبێت. سەرەتا خۆم لە هەر ڕووبەڕووبوونەوەیەک لەگەڵ ئەو پیاوەدا پاراست، هەڵەیە کە نیازێکی نهێنیت هەبوو، زوو ڕوخساری خۆت دەرخەیت. باشترە دوور بە دوور زەوی بکێڵیت و مەرام خۆشبکەیت و خۆت دەرنەخەیت. من لە دوای هەڵهاتنی تریفە یابەحرییەوە ئامۆژگارییەکی قووڵی ئەو عەتارە مەکربازەم گرتە گوێ، کە پێیگووتم، دەبایە لە بری کارخانەی مافوورەکە، سەید قادری نیامان بکڕیبایە. من ئێستا فێربووم، بەر لەوەی کاڵاکان بکڕم، گەر بۆمکرا یەکێک لە نزیک کاڵاکانەوە دەکڕم. لە گەشتی سەرەتایی و سەیرمدا بەدوای غەزەلەکاندا نهێنی عاجباتیم دۆزییەوە. بۆ یەکەمجار دوو مەخلوقی سەیر کە ناویان بەمۆ و مەمۆ بوو دەرکەوتن و پێیان ڕاگەیاندم کە کۆمەڵێک غەزەلیان هەیە لای هیچ ئادەمیزادێکی تر وا بە کاملی دەستناکەون. ئەوان حیکایەتی دەرکەوتنی غەزەلنوس و شەوە سەیرەکانی یانەی فەرمانبەرانیان

گێڕایەوە. پێیانگووتم کە ئەوان لەو شەوانەوە تێکستی تەواوی ئەو غەزەلانەیان لەبەرە کە بەیازەکانی غەزەلنوس و ناو سەری ئەوانی لێدەرچێت نوسخەیان لە هیچ جێگایەکی دونیادا نییە، نرخێکی گەورەیان لە سەر غەزەلەکان دانا و پارەی خۆیان وەرگرت و کۆپییەکی ئەو شیعرانەیان بۆ جێهێشتم، هەر ئەوانیش لە بوونی ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان ئاگاداریانکردمەوە. پێشتر دەمزانی ڕۆحلەبەری خەیاڵی هەن کە دوور لە یەک و بێئاگا لەیەک و پەرتەوازە دەژین. بەڵام وەک نهێنییەکی ترسناکم بۆ ئاشکرابکەن، وەک بیانەوێت غەزەلنوس تووشی تەلوکەیەکی گەورەبکەن، پێیانگووتم «غەزەلنوس، خولیای ترسناکی هەیە، خولیای ترسناک». ئەوانیش بە وردی نەیاندەزانی ئەو خولیا ترسناکانە چیین، بەڵام منیش دڵنیابووم هەر مرۆڤێک هێزی وەها گەورەی هەبێت خولیای ترسناکیشی دەبێت. دوای ئەوەی کە ئەو غەزەلانەم دەستکەوت، چەند شەوێک لەسەریەک نەخەوتم، سەرەتا تەنیا بیرم لە جوانی دێڕەکان و مۆسیقای قافییەکان و قووڵی ماناکان دەکردەوە، بەڵام کە زیاتر لێیان ڕامام تێگەیشتم سیحری گەورەی ئەو غەزەلانە لەوەدایە کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بڕوات و ورد سەیری نهێنی هەموو ژیان بکات. وا سەیری من مەکەن وەک ئەوەی نەفام و نەزان بم و ماڵ و سامان و بێبیشی یاخود تێربوون و وەڕزبوون لە ڕۆتینی ئاسوودەیی منیان خستبێتە سەر خولیا و کەڵکەڵەی خەیاڵات، نهێنی ئەو خەیاڵانە لەوەدایە کە وامان لێدەکەن شتێک بکەین، بجوڵێین، سەیری ناوەوەی خۆمان بکەین، ئەو کیشوەرە خەیاڵییە بدۆزینەوە کە لە دڵماندایە. لەو کاتەوەی من ئەو غەزەلانەم لە بەمۆ و مەمۆ کڕیەوە، کەوتمە خولیای چاوەدێریکردن و بەدواداچوونی ئەو پیاوە. هەستدەکەم من زۆر درەنگ بە چیرۆکی ئەوم زانیوە، هەمیشە بە کوچەکان و

کۆڵانەکانی ئەم شارەدا دەگەڕام و دەمگووت «کوا خەیاڵ؟». ناکرێت شارێک لەسەر ئەم ئەستێرەیە هەبێت کە بە هیچ جۆرێک ئاسەواری خەیاڵی تیانەبێت، نابێت، دەبێت خەیاڵ لە جێگایەکدا خۆی شاردبێتەوە کە من نایبینم. سەردەمێک مافوورەکانی تریفە یابەحریم بینی، هەستمکرد سەرەداوێکم بەرەو ئەو پەنا و حەشارانە دۆزیوەتەوە کە خەیاڵ خۆی تیا شاردۆتەوە. من گەلەک شاری دیکەی دونیا چووم بۆ ئەوەی تێبگەم خەیاڵ چۆن ئیشدەکات، چۆن دەردەکەوێت. هەموو ئومێدم ئەوەبوو گەڕەکێکی ئەفسووناوی و خەیاڵکار لەم شارەدا دروستبکەم، لە شارەکانی دیکەدا مرۆڤ بە زوویی خەیاڵ دەدۆزێتەوە، لە شێوەی بینا و باغچەکاندا، لەو پەیکەرە جوانانەدا کە باغەکان دەڕازێننەوە، لە چاوی عاشقەکانیاندا، لە کتێبخانە گەورەکانیاندا، لە مۆزەخانەکاندا، لە سەر شانۆ و ئۆپێراکان، لە جل و بەرگی ژنەکانیاندا، لە دیمەنی کڵێسە و مزگەوت و پەرستگاکاندا، لە ڕێکخستنیاندا بۆ ژیان، بۆ گوڵ، بۆ سوفرە و خوان. لێرە نەبێت لەم شارە پیسەدا نەبێت کە لە گەنجیمەوە وەک شێت بە کوچەکانیدا دەگەڕێم و دەپرسم «کوا خەیاڵ؟ کوا خەیاڵ». لە دەرەنجامی سەفەرەکانمدا گەیشتمە ئەو یەقینەی دوو شێوە شار لەسەر ئەم ئەستێرەیە شەیتان دروستیان دەکات، یەکێکیان ئەو شارانەیە کە خەیاڵ تیا بەرەڵا و بێسنوور و بێجڵەوە، خەیاڵ تیا سالار و سەروەرە، خۆی سەرداری هەموو یاساکانە و دەستی کراوەیە و ئازادە چی دەکات بیکات و چی دەڵێت بیڵێت، جۆرە شارێکی ترسناکی دیکەش هەیە کە ئەویش دەستکردی شەیتانە، وەک ئەم شارەی ئێمە کە خەیاڵی تیا نییە، کوچە و کۆڵانی خاڵییە لە ڕەنگی خەیاڵ، تیشکی ئەستێرەکانی وەک تۆزە و تریفەی مانگی غەمگین و بێگیانە. دەڕۆیت و جگە لە پیسی حەقیقەت هیچی تر نابینیت، لەم شارانەدا مرۆڤ بۆ

ئـەوەی خەیاڵـدار دیارنەبێت، وەک بوونەوەرێکـی تەپۆ و چەپـەڵ و بێئـارەزوو خـۆی دەردەخـات. کـە سـەر بەرزدەکاتـەوە و تەماشـای ئاونیگای دەکەیـت، دەمیەوێـت خەیاڵەکانـی بشـارێتەوە... وەک چـۆن سمۆرە لـە دارستانەکاندا گوێز دەشـارێتەوە، ژن و پیـاوی ئـەم شـارە خەیاڵەکانیـان دەشـارنەوە و دواتریـش هەرگیـز ناچنـەوە سـەری. هـا، ئێوە کەستان لـە خۆتـان پرسیوە بۆ لەگـەڵ هەمـوو ئـەو ڕق و دڵڕەقییـەی لـەم شـارەدا هەیـە، مرۆڤەکانـی شـەرمن دەنوێنـن؟ چونکـە شـەرم ئـەو دیوارەیـە کـە ناهێڵێـت ئـەو خەیاڵانـە بخوێنینـەوە کـە هـەر ئادەمیزادێـک بـە نهێنـی لـە سـەری خۆیـدا هەڵیاندەگرێـت. ڕۆژی وەهابـووە بەسـەعات بـەدەوری کوچـەکان و مزگەوتـەکان و منـارە و قـەڵا و بـورج و دەبـۆ غەمگینەکـەی ئـەم شـارەدا سـوڕاومەتەوە و سـەیری چـاوی خەڵکـم کـردوە، هیـچ ئادەمیزادێـک ناهێڵێـت ماوەیەکـی زۆر بـە ڕوونـی سـەیری چـاوی بکەیـت، ناهێڵێـت گلێنـەی هیـچ ئاشـکرابکات و هیـچ بڵێـت. ئـەم شـارە خەیـاڵ دەکوژێـت، منیـش ئـەوە دەزانـم... ئـەوە ڕاستییەکە زۆر درەنـگ مەخلوقـە خەیاڵییەکانیـش تێیدەگـەن. نازانـن بینینـی ئـەم قـەڵا و گومـەز و قەیسـەرییە تاریکانـە چەنـد کاریگـەری خراپیـان لەسـەر خەیـاڵ هەیـە. مـن دەزانـم پێشـتر دەسـەڵاتدارە کۆنـەکان دەرهـەق بـە خـەون و خولیـا دڵڕەقبـوون و خۆڵێکـی کـپ و هەوایەکـی گۆڕئاسـایان بەسـەر ئـەم شـارەدا کـردوە، مـن دەمویسـت دەسـەڵاتێکم هەبێـت، خەیـاڵ خـۆی لـە پێشـچاوم ون نـەکات. ئـەوە خولیـای هـەرە گـەورەی منـە، خەیاڵـی ئادەمیـزادەکان ببینـم، لەزەتیـان لێوەرگـرم، سـوودیان لێوەرگـرم. گـەر ترسـناکبوون دەسـتەمۆیانبکەم، گـەر یاخیبـوون ڕایانبهێنـم، بیانکـڕم، بیانبەخشـم، بیانلاوێنـم و بیانترسـێنم. مـن ویسـتم پـلان بـۆ دروسـتکردنی گەڕەکێـک دابنێـم بۆنـی ئەفسـانەی لێبێـت، بـەڵام لـەم شـارە نەگریسـەدا هـەر

هێندەی پلانێکت هەبوو، هێندەی نەخشەیەکت هەبوو، چنۆکەکان تێدەئاڵێن و دەیانەوێت بزانن چی دەکەیت، بۆ دەیکەیت، بۆ کێی دەکەیت. ڕۆژگارێک کە بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی حیزب، زەوییەکانی نوێمێران بەسەر بەرپرس و پەرلەمانتار و وەزیرەکان و پارەدارە گەورەکاندا بەشکرا، من دەمویست شارێکی خەیاڵی دروستبکەم، بەڵام ژمارەیەک لە ئەندامانی بیرۆی باڵای حیزب هێند گەمژەن ناتوانن «بۆنی پارە» لە «بۆنی خەیاڵ» جیابکەنەوە. گەڕەکێکی خەیاڵی دروستبکەیت، جیاوازە لەوەی گەڕەکێک دروستبکەیت، کۆشکەکانی بۆنی دەوڵەمەندی لێبێت. من لە ڕاستیدا نەمدەزانی گەڕەکێکی خەیاڵی دەبێت چۆن بێت، بەڵام دەمزانی دەبێت شتێک بێت وەک مافوورەکانی تریفە یابەحری، شتێک بێت وەک غەزەلەکانی غەزەلنوس... دەشمزانی کە جۆرە جێگایەکی وەها بە کەسانی وەک تریفە یابەحری و غەزەلنوس دروست ناکرێت. من بە ئەزموونی بچوک و کەم بەهای خۆمەوە دەڵێم، زۆربەی بوونەوەرە خەیاڵییە ڕاستەقینەکان ڕقیان لە دەسەڵاتە. بێئەوەی لەوە تێبگەن جوانی و لەزەتی دەسەڵات لە جوانی و لەزەتی خەیاڵ کەمتر نییە. خەیاڵ بەبێ دەسەڵات وڕێنەیەکی شیرینە... ئەوە تەنیا دەسەڵاتە دەتوانێت بوون ببەخشێتە خەیاڵ، بیکات بە حەقیقەت... ترسناکن ئەوانەی نایانەوێت جوانی ناو خەیاڵەکانیان ببێتە حەقیقەت... ترسناکن ئەوانەی تێناگەن دەبێت هێزێک و پلانێکی گەورە هەبێت کە ئادەمیزادەکان هەر یەکەیان بە حوکمی شوێنی خۆی بەشێکی بچوکی ناو ئەو پلانە بێت، بەدبەختە ئەوەی لە جۆرە پلانێکی وا ڕادەکات... بەدبەختە ئەوەی جێگای ڕاستەقینەی خۆی جێدەهێڵێت و دەیەوێت خۆی شاهەنشای خەیاڵی خۆی بێت...

# درێژترین کتێبی مێژوو

درێژترین کتێبی دونیا، لەسەر دەفتەرێکی ئێجگار تایبەتی و گەورە دەنوسرا، ئەو کتێبە لە ماڵی غەزەلنوس لە ناوەڕاستی ژوورێکی تایبەتیدا لەسەر مێزێکی گەورە دانرابوو. درێژی و قەوارەی دەفتەرەکە بە جۆرێک بوو، نمونەی لە هیچ دەفتەرفرۆشییەکی دونیادا دەست نەدەکەوت. غەزەلنوس لای یەکێک لە سەحافە خەیاڵبازەکان بە کردی دابوو، کابرایەکی چاویلکە لە چاوی پیر، کە لە کتێبخانەیەکی پڕ کتێبی دینیدا بەرگی بۆ ئەو دەستنوسە کۆنانە دروستدەکرد کە خەڵکی بەیازناس و پسپۆڕی تایبەت هێنابوویانن بۆ ئەم شارە.

لە کۆتایی سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیستویەکدا، ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانی ئەم شارە کەوتنە نوسینەوە و کۆکردنەوەی حیکایەتەکانی مردن. پێموایە لەو قۆناغەدا هوشیاری مرۆڤی ئێمە بەرابەر مردن گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی و قووڵی بەسەردا هاتبێت، ڕەنگە هۆکاری ئەو گۆڕانکارییە بەپلەی یەکەم بگەڕێتەوە بۆ کزبوونی جەنگی ئێمە و دەوڵەتە داگیرکەرەکان. بەدرێژایی سەدەی بیست مردن وەک شتێکی جوان تەماشادەکرا، بەڵام لەگەڵ ڕاپەڕیندا مردنگەلێکی وەها ناشیرین پەیدابوون، کە مردنیان لە کارێکی ڕۆمانسییەوە گۆڕی بۆ ڕووداوێکی دزێو و پوچگەرا و تاریک. ئەوکات گروپگەلێکی زۆر هەبوون وەک «ئەندازیارە خەیاڵییەکان» «کورە سەفەرییەکان» «پاسەوانانی نێرگس» « کتێب پەرستەکان» «ژنانی پەژموردە» «کچانی باراندوو» و کە پێکرا تخوبە گەورەکانی ئیمپراتۆرییەتەکەی غەزەلنوسیان لەم شارەدا پێکدەهێنا. غەزەلنوس سەرۆک و شاهەنشاهی هەڵنەبژێردراوی هەموو ئەو تاقمە خەیاڵیانەبوو، کە لە ڕێگای غەزەلەوە دەیانناسی. ئەوان هەموو لە

نوسینی درێژترین کتێبی دونیادا بەشداریاندەکرد، زۆربەیان تەنیا زانیاریان لەسەر شوێن و ماڵی قوربانییەکان کۆدەکردەوە، ئیشیان ئەوەبوو ماڵی کچانی سووتا و ناکام دەستنیشانبکەن، شوێنماڵی قوربانییەکانی شەڕی ناوخۆ بدۆزنەوە، دایک و باوکی ئەو کوڕانە بدۆزنەوە کە لە دەریای ئیجەدا خنکان، سۆراغی ئەو ژن و پیاوە بێسەروشوێنانە بکەن کە لە ناکاو وندەبوون و کەس شتێکی دەربارەی چارەنوسیان نەدەبیستەوە. ئەوانەی دەفتەرەکانیان دەگێڕا، ئەو دەفتەرانەی دواتر بە ناوی دەفتەرە باڵدارەکانەوە ناویان ڕۆیشت، گروپێکی چکۆلانەی حەوت کەسی بوون کە تریفە یابەحری سەرپەرشتیدەکردن. جگە لە تریفە، دوو کوڕ و چوارکچی دیکە تەواوی کارەکانیان دەبرد بەڕێوە، ئەو گروپە ناویان دەفتەردارەکان بوو. ناوی ئەو گروپە هەمیشە وەک نهێنی دەمێنێتەوە و دەبێت وەک نهێنیش بمێنێتەوە، چونکە ئیشی ئەو دەفتەردارانە دەشێت لە هەر کاتێکدا بێت دووبارە دەست پێبکاتەوە، کاری ئەوان تا ئێستا تەواو نەبووە، بۆیە هەموو ناوهێنان و ئاماژەیەکی هەڵە لەوانەیە ژیانیان بخاتە مەترسییەوە. تەنیا شتێک بتوانین لەسەر دەفتەردارەکان بیڵێین، ئەوەیە کە پتر لە فریشتە دەچوون، هەندێک لەو کەسانەی دەفتەردارەکانیان بینیوە، لەو باوەڕەدان ئەوان مەخلوقاتی هێند بەڕەحم و ناسکن، هیچ ئادەمیزادێک گەر نهێنیشیان بزانێت ناتوانێت ئاشکرایانبکات. وەک فریشتە، بێ هیچ وادەیەکی پێشوەخت، لە حەوش و ماڵی قوربانییەکاندا دەردەکەوتن، ئەوکات وادە و شێوەی ئەو دەرکەوتنە زۆربەی کات غەزەلنوس و حەسەنی پیزۆی گوڵاو دایاندەنا، شتەکان بەجۆرێک ڕێکدەخران، هیچ دەفتەردارێک نەکەوێتە بۆسەیەکی کتوپڕەوە. پیزۆ، ئەندازیاری ڕاستەقینەی نەخشەکان بوو، کەسێک بوو هەموو زانیارییەکانی خۆی لە بارەی خۆشاردنەوە و خۆگۆڕین و خۆدەربازکردنەوە لەو بوارەدا خستەکار. ئەوەی ئێستاش سەیرەو شوێنی بڕوا نییە، هەستانی تریفە

یابەحرییە بە سەرپەرشتیکردنی گەشتی دەفتەدارەکان. خۆتان دەزانن، خانمی یابەحری بەردەوام هەستیدەکرد، جانەوەرێکی گەورە بەدوایەوەتی. ئیدی چۆن چۆتە ژێر باری وەها کارێکەوە کە خاڵی نییە لە ترسی کتوپڕ و هەڵوێستی لە ناکاو؟. وەک دواتر و دوای سۆراغ و تێفکرینێکی زۆر پێیگەیشتم، پێدەچێت خانم تەنیا بۆ خۆڕزگارکردن لەو ترسانە، یاخود بەگژداچوونەوەی ئەو جانەوەرە خەیاڵیانەی ناو ژیانی بەو کارە هەستابێت. لەدەستپێکی سەدەی بیستویەک و ساڵانی دواتردا، ئەو تیپە ئیشێکی زۆریان لە نوسینی ئەو کتێبەدا کرد، سەدان چیرۆکی سەیری ئەو ساڵانەیان کۆکردەوە. دەفتەردارەکان بەردەوام بە دەفتەری پڕەوە دەهاتنەوە و دەفتەرەکانی خۆیان دەدایە خانمی یابەحری و دواتر ماجیدی گوڵ سۆلاف بەدەستوخەتە سیحراوییەکەی خۆی دەیگوازتەوە سەر ئەو کتێبە گەورەیەی کە دەبایە هەردەم لەو ژوورە تایبەتییەدا بمابایە. کاتێک لاشەکەی موراد جەمیل دۆزرایەوە، ئەوان زیاد لە چوارساڵ بوو بە نهێنی فەسڵەکانی ئەو کتێبە گەورەیەیان دەنوسی. ئەو ساڵانە ماجیدی گوڵ سۆلاف هەفتەی ڕۆژێک یان دووان لە دوانیوەڕۆیەکی زووەوە تا شەوێکی درەنگ ناوەڕۆکی ئەو دەفتەرانەی دەگوازتەوە و بە خەتێکی ئێجگار قەشەنگ کە هەموو نەوەکانی داهاتوو بتوانن بیخوێننەوە برگە دوای برگە چیرۆکەکانی دەنوسییەوە. هەمیشە کەمدوو و بادیهەوابوو، لە خۆی زیاتر کەسی بە ڕۆحلەبەری خەیاڵی نەدەزانی. وشەکانی هەردەم پڕ ویقار و بە حورمەتانەبوون، بەڵام بۆشناخی و خۆگۆڕین و تەماشاکردنی جۆرێک لە خۆبڵندی تێدابوو کە هەردەم لەگەڵ یابەحری و حەسەنی پیرزۆدا مایەی پێکدادانی بچوک و نەرمەکاریبوو. تا ماوەیەکی درێژ کەس لەو گروپەدا هەستی نەدەکرد مەترسی لەسەر بێت. لە هەموو لایەکەوە چیرۆکی ترسناکی مردن و تیاچوون دەگەیشتە ئەو کتێبە گەورەیە، بەڵام لەو ماوەیەدا شتێکی ئەوتۆ ڕووینەدا بترسن و دەست لە خەونی نوسین

بکێشـنەوە. بـەڵام ئـەو چیرۆکانـە بۆنـی زۆربـەی کوچـەکان و هەناسـەی شـێداری نێـو ماڵـە کۆنـەکان و بۆغەمـی زۆربـەی خەڵکـی بێکەسـی ئـەو شـارەی هێنایـە نـاو ئـەو کتێبـەوە کـە لەگـەڵ کردنەوەیـدا مـرۆڤ هەسـتی بـە هاڵاوێکـی سـەیردەکرد، هـاڵاوی هەناسـەی مـردووەکان و بۆنـی بەجێمـاوی ژیانیـان و شـنەی غەریبیـان.

هەرچـی پەیوەنـدی نێـوان غەزەلنـوس و یابەحریشـە، تـا دێـت بـەرەو غەمگینـی دەڕوات. هەمـوو خۆشەویسـتییەکی ڕاسـتەقینە بڕێکـی زۆر خۆئازاردانـی تێدایـە. بـەڵام عەشـق بـەو ڕۆحـە سـۆفییەوە کـە نەگەیشـتن بـە مەحبوبـە تاکـە ڕێـگای مانـەوە و بـە ئەبەدیبوونـی بێـت، لای تریفـە یابەحـری ڕۆژ دوای ڕۆژ و سـاڵ دوای سـاڵ شـێوەیەکی توندتر و سـەرپەڕتر وەردەگرێت. ئـەو ماوەیـە بـۆ غەزەلنـوس و تریفـە یابەحـری، دەمـی تێپەڕیـن و ڕاهاتـن بـوو بـە ڕێبـازی قوتابخانەیـەک کـە سـۆفیسـتە کۆنـەکان ئوسـتاد و سەرمەشـقی بـوون. هـەر دووکیـان مەشـقی ئەوەیـان دەکـرد چـۆن ئـەو بوونـەوەرە ڕاسـتەقینەی پێشـدەمیان بگۆڕنـە سـەر ڕۆحێکـی خەیاڵـی دوورە دەسـت. هەردووکیـان سـەر بـەو قوتابخانـە خۆرهەڵاتییـەی خۆشەویسـتی بـوون کـە ئیـش لەسـەر گۆڕینـی مەحبوبـە دەکات لـە بوونەوەرێکـی ڕاسـتەقینەوە بـۆ کەسـێکی خەیاڵـی. وەک ئـەوەی بـۆ عاشـقان تەنیـا دوو جـۆر بەیەکگەیشـتن لەسـەر زەمیـن هەبێـت، جۆرێکیـان بەیەکگەیشـتنێکی ڕاسـتەقینە و دونیایـی و جەسـتەییە، ئەویدیشـیان بەیـەک شـادبوونێکی خەیاڵییـە. هەردووکیـان لـە قووڵایـی دڵیانـدا باوەڕیـان وابـوو کـە مانـەوەی خۆشەویسـتی گرێـدراوی یەکگرتنێکـە لـەم دونیـا و لـە ئاسـتی ڕاسـتەوخۆی جەسـتەدا ڕوونـادات، بەڵکـو لـە ئاسـتی ڕۆحـدا و لـە جێگایەکـی دیکـەدا دێتـە ئەنجـام.

سـەرەتا تەنیـا ئـەو ئـازارە ئازادیبەخشـە ئەشـکەنجەی دەدان، بـەڵام دواتر مەترسـی ڕاسـتەقینەتر و گەورەتـر سـەریانهەڵدا. ڕۆژ بـە ڕۆژ نـاوی غەزەلنوس و ئیشـە سـەیرەکانی پتـر دەبیسـتران، شـتێک زۆر سـەرەنجی دونیـای بـۆ

ماڵـی غەزەلنـوس ڕاکێشـا برایانـی دولبـەر بـوو، کـە بەجۆرێکـی سـەیر لـە هەمـوو ناوچەکانـی کوردسـتانەوە خەڵـک بـۆ سـەوزکردنەوەی زەوییـە بێبـەر و باغـە وشـکەکانیان داوایاندەکـردن. برایانـی دولبـەر هێنـد چـڕ و بەخـوڕەم کێڵگـە مردووەکانیـان سـەوزدەکردەوە، ناوبانگیـان بـە گونـد و مـەزرا و دێ ڕوخاوەکانـدا بڵاوبـووەوە، ئـەوان تەنیـا درەخـت و سـەوزییان نەدەهێنـا، بەڵکـو جوانیـان دروسـتدەکرد، ئـەو درەختانـەی ئـەوان سـەوزیاندەکردنەوە تابلۆی سـیحراوی بـوون، ئـەو گوڵانـەی ئـەوان دەیانڕوانـدن ڕەنـگ و بۆیەکـی نەبینـراو و نەبیسـتراویان هەبـوو. دوای زیندووکردنـەوەی هـەر کێڵگەیـەک، بـە بـۆن و بەرامـەی گەنـم و جـۆوە، بـە عەتـری گوڵـەوە دەگەڕانـەوە بـۆ هۆبـە بچوکەکەیـان لای غەزەلنـوس و وەک دوو منداڵـی ڕۆحپـاک لـە کتێبخانەکـەی غەزەلنوسـدا دادەنیشـتن و تکایاندەکـرد غەزەلیـان بـۆ بخوێنێتـەوە.

تـا ئـەو ئێوارەیـەی عەتـار دەرکـەوت و ویسـتی کتێبەکانـی غـەزەل بکڕێتـەوە، غەزەلنـوس هەسـتی بـە مەترسـی نەکردبـوو. بـاوەڕی وابـوو خەیاڵ و خولیاکانـی ترسـیان بـۆ کـەس نییـە. هـەر شـتێکی کردبێـت بـۆ ئەوەبـووە بیسـەلمێنێت کـە ئـەو و ڕۆحلەبـەرە خەیاڵییەکانـی دی لـە خەیاڵـدا نـاژیـن، بەڵکـو کـوڕی ئـەم سـەرزەمینەن. دوای دەرکەوتنـی عەتـار بـە ماوەیـەک ئـەو لاشـەیەی مـوراد جەمیلیـان دۆزییـەوە. بـەڵام لـەو ماوەیـەدا شـتگەلێکی زۆر ڕوویاندابـوو کـە دەبێـت ئێـوە ئاگاداریانبـن. سـەردەمێک تریفـە یابەحـری خەریکـی ئەوەبـوو کیـژە بێپەنـاکان فێـری مافوورچنیـن بـکات، چەنـد ماڵێکـی دی هاوشـێوەی ماڵـی ئـەو لـەو شـارەدا هەبـوو، بەپێـی هەندێـک ئامـار کـە دواتـر لـە ڕۆژنامەیەکـدا خوێندمـەوە، ژمـارەی ئـەو جـۆرە ماڵانـە ئـەوکات لەسـەروو هەشـت ماڵـی نهێنییـەوە بوون کـە خەڵکانی پیاوچاک و مرۆڤدۆسـت بـۆ پاراسـتنی ژیانـی ئـەو ژنـە بێکەسـانە تەرخانیانکردبـوون. چەنـد سـاڵێک لەوەوبـەر یەکەمیـن ڕووداوی ترسـناک ڕوویـدا، کاتێـک دەسـتێکی نەنـاس لـە کاتـی شـیرین خـەودا ئاگـری لـە یەکێـک لـەو ماڵانـە بـەردا و سـێ کـچ و

دوو ژن تێیدا بوون بە زوخاڵ، دواتر لە ڕووداوێکی تردا و لە ماڵێکی دیکەدا ژنێکی تر سەربڕدرا کە دەمێ ساڵبوو لەدەست مێردەکەی و براکانی هەڵهاتبوو، زۆری نەبرد دوو خوشکی دیکەش ژەهرخواردکران و لە ماوەی چەند سەعاتێکدا هەردووکیان مردن، پاشان چەکدارێک چووە سەر پەناگایەکی دیکە و دەستڕێژێکی کوێرانەی بە ناو ژنەکاندا کرد و کچێکی کوشت و دووانیش برینداربوون. ئەو ڕووداوانە مایەی ئەوەبوون، ئەو خانمانەی لە پشت دروستکردنی ئەو ماڵانەوەن تێبگەن ژیانی ئەو ژنانەی لە پەناگاکاندا دەژین لە مەترسیدایە. چاوێکی زۆر بەکار و نهێنی لە دوای دۆزینەوەی ئەو حەشارگایانەبوو. بەپێی ئەو چیرۆکانەی نەورەسی گوڵ سۆلاڤ بەردەوام بۆ تریفە و کچەکانی دیکەی دەهێنا، بڕێک لەو ماڵانە تەواو بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوون، لە ماوەی ئەو ساڵەدا ژمارەیەک لەو ژنانەی لەو ماڵانەدا دەژیان هەڵهاتبوون، هەندێکیان بە کۆمەکی هەندێک ڕێکخراوی چالاک لەو بوارەدا گەیشتبوونە ئەورووپا، هەندێکیشیان ڕوویان لە بەغدا و شارەکانی باشوور کردبوو، هەندێکیان لە ڕیستۆرانت و ئوتێلەکانی ئەستەمبول خۆیان گرتبووەوە، چەندانێکیش لە قاتی سەرەوەی ئوتێلەکانی مەرجە نەبێت لە دیمەشق شوێنی دیکەیان دەست نەکەوتبوو. ئەو کیژانەی دوای هەڵوەشاندنەوەی ماڵە نهێنییەکانی دی بێجێگا دەمانەوە بەسەر پەناگاکانی دیدا دابەشدەکران. تریفە یابەحری سەرەنجی ئەو ترسە قووڵ و بەردەوامەی دەدا کە ژن و کچە بەستەزمانەکان تیادەژین، بۆ ئەوەی ئەو ترسەیان لە بیرببەنەوە، ناچاربوو زیاتر لە دونیای خەیاڵ و مافوورچنیندا قاڵیانبکات. خۆیشی تا دەهات بێدەنگتر و غەمگینتر دەبوو، زۆر لە جاران زیاتر دەگریا و زۆر زیاتریش دەترسا. لەو سەردەمەدا هێدی هێدی دەگەڕایەوە ناو دونیای مافوورەکانی خۆی. وەک دواتر نەورەسی گوڵ سۆلاڤ بۆی باسکردم، تریفە لەو چەند ساڵەدا بەردەوام لەگەڵ ئەو کیژانەدا مافووری

چنییوە و هەڵیوەشاندۆتەوە، هەوگیز مافووریان بۆ ئەوە نەچنیوە شتێک بەرهەمبهێنن، بەڵکو بۆ ئەوە بووە تەعبیر لە ڕۆحی خۆیان و ترس و ئازارەکانیان بکەن. وەک ئەوەی لە خۆیان زیاتر هیچ بینەرێک لەسەر ئەم ئەستێرەیە نەبێت شایستەی تەماشاکردنی ئەو نەخشانە بێت، یاخود لە دوای مافوورێکی خەیاڵی بن و بۆیان دروست نەکرێت و پێینەگەن. جارێک نەورەسی گوڵ سۆلاف لە تریفە دەپرسێت « بۆ مافوورەکان هەڵدەوەشێننەوە، بۆ ناهێڵیت دوای خۆت خەڵک لەزەت لە سەیرکردنی ئەو نەخش و نیگارە جوانانەی تۆ ببینن؟»، یابەحری دەڵێت «نەورەسی خۆشەویست، ئەوانەی ئێمە هەڵیاندەوەشێنینەوە مافوور نین، هیچ نین، تەنیا مەشق و خۆ ئامادەکردنن بۆ ڕۆژێک جوانترین فەرشی هەموو دونیا دەچنین. من و ئەو کچانە بۆ فەرشێک دەگەڕێین هەموو ژیان و بوونی خۆمانی بخەینە ناو، بۆ مافوورێک دەگەڕێین کە داتخست و چوویتە سەری وابزانیت لە باغێکی خەیاڵیدایت، لە جێگایەکی لە دەرەوەی ئەم زەمینە، لە شوێنێکی ترس و بێکەسی و دیوار و ژووری داخراوی تیا نییە». هەر لەو وەرزەدا ژنکوژی دەگاتە نوێمیرانیش، کچی هەندێک دەوڵەمەندی ناسراوی شار و ژنی هەندێک پیاوی حیزبی لە هەلومەرجی زۆر تەماوی و ناسیاردا وندەبن و کەسیش ناتوانێت فایلی مەسەلەکانیان بکاتەوە.

***

بەر لە دۆزینەوەی لاشەکە بە ماوەیەکی کورت، شەوێکیان پیاوێکی غەریب خۆی کرد بەماڵی غەزەلنوسدا، دەستێک جلی لە بەردابوو، کەمێک لە جلی قەشەکان دەچوو. ڕیشێکی سەیری هێشتبووەوە، عەترێکی میسکبۆی دابوو لە خۆی، کەرەواتێکی سپی درێژی بەستبوو، چاو و برۆی لە چاو و برۆی یەکێک دەچوو لە جەنگەڵەوە هاتبێت، سەرەتا

لە ساڵۆنەکەی ماڵی غەزەلنوسدا دانیشت، گەنجێکی بەهەیبەت بوو، لەوانەی مرۆڤ ناتوانێت هیچ جۆرە شوناسێکیان بداتێ. بە حورمەتێکی دەستکردەوە لە ژووره هێمن و بێدەنگەکەی ماڵی غەزەلنوسدا، سڵاوی لە غەزەلنوس کرد و وەک «ڕاوکەری شاکارە ئەدەبییەکان» خۆی بە غەزەلنوس ناساند. شتەکانی بە چیرۆکی وەستێکی باوکی دەستپێکرد کە دارا و نەداری خۆی بۆ کۆکردنەوەی دەستنوسی کۆن و بەیازی شاعیرە کلاسیکییەکان سەرفکردبوو. بەجۆرێکی وەها قسەیدەکرد هەموو کەس باوەڕیدەکرد. لە جانتایەکی دەستی چکۆلانەوە وەرەقەیەکی لوولکراوی درێژی دەرهێنا و بە ئەسپایی نەخشەی شارێکی پیشانی غەزەلنوسدا و گووتی «ئەمە هێڵکاری سەرەتایی شاری خەونەکانە، شارێک تێکەڵەیەکە لە بەهەشت بە مانای خودایی و بە هەشت بە مانا ئینسانییەکەی». غەزەلنوس بەسەرسامی سەیری ئەو نەخشەیەی کرد و چەند جارێک لەبەرخۆیەوە گووتی «شاری خەونەکان.. ئاه... شاری خەونەکان... ». بە کەمێک تێڕامانەوە پرسی « دەبێت چ جۆرە جیاوازییەک لە نێوان بەهەشت بە مانا خودایی و بەهەشت بە مانا ئینسانییەکەیدا هەبێت؟». پیاوە غەریبەکە پێکەنی و گووتی «جەنابی غەزەلنوس، ئێوە لەمن کارامەتر و پڕفامترن، یەکێک لە هەڵە گەورەکانی ئاین، هەموو ئاینەکان ئەوەیە یەکجۆر تێڕوانین بۆ بەهەشت دروستدەکەن، هەر سەردەمە و بەهەشتی خۆی هەیە، هەر شارە و بەجۆرێک تەماشای بەهەشت دەکات، ئەگەر نەڵێم هەر مرۆڤە و بەجیا جۆرە بەهەشتێکی هەیە لە بەهەشتی ئەویدی ناچێت... ئاغای غەزەلنوس ڕەنگە بەهەشت لای تۆ باغێک بێت، پڕبێت لە شاعیر و غەزەلنوسی گەورە، کتێبخانەیەک بێت پڕبێت لە کتێبی شیعر. بەڵام بۆ یەکێک کە یاری تۆپ دەکات، بەهەشت جێگایەکە دەبێت گۆڕەپانی یاریکردنی تێدابێت، بۆ یەکێک کە حەزی لە شەترەنجە، بەهەشت دەبێت پڕبێت لە یاریکەری باشی

شەترەنج... بۆ کە ناوی بەهەشت دێت، مرۆڤ ڕاستەوخۆ حۆری و غیلمانی بیر دەکەوێتەوە، نازانم ؟ هەر مرۆڤە و بەجۆرێک بەهەشتی دەوێت، ئەو خراپانەی مرۆڤ لەسەر زەوی ناتوانێت بیانکات، دەیەوێت لە بەهەشت بیانکات. بەڵام لە پاڵ ئەوەدا من دەپرسم ئاخۆ ئێمە وەک مرۆڤی ئەم سەردەمە دەتوانین بیرۆکەی بەهەشتێک بەبێ کۆمپیوتەر بەبێ سەتەلایت، بەبێ فڕۆکە و شەمەندەفەر و کەشتی گەورە بهێنینە پێشچاوی خۆمان، بیهێنە پێشچاوی خۆت بەهەشت دەبێت چ جێگایەکی ناخۆش بێت بەبێ سینەما، بەبێ یاریگا، بەبێ ئینتەرنێت... بە گشتی خەیاڵی بەهەشت خەیاڵێکی موبارەکە، مرۆڤ بێ ئەو خەیاڵە ناژی... من خۆم بە کەسێکی ئیماندار دەزانم. بەڵام بەداخەوە بەهەشت شتێکە هەر سەردەمە و بەجۆری خۆی دروستیدەکات».

هاتنی ئەم میوانە لە ناکاو و غەریبە غەزەلنوسی تووشی پەشۆکان کردبوو، ڕیشی خۆی خوراند و پرسی «جا پێتوایە بیرۆکەی دروستکردنی ئەم گەڕەکە بەهەشتمان بۆ دەهێنێت؟». پیاوە غەریبەکە کە لە کاتی قسەکردندا خۆی بە ناوی «جەواهیر سەرفەراز» بە غەزەلنوس ناساندبوو، گووتی « پێموایە ئەگەری دروستبوونی بەهەشت لەسەر زەمین لە ئەگەری پێڕاگەیشتنی لە قیامەتدا گەورەترە، ئەوەی من لە کتێبە کۆنەکاندا لەسەر بەهەشت خوێندومەتەوە، جێگایەکی خۆش نییە، تاکە ئیشێک لەوێ مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێت بیکات ئەوەیە دەتوانێت بە ئاسانی سوار حۆرییەکان بێت، ئەم وێنەیەی بەهەشت، چیتر لەگەڵ خەیاڵی خەڵکی ئەم شارەدا جووت نایەتەوە. بەهەشت بەبێ چێشتخانەی خۆش، بەبێ ئۆتوموبیل، بەبێ سەتەلایت... شوێنێکی ناخۆشە. باری تەعالا وێنەیەکی بەهەشتی کێشاوە کە ئەم شتانەی تیانییە، ئەوەی جەلالەتیان باسیدەکات، بۆ مرۆڤی دەور و زەمانی دێرین خۆش و ئەفسانەیی بووە، بەڵام بۆ ئێمەی ئادەمیزادانی ئەم

ڕۆژگارە بەهەشت بەبێ ئینتەرنێت، بەبێ مۆبایل، بەبێ سینەما، بەبێ زۆر شتی تر مانای نییە...». غەزەلنوس سەیرێکی جەواهیر سەرفرازی کردو گووتی «بەڵام ئەم نەخشە بێڕۆحە چۆن دەکرێتە بەهەشت؟ تۆ چۆن دەتوانیت لەم هێڵە مردووانەوە بەهەشت بسازێنیت... چۆن؟»، «جەواهیر سەرفراز» بە غەمگینییەوە سەیری غەزەلنوسی کرد و گووتی «ئاغای غەزەلنوس، من بۆ ئەو مەبەستە لێرەم... بۆ ئەو مەبەستە؟ من پێویستیم بە خەیاڵە، مرۆڤ تەنیا لە ڕێگای خەیاڵەوە دەتوانێت بەهەشت دروستبکات... بەهەشت جێگایەکی خۆش نییە، جێگایەک نییە کە ئارەزووە حەرامەکانی تیا تێردەبێت، مرۆڤ زۆر لە تێگەیشتنی بەهەشتدا هەڵەدەکات، بەهەشت شوێنێکی خەیاڵییە... جەنابی غەزەلنوس، بەهەشت جێگایەکی خەیاڵییە؟ ». غەزەلنوس بەسەرسامییەوە گووتی « دەزانم بەهەشت پەیوەندییەکی زۆری بە خەیاڵەوە هەیە، بەڵام نازانم ئاخۆ خەیاڵ بەهەشتە، یان بەهەشت خەیاڵە؟ ئەوە پرسیارێکی سەختە من وەڵامم بۆی نییە، ئاخۆ خەیاڵە ئەو جێگایە دروستدەکات، یان ئەو جێگا عاسییە خۆی لە شوێنێکی نادیاردا هەیە و ئێمە بە خەیاڵ بۆی دەڕۆین». جەواهیر سەرفراز کەمێک بۆینباغە سپییەکەی چاککرد و گووتی « وا دەزانم کە وەڵامی ئەو پرسیارە دەزانم، باشتر لە مەخلوقاتە خەیاڵییەکان، باشتر لەوان». کەمێک بەماناوە سەیری غەزەلنوسی کرد و گووتی «من ماوەیەکی کەم لەوەوبەر بە چیرۆکی ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانم زانی. بەخت یارمبوو، شەوێک لە دانیشتنێکی پیاوە دەنگ خۆشەکاندا بەشداربووم، ئەوانەی گۆرانی دەڵێن و بەدەنگی بەسۆزیان خولیای هەمەجۆرت تیا سەوزدەکەن، ئەستێرە و مانگت نیشاندەدەن، بەیانی و ئێوارە، کازیوە و ڕۆشنی تریفەت بۆ دەخەنە ناو ئاوازەوە. لە دەنگی ئەو پیاوباشانەوە، لە ڕێگای هەندێک ژنی پەشموردەوە چیرۆکی تۆم بیست. چەندجارێک و بە چەند شێوەیەک

حیکایەتی غەزەلەکانی ئێوە بەرگوێم کەوت. پێموابوو غەزەلنوس ناوی کۆنی شاعیرێکی دێرین بێت کە من نەمناسیوە و نەمدیوە، ناوەکەتان بۆنی سەردەم و زەمانێکی تری لێدێت، کەمێک کۆن و کاڵ دەنوێنێت، بۆ یەکێکی وەک ئێوە کە هێشتا تەواو نەچوونەتە سن وساڵەوە، کەمێک سەیر و پرتەلیسم کەوتۆتەوە، وەک ئەوەی ئێوە دوای سەردەمی خۆتان لەدایکبووبن. بەڵام غەزەلەکانتان قەشەنگ و ئەفسونکارن، هیچ شتێکم نەبینیوە و نەبیستووە وەها کاریگەربێت، وەها خەیاڵ دروستبکات. مرۆڤ ناتوانێت دوای بیستنی ئەو غەزەلانە ئاسایی و ئاسوودە بژی. بەڵام جەنابی غەزەلنوس بابگەڕێمەوە سەر بابەتی بەهەشت، من و تۆ هەردووکمان بە جۆرێک لە جۆرەکان زۆر بیرمان لە بەهەشت کردۆتەوە. من پێتدەڵێم، هەموو خەیاڵێک ناتوانێت بەهەشت دروستبکات، خەیاڵ وەک دەرگا وەهایە، وەک ڕێگا وەهایە، ڕاستە ئەوەی بەو ڕێگایەدا نەڕوات ناگاتە بەهەشت، بەڵام مەرج نییە ئەوەی بەو ڕێگایەدا ڕۆیشت بگاتە بەهەشت. خەیاڵ هەزاران ڕێگای لێدەبێتەوە، یەکێک لەو ڕێگایانە دەگاتە بە هەشت... کێشەی گەورەی تۆ ئەوەیە تا ئێستا بیرت لە دۆزینەوەی ئەو ڕێگایە نەکردۆتەوە کە دەتبات بۆ بەهەشت... ئەوسەری ئەوسەری خەیاڵ بەهەشتە. ئا، جەنابی غەزەلنوس، مرۆڤ دەبێت بگاتە بەهەشت، ئەوسا گەیشتۆتە ئەوپەڕی خەیاڵ. عەزیزم، من بوونەوەرێکی خەیاڵی نیم، بەهرەیەکی ئەوتۆم لە خەیاڵدا نییە، عاشقی شیعرم، عاشقی کتێبم، عاشقی غەزەلیاتی کۆنم، عاشقی سینەمام، عاشقی بیناسازیم، عاشقی تابلۆم. شێتی ئەوەم تێبگەم خەیاڵ چییە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەهرەیەکم نییە، خەیاڵێکم نییە، لەبەرئەوە ڕوومکردۆتە ئەوەی وەک پلاندانەرێک، وەک بەڕێوەبەرێک ئیشبکەم... من پێویستیم بە تۆیە، بۆ ئەوەی گەڕەکی خەونەکان دروستبکەم، پێویستیم بە تۆیە، پێویستیم بە هەموو بوونەوەرە خەیاڵییەکانە... پێویستیم بە غەزەلەکانتە، من ئەو

كەسـەم كـە دەمەوێـت غەزەلەكانـت لێبكـرم... ئـەو كەسـەم».

غەزەلنـوس گووتـی «جەواهیـری سـەرفراز، ئەوسـەری خەیـاڵ بەهەشـت نییـە. نـا... نـا بەرێـز وانییـە. بەهەشـت لای مـن ئاسـوودەیی نییە، شـوێنێكی جـوان و بێغـەم نیَیـە. خەیـاڵ ڕێگایەكـی تیانییـە بمانبـات بۆ بەهەشـت، نـا، مـن لـە ئەزموونـی خۆمـەوە قسـەدەكەم، خەیـاڵ چەكێكـە لـە چەكەكانـی شـەڕ لـە جەهەنەمـدا... بەلامـەوە گرنـگ نییـە بەهەشـت دروسـتبكەم، هەرگیز بـۆ بەهەشـت نەگـەڕاوم، بیـرم لـە شـتی وا نەكردۆتـەوە. مـن بـە كۆمەكـی خەیـاڵ بەسـەر زەویدا دەگەڕێـم... بـە نـاو باغـە شـاردراوەكانی نـاو مرۆڤـدا. خەیـاڵ شـتێكە یارمەتیمـدەدات پتـر لـە مـرۆڤ تێبگـەم... خەیـاڵ بـازدان نییـە بەسـەر حەقیقەتـدا بـۆ نـاو خـەون... تـۆ بـە هەڵـە تێگەیشـتوویت... تـەواو بـە هەڵـە لـە مـن تێگەیشـتوویت. ئەوسـەری خەیـاڵ حەقیقەتـە، ئەوپـەڕی حەقیقەتـە، لەوانەشـە مـردن بێـت، چونكـە مـردن هیـچ نییـە جگـە لەوپـەڕی حەقیقـەت. مـن خەونـم نییـە عەزیـزم، مـن خەیاڵـم هەیـە، فەنتازیـام هەیـە. دەزانـم... لـە مێـژە دەزانـم، خەیـاڵ خەونـی سـەیر سـەیر لـە مرۆڤـدا سـەوزدەكات، بـەڵام زۆربـەی وەخـت خـەون شـتێكی ترسـناكە، خـەون لـە جێگایەكـدا ناوەسـتێت، دەبێتـە لافاوێكـی ترسـناك كـە دەیەوێـت هەمـوو دونیـا ڕادات و شـتێكی تـر دروسـتبكات... مـن و تـۆ دوو مەخلوقـی جیاوازیـن، تـۆ خەونـت هەیـە و مـن خەیاڵـم هەیـە... ئـەوە گەورەتریـن جیاوازییـە بكەوێتـە نێـوان دوو مەخلوقـەوە... بیـرت نەچێـت، مـن غـەزەل دەڵێـم، غـەزەل... شـاری خەیاڵـی و گەڕەكـی ئەفسـانەیی دروسـت ناكـەم، مـن غـەزەل دەنوسـم... ئەوانـەی خەیاڵیـان هەیـە لـەم دونیایـە هەڵنایـەن، بیـر لـە چارەنوسـی هەمـوو مەخلوقاتەكانـی سـەر ئـەم زەوییـە دەكەنـەوە، بـە تەنـگ گـوڵ و میرووولەكانیشـەوە دێـن. مـن وام عەزیـزم مـن وام. بـەڵام ئـەوەی خەونـی هەیـە دەیەوێـت هەمـوو ئادەمیـزادەكان بخاتـە خزمەتـی ئـەو خەونـەی خۆیـەوە... جەواهیـری سـەرفراز، دیكتاتۆرەكانـی دونیـا، حاكمـە دڵڕەقـەكان،

ئیمپراتۆرە سامناکەکان، هەموو خەونیان هەبووە. بەڵام شاعیرەکان خەیاڵیان هەیە... ترسناکترین شت ئەوەیە خەیاڵ وەرگەڕێت و ببێتە خەون... دەبێت خەیاڵ وەرگەڕێت و ببێتە هێزی بینینی حەقیقەت... من وا لە دونیا گەیشتووم».

وەک ئەوەی کابرای غەریب سەراسیمە و دەستەوەستان بێت، وەک لەو جیاکارییە سەیر و توندە تێنەگات کە غەزەلنوس باسیدەکات، گووتی «جەنابی غەزەلنوس، خەیاڵ چ سوودێکی هەیە گەر موعجیزەیەک دروست نەکات. ئیشی خەیاڵداری گەورە ئەوە نییە خۆی بە چارەنوسی مەخلوقاتە نزم و بچوکەکانەوە سەرقاڵبکات. مێژووی مرۆڤایەتی هەرەمەکان و تاج مەحەل و شورای چینی پاراستووە، نەوەک چارەنوسی گوڵ و مێرووله وەک ئێوە دەڵێن. لێگەڕێ گوڵ بۆ خۆی بگەشێتەوە و بمرێت، بەڵام مەهێڵە خەیاڵتان بەخەسار بچێت و بێنیشانەبەسەر زەویدا بڕوات. غەزەلنوس من و تۆ دۆست نین، بەڵام ماوەیەکە عەزیزم لەدوای سۆراغی تۆم، من نرخی تۆ دەزانم... خەیاڵی تۆ دەتوانێت دینەمۆیەکی مەزن و بزوێنی موعجیزەیەک بێت، ئەم ڕۆحلەبەرە جوانانە هێزێکی لەبننەهاتوون... هێزێکی گەورەن و واهەستدەکەم کلیلی هەندێکیان لەلای تۆ بێت. گوێبگرە عەزیزم، لەشەڕی سەفەوی و عوسمانییەکانەوە ئەم شار و گوند و عەردەی من و تۆ، ئیمپراتۆر و لەشکر و حاکم پیاتێدەپەڕن، لە پێش ئەو زەمانەشەوە ئەم خاکە هەر پڕبووە لە شاعیر و غەزەلنوس، بەڵام سەیرکە ئەم خاکەی من و تۆ شوێن دەستی هیچ خەیاڵێکی پێوە دیار نییە... ساڵەهای ساڵە وەک شێت دەگەڕێم و دەڵێم کوا خەیاڵ؟ کوا خەیاڵ؟ ئاه... وێرانەیە، وێرانە. غەزەلنوس ئەو کتێبانەم پێبفرۆشە، ئەو غەزەلانەم بدەرێ، با لەم شارەدا گەڕەکێک دروستبکەم بێوێنەبێت، شتێک لە یادەوری بەشەرییەتدا بمێنێتەوە... ئەم شارەی من و تۆ دەبێت شتێک دروستبکات، موعجیزەیەکی هەبێت تا دونیا سەری بۆ

نزمبکاتـەوە، ڕێزبیگرێـت، بیپارێزێـت».

غەزەلنـوس چەنـد جارێـک بـە تێفکرینـەوە چاویلکـە چکۆلانەکـەی پاککـردەوە و گووتـی « عەزیـزم قسـەکانی تـۆ قەشـەنگن، منیـش حەزدەکـەم ئـەم شـارە خاوەنـی ئەفسـانەی خـۆی بێـت، بەڵـێ شـارێکی بێخەیـاڵ و فەقیـرە... لەگەڵتـدام، گەڕەکەکانـی تۆزاوی و تەسـک و نارێکن. شـەقامەکانی پیـس و بێسـەوزی و بێڕەنگـن. بـەڵام مرۆڤـەکان ناتوانـن خەیاڵـی خۆیـان یەکبخـەن، لەوانەیـە بتوانـن بـە کۆمـەڵ یـەک حەقیقەتیـان هەبێـت، بـەڵام ناتوانـن بـە کۆمـەڵ یـەک خەیاڵیـان هەبێـت... چونکـە جەوهـەری ئـازادی ئینسـان لـە خەیاڵیایەتـی، چۆن شـیعری شـاعیرەکانی دونیـا لەیـەک ناچـن، خەیاڵـی مرۆڤەکانیـش لـە یـەک ناچـن... بیهێنـە پێشـچاوی خـۆت هەمـوو شـاعیرانی دونیـا بـۆ نوسـینەوەی شـیعرێک کۆبووبێنـەوە، بیهێنـە پێشـچاوی خـۆت، لەوانەیـە ئـەو شـیعرە دواجـار تێکسـتێکی بێمانـا دەربچێـت، چونکـە ڕۆحـی ڕاسـتەقینەی هیـچ یەکێکیانـی تیـا نییـە. خەیاڵـی هـەر مرۆڤێـک بـە ڕۆح و بوونـی ئـەوەوە گرێـدراوە... شـتێک نییـە بچێتـە نـاو هیـچ خەونێکـی گـەورەوە... بـڕۆ گەڕەکێکـی خەیاڵـی بـۆ خـۆت دروسـتبکە... نەخشـەکەت کۆبکـەرەوە و بـڕۆ، تـۆ دەتوانیـت بێیـت و بـە خەیاڵـی منـدا سـەفەریکەیت، بـەڵام ناتوانیـت خەیاڵـی مـن بەریـت بـۆ خـۆت... دەتوانیـت مـن داوەتبکەیـت و بـەو شـارە خەیاڵییـەی خۆتـدا بمگێڕیـت، بـەڵام ناتوانیـت بمکەیتـە کرێـکار لـەو شـارەدا. ئەهرامـەکان موعجیـزەی خەیـاڵ نیـن... موعجیـزەی ئیشـن... موعجیـزەی ماندوێتیـن. گەورەتریـن موعجیـزەی خەیـاڵ ئەوەیـە مرۆڤێـک دروسـتبکات بـە قووڵـی لـەم دونیایـە تێبـگات، هەمیشـە عاشـق و ئیلهامبەخـش بێـت... لەوەدەرچێـت، خەیـاڵ موعجیزەیەکـی تـری نییـە».

جەواهیـر سـەرفراز بێئـەوەی خـۆی زویـر نیشـانبدات گووتـی « خەیـاڵ بـە تەنیـا دەبێتـە وڕێنەیەکـی بێنـرخ. لەمێـژە ئـەم دەردە گەورەیـە دەناسـم، دەردێکـی کۆنـە شـاعیران و نوسـەران زۆر تووشـی هاتـوون. منیـش دەزانـم

خەیاڵ توانا و قودرەتە، بەڵام بۆ ئەوەی شتێک بەجێبهێڵێت، دەبێت لە ناو نەخشەیەکدا ئیشبکات... تۆ ئەو نەخشەیەت لانییە، ئەو نەخشەیە لای منە... دەبێت من و تۆ کۆمەکی یەک بکەین».

غەزەلنوس هەرکات ئاوها بە ئارامی لەسەر کورسییەکەی خۆی دابنیشتایە، بیرمەندتر و حەکیمتر دەینواند، بێئەوەی ڕاستەوخۆ تەماشای میوانەکەی بکات، بە پێکەنینەوە گووتی «بەڵام خەیاڵ نەخشەیەکی خۆی هەیە، هیچ کەس ناتوانێت بزانێت نەخشەی خەیاڵ چییە، مرۆڤ کە زانی خەیاڵ بەرەو کوێ دەڕوات، چیتر خەیاڵ نییە. هاوڕێم تۆ لەوەدا هەڵەیت، ببورە، ببورە بەڕێز، تۆ خەیاڵ وەک جۆرێک لە دیکۆر تەماشادەکەیت، لە کاتێکدا خەیاڵ ژیانی ڕاستەقینەی ئێمەیە... خەیاڵی ئێمە ناتوانێت ژیان جوان بکات، چونکە بەشێکە لە ژیان خۆی. تۆ دەتەوێت خەیاڵ لە شێوەی شارێکدا، کوچەیەکدا، گەڕەکێکدا دروستبکەیت... وەک پادشاکان، وەک ئەمیر و سیاسەتمەدار و سەرکردەکان کە هەمیشە حوکمڕانی بە خەونێک و بە خورافەتێک دەڕازێننەوە... هەموو پادشایەک و ئەمیرێک کە لە بینینی حەقیقەت بێزاردەبێت، بیر لە خەونی گەورە دەکاتەوە. بەڵام برام، تۆ شتێک فەرامۆشدەکەیت، بەدرێژایی مێژوو، ئەو کەسانەی خاوەن خەیاڵی قووڵ و گەورەبوون خەڵکێک بوون گومانیان لە بوونی بەهەشت هەبووە. بەهەشتی مرۆڤە خەیاڵییەکان لە ناو ڕۆحیاندایە، لە خەیاڵیاندایە، لەو ئیشراقانەدایە کە نیشانی جیهانی دەدەن. بەهەشتی من لە عەشقە ناکام و بێدەرەنجامەکانمدایە، لەو دیو دەرگای ئەو باغانەوەیە کە دەبێت بە ئاراستەیان بڕۆم. خەیاڵ هێزە، بەڵێ، برای ئازیزم تۆ لەسەر هەقیت، خەیاڵ هێزە... بەڵام خەیاڵ تەنیا دەستکاری ڕۆح دەکات، نەوەک دەستکاری دونیا».

جەواهیری سەرفراز بە سەبرەوە گووتی « غەزەلنوسی عەزیز، پێمبڵێ، ئایا ئەم شارە شایستەی شتێک نییە، دواتر هەستبکەین

ئادەمیزادەكانی سەر ئەم زەوییە خەیاڵیان هەبووە؟ شایستەی ئەوە نییە؟. من نە فەیلەسوفم و نە شاعیر، من بەڵێندەرم، ئا ئاغام، من بەڵێندەرم، جەواهیری سەرفراز ڕاوكەری شاكارەكان و ڕاوكەری ڕۆحەكان و خەیاڵە جوانەكانە. من دەزانم دەتوانم چ جۆرە شارێك دروستبكەم... بەڵام پێشوەخت دەبێت هێزی تۆم لەگەڵدا بێت، ها ئاغای پڕ غەزەل، چیت دەوێت ؟... چی شتێكت لە سامان و موڵكی دونیات دەوێت تا بیخەمە بەردەستت... ئەو مەملەكەتەی من خەونی پێوە دەبینم بێ شاعیران، بێ غەزەلنوسان، بێ دەنگخۆشە گەورەكانی ئەم شارە... دروست نابێت. چ كۆشكێكت حەز لێیە لەم شارەدا، چ كێڵگەیەك، چ مەزرایەك، چ ئافرەتێك، چ شتێكی مەحاڵ پێمبڵێ... پێكەوە من و تۆ شارێك یان گەڕەكێك دروستدەكەین كە خەیاڵی تۆ و هێزی من پێكەوە نەخشەی دادەڕێژن... گەڕەكێكی جوان و بچكۆلە... من لەوباوەڕەدام، مرۆڤ بەبێ خەیاڵ ناتوانێت حوكمڕانی ئەم وڵاتە بكات... بۆ وەك دوژمن سەیرمدەكەیت؟... بۆ لە مانای حەرفەكانم ناگەیت... ئەگەر دەتەوێت دونیا جوان بێت دەبێت شاعیر لە بورجی خۆی بێتەدەرێ، پادشاش لە كۆشكی خۆی دەرچێت، دەبێت پێكەوە لە ناوەڕاستی شەقامێكدا بەیەكبگەن و لەوێدا، بەڵێ عەزیزم ئا لەوێدا بیر لە دروستكردنی شتێكی تر بكەنەوە. ئەوا من هاتوومەتەماڵی تۆ... هاتوومە بەر دەرگات، من ڕقم لە كەللەڕەقی و بەدهەوایی و سەرسەختییە... تێبگە غەزەلنوس ترسناكە پادشاكان نائومێدبكەیت، تێبگە هیچ شتێك لە پادشایەك ترسناكتر نییە كە بە تووڕەیی بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ. خۆت بخەرە دۆخی ئەوەوە، پادشایت و دەتەوێت دونیا جوان بكەیت و كەس نییە كۆمەكت پێبكات... ها... ترسناكە پادشا كەسێك نەدۆزێتەوە دونیای لەگەڵدا جوانبكات... دەستی خۆتم بەرێ و بیدەنگ بە».

غەزەلنوس گووتی« ناتوانم دەستی خۆمت بدەمێ. خەیاڵ بۆ ئەوە

نەدراوە بە مرۆڤ پیسی و کارەسات و ویرانەیی جوانبکات. باغەکانی خەیاڵ بۆیە جوانن چونکە نابنە دیکۆری حەقیقەت. گەر خەیاڵ ببێتە شتێک کە ڕاستی دەشارێتەوە، دەبێتە هێزێکی ترسناک... بمبورە ئەی برای غەریب، واهەستدەکەم تۆ دەتەوێت من و تۆ پێکەوە شتێک دروستبکەین کە پیسی و ناشیرینی ئەم شارە بشارێتەوە... گەر دەتەوێت خەیاڵی من کۆمەکت پێبکات، شتێک مەکە ئەم هەموو دزێوییە نەبینین، خەیاڵ سەفەرێکی قەشەنگە، بەڵام نابێت کارەسات لەبیر مرۆڤ بەرێتەوە».

جەواهیری سەرفراز دەیگووت «غەزەلنوس، بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ کارەسات و دڵتەنگی و غەم هەبووە و هەر دەمێنێت. تێبگە، مرۆڤ ناتوانێت بەهەشتێکی گەورە دروستبکات، بەڵام دەتوانێت هەندێک بەهەشتی بچوک بچوک دروستبکات... هیچ کەس، هیچ سەرۆک و شاهەنشا و میرێکی سەر زەوی نەیتوانیوەغەم و خوێن بسڕێتەوە، بەڵام دەتوانێت شتێکبکات هەستی مرۆڤ بە غەم و خوێن کەمتر بێت... ئەوەیە ئومێدی من».

غەزەلنوس دەیگووت «نازانم پادشاکان دەتوانن چیبکەن... نازانم. بەڵام دڵنیام خەیاڵ بۆ ئەوە نەهاتووە، هەستی غەم لە مرۆڤدا بکوژێت... ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان ڕۆحلەبەری غەمگینن».

ئەو شەوە جەواهیر سەرفراز هەوڵێکی زۆری دا غەزەلنوس والێبکات، لە دروستکردنی گەڕەکی خەونەکاندا کۆمەکیبکات. بەڵام بێسوود بوو. شەوێکی درەنگ بە هێمنی لە ماڵی غەزەلنوس هاتەدەرێ، بەڵام لەقووڵایی دڵیدا هەستی بەڕقێکی قووڵکرد، ڕقێک لەوەوبەر کەمتر هەستی پێکردبوو، پڕ بەدڵ ئەو خواستە لە ڕۆحیدا بوو بگەڕێتەوە و بیکوژێت.

# ژنی بارۆنی مریشك بەوردی چیرۆكی نەوجەوانی چینی بۆ گێڕامەوە
# تەموزی ٢٠٠٤

دوای حیکایەتێکی درێژ دەربارەی فیلێکی گەورە کە ئەستێرە لەلایەکی ئاسمانەوە دەبات بۆ لایەکی تر، لە ماڵی «بارۆنی شیر و شەکر» هاتمەدەرێ. دەبایە بچووبامایە بۆ ماڵی بارۆنی هەرمێ، تا بۆ کچەکەی ئەویش حیکایەتێکی نوێ بگێڕمەوە. وەک جاران لە دەرگای ماڵی بارۆنمدا و ئیشکەرێکی منداڵ دەرگای کردەوە، بە هێمنی بە پلەکانی کۆشکی میری هەرمێدا سەرکەوتم، کچەکەی بارۆنی هەرمێ ناوی «ڕۆژان» بوو، یەکێک بوو لەو منداڵە شیرینانەی هەردەم بەر لەوەی بگەمە ناوەڕاستی چیرۆکەکان خەوی لێدەکەوت. بەڵام پرسیاری زیرەکانەی لێدەکردم، پرسیارگەلێک منی دەخستە سەر ئەو بڕوایەی منداڵان پێکڕا، هەتا ئەوانەی کە لە ناوەڕاستی حیکایەتیشدا دەخەون، مەخلوقاتی بلیمەتن. ئەو ڕۆژە وەک هەمیشە دەرگای ژوورەکەی خانمی چکۆلەم کردەوە، بەڵام سەرسام و سەراسیمە لەگەڵ ڕۆژانی ناسک و شیریندا «کە ئەو ڕۆژە دوو پرچی ڕەشی چکۆلانەی دروستکردبوو» دوو خانمی قەشەنگ و بە ویقارم لە ژوورەکەدا بینی. دەمودەست ژنی بارۆنی مریشکم ناسییەوە. تەنورەیەکی کەمێک تەسک و کورتی لە بەردابوو، گەنجتر و چێژبەخشتر هاتە پێشچاوم لەو شەوەی لە ئاهەنگەکەدا بینیم. پێدەچوو خانمەکەی دیکە، ژنی بارۆنی هەرمێ بێت. پاش سڵاوێکی کورت، ئەو لەگەڵ منداڵەکەیدا بە خێرایی ژوورەکەیان بۆ من و خاتوونی مریشک چۆڵکرد. ژنی بارۆنی مریشک ئەم ڕێگایەی بە باشترین ڕێگا زانیبوو بۆ ئەوەی من ببینێت و کەسیش گومانی لێ نەکات. کراسێکی پرتەقاڵی لە بەردابوو،

قژێکی خاوی مێشکراو، دەموچاوی باریک و چاوەکانی کراوە و غەمگین بوون. ژنێکی جوان بوو، بەڵام پێدەچوو لە ویقاریدا لاسایی یەکێکی دی بکاتەوە، دەستەکانی پڕبوون لە بازن، مەکیاجێکی تەنکی کردبوو کە بە مەکیاجی یەکێک دەچوو تازە لە پرسە هاتبێتەدەرێ، گوڵێکی ئاڵتونی گەورەی دابوو لەسەر سنگی. هەر لە سەرەتاوە شتێک لە ترس و شەرمم لە چاویدا بینی، کە کەمتر لە چاوی خانمە بارۆنەکاندا دەردەکەوت. کە ژوورەکە چۆڵبوو، بەرلەوەی ئەو قسەبکات، گووتم «خانمی ئازیزم، ببورە، ببورە من ئەو شەوە ئێجگار نەزان و بێحورمەتانە، ئامەنگەکەم لە ئێوە تێکدا... باوەڕتبێت، مەبەستێکی لەو جۆرەم نەبوو، بەڵام ڕێگایەکی ترم شک نەدەبرد... دەبایە ئێوە بزانن من دەمەوێت قسەتان لەگەڵدا بکەم».

وەک ئەو ژنانەی کە لە کاتی قسەکردندا سەیری شوێنێکی نادیار دەکەن، سەیرێکی دەستی کرد و بە ئەسپایی پرسی «تۆ کێیت و چی دەکەیت لە نوێمیران، دڵنیام تۆ بۆ شتێکی تر هاتوویتە ئێرە؟... دڵنیام». بە ئەسپایی گووتم «بەڕێز من بۆ حیکایەتکردن بۆ منداڵان هاتوومەتە نوێمیران، بەڵام زۆر مەبەستیشم بوو ئێوە ببینم، من لە ڕێکخراوێکی بیانیدا ئیشدەکەم کە سۆراغی خەڵکانی ونبوو دەکەن، دەبایە هەندێک زانیاری کەم لەسەر موراد جەمیل کۆبکەمەوە، گەڕان و پشکنینەکانم بۆ لای ئێوەیان هێنام... خانمێک کە یەکێک بوو لە دۆستە زۆرەکانی موراد جەمیل ناوی ئێوەی بۆ من هێنا، وەک ئەوەی دوا نهێنی موراد جەمیل لای ئێوە بێت، بەڵام لە ڕاستیدا من تا ئێستا ناوی ڕاستەقینەی ئێوە نازانم، هەموو هەر بە ژنی بارۆنی مریشک ناوتاندەهێنن».

بە چاوە غەمگینەکانی سەیریکردم و بزەیەکی تەنک و پڕ تەلیسم کەوتە سەر لێوی و گووتی «ناوم سەیرانە، زۆربەی ژنی بارۆنەکان وەختە ناوی

خۆیان بیربچێتەوە، کەس ناوی ڕاستەقینەی ئێمە بە کارناهێنێت. وەک ئەوەی شەرم و شورەیی بێت یان شتێک». کە بەو جۆرە قسەیکرد، گەلێک جوان و ناسک هاتە بەرچاوم، سادەیی و پاکییەکم تیابینی تا ئەوکات وامدەزانی مرۆڤ لە نوێمیران دەستی ناکەوێت و نایدۆزێتەوە. لەگەڵ قسە و تەماشا و جوڵەکانیدا تێگەیشتم لەو ژنانەیە، کە حەزیان بە هەموو شتێکە و لە هەموو شتێکیش دەترسن، سەرەتا قفڵدار و ڕووبەست دەنوێنن، کە دەشکرێنەوە بێسنوور و بێلەمپەر واڵادەبن. هەر بە هەمان سادەییەوە گووتی «ئێمە بە مورادمان دەگووت «نەوجەوانی چینی»»، وەک چۆن لە حیکایەتە کۆنەکانی جاراندا کە بە منداڵی بۆیان دەکردین، کوڕی پادشا دەچێتە ئەشکەوتێکەوە و نیگاری کچێک دەدۆزێتەوە و عاشقی دەبێت، دوای دەردەکەوێت ئەو وێنەیە نیگاری کچی پادشای چین و ماچینە، موراد جەمیلیش ئاوهابوو، هەر کەسێک وێنەکەی بدیبایە یەکسەر عاشقی دەبوو، لە کوڕە پادشایەک دەچوو کە خۆی گۆڕی بێت و هاتبێت بۆ ئەم شارە، لەبەرئەوە من و ژنەکانی هاوڕێم بە کوڕی پادشای چین و ماچین ناوماندەنا، ناوە نهێنییەکەی لە نێوماندا «نەوجەوانی چینی» بوو».

پێشتر ئەو ناوەم نەبیستبوو. بە سەرسامی سەیرمکرد و گووتم «نەوجەوانی چینی... نەوجەوانی چینی... ناوێکی سەیرە، وەک ناوی نێو حیکایەتێک». هەستمکرد زۆر خێرا لەگەڵمدا دەکرێتەوە، وەک ئەوەی ئەو نهێنییەی کەوتۆتە نێوانمان پردێکی پتەوی لە بڕوا لەلا دروستکردبێت، کەمێک تەنورە تەسکەکەی ڕاکێشا کە لەگەڵ دانیشتندا تادەهات کورتتر دەبووەوە و گووتی «پیاوی کورد هەزار ساڵە، هەر وەخت لە حیکایەتێکدا باس لە جوانی بکەن دەڵێن « دەتگووت کچی پادشای چین و ماچینە » «دەتگووت کچی قەڕاڵی فەرەنگە» ها... وا نییە. نەبوو جارێک بەڕاستی جوانی ئێمە بکەن بە ناونیشان، وانییە کاک ماجید، وانییە. ئێمەش کە

جوانی موورادمان بینی، کە هەموو پێکڕا عاشقی ئەو بووین، کە وەها تەلیسمی لێکردبووین، تۆڵەی ئەو هەزار ساڵەمان بەو جۆرە کردەوە، جوانی موورادیش لە جوانی پیاوانی ئەم شارە نەدەچوو. وەک ئەوەی لە چین و ماچینەوە هاتبێت، وەک کوڕی قەڕاڵی فەرەنگ بێت. شتێکی تر بوو، ئەو شتێکی تر بوو. هەستدەکەم خۆیشی زۆر حەزی لەو ناوەدەکرد، من بەردەوام پێمدەگووت نەوجەوانی چینی. یەکەمجار کە بینیم خۆم نەگرت و پێمگووت تۆ خەڵکی چ شار و مەملەکەتێکی وەها جوانیت؟ پێشتر وام بە هیچ پیاوێک نەگوتبوو. سەیریکردم و بەو دەنگە پڕ سۆزەیەوە کە هەموو ئافرەتێکی شێتدەکرد، بە پێکەنینەوە گووتی خەڵکی چین و ماچینم». وەک بیر لە یادگارێکی تاڵ بکاتەوە گووتی « هەندێک لە ژنانی نوێمیران ناویان نابوو «نەوجەوانی فەرەنگی»، بەڵام من حەزمدەکرد پێیبڵێم «نەوجەوانی چینی». من زۆر حەزم لەو ناوە بوو. نازانم چ کچێک یان ژنێک دایهێنابوو... مووراد لە دەرەوەی نوێمیران ئافرەتی زۆری دەناسی، لەوانەیە یەکێک لەوان ئەو ناوەی پێبەخشیبێت، لەوانەیە خۆی بە خۆی بەخشیبێت، کەس نازانێت. گرنگ ئەوەبوو لای ئێمە ناوی نەوجەوانی چینی بوو». بەرابەر سەیران خان دانیشتم، دەستەسڕێکی سپیم لە جانتاکەم دەرهێنا و گووتم «خانم دەزانیت، کە مووراد چی بەسەر هاتووە، دەزانیت؟». بە غەمەوە سەیریکردم و گووتی «هەموو دەزانین چی لێهاتووە، هەموو دەزانین، هیچ ژنێک نییە لە نوێمیران نەزانێت چی لێهاتووە، بەڵام چۆن و کەی و لە کوێ، کەس نازانێت... کەس نازانێت». من بە غەمەوە پێمگووت «نهێنییەکت پێدەڵێم، نابێت لای هیچ کەس بیدرکێنیت، من زانیاری تەواوم هەیە کە مووراد جەمیل کوژراوە... زانیاری تەواو». وەک من دەستەسڕێکی لە جانتاکەی دەرهێنا و فرمێسکێکی چکۆلانەی سڕی و گووتی «هەموو دەزانین کە کوژراوە... هەموو دەزانین».

ئەو شەوە لەبری ئەوەی من حیكایەت بۆ كچەكەی بارۆنی هەرمێ بكەم، ژنی بارۆنی مریشك، منی دانا و حیكایەتی ڕاستەقینەی نەوجەوانی چینی لە نوكەوە بۆ گێڕامەوە، هەڵبەت چیرۆكەكە وەها درێژ و پڕناوە كە گێڕانەوەی بەتەواوەتی زیانێكی زۆری بۆسەر ئابڕووی گشتی و ئەخلاقی كۆمەڵایەتیمان هەیە، لەبەرئەوە بە ناچاری بەمجۆرە بۆتان كورتدەكەمەوە

«نەوجەوانی چینی گەنجێكی ئاسایی نێچگار جوان دەبێت، كوڕی یەكێكە لە خێزانە هەژار یان مامناوەندەییەكانی ئەم شارە، كە خودا بەهرەیەكی بێوێنەی دەداتێ كە لە زۆرینەی پیاوانی دونیای حەرامكردوە، ئەویش ئەوەیە زۆرینەی ئەو ئافرەتانەی دەكەونە سەرڕێگای حەزی لێدەكەن. هەڵبەت نیعمەتێكی وەها، كە هەموو پیاوێكی دونیا خەونی پێوەدەبینێت، لە شارێكی وەها ڕۆحتەنگ و دڵخاڵیدا دیوێكی ترسناكیشی هەیە. بەڵام موراد گوێ بەو دیوە ترسناكەی پەیوەندییە زۆرەكانی نادات. شتێك لە فەرهەنگیدا نییە ناوی بەقا و مانەوە بێت، لە یەككاتدا دەتوانێت بێشومار ژنی خۆشبوێت و بێشومار پەیوەندی ببەستێت. سەیر لەوەدایە هیچ ژنێكیش نایەوێت موراد بۆ خۆی داگیربكات، وەك ئەوەی هەموو ژنێك بزانێت كە موراد جۆرێكە لە مرواری، مرۆڤ ناتوانێت هەڵیگرێت بۆ خۆی، بەڵكو دەتوانێت تەنیا جارێك دەستێكی لێبدات یاخود نیگایەكی بكات، یان بۆ جارێك یان دووان بیباتە ناو جێگاوە. بەرلەوەی ئەو گەڕەكە گەورەیەی نوێمیران دروست ببێت و خانەوادە خانەدانەكان بێنە ئەم بەشە تایبەتی و ناوازەیەوە كەسەرەتا میراوایان پێدەگووت، موراد سەرەتا لەگەڵ كچی یەكێك لەوانەدا دەبێتە دۆست كە ترێلە شۆفل و لۆری گەورەیان دەنارد بۆ ئێران. كوڕەكە سەرەتا شۆفێری لۆری دەبێت، بەهۆی ئەوەی كە ئیشی ئەوەیە لۆرییەكان تا سەر سنوور لێبخوڕێت، دەرگایەكی لێدەكرێتەوە تا ئاسان تێكەڵاوی ماڵە دەوڵەمەندەكان و خەڵكانی پارەداربێت. لەبەر هەر هۆیەك بێت موراد زووتر و بێگرفتتر

لە هەر شۆفێرێکی تر کەلوپەل و بار و ماشێنەکان لە پاسگە و خاڵەکانی گومرگ دەپەڕێنێتەوە، ئەوە وادەکات خۆشەویست و شوێنی متمانەبێت. بەرلەوەی موراد بکەوێتە ناو ژنانی خانەدان و میرئاسای شارەوە، پەیوەندی گەلێکی زۆری لەگەڵ کچانی هەژار و خانمە فەرمانبەرە بێهیواکاندا هەبووە، کە بەجوانی خۆی و بە غەزەلەکانی مەستیدەکردن. بەڵێ بەغەزەلەکانی، من بۆ یەکەمجار لە دەمی ژنی بارۆنی مریشکم بیست کە موراد جەمیل شیعر بێژ و غەزەلخوێنێکی دەنگخۆش و مەستهێن بووە. ئەمرۆ هەموو دەزانن ئەوەی ژنانی نوێمیرانی تووشی دەردی «نەوجەوانی چینی» کرد، ئەو وێنەیە بوو کە لە دەستی خانمی گوڵبەهارەوە داکەوت «کە دیارە لە بەر هەندێک هۆی ئەخلاقی ناوی ڕاستەقینەی خۆی لێرەدا ئاشکرا ناکەین». پێدەچێت گوڵبەهار لەسەرەتای ساڵی دوو هەزاردا عاشقی نەوجەوانی چینی بووبێت، زۆربەی ژنانی نوێمیران ئێستاش گوناهی ئەو دەردە کە زیاتر لە ئەنفلۆنزایەکی سەخت دەچێت تا عەشق، دەخەنە پاڵ گوڵبەهار. گوڵبەهار ئەو وێنەیە دەهێنێت و پیشانی ژنی بارۆنی هەنگوینی دەدات، کە ئەوکات بەرلەوەی وشەی بارۆن داکەوێت، پێیاندەگووت «میری میرانی هەنگوین». ژنی هەنگوین بەجۆرێک ئالودەی وێنەکە دەبێت، خراپتر لە ئالودەبوونی پاڵەوانی حیکایەتە کۆنەکەمان بە نیگاری هەڵکەنراوی ناو ئەشکەوتەکە، سوێند دەخوات کە ئەو وێنەیە ڕاستی نییە و مەخلوقی وەها مەگەر لە خاکی چین و ماچیندا هەبێت، واتە لە خاکی خەیاڵ و ئەفسانەدا. ئەوە گوڵبەهار ناچاردەکات، بۆنەیەک بدۆزێتەوە کە نەوجەوانی چینی پیشانی ژنی هەنگوین ئاغا بدات. پێدەچێت یەکەم یەکدی بینینی نێوان ئەو دووانە لە دوکانی ستیانفرۆشێکی هاوڕێی موراد بووبێت، ژنی بارۆن کە هەڵبەت خانمێکی بەحورمەت و پڕ ڕێزە و پێشتر چ جۆرە سەرکەشییەکی ژنانە و بێحیسابی نییە، دوای ئەوەی موراد دەبینێت، دوای ئەوەی گوێی

لە یەک دوو غەزەل دەبێت عاشقی موراد دەبێت. ئەم حاڵەتە بۆ هەموو عاشقەکانی دیکەی موراد جەمیلیش ڕاستە. گوڵبەهار کە دڵنیایە ناتوانێت موراد بۆ خۆی هەڵگرێت و تا قیامەت بە موڵکی خۆی حیسابیبکات. لەخۆبوردوانە و بێهەرا و بگرەیەکی ئەوتۆ، کە لەم جۆرە ڕەوشانەدا زۆر لە نێوان ژناندا پێکدێت، بۆ ژنی بارۆنی هەنگوین دەست لە موراد بەردەدات. هەموو ئەو کیژ و خانمانەی بە خۆشەویستی مورادا تێپەڕیوون، دوای کە ناچاردەبن بۆ خانمێک یان کیژێکی دی دەست لە موراد بەردەن، وامەستدەکەن تەواوی ئەو ئەزموونەیان هیچ نەبووە جگە لە خەونێک، سەفەرێک بۆ ئاسمان، گرتنی سەرابێک بۆ ماوەیەکی کورت، هەمووش بە ئەندازەیەک لە یەکتر تێدەگەن، هیچ یەکێکیان هەست ناکات بەو پەیوەندییە حەرامێکی شکاندبێت یاخود شەرەفی لکەیەکی گرتبێت. دواجار موراد وەک خەونێکی دەستاودەستی لێدێت کە هەموو خانمە جوان و بێکەس و مەحرومەکانی نوێمیران یەک دەیدەن بەوی دیکەیان. تاکە شتێک لەو خەونەدا دەگۆڕدرێت کورتی و درێژییەکەیەتی، کە پێدەچێت تاکە شتێکیش بێت موراد خۆی ڕکێفی بەسەریدا هەبوو بێت. ئەوەی موراد لە نوێمیران و لە نێو خانەدان و پارەداران و ئاهەنگەکانیاندا دەکاتە میوانی هەمیشەیی ئەوەیە کە سەردەمێک واز لە شۆفێری لۆری دەهێنێت، لەگەڵ خاوەنی یەکێک لە هۆڵە گەورەکانی شاردا دەبێتە ڕێکخەر بۆ ئاهەنگی شەکراو و شایی و ڕۆژی لەدایکبوون. لەو هۆڵەدا ژنان و کیژانی گەنج بە بەردەمیدا دەڕۆن و بە شەپۆل عاشقی دەبن. پێدەچێت کوڕەکە لە دوا دوو ساڵی ژیانیدا مەیلێکی زۆری بەلای کچ و ژنە دەوڵەمەندەکاندا لادروستبووبێت، بێئەوەی لە هەندێک پەیوەندی خێرای دیکەش لە گەڕەک و کۆڵانە هەژارەکاندا دەستی پاراستبێت. کەس بە دروستی نازانێت چەند کیژ و چەند ژنی خانەدان بە ڕاستی پەیوەندیان لەگەڵ مورادا هەبووە، ئەوەی کە گرنگە

ئەو ئەستێرە سەیرانەیە کە لەسەر لەشی خانمان یان لە فەزای ئەو شوێنەدا جێیدەهێڵێت کە ژوانی تیادەکات، وەک ئەوەی کوڕی ئاسمان یاخود باڵیۆزی ئەستێرەکان بێت. هەر ئەو ئەستێرانەش دواجار نهێنی ئاشکرادەکەن. مرۆڤ ناتوانێت بزانێت ئاخۆ سەرەتا پیاوان و کوڕانی نوێمیران تا چەند ئاگاداری ئەو پەیوەندیانەبوون، بەوەدا موراد پەیوەندییەکانی زۆربوون و زوو زووش گۆڕیونی، کەس تاسەر نەیتوانیوە بەڵگەیەکی تەواوی لەسەر بگرێت، حیکایەتەکەشی لە ناو ژناندا وەک نهێنییەکی گەورە و موقەدەس کە پێکڕا دەبێت بیپارێزن، ئاسان نەچۆتەدەرەوە و نەبۆتە بابەتی غەیبەتە ئاساییەکان. ژنی بارۆنی مریشک ڕایوابوو کە نەوجەوانی چینی وەها فریشتەڕەنگ و خودایی دەرکەوتووە، پێکڕا ژنان وەک نهێنییەکی ئاینی سەیری عەشقی خۆیان بۆ ئەو گەنجە کردوە. ژنی بارۆن لە قسەکانیدا سێ جار بۆ منی دووپاتکردەوە کە «نەوجەوانی چینی، بۆنی خەیاڵی لێدەهات». ئەگەر چی من خۆم بە یەکێک لە پسپۆڕەکانی خەیاڵ دەزانی، بەڵام پێشتر جۆرە گوزارەیەکی وەک «بۆنی خەیاڵم» بەرگوێ نەکەوتبوو. وازەندەکەم کە گەر پیاوانی نوێمیرانیش بڕێک لەو حیکایەتەیان بیستبێت باوەڕیان پێنەکردوە. ئەوەی حیکایەتەکەی هێناوەتە سەر ئەو کۆتاییە غەمگینە، ئەوەیە کە پێدەچێت دواجار نەوجەوانی چینی خۆی عاشق بووبێت. ئەوە گۆڕانکارییەکی ترسناکی لە چۆنێتی و ئاڕاستەی یارییەکەدا دروستکردوە. حیکایەتەکە بەو جۆرەی من لە دەمی سەیران خانمم بیست، بەمشێوەیە بووە. ژنی بارۆنی مریشک دوا خانمە لەو زنجیرەیەدا کە موراد پەیوەندی لەگەڵیاندا هەبووە. بەڵام پێش ژنی بارۆنی مریشک، نەوجەوانی چینی حەزی لە ژنی بارۆنێکی گەنج کردوە بە ناوی «بارۆنی کولەکە»وە. ژنی بارۆنی کولەکە کە هەر وەک من لە دەمی خانمم بیست ناوی «باران شوکور» بووە، کە ئەویش کچێکی بێئەندازە جوان و گەنج بووە، بێئەندازە

سیحراوی، گەلەکیش پڕ لە خەیالات و حەز، کچەکە یەک دایکی پیری هەبووە کە چەند ساڵێک لەوەوبەر مردوە، لەوە زیاتر کەس هیچ شتێکی دەربارەی ئەسڵ و ڕەچەڵەکی نەزانیوە. نەوجەوانی چینی دوای باران شوکور بۆ ماوەیەک دەچێتە پەیوەندییەوە لەگەڵ ژنی بارۆنی مریشکدا. بەڵام نەوجەوانی چینی کە دەگاتە سەر نۆرەی خانمەکەی بارۆنی مریشک، وەها غەمگین و دڵتەنگە پێشتر کەس وەها نەیبینیوە. ئەو چەند جارەی نەوجەوانی چینی لەگەڵ ژنی بارۆنی مریشکدا دادەنیشێت، بەشی زۆری کاتەکەیان بەوەوە دەڕوات، فرمێسکەکانی موراد وشکبکاتەوە، کە شێتانە حەزی لە ژنی بارۆنی کولەکە کردوە و شەرم لەوەش ناکات بۆی بگری. موراد ناتوانێت هەرگیز باران شوکور لە بیربکات و تاکە ئومێدی ئەوەیە کە ژنی بارۆنی مریشک یارمەتیبدات. من لە قسەکانی خاتوونی مریشکەوە تێگەیشتم کە ئەو کەمتەرخەمییەکی نەکردوە، بە پێچەوانەوە پێدەچێت ژنی بارۆن دڵسۆزانە کۆمەکی بە هەردوو عاشقەکە کردبێت. ئەوە یەکەمجارە نەوجەوانی چینی هەنگاوێک بۆ دواوە بگەڕێتەوە و بۆ کۆنە یارێکی وەها پەرۆش و شێت بێت. لە قسەکانی ژنی بارۆنی مریشکەوە تێگەیشتم کە باران شوکور و نەوجەوانی چینی بۆ نزیکی ساڵێک لە پەیوەندیدا دەبن. ئەوەی چیرۆکەکەیان ئاشکرادەکات ئەو ئەستێرانەیە کە موراد لەسەر جەستەی ژنی بارۆن جێیدەهێڵێت و جار دوای جار دووبارەدەبێتەوە. موراد ئەستێرەکانی خۆی تەنیا لەسەر لەشی باران جێناهێڵێت، بەڵکو ئەستێرەکانی ئەو لەسەر دیوار و پێخەف و قەرەوێڵەکانیش جێدەمێنن. بارۆنی کولەکە کە کوڕێکی وریایە هەر زوو سەرەنجی ئەستێرەکان دەدات، بەوەدا بارۆنی کولەکە خۆشی کەسێکی داوێنپاک نییە پێدەچێت لە دەمی ژنێک لەو ژنانەی لەگەڵیاندا خەوتووە، حیکایەتی ئەو ئەستێرانەی بیستبێت و لە حەقیقەتی چیرۆکەکە تێگەیشتبێت. چیرۆکی ئەستێرەکان سەرەتا لە بارۆنی کولەکەوە

دادەکەوێـت، لـەوەوە هەندێـک لـە پیاوانـی نوێمیـران یـادەوەری خۆیـان تیژدەکەنـەوە و یادیـان دەکەوێتـەوە کـە ڕۆژێک لـە ڕۆژان ئەسـتێرەی سـەیر و ڕوناکـی گومـان لێکراویـان لـە سـەر لەشـی ژنەکانیـان و لـە فـەزای ماڵەکانیانـدا بینیـوە. لەڕێگای ئـەو حیکایەتـەوە زۆر لـە بارۆنـەکان ڕقێکـی شـێتانە و کوێـر لـە نەوجەوانـی چینـی هەڵدەگـرن. خانمـی بارۆنـی مریشـک پێیوابـوو، چیرۆکـی ئـەو ئەسـتێرانە ڕاسـت نییـە، بەڵکـو خـودی ئـەو ڕوناکییـە، جۆرە تیشـک و کرانـەوە و ڕوناکییەکـە کـە هەمـوو ژنێکـی ئاسـایی دوای ژوانێکـی ڕاسـتەقینە پێـی دەدرەوشـێتەوە. هەمـوو خانمێـک دوای خەوتنێکـی عاشـقانەی قـووڵ، کـە هەسـتبکات پیاوێـک هەیـە و بـە ڕاسـتی دەیەوێـت بیبـات بـۆ بەهەشـت، پـڕ دەبێـت لـە وەهـا جوانـی و وەهـا نورێـک. خانـم هەروەهـا ڕای وابـوو بـەوەدا ژیانـی نوێمیـران سـارد و تاریـک و بێڕۆشـناییە، ئـەو ئەسـتێرانە لێـرە ڕۆشـنتر و سـافتر دەرکەوتـوون. ئـەز بـۆ خـۆم لـە مێژوبـوو ئافرەتـم بـۆ گرنـگ نەبـوو، تـەواوی حیکایەتەکـەش بـۆ مـن وەک فلیمێـک وابـوو کـە لـە ژیانـی ڕاسـتەقینەدا تیـا دەژیـام، لەڕاسـتیدا نەمدەزانـی کـەی دەشـێت ئافـرەت بدرەوشـێتەوە و کـەی نەدرەوشـێتەوە، بەلاشـمەوە گرنـگ نەبـوو کـەی دەدرەوشـێتەوە یـان نادرەوشـێتەوە. بـەڵام دوای درەوشـانەوەکانی بـاران شـوکور، ئیـدی بارۆنـی کولەکـە ژمارەیەکـی زۆر چـاو دەخاتـە دوای تـا بـە تـەواوەتـی تێـدەگات ئـەو کـوڕەی ژنەکـەی شـێتانە عاشـقی بـووە مـوراد جەمیلـە. ژنـی بارۆنـی مریشـک بـاوەڕی وەهـا بـوو، بارۆنـی کولەکـە بـۆ ئـەوەی ئابـڕووی نەچێـت، بارانـی نـاردووە بـۆ لای خاڵێکـی لـە دەرەوەی وڵات، بـۆ ئەڵەمانیـا یـان ئینگلسـتان... دڵنیاشـبوو، کوشـتنی مـوراد بـە تەنیـا دەسـتی بارۆنـی کولەکـەی تێـدا نییـە، بەڵکـو پلانی ژمارەیەکی زۆر لە میر و ئاغا و بارۆنەکانی ئەم وڵاتەیە».

## یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

هیچ کەسێک لەم شارەدا نییە، ناوی جەواهیر سەرفراز بێت، ئەوە من بووم شەوێکی ئەیلولی دوو هەزار و دوو ڕووم لە ماڵی غەزەلنوس کرد و خۆم وەک کڕیاری دەستنوسی کۆن و ڕاوکەری شاکارە ئەدەبییەکان نیشاندا، ئەوەی من لە غەزەلنوس تێگەیشتم ئەوەبوو کە هەر مرۆڤە و شاری خەیاڵی خۆی هەیە، بەڵام ئەوەی لای من ترسناک بوو، ئەوەبوو کە ئەو وایدەزانی پادشا و شاعیر ناتوانن پێکەوە لە دروستکردنی شارێکدا ئیشبکەن. باوەڕی وابوو شاعیر شتێکی نییە پێشکەشی پادشای بکات. ئەو قسانەی لە خۆ بەبچوکزانییەوە سەرچاوەیان نەگرتبوو. بەڵکو لە هەواو غروری کەسێکەوە بوو کە دەزانێت دەڵێت چی. ئەویان وەک پیاوێکی سادە بۆ وەسفکردبووم، بەڵام بلندبین و سەرکەش هاتە پێشچاوم. ئێستا تێدەگەم کە غروری شاعیر جۆرە غرورێکە هەموو کەس نایبینێت. کاتێک قسەیدەکرد قووڵ سەیری نێو چاویم دەکرد، زۆر قووڵ. هەستمدەکرد شتی زۆر ترسناکی تێدایە. دەمزانی گەورەترین پرسیاری ئەو ساتەی ئەم شارە ئەوەیە چۆن شاعیر و پادشا، پێکەوە ئیشبکەن... چۆن پێکەوە لەسەر سفرەیەک دانیشن و بیر لە جوانکردنی ئەم شارە بکەنەوە، بیر لە چارەنوسی ئەم وڵاتە بکەنەوە کە تازە بە تازە نەسیمی ئازادی بەر ڕوخساری دەکەوت. خۆم لەوەچەی میر و بەگزادەکان بووم و دەمزانی سەرۆک بە تەنیا ئەوەی بۆ ناکرێت، دەزانم... من دە ساڵ زیاتربوو تێکەڵ بە سیاسەتمەدارەکانی ئەم مەملەکەتە بووبووم کەس نەیدەزانی چی دەکەن و چیان دەوێت. بە کۆمەڵێک کوێر دەچوون، لە ترۆپکی شاخێکی بەرزەوە بەرەو بنی خەرەندێکی قووڵ خلدەبوونەوە،

پێیانوابوو لە دامێنی ئەو شاخەدا دەکەونە باغێکی سەوزەوە، بەلام من دەمبینی کە بنی ئەو چیا سەختە هیچ نییە جگە لە خەرەندێکی بێبن. من دەمزانی لەگەڵیاندا تا بنی ئەو خەرەندە بەردەبمەوە، بەلام دەمویست شتێک بکەم، گەڕەکێک، باغێک، کوچەیەک دروستبکەم. دەمویست هەستبکەم کە من وەک ئەوان بەرنابمەوە، بەڵکو دەفڕم و خەون دەبینم. بەلام غەزەلنوس وەک ڕۆحێکی تەنیا ئیشیدەکرد من دەمویست خەیاڵی خۆیم بداتێ، ئەو باسی حەقیقەتی بۆ دەکردم. هەر ڕۆحلەبەرێکی خەیاڵی زۆر باسی حەقیقەت بکات، ترسناکە. من دوای ئەو دانیشتنەم لەگەڵ غەزەلنوسدا ماوەیەک چوومە خەڵوەتەوە و چەندین کتێبم لەسەر دەردی قووڵی شاعیرەکان و نەخۆشییە دەرونیەکانیان و ئەو بیمارییە جەستەیی و ڕۆحیانە خوێندەوە کە تووشی دێن. لە دەرەنجامی پشکنین و خوێندنەوەکانمدا گەیشتمە ئەو بڕوایەی شاعیران پێکڕا نەخۆشییەکی ترسناکیان هەیە، ئەویش ئەوەیە هەرکات داوایان لێدەکەیت لە بونیادنانی دونیادا بەشداربن، ئەوان بەرەو خەیاڵ و تەلیسم و ئەفسانە ڕادەکەن، کە لێشدەگەڕێیت ڕوو لە خەیاڵ بکەن و پێیاندەڵێیت ئاغایان فەرموو برۆن و ئەوهامی ڕەنگینی خۆتان بژین، دەگەڕێنەوە بۆ دونیا و بەدەنگی بەرز دژ بە پادشاکان و بە دونیا دەیکەنە دەنگەدەنگ و قسەکردن. بەدرێژایی مێژوو ئەوە دەردی شاعیران بووە. هاواری انا الحق ی حەلاج لە کاتی مردندا چییە جگە لە هەڵهاتنێکی خەیاڵی بۆ پێشەوە، یاخود تەماشاکردنی لۆرکا بۆ ئەستێرەکان پێش لە مردن... چییە جگە لە ڕاکردن بەرەو خەیاڵ. ئەو شەوە کە چووم بۆ لای غەزەلنوس داوام لێکرد کۆمەکمبکات، ئەو شتێکی هەبوو، کە ئێمە نەمانبوو، هێزێک دەیتوانی هەمووممان جوانبکات و بەهێزمانبکات. بەلام ئەو غرورە قووڵەی، ئەو خواستە شەیتانییەی کە دەست نەخاتە دەست مەخلوقێک وەک

خۆی شاعیر و خەیاڵناس نەبێت، ئەو خواستەی بڵێت «سەیرکەن، من گەرچی بوونەوەرێکی خەیاڵیم، بەلام دەتوانم حەقیقەتیش ببینم و لە شاگردانی ڕاستیش ڕوونتر بیدرکێنم»، ئەو شانازییە درۆیە کە شاعیران لە ئەلیادە و ئۆدیسەوە بە باڵای خۆیان بڕیوە، لە فیردەوسی و خەیام و موتەنەبی و مەولانا خالیدەوە تووشی هاتوون، هەموویم لە چاوی غەزەلنوسدا خوێندەوە... شاعیران بەهەشتێکی خۆیان هەیە پیشانی کەسی نادەن. وا هەستدەکەم لە دێرزەمانەوە وەها بووە، ئێمەی ئادەمیزاد هەموومان لە بەهەشت دەرچووین و ئەوان لەوێ ماونەتەوە. تێدەگەن؟ من لەدەرەنجامی گەڕانی زۆرمدا بەوەها ڕاستییەک گەیشتم. ئەو شەوە دەمتوانی بیکوژم. هەر وەختێک گوێم لە شاعیرێک دەبێت باس لە جیاوازی نێوان خۆی و دونیا دەکات دەمەوێت بیکوژم. زۆرجار دەچمە چاپخانەی شاعیرەکان و لە جل و بەرگی لادێییەکی نەخوێندەواردا سوچێک دەگرم و گوێدەگرم کە باسی خۆیان دەکەن، باسی جیاوازی و گەورەیی خۆیان دەکەن، هەموویان ئەو غرورە ڕەشە لە وشە و ڕەفتاریاندایە، کە وادەکات شێتبم و لە پێستی خۆم دەرچم. من لە خوێندنەوە و گەڕانەکانمدا، گەیشتمە ئەو بڕوایەی شاعیران بۆ ئەوەی گوڵ و ئەستێرە و بولبولیان خۆشبوێت، دەبێت ڕقیان لە پادشابێت، ڕقیان لە سەرۆکەکان بێت، ڕقیان لە میر و وەزیر و جەنگاوەرەکان بێت... هەر شاعیرێک جۆرە ڕقێکی وای تیا نەبێت، ئەوا خوێنی پاکی ئەو جنسە بەدە بە دەماریدا ناگەڕێت. ئەوان هەموو دونیا وەک مەیدانی جەنگی نێوان خۆیان و پادشاکان دەزانن. لەو ماوەیەدا چەندەها جار ئەو خاولییە ترسناکەم دەردەهێنا، ئەو پەڕۆ سامناکەی لە هەموو ژیانمدا لە هیچ شتێک وەها نەترساوم، دەرمدەهێنا و سەیرمدەکرد... ئەوە خولیای شاعیرەکانە، ئەوەیە خولیا بەدەکەیان سەرکەون بەسەر هەموو شتێکدا کە شیعر

نییە. لەوە زیاتر هەر قسەیەک بکەن، درۆ دەکەن... هەتا کاتێک کە باس لە پیسی دونیا دەکەن، بۆ ئەوەیە بڵێن، ئەها ئێمە چەند جوانین... چەند پاکین... من بۆ مێژوو دەڵێم، ئەو شەوە شتی زۆر ترسناکم لە چاویدا خوێندەوە، شتی زۆر ترسناک. گەر پێویستیم بە هێزی ئەو غەزەلانە نەدەبوو، دەمکوشت، بەڵێ هەر ئەو شەوە لەوێدا دەمکوشت. ئەو هەموو شتێکی لە چاومدا دەخوێندەوە، بەڵام نەدەترسا. وەک ئەوەبوو بیەوێت تورەمبکات و وابکات دەمامکی خۆم دامالم و هەموو قسەیەکی ناو ناخمی پێبڵێم. بەڵام من سەبرمگرت و ئاسودە وەستام و خۆم وەک پیاوێک نیشاندا کە دەتوانم جڵەوی دڵی خۆم بگرم. کە هاتمە دەرێ، پڕبووم لە ئارەزوویەکی تاریک بۆ ئەوەی بزانم لەو ماڵە سەیرەدا چی دەگوزەرێت؟ ئەم پیاوە کێیە و چی دەکات؟.

من بووم «تەرخونچی»م نارد بۆ ئەو ماڵە. ڕۆژێک چووم بۆ لای عەتار و پێمگووت، دەمەوێت یەکێک لەو ماڵەدا سەوزبکەم، چاوێک بچێنم و گوێچکەیەک بڕوێنم کە ببینێت و ببیستێت. من دڵم کرمێ و خولیام پڕ لە پرسیار و سەرم سەرشار بوو بە گومان. عەتار ئەوەی بە کاری نەکردە حیسابکرد و کووتی شتی وا بەو ناکرێت، بەڵام ئەو بلیمەتێکی وەها بوو کەسی نائومێد نەدەکرد. زۆری نەبرد هەواڵی ئەوەی بۆ هێنام کە غەزەلنوس بۆ مامۆستایەکی حیساب دەگەڕێت، چونکە منداڵەکانی لە زانستدا کۆڵ و لە حیسابدا نەزانن. خۆی هەموو شتێکی ڕێکخست و تەرخونچی کرد بە مامۆستای منداڵەکانی غەزەلنوس. بەر لەوەی ڕەشید تەرخونچی بۆ وانەوتنەوە ڕووبکاتە ماڵی غەزەلنوس، داوەتمکرد و لە کەرەمی خۆمدا نوقمکرد. پیاوێکی باریک و درێژ و ڕووخۆش بوو، لەوانەی

دەتوانن هەزار دەموچاویان هەبێت. پێمگووت من پیاوێکی بەسەبرم، سەرەتا هێندەم دەوێت خۆت خۆشەویستبکەیت و گومان لەسەر خۆت دروست نەکەیت. تەرخونچی چەند مانگێک بێسوود سەردانی ماڵی غەزەلنوسی کرد، زۆرجار راپۆرتی بێمانای دەربارەی تەمەڵی منداڵەکانی غەزەلنوس لە حیسابدا بۆ دەنوسیم، بەڵام دەبێت بڵێم کە راپۆرتەکانی توانایەکی وەسف و وردەکارییەکی بێوێنەیان تێدابوو، کە بۆ مامۆستایەکی حیساب ناسروشتی هاتە بەرچاوم. لەرێگای ئەو راپۆرتانەوە ئاشنای جوگرافیای راستەقینەی ئەو ماڵە بووم، ژمارەی ژوورەکان و دەرگاکان و چلچراو گلۆپ و پەردەکانیشی بەوردی لەو راپۆرتانەدا نوسیبوو، باسی ئەوەی تێدابوو کە غەزەلنوس دوو کتێبخانەی هەیە، یەکێکیان ئاشکرایە و ئەویدی نهێنییە، بەوردی باسی سروشتی کەمدوو و غەمگینی ئەویشی کردبوو. لەزۆر شوێندا گومانی ئەوە دەکات عەشقێکی کەروڵاڵ لە نێوان تریفە و غەزەلنوسدا هەبێت. تەرخونچی لەو ماوەیەدا هەردەم فێڵێکی بەکاردەهێنا تا بتوانێت بەو ماڵەدا بسورێتەوە، خەیاڵوان کە یەکێک لە منداڵەکانی غەزەلنوس بوو، بەردەوام بە بۆنی گوڵ بێهۆشدەبوو، هەر کەسێک چەپکێک گوڵی بخستبایەتە بەر لووتی لە هۆش خۆی دەچوو، لەو کاتژمێرانەدا کە دەبایە تەرخونچی وانەی ماتماتیک بە منداڵە بەستەزمانەکە بڵێت، هەندێجار گوڵێکی دەخستە بەر کەپووی و منداڵە دەبورایەوە، ئاوها فرسەتی دەهێنا بەو ماڵەدا بگەرێت و بۆنبکات و گوێبگرێت، هەر کاتێک یەکێک دەیبینی دەیکردە هاوار و هەرا کە بچن بە کۆمەکی منداڵە بێهۆشەکەیانەوە کە لە بینینی کتێبی حیساب دەترسێت و ژمارەکان بێهۆشیدەکەن. لە رێگای راپۆرتەکانی ئەوەوە گەیشتمە ناوی ئەوانەی هاتوچۆی ماڵی غەزەلنوس دەکەن. کەوتمە گومانێکی قووڵەوە کە زانیم کەسێک بە ناوی حەسەنی پیزۆی گوڵاو،

کۆنە چالاکێکی ناودار لە تیپەکانی ئیغتیالاتی ناو شاردا هاتوچۆی غەزەلنوس دەکات. ڕۆژێک لیستێکم لە ناوی ئەو کەسانە داواکرد کە دیداری ئەو دەکەن. هەڵبەت ئامادەکردنی ئەو لیستە بۆ تەرخونچی کە وەک مامۆستای ماتماتیک دیدەنی ئەوماڵەی دەکرد، ماوەیەکی درێژی ویست، بەڵام دواجار ئەو لیستە بوو کە هەموو ژیانم بۆی دەگەڕام. هەر لە ڕێگای ڕاپۆرتەکانی تەرخونچییەوە ماجیدی گوڵ سۆلاقم ناسی. هەر ئەو تەرخونچییە سەرکز و ڕووخۆشە ناوی زۆربەی ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانی بۆ هێنام... ناوی ئەو ئەندازیارانەی لەسەری خۆیاندا بورج و پرد و باڵەخانە ئەفسانەییان دروستدەکرد، ئەو باغەوانانەی دەیانتوانی تەنیا بەسەیرکردنی خاک، گوڵ و چیمەن بڕوێنن، ئەو عاشقانەی بە هەر شەقامێکدا بڕۆیشتبانایە دیوار و بەرد و پایە بێڕۆحەکانیش بۆنی خۆشەویستیان دەگرت، ئەو باڵندەبازانەی دەیانتوانی بە چەپڵەیەک ئاسمان پڕکەن لە مەل و پەلەوەری جۆراوجۆر. ئەو کچانەی بەتەک هەر باغێکدا گوزەریانبکردبایە ئاو لە زەوی دەتەقی و لە دویان فوارە وەک شێت بەرەو هەوا دەڕۆیشت. ئەو دارتاشانەی کورسییەکانیان هەستی فڕینیان دەداینێ و ئەو چێشتکەرانەی مێزەکانیان بۆنی خوانی بەهەشتی لێهەڵدەستا. ئەو فرۆشیارە شەرمنانەی هەندێک لە کاڵایان تەنیا بۆ سەفەری خەیاڵی بەکاردەهات، ئەو دەرمانفرۆشانەی داڕویان خەونی گوڵەکان و تامی تیشک و مەلمەسی تریفەی دەداینێ... لیستێکی وەها درێژ بوو کۆتایی نەدەهات. من پێویستیم بە هەموویان بوو... پێویستیم بە یەکەیەکە ئەو مەخلوقانە بوو کە دەهاتن و لەو کتێبخانە خەیاڵییەی غەزەلنوسدا گوێیان لە غەزەل دەگرت... من ڕۆژێک بڕیارمدا هەموو ئەو مەخلوقاتانە موڵکی من بن... بڕیارمدا هی من بن.. هی من...

# هەوڵێكی سەرنەكەوتوو بۆ ڕفاندنی ماچەلانی ڕاستەقینە
# ئابی ٢٠٠٤

شەو درەنگ بوو، وەک هەموو شەوەكانی دیكەی ئەو ماوەیە چاوەڕوانی ئەفسانەم دەكرد... چاوەڕوانی ماچ و خەون و حەرفەكانی ناو ئەو دەنگە پڕ تەلیسمەیم دەكرد. لەپڕدا یەكێک تەواوی كارەبای ئوتێلەكەی كوژاندەوە، شەوان تا بەیانی ئیش بە ماتۆڕی كارەباكە دەكرا، گەر وا نەبایە گەرما هەموومانی دەخنكاند. زۆربەی شەوان تاریكی باڵی بەسەر كۆی كوچە و شەقامەكانی دەوروبەردا دەكێشا، تاریكییەكی وەها كپ و سەنگین مرۆڤی بێئۆقرە دەكرد. بەلام لەگەڵ ئەو شەوەزەنگە ڕەشەی دەرەوەشدا، بەوە خۆشحاڵبووم كە لە ناو ئوتێلەكەدا ڕوناكی هەیە. ئەو شەوە بێهۆ نەبوو هەستم بە ترس كرد. دوای خامۆشبوونی چراكان بە ماوەیەكی كورت، یەكێک بەهێزێكی بێوێنەوە پاڵی بەدەرگای ژوورەكەمەوە نا. گوێم لە دەنگی پێ و هەناسەی دوو كەس بوو كە خۆیان كرد بە ژووردا، لەجێگای خۆم هەستام و دڵم وەک دڵی باڵندەیەک دەلەرزی. لە ساتێكی كورتدا شتگەلێكی زۆر بەدڵمدا ڕابورد. دواتر كە بیرم لەو چركەیە دەكردەوە، بەوە سەرسام بووم، چۆن لە ساتێكی وەها كورتدا شتگەلێكی هێند زۆر و هێند جیاواز بە خەیاڵی مرۆڤدا ڕادەبورێت. لە نێوان هەستانی من و وەستانمدا بە تەواوەتی، یەكێكیان لایتێكی دەستی وەها ڕاستەوخۆی تێگرتم ئیدی هیچم نەدەبینی، بەلام هەستمكرد لە پشت ئەو دووكەسەوە خەڵكانێكی تریش لە بەردەركی ژوورەكەدان. یەكەمین كەسیان كە بە هەست تارماییەكەیم لەوانی دی جیاكردەوە، پیاوێكی زەبەلاح بوو. بێئەوەی دوودڵ بێت یان هیچ بڵێت، بە چ تین و توانایەک خودا بە جەستە گەورەكەی بەخشیبووی، پاڵێكی

تا بە سنگمەوە و بە خواری کەوتمەوە سەر جێگاکەم. مرۆڤ زۆرجار لەوەها ساتێکدا تەنیا فریای ئەوە دەکەوێت بیر لە مردن بکاتەوە، بەڵام من وەک عەقڵێک کە لەسەختترین ساتەکاندا غروری خۆی لە دەستنادات، بیرم لە هەڵهاتن کردەوە. هەستم بە قورسایی گەورەی ئەو پیاوە کرد لەسەر لەشم، بەڵام پێدەچوو باش حیسابی گەورەیی و هێزی منی نەکردبێت، لەگەڵ ئەوەی کە ویستی دەستم بگرێت و بەجۆرێک بایدات ئازارمبێت، تاریکی کۆمەکی نەکرد و ئاسان خۆم ڕاپسکان و وەرگەڕام و دەستی لایتەکەیم گرت و کێشام بە دەرکی دۆلابی جلەکاندا، بەجۆرێک لایتەکە خامۆشبوو و ژوورەکە دووبارە تەواو تاریک داهات. ساتێک بوو ئەوانی دی بەڕوونی هیچیان نەدەبینی، من ئەو کورتە ساتەم بە هەل وەرگرت و پاڵێکی وەهام بە پیاوی دووەمەوە نا کەوت بەسەر کۆمێدییەکی بچوکدا لە یەکێک لە سوچەکاندا. ئاگاداربووم کەسێکی دی لە بەر دەرگاکەدا دەیەوێت لایتی دووەم داگیرسێنێت، بەرلەوەی ئەو وەها کارێکبکات خۆم گەیاندە بەردەرگا، کابرای گەورە کە لە تاریکیدا بە دوامدا هات، کەوت بەسەر هاوڕێکەی خۆیدا و هاواری لە پیاوی سێهەم کرد «مەهێڵە دەرچێت». بەڵام من لۆقێکی وەها درێژم هەبوو، ڕاکردنێکی وەها خێرام هەبوو، ئەو نەیتوانی بمگرێت. وەها بە خێرا لە پلەکانەوە بۆ دەرگای دەرەوە دەرچووم، خۆم بە خێرایی خۆم سەرسامبووم. دڵنیابووم کە گەر لە بەر دەرگا تەقەم لێنەکەن نامگرن. لە بەر دەرگای ئوتێلەکەدا یەکێک هاواریکرد «خەسیو جوجی... خەسیو جوجی... گووی سەگ... گووی سەگ... بیگرە». پێدەچوو ئەو ئوتومبیلەی کە هێناویانە، شۆفێرێکی خەواڵووی بێباکی هەبێت، کە وایزانیوە ئیشی تەنیا لێخوڕینە، بەر لەوەی ئەو بێتە دەست، من بە هەموو تین و توانای خۆم بەرەو کۆڵانێکی تەسک هەڵهاتم کە دەکەوتە بەرابەر ئوتێلەکەوە، لەوێوە بە هەرچی هێزێک کە خودا بە

منـی بەخشـیوە ڕامکـرد، دەمزانـی گـەر خێرابکـەم دەگەمـە نـاو زنجیـرە کۆڵانێکی وەها تەسک و تێکەڵاوەوە بە ئۆتومبیـل ناتوانن دوامبکـەون و بـە پێیش ئاسان لـە پێچاوپێچەکانیـدا نامدۆزنـەوە. ئاوها بێئـەوەی ئاوڕبدەمـەوە و دوودڵیبکـەم لـە یەکـەم هەوڵـی گرتـن و ڕفانـدن دەربازبـووم.

شـەو ونببیـت ئاسـاییە، بـەڵام سـامناک ئەوەیـە بەیانـی نەزانـی ڕوو لـە کـوێ بکەیـت. بـە درێژایـی ئـەو شـەوە بـە ترسـێکی بێئەنـدازەوە لـە هەمـوو سـێبەرێک، لـە هەمـوو تارمایـیەک کوچـە بـە کوچـە سـوڕامەوە. تاکە کەسـێک دەیتوانـی یارمەتیمبـدات ئەفسـانەبوو، دەبایـە تـا بەیانی چاوەڕێبکـەم. بەیانی بەخـت زۆر یارمبـوو و وەک ئـەوەی ئەفسـانە دڵـی دەلیلـی بێـت، لـە هـەر ڕۆژ زووتـر هاتبـووەوە ئوتێلەکـە. بەترسـێکی زۆرەوە گەڕامـەوە و چیرۆکـی ڕووداوەکانـی شـەوم بـۆ گێڕایـەوە. دەسـتی گرتـم و ماچیکـردم و گووتـی دڵنیایـە هەمـووی لـە ژێـر سـەری بارۆنـی کولەکـە و مورتـەزای شـەیتان دایـە، گووتیشـی ئـەو ئیشـە بێئـاگاداری مێردەکـەی ئـەو نییـە. پێشـیگووتم کەژیانـم بەڕاسـتی لـە مەترسـیدایە و باشـترە بگەڕێمـەوە بـۆ ئەورووپـا. بـەڵام مـن تێمگەیانـد کـە ناتوانـم لـەو دووربکەومـەوە و تـا چارەنوسـی بـاران شـوکوریش ئاشـکرانەکەم ناگەڕێمـەوە. پاسـپۆرتە بەریتانییەکـەی لـە قاسـەی ئوتێلەکـە بـۆ دەرهێنـام و ژمـارە تەلەفونـی خانمێکـی ناسـیاوی خـۆی دامـێ و ڕەوانـەی شـارۆچکەیەکی کـردم نزیکـی ١٥٠ کیلۆمەتـر لـەو شـارەوە دووربـوو. هـەر خۆشـی لـە بەردەممـدا تەلەفونـی بـۆ ئـەو خانمـەی ناسـیاوەی کـرد و ژوورێکیـان لـە ئوتێلێکدا بـۆ گرتـم، پێشـیگووتم بـە زووتریـن کات شـوێنێکم بـۆ پەیدادەکات و دەنێرێتـەوە بـە دوامـدا و دەتوانیـن لەو شـوێنەدا بـە ئازادی پێکـەوە بخەویـن. ئینجـا زۆر ماچیکـردم و خـۆی بـە سـنگمەوە نوسـاند و گووتـی «بـڕۆ و چاوەڕێمبـە». بـەو شـێوەیە ماوەیـەک لـە ئەفسـانەو لـەو شـارە دووركەوتمـەوە.

# ڕۆژێکی درێژ لە ژیانی ماجیدی گوڵ سۆلاڤ و غەزەلنوسدا

هەر سێکیان بەرامبەری گوڵ سۆلاڤ دانیشتبوون، وشە بە وشە هەموو چیرۆکی نەوجەوانی چینی بۆ گێڕانەوە. ستایشێکی زۆریان کرد کە لە ماوەیەکی وەها کورتدا ئەو هەموو زانیارییە گرنگەی دەستکەوتووە. کە گوڵ سۆلاڤ چیرۆکەکەی تەواوکرد پرسیاری گەورە ئەوەبوو دوای ئەوە دەتوانن چی بکەن، چۆن بەردەوام بن و بۆ کوێ بڕۆن و چ ئاڕاستەیەک وەرگرن؟. غەزەلنوس ڕای وابوو بارۆنەکان ترسناکن و کەس ناتوانێت بە ئاشکرا بچێتە جەنگەوە لەگەڵیاندا، تاکە شتێک دەتوانن بیکەن ئەوەیە دوای چیرۆکی باران شوکور بکەون و چارەنوسی ڕاستەقینەی ئەو ئاشکرابکەن. بە بۆچوونی ئەو دەبایە ئەو ماوەیەی گوڵ سۆلاڤ لە نۆیمیران دەمێنێتەوە، هەوڵی کۆکردنەوەی زۆرترین زانیاری لەسەر باران بدات. هەرچی تریفە یابەحریشە ئەو ڕۆژە بێدەنگ و خەیاڵاوی و ڕەنگ پەڕیو دەردەکەوت، بەدرێژایی دانیشتنەکە هیچی نەگووت، هەر سێکیان سەرەنجی ئەوەیان دەدا کە تریفە جار دوای جار کاڵتر و بێڕەنگتر و بێدەنگتر دەردەکەوێت. هەر جارێک لە هۆی بێدەنگی و ڕەنگزەردییەکەی پرسیاریان دەکرد، بە زەردەخەنەیەکی ناسکەوە دەیگووت «بە هۆی ماندوێتی و کەم خەوی و خەیاڵی زۆرەوەیە». ئەو ماوەیە تریفە بەسەرێک سەرپەرشتی منداڵەکانی دەکرد، بە سەرێکی دیش لەگەڵ کیژە ڕاکردووەکانی نێو ماڵەکەی خۆیدا خەریکی چنینی مافوورێک بوو کە دەبایە ببێتە جوانترین فەرشی هەموو دونیا. ئەمە جگە لە کاری هەمیشەیی خۆی لەگەڵ دەفتەردارەکاندا. تریفە یابەحری لەوانی دی زیاتر ئەو چیرۆکانەی مردنی دەخوێندەوە، هەندێک شەو لە ژێر باری ئەو حیکایەتانەدا نەدەخەوت و تا بەیانی دەگریا. ماوەیەک غەزەلنوس داوای

لێکرد، ئەو حیکایەتانە نەخوێنێتەوە، چونکە کارێکی وەها کوشندەی لێدەکەن لە مرۆڤبوونی خۆی شەرمبکات و لەوانەیە بیر لەوە بکاتەوە نێو ئەم توخمە بێڕەحمەی بوونەوەران جێبهێڵێت و ڕووبکاتە دونیای جانەوەران و دڕندەکان. تریفە بە خوێندنەوەی ئەو چیرۆکانە بە جۆرێک پڕغەم دەبوو تەنیا لە چنینی ئەو مافوورەدا کەمێک دڵنەوایی و دڵخۆشی تێدەگەڕایەوە، تا نەگەیشتبایەتەوە سەر کورسییەکەی خۆی و نەکەوتبایەتە چنین لە دەست ئازاری ئەو حیکایەتە سامناک و غەمگینانەی مردن ڕزگاری نەدەبوو کە لەبنەوە ڕۆحیان دەخوارد.

ئەو ڕۆژە دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکەیان، گوڵ سۆلاف تکای لە غەزەلنوس کرد، پێکەوە قسەبکەن.

لەدەوری هەمان ئەو مێزەی کەچەند ساڵ بوو غەزەلنوس کاری لەسەردەکرد، بەرابەر یەک دانیشتن، وەک ئەوەی حیسابێکی قورسیان لەگەڵ یەکدا هەبێت و نەزانن لە کوێوە دەست پێبکەن، ماوەیەک بێدەنگبوون. ژوورەکە کتێبخانەیەکی گەورەی تێدابوو کە گوڵ سۆلاف هەندێجار کتێب و ڕۆمانی لێدەخواست. سەرتاپای ژوورەکە بە کورسی و مێزەکانیشەوە بۆنی کاغەزی کۆنی لێدەهات و ڕەنگی دەستنوسێکی دێرینی گرتبوو. غەزەلنوس کە لە هەر کات پەشێوتر دیاربوو، وەک یەکێک زۆر بەرگەی بێدەنگی نەگرێت، گووتی «گوڵ سۆلاف، دەزانم تۆ لەسەرەوە هەموو حیکایەتەکەت نەگێڕایەوە... دەڵێم لەوانەیە هەندێک شت مابێت بتەوێت بە تایبەتی بە منی بڵێیت... واتێگەیشتم؟». گوڵ سۆلاف قووڵ سەیری چاوی غەزەلنوسی کرد و گووتی « من هەموو چیرۆکەکەم گێڕایەوە، غەزەلنوس، هەرچییەکم دەزانی پێمگووتن. یەک بەشی چکۆلانە نەبێت، ئەو بەشەش تایبەتە بە تۆ... بەرلەوەی هیچ بڵێم دەبایە گوێم لە خۆت بێت، دەبێ تێبگەم». غەزەلنوس وەک خۆی نادیدە بکات پرسی «بەشێک پەیوەندی بە منەوە هەبێت؟ دەشێت گوڵ

سۆلاف دەشێت... بەڵام سەرەتا پێم بڵێ، تۆ چیت بینیوە و چیت بیستوە وەها پڕ گومان دەتبینم؟». گوڵ سۆلاف بە هیوای ئەوەی وەڵامێکی دەستبکەوێت، پرسی «غەزەلنوس، تۆ لە کەیەوە موراد جەمیلت دەناسی؟». وەک پرسیارێکی زۆر سەختی لێکرابێت، پاڵیدا بە کورسییەکەوە و پاش تێڕامانێکی زۆر گووتی « چەند مانگێک دوای مردنی مەهناز مارۆ بوو... چەند مانگێکی کەم، سەردەمێک بۆکڕوزی ئافرەتانی سووتاو ژیانی منی گرتبوو، یەکەمجار کە هات هێندە جوان بوو وامدەزانی خەیاڵە... ئەوە یەکەمجار بوو، ئەو کات زۆر گەنج بوو... زۆر...».

ماجیدی گوڵ سۆلاف گووتی «نەوجەوانی چینی، لە ناو خانمانی نوێمیراندا جۆرە غەزەلێکی خوێندۆتەوە. لە کاریگەریدا لە غەزەلەکانی تۆ دەچن... پێدەچێت ئەو زۆر هاوڕێی تۆ بووبێت... زۆر».

غەزەلنوس گووتی «هاوڕێ؟ نازانم مرۆڤ دەتوانێت ناوی هاوڕێتی لێبنێت یاخود نا؟... من و ئەو هاوڕێ نەبووین... جۆرە پەیوەندییەکمان هەبوو ئاسان وەسف ناکرێت... لە سەرەتاوە نەمتوانی هیچتان بۆ باسبکەم، چونکە خۆشم تا ئێستا ناتوانم هەموو شتێک تەفسیربکەم، ناتوانم شتەکان ناوبنێم، گومانم لە خۆم و لە ئەو و لە هەموو دونیا هەیە. وەک ئەوەی چەندەها جار کەسێک لە تاریکیدا ببینیت و قسەبکەن، بەڵام نەزانیت لەگەڵ کێدا قسەدەکەیت، تێنەگەیت ئەوەی بەرابەرت، دۆستتە یان دوژمن؟ بەشێکە لە خۆت یان ئەهریمەنێکە و دەیەوێت فریوتبدات؟ خەیاڵێکی ڕووتە یان ڕاستییە؟ من لە هیچ دڵنیانەبووم و لە هیچ دڵنیانیم».

ماجیدی گوڵ سۆلاف «تۆ دەتزانی کە ناوی نەوجەوانی چینییە... دەتزانی؟...»

غەزەلنوس گووتی «گوڵ سۆلاف، دەبێت هەموو شتێکت لە سەرەتاوە

بـۆ بگێڕمـــەوە، هەمـــوو شـــتێک. ماوەیـــەک بێدەنـــگ بـــەو پرســـیاری زۆرم لێمەکـە. کەمێـک سـەبرت هەبێت و دواتـر دەتوانیـت هەموو شـتێک بپرسـیت. شـــەوێک لـــە دوای مردنـــی مەهنـــاز، دوای ئـــەوەی لـــە کۆڕێکـــی عاشـــقانەدا کۆمەڵێـک غەزەلـمَ خوێنـدەوە گەڕامـەوە بـۆ ماڵـێ. ئـەو ماوەیـە کوڕگەلێکـی زۆری کەساس و تەنیـا کـە ئومێدیـان بـەم وڵاتـە نەمابـوو، زۆربەیـان لەسـەر سـەفەربوون بـۆ خۆرئـاوا، زوو زوو منیـان بـۆ ئێوارەیەکـی شـیعر خوێندنـەوە بانگدەکـرد و منیـش بەپێـی توانـا و بـە قـەد وزەی ئـەو سـاڵانەم کـە گەنجتـر و پـــڕ هیواتـــر بـــووم، چەنـــد ســـەعاتێک غەزەلخوێنیـــم بـــۆ دەکـــردن. هیـــچ شـتێک لـە دونیـادا لـەوە خۆشـتر نییـە لـە نـاو کۆمەڵێـک گەنجدا کـە عەشـق ســـووتاندونی، غەزەلخوێنـــی بکەیـــت... ئەودەمـــە لـــە تـــاو ئـــازاری دەرون و بۆنـی مردنـی مەهنـاز نەمدەزانـی بـەرەو کـوێ هەڵبێـم، لـەو زەمانـەدا چەندیـن جـار بیـرم لێکـردەوە، لەگـەڵ قافڵـەی کۆچبەرانـدا بـەرەو دەرەوە بـڕۆم و خـۆم لـە نـاو و بۆنـی ئـەم وڵاتـە دووربخەمـەوە کـە لـە ڕوخسـاری مرۆڤـی غەمگیـــن زیاتـــر، زێڕێکـــی دیکـــە و شـــاکارێکی تـــری تیـــا نییـــە. بـــەڵام ئارەزوویەکـی ترسـناک بـۆ خۆئـازاردان، منـی هێشـتەوە. مـن خۆشەویسـتی ئـەم دونیایـەم لـەو ئـازارەدا دەبینییـەوە، دەبێـت غـەم بـۆ درەخـت و بـاغ و پەپولـە بخـۆم تـا بزانـم عاشـقم. مـن لـەو سـاڵانەدا هـەزاران جـار لـە خـۆم پرسـیوە، مـن کـوڕی کێـم؟ کـوڕی مـەلای هاجـەرم یاخـود مـەلای سـوختە؟ کـــوڕی ئـــەو ڕۆحـــەم کـــە تـــا ســـەر ئێســـقان خـــۆی ئەشـــکەنجە دەدات تـــا نەهێڵێـت عەشـق بەسـەریدا سـەرکەوێت یـان کـوڕی ئـەو پیـاوەم کـە تامـرد خـۆی بـۆ ستایشـی عەشـق تەرخانکـرد؟ مـن کـوڕی کێـم؟ هیـچ کـەس لەسـەر ئـەم ئەسـتێرەیە نەبـوو وەڵاممبداتـەوە. دەزانـی چەنـد سـەختە پرسـیارێکی گـــەورە لـــە ناوەڕاســـتی ژیانتـــدا بێـــت و کـــەس نەبێـــت کۆمەکـــت پێبـــکات، ڕێـــگات بـــۆ ڕوناکبکاتـــەوە. مـــن ڕۆحلەبەرێکـــی غەمگینـــم ئەوەتـــەی هـــەم بـــە تاریکیـدا دەڕۆم. هیـچ کـەس بـە ئەندازەی مـن بـە نـاو شـەو و تاریکسـتانی

ژیانـی خۆیـدا نەگـەڕاوە. هەمیشـە دوو هێـزی ترسـناک و گـەورە لـە نـاوەوە یاریـم پێدەکـەن. بەسـەرێک مـن غەزەلنوسـم، پەیامبـەری خۆشەویسـتی، شـاعیری عەشـق، ئـەو مرۆڤـەی هەمـوو عومـری لـە خوێندنـەوە و تێگەیشـتن و نوسـینی غەزەلیاتـدا بردۆتـە سـەر. بـە سـەرێکی دیش، ئـەو پیـاوەم کـە هەمـوو ژیانـم لـە عەشـقی دونیایـی ڕادەکـەم، وەک ئـەوەی بـەر نەفـرەت کەوتبـم، عەشـق و دۆزەخـم پێکـەوە گرێداوە، ئەڤیـن و ئـازارم تێکەڵکـردوە. مـن کامیانـم...؟ گـوڵ سـۆلاڤ کامیانـم؟. بۆیـە لـە تـۆ دەپرسـم چونکـە ناتوانـم لـە تریفـە یابەحـری بپرسـم، مـن و ئـەو بڕیارمانـداوە لـە غەریبـی یەکتـردا بمریـن و لێومـان بـەر لێـوی یـەک نەکەوێـت. ناتوانـم لـە حەسـەنی پیـرزۆی گـولاو بپرسـم، چونکـە عاشـق نەبـووە. دەبێـت لـە تـۆ بپرسـم... لـە تـۆ. مـن هەمیشـە ئـەو ئـازارەم هەبـووە کـە مـن کێـم؟. ئـەو شـەوەی لـەو کـۆڕە گەڕامـەوە، لـە سـەر مێـزی نانخواردنەکـە چاویلکەکـەم داکەنـد، ڕیشـم لـە تەپوتـۆزی ئـەم شـارە پاککـردەوە، کەمێـک نانمخـوارد و ویسـتم کەمێـک زوو بخـەوم تـا بەربەیـان فریـای گەشـتێکی هەزاربـاغ بکـەوم. ئـەو باجییـەی ئـەو کات لێـرە خزمەتیدەکـرد، منداڵەکانـی خەوانـدو و ویسـتی بگەڕێتـەوە بـۆ ماڵـی خـۆی. مـن کلیلەکانـم لێوەرگـرت و خوداحافیزیـم لێکـرد و سـەرێکی منداڵـە خەوتووەکانمـدا و لـە ژووری خەوتنەکـەی خۆمـدا ڕاکشـام، ئومێدمبـوو ماندوێتـی ئـەو ڕۆژەم لێدەرچێـت... مـوراد جەمیـل لـەو شـەوەدا دەرکـەوت. مـن لـە نێـوان خـەون و وریایـدا هاتوچۆمدەکـرد، گەنجێـک دەرگای کـردەوە و گووتـی «غەزەلنـوس ناتوانیـت تـا قیامـەت لێـم هەڵبێیـت. ناتوانیـت، مـن دیـوە ڕاسـتەقینەکەی تـۆم... مـن ئـەوەم کـە تـۆ خەونـی پێوەدەبینـی».
گەنجێکـی ئێجـگار جـوان بـوو. دەرکەوتنـی بـەو جـۆرە کتوپـڕە دەرکەوتنـی مـەلای سـوختەی بیرخسـتمەوە لـە خەڵوەتگاکـەی مـەلای هاجـەردا، یـان بـە پێچەوانـەوە دەرکەوتنـی مـەلای هاجـەر لـە غەزەلخانەکـەی مـەلای سـوختەدا. سـەرەتا وامدەزانـی گەنجێکـە لەوانـەی غەزەلـەکان خەیاڵیـان تێکـدەدا، بـەڵام

ڕوخسارێکی هێندە ڕوون و سەیری هەبوو، هێند دڵنیا و لەسەرەخۆ قسەیدەکرد، ترساندمی. هەموو ژیانم زۆر لەو کەسانە ترساوم کە بەئارامی قسەدەکەن، ئەوانەی بە هێمنی و خەیاڵساردی خۆیان پێتدەڵێن دەزانن چییان دەوێت و بۆچی دەژین. من هەمیشە نیشتەجێی ناو کۆڕی ئەوانەبووم کە هەستدەکەن لە دونیادا وێڵ و لە ژیاندا بێئامانجن. خەیاڵ دەرگایەکە ئەو کەسانە پیا تێدەپەڕن کە ونبوون، ئەوانەی ڕاستەڕێی خۆیان دەزانن کەمتر دەبنە بوونەوەری خەیاڵی... مرۆڤ کە زانی بەرەو کوێ دەچێت پێویستی بە خەیاڵ نییە. پێیگووتم «ماوەیەکە لە زۆربەی کۆڕەکانمدا ئامادەیە، حەرف حەرف گوێدەگرێت و بە ڕۆح و جەستە تامی غەزەلەکانم دەکات». من پێشتر نەمبینیبوو، لە خۆمم پرسی، دەکرێت مرۆڤ کوڕێکی وەها بەڕوخسار فەرامۆشبکات؟ دەبێت لە کوێ بووبێت... بۆ زۆرجار ڕوخساری هەموو ئەوانەم لە یادە کە لە کۆڕ و ئەڵقە و زیکرە پڕ خەیاڵەکاندا ئامادەدەبن، بۆ ئێستا ڕوخساری ئەم گەنجەم ناکەوێتەوە یاد کە دیمەنێکی هەیە، هەر کەسێک یەکجار بیبینێت، تامردن فەرامۆشی ناکات. من پێمگووت «تۆ ڕاست ناکەیت، تۆم لە هیچ کوڕێکدا نەبینیوە... تۆ سەر بە هیچ دەستە و تاقمێک نیت، لەوانەی پێویستیان بە غەزەلەکانی منە تا لەسەر زەوی هەڵبکەن و درێژە بە سەفەری پڕ ڕوئیای خۆیان بدەن». ژوورەکەم یەک کورسی تێدابوو، بە ئەدەبێکی زۆرەوە ڕوخسەتی خواست و لەسەر ئەو تەنیا کورسییە دانیشت. بە غەمگینییەکی زۆرەوە گووتی «من بەدرێژایی هەموو کۆڕەکان وام هەستکردوە تۆ لە کاتی خوێندنەوەی غەزەلەکانتدا تەنیا سەیری من دەکەیت... بە ئەندازەیەک پێم سەیربوو مرۆڤێک وەها بێشەرمانە سەیری ناوچاوی یەکێکی دیکە بکات... بەڵام غەم مەخۆ، تۆ تەنیا نێرینەیەک نیت کە من نابینێت، زۆربەی ئەوانەی دەیانناسم پێیانوایە من بەجۆرێک خەیاڵی و جوانم، مرۆڤ تەنیا لە خەیاڵدا دەتوانێت بمبینێت... پیاوان

تەنیا ساتێک من لە خەیاڵەکانیاندا دەبینن کە بیر لەوەبکەنەوە بە پلەیەک قۆز و ناوازەبن، ڕوخساری فریشتە وەربگرن... کە مرۆڤ بۆ جۆرە ڕوخسارێکی جوان گەڕا کە ڕوخساری خۆی نەبێت، ئەوسا من دەدۆزێتەوە». وەڵامەکەی بۆ من سەیر بوو، خۆی بە شێوەیەک جوان بوو، هەموو پیاوێکی سەرزەمین گەر دەرفەتیبدەن شێوەی خۆی هەڵبژێرێت، وەها جوانییەک هەڵدەبژێرێت. لەو جۆرە جوانیانەبوو گەر لە نێو خانماندا جوانی وەها هەڵکەوێت، هەموو ژنی دونیا ئیرەیی پێدەبەن و ڕقیان لێیدەبێتەوە، گەر لە پیاواندا شێوەی وەها بێتە مەیدان، پێکڕا پلانی کوشتنی دادەڕێژن. من لێمپرسی «چیت لە من دەمەوێت؟ دەتوانم چی بۆ تۆ بکەم؟ بۆ وەک دز هاتوویتەتە ماڵم؟»، بە دڵنیایی و هێمنییەوە گووتی «من زۆر گوێم لە غەزەلی تۆ گرتووە. واهەستدەکەم ئەو غەزەلانە هی تۆ نین... نابێت هی تۆ بن... ». من گووتم «تۆ ڕاستدەکەیت، ئەو غەزەلانە هی من نین، بەشی هەرە زۆری غەزەلیاتی مەلای سوختەن کە شاعیرێکی کلاسیکی نەناسراوە، جار جار قەسیدەی خۆمی تێدەکەوێت. هێند هەیە من بەجۆرێک دەیخوێنمەوە خەڵکان زیاتر هەستدەکات، کۆمەکیان پێدەکات خەیاڵی خۆیان بژین، من هێندە ئەو غەزەلانەم خوێندۆتەوە بۆتە بەشێک لە وجودم، هەستناکەم لە نێوان من و ئەواندا مەودایەک ماوە و فاسیلەیەک هەیە، من درێژکراوەی مەلای سوختەم، هەر ئەوم لەسەردەمێکی تر و لە شێوەیەکی تردا دەژیم و درێژە بە پەیامەکەی دەدەم». کەمێک تێفکری و گووتی «مەبەستم نییە، بزانم ئەو غەزەلانە کێ نوسیوونی، مەبەستم نییە. دەمەوێت بڵێم ئەو غەزەلانە هی تۆ نین، نابێت هی تۆ بن، تۆ خۆت هیچ نیت جگە لە عاشقێکی ترسنۆک، ئەو غەزەلانە هی منن، من دەتوانم ئەو غەزەلانە بەکاربهێنم... منم پێویستیم بەو غەزەلانەیە بۆ ئەوەی بۆ ئەو ژن و کیژانەی بخوێنمەوە کە عاشقم دەبن... تۆ تەنیا باسی عەشق دەکەیت

لە ڕووە خەیاڵییەکەیدا، منم کە عەشق لە ڕووە ڕاستەقینەکەیدا دەژیم... من ئەو بەشەی تۆم کە لە وجودی خۆتدا خنکاندوتە. تۆ دەرەقەتی دیوە ڕاستەقینەکەی عەشق نایەیت». بە سەرسامییەوە سەیرمکرد و گووتم «ئەی تۆ دەرەقەتی دیوە خەیاڵییەکی عەشق دێیت؟ عەشق کە دەبێتە دەریایەکی بێبن، دەبێتە خواستێک وەک گێژاو مرۆڤ بەرەو قووڵایی ئەم دونیایەو کۆی نهێنی ئەم وجودە ڕادەکێشێت؟... تۆ دەرەقەتی ئەوە دێیت کە عەشق دەبێت بەسەفەرێکی ناکۆتا بە باغێکی خەیاڵیدا کە هەموو خەون و جوانییەکانی مرۆڤی تێدایە، دەبێتە گەشتێکی بێبڕانەوە بە گوڵزارێکدا تاسەر ئێسقان ئازارتدەدات و بەختەوەریشت بۆ دێنێت. خۆشییەکەی لە سووتان و شادییەکەی لە ناکۆتابوونیدایە؟»، ئەو بێئەوەی وەڵامبداتەوە باسی پەیوەندییەکانی خۆی بۆ کردم، ئەوکات زۆر گەنج بوو، تازە لەسەرەتای ئەو گەشتە درێژەدابوو کە دواتر بەرەو شوێنی ترسناکی برد. بەشێوەیەکی سەیر پێی لەسەر ئەوە داگرت کە ئەو غەزەلانە دەبێت موڵکی یەکێک بن بتوانێت لە عەشقی ڕاستەقینەدا، لە ناو جەرگەی ژیاندا، لە گەرمەی خۆشەویستی و سەرجێکردندا بەکاریانبهێنێت. ماجیدی گوڵ سۆلاف، من هەمیشە بەرامبەر حەقیقەت لاوازبووم، هەمیشە لاوازبووم. لەسەردەمێکەوە کە بە کۆڵانەکانی ئەم شارەدا دەڕۆیشتم و درەخت و باڵندە و پایە و دیوارەکانم ڕەنگدەکرد، لەو کاتەوە ئەو وەکو کۆی برینەکانی من بناسێت و دەستی خستبێتە سەر دەردی گەورەی من، گووتی «من ئاگاداری چیرۆکی کچەکەی سەیفەدین مارۆم، کیژێکی زۆر جوان بوو، گەر منی خۆشبویستبایە وەها بەدبەختم نەدەکرد، ئەو کچێکی پڕ خەیاڵ بوو، هێندەی بەسبوو تۆ بڵێیت خۆشتدەوێت، هێندەی بەسبوو، بەڵام بەشێوەیەک لە شێوەکان تۆ کوشتت. شتێک هەیە غەزەلنوس دەبێت باش بیزانیت، مرۆڤ هەرگیز لە داخی ئەوانە خۆی ناسوتێنێت کە ڕقی لێیانە، مرۆڤ لە غەمی ئەوانەدا

خـۆی دەکوژێـت کـە خۆشـیدەوێن». مـن گووتـم «مەهنـاز قوتابییەکـی ناسـکی مـن بـوو، مـن هەسـتم نەدەکـرد کـە خۆشـیدەوێم، هەسـتم نەدەکـرد، نەمدەزانـی». بـە پێکەنینـەوە گووتـی «ژنـان باسـی دڵـی خۆیـان ناکـەن، دڵنیابـە، ژنـان باسـی دڵـی خۆیـان ناکـەن... وەک مەتەڵێـک لەوێـدا بەجێیدەهێڵـن و دەبێـت ئێمـە بیخوێنینـەوە، بـە وردی بچینـە نـاوی و شیبکەینەوە». دواتـر زیاتـر پێکەنـی و گووتـی «تـۆ چـۆن غەزەلنوسێکیت کـە لـەو ڕاستییە تێنەگەیشتوویت». بـە دەنگێکی غەمگینـەوە گووتـم «مـن دەبایـە مەهنـاز فێربکـەم خەیاڵـی هەبێـت، ئـەوە ئیشـی مـن بـوو، کچێکـی گەنـج بـوو، هەتـا ئارەزووشـم لێبایـە نەمدەتوانـی دەسـتی بـۆ بـەرم... تـۆ چـی دەڵێیـت؟». وەک ئـەوەی پتـر بمبوغزێنێـت و بیەوێـت بـە مەبەسـت ئازارمبـدات، گووتـی «سـەرزەمینێکی خەیاڵیـت نیشـانی ئـەو کچـە بەسـتەزمانەدا، لـە هەمـوو شـتێکی سـەر ئـەم زەوییـە دوورتخسـتەوە، خەیاڵیـت پڕکـرد لـە باغـی ڕەنگاوڕەنگ... وات لێکرد ڕقی لە دەستگیرانەکەی بێتـەوە... دواتـر بەجێتهێشـت و هاتیتـەدەرێ و ڕۆیشـتیت. دەتتوانـی پێیبڵێیـت خۆشـتدەوێت... هـەر شـتێکی سـادەی پێبڵێیـت بتوانێـت تـا ماوەیـەک دڵـی ڕابگرێـت. عەشـق ئـەو شـتە ئەفسـانەیی و نەمـر و قـووڵ و ئاڵـۆزە نییـە کـە تـا کۆتایـی دەبێـت وەک پـەت لـە ملـی مرۆڤـدا بێـت... عەشـق ئاسـانترە، تێدەگەیـت، تێکەڵبـوون و نزیکبوونـەوەی دوو ڕۆحلەبـەرە. خۆشەویسـتی مـرۆڤ دەکات بـە هاوڕێـی یـەک، نەوەکـو بیانـکات بـە کۆیلـەی یـەک». مـن قـووڵ تەماشـامکرد و گووتـم« مـن ناتوانـم وەک تۆبـم... ئـەم دەسـتوورە غەریبڕەنگـەی تـۆ لـە عەشـقدا لەگـەڵ دەروونێکـی کەیلـی وەک دەرونـی منـدا تەبـا نابێـت، مـن سـەری سـۆفییە کۆنەکانـی خۆرهـەڵات لەسـەر شـانمە و تـۆ لەشـی هەوەسـبازێکی فەرەنگیـت هەڵگرتـووە... مـن و تـۆ نابیـن بەیـەک». بـۆ یەکەمجـار بـە غەمێکـی قووڵـەوە لێیڕوانیـم و گووتـی «مـن ژنـان پێمدەڵێـن، نەوجەوانـی چینـی... چونکـە هەمـوو کـەس دەزانێـت مـن

بۆنی خەیاڵم لێدێت... هەموو کەس دەزانێت. من بوونەوەرێکی خەیاڵیم وەک تۆ، بەڵام من بەڕاستی عەشق دەکەم... تۆ ناوێریت عەشق بەڕاستی بکەیت و دەتەوێت بەجۆری تر خۆت لە بەحری حەقیقەتدا ونبکەیت... تاکە شتێکی ڕاستەقینە کە مەخلوقێکی خەیاڵی بیکات عەشقە».
ماجیدی عەزیزم کە ناوی «نەوجەوانی چینی» هێنا، من موچڕکێکی سامناک بە هەموو جەستەمدا هات، ئەوساتە تێگەیشتم ئەم مرۆڤەی بەرامبەرم بەشێکە لە من. هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و وەک یەکێک ببورێتەوە کەوتم بەسەر جێگاکەمدا و بێهۆش کەوتم، کە هۆشم هاتەوە ئەو لەو ژوورەدا نەمابوو. ئەو شەوە وەک شێت گەڕامەوە بۆ ناو غەزەلەکان، پەڕە بە پەڕە هەڵمدانەوەو گەڕام، دڵنیابووم ناوی نەوجەوانی چینیم لە نێو ئەو کتێبانەدا بینیوە، دڵنیابووم. شەو تا بەر بەیان گەڕام، نزیکی کازیوە ئەم دێڕەم دۆزییەوە:

دێیت و دەڕۆیت و دەمریت، گەردەلوول و ڕەشەبایت
نەوجەوانێکی چینیت، غەزەلخوێنێکی تەنهایت
ئەستێرەت لێدەبارێ و کتێبێکی بینەوایت
لە حەقیقەت دەچیت و سیحر و خەیاڵی ڕەهایت

دوای چەندین سەعات خوێندنەوە، بەیتێکی دیکەم لە ناو ئەو غەزەلانەدا خوێندەوە کە سەرسامیکردم، وەها منی خستە بەر تەلیسمی وجود، تا ئێستا لە دۆزەخی دەرناچم.

ئەی منداڵی خەیاڵی، ئەی نەوجەوانی چینی
لەخەیاڵدا دەژیت و حەقیقەتیش دەبینی
تۆ تریفەی ئەم باغەیت، ئەستێرەیت و ئەڤینیت
لەم پێدەشتەدا دەمری و کوڕی چین و ماچینیت

پێمبڵێ ماجیدی گوڵ سۆلاف مرۆڤ دوای شەوێکی وەها چۆن دەتوانێت ئاسوودە بژی، چۆن؟ ناوی نەوجەوانی چینی یەکەمجار لەم غەزەلانەوە داکەوتبوو، من نەوجەوانی چینی بووم، تێدەگەیت، ئەوە ناوێکی تایبەتی بوو کە خانمێک لەوانەی من بە غەزەل دەمخستنە خەیاڵەوە، پێیگووتم. ئەویش لەم غەزەلانەی وەرگرتبوو... تێدەگەیت، لەم شیعرانە دەریهێنابوو. من... من نەوجەوانی چینی بووم و نەوجەوانی چینیش من بووم».

پێدەچوو غەزەلنوس ماندووبێت، ماجەلانی خەیاڵی سەراسیمە و پڕ لە پرسیار سەیریکرد و بێئەوەی دڵی بە ماندووبوونی بسووتێت گووتی «غەزەلنوس، چۆن بەشێک بوو لە تۆ؟ چۆن؟ تۆ چۆن ئەو بوویت و ئەو چۆن تۆ بوو؟».

غەزەلنوس بە ماندوویی پاڵیدایەوە و گووتی « بەدرێژایی ژیانم ویستوومە ئەو مەتەڵە بدۆزمەوە، بەڵام بێسوودبووە. هەمیشە لە چیرۆکی مەلای هاجەر و مەلای سوختەوە دەستم پێدەکرد... پرسیارەکەم ئەوەبوو چۆن مرۆڤێک دەبێت بە دوو ڕۆحی جیاواز و جودا و نەیار بەیەک... چۆن؟ من ساڵەهای ساڵ ئەو پرسیارەم دەکرد و وەڵامم بۆی نەبوو، هیچ مرۆڤێک ناتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. دوای چەندین ساڵ ئێستا دەزانم کە ئەو پرسیارە چ هەڵەیەکی گەورە بوو. مرۆڤ زۆرجار ناتوانێت وەڵامێک بدۆزێتەوە، چونکە تێگەیشتن و داڕشتنی بۆ پرسیارەکە هەڵەیە. ماجەلانی برام، سەرداریاشی دۆستم... مەلای هاجەر و مەلای سوختە یەک ڕۆح نەبوون بووبێتن بە دوو، بە پێچەوانەوە دوو ڕۆح بوون و ویستویانە ببن بە یەک. ساڵەهای ساڵ من بیرم لەو حیکایەتە کردۆتەوە، هەزارانجار ئەو دوو نامەیەم خوێندۆتەوە. دوای ئەو هەموو ساڵە ئێستا باشتر دەتوانم لەو چیرۆکە تێبگەم. بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە هیچ یەک لە مەلای هاجەر و مەلای سوختە

نەگەیشتنە وەڵامێکی یەقین دەرهەق بە خۆیان، چونکە بە ئەندازەیەک لێک نزیکبوون، پێیانوابوو جیابوونەوەیان کەرتبوونی یەک ڕۆحە بۆ سەر دوو کێشوەری جیاواز، لە کاتێکدا تراژیدیای ڕاستەقینەی ئەو دوو مرۆڤە ئەوەیە کە دوو ڕۆحی نزیکن و ناتوانن ببن بەیەک. مەلای هاجەر و مەلای سوختە دوو مرۆڤ بوون جودا، کە هەردووکیان لەسەر خوانی یەک عیشق کۆبوونەتەوە، هەر دووکیان یەک ئەڤین فڕاندوونی، ئەڤین ڕۆحی شوبهاندوون بە یەک. بە تەفسیری من مەلای هاجەر، جەنگێکی کوشندەی دژ بەو ئەڤینە هەڵگیرساندوە، هەموو هێز و تینی ژیانی خۆی خستۆتە خزمەت ئەوەی لەو عەشقە ڕابکات. مەلای سوختەش بە پێچەوانەوە ئارەزووی گەورەی تەمەنی ئەوەبووە کە بۆ ئەو عەشقە بژی، بیگەێنێت بە خەیاڵیترین پلەی خۆی و بە بڵندترین شێوە. بەڵام لە دەرونی مەلای هاجەردا ئارەزوویەکی قووڵ هەبووە بۆ ئەوەی ئەو مەلای سوختە بێت، وەک چۆن لە قووڵایی مەلای سوختەشدا ترسێکی خودایی قووڵ هەبووە و ویستوێتی مەلای هاجەر بێت. مەلای هاجەر هیچ نەبووە جگە لە دیوە خەیاڵییەکەی مەلای سوختە و مەلای سوختەش هیچ نەبووە جگە لە دیوە خەیاڵییەکەی مەلای هاجەر... دوو مرۆڤ بوون ویستوویانە لە یەکدا بتوێنەوە. هەموو مرۆڤێکی ئەم شارە بۆ دیوە خەیاڵییەکەی خۆی دەگەڕێت، ئەم شارە هەموو مرۆڤێک دەکات بە دوو کەرتەوە، مرۆڤ لەم شارەدا تەنیا دەتوانێت نیوەی خۆی هەڵبژێرێت، بەشێکی بچوکی خۆی هەڵبژێرێت و بەو بەشەوە بژی. هیچ مرۆڤێک نییە سەرتاپا وجودی خۆی ئاشکرابکات و دانی پیابنێت. مەلای سوختە و مەلای هاجەر هیچ نین جگە لە قەدەرێک کە ئەم کوچە و کوزەر و شەقامانە دروستیانکردون. هەموو کەسێکی ئەم وڵاتە نیوەیەکی خەیاڵی هەیە کە لە دەرەوە تەواویدەکات. مەرج نییە مرۆڤ لەگەڵ ئەو نیوە خەیاڵییەی خۆیدا تەبابێت، مرۆڤ بۆ ئەوەی ئاسوودە

بـژی، زۆرجـار ناچـارە ڕقـی لـەو نیـوە خەیاڵییـەی خـۆی بێـت، بیکوژێـت و سـووکایەتی پێبـکات. ناچارە بـۆ هێزێـک بگەڕێـت جڵەوییـکات، ئـەو دوو دیـوە هەرگیـز ناگـەن بەیـەک... لـە مردنـدا نەبێـت، چونکـە حەقیقـەت و خەیـاڵ تەنیـا لـە مردنـدا دەگـەن بـە یـەک».

غەزەلنـوس هەناسـەیەکی قووڵـی هەڵکێشـا، ماوەیـەک بـە هێمنـی سـەیری ماجیـدی گـوڵ سـۆلاقی دەکـرد و دەیگـووت « کـە ئـەو شـەوە غەزەلەکانـم دۆزییـەوە، تێگەیشـتم نەوجەوانـی چینـی، منـم... تێگەیشـتم ئـەم پیـاوە بەشـێکە لـە ڕۆحـی مـن، بەشـێکە لـە وجـودی مـن، دیوێکـی تـری منـە کـە تـا ئێسـتا لێیڕادەکـەم. دیوێکـی ترسـناکی منـە کـە نازانـم ئاخـۆ بکەومـە جەنگـەوە لەگەڵیـدا یـان ملکەچیبـم و لێگەڕێـم یـاری خـۆی بـکات؟».

ماجیـد بـە مەکرێکـی بەدکارانـەوە گووتـی « ئاوهـا لێگەڕایـت، بـژی و یـاری خـۆی بـکات... لێگەڕایـت بکوژرێـت».

غەزەلنـوس وەک ئـەوەی گوێـی لـە قسـەکانی گـوڵ سـۆلاف نەبووبێـت یاخـود گوێـی پێنـەدات گووتـی «چەنـد شـەوێکی دی گەڕایـەوە... داوای لێکـردم غەزەلـی بدەمـێ، دەیگـووت ئـەو غەزەلانـە بـۆ ئـەوە کـراون لـە ژیانـدا، لـە حەقیقەتـدا بەکاربێـن. تانـەی لـە مـن دەدا و بـەو پیـاوە ناویدەنام کـە ناوێـرم سـەیری ڕاستی بکـەم، دەیگـووت هەمـوو مەخلوقێکـی ترسنۆک بـە عەشـقی خەیاڵـی دەوێرێـت. مـن وەک کەوتبێتمـە شـەڕێکی کوشـندەوە بەرگریـم لـە خـۆم دەکـرد و دەمگـووت هەمـوو پیاوێکـی ناشـیرین و کـەم بەهـرەش دەتوانێـت بەزمانـی لـووس هەندێـک کچـی بێکـەس و بێسـۆز و بەسـتەزمان فریوبـدات، بـەڵام هیـچ یـەک لـەو پیاوانـە ناگەنـە ئـەو باغـە خەیاڵـی و بێسـنوورانەی عەشـق کـە لەوێدا مەحبوبـە بەپلـەی کەمـاڵ و بـە مەنزڵـی خەیـاڵ دەگات. مـن دەمگـووت عەشـق دەسـتتدان نییـە لـە لەشـی

مەحبوب، بەڵکو دەستدانە لە ڕۆحی لە ساتێکدا کە گەیشتۆتە مەقامی ئلوهییەت. دەمقیژاند بەسەریدا و دەمگووت هەموو پیاوێکی پووتی ئەم شارە کەی بیەوێت دەستی دەگاتە سینەو بەرۆکی سۆزانییەک، بەڵام کێ دەتوانێت عەشقێک بژی کە لە لەشی مەحبوبەدا مەخلوقێکی خەیاڵی بخولقێنێت بە پلەو پایە لە ئادەمییەکانی تر باڵاتر و گەورەتر بێت. بە پێکەنینەوە سەیریدەکردم و غەمی لەوە دەخوارد، من بە ناهەق دەستم بەسەر ئەو هەموو غەزەلەدا گرتووە، کە موڵکی ئەو و عاشقانی تری وەک ئەوە. ئەو گەنجە ڕۆژ دوای ڕۆژ و هەفتە لە دوای هەفتە ئەو گومانەی تیاڕواندم کە ئەو لەسەر هەقە. لەو دەمەدا من یادی مەهناز تا دەهات پتر ئازاری دەدام، جار دوای جار زیاتر هەستمدەکرد من جگە لە عاشقێک کە تەنیا دەتوانم کچی خەیاڵیم خۆشبوێت، جۆرە ئافرەتێک بپەرستم کە لەم جیهانەدا بوونی نییە، هیچی تر نیم... ئەو دەمە من دێوانەی کیژێکی خەیاڵی بووبووم کە لە باغێکی خەیاڵیدا دەمبینی، بێئەوەی من هیچ شتێک بدرکێنم ئەو هەموو شتێکی لە دڵمدا دەخوێندەوە. ڕۆژێک زۆری بۆ هێنام و باسی باغی مەهنازم بۆ کرد، باسی جوانی باڵندەکان و گەورەیی گوڵەکان و ڕەنگی هۆشفڕێنی گەڵاکان. ئەو گووتی غەزەلنوس، تۆ لە ئافرەتدا بۆ حەقیقەت ناگەڕێیت، تەنیا بۆ سێبەرەکەیان وێڵیت. دەیویست بەو قسانە ئازارمبدات. من دەترسام غەزەلی بدەمێ، دەترسام... دەمگووت تۆ گەنجێکی بێباک و سەرەڕۆیت کە غەزەلەکانم دەخەیتە خزمەت ئارەزووە پیس و شەیتانییەکانی خۆتەوە. ئەو پێدەکەنی و دەیگووت غەزەلنوس ئەم غەزەلانە بۆ ئەوە نەنوسراون لەو سەر ڕەفانەدا بمرن، دەرگایان لێبکەرەوە بابفڕن، بۆ ئەوە کراون پیاوان لە کاتی عەشقدا بۆ ژنانی بخوێننەوە، بۆ ئەوە کراون بژین، فرمێسک تەڕیانبکات، ئارەزوو بیانسووتێنێت، خوێناوی بن.

هەفتە دوای هەفتە و مانگ دوای مانگ من لە دوای هەموو جەنگێک دڵم بۆی دەسووتا. لە دوای هەموو جەنگێک غەزەلێک دووانم دەدایە... دواجار ئەو ژیانێک دەژیا، من لە قووڵایی دڵەوە حەزم لێیبوو. هەندێک شەو دامدەنا و مەرجی ئەوەم بەسەردا دەسەپاند حیکایەتی عەشقەکانی خۆیم بۆ بگێڕێتەوە، چیرۆکی ئەو ئەستێرانەم بۆ بگێڕێتەوە کە لەسەر لەشی ئافرەتان جێیدەهێڵێت. پێدەکەنی و دەیگووت تۆ پیاوێکی بێئابڕوویت، لە ڕۆحتدا ئارەزوویەکی خنکاو هەیە، لە پشت ئەو ڕیشە سۆفی ڕەنگ و چاویلکە ڕۆمانسییەتەوە، دڵێکی بێئابڕوو هەیە. دەمویست وەکو ئەو دونیا بگەڕێم، بەڵام من ونبووبووم، کە یەکەمجار چوومە باغی مەهنازەوە هەستم بەو ونبوونە کرد. ئیدی دڵنیابووم ناتوانم وەکو ئەو بژیم... هاوڕێم، شەوێک لە باغی مەهنازدا پێکەوە دەگەڕاین. من لە نەوجەوانی چینیم پرسی «موراد بۆ ئەم کچە ئەم باغە بە من دەبەخشێت؟ بۆ ئەم لالەزارە بێسنوورە دەدات بە من؟ بۆ گەڵا و گوڵەکانی تا ناکۆتا بۆ من دەکاتەوە؟». بە پێکەنینەوە گووتی «بۆ ئەوەی ونتبکات، بۆ ئەوەی وابکات بە هیچ ئافرەتێکی تری دونیا نەگەیت... ئەو لەو ساتەدا کە مردنی هەڵبژاردوە، دڵنیابووە باغێکی گەورە بەجێدەهێڵێت. باغێکی بێسنوور و بێ ئەمسەر و ئەوسەر... باغێک تۆ تیا وندەبیت. مەهناز کە خۆی سووتاندووە ویستوێتی ببێت بە مەخلوقێکی خەیاڵی، ببێتە ئەو شتەی کە تۆ دەتەوێت. هەموو مرۆڤێک کە خۆی دەکوژێت، هەموو ژنێک کە خۆی دەسوتێنێت، بۆ ئەوەیە دیوە خەیاڵییەکەی خۆیمان پیشانبدات. مەهناز بەو باغە ئەوەی پێشکەشکردویت کە تۆ دەتەوێت، بەوە تۆڵەی لێکردویتەتەوە هەموو خەونی تۆ بهێنێتە دی... غەزەلنوس... سەیرە... هیچ باغێکی ئەم سەرزەمینە لەو باغە گەورەتر نییە کە مرۆڤ بۆ ژوانێک دروستیدەکات کە نایەتە دی. باغێکە لە ونبوون زیاتر هیچی دی تیا نییە. چونکە

باغێکی ناکۆتایە، گەڕانێکی بێکۆتاییە بە هەموو جوانی دونیادا. تۆ تەنیا کەسێکی لە دونیادا باغێکی وەهات هەیە... سەیرکە ژنان چ مەخلوقاتێکی بەنرخن، گەر بە ژیان نەتوانن، بە مردن بە خۆسووتاندن جوانی خۆیان دەبەخشنەوە بە ئێمە». ئەو ڕاستیدەکرد، ماجەلانی برام، ڕاستیدەکرد... من لەو ڕۆژەوە دەبایە ناو گوڵزارەکان، ناو غەزەلەکان، ناو ئازاری مرۆڤەکانی تر، ناو جوانی ڕۆحیان، ناو خەیاڵەکانیان بۆ مەحبوبە بگەڕێم. من لە دوای هەزارباغ، دوای باغی مەهنان، دوای عەشقی تریفە یابەحری، خۆشەویستی بە گەڕانێکی دووروودرێژ و بێحاسڵ دەزانم لە ناو لالەزارێکی گەورەدا بۆ مەحبوبە. بەڵام ئەو ناو ژیان دەگەڕا، لە ناو ئافرەتە ڕاستەقینەکان و کوچە تۆزاوی و شەقامە پیسەکانی ئەم شارەدا ئەو شتانەی دەدۆزییەوە کە من لە خەیاڵدا بۆی دەگەڕام... هەموو ئەو ئافرەتانەی ئەو بەڕاستی لەگەڵیاندا دەخەوت، من دوای ئەو بە خەیاڵ لەگەڵیاندا دەخەوتم... ئەوەی ئەو بەڕاستی دەیدۆزییەوە من بە خەیاڵ ونمدەکرد

ئەو ڕۆژەی ئێوە بۆ ناوی ئەو خانمانە دەگەڕان کە موراد لەگەڵیاندا خەوتووە، من لاڵبووم و نەمدەزانی چی بکەم و چی بڵێم و چۆن شەرم و درۆی خۆم بشارمەوە، دواجار بێدەنگیم هەڵبژارد. من ناوی هەموو ئەو ژنانەم دەزانی، منیش بەخەیاڵ لەگەڵیاندا خەوتبووم... ئەوەی ئەو بەڕاستی دەیکرد لای من لەسەر شانۆیەکی خەیاڵی و لەسەرمدا ڕوویدەدا. کە ئەو لەگەڵ ئافرەتێکدا دەخەوت من هەموو لەشم هەستی پێدەکرد، هەموو گیانم ڕۆشندەبووەوە. ئەو بەشێک بوو لە من... ئەو من بوو، منیش نەوجەوانی چینی بووم. لێت ناشارمەوە ماجیدی گوڵ سۆلاف ئەویش بێئەندازە حەزی لە باغە خەیاڵییەکانی من بوو، لەگەڵ هەموو لاقرتی و سووکایەتییەکیدا، زۆرجار خۆی لەبیردەکرد و دەیگووت غەزەلنوس بمبە بۆ ئەو باغە خەیاڵیانەی خۆت، بمبە بۆ جێگایەک

حەقیقەتی ئەم دونیایەم بیربچێتەوە. من لەگەڵ خۆمدا دەمبرد بۆ باغی مەهنان، دەمبرد بۆ هەزارباغ، کە بردم بۆ هەزارباغ بینینی سەبری شێتیکرد، دەیگووت هەموو عەشیقە ڕاستەقینەکانی خۆمت دەدەمێ و ئەو کچەم پێببەخشە. بەدرێژایی ئەو چەندساڵە خولیای بوو سەبری زەوتبکات... دیوێکی زۆر قووڵ و خەیاڵکردی تیابوو. زۆرجار دەمبینی لەبەردەم گوڵێکدا سوژدەدەبات و دەنوشتێتەوە و دەڵێت «من کوڕی تۆم». گوڵ سۆلاف، موراد جەمیل واهەستیدەکرد، من دەیبەم بۆ ناو گوڵزارێک کە سەرێکی لە چین و ماچینە و سەرێکیشی لێرەیە، واهەستیدەکرد ئەو بە ناو ئەم باغانەدا هاتووە بۆ ژیان و لە هەموو گوڵێک شتێک لە جوانی هەڵگرتووە. هیچ کەسێکم نەبینیوە وەک ئەو بە جوانی خۆی هوشیاربێت. خۆشبەختە مرۆڤێک ئاوها بە جوانی خۆی هوشیاربێت... ئەویش ماوەیەکی زۆر خۆشبەختبوو. شەوێکیان قسەیەکی پێگووتم کە تادەمرم لە یادم ناچێتەوە، پێکەوە لە باغی مەهنازدا دەسوڕاینەوە گووتی «غەزەلنوس، واهەستدەکەم، من لێرەبووم لەم باغەدا بووم و دەستێکی نەناس منی کردۆتە دەرەوە... وەک ئەوەی هەر شتێک لە ژیانمدا دەیکەم بۆ ئەوەبێت، دووبارە بگەڕێمەوە بۆ ئێرە». ئەوە منی خستە خەیاڵێکی وەها بێبنەوە چەندین ڕۆژ دەتلامەوە، وام هەستدەکرد ئەوە قووڵایی هەرە تاریکی ناخی منە قسەدەکات. خۆم بە گوناهبار دەزانی کە هەموو شەوێک لەو باغە دێمەدەرێ و بۆ حەقیقەت دەگەڕێم. ئەویش ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر هەستیدەکرد کە پێویستی بەو غەزەلانەیە بۆ ئەوەی کەمێک خەیاڵ تێکەڵاو بە عەشقەکانی بکات، کەمێک لە خەون... ئەو غەزەلانە جار دوای جار... جار دوای جار زیاتر کاریان تێدەکرد، ئەو هەموو هێزی ئەوە بوو کە فریوی خەیاڵی عەشق نەخوات... دەیتوانی عاشق بێت بێئەوەی عەشق بیدات بە زەویدا، بەپێچەوانەی زۆر لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانەوە کە بێئەوەی

عاشق بن، عەشق دەیاندات بە زەویدا. دەیتوانی بۆ ماوەیەک دڵی خۆی و ئافرەتەکانی دۆستی خۆشبکات و بڕوات... ئەوە هەموو ئومێدی بوو، تا دواجار عەشقێک لەو عەشقە کوشندانە هاتە سەر ڕێگای کە ئیدی دەبێت هەموو ڕۆحی خۆتی بۆ دابنێیت... هەموو ڕۆحت.

لە ماوەی ئەو ساڵانەدا من و ئەو ژیانمان پڕبوو لە ناڕێکی و دەنگەدەنگ. زۆرجار پێکەوە پیاسەی دووروودرێژمان دەکرد، هەندێجار دەبووینە هاوڕێ و هەندێجاریش دوژمنی سەرسەختبووین. شتێک کە هەرگیز لەسەری بە شەڕ نەهاتم، ناوی نەوجەوانی چینی بوو. هەرچەند من ئەو ناوەم بە موڵکی ڕاستەقینەی خۆم دەزانی، بەڵام جار دوای جار هەستمدەکرد ئەو زیاتر لە من زیاتر شایەنی ئەو ناوەیە. زۆر شت هەبوو تامردن تێیدا نەگەیشتینە ئەنجام. من دەمگووت موراد جەمیل من مەخلوقێکی خەیاڵیم و کەوتوومەتە دونیای حەقیقەتەوە، بەڵام تۆ کەسێکی سادە و ئاساییت، مرۆڤێکی ڕاستەقینەی کە دەتەوێت شتێک لە خەیاڵ تێکەڵاوی ژیانت بکەیت. ئەو بە پێچەوانەوە ڕایوابوو، ئەو فریشتەی ناو ئەو شیعرانەیە و هاتۆتەدەرێ. بەڕوویەکدا لەسەر هەق بوو ئەو شیعرانە چەند کاریگەری لەسەر هۆشی مرۆڤ جێدەهێڵن، جوانی ئەویش هەمان کاریگەری جێدەهێشێت. سەیری لەوەدەهات کە من بایەخێکی زۆر بە حەقیقەت دەدەم. ڕۆژێک پێیگووتم، کێشەی هەرە گەورەی تۆ ئەوەیە خەیاڵ بە جۆرێک دەژیت وەک ئەوەی بەشێک بێت لە حەقیقەت، لە کاتێکدا من حەقیقەت بەشێوەیەک دەژیم وەک ئەوەی بەشێک بێت لە خەیاڵ. جار دوای جار غەزەلم دەدایە، لەگەڵ هەموو غەزەلێکیشدا هەنگاوێک لە مردن نزیکدەبووەوە. بەر لە کوژرانی بە چەند هەفتەیەک نامەیەکی بۆ نوسیم، لەوێدا دەڵێت عەشق نە خەیاڵەو نە حەقیقەت، عەشق تاکە شتێکە وەک مەرگ وایە... من ئەوکات بە تەواوی نەمدەزانی مەبەستی چییە، بەڵام ئێستا لە هەموو شتێک

تێدەگەم... من هەموو شەوێک دەیبینم، ماجیدی گوڵ سۆلاف هەموو شەوێک دەیبینم».

ماجید پرسی «غەزەلنوس دەمەوێت بزانم. خۆی هیچ خەبەرێکی لەوانە هەبوو کە دەیانەوێت بیکوژن یاخود نا؟».

غەزەلنوس بە غەمگینی سەیری گوڵ سۆلافی کرد، چاوی شتێکی تێدابوو نیوەی فرمێسک و نیوەی زەردەخەنە بوو. گووتی «لەو سێ ساڵەی دواییدا بەشێوەیەکی بەد لە هەموو عەشقێکەوە دەگلا. هەستێکی قووڵی بە خۆشبەختی هەبوو، وەک پەپولەیەکی کامەران وەهابوو کە بێباک لە باغێکدا دەفرێت. بەڵام هەموو جارێک شتێک لە ڕۆحی خۆی، لە بەختەوەری خۆی پێشکەش بەوانی تر دەکرد. وای هەستدەکرد دەتوانێت لەیەک کاتدا هەموو دونیای خۆشبوێت. من سەرزەنشتمدەکرد، سزامدەدا، غەزەلم لێحەرامدەکرد، بەڵام سوودی نەبوو. دوو هەفتە بەر لە کوژرانی بە پێکەنینەوە هات، لە سەر هەمان ئەو کورسییە دانیشت کە ئێستا تۆ لەسەری دانیشتوویت. گووتی «غەزەلنوس، دەمکوژن». گووتم «هەڵبەت دەتکوژن، چەند ساڵە من دەزانم دەتکوژن، دواجار مێردێک، برایەک، باوکێکت لێپەیدا دەبێت دەتتۆپێنێت، تۆ بەتەمای چیت، بەتەمای تا قیامەت سوار ژنی خەڵک بیت؟». بە هەمان ڕووی خۆشەوە گووتی «نا غەزەلنوس، ئەمجارە لەسەر عەشق دەمکوژن، عەشقێکی ڕاستەقینە». نەمزانی ئەو ڕۆژە چی وا دڵخۆشیدەکات، عەشقی قووڵ و بێبنی بۆ باران شوکور یاخود مردن. داوای غەزەلێکی کرد، غەزەلێک وەک ئەو دەیگووت «بەرد بکات بە ئاو». بۆ یەکەمجار بردم بۆ ئەو جێگا نهێنییەی کتێبخانەی غەزەلەکانم تیا هەڵگرتبوو، بۆ یەکەمجار ڕێگام پێدا ئازادانە بچێتە ناو بەحری غەزەلەکانەوە، ڕێگام پێدا بگەڕێت و خۆی چ غەزەلێکی دەوێت بیدۆزێتەوە و دەریبهێنێت. سێ شەو و سێ ڕۆژ پێکەوە گەڕاین، سێ شەو و سێ

ڕۆژ پێکەوە غەزەلمان خوێندەوە، کە من ماندووەبووم ئەو بێوچان غەزەلی دەخوێندەوە. دەنگی، شێوەی وەستانی، شێوازی خوێندنەوەی، هەمووشتێکی جوان بوو. دوای سێ ڕۆژ هاتینەدەرێ، من لە بەر ڕوناکی بەیانییەکی ڕۆشندا سەرەنجمدا ڕەنگێکی دیکەی هەبوو، وەک ئەوەی پیربووبێت. ئەویش بەسەرسامییەوە سەیری منی کرد و گووتی «ئێستا تێدەگەم بۆ تۆ هەموو ژیانت پێشکەش بەم کتێبانە کردوە، ئێستا تێدەگەم من چیم لە کیس چووە». وەک فریشتەیەک ڕۆیشت و ئیتر نەمبینییەوە، ئەوە دواهەمین یەک بینینمان بوو. هەفتەیەک دوای ئەوە نامەیەکی بۆ ناردم. ئەو شەوەی کە کوشتیان بێئەوەی کەس پێمبڵێت من هەستم بە هەموو شتێک کرد، هەستم بە مردنی کرد. هەستێکی سەیربوو. وەک ئەوەی نیوەی لەشت بڕوات و تۆ لەسەر یەک کەرتی وجودت بوەستیت، لەسەر یەک قاچ بوەستیت، بە یەک چاو ببینیت، بە یەک دەست نیشبکەیت. چاوم دەنوقاند و خوێنەکەیم دەبینی، چاوم لێکدەنا و شوێنی گۆڕەکەی دەهاتە بەرچاوم. لە شەوی دواترەوە دەرسیم تاهیرم برد و پێکەوە ڕۆیشتین بۆ پێدەشتەکانی قەراغشار... دوای سێ شەو گەڕان، من لاشەکەی نەوجەوانی چینیم دۆزییەوە».

بەر لەوەی قسەکانی تەواوبکات. غەزەلنوس هەستاو لە شوێنێکی نادیاری کتێبخانەکەیدا نامەیەکی دەرهێنا و گووتی «گوڵ سۆلاف... ئەمە ئەو نامەیەیە کە ئەو بەر لە مردن بۆی نوسیم، گەر دەتەوێت دەتوانیت بیخوێنیتەوە، زۆر شتی تێدایە کە بە زمان ناگووترێت و ئێستا بە من ناگێڕدرێنەوە.. ».

ئەو شەوە ماجیدی گوڵ سۆلاف، گەڕایەوە بۆ ماڵێ و لەوپەڕی سەرسامیدا نامەکەی نەوجەوانی چینی بە وردی خوێندەوە.

# بەشێك لە نامەکەی نەوجەوانی چینی بۆ غەزەلنوس

«عەزیـزی مـن غەزەلنـوس. بمبـورە کـە وەک تـۆ لـە نوسـیندا پڕبەهـرە نیـم و دەسـت و قەڵەمێکـی سیحراویم نییـە، مەسـتتبکات. ئەمـە یەکـەم نامـە و پێدەچێـت دوا نامـەش بێـت. ئـەو ڕۆژە کـە پێکـەوە لـە نێـو کتێبخانـەی غەزەلەکـەدا هاتینـەدەر، منیـش هەمـان هەسـتم هەبـوو، هەسـتێک لێیهەڵدێـم و دەمەوێـت بـە ناڕاسـتی بگـرم. ئـەو هەسـتەی تـۆ زۆرجـار باسـتکردوە، ئـەو هەسـتەی مـن و تـۆ هـەر یەکەمـان نیـوەی دونیایەکمـان بەرکەوتـووە، کـە لـە ڕاسـتیدا دونیـای هـەر دووکمانـە. بەدرێژایـی ئـەو سـاڵانەی مـن و تـۆ دۆسـت یـان دوژمنـی یـەک بوویـن، بـەردەوام شـانازیم بـە توانـای خۆمـەوە کـردوە کـە دەتوانـم کچانـی ئـەم شـارە بـە جوانـی خـۆم سەرسـامبکەم. شـانازیم بـەوەوە دەکـرد ئـەو شـتانەی تـۆ لـە خەیاڵـدا تیادەژیـت، مـن لـە حەقیقەتـدا تیادەژیـم، ئـەوەی تـۆ لـە غەزەلەکانتـدا دەیخوێنیتـەوە، مـن لـە ژیانـدا تیادەژیـم. لەگـەڵ ئەوەشـدا لێـت ناشـارمەوە کـە چەنـد سـاڵ لەمەوبـەر، کاتێـک یەکەمجـار گوێـم لـەو غەزەلانـەی تـۆ بـوو، وەک ئەوەبـوو لەوساتەدا لەدایکبووبێتـم. هەندێـک شـت کاریگەرییەکـی وەهـا گەورەیـان لەسـەر ژیـان هەیـە مـرۆڤ بـە هێـزی ئاسایی خـۆی و بـە عەقڵـی تـاک و تەنیـای خـۆی بـۆی تەفسـیرناکرێت. کەسـانێک هـەن دەژیـن و دەژیـن و دەژیـن... دێـن و دەڕۆن... هەمـوو ڕۆژێـک دەچنـە نـاو بـازاڕ، نـاو شـەقام و قەیسـەرییە بۆنـدارەکان، بـەڵام هیـچ شـتێک لـە ژیانیانـدا ڕوونـادات... هیـچ شـتێک. هـەزاران ئافـرەت دەبینـن و شـتێک ڕوونـادات، سـەدان کتێـب دەخوێننـەوە و هیـچ ڕوونـادات، دەیانجـار سـەفەردەکەن و هیـچ ڕوونـادات، هەزارجـار گـوێ لـە شـیعر و شـاعیران دەگـرن، بـەڵام شـتەکان هەموویـان وەک خۆیانـن و هێـز نییـە ئارامییـان بشـێوێنێت. وەک ئـەوەی ئـەم زەمینـە شـەپۆلێک بێـت و

مرۆڤیش مراوییەکی بێهۆش، وەک دونیا نەسیمێک بێت و مرۆڤ گەڵایەکی وەریو. بەڵام ڕوودەدات لە ناکاو یەک نیگا، یەک سەیرکردن، یەک بزەی نادیار، لە کەسێکی نەناسەوە، لە یەکێکەوە کە هیچ دەربارەی نازانیت، لە ڕۆح و ژیان و جەستەی تێنەگەیشتوویت، سەرلەبەری زیندەگیت لەبەر یەک هەڵدەوەشێنێت و وەها ئارامیت تێکدەدات، هیچ شتێکت وەک جاران نامێنێت و سەرتاپا شیرازەکان دەپچڕێن و تەواوی ئارامییەکان دەڕۆن و سەرەوخوارییەک ڕوو لە زیندەگیت دەکات هەر لە مەرگدا ئاسوودەیی و خۆشبەختیت دەستدەکەوێتەوە. پێدەچێت ئەوانە خۆشبەختبن کە ژیانیان جۆرە بومەلەرزەی وەهای تێدا نییە و عومریان گەردەلوولی وەها ڕووی تێناکات، لەوانەشە بەدبەختترین جۆری ئادەمیزادبن، چونکە دەمرن و مانای سەرسامی نادۆزنەوە. ئەو ڕۆژەی بۆ یەکەمجار گوێم لە غەزەلەکانی تۆ بوو ئەو سەرسامییەم بینی. وەک چۆن سەیرکردنی کچێک، بینینی نیگارێک، بیستنی گۆرانییەک، خوێندنەوەی کتێبێک دەشێت ژیانی مرۆڤ سەر لەبەر ئاوەژوویکاتەوە و بیگۆڕێت، بیستنی ئەو غەزەلانە ژیانی منیان گۆڕی. تا ئەو کاتە وامدەزانی من بۆ ئەوە دروستبووم کچان و ژنانی ئەم شارە سەیرمبکەن و پێم سەرسامبن... تا ئەو کاتە وامدەزانی من تەنیا سەرسامی دروستدەکەم و خۆم سەرسام نابم. بەڵام لە ناکاو بەجۆرێک بەو غەزەلانە سەرسامبووم، جارێکی تر ژیانم ڕوخساری خۆی وەرنەگرتەوە. وەها سەرسامبووم نەمدەتوانی بێ ئەو غەزەلانە بژیم... وەک ئەوەی کۆمەڵێک وشەبن لە دەروونمدا خەوتبن و دەستی من نەیانگاتێ و تۆ هاتبیت لەقووڵایی دڵی من دەرتهێنابن و بۆم بخوێنیتەوە. وامدەزانی هەر وشەیەک تۆ دەیڵێیت، لە ڕۆحی من دەریدەهێنیت... جار دوای جار زیاتر هەستمدەکرد کە ئەو غەزەلانە هی منن. زۆرجار هەستدەکەم تۆ لەسەر هەقبیت، من بەجۆرێک لە عەشقی دونیایدا نوقمبووبووم ڕێگای نێوان عەشق و خەیاڵم ونکردبوو،

بەدبەختترین عاشقیش لای تۆ کەسێکە کە ڕێگای نێوان عەشق و خەیاڵ وندەکات. گرنگ لای من ئەو بەختەوەرییە دونیاییە ڕاگوزەرە بوو کە ئێستا دەیچێژین، غەزەلنوس من هەموو ژیانم هەستمکردوە، تا پڕ خەیاڵتربین غەمگینترین. ئەو غەزەلانەی تۆ منیان تینوتر دەکرد، لەگەڵ هەموو غەزەلێکدا هەستمدەکرد دەمەوێت لە خۆشەویستیدا دوورتر بڕۆم، بەڵام هەرگیز نەمدەزانی دوور ڕۆیشتن لە خۆشەویستیدا لای تۆ مانای چی؟. من دوور ڕۆشتن لە خۆشەویستیدا بەوە تێگەیشتم کە دڵی خۆم بەم بە هەموو ڕۆحلەبەرێک، هەتا ئەگەر بۆ چرکەیەکیش بووە، هەتا ئەگەر بۆ هەناسەیەکیش بووە، ڕەنگە هەڵەبوویم، بەڵام دڵنیابە ویستومە کەسێکی باشبم، ویستم وەک غەزەلەکان گەر بۆ ساتێکیش بووە شتێک لە فێنکی بهێنم، ویستم لە ژیانی ئەواندا شتێکی تربم، شتێک لەو دووبارەبوونەوە ڕۆژانە و سادەیە نەچێت کە دەیبینن. تەنیا فریشتە و شەیتان وادەکەن دونیا خۆی دووبارەنەکاتەوە، بەڵام مرۆڤ مەخلوقێکە بێویستی خۆی هەردەم هەمان ئەو شتانە دووبارەدەکاتەوە کە لێیان دڵنیایە. زۆرجار دەڵێم، ڕەنگە ئاسانتر بێت مرۆڤ تا کۆتایی یەک ئافرەتی خۆشبوێت، هەر وەک چۆن ئاسانترە مرۆڤ تا کۆتایی یەک غەزەل بنوسێت. بەڵام دڵنیابە، منیش وەک تۆ ڕێگا قورسەکەم هەڵبژارد... من و تۆ یان فریشتەیەکین و بووین بە دووکەرتەوە یان شەیتانێکین و دابەشبووین. کامیانین؟ نازانم... بالێگەڕێین خودا خۆی بڕیاری لەسەربدات. تا ئەو ڕۆژەی گوێم لە غەزەلەکانی تۆ بوو، خۆم بە بوونەوەرێک دەبینی کە ڕاستەوخۆ خۆم فڕێدەدەمە ژیانەوە، وەک ڕاوکەرێک کە خەو بە ماسییەوە نابینێت، بەڵکو ڕاستەوڕاست بە بەلەمەکەی بەرەو ناوەڕاستی دەریا دەڕوات و لەوێدا جار دوای جار قولاپ هەڵدەدات. مرۆڤ هەیە لەسەرەتادا خەون دەبینێت، مرۆڤیش هەیە لە کۆتاییدا خەون دەبینێت. من لە جۆری دووەمم، ماسیم دەگرت ئەوسا خەونم

پێوەدەبینی، ئەوەک خەون ببینم و دواتر بڕۆم بۆ ماسیگرتن. ئەو ڕۆژەی کە گوێم لە غەزەلەکان بوو، سەرسامبووم، سەرسامی ئەوەبووم کە خۆم وەک ئەو نیوەیەی تۆ بینی، کە تۆ لە خۆتدا خنکاندوتە... وەک چۆن منداڵێک دوای ماوەیەکی درێژ تێدەگات کە ئەو کوڕی دایک و باوکێکی ترە، تێدەگات ئەو خێزانەی لە ئامێزیدا دەژی، ماڵی ڕاستەقینەی ئەو نییە و ئەو ڕۆحێکی بێکەسە کە باب و کەسی ڕاستەقینەی خۆی فڕێیانداوەتە دەرەوە، وا تێگەیشتم کە من لە تۆم و تۆش شێتانە لە خۆت دوورم دەخەیتەوە و دەرمدەکەیت. ڕەنگە بپرسیت چۆن گەیشتیتە ئەو دەرەنجامە، بە چیدا وەها بڕوایەکت لا دروستبوو؟. پێت سەیر نەبێت کە بڵێم ئەوەی منی گەیاندە ئەو بڕوایە، ئەوە نەبوو کە من و تۆ لە یەکدەچین، بە پێچەوانەوە، من و تۆ سەد دەر سەد جیاوازین. من و تۆ دوو جەمسەری دژین، بە جۆرێک دژین لە مبەرەو بەری یەک ڕۆح دەچین. هەستمکرد تۆ بە درێژایی ژیانت لە من ڕادەکەیت و منیش بە درێژایی ژیانم لە تۆ ڕادەکەم... هەر دووکمان لە بوونی یەک ئاگادارین و ناوێرین خۆمان لەیەک ئاشکرابکەین. تۆ عاشقێکی خەیاڵی کە تا قیامەت شەر لەسەر پاکی خەیاڵی خۆت دەکەیت، تۆ نەوجەوانێکی چینیت کە هەرگیز لە سنووری چین و ماچین نەچوویت بەودیودا، بەڵام هەموو خەیاڵ و ئارەزووشت لەوەدا بوو کە لە سنووری چین و ماچین دەرچیت، لەو دیو سنووری چین و ماچین عاشق بیت و تامی ئەو ماچە فەرەنگیانە بکەیت کە لێوە خەیاڵییەکانی تۆ شەرمییان لێدەکرد...

غەزەلنوس دوای ئەم هەموو ساڵە، من دەست لەسەرسەختی بەردەدەم و دەڵێم من و تۆ هەردووکمان شایستەی ئەو ناوەین، ئەگەر تۆ شەرمیش لەوەرگرتنی بکەیت، من ئەو مافەت دەدەمێ کە نەوجەوانی چینی بیت، ڕەنگە تۆ زیاتر لە من شایستەی ئەو ناوە بیت، من لە بیرم نییە کەی لە چین و ماچین هاتوومەتە دەرێ، کەی لەسەر زەمینی خەیاڵ

هاتووم بەمدیودا، بەڵام دڵنیام تۆ تا ئێستا لەوێیت... تۆ لە چین و ماچین دەرنەچوویت، تۆ ئەودیو مەرزی ئەو وڵاتە سیحراوییەت نەبینیوە. ئێستا لە تۆ تێدەگەم کە دەتبینم چیرۆکەکانی حەقیقەت کۆدەکەیتەوە، پێویستت بەوەیە شتێک لە حەقیقەت ببەیت بۆ ئەو دونیا خەیاڵییەی کە تۆ و مرۆڤە شەیداکانی هاوشێوەت تیا نوقمن. من بە پێچەوانەی تۆوە پێویستیم بە خەیاڵ هەیە تێکەڵ بەم هەموو ڕاستییەی بکەم. کە گوێم لە غەزەلەکانی تۆ دەبوو بۆنی نیشتیمانی خۆمم دەکرد، بۆنی ئەو خاک و ئاوەم دەکرد کە دەبایە منیش وەک تۆ گوڵەکانی ئاویدەم و گوڵاوی لێبگرم. لە ساتێکدا تێگەیشتم تۆ چەند تینووی حەقیقەتیت، من ئەوەندە تینووی خەیاڵم... تۆ کە غەزەل دەخوێنیتەوە، باس لە تینوێتی خۆت دەکەیت بۆ ئەم جیهانە و من کە غەزەل دەبیستم باس لە تینوێتی خۆم دەکەم... بۆ چین و ماچین.

ڕۆژ دوای ڕۆژ و ساڵ دوای ساڵ دەبووایە شتێک بگۆڕێت... ڕۆژێک «باران شوکور»م بینی تێگەیشتم کە ئەم کچە من دەباتەوە بۆ ئەو وڵاتە سیحراوییە... کە بارانم بینی تێگەیشتم هەرچی غەزەلی سەر زەوییە ناتوانێت ستایشیبکات. ئەو چەند ساڵەی لەگەڵ تۆدا بردمنەسەر و باسی ئەو کیژ و خانمانەم بۆ دەکردیت کە دێنە سەر ڕێگام، بەردەوام بیرمدەچوو ڕاستییەکت پێبڵێم. خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەوە نییە حەزبکەیت لەگەڵ یاردا بخەویت، بەڵکو ئەوەیە حەزبکەیت لەگەڵیدا بمریت. بەر لە باران هەر ژنێکی ئەم دونیایەم بینیبێت، بیرم لە مردن نەکردۆتەوە، هەردەم بیرم لە لەش، لە ئارەزوو، لە ماچ کردۆتەوە، یاخود لە ڕاستیدا بیرم لە هیچ نەکردۆتەوە... غەزەلنوس من و تۆ هەردووکمان ئەو هێزەمان تێدایە کە ئافرەتمان بینی بیر لە هیچ نەکەینەوە، ئەوە هێزێکە کەم پیاوی ئەم سەر ئەستێرەیە هەیەتی، منیش زۆرجار دەمتوانی وابم، دەمتوانی بیر لە هیچ نەکەمەوە. بەڵام

غەزەلنوس، تۆ پێمبڵێ، بۆ یەکەمجار کە باران شوکورم بینی بیرم لە مردن کردەوە، بۆ کە دەستم بەر دەستی کەوت، بیرم لە مردن کردەوە، بۆ پێش ئەوەی لەگەڵیدا بخەوم غەمگین بووم و دوای ئەوەش هەر غەمگین؟ غەزەلنوس پێمبڵێ چ شتێکە خۆشەویستی بە مردنەوە گرێدەداتەوە... چ شتێک؟.

من چاوەڕێدەکەم لەم ڕۆژانەدا بمکوژن، ڕاستییەکەی هەردووکمان چاوەڕوانی ئەوەدەکەین بمانکوژن. مێردی باران ماوەیەکە بە هەموو شتێک دەزانێت، بەڵام کەسمان بیر لە ڕاکردن ناکەینەوە، ئەم خۆشەویستییە سەیر غەمگینیکردوم، پێمبڵێ غەزەلنوس، بۆ خۆشەویستی ڕاستەقینە هەمیشە غەمگینە. من دەزانم ئەڤین هەیە، خودا و خەڵک ڕێی لێدەگرن و غەمگین دەبێت، من باسی ئەوە ناکەم، باسی ئەوە دەکەم خۆشەویستی خۆی لە قووڵاییدا هەمیشە غەمگینە، ئەگەر هیچ شتێکیش نەبێت، ئەگەر هیچ ڕێگرێکیشی نەبێت، هەر غەمگینە. لە خۆشەویستی ڕاستەقینەدا عاشقان هەتا کە بۆ یەکیش دەبن هەستدەکەن بۆ یەک نین، ئەو هەستەیان هەیە کە نەگەیشتووین بە مەحبوبە. من و باران دەیانجار پێکەوەخەوتووین، دوای هەموو پێکەوە خەوتنێک ئەو هەستە قووڵەمان بە بۆشایی هەبوو، ئەو هەستەی لەگەڵ یەکدا نین، شتێک هەیە ناتوانین بیبەخشین بەیەک، قووڵاییەک هەیە ناتوانین بیگەینێ. غەزەلنوس ئەو ڕۆژە کە لە ناو کتێبخانەی غەزەلەکان هاتمەدەرێ، تێگەیشتم کە من لە باراندا بۆ جوانی ئەم غەزەلانە دەگەڕێم، ئەو غەزەلانە کە هەرگیز کۆتاییان نایەت، چونکە ئەوانیش بۆ جوانییەک دەگەڕێن کە هەرگیز نایگەنێ. وەک ئەوەبوو دەستم خستبێتە سەر تەلیسمی حیکایەتی مەلای سوختە، ئەو حیکایەتەی ماوەیەک لەمەوبەر تۆ بۆت باسکردم. مەلای سوختە تا مردن لە نوسینی غەزەل نەکەوت، چونکە بۆ جوانییەک دەگەڕا کە هەرگیز نایگاتێ. منیش لەو کتێبخانەیە هاتمەدەرێ تێگەیشتم

کە خۆشەویستی گەڕانە بەدوای شتێکدا کە ناگیرێت. عاشقبوون بریتی نییە لەوەی حەزبکەیت هەمیشە لەگەڵ یاردا بیت، بە پێچەوانەوە ئەوەیە هەستبکەیت هەتاهەتایە ناگەیت بە مەحبوبە... لەوە دەرچێت عەشق هیچی تر نییە، من لە تۆ و لە غەزەلەکانتەوە ئەو دەردە تووشبووم. غەزەلەکانی تۆ ساڵ دوای ساڵ و دڵۆپ دوای دڵۆپ منیان کوشت. تۆ منت تووشی دەردی خۆت کرد و من نەمتوانی تۆ تووشی دەردی خۆم بکەم. کە لە کتێبخانەکە هاتمەدەرێ هەستمکرد ئیدی من تا هەتاهەتایە بێهودە دەسوڕێمەوە، تا دەمرم مەحکومم بەوەی لە باران شوکوردا بۆ جوانی ئەو غەزەلانە بگەڕێم و لە ئاوازی ئەو غەزەلانەدا بۆ جوانی باران بگەڕێم. باران ئەو ژنە خەیاڵییەی ناو ڕۆحی تۆیە کە پەڕیوەتە ناو ڕۆحی من. ئێستا مردن جگە لە شتێکی بێمانا هیچی تر نییە بەلامەوە. دەبێت مێردەکەی باران بەرامبەر بە من چی لە باران تێگەیشتبێت؟ دەبێت چی لە ژیان بزانێت؟. لێگەڕێ بمکوژێت، کوشتنی من غەدر نییە بەڵکو ئەو دەرگا دوورەیە کە من لە مێژە بۆی دەگەڕێم. وەکو دوو عاشق من و باران مەحکومین بەوەی لەیەک دووربین... گەر منیان کوشت و باران زیندووبوو، تکایە مەهێڵە سەیری لاشەکەم بکات، گەر ئەویشیان کوشت هەوڵبدە لە تەنیشت یەکەوە بماننێژیت... گەر دەستت گەیشت بە لاشەکەم، لە هەر شوێنێک بم، بمهێنە و لەم کتێبخانەی غەزەلەدا و لە نزیک ئەم کتێبانەوە بەخاکم بسپێرە. هیچ شتێک لەوە سیحراویتر نییە عاشقێک لە کتێبخانەیەکی غەزەلدا بنێژیت. هەموو کتێبخانەیەکی دونیا هەقە عاشقێک لە ناوەڕاستیدا بنێژن. لە ناو هەزاران بەیت شیعردا... لەوێ لە ناوەڕاستی ڕەفی کتێب و دەستنوسەکاندا گۆڕێکم بۆ دروستبکە... لەوێ پێکەوە لەگەڵ باران شوکوردا بمنێژە... پێکەوە... ئەوە دوا ئاوات و دوا هیوای منە...».

## یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

هاوینی دوو هەزاروچوار سەرۆک ناردی بە دوامدا و سەبارەت بە پرۆژەی شاری خەونەکان پرسیاری لێکردمەوە. چەندین ساڵ بوو سەرۆک ئەو پرۆژەیەی لە بیرکردبوو. ئەمجارەیان سەرۆک وەک خەوی بینیبێت زۆر بە دڵگەرمی و حەماسەوە قسەی لە پرۆژەکە کرد، وەها لە خەونەکانیدا باڵیگرتبوو، ئومێدی وابوو لە هەموو شارێک و قەزایەکی کوردستان گەڕەکێکی وەها ناوازە دروستبکات. پەتای مۆدێرنەکردنی کوردستان وەها لەسەری سەرۆکی دابوو، پێشتر بەو جۆرە نەمبینیبوو. ئاشکرا ئەمریکییەکان کاریگەرییەکی گەورەیان لە سەر خەیاڵی سەرۆک هەبوو. سەرۆک ئەو ماوەیە هێندەی ئەمریکییەکانی دەبینی ئێمەی نەدەبینی... پێدەچوو ژەنراڵێکی ئەمریکی بە جۆرێکی خراپ هەندێک وێنەی خستبێتە سەری سەرۆک و ئەویش بیەوێت بە خێراترین شێوە جێبەجێیانبکات. لەو سەردانەمدا سەرۆک هەندێک نەخشەی خستە بەردەستم و گووتی «ئەمە سەرەتای پلانێکی نوێی مارشاڵە، بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان»، نەخشەکان گەلەک مادیی و دوور لە خەیاڵ هاتنە بەرچاوم. ئاشکرا ئەمریکییەکانیش دوای دروستبوونی مۆلەقی و نائارامی لە ناوەڕاستی عێراقدا، تووشی هەمان ئەو نەخۆشیەی من بووبوون بۆ دروستکردنی شارێکی خەیاڵی تا وەک نمونەی سەرکەوتنی ڕۆحی مۆدێرنیزم و خەونی ئەمریکایی پێشکەش بە دونیای بکەن. من هەر لەسەر داوای سەرۆک شاندێکی ئەمریکیم بینی کە پسپۆڕی دروستکردنی گەڕەکی ئەفسوناوی و شاری عاجباتی بوون. لەگەڵ ئەنجومەنی شار و لیژنەی شارەوانی و سەندیکای ئەندازیارە مەدەنییەکاندا دانیشتم، بەردەوام قسەیان لە

گۆڕینی نەخشەی بنەڕەتی و ماستەرپلان و ئەو شتانەدەکرد. من لە کاتێکدا بە گەرمی لە هەموو کۆبوونەوەکاندا بەشداریمدەکرد، لە هۆڵی کۆبوونەوەکان دەهاتمەدەرێ و بۆ ڕۆژنامەنوسەکان پێدەکەنیم و لەبەردەم کامێراکاندا زەردەخەنەم دەگرت، هەستێکی ناوەکی سەیرم هەبوو کە بەبێ ئەو غەزەلنوسە حیزە هیچ شتێک ناکرێت. لە کاتێکدا جەنابی پارێزگار و وەزیری ئاوەدانی و بەرپرسی پرۆژە تایبەتەکان قسەیان لەسەر مۆرکردنی ڕێکەوتننامە لەگەڵ کۆمپانیای تورکی و ئوردونی و مالیزیدا دەکرد، من ڕێگای خۆم جیاکردەوە و چووم بۆ لای عەتار. گەر دەتەوێت ئەم شارە ئاوەدانبکەیتەوە یاخود کاولیبکەیت دەبێت بچیت بۆ لای کەسانی وەک عەتار. دەبێت بڵێم کە من پێشتر ئەم ڕاستییانەم بەسەرۆک گووت، من بە جەنابیانم گووت سەروەرم مەسەلەی شاری خەونەکان مەسەلەیەکی میعماری و ئەندازەیی نییە، هێندەی پرۆژەیەکە دەبێت شاعیران و دەڵاڵە شارەزاکان و ئادەمکوژان بەشداری تیابکەن. سەرۆک ئەوکات بە هۆی ئەو هەموو باروتەوە کە لە پایتەخت دەچوو بە لووتیدا تەواو گێژبووبوو زۆر درەنگ لە شتی بچوک و سادە حاڵیدەبوو، بێئەوەی بزانێت مەبەستم چییە، ناوی یەک دوو شاعیری ستۆکی ئەو زەمانەی بۆ هەڵدام و دوو سێ دیوانی کۆنی شیعریشی لە کتێبخانەکەی پێبەخشیم تا سوودی لێوەرگرم. بۆ ئەوەی دڵی سەرۆک نەشکێنم، کتێبەکانم وەرگرت و هاتمەدەرێ و خۆ بە خۆ چووم بۆ لای عەتار. کە چووم بۆ لای عەتار لیستی ناوی هەموو ئەو مەخلوقە خەیاڵیانەم بۆ برد کە تا ئەوکات دەستم کەوتبوو. عەتار خۆشی بە بینینی من نەدەهات، جارێک جورئەتیکرد و گووتی «جەنابی بارۆن، پێدەچێت تۆ مەخلوقێکی شووم بیت، لەگەڵ تۆدا دەست بە هەرشتێک بکەم دەرەنجامی نابێت». نوشوستی خۆی لەگەڵ تریفە یابەحری و غەزەلنوسدا دوو برینی گەورەی ژیانیبوون.

بەهیچ جۆرێک تێنەدەگەیشت خەیاڵ بۆ گرنگە، بۆ من وەک پیاوێکی دەوڵەتی و سیاسەتمەدار، پارەدار و زەنگین وەها خولیای خەیاڵ و غەزەل و مافوور و ئەم شتانە چۆتە سەرمەوە؟

من بۆ ئەوەی ئیشەکەمان ڕێک بڕوات، ناچاربووم بە زمانێکی سووک و سادە کە حوشترێکی وەک عەتار تێبگات، هەموو شتێکم بۆ ڕوونکردەوە و گووتم«عەتار دەزانم، تۆ زۆر خولیاتە بزانیت بۆ من وەها دوای ئەم شتانە و ئەم کەسانە کەوتووم، حەزدەکەم بزانیت، ئێستا دونیایەکی ترە، جیهان گۆڕاوە، میللەتان تەنیا بە هێز و شمشێر و توانای خۆتەقاندنەوە نازین. جوانی ئێستا لەسەروو هەموو شتێکی دونیاوەیە، من لەو چەند ساڵەدا زۆر شار و زۆر وڵات چووم... دوو شت میللەتانی سەر ئەم زەوییەی بەهێزکردوە، یەکەم ڕێکوپێکی. دووەم خەیاڵ. هەر یەک لەم دوو وشەیەش مانای زۆر هەڵدەگرن. عەتار سەیری میللەتە پێشکەوتووەکان بکە «کەوامگووت دەمزانی وشەی میللەتانی پێشکەوتوو، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر خەیاڵی خەڵکی ئەم شارە هەیە، کە حەزیاندەکرد پێشکەوتووبن، بەڵام هێندەی بە ورگ و ژێر ورگ بیریان لە پێشکەوتن دەکردەوە بە عەقڵ بیریان لێنەدەکردەوە»... سەیری ڕوقی و مەدەنییەت بکە. ئێمە لە زەمانی خوداڵێخۆشبووان حاجی تۆفیقی پیرەمێرد و ئەحمەد مختارەوە... هەر بیر لە پێشکەوتن و مەدەنییەت دەکەینەوە، بەڵام هێچمان دیار نییە. ڕۆژ بە ڕۆژ دونیای ئێمە کاول و کاولتر دەبێت. هەر کورد وانییە، ئەم ناوە هەمووی ڕزیوە، عەردەکەی و هەواکەشی عەمارەپۆ بووە و هیوای لێناکرێت... سەیرکە عەتاری برام، چیمانکرد، ئەو ئەمریکییە بەدبەختانەمان ناچارکرد لەو سەری زەوییەوە بە دەیان ملیۆن تەن تڕوتقاقەوە زەریا بە زەریا و ئاسمان بە ئاسمان دونیا تەیبکەن تا تۆزێک هۆشمان بۆبێتن، تۆزێک مەدەنییەت و شارستانییەتمان

فێربکەن، بەڵام سوودی نییە، هیچ شتێک لەگەڵ ئێمەدا سوودی نییە، دونیا بەدەست ئێمەوە سەریسوڕماوە و گیری خواردوە. نە ئەوەیە بگەڕێینەوە بۆ دواوە و بچینەوە ناو ئەشکەوت و کوونەکێوەکانی جاران، نە ئەوەیە بەڕاستی ببین بە خاوەنی مەدەنییەت. بۆ جەنابی عەتار... بۆ؟ لەبەرئەوەی ڕێکوپێکی و خەیاڵمان نییە. سەیرکە من مەسەلەکە ناگێڕمەوە بۆ عیلم و زانست و فەلسەفە و ئەو شتانە، ئەوانە لە کتێبخانەی گشتی هەن و مرۆڤ دەتوانێت بیانخوێنێتەوە و لێیان فێربێت. عیلم مولکی هەموو بەشەری سەر ئەم زەوییەیە، بەڵام خەیال یان ڕێکوپێکی شتێکە دەبێت لە خۆتدا هەتبێت. هەموو میللەتێک کە پەرەدەستێنێت، دوو دەستەو تاقمیان هەیە کە دەیانخەنە سەر هەوای ئەو شارستانییەت و گەشەیە. خەڵکێکیان هەیە ئیشیان هەر خەیالکردنەوەیە... تێدەگەیت، ئەوانە لە هەموو ڕشتەیەکدا هەن، وەک شاژنی ناو شانەی هەنگوین وان دادەنیشن و خەیاڵدەکەن... تەنیا ئیشیان ئەوەیە ئاسۆی ئەو ڕشتەیە فراوانبکەن و شتی تازەی بۆ بێنن. خەڵکێکیش هەیە ئیشیان هەر ئەوەیە نەخشە دانێن، ئیشیان ئەوەیە شتەکە لەسەر پلانێکی عاقڵانە ڕێکبخەن، تا عەقڵی ئینسان و ماسولکەکانی و خەیاڵی پێکەوە بە باشی ئیشبکەن. میللەتان چۆن گەشەیان کردوە؟ ها عەتار چۆن؟ باوباپیری ئێمە سەد ساڵە باس لە ڕاپەڕین و هەستانی شێرانەی کورد دەکەن... ئا جەنابی عەتار، ئەوە خەوی باوکی من و باوکی تۆش بووە، کە کورد ببێتە قەومێکی مەشهور و بەناو و ناسراوی دونیا. ئەو خەیاڵی پەرەسەندن و مەدەنییەتە سەد ساڵە لە ناوەوە دڵمان دەخوات، تا وای لێهات ئەمڕۆ ئەم ئیسلامیانە پەیدابوون، دەڵێن جەناب پێویستیمان بە ڕوقی و مەدەنییەت نییە، تێدەگەیت وا دەڵێن، دەڵێن کتێبەکەی باری تەعالا و حەدیسی ئەنبیا و ئەولیامان بەسە، بەڵام من وا ناڵێم، تۆش وا ناڵێیت. ئێمە پێویستمان

بە پەرەسەندن هەیە و تەواو، چونکە گەر ئەم دەڤەرە وەک خۆی بێت، هەر وا وەحشییەت و بخۆبخۆ بێت، من و تۆی کورد، لە پێش هەمووانەوە کەولکراوین... وانییە؟ وانییە عەتار... لە پێش هەمووکەسەوە کەوڵنەکراوین؟ میللەتان بەوە بوونەتە خاوەنی شان و شکۆ، ئەوانەی عەقڵیان هەیە، لەگەڵ ئەوانەی کە بازوویان هەیە، لەگەڵ ئەوانەی خەیاڵیان هەیە پێکەوە ئیشیانکردوە، عالم و سیاسی و شاعیر بەیەکەوە ئیشیانکردوە. تێدەگەیت بە یەکەوە ئیشیانکردوە. وەک لای ئێمە نەبووە سیاسییەکە قوونبکاتە شاعیرەکە و بڵێ بابڕوات خەریکی خەیاڵهەڵاوی خۆی بێت، شاعیرەکە نەیگووتووە سیاسییەکان هەموو دزو باوەحیزن نامەوێت سەروکەللەیان ببینم، عالمەکە نەیگووتووە ئیشی من ناو دەفتەر و قەڵەم و دەرس و دەورەکەی خۆمە. نا وایان نەگووتووە هەر سێکیان دەستیان خستۆتە ناو دەستی یەک و بەوە مەدەنییەت دروستبووە. ئێمە چونکە دەوڵەتمان نییە لەم ئیشە تێنەگەیشتووین... ئا عەتاری عەزیز، عالمەکە بیردەکاتەوە و زانست بەرهەمدێنێت، سیاسییەکە نەخشە دادەنێت و پلانرێژیدەکات و پارەی بۆ پەیدادەکات، لە هەموو شیان گرنگتر شاعیرەکان و خەیاڵدارەکانن کە خەیاڵ و جوانی و ئیلهامی دەخەنەسەر، بەبێ ئەمەی دواییان هیچ شتێک ناکرێت، ڕوقی دروستکردنی زیندان نییە، ڕوقی دروستکردنی شارێکە کە بە شەقامەکانیدا ڕۆیشتیت هەستی شاعیرییەتت تیا ببزوێت. گەشە و پەرەسەندن شتێکە کە مرۆڤ سەیریکرد دەبێت بڵێت «ئای خوای خاوەن جاه و جەلال، کە شتێکی جوانە»، مەدەنییەت ئەم خۆڵ و زبڵ و شیاکەیەی ناو بازاڕی ئێمە نییە، بەڵکو سەرسامییە، عەزیزم سەرسامییە. مەدەنییەت و دروستکردنی شتی ناوازە و عەنتیکە لەیەک جیانابێتەوە. تۆ شتی جوان دروستبکە دوایی کەس ناپرسێت چۆن درستکراوە، تەنیا دەڵێن «ڕەب العالمین کە سەیرە». کەس ئەمرۆ لەوە

ناپرسێت چەند کرێکار و چەند کۆیلە لە دروستکردنی ئەهرامەکان، یان لە دروستکردنی شورای چین، یان لە بەرزکردنەوە باغە هەڵواسراوەکانی بابلدا مردون. هەموو خەڵک سەیریاندەکەن و دەڵێن «سەیری هێز بکە، سەیری جوانی بکە، سەیری ئیرادە بکە»... عەتار مێژوو شتێکی دەبەنگە زۆرجار دەبێت بزانیت چۆن دەیخەڵەتێنیت، دەبێت شتێک دروستبکەیت کە خەڵکی سەیریانکرد هەستبکەن بە ناو عەقڵ و خەیاڵ و ئیرادەدا دەسوڕێیتەوە... تێدەگەیت... پەرەسەندن شتێکە ئەفسوونت لێدەکات... بەبێ کۆمەکی مەخلوقە خەیاڵییەکان ئەو ئەفسونە دروست نابێت... ئێستا عەتاری برام گەر هەر دەپرسێت، ئەی من لەم ناوەدا ئیشم چییە؟ من پێتدەڵێم من ئیشم لە بەڕێوەبەری نەخشەکە دەچێت، ئیشی من لە ئیشی هەموویان ترسناکترە، بەبێ من ئەو نەخشەیە ئیش ناکات، کە ئەو نەخشەیەش ئیشی نەکرد تەواوی مەکینەکە لە یەک هەڵدەوەشێت... تێدەگەیت، ئێستا گرفتی گەورەی من ئەوە نییە چۆن داروديوار بەرزبکەمەوە، بەڵکو ئەوەیە چۆن شارێک دروستکەم پڕبێت لە خەیاڵ، لە خەون، لە جوانی... ئەوەی کە نایەتە ژێربار غەزەلنوسە... ئەو حیزەیە».

ئەمجارە هەستمکرد عەتار بەباشی لە من تێکەیشت. بە گومانەوە سەیریکردم و گوتی جەنابی بارۆن، ئەو غەزەلنوسە زۆر جێگای بڕوا نییە، من چەند ساڵێک لەمەوبەر کردم بە مامۆستای کچی سەیفەدین مارۆ، خوا لە گوناهی خۆشبێت. وەها کاریگەرییەکی خراپی لەسەر خەیاڵی دانا، شتەکە بەوە کۆتاییهات مەهناز خان وازی لە دەستگیرانەکەی هێنا، دڵنیام جەنابیشتان دەستگیرانە داماوەکەی دەناسن نەجۆ ئەشکانی کە ئێستا بەرپرسە لەوەزارەتی پێشمەرگە، دواجار ئافرەتەکە خۆشی سووتان. واهەستدەکەم ئەو پیاوە خەیاڵێکی وا دەخاتە سەری خەڵکەوە دواتر لەدەست دەردەچن و دەستەمۆناکرێنەوە.

تێبینییەکەی عەتار زۆربەجێ بوو، بەڵام من بیرم لەوەش کردبووەوە، گووتم ئەمە لە حاڵەتێکدایە کە خەیاڵ لە ناو نەخشەیەکدا ئیش نەکات، خەیاڵ نەچێتە ناو پلانەکەوە. عەتاری ئازیز ئێمە خەیاڵمان بۆیە دەوێت تا دونیای پێ جوانبکەین، تا شوێنێک دروستبکەین، من ئەمەوێت خەیاڵ بڕوێنم، تێدەگەیت ڕەگوڕیشەی بدەمێ، ئەمە بە کەسانی خەیاڵباز خۆیان ناکرێت، گرفتی گەورەی من لەگەڵ ئەوانەدا ئەوەیە حەزیان لە ڕەگوڕیشە نییە، تێدەگەیت هەر کەسێکیش نەیەوێت ڕەگوڕیشەی هەبێت ترسناکە. عەتار من لێتی ناشارمەوە، ئیشی من ئەوەیە نەهێڵم خەیاڵێکی بێڕەگوڕیشە لەم شارەدا هەبێت. ئەم شارە خۆی چییە؟ ئەم میللەتە داماوە خۆی چییە، ئینجا کۆمەڵێک خەیاڵداری بێڕەگوڕیشە بێن و هێندەی تر لە بنەوە هەڵیکۆڵن و بنبۆشیبکەن. من مەبەستدەکەم گەنجی ئەم شارە ڕۆژ دوای ڕۆژ بێ ڕەگوڕیشەتر دەبن، ئا عەتار، دوو وشە لای من موقەدەسن، یەکەم نەخشە و ڕێکوپێکی دووەم ڕەگوڕیشە، ئا عەزیزم، ڕەگوڕیشە... بەس خودای گەورە خۆی دەزانێت ڕەگوڕیشە بۆ هەموو مرۆڤێک چەند پێویست و چەند موقەدەسە. من خەیاڵێکم دەوێت سەرنجی دونیا ڕابکێشێت، گەشە و پەرەسەندن نیشانبداتەوە، بەڵام خەیاڵێک کە دەستەمۆنەکرێت، بڵێت من ئیش لەسەر شەقام و کۆلان ناکەم، دانابەزمە قەیسەری و بازاڕەوە، خەڵکم لا کاوبایە، خەیالی وا ترسناکە... تێدەگەیت... خەیاڵێک تەنیا لە ناوەوە خەڵک فێری جۆرە خولیایەک بکات تێکەڵ بە پۆلەکە و بە یارییەکە نەبن... عەتار ئەوەیان ترسناکە... خەیاڵێک بە موجەڕەدی باسی خۆشەویستییەک بکات کە من نازانم مانای چی، خەیاڵێک دەوڵەت و چارەنوس و ڕوقی قەوم بە هیچ نەگرێت... ئەوە لە تاعوون ترسناکترە... سەیرکە عورفێک و عادەتێک هەیە کە شاعیرانی سەدەی بیست هێناویانەتە دونیاوە، خەیاڵ ئیدی خەیاڵی شاعیر بێت یاخود

خەیاڵی هەر کەسێکی تر، موڵکی میللەتە، موڵکی خەڵکە. ئێمە ئەمە لە شاعیرە پایەبەرزەکانی کوردەوە فێربووین، ئەوەی قسەیەکی تری هەیە ئێمە قەبووڵی ناکەین... بۆیە تۆ دەبێت یارمەتیمبدەیت، ئیش بە خەیاڵی جوانی ئەوانەبکەین. بیخەینە کار.

هەستمکرد کەس لەوەوبەر ئاوها بەڕوونی قسەی بۆ عەتار نەکردوە، ئەو سەرشار و دڵخۆشبوو، پەیمانی دامێ کە هەموو کۆمەکێکم دەکات. من لیستی ناوەکانم خستە بەردەست و گووتم عەتار من ئەم ناوانەم پێویستە، مەرج نییە تۆ بتوانیت هەموویان ڕازیبکەیت، بەڵام بزانە من هەموو ئەوانەم دەوێت.

کەوامکووت، نە من و نە عەتار کەسمان لە هیچ دڵنیانەبووین.

عەتار دەیتوانی هەموو مرۆڤێک بکڕێت، هیچ کەس لەو باشتر لەم شارەدا نەبوو کە ئیشی کڕین و فرۆشتنی ئینسان بێت. ڕازیکردنی خەڵک بە پارە هونەری هەرە گەورەی ئەوبوو، لە نێوان ئەندازیار و کۆمپانیاکاندا، لە نێوان تاپۆ و موڵکدارە گەورەکاندا، لە نێوان وەزارەت و بەڵێندەرەکاندا، لە نێوان دارایی و ژووری بازرگانیدا ئیشیدەکرد. ماوەیەک بوو ڕێکەوتنی گەورە نەبایە خۆی تێنەدەخست. بەڵام ئیشی ئەم ڕۆحلەبەرە خەیاڵیانەی پێخۆش نەبوو. من دەمویست هێدی هێدی ڕێگا بەرەو خەیاڵی ئەو مەخلوقە جوانانە بکەمەوە، لە عەتاریش زیاتر کەسی ترم بەدەستەوە نەبوو.

لەو کاتەدا هەواڵێکی سەیرم بۆهات. لە ڕێگای جێگرەکەی خۆمەوە لە کاروباری ئاسیشدا، کە ئاگاداری هەموو ئیش وکارێکی من بوو، بیستم کە ماجیدی گوڵ سۆلاف ناسراو بە ماجەلانی خەیاڵی هاتۆتە نوێمیران و بۆتە حیکاتخوانی منداڵی بارۆنەکان. من ڕاستەوخۆ تووشی دڵەخورپێ بووم و خەیاڵم بۆ شتی خراپ چوو. ماجیدی گوڵ سۆلاف لەو ساڵانەی دواییدا هاوڕێی هەرە نزیکی غەزەلنوس

بووە. دەمزانی لەگەڵ ڕێکخراوی نابینایاندا ڕێکەوتووە و حیکایەتی سەفەرێکی ئەفسوناوی بۆ کوێرەکان دەگێڕێتەوە. گوڵ سۆلاف گەنجێکی بەفیز و پڕهەوا و بێ هاوڕێ بوو. لەوانی دی خەیاڵاتی تر بوو، هەستم نەدەکرد شتێک لەم دونیایەدا زۆر سەرەنجی ڕادەکێشێت، تا ئەو جێگایەی من ئاگاداریشبووم لە غەزەلنوس بترازێت هاوڕێی نەبوو. ڕۆحێکی بێدەنگ و ئاڵۆز ونامۆبوو. دەرکەوتنی لە نویمیران شتێکی ئاسایی نەبوو. هەر ئێوارەی هەمان ڕۆژ زانیم کە بارۆنی بوکەشوشە لە پشت مەسەلەکەوەیە، کە بە تەلەفون قسەم لەگەڵ بارۆن کرد، هیچ شتێکی ئەوتۆی لەسەر پەیوەندی نێوان غەزەلنوس و گوڵ سۆلاف نەدەزانی، منیش خۆم لێ نەزان کرت و وامدەرنەخست کە گومانێکی خراپم لە ماجیدی گوڵ سۆلاف هەیە. بەلام لە ناخی دڵەوە دەمزانی ئەو گەنجە لە خۆبایی و ڕێکپۆشە بەدوای شتێکدا هاتووە بۆ نویمیران. من ماوەیەک بوو ئەو غەزەلنوسەم بە پیاوێکی سادە و ئاسایی نەدەبینی. تەرخونچیش لە ڕاپۆرتەکانیدا باسی ئەوە دەکات کە ماڵەکەی لە دەریاچەیەکی پڕ نهێنی دەچێت. من بڕیارمدا نهێنی ماجیدی گوڵ سۆلاف بدۆزمەوە، شەوێک لە ئاهەنگەکەی ماڵی میر سەفیندا بانگمکرد، شتی زۆرم لە چاویدا خوێندەوە، هەستم بەو ترسە کوتوپڕەی ناو دڵی کرد، چاوەدێرەکانم دوور بە دوور ئەو دۆخەیان تۆمارکرد کە دوای خوداحافیزی نێوان من و ئەو تووشیهات. هەر کەسێکی دیکەش بایە گومانی لێپەیدادەکرد. هەڵهاتنی کتوپڕی لە ئاهەنگەکە، ئەو تێکچوون و شپرزەبوونەی، دەست لەرزین و سەرئێشە لە ناکاوەکەی، پێکرا هۆی گەورەبوون درێژە بە پلانی چاودێرکردنی بدەم. ئەو شەوە هەستمکرد ئەم گەنجە پنتی هەرە لاوازی ئەو تیپە چکۆلانەیەی غەزەلنوسە... دڵنیابووم لە ڕێگای گوڵ سۆلافەوە قووڵتر دەتوانم بچمە ژووری.

# گفتوگۆیەکی قووڵ دەربارەی جەوهەری خەیاڵ و مانای لاشەکەی نەوجەوانی چینی
# دواتریش ڕاگەیاندنی جەنگ لە لایەن منەوە
# «حەسەن تۆفان ـ سەرەتای ئەیلولی ٢٠٠٤»

ژمارەی ئەو بارۆنانەی دەهاتن بۆ یانەی پیاوکوژە بێئیشەکان کەمبوون. وەک لە شبرەوە تێگەیشتم بارۆنی کولەکە یەکێکە لەو بارۆنە کەمانەی زوو زوو دێت بۆ یانەکە. شبر زانیارییەکی تەواوی لەسەر بارۆنی کولەکە هەبوو، ئەو گووتی «بارۆنی کولەکە، لە بارۆنە ڕاستەقینەکان نییە، کابرا تا ساڵی نەوەدوپێنجیش کاسبێکی ئاسایی بازاڕبووە، سەرەتا لە کولەکە فرۆشتنەوە دەستیپێکردوە، دەستپێکی ژیانی وەها دەستکورت دەبێت ماوەیەک لە عەلوەکە کۆڵکێشیدەکات. ئەوەی بارۆن دروستدەکات و دەیکات بەو پیاوەی ئەمڕۆ فەرهودی ڕاپەڕینە. لە گەرمەی شەڕە تفەنگی نێوان خەڵک و فاشیستەکاندا، بارۆن کە ئەوسا بە «سامانی شەفەی شجەر» بانگیاندەکرد سەدان کارتۆن جگەرە لە مەخزەنێکی دەوڵەت دەبات و ماوەیەکی درێژ حەشاریاندەدا. لە ڕۆژگاری ئابلۆقەی ئابووریدا لە بەختی بارۆن نرخی جگەرە بە جۆرێکی بێوێنە بەرزدەبێتەوە. لەو ئان و ساتەدا ئەو دەستی خۆی دەوەشێنێت و سەرمایەیەکی زۆری دێتەدەست کە بۆ ئەوکات پارەیەکی مفت و مۆڵ بووە، بارۆن بە زیرەکێکی زۆر لەیەک دوو ئیشی گەورەدا لەگەڵ بازرگانە ناسراوەکانی بەغدادا بە هۆی ساغکردنەوەی شیری ئێکسپایەرەوە سەرمایەی خۆی چەند بەرابەردەکات. لە کۆتایی ساڵی دووهەزارویەکدا کە بارۆنی گوڵ بە فیاگرا دەمرێت و کوڕەکەی بەشی

زۆری سامانی باوکی لە ئافرەت و ویسکی و کاسبی بێسەروبەرەدا دەدۆڕێنێت، کۆشکەکەی نوێمیرانیان بە پارەیەکی کەم دەکەوێتە دەست بارۆنی کولەکە. ئەگەر ئەوە نەبایە ئەستەمبوو ئەو پیاوە بگاتە ناو میر و پەرلەمانتار و بەرپرسە بەرزەکان. زۆر لە دەوڵەمەندەکانی نوێمیران، هێشتا وەک نامۆیەک سەیریدەکەن کە شەپۆل هێناویێتی و شایستەی ئەو دونیایە نییە. بەڵام کولەکە لە ماوەی چەند مانگێکدا لەگەڵ بارۆنی پۆرسەلان و میری خەنەووسمەدا دۆستایەتییەکی نزیک پەیدادەکات، ئەوان دەبنە پشت و پەنای گەورەی، خۆشی کەسێکی خۆبەرەپێش و سنگنێرە کە سڵ لە هیچ ناکاتەوە. ئێستا هەموو کەس دەزانن کە مورتەزای شەیتان بە پلەی یەک بۆ بارۆنی کولەکە و شێخی ناوساجی و قەیسەر ئیشدەکات».

من چیرۆکەکەی ماجیدی گوڵ سۆلافم دەربارەی نەوجەوانی چینی بۆ شبر گێڕایەوە و گووتم ئێستا ئیشی ئێمە ئەوەیە کۆمەڵێک هەواڵ و زانیاری لەسەر ژنەکەی بارۆنی کولەکە کۆبکەینەوە کە لە کاتی کوشتنی موراد جەمیلەوە پێدەچێت ئەویش بێسەروشوێن بێت. شبر هیچی لەسەر ژنەکەی بارۆن و نەوجەوانی چینی نەدەزانی. هۆی نەزانینەکەشی ئەوەبوو شبر پیاوێکی ئێجگار ڕەوشت بەرزبوو، بەدەگمەن قەبووڵیدەکرد یەکێک لە بەردەمیدا باسی ئەخلاقی ژن و کچی خەڵک بکات. کە حیکایەتی نەوجەوانی چینیم بۆ گێڕایەوە شبر گووتی «حەسەنی پیزۆ، بە دووری نازانم مورتەزای شەیتان دەستی لەدیزەکەدا هەبێت، بە دووری نازانم... لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا کە زۆر ماڵی نهێنی ئافرەتان سووتان و زۆر ژن کوژران و هەندێک کچ لە نوێمیران بێسەروشوێن بوون، قسەیەکی زۆر هەیە کە مورتەزای شەیتان و چەقەڵ ئیسماعیل و ئەو منداڵە پڕوپووچانەی دەوریان دەستیان لەو مەسەلانەدا هەبێت. ئەوە تا چەندە ڕاستە نازانم، بەڵام دەنگۆیەکی بەهێز هەیە و وەک منیش بیستوومە

ئەو دەنگۆیە لە ژنانی نوێمیران خۆیانەوە کەوتۆتەوە... پێدەچێت سەری هەموو ئەم داوانەش بڕواتەوە بندەستی جەعفەری مەغۆلی، کە حیزب تا ئێستا حیسابێکی زۆری بۆ دەکات، قسە و باسێکیش هەیە کە جێگری سەرۆک لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ پایتەخت و لەوانەیە لە باشوور هەندێک کاروباری زۆر تایبەتی پێبسپێرن. دەڵێن هەتا ئەمریکییەکانیش دڵنیان لەوەی مەغۆلی شتی پێدەکرێت. حەسەنی پیزۆ، من و تۆش دەزانین کە لەدوای ڕاپەڕین جەعفەری مەغۆلی لە ژنکوژەکان بوو، ئەوەی کاتی خۆی من و تۆ نەمانکرد، ئەو دەیکات، حیزب دەیان ژنی پێکوشت کە تا ئێستا هۆی کوشتنی بەشی هەرە زۆریان دیارنییە... مورتەزای شەیتان دۆستێکی نزیکی بارۆنی کولەکەیە، بەدووری نازانم لەو مەسەلەیەدا دەستی هەبێت... گەر ژنی بارۆنی کولەکە بە نهێنی کوژرابێت ئەوا مورتەزا دەستی لە یارییەکەدا هەیە... ».

دوای ئەو زانیاریانەی شبر گەڕامەوە بۆ لای غەزەلنوس و ویستم ئەو زانیارییە تازانەیان بۆ بگێڕمەوە کە لەسەر بارۆنی کولەکە و مورتەزای شەیتان کۆمکردونەتەوە، تا ئەوکات هیچ کەس لە برادەرانی من ناوی مورتەزای شەیتانیان نەبیستبوو. ڕۆژێکی سەیربوو، ماجیدی گوڵ سۆلافیش لەوێ بوو، سێ قۆڵی لە کتێبخانەکەی غەزەلنوسدا دانیشتین، ئەو ڕۆژە غەزەلنوس چیرۆکی پەیوەندی خۆی و موراد جەمیلی بۆ منیش گێڕایەوە. گوتی بەردەوام چیرۆکەکەی لە ئێمە شاردۆتەوە، چونکە نەیویستوە خۆشەویستی و ڕێزی ئەو وا بکات دوای نهێنی مردنی موراد بکەوین، بەڵکو مەبەستی بووە هەر کەسەمان و بەخواستی خۆی و بەپێی خولیای خۆی لەگەڵ کێشەکەدا بژی. ترساوە گەر بزانین نەوجەوانی چینی نزیکە لەو، لە گەڕانماندا پەلەبکەین و خۆمان بخەینە تەهلوکەوە. سەیرم لێهات کە بۆ یەکەمجار غەزەلنوسم بینی دەگری، بەجۆرێکی زۆر بە کوڵ و بێبڕانەوە دەگریا. بۆ ئەوەی غەمنەخوات

دەستمکردە ملی و گووتم «غەزەلنوس، ئێمە کوڕی ئەم وڵاتەین، ئەم وڵاتە پڕە لە لاشە. تاکە کارخانەیەک لەم شارەدا ئیشدەکات، ئەو کارخانەیەیە کە لاشە دروستدەکات و دەیاننێژێت... غەم لەوە مەخۆ، کە تۆ ئێمەت تووشی هیچ غەمێک کردبێت، هەر یەک لە ئێمە تارمایی لاشەیەک لە خەیاڵماندایە کە بەردەوام بەدوای خۆیدا ڕاماندەکێشێت».

من و ماجیدی گوڵ سۆلاڤیش تووشی دۆخێکی ڕۆحی وەها بووبووین، غەزەلنوس بیوستبایە یاخود نا ئێمە لەگەڵ چیرۆکەکەدا دەڕۆیشتین. لاشەکەی موراد بەردەوام لەگەڵماندا دەسوڕایەوە و بووبوو بە بەشێک لە ژیانمان. من گووتم «غەزەلنوس کێشەکە ئەوەیە کە ئێمە تەرمەکەی مورادمان ونکرد، دەبایە ئەو تەرمە وننەکەین، ئێستا زۆر پێویستیمان بەو تەرمە هەیە». غەزەلنوس هیچی نەگووت، بە چاوە پڕ فرمێسکەکانی سەیریکردم و گووتی «ئێستا دەبێت زیاتر بایەخ بە حەقیقەت بدەین. گرنگ ئەوەیە چارەنوسی باران شوکور بزانین». ئەو کەمتەرخەمییەی غەزەلنوس بەرابەر تەرمەکەی موراد کەمێک نیگەرانیکردم. نازانم بۆ لەو ساتەدا هەستمکرد لاشەکەی موراد و تەلیسمی باران لای هەموومان مانایەکی خەیاڵیان هەیە، ئەو مانا ڕاستەقینەیەی من لە زەمانی دوای ڕاپەڕیندا ونمکردبوو، ئەو مانایەی ماجیدی گوڵ سۆلاف لە نەخشە خەیاڵییەکەی خۆیدا بۆی دەگەڕا، ئەو نهێنییە قووڵەی غەزەلنوس لە غەزەلەکانیدا عەوداڵیبوو، پێکڕا لە نهێنی ئەو دوو مرۆڤەدا کۆبووبووەوە. من بە غەزەلنوسم گووت «مرۆڤ ناتوانێت دوای چارەنوسی مردنی هیچ کەسێک بکەوێت، گەر تەلیسمی ئەو مردنە نەبێت بە بەشێک لە تەلیسمی ژیانی خۆی. ژیانی هەریەکەمان مردوویەکی تێدایە کە دەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ لای و لەگەڵیدا قسەبکەین و خزمەتیبکەین، تێیبگەین و داوای لێبوردنی لێبکەین. زۆربەی وەخت ئەو لاشەیە، جەستەی کۆچکردووی کەسێکی

نزیکە، دایکمانە یاخود باوکمان یان کەسێکی نزیکی ترە کە لە ناکاو لە ڕەوتی ئەم ژیانە دڵڕەقەدا بە جێماندەهێڵێت، ئەگەر کەسێکی وا نزیکیش نەبێت، لاشەیەکی خەیاڵییە، مردوویەکی خەیاڵییە کە لەوانەیە مردنی خۆمان بێت، لاشەی خۆمان بێت. من زۆرجار لە ڕێگای مردووەکانی ترەوە قسەم لەگەڵ مردنی خۆمدا کردوە... زۆرجار». غەزەلنوس وەک ئەوەی چاوەڕوانی ئەو قسانە لە من نەبێت، بە غەمێکی زۆرەوە گووتی «حەسەنی پیرۆ، نەوجەوانی چینی شتێکی تربوو... من نەوجەوانی چینیم کوشت، تێدەگەیت، غەزەلەکانی من نەوجەوانی چینیان کوشت... ئەو بەڕاستی دەژیا... دوای هیچ تارماییەک نەکەوتبوو، ڕەنگە تاکە مرۆڤێکی ئەم شارە بووبێت کە دوای هیچ تارماییەک نەکەوتبێت... ئەو ئەوەی کرد کە من و تۆ بۆمان ناکرێت... ئەو ئەم شارە وەک باغێکی خەیاڵی دەژیا... هەزارباغی ئەو شوێنێکی جیانەبوو لە دەرەوەی ئەم شەقام و کوچانە، هەموو ژنێک لای ئەو مەحبوبەیەکی خەیاڵی بوو... هەموو کوچەیەک باغێکی خەیاڵی بوو. من کوشتم... زۆر ویستم غەزەلی نەدەمێ، زۆر ویستم بە هەمان شەقامی خەیاڵدا نەڕوات... خۆی جوانی ژیانی خۆی دەبینی... دەیزانی چ شاهانە دەژی... بەڵام ئەو غەزەلانە بردیان و کوشتیان. ئەو ئەو مەخلوقەبوو کە من خەونم پێوە دەبینی، ئەو ژیانە دەژیا کە من دەمویست. ئەم غەزەلانە نەیانهێشت بژی».

ماجیدی گوڵ سۆلاف بە فیزەوە گووتی «نەوجەوانی چینی ساتی خۆشی بردە سەر، بەڵام ژیانی ڕاستەقینەی ئەم شارە پیس و پۆخڵەی نەبینی، ژیانی ڕاستەقینە نوقمبوون نییە لە ناو سنگ و مەمکی ژناندا، بەڵکو پیاسەکردنە بەم شەقامە پیسانەدا. تێناگەم چۆن مرۆڤ دەتوانێت ژیانی شارێکی واپیس و پۆخڵ و پڕ ناشیرینی وەک ژیانێکی خەیاڵی بژی؟...».

غەزەلنوس سەیرێکی ماجیدی کرد و دوای کەمێک تێفکرین گووتی «

نەوجەوانی چینی سەرەتا ئەو جیاکارییەی لە نێوان خەیاڵ و ڕاستیدا نەدەزانی. وەک منداڵێک تازە لەدایک بووبێت، خەیاڵ و ڕاستی لای ئەو یەک شت بوون، دواتر لە ژێر کاریگەری غەزەلەکانی مندا لەو دابەشبوونە تێگەیشت».

من باوەڕم وابوو ئەو دابەشبوونە نهێنی مان و نەمانی هەموومانە، من بۆ خۆم هەر لەسەردەمی شۆڕشەوە لە نێوان خەیاڵ و حەقیقەتدا سەرگەردان و دوو کەرتبووم... ئێستاش دەڵێم، هیچ مرۆڤێک لەم شارەدا نییە دوو کەرت نەبێت، وەلێ هەندێکمان بەو کەرتبوونە دەزانین و هەندێکمان دەمرین و درکی پێناکەین. لەو کاتەدا هەڵمدایە و گووتم «سەردەمی شۆڕش، ئەو کاتەی لە ئیفتیالاتدا ئیشمدەکرد. وام هەستدەکرد گەر یەکە یەکە خەڵکە خراپەکارەکان بکوژین، ئیدی دونیا دەبێت بە بەهەشت. زۆرجار کە لەگەڵ برادەرەکانمدا یەکێکمان دەکوشت، بەجۆرێک خۆشحاڵبووین واماندەزانی هەنگاوێک لە بەهەشت نزیکبووینەتەوە. ئاهەنگمان سازدەکرد و هەرامان دەنایەوە. ئێستاش زۆر خەڵک هەن وابیردەکەنەوە، لەوانەیە لە ژیانی زۆربەی ئادەمیزادەکاندا قۆناغێک هەبێت پێیوابێت کوشتن لە بەهەشتمان نزیکدەکاتەوە. زۆربەمان لە منداڵییەوە وەها گۆشبووبووین نەماندەتوانی وێنەی ئەو نیشتیمانە بەهەشتی و خەیاڵییەی لەسەرماندایە بەبێ کوشتن و بەبێ بازدان بەسەر تەرم و لاشەی خەڵکی تردا بهێنینە پێشچاو. ئێستاش ئەم وڵاتە پڕە لەو کەسانەی پێیانوایە گەر یەک بە یەک خراپەکان بکوژین، دەتوانین بەهەشت دروستبکەین... من یەکەم شەو کە چوومە هەزارباغ گووتم ئەم جوانییەی لە خەیاڵدا هەیە لە ڕاستیدا نییە و ناشبێت، بە خۆمم گووت حەسەنی پیزۆ ڕاستیت بۆچییە، ئەو هەموو ساڵەی لە دروستکردنی گوڵاودا سەرفتکرد ئێستا ئەم باغەی پێشکەشکردویت، تیا بحەوێرەوە و بێدەنگ بە، ئەمڕۆ تۆ بەهەشتێکی خۆتت هەیە،

قوون بنێرە سەر دەرپێی خەیاڵییەکەی خۆت و ئەم کونجی قەناعەتە بەرمەدە. ئێستاش کاتێک بەڕۆژ بە سێباغدا دەڕۆم، سەیرم لێدێت ئەم شوێنە شەوان لە خەیاڵی من و تۆ و ئەو پیرێژنانەدا دەبێتە شوێنێکی وەها سیحراوی... وەک چۆن شەو و ڕۆژ بەیەکتری ناگەن گوڵەکانی هەزارباغ و ئەو شەقامە پیس و تۆزاویانەی ڕۆژیش بەیەک ناگەن. من زۆر لەو شتانەدا شارەزا نیم، بەڵام دەڵێم ئەوەی منی کردە پیاوکوژ ئەوەبوو کە دەمویست لە حەقیقەتەوە بازبدەم بۆ خەیاڵ... هەر من وانەبووم، زۆر لە پێشمەرگەکانی تری ئەو سەردەمەش کە خەباتمان دەکرد، هەر خولیایەکی وەها لەسەرماندا بوو، بازبدەین... لەم دونیا ناشیرینەوە بەرەو دونیایەکی تر. جارێک لەگەڵ یەکێک لە ڕابەرەکانی شۆڕشدا قسەمدەکرد و گووتم «مەڤاڵ، ئێمە لەم شۆڕشەدا دوای چی کەوتووین... من خەریکە کەم کەم لە خەڵک کوشتن وەڕزدەبم». بە خەفەتێکەوە سەیریکردم و گووتی «مەڤاڵ تۆفان، دوای کڵاوی بابردوو کەوتووین». گووتم« مەڤاڵ، کڵاوی بابردوو چییە؟». گووتی «مەڤاڵ کڵاوی بابردوو ئەو شتەیە گەر شۆڕشیش سەرکەوێت بۆمان ناگیرێت». شۆڕشەکە سەرجەم بۆ شتێکی خەیاڵی دەگەڕا کە کەس بە تەواوی نەیدەزانی چییە. کە ڕاپەڕین سەرکەوت ئەو خەیاڵە بە شتێکی تاڵ و ناشیرین تەواوبوو... ڕۆژێک ئەو ژنەم کوشت و سەیری چاویم کرد. ئەو نیگاکردنە هەموو ژیانی منی گۆڕی. لە چاوی ئەو ژنەدا کۆتایی ئەو خەیاڵەم بینی، ئەو کڵاوە بابردووەم بینی کە مەڤاڵەکەی سەرکردایەتی باسیکرد. عەزیزان دوای ڕاپەڕین هاوڕێ شۆڕشگێڕەکانم خەیاڵی خۆیان توڕدا و نەچوونەوە سەری، کەس نەیپرسی ئەرێ خەیاڵی ئەو شۆڕشە دووردرێژە چی بوو. نەیپرسی ئەرێ خەیاڵاتی شەهیدەکان چیان بەسەرهات؟. شۆڕش وەکو خەو وایە، کە تەواو دەبێت وەک بەئاگابێیت خەونەکانی دەڕۆن و بیردەچنەوە... هیچ شتێک لە دونیادا وەک شۆڕش

درۆزن نییە. دوای سەرکەوتنی ڕاپەڕین و گەڕانەوەی خەڵک لە کۆڕەوە گەورەکە، من سەیری چاوی هاوڕێکانی خۆم دەکرد و تروسکایی یەک خەیاڵ چییە نەمدەبینی... ئەوە وایکرد ڕابکەم و بڕۆمە ژوورێ و دەرگا لە خۆم داخەم... خەڵک هەیە دەتوانێت واز لە خەیاڵ بهێنێت و بژی، بەڵام کەسانی وەک ئێمە ناتوانین بێ خەیاڵ بژین، کە بەڕێگایەکی خەیاڵیدا دەڕۆین و دەزانین کۆڵانەکە داخراوە و ڕێگاکە دەرناچێت، ڕێگاکە دەگۆڕین و دەچینە کۆڵانێکی ترەوە. لێتان ناشارمەوە لای منیش زۆری ویست تا ئەو دوو دنیایەم لە یەکتری جیاکردەوە... دوای ڕاپەڕین، دوای ئەوەی ئەو ژنە بەستەزمانەم کوشت، تێگەیشتم خەیاڵاتی سەردەمی شۆڕش لەسەر ئەم خاک و ئاوە سەوز نابێت. بە خۆمم گووت حەسەنی پیرۆ، تا نەبوویتەتە جانەوەرێکی ڕیسواتر و بێئینسافتر لەم یارییە دەرچۆ... بۆ ئەوەی خۆم پاکبکەمەوە و شتێکی تر لە ڕۆحمدا سەوزبکەم زیاد لە شەش ساڵ چوومە خەڵوەتەوە. هەستدەکەم لەو ماوەیەدا بۆنی گوڵاوەکانی دایکم ڕۆژ دوای ڕۆژ و ئێوارە دوای ئێوارە لەم دونیا مەلعونەی دوورخستمەوە... گەر ئەو لاشەیەی موراد نەبووایە دونیا نرخی لەلام نەمابوو... من کتێبی مردووەکانیشم لە بەر خاتری ئێوە دەنوسی. بەڵام برادەرانی عەزیز مرۆڤ چەند خەیاڵاتی بێت، ڕاستی هەمیشە لە شێوەی لاشەیەکدا دێتەوە بەردەمی... ناتوانین لە ڕاستی ڕابکەین... کێشەکە ئەوەیە کە خەیاڵ قورسایی ڕاستیمان لەسەر هەڵناگرێت، ڕاستی شتێکی ناشیرینە بمانەوێت و نەمانەوێت دەمانهاڕێت، چاوبنوقێنیت و نەینوقێنیت یەک شتە، وەک گوللەیەکی بێڕەحم وایە کە بەرەو ناوچاوان دێت... خەیاڵیش هەر وا زاڵمە، چەند ڕاستی بتبات مرۆڤ ناتوانێت لە خەیاڵ ڕزگاربێت. برادەران، موراد جەمیل گەرچی زۆر لە ڕاستیدا ژیا، دەرگای ڕاستییە خۆش و بەتامەکانی بۆ واڵابوو، بەڵام دواجار نەیتوانی لە گوشاری خەیاڵ دەرچێت، ئینسان مەخلوقێکی

ناسکە لە نێوان پەستانی ڕاستی و خەیاڵدا یان وەک من دەبێتە پیاوکوژ یان وەک تۆ غەزەلنوس دەبێتە شاعیر. غەزەلنوسی برام، من ئێستا لە تۆ دەترسم، لە ماجیدی گوڵ سۆلاف دەترسم... وەها سەیرمەکە برام. بەڕاستی لە تۆ دەترسم، تۆ پیاوێکی خەیاڵاتیت، من و تۆ باغێکی هاوبەش لە سەرماندایە، بەڵام دەترسم چۆن خەیاڵاتی عەشق نەوجەوانی چینی کوشت... ئەم هەموو ڕاستییە تاڵە ئێمەش بکوژێت».

ماجیدی گوڵ سۆلاف نەیدەشاردەوە کە ڕقی لە دەنگ و شێوەقسەی منە، هەر کاتێک زۆر قسەمبکردایە وەڕزییەکی زۆرم لەسەر دەموچاوی دەبینی. گەرچی من زۆربڵێیەکی وەها بێتام نەبووم، بەڵام ناخۆشی دەنگم و خراپی دەم و نوتقم وایاندەکرد، خەڵک کەم بایەخ بە ناوەڕۆکی قسەکانم بدەن. ئەو ئێوارەیە بەر عەکسی جاران، هەستمکرد گوڵ سۆلاف بە ڕێز و حورمەتەوە تەماشامدەکات. من پێکەنیم و گووتم «گوڵ سۆلاف، مرۆڤ کە قسەی دڵی خۆی کرد، گەر شەیتانیش بێت هەر جوانە». ئەو بە زەردەخەنە ئەرستۆکراتییەکەی خۆیەوە گووتی«هەڵەیەکی گەورەیە ئەو دیوارەی لە نێوان خەیاڵ و ڕاستیدایە بشکێت، هەڵەیە... خەیاڵ گەر باریکەیت بەڕاستی ترسناکە و ڕاستیش گەر باریکەیت بە خەیاڵ ترسناکە. تێکەڵاوکردنی ئەم دوو زەمینە، وەک تێکەڵکردنی ئاو و ئاگر وەهایە».

غەزەلنوس بە گومانەوە سەیری هەردووکمانی کرد و پاش کەمێک بیرکردنەوە، هەندێک کاغەزی لەسەر مێزەکەی خۆی هەڵگرت و بێئەوەی بزانێت چی دەکات داینانەوە و گووتی « ئەو سنوورەی ئێوە لە نێوان ڕاستی و خەیاڵدا دایدەنێن نەکردەیە و نابێت. چ شتێک نەوجەوانی چینی کوشت؟ ها... ئێوە ئەو پرسیارەتان لە خۆتان کردوە...؟ حەقیقەت یان خەیاڵ؟ مرۆڤ تەنیا لە جیهانێکدا دەتوانێت سنوور لە

نێوان ڕاستی و خەیاڵدا دابنێت کە خۆشەیستی و کوشتنی تیانەبێت... لە هەر جێگایەک خۆشەویستی و کوشتن هەبێت، حەقیقەت و خەیاڵ بەشێوەیەکی ئەوتۆ تێکەڵدەبن جیابوونەوەیان ئەستەمە. من چەندین ساڵە غەزەل دەخوێنمەوە، لەگەڵ هەموو غەزەلێکدا جار دوای جار قووڵتر بە خەیالاتدا ڕۆدەچم، بەڵام هەرکات لە خەیاڵدا زۆر دوور ڕۆیشتبێتم زۆر بیرم لە ڕاستی کردۆتەوە. ئێوە بیرتان لێکردۆتەوە کە بۆ لە نێوان هەموو خەڵکی ئەم شارەدا بە تەنیا ئێمە چیرۆکی مردن کۆدەکەینەوە؟...ئەی بۆ لاشەکەی نەوجەوانی چینی ژیانی ئێوەی واگۆڕی؟. ها... ماجەلان تۆ بیرت لێکردۆتەوە؟ چونکە هیچ کەس بەقەد مەخلوقێکی خەیاڵی تینووی ڕاستی نییە. خەیاڵ خۆی بە زۆر دەستمان دەگرێت و دەمانباتە سەر ئەو ڕاستە هێڵەی کە دەمانگێڕێتەوە بۆ ڕاستی. نەوجەوانی چینی لە دونیای حەقیقەتەوە هات بۆ لای من، خۆشەویستی هێنای. من دەمویست بڕۆی بێنەوەی عەشق بیکوژێت و بەدبەختی بکات... دەمویست وابکەم بە شتێکی کەم لە حەقیقەت و بە شتێکی کەم لە خەیاڵ ڕازی بێت... ئەو دەردەی کە ئێمە تووشمان هاتووە ئەوە نییە خەیاڵمان هەیە یان بیر لە ڕاستی دەکەینەوە، هەموو مرۆڤێک شتێکی کەم لە خەیاڵ و شتێکی کەم لە ڕاستی لەلا دەستدەکەوێت. دەردی من و تۆ ئەوەیە بە خەیاڵی کەم و ڕاستی کەم ڕازی نابین... ئەوەی بیەوێت تا ئەوسەری خەیاڵ بڕوات دەیەوێت تا ئەوسەری حەقیقەتیش بڕوات، ئەوەشی بیەوێت تا ئەوسەری حەقیقەت بڕوات، دەیەوێت تا ئەوسەری خەیاڵ بڕوات... ئەوە دەردی ئێمەیە... خەڵکانی دی بە کەمێک حەقیقەت و کەمێک خەیاڵ دەژین و هەستناکەن شتێکیان ونکردوە، بەڵام ئێمە تازە مەحکومین بەوەی تا ئەوسەر بڕۆین... بەش بە حاڵی خۆم مەحکومم تا ئەوسەر بڕۆم... نەوجەوانی چینی ڕێگای تری بۆ من نەهێشتەوە، ئەو هات و تا ئەوسەری خەیاڵ

ڕۆی کە مەرگە، ئێستا منیش هیچ ڕێگایەکی دیم لە پێشدەمدا نییە ئەوەنەبێت تا ئەوسەری حەقیقەت بڕۆم... ئێوە ئازادن لەگەڵمدا دێن یاخود نا، دەتوانن بڕۆن... هەر یەکەتان زەوی خەیاڵی و ژیانی تایبەتی خۆی هەیە. بەڵام من مەحکومم بە ڕۆیشتن... دەبێت بڕۆم...».

ماجیدی گوڵ سۆلاف گووتی «غەزەلنوس ئێمە هەموو شتێکمان پێکەوە کردوە، دەزانین ئیشەکە پڕە لە مەترسی... دەزانین یەکێک هەیە نەوجەوانی چینی کوشتووە، ژنێک هەیە دیار نییە... خەڵکێکی نادیاریش هەن دەیانەوێت غەزەلەکان ببەن و بڕۆن، ئێمە تا ئێستا هیچ دەربارەی ئەوانیش نازانین... ئێمە ناتوانین لێرەدا بوەستین و هیچ نەکەین».

ئەو ڕۆژە بڕیارماندا بەردەوامبین. تا کۆتایی لەگەڵ یارییەکەدا بڕۆین. کەس لەو یاریزانە بچوکتر نییە کە لە ناوەڕاستی گەمەکەدا دەچێتەدەرێ. هیچ یەک لەئێمەش خۆمان بە یاریزانی بچوک نەدەزانی...

* * *

هەر ئەو ڕۆژە من و ماجیدی گوڵ سۆلاف گرنگترین گفتوگۆی ژیانمان ئەنجامدا. من دەمزانی دیمەنی قاتە ئینگلیزی و ویقارە شاهانەکەی لەگەڵ سروشتە خاکی و بازاڕییەکەی مندا ناگونجێت، لەگەڵ ئەوەشدا سەرسامیی من بە گوڵ سۆلاف لە سەرسامیم بە غەزەلنوس گەورەتربوو. غەزەلنوسم وەک پیاوێکی ون دەهاتە بەر چاو کە لە نێوان دوو دونیادا سەری لێشێواوە، جیاوازییەکی گەورەم لەنێوان خۆم و غەزەلنوسدا نەدەبینی، کەسمان لە ڕاستیدا بەتەواوی سەر بە هیچ دونیایەک نەبووین... بەڵام گوڵ سۆلاف زۆر باوەڕی بە خەیاڵی

خۆی هەبوو، ئەوە وایدەکرد هەندێک هێزی هەبێت کە ئێمە نەمانبوو. لەو ڕۆژەدا من و گوڵ سۆلاف گفتوگۆیەکمان کرد کە تا مردن بیرم ناچێتەوە. ئەوە یەکەمجار بوو دوای ئەو هەموو ساڵە ئەو دڵی خۆیم بۆ بکاتەوە، لە دوایَ ئەو ڕۆژەوە ئیدی بە ڕێزێکی زۆرەوە سەیری ماجیدم دەکرد، گەرچی خۆبادان و لە خۆڕازیبوونی زۆری، لەنجەولاری بە ویقاری لە قاتە سپی و ڕەش و کرێمییەکانیدا هەمیشە غەمباریدەکردم. ئەو ڕۆژە بە ماجیدم گووت «گوڵ سۆلاف، لاشەکەی نەوجەوانی چینی هەمیشە لەگەڵمدایە. زۆر جار چاو لێکدەنێم و دەیبینم، کە لە هەزارباغ دەسوڕێمەوە دەیبینم، کە بە شەقامەکاندا دەڕۆم هەستێکی قووڵم هەیە کە لە دواوە سەیرمدەکات، هەندێجار هەست بە هەناسەی دەکەم، هەستدەکەم هێند لێم نزیکە خەریکە بەرمدەکەوێت... گوڵ سۆلاف تۆ پیاوێکی لە من گەنجتر و خوێندەوارتری. ڕاستە دونیات نەبینیوە، بەڵام دەڵێم لەبەرئەوەی دونیات نەبینیوە، لەوانەیە باشتر تێبگەیت. لەم شارە پیس و چەپەڵەدا دونیا هێندە بچوکە بیبینیت و نەیبینیت وەکو یەکە. من لە تۆ دەپرسم، گوڵ سۆلاف، زۆرجار واهەستدەکەم لاشەکە سیحرێکی زۆری لەسەرم هەیە... دەمەوێت تێبگەم، چی وادەکات پیاوێک لە تەمەنی مندا عاشقی لاشەیەک بێت؟ تۆ ئەوە چۆن تێدەگەیت؟»

گوڵ سۆلاف گووتی «حەسەنی پیرۆ، منیش هەمان هەستم هەیە، لەو کاتەوەی ئەو لاشەیەم بینیوە، دەمەوێت شتێکی بۆ بکەم. جار جار لە ژیانی منیشدا دەردەکەوێت، بەڵام نامێڵم تەواو دەست بە سەر خەیاڵمدا بگرێت، مردووەکان زاڵمن گەر دەرگایان بۆ بکەیتەوە، وەها ژیانت داگیردەکەن، خەو و خۆراکت لێحەرام دەبێت»

ئێستێکی کرد و گووتی «پیرۆ، دەزانی بۆ دەمەوێت تا کۆتایی لەگەڵ ئەم حیکایەتەدا بڕۆم؟ لەبەرئەوەی خوێندنەوەی چارەنوسی مردووەکان، تەنیا شتێکە مرۆڤ لە ڕاستیدا بێ هیچ مەبەستێک دەیکات.

مـردووەکان ناگەڕێنـەوە بـۆ ئـەوەی سوپاسـمانبکەن. ئێمـە خزمەتێکیـان دەکەیـن، بێئـەوەی ئاگاداریـن، بێئـەوەی ئێمـە چاوەڕێـی هیـچ بکەیـن و ئەوانیـش چاوەڕوانـی هیـچ بـن. ئـەوە ئەوپـەڕی بەخشـندەییە، گەیشـتنی ئینسـانە بـە پلـەی کەمـاڵ. خزمەتکردنـی مـردووەکان وەک خزمەتکردنـی زینـدووەکان نییـە، مـرۆڤ هـەر وەخـت خزمەتـی زیندوویـەک دەکات، دڵـی پڕدەبێت لـە چاوەڕوانـی، منـەت دەکەوێتـە بەینـەوە، ئومێدی وەرگرتنـەوەی چاکـەی زۆرتـر دێتـە پێشـێ، دڵخۆشـدەبێت کـە فەزڵـی بەسـەر ئەوانـی دیـدا هەیـە. مـرۆڤ کاتێـک خزمەتـی خـودا یـان نیشـتیمانیش دەکات هـەر چاوەڕوانـی پاداشـتە. سـەیرکە حەسـەنی پیـزۆ ئەوانـەی خزمەتـی نیشـتیمانیان کـرد ئێسـتا چ جانەوەرێکیـان لێدەرچـووە. مـن زۆرجـار دەڵێم خۆزگـە خزمەتـی نیشـتیمانیان نەکردبایـە. سـەیرکە و بـە چـاوی خـۆت ببینـە، ئەوانـەی خزمەتـی خـودا دەکـەن چ دڕندەیەکـن، چەنـد بێبـاک بـە ئومێـدی بەهەشـت مرۆڤەکانـی دی پارچەپارچـە دەکـەن. بـەڵام مـن کـە خزمەتـی ئـەو کـوڕە مـردووە دەکـەم، چاوەڕوانـی هیـچ نیـم... ئـەوە زیاتـر دڵنیامـدەکات کـە مـن ڕیشـەیەکم لـەم سـەر زەمینـە نییـە... کاتێـک لەگـەڵ مردووەکانـدا خەریکدەبـم، نـە هیـچ وەردەگـرم و نـە هیـچ دەبەخشـم... مـن وەکـو غەزەلنـوس بـەدوای ڕاسـتیدا ناگەڕێـم... بەڵکـو کاتێـک لەگـەڵ ئـەم لاشـەیەدا دەڕۆم، نـە مـردووەکان هیچـم دەدەنـێ و نـە مـن هیـچ دەدەم بـە مردووەکان... ئـەوە پاکترین جـۆری پەیوەندییـە بوونەوەرێـک بـە بوونەوەرێکـی تـرەوە ببەسـتێت، نـە ئـەوان داوایەکیـان لـە مـن هەیـە و نـە مـن دەتوانـم داوام لـەوان هەبێـت. ئـەوە مرۆڤانەتریـن جـۆری پەیوەندییـە... لـە خۆشەویسـتی بڵندتـرە... خۆشەویسـتی پـڕە لـە تـرس و داواکاری و خۆپەسـەندی... بـەڵام بایەخـدان بـە چارەنوسـی مـردووەکان، خاڵییـە لـە داواکاری و خۆپەرسـتی. ئەمجـۆرە پەیوەندییـە تەنیـا لەگـەڵ مردووەکانـدا دەبەسـترێت... تێدەگەیـت تەنیـا لەگـەڵ مردووەکانـدا... ئـا مـن وەک

غەزەلنوس بۆ حەقیقەت ناگەڕێم... من بۆ پاکی دەگەڕێم... غەزەلنوس بۆ نیوەیەکی ونبووی خۆی دەگەڕێت، بەڵام من دەمەوێت بازنەیەکی پاک لەگەڵ نەوجەوانی چینیدا دروستبکەم، ئەو هیچ نابەخشێتە من و منیش ناتوانم هیچی پێیبەخشم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەردووکمان لە هاوکێشەیەکداین، لە بازنەیەکداین. ئەو بازنەیە تەنیا لەگەڵ مردووەکاندا دروستدەکرێت. تۆش حەسەنی پیرۆ، عاشقی ئەو لاشەیە نیت... تۆ لە هەموومان زیاتر پێویستت بەو لاشەیەیە... تۆ دەبێت لە هەموومان زیاتر لەگەڵ لاشەکەدا بڕۆیت... چونکە ئەو تەنیا ڕێنیشاندەری تۆیە لە بەرەی بکوژەکانەوە بڕۆیت بۆ بەری کوژراوەکان... سەیرکە حەسەنی پیرۆ، لەو ساتەوەی من تۆ دەناسم دەمەوێت شتێکت پێبڵێم، زۆربەی پیاوکوژانی ئەم وڵاتە بەدوای جۆرە پاکبوونەوەیەکی سیاسیدا دەگەڕێن. مەڵێ گوڵ سۆلاف بێئابڕووە، من هەر وەخت بیر لە تۆ دەکەمەوە ڕاستە و ڕاست لەخۆم دەپرسم ئاخۆ گەر پیاوکوژێک بڵێت من پەشیمانم ئیدی یارییەکە تەواودەبێت؟ گەر بڵێت من ئامادەم سزای خۆم وەرگرم ئیدی هەموو شتێک تەواو؟ گەر چووە بەردەمی سەرۆکەکانی و گووتی ئێوە منتان کرد بە پیاوکوژ، بەوە هەموو شتێک دەگوزەرێت؟ ها... هیچ دەگوزەرێت؟ بەو قسەیە موویەک لەسەری سیاسییە پیس و چەپەڵەکانی ئەم شارە دەبێتەوە؟ ها گەر چووە بەر دادگا و سنگی خۆی ڕووتکرد و گووتی بمکوژن، بمکوژن... من تاوانبارم، ئیتر بەوە دەبێت بە مرۆڤێکی تر؟ نا... حەسەنی پیرۆ... ؟ نا.. ئەی ئەگەر دەستیکرد بە شیعر خوێندنەوە، ئیتر بوو بە کەسێکی دەستپاک؟.
حەسەنی پیرۆ من شەوان کە سەر دەخەمە سەر سەرین بیر لەو شتە ترسناکانە دەکەمەوە... حەسەنی پیرۆ، هیچ پیاوکوژێک بەو جۆرە پاکنابێتەوە... ئەو جۆرە پاکبوونەوە سیاسی و عاتیفییانە مەرهەمێکن مرۆڤ دەینێتە سەر برینەکە... تۆ تەنیا بەوە پاکدەبیتەوە بگوازیتەوە

بۆ بەرەی کوژراوەکان... دەبێت ڕۆحی کوژراوێک بچێتە گیانتەوە، ئەوسا تێدەگەیت؟... حەسەن تۆفان، تەنیا بینینی ئەو لاشەیە بەس نییە، بەس نییە هەستی پێبکەیت و وابزانیت لە تەنیشتتەوە دەڕوات... بە پێچەوانەوە دەبێت ببیت بەو... ئەوەی یەکێک دەکوژێت تەنیا بەوە پاکدەبێتەوە، هەتا مردن ڕۆحی کوژراوێک لە بەربکات و لە بری ئەو بژی، دوای خەونەکانی بکەوێت و لەخولیا و ئامانجی ئەودا نوقمبێت... نەوجەوانی چینی ئەو دەرفەتەی پێشکەشکردویت لە بری ئەو بژیت، ڕۆحی ئەو لەبەربکەیت و دوای حیکایەتەکەی بکەویت. گەر دەتەوێت پاکبیتەوە، ڕۆحی نەوجەوانی چینی لەبەربکە و گەر بۆ جارێکیش بووە لە چاوی مردوویەکەوە لەدونیا بڕوانە... ئەم وڵاتەی من و تۆ، عەزیزم، وڵاتی مردنە... هەموو ڕۆژێک ئەم هەموو مەیتە... ئەم هەموو مەیتە، کە بۆگەنیان لووتی بەشەرییەتی پڕکردوە، ئەو هەموو ژنە کوژراوەی ئەم شارە، کە چیرۆکیان بەمسەرو سەری دونیادا بڵاوبۆتەوە... حەسەنی پیزۆ، پادشای گوڵاو... هەستدەکەم هەموومان پێویستمان بەوە دەبێت جارێک لە جاران ڕۆحی مردوویەک لەبەربکەین و بەشاردا بگەڕێین... بە گاڵتە وەریمەگرە. بیر لەوە بکەرەوە گەر نەوجەوانی چینی ئێستا زیندوو بێتەوە چی دەکات؟... بەقسەم بکە ئەوە بکە بە خولیای خۆت. بیر لەوە بکەرەوە و هەستە بڕۆ دوای ئەو خولیایە بکەوە».

لەو ساتەدا پێموابوو، ڕۆحی نەوجەوانی چینی گەر بگەڕێتەوە بۆ دونیا ڕاستەو ڕاست بەدوای باران شوکوردا دەگەڕێت... وەک ئەوەی تەلیسمم لێکرابێت هەستام و جگە لە گەڕان بۆ باران شوکور هیچ خەیاڵێکی دیکەم نەبوو.

***

من لە ژێر کاریگەری ڕاستەوخۆی قسەکانی ماجەلاندا، یەکەم کەس

بووم کە بڕیارمدا بە ئاشکرا بچمە شەڕەوە. ئەو کاتەی من لای خۆمەوە بڕیاری ڕاگەیاندنی شەڕمدا، هیچی ئەوتۆم لەسەر درێژ و پانی بەرەکانی جەنگ نەدەزانی. پێموایە هەموو ئەوانەی لەو دەمەدا لەگەڵ میر و بارۆنەکانی نوێمیراندا چوونە شەڕەوە هەواڵێکیان لەسەر درێژ و پانی گۆڕەپانی جەنگ نەبوو. کە ئێمە چووینە شەڕەوە لە مێژبوو میرەکانی نوێمیران بە شێوەی جۆراوجۆر ئابلۆقەیان دابووین.

لە شەشی ئەیلولی ساڵی دووهەزارو چواردا... من پەلاماری مورتەزای شەیتانمدا.

دوای قسەکانی من و گوڵ سۆلاف، هەمان شەو من و شبر چووینە سەر مێزەکەی مورتەزای شەیتان. بە پێکەنینێکی گەورە پێشوازی لێکردین. ترسێکی قووڵ لە چاویدا بوو. بەڵام بە دەم گووتی « ئەمە چ شەوێکی خۆشە، چ شەوێکی سیحراوی و پڕ ئاهەنگە، من دووان لە جوانترین کوڕانی ئەم شارە بوونەتە میوانم... مرۆڤ بۆ شەوێکی وەها ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە، خەڵک هەن دەمرن و شەوی وا نابێت بە نسیبیان... چ خۆشبەختم... چ پیاوێکی کامەرانم... سیولالا... ئەمە چ شانسێکە ڕووی کردۆتە من و نەسیمی چ بەختێکە بە باغمدا شنەی دێت؟ ». من و شبر خۆمان وادەرخست کە تەنیا بۆ ناسین و بەهرە وەرگرتن لە قسە خۆشەکانی چووینەتە سەر مێزەکەی. پێمانگووت خۆشبەختدەبین و گەورەدەبین قەبووڵبیکات ئێوارەیەک داوەتێکی بکەین. ئەو لەگەڵ هەموو گومان و دوودڵییەکیدا گووتی «داوەتی ئێوە شەرەفێکی بێوێنەیە.. وەک ئەوە وایە سەرلەنوێ لە دایکبووبێتمەوە، نە شەماڵی دوور و نە نەسیمی بەیانیان وەک نرخی ئەم حورمەتەی ئێوە لە منی دەنێن، ئاوا دڵ و ڕۆحم فێنک ناکەنەوە...».

من و شبر هەردووکمان دەمانزانی، زۆربەی نهێنییەکان لای مورتەزای شەیتانن. یارییەکە خاڵی نەبوو لە مەترسی گەورە. من ویستم شبر

نەیەتە ناو حیکایەتەکەوە، ویستم بە تەنیا ئەو پلانە جێبەجێبکەم کە لەسەرمدایە، بەڵام شبر نەیدەویست لەجۆرە یارییەکی وا ترسناکدا بە تەنها بەجێمبهێڵێت. ئەگەرچی پەککەوتە و بێهێزبوو، بەڵام لە فێڵ و مەکردا لەمن زۆرزانتر و لێوەشاوەتر بوو. من دانیشتنەکەم لەگەڵ مورتەزادا بەباسی ڕابوردووی خۆم و جەعفەری مەغۆلی کردەوە، گووتم من دۆستێکی نزیکی جەعفەری مەغۆلیم و پتر لە دوازدە ساڵە نەمبینیوە، دەزانم کە جەعفەر دۆستێکی نزیکی ئەوە و دەخوازم گەر بتوانێت کۆمەکمبکات مەغۆلی ببینم. مورتەزا بەو شێوازە سەیر و ناوازەیەی خۆی، بەو زمانە شیرینەی گووتی «مەغۆلی، ئاه ئەو شازادەیە... ئەو جوامێرە... خوای مەزن، گوڵدانی ئەم وەتەنە، چەند گوڵی تری وەک جەعفەری مەغۆلی تێدایە؟. چەند چرۆ و چەند نەمامی تری وەک ئەو لە باغ و بێستانی ئەم نیشتمانەدا هەیە... من هەر دەبووایە بمزانیبایە کە نەجیبزادەیەکی وەک ئێوە، کە کوڕێکی پاکی وەک تۆ و ئەو، هەر دەبێت ڕەدیفی پیاوی وەها بن... من بەختەوەرم، بەختەوەرم کە لەسەردەمێکدا دەژیم کە قارەمانی وەک جەعفەری مەغۆلی تێدا دەژی... کە پیاوی وەها جوامێر و مەردی وەها بێوێنەی تیا زیندووە... قەسەم بە تیشکی خۆر و ئاوی کانییە پاکەکانی ئەم نیشتیمانەی من و تۆ لە باوەشیدا گەورەبووین، ئەو پیاوە لە گەوهەرێک دەچێت کە تا ئێستا نرخ و بەهای نەدۆزراوەتەوە ». هەموو کەس دەیزانی کە مورتەزای شەیتان درۆدەکات. شبر بۆ ئەوەی وابکات زیاتر بدوێت گووتی «مورتەزا، بەڕاستی پێمبڵێ، تۆ دەتوانیت جەعفەری مەغۆلی ببینیت. من بیستوومە دەڵێن جەعفەر هەر لە ئەوروپایە، دەڵێن لەو کاتەوەی چووە بۆ هۆڵەندا نەگەڕاوەتەوە؟». مورتەزا بە پێکەنینەوە گووتی « لەو ڕۆژەوەی حیزب داوایکرد... لەو ڕۆژەوەی سەرۆک بە نامەی تایبەتی ناردی بەدوایدا، ئیدی دوای سێ ڕۆژ لێرەبوو... جەعفەری

مەغۆلی، ئای چەندە دڵی بەم خاکە دەسووتێت... کێ هەیە دلاوەری وەک ئەو لەبیربکات... گووتی ماڵاوا ئەی شارە جوانەکانی خۆرئاوا، خواحافیز ئەی ئاسوودەیی، من نیشتیمان بانگمدەکات، وەتەن هاوارم بۆ دێنێت، سەرۆک بە هەموو شکۆی خۆیەوە، بەو پەیامە پیرۆزەوە کە هەڵیگرتووە، میهی میهی بانگمدەکات... جەعفەر لەوانەیە کە ژیانی خۆی کردوە بە فیدای ئەم نیشتیمانە... لەوانەیە... ئەی شبری برام... من دەتوانم مەغۆلی ببینم، گەر نەشتوانم، بۆ ئێوە تا بەردەرگای ئەو زاتە لەسەر زگ دەڕۆم، شەرەفە... شەرەفە، سەروەرییەکی گەورەیە ئێوە دەیبەخشنە من لە نێوان ئێوە و پیاوانی بەرزی وەک خۆتاندا پەیامنێرێکی بچوک بم... چ خۆشبەختییە بۆ یەکێکی ناچیزی وەک من میهیهی خزمەتی پیاوانی گەورەی وەک ئێوەبکەم». شبر گووتی «مورتەزا پێمان خۆشە تۆ شتێکمان بۆ ڕێکبخەیت چاومان بە مەغۆلی بکەوێت... گەر ڕاستە حیزب پلەوپایەی داوەتێ دەبێت هاوڕێی خۆی لە بیربێت... تۆ پێی بڵێ، حەسەن تۆفان و شبر مستەفا دەیانەوێت بتبینن... ئەو هاوڕێی عومرمان بووە».

مورتەزا وەک لەسەر شانۆیەک وەستابێت، دەستی بەرزکردەوە و گووتی « مەغۆلی هاوڕێی خۆی لە بیرناکات، یەکێک بەوەفا و بە ئەمەک نەبێت سەرۆک وەها قەدری ناگرێت، وانییە؟ برایان وانییە... سەرۆک بەدرێژایی ژیانی بۆ پیاوی وەفادار و بە ئەمەک گەڕاوە... خودایە... ئەی پیاوە گەورە و میرزادەکان... ئێوە نابێت ئەوە لە بیربکەن... بەڵام ئیش، ئیلاهی، لەگەڵ ئیشدا دەڵێیت چی... خزمەتکردنی وڵاتێکی وا وێران، بەسەرکردنەوەی واجبەکان... وریایی دەرهەق بەو هەموو دوژمنە... ئەو هەموو نەیارە... ئەو هەموو شەونخونییە... پاراستنی ئەم وڵاتە... پاراستنی پیاوە جوانەکانی... عەزیزم، مەغۆلی ڕۆحی بەسەر پیاوەخاسەکانی ئەم وڵاتەوە دەردەچێت... دەتوانێت بۆ پاسەوانکردنی

ڕۆحێکی جوان، بە هەفتە چاو لێکنەنێت... مەغۆلی ئێوەی بیرنەچووە... بیری نەچووە... بەڵام ئیش عەزیزم ئیش... ئەرکی حیزب...». من کە تەماشای دەست و نیگا و پێکەنینەکانیم دەکرد، دڵنیابووم دەتوانم ئەم ڕێوییە بگرم... دڵنیابووم لە دڵیدا شتێک هەیە دوای بکەویت دەیگریت. دەمزانی لەگەڵ ئەمجۆرە مەخلوقانەدا یەک یاری هەیە، ئەویش یاری ڕووبەڕووە. هەموو ئەو جانەوەرانەی حیزب دروستیکردبوون لە یاری ژێرەوانکێدا... لە نمایشکردندا، یەکەمبوون. بۆ ئەوەی ئاشکرا و بێپەردە یاری لەگەڵدابکەم گووتم «مورتەزا، من هاوڕێی مەغۆلیم... من وەک ئەو نیم، تێدەگەیت، من لە حیزب هاتمەدەرەوە و جارێکی تر لە ژیانمدا ناچمەوە ناو حیزب، بەڵام ئیشدەکەم تێدەگەیت، ئیشدەکەم، بەڵام بە یاساو ڕێسای خۆم... تا ڕۆژێک چەک هەڵگرتن مانای هەبوو، من چەکم پێبوو، بەڵام ئێستا تەواو... مەغۆلی کوڕی نیشتیمان نییە... مەغۆلی ئێستا خزمەتکاری میرەکانە... من دەمەوێت بیبینم و چەند پرسیارێکی لێبکەم، دەزانی مورتەزا ئەو پرسیارانە چیین؟... دەزانیت؟ حەزدەکەیت بیانبیستیت، ها حەزدەکەیت؟ لێیدەپرسم جەعفەری مەغۆلی ڕۆڵی تۆ لە کوشتنی ئەو ژنانە چی بوو کە دوو ساڵ لەمەوبەر لە ماڵی ژنە بێپەناکاندا سووتان... ئەو ژنانەت لە بیرە؟ ئەو ژنە بەستەزمانانەی گەڕەکی «بابەردان». ها... لە بیرتە؟ پێیدەڵێم مەغۆلی برادەرم، شەرمەکە و پێمبڵێ، ڕۆڵی تۆ لە کوشتنی هەندێک لە ژن و کچانی نوێمیراندا چییە؟. ها... لەم دوو ساڵەدا زیاد لە ئافرەتێک و کچێک لە نوێمیران بێسەروشوێن بوون... وانییە مورتەزای ئازیزم، وانییە؟ پێیدەڵێم برادەرە ژنکوژە عەزیزەکەم، دوای ئەوەی من دەستم لە ژنکوشتن هەڵگرت، تۆ چەند ژنی ترت کوشت؟ لێشی دەپرسم تۆ بۆ کامە ئاغا و میر و کادێری باڵای بەئەمەک ئیشدەکەیت... کامەیان زۆرترین خەڵاتت دەداتێ؟ لێیدەپرسم مەغۆلی عەزیزم، من برادەرە

دێرینەکەی خۆتم، پێمبڵێ تۆ ئەمڕۆ تفەنگ بۆ کێ دەتەقێنیت؟ جگە لە چەقەڵ ئیسماعیل و مورتەزای شەیتان چەند پیاوی ترت هەیە لە بازاڕ و کوچەکاندا ئیشت بۆ دەکەن و خەڵک دەترسێنن؟... پێیدەڵێم لەگەڵ چەند کومپانیادا شەریکیت؟ ها عەزیزم... چەندجار لەسەدا بیستی و لەسەدا سی و لەسەدا چلی وەردەگریت ؟ بۆ قازانجی چەند کەس لووت دەنێیتە ناو تەندەرەکان؟ ساڵی دەم و دانی چەند کەس دەشکێنیت لەوانەی دەوێرن دەمبکەنەوە؟ تا ئێستا پەراسووی چەند ڕۆژنامەنوست شکاندوە؟ لە چەند باڵەخانەی نوێدا بەشت هەیە؟ لێیدەپرسم، جەعفەری برام ژمارەی پارەگێڕەکانی تۆ و برادەرە بارۆنەکانت لە بازاڕدا گەیشتونەتە چەند؟ ژمارەی دوکانەکانت چەندە عەزیزم؟ چەند سەد دۆنم زەویت لە دەوروبەری شار هەیە؟ چەند گوندت لە جووتیارە بەستەزمانەکان کڕیوەتەوە و کوڕەکانیشت کردون بە پۆلیس؟ لە ژێرەوە چەند بەنزینخانەت هەیە؟ ژمارەی قەحبەکانت گەیشتۆنە چەند؟ کێ مەسرەفی ئەو پیاوە دڵسۆزانەی تۆ و بارۆنی پۆرسەلان و بارۆنی کولەکە و شێخی ناوساجی و قەیسەر هەڵدەگرێت... کێ؟ حیزب؟ مەکتەبی سیاسی؟ هاوڕێیان و هەڤاڵان و کادێرە بە ئەمەکەکان؟ ها کێ؟».

قسەکانم وەک کوتەکێک وەهابوو بەر سەری مورتەزای شەیتان کەوتبێت، بۆ ئێستێک وەها حەپەسا نەیدەتوانی زمان هەڵبهێنێت. پێشتر کەس بەو جۆرە قسەی لەگەڵدا نەکردبوو. ئەوە تاکە شێوازێکی گونجاوی یاریکردن بوو لەگەڵ مورتەزای شەیتاندا. دەمزانی گەر هەردووکمان بەرابەر بە یەک دەمامک بکەینەسەرمان، تا هەتاهەتایە یارییەکە تەواو نابێت، بەڵام گەر یەکێکمان دەمامکەکە فڕێبدات، یارییەکە دەگۆڕێت. دڵنیابووم کاتێکی دەوێت تا ئەو کوتەکە تەواو گێژیدەکات. شبریش لەو باوەڕەدا نەبوو، وا دوور بڕۆم، بەڵام خۆشحاڵبوو

کە مورتەزای بەو جۆرە دەبینی. لە چاوی شبردا شادییەکی گەورەم خوێندەوە. مورتەزا کەمێک خۆی ڕاوەشاند و گووتی «حەسەن تۆفانی برام، پیاوە گەورەکە... درۆی نەیارەکان نەتبات، سوێند بە بێگەردی پەپولە، بە غونچەی درەختی سێو، مەغۆلی دەستێکی لەو شتانەدا نییە... ژنە سووتاوەکان، کچە کوژراوەکان؟؟...هیهی هی هی هم... وای حەسەنی برام... وای. مەغۆلی سەربازێکی ڕاستگۆیە، ڕۆژێک لە هۆڵەندە گەڕایەوە من پێشوازیم لێکرد، هەر گەیشتینە شار، هەر چاوی بە منارەکان کەوت، چاوی بەو شاخانە کەوت، چاوی بە گومەز و قەڵا و بورجی کارەباکە کەوت، دەستیکرد بە گریان، خۆڵی زەوییەکەی دەخوارد، تۆ نازانیت چەند ئەم خاک و ئاوەی خۆشدەوێت، گیای دەخوارد، ئا عەزیزم، وەک یەکێک غەریبی شێتی کردبێت چیمەنی حەوشی ماڵەکەی خۆیانی دەخوارد... گەر ئەو ڕۆژە مەغۆلیت بدیایە دەتزانی چ پیاوێکی ناسکە... دەتزانی چەند ئەم وڵاتەی خۆشدەوێت. من خۆم بۆ نەگیرا و لەگەڵیدا گریام، لەگەڵیدا خۆڵم خوارد، لەگەڵیدا گیام خوارد».

من پێمگووت «مورتەزا، هەموو ژنانی ئەم شارە ناوی تۆیان بیستووە... تۆ بۆ کێ ئیشدەکەیت؟ هەموو دەڵێن تۆ بۆ حیسابی مەغۆلی ئەو دوو خوشکەت لە گەڕەکی «کانیتۆز» دەرمانخوارد کرد، تۆیت دەستت لەسەربڕینی ژنی هەڵهاتووی یەکێک لە ئاغاکاندا هەیە... من دەسەڵاتێکم بەسەر تۆدا نییە، بۆ دەترسیت... ئەوەی من لێت دەپرسم، ئەو قسانەیە کە خەڵک لە دەرەوە دەیزانن، هەموو خەڵک دەیزانن».

هەستمکرد هێدی هێدی قسەکانم شێتیدەکات، بەڵام دووبارە خۆی گرت و گووتی «حەسەن تۆفان دۆستی من، برای شیرینم... مورتەزا پەپولەیە... مورتەزا ناتوانێت مێرولەیەک ئازاربدات... یەکێکی خراپ

ئەو دڵـە پـاک و جـوان و گەورەیـەی تـۆی چەواشـەکردوە، یەکێکـی ترسـناک ئـەو ڕۆحـە گەورەیەتـی ژەهراویکـردوە، قەسـەم بـە ژیانـی گـوڵ... قەسـەم بـە دەنگـی باڵنـدە کاتێـک خەریکـە دەپێکرێـت... مـن بێگوناهـم، دڵێکـم هەیـە لـە بەفـر پاکتـر... لـە ئـاو پاکتـر، لـە شـەونم پاکتـر... تـۆ مورتـەزا ناناسـیت... شـەو و ڕۆژ بـەم شـارەدا دەسـوڕێمەوە و بـە خەڵـک دەڵێـم ئێـوە مورتـەزا ناناسـن، وەرن ڕۆحـی ببینـن... ڕۆحـی».

مـن بـە گاڵتەجاڕییـەوە گـوتـم «ڕۆحـی؟ هـا ڕۆحـی؟ ئـەو ڕۆحـە شـەیتانییەی دەیفرۆشـیت بـە هەمـوو کەسـێک، مورتـەزا ئـەو شـەوەت لـە بیـرە لەگـەڵ قەیسـەردا لـە قـەراغ شـار، کوڕێکـی گەنجتـان ئـازاردا، بیرتـە تـۆ وەک ئێسـتا لـە تاریکیـدا قسـەی پڕوپوچـت دەکـرد. مـن ئـەو شـەوە لەوێبـووم، لـە تاریکیـدا سـەیری تـۆ و قەیسـەر و پیـاوە ئازاکانـی دیکـەم دەکـرد کـە لـە منداڵێکـی بەسـتەزمانتان دەدا کـە نایەوێـت دوکانەکـەی چۆڵبـکات... مورتـەزا بیرتـە، یـان بیـرت نییـە؟ مانگـی چەنـد جـار ئاوهـا لـە خەڵـک دەدەن... باسـی ڕۆحـت کـرد؟ وانییـە؟ بـەو بۆنەیـەوە پێمبڵـێ، ڕۆحـی بـاران شـوکور لـە کوێیـە؟ پێمبڵـێ ژنـی بارۆنـی کولەکـە لـە کوێیـە؟ تـۆ ڕۆحێکـی پـاک نییـت؟ دەپێمبڵـێ بـاران شـوکور کـوا ؟»».

وەک چنگێکـی تیـژ برینداریکردبێـت لـە شـوێنی خـۆی هەسـتا و لـە مێزەکەمـان دوورکەوتـەوە و گـوتـی «حەسـەن تۆفـان... تـۆ عەزیـزی منیـت... تـۆ سـەروەری منیـت... هەمـوو دونیـا دەزانێـت ژنـی بارۆنـی کولەکـە لـە دەرەوەی وڵاتـە... هەمـوو دونیـا دەزانێت...خـوای گـەورە، لـە گومانـی خراپـی ئـەم پیـاوە بمانپارێـزە... خوایـە، ببـورە... خـوای گـەورە ببـورە، چونکـە حەسـەن تۆفـان گـەورەی منـە، مامۆسـتای منـە، عەزیـزی منـە... سـەروەری منـە». وەک گێژبووبێـت، وەک تیرێکـی ژەهـراوی پێکابێتـی و چاوەڕوانبێـت ژەهرەکـەی هێـدی هێـدی بگاتـە دڵـی، بـە خاوییەکـی زۆر، بـە ملهوڕی جانەوەرێکـی بەزیـوەوە لەگـەڵ ئـەو قسـانەدا یانەکـەی چۆڵکـرد.

دوای ئـەوەی مورتـەزا ڕۆیشت، سـەیرێکی شبرم کـرد و گووتـم «شبری برام ئێسـتا یـان دەمانکوژن، یـان مەغۆلـی دەنێرێـت بەدوامانـدا بـۆ ئـەوەی بێدەنگمانبـکات، یـان گـەر ژنـی بارۆنـی کولەکـە لـە ژیانـدا مابێـت لـە ژێـر زەویـش بێـت دەریدەهێنـن و ئاشـکرایدەکەن».

شبر سـەیریکردم و گووتـی «نـا... هیچ یەکێـک لـەو سێ ئەگـەرەی تـۆ ڕاسـت نییـە، نامانکوژن لەبەرئـەوەی واهەستدەکەن هێـزی گەورەترمـان لـە پشتە. ئـەوە عەقڵـی ئەوانـە، بـرات لـە نـاو ورگـی مەکینەکـەدا گەورەبـووە، لـە نێـوان ددانەکانیـدا ژیـاوم، سـەیری قاچـم بکـە ئەوسـا دەزانیـت لـە کـوێ بـووم... مـن دەزانـم چـۆن بیردەکەنـەوە. مەغۆلیـش خـۆی دەرناخـات چونکـە مورتـەزای شـەیتان ناوێرێـت هەواڵـی ئەمشـەو ببـات بـۆ مەغۆلـی. ژنـی بارۆنیـش دەرناکەوێـت، لەبەرئـەوەی دڵنیـام نەمـاوە».

پرسیم «ئەی چی دەبێت؟»

شبر سەیریکردم و گووتی «نازانم»

بـە هەسـتی کەسـێکەوە بزانێـت شـەڕێکی بێسـەروبنی هەڵگیرسـاندوە، بـە کەساسـی گووتـم «شـبر ئێسـتا چیبکەیـن؟»

شـبر بـۆ ئـەوەی ئارامبکاتـەوە، زەردەخەنەیەکـی گـەورەی گـرت و گووتـی «ئێسـتا دەچینـەدەرێ، لـە دەرگاکـەوە جـوان جـوان سـەیری ئـەم سـاڵۆنە بکـە، چونکـە ئیتـر تامـردن نایبینیتـەوە، ئیتـر کەسـمان ناتوانیـن بێینـەوە بـۆ ئێـرە، ئیـدی پێویسـتیمان بـەوە نییـە بێینـەوە بـۆ نـاو ئـەم یانەیـە... چەنـد وەختـە کـە ڕوو لێـرە دەکەیـن، بـۆ ئـەوە بـوو ڕۆژێـک فیشـەکێکی وەهـا بتەقێنیـن، ئێسـتا گوللـەی یەکەمـی خۆمـان تەقانـد، ئیـدی بـە هەمـوو حیسـابێک هەڵەیـە، لێـرەدا دەربکەوینـەوە... بـای بـای یانـەی پیاوکـوژە بێنیشـەکان... بـای بـای... بابڕۆیـن... کـە گەیشـتینە دەرێ پێتدەڵێـم، دەبێـت چـی بکەیـن».

# بەیەکگەیشتنی ماجەلانی ڕاستەقینە و ماجەلانی خەیاڵی ئەیلولی دووهەزار و چوار

ئەفسانە وەک پیاوێک وەسفی زوهدی شازەمانی کرد کە بۆنی درەختە دوورەکان و ئاوە نەبینراوەکانی لێدێت. پیاوێک لەگەڵ خۆیدا سیحری زەوییە نادیار و کیشوەرە نهێنییەکان دەگێڕێت، بۆنی میوەی تەلیسماوی و گەڵای درندەی لێهەڵدەستێت، عەترێکی هەیە تەنیا لە پێدەشتە خەیاڵییەکاندا دەشێت هەبێت. کاتێک لەگەڵیدا دەخەویت هەستدەکەیت لەگەڵ بای شەودا خەوتوویت، هەستدەکەیت ڕێبوارێک دەست لە لەشت دەدات کە پێشتر دەستی لە هەموو ئەستێرەکان داوە. پەنجەکانی بۆنی خەیاڵی سەر کەشتییەکان و ماچەکانی بۆنی کێڵگە دوورەکانی لێهەڵدەستێت. کە دەستی بەر ژنێتیت دەکەوێت، وەک ئەوەیە کلیلێکی ئەفسانەیی بەر خەزنەی شەرمت کەوتبێت و دەستێکی نەرم قوفڵی حەیات بکاتەوە. کە لێوی بەر لێوت دەکەوێت، هەموو لەشت پڕدەبێت لە وردە بروسکەی خێرا، کە گوێت لە هەناسەی دەبێت هەرە سەختترین ماسولکەت شلدەبێت، کە قسەشدەکات وا هەستدەکەیت، نەسیمێک سینەتی گوشیوە و لێوێکی تینوو بەسەر لەشتدا دێ و دەچێت.

غەزەلنوس بەسەرسامییەوە گوێی لە وەسفەکانی ئەفسانە گرت. ئێستا شازدەساڵ بوو ئەو ژنەی دەناسی. لەو ماوەیەدا، ئەفسانە هەمیشە هاوڕێیەکی دڵسۆز و ژنێکی ڕاستگۆ بووە. بەدرێژایی ئەو ساڵانە «خانمی چرپە ئەفسوناوییەکان» هەردەم باسی ڕق و بێزاری خۆی لە مێردە ئوتێلچییەکەی دەکرد، بەڵام تا ئێستا خیانەتی لێ نەکردبوو. دڵنیابوو ئەفسانە گەر خیانەتی لە مێردەکەی بکردایە، بۆی باسدەکرد... ئەوە یەکەمین خیانەتی بوو. چەند ساڵێک لەوەوبەر

پێیگـووت «ڕۆژێـک خیانەتـی لێدەکـەم، بـەڵام لەگـەڵ یەکێکـدا هێنـد لـە خۆشەویسـتی بزانێـت، وەهـا مەسـتمبکات... گـەر ئیسـماعیل دواتـر کوشـتمی بـە خەیاڵـمدا نەیـەت». کـە ئێسـتا سـەیری چـاوی ئەفسـانەی دەکـرد، دڵنیابـوو ئـەو پیـاوە خەیاڵییـەی دۆزیوەتـەوە کـە هەمـوو ژیانـی بـۆی دەگەڕێـت. ئـەوەی سـەیربوو، پیـاوی خەونەکانـی ئەفسـانە خاڵـی بـاران شـوکور بێـت... لەوسـەری دونیـاوە هاتبێتـەوە بـۆ ئـەوەی بـاران بدۆزێتـەوە... سـەیری لێهـات کـە زانـی ئەفسـانە ئـاگاداری درۆکـەی بارۆنـی کولەکەیـە. بەدرێژیـش چیرۆکـی نامـە دزراوەکانـی بـۆ گێڕایـەوە، سـەربوردی یەکتـر بینینـی زوهـدی شـازەمان و بـارۆن لـە ماڵێکـی کۆنـدا، حیکایەتـی ئـەو پەلامـارەی دڵنیابـوو مێـردە ئوتێلچییەکـەی دەسـتی تێـدا هەیـە. ئەفسـانە دوای ئـەوەی بـە عادەتـی ژنانـەی خـۆی هەمـوو شـتێکی بـە ورد و درشـتەوە گێڕایـەوە، دەسـتی خسـتە سـەر دەسـتی غەزەلنـوس و گـووتـی «غەزەلنوس، یارمەتیبـدە... لـە بـەر خاتـری مـن یارمەتیبـدە، زۆر پێویسـتی بـە ئێمەیـە». غەزەلنـوس بـە سـۆزێکەوە کـە تەنیـا لـە کاتـی غەزەلخوێنیـدا لـە ڕوویـدا دەردەکـەوت، گـووتـی «ئەفسـانە... هـاوڕێ باشـەکەم... بـە پێچەوانـەوە مـن پێویسـتیم بـە یارمەتـی تۆیـە... ئێسـتا دڵنیـام کـە مەسـەلەی بـاران شـوکور پەیوەندییەکـی زۆری بـە کوژرانـی نەوجەوانـی چینییـەوە هەیـە، بـاران و نەوجەوانـی چینـی بـۆ نزیکـی سـاڵێک پەیوەندییەکـی نهێنیـان لـە نێوانـدا بـوو، مەسـەلەکە ئاڵۆزتـرە لـەوەی تـۆ دەیبینیـت، چیرۆکێکـی پـڕ لـق و پۆپـە. ئێسـتا وای بـۆ دەچیـن کچەکـە لەگـەڵ دەسـتگیرانەکەیدا کوژرابێـت... تـۆ خـۆت لـە حیکایەتەکـە دووربگـرە... چونکـە دوور نییـە دەسـتی زۆر گـەورە لـە مەسـەلەکەدا هەبێـت، خـۆت دەزانیـت، مەبەسـتم چییـە... مـن و دووان لـە هاوڕێکانـم زۆر لـە ئیشـەکەوە ئاڵاویـن، چونکـە نەوجەوانـی چینـی لـە منـەوە زۆر نزیـک بـوو... زۆر زۆر نزیـک، دەبێـت زوهـدی شـازەمان بهێنینـەوە و لەگەڵمانـدا بێـت».

دوای سێ ڕۆژ لەو دانیشتنە، زوهدی شازەمان گەڕایەوە بۆ شاری منداڵی خۆی و لە شەوی شەشی ئەیلولی دووهەزاروچواردا، لە هەمان ئەو شەوەدا کە حەسەن تۆفان و شبر بۆ یەکەمجار پەلاماری مورتەزایان دا، زوهدی لەسەر سفرەی غەزەلنوس بە ئامادەیی ماجیدی گوڵ سۆلاف وەک شاهێکی قژ درێژ بە دەستێک جلی نوێوە، بە چاکەتێکی بریقەدارەوە، بە تەواوی ویقاری گەڕیدەیەکی دونیادیدەوە دانیشتبوو و نانی دەخوارد. ئەو ئێوارەیە بۆ یەکەمجار ئەو دوو گەڕیدە گەورەیە پێکەوە لەسەر خوانێک بەرامبەر بەیەک کۆبوونەوە و لە نزیکەوە سەیری یەکتریان کرد. دوو گەڕیدە کە جوان و بە ویقار دەیاننواند، هەر دووکیشیان گەلەک ڕێکپۆش و سەنگین بوون. دوای نانخواردن، زوهدی شازەمان ئەتڵەسێکی گەورەی لە جانتاکەی دەرهێنا، ئەتڵەسێکی زۆر زۆر کۆن کە هێشتا باق و بریقی خۆی تەواو نەدۆڕاندبوو. نەخشەیەکی گەورە و وردی دونیا کە بە قەڵەمێکی سوور ڕێگای سەفەرە درێژ و ناکۆتاکانی خۆی تیا ڕەنگکردبوو. ئەو شارانەی کە بینیبووی بە بازنەیەکی سوور دەستنیشانکرابوون، شارگەلێکی زۆر لەم سەری زەوییەوە بۆ ئەو سەری زەوی. ئەو شەوە زوهدی شازەمان باسی پاسکیلفرۆشەکانی هانۆی بۆ کردن، باسی کێڵگەکانی برنج لە ڕێگای نێوان ماکاو و پەکیندا، باسی خەوتنی لەگەڵ کچێکدا کە لە بەردەرکی یەکێک لە پەرستگا خەیاڵی و جوانەکانی سریلانکادا پەیکەری تامیلی چکۆلانەی فرۆشتوە، ونبوونی لە جۆهانسبۆرگ لە نێوان دوو باغدا، ئەو دزانەی لە ئەزمیر ڕووتیانکردۆتەوە، شەوەکانی لە قەحبەخانەکانی مانێلادا، شەقازلەی ژنێکی حیجاب بەسەر لە کوالالامپور، بێشەرمی سەعاتفرۆشەکانی کەلکوتا، شەڕی لەگەڵ مێردێکی دڵپیسی ژنێکی نیقاب بەسەری سعودی لە ئوتێلێکی تەنجەدا، حیکایەتی ئەو کچە

مەغریبیانەی کۆندۆم بەکارناهێنن، حیکایەتی مانەوەی لەگەڵ خێزانێکی هەژاردا لە بۆگۆتا، چیرۆکی گەیشتنی بەو گوندەی تشی گیڤارای تیا گیراوە، ڕزگاربوونی لە خنکان لە باشووری شیلی، ڕزگاربوونی لە شەڕەچەقۆی نێوان کۆمەڵێک دز لە ڤینیسیا.

بەدرێژایی ئەو شەوە چیرۆکە سەیرەکانی خۆی بۆ گێڕانەوە، قسەی لەسەر جیاوازی تامی ماسییە جیاوازەکان و باڵندە جیاوازەکان کرد، قسەی لە نەهەنگێکی سپی کرد کە بەڕێکەوت لە کەشتییەکی نەفەربەردا لە نێوان ئەندەنوسیا و ئوسترالیادا بینیویێتی، باسی نەورەسێکی کرد کە جارێک هەژدە ڕۆژ لە کەشتییەکدا لەگەڵیدا ماوەتەوە.

ماوەیەکی درێژ غەزەلنوس و گوڵ سۆلاف گوێیان لە زوهدی گرت. گوڵ سۆلاف هەستی بەسەرسامییەکی قووڵ کرد، سەرسامییەکی بێوێنە بە پیاوێک کە بەشی زۆری دونیای بینی بوو، ئەو سەفەرانەی ئەو بە خەیاڵ دەیکردن ئەو بەڕاستی کردبوونی، ئەو ئاوانەی ئەو بە بەلەمی خەیاڵ بە ناویاندا گوزەریکردبوو، شازەمان بە بەلەمی ڕاستەقینە پیایاندا ڕۆیشتبوو. بەدرێژایی ژیانی ویستبووی وابژی، هەردەم لە زەوییەکەوە بازبدات بۆ زەوییەکی تر و لە شارێکەوە بڕوات بۆ شارێکی تر. گوڵ سۆلاف دوای ئەوەی گوێی لە زوهدی شازەمان گرت، شتێک لە تووڕەیی دەرهەق بە غەزەلنوس کەوتە دڵییەوە کە بێباک گوێیدەگرت، بێئەوەی گوڵ سۆلاف بەم گەڕۆکە نەسرەوتە بناسێنێت، حەزیدەکرد غەزەلنوس لەگەڵ گوێگرتندا لەو لە بەردەم ئەم پیاوە غەریبەدا ستایشی سەفەرە خەیاڵییەکانی گوڵ سۆلاڤیش بکات. دوای سەبرێکی زۆر، دەبایە خۆی بەو کارە هەستێت و بە شتێک لە شەرمەوە بڵێت «زۆر بەڕێز، کاک شازەمان، بەندەش بە ماجەلانی خەیاڵی ناسراوم، نەخشەیەکی خەیاڵیم هەیە و لەسەر ڕووبار و زەوییە خەیاڵییەکانی ناو ئەو نەخشەیە سەفەرێکی خەیاڵی دەکەم... کە نەسەرەتای هەیە و نە کۆتایی...».

شـازەمان بێئـەوەی بزانێـت گـوڵ سـۆلاف باسـی چیـدەکات گووتـی «زۆر شـەوانی ژیانـم کـە لـە کەنـار دەریایـەک، یـان لـە نێـو چڕسـتان و لـق و پۆپـی پێکداچـووی جەنگەڵێکدا خەوتـووم، کـە بۆنـی دەریاچـە دوورەکانـم کـردوە و بـەم چـاوە سەرسـامانەم سـەرم بـۆ ئاسـمان بەرزکردۆتـەوە بـۆ ئـەوەی ئەسـتێرەی زەوی تـر ببینـم و هـەوای نەتەوەکانـی تـر هەڵمـژم... بەخـۆم گووتـووە، مـن ماجەلانێکـی کـوردم کـە وەک دوا گەڕیـدە دونیـا تەماشـادەکەمەوە... هـەر کەسـەو دونیـا بـۆ خـۆی دەدۆزێتـەوە... کـەس ناتوانێـت شـارێکی ئـەم دونیایـە بـۆ یەکێکـی تـر بدۆزێتـەوە. هەمـوو شـارێک بـە ژمـارەی ئـەو غەریبانـەی ڕووی تێدەکـەن و جێیدەهێڵـن، ئەوەنـدە جـار دروسـتدەکرێت و وندەبێـت».

غەزەلنـوس ئـەو شـەوە زوهـدی شـازەمانی ناونـا ماجەلانـی ڕاسـتەقینە. گووتـی « ئێمـە لـەم شـارەدا وەهـا دیلیـن، کەسـێکی تـری وەک تۆمـان نەبینیـوە، ئێـرە شـارێکە بەدەگمـەن ڕێبـوار و گەڕیـدە پێیـدا تێپەڕیـوون... زۆرجـار هەسـتدەکەم مـرۆڤ و درەخـت و باڵندەکانـی ئـەم شـارە پێکـڕا دەیانەوێـت ونبـن. مـن شـەیدای بینینـی ئـەو کەسـانەم کـە وەک ئێمـە بـە خەیـاڵ لەجیهانـدا ناژیـن... ئـەی بـرای غەریبەمـان، تـۆ ماجەلانێکـی ڕاسـتەقینەیت، هیـوادارم ئـەم شـارە قووتـت نـەدا... ئـەوەی زۆر لـەم شـارەدا بمێنێتـەوە، گـەر ئـاگادار نەبێـت هەسـتی بـۆ حەقیقـەت دەمرێـت و توانـای لەسـەر خەیـاڵ ئیفلیجدەبێـت... ئێـرە تاکـە شـارێکی دونیایـە کـە حەزنـاکات بـە شـارەکانی تـری دونیـا بەراوردبیکەیـت و ناشـیەوێت بـە شـارەکانی نـاو خەیـاڵ بیپێویـت، خۆشـبەختە بـەوەی لـە بێهۆشـیدابێت... شـارەکان لـە بێهۆشـیدا نـە لـە ڕاسـتیدان و نـە لـە خەیاڵـدان». زوهـدی شـازەمان بـە نازنـاوی ماجەلانـی ڕاسـتەقینە خۆشـحاڵبوو. پێکەنـی و گووتـی « غەزەلنـوس مـن زۆر شـاری دونیـام بینیـوە، هەندێـک شـار هـەن بڕیـاردەدەن نـە بژیـن و نەبمـرن... ئـەم شـارە یەکێکـە لـەو شـارانە... »...

گوڵ سۆلاف بە شەرمەوە گووتی «ئەمە لەو شارانەیە، مرۆڤ کە چووە ناوی هەرگیز ناتوانێت لێیدەرچێت». زوهدی بەسەرسامییەوە سەیریکرد و گووتی «بەڕێز گوڵ سۆلاف، ئێوە بۆچوونێکی ڕاست و جوانتان هەیە... من چەندین ساڵە وڵاتە و وڵات دەکەم. لەم وڵات دەردەچم و ڕوو لەوی دی دەکەم، لەم شار دێمەدەرێ و دەڕۆم بۆ ئەو شاری تر... بەڵام لەدەروازەی هەر شارێک دەردەچم و پێ لە دەروازەی هەر شارێکی تر دەنێم... هەستدەکەم هەر لێرەم... هەمیشە تارماییەکی تاریکی ئەم شارە لەسەر سەرم بووە... سێبەری دیوارەکانی لە ڕۆحمدابوون. بۆ هەر کوێ چوویم لەم شارە ڕامکردوە. هەستدەکەم لێرە زۆر غەریبم... زۆر... مرۆڤ لەو شارانەدا غەریب نییە کە لێیان دەردەچێت، بەڵکو لەو شارانەدا غەریبە کە ناتوانێت لێیان دەرچێت. مرۆڤ لەو جێگایە غەریب نییە کە دەردەکرێت، بەڵکو لەو جێگایەدا غەریبە کە دەیبەستێتەوە».

گوڵ سۆلاف بە کەمێک وردی و درێژی باسی ئەو شارە سەیرانەی کرد کە لە سەر نەخشە خەیاڵییەکەی چۆتە ناویان و دواتر هەستیکردوە نەیتوانیوە لێیان دەرچێت، ئیدی بۆ هەر کوێ چووبێت هەستێکی سەیری هەبووە کە هەر لە کوچە و کۆڵانی ئەو شارەدایە، هەر دیلی کوچەکان و زیندانی ڕێگا پێچاوپێچەکانی ئەوێیە. بە بڕوا و دڵنیاییەوە گووتی « هەندێک شار هەیە تۆ دەچیتە ناویان و هەندێک شاری دیش هەیە دێنە ناوتەوە... ئەوانەی دێنە ناوتەوە بە چەشنێک داگیرتدەکەن، وادەکەن لە هەر جێگایەکی تری زەوی بیت وا هەستبکەیت لەوێیت». ماجەلانی ڕاستەقینە کەم کەم خەیاڵ و زمانی ئەم کوڕە سەرسامیدەکرد کە وەک لۆردێکی گەنجی ئەوروپی بە ئەتەکێتێکی زۆرەوە نانی دەخوارد، تاکە کەسێک بوو لەم شارەدا بیبینێت و بزانێت وەک ئەوروپییە نەجیبزادەکان نان بخوات، غەزەلنوس بە خۆی و قژە هەڵچوو و ڕیشە زۆرەکەیەوە لە بەردەمیدا ناڕێک و شپرزە دەینواند. غەزەلنوسی وەک یەکێک هاتە

پێشچاو کە خەیاڵەکانی ئەندازەیان نییە و پێوەر و ڕێگا ناناسن، بەڵام خەیاڵی ئەم کوڕە گەنجە بە جۆرێکی سەیر ئەندازەیی و نەخشەکاربوو. شازەمان خۆی یەکێک بوو لە عاشقانی نەخشە... بێئەندازە ئەو نەخشەیەی خۆی خۆشدەویست کە دەلیلی سەفەرەکانی ئەو بوو بە دونیادا. لە ناکاو وەک هێزێکی ناوەکی بیجولێنێت، خواستێکی تێدا دروستبوو ئەو نەخشەیە ببینێت کە ماجیدی گوڵ سۆلاف باسیدەکات... نەخشەیەکی خەیاڵی کە وەک نەخشەی زەوی نییە... هەرگیز تەواو نابێت... زەوییەک کە هەرگیز تەواو نەبێت... ئەوە شتێک بوو زۆر جار لەسەفەرە دووروردرێژەکانیدا بیری لێکردبووەوە. هەر کات دەگەیشتە سەر لێواری دەریایەک، هەر کات ئۆقیانوسێکی دەبڕی و لە قەراغی ئۆقیانوسێکی تر دەگیرسایەوە، ئەو پرسیارەی لە خۆی کردبوو «بۆ زەوی تەواو دەبێت... دەبێت ئەو خاکە لە کوێ بێت کە بەردەوام پیادەڕۆیت و کۆتایی نایەت؟.... بۆ ئەم ئەستێرەیە وەها بچوکە؟ بۆ ناتوانێت بێئەوەی بوەستێت، دابەزێت، بفڕێت، بپەڕێتەوە، زەوییەک هەر بڕوات و بڕوات و نەوەستێت؟؟»

ئەو شەوە سێ قۆڵی چوون بۆ سەیری نەخشەی زەوییەکانی ماجەلانی خەیاڵی. غەزەلنوس لە ناوەڕاستی هەردووکیاندا دەڕۆیشت. سەیری لێهات کە ئاوها لە ناکاو خۆی لە نێوان ئەم دوو مەخلوقە جیاوازەدا دەبینێتەوە، پیاوێکی بە قەد و قامەت کە ڕوخساری دەریاوانێکی هەبوو بای باکوور کەشتییەکەی بە ئاسماندا فڕاندبێت و لە ئاو ترازاندبێتی و لەم شارەدا دایگرتبێت، لەگەڵ گوڵ سۆلافێکی لە خۆبایی و ڕێکپۆشدا. یەکێکیان لە سەر زەمینی ڕاستیدا ونبووبوو، ئەوی تریان لە سەر زەمینی خەیاڵدا. ئەو شەوە تا بەیانی غەزەلنوس سەراسیمە گوێی لەو دوو کەسە گرت کە وەک لە ماراسۆندا بن، وەک پێشبڕکێیەکی شێتانە بێت کە خەیاڵ و ڕاستی تێیدا پێکەوە ڕابکەن

هەر یەکەیان بە نۆرە باسی دونیای خۆی دەکرد. گوڵ سۆلاف لەسەر نەخشە خەیاڵییەکەی باسی ئەو باڵدارە خورافیانەی دەکرد کە لە ناکاو لە یەک باڵدارەوە سێبەری سەدان باڵندەی تر دێتەدەرێ و لە سێبەری هەر باڵندەیەکەوە سێبەری دەیانی دی. ماجەلانی ڕاستەقینە باسی ئەو پۆلە نەورەسانەی کرد کە جارێک لە کەنارەکانی باشووری ئیتالیا بینیوونی توانیویانە بەری خۆر بگرن. بە شادییەوە سەیری ماجەلانی خەیاڵی دەکرد و دەیگووت «گەر ئەو هەموو باڵندەیەت بدیبایە کە من دیمن، دەتگووت لەوانەیە ئەم هەموو تەیرە بێشومارە تەنیا لە خەیاڵدا هەبێت، بەڵام ڕاستیبوو، من سەرم بەرزکردەوە و بینیم نە هەور دیاربوو نە خۆر... هیچ شتێک، وەک ئەوە بوو گەردون باڵندە داگیریکردبێت».
گوڵ سۆلاف باسی گوندێکی بچوکی بۆ کرد، کە هەموو بەردەکانی ئەو گوندە، هەتا بچوکترین بەردیشی وێنەی دڵ و تیرێکی لەسەر نەخشکراوە. مەجەلانی ڕاستەقینە دەیگووت «گوڵ سۆلاف، شەوێک لە کەنارەکانی ئیسپانیا ڕێگام کەوتە گوێ ئاوێک، بەدرێژایی ڕۆخی کەنار عاشقانم بینی دەگریان... هەموو باوەشیانکردبوو بە یەکدا و دەگریان... نە یەک جووت عاشق و نە دوو، بەڵکو سەدان و هەزاران... هەزاران هەزار دڵدار، وەک هەرچی عاشقی دڵشکاوی سەر زەمینە هاتبن و لەو کەنار دەریایەی ئیسپانیا بگرین... من تەنها بەناو ئەو هەموو عاشقەدا بە خۆم و شوشەیەک بیرەوە دەڕۆیشتم... یەکێک بە ئینگلیزییەکی ڕوون لە دواوە بانگیکردم هێی تۆ کوردە، بۆ بەتەنیایت... بۆ ئافرەتێکت لەگەڵدا نییە بەسەر شانیدا بگریت و بەسەر شانتدا بگری؟ ئاوڕمدایەوە کەسم نەبینی، گەڕامەوە دواوە و بەڵام هەستم نەکرد کەس لەوانەی لێم نزیکن، منیان بانگکردبێت... شتێک بوو وەک خەیاڵ وابوو... وەک دەنگێک لە مێشکی خۆمدا هاواریکردبێت...دوایی زۆر ڕۆیشتم... زۆر زۆر تا لە هەرچی کەسە دوورکەوتمەوە، شوشەی بیرەکەم فڕێدا و

پاڵکەوتم و کەوتمە سەیری ئەستێرە... ئەو شەوە گووتم «شازەمان... ئەمشەو دونیا وەک شێت بەرەو خەیاڵ ڕادەکات»... من زۆرجار ئەوەم بینیوە... دونیا کاتێک بەرەو خەیاڵ ڕادەکات... مرۆڤ گەر زۆر بگەڕێ، ئەوە دەبینێت». گوڵ سۆلاف وەک خرۆشابێت گووتی «ماجەلانی ڕاستەقینە، منیش پێچەوانەی ئەو ساتانە ژیاوم... ڕۆژێک لەگەڵ منداڵە کوێرەکاندا ڕێگام کەوتە شارێکەوە هیچ شتێکی خەیاڵی تێدا نەبوو، بۆ هەر جێگایەک چووبێتم شتێک لە خەیاڵی تێدابووە، هەر گوندێک، شارۆچکەیەک، خێوەتگایەک، ڕەوە کۆچەرییەکم لەسەر نەخشە خەیاڵییەکەی خۆم بینیبێت، شتێکی خەیاڵیان تێدابووە... بەڵام زۆرجار بێئەوەی بزانم چۆن... بێئەوەی بەشێکبن لەو نەخشەیەی لەسەر ئەم دیوارە دروستمکردوە لە ناکاو جێگایەک دێتە بەردەمت کە هیچ شتێکی خەیاڵی تێدا نییە، هیچ شتێک... شوێنێکی سەیر بوو باڵندەکانی پێکڕا کز و نەخۆشبوون، لە باڵندەکانی ئەم شارە دەچوون... درەختەکان زەرد و بێئاو و عاجز بوون، کە دەستم لێدەدان وەک ئینجانە و گوڵی ئەم شارە لە مرۆڤ زویر دیاربوون... کە دەستم لە دیوارەکانی دەدا، هەستمدەکرد خۆشحاڵ و ئارام نین، شەرمن و ترساو بوون، وەک دیوارەکانی ئەم شارە. کە دەستم دەخستە سەر بەردەکان هەستمدەکرد ڕادەچڵەکین... هەتا منداڵە نابیناکانیش کە بە تاریکی هەندێ کوچەدا دەڕۆیشتن دەیانگووت لە تاریکی ناو کۆڵانەکانی کوێری دەچێت... مرۆڤەکانی وەک خەڵکی ئەم شارە تووڕە و غەمبار و کەمتەرخەم دەردەکەوتن... بەلای کچاندا دەڕۆیشتم و نەیاندەبینیم، وەک کچی ئەم شارە... ڕقێک لە چاوی گەنجەکانیاندا بوو وەک ڕقی نێو نیگای کوڕی ئەم شارە... ئەو شارە هیچی لە خەیاڵ نەدەچوو، پڕبوو لە قوڕوچڵپاو، پڕبوو لەو شەقامانەی با نەبێت کەس گسکی نەدەدان، لەو منداڵانەی باران نەبێت کەس نەیدەشتن... بە پەلە منداڵەکانم لە

خەیاڵ دەرهێنا و ڕامانکرد... من هیچم نەگووت، بەڵام منداڵەکان بە منیان گووت «سەرداریاشی... هەندێجار تۆ سەرت لێدەشێوێت و بێئەوەی ئاگات لێبێت خۆت دەکەیتەوە بەم شارەی خۆماندا... بۆ کەشتییەکە وا ئاوبەرناکەیت، نەگەڕێتەوە بۆ ئێرە». من بە منداڵە نابیناکانم گووت هەموو نەخشەیەکی خەیاڵی چەند قایمبێت، چەند مەحکەم چنرابێت، لە ناکاو درزێکی ترسناکی تێدەبێت و شتە ڕاستییەکان وەک دڕندە پەلامارماندەدەنەوە... لەو کاتانەدا نابێت بترسین و بشڵەژێین... دەبێت زوو بە زوو تێبگەین کە ئەمە وێنەی دونیا ڕاستەکەیە وازمان لێناهێنێت... پێمگووتن، ئەم شارە وەک شەیتان وایە، وەک شەیتان وایە و ناهێڵێت ئاسوودەبین و بڕۆین، دەبێت هەموو وەختێک حیسابی ئەوە بکەین لە هەر شوێنێکی دونیابین وەک شێت پەلامارمان بداتەوە».

ماجەلانی ڕاستەقینەش گووتی «منیش گەرچی زەوی ڕاستەقینە گەڕاوم... لەسەر ئەتڵەسی جوگرافیاناسەکان سەفەرمکردوە، بەڵام جار هەبووە کەوتوومەتە بەر هێرشی خەیاڵات. هەزارجار ڕوویداوە بە ڕێگادا بڕۆم و لە ناکاو بوەستم و ببینم گوڵ قسەم لەگەڵدا دەکات... درەخت بانگمدەکات... زۆر جار باوەشم بە دارێکدا کردوە و گووتوومە چیت لە من دەوێت ئەی درەخت؟... گوڵم ماچکردوە کە بۆنی مرۆڤی لێهاتووە... بۆنی فرمێسکی ئەو کچەی لێهاتووە کە بیستوچوار ساڵ لەمەوبەر لێرە بەجێمهێشت. ئێوارەیەک لە کەنارەکانی خۆرئاوای هیندستان لە قەراغ دەریا وەستابووم، لە ناکاو هەزاران ماسیم بینی لە ئاودا خۆهەڵدەدەن و وەک منداڵی هار بازبازێندەکەن، گەشتیارێکی هۆڵەندیم لەگەڵدا بوو، پێمگووت، ئەو هەموو ماسییە دەبینی کە لە ئاوی ئەم ئێوارەیەدا بازدەدەن و دەچن بە هەوادا و دەیانەوێت بفڕن... هەستمکرد ئەو هیچ نابینێت... من بە تەنیا ماسییەکانم دەبینی... بەلەمێکم لە یەکێک لە بەلەمداران گرت و بەرەو قووڵایی ئاو ڕۆیشتم. لەوێدا هەزاران ماسیم

بینی لە دەورم بازیاندەدا... هەزاران ماسی کە هەموو وەک زێڕ لە ژێر نوری مانگەشەودا دەبریسکانەوە، هەستمکرد بۆ من یاریدەکەن... هەستمکرد دەیانەوێت دڵم خۆشبکەن... هەستمکرد پێمدەڵێن «هێی تۆ کوردە... هەمیشە وا غەمگین بە... تۆزێک پێبکەنە»... دەستم درێژکرد و یەکێکیانم گرت و بە دڵ ماچمکرد... هەستمکرد ماچمدەکاتەوە... ماچێک بوو بۆنی قووڵایی دەریای لێدەهات... ئێستاش تێناگەم ئەوە ماسییەکی ڕاستەقینە یاخود ماسییەکی خەیاڵی بوو، لە سەر ئاوەکانی خۆرئاوای هیندستان منی ماچکرد؟».

ئەو شەوە تا بەیانی گوڵ سۆلاف نەخشە خەیاڵی و ناکۆتاکەی دەکردەوە و قسەیدەکرد، لەگەڵ هەموو چیرۆکێکی ئەودا ماجەلانی ڕاستەقینەش، بە خۆی و قژە درێژەکەیەوە چیرۆکێکی لەسەر ئەتڵەسەکەی خۆی دەردەهێنا و دەیگێڕایەوە، بەرامبەر هەر سەربوردێک لەسەر نەخشە خەیاڵییەکەی گوڵ سۆلاف، سەربوردێکی ڕاستەقینەمان لە سەر ئەتڵەسەکەی زوهدی شازەمان هەبوو. لە هەندێک لە چیرۆکە خەیاڵییەکانی ماجیددا حەقیقەت وەها دەهاتە پێشێ سەیر و تاڵ و تاریک دەکەوتەوە، لە هەندێک لە چیرۆکە ڕاستەقینەکانی شازەمانیشدا، خەیاڵ وەها گوژمیدەدا، مرۆڤ دەیگووت ئەستەمە ئەم سەر زەمینەی من و تۆ ڕووداوی وەها و پێشهاتی لەو چەشنەی تێدابێت. غەزەلنوس بە نۆرە تەماشای هەر دووکیانی دەکرد و نەیدەزانی دونیای کامیان سەیرتر و جوانتر و قووڵترە... دوو دونیابوون لە ناکاو لە بەردەم ئەودا دەیاندا بەیەکدا و دەرەنجامەکەشی، پەرشبوونەوەی سەدان چیرۆکی سەیربوو، دروستبوونی دەیان حیکایەتبوو کە لە فەزای ئەو ژوورەدا بڵاودەبوونەوە و بەر یەکدەکەوتن و پێکەوە دەفڕین. غەزەلنوس دەمەوبەیان سەیرێکی ژوورەکەی کرد و تێنەدەگەیشت ئایا ئەمە ژووری حەقیقەتە یان خەیاڵ؟.

# پەلاماری دووەم بۆ سەر مورتەزای شەیتان
# حەوتی ئەیلولی دوو هەزار و چوار

ڕۆژی دوایی، ڕۆژی ئیش بوو... ڕۆژی ڕووبەڕووبوونەوەی حەقیقەت بوو. ماجەلانی ڕاستەقینە لەگەڵ هەر چوار بوونەوەرە خەیاڵییەکەدا دانیشت. ئەوە یەکەمجاری بوو بزانێت کە موراد جەمیل کوژراوە. حەسەنی تۆفان تا خاتری شازەمان نەشکێنێت، بە هێمنییەوە گووتی «بەدووری نازانین بارانیش کوژرا بێت... بە دووری نازانین... تۆ دەبێت خۆت بۆ هەموو پێشهاتێک ئامادەبکەیت.. لەم ساڵانەی دواییدا چەند ئافرەتێکی تر بەو جۆرە لە نوێمیران بێسەروشوێن کراون.. بەڵام ئێمە تاکۆتایی ئومێدمان هەیە، نابێت دەستبەرداری ئومێد ببین». شازەمان هەستیکرد پێویستی بەوەیە بگری، بەڵام وەک زۆربەی پیاوان کە لەساتی گریاندا گەرویان دەگیرێت و سستدەبن، نەیتوانی فرمێسکێکیش چییە بیڕێژێت.

دەبووایە تا شتەکان ڕوونتر دەبنەوە لەو ماڵەدا بێت.

هەر ئەو ڕۆژە حەسەن تۆفان لەگەڵ شبردا کارێکی سەیریان هەبوو، دەرکەوتنی زوهدی شازەمان بەو هەموو زانیارییەوە کۆمەکێکی ناوەخت و چاوەڕوان نەکراوبوو. شەوی پێشوو کە لە یانەی پیاوکوژە بێئیشەکان هاتنەدەرێ. شبر گووتی «حەسەنی پیرۆز، مرۆڤ لە شەڕدا دەتوانێت فیشەکی یەکەم دوابخات، بەڵام کە فیشەکی دووەمی دواخست ئەوا خۆی تووشی دەردێکی گەورەدەکات. لە فیشەکی یەکەمدا تۆ دوژمن وریا دەکەیتەوە، فیشەکی دووەمت دەبێت بپێکێت... دەبێت شپرزەییەکی گەورە لە دڵی دوژمندا دروستبکات، ئاسان خۆی بۆ نەگیرێتەوە... بزانە چارەنوسی شەڕ زۆربەی جار لەسەر دەستڕێژی دووەمە، دوای دەستڕێژی یەکەم هێشتا ماوەیەکت هەیە بۆ بیرکردنەوە، بەڵام دوای دەستڕێژی

دووەم دەبێت بزانیت ئیتر ئەوەی بەرامبەریشت یاری خۆی دەکات... ئێستا نابێت فیشەکی دووەم دوا بخەین... سبەی من و تۆ دەچین بۆ ماڵی مورتەزای شەیتان و درێژە بە یارییەکە دەدەین... تێدەگەیت... دەبێت مورتەزا ئەو هەستەی لا دروستبێت کە ئێمە زۆر شت دەزانین و خەڵکانێکی گەورە لە پشتمانن... تۆ غەمی ئەوە مەخۆ. من دەزانم، حیزب لە ناوەوە بووە بە چەندین باڵ، تۆ نازانیت، حیزب هەلاهەلابووە. لەو نێوەدا جێگای دوو یاریکەری بچوکی وەک من و تۆش دەبێتەوە یاری خۆمان بکەین. دەبێت مورتەزا وا تێبگات یارییەکە لەو گەورەترە... ئەوە تەنیا شانسمانە، گەر بزانێت من و تۆ بە تەنیاین... گەر دڵنیابێت لە پشتی قوونمانەوە لە هەوا زیاتر هیچی تر نییە، ئەوا حسابمان خاڵی و مایەمان فتە... لە هەفتەیەکدا وەک پۆڕی خوراومان لێدێت... دەبێت وادەرکەوین ئێمە لە ژێرەوە بۆ خەڵکێکی گەورەتر لە بارۆنی کولەکە و شێخی ناوساجی یاریدەکەین... مورتەزا پیاوێکی شەیتان و زیرەکە، دەزانێت ئێستا باڵەکانی حیزب لە شەڕی مان و نەماندان... تێدەگەیت؟ ئێستا بارۆنەکان و میرەکانی نوێمیران لەسەرەوە کۆک دیارن و لە ژێرەوە هەر یەکەیان گرێدراوی یەکێک لەسەرە گەورەکانی ناو حیزبن. یارییەکە بە جۆرێک تێکەڵاوبووە و باڵەکان بە جۆرێک چوون بەناو یەکدا کەس بەتەواوی سەرو و قوونی خۆی بۆ جیاناکرێتەوە. هیچ کەسێک بە تەواوەتی نازانێت کێ لەوی دی بەهێزترە، کێ لەسەرەوە لەگەڵ کێدایە و کێ لە ژێرەوە کار بۆ کێ دەکات. حەسەن من لە ورگی نەهەنگەکەدا گەورەبووم، دەزانم لە ناوەوە چی هەیە، حیزبەکانی ئەم وڵاتە وەک ئەو ئەژدیهای حەوت سەرەیان لێهاتووە کە سەرەکانی یەک یەکتر دەخۆن. گەر بتوانین وا بخەینە خەیاڵییەوە کە ئێمەش هێزێکی گەورەمان لە پشتە... دوور نییە، مورتەزا بۆ ڕزگارکردنی کەوڵی خۆی کۆمەکمان پێبکات. من دەزانم ژمارەیەکی زۆر لە بارۆنەکان و

خەڵکێکی تریش لە حیزبدا بۆ کەسانی وەک بارۆنی پۆرسەلان و میری کولەکە لە بۆسەدان. هیچیان پیاوی خۆشەویست نین. مورتەزا ئەو شتانە دەزانێت، دەشزانێت گەر بەلەمەکە کونی تێببێت یەکەم کەس کە فرێیدەدەنە بەحرەوە کەسانی وەکو ئەوە... تێدەگەیت... بەداخەوە یارییەکە بەو جۆرە ناشیرینە... بەڵام بیرت نەچێت کە ئێمە لەگەڵ خەڵکی زۆر بەهێزدا شەڕدەکەین... گەر هەموو زیرەکی خۆمان نەخەینە کار تیادەچین».

عەسری ئەو ڕۆژە، مورتەزا بە بیجامەیەکی بریقەدارەوە کە هیچ لەگەڵ قەپۆزە خوار و قژەبژ و پێکەنینە شەیتانییەکەیدا نەدەگونجا پێشوازی لێکردن. وەک پیاوێک زۆر حورمەتی میوان بگرێت، کۆمەکی تۆفانی کرد تا عەرەبانەکەی شبر بە پلەکاندا سەرخەن. مورتەزا بە عادەتی خۆی گووتی «خوای گەورە لەم ڕۆژە خۆشە، لەم هەوایە کە بۆنی عەتری بەهەشتی لێدێت... لەم نەسیمە کە دەڵێی گوڵاوی پیرۆ خانی دایکی بەحورمەتتانە. چ شادییەکە بۆ من خەڵکی وەک ئێوە گەورە لوتفبکەن و ئێمە بەسەربکەنەوە... ». لەگەڵ قسەکانیشیدا مورتەزای شەیتان ترس و شپرزەیی و ڕەنگزەردی پێوە دیاربوو. ئاشکرا شەوی پێشتر باش نەخەوتبوو. ڕوخساری ماندوو و ڕۆحی هیلاکبوو. شبر کە بەو جۆرە بینی، دڵنیابوو گورزی پێشوو برینداریکردوە و لە جێگایەکی ناسکدا پێکاوێتی. شبر دەیزانی مورتەزا لەگەڵ هەموو ناشیرینی خۆیدا بایەخێکی گەورە بە قیافە و هەندامی دەدات، ئەمڕۆ کەساس و ڕیش هاتوو دەردەکەوت. بۆ ئەوەی شپرزەیی خۆی بشارێتەوە گووتی «برای بچوکی خۆتان دەبوورن. من سەرەتای پاییزان هەمیشە دەردم گرانە، بینینی وەرینی ئەو هەموو گەڵایە وەها ڕۆحم دەگوشێت واهەستدەکەم دڵی من لەگەڵ هەموو گەڵایەکدا دەمرێت و زیندوو دەبێتەوە، پاییزان من غەمی درەخت دەمکوژێت، ئاخر بیری لێبکەنەوە... ملیۆنەها درەخت

کە هاوڕێمانن، لەگەڵماندا سەرنشینی ئەم ئەستێرە جوانەن، لە پاییزدا نەخۆش و غەمگین و زەردەبن. ئاه بیری لێبکەنەوە... بیر لەو هەموو هاوڕێ و برایانەمان بکەنەوە کە لە پاڵماندان و سروشت ڕووتیاندەکاتەوە و پێیاندەڵێت بخەون... عەزیزانی من... سەرەتای پاییزان مەراقی خەزان وەها کارم تێدەکات، سەرئێشەیەکی توندەگرم، دەستدەکەم بە دۆعا، دەڵێم خوایە پاییز بێئازار بەسەر نەمامە ناسکەکاندا بڕوات. خوایە خەزان زۆر ئازاری گوڵەکان نەدات... بەڵام هەندێجاریش دەپرسم بۆ ئێمەی ئادەمیزاد... هی هی هی... بۆ ئێمەی بەشەری بێفەڕ... هی هیهی هی... پاییزمان نییە، گەر هەر ساڵە جارێک تازە ببووینایەتەوە... گەڵای ڕەشمان لە خۆمان بوەراندایە، گومانی خراپمان لە خۆمان دەرکردایە... بە دڵێکی پاکەوە بهاتباینایەتەوە ناو بەهار... ئێستا دونیا جۆرێکی تر دەبوو... وانییە... جۆرێکی تر بوو».

شبر دەستێکی بە قژە زەردەکەیدا هێنا و گووتی «مورتەزای ئازیز، گەر ئێمە وەک درەختەکان خاوەنی پاییزی خۆمان بووینایە، کەسانێک ئەوەی لە هاوینی ئەمساڵدا دەیکەن لە بەهاری داهاتوودا حاشایان لێدەکرد، ئەو کات وەرزەکان دەرفەتێکی گەورەیان دەدایە مرۆڤ خۆی لە بیربکات و گوناهی خۆی نەزانێت...».

حەسەنی تۆفان گووتی «مورتەزا. من چەندە مەراقمە پاییز گوڵەکان ئازار نەدات، هێندەش مەراقمە مرۆڤ مرۆڤ ئازار نەدات... من دوێنێ شەو، تۆم خستە حاڵێکی خراپەوە. بەڵام دەبێت تێبگەیت، من و تۆش ناچارین وابکەین... گەر مرۆڤ ناچاربێت، سروشت بۆ دەبێت ناچار نەبێت؟. ئێمەش لە خۆڵ و خاکی تەبیمەت خولقاوین. هەر یەکە و هێزێکی لە خۆمان گەورەتر یاریمان پێدەکات... ئێمە وەک خۆتان دەڵێن تۆپی بلیاردین... تۆپی بلیارد».

شبر گووتی «مورتەزا، ئێمە هیچمان لەگەڵ تۆدا نییە، نە دوژمنی

تۆین و نە بوغزێک بەرابەر بە تۆ لە زگماندایە. ئەوەی ئێمەی ناردوە لە من و تۆ گەورەترە، لەوانەش گەورەترە کە تۆ ئیشیان بۆ دەکەیت؟ تێدەگەیت لە شێخی ناوساجی و بارۆنی کولەکە و مەغۆلیش بەدەستترە... مورتەزا... حەزدەکەم گوێم لێبگریت... تێدەگەیت... نە من و نە حەسەن تۆفان بە خۆشی خۆمان لێرە نین... ».

مورتەزا سەیریدەکردن و بێوچان لەشی دەجولاند... سەری دەجولاند، پەنجەکانی دەتەقاند، پێدەکەنی و خامۆش دەبوو. نەیدەتوانی لە شتێک دڵنیابێت و نەیدەوێرا دڵنیابێت. لە دوێنێ شەوەوە چەندین جار ویستبووی خۆی بگەیێنێتە جەعفەری مەغۆلی و بارۆنی کولەکە و شتەکانیان بۆ باسبکات، بەڵام دوای هەق و حیسابێکی ورد پەشیمان بووبووەوە. ژیانی لەگەڵ بارۆنەکان و پیاوەکانیاندا فێریکردبوو، حیسابی ورد بۆ هەموو شتێک بکات. حەسەنی پیرۆ و شبر دوو کەسن مێژوویەکی درێژیان هەیە، وەک دوو هەرزەکار تەقەناکەن... قسەکانیان بەشێکە لە یارییەکی گەورەتر. دوێنێ شەو بەدرێژایی لە ناو جێگاکەدا سەمای بە لەشە نەسرەوت و خوار و گرێدارەکەی کردبوو، لەگەڵ هەموو ئەمدیوە و دیوێکدا تارمایی حەسەنی پیرۆی بینیبوو. ئەو ڕۆژگارێک بێبیرکردنەوەیەکی قووڵ خۆی خستبووە خزمەتی میرانەوە، هەر ئەوەندەی بۆ گرنگ بوو جێگای ببێتەوە، بەڵام ئێستا یارییەکی گەورەتر هەیە... ئەو دەیزانی لە هەموو شانۆگەرییەکی لەم جۆرەدا فەسڵێک دێتە پێشێ بارۆن بارۆن دەخوات... میر میر دەدات بە زەویدا... دەیزانی ئەو چەند ساڵە ناوی ئەو بە چەندەها شتەوە گرێدراوە، هەندێکیان ئەو بێئاگایە لێیان و هەندێکیشیان ڕاستەوخۆ لە بەرچاوی ئەودا ڕوویانداوە. گەورەترین هەڵەی ژیانی ئەوەبوو کە خۆی کرد بە دوژمنی ژنان. شەو کە لە جێگاکەدا گینگڵی دەدا، دەیگووت «ئەوە گەورەترین هەڵەی ژیانمە، ئەوە وادەکات ئاسانتر ببینرێم... زووتر بمکەن بەو شەیتانەی دەبێت دەرچم و مەیدانەکە

چۆڵبكەم». بەدرێژایی شەو لە خۆی دەپرسی «دەبێت كێ لە پشت حەسەنی پیرۆ و شبرەوە بێت؟» «كێیە دەیەوێت من لە یارییەكە دەرچم؟» «كێیە دەیەوێت پێستی من بكات بە قەڵغانی خۆی؟». باڵە نارازییەكانی حیزب؟ باڵی خزمەكانی سەرۆك؟ باڵی وەكیلی گەورە؟ باڵی كادیرە كۆنەكان؟ باڵی «وەفا و دڵسۆزی»؟ باڵی «گۆڕان و نوێبوونەوە»؟ دوور نییە ڕێكخراوەكانی ژنان و ئافرەتان دەستیان لە مەسەلەكەدا هەبێت، كە هەندێك لە ژنی بارۆنەكان تێدا چالاكن، ئەو ژنانەی زۆربەیان بۆ ڕۆژێكیش بووە دۆستی موراد جەمیل بوون؟ دوور نییە مێردی هەندێك لەو ژنانە نەبێت كە دەزانن مورتەزا لە هەر كەس زیاتر شت دەزانێت و دەتوانێت لەسەر ئابڕووی ژنەكانیان قسەبكات، لەوانەیە بیانەوێت بۆ هەتا هەتایە بێدەنگی بكەن؟ دوور نییە جەعفەری مەغۆلی خۆی نەبێت بڵێت ئێستا كاتی ئەوە هاتووە ئەم ئامێرە ستۆكە كاركەناربێت و بڕوات... بەلام نا... گەر مەغۆلی بێت پرسیاری لێناكات، بەڵكو ڕاستە و ڕاست دەیكوژێت. ئەو مەغۆلی دەناسێت، دڵڕەقترین پیاوی ناو حیزبە كە ئێستاش بە عەقڵی سالانی هەشتا لێدەخوڕێت، مەغۆلی و باڵی بارۆنی پۆرسەلان كە خەڵكێكی زۆر بە گەورەترین و ترسناكترین هاوپەیمانی نێوان عەسكەرییەكان و تاجیرەكانی ناو حیزبیان دەزانن، پێچاوپێچ شت ناكەن، وەها خۆیان بەهێزدەبینن بێشەرم و دوودڵی نەیارەكانیان بە پەروباڵەوە دەسووتێنن. بەلام مەغۆلی ئیشی بۆ هەموویان كردوە. ئەوەی حەسەنی پیرۆی كردۆتە ملی، كەسێكە دەیەوێت مەغۆلی بترسێنێت... لە دڵی خۆیدا دڵنیابوو كە مەغۆلی و بارۆنی پۆرسەلان خۆیان ناكەن بە خاوەنی... گەر شتەكان تۆخببنەوە، گەر ئەو قسانەی حەسەن تۆفان بگاتە ڕۆژنامەكان، هەموو وەك سەگ فەرامۆشیدەكەن. حەسەن تۆفان و شبر لەوە زیرەكترن بەبێ پشتێكی گەورە یاری وەها بكەن. شتەكە ئێجگار ترسناكترە لەوەی ئەو بیری

لێدەکاتەوە... شەو دە جار هەستا و بە ژوورەکەدا گەڕا، چەند جار بە غەمگینیش لەبەر خۆیەوە پێکەنی. سەرەتا دەیویست ڕابکات بۆ ئامێزی مەغۆلی، بەڵام ئێستا هەرچییەکی کردوە دەبێت نەهێڵێت مەغۆلی و بارۆنی پۆرسەلان و بارۆنی کولەکە بە هیچ بزانن، نەهێڵێت هەواڵەکە بگاتە دەمی ئەوانەی ئەم ئیشی بۆ کردون، چونکە گەر بزانن ئەم لە ژێر جۆرە گوشارێکی وەهادایە، دەیکوژن... هەزار و یەک ڕێگایان هەیە بۆ ئەوەی بیکوژن... تا خۆی قایمدەکات و نهێنییەکانی خۆی مەحکەمدەکات، نابێت هیچ بزانن... ئەمیش دەبێت بزانێت یارییکات... ئێستا بە سەرێک خۆشحاڵبوو کە شبر و حەسەن تۆفانی دەبینی و بەسەرێکیش دەترسا. خۆشحاڵبوو شت زیاتر بزانێت و زیرەی لە چارەنوسی خۆشی کردبوو. شبر و حەسەنی پیزۆ دەیانتوانی ئەوەی تیا بخوێننەوە، هەموو زیرەکی و توانای لەسەر نواندن و خۆونکردن بەشی ئەوەی نەدەکرد، لە دەست ئەم دوو پیاوکوژە دێرینەی شار دەرچێت کە کەس نەبوو لە حیزبدا مێژوویان نەزانێت. ماوەیەک بوو لە ناکاو بەجۆرێکی پڕ گومان لە یانەی قارەمانە بێئیشەکاندا دەرکەوتبوونەوە، بێئەوەی هیچ کەس بزانێت چی لە ژێر سەریاندایە. هەتا تونچی و فازیلی قەندیلیش نەیاندەزانی نیازیان چییە... لە ناکاویش ئاوها چاونەترسانە پەلاماری ئەو دەدەن کە خۆی بە یەکێک لە گەورەکان دەزانێت. تەنیا کەسێک دەتوانێت پەلاماری وەها فیلێک بدات کە جانەوەری زلتری لە پشت بێت. دڵنیابوو حەسەنی پیزۆ و شبریش ئەو یاسایە دەزانن.

شبر وەک بزانێت ئەو بیر لە چی دەکاتەوە گووتی «مورتەزا. ئێمەش و تۆش دوو شتی بچوکین لە یارییەکەدا... کە شەڕ گەرمدەبێت کەسانی وەک ئێمە دەبن بە خۆراک. سەیری من بکە، دوای ئەو هەموو ساڵ خەباتە خەریکبوو ڕیسوادەبووم، گەر خۆم وریانەبوومایە و پشت و

پەنای گەورەم پەیدانەکردبایە... بێمایەبووم... تۆ نهێنی زۆر دەزانیت، با تیانەچیت... ئێمە دەبێت هەندێک شت بزانین، ئێمەش ڕاسپێردراوین... گەر کەسێکی گەورە ئێمە ڕانەسپێرێت، خۆمان ناخەینە جەهەنەمی وەهاوە... تۆ دەزانیت ئێمە کەسمان لەم مەسەلەیەدا بەشە قازانجمان نییە. ئێمەش وەک تۆ ئیشدەکەین... حەزدەکەم بزانیت، ئێمە دوژمنی تۆ نین و دڵمان لەلاتە، بەڵام ئێمەش ئیشدەکەین... ئەوەی ئێمەی ڕاسپاردوە زانیاری دەوێت، گرنگ نییە ئێمە چۆن پەیدایدەکەین... ئێمە ناوی تۆ ناهێنین، هیچ شتێک بۆ تۆ نابێت، ناوی تۆ بە نهێنی دەمێنێتەوە... دوێنێ شەو تۆمان ئەزیەتدا، خۆت دەزانیت دەبێت وابێت... تۆ خۆشت ئەو یارییانەت زۆر کردوە...».

مورتەزا گووتی « من... من دەبێت چی بزانم... هەموو گومانە خراپەکان بە جۆرێکی نارەوا هاتنەسەر من، چەندەها دڵی ڕەش کە بۆ گوناهبارێک دەگەڕێن، منیان کردە ئامانج. گومانی خراپ منی بە ناهەق بەدناوکرد... لەبەرئەوەی ڕوخسارم ناشیرین و قامەتم خوار و پێکەنینم شەیتانی هەڵکەوتووە، لەبەرئەوەی ژنانی ئەم شارە حەزیان لە زەردەخەنەکانم نییە... لەبەرئەوەی لە زەمانی هابیل و قابیلەوە باوەڕیان وایە کە پیاوە ناشیرینەکان شەیتانن و پیاوە جوانەکانیش فریشتەن، چونکە ژنانی ئەم شارە شێتی کوڕی جوان و کوشتەی پیاوی قۆزن دەبێت وەک سەگ هەموو گوناهەکان بکەنە ملی من. وای کە بێدادییە... وای.

من هاوڕێی بارۆنەکانم... دۆستیانم... هاوڕێی جەعفەری مەغۆلیم... بەڵام هەتا مێروولەشم بە دەستی خۆم نەکوشتووە... ناتوانم... ناتوانم مێرولەش بکوژم...».

حەسەنی پیزۆ گووتی «مورتەزا، لەوانەیە تۆ ڕاستبکەیت و کەست نەکوشتبێت، من خەڵکیشم کوشتووە. حیزب ژنیشی پێ کوشتووم.

ناشیرینەکان هەموویان شەیتان نین... تۆ پیاوێکی زیرەکیت، کەس گومانی لەوە نییە، زۆرجار بە ناشیرینییەکەشت خەڵک دەترسێنیت و هەندێجاریش دەیکەیت بە قەڵغان... کەس نییە لەم شارەدا وەک تۆ بزانێت ناشیرینی خۆی بەکاربهێنێت، هەندێجار ناشیرینی بە ئەندازەی جوانی سەروەت و سامان پەیدادەکات، تۆ لەوانەیت کە دەتوانن ناشیرینی خۆیان باش بفرۆشن و بیکەن بە پارە، تۆ دەتوانیت وا بکەیت... خەڵکی ئەم شارە حەزیان لەسەیرکردنی ناشیرینییە. من دەزانم خەڵکانی ناشیرین لەم شارەدا ئازار زۆر دەچێژن، بەڵام جوانەکانیش بێئازار نین...».

مورتەزا بە باڵا خوار و خێچەکەیەوە هەڵدەستا، وەک ڕۆژانی تر دەکرایەوە و پێدەکەنی، دەیگووت «ناشیرینەکان مەسیحەکانی ئەم شارەن... وای حەسەنی برام... تۆ نازانیت... قەسەم بە هەر دڵێک کە دەزانێت کانگای جوانی لە کوێوەیە... قەسەم بە هەر یەکێک جوانی و ڕۆح پێکەوە گرێدەدا... ئێمە مەسیحەکانی ئەم شارەین. هەموو ڕۆژێک لەگەڵ بەیانیدا لە خاچماندەدەن... هەموو شەوێک بەر لە خەوتن لە خاچماندەدەن... بێگوناه گوناهبارین و لەو پەڕی پاکیدا پیسین... هەموو باغ و ڕۆشنایی گەردون لە دڵماندا بێت، چونکە زەردەخەنەمان جوان نییە، دڵدزێو و ئەهریمەنزاد تەماشاماندەکەن... ڕۆحیشمان وەک بەفر سپی بێت هەر ڕەشین... دەستیشمان وەک ئەولیا پڕ تیشک بێت هەر تاریکین... تا گەورەبین بچوکتر سەیرماندەکەن و تا ڕووخۆشتربین نزمتر لێمان دەڕوانن... من هەموو ژیانم باری ئەو ناشیرینییە ڕادەکێشم، چۆن هێسترێک بارێکی گەورە بە هەورازێکدا سەردەخات، ئاوەها شەو ڕۆژ باری ناشیرینی خۆم سەردەخەم... باجی ڕوخسارێک دەدەم کە دەستم لە دروستبوونیدا نەبووە».

حەسەنی پیزۆ سەرسام لە قسەکانی مورتەزا گووتی «ئەوانەی ئێمەیان ڕاسپاردوە، پرسیاری تۆیان نەکردوە... ئەوەی لە ژێر

چاوەدێریدایە و دەبێت نهێنییەکانی دەربکەون، تۆ نیت... من دڵم بۆت دەسوتێت... بەڵام من تۆم بینی، شەوێکی تاریک تۆم لەگەڵ قەیسەردا بینی... بەڵام حەزدەکەم پرسیارێکت لێبکەم. تۆ دەربارەی زوهدی شازەمان چی دەزانیت؟ ها... دەتەوێت حاشا لەوەش بکەیت... دەتەوێت بڵێیت، کە تۆ و بارۆنی کولەکە نامەکانی ئەوتان نەدزیوە؟ تۆ نەبوویت کە بەیانییەکی زوو سەعات شەش وەک شێت خۆتکرد بە ئوتێلێکدا و پیاوێکی بێکەس و غەریبەت لە خەو کرد... ها تۆ باش دەزانیت کە باران شوکور نەچووە بۆ ئەورووپا بۆ لای خاڵی. زوهدی شازەمان خاڵی باران شوکورە و لەوسەری دونیاوە هاتۆتەوە بۆ ئەوەی بزانێت خوشکەزا بەستەزمانەکەی چی بەسەرهاتووە؟ مورتەزا... ئەی ئێوە نەبوون ماوەیەک لە مەوبەر نیوەشەو لەگەڵ خەسیو جوجیدا موەلیدەکەی ئوتێلی «بەفر و سەراب»تان کوژاندەوە و ویستتان ئەو کابرا بەستەزمانە بفڕێنن... ئێوە نەبوون؟».

مورتەزا لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دەوەستا و بێئەوەی هیچ بڵێت، تەماشای دوو میوانەکەی دەکرد... بە جۆرێک سەرسامبوو نەیدەزانی لە کامیان بڕوانێت، بۆ یەکەمجار هەستیدەکرد کەوتۆتە تۆڕێکی تاریک و بێدەربازەوە. حەسەنی پیزۆ بۆ ئەوەی تەواو بیخات گووتی «مورتەزا ئەی کێ موراد جەمیلی کوشت؟ نەوجەوانی چینی کێ کوشتی؟ تۆ کوشتت؟ یان بارۆنی کولەکە؟ یان جەعفەری مەغۆلی؟ مورتەزا، من و جەعفەر پتر لە دەساڵ لە شانەکانی ئیغتیالاتدا ئیشمانکردوە، دەست و خەتی یەکتر دەناسینەوە... بەڵام دەمەوێت لە تۆی ببیستم کێ نەوجەوانی چینی کوشت؟ بۆ ویستتان زوهدی شازەمان بفڕێنن؟ باران شوکورتان چی لێکرد؟ تێدەگەیت... خەڵکێکی زۆر بەرز لە دەوڵەت و حیزبدا حەزدەکەن ئەم وەڵامانە ببیستن... حەزیان لێیەتی»

شبر بۆ ئەوەی گورزەکەی حەسەنی پیزۆ تەواوبکات گووتی «

مورتـەزا بیـری لێبکـەرەوە، بـە هێمنـی بیـری لێبکـەرەوە... تەنیـا مـن و حەسـەنی پیـزۆ دەتوانیـن یارمەتیـت بدەیـن... گـەر جەعفـەری مەغۆلـی و بارۆنـی کولەکـە بزانـن ئاشـکرابوویت دەتکـوژن... ئەمشـەو بـەر لـەوەی ڕۆژ بێتـەوە دەتکـوژن... ».

## تریفە لە هەزارباغ

تـرس لـە جانـەوەرە نادیـارەکان و بێدەنگـی، دوو نیشـانەی گـەورەی ژیانـی تریفـە یابەحـری بـوون. ئولفەتـی تریفـە بـە منداڵـە خەیاڵییەکانـەوە و ئیشیشـی لەگـەڵ ژنـە بێکەسـەکاندا خاڵـی نەبوو لـە بێدەنگی. هەندێجـار بەسـەعات یەکێـک لـە منداڵـە بچوکەکانـی دەگرتـە ئامێـز و بەبێدەنگی قسـەی لەگەڵـدا دەکـرد، زۆربـەی منداڵـەکان هێـدی هێـدی فێردەبـوون بـە بێدەنگـی قسـە لەگـەڵ تریفـە یابەحریـدا بکـەن. یـەک لـە دوای یـەک بـە هەفتـە دەینـان بـە سـنگی خۆیـەوە و فێـری ئـەوەی دەکـردن بێئـەوەی لێویـان بجوڵێنـن و زمـان بەکاربهێنـن و وشـە بگۆڕنـەوە، لەیەکتـری تێبگـەن. مانـگ دوای مانـگ و سـاڵ دوای سـاڵ پەیوەنـدی ڕۆحـی تریفـە بـە منداڵـە خەیاڵییەکانـەوە قووڵتـر و قووڵتـر دەبـووەوە. لـە کۆتایـی سـاڵی دووهەزاروسـێدا زۆربـەی منداڵـەکان دەیانتوانـی بێئـەوەی تریفـە لـە ماڵـەوە بێـت ببینـن و گوێیـان لـە دەنگـی بێـت... زۆرجاریـش لـە ژوورەکـەدا بـوو، بـەڵام وەک تارماییەکـی سـپی لێدەهـات و شـێوەی شـنەبایەکی فێنکـی وەردەگـرت کـە وەک سـرووەی بەیانـی بەسـەر شـتەکاندا هەڵیدەکرد. ژنە بەدبەختەکانی ماڵە غەمگینەکەی خۆشـی، هەمـان هەسـتیان هەبـوو، هەندێـک شـەو هەڵدەسـتان و وا هەسـتیاندەکرد تارمایـی ئـەو لـە حـەوش و هەیوانەکـەدا دەسـوڕێتەوە. دەنگـی لە ژێـر زەمینی ماڵەکـەدا دەبیسـترێت. ژنانـی بێپەنـا هەمـوو دەیانزانـی تریفـە یابەحـری تـا چ

ئەندازەیەک شێتی غەزەلنوسە، بە چ پلەیەک عاشقێتی. نەورەسی گوڵ سۆلاڤیش کە ئەو کات نزیکترین دەستەخوشکی بوو، لە هەر کەسێکی دی دونیا پتر ئاگاداری ئەو گۆڕانە سەیر و قووڵانەی ناوەوەی خانمی یابەحری بوو. گوێگرتنی بەردەوامی لە غەزەلەکان گەیاندبوویانە ئەو بڕوایەی کە بۆ ئەوەی ببێت بە خۆشەویستی غەزەلنوس دەبێت پێی لەم زەوییە ببڕێت و ببێتە وێنەیەک تەنیا بە خەیاڵ نیگاربکرێتەوە. وەک دواتر نەورەسی گوڵ سۆلاف بۆی گێڕاینەوە... ئەوەی ئەو خولیایەی لای خانمی یابەحری زۆر بەهێزکردوە، دۆزینەوەیەتی بۆ دەرگاکانی هەزارباغ.

شەوێک لە شەوان دوای چەندین ساڵ پرسیار و دوو دڵی و سەبر، تریفە یابەحری بەنهێنی دوای غەزەلنوس دەکەوێت. تریفە کچێک نییە ئیرەیی بیخوات، هێندە هەیە دەیەوێت تێبگات چ دەردێک لە ژیانی غەزەلنوسدایە و بەچی ئەم ڕۆحە نەسرەوتە بەختیار دەبێت. چەندەها شەو بەدوایدا دەڕوات و هەمیشە لە یەکێک لە کوچەکانی سێباغدا وەک با بیفڕێنێت و تەلیسم بیبات وندەبێت... شەو دوای شەو... غەزەلنوس دەڕوات و ئەو بەدوایدا... غەزەلنوس دەڕوات و ئەو بەدوایدا... شەوێک لە پشت یەکێک لە درەختەکانەوە، تریفە دەچێتە ناو ئەو باغە خەیاڵییە کە تەنیا ڕۆحلەبەرە ناوازەکانی خەیاڵ دەتوانن ئاوها ئاسان دەرگاکانی بدۆزنەوە. لە دیمەنی ئەو هەموو گوڵە سەرسامدەبێت، سەیری لێدێت شار وەها باغێکی نەبینراو لە ناوەڕاستیدا بێت و کەس نەیبینێت. بەدوای غەزەلنوسدا پێچاوپێچەکانی ئەو گوڵستانە گەورەیە دەبڕێت، دوورا و دوور ئەو پیرێژنە ڕەشپۆشانە دەبینێت کە گوڵی خەیاڵی دەچنن. سەرەنجی وێڵی و سەرگەردانی غەزەلنوس دەدات، دەیبینێت باغ دوای باغ و چیمەن لە دوای چیمەن دەگەڕێت، تا دواجار لە سوچێکی بە گوڵ گەمارۆدراودا لە ئافرەتێکی جوان نزیکدەبێتەوە، بە ئارامی لە بەردەمیدا دادەنیشێت و دەستدەکات بە غەزەل خوێندنەوە... غەزەل لە دوای غەزەل و غەزەل

لەدوای غەزەل تا دەمەوبەیان. چەندین شەو تریفە ئەو دیمەنە دەبینێت. هەموو شەوێک لەگەڵ نیوەشەودا دوای ئەو پیاوە غەمگینە دەکەوێت، نازانێت ئایا بەڕاست بە کوچە ڕاستەقینەکانی ئەم شارەدایە دەڕوات یاخود بە کۆڵانی خەیاڵەکانی غەزەلنوسدایە دەگەڕێت... نازانێت. شەو دوای شەو سەیری سیحری ئەو کچە دەکات کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕۆحلەبەرێکی ڕاستەقینە بووە و ئێستا بۆتە خەیاڵ. جار دوای جار دڵنیادەبێت کە ئەم ئافرەتە خەیاڵییە خانمی خەونەکانی غەزەلنوسە، کە جگە لە کچی خەیاڵی ناتوانێت عاشقی کەسی دی بێت. عەشق لای ئەو ڕەدوونانی کچێکە کە ناگیرێت، لە باغێکی گەورەدا کە نابینرێت. بە قسەی نەورەسی گوڵ سۆلاف بێت، تریفە جارێک لە جارەکان بە تەنیا دەچێتە ئەو باغە و ڕوو بە ڕوو ئەو خانمە خەیاڵییە دەبینێت. کە یابەحری لێیدەپرسێت بۆ نایەیتە دەرێ، سەبری لەوەلامدا دەڵێت لەگەڵ هاتنە دەرەوەی ئەودا لەم باغە خۆشەویستی غەزەلنوس بۆ ئەو دەمرێت... چونکە غەزەلنوس عاشقی ئەو ژنانەیە کە لە دونیای ڕاستیدا ناگیرێن و بوونیان نییە. هەڵبەت هەموو دەزانین تریفە یابەحری پێشتر ئەو خواستە لە ناویدا بووە ببێتە ئەو بوونەوەرە خەیاڵییە. پێدەچێت بینینی سەبری ئەو بڕوایەی تیا سەوزکردبێت تەنیا لە ڕێگای بوون بە خەیاڵەوە دەتوانێت خەونی خۆی و غەزەلنوس بهێنێتەدی و بە ڕاستی عاشقی بێت. ئیدی زیاتر و زیاتر لەگەڵ ئەو یارییە کوشندەیەدا دەڕوات... یاری وەرگەڕان بەرەو مەخلوقێکی خەیاڵی...

چیرۆکی چوونی تریفە یابەحری بۆ هەزارباغ و بینینی سەبری، حیکایەتێکی سەلمێنراو نییە، دوور نییە چیرۆکێک بێت نەورەسی گوڵ سۆلاف بۆ جوانکردنی هەرچی زۆرتری تریفە یابەحری دروستیکردبێت. بەڵام خواستی خۆشاردنەوەی تریفە و وەرگەڕانی بەرەو تارماییەکی زیندوو چیرۆکێکی ڕاستە کە هەمووان دەیسەلمێنن. لە سەرەتای پاییزی ساڵی

دوو هەزارچواردا دوای ڕوداوێكی ناخۆش، تریفە لەگەڵ ماندوێتییەكی زۆردا واز لە ئیشی خۆی لە نوسینی درێژترین كتێبی دونیادا دەهێنێت، پێدەچێت چیتر توانای لەسەر ئازار و غەمخواردن گەیشتبێتە دوا سنووری خۆی، زۆربەی ڕۆژ بەیانیان لەگەڵ ژنە غەمگینەكاندا تێكەڵی دونیای مافوورچنین دەبێت و ئێواران دەگەڕێتەوە بۆ سەرپەرشتیكردنی منداڵان و شەو دەگەڕێتەوە بۆ لای قاڵیچنەكان... جوڵەیەكی بەردەوام و هەمیشەیی، ڕاكردنێكی بێسرەوت، ترسێكی نەبڕاوە لە هەندێك خێو و ددانی جانەوەرانەی تیژ كە بێهیچ هۆیەكی دیاریكراو هەستیان پێدەكات. لەو ماوەیەدا ڕۆژ بە ڕۆژ خۆشەویستی و سەرسامی بە غەزەلنوس گەورەتر دەبێت، خۆشەویستییەك لە بێدەنگی و سووتان و شەوقێكی ناوەكی كوێردا دوایی دێت. بڕوای تەواوی بەوە هەیە كە لە خۆشەویستیدا شتێك نییە ناوی «بۆیەكبوون» بێت، غەزەلنوس لە دڵیدا وێنەی تارمایی خۆشەویستییەكی دوور و نەگیراو وەردەگرێت، كە بەبێ ئەو دوورییە، بەبێ ئەو «بۆیەكنەبوون»ـە ناتوانێت بژی. بە كیژەكانی هاوڕێی دەڵێت «مرۆڤ لە خۆشەویستیدا یار تا مەقامی كەسێكی باڵا و سەروو ئادەمی بەرزدەكاتەوە. غەزەلنوس تا زیاتر شیعرم بۆ بخوێنێتەوە، زیاتر تێدەگەم كە ئەو شتێك نییە بتوانم بیگرم... وەك چۆن كەس ناتوانێت مۆسیقای ناو شیعر بەدەست بگرێت، كەس ناتوانێت خۆشەویستیش بەدەست بگرێت». هەندێك شەو لەگەڵ كچە غەمبار و هەڵهاتووەكاندا دادەنیشێت و دەڵێت «تا دووربكەومەوە زیاتر هەستدەكەم گەیشتوومەتە ئەو مەقامە دوورەی ئەو دەیەوێت... تا دوور بكەوێتەوە، هەستدەكەم زیاتر گەیشتۆتە ئەو مەقامەی من دەمەوێت. لە خۆشەویستیدا مەحبوب تا بێت لە تۆ بەرزتردەبێتەوە... بەرزتردەبێتەوە... بەرزتردەبێتەوە... تا دەگاتە پلە و پایەیەكی وەها تەنیا بە خەیاڵ دەتوانیت لە تەنیشتییەوە بژیت».

بنەماكانی ئەو خۆشەویستییەی نێوان غەزەلنوس و تریفە یابەحری

لەسەر کۆڵەکەی ئازاری زۆرتر بۆ عەشق و نەگەیشتن بە یەک درستبووە. جارێک غەزەلنوس لە نامەیەکی کورتدا بە تریفە دەڵێت «ئەی یار، من و تۆ دەبایە لە سەدەی شازدە و حەڤدەدا بژیابایینایە، لەو سەدە دوور و تۆزاوی و ساردانەدا کە تاریکی زەمین و بێڕەحمی سروشت، مرۆڤی ناچاردەکرد پتر بۆ ڕۆحی خۆی بگەڕێتەوە... من و تۆ منداڵی دەروێشە کۆنەکانین... پاشماوەی ڕۆژێکین ئینسان جەستەی خۆی خۆشنەدەویست... من و تۆ جەستەمان نییە». واهەستدەکەم هەردووکیان لەزەتێکی زۆریان لە وێناکردنی خۆیان وەک دەروێش و قەلەندەرە کۆنەکان بینیبێت. بانگکردنی یەکدی بە «قەلەندەر» «زیکرساز» «خەڵوەتچی» بەشێکی زمانی ئەو سەردەمەیە کە لەگەڵ یەکدا بەکاریدەهێنن. چیرۆکی ئەو نامە کورتانەی لە نێوان غەزەلنوس و تریفە یابەحریدا دێن و دەچن، یەکێکە لە شتە سەیرەکانی ئەم چیرۆکەی ئێمە. غەزەلنوس و تریفە لە قۆناغێکدا وایان لێدێت تەنیا لە کاتی کارکردندا بۆ کتێبی مردن یەکدی دەبینن. هەمیشە خۆیان لەوە دەپارێزن بە جەستە نزیکبن و هەردەم خۆ لە یەکدی دەدزنەوە. غەزەلنوس کاتێکی زۆر لە کتێبخانەکەدا دەباتە سەر و تریفەش بەدەگمەن نەبێت پێناخاتە ئەو جوگرافیا داخراو و دوورەی غەزەلنوسەوە، کە بۆنی دەستنوس و پەڕەی کۆنی لێدێت. تریفە هەستدەکات غەزەلنوس ساڵ دوای ساڵ زیاتر بۆنی ئەو کاغەزە زەردانەی بەیاز دەگرێت و بۆنی لە بۆنی دیوانە کۆنەکانی غەزەل نزیک دەبێتەوە. لەو دەمەدا پتر لە ڕێگای ئەو کورتە نامانەوە لەگەڵ یەکدا دەدوێن کە بەردەوام غەزەلنوس دەیخاتە چەکمەجەی مێزێکی تریفە یابەحرییەوە و هەر لەو چەکمەجە بچوکەشدا وەڵامی خۆی وەردەگرێتەوە. ئێمە ئێستا کۆمەڵێک لەو نامانەمان بۆ ماوەتەوە، هەندێکیمان لە نەورەسی گوڵ سۆلاف وەرگرت و هەندێکی دیکەشیان لە دەستی تەرخونچییەوە گەیشتۆتە بارۆنی خەیاڵ و لە ڕێگایەکی نادیارەوە کە ئێمە تەفسیرمان

بـۆی نییـە دزەی کردۆتـە نـاو دۆسـییە و فایلەکانـی ئاسایشـەوە. لێـرەدا چەنـد ژمارەیەکـی کـەم لـەو نامانـە دەخەینـە بـەر دەسـتتان کـە هەموویـان نامـەی کـورت کورتـن و بەدەگمـەن لـە چـوار یـان پێنـج دێـڕ تێدەپـەڕن، بەڵام پێدەچێـت زمانحاڵـی ئـەو عەشـقە بـن کـە لـە هەندێـک جێـگادا گەیشـتۆتە تخوبـی خۆکوشـتن.

***

«تریفـەی پەریـزاد... دوێنـێ شـەو لـە شـەوەکانی تـرم سـەختتربوو. بیرکردنـەوە لـە کەماڵـی خـۆم بـەرەو بیرکردنـەوە لـە کەماڵـی تـۆ ڕایکێشـام. هـەر وەختێـک دەمەوێـت بەرزببمـەوە بـۆ ئـەوەی بگـەم بـە تۆ... هەسـتدەکەم کەماڵـی تـۆ پلەیـەک باڵاتـر دەڕوات و مـەودای نێوانمـان تـا قیامـەت هـەر وەکـو خۆیەتـی... غەزەلنـوس»

«قەلەنـدەری ئەزیـزم... هیـچ خاڵێـک نییـە مـن و تـۆ پێکـەوە کۆبکاتەوە. لـە خۆشەویسـتیدا هەمیشـە یەکێـک لـە زەوییـەو ئـەوی دی لـە ئاسـمان... یەکێـک ئادەمییـە و ئـەوی دی خـودا... تریفـە»

«تریفـەی خەونەکانـم... ئـەی سـاقی ئەبـەدی مەجلیسـێک مـن پیاڕانەگـەم دەم بـۆ شـەرابی بـەرم... هەسـتدەکەم هێـدی هێـدی پێویسـتیم بـە سـەیرکردنی هەرچـی زیاتـری تۆیـە. ئـەم بەیانییـە لێـرە نەبوویـت و وەک بـۆ تـۆ بگەڕێـم، شـێتانە لـە بـازاڕی شـاردا بـە قـژی بـژ و ڕوخسـاری مانـدووەوە سـەیری مەخلوقاتـی خـودام دەکـرد... تێگەیشـتم تـۆ لـە جنسـی هیـچ کـەس نیـت... غەزەلنـوس»

«ئـەی فریشـتە چاویلکەدارەکـەی مەیخانەکانی عەشـق، تـۆ بوونەوەرێکـی سـەیریت... کـە دوورم نزیکیـت و کـە نزیکـم دووریـت. ئینسـان عاشـقی ئینسـان نابێـت، بەڵکـو عەشـق شـتێکە لـە نێـوان ئادەمـی و فریشـتەدا دروسـتدەبێت... کـە هەسـتدەکەم تـۆ ئادەمیـت و بـۆ لات دێـم، لـە خـۆم

دەڕوانم خەیاڵم و پەریزام... کە هەستدەکەم من ئادەمیم و دەبێت ماچتبکەم، تۆ دەبیتە فریشتە و دەڕۆیت...تریفە»

«چ ساقییەکی بەدیت... هەرچی لە دەستی تۆ دەینۆشم، دەبێت بە غەزەل... غەزەلنوس»

«دەزانم گەر پێتبگەم دەمرم. گەر لەشم بەر لەشت بکەوێت دەمرم. گەر ماچتبکەم دەمرم. گەر بەر هەوای دەستیشت بکەوم دەمرم... گەر ماچمبکەیت کوشندەیە، چونکە ئەوە دوا ماچی عومرم دەبێت... تریفە»

«خانمی یابەحری... من ئومێدم نەما. خەیاڵ هەر ئومێدێکمان پێدەبەخشێت، دەبێت ئازابین و لە ڕاستیدا بۆی بگەڕێین، بەڵام چۆن ئومێدی تۆ دەبێتە حەقیقەت؟ چۆن خەیاڵی تۆ دەبێتە ڕاست؟... پێمبڵێ... غەزەلنوس»

«کۆنە خەڵوەتچی و بەیازناسی شارەزا... من دەزانم چۆن ڕاستی دەبێت بە خەیاڵ، بەڵام کەس فێری نەکردوم، خەیاڵات چۆن دەبنە ڕاست... گەر تۆ ئوستادی عەشقیت... عەشق کەسی فێرنەکردوە، ڕێگا بدۆزێتەوە... عەشق تەنیا ونبوونەو ونبوون... تریفە»

«چۆن دەڵێیت من و تۆ بۆیەک نین؟ ماوەیەکە بۆ هەر کوێیەک دەچم، بە هەر باغێکدا دەڕۆم، بە هەر کوچەیەکدا تێدەپەڕم... هەستدەکەم تۆ لەگەڵمدایت... دوێنێ غەزەلم بۆ هەندێک ژنی پەژمووردە و بێڕەنگ دەخوێندەوە، وەک زیکرچی خەڵوەتێکی نهێنی گوێیان لێگرتم، هەموو زانیان لە خەتی غەزەلی سوختە دەرچووم و گڕی خۆم دەنوسمەوە... چۆن دەڵێیت، من و تۆ بۆیەک نابین؟... شەو و ڕۆژ خاشاکی خۆم دەبینم با بۆ تۆی دەهێنێت و عەتری تۆ بۆندەکەم کە خەیاڵ دەیهێنێت... غەزەلنوس»

«ماچ؟ غەزەلنوس ماچ؟ تۆ تێناگەیت... گەر ماچمبکەیت، هەموو تەلیسمی تۆ دەشکێت... تۆ بەوەوە جوان و سیحراویت، کە ئێستا

خەیاڵیت.... کە جاران خەیاڵ بوویت... کە هەمیشە وەک خەیاڵ دەمێنیتەوە. ماچ هەموومان وەک یەک لێدەکات... بەڵام عەشق مەقام و پلەی هەیە... ئەوەی عەشق بە ڕەنجی خۆی پلە لە دوای پلە بەرز و نزمی دەکات، بە ماچ تێکیمەدە... ئەوەی دڵ دروستیدەکات، بە لێو مەیڕوخێنە... تریفە»

«شەو نییە بیر لەوە نەکەمەوە ئەم غەزەلانە بسوتێنم و بێمە سەرێ و لەباوەشتبکەم و لەگەڵتدا فێردەوسی ئەم دونیایە بژیم... غەزەلنوس»

«شەو نییە بیر لەوە نەکەمەوە بێم و ئەو غەزەلانەت بسوتێنم و خۆم فڕێدەمە باوەشت و لە نێوان دوو دەستتدا ونبم... بەڵام بیردەکەمەوە، دواتر خەیاڵەکانم بەبێ تۆ مانایان نییە ئەزیزم... ئەو خۆشییەی کە هەمیشە بیرتبکەم، قووڵترە لەو خۆشییەی پێتبگەم... تریفە»

## یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

ڕۆژێک لە ڕۆژان تەرخونچی خزمەتێکی پیشکەشکردم کە تادەمرم لەیادم ناچێتەوە. بەوەدا ئەو پیاوێکی وریا و شەیتان و هەمەڕووبوو کە بەجۆرێک تێکەڵاو حیکایەتەکە بووبوو، هەندێجار لە من پەرۆشتر دەردەکەوت و شەوق و ئارەزووی لە من زۆرتربوو، هەموو شتێک لەسەر غەزەلنوس بزانێت. لە پاییزی دووهەزاروچواردا تەرخونچی ڕۆژێک لە پشکنینە وردەکانیدا لە ماڵی غەزەلنوس دەچێتە ژوورێکی داخراوەوە. هەڵبەت ئەو بەستەیەک کلیلی بۆ دابینکرابوو کە هەموو دەرگایەکی دونیای دەکردەوە، تەکنیکی وردی وێنەگرتن و گوێگرتنی پێبوو. لەو ژوورەدا شتێک دەدۆزێتەوە کە سەرەتا تەنیا مایەی سەرسوڕمان و سەراسیمەبوون بوو... کتێبێکی زۆر گەورە... کتێبێک

کە وەک شتێکی موقەدەس لە ناوەڕاستی ژوورێکی داخراودا لەسەر مێزێکی تایبەت دانراوە... تەرخونچی سەرەتا لەبەر بێکاتی بە کامێرا دیجیتالەکەی تەنیا چەند وێنەیەکی کتێبی دانراو دەگرێت... کە من وێنەکانم بینی، جگە لەسەرسامی هەستم بە هیچی دی نەکرد... سەرسامی و بەس. هەمووتان چیرۆکی ئەو ڕاوچییانەتان بیستووە کە لە ناکاو لە ناوجەرگەی بەحردا جانەوەرێکی خورافی و گەورە دەبینن، جانەوەرێک بۆجارێک سەرێک لە ئاو دەردەهێنێت و خۆی پیشانی کەشتییەوانەکان دەدات و دووبارە دەچێتەوە بن ئاو، بۆ ئەوەی دوای خۆی تەلیسمێک جێبهێڵێت و دونیا بکات بە دووبەشەوە، بەشێک بڵێن ڕاستەو جانەوەری وەها هەیە و بەشێکیش بڵێن درۆیە و دەستکردی خەیاڵە.. ها، هەمووتان ئەو چیرۆکەتان بیستووە. ئەو کتێبەش لەو جانەوەرە زەبەلاحانە دەچوو کە ئاوها لە پڕ دەردەکەون... نەهەنگی کتێبەکان بوو، زۆر گەورە و عاجباتی و زەبەلاح بوو، کە بە خەیاڵی من جێگای زانستی هەموو دونیای تێدا دەبووەوە. تەرخونچی جاری یەکەم تەنیا وێنەکەی هێنا. من وەک کەسێک کە شێت و شەیدای خەیاڵم بینینی کتێبەکە وەها خرۆشاندمی، دەمویست لەو ساتەدا تەلەفون بۆ هاوەڵانی خۆم لە ئاسایش بکەم، بە بیانووی هەر شتێکەوە بووە، بدەم بەسەر هێلانەی ئەو شاهی غەزەلەدا و ئەو کتێبە دەربهێنم و پەڕە بە پەڕە سەیریبکەم و بزانم چی تیا نوسراوە. بەڵام تەرخونچی بە منی گووت گەر یارمەتییدەم دەتوانین پێکەوە ئەو کتێبە بدزین. ئەو ماوەیە من دەمزانی تریفە یابەحری زۆربەی شەو لە ماڵی ژنە قاچاخەکاندا دەخەوێت، خەبەرم لە هەموو جوڵەیەکی هەبوو، ئاگاداری ئەوەشبووم دەیویست خەیاڵیترین فەرشی هەموو دونیا بچنێت، فەرشێک نە شاهەنشا کۆنەکانی ئێران و نە سوڵتانە تورکەکان لەسەری دانەنیشتوون. من دوژمنی ژنان نەبووم، ئازادی

ژنان مەرجێکی گرنگی مەدەنییەت و بنەمایەکی سەرەکی شاری خەونەکانی من بوو، بەڵام گەر بۆ بەرگرتنی گوشارەکانم لەسەر ئەم بوونەوەرە خەیاڵیانە پێویستبایە، تریفە یابەحری بترسێنم، دەستم نەدەپاراست. دڵنیابووم شەوان لە بری تریفە خانمێکی لادێیی هەژار و کچەکەی چاوەدێری منداڵەکانی غەزەلنوس دەکەن، تەرخونچی پتر بۆ جێبەجێکردنی پلانی بردنی کتێبەکە ختوکەی دڵی دەدام. نەخشەی تەواومان هەبوو، دەمانتوانی بێغەم و دوودڵی لەسەر ئەو نەخشەیە هاتوچۆبکەین. غەزەلنوس لە ژێر زەمینە چەپەکەکەی ماڵی خۆیدا دەژیا، هەمیشە غەرقی غەزەلیات بوو، وەک ڕەشید تەرخونچی بۆ منی وەسفکرد و نەخشەکانیش دەریاندەخست ژووری ئەو کتێبە نەهەنگئاسایە، دوورەپەرێز و بێچاودێر بوو. تەرخونچی بە هەموو مەکری خۆیەوە دەیگووت «گەر بزانیت چۆن لە کلیلدانەکاندا کلیلی خۆت دەگێڕیت، دەتوانیت ئاسان بگەیتە کتێبەکە». من سەرەتا هانمدا بەر لەوەی ملی کارێکی وەها پڕ بگرینە بەر، جارێکی تر خۆی بگەیێنێتەوە ئەو ژوورە و هەندێک لاپەڕەی کتێبەکە بخوێنێتەوە. کە ئەو داوایەم لە تەرخونچی کرد، دەمگووت وەها کارێک ئاسان سەرناگرێت و نایەتەبەر. بەڵام تەرخونچی کارامەیی نواند و لە ماوەیەکی کەمدا بە هەواڵێکی سەیرەوە گەڕایەوە. سەرتاپای ئەو کتێبە گەورەیە چیرۆکی مردن بوو... حیکایەتی جیاواز جیاوازی مردن کە یەکێک بە دەستوخەتێکی سیحراوی نوسیبوویەوە. ئەو وێنانەی تەرخونچی گرتبوونی ڕۆشن و خوێنراوەبوون. لەگەڵ بینینی وێنەکاندا دڵنیابووم لە بەردەم دۆزینەوەی گرێکوێرەی کتێبە باڵدارەکاندام. دڵنیابووم چەند ساڵە ئەو دەستە نهێنییەی چیرۆکەکانی مردن کۆدەکاتەوە، غەزەلنوسە... هیچ چارێک نەبوو ئەوە نەبێت ئەو کتێبە دەربهێنم و تێیبگەم. شەوێک یەکێک لە هەرە لێزانترین و بەهێزترین دزەکانی

ئەم شارەم لەگەڵ تەرخونچیدا نارد، خۆم دووراو دوور چاوەدێری ئیشەکەم دەکرد، نزیکی سەعات سێی دەمەوبەیان بە خۆیان و ئەو نەهەنگە گەورەیەوە هاتنەدەرێ. گەورەترین کتێبێک بوو تا ئەو کاتە بینیبێتم، کتێبێک بوو، بۆنێکی تایبەتی هەبوو... ئەوە یەکەمجاربوو، کتێبێک ببینم بۆنی هەبێت، بۆنێکی لە بۆنی هەندێ کوچەی داخراوی ئەم شارە دەچوو. هەمان شەو بە سێ کەس کتێبەکەمان گواستەوە بۆ ژێرزەمینی ماڵی خۆم و دەستمکرد بە خوێندنەوەی. لێتانی ناشارمەوە کە لەگەڵ گەلێک لە چیرۆکەکانی ئەو کتێبەدا گریام، کتێبێک بوو بە ئەندازەی هەزاران کتێب مردنی تێدابوو، وەک خودی ئەم وڵاتە کە بە ئەندازەی هەزار وڵات مردنی تێدایە... وەک سیحرێکی گەورە ڕامکێشێت چیرۆک لە دوای چیرۆک خوێندمەوە، لەگەڵ هەموو فرمێسکێکدا دەمگووت «غەزەلنوس، بۆ ناتەوێت ئەم چیرۆکانەمان بیربچێتەوە، بۆ ناتەوێت... بۆ تەنیا لە ناومەرگدا بۆ حەقیقەت دەگەڕێیت؟ بۆ بیر لەوە ناکەیتەوە دەتوانین شتی جوان دروستبکەین و ڕوخسارێکی کراوە و گەش بدەین بە ڕاستی؟ بۆ دوای غەم دەکەویت و دوای ئومێد ناکەویت؟». گووتم گەر ڕۆژێک شاری خەونەکانم دروستکرد، ئەو کتێبە گەورەیە دەخەمە نێو بناغەی باغچەی سەرەکی ئەو شارە. شاری وەها دەبێت لەسەر مردنی ئەم یادگارییە تاڵ و تاریکانە دروستبووبێت. بەڵام ئەو کتێبە نیشانەی شتێکی تریش بوو، نیشانەی ئەوەبوو ئەم غەزەلنوسە هەرشتێکی بوێت دەیکات. من کە لە سیحری وشەکان و دێڕەکانی دەرچووم... هەستم بە ترسێکی قوولکرد، نەمدەزانی ئاخۆ ئەم پیاوە بە پیلان و نەخشەیەکی پێشوەخت کاردەکات، یاخود ژیان خۆی ئەم هەموو هێزەی پێبەخشیوە؟. هیچ شتێک لەوە ترسناکتر نییە هێزێکی گەورە بکەوێتە بندەستی شاعیرەکان. من هەر جارێک لەگەڵ هاوڕێیانی ناو

حیزبدا دادەنیشم، دەڵێم «خۆتان چاکبکەن... ببن بە سیاسی غەمخۆر و دووربین، عاقڵبن و دوای هەوای گوونتان مەکەون، با هێزی گەورەی ئەم کۆمەڵگایە نەکەوێتە بندەستی هەندێک شاعیر و نوسەر، تا بە ئارەزووی خۆیان یاری بە عەقڵی عەوام بکەن». نا وامەزانن، من هەر بەخۆڕا نامەوێت هێز بکەوێتە بندەستی شاعیران... واتێمەگەن من هەر بە فیترە دوژمنی شیعربم یان وابزانن من قوتابی یەکێک لە ئەفلاتونییەکانم، کە لەم دەورو زەمانەدا بەزۆر شێوە سەریان دەرهێناوەتەوە. نا من نە کینەیەکی کوێرم لە شاعیران هەیە و نە ئەفلاتونیشم، بەلام دەپرسم گەر هێز بکەوێتە دەست شاعیران چی لێدەکەن؟ یەکەمین شت کە شاعیران دەیکەن، ئەوەیە هەر شتێک شیعر نەبێت لە ژیان دەیکەنە دەرێ... ئەمەش ترسناکترین شتە. بەلام ئەوان هێزێک و بەلاغەتێکی وەهایان هەیە، ئەم شتە ترسناکە وەک جوانییەکی بێوێنە دەربخەن، خەڵک شێت و شەیدابکەن. سەرەتا بۆ ئەوەی شەبەنگێکی سیحراوی بەدەوری سەری شیعردا بکێشن، دەبێت ویژدان دروستبکەن... ویژدانی شاعیرەکانیش وەک ویژدانی حاکم و قازییەکان و یاساناسان نییە، من زۆرم خوێندەوە و زۆر تێفکریم تا جیاوازی قووڵی نێوان ئەو دوو جۆر ویژدانەم دەستکەوت. ویژدانی شاعیران لەسەر جیاکردنەوەی دەستەلات لە بێدەستەلات دروستبووە، بەلام ویژدانی ناو یاسا لەسەر جیاکردنەوەی تاوانبار لە بێتاوان دروستبووە. حاکم و دادوەران بۆ ئەوە ئیشدەکەن تاوان نەهێڵن، بەلام شاعیران بۆ ئەوە ئیشدەکەن ئەو جیاوازییە لە نێوان دەسەلات و بێدەسەلاتاندا نەهێڵن... ئەوان هەزار بەند و باڵۆرە بۆ تاوانبارێک دەدۆزنەوە تا دواجار بێگوناه نیشانیبدەن، هەزار ڕێگای پێچاوپێچ و هەزار فێڵی هونەری و فەلسەفی دەخەنە کار تا واپیشانبدەن گوناهباران قوربانین، پاڵەوانن، فەیلەسوفن. وەک ستاندال لەگەڵ ژولیان سوریلدا

دەیکات، وەک دۆستۆفسکی لەگەڵ ڕاسکۆلینکۆف یان پاڵەوانەکانی ناو کارامازۆفدا دەیکات، وەک کافکا لەگەڵ «کا»ی پاڵەوانی دادگادا ئەنجامیدەدات، کە تەواو لە گوناهە ڕاستەقینەکانی بێدەنگ دەبێت و چاوی خۆی غافڵدەکات و هەتا حەرفێکی ڕاستەقینەش دەربارەیان نانوسێت. بەدرێژایی مێژوو وایانکردوە، گەر ویستبێتیان خراپترین کەسیان کردۆتە پێغەمبەر تەنیا بۆ ئەوەی وێنەیەکی ناشیرین بدەن بە دەسەلاتداران.

من کە ئەو کتێبەی غەزەلنوس کەوتە بەردەستم دڵنیابووم ئەم کتێبە بۆیە دەنوسێت تا ئەم سەردەمە ناشیرینبکات. ویژدان لای ئەوان ئەوەیە هەرشتێک شاعیرانە نەبێت وەک تاوان تەماشایبکەن. خولیای ئەو بۆ مردووەکان، خولیایەتی بۆ ئەوەی ئەم سەردەمەمان خۆشنەوێت و نەفرەتی لێبکەین... شاعیران هەموو نەفرەت لەسەردەمی خۆیان دەکەن... هەموو شاعیرە گەورەکانی دونیا تفیان لەو ساتە کردوە کە تیا ژیاون، تەنیا شاعیرە بچوک و بودەڵەکان عاقڵانە لەسەر کورسی حیکمەت دانیشتوون و گووتوویانە «ئەڵا، ئەمە چ سەردەمێکی خۆشە... چ دەوروعەیامێکی باشە بۆ من و بۆ خەڵک». مێژوو بگەڕێ، شاعیرێکی گەورە نابینیت وای گووتبێت، مەگەر لە ژێر باری ناچاریدا یان ڕۆحێکی پڕ نیفاقیان هەبووبێت شتی وەهایان نوسیبێت. دەزانن بۆ شاعیران هەمیشە دوای ئەو جۆرە ویژدانە دەکەون؟ دەزانن؟. لەبەرئەوەی شاعیران کە لە دایکدەبن دوو هەستی جیاوازیان تێدایە، یەکەم پێیانوایە، ئەمانە مەخلوقاتی ناوازەن و لەگەڵ لەدایکبوونیاندا سیحرێک و نهێنییەک دێتە دونیاوە، لایان وایە خودا ئەوانی تاککردۆتەوە و بەوێنەی مەخلوقاتی دی دروستی نەکردون. دیوەکەی تریشیان ئەوەیە کە شاعیران بەبێ ڕیزپەڕ و ناوازە واهەستدەکەن ئەوان سەروەری ڕاستەقینەی دونیان و باشترین جۆری مەخلوقاتن

و شایستەی ئەوەن لەسەر عەرشی ڕاستەقینەی ژیان دانیشن. بەڵێ، برادەران... ڕقی قووڵی شاعیران لەو کینە ئەزەلییەوە سەرچاوەی گرتووە، هەر ئەمەشە وادەکات پادشا و شالیار و دەسەڵاتدارانی دونیا کەیفیان بە شاعیران نەیەت. نە لەبەرئەوەی کە وشەی جوان دەنوسن، بەڵکو لەبەرئەوەی دەزانن کە شاعیران تەنیا کەسێکن بە ڕاستی لەسەر عەرشی ژیان ململانێیان لەگەڵ دەکەن، تاکە کەسێکن کاتێک لە دەرەوەی عەرشیشن واهەستدەکەن لەسەر عەرشن. من خۆم کێشەیەکی گەورەم لەگەڵ ئەو هەستە ترسناکەی شاعیراندا نەبوو، گەر بهاتبایە و زیاتر تێکەڵاوی ژیان ببن، من لەوانە دەترسم کە تێکەڵ نابن، کە تەنهان، کە تەنهان و بەهێزن، لە شوێنی خۆیان دادەنیشن و بێئەوەی ڕاستە وڕاست پێبخەنە ناو جیهانەوە شتەکان دەلەرزێنن، بەڵێ من لەوانە دەترسم... بەتایبەت کە ئاشکرا دەبێت هیچ هێزێک نییە لە خەڵوەتی خۆیان دەریانبهێنێت، کە ئاشکرادەبێت چەند لەو قسانە بێباکن کە لە دەرەوە بەرابەریان دەکرێت... بێباکی بەرابەر هەموو هێزە گەورەکان ئەوەیە وادەکات لە شاعیران بترسم.

ئێستا هەستدەکەم هێدی هێدی دەردێکی ترسناک لە گیانمدا دروستدەبێت، دەردێکی ڕەش. هەرچەند ئەو غەزەلانەم گوێ لێدەبێت و هەستدەبم حەزدەکەم وا لەو غەزەلنوسە بکەم هەست بە لاوازی بکات. حەزدەکەم برینداریبکەم... وابکەم ئازاربچێژێت. منیش خەونێکم هەیە و دەبێت خەباتی بۆبکەم... تێدەگەن؟ بەڵێ، ئەوە بەهانەی دڵی منە.

لە کۆتایی ئەیلولی دووهەزاروچواردا، چەند ڕۆژێک دوای بردنی کتێبی مردن. ڕۆژێک چوومەوە بۆ لای غەزەلنوس، سەردانێکی کتوپڕ و ناوەخت بوو، ئەو خاولییەشم لەگەڵ خۆمدا برد کە حیکایەتی شاعیر و پادشای لەسەربوو، من ئەو کات تەواو لە دۆخی ڕۆحی غەزەلنوس

تێدەگەیشتم، تا دەهات تریفە یابەحری پتر لێی دووردەکەوتەوە، بە مەزەنەی من ئەوە دۆخێکی دەرونی دژواری بۆ دروستکردبوو... زۆرم هەوڵدا بچمە بنج و بناوانی ئەو ناکۆکییەوە بەڵام هیچم دەستنەکەوت، هەندێک لەو پارچە کاغەزانەی جارجار تەرخونچی دەیهێنان مانا و نرخێکیان بۆ من نەبوو. بەڵام ئەو بارە دەرونییە دژوارەم بە هەل زانی و دیسان لە بەرگی ئاغای سەرفرازدا چوومەوە بۆ دیداری. دەبێت بڵێم، لەگەڵ هەموو ئەو وەسفە ورد و نەخشە پڕپێوەرانەی تەرخونچیشدا بۆماڵی غەزەلنوس، من لە هەر دوو سەردانەکەمدا جۆرە هەستێکی سەیرم هەبوو کە بە نەخشەکان وەسف ناکرێت. هەر دووجارەکە کاتێک پێمخستە ئەو ماڵە، هەستمکرد پێدەخەمە ناو دونیایەکی زۆر بەرین و زۆر دێرین و زۆر قووڵ. هەستێکی نامۆبوو، وەک ئەو هەستەی تووشی مرۆڤ دەبێت کاتێک دەچێتە ساڵۆنی بەرینی مزگەوتێکی دێرین یان کاتێک پێدەخاتە ژێر سەقفی کاتێدرائییەک یان کڵێسەیەکی گەورە کە زەنگەکانی بە هەموو هێزی خۆیان لێدەدەن. ماڵەکە شتێکی تێدابوو کە ڕایدەکێشایت، لەوپەڕی بێدەنگیشدا هەستت بە چرپەیەک دەکرد، چرپەیەکی زۆر نهێنی وەک ئەوەی شتێک ڕۆحت بدوێنێت. ماڵەکە وەها گەورەبوو مرۆڤ لە هەر جێگایەکدا بایە، هەستی بە جێگاکانی تر نەدەکرد، من هەر دوو جارەکە ئەو هەستەم تیا دروستبوو کە ژوورەکانی دیکەی ئەم ماڵە پڕ لە ڕۆحلەبەری خەوتوون، پڕ لە مەخلوقاتی ئاسوودەن کە وەک تیپێکی گەورەی یۆگاچییان دانیشتوون و لە ناخی خۆیاندا قووڵدەبنەوە.

غەزەلنوس بە نیگا هێمن و ڕوخسارە ڕۆمانتیکییە مەلعونەکەی خۆیەوە بەرامبەرم دانیشت، لە ڕێزی میواندا زۆر بەحورمەت و ئسوولزان بوو، گەرچی دڵنیابووم دڵی بەبینینی من ئاسوودە نییە، بەڵام چاوانی مەحەبەتێکی قووڵیان تێدابوو، کە پێموابوو

جۆرە ئەڤینێکی نهێنی ناو دڵە بۆ هەموو ئادەمیزادان، جۆرێک لە خۆشەویستی گشتییە بۆ مرۆڤ. هەرکەسێک بوویتایە و بتدیبایە، ئەو ئەڤینەت بەردەکەوت کە لە چاویدا بوو. من ئەو شەوە تەنیا بۆ ئەوەچووم کە ئەو خاولییەی پیشانبدەم...

بینینی ئەو خاولییە بە نەخشە ڕەنگینەکانییەوە تووشی پەشۆکانێکی کتوپڕی کرد. جاری پێشوو لە هیچ ئێستێک و وێستگەیەکدا ئاوها پرسەرەنج نەمدیبوو... فزولێکی قووڵ لە نیگاو دەستیدا بوو، جوڵەی پەنجەکانی پڕبوون لە پرسیار و سەرسامی. بە منی گووت «بۆ وەها چیرۆکێکم پیشاندەدەیت؟ ئەم چیرۆکە چ کاری بە منەوە هەیە؟».
من گووتم «غەزەلنوس، من دڵنیام ئەم خاولییە لە دەستکردنی خەیاڵی شاعیرێکە... شاعیرەکان هەمیشە لە بیری ئەوەدان بەسەر شاهەنشاکاندا زاڵبن... بۆیە دەمەوێت تۆ بیبینیت، تا بزانم تۆ چی لەم چیرۆکە تێدەگەیت؟ چیرۆکێکی سەیرە کە دەبێت شاعیران بیبینن. تۆ دەڵێیت چی؟».

بە هێمنییەوە سەیریکردم... من زۆر لەو هێمنییەی دەترسام.

ئێستێکیکرد و گووتی «نا شاعیران دەسەلاتیان لە جێگایەکدایە کە نە پادشاکان و نە مرۆڤەکانی تر پێیناگەن. من هەستناکەم شاعیری ناو ئەم چیرۆکە هیچی کردبێت بۆ ئەوەی پادشا ببەزێنێت... شتەکانی بەوچاوە بینیوە کە چاوی سروشتی خۆی بووە. شاعیران شتەکان بەو چەشنە دەبینن، چاوێکی تریان نییە تا بە چەشنێکی تر بڕوانن. لە ڕاستیدا شاعیر ناچێتە ناو هیچ شەڕێکەوە... ئەوە جیهانە لە شەڕێکی دۆنکیشۆتیدایە لەگەڵ شاعیردا. هەمیشە لە هەموو دەور و زەمانێکدا خەڵکێک هەن پێیانوایە دەتوانن پەلاماری ئەو زەوییە خەیاڵیانە بدەن کە لە ڕۆحی شاعیردایە... ئەو جەنگانەی بۆ گەیشتن و داگیرکردنی باغی ناو ڕۆحی شاعیرەکان کراوە، زۆرترە لەو جەنگانەی بۆ

داگیرکردنی وڵات و مەملەکەتە ڕاستەقینەکانی دونیا کراوە. هەموو هەوڵێک بۆ کوشتنی شاعیرەکان، لە ڕاستیدا هەوڵە بۆ داگیرکردن و سووتاندن و وێرانکردنی ئەو باغانەی ناو ڕۆحیان».

من گووتم«غەزەلنوس سەیرکە، کڕۆکی چیرۆکەکە ئەوەیە چ هێزێک لەم دووانە جاوید و نەمرن و تا هەتاهەتایە بەسەرووەری دەمێنێتەوە. ئەمە پرسیاری پادشاکان نییە، پادشاکان حەزیان بە بەراورد نییە... من دڵنیام کە کڕۆکی ئەم چیرۆکە شاعیرێک دروستیکردوە، بۆ ئەوەی سەرکەوتن و سەرفرازی شیعر بەسەر دەسەڵاتداراندا بنوسێتەوە ».

بە هەمان هێمنییەوە سەیرێکی وێنەکانی کردەوە، چەندجارێک خاولییەکەی ئەمدیوە و دیو کرد، بە نەرمی پەنجەی بەسەر نەخشەکاندا هێنا و گووتی« تەفسیری تۆ بۆ ئەم چیرۆکە، هەڵەیە... لە بنەڕەتدا ئەوەی حیکایەتەکەی داڕشتووە پادشاکانن، دڵنیام ئەوەی لە کۆتاییدا کوژراوە شاعیرەکەیە، گەر ورد لە خاولییەکە بڕوانیت خۆی هەموو شتێکت پێدەڵێت، هەموو شتێک. بڕوانە، بابەتی گرەوەکە ئەوەیە کێ بە جوانترین شێوە وەسفی شار بکات، وانییە؟ ئەوەی لێرەدا وەسفی شاردەکات، پادشایە... بە پێچەوانەی ئەو تەفسیرەی تۆوە، شاعیری ئەم چیرۆکە بێئەوەی بیر لە ژیان و مردن بکاتەوە، بەپێی ئەو یاسایانە یاریکردوە کە خۆی دەیەوێت، شاعیر کەسێک نییە بتوانێت وەسفی شارە ڕاستەقینەکان بکات، ئەم دیمەنانەی لەسەر ئەمدیوەی خاولییەکەیە وەسفی شار ناکەن، بەڵکو شارێکی دیکەیان دروستکردوە، شارێکی خەیاڵی بڕوانە، ئەو شارەی شاعیر باسیدەکات، هەمان ئەو شارە نییە. شاعیر بە تەواوەتی وەسفی شاری بۆ پادشا جێهێشتووە، بێئەوەی بیربکاتەوە یان دوودڵ بێت لەوەی بەمکارە مردنی هەڵبژاردوە، ئەوە ئەخلاقی شاعیرانە کە بێ دوودڵی مردن هەڵدەبژێرن... ئەوەی لە کۆتایی ئەم چیرۆکەدا

دەکوژرێت شاعیرەکەیە، چونکە لە بنەڕەتدا ناچێتە ناو گرەوەکەوە، ناچێتە ناو یارییەکەوە... شاعیر دواجار تەنیا بەو یاسایانە یاریدەکات کە لەسەری خۆیایەتی».

بەسەرسامییەوە پرسیم «بە بۆچوونی تۆ بۆ وای کردوە، بۆ مردنی هەڵبژاردوە؟... بۆ ئەوەی پادشا بژی؟»

پێکەنی و گووتی «نەمبیستوە تا ئێستا شاعیران لە پێناوی پادشاکاندا بمرن... ژیانی پادشا لای شاعیران نرخی ژیانی خونچەیەکی نییە. نا... بیر لەم ساتە بکەرەوە. یەکێک هەیە لەم چیرۆکەدا دەیەوێت شاعیرییەتی شاعیر تاقیبکاتەوە... یەکێک کە تێناگات شاعیران لە ناو هەمان ئەو شارەدا ناژین کە پادشاکان تیادەژین. گەر ڕای منت بەلاوە گرنگە، لە بنەڕەتدا ئەو پرسیارە تەڵەیەکی گەورە و کوشندەیە و بۆ شاعیر دانراوە، پادشاهی گەنج ویستویێتی لەزەتی پادشایەتی بچێژێت و ڕەنجی شاعیریی فڕێبدات... تاقیکردنەوەکە لە بنەوەڕا بێداد و نادروستە... چونکە شاعیران ناتوانن وەسفی جوانی شارە ڕاستەقینەکان بکەن... پتر دەتوانن وەسفی خەراباتی بکەن».

تەفسیری غەزەلنوس بۆ ئەو حیکایەتە بەنجیکردم... بە پێچەوانەی پلانی خۆمەوە کە دەمویست پتر بدوێم، هەستمکرد پێویستیم بە بێدەنگی و بیرکردنەوەیە، بێئەوەی قسەیەکی زۆربکەم، یان ناڕازیبوونێکی ئەوتۆ دەرخەم، خاولییەکەم پێچایەوە و بە ئومێدی دیداری داهاتوو لە ماڵی غەزەلنوس هاتمەدەرێ. وەک دیلێک لە نیوەشەودا ئازادیبکەن نەمدەزانی بۆ کوێ بچم... شەوێک بوو لەو شەوە کەمانەی ژیانم کە بە جۆرێکی ترسناک خۆم بە کۆیلەی غەزەلنوس دەزانی... شەوێک بوو لەو شەوە دەگمەنانەی لە یادمکرد من بارۆنم و هەوای ئەو شاعیرە خەوتوو و مردووەی ناو ڕۆحم دەبیردم.

# نیشتەجێبوون لە ماڵی غەزەلنوس
# ماجەلانی ڕاستەقینە

مرۆڤی پڕ خۆشەویستی کەسێکە کە سەیری چاویت کرد، دەزانێت بیر لە چارەنوسی تۆ دەکاتەوە. من لەسەفەرە دوورودرێژەکانمدا لەسەر زەوی، ئەو جۆرە چاوانەم بینیبوو... چاوانی تریفە یابەحریش لەو جۆرەبوو.

کە یەکەمجار تریفەم بینی، وەها پڕ لە سۆزی فریشتە بوو، غەمخۆری بۆ هەموو شتێک لە چاوانی دەباری. من بەوردی ژیانی ئاوارەیی خۆمم بۆ باسکرد، ونبوونم لەسەر شەقامە بێکۆتاکانی جیهان، نامەکانی باران شوکور و پەیوەندیم بە ئەفسانەوە، ئەو وەک خوشکێک دەستی دەخستە سەر دەستم و دەیگووت «چاوبنوقێنە و لە دڵەوە دۆعا بۆ باران بکە و ئومێدی ئەوە بخوازە ئێستا لە هەر جێگایەکە ئاسوودەبێت... بە ئومێدی ئەوە بژی کە زیندووە و دەیدۆزینەوە». ئەویش زۆر وردەکاری ژیانی خۆی بۆ باسکردم، بەڵام هەستمدەکرد زۆر ناسک و لاواز و بێپەنگە. دەترسام لە کاتی قسەکاندا بێهۆش بێت، یان هەوا بیبات، بەڵام وشەکانی وەها سادە و فێنکی بەخشبوون، هەموو ئازار و پەژارەیەکیان دەبرد.

لەو ماوەیەدا ئەفسانەش ڕۆژانە دەهات بۆ لام، چەندجارێک پێکەوە چووین بۆ ماڵی هاوڕێیەکی خۆی و لەوێ پێکەوە خەوتین. هەموو خەوتنێکی ئەو ژنە جۆرە گەشتێکی ڕۆحی بوو بۆ من. من لەوەوە فێربووم ژنی ڕاستەقینە ئافرەتێکە، هەرجارێک لەگەڵیدا دەخەویت، وەک ئەوە وایە هەرزەکارێک بیت و یەکەمین جارت بێت لەگەڵ ژنێکدا بخەویت. لەشی ئەفسانە لەشێکی ئاسایی نەبوو بەڵکو گرتنی هەموو ئەو شتە خەیاڵی و سیحری و نادیارانەبوو کە من لە منداڵیمەوە بۆیان

دەگەڕام، ئەو فێریکردم کە خەوتن لەگەڵ ئافرەتدا، سەفەرێکی چ درێژ و بێوێنەیە. هەموو خەوتنێک لەگەڵیدا وەک سەفەروابوو بۆ شارێکی خەیاڵی، وەک دۆزینەوەی کیشوەرێکی نوێ وابوو. وەک ئەوە بوو من هەموو ژیانم سەفەرمکردبێت و بۆ ئەم شارە گەڕابێتم کە لە لەشی ئەم ژنە و لە جوگرافیا نهێنییەکانی ئەودا خەوتووە. بەدرێژایی ژیانم چووبێتمە سەر هەر ئاوێک، هەر زەریایەک، هەر ترۆپکێکی بەرز، لە هەر شارێکدا گیرسابێتمەوە، لەگەڵ هەر ژنێکدا خەوتبم، هەمیشە هەستم بە پوچی و بۆشی و بێهودەیی کردوە، ئەوە یەکەمجار بوو لە ژیانمدا هەستبکەم ڕۆحێکی ڕاستەقینە دێتە دەستم و دەیگرم. من کە هاتمە ناو دونیای غەزەلنوس و هاوڕێکانییەوە، تێگەیشتم ئەم شارە لە ناوەوە لە نێوان خەیاڵ و حەقیقەتدا بەجۆرێکی کوشندە دابەشبووە، لەو ساتەدا کە هەستم بەو ڕاستییە ترسناکە دەکرد، لەهەمان ساتدا دەرکم بەوە کرد لەشی ئەفسانە، ژنێتییە قووڵ و بێبنەکەی، چرپە ئەفسوناوی و دەنگە کەمێک نوساوەکەی، تاکە شتێکن دەکەونە دەرەوەی ئەو شەڕە ئەزەلییەی ڕاستی و خەیاڵەوە. ئەو لەزەتەی ئەفسانە دەیبەخشی بە من، جیاوازبوو لەو لەزەتە ڕووت و ڕاستەقینەیەی بە درێژایی تەمەنم لە لەشی ئافرەتانی تر چەشتبووم... ئافرەتانی دی تەنیا لەزەتیان دەدامێ، لەزەت بەوجۆرەی ئێمەی پیاو تێیدەگەین، لە کاتێکدا من ئافرەت دوای ئافرەت بۆ شتێکی باسنەکراو و وەسفنەکراو دەگەڕام. لەشی ئەفسانە پرد بوو، پردێکی ئەزەلی بوو، نە لە بەری ڕاستیدا بوو و نە لە بەری خەیاڵ، بەڵکو بۆ ئەزەل لە نێوانیاندا هەڵواسرابوو. پێدەچوو من هەموو ژیانم بۆ ئەو پردە گەڕابم، پردێک لە نێوان ئەمبەرە و بەری دوو دونیادا وەستا بێت، پردێک ڕێگامبدات لەسەری بژیم، نەبمبات بۆ دونیای ڕاستەقینە و نە دوورم بخاتەوە تا ناو بەحری خەیاڵ. من کوڕی سەر ئەو پردەبووم... ئەفسانە ئەو هەلەی دامێ کە تا دونیا دونیایە

لەویادا بوەستم و بیکەم بەماڵی خۆم.

من ئەو ماوەیەی لە ماڵی غەزەلنوس بووم، سەرەنجی عەشقی نێوان تریفە و ئەومدا... ئای چ عەشقێکی نەبینراو و نەبیستراو و کوشندەبوو.

قسەیەکی سادەیە، بەڵام دروست و ڕاستە گەر بڵێم، دووجۆر عەشق هەیە یەکێکیان مرۆڤ دەخاتە دۆزەخەوە و ئەوی دیان مرۆڤ دەخاتە بەهەشتەوە. غەزەلنوس و تریفە یابەحریش ڕایان وابوو، عەشق دەبێت بمانسووتێنێت تا تێیبگەین. سەیربوو لەلام کە بینیم، ئەو دوو مەخلوقە ناسکە، خۆشەویستی یەک بە ونبوون و فیراقێکی هەمیشەییەوە گرێدەدەن. باوەڕیان بەوە نەبوو یەکدی بدۆزنەوە، باوەڕیان بەوە بوو تا مردن بۆ یەکدی بسووتێن و بۆ یەکدی بگەڕێن. ئێوارەیەک دوای ئەوەی غەزەلنوس شتێکی زۆری لەسەر تێڕوانینی خۆی دەربارەی خۆشەویستی گووت، من بەوەحی ئەو هەموو سیحرەی ئەفسانە دەیدامێ، بە غەزەلنوسم گووت «من ناتوانم وەکو تۆ عاشق بم، من وەک خۆت دەڵێیت عەقڵێکی فەرەنگیم هەیە. عەشق خەیاڵی ڕووت نییە... عەشق گۆڕینی یار نییە بۆ وەهمێک کە ناگیرێت... غەزەلنوسی برام، تۆ بە ناهەق دۆزەخێکت بۆ خۆت داخستووە. هیچ شتێکی دی نییە ئەی برام وەک تێکەڵاوبوونی لەش، نێر و مێ لەسەر یەک سفرە کۆبکاتەوە. عەشق هەڵمژینی لێوی یارە تا ڕادەی خوێن تێزان، دەستدانە لە هەموو بستێکی جەستەی، دۆزینەوەی لەشێتی هەموو شەوێک، ماچکردنی هەموو تکەیەک عارەقێتی... غەزەلنوس، تۆ دەبێت لە لەشی یار تێبگەیت ئەوسا دەزانی ڕۆحی چییە. سۆفییەکان تەنیا وەهمی ناو خەیاڵەکانی خۆیان خۆشدەوێت... عاشقی تەواو نە هێند لە حەقیقەتی یاردا نوقمدەبێت خەیاڵی نەبینێت، نە هێند لە خەیاڵیشیدا دوور دەڕوات بۆی نەدۆزرێتەوە... من واتێدەگەم... عەشقی ڕاستەقینە نە دۆزینەوەیە بە تەنیا و نە گەڕانە بە تەنیا. دۆزینەوەیە و گەڕانە... دۆزینەوەیە و گەڕان».

من جار دوای جار لەگەڵ ئەفسانەدا دەخەوتم و هەر جارەی لەشێکی هەبوو، ئەفسانە هێندە دەگۆڕا، هێندە ڕەنگاوڕەنگ بوو، درەختێک بوو هەرجارێک دەستم بۆ میوەکەی دەبرد تامێکی دەدا. ئەوەی دەست بۆ لەشی یار نەبات تێناگات کە یار دەتوانێت بە تەنیا هەموو جیهان بێت. یاری ڕاستەقینە هیچ شەو لەوی دیکەی ناچێت، وەک درەختێک هیچ دەنکە میوەیەکی تامی دەنکەکەی دیکەی نەدات. پێمگووت «غەزەلنوس، تۆ کابرایەکی سەیریت، من بە سوار ماتۆڕەکەم دونیام تەیکردوە و مەخلوقی وەک تۆم نەبینیوە. نمونەی وەک تۆ لە لێواری هیچ بەحرێک و لە کونجی هیچ جەنگەڵێکدا نەماوە، کابرا تۆ چی دەکەیت؟ خۆشەویستی ئەوەیە لە میوەی درەختەکە بخۆیت... ئەوەیە بهێڵیت یار لەشی خۆیت بە هەزار ڕەنگ پێشکەشبکات، تۆش بتوانیت لەشی خۆت بە هەزار ڕەنگ پێشکەشی ئەو بکەیت... ئەوەیە خۆشەویستی». من ئەفسانە بە هەزار ڕەنگ لەشی خۆی پێشکەشدەکردم.... لەشی ئەفسانە بۆ من وەک ماڵی ڕۆحی هەموو بوونەوەران وابوو... وەک جوانی هەموو ئەو شارانە وابوو کە بینیومە... بەرین بوو وەک بەرینی ئەو دەریایانەی لە ڕۆخیاندا پیاسەمکردبوو... لەشی ئەو ژنە وایکرد، بیر لەوە بکەمەوە تا هەتاهەتایە لەم شارەدا نیشتەجێبم. نا ئەم شارە نیشتیمانی من نەبوو، بەڵکو لەشی ژنی خائینی خاوەن ئوتێلەکە نیشتمانم بوو.

دەکرا هەموو ڕۆژێک من و غەزەلنوس و تریفە لە بەرچاییەوە تا شەو چەندین جار لەسەر عەشق قسەبکەین. بەڵام تەنیا پێنج ڕۆژ بوو لەلای غەزەلنوس بووم کە کتێبێکی گەورە و پڕ نهێنی لە ماڵی ئەوان دزرا. من ئەو کتێبەم نەبینی بوو، وەک دەیانگووت یەکێک بووە لە کتێبە گەورەکانی ئەو شارە. دزینی ئەو کتێبە زۆر شتی لە ڕۆحی غەزەلنوس و تریفەدا گۆڕی. تا ئەو کاتە ئەو کتێبە پردی گەورەی نێوانیان بوو، ونبوونی کتێبەکە تەلیسمێکی گەورەبوو. تریفە دوای دزینی کتێبەکە

بەجۆرێکی سەیر پەشۆکا، هەستیدەکرد کۆمەڵێک جانەوەری خەیاڵی بەڕاستی پەلاماریدەدەن و دەیخۆن، دەیگووت ناتوانێت بخەوێت، لە خەودا هەستی بە لمۆز و قەپ و کەڵبەی ئەو جانەوەرانە دەکرد. زۆرجار کە دەمدوان ئەو ترسە بەڕوونی لە سیماو روویدا بوو، دڵنیابوو یەکێک چاوەدێریدەکات، دڵنیابوو یەکێک هەیە دەیەوێت لەساتێکی غافڵیدا قەپی پیابکات. زۆرجار بە منی دەگووت «ماڵی غەزەلنوس، شوێنێکی ئەمین نییە، بڕۆ، بڕۆ لێرە». دوای دزینی کتێبەکە هەستمکرد غەزەلنوسیش ئارامی و هێمنی جارانی نەماوە، زۆرجار تووشی پەشۆکانێکی لە ناکاو دەهات، هەموو هەستیاندەکرد شتێک ڕاویاندەنێت. من سەرەتا وەک هەموو میوانێکی شەرمن، پێموابوو هۆی ترسەکەیان بوونی منە لەو ماڵەدا، بەڵام هێوریانکردمەوە و گووتیان ترسەکان لەوە گەورەتر و نهێنیتر و تاریکترن بە منەوە گرێبدرێن. لەو دەمەدا منیش تووشی هەمان ترس هاتم و هەمان دەردمگرت، شتێک لە فەزای ماڵی غەزەلنوسدا دروستبوو کە پێشوەخت بۆنی کارەساتی بڵاودەکردەوە. ڕۆژێک ئەو دەفتەردارانەم بینی کە زۆربەی ناوەڕۆکی ئەو کتێبە ئەوان نوسیبوویان و کۆیانکردبووەوە، حەوت کەسی فریشتەڕوو بوون کە بەجۆرێکی سەیر لە یەک دەچوون. بە جۆرێک غەمگینبوون وەک ئەوەی یەکێک هەموو مێژووی ژیانی دزیبێتن، نازانم بۆ لەگەڵ بینینی ئەواندا ئەو هەستەم لا دروستبوو کە ئەو دەفتەردارانە زیندوونین. من ئەوەتەی هاتبوومەوە ئەم شارە خەڵکم دەبینی بە مردوو دەچوون، ڕوخسارییان وەک تارماییەکان سپی بوو، ئەوانیش وەهابوون سپی و باریک و بێدەنگ. ڕۆژێک پێکڕا لەدەوری مێزی خاڵی ئەو کتێبە دانیشتن و منیشیان داوەتکرد. ئەو ڕۆژە تریفە گووتی چیتر لەو کتێبەدا ئیشناکاتەوە و خۆی بۆ چنینی فەرش تەرخاندەکات. ئەو قسانەی تریفە یابەحری هەرایەکی گەورەی نایەوە، من نەمدەزانی سەیری کامیان بکەم، دەفتەردارەکان بە بێدەنگی دەگریان،

حەسەن تۆفان گووتی «دەتوانین سەر لەنوێ دەست پێبکەینەوە». ماجیدی گوڵ سۆلاف دەستیکردە ملی تریفە و گووتی «من هەمووشتێک دەنوسمەوە، شەو و ڕۆژ ناخەوم و هەموو چیرۆکەکان جارێکی تر دەنوسمەوە، بە خەتێکی لەوی دی جوانتر». غەزەلنوس گووتی «سوودی نییە... ئەوەی کتێبەکەی دزیوە جارێکی تریش دەیدزێتەوە، دەبێت بۆ کتێبەکە بگەڕێین». حەسەن تۆفان گووتی «کوێ بگەڕێین؟ ئێمە هیچ زانیارییەکمان لەبەر دەستدا نییە... ». تریفە لە هەمووان نائومێدتر دەگریا و دەیگووت «ئەوە ئیشی چەند ساڵە، بە ئاسانی نانوسرێتەوە. بەچی دەنوسرێتەوە، چۆن دەنوسرێتەوە؟». دواجار ماجید هەڵدەستا و دەیگووت «ئێمە بەردەوامدەبین، وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت، هیچ شتێک نەبووبێت، ئێمە لەسەر بابەتێک ئیشدەکەین سەرەتا و کۆتایی نییە، وانییە غەزەلنوس؟ ئێمە حیکایەتی ئازارێکی ناکۆتا دەنوسینەوە... ئەو ئازارە هەمیشە هەیە... من دەتوانم بە تەنیا لەگەڵ دەفتەرداروەکاندا ئیشبکەم... دەتوانم». غەزەلنوس گووتی «من دڵنیام بە دوامانەوەن... بە دوامانەوەن، بەڵام نازانم کێن و نازانم بۆ؟». حەسەن تۆفان گووتی «غەزەلنوس بارۆنەکانن، ئەوانن، بە دوامانەوەن... لە مێژە بەدوامانەوەن، ئەوانن». ئەو قسانە لە هەناوی مندا زرنگەیەکی ترسناکیان هەبوو، دیمەنی هەموو ئەو شەوەم هاتەوە یاد کە لە ئوتێلەکەدا ویستیان بمرفێنن، موچرکەیەکی سارد بە لەشمدا ڕابورد و بە هەستێکی قووڵی نائارامییەوە وەک ئەوەی تاسەر ئێسقان گوناهباربم سەیری هەموویانم کرد. لە مێژبوو ژیانی من دەنگەدەنگی وەها زۆری تێدا نەبوو، بەڵام پێموابوو قەدەر منی فڕێداوەتە ناو سەیرترین پنتی ئەم وڵاتەوە، بۆ ناو ناوازەترین و ڕیزپەڕترین کەسانی ئەم شارە، خەڵکانێک لە ئازارەکانیاندا تەراکەوتە و لە خەونەکانیاندا بێوێنەبوون. دوای هەرا و گریە و دەست لەملانێیەکی زۆر بڕیاریاندا ماوەیەک پشوویدەن و بە

هێمنی بیربکەنەوە و بزانن چی ڕوودەدات...

ڕۆژێک دواتر حەسەن تۆفان هات و بە دەنگێکی قرخ و ڕۆحێکی سافەوە گووتی «ماجەلانی ڕاستەقینە، ئەمشەو من و شبر پێکەوە ئاشنایەکی تۆ دەبینین»... بێئەوەی هیچی تر بڵێت بە غەمەوە سەیریکردم و گووتی «غەم وەکو خەیاڵ شتێکە بە دوامانەوەیە».

بە بێدەنگی سەیرمکرد و هیچم نەگووت... بەڵام ڕۆژانی دواتر بە ڕوونی تێگەیشتم حەسەن تۆفان مەبەستی چی بوو.

## کە بارۆنی خەیاڵم بینییەوە بەرەو شێتبوون دەڕۆیشت

کە تیشکان تاهیرم بینییەوە، ڕاستەوڕاست ئەو دیمەنەی نێوان جێسیکە لانگ و جاک نیکلسنم هاتەوە یاد لە فلیمی «پۆستەبەر دووجار لە زەنگ دەدات». ئەو دیمەنەی جاک نیکلسن بۆ یەکەمجار پەلاماری جێسیکە لانگ دەدات کە ژنی جوانی کابرایەکی یۆنانی پیرە، لەسەر مێزی چێشتخانەکە پاڵیدەخات، جێسیکە لانگ لە پێشدا وادەردەکەوێت وەک ئەوەی بەرگری لە خۆی دەکات، بەڵام لەو جۆرە بەرگریانەی پڕن لە بانگهێشت و داوای نهێنی، ئینجا دیمەنەکە بەوە تەواودەبێت، جاک نیکلسن دەستی دەخاتە سەر شوێنێکی زۆر گرنگی جێسیکە لانگ، ئینجا شتەکان لە شەڕی نێوان ژن و پیاوێکەوە هێدی هێدی دەگۆڕێن و وەک دیمەنی گەرمی نێوان نێر و مێیەکیان لێدێت. من چەند جار تیشکان تاهیرم دەبینی ئەو دیمەنەم دەکەوتەوە خەیاڵ، هەتا دواجار کە من لە دۆخێکی دژوار و خراپدا بووم و ژیانم لەسەر پەتێکی باریک یاریدەکرد، کە ئەوم بینی دیسان ئەو دیمەنەم هاتەوە یاد، دیمەنی جێسیکە لانگ و جاک نیکلسن لەسەر مێزی چێشتخانەکە... من ئەو فلیمەم چەندین جار

دیبوو، زۆرجار تەنیا لە بەر ئەو دیمەنە تەماشامدەکردەوە، لەو باوەڕەدا نەبووم لەم شارەدا کچێکی وەک جێسیکە لانگ هەبێت. درۆ ناکەم گەر بڵێم ئەو خانمی خەونەکانم بوو، لە سەفەری سەر کەشتییەکەمدا زۆربەی وەخت کە دەچوومە شارێکەوە بۆ ژنێکی وەک ئەو دەگەڕام. من دەستم لەوە شتبوو لەم شارەدا کچێکی وەک جێسیکە لانگ بدۆزمەوە، لە ڕاستیدا ڕوخسار و نیگار و شێوەی خۆگۆڕین و قسەکردنی کچی ئەم شارە نەخۆشیان دەخستم. ئەو ڕۆژەی کە تیشکانم تیا بینییەوە، خۆم وەها ڕێکپۆش و پاک ڕوخسار گۆڕیبوو، لە جۆنی دێپ دەچووم لە سەرەتاکانی گەنجیدا، کە خۆم لە ئاوێنەدا سەیردەکرد، ڕوخسارم لە ڕوخساری ئەو دەچوو لە فلیمی «کرای بەیبی» دا، ساڵی ۱۹۹۰ دەمێک ئەو زۆر لاو و یاخی بوو، تازە پێیخستبووە سەر پلەکانەی ناوبانگ و بە ئەفسانەی وەک «جەیمس دین» و «مارلۆن براندۆ» بەراوردیاندەکرد. ئەو ئێوارەیە لە ماڵی بارۆنی مەدەنی، کاتێک لە گێڕانەوەی حیکایەتێکی منداڵانە بوومەوە لەسەر مشکێکی هار کە ناوی قرتیلەیە، لەسەرەخۆ لای سێوانی خرپن و چکۆلانە هاتمەدەرێ، هێشتا خەیاڵم لای ئەو مشکە هاروهاجە بوو کە تیشکانم بە بەرگێکی ئێجگار جوانەوە لە بەر دەرگای هۆڵەکەدا بینی. دڵنیابووم لەڕێی من وەستاوە، بەڵام خۆی نەزان نیشاندا و وایکرد شتەکان وادەرکەون کە ڕێکەوتە، بە دەنگێکی ناسک و خۆش گوتی «وای کوڕی باش، ئەوە تۆ لێرەیت... وەی ئەم هەموو شیاکەتە چییە؟ کوڕی باش». لەبەرئەوەی پێدەچوو لە دەرەوەی کوردستان گەورەبووبێت، کوڕی باشەکە بە جۆرێکی تر لە زاری دەهاتەدەرێ وەک «کووری باش». ئەوە هێندەی تر ناسکیکردبووەوە، کە گوێت لێیدەبوو بۆی دەمردیت، من کە دەمبیست ئاوها قسەم لەگەڵدا دەکات وەختەبوو ڕۆحم بۆی دەردەچوو. بێئەوەی ویقار و کەمتەرخەمی خۆم لکەداربکەم گوتم « خانم ئەم کاتەتان باش، چەند سەیرە لێرە دەتانبینم، وامدەزانی ئێوە لە دەرەوەی

نوێمیران دەژین». گووتی «نا من لێرەم لە ماڵی بارۆنی مەدەنیم، بەڵام من ئێواران خوێندنم هەیە، بۆیە تۆ نامبینیت». بە ئەسپایی دەستیگرتم و گووتی «مەترسە کەس لەماڵ نییە، وەرە لە گەڵمدا». لەگەڵماکەی وەها گووت کوڕ نەبوو بتوانێت خۆی بگرێت و دوای نەکەوێت. ئەمڕۆ جوانتر و سیحراویتر بوو لە ئاهەنگەکە. لە ئاهەنگەکە هێند مکیاجیکردبوو جوانی ڕاستەقینەی خۆی ونبووبوو، بەڵام ئەمڕۆ جوانی وەها دیاربوو، ڕەنگی پێستی، ناسکی لێوی، تەڕی ناو گلێنەی، کاڵی چاوی، هەمووشی تێکڕا پێکەوە... ئەژنۆی ئادەمیان دەشکاند. منی بردە ناو مەتبەخی کۆشکەکەی بارۆنەوە. تەنورەیەکی سپی لەبەردابوو، تیشێرتێکی مۆری ناسکی یەخە سپی. کە هەردووکیان وەها لەگەڵ باریکی کەمەریدا چەسپبووبوون وایان لە مرۆڤ دەکرد بیر لە جەبر و تەکامول و ئەندازەی ئیلاهی بکاتەوە. من لە سەر کورسییەکی مەتبەخەکە دانیشتم، بە هێمنی قوتویەکی کۆلای ساردی خستە بەردەستم و گووتی «کووری باش، هەر کە تۆ ئەرۆی، سێوان هەموو چیرۆکەکانم بۆ دەگێڕێتەوە... زۆر حەزم لە حیکایەتی قرتیلەیە کە لەگەڵ فرتیلە و مرتیلەی برایدا لە مزگەوتێکی کۆندا بە خواردنی کتێبی کۆن خوێنیان ژەهراوی دەبێ، وەلا حیکایەتێکی خۆشبوو... کووری باش، ئەی نازانیت حیکایەت بۆ کەسێک لە عومری مندا بکەیت... بۆ کچێکی گەنج، وەها خەوی لێبکەوێ». قسەکانی وەها عەیارانە بوو، قومی کۆلا ساردەکە پەڕییە قورگم. گووتم «چۆن، کچی باش، من لە ئەسڵدا ئیشم گێڕانەوەی چیرۆکە بۆ گەورەکان، بەڵام ئێستا جگە لە منداڵان کەس نایەوێت گوێ لە چیرۆکەکانم بگرێت، لەبەرئەوە ناچارم بەمجۆرە بژیم». گووتی «یەعنی حیکایەتت بۆ کچی وەکو منیش کردوە؟». گووتم «نا تیشکان خان، نا... خۆت دەزانیت، ئەم شارە و داب و نەریتی خەڵک و ئەم شتانە ڕێگا نادەن، بەڵام گەر یەکێک حەزبکات، دەتوانم حیکایەتی بۆ بکەم». بە پێکەنینێکی ناسک

و سیحراوییەوە، دەستی بە قژیدا هێنا « قژی زەردبوو، زێڕین بوو، کورتبوو، دەبریسکایەوە» گووتی «وەلا کورری باش، حەزدەکەم حیکایەتی وام بۆ بکەیت». تا ئەو شوێنە من بەهەموو شتێک زۆر دڵخۆشبووم، کە سەیرمدەکرد کت و مت جێسیکە لانگ بوو، بە گۆشت و خوێنەوە هاتبووە بەردەستم. تا ئەو شوێنەی کچێک دەناسیت هەموو شتەکان خۆش و قەشەنگە، بەڵام کێشەکە دواتر دەست پێدەکات کە مرۆڤ دەپرسێت «ئەی دواتر چی؟ ئەی شتەکان چۆن دەڕۆن؟». ئەوەی وایدەکرد من نەمەوێت زۆر لە کچان نزیکببمەوە بەشێکی ئەوەبوو، لەگەڵ کچاندا هەمیشە دەبێت بگەیتە شوێنێک، منیش نەمدەویست بگەمە هیچ شوێنێک، خۆشترین جۆری پەیوەندی لەلام پەیوەندیبوو لەگەڵ مردواندا. چونکە مردووەکان داوای هیچت لێناکەن، دەبنە برادەرێکی بێدەنگت و تەواو. ژنان مەخلوقاتی زۆر قەشەنگن، بەڵام خراپترین سیفەتیان ئەوەیە بەردەوام داوای شتێکت لێدەکەن، خۆیان بە خاوەنی ئەو هەقە دەزانن بەردەوام داوابکەن، ئەو کاتەش کە داواناکەن، لە هەموو کات خراپترە، چونکە بەردەوام بیرتدەخەنەوە کە داوا ناکەن. دیارە من هەرگیز نەمدەوێرا شتی وا لە بەردەم خانمی تریفە یابەحریدا بڵێم... کە دەیگووت «هەموو ئەو جانەوەرانەش کە لە خەیاڵمدا دوامدەکەون و دەیانەوێت بمخۆن نێرن». من ئەم زانیارییەم لە شیتەڵکردن و وردکردنەوەی سەدان فلیمەوە بەدەستهێنابوو... لەوەش بگوزەرێین ناخۆشترین شتی پەیوەندی لەگەڵ کچاندا ئەوەیە کە دەبێت پلەپلە بۆی سەرکەویت، هەموو پلەیەکیش بیرکردنەوەی زۆری دەوێت، حیساباتی دەوێت، نەخشەو پلانی دەوێت، ترس و دڵەلەرزێی دەوێت. بەڵام من حەزم لەو پەیوەندیانە بوو کە هەر لەگەڵ دەستپێکردنیدا دەکەویتە سەر ڕاستەڕێ و هەر لە سەرەتاوە هەموو شتێکی دیارە... شتی وەهاش لەگەڵ کچی ئەم شارەدا نەکردەبوو. بەڵام بۆ خانمی جێسیکە لانگ هەموو شتێکم دەکرد، هەموو شتێک، مرۆڤ لە

ژیانیدا یەکجار کچێکی وەک جێسیکە لانگ دێتە بەردەمی، گەمژەیە گەر لە دەستی خۆی بدات. من گەرچی ناویم دەزانی، لێمپرسی « تائێستا نازانم ناوت چییە؟». گووتی «ناوم تیشکانە... لە بەغدا لەدایکبووم». لێمپرسی «خانم تۆ چی بارۆنی مەدەنیت؟». کەمێک سەری دانەواند و گووتی «هیچ، من ناسیاویانم...». وەک ئەوەی پرسیارەکە پەشۆکاندبێتی گووتی «من لێرە لەگەڵ خوشکەزایەکی تری بارۆندا لە قاتی ژێرەوە دەژین... ». پاش کەمێک قسەوباسی ئاسایی، من کۆلاکەم خواردەوە و گووتم « بەداخەوە کاتێکی زۆر کەمم هەیە، دەبێت بڕۆم بۆ ماڵی بارۆنی گوللەوباروت، زۆر خۆشحاڵبووم کە یەکترمان ناسی، هیوادارم بتوانین یەک ببینینەوە». ئەو سەیریکردم و گووتی «ماجد من حەزدەکەم بێم بۆلات... تۆ لەچ گەرەکێک دەژی؟» کە ناوی منی دەهێنا، بەدستووری عەرەبان «ی» ـەکەی کەمێک قووتدەدا. من گووتم «ناترسیت بێیت بۆ لام حیکایەتێکت بۆبکەم، خەوت لێبکەوێت و بە خەوتوویی ماچتبکەم. تۆ بە جۆرێک جوانیت، هەستدەکەم بۆ وەزعی تەندروستیم خراپ بێت زۆر بتبینم». پێکەنی و بە ناسکییەکەوە کە پیاوی دەکوشت گووتی « ئا... دێم بۆ ئەوەی حیکایەتم بۆ بکەیت و خەوم لێبکەوێت... بەس تۆ کوڕری باشیت، ماچم ناکەیت...» تۆزێک وەستا و بە شەرمێکەوە گووتی «گەر خۆم بەخەبەر نەبم».

من ناونیشانی ماڵی خۆمم پێدا، کە ڕۆیشتم لەبەر پەنجەرەکەوە بە ئەسپایی ماچێکی هەوایی بۆ هەڵدام و بە دەستووری کیژانی زۆر هەرزەکار بای بایەکی لێکردم... من ئەو جۆرە خواحافیزییەم تەنیا لە فلیمدا بینیبوو. نازانم بۆ ئەو خواحافیزییە وەها دڵی خۆشکردم. کە لە ماڵی بارۆن هاتمەدەرێ، ئەو دڵخۆشییە کورت و کوتوپڕە ئەوەی بەیادا هێنامەوە، من پیاوێکی چەند غەمگینم... چ بەدبەختێکی گەورەم... چ نەگبەتێکم هەموو عومرم لەسەر ئەو چوار جادە پیسەی شار بە خۆڕا

تێپەڕیوە. پاڵمدا بە دیواری ماڵی یەکێک لە بارۆنەکانەوە و وەختبوو بگریم... ئاوڕم لە دواوەی خۆمدایەوە و ژیانم هیچی تیانەبوو، هیچ... ئەو بای بایە چکۆلانەیە بۆیە وەها دڵی خۆشکردم، چونکە ژیانم بۆشاییەکی گەورەبوو... ژیانی پیاوێک کە هەتا خواحافیزییەکی سادە دڵخۆشیدەکات... ئەوە بە جۆرێک غروری ڕوشاندم، هەستمکرد خەڵکی کە نامبینن و فەرامۆشمدەکەن لەسەر هەقن.

ئەو شەوە کە لە گێڕانەوەی هەموو چیرۆکەکان بوومەوە، ویستم بگەڕێمەوە بۆ ماڵێ. لە ڕێگادا بووم بەرەو دەرگای گەورەی نوێمیران، لە ناکاو ماشێنێکی ئێجگار جوان و گەورە لە بەردەممدا وەستا و گووتی «ماجیدی گوڵ سۆلاف سەرکەوە». لە ناو ماشێنەکەدا بارۆنی خەیاڵم بینی. سەرەتا ویستم سوار نەبم، بارۆن پێیداگرت و منیش ملمدا و بە ناچاری سوار ماشێنەکەی بارۆن بووم. بارۆن ئەو شەوە ڕوخسارێکی پەشۆکاوتری لە یەکەمجار هەبوو، کەمێک تورە دەهاتە بەرچاوم، وەک شتێک دەماری گرتبێت و گرژییەکی ناکاوی تووشبووبێت، بە خێرایی بە نوێمیراندا سوڕاندمییەوە و گووتی «گوڵ سۆلاف. تۆ مامۆستای چیرۆکی خەیاڵییت، نوێمێران چۆن دەبینیت... ئەوە مەراقێکی گەورەمە بزانم، تۆ نوێمیران چۆن دەبینیت؟»

من گووتم « بارۆنی خەیاڵ، خۆت دەزانیت، من کوڕی خێزانێکی هەژارم... نوێمیران بۆ من شوێنێکی جوانە... شوێنێکە وەکو خەون، بۆ کەسێکی نەدار و دەستکورتی وەکو من کە حەزێکی زۆرم لە ژیانی خۆش هەیە، نوێمیران خەوێکی دوورە کە نامەوێت زۆر بیری لێبکەمەوە».

ئێستێکی کرد و گووتی «بەڵام شوێنێکی خەیاڵی نییە، وانییە شوێنێکی خەیاڵی نییە؟». من بۆ ئەوەی خۆم لە بارۆن لادەم گووتم «کەوتۆتە سەر ئەوەی مرۆڤ چۆن پێناسەی خەیاڵ دەکات...ڕەنگە بۆ پیاوێکی

هەژار کە ناتوانێت کرێ خانووەکەی دابینبکات، شوێنێکی خەیاڵی بێت... پیاو چووزانێت؟». بەغەمێکەوە سەیریکردم و گووتی «دەزانم تۆ ڕاست ناکەیت، دەزانم. تۆ شوێنی خۆشترت بینیوە، تۆ جیهانی سەیر سەیر زۆر گەڕاویت... لە هەر شوێنەی چیرۆکێکت کۆکردۆتەوە». من سەیری بارۆنم کرد، بۆ ئەوەی بزانم ڕاستدەکات یان گاڵتەم پێدەکات. سێبەری جیدییەت و گاڵتەشم بە تێکەڵاوی لە ڕوخساریدا بینی. بۆ ئەوەی ترسی خۆم بشارمەوە بە هێمنی گووتم «جەنابی بارۆن ئەوەی زانیاری داوە بە تۆ بە هەڵەداچووە، من هەرگیز سەفەرم نەکردوە، لە هەموو ژیانمدا لەم شارە نەچوومەتە دەرێ، هەتا شار و شارۆچکە و گوندەکانی دەوروبەری ئەم شارەشم نەبینیوە. لە لەدایکبوونمەوە تا ئێستا هەر لە کوچە و کۆڵانەکانی ئێرەدا ئەمبەرەوبەر دەکەم، لە هەموو ژیانمدا تائێستا نەچووم بۆ سەیرانیش، سەیرانگاکانی دەوروبەریشیم نەبینیوە». دەستێکم بۆ شاخەکانی دەوروبەر ڕاکێشا و گووتم «بارۆن هەتا سەر ئەو لووتکانەشم نەبینیوە کە هەموو خەڵکی شار هەفتانە دەیبینن... لە کۆڕەوەکەشدا من هەر لێرە بووم، کاتێک تانک و زرێپۆشەکانی دەوڵەت هاتنەوەشار، من تاک و تەنیا بەشەقامەکاندا پیاسەمدەکرد».

هەستمکرد بارۆن کەمێک مەستە، بە خەیاڵەوە گووتی «ماجیدی گوڵ سۆلاف تۆ بەردەوام لەسەفەردایت، من دەزانم، من هەواڵم هەیە... من زۆرشت لەسەر تۆ دەزانم... بارۆنی بوکەشوشە وادەزانێت کە تۆ تەنیا حیکایەت بۆ منداڵە کوێرەکان دەکەیت، نازانێت کە تۆ گەشتێکی ڕاستەقینەیان پێدەکەیت... کەس ئەوە نازانێت من نەبێت».

کەمێک وەستام و گووتم «من گەشتی ڕاستەقینە بە کەس ناکەم، من دەتوانم تەنیا گەشتی خەیاڵیان پێبکەم... گەشتی خەیاڵی، لەڕاستیدا من هیچ ناکەم، تەنیا دڵی ئەو منداڵە کوێرانە خۆشدەکەم کە ناتوانن دونیای ڕۆشن ببینن، لەبەرئەوە یارمەتیاندەدەم دونیایەکی تر ببینن،

دونیایەک کە لە ناو خەیاڵی هەموومان‌دا خەوتووە».

بە دەنگێکی مەست پێکەنی و گووتی «بەڵام خۆت و منداڵە کوێرەکان بەڕاستی ئەو شارە خەیاڵیانە دەژین... من لەو منداڵە کوێرانەم پرسیوە، ئەوان هەموو شتێک دەبینن، وەک هەر ڕێبوارێک کە سەفەرێکی ڕاستەقینە دەکات، سوار کەشتییەکەت دەبن، هەست بە بۆنی درەخت و ئاو و ڕووبارەکان دەکەن، ئەو گوندە خەیاڵیانە دەناسن، بەو شارە گەورانەدا پیاسەدەکەن کە تۆ دەیانبەیت».

پاش تۆزێک ماشێنەکەی لە ڕۆخی شەقامێک وەستان و بە توندی دەستیگرتم «پێمبڵێ... ماجیدی گوڵ سۆلاف... تۆ چۆن خەڵک دەبەیت بۆ ناو ئەو نەخشەیە... من شێتی نەخشەم، لە منداڵییەوە نەخشەیەکی گەورە لەسەرمدایە. بەڵام نازانم چۆن دروستیبکەم... پێمبڵێ چۆن دروستیبکەم؟ من چەند ساڵە لەگەڵ سیاسییەکاندا ئیشدەکەم... ئێستاش لەگەڵ ئەندازیارەکاندا خەریکم... لە ئەنجومەنی شار یەکێکم لە بەرپرسەکانی دانانی ماستەرپلانێک بۆ ئەم شارە... من حەزم لە نەخشەیە، تێدەگەیت نەخشەی گەورە، نەخشەیەک هەموو ژیان لە ناو خۆیدا کۆبکاتەوە، نەخشەیەک هەموومان لە ناویدا بین، تێدەگەیت... نەخشەیەک وەک تۆزێک خۆت دروستیدەکەیت و خۆشت لە ناویدایت، وەک بینایەکی بەرز وەستاکانی هەمیشە لە ناوەوە کاردەکەن و ناتوانن بچنەدەرێ، ئەوە خەونی منە. ماجیدی گوڵ سۆلاف، نەخشە شتێکی بەشەرییە، بۆ یەک مرۆڤ نییە، تێدەگەیت، هەر مرۆڤێک بیری لە نەخشەکردەوە دەبێت بیر لە هەمووان بکاتەوە... من حەزم لە نەخشەیەکە هەموومان دروستیبکەین و هەموومان لە ناویدا بین... بەشەر بە نەخشە لە ئاژەڵ جیادەبێتەوە، نەوەک بە زمان یان بە خەیاڵ، حەیوان زمانیش و خەیاڵیشی هەیە، زانست ئەوەی سەلماندوە، بەڵێ، شتەکە تەواو زانستییە. تاکە شتێک کە مرۆڤ لە پەلەوەر و گیاندارانی

تـر جیادەکاتـەوە، نەخشـەیە... نەخشـە واتـای هەمـوو دیمەنەکـە ببینیـت، تـەواوی دونیـا لەبەردەستتدا بێـت، هەمـوو جیهـان لـە نـاو ئـەو شتەدا بێـت کـە تـۆ دەیکێشـیت...».

وەک پەشـۆکانم بخوێنێتـەوە، کەمێـک نێوچاوانـی گرژکـرد و گووتـی «ئـاه ماجیـدی گـوڵ سـۆلاف... پێمبڵـێ، تـۆش لـە مەکتـەب ڕقـت لـە جوگرافیـا بـوو یـان نـا؟»،

بۆ ئەوەی تێنەکەوم گووتم «نازانم، بیرم نەماوە».

سـەری نزیککـردەوە و بـە ئەسـپایی گووتـی «منیـش وەک تـۆ ڕقـم لـەم شـارەیە، ڕقـم لـەم جیهانەیـە... ئـا بەمجـۆرەی کـە هەیـە. جوگرافیـا یـان مێـژوو باسـی ئـەو دونیایـە دەکـەن وەک ئـەوەی هەیـە یـان وەک ئـەوەی هەبـووە... بـەڵام مـن بـاس لـە نەخشـەیەک دەکـەم کـە هەنـدێ بـۆ هەمووانـی دەکێشـن... سـەیرمکە، خەڵکـی خۆرئـاوا بەچـی بـوون بـە هێزێکـی گـەورە... بـەو پیـاوە زیرەکانـەی نەخشـەیەکی وەهـا گەورەیـان دروسـتکرد تـەواوی دونیـای گرتـەوە... وانییـە، بـەوە نەبـوون بـە پیـاو؟...».

ئـەو ویقـارەی تیانەبـوو کـە لـە یەکەمجـاردا بینیبـووم، نیـگای شـێوەیەکی تـر و ڕوخسـاری ڕەنگێکـی تـر بـوو، شـتێکی تیابـوو کـە لـە شـێتییەوە نزیـک بـوو، مەسـتی بەجۆرێـک دایگیرسـاندبوو، لێـی دەترسـام... بـەوەدا مـن جگـە لـە بیـرە هیـچ جـۆرە ئەلکهولێکـی دیـم نەدەخـواردەوە، زۆر لـە پیـاوی سـەرخۆش سـڵمدەکردەوە. لـە منداڵییـەوە لـە مەسـتان دوودڵ و بەگومانبووم، هەسـتمدەکرد بینینـی ئـەوان بـۆ خەیاڵـم زۆر خراپـە. سـەیریکردم و گووتـی « پێمبڵـێ، چـۆن ئـەو منداڵـە کوێرانـە بـەو دونیایـەدا دەگێڕیـت؟ بـۆ ڕۆژێـک نامبەیـت لەگـەڵ خۆتـدا؟ بـۆ؟»

بـە کەمێـک ئازاییـەوە گووتـم « جەنابـی بـارۆن، مـن حیکایەتخوانـم... ئەگـەر مێـژووی ئەمشـارە بخوێنیتـەوە، بـەردەوام حیکایەتخـوان هەبـووە، جـاران ئیشـەکە جۆرێکـی تـر بـوو، خەڵـک لـە چایخانەکانـدا دادەنیشـتن

و حیکایەتخوانەکان لە جێگایەکی بەرزەوە ئەفسانەو چیرۆکیان حیکایەتیاندەکرد... بەڵام من لەدەورو زەمانێکی تردا لە دایکبووم، من پیاوێکی بەدبەختم نە لە شوێنی خۆم و نە لە زەمانی خۆمدا لەدایک نەبووم... جەنابی بارۆن، من ناچم بۆ هیچ شوێنێک، هێند هەیە حیکایەتەکانم چەشنێکن کوێرەکان باشتر تێیدەگەن، من کەسێکم تەنیا نابیناکان دەتوانن خەیاڵاتم ببینن... چاوساغەکان بێن و نەیەن وەکو یەکە».

بارۆن گووتی «نامەوێت دانیشم بە قەڵەم و ڕاستە و پەرگاڵ نەخشەی دونیا دروستبکەم... ئەوە جوگرافیاناسەکان وادەکەن... من و تۆ نەخشەیەک لەسەرماندایە و دەیهێنین بۆ دونیا... ئەوە جیاوازی ئێمە و ئەو گەمژانەیە کە من ڕقم لێیانە... گوڵ سۆلاف پێویستیم بەوەیە ناو خەیاڵت ببینم... چۆن ئەو منداڵە کوێرانە ناو خەیاڵت دەبینن، منیش دەمەوێت ناو خەیاڵت ببینم». زەردەخەنەیەکی ترساوم گرت و گوتم «جەنابی بارۆن، چۆن مرۆڤ ناتوانێت دیوی ئەو دیوی مانگ ببینێت، شەوی خۆر تەماشابکات، بەسەر ڕووکاری دووهەمی ئەستێرەکاندا چاوبگێڕێت، ئاوهاش ناتوانێت خەیاڵی ئەوانی تر بەتەواوەتی ببینێت... مرۆڤ تەنیا دەتوانێت هەندێک شت ببەخشێت... هەندێک شتی کەم و هیچی تر... خەیاڵ دیوی ئەودیوی ئەو شتانەیە کە ئێمە نایگەینێ».

وەک بپاڕێتەوە گووتی « دەمەوێت شارێک لە شارە خەیاڵییەکانی تۆ ببینم... دەمەوێت بۆم باسبکەیت... دەمەوێت چاو لێکبنێم و لەگەڵ خۆتدا بمبەیت... حەزدەکەم ئەو زەویانەی لە خەیاڵی تۆدان هی من بن. ئای ماجیدی گوڵ سۆلاف چەند حەزمدەکرد، چەند سەدەیەک لەمەوبەر لە خۆرئاوا لە دایکببوومایە... چەند حەزمدەکرد؟». من بێئەوەی لە هیچ تێبگەم گووتم «بێگومان خۆشدەبوو، جەنابی بارۆن، منیش جار جار بەجۆرێکی بێمانا دڵم بۆ جل و بەرگی زەمانی زوو لێدەدات». بێئەوەی

گوێ بە قسە بێماناکانی من بدات بەدەم خەیاڵەوە سەری بەرزکردەوە و گووتی«سەردەمانێک زەوییەکی تر و ژیانێکی تر هەبوو مرۆڤ بیدۆزێتەوە... خاکی تر هەبوو داگیریبکات. بەڵام ئێستا سەرتاپای دونیا لە یەک دەچێت... ئەورووپییە کۆنەکان، لۆردەکان، بارۆنەکان، دۆقەکان خۆشبەختبوون، زەوی تر هەبوو داگیریبکەن... بەڵام ئێمە دەسەڵاتدارانی ئەم وڵاتانە بەراورد بەو پیاوە گەورانە هیچ نین جگە لە ڕاوکەری نەفامی چۆلەکە... ڕاوکەری باڵندەی غەمگین. من ئێستا جگە لە ڕاوچییەکی چکۆلە زیاتر چیم... ماجیدی گوڵ سۆلاف دەسەڵات بە بڕوای تۆ چییە؟ ». من هەرگیز بیرم لەو پرسیارە نەکردبووەوە، لەو باوەڕەشدا نەبووم لە ژیانمدا کەسێک بێتە ڕێگام پرسیاری وەهام لێبکات، گووتم «دەسەڵات ئەوەیە کۆشکی گەورەت هەبێت، ماشێنی جوانت هەبێت، بتوانیت دەستت بگاتە هەندێک لەو ژنانەی حەزت لێیانە... تۆ حوکمبکەیت، ئەوانە بخەیتە زیندانەوە کە ڕقت لێیانە. شتێکە لەو بابەتە». بە پێکەنینەوە سەیریکردم و گووتی «هەموو بارۆنەکانی نوێمیرانیش وا بیردەکەنەوە... ئاە هەموو بارۆنە گەمژەکانی نوێمیرانیش وابیردەکەنەوە. بەڵام ئەوە دەسەڵات نییە. دەسەڵات شتێکی ترە... من دوای ساڵەهای ساڵ خوێندنەوە و ئیشکردن گەیشتمە ئەو بڕوایە. گەر مرۆڤ نەتوانێت خەیاڵ دەستەمۆبکات و لەم سەر زەوییەدا سەوزیبکات، بێدەسەڵاتە. دەسەڵات بریتییە لە دەستەمۆکردنی خەیاڵ و هیچی تر. گوڵ سۆلاف هەندێجار مرۆڤ شێت دەبێت تا دەگاتە قەناعەتێک، من لەوانەم کە شێت دەبن تا دەگەنە قەناعەتێک، بەڵام کە لە شتێکدا گەیشتمە بڕوا، ئیتر تەواو دەتوانم ژیانی خۆمی پێببەخشم... دەتوانم لە پێناویدا بکوژم و زەمین وێرانبکەم، هیچ شتێک لە قەناعەت ترسناکتر و جوانتر نییە... مرۆڤ تا قەناعەتی نییە شێتە، کەدەشبێتە خاوەنی قەناعەت شێتتر دەبێت». بە شەرمەوە پرسیم «جەنابی بارۆن چۆن گەیشتیتە قەناعەت؟»).

دەستیکردەوە بە لێخوڕین و ماوەیەک بێدەنگبوو، بەڵام ئاشکرا بیری لە پرسیارەکەی من دەکردەوە. دوایی بە هێمنی گووتی «گوڵ سۆلاقی برام، ئەوەی مێژووی بەشەرییەتی دروستکردوە و دیاریدەکات، خەیاڵی حاکم و حوکمڕانانی دونیایە... زۆر گەمژە هەن لەم شارەدا هێشتا لەوە تێناگەن... گەمژە هەیە وادەزانێت خەیاڵ شتێکە لە ئیشی شاعیرانە؟ هاها... گەمژەی وەهاش لە دونیادا هەیە و زۆریشن... وانییە؟». من بە ترسەوە سەیرمکرد و گووتم «نازانم». بەدەنگی بەرز گووتی «ئەوروپییەکان خەیاڵ لە سنووری ئەورووپا هێنانی بەمدیودا... هەموو حاکمێکی دونیا مێژووی خەیاڵی حاکمەکانی پێش خۆی دەخوێنێتەوە... ناپلیۆن خەیاڵی ئەسکەندەر و هانیپاڵی خوێندەوە، بەڵێ ئاوهابوو... هیتلەر خەیاڵی ناپلیۆن و بسمارک لەسەریدا بوو... سەدام حسەین، خەیاڵی هیتلەر و ستالینی لە سەری خۆیدا سەوزکردبوو، بەڵام ئەو پادشا و دیکتاتۆرانە لەسەر زەوی پەلیاندەکوتا... زەوی تاقیگا و ماڵی ئەوان بوو، بەڵام ئێمە لەم شارە چکۆلانەیەدا ناتوانین خەونی وەها ببینین، ئەو جۆرە خەونانە لە دونیادا بەسەرچوون... بەڵام ڕاستت دەوێت خەیاڵ شتێکە یەکەمجار لە سەری سیاسییەکان و بازرگانە گەورەکاندا دروستدەبێت. من مێژووی شیعریشم بە وردی خوێندۆتەوە، شاعیران هەندێجار هیچ نین جگە لە سەگێک کە دوای خەیاڵی سیاسییەکان دەکەون، تۆ بەختەوەریت کە شاعیرنیت. بەختەوەریت و زۆریش بەختەوەریت... سەرەتا سیاسییەکان باسی ئازادی دەکەن ئینجا ئەوانیش دێن و دەکەونە هۆنینەوەی بەیت و بالۆرە بەسەر ئازادیدا. پازدە ساڵ لەمەوبەر خەیاڵی ئێمە ئەوەبوو بگەینە ئەم ڕۆژە، ئەم ئازادییەمان هەبێت کەئێستا هەمانە... ئەو کات شاعیرەکانمان و سیاسییەکانمان و خەڵکی سادە و ساکاری سەر جادەش، هەموو یەک خەیاڵمان هەبوو. دەمانویست شارێک شارۆچکەیەکمان بەدەستەوە بێت و دانیشین و ئاسوودە بژین، ئەو کات ڕۆژگاری زێڕینی ئێمەبوو، سەردەمی

جوانی بوو، هەموو یەک خەیاڵمان هەبوو. ئێستا من دەمەوێت شتێکی وابکەم... تێدەگەیت... هەموو یەک خەیاڵمان هەبێت. نا من نامەوێت خەیاڵی خەڵکی بسڕمەوە و خەیاڵی خۆم سەوزبکەم... من پیاوێکی مۆدێرنم... تێدەگەیت، پازدە ساڵ لە مەوبەر پیاوی مۆدێرنی وەک من لەم کەلاوەیەدا دروست نەدەبوو. من نامەوێت خەیاڵی من بچێتە شوێنی خەیاڵی تۆ، بەڵکو دەمەوێت نەخشەیەکمان هەبێت، خەیاڵی هەر دووکمان لەسەری یارییکات... پێکەوە باغەکە دروستبکەین، پێکەوە کەشتییەکە دروستبکەین، پێکەوە سەفەربکەین، ئەو کەشتییەی تۆ کە کوێرەکانی پێدەگێڕیت کەشتی هەموومان بێت. ئەو ئیقلیمە ڕوناک و سەوزانە قیبلەگامان بێت... وانییە؟. کە ئەم قسانە بۆ برادەرە مارکسییە کۆنەکانم دەکەم، خەندەیەک دەیانگرێت و دەڵێن کابرا ئەوەی تۆ دەیڵێیت یۆتۆپیایە، یۆتۆپیایە. منیش پێدەکەنم و دەڵێم یۆتۆپیا نییە، بەڵکو ئەندازەیە، حیساباتە، هونەری ڕاکێشانی خەڵکە بۆ ناو نەخشەکە، کۆڵنەدانە، ڕەحمە... بەڵێ ڕەحم و سۆزە... هەروەها بێڕەحمیشە. ئەوەی تا کۆتایی مل نەدات، ئەوەی جوانی ئەم شارە و ئومێدی سبەینێ و نرخی پاشەڕۆژ بە هیچ بگرێت، وەک چۆن بەرازێک لە پیسایی خۆیدا نوقمدەبێت ئاوا لە خەیالاتی خۆیدا نوقمبێت، من ڕەحمی پێناکەم. بۆ پازدە ساڵ لەمەوبەر دەمانتوانی هەموو یەک خەون ببینین... بۆ؟ ئەمڕۆ بۆ ناتوانین؟. من بە بارۆنەکانی برادەرم گووت، ئەوە خەیاڵپڵاو نییە، ئەوە هونەرە... لە کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی میراندا هەستامە سەرپێ و بەدەنگی بەرز گووتم، ئێمە ئیشمان ئەوەیە نەهێڵین خەیاڵی مرۆڤەکان بە زایە بچێت... ئەوە نهێنی جیاوازی نێوان خۆرئاوا و خۆرهەڵاتە. لە خۆرئاوا ناهێڵن خەیاڵی جوانی بەشەر بە زایە بچێت، بەڵام لێرە ناهێڵین هیچ خەیاڵێک لەسەری ئادەمیزاد بێتەدەرێ، هەموو خومان بەوەوە گرتووە بڵێین خەیاڵ شتێکی ترسناکە نابێت لەسەرمان بێتەدەرێ، هەموو

فێربووین خێرا خەیاڵ و خەونی خۆمان بخەینە ژێرەوە و وەک گووی پشیلە بیشارینەوە و بڵێین یۆتۆپیایە. باوەڕتبێت من وام بە هەموو سیاسی و بارۆنەکانی ئەم وڵاتە گووتووە... بەڵام زۆربەیان تێناگەن تۆ باسی چی دەکەیت». من بە کەمێک شەرمەوە سەیری بارۆنم کرد، کە بە خێراییەکی بێمانا لە شەقامە خاڵییەکانی شەودا ماشێنەکەی دەئاژووت. گووتم «جەنابی بارۆن منیش تێناگەم تۆ باسی چی دەکەیت. من بیر لەوە ناکەمەوە خەیاڵاتی خۆم بکەم بە ڕاست... پیاوێکی شۆڕشگێڕ نیم، خەڵکانی شۆڕشگێڕ بیر لەوە دەکەنەوە خەیاڵات بکەنە ڕاست. جەنابی بارۆن، من قەت شۆڕشگێڕ نەبووم... شۆڕشگێڕەکانی ئەمڕۆ دیکتاتۆرەکانی سبەینێن، من حەزم بە چارەیان نییە. من کەسێکی بێلایەنم، مندااڵن زیاتر لە خەیاڵاتم تێدەگەن. شتێک لە دونیادا نییە ناوی شاری خەونەکان بێت، شاری خەونەکان ئەو شارەیە کە خەونی لێ نییە... شتی واش لەم مەملەکەتەی ئێمەدا دروستناکرێت». لە تاریکییەکەدا لابەلا سەیری بارۆنم کرد، پیاوێکی جوان بوو. هەناسەیەکی هەڵکێشاو گووتی «منیش شۆڕشگێڕ نیم... سەردەمی شۆڕشگێڕان تەواو. لە کۆتایی ساڵانی هەشتاوە سەردەمی شۆڕشگێڕان تەواو. بەڵام من هەندێک شت دەزانم کە تۆ نایزانیت. ئێمەی کورد لە خوارەوەی دونیادایین، گەر ئەم ئەستێرەیە کونێکی تێبێت و بیانەوێت باری سووکبکەن یەکەم کەس ئێمە فڕێدەدەنە خوارێ. ئێمە بەشە زیادەکەی بەشەرییەتین، تێدەگەیت، لەم سەردەمەدا کە دونیا بۆتە یەک، میللەتانی داماوی وەک ئێمە ئەو هەستە هەراساندەکات کە ئێمە بەشە زیادەکەی بەشەرییەتین و لەوانەیە ڕۆژێک لە کەشتییەکەوە فڕێماندەنە ناو زەریا. ماجیدی گوڵ سۆلاف ئەو هەستە بەنهێنی لە ناو هەموو کوردێکدا هەیە... هەستێکی ترسناکە کە ئێمە تلپە و خاشاکی سەر ئەم ئەستێرەیەین، تا دونیاش بچوکتربێتەوە ئەو هەستە لە دڵماندا گەورەتر دەبێت، هەستێکە لەگەڵ شیردا دەرخواردی

منداڵەکانمانی دەدەین. تا هێزی گەورەتر لە دونیادا دروستببێت ئێمە بچوکتردەبینەوە. یەک ڕێگا لە بەردەمماندایە، ئەویش ئەوەیە شتی وەها جوان بکەین، مرۆڤایەتی هەستبکات کە زیاد نین. خۆمان بە جوانی گەورەبکەین و خۆمان بەباغێک ڕزگاربکەین. زۆرجار واهەستدەکەم، چارەسەری کێشەکانی بەشەرییەت لە ناو ئێمەوە باشتر دەردەکەوێت. بەڵام من کارم بە بەشەرییەتەوە نییە، کوردێکی بەدبەخت چییە تا بۆ بەشەرییەت بیربکاتەوە... ها... ئەوەیان قسەی پڕوپوچە. من بڕیارمداوە لە خەیاڵاتەکانمدا لە سنووری شارەوانی ئەم شارە دەرنەچم. لە گەنجیمدا ناسیونالیستێکی مارکسی مەزەب بووم، بەڵام ئێستا لە سنووری شارەوانی ئەم شارە بترازێت ناتوانم بیر بۆ شوێن و مەکانی تر بکەمەوە... عەزیزم... دەزانم ئەم دونیایە شتێکی گەورەی کەمە، ئەم وڵاتانەی من و تۆ جۆرە پیاوێکی کەمە... دەزانی ئەو پیاوە کێیە؟ ئەو پیاوە جۆرە سیاسییەکە شاعیرانە بیربکاتەوە، یاخود جۆرە شاعیرێکە سیاسییانە بیربکاتەوە. لای میللەتانی بچوک و بەدبەختی وەک ئێمە ئەم دوو ڕۆحە نابێت لەیەک بترازێت... میللەتانی گەورە باکیان نییە... میللەتانی گەورە دەتوانن کاولکاریبکەن و لەسەر زەویش سەربەرز و سەرفراز بمێننەوە، بەڵام ئێمە گەر جوانی قیبلەنمامان نەبێت دەمرین... ئەوە قسەی منە... تێدەگەیت... من شۆڕشگێڕ نیم، سیاسی نیم، شاعیر نیم، بەڵکو پیاوێکی واقعیم کە دەزانم شتەکان بۆ کوێ دەڕۆن. دەزانم تەنیا دروستکردنی جوانییە ئەو هەستەمان دەداتێ کە ئێمە لەسەر ئەم ئەستێرەیە زیادنین، ئێمە ناتوانین ڕاکێت و ماشێن و دەرمان بۆ بەشەرییەت دروستبکەین، بەڵام دەتوانین جوانبین، گەر فەوتاشین و مردین، فەوتان و مردنمان وەک فەوتان و مردنی جوانی وەهابێت. تۆش وایت، ماجیدی گوڵ سۆلاف تۆش وەکو منیت، لە ناو ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکاندا تۆ لە هەمووان زیاتر لە من نزیکیت، بۆیە لێتدەپاڕێمەوە لەگەڵمدا بیت... لەگەڵمدابە... مەبە

بە دوژمنی بارۆن... دوای شتی بچوک مەکەوە، تەنیا بیر لە ڕابوردوو مەکەرەوە، دەستی خۆتم بەرێ و پێکەوە بابڕۆین بۆ پاشەڕۆژ». من بەترسەوە دەستم کێشایە دواوە و گووتم «جەنابی بارۆن نازانم تۆ دەتەوێت بچین بو کوێ؟ نازانم؟». بە جۆرێکی شێتانە گووتی «ئەو ئەمەریکییە حیزانە ناتوانن هیچ بۆ ئێمە بکەن... تێدەگەیت. ئەم میللەتەی من و تۆ جاران لە دەرەوە کاولیاندەکرد، دەیانکوشت، ئێستا لە ناوەوە خۆی خۆی کاولدەکات، تێدەگەیت، گوێبگرە گوڵ سۆلاف من زۆر لەگەڵ ئەو ئەمەریکییە حیزانەدا دانیشتووم، خەیاڵی ئەوان وەک خەیاڵی سیاسییە نەفامەکانی ئێمە وایە. تۆ تێمناگەیت... هەستدەکەم کەس تێمناگات... کێ تێم بگات؟ بارۆنە گەمژەکانی نوێمیران؟ کە باسی خەیاڵیان بۆ دەکەم، حیکایەتی عەلادین و کڵاوی سەخری جن و ئەنگوستیلەی سلێمان پێغەمبەریان بە یاددێتەوە. حیکایەتی کوڕەکەچەڵە و ئەسپی باڵدار. گوڵ سۆلاف دەمەوێت کاتێک ئەم دونیایە تازەدەکەینەوە تۆم لەگەڵدا بیت... باسی ئەو شتە جوانانەم بۆ بکە کە لەسەفەرەکانتدا بە خەیاڵ دەیبینیت، ئەو منارە سەیرانەی دێنە ڕێگات، ئەو نەخش و نیگارەی دیوارتاش و پایەتاشەکان لە شارە سەیروسەمەرەکانی دونیادا دروستیدەکەن، ئەو بورج و قەڵایانەی لە بلوور دروستکراون... ئەو مزگەوتە گەورانەی ئیمانداری بللورین و پاکدامێن تیا نوێژدەکەن... ئەو هارمۆنییەی کە مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا دەیخولقێنن... هارمۆنی نێوان مرۆڤەکان، ئەوەیە مۆسیقای ڕاستەقینەی وجود. خەیاڵ لای من ئەوەیە کە باغێک دروستبکەم هەر مرۆڤێک بینی بڵێت ئەمە ئەو باغەیە کە هەمیشە لە خەونەکانمدا بووە... چی وادەکات شارێک ببێتە شاری خەونەکان؟ ها گوڵ سۆلاف چی وادەکات؟. ئەوەی هەر کەسێک سەیری درەختەکانی کرد، بڵێت ئەمە ئەو درەختەیە کە من دەمەوێت هەمیشە بیبینم، هەر کەسێک بۆنی گوڵەکانی کرد بڵێت ئەمە ئەو گوڵەیە کە من

دەمەوێت تا مردن بۆنیبکەم، کە عاشقەکانی بینی یەکتری ماچدەکەن، بڵێت ئەمە ئەو ماچەیە کە دەمەوێت بەسەرییەوە بمرم، کە بە شەقامەکانیدا پیاسەیکرد هەستبکات تا هەتاهەتایە، تا کۆتایی دونیا نایەوێت بگاتە ماڵەوە، کە لە نێو ژوورەکاندا دانیشت، هەستبکات لە ناو تەبایی نێوان مرۆڤ و شتەکاندا مەلەدەکات، کە منارەکانی بینی واهەستبکات لە پاکی ئاسمانەوە نزیکە... کە لەسەر مافوورەکانی دانیشت وابزانێت بە سەر باغی پادشامەستەکاندا دەفڕێت. کە شیعری خوێندەوە دونیا لە بیربکات، شیعر دەبێت ئەو یادەوەرییە ڕەشەی ناوسەرمان بکوژێت... من پێویستیم بە شیعرە بۆ ئەوەی لەم دونیایە دووربکەومەوە، نەوەک بۆ ئەوەی یادگارە کۆنەکان و حەسرەتە ڕەشەکان قووڵتر بژیم... جوانی ئەوەیە شتێک دروستبکەین و شتێکمان بیربچێتەوە... شتێک بخولقێنین و ئەم دونیا پیسە فەرامۆشبکەین».

هەستمکرد بارۆن لە خەیاڵەکانیدا زۆر دوور دەڕوات. تا ئەوکات هیچ بوونەوەرێکی خەیاڵیم نەبینی بوو وەها دوور بڕوات و خەون بە دروستکردنی وەها کوچەو کۆڵانێکەوە ببینێت. من لە دروستکردنی شارە خەیاڵییەکانمدا هەمیشە یاسایەکی سەرەکیم ڕەچاودەکرد، ئەویش ئەوە بوو شارێک دروستبکەم هیچ کات نەبێت بە شاری ڕاستەقینە. خەیاڵ دروستکردنی شتێکە کە ناکرێت بە حەقیقەت، ئێستا کە دەمبینی ئەو بێباک باس لە دەستەمۆکردنی خەیاڵ دەکات دەترسام. بەڵام شێوازی قسەکردن و خۆدەربڕینی بارۆن جۆرێک بوو نەمدەتوانی هەستبکەم پیاوێکی ترسناکە... من بیرم لە قسەکانی دەکردەوە کە دەستی گرتم و گووتی «ترسناکن ئەو شاعیرانەی پەڕەکانی خۆیان دەڕازێننەوە، لە ستایشی مەحبوبەدا وزەی ڕۆحی خۆیان دەدۆڕێنن و دونیاش وەک خۆی بە ناشیرینی جێدەهێڵن... ترسناکن... ماجیدی گوڵ سۆلاف ئەوەی میللەتی ئێمە ڕزگاردەکات ئەوە نییە حیزبە کەلەڕەق و سەرسەختەکانمان

یەک بگرن... ئەوەیە خەیاڵاتەکانمان یەکبگرێت و شتێکی نوێ بەرهەم بهێنێت... من کە باسی نەخشەت بۆ دەکەم، باسی ئەو جێگایە دەکەم کە خەیاڵی شاعیر و سیاسی و ئەندازیار پێکەوە کۆدەبنەوە و یاریدەکەن... خەیاڵی جوانناسەکان و حوکمڕانان و بیناسازان پێکەوە یاریدەکەن... گوڵ سۆلاف ئێمە ناتوانین خۆمان ڕزگاربکەین و نیشتیمانمان لەدەست داگیرکەران دەربهێنین، بەڵام دەتوانین خەیاڵمان ڕزگاربکەین... ناتوانین وەک ئیمپراتۆرییەتە کۆنەکان بەسەر زەویدا پەلبهاوین، بەڵام دەتوانین وەک تۆ بە ناو خەیاڵدا پەلبهاوین... ناتوانین زەوی خۆمان یەکبخەینەوە بەڵام دەتوانین خەیاڵمان یەکبخەینەوە... ئەوە سەیرکردنی منە بۆ دونیا، بۆیە پێمدەڵێن بارۆنی خەیاڵ».

ئینجا سەیرێکیکردم، شتێک لە شێتی لە نیگایدا بوو و بە حەسرەتێکی قووڵەوە گووتی « من پیاوی دەوڵەتم... تێدەگەیت، من دوازدە ساڵە پیاوی دەوڵەتم، دوازدە ساڵە لە بواری جۆراوجۆردا کارمکردوە، دڵنیابە من لەوانە نەبووم کە حیزب دەخەنە پێش دەوڵەتەوە. من ئەو شارە خەیاڵییە دەخەمە پێش هەموو شتێکەوە، بەڵام من تاک باڵم ماجیدی گوڵ سۆلاف، تاک باڵم... دەمەوێت شارێکی گەورە بۆ خەونەکانی هەموومان دروستبکەم، دروستکردنی شاری خەونەکان ئەوە ئیشی منە... بەڵام تاک باڵم... تۆ لەو باوەڕەدایت، سیاسییەک بە تەنیا بتوانێت دونیایەکی جوان دروستبکات... لەو باوەڕەدایت؟».

هەستمکرد بارۆن تادێت غەمگینتر و تووڕەتردەبێت. گووتم «جەنابی بارۆن نازانم گەر حیزب بچێتە پێش دەوڵەت یان بچێتە دوای دەوڵەت چی لە چی دەگۆڕێت؟ سەر لەو شتانە دەرناکەم. من نازانم باسی سیاسەت بکەم... جەنابی بارۆن من یەک شت باش دەزانم، ئەویش سەیری فلیم بکەم و حیکایەت بۆ منداڵان بگێڕمەوە... تەنیا ئەو دوو شتە باش دەزانم... لەوانە بترازێت هیچ شتێکی دی نازانم».

بارۆن سەیرێکیکردم و بە هێمنی سەری خستە سەر سوکانەکە، ماوەیەک بێدەنگ بوو و من بە لای چاو سەیرمدەکرد، بە درێژایی هەموو قسەکانمان نەمدەویرا چاو ببڕمە چاوی. پاش ئێستێک بێدەنگی هەستمکرد بارۆن لە ناوەوە دەکولێت... بارۆن دەگریا... بێئەوەی من قسەیەکی ناخۆشم بە بارۆن گووتبێت، ئەو دەگریا. سەری خستبووە سەر سوکانەکە و وەک منداڵێک فرمێسکی دەباران. ماوەیەکی درێژ سەیرمکرد و هیچم نەگووت... دواتر بە ترسەوە دەرگاکەم کردەوە و لەسەرەخۆ ئوتومبێلەکەی بارۆنم بەجێهێشت، لە دەرەوەش دەنگی گریانی بارۆن هەر لە سەرمدا دەنگیدەدایەوە. ئەو شەوە کە گەیشتمەوە ماڵێ... بێئەوەی هیچ بکەم خەوتم و لە قووڵایی دڵدا ئاسوودەبووم. بارۆنم وەکو پیاوێکی باش هاتە پێشچاو کە خەریکە شێت دەبێت... بەڵام دڵنیابووم هەموومان خەریکە شێت دەبین، هەر یەکە و بە شێوەی خۆی.

## گەڕان بۆ یاقووتی مەمەد

عەتار لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا چەندەها تیپی تایبەتی زانیاری دروستکردبوو، یەکێک بوو لەو پیاوانەی لە دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش زانیاری دەکڕی و زانیاریشی بەوان دەفرۆشت، لە پاڵیشدا ئیشی بۆ سەرانی گەورەی دەوڵەت و حیزب دەکرد. لەو سێ ساڵەی دواییدا تیپێکی تایبەتی لە گەنجان و ژنان دروستکردبوو کە ئیشیان تەنیا دواکەوتنی هەواڵی ئەو کچ و ئافرەتانە بوو کە لە ماڵ هەڵدەهاتن. خۆی لێزانێکی گەورەی دەموچاو بوو، سیخوڕ و هەواڵدزەکانی زۆربەیان منداڵ و بێگوناە و فریشتەڕوو دەردەکەوتن. بە هۆی لێزانی خۆی و هاوکارە نهێنییەکانییەوە زووتر لە هەمووان دەگەیشتە ناو نهێنییەکان. وای لێهات

هــەر کــەس ئافرەتــی دیارنەمایــە ڕووی لــە عەتــار دەکــرد. ڕۆژ دوای ڕۆژ قەڵەوتـر دەبـوو، ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕەشـتر دادەگـەڕا و لـە جـاران زۆرتـر عارەقـی دەردەدا. لـە پاییـزی سـاڵی ٢٠٠٤ دا، چیرۆکـی ئافرەتێـک بـە نـاوی یاقووتـی مەمـەد شـاری هەژاند. یاقـووت کچـی یەکێـک لـە ئاغـا ناودارەکانـی سـپیرەز دەبێـت، لـە یەکێـک لـە شـارۆچکە دوورەکانـەوە لەگـەڵ کـوڕی یەکێـک لـە بەرپرســە سیاســییەکاندا هەڵدێــت و ڕوودەکەنــە ئــەم شــارە. کــوڕە زۆر ناکەسـبەچە و بێنەزاکـەت دەبێـت، هێنـدەی دەزانێـت ناتوانێـت دۆسـتەکەی قایمبـکات و لەگـەڵ خۆیـدا بیشـارێتەوە، بـۆ ئەوەی کەوڵـی خـۆی دەربازبکات، کچـەی بەسـتەزمان لـە ناوەڕاسـتی شـاردا جێدەهێڵێـت و دەسـتی لێبـەردەدا. وەهــا نامــەرد دەبێــت هەتــا ڕێ و شــوێنی خۆشاردنەوەشــی بــۆ دانانێــت، هــەر وەکــو مشــکێکی ترســنۆک هەڵدێــت و خــۆی لــە کونێکــی نەزانــراو قایمـدەکات. گـەر یاقووتـی مەمـەد بـە ڕێکـەوت نەکەوتبایەتـە سـەر ڕێـگای پیرەمێردێکـی بەویـژدان بـە نـاوی مـام هەریـرەوە کـە کچەکـەی لـە یەکێـک لـە ڕێکخراوەکانـی ژنانـدا کاریدەکـرد، دەشـیا یاقـووت هـەرزوو تیـا بچووایـە. دوو ڕۆژ دوای ئـەو شـەوەی مـام هەریـر یاقووتـی مەمـەدی گرتـەوە، ئـەو بـە کۆمەکـی ڕێکخراوەکانـی ئافرەتـان و کچـان، گەیشـتە ماڵـی تریفـە بابەحـری. کچەکـە لـە ئەسـتێرەیەک دەچـوو هـەر ئێسـتا لـە ئاسـمان کەوتبێتـە خـوارێ، وەهــا جـوان و پــاک بـوو، هــەر کــەس بیدیبایــە حەیرانــی دەبـوو. خۆشـحاڵبوو دوای بێقەرارییەکـی وەهـا کوشـندە، لانکەیەکـی دۆزیبـووەوە. کاتێـک گەیشـتە ئــەو پەنــاگا چەپــەک و نهێنییــە، پێــوەی دیاربــوو کــە ئــەو چەنـد ڕۆژە زۆر بیـری لـە مـەرگ کردۆتـەوە. کچـان و ژنانـی ماڵـی بابەحـری ئامێزیـان بـۆ کـردەوە و لــەدەوری ئەڵقەیــان بەســت. ئــەو چیرۆکـی خــۆی گێڕایــەوە و ئەوانیـش چیرۆکـی خۆیـان بـۆ گێڕایـەوە. لـەو کاتـەدا کـە ئـەو لـەو ماڵـەدا سـەربوردی ژیانـی خـۆی حیکایەتدەکـرد، پیاوانـی خێـڵ و چەکدارەکانیـان لـە حیـزب و سوپادا وەک ئاڵـۆش لـە ڕۆحـی دابێتـن، بست بـە بسـتی ئـەو

دەڤــەرە بـۆ یاقــووت خــان دەگــەڕان. چاوســاغان و شــارەزایان ناوبانگــی عەتاریـان بـۆ وسـوو ئاغـای بـرا گـەورەی یاقـووت هەڵـدا. دوای سـێ شـەو لـە هەڵهاتنـی کچـە... وسـوو ئاغـا و چەتـۆ ئاغـای بـرای بـە هەمـوو تفاقـی شـەڕەوە چـوون بـۆ ماڵـی عەتـار و شـەوێکی درەنـگ جانتایـەک پـڕ دراو و کۆمەڵێـک وێنـەی جۆراوجـۆری یاقووتیـان بـۆ خسـتە سـەر مێـزی هۆڵـی میوانەکە. عەتـار وەک زۆربـەی شـەوەکانی دیکـەی ژیانـی، بەوێنـەی مەهراجا هیندییـەکان خاولییەکـی بەسـەریەوە بەسـتبوو، سـەیری فلیمێکـی کۆنـی ئەحمـەد مەزهـەر و مریـەم فەخرەدینـی دەکـرد. لەشـی داکەوتـوو و ڕۆحـی خەواڵـوو بـوو. تـا دەهـات کەمتـر بەرگـەی بێخـەوی و میوانـی درەنـگ وەختـی دەگـرت. کـە ئاغایانـی سـپیرەز گووتیـان « بـە هـەر نرخێـک بـووە، دەبێـت ئـەم کچەمـان لـە ژێـر زەوییـەوە بـۆ بهێنیتـە سـەر زەوی» . عەتـار دوای باوێشـکێکی درێـژ کەمێـک هۆشیهاتەوە، کەمێـک پشـتملی خـۆی خووراند و سـەیرێکی وێنەکانـی کـرد. وسـوو ئاغـا گووتـی « گـەر تـۆ بتەوێـت دەتوانیـت بۆمانـی بدۆزیتـەوە، گـەر نەشـتەوێت قسـەیەکی ترمـان لەگەڵتـدا هەیـە» . عەتـار هـەر کات گوێـی لـەم هەڕەشـە ژێراوژێرانـە بایـە، بێویسـتی خـۆی دەسـتی دەبـرد بـۆ سـەری لووتـی و دەیخوراند. کـە هەڕەشـەکان سـنووریان ببەزاندایـە هــەردوو گوێـی عارەقیـان دەردەدا و گرێکانـی کەپـووی وەک بەربینـی کۆتـری ماقـوو دەئاوسـان. بـە هێمنـی سـەیری چـەک و تفاقـی ئاغاکانـی کـرد و گووتـی «گـەر لـەم وڵاتـەدا بێـت بۆتـان دەدۆزمـەوە... گـەر نەمدۆزییـەوە یەعنـی کچەکەتـان چۆتـە دەرەوەی کوردسـتان و لـە تـۆڕی منـدا نەمـاوە... ماسـی نییـە لـەم حـەوزە مەلعونـەدا بێـت و مـن نەیبینـم... بـەڵام گـەر لـەم حـەوزە دەرچووبێـت، ئیتـر لـە حوکمـی قولاپـی مـن دەرچـووە و لۆمەممەکـەن... ئاغایـان کـەس بـۆی نییـە هەڕەشـە لـە عەتـار بـکات... عەتـار ئـەوەی بکرێـت دەیـکات... بـەڵام هیـچ ڕاوکەرێـک نییـە لـە دونیـادا بتوانێـت هەمـوو تەیـرەکان ڕاوبـکات... ڕاوکـەری وا لـە دونیـادا نییـە... مـن

ئادەمیزادم، ڕاداری ئیلاهی نیم». ماوەیەک بوو، هەر گرفتێکی بهاتبایەتە بەردەم دەیگووت «من ڕاداری ئیلاهی نیم».

لە ڕۆژی دواییەوە عەتار دەبایە هەموو هونەری خۆی بۆ دۆزینەوەی یاقووتی مەمەد بخاتەکار. دەیزانی ئەم سپیرەزیانە خەڵکی کەلەڕەق و بێدینن، خودایان بۆیە دەوێت تا بیکەن بە هاوکاری شەیتان، دەیزانی هەموو ئەو مرۆڤانەی دەیانەوێت نیازی ئەهریمەن و کۆمەکی ئیلاهی تێکەڵاوی یەک بکەن پڕ مەترسین... زۆر پڕ مەترسین. ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو جارێکی دی چەکە قورسەکەی خۆی بەکاربهێنێت، ئەو چەکەی کەس نییەتی ئەو نەبێت « شەهریار بایز ئەو کوڕەی دوو چاویی شوشەیی سافی هەیە و دەتوانێت ئەو دیو دیوارەکان ببینێت». هەر لە منداڵییەوە لە بری شەهریار پێیدەگووت «شوشە». دەبایە خۆی و شەهرەیاری شوشە بۆ کچێکی زۆر جوان بگەڕێن، ئێجگار جوان. هەڵبەت ئەستەمبوو لە سەرەتاوە شوشە بخاتە کار، ئەوە ئەو چەکە قورسەبوو کە لە کاتی دواجێمی یارییەکاندا بەکاریدەهێنا. ئەستەمبوو هەموو ئەم شارە کوچە بە کوچە و ماڵ بە ماڵ بپشکنێت، سەرەتا پێویستی بە تیشکۆخستن بوو. بەشی هەرە زۆری ئیشەکانی خۆی باش دەبردبەڕێوە، بەڵام سەرەتاکان هەمیشە سەخت و دژوارن. عەتار بۆ گرتنی نێچیرەکان تەپکەتۆڕێکی ئاڵۆز و هەمەسەری دروستکردبوو، سەرەتا وێنەی یاقووتی مەمەدی دەدا بەو کەسانەی کە لە خاڵەکانی پشکنیندا کاریاندەکرد، ئەوانە لە دۆزینەوەدا لە هەر کەس زیاتر کۆمەکی عەتاریان دەکرد. هەر کەسێک بەڕاستی ڕۆڵی لە گرتنی نێچیرێکدا هەبایە، عەتار وەها پاداشتیدەکرد، کەرەمی دەنگبداتەوە. لە ناو پۆلیسەکانی هاتوچۆدا کە شەقام و ناو ماشێنەکانیان چاودێریدەکرد تۆڕێکی گەورەی هەبوو، لە نێو ئەو دوکاندارانەدا کە شتی ژنانە دەفرۆشن خەڵکێک بە دڵسۆزی ئیشیان بۆ ڕادەپەڕاند، لە چێشتخانەکانی دەوروبەری شار، لە گوندەکانی

سەر سنووردا دەیان داوی وردی چنیبوو... مرۆڤ هەر چۆنێک بجولابایەتەوە مەترسی ئەوەی هەبوو بکەوێتە ناو یەکێک لە تەپکە ئاسنینەکانی عەتارەوە. لەو دوو ساڵەی دواییدا ئیشەکانی زۆربەی بە وێنە و تەلەفوون بەڕێوەدەچوون، ئەو ماوەیەی کە هێدی هێدی مۆبایل بڵاودەبووەوە، کارەکانی خێراتر و ئاسانتر بووبوو. لای عەتار شتێک نەبوو ناوی ئیشی چاک یان بەد بێت، بازاڕی ئەو مرۆڤ بوو... هیچ جارێک بیری لە شوناسی ئەو کەسانە نەکردبووەوە کە دوایان دەکەوت. هەندێجار هەستیدەکرد بە شێوەیەکی بێمانا عاشقی ئەم ئیشە بووە، تا زیاتر دەوڵەمەندبایە کەمتر بیری لە ژنهێنان دەکردەوە، لەگەڵ یەک دوو سۆزانی لاکۆلاندا سەروکاری هەبوو، هەفتەی جارێک تەلەفونی بۆ یەکێکیان دەکرد و دەهاتن بۆ لای، لەوەش بترازێت بەو فلیمە ڕووتانەی شەو ڕازیبوو کە پێشخەوتن لە ژێر بەتانییەکەوە سەیریدەکردن. هەندێجار بە دیار ئەو فلیمانەوە خەوی لێدەکەوت و بەیانیان گەر کارەبا هەبایە لەدەنگی خشەخشی تەلەفزیۆنە گەورەکەی بە ئاگادەهاتەوە. چەند ساڵێک لەوەوبەر جارێک ویستی ژن بهێنێت، کچێکی عەیاری زانکۆبوو لە هند روستەم دەچوو، هاوڕێیەکی لەگەڵ کچەدا یەکدی بینینێکی بۆ سازکرد. بە خۆی و چاکەت و پانتۆڵێکی نیللی خەت خەتەوە، بە ڕیش و سمێڵێکی پاک تاشراوەوە، بە بۆنێکی تیژی عەترفرۆشە شامییەکانەوە، بە جووتێ گوێی عارەقاوییەوە، بە نیگای پیاوێکەوە کە لەبری ئەوەی فێڵ و جامبازی لە ڕوخساریدا بێت حۆلی و حەپۆلی لە چاویدا بوو، چوو بۆ بینینی ئەو کچە عەیارە. کچەکە هەر ئەوی بینی بێئەوەی بزانێت کێیە، بە شێوەی ڕۆیشتن و خۆگۆڕینیدا پیاوی کەرۆک و نەفامی ناو فلیمە عەرەبییە کۆنەکانی هاتەوە یاد، گرێکانی لووتی وەها ئاوسابوون و دەموچاوی بەجۆرێک سەر عارەق نیشتبوو، دەتگووت حوشترفرۆشێکی گێژی بەر خۆری باشوورە. کچەکە پاش تۆزێک وردبوونەوە لە قەد

وقیافەتـی عەتـار، بێئـەوەی خـۆی بخاتـە هیـچ قسەوباسـێکەوە بـە تەوسـەوە داوای لێبوردنـی کـرد و ڕۆیشـت، شـێوەی هەسـتان و جێهێشـتنی وەهـا تونـد و برینداركـەر بـوو، عەتـاری سسـتكرد. دواتـر بـە هاوڕێكـەی عەتـاری گووتبوو « ئێسـكی مـرێ. بۆنـی فـەردەی تـووری بـازاڕی لێدەهـات بۆیـە حـەزم نەكـرد بمێنمـەوە » . ماوەیـەک هاوڕێكانـی بـۆ گاڵتەجـاڕی پێیاندەگـووت «فـەردە تـوور» . فـەردە تـووری بـازاڕ... فـەردە تـووری بـازاڕ... عەتـار هـەر جارێـک دەچـووە بـەر ئاوێنەكە و سـەیری خـۆی دەكرد ئەو قسـەیەی بیردەكەوتەوە... هیـچ شـتێک لـە ژیانیـدا وەهـا برینـداری نەكردبـوو... لـەو كاتـەوە لەزەتێكـی گـەورەی لـەوە دەبینـی دوای ئافرەتـە ڕاكـردوەكان بكەوێـت... شـەڕواڵ و مراخانییـەک لەبەربـكات و بـە جێبـە تازەكەیـەوە بـازاڕی خـۆی گەرمبـكات و جگـە لـە نێچیرەكانـی بیـر لـە هیچـی دی نەكاتـەوە. ئێسـتا هەفتەیـەک بـوو تەنیـا سـەرقاڵی دابەشـكردنی وێنـەی یاقووتـی مەمـەد بـوو كـە هاوڕێیەكـی فۆتۆگرافـی دەسـتە دوای دەسـتە دەیشـتەوە و دەرزەن بـە دەرزەن بـۆی دەخسـتە زەرفـی تایبەتـەوە، تـا بەسـەر هاوكارەكانیـدا بەشـیبكات.

یاقووتـی مەمـەد لـە شـەوی یەكەمـەوە چـووە سـەر ئـەو تەونـە گەورەیـەی كیـژەكان مافووریـان لەسـەر دەچنـی. مافوورێـک وەک دەیانگـووت بـۆ هیـچ كەسـێكی ئـەم دونیایـەی ناچنـن، بەڵكـو بـۆ ئـەوەی دەچنـن بگەنەوەڕۆحـی خۆیـان. تریفـە كـە یەكەمجـار ئـەو ئامێـرە گەورەیـەی فەرشسـازی پیشـانی یاقـووت دا، بـە دەنگـە میهرەبانەكـەی خۆیـەوە گووتـی «ئـەم فەرشـەی ئێمـە دەیچنیـن، بـۆ ئـەوە نییـە ڕابخرێـت، بـۆ ئـەوە نییـە كـەس لەسـەری بوەسـتێت و لەسـەری دانیشـێت، بـۆ ئـەوە نییـە بڕواتـە بـازاڕ، بەڵكـو چـۆن باڵنـدەكان بـە ئاسـماندا دەفـڕن، ئێمـەش لەسـەر ئـەم فەرشـانە دەفڕیـن... بـە نـاو نەخشـەكانیدا سـەفەردەكەین و دەگەینـە دونیایـەک پیاوانـی دڕنـدە و دڵڕەقـی تیـا نییـە».

تریفـە یابەحـری لەسـەر كورسـییەک دادەنیشـت، بـەو دەنگـە سـیحراوییەی

خۆی، بە ڕێنماییە ئەفسووناوییەکانی دەستی کیژەکانی دەخستە سەر سەمایەکی بێوێنە. لەگەڵ بەرزبوونەوەی تێمپۆی فەرشچنیندا، مافوورچنەکان وەک تارماییان لێدەهات، دەکەوتنە ناو تەم و بولێڵێکی گەورەوە. کچەکان هێدی هێدی دەچوونە دونیایەکی تر و دۆخێکی ڕۆحی تریان وەردەگرت. یاقووت وەک ئەوانی دی لە سەرەخۆ لە شوێنی خۆی دادەنیشت، گوێی لە قسەکان و ڕێنماییەکانی تریفە دەگرت، فێردەبوو چۆن دەست بۆ ئەو دەزووە باریکانە بەریت کە وەک هەوا ناسکبوون، فێردەبوو هەموو دەزوییەک و تاڵێک و بەربەنێ وەک ژێی سازێکی گەورە وەزیفەیەک و دەنگێکیان هەیە، وردە وردە تێدەگەیشت ئەوەی مافوورێکی جوان دروستدەکات، ڕەنگی تاڵەبەنان و چەشنی بادان و جۆرێتی دەزووەکان نییە، بەڵکو جۆری ئەو دەستەیە کە دایدەنێت. یاقووت سەیری لێهات کە بینی هەر کات دەست لە تاڵی ئەو مافوورە دەدات، هەست بە هیچ ناکات، کە دەیگرێت هەستناکات شتێک لە دەستیایەتی، کە بەرزیدەکاتەوە دەیبینێت، بەڵام لەوە دەچێت تاڵێک تیشکی گرتبێت.

کە هاتە ئەمماڵە سەراپای ترس بوو، ڕاستە ماڵەکە لە شوێنێکی چەپەک و خۆشدایە، ڕاستە داپیرەیەک لەسەرەوە وەک ڕووپۆش و دەمامکی کۆمەڵایەتی تیادەژی، ڕاستە هەموو شتێک لەم ماڵەدا بۆنی دڵنیایی لێدێت. بەڵام دەیزانی سپیرەزان بەدوایەوەن، دڵنیابوو تا مردن بەدوایەوە دەبن. کە لەگەڵ ئەو کوڕەدا هەڵهات دڵنیابوو چ نامەرد و پرپوچێکە، هێند هەبوو دەیویست حیکایەتی ڕاکردنێک بژی «تەنیا حەیوان لەم وڵاتەدا هەوڵنادات لە ژیانی خۆی ڕابکات» یاقووتی مەمەد وابیریدەکردەوە... تا ئەوکات هەر کەسێکی ناسیبوو، هەموو ویستبوویان هەڵبێن. ئێستا کە دەستی لەو مافوورە دەدا هەستیدەکرد ئەم مافوورە دەیبات و لەگەڵ خۆیدا بۆ جێگایەکی دیکەی هەڵدەگرێت. نەورەسی گوڵ سۆلاف کە هێنای بۆ ئێرە پێیگووت «لەوانەیە ڕۆژێک ڕێکخراوێکی

بیانی یان کەسێکی دی کۆمەکت پێبکات لەم وڵاتە دەرچیت و لە شوێنێکی تر ژیان دەست پێبکەیتەوە... کێ چوزانێت؟». بەڵام کە لەسەر ئەو تەونە دانیشت لە دڵی خۆیدا گووتی «خودایە نامەوێت بچم بۆ هیچ شوێنێک، یارمەتیمبدە... خودایە... با وەک ئەم کیژانە بتوانم بەم مافوورە دنیام بیربچێتەوە...».

وەک تریفە دڵی بخوێنێتەوە دەستی خستە سەر دەستی و گووتی «یاقووت، جاران نەمدەویست بە خەیاڵ لەم دونیایە هەڵبێم... بەڵام ئێستا دەمەوێت... یاقووت... سەیرمکە، ئەم دونیایە وەها ناشیرینە، گوناهێکی گەورەیە جوانەکان تیا بژین... گوناهێکی گەورەیە».

## دانیشتنێکی درێژ لەگەڵ مورتەزای شەیتاندا
## حەسەن تۆفان - ئەیلولی ٢٠٠٤

شبر گووتی «هێزی ئێمە ئێستا لەوەدایە کە مورتەزای شەیتان نازانێت کێ ئێمەی ناردوە، دڵنیا نییە چ هێزێک لە پشت گەمەکەوەیە. یەکەمین شت مورتەزا دەیکات ئەوەیە بەوردی دەگەڕێت تا تێبگات و بزانێت ئێمە ژێر بە ژێر پەیوەندیمان بە چ لایەنێکی ناو حیزبەوە هەیە، دەکەوێتە سۆراغی ئەوەی کام لە سەرکردەکان پشت و پەنامانە، بەوەدا ئێمە ئاشکرا پەیوەندیمان بە کەسەوە نییە، ناگاتە ئەنجام... ناتوانێت خۆی لای مەغۆلی و بارۆنی پۆرسەلان ئاشکرابکات، دڵنیایە گەر ئاشەکە بە دیوێکی تردا بگەڕێت، خۆی تیا دەچێت، باشترین ڕێگا لە بەردەمیدا ئەوەیە لەگەڵ ئێمەدا ڕێبکەوێت... موتەزا ئەوە لە هەر کەس باشتر دەزانێت... ئەزموونی زۆری فێریکردوە شتەکان بە وردی هەڵسەنگێنێت، ئەو کەسێک نییە چاو بنوقێنێت و بە ڕێگادا بڕوات...

تەنیا کەسانی وەکو من و تۆ کە باکمان بە دونیا نییە دەتوانین چاو بنوقێنین و بڕۆین... مرۆڤ کە ویستی هەموو شتێک ببینێت، هیچ نابینێت... من لە حیزبدا بووم دەزانم زۆربەیان ئەو نەخۆشییەیان هەیە، هەموو لە هەوڵی ئەوەدان هەموو شتێک ببینن، بەڵام دواجار بە کوێری دێنەدەرێ و نابینادەبن، حەسەنی پیرۆ بە دەگمەن یەکێک هەیە لە حیزبدا بمێنێتەوە و کوێر نەبێت...»

نەخشە و ڕوانینە سەرەتاییەکانی شبر ڕاستبوون. هێندەی نەبرد ئێوارەیەکیان مورتەزای شەیتان لە بازاڕی فەرشفرۆشەکان لە بەردەمماندا قیتبووەوە و بە دەنگێکەوە لە دەنگی ئەو نەدەچوو گوتی «دەمەوێت بتانبینم... عەزیزان دەمەوێت بتانبینم. پێدەچێت قەدەر ئێوەی ناردبێت، من بخەنەوە سەر ڕێگای ڕاست... ڕۆشناییەک ببەخشنەوە بەم عومرە فانی و ناچیزەم».

ئەو ئەکتەربازی و نمایشسازییەی منی زۆر تووڕەدەکرد، زۆرجار کە دەمبینی بەو جۆرە دەدوێت و دەست بادەدات و قامەتی لوولدەکات، پەست و نیگەران دەبووم. شبر دەیگووت «ئەم پیاوە بە حوکمی ئەوەی کۆنە ئەکتەرە. ژیان وەک شانۆیەک دەژی». بەڵام من وام هەستدەکرد هەر ئەهریمەنە و فێری بەلاغەتی فریشتە بووە، دەتوانێت زمانی شیرین و لەفزی ناسک بێت، بەڵام لە ناوەوە شەیتانێکی بێڕەحم جڵەوی دڵی دەکات. لەسەر داوای خۆی، هەمان شەو من و شبر چووین بۆ دیداری... دەمانویست وابکەین لێمان نزیکبێت و تەرە و تەوەلا نەبێت. سەرەتای قسەمان لەسەر ئەوەبوو بۆ مورتەزا ئاوها بە بەلاغەتی فریشتەکان دەدوێت. گوزارەی «بەلاغەتی فریشتەکان» کە جارێک لە غەزەلەکانی هەزارباغدا بیستبووم، بۆ مورتەزا سەرەنجڕاکێش بوو، دەستیکردەوە بە نواندنەکانی خۆی و گووتی «هێشتا زارۆیەکی پاکبووم ڕەش و سپیم جیانەدەکردەوە، هێشتا مەعدەنم لای خوداش ڕۆشن نەبوو،

بەڵام لە چاو منداڵانی تردا ڕموزن و ناشیرین دەردەکەوتم... برایانی من، دۆستە دێرینەکانم، بە هەموو هەوری دونیا و بە هەموو غونچەی شەهید و نەگەشاوەی سەرزەوی سوێنددەخۆم، من تاکە ڕموزن نیگار و سەگڕوخسار و بەدوێنەی ئەو وەرزە نەبووم... سوێندتان بۆ دەخۆم و تکاتان لێدەکەم باوەڕم پێبکەن، لە وەرزێکدا لەدایکبووم هەموو منداڵەکانی ناشیرینبوون... منداڵانی ئەو وەرزە کەسمان ئاسایی و جوان وەک منداڵی وەرزەکانی دیکە لە دایک نەبووین... من کوڕی وەها وەرزێکی مەلعونم کە تێیدا شەیتانێکی برسی ماڵ بە ماڵ نیکاحی ژنەکانی ئەم شارەی کردوە... پێتاندەڵێم و ئێوە ئارەزووی خۆتانە باوەڕدەکەن یان نا. شەیتان لە هیچ شارێکی دونیادا بە ئەندازەی ئەم شارە ژنی لە خۆی مارە نەکردوە و نیکاحی نەکردون...».

شبر بە پێکەنینێکی بەرز گوتی «مورتەزا پێدەچێت بەلاغەتی جوانی زمانت هەوڵێک بێت بۆ ڕاستکردنەوەی بەلاغەتی چەوتی دەستەکانت. زۆرن ئەوانەی وشەی جوان بۆ شاردنەوەی ناشیرینی دڵیان بەکاردەهێنن».

گوتی «نا، بەلاغەتی جوانم بۆ شاردنەوەی دەستی ڕەش و دڵی ڕەشم نییە... بەڵکو بۆ داپۆشینی عەیبی ڕوخسار و ناشیرینی جەستەمە. پیاوە ناشیرینە بەستەزمانەکان گەر وشەی جوانیان نەبێت، لەم دونیا و لەو دونیا مەنزڵ و ماڵیان جەهەنەمە».

ئەو شەوە بە دەستێک جلی نوێوە، بەرابەرمان دانیشتبوو، بە خواری جگەرەیەکی خستبووە نێوان پەنجەکانی، نە دایدەگیرساند و نەدایدەنا، نە دەیبرد بۆ لێوی و نەدەیخستەوە پاکەتەکەی. دەستی بەچەشنێک دەماردار و ئێسکن و بێتووک بوو، مرۆڤی دەترسان. سەرەنجی ئەوەمدا مورتەزا نێوچاوانی بێئەندازە چرچ و ڕوومەتی سەیر ساف و کەم شوخت بوو، کۆمەڵێک ناکۆکی قووڵ لە دیمەنیدا وەها ناشیرینیانکردبوو، مرۆڤ گەر زۆر ئیجتیهادی لە نیگاریدا بکردبایە ترسی ئەوەی لێدەنیشت،

بگاتە ئەو ئەنجامەی بەڕاستی ئەم پیاوە لە نیکاحی شەیتان و مرۆڤ دروستبووە. بەڵام کە هەڵدەستایە سەرپێ، کە قیافەتە خوارەکەیم لە قاتی تازە و قوماشی قەشەنگدا دەبینی، دەگەیشتمە ئەو بڕوایەی ئەویش پیاوێکی ئاسایی ئەم وڵاتەیە... وەک من و شبر، وەک مەغۆلی و تونچی. بەدەنگە منگنەکەی خۆم قسەکانم پێبڕی و گووتم « مورتەزا... بیرتکردەوە؟ ئێمە کاتمان زۆر نییە، ئەوانەی لە ئێمە باڵاترن فشارمان لێدەکەن، دەیانەوێت قسەیەکی ڕاستیان لە تۆوە پێبگات، ناتوانین تەواوی وەختەکە لێگەڕێین سەرقاڵی بیرکردنەوە و حیسابات بیت».

وەک یەکێک هەموو ژیانی کەوتبێتە زەلزەلە، بە چاوێکی ترساو سەیریکردم و گووتی «ئێوە بە هەڵەدا دەڕۆن... من چیم؟ من کێم؟ بتوانم هەموو شتێک بزانم، من خزمەتکارێکم، بەردەستێکی بچوکم، مورتەزای شەیتان کە هیچ ڕۆحلەبەرێک خۆشی ناوێت کێیە تا خەڵک بکوژێت؟... خەسیو مورتەزا چییە؟ ها چییە؟ سەگێکەو هیچی تر. من بەیانیان کە هەڵدەستم دەڵێم ئەی ڕوناکی بمبورە کە بە لەشی خەواڵووم بە ناوتدا دەڕۆم... شەو کە بە ژێر ئاسماندا پیاسەدەکەم، دەڵێم خودایە نەکات بە تاریکی پێ بە مێروویەکی خەوتووتدا بنێم، چونکە نرخ و مانای ئەو مێروە لە نرخ و مانای من باشتر و بەرزترە...».

وام هەستکرد شبر بە پێچەوانەی منەوە لەزەتێکی زۆر لە قسەکانی مورتەزا دەبینێت. من هەروا بە منگنی گووتم «مورتەزا، کێ بەر پرسە لە کوشتنی ژنان... هەموو دەڵێن تۆیت؟ تۆ تاکەی لەسەر ئەم نمایشە پڕوپوچە بەردەوامدەبیت. من حەسەنی پیرۆم پێدەڵێن... تێدەگەیت، حەوسەڵەی ئەوەم نییە نیوەی عومرم دانیشم و گوێ لە درۆکانی تۆ بگرم».

بە غەمێکەوە قاقایەکی لێداو گووتی «من... مورتەزای دڵ پەپولە، مورتەزای خەسیو، غەمگین، دەم پاک، بەوەفا وەک سەگ، مورتەزایەک

کـە نازانێـت زەرنەقووتەیـەک ڕاوبـکات... مـن؟».
مـن بـە توڕەییـەوە پاڵمدایـەوە و گووتـم «واز لـەم لیبۆکبـازی و نواندنـە پوچـە بهێنـە کـە دەبایـە لـە شـانۆدا بیکەیـت... تێدەگەیـت، هەردووکمـان دەزانیـن کۆمەڵێـک مەیـت لـە نێـوان ئێمەدایـە. زاری خاوێنـت و وشـەی پاکـت ئـەوە ناشـارنەوە کـە دەسـتی خراپـەکارت و دڵـی بـەدت کردویانـە... حیـزب ڕۆڵـەی هەزارجـار لـە تـۆ کارامەتـری تـوڕداوە، خەڵکێـک هـەن نایانەوێت ناوی حیـزب بـە هـۆی تـۆ و بارۆنەکانـی دۆستتەوە پیسـبێت و تـۆزاوی بێـت، کێ هەیـە بیەوێـت شـکۆی حیزبێکـی نیشـتیمانپەروەر بـە هـۆی بەدکارییەکانـی ئێـوەوە لکەداربێـت و بکەوێتـە نێـو پیسـی و زەلـکاوەوە... مەسـەلەکە لـەوە ئاڵۆزتـرە کـە تـۆ تێیدەگەیـت».
توڕەبوونـی لـە نـاکاوی مـن ماندوویکـرد، هەسـتمکرد خـۆی وا دەردەخـات وەک ئـەوەی خەریـک بێـت لـە شـوێنی خـۆی بڕوخێـت، بـەڵام سـەیریکردم و بـە دەنگێکـی سـادە و ئاسـایی و دڵنیـاوە گووتـی «مـن نەمکوشـتووە... مـن هیـچ کەسـم نەکوشـتووە». هەناسـەیەکی هەڵکێشـا و گووتـی «هەمـوو خەڵـک وادەزانـن مـن کوشـتوومن، بـەڵام مـن نەبـووم، مورتـەزا نەبـووە».
شبر جگەرەیەکی داگیرساند و گووتی «ئەی کێ بوو؟».
کەمێـک وەسـتا و وەک یەکێـک بڕیارێکـی زۆر سـەخت جێبەجێبـکات گووتـی «ئـەو ژنانـەی لـە گەڕەکـی بابـەردان سـووتان، مـن نەبووم... قەسـەم بـە باڵـی بچکۆلانـەی بولبـول کـە لەگـەڵ گەردەلوولـدا شـەڕدەکات. مورتـەزا کەسـی نەکوشـتووە. ئـەوە مـن نیـم.. مـن کێـم؟ ئێـوە مورتـەزای بەدبەخـت وەک چـی دەبینـن و وەک کـێ تەماشـایدەکەن؟... ئـەوە عەتـاری مەلعـون بـوو ماڵـی ئـەو ژنانـەی دۆزییـەوە... عەتاربـوو. ژنـی بارۆنـی پەشـمەک لـەو ماڵـەدا بـوو، دە مانـگ بـوو ژنـی بارۆنـی پەشمەک ڕایکردبـوو، عەتـار ئـەو ماڵـەی دۆزییـەوە... مـن ئـاگام لـەوە نییـە... سـیولالا... چـۆن مـن دەخەنـە هەمـوو حیکایەتێکـەوە؟ چـۆن؟ مورتـەزا لـەوە پاکتـرە ئاگـر لـە

خەڵک بەربدات... ئەوە ژنی بارۆنی پەشمەک بوو لەوماڵەدا سووتا».

شبر خۆشحاڵبوو کە مورتەزا خەریکە دێتە قسە، بە کەمێک بێباکییەوە دەستی بە قژیدا هێنا و گووتی «بەڵام تۆ بەرپرسی لە کوشتنی دوو ژنی تر لە نوێمیران... خۆ حاشا لەوەیش ناکەیت...».

مورتەزا بە چاوێکی غەمگین و ترساوەوە سەیری هەر دووکمانی کرد، کەفێکی سپیم لەسەر لێوی بینی و بە دوو لێوی وشکەوە گووتی «من کەسم نەکوشتووە، لە هەموو ژیانمدا مێرولەیەکیشم نەکوشتووە... من هیچ نیم جگە لە زێوانێکی بەدبەخت... من ناتوانم خەڵک بکوژم، قەسەم بە تەرزەی پاک کاتێک بەر چیمەن دەکەوێت... قەسەم بە برایەتی کاتێک دڵپیسی و گومان ڕاودەنێت و دەیبەزێنێت و ئەتکیدەکات... کەسم نەکوشتووە».

لەوێدا هەستمکرد وشەکان تەواو لە زاری ناترازێن. لە شوێنی خۆی هەستاو گووتی «ئێوە نازانن مورتەزای داماو کێیە... شوێنێکی لەوە بەرزترتان داوەتێ کە هەیەتی، چڵی درەختێکتان پێ ڕەوا بینیوە کە نایگاتێ، لە باغێکدا داتانناوە کە نایبینێت. من خزمەتکارێکی بچوکم، بچوکتر لەو عەبدانەی زەمانی زوو لە دیوان و دەربارەکاندا پادشا سواریان دەبوو، من لەوانە بچوکترم... من کەسم نەکوشتووە، سیولالا... من خەڵک دەهێنم و دەبەم، هەواڵ دەهێنم و دەبەم... شتێکی بچوک دەکەم بۆ ئەوەی بژیم... بەڵام چونکە ئەم شارە کەسێکی دی وەک من دزێوی تێدا نییە، هەموو گوناهەکان دەخەنە ملی من... گەر جوان بوومایە، گەر ددانەکانم وەک ددانی شەیتان نەبایە، کەس نەیدەوێرا ئاوها بمکاتە خزمەتکار و دواتریش بمکاتە گوناهبار... ئێوە چی لە ژیانی خەسیو مورتەزا دەزانن... چی لە ئازارەکانی دەزانن... چی لەوە تێدەگەن گەر هەموو ژن و کچی ئەمشارە بە خۆڕا وەک سەگ تەماشاتبکەن... ها چی لەوە تێدەگەن؟... من ئەکتەرێکی شانۆ بووم... چەند ساڵ لەمەوبەر

دەوری یاگۆم بینی، وای لە من. کە دەمگووت «ئەوە دەستەسرەکەی تۆیە ئۆتیلۆ» هەموو خەڵک هەڵدەستان و چەپڵەیان بۆ لێدەدام... بەوە گوناهباریانکردم کە کۆمەکم بە هاوڕێیەکی خۆم کردوە ژنەکەی بکوژێت، بە خۆڕا چوومە زیندانێکەوە کە شایستەی نەبووم... هەموو دەتانەوێت مورتەزا یەکەمین گوناهبار بێت، هەموو واتان دەوێت، هەموو پیاوکوژێکتان پێویستە تاوانەکانی پیا هەڵواسن. بەڵام من کەسم نەکوشتووە». مورتەزا وەها ترساو و کۆم و چەماوەبوو بەزەیم پیا هاتەوە.

شبر بە گومانەوە لێیپرسی «مورتەزای شەیتان، تۆ کێیت؟». من لە پرسیارەکەی شبر تێنەگەیشتم، نەمزانی ئاخۆ دەیترسێنێت، یاخود بەڕاستی دەیەوێت بزانێت کێیە. بۆ ساتێک منیش کەوتمە گومانەوە و لە شوێنی خۆم هەستام و سەیری چاوی مورتەزام کرد، منیش بە دەنگێکی کپ و غەمگین گووتم «مورتەزا تۆ کێیت؟ تۆ کێیت؟». وەهابوو وەک ئەوەی دەنگم لە دوورەوە بێت، وەک ئەوەی پرسیارێکی زۆر قووڵ بکەم و بۆ نهێنییەکی زۆر بێبن بگەڕێم، وەک ئەوەی لە شانۆگەرییەکدا بم و تێکستەکە بیسەپێنێت بەسەرمدا ئەو پرسیارەبکەم. لە ناکاو هەستم بە سۆز و بەزەییەکی گەورەکرد بەرابەری، کەمێک لە ژوورەکەدا سوڕامەوە و بە خۆم گووت «حەسەنی پیرۆ عاتیفە نەتبات، تۆ ئێستا ڕۆحی نەوجەوانی چینی لە لەشتدایە، دڵی کەسێک لە هەناوتدایە کە دەیەوێت بزانێت باران شوکور چی لێهاتووە». بە بێڕەحمی گەڕامەوە سەری، وەها لە کورسییەکەی خۆیدا گرمۆڵەبووبوو، تەنیا تۆزێکی دەبینرا. گووتم «مورتەزا ئەو شەوەی کە موراد جەمیلیان کوشت تۆ لە گەڵیاندا بوویت؟». بە دەنگێکی گریاوەوە گووتی «من هاوارمکرد مەیکوژن... قەسەم بە شەماڵی هاوین و سروەی بەهاران، هاوارم لە هەموویان کرد، نەیکوژن...گووتم کوشتنی ئەم پیاوە سوودی چییە، شەوێکی مانگەشەو

بوو. من دەبووایە موراد جەمیل بە قسەی خۆش لە ماڵ بهێنمە دەرێ. خۆی کە منی بینی هەموو شتێکی دەزانی. باوەڕم پێبکەن، کراسێکی پرتەقاڵی گەنجانە و کاوبۆیەکی لەبەردابوو، کە بە ناوی نەوجەوانی چینی بانگمکرد، زەردەخەنەیەک کەوتە سەرلێوی و بەدەنگی بەرز وەک وەڵامی مردن بداتەوە، وەڵامیدامەوە. سوێندتان بۆ دەخۆم کە دەستم لە دەستی دا دەیزانی بۆ کوێی دەبەم. بەڵام چۆن یاریکەرێکی شادومان دوای تۆزێک خۆگەرمکردن بە حەماسێکی بێوێنەوە دێتە ناو گۆرەپان، ئاوها شاد و بەجۆشبوو. مانگەشەو بوو، فێنکییەکی بەهارەی خۆشبوو، مانگ وەک داسێکی زیوین وابوو، عەفوومکەن... برایان عەفوومکەن... لەم بەلاغەتە سەقەتەم ببوورن... مانگ بە کەوانەیەکی ڕۆشندەچوو لە کتێبێکی جوان فڕیبێت و لە ئاسمان نیشتەجێبووبێت. هەور دەیگرت و بەریدەدا، دڵی من وەک ئەو مانگە وابوو... من نەمویستووە کەس بکوژم... باوەڕ بە مورتەزا بکەن... عاشق کوشتن لە دینی مندا نییە، بەڵام بارۆنی کولەکە... وەها نائومێد بوو... وەها بریندار‌بوو... سوێندتان بۆ دەخۆم کە تا سەر ئێسقان لە بارۆنی کولەکەش دەگەیشتم... لە بەرئەوەی کوڕێکی هەژار بوو، لەبەرئەوەی لە کۆڵکێشییەوە بووبوو بە بارۆن هەموو ڕقیان لێیبوو، هەموو حەزیاندەکرد ژنەکەی حیزبێت...».

لە ناکاو وەک هوروژمێکی عاتیفە گرتبێتی، دەستی خستە سەر دەموچاوی و گووتی «زۆر بیری نەوجەوانی چینی دەکەم، زۆر بیریدەکەم... من دوو ساڵ زیاتر بوو بەدوای هەموو شتێکیدا دەڕۆیشتم، دوو ساڵ زیاتر بوو، دوو ساڵ لە مەوبەر بارۆنی پۆرسەلان منی ڕاسپارد بۆ ئەوەی هەنگاو بە هەنگاو دوایبکەوم و هەموو زانیارییەکی لەسەر کۆبکەمەوە. دەمزانی لەگەڵ چەند ژندا پەیوەندی هەیە... قەسەم بە هەموو ئەستێرەکانی ئاسمان دەمزانی لەگەڵ چەند ژندا پەیوەندی هەیە. قەسەم بە ڕەشەبای بەیانیانی هاوین، قەسەم بە ڕۆحی درەختی کوژراوی ناو تۆفان... گەر

بمویستبایە خراپە بکەم، گەر بمویستبایە یارییکەم، فیتنە بنێمەوە هەموو شتێکم دەکرد، بەڵام ئێوە نازانن مورتەزا چ دەست و دەمێکی پاکە... گەر خراپەیەکی کردبێت، باشی خۆی پێیکردوە... گەر خراپەی بەرابەر یەکێک کردبێت بۆ ئەوە بووە دڵی یەکێکی تر خۆشبکات... ئای چەند بیری نەوجەوانی چینی دەکەم، ماوەیەک ئیشم ئەوەبوو ناوی ئەو کچ و ژنانە بخەمە لیستەوە کە ئەویان خۆشدەویست... ئەوەتەی خزمەتی بارۆنەکان دەکەم ئەوە یەکەمجار بوو خۆشی لە ئیشێک ببینم... ڕۆژ بە ڕۆژ نهێنی موراد و ژنانی ئەم شارەم پێدەگەیشت... خوشکی فیلان و فیسار... کچی کێ و کێ... ژنی ئەم و ئەو... خوای گەورە... ڕۆژ بە ڕۆژ منیش عاشقی نەوجەوانی چینی دەبووم... منیش عاشقی دەبووم... ڕۆژ دوای ڕۆژ زانیارییەکانم دەبرد بۆ بارۆنی پۆرسەلان و ئەو دڵخۆشدەبوو. موراد لەگەڵ هەر ژنێکدا بخەوتبایە، بارۆنی پۆرسەلان لای خۆی دەینوسی، حەزی لەوەیە نهێنی خەڵک بزانێت، حەزی لەوەیە گەر هاتنە سەر ڕێگای و بوونە دوژمنی هێندەی زانیاری لەلابێت بیانترسێنێت. تا دواجار تێگەیشت یەکێک لە عەشیقەکانی موراد خوشکێکی خۆیەتی... من پێشتریش ئەوەم دەزانی، بەڵام بە قسەم نەکرد و زاری خۆم بەست و نەمدرکاند... دەمزانی دەیکوژێت، ئێوە مورتەزا وەک پیاوێکی شەیتان و بێڕەحم سەیردەکەن... من یەک ساڵ بوو دەمزانی هێشووی خوشکی بارۆن دۆستی نەوجەوانی چینی بووە، بەڵام بۆ ئەوەی ژیانی ئەو کوڕە بپارێزم نهێنیەکەم شاردەوە و خۆڵم پیاکرد و لە دڵی خۆمدا خنکانم. دەیانجار بارۆنی کولەکە دەینادرم بۆ ئەوەی سۆراغی باران شوکور و موراد بکەم و من بە گریانەوە دەگەڕامەوە و دەمگووت بارۆن ژنەکەت لە بللور سافترە، لە ئاونگ بێگەردترە... درۆمدەکرد... بە چاوی خۆم لە باوەشی یەکدا دەمبینین و درۆمدەکرد بۆ ئەوەی نەکوژرێن. تا توانیم درۆمکرد... بەڵام جێگایەک هەیە ئیتر خەنجەرەکە دەگاتە ملی خۆت

و ناتوانیـت درۆبکەیـت... کـە بارۆنـی پۆرسـەلان زانـی خوشـکەکەی خـۆی یەکێکـە لـە دۆسـتەکانی مـوراد گووتـی دەبێـت بیکوژیـن... سوێند دەخـۆم بـە هەمـوو ئەسـتێرەی بەربەیـان... سوێندەخۆم بـە گـوڵاوی ئـەو باغانـەی کـە تـا ئێسـتا ئادەمیـزاد پێـی تێنەخستوون، بارۆنـی کولەکـە بێگوناهـە... بـارۆن بـە تەنیـا نەیدەتوانـی بیکوژێـت... بـارۆن نەیدەویسـت بیکوژێـت، بـەڵام بارۆنـی پۆرسـەلان چـووە بنکڵێشـەی بارۆنـی کولەکـە... یـەک مانـگ بـوو دەیانویسـت بیانکـوژن، شـەو دوای شـەو کاتیـان دیاریدەکـرد. مـن هەمـوو جارێـک دەکەوتـم بەسـەر دەسـت و قاچـی بارۆنـدا و دەمگـووت تـۆ ئـەو ژنـەت خۆشـدەوێت، بـۆ دەیکوژیـت... بـارۆن بـۆ دەیکوژیـت؟... بـارۆن دەگریـا... قەسـەم بـە بۆنـی فریشـتە پاکیـزەکان... درۆ ناکـەم. بارۆنـی کولەکـە نەیدەویسـت بیکوژێت، بـەڵام بارۆنـی پۆرسـەلان لـە ژێـرەوە ئەوانـی تـری لێهانـدا... ڕۆژانـە نامەیـان بـۆ دەنـارد و پێیـان دەگـووت ژن حیـز... هیهـی... عەفوومکـەن بـەڵام وایـان پێدەگـووت... پێیاندەگـووت ئەمشـەو کـە چوویتـەوە بزانـە ئەسـتێرەکان بـە کوێـی ژنەکەتـەوەن... تێدەگـەن... بارۆنـی کولەکـە منداڵێـک بـوو، گەنـج بـوو، وەک بـاران و مـوراد گەنـج بـوو، نـاو حیزبـی نەبینیبـوو، نەیدەزانـی چـی لـە دەوری ڕوودەدا... ئـەو بەڕاستی حـەزی لـە بـاران بـوو. بـەڵام بـە نامـە و تەلەفـون شـێتیانکرد... بـە زۆر خستیانە سـەر ئـەو بڕوایـەی کـە بیکوژێت. کەدڵنیابووم بـارۆن هیچ جارێکـی نەمـاوە جگـە لـەوەی بیکوژێـت... دوو نامـەم بـۆ بـاران شـوکور نوسـی و گووتـم بـارۆن و مورتـەزا دەیانەوێـت بتانکـوژن، بـڕۆن و ڕاکـەن... خـوای گـەورە... ئـەوە مـن بـووم ئـەو دوو نامەیـەم نوسـی... ئـەوە مـن بووم... مـن بـووم...».

وەک مارێـک دوای گرمۆڵەبـوون بکرێتـەوە، کەمێـک خـۆی کێشـایەوە و لەسـەر کورسـییەکەی هەسـتا. مـن تـا ئـەو کات لـە بـەر پەنجەرەکـەدا وەسـتابووم. بـەرەو ڕووم هـات و گووتـی «ئـەو شـەوەی کـە کوشـتیان

کراسێکی پرتەقاڵی لە بەردابوو. کارەبای شار هەر هەمووی بڕابوو، یەک فیدەریش چییە ئیشی نەدەکرد».

سەیرێکی منی کرد و بە دەنگێکی گڕ و ترسا و گووتییەوە «یەک فیدەریش چییە ئیشی نەدەکرد».

هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە عادەتی خۆی پێکەنی و گووتی « من و بارۆنی کولەکە لە دواوە سواربووین و جەعفەری مەغۆلی لە پێشەوە... من بە موورادم گووت هۆڵێکی ئاهەنگمان بە کرێ گرتووە، نیازی شاییەکی زۆر گەورەمان هەیە، وەرە و بزانە لە چیمان کەمە و چیمان دەوێت. موراد خۆی وا دەرخست کە باوەڕی پێکردوم... شتێکی نەگووت بۆنی گومانی لێبێت. کە بارۆنی کولەکەی بینی گووتی « بارۆن لە مێژە دەمەوێت بتبینم». مەغۆلی وەک برایەکی شیرین دەستیکردە ملی و گووتی «سەیرێکی هۆڵەکەمان بۆ بکە بزانە مواسەفاتی تێدایە»... هی هی هی هی. هەر کارێک کوشتنی تیابێت و نەیانەوێت نهێنییەکەی بچێتەدەرێ، مەغۆلی خۆی دەیکات... ناهێڵن دەستی تری تێکەوێت... بەدرێژایی ڕێگا موراد جەمیل و جەعفەری مەغۆلی نوکتەیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە... پێدەکەنین... باسی ئەو ژنە عەرەبانەیان دەکرد کە هاتوون بۆ ئوتێلەکان... موراد زۆر دڵی خۆشبوو».

من دەستیم گرت و گووتم «بۆم مەگێڕەوە، بۆم مەگێڕەوە، من هەموو شتێک دەزانم... دەزانم مەغۆلی چۆن کوشتوێتی... من برادەری مەغۆلی بووم، هەموو شتێک دەزانم... پێمبڵێ... باران شوکورتان چۆن کوشت؟».

مورتەزا چووەوە سەر کورسییەکەی و دیسان خۆی گرمۆڵەکردەوە، شەیتانێکی وەها قاچ درێژ بوو، کە بەو جۆرە دادەنیشت، نوکی ئەژنۆ تیژەکانی وەک قاچی مێروویەکی زەبەلاح زۆر لەسەروو لەشییەوە بوون. سەیری لێهات کە وەسفی ئەو شوێنەم بۆ کرد کە مورادیان تیا

ناشتووە. گووتی «نا... نا.. مورادمان لەوێدا نەکوشت، لە جێگایەکی دی کوشتمان. کە جەعفەری مەغۆلی دوا تەقەی لێکرد و دەستەسڕێکی خستە خوێنەکەیەوە، بە هەر سێکمان لاشەکەمان خستە پشتی ئۆتومبیلەکەی بارۆنی کولەکەوە و ویستمان بیهێنینەوە بۆ نوێمێران... وای لەو شەوە... ئەو ماوەیە هەموو مەیتەکانیان دەهێنایەوە بۆ نوێمیران... کە گەڕاینەوە، هێزێکی گەورە چواردەوری هەموو ئەو گەڕەکەی گرتبوو، کونسڵی بەریتانی و بەرپرسێکی گەورەی ئەمریکی هاتبوون بۆ ماڵی بارۆنی شەکروچا... هێزەکانیان وا دابەشکردبوو، پۆڵ برێمەریش بهاتایە تا دەگەیشتە ماڵەوە سێ جار دەیانپشکنی. مەغۆلی ماشێنەکەی گێڕایە دواوە و هاتین و بە ناچاری لەو پێدەشتەدا ناشتمان». بە ترسێکەوە سەیری هەردووکمانی کرد و گووتی «بەڕەحمەتبێت، کوڕێکی جوان بوو».

شبر بێئەوەی مژی لە جگەرەکەی دابێت کوژاندییەوە و گووتی «باران شوکریشتان هەمان شەو کوشت؟»‌.

کەمێک وەستا و پاش بیرکردنەوەیەکی کورت گووتی «کە گەڕاینەوە کاتژمێر یەکی شەو بوو، کونسوڵی بەریتانی و میوانەکانی دی هەموو ڕۆیشتبوون. هەور دەهات و دەڕۆی، با هەڵیدەکرد و خامۆشدەبوو... قەسەم بە شەونم و غونچە، شەوێکی خۆشبوو. گەر ئەو دوو کوشتنەی تێدا نەبایە، شەوێکی خۆشبوو...». بەجۆرێکی سەیر دەستی لە دواوە درێژکرد و ئەژنۆکانی خۆی خوراند..وەک بیریکاتەوە بەزەردەخەنەیەکی گەورەوە سەیری هەردووکمانی کرد و ماوەیەک بێدەنگبوو. پاشان تۆزێک خۆی ڕاستکردەوە، لە جانەوەرێک دەچوو خۆی بۆ قەڵەمبازێکی گەورە ئامادەبکات، ملی وەها درێژ بوو لە قازێک دەچوو بیەوێت گوێ لە دەنگێکی دوور بگرێت. تا زیاتر لە ڕوخساری وردبوویتایەتەوە دزێوتر و دزێوتر دەردەکەوت، هەموو جۆرەکانی ناتەبایی و تێکچوون لە شێوەی لەش و قەپۆزیدا بوو. گووتی «بارۆنی پۆرسەلان و مەغۆلی بە بارۆنی

کولەکەیان گووت ئێمە باران شوکور ناکوژین، ئەوە ژنی خۆتە و دەبێت تۆ ئەو کارە بکەیت. بارۆنی کولەکە خەریکبوو دەگریا، خودا شاهیدە من کەسم نەدیوە وەک ئەو پیاوە ژنی خۆی خۆشبوێت... کە گەیشتینە ماڵێ، نوێمێران سەراپا خامۆشبوو، خامۆشی شارێک نا کەخەوتبێت، بەڵکو شارێک مردبێت، نوێمیران کە دەخەوت وەک مردووی لێدەهات کە هەڵیشدەستا وەک مردوو لە خەو هەڵدەستا، خاو و خلیچک و خەواڵوو. هیهی هیهی... دەرگای حەوشەمان کردەوە، من وامدەزانی دەنگی دەرگاکە لەسەرتاپای شاردا دەبیسترێت... هیهی... سیولالا... هیچ شتێک لای من وەک جیڕەی دەرگا لە نێوەشەودا ترسناک نییە... برایان... لە حەوشەکەی ماڵی بارۆندا وەستام و بۆنی گیای بەهاران مەستیکردم، پێتان سەیر نەبێت لەو ساتەدا کە هێشتا بۆنی خوێنمان لێدەهات، من بۆنی گیا مەستیکردبووم... بۆنی گیا... من نوقمی بۆنی گیابووم... مەغۆلی بە منی گووت، لەگەڵ بارۆندا بچمە ژووریێ و گەر پێویستی بە یارمەتی بوو، یارمەتیبدەم... لەگەڵ بارۆنی کولەکەدا سەرکەوتم بۆ قاتی سەرەوە. باران لە ژووری خەوتنەکەی خۆیدا خەوتبوو، گڵۆپێکی شینی سفری داگیرساندبوو... قەسەم بە دامێنی هەموو مرۆڤە ڕاستگۆکانی ئەم زەمینە، ئەو گڵۆپە سفرە لەو گڵۆپە دەچوو کە بیست ساڵ لەوەوبەر لە شانۆگەری ئۆتیلۆدا بەکارمانهێنا، هەمان ڕەنگی شینی هەبوو کە لەسەر شانۆی گشتی پەروەردە لە دوا دیمەنی شانۆگەرییەکەدا دامانگیرساند... هەمان ئەو ڕەنگەی هەبوو. بارۆنی کولەکە وەک ئۆتێلۆ چووە سەر جێگاکەی باران شوکور کە وەک دێزدەمونە لەسەر سیسەمێکی قەشەنگی ژن و مێردایەتی خەوتبوو. وەک ئەوەی باران پێشتر مردبێت بە ئاگا نەهاتەوە، وەک ئەوەی خۆی لەو قسانە بپارێزێت کە دێزدەمونە دەیکات، وەک گەردنی خۆی بۆ پەنجەی جەلادێک ڕووتکردبێت، گەردنە سپی و جوانەکەی وا دانابوو، تەماحی خنکاند و دەست لێدانی لە دڵی بارۆندا

گەورەترکرد. قەسەم بە هەناسەی پاکی منداڵ، قەسەم بە پەڕی کۆترێک کە گوڵلەی نامەقی ڕاوکەر بەر سینەی دەکەوێت، هیهیهیە هی... قەسەم بە باری تەعالا کە باڵی ناسکی پەپولە و کەڵبەی گورگیشی دروستکردوە. هەموو شتێکی لەو دیمەنەی کوشتنی دێزدەمونە دەچوو بە دەستی ئۆتێلۆ. جلە سپییەکانی باران شوکور، دەستکێشە ڕەشەکانی بارۆنی کولەکە، بێدەنگی ژوورەکە. بەڵام نە من یاگۆ بووم، نە بارۆنی کولەکە ئۆتێلۆ بوو، نە باران شوکور وەک دێزدەمونە بێگوناه بوو. کە بارۆن دەستی خستە بینی باران بیخنکێنێت، باران نە ڕاچڵەکی، نە جوڵایەوە، نە هەستم بە خیزە و قرغە و هەناسەتەنگی کرد. ئێستاش دەڵێم، بەرلەوەی بارۆن دەستبخاتە بینی باران ئەو مردبوو... سوێند بە بای سەبا و شەماڵی دەمە و سەحەر. بینیوتانە؟ کەس لە ئێوە بینیوێتی مەخلوقێکی زیندوو بخنکێت و نەجوڵێتەوە؟ کەس لە ئێوە بینیوێتی مرۆڤێک لە خنکاندا هاوارێک یان دەنگێکی لێوە نەیەت؟. من هەزاجار بە بارۆنم گووت بەر لەوەی تۆ باران بکوژیت، ئەو مردبوو، بەڵام ئەو دەڵێت من هەستم بە ترپەی دڵی کردوە، هەستم بە هەناسەی کردوە، هەستم بە نوری نیگا و خوڕەی خوێنی کردوە. بەڵام کێ دەڵێت هەمووی وەهمی پیاوێک نین کە بەدوای گوناهێکدا دەگەڕێت خۆی پێ ئەشکەنجەبدات؟ من دەزانم ئەو فشارەی کە بارۆن بە پەنجەکانی خستبوونییە سەر گەردنی باران بەشی ئەوەی نەدەکرد باڵی پەپولەیەک بشکێنێت. بەشی ئەوەی نەدەکرد گوڵێک لە چڵەکەی بکاتەوە بۆیە وا باوەڕدەکەم ئەوە تەنیا حەسرەت و خۆئەشکەنجەدانە وا لە میری کولەکە دەکات خۆی بە گوناهبار بزانێت...».

من پێمگووت «یاخود تۆ حەزدەکەیت بارۆن بێخەتا دەرچێت؟».

کەمێک بێدەنگبوو و گووتی « ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە کە بینیم. خودای گەورەمان شاهیدە، من ئەوەم بینیوە کە گێڕامەوە. ئەو شەوە

لاشـەكەی بارانـم هەڵگـرت و ناشـتم. بارۆنـی پۆرسـەلان و مەغۆلـی بارۆنـی كولەكەیـان بـرد و تـا هەفتەیـەك نەمبینییـەوە. بـۆ ئـەوەی غەمـی خـۆی فەرامۆشـبكات، هەفتەیـەك لـە مـەی زیاتـر هیچی نەنۆشـیبوو، لـە ماڵـی ئـەم سۆزانییەوە چوویـوو بۆ ماڵـی ئـەوی دی، دوای هەفتەیـەك كـە بینیم، ڕیشـی هاتبـوو... بێخـەوی و مـەراق خەریكبـوو دەیانكوشـت... لـەو بەدبەختییـە دوورمخسـتەوە و هێنـام بـۆ ئـەم ماڵـە، هێنـام بـۆ ئـەم ژوورە. هەفتەیـەك ئامۆژگاریمكـرد... ڕێـم نیشـاندا... بەسـەریدا هاتـم، كـە هاتـەدەرێ دەترسـا، ئێسـتاش لـە هەمـوو شـتێك دەترسـێت... ئـاە ئـەی بەیانییـە خوێناوییەكانـی ژیـان، لەدەسـت ئێـوە بـۆ كـوێ بچیـن؟... ئەویـش گەنجـە، ئەویـش لێقەومـاو و دەسـتخەڕۆیە...هیهی هیهـی هیهـی... وەك مـن و وەك ئێـوە... ».

مورتـەزا ئێسـتا بـە پێـوە قسـەیدەكرد، چاوانـی كرابوونـەوە، ددانەكانـی زەرد و كـۆن دەیاننوانـد. لـە كاتـی قسـەكردندا وەك وشـەكان هەڵبـدات و بیانگرێتـەوە دەسـتی بـە هەمـوو لایەكدا دەجوڵاند. وەك مارێـك هاتە بەرچاوم كـە تاوێـك پەپكەدەخـوات و تاوێـك دەكرێتـەوە. شـبر بەسەرسـامییەوە سـەیری منـی كـرد و دووبـارە لـە مورتـەزای پرسـییەوە «مورتـەزا تـۆ كێیـت؟ ڕۆڵـی تـۆ چییـە؟ تـۆ چیـی دەكەیـت؟ بـۆ تـۆ لـە نـاو یارییەكەدایـت؟».
مورتـەزا لـە بەرچـاوی مـن لـە درەختێكـی بێگـەڵای پیـر دەچـوو لـە نـاكاو ڕۆحـی تێگەڕابێـت و بەچیلكـە و وشـكەبەرگی خۆیـەوە بـە زەویـدا بـڕوات، هەندێـك بـەلای منـدا وەرگـەڕا و سـەیرێكیكردم و بـە قاقایەكـی زۆر بـەرزەوە گووتـی «وامەزانـن، مـن لـە ترسـدا قسـەتان بۆدەكـەم. گـەر وابزانـن زویردەبـم لێتـان. بۆیـە ڕاسـتی دەڵێـم، چونكـە حەزدەكـەم نهێنـی بدركێنم، هیچ شـتێك لـە دركاندنـی نهێنـی خۆشـتر نییـە. هیـچ شـتێك لـەوە خۆشـتر نییـە لـە بەردەسـت دوو پیـاوی پـاك و گـەورەدا دانیشـیت كـە دەیانەوێـت حەقیقەتیـان گـوێ لێبێـت... وای وای لـەو لەزەتـە. مـن ڕۆحـم بەسـەر ئەوانـەوە دەردەچێت كـە دەیانەوێـت حەقیقەتیـان گـوێ لێبێـت... ئێـوە وادەزانـن مـن شـەیتانێكی

درۆزنـم و ڕقـم لـە حەقیقەتـە، وادەزانـن لـە قووڵایـی ڕۆحمـدا ئـارەزووی درکاندنـی ڕاسـتیم نییـە... نـا، ئێـوە هەڵـەن، مـرۆڤ بۆیـە دەچێتـە نـاو بەحـری نهێنییەکانـەوە تـا دواتـر کـە هاتـەدەرێ کۆمەڵێک حیکایەتـی پێبێت. کـە چوومـە بنـی بیـری ئـەم شارەوە خولیـا و خەیاڵـم لای ئـەم ساتەبوو کـە درەنـگ یـان زوو ڕۆژێـک هەمـوو شـتێک دەگێڕمـەوە... ڕۆژێـک لەبـەردەم دوو پیـاودا کـە حەزیـان لـە بیسـتنی حەقیقەتـە ئەژنـۆ بەسـتەزمانەکانم شـلدەبن، زمانـی ترسـاوم شـلدەبێت، هیهیهـی ملـی بەسـتەزمانم شـۆڕدەبێت و هەمـوو شـتێک دەگێڕمـەوە. مـن دە ساڵە چاوەڕێـی مەخلوقێـک دەکـەم لێمبپرسـێت، مـن کێـم. بـەڵام کـەس ناوێرێـت. کـەس ناوێرێـت لـە مورتـەزای شـەیتان بپرسـێت... تـۆ کێیـت؟ ڕاسـتە مـن خزمەتـکارم، بـەڵام مـن سـندوقی دەرد و نهێنیشـم... سـندوقی دەرد و نهێنیـم».

ئێسـتا قامەتـی نەرمەجوڵـە و بزۆکتـر دەهاتـە بەرچـاوم، ڕووی بـە شـێوەیەکی کتوپـڕ کرابـووەوە. دەیڕوانـی و سـەرتاپای ڕوخسـاری یـەک زەردەخەنـەی گـەورە و ناشـیرین بـوو. مـن بـە ئەسـپایی گووتـم « ئـەی بارانـت لـە کـوێ ناشـت؟». گووتـی «حەسـەن تۆفـان... مـن ئـەوە نیـم کـە تـۆ تێدەگەیـت... مـن ئـەوە نیـم... هەمـوو وادەزانـن مـن پیاوێکـی گرنگـم، لـە «سـوارانی زۆزان»یـش وادەزانـن مـن لای بارۆنـەکان پلەوپایەیەکـی بـەرزم هەیـە... بـەڵام وانییـە... ڕاسـتە مـن زۆر خزمەتیاندەکـەم... بـەڵام برایـان... برایـان... مـن هیـچ نیـم جگـە لـە مردوونێـژی ئـەوان... مـن بەحرێکـی قووڵـی نهێنیـم، هەمـوو وادەزانـن کـە نهێنییەکـم خسـتە نـاو دڵـم ئیتـر مـەرگ نەبێـت هیچـی تـر لێـم نابیسـتێت. شـبر مسـتەفا دەتەوێـت بزانێـت مـن کێـم؟... مـن سـندوقی ڕەشـی بارۆنەکانـم... ئـەوان هەرچـی شـتێکی ڕەشـیان هەبێـت لـە دڵـی منـدا دەینوسـن. کتێبێکـم کـە دڵـی بەسـتەزمانی خـۆم دەکەمـەوە تیـا بنوسـن و دڵـی بەسـتەزمانی خـۆم دادەخـەم تـا کـەس هیـچ دێڕێکـی ئـەو کتێبـە نەخوێنێتـەوە... ئـەوان حیسـابی کتێبێکـم بۆدەکـەن کـە تـا قیامـەت

ناخوێنرێتەوە... حەسەن تۆفان، تۆ وادەزانی من نازانم ئێوە کێن؟... ها... من گێلم... من زۆر بیرم لێکردەوە، زۆر زۆر... دوای سۆراغی ئێوە کەوتم... دەزانم ئێوە هیچ نین. هیچ کەس ئێوەی ڕانەسپاردوە... حەسەنی تۆفان... هیهی هیهی... ئێوە لە بەیانییەوە وادەزانن کە من لە ترسدا شتتان پێدەڵێم... هیهیهی... خۆشحاڵن لاواز و کەساس و ترساو دەمبینن... هاها... بەختەوەرن کە یاری بە دڵێکی بەستەزمان و پاکی وەکو من دەکەن. بەڵام من دەزانم هیچ کەس ئێوەی ڕانەسپاردوە. ئێوە ڕقتان لە بارۆنەکانە و هیچی تر... ڕقتان لە حیزبە و هیچی تر... ڕقتان لە سەرۆکەکانمانە... هی هی هی هی هی».

من نەمزانی چی بڵێم. شبر کەمێک ناو قژە زەدەکەی خوراند و گووتی «گەر دڵنیایت، ئێمە کەس ڕاینەسپاردوین، بۆ بە مەغۆلیت نەگووت... بۆ لای میری پۆرسەلان ئێمەت ئاشکرا نەکرد؟».

مورتەزا گەش و کراوە قسەیدەکرد. دەستی بەرزکردەوەو گووتی «لەبەرئەوەی ئێوەم خۆشدەوێت. ئێوە دوو گوڵی تاقانەی ئەم شارەن... ئێوە دوو درەختی دەگمەنی ئەو باغەن کە خەریکە هەمووی دەمرێت و پەژموردە دەبێت... پێمەکەنن. بەڕاستیمە... ئێوە وادەزانن، من ڕێزی جوانی ئێوە ناگرم. من هەموو شتێکتان پێدەڵێم، لەبەرئەوەی دەزانم ئێوە ناتوانن هیچ بکەن... قەسەم بە هێلکەی تازەی کوکوختی لە هێلانەکاندا... ئێوە ناتوانن هیچ بکەن... ناتوانن هیچ بکەن... ناتوانن... لەبەرئەوەی منیش و ئێوەش لەو بەشەی ئەم شارەین ڕاستی بزانین و نەزانین ناتوانین هیچ بکەین. گەر بمزانیبایە ئادەمیزادێک ئێوەی ناردوە هیچم نەدەردکاند... سوێند بە سەحەرگاهانی بەهار، سوێند بە کێڵگە پاکەکانی سوبح... دەبووم بە بەردێکی ڕەق و هیچم نەدەردکاند، دەبووم بە مەیمونێک کە زمان نازانێت و بە سەگێک کە کلکی کلاْفدەکات و هەڵدێت... بەڵام دەزانم ئێوە دوو ڕێبواری ڕێگای حەقیقەتن... دوو

پەپولـەن و هاتـوون لـە هەلاَلَـەی دلَـی مورتـەزا شیلەی حەقیقـەت بمژن... بمبـورن، عەزیـزان لـە بەلاغەتـی شـکاوم ببـورن. ئێـوە دەزانـن مـن باغـی حەقیقەتم، مورتـەزا لالـەزاری حەقیقەتـە. مـن دەزانـم ئێـوە نیازتـان بەهیـچ نییـە، بۆ کـەس ئیش ناکـەن... سـەر بەباڵەکانـی حیـزب نیـن... دوو هەلَـۆن و لەسـەرەوەڕا بـۆ بینینـی ڕاسـتی بـەرەو خـوار دەفـڕن».

وەک لیبۆکێـک سـەمابکات بـە دەوری خۆیـدا دەسوڕایەوە و بـەو خەنـدە گـەورە و شـێتانەیەی خـۆی سـەیری هەردووکمانـی دەکـرد. ئـەوە یەکەمجاربوو دڵنیابـم، خوێندنـەوەی چڕوچاوی ئـەم مەخلوقـە هیـچ شـتێکی دیاریکراومـان لەسـەر ڕۆحـی پێنالێـت، خەڵـک هەمـوو تەنیـا سـەیری ڕوخساریان دەکـرد، بـەلاَم دلَـی شـتێکی ئالۆزتـر بـوو. چـووە بەردەمـی شـبر و گووتـی «وامەزانـن مورتــەزای بەسـتەزمان بلیمەتـە، وامەزانــن دلَــی پــڕ نابێـت لــە تــرس و دوودلَــی... دلَــی مورتــەزا هەندێجـار وەک دلَــی زەرنەقووتەیەکـی ترسـاوی لێدەدات... شـەو ناخەوێت. قەسـەم بـە برایەتـی مـن لەگەڵ غەمـدا، دلَم وەک دلَـی عاشـقان پەشـیمانی دەکێشـێت و حەسـرەت دەیسـووتێنێت... چەندەهـا شـەو وەک شـێت بـە ژوورەکانـی ئـەم کۆشـکە چۆڵـەدا ڕامکـردوە و پـڕ بـە هەمـوو دیـوار و پەنجـەرەکان هاوارمکـردوە. منیـش نامەوێـت نهێنییـەکان لەگـەڵ خۆمـدا ببەمـە گـۆڕەوە. وادەزانـن مورتـەزا لـەوە دەترسـێت، ئێـوە بچنـە حـوزوری بارۆنـەکان و بلَێـن مورتـەزا نهێنـی ئێـوەی درکانـدوە؟ هـا... وادەزانــن؟ ئێــوە وا ناکــەن. تاســەر ئێســقانیش گوناهباربـم، ئێــوە لــەوە گەورەتـر و پاکتـرن وام لەگەڵـدا بکـەن. ئێـوە تێمدەگـەن... ئێـوە دەزانـن دەسـتە ڕاسـتەقینەکانی مورتـەزا چەنـد پاکـە... ئێـوە حەقیقەتتـان دەوێت... مورتـەزا زێوانـی حەقیقەتـە. مـن هەمـوو شـتێک دەزانـم. مورتـەزای شـەیتان هەمـوو دلَێـک دەخوێنێتـەوە... لـە یەکـەم شـەوەوە کـە حەسـەن تۆفـان منـی ڕیسـواکرد... لـە دەنگیـدا، لـە تووڕەبوونیـدا، لـە شـێوەی هەناسـەدانیدا تێگەیشـتم چەنـد پیاوێکـی ڕاسـتگۆیە... دوێنـێ بـە خـۆم گـووت مورتـەزا

چاوبنوقێنە و ڕۆحی خۆت تەسلیمی ئەو دوو فریشتەیە بکە. گووتم ئەمانە لەو ڕۆحانەن حەقیقەتیان دەوێت. مرۆڤە جوانەکانی ئەم شارە، ژن و پیاوە جوانەکانی ئەم شارە دەیانەوێت بزانن حەقیقەت ماوە یان مردووە. هی هیَ هەموو دەیانەوێت بگەنە یەقینێک. من دوێنیَ شەو تا بەرەبەیان لەسەر یەک قاچ سەمامدەکرد و خۆشحاڵبووم کە ئێوەم دۆزیوەتەوە... قووڵایی ڕۆحی ئێوەم بینیوە... دواجار کە هاتن بۆلام زانیم ئێوە ڕیسوام ناکەن... زانیم».

ئینجا بە چرپە گووتی «منیش ڕقم لە حیزبە، قەسەم بە خودا ڕقم لە حیزبە... کەس نییە ڕقی لە حیزب نەبێت، هی هیهی هی هەتا سەرۆکیش ڕقی لە حیزبە».

من بە غەمێکی قووڵەوە گووتم «مورتەزا... گرنگ نییە ئێمە چیین؟ بەڵام پێمبڵێ باران شوکورت لە کوێ ناشت؟». مورتەزا گووتی «من مردوونێژی حیزبم... مردوونێژی بارۆنەکانم. لە مێژە حەزدەکەم یەکێک بدۆزمەوە ئەو ڕاستیانەی لا بدرکێنم... قەسەم بە ڕۆحی بولبول و بۆنی مێخەک و ڕەنگی یاسەمینی نوێ، بێزاربووم وەک کتێبێک بژیم کە لە ناومدا شت دەنوسن و دایدەخەن... لە ڕۆحمدا نهێنی دەنوسن و دایدەخەن. گەر دەوێریت حەسەن تۆفان وەرە و ئەم کتێبە بکەرەوە و سەیری لاپەڕەیەکی بکە... گەر دەتوانیت وەرە و دڵم بخوێنەوە کە ساڵ دوای ساڵ نهێنی تیا دەنوسن. وەرە و سنگم واڵاکە و بزانە چی تێدایە. بەڵام ئەوەی ئەم نهێنییە دەزانێت دەبێت بە مەخلوقێکی ترسناک... دەزانم ڕۆژێک لە ڕۆژان دەمکوژن... کە دوا لاپەڕەی ئەو دڵەی منیان نوسی... کەسەیریانکرد دڵی من چیتر لاپەڕەی سپی تیانەماوە و نهێنی دیکە ناگرێت... کە ڕوانیان ڕۆحی مورتەزای بەستەزمان لێیدەڕژێت... هیهی هی هاها.. هی هو هی.. دەیکوژن، بۆ ئەوەی خۆم و نهێنییەکانم بۆ هەتاهەتایە بڕۆین بۆ جەهەنەم... شبری قزڵەرد... لێم مەپرسە، من

کێم. مـن کتێبێکـی زینـدووم، بەڵگەیەکـی ڕەشـم و هەناسـە دەدەم... بمکوژە تـا لەگەڵمـدا ئـەو کتێبـە زینـدووە بمرێـت... دەتەوێـت بمـرم و لەگەڵمـدا نهێنـی سـەردەمێک بچێتـە ژێـر خـاک؟. هاهـا... مـن توحفەیەکـی زینـدووم».
بـە جیدییەتێکـەوە پتـر لـە جیدییەتـی ئەکتەرێکـی شـارەزا دەچـوو، هاتـە بەردەمـی مـن و بەدەنگێکـی زوڵاڵ و بـەرز گووتـی « حەسـەنی تۆفـان، تـۆ دەتوانیـت خـۆت ئاوهـا بخەیتـە مەترسـییەوە؟... دەتوانیـت؟ ئـەوان منیـان کـرد بـە مۆزەخانەیەکـی تاریـک کـە لەسـەر دوو قـاچ دەڕۆم... دە سـاڵە، ڕۆژ دوای ڕۆژ دڵـی خـۆم دەکەمـەوە و ئـەوان نهێنـی تێـدا دەنوسـن، هەمـوو شـەوێک بـە دڵـەی بەدبەختـم دەڵێـم، ئـەی دڵـەی بەدبەخـت خۆتبگـرە و مەڕوخـێ. ئـەو دڵـەی مـن نەبێـت هیـچ سـندوقێک لـە دونیـادا ئـەو هەمـوو نهێنییـە ناگرێـت... ئەگـەر تـۆ تەنیـا دڵۆپێـک لـە نهێنییەکانـی مـن بزانیـت، شـێتدەبیت. گـەر سـەری ئـەو سـندوقە هەڵبـڕی دەرد و ترسـی وەهـا دەبینـی بەشـی هـەزاران شـاری دونیـادەکات. هیـچ شـتێک وەک ئـەوە مـرۆڤ شـێت نـاکات، نهێنـی بزانێـت و نەیدرکێنێـت. مـن بۆ ئەوەی شـێت نەبـم پێدەکەنم... هاهـا... هیهـی... بـۆ ئـەوەی شـێت نەبـم سـەمادەکەم».
شـبر لێیپرسـی « مورتـەزا تـۆ چـی دەکەیـت؟ تێناگـەم مانـای چـی مردوونێژی بارۆنـەکان بیـت... مورتەزا مەترسـە و دڵـی خۆتمـان بۆبکەرەوە».
گووتـی « مورتـەزا بترسـێت؟... بترسـێت؟... مورتـەزا هەندێجـار زۆر دەترسـێت و هەندێجاریـش دەبێتـە ئازاتریـن پیـاوی دونیـا. مورتـەزا ئاوهایـە. حیکایەتـی مـن لەسـەردەمی شـەڕی ناوخـۆوە دەسـت پێـدەکات. تـازە لـە زینـدان هاتبوومـەدەرێ... پیاوێـک بـووم غەمگیـن و بێئیـش، زیندانـی بەعسـییەکان منـی کردبـوو بـە ڕموزنێکـی ناشـیرین. ئێـوە وادەزانـن مـن هەمیشـە وا ناشـیرین بـووم؟ بەڵـێ هـەروا ناشـیرین بـووم، بـەڵام وەهـا نـا و بەمشـێوەیە نـا... منیـش وەک هەمـوو مەخلوقاتـی دیکـەی خـودا جوانـی خـۆم هەبـووە... ڕۆژێـک لـە ڕۆژان دڵـی مرۆڤێکـی ئاسـایی لـە

سینەمدا ترپەی هاتووە، منیش وەک هەر ئادەمییەکی بەدبەختی تری ئەم دونیایە غەم و شادومانی خۆم هەبووە... ڕۆحم بە ئان و ساتی وەهادا ڕۆیوە پڕیووە لە ڕەحم و خۆشەیستی. قەسەم بە جوانی عەشق لەوانەیە یەکێکیش دوور بە دوور هەستی بە پاکی دڵم کردبێت و حەزی لێکردبم... کێ چوزانێت؟. هیهی... بەڵام هەستدەکەم پلانێکی ئیلاهی و پیلانێکی گەردونی لە گۆڕێیوون تا ڕۆحی من وابشێوێت. بارۆنی پۆرسەلان لە کاتی شەڕدا ویستی دەستم بگرێت و لە هەژاری و بێکەسی دەرمبهێنێت. ئەوکات بێکەسبووم، برایەکم کە ئەویش وەک من نەدار و هەژاربوو بەخێویدەکردم... من وەها دەستکورتبووم، سەگ و پشیلەکان لە من باشتر و خۆشتر دەژیان. هاوڕێ کۆنەکانم، ئەوانەی لەگەڵیاندا چووبوومە سەر شانۆ، ئەوانەی لە ماکبەس و ئۆتێلۆدا هاوتەختەمبوون، ڕیسوایانکردبووم، وەک ژنکوژێکی دڵڕەق سەیریاندەکردم... بە هەر کۆڵانێکدا دەڕۆیشتم ژنان خۆیان دەشاردەوە... هیهی هی... بە هەر کوچەیەکدا تێدەپەڕیم، مندالان لە بەردەممدا هەڵدەهاتن... ناوی سامناکی مورتەزای شەیتان لەم شارەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وەرزە... چۆن دەیانتوانی وا بە مورتەزای بێخەتا بڵێن؟... چۆن دەیانتوانی بێئەوەی جوانی ڕۆحم ببینن، ئاوها وێرانمکەن؟... چۆن؟... وەها بوو ڕووم لە هەر ئیشێک دەکرد قاپییەکانی بە ڕوومدا دادەخران. هی هی هی... وەها بوو... نان لەسەر سفرەمدا نەبوو... وەها بوو، برسێتی و بێپارەیی و ڕیسوایی تادەهات بەرەو خوار دەیبردم... لەو کاتەدا بارۆنی پۆرسەلان کارەمیکرد و ئەو کارەی بۆ دۆزیمەوە. سەرەتا هەندێک لاشەی کوشتاری ناوخۆبوو کە دەبایە بێسەروشوێن بکرابانایە... دەبایە ونبن و کەس نەزانێت کێن و کوڕی کێن و لە کوێن... سێ لاشەبوو لە ژێرزەمینێکدا، هەر سێکیان بۆگەنیان کردبوو... نازانم کێ بوون و سەر بە چ حیزبێک بوون... سێ گەنج بوون لە سێ بەتانی ڕەشەوە پێچرابوون... من هەر سێ لاشەکەم

هەڵگرت و ناشتمن... سوێند بە جوانی و بەڕاستی ئەوە یەکەمجاربوو دەست لە دەستی مردوویەک بدەم... من گۆڕم بۆ هەڵکەندن، من بە هێمنی خستمنە ژێر خاک و تەسلیمی خودام کردن... هەندێجار ڕوودەکەمە خودا و دەڵێم ئەی باری تەعالا، گەر مورتەزا نەبێت کە لاشەی مردووە بێخەتاکان دەهێنێتەوە حزورت تۆ چی دەکەیت؟. من لەو ساڵانەدا تێگەیشتم حیزب هەمیشە لاشەیەکی هەیە بیشارێتەوە... حیزبەکانی ئەم شارە هەمیشە لاشەیەکیان هەیە بیشارنەوە».

مورتەزا وەک بیر لە دەورو زەمانێکی زۆر دێرین بکاتەوە، وەک بوونی من و شبری فەرامۆشکردبێت چووە پێشدەمی پەنجەرەی ژوورەکە و گوتی « ئەوکات نوێمیران دروست نەکرابوو، پارچەیەک زەوی گەورەی بێساحێب بوو. بارۆن بازنەیەکی بۆ کێشام و گوتی مەیتەکانت لێرەدا بنێژە. هی هی، بازنەیەکی تەباشیری گەورە... من سنووری ئەو بازنەیەم لە مێشکمدا کێشا و پیکابێکی سپیم لە بارۆن وەرگرت و بووم بە لاشەنێژ. هیچ هەفتەیەک نەبووە ئیدی من لاشەم نەبێت، گەر هەفتەیەک لاشەکەم دوابکەوێت زەویم لێدەبێتە جەهەنەم... قەسەم بە خودا لە شەڕی ناوخۆدا لاشەکان زۆرتربوون... هەندێجار لە گۆڕەپانی جەنگدا چەندین لاشەی بێشوناس جێدەمان کە زۆربەیان جەنگاوەری بێ کەسوکار بوون. شەوان دەرەنگ بە خۆم و پیکابە پاک و سپییەکەمەوە، پیکابە فریشتەییەکەمەوە بە وەرەقەی مۆرکراوی سەرکردایەتی و فەرماندەی گشتی هێزەکانەوە دەچووم و لاشەکانم هەڵدەگرت و دەمناشتن... هی هی... ئێوە وادەزانن مورتەزا ڕەحمی نییە... لاتان وایە مورتەزا لاشەکانی خۆشناوێت... هی هی... من لێرەدا، لە دڵمدا ئەلبومێکی نهێنیم هەیە کە هیچ کەسێک ناتوانێت بیکاتەوە، هیچ کەسێک ناتوانێت بیبینێت، لەوێدا وێنەی هەموو لاشەیەکم هەڵگرتووە... لێرەدا، ئالەم کەللە ناشیرینەمدا، بۆنی هەموو لاشەیەکم بە جیا هەڵگرتووە... لەم دەستە پاکانەمدا مەلمەسی هەموو

پێستێک و هەموو مردووییەکم هەڵگرتووە. گەر من ئەو هەموو مردووەم نەناشتبایە کێ دەیناشتن؟ لەدوای شەڕی ناوخۆ، ڕۆژێک بارۆنی پۆرسەلان هات بۆلام و گووتی «غەفوور ئاغای سەرماوزەڕ» ئیشی پێتە. غەفوورئاغا لە دۆستانی نزیکی سەرۆک بوو کە لە مەجلیسدا دەیگووت «نیوەی بەزی ورگی سیاسییەکانی کوردستان، دوگی بەرخی منە». کچێکی سەرماوزەڕی بەبێ ویستی ئاغا و کوڕەکانی لە زانکۆ حەزی لە هەتیوە گەدایەکی هاواری کردبوو. کوڕانی ئاغا هەردووکیانیان کوشتبوو و خستبوویاننە دوو گوێنی گەورەوە و لە ئەشکەوتێکی عاسی نێو دەربەندانەدا شاردبوویاننەوە. ئەوە یەکەم ژن بوو من بینێژم. کە لاشەکانم لەو ئەشکەوتە دەرهێنا وامدەزانی لە جەستەی ئەمجۆرە ژنە بەدبەختە، نایەتەوە ڕێگام. کە ناشتم وامدەزانی خانم لە نێوان ئەم هەموو جەنگاوەرەی شەڕی ناوخۆدا هەست بە ترس و بێزاری دەکات. قەسەم بە هەناسەی پاکی کەو لە کاتی قاسپە قاسپدا... ئەوە یەکەمین ژن بوو من پەنجەم بەر لەشی بکەوێت. هیهی هیهیهی دواتر هەر ئاغایەک، هەر قەبیلەیەک، هەر بەرپرسێکی حیزبی، هەر ڕێکخراوێک، هەر حیزبێک، هەر دەوڵەمەندێک، هەر دەزگایەکی پۆلیس یان ئاسایش بیانویستبایە لاشەیەک بشارنەوە و بێسەروشوێنی بکەن دەیاندا بە مورتەزا. کە نوێمیرانیان دروستکرد، ئەو پارچە زەوییەیان بە دیوارێکی بازنەیی گەورە گەمارۆدا و دوو دەرگایان بۆکرد».

مورتەزا وەستا و دەستی لە گیرفانە قووڵەکانیدا گێڕا و گووتی «ئەوە کلیلی ئەو دەرگایانەیە، ئەوە کلیلی باغەکانی مورتەزایە... ئەوە کلیلی باغەکانی حەقیقەتە. من لەو پارچە زەوییەدا گوڵ و ئادەمیزاد دەنێژم... هیهی هی هەموو خەڵک لە نوێمیران وادەزانن ئەوە باغێکی گەورەیە، هەموو خەڵک پێیدەڵێن باغەکانی مورتەزا. بارۆنەکان نەبێت... بارۆنەکان هەموو دەزانن. لەم دە ساڵەدا هەفتە نەبووە لەوێ مەیت

نەنێژم... قەسەم بە دووری ئاسمان و بەرزی مانگ و غەریبی ئەستێرە... قەسەم هیهی بە ئیشراقاتی سپێدان لەسەر دڵ... هەر ئاغایەک ویستبێتی هیهیە هیهیهی... ویستبێتی لاشەی ژنە خائینەکەی بشارێتەوە من بۆم شاردۆتەوە، هەر بەرپرسێک ویستبێتی نەیارەکانی کفن و دفن بکات من بۆم کفن و دفن کردوە، هەر کاسبێک، سیخوڕێک، تیرۆریستێک، عاشقێک، نهێنیزانێک، خائینێک کوژرابێت، من بەو دەستانەی خۆم هەڵمگرتووە و لە باغی مورتەزادا شاردومەتەوە، کەمجار هەبووە لێو نەنێمە سەر نێوچاوانی مردووەکان و ماچیان نەکەم و نەڵێم «دڵی من بۆ وا مردیت »... هەموویان وان لێرەدان... وان لە دڵی مورتەزادان... لەم بەحرە کپ و بێدەنگ و بێزمانەدا کە ناوی مورتەزایە... هیهیە هی هوهی... وای لەم دڵە بێدەنگ و کپەی من وای... هیهی ئێوە وادەزانن من لە ترسدا قسەتان بۆ دەکەم؟ ها؟ وادەزانن لە ترسدا قسەتان بۆ دەکەم؟ نا، ئێوە تەنیا دوو کەسن، سەرتان هێنابێتە سەر لێواری ئەم بەحرە کپەی دڵی من و بتانەوێت گوێبگرن و ببیستن، بزانن دەریا تاریکەکەی نێو ڕۆحی مورتەزا گەر دەمبکاتەوە دەڵێت چی؟ ئەوەی گوێ لەم ئۆقیانوسە بگرێت دەبێت بترسێت... ئەوەی گوێ لە شەپۆلە قووڵەکانی دڵی مورتەزا بگرێت دەبێت دەست بخاتە سەر دڵی و تامردن ئاسوودە نەخەوێت... هیهی هی هی... من پێمکوتن... من باران شوکورم لە باغی خۆمدا ناشت... باران شوکور لای منە... ئەوە کلیلی دەرگاکانە... کلیلی دەرگاکان».

من بە مورتەزام گووت «مورتەزا، من هیچم لە تۆ ناوێت، ئەو لاشەیە نەبێت... ئەو لاشەیەم بدەرێ و ئیدی هیچی تر... وابزانە نهێنی تۆ لە بەحرێکی قووڵدایە».

مورتەزا بە سەرسامییەوە سەیریکردم و پرسی «بۆچیتە؟ چی لە لاشەکە دەکەیت؟ تائێستا هیچ لاشەیەک لە باغی مورتەزا نەچۆتەدەرێ؟ هیچ لاشەیەک».

وەک یەکێک کوتەکێکی گەورەی دابێت بەسەرمدا گێژ و حەپۆل سەیرمدەکرد و گووتم «نازانم بۆچییمە، بەڵام دەمەوێت».

شێتانە بازیدایە بەر دەمم و گووتی «هەموو زەمینم بدەیتێ، ناتوانم لەگەڵتدا بێم... گەر بزانن من نهێنی ئەو گۆڕستانەم درکاندوە دەمکوژن، قەسەم بە دوا غونچەی بەهار، قەسەم بە هەموو ئێوارە فێنکەکانی دونیا دەمکوژن. من دەتوانم شوێنی لاشەکەت پێبڵێم... دەتوانم، بەڵام قەسەم بە شەونمی سوبح بزانن من کاری وەهام کردوە دەمکوژن... گەر دەتەوێت حوکمی مردنم بدەیت، گەر دەتەوێت بمکوژیت، ئەوا مورتەزا ئامادەیە... گەر بە مردنی مورتەزا دڵی ئێوە ئاسوودەدەبێت، ئەی پیاوچاکان... ئەوا بە جۆرێکی دی بیکوژن... من نامەوێت بە دەستی ئەوان بکوژرێم... نامەوێت بمکوژن و لە باغەکەی خۆمدا بمنێژن... گەرچی دڵنیام درەنگ یان زوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان دەمکوژن و هەر لەو باغەدا دەمنێژن».

***

ئەو شەوە مورتەزا کلیلی یەکێک لە دەرگاکانی باغچەکەی داینێ و ئێمەش سوێندمان خوارد، هیچ کات و لە ژێر هیچ گووشارێک و لەبەر هیچ ترسێکدا ناوی نەهێنین. ئەوەی ئەو شەوە کامەرانیکردم و زۆر خستمیە سەر سەفا، ئەوەبوو مورتەزا دەربارەی چارەنوسی لاشەکەی موراد جەمیل هیچی نەدەزانی... وەک ئێمە شەوێک گەڕابووەوە سەر شوێن گۆڕی ئەو و جگە لە چاڵێکی خاڵی هیچی دی نەبینیبوو. ونبوونی لاشەکە ترسێکی قووڵی خستبووە دەرونی بارۆنی کولەکە و بارۆنی پۆرسەلانیشەوە. کە مورتەزا چیرۆکی ونبوونی لاشەکەی بە هەموو وردەکارییەکانەوە گێڕایەوە، تێگەیشتم لاشەکە لە بن دەستی ئەواندا نییە. ئێستا دەمزانی لاشەکەی موراد لە کوێیە و لای کێیە... بە شادییەکی گەورەوە لە ماڵی مورتەزا

هاتمە دەرێ. پاڵم بە عەرەبانەکەی شبرەوە دەنا و گۆرانیم دەگووت. شبر کە منی وەها دڵخۆش و کامەران بینی گووتی «حەسەنی پیرۆز لە هەموو ژیانتدا وەها بەسەفا نەمدیویت». ئەو شەوە چووم بۆ هەزارباغ و بەدەم پێکەنینەوە لە ناو گوڵەکاندا لێیخەوتم، تا بەیانی خەوم بەوەوە بینی کچێکی زۆر جوان بەناوی باران شوکورەوە، لە نێو گوڵەکاندا ڕادەکات و بە نازکی پێمدەڵێت «حەسەنی پیرۆز دوامکەوە... ئای حەسەنی پیرۆز بۆ وەها وەستاویت و دوام ناکەویت».

## یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

پێمگووت عەتار چیت بۆ کردوم؟ ئەو بە پێکەنینە گێژەکەی خۆیەوە سەیریکردم و لیستی ناوی ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانی دەرهێناو گووتی «جەنابی بارۆن... من تا ئێستا عەقدم لەگەڵ ئەمانەدا مۆرکردوە». هەندێک ناوی نیشاندام، ناوی هەندێک ئەندازیار و وەستا و پارێزەر و یاساناس و باغەوانی خەیاڵکاربوون. سەری بەرزکردەوە و گوێکانی خۆی سڕی و گووتی «بەڵام هەندێک لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان نایەنە ناو هیچ عەقدێکەوە، نایەنە ناو هیچ پەیمانێکی دونیاوە... نایەنە ناو هیچ پرۆژەیەکەوە». ئەو کاتە هێدی هێدی خەریکبوو نیگارێکی تەواوم لەسەر سروشتی ئەو شارە خەیاڵییە لادروستدەبوو کە دەمویست بنیادی بنێم. بیرۆکەی سەرەکیم ئەوەبوو کە شاری خەیاڵی دەبێت لەسەر تێکەڵبوونی سێ جۆر جوانی دروستبووبێت. یەکەم جوانی بیناو خانووبەرە و باغەکان. دووەم جوانی ژیان و هارمۆنییەتی نێوان ئادەمیزادەکان. سێیەم جوانی خەیاڵ کەسەرچاوەی بەردەوامی و مانەوەی هەموو

جوانییەکانی تره. خۆتان دەزانن من دوای خوێندنەوەیەکی درێژ و سەردانی چەندین وڵات و بینینی چەندین کیشوەر، گەیشتمە ئەو پرۆژەیە. شەوێک لەگەڵ هەموو ئەو ڕۆحلەبەرە خەیاڵیانەدا کۆبوومەوە کە لەگەڵ ئەو سەرزلە گوێتەڕەدا پەیمانیان مۆرکردبوو. کۆمەڵێک خەڵکبوون لە لەشکرە گەورەکەی غەزەلنوس، ئەوانەی خولیایان بوو شتێک لە خەیالاتیان بکەن بەڕاست. من کەسەیری دەموچاویانم کرد، ڕاستەوڕاست دوو توخم ئادەمیزادم لە ناودا بەدیکردن، توخمێکی ڕەش کە دەمزانی خەیالاتی جوانیان هەیە، بەڵام هێندەی بیر لەوە دەکەنەوە خەیاڵی خۆیان بکەنە کاڵا و بیفرۆشن، بیریان لای ستاتیکا و جوانی خەونەکانی خۆیان و خەونەکانی من نەبوو، بیریان لە جەوهەری ئەو گەڕەکە ئەفسانەییە نەبوو کە من دەمەویست دروستیبکەم. لەگەڵ توخمێکی سپی کە بەڕاستی بۆ کەسێک دەگەڕان کۆمەکیان پێبکات خەونەکانیان بهێنێتەدی. مرۆڤ دەبێت بەڕاستی لە مانای جوانی تێبگات ئەوسا دەتوانێت لەگەڵ مندا ئیشبکات. مەخلوقات زۆرن کە خەیاڵیان هەیە، بەڵام من مەخلوقێکم دەوێت هەم خەیاڵی هەبێت و هەم لە جوانی تێبگات، جوانی بەو مانایە نا بتوانێت مووروویەکی جوان دروستبکەیت، بەڵکو بەو مانایەی شوێنی ئەو مووروووە بە جوانی لە ناو ملوانکەیەکی گەورەدا جێبکەیتەوە. بیخەیتە جێگای ڕاستی خۆی لەسەر نەخشەکە. شەڕی یەکەمی من لەگەڵ ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکاندا لە یەکەم شەوەوە لەسەر مانای جوانی دەستی پێکرد. ئەوان بە کاریگەری غەزەلنوس واتێدەگەیشتن هەر شتێک و جوانی خۆی لە ناو خۆیایەتی و لێی جیانابێتەوە، بەڵام بۆچوونی وەها منی شێتدەکرد... تووشی هیستریا و نامۆیی و خۆ لەدەستدانی دەکردم. ئەو شوێنەی تیا کۆبووینەوە ژوورێک بوو لە قاتی سەرەوەی یانەی ئەندازیاران. من لە ناوەڕاستی

ژوورەکەدا وەستابووم، بوتڵێک ئاوی تورکیم بەدەستەوە بوو، گووتم«هیچ شتێک بە تەنیا خۆی جوان نییە، هەموو شتەکان جوانی خۆیان لەو جێگایەوە وەردەگرن کە تێیدا وەستاون... ژنێکی جوان کە لە ناو خەراباتێکدا دەژی، چ هەستێکمان دەداتێ، چ هەستێک؟ لەبری هەستی جوانی و جاویدانەگی و گەورەیی، غەم و بێمانایی و پوچیمان بیردەخاتەوە. کە خاتوونێکی قەشەنگ لە خەراباتێکدا دەبینین، لەبری شادی، لەبری ئارەزوو، لەبری خرۆشانی پیاوەتی، هەست بە پوچی ئەم دنیایە و بێمانایی ئەم وجودە و ناڕێکی ئەم ژیانە دەکەین... بەڵێ جوانی کە لەجێگای ڕاستەقینەی خۆی نەبوو لە نەخشەکەدا، لەبری ئەوەی هەستی جوانیمان بداتێ، هەستی ناڕێکی و تێکچوون و ناعەدالەتیمان دەداتێ... ڕۆژێک لە باغێکدا پیاسەمدەکرد، هەر وەک چۆن هەموو مەخلوقاتی دیکەی خودا دەڕۆن ئاوها دەهاتم و دەڕۆیشتم، ژێر پێم چیمەنێکی وشک و گیایەکی مردوو بوو، چەندەهاجار هاتم و چووم... هاتم و چووم. هیچ شتێک لەو چیمەنە وشک و باغە پەژموردەیە سەرەنجی ڕانەکێشام... هیچ شتێک. دوای دە جار هاتوچۆ... ڕۆیشتن و هاتن، گوڵێکی سپی چکۆلانە و قەشەنگم بینی، کە بە هەموو حیسابێک جوانبوو... بە هەموو حیسابێک قەشەنگبوو. لە خۆم پرسی، هێی میری خەیاڵ تۆ چ دەردتە وا ئەم گوڵە نابینیت... چ دەردتە؟. دەزانن بۆ نەمبینی، عەزیزان دەزانن بۆ نەمبینی؟ چونکە جوانی لەناو بەحرێک لە پەژموردەییدا نابینرێت... جوانی تەنیا لە شوێنی خۆیدا دەبینرێت، لە ناو شتێکدا کە سەرتاپای جوانی بێت. گەر ئەو گوڵە لە ناو سەوزی و تەڕی و ناسکییەکی گەورەدا بایە من دەمبینی. من بۆیە ئەو گوڵەم نەبینی، چونکە لالەزارە زەرد و باغە پەژموردەکەم دەبینی، گەر لە سەرەتاوە ئەو زەردی و ژاکاوییەم فەرامۆشبکردایە، زووتر ئەو گوڵەم دەبینی. گەر ناشیرینی

دونیا فەرامۆش نەکەین، گەر پەژموردەیی لالەزارەکە فەرامۆش نەکەین، جوانی گوڵە ناوازە و تاقانەکانمان بۆ نابینرێت... بۆ ئەوەی جوانی خەیاڵ دەربکەوێت، دەبێت ناشیرینی دونیا ڕوخساری خۆی ونبکات. ئەی هاوڕێ ئەندازیارەکانم... ئەی برایانی پرگاڵ و گۆشەپێو و ڕاستە. سەیری ئەم شارەبکەن کە وردەوردە پڕدەبێت لە خانووی بەرز و بەردین و گەورە بە پایەی گریکی و بە ویقاری ماڵی خوداکانی ئۆلۆمپەوە. بەڵام کە ورد دەڕوانن لەم شارەدا جگە لە ناڕێکی چی دەبینن؟ هیچ... هیچ ئەم شارە لەگەڵ هەموو وردەکاریی ئەندازیارە تاکڕەوەکاندا هێشتا خەراباتە، هەرچی جوانییەک کە لە خەراباتدا دەیڕوێنێت پتر خەرابات زەقدەکاتەوە، بۆیە دەبێت ئەم شارە لە بیر خۆتان بەرنەوە... گەر دەتانەوێت لەگەڵ مندا ئیشبکەن، ئەم شارە فەرامۆشبکەن و مەپرسن چی تێدایە. ئەوە هەڵگرن بۆ خەڵکی خۆی. جوانی لای من نەخشەیە... ئیشکردنە لەسەر نەخشەیەک کە بەرد بە بەرد و بست بە بستی حیسابکرابێت، شاری خەیاڵ شارێکە تێیدا ماتماتیک و سیاسەت و شیعر تەبان، پێکەوە کاردەکەن، برایان ئەوە خولیای منە بۆ ئەم کۆمەڵگا بریندارەی ئێمە کە دەیەوێت لە جەهەنەم هەستێتەوە، دەمەوێت ماتماتیک و سیاسەت و شیعر ئاشتبکەمەوە. جوانییەکی تاقانە ناتوانێت لە بەحری ناشیرینیدا جوان بێت...».

هەستمکرد هەندێک لە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان بەرەو قسەکانم دەبزوێن و بڕوام پێدەکەن. بەڵام لە کۆتایی ئەو دانیشتنەدا پتر تێگەیشتم کە غەزەلنوس چ کاریگەرییەکی لەسەر ئەم بوونەوەرە خەیاڵیانە هەیە. پێکڕا خۆیان وەک کۆمەڵە بوونەوەرێکی ناوازە سەیردەکرد کە لە سەر زەمین نامۆن و دەیانەوێت بە نامۆیی بمێننەوە. سەیرترین شت لە مرۆڤدا ئەوەیە کە دەتوانێت شانازی

بە نامۆبوونی خۆیەوە بکات. ئەوەش دەردێکی دیکەیە کە شاعیران مرۆڤایەتیان پێوە گیرۆدەکردوە. بەر لە شاعیران هیچ کەس نامۆیی وەک تاج نەخستۆتە سەر سەری خۆی. ئاخ ئەگەر بمانتوانیبایە خەیاڵ لەدەستی شاعیران دەربهێنین، ئاخ. ئەوکات دەمانتوانی زەوییەکی جوان دروستبکەین. بەڵام شاعیران... ئەو حیزانە، خۆیان لە دونیایەکی جواندا دەژین و ڕێگاش نادەن ئێمە ئەم دونیایە فەرامۆشبکەین و ئازارەکانیمان بیربچێتەوە... ئەوە دەردی گەورەی منە لەگەڵیاندا. ئەو شەوە یەکێک بوو لە شەوە ترسناکەکانی ژیانم، لەو شەوەدا تێگەیشتم کە دەشێت کەسانێک لەم ئەندازیار و وەستا و باغەوانانە بەڕاستی بۆ دروستکردنی بینای جوان و خەیاڵی، شەقامی سەوز و ئەندازەیی، فولکەی پڕ کۆتر و مەیدانی پڕ لە ڕۆشنایی و گوڵ، کۆمەکمبکەن. ڕەنگە بتوانن دوای ڕەنجێکی زۆر لە دروستکردنی شتەکاندا هەمەڕەنگی و هارمۆنی بخولقێنن. هەستمکرد لەوانەیە بتوانین ماڵەکان و باغەکان و شەقامەکان بەم ڕۆحلەبەرە خەیاڵیانە دروستبکەین، بەڵام من پێویستیم بە ئەندازیارێکی دیکەش بوو بتوانێت هارمۆنی بخاتە ناو دڵەکانەوە و وابکات بۆیەک لێبدەن... ئەندازیارێک بتوانێت ڕۆحی مەخلوقاتەکان لە یەک نزیکبکاتەوە و وابکات ئەو شارەیان خۆشبوێت. دڵنیابووم ئەم بوونەوەرانە دەتوانن جوانی و هارمۆنی نێوان شتەکانم پێببەخشن، بەڵام ناتوانن ئەو هێزەم بدەنێ کە هەموو مرۆڤەکان دەکات بە عاشقی یەکتر. ئاه ئێوە نازانن چ شەوێکی ترسناکبوو، من لە یەکەم ڕۆژی ژیانمەوە لەوەها شەوێک دەترسام، وەها شەوێک بگەیتە ئەو بڕوایەی زەمینێکی جوان بەبێ شاعیران دروست ناکرێت. ئەگەرچی من هەمیشە بڕوایەکی وەهام هەبووە، بەڵام ئەو شەوە کە سەیری دەموچاوی ئەو ئادەمیزادانەم کرد کە عەتار کۆیکردبوونەوە پتر ڕووی ترسناکی وەها قەناعەتێکی

تاریکم دەبینی. سەردەمێک کە خولیای کڕینی غەزەلەکان کەوتە سەرم، زۆر لە مانای ئەو غەزەلانە ڕامام... ئەو نمونانەی لە بەردەستمدا بوون، بە غەزەلی تر بەراوردمکردن. چەندین شەو لەگەڵ هەندێک ئوستادی پیری کلاسیکیاتدا لە کتێبخانەکەی خۆمدا دێڕەکانمان تەفسیرکرد. گەیشتمە ئەو یەقینەی ئەو غەزەلانەی غەزەلنوس هێندەی باس لە جۆرێک لە هارمۆنی ناکۆتای نێوان مرۆڤ و گەردون دەکات، باس لە عەشقی ڕووت ناکات، غەزەلەکانی ئەو شیعر نەبوون، بەڵکو پردبوون. مامۆستایەکی پیری کلاسیکیات پێگوتم «ئەوانە پردن لە نێوان مومکین و موعجیزەدا، لە نێوان مەوجود و موفاریقدا. لە نێوان واحید و لامتناهیدا». من پێمگووت من پیاوێکی مۆدێرنم، ئەم قسانەی تۆ بە زمانی نوێ، بە زمانی سەدەی بیست و یەک واتە ئەم قەسیدانە پردن لە نێوان تاک و دونیادا، لە نێوان خود و ئەوانی دیدا، لە نێوان تەنهایی و ڕۆحی کۆمەڵگادا. پیرە سەری لەقاند و گووتی «ڕەنگەوابێت... کوڕم ڕەنگەوابێت، من ئەوەیان نازانم». من بە جۆرێک لە جۆرەکان باوەڕم هەبوو ئەو غەزەلانە هێزێکی گەورەی تێگەیشتنی عاشقانەی مرۆڤن لە مرۆڤ، نەوەک ستایشی عاشق بن بۆ مەعشوق. شەوێک بوو لە شەوە سامناکەکانی ژیانی من... تێگەیشتم بەبێ غەزەلنوس هیچم بۆ ناکرێت، سوودی چییە مرۆڤ شاری جوان دروستبکات، بێئەوەی بتوانێت ڕۆحی ئادەمیزادەکان پێکەوە کۆکبکات و گرێیانبدات، بێئەوەی بتوانێت هەتا هەتایە زیندویێتی خەیاڵ مسۆگەربکات. لەو شەوانەدا جارێک ماجیدی گوڵ سولاڤم گرت، ئەو ڕستەیەکی وەها ترسناکی پێگووتم کە هەرگیز لە یادم ناچێتەوە، ئەو ڕاگوزەر بە منی گووت «بارۆن... شاری خەونەکان ئەو شارەیە کە خەونی لێ نییە». من دواتر بیرم لێکردەوەو تێگەیشتم ئەو ڕستەیە چ ترسناک و دڵتەزێنە. من پێویستیم

بە غەزەلنوس بوو، بۆ ئەوەی یارمەتیمبدات نەخشەکانم پڕکەم لە خەیاڵێک نەمرێت و نەبڕێتەوە. شاری خەونەکانی من پێویستی بە غەزەلەکان بوو تا خەیاڵ تیا نەمرێت، پێویستی بە فەرشەکانی تریفە یابەحری بوو تا ئادەمیزادەکان هەستبکەن لە موعجیزەوە نزیکن، پێویستی بە کەشتییەکەی ماجیدی گوڵ سۆلاف هەبوو، تا بزانین کە حەقیقەت تێپەڕە و خەیاڵ ئەبەدییە. سەرنشینانی شارە جوانەکانی دونیا هەموو لەوە تێگەیشتوون، هیچ شارێک لە مردن و لەناوچوون ڕزگاری نابێت گەر تێنەگات تەنیا هێزێک لە مردن دەیپارێزێت خەیاڵە. من غەزەلنوسم پێویستبوو تا ئادەمیزادەکان پڕکەم لە گونجان و تەبایی لەگەڵ یەکدا. ئەو شەوە کە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانم بینی، هەریەکەیان لە دونیایەکی تایبەتیدا دەژیان... هیچ شتێکیش لای من لە دونیای تایبەتی ترسناکتر نییە، ئەوەی دوژمنی خەیاڵی منە ئەوەیە ئادەمیزادان هەریەکەیان لە خەیاڵی خۆیاندا نوقمبن. ژیانی تایبەتی... خەیاڵی تایبەتی کە مرۆڤ لە یەکتر دادەبڕێت، ئەوە دەردی ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانی ئەم میللەتەیە. من ئەو شەوە تێگەیشتم پێویستیم بەوەیە شاعیرەکان لە جیهان موتوربەبکەم، ئەوە ئیشی من و ئومێدی من و پەیامی موبارەکی منە کە خودا هەڵیبژاردوم جێبەجێبکەم. هیچ شارێکی جوان، هیچ گەڕەکێکی نوێ دروست نابێت گەر ڕۆحی شاعیرەکان لە هەموو شتێک موتوربە نەکرابێت. بەبێ ئەوان ئەندازیارەکان هیچ نین، باغەوانەکان گەر سیحری شیعر لە دەست و پەنجەیان موتوربەنەکرابێت گوڵەکانیان جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ دڕکدا نییە، عەشق بەبێ هەناسەی ئەوان جۆرێکە لە جەنگ، بەبێ غەزەلنوس شاری خەونەکان دەبێتە شارێکی خاڵی لە خەون. ئەو شەوە وەک شێت گینگڵمدەدا و هاوارمدەکرد «خودایە چ هێزێکی سیحراوییە خەیاڵ». بەڵام ئەو هێزە کە دەکەوێتە بندەستی

شاعیران، گومڕایاندەکات... ئیشی من ئەوەبوو ئەو گومڕاییە بکوژم، هەر شاعیرێک نەیەوێت ڕۆحی لە درەختەکان و غونچەکان موتوربەبێت دەبێت جەهەنەم بە چاوی خۆی ببینێت. هەر شاعیرێک نەیەوێت شەرابی خۆی تێکەڵ بە شەرابمان بکات دەبێت سزای خۆی وەرگرێت. ئەو شەوە بۆ یەکەمجار بەڕاشکاوی بە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانم گووت، ئیدی ئێوە مولکی منن، بڕۆن و ئازادانە ڕۆحی خۆتان پڕکەن لە هەر خەیاڵ و جوانییەک، بەلام ئێوە بۆ هەر کوێ بڕۆن لەسەر نەخشەکانی من دەسوڕێنەوە. مەبەستم بوو غەزەلنوس بزانێت کە دەمەوێت هێدی هێدی و بەش بەش ئیمپراتۆرییەتەکەی داگیربکەم. هەموو شتێکم دەکرد بۆ ئەوەی ئەو غەزەلانەم بداتێ و کۆمەکمبکات. بۆ ئەوەی دەستەمۆیبکەم نەدەبایە لێیگەڕێم ئاسوودە بێت، گەر شاعیرەکان ئاسوودەبن لە ژوورەکانی خۆیان نایەنەدەرێ و لە جوانکردنی دونیا و لە سەوزکردنی خەیاڵ خۆیان بەدووردەگرن. ئەم ساتە دڵتەنگەی مێژوو، ڕۆژی ئەوەبوو شاعیران ئیشبکەن، لە ژوورەکان بێنەدەرێ و لەگەڵماندا دەست بەکاربن... نا وامەزانن، من کوێرم، من جوانی هەموو مەخلوقات و گرنگی هەموو مەخلوقات دەبینم... بەلام لە هەموو مەخلوقاتی دونیا پتر ڕقم لە شاعیران بوو، چونکە تاکە چەشنی ئادەمیزادن کە کاتێک دونیا ئیشی پێیانە و پێویستی بە جوانی و خەیاڵیانە لە مەعشەری ئادەمیزادان هەڵدێن و لە ناو ژوور و کتێبەکانی خۆیاندا خۆیان وندەکەن.

شەوێک بێئەوەی بترسم لە دەرگای ئەو خانووە نهێنییەی تریفە یابەحریم دا. دەمویست لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی غەزەلنوس بدەم، دەمویست هێدی هێدی بترسێت، بۆ ئەوەی بزانێت سەروکاری لەگەڵ هێزێکی گەورەدایە، جار دوای جار کاغەزی سەختتری فشارم بەکاردەهێنا، بەبێ ئەوەی بە تەواوەتی بزانێت کێیە بە دوایەوەیەتی...

دەبایە بێتە ناو خەیاڵەکانی منەوە، من ڕقم لەو شاعیرانەیە کە دەیانەوێت وەها بژین وەک ئەوەی پادشایەک لەسەر زەوی نەبێت... پادشایان بۆ ئەوە دەوێت تا نەفرەتی لێبکەن. نا وامەزانن من دوژمنی ئەو بووم، ئەو خۆی دوژمنی خۆی بوو. کە لەدەرگای ماڵی خانمی تریفەمدا، پیرێژنێک کردییەوە، لە پیرێژنی ناو حیکایەتەکان دەچوو، لەوانەی مرۆڤ تێناگات ژیان وەها پیریکردون یان ئەوان ژیانیان پیرکردوە. پێمگووت «داپیرەی من، ئەی خانمی لوتف و کەرەم، من پیاوخراپ نیم و بۆ ئازاری هیچ کەس لەدەرگای ئەم ماڵەم نەداوە، ناوم جەواهیر سەرفرازە و هاتووم خانمی تریفە یابەحری ببینم». کە تریفەم بینی بە ئەندازەیەک سپی و ترساو بوو، ماوەیەک وەستام و تەنیا سەیری ئەو ترسە قووڵەی نێو نیگایم کرد، ئەو بە هێمنی داوەتی کردمە ژووری، ماڵێکی کپ و بێدەنگ بوو ئاسەواری وەهای تێدانەبوو، نیشانەبێت کە کەسی دیکەی تیا دەژی. واتێدەگەم تریفە ئەوانی دیکەی لە جێگایەکی دیکەی ماڵەکەدا قایمکردبێت، چونکە من لە مێژبوو گەر لە دووریشبایە بۆنی هەناسەی ئادەمیزادانی ترم دەکرد. من پێمگووت «خانمی مافوورە سیحراوییەکان، من ئەو پیاوەم کە چەند ساڵێک لە مەوبەر کارخانەی مافوورەکەم لە بەر خاتری تۆ و لە پێناوی دەست و پەنجەکانی تۆدا کڕییەوە... ئێستا هاتووم بتبەم و بتخەمە سەر تەونێک کە شایستەی خەیاڵەکانی تۆیە. من نامەوێت هیچ مەخلوقێک ئازاربدەم، نامەوێت تۆ و مافوورچنەکانت بترسن و بلەرزن، هێندەم دەوێت گوێم لێبگرێت، وەک گوێگرتنی خوشکێک لە برایەک، وەک گوێگرتنی ئادەمیزادێک لە ئادەمیزادێک... من بەڕاستی پێویستیم بە خەیاڵی تۆیە. ئیشم ئەوەیە خەیاڵە جوانەکان ڕزگاربکەم، نەهێڵم بەهەدەر بڕۆن، پێکرا شتێکیان لێدروستبکەم، بژی و بمێنێتەوە... من دەمەوێت فەرشەکانی تۆ ببەم

بەرەو دونیای ڕاستەقینەی خۆیان، لە شوێنێکدا ڕایخەم کە پایە و پەنجەرە و دیوارەکانیشی بە ئەندازەی ئەو جوان بێت، لە شوێنێکدا مرۆڤێک بەسەریدا بڕوات، نرخی ئەو سیحرە بزانێت کە دەیبینێت، دڵی ئەوەی هەبێت تێبگات و عاتیفەی ئەوەی هەبێت خۆشیبوێت. تریفە یابەحری، وەک برایەکی بەستەزمانی خۆت تەماشامبکە، خەیاڵی هیچ مرۆڤێک بە تەنیا ناگاتە کەماڵ... تۆ ناتوانیت فەرشێکی وەها دروستبکەیت جێگەی جوانی هەموو دونیا بگرێتەوە... خەیاڵ دەبێت یەک یەکتر تەواوبکات... جوانی دەبێت دەستی جوانی بگرێت... وەک خوشکێک دەستم بگرە و وەرە لەگەڵمدا، من دەمەوێت شارێکی نوێ دروستبکەم، سەرۆک خۆی ڕایسپاردوم، ئەمریکییەکان ڕایانسپاردوم، شار دروستناکرێت گەر غەزەلنوسێک پڕی نەکات لە عیشق، گەر قالیچنێکی سیحراوی وەک تۆی نەبێت. کاتێک لە مسەرە و سەری زەمینەوە میوان دێن، دەبێت بزانن بەسەر مافوورێکدا دەڕۆن لە جەوهەری خەیاڵ چنراوە... تریفە یابەحری ئێمە هەمیشە میللەتێکی خەیاڵی بووین... دەستی خۆتم بدەرێ و وەرە لەگەڵمدا». هەستمکرد تا من زیاتر دەدوێم ئەو زیاتر دەترسێت، بەڵام ترسەکەی لەو جۆرە نەبوو لە دەستم هەڵبێت و خۆی بشارێتەوە، بە پێچەوانەوە دەستی هێنا و خستییە سەر دەستم. خودایە مەلمەسێکی وەها ئەفسوناوی هەبوو، بۆ تاوێک دڵمی پڕ فێنکییەک کرد، پێشتر لە ژیانمدا نەمجەرباندبوو، لە دەستییەوە تەزوویەکی سارد دەهات و دەبووە عاتیفەیەکی بەهێز، مەلمەسی لە هەتوانێک دەچوو کە دەیخەیتە سەر شوێن داغێک و یەکسەر تیماریدەکات. مرۆڤ تا پەنجەی وەهای بەر نەکەوێت تێناگات چ جەستەیەکی داغانی هەیە و پێویستی بە چ مەرهەمێکە. بە چاوە قووڵ و نیگا غەمگینەکانی سەیریکردم و گووتی «برام، شاری خەونەکان دروست مەکە، یارمەتی خەڵکی ئەم

شارە بدە با لەوە زیاتر خەم نەخۆن... ئێمە بۆیە خەیاڵدەکەینەوە تا ئازارەکانی خۆمان بیربچێتەوە، خەیاڵ لەم شارەدا قەڵغان و سوپەرە... وەرە پێشی برام، با شتێک بە گوێتدا بچرپێنم... خەیاڵ وەک خۆشەویستی وەهایە کاتێک دەژی کە بەکەس نەگیرێت، کە شێوەی نەبێت... وەرە پێشی پێتبڵێم، گەر شارێکی خەیاڵی لەسەر ئەم ئەستێرەیە هەبێت، ئەو شارەیە کە بۆی دەڕۆین و نایگەینێ... دەبێت هەمیشە بۆی بڕۆین و نەیگەینێ. تۆ دەوڵەمەندی، تۆ هێزت هەیە، سەرەتا شاری حەقیقەت چاک بکە... شاری دەرد و خۆشاردنەوە و خۆسووتانەکان چاک بکە، شارێک بۆ ئەو ژنانە دروستبکە کە نازانن لە کوێی دونیادا خۆیان لە جانەوەرەکان بشارنەوە. ئیشی خۆت لەگەڵ ئیشی شاعیراندا تێکەڵمەکە. جەواهیری برام... خەیاڵ وڵاتی تۆ نییە. عەزیزم، باوەڕت بێت وڵاتی تۆ نییە. واز لە فەرشەکانی ناو خەیاڵی من بهێنە و ئەوێش داگیرمەکە. گەر دەتەوێت خزمەتی خەیاڵ بکەیت، حەقیقەت جوان بکە... گەر دەتوانیت یارمەتی بەستەزمانەکان بدە ئازار نەچێژن، جەمعییەتێک بۆ چاکەکاران و کۆمەکی برسی و بێکۆمەکان دروستبکە... ئەوە بکە... ئەوەبکە... لێگەڕێ ئێمە لەم جەهەنەمەدا خەیاڵ ڕزگاربکەین... جەواهیری برام، من لەوەتەی فامکردۆتەوە، شازدە ساڵە بەردەوام ئیشدەکەم... گوێم لێبگرە، گەر حەقیقەت جوان بێت، هەموو بەختەوەری خۆی دەدات بە خەیاڵ، بەڵام گەر حەقیقەت تاڵ بوو، هەموو ژەهراوی خۆشی دەدات بە خەیاڵ». قسەکانی تریفە یابەحری منی لە دڵەوە زامدارکرد، گوتم «خەیاڵ شتێک نییە مرۆڤ لەسەری خۆیدا دیلیبکات، خەیاڵ تارمایییەک نییە هەتاهەتایە بەدوایدا ڕابکەین و نەیگرین، خەیاڵ هێزە، وەک هەموو هێزەکانی تر، وەک توانای ئیرادە و عەقڵ... تریفە یابەحری، خوشکی عەزیزم، ئەو دەستانەتم بدەرێ ماچیبکەم،

من هەموو شتێک لەسەر ئەم ماڵەی تۆ دەزانم، بەڵام خیانەتکار و زمانبەدنیم، ئەو دەستە ناسکانەی خۆتم بدەرێ ماچیبکەم، من سیاسیم، من لەو کاتەوەی سەرم لە هێلکە جوقاوە سیاسیبووم، سیاسەت ئیرادەیە، بەڵام ئیرادەیەکە بێخەیاڵ و بێمێشک. خەیاڵیش هێزێکە بێئیرادە و بێنەخشە... خوشکی عەزیزم ئەو دەستانەت دانێ ماچیبکەم... من ئیرادەم هەیە، دەتوانم وابکەم فەرشەکانی تۆ بژین و بمێننەوە، وابکەم غەزەلەکانی غەزەلنوس نەوە دوای نەوە ڕۆحلەبەری خەیاڵی دروستبکەن. وادەکەم مافوورەکانت بژین... هەر یەکەیان لە ژوورێکی شاهانەی ناو شارێکی ئەفسوناویدا جێگیربن کە ڕەمزی سەرکەوتنی ئێمە بێت... ڕەمزی توانامان بێت لەسەر ژیان... گەر خەیاڵەکانمان نەژین خۆشمان ناژین... من نامەوێت تەسلیمی مردن بین. سیاسییەکانمان کە خەیاڵیان نییە دانیشتوون و تەسلیمی مردن بوون. مەڵێ خەیاڵ شتێکە نایگەینێ... هەموو میللەتێک سەردەمێک لە مێژوویدا هەیە کە چنگی کردوە بە خەیاڵی خۆیدا و گرتویتی. من دەزانم خەیاڵ لە جنسی پاسارییەکە کە دەفڕێت، گرتنی سەختە، بەڵام ئەستەم نییە. ساتێک هەیە دەتوانین ئەو پاسارییە دەستەمۆبکەین و بانگیبکەین لەسەر دەستمان بنیشێتەوە... من دەمەوێت شاری خەونەکان دروستبکەم... ئەوە فەرمانی سەرۆکە... بەڵام سەرۆک بە تەواوی نازانێت شاری خەونەکان چییە، ڕۆژێک لە ڕۆژان وەک من بیری لە وردەکارییەکانی نەکردۆتەوە... شاری خەونەکان ئەو شوێنەیە کە ئیرادەی من و خەیاڵی تۆ تێیدا بەیەکدەگەن، هەر یەکەمان ڕێگا بۆ ئەو یارییە خۆشدەکات کە ئەوی تر دەیکات... تریفە ئەو دەستانەت دانێ با ماچیبکەم... سیاسییەکانی ئەم وڵاتە وابیرناکەنەوە، منم بەتەنیا وابیردەکەمەوە، فورسەتێکی گەورەمان هەیە شتێکی جوان دروستبکەین... شتێک هارمۆنیای تێکچووی

ڕۆحی ئەم میللەتە لە خۆیدا کۆبکاتەوە... هارمۆنیای تێکچووی نێوان سەرەکان و دەستەکان و خەیاڵەکان بکات بەیەک... من ناهێڵم کەس ئەوەم لێبستێنێت و ئەو دەرفەتە بکوژێت... تریفە یابەحری من بە ناوی ڕۆحی ئەم میللەتەوە قسەدەکەم کە هارمۆنیای تێکچووە... شاری خەونەکان دروستکردنەوەی ئەو هارمۆنییەیە... دەستت دانێ ماچیبکەم، خوشکی عەزیزم. ئەوەی من دەمەوێت دروستیبکەم، گەڕەکێک نییە کۆمەڵێک پارەدار شوقەکانی بە پارەی زۆر بکڕن کە خەڵکی هەژار و نەدار نایکەنێ... بەڵکو شوێنێکە بۆ من و تۆ و بۆ هەمووومان».

وەک بەزەیی پێمدا بێتەوە، وەک سەیری نێوچاوی یەکێک بکات کە هێدی هێدی شێتدەبێت. گووتی «برای عەزیزم، تۆ چەند دڵێکی باشت هەیە... تۆ دەتەوێت خەیاڵی ئێمە لەگەڵ دونیادا ئاشتبکەیتەوە. دەتەوێت لەگەڵ ئەم هەموو ترس و ڕاکردن و غەمەدا ئاشتمانبکەیتەوە... برای عەزیزم... خەیاڵی من تازە لەگەڵ دونیادا ئاشت نابێتەوە. تۆ پیاوێکی باشیت، تۆ پیاوێکی زۆر باشیت، نازانم ژن و منداڵت هەیە یان نا؟ بچۆرەوە بۆلای ژن و منداڵەکەت، بڕۆرەوە بۆ لای سەرۆک و بڵێ من دەتوانم شاری جوان دروستبکەم... بەڵام بۆ ئەوەی ئەزیەتت نەدات، هەر زوو پێیبڵێ خەیاڵ لەم شارەدا وەها تۆراوە کەس ناتوانێت لەگەڵ دونیادا ئاشتیبکاتەوە... بەرلەوەی دەستخەڕۆبیت... پێیبڵێ جەنابی سەرۆک ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان ناتوانن لەگەڵ دونیادا ئاشتببنەوە. بەرلەوەی پارە سەرفبکەیت و دوایی خانەخەراب بیت و بەدناو بیت، بڵێ ئەوەی تێکچووە دروست ناکرێتەوە... پێکەوە نانرێتەوە».

عەزیزان کەس وەک تریفە یابەحری وەڵامی ڕۆشنی نەدامێ. زۆر لەگەڵ تریفەدا دوام، هەڕەشەم لێکرد، تەماحم خستەبەر، گووتم

کە ئەو ژنانە ئاشکرادەکەم کە دەیانشاریتەوە، گریام... بەڵام ئەو بەردەوام دەستی دەخستە سەر دەستم و دەیگووت «ئیشی تۆ ئەوەیە دونیا چاکبکەیت و کارت بە خەیاڵەوە نەبێت» دەیگووت «تۆ تەماحت لەوەیە ڕۆحی ئێمە یەخسیربکەیت، نەوەک تەماحت لەوە بێت پێکەوە دونیا جوانبکەین». بە منی گووت «گەر دەتەوێت ببیتە مەخلوقێکی خەیاڵی دەبێت بڕۆیت و سەیری ئەو هەموو ناکامی و نامورادی و خوێن و ئازارە بکەیت کە لەم شارەدا هەیە. ئەوە دەتبات بۆ سەرزەمینی خەیاڵ». گووتی «هەموو ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان، ناموراد و بەدبەخت و تەنهان... هەموویان...». گووتی «سیاسییەکان جەهەنەم دروستدەکەن نەوەک شاری خەیاڵی». دواجار، دوا قسە و دوا بڕوای خستە دەستم و گووتی «برام، خەیاڵی من لە دونیا تۆراوە، دەمەوێت لێی دووربکەومەوە نەوەک بچمەوە ناوی». دەستی دەخستە سەر دەستم و گووتی «حەزم لێ نییە خەیاڵم لە هیچ نەخشەیەکدا ئیشبکات، حەزم لێیە، خەیاڵ بکەم بە فەرشێکی باڵدار و پێی بفڕم... برای عەزیزم، خەیاڵ وەک تۆ تێکەیشتویت ڕێگا نییە، بەڵکو دەرگایەکی نهێنییە کە ماڵەکانمان گرێگرت پیا ڕادەکەین».

نا هاوڕێیان... نا. هیچ شتێک سوودی نەبوو. ئەو غەزەلنوسە بەشێوەیەک چووبووە ڕۆح و عەقڵی هەندێک لەم خەیاڵبازانەوە، هیچ هێزێک نەیدەگۆڕین. ئەو شەوە بە چاوی پڕ فرمێسک و دڵی پڕ قینەوە لای تریفە هاتمەدەرێ. تا سەر ترۆپکی یەکێک لە شاخەکانی دەوروبەری شار ماشێنەکەم لێخوڕی، لەوێ بەدەم گریانەوە دەستی خۆم گەست، بەدەم فرمێسکەوە تا هێزم هەبوو تفێکی گەورەم لەم دونیایە کرد....

# حکایەتەکەی غەزەلنوس دەربارەی خەلیقەت و پەیوەندی شەیتان و کتێب
## ماجیدی گوڵ سۆلاف - سەرەتای پاییزی ٢٠٠٤

چوار ڕۆژ دوای ئەو شەوەی بە نهێنی لە ماشێنەکەی بارۆنی خەیاڵ دابەزیم، تیشکان تاهیر هات بۆلام. ئێوارەیەک لە دەرگای دا و دایکم تا ژووری من ڕێنماییکرد. کە پێی خستە ژوورەکەمەوە گووتی «وی کوڕی جوان، ژوورەکەت چەند خۆشە». لەو باوەڕەدانەبووم وازوو بەقەد و قامەتی جوانی خۆیەوە بەرابەرم دەرکەوێت، بەسەرسامییەوە سەیری نەخشەی سەر دیوارەکەی کرد و گووتی «کوڕی ئاسمان، تۆ عالەمی خۆتت هەیە». کراسێکی ڕەشی سادەی لەبەردابوو، لەگەڵ پانتۆڵێکی بێجی خەت خەتدا. مەکیاجێکی جوانی کردبوو، بەڵام بۆن عەترێکی ناسک وەک هەورێک لە تەکیدا خۆی کرد بە ژووردا. من هەمیشە حەزم لە خانمانی قژ کورت کردوە، بەڵام ئەم قژکورتییەی ئەو شتێکی تر بوو، مرۆڤی ناچاردەکرد بڵێت «خانم، بۆ ئەوەی لە ئافاتی ئەم قژە کورتەت بەدووربین، بۆ خاتری ڕەب لعالەمین نەختێک درێژیکە». سەیرێکی دۆلابی فلیمەکانی کرد و گووتی «وی، تۆ ئینگلیسیش دەزانی». گووتم «کەمێک دەیزانم، بەشی ئەوەی سەیری ئەو فلیمە نوێیانەی پێبکەم کە وەرگێڕانی عەرەبیان لەسەر نییە». تۆزێک هەستا و سەیری هەندێک کتێبی کرد و گووتی «کوڕی قۆز، سیدێی بوڵن بوڵنت نییە؟». بوڵن بوڵن گۆرانیبێژێکی پرپوچبوو لەوانەی بە ئاوازی تورکی گۆرانی دەڵێن، وەک گۆرانیبێژە تورکەکان دەست ڕادەوەشێنن و سەربادەدەن، خەڵکی بێ کولتوور و بێ ماریفەت زۆر گوێیان لێدەگرت. سەیر نەبوو بەلامەوە تیشکان حەز لە بوڵن بوڵن بکات، ئەو کچێکی سادەبوو کە هیچی

ئەوتـۆی لـە دونیـا نەدەزانـی. گووتـم «نـا تیشـکان، مـن گـوێ لـە بوڵـن بوڵـن و ئـەو جـۆرە گۆرانیبێژانـە ناگـرم... بمبـورە سـێدێی وەهـام نییـە». سـەیرێکیکردم و بـە عەیارییـەوە گووتـی «خـۆ پێتناخـۆش نییـە هاتـووم بـۆلات». مـن ئەگەرچـی هەمـوو ژیانـم ئاواتـی ئـەوەم خواستبوو کچێکی وەک تیشـکان دۆسـتم بێـت، بـەڵام بـەوەدا نەمدەویسـت ژنبهێنـم، نەشـمدەزانی گەر پەیوەنـدی لەگـەڵ کچێکدا دروسـتبکەم دوایـی چـۆن درێـژەی پێبـدەم و کـەی رایبگـرم، لـە ناخـدا بـڕوام وابـوو هەرجـۆرە پەیوەندییـەک دروسـتبکەم بـە کارەسـات دەشـکێتەوە. لەگـەڵ ئـەو هەستەشـدا گووتـم «گوێبگـرە تیشـکان، باوەڕناکـەم پیاوێـک لـەم سـەر زەوییـە هەبێـت پێـی ناخۆشـبێت تـۆ بچیـت بـۆلای، کەسـی وەهـا لـە دونیـادا نییـە، منیـش بـە تایبـەت زۆر حـەزم لـە تۆیـە... بـەڵام لێتـی ناشـارمەوە نازانـم گـەر لـە نوێمیـران بزانـن تـۆ هاتوویت بـۆ لام چـی ڕوودەدات؟». تیشـکان گووتـی «کـەس لـە نوێمیـران نازانـێ مـن لای تـۆم». ئینجـا گووتـی «بەڕاسـت حـەزت لـە منـە؟». مـن بـۆ ئـەوەی قسـەکەم ڕاسـتبکەمەوە گووتـم «مەبەسـتم ئەوەیـە بڵێـم، هیـچ پیاوێـک نییـە لـە دونیـادا بتوانێـت حـەزی لـە تـۆ نەبێـت، تـۆ کچێکـی وەهـا جوانـی شایسـتەی هەمـوو خۆشەویسـتییەکی. دەزانـم زۆر کەسـیش پێـش مـن حەزیـان لێکردویـت... تیشـکان لەوانەیـە مـن زۆر ئەزموونـم نەبێـت، بـەڵام پیاوێکـی بێعەقـڵ نیـم، دەزانـم تـۆ لـە چ دنیایەکـەوە هاتوویت بـۆ لای مـن». وەک خـۆی لابـدات و نەیەوێـت بچێتـە نـاو بـاس و خواسـی وەهـاوە، باوێشـکێکی نەرمـی دا و گووتـی «هاتـووم حیکایەتێکـم بۆبکەیـت، خـەوم لێبکەوێـت... وی کـوڕی بـاش مـن چەنـد شـەوە تێـر نەخەوتـووم». هاتـە سـەر جێگاکـەم و لەسـەرەخۆ لەسـەر پێخەفەکـەم پاڵکـەوت و گووتـی « حیکایەتێکـی خـۆش بـۆ کچێکـی وەکـو مـن دەسـتبدات». منیـش بە هێواشـی لـە تەنیشـتییەوە دانیشـتم و دەسـتێکی بچوکـم بـە قژیـدا هێنـاو حیکایەتێکـی درێـژم بـۆ کـرد دەربـارەی کیـژە میرزادەیـەک کـە خاوەنـی سـەدان مـاڵ و

باغ و کۆشکی گەورەیە، کۆشکەکان هەموو شتێکی جوانی دونیایان تێدایە، هەموو جۆرە زێڕ و یاقووت و مەرجانێک، سەدان خزمەتکار و بەردەستی هەیە، ئەمیرەکان لەملاولای دونیاوە پەیتا پەیتا بۆ خوازبێنی ئەو دێنە بەر دەربار، بەڵام کچەکە بەهیچ شتێک دڵی خۆش نییە و بەردەوام دەگری، چونکە هێند دەوڵەمەندە نازانێت حەز لە چی بکات... ئەوەندە زەنگینە هەر شتێکی لە دونیادا بوێت دەتوانێت بە ئاسانی پەیدایبکات. ڕۆژێک لە ماڵ دێتەدەرێ و دەیەوێت بەدوای شتێکی عاسی و سەختدا بگەڕێ کە پەیداکردنی قورس بێت، دەیەوێت لە دونیادا شتێک بدۆزێتەوە کە بۆی نەبێت و نەتوانێت بیکڕێت و بیکات بە موڵکی خۆی تا لەزەتی پەیداکردن و کڕینی شتی سەخت و ناوازە بچێژێت... چەند شار دەگەڕێت و چەند زەمین تەیدەکات، لە هەر جێگایەک هەر شتێکی بەدڵ بێت دەیکڕێت و هەر ئادەمیزادێک مەبەستی بێت دەیکات بە ئیشکەری خۆی. تا ڕۆژێک دەگاتە ماڵێکی لاتەریک و شوێن چەپەکی سەر دووڕیانێکی گەورە، لە دەرەوە گوێی لە دەنگی بولبولێکی ئێجگار سیحراوی دەبێت، بولبولێکی دەنگخۆش و بێوێنە. کە دەچێتە ژوورەوە تەنیا گەنجێکی جوان دەبینێت کە لە بەر پەنجەرەیەکدا وەستاوە و وەک بولبول دەخوێنێت. کچەکە کە ڕاهاتووە هەموو شتێکی دونیا بکڕێت، بە کوڕەکە دەڵێت «دەتوانم ئەو بولبولەت لێبکڕم کە دەخوێنێت؟». کوڕەکە داوەتی کیژە ئەمیرەکە دەکات و دادەنیشێت، لەسەرەخۆ حیکایەتی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە و پێیدەڵێت ئەو بولبولە تاکە شتێکی دونیایە کە ناکڕدرێت و نافرۆشرێت، چونکە ئەو بولبولە هیچ نییە جگە لە تەیرێکی خەیاڵی کە بە دەیان ساڵ ئیش لە سەری خۆی و گەروی خۆی و ڕۆحی خۆیدا دروستیکردوە. ئەوە شتێکە نافرۆشرێت و ناکڕدرێت. کیژەکە شەیدای ئەوە دەبێت ئەو بولبولە بکڕێت و بیکات بە موڵکی خۆی، هێدی هێدی دەکەوێتە سەوا و مامەڵە لەگەڵ ئەو کوڕەدا

و سوودی نییە، نیوەی کۆشکەکانی خۆی دەداتێ بەرابەر ئەو بولبولە و سوودی نییە، سێ بەشی کۆشکەکانی دەداتێ و سوودی نییە، هەموو سامان و ماڵی خۆی دەداتێ و سوودی نییە، خۆشی پێدەبەخشێت هەر بێسوودە. دواجار کە کیژەکە وەختە دەگاتە شێتی، کوڕەکە پێیدەڵێت «خانم من ساڵەهای ساڵە دەزانم ڕۆژێک دێت تۆ دێیت و بۆ ئەو شتە دەگەڕێیت کە ناتوانیت دەستت پێیبگات. بۆ ئەوەی تۆڵەی ئەو هەموو نەدارییەی خۆم بکەمەوە شتێکم دروستکرد کە تۆ هەرگیز ناتوانیت بیگریت و بیکڕیت و ببیتە خاوەنی... ئەوە جیاوازی نێوان سامانی من و سامانی تۆیە، من شتێکم هەیە کە تۆ ناتوانیت ببیتە خاوەنی، بەڵام تۆ شتێکی وەهات نییە، خەڵکی تر نەبنە خاوەنی. خانم شتە خەیاڵییە جوانەکان بە تۆ ناکڕدرێت و ناتوانیت تۆ بیکەیت بە موڵکی خۆت، خانم هەمیشە شتێک لە دونیادا هەیە تۆ ناتوانیت داگیریبکەیت، حیکمەتی خوێندنی ئەو بولبولە خەیاڵییەی من ئەوەیە. ئەوە بولبولێکە دەتکوژێت و پێیناگەیت». ئا بەو جۆرە کیژە زەنگین و ساماندارەکە تووشی دەردێکی کوشندەبوو، بۆ هەر کوێیەک دەچوو دەنگی ئەو بولبولە لە ناوەوە دەیخوارد و لەسەریدا دەزرینگایەوە... تا دواجار شێتی و حەسرەت بڕستیان لێبڕی و دوای چەندین مانگ نەخۆشی سەخت گیانی سپارد و هەرگیز جارێکی دی بە بیستنی سەدای ئەو بولبولە سیحراوییە شادنەبوو».

کە ئەو چیرۆکەم بۆ تیشکان تاهیر کرد نەمدەزانی ئەو چیرۆکە هەموو شتەکان دەگەێنێتە ئاقارێکی ترسناک.

تیشکان خۆی وا پیشاندا کە خەوتووە. بەڵام دڵنیابووم بیر لە چیرۆکەکە دەکاتەوە. پڕ بەدڵ دەمویست ماچیبکەم، دەمزانی ئێستا دەتوانم لێوی بۆ بەرم و ماچیبکەم، بەڵام دەستێکی نهێنی لە ناوەوە وەستاندمی. دەمزانی تیشکان لەوێدا ڕاکشاوە و چاوەڕوانی لێوی من

دەكات، دەمزانی لێوەكانی ئامادەن بۆ ماچێكی دووردرێژ و جەستەی شتێكی تایبەتی لە من دەوێت. دەشمزانی كە خانمێك چاوەڕوانی ماچی لێكردیت و نەتكرد، ئیدی دەبێتە دوژمنێكی ترسناك، لەوانەبوو ئەوجارە تیشكانم ماچبكردایە، شتەكان ڕێگایەكی تر و ڕەنگێكی تریان ببووایە... بەڵام نازانم... لەوانەشە وانەبێت. لەگەڵ هەموو ئەو دوو دڵنیاییەشدا دڵنیام، ماچێك هەندێجار دەتوانێت ڕێڕەوی ژیانی كەسێك بگۆڕێت.

كە تیشكان بەبێ ئەو ماچە ڕۆی، هەستمكرد هەڵەیەكی گەورەم كردوە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە حەسەنی پیزۆ هەموو حیكایەتی خۆی لەگەڵ مورتەزای شەیتاندا بۆ من و ماجەلانی ڕاستەقینە و غەزەلنوس باسكرد، ئەوكات تریفە یابەحریمان كەم دەبینی، هێدی هێدی دانیشتنەكانمان دەبوونە دانیشتنی پیاوانەی ڕووت بەبێ ناسكی كچێك كە ئەو دونیا زبرەی نێرانی بۆ هێوردەكردینەوە. دووركەوتنەوەی نیگاكانی تریفە و پیاهەڵشاخانە ناسكەكانی منیان نائومێدتركرد. هەركات دەمبینی تریفە لەوێ نییە بیری تووڕەبوون و دڵڕەقییەكانیم دەكرد، كچێك بوو لەگەڵ هەموو دونیادا وەك شەونم وەهابوو، بەڵام دەرهەق بە من بێمرووەت و دڵڕەق بوو، منیش لە بێدادیدا ناچار هەموو زامێكی ئەوم بە خراپی خۆم تەفسیردەكرد. ئەو شەوە حەسەنی پیزۆ سەختترین ئەركی ژیانی خستە ئەستۆم. بەقسەی ئەو دەبوو هەموو لەتەك دەرسیم تاهیردا بچین و لە نوێمیران، لەو دیو دیوارەكانی باغی مورتەزاوە لاشەكەی باران شوكور دەربهێنین... حەسەنی پیزۆ گووتی «واهەستدەكەم ئەوە تەنیا شتێكە بۆدڵخۆشی ئەو دوو جوانەمەرگەی بكەین. تاكە شتێكە دڵی بەڕێز شازەمانی پێ خۆشبكەین، تا وا تێنەگات دوای بیستوچوار ساڵ پێی لە دارستانێك ناوە ئادەمیزادی تیا نییە. دەبێت لاشەكانیان لە تەنیشت یەكەوە بنێژین، وانییە غەزەلنوس وا نییە؟ ئێمە نە دڕندەین

و نە شەیتان هێشتا دەبێت بەشی ئەوە هێزمان هەبێت، دوا ئاواتی ئەوان بهێنینە دی». ئەو شەوە، لە زنجیرە شەوگارە بێبن و قووڵەکانی غەزەلنوس بوو، ئەگەرچی چەند ساڵ بوو هاوڕێبووین و هەر دووکمان شتگەلێکی زۆرمان لە نێواندا بوو کە شتگەلی نێو دوو هاوڕێ بوون، نەمن ئەوم وەک مەخلوقێکی خەیاڵی دەبینی و نە ئەویش، بەڵام ئەو شەوە غەزەلنوس شتێکی تر بوو، بۆ یەکەمجار هەستمکرد جیاوازی تەمەن لە نێوانماندا جیاوازی حیکمەت و عەقڵیشە. کە حەسەنی پیرۆ تەواوی وردەکارییەکانی مردنی نەوجەوانی چینی گێڕایەوە، کاتێک دەستی خستە سەر مێزەکە و گووتی «جەعفەری مەغۆلی کوشتوێتی»، وەک ئەوەبوو غەزەلنوس بارێکی قورس لە ئەستۆی داگیرابێت و گەیشتبێت بە حەقیقەتێک کە لە هەر خەیاڵێکی دونیا بەلایەوە گرنگتر بوو. بە هێمنی سەیریکردین و گووتی «پیرۆ تۆ ئیشێکی گەورەت کردوە، ئێوە تەلیسمی قووڵی مردنێکتان بۆ ئاشکراکردم کە تەلیسمی مردنی منیشە... زۆر سوپاسگوزارتانم، تۆ و گوڵ سۆلاف. ئەو لاشەیە لاشەی منە و جەستەی ئەو ژنە، جەستەی منە...».

بە نیگایەکی غەمگینەوە سەیری هەموومانی کرد، دەستی خستە سەرشانی ماجەلانی ڕاستەقینە کە بە خۆی و قژە سپییە درێژەکەیەوە بۆ خوشکەزاکەی دەگریا. غەزەلنوس بە ماجەلانی گووت «باران زۆر حەزی لە غەزەلەکانی من بوو. من وەک نەوجەوانی چینی حەزم لێکرد. تا ئەو پتر خۆشیبویستبایە من پتر غەزەلم بۆ دەنوسی... هەر شتێک نەوجەوانی چینی خۆشیبویستایە منیش خۆشمدەویست. بەڵام من لەو عەشقە دونیاییەی ئەو هەڵدەهاتم... باران شوکوری ئەو لە کۆشکێکی ڕاستەقینەی ئەم شارەدا دەژیا، ژنی بارۆنێک بوو، بەڵام باران شوکری من لە باغێکی خەیاڵیدا دەژی. ئەو خواستەی پێکەوە بمرن، لە هەموو خواستێکی تر گەورەتر بوو. ماوەی ساڵێک پێکەوەبوون، هەموو

لەزەتەکانی دنیایان تاقیکردەوە. ئەوەی هەموو ژیان بژی ئیتر دەتوانێت بێترس سەیری مردن بکات، لە مردندا پەلەقاژێ ناکات و هاوارناکات... لەو عاشقانە نەبوون کە بۆیە دەیانەوێت بمرن، چونکە بەیەک ناگەن... باران و نەوجەوانی چینی لە ماوەی ئەو ساڵەدا هەموو خۆشییەکانی ژیان، ژیان... بەڵام هەستیشیاندەکرد هێشتا بۆ یەک نین... دەیانویست بەرەو خەیاڵ بڕۆن. باغ تاکە ئومێدی ئەوان بوو». بە غەمەوە سەری دانەواند و گووتی «من وامکرد عەشق وەها سەخت و دوور و نەگیر بێت، باغ تاکە ئومێدیان بێت...».

غەزەلنوس ئەو شەوە سەرەتا هەندێک غەزەلی بۆ خوێندینەوە، لەو غەزەلانەی نەوجەوانی چینی بۆ باران شوکوری خوێندبووەوە. من پێشتر چی غەزەلێکی غەزەلنوسم بیستبوو هیچیان وەها قووڵ و قەشەنگ نەبوون. هەر ئەو شەوە بەدەم خوێندنەوەی غەزەلەوە داوەتیکردین بۆ پیاسەیەکی دوورودرێژ. شەوێکی مانگەشەوی پاییزە بوو، هەوا بەڕاستی ڕوو لە ساردی بوو، نور زۆربوو و ئادەمیزاد کەم، بێدەنگی زۆر و چرپەی گەردون کز، ئەستێرەکان غەمگین و ئێمە بەختەوەر. دەڕۆیشتین و ئەو غەزەل بەدوای غەزەل دەیخوێند، ئێستاش نازانم چۆن و لە چ ساتێکدا کەوتینە سەر خاکی ئەو باغە خەیاڵیانەی ئەو. باغێکی سیحراوی کە هەرگیز ناو و ناونیشان و شوێنی لە هیچ کتێبێکی دونیادا نادرکێنم، ئێمەی بە ناو لالەزارێکی سیحراویدا کێشکرد کە گوڵەکانی پڕبوون لە جوانییەکی وەها لە هیچ یەک لە شارە سیحراوی و جەنگەڵە ئەفسانەییەکانی خۆمدا نەمبینیبوو، بە ناو باغی ئەوتۆدا پێشمانکەوت ئەستەمە ڕۆژێک لە ڕۆژان دیدی من یان نەخشە ڕاستەقینەکانی ماجەلانی ڕاستەقینە بیانگاتێ... ئەو شەوە تێگەیشتم کە ماهییەتی خەیاڵ لای غەزەلنوس دوورتر و ڕەنگینتر و قووڵترە لە ماهییەتی خەیاڵ لای من و لە حەقیقەتی دونیا لای زوهدی شازەمان. هەر دەڕۆیشتین و بە جوانیدا

ڕۆدەچووین، تا من و حەسەنی پیرۆ و ماجەلان لە شوێنێکدا گەیشتینە یەقین کە ئێمە بۆ یەکەمجار لە هەموو ژیانماندا بە ناو شیعرێکدا سەفەردەکەین... ماجەلانی ڕاستەقینە بە خۆی و قژە درێژ و سپییەکەیەوە گووتی «غەزەلنوسَ ئەم جێگایەی تۆ ئێمەی بۆ دەهێنیت، جێگا نییە بەڵکو قووڵایی ناو قەسیدەیەکە». ئەو لەسەر هەق بوو، غەزەلنوس ئێمەی بۆ ناو قووڵایی بێبنی شیعرێک دەبرد کە مرۆڤ تا ناکۆتا دەتوانێت تیا قووڵ ببێتەوە... جوانییەکی وەها بوو مرۆڤ لەسەر زەمین و بە حەواسی ئاسایی هەستی پێناکات، لە شوێنێکی زۆر دووری ناو ئەو باغانەدا غەزەلنوس دەستی بۆ ئەو باغە بێسنوورە ڕاکێشا و گووتی «سەیرکەن چ جوانییەکی ناکۆتای هەیە غەزەل». باغ دوای باغ ئێمەی برد و گوڵ دوای گوڵ سەرسامیکردین. لە شوێنێکی ناو ئەو بەحری جوانییەدا، لە ناوەڕاستی چیمەنێکی سەوزدا ئێمەی وەستان و بردینیە سەر گڵکۆیەکی گەورە لەسەری نوسرابوو «ئا لێرەدا نەوجەوانی چینی بۆ هەتاهەتایە خەوتووە». غەزەلنوس شەوێک دوای ئێمە، شەوێک دوای ئەوەی مەیتەکەی نەوجەوانی چینیمان دەرهێنا خۆی دیسان لاشەکەی لە خاک دەرهێنابوو و بەرەو قووڵایی ئەم باغە بێسنوورانە دابووی بە کۆڵیدا و لە قافییەی کۆتایی ئەم هەموو شکۆفە و غونچەیەدا ناشتبووی. کە سەرمان هەڵبڕی چواردەورمان شکۆفە و ڕەفی درێژ و ناکۆتای کتێب بوو، من سەرم هەڵبڕی بزانم لە کوێم. مانگم بە گەورەیی لە ژوور سەری خۆم بینی، دەستمبرد بۆ گوڵەکان بزانم گوڵی ڕاستەقینەن یان خەیاڵ. گوڵی ڕاستەقینەبوون، دەستم برد بۆ کتێبەکان بزانم کتێبی ڕاستەقینەن یان خەیاڵ. دیوانی ڕاستەقینەی غەزەل بوون. جێگایەک بوو بۆنی مەزاری لێدەهات، بۆنی باغی لێدەهات، بۆنی کتێبخانەی لێدەهات. نەوجەوانی چینی لە گۆڕێکی چکۆلانە و باریکدا لە نێوان کتێبەکانی غەزەل و گوڵە قەشەنگەکانی باغدا نێژرابوو. غەزەلنوس لە

ناو شەپۆلی تریفە و زرنگەی قافییەکانی غەزەل و بۆنی گوڵاوی باغدا دەستی خستە سەر گۆڕەکەی ئەو و گووتی «من ئالێرەدا مردوم». سەیری هەر سێکمانی کرد... هەرسێکمان برۆنزی و خەستە و سەراسیمەبووین... لە سێ دیل دەچووین بە جەنگەڵێکی ڕەشدا هەڵهاتبین و گوڵ و درەخت و تریفە ڕێگایان لێگۆڕیبین. جێگایەکی سەیربوو کە ئێمە نەماندەتوانی بچینەوە سەری. ئەوە یەکەمجاربوو لە ژیانمدا نەمدەزانی لەناو خەیاڵدام یان لە حەقیقەتدا. بەڵام تێگەیشتم ئەم سەفەرەی غەزەلنوس بۆ ئەوەیە ئەو دوو عاشقە لە باغێکی خەیاڵیدا بنێژێت. ئەو شێتی باغە خەیاڵییەکان بوو، ڕۆحی هەمیشە لەو باغانەدا دەگەڕا. ژیانی ڕاستەقینەی ئەو لە نێوان غەزەل و ئەو باغانەدا دابەشبووبوو. دواجار غەزەلەکانی خۆی لەو باغەدا شاردبووەوە، ئەو باغە کتێبخانەی نهێنی ئەو بوو. بڕوایەکی سەیر و گەمژانەی هەبوو، بڕوایەک لە پشت هەموو ئەفسانەکانی ژیانییەوە بوو، لە پشت هەموو خەیاڵ و خولیاکانییەوە وەستابوو، لەو باوەڕەدا بوو کە عاشقان نامرن، بەڵکو دەبن بە کتێب یان بە گوڵ. ئەو شەوە بۆ یەکەمجار ئێمەی لەو کتێبخانەی غەزەلەدا سوڕاندەوە، گووتی «غەزەلنوسەکانی دوای من دێن و ئەم کتێبخانەیە دەدۆزنەوە، وەک چۆن ماجیدی گوڵ سۆلاف ئەو موسافیرە خەیاڵیانەی دوای تۆ دێن و ئەو نەخشەیەی تۆ تەواو دەکەن، وەک چۆن حەسەنی پیرۆ باغەوانەکانی دوای تۆ دێن و کلیلی دەرگای باغە نهێنییەکان دەکەنەوە، وەک تۆ ماجەلانی ڕاستەقینە، گەڕاڵەکانی دوای تۆ دەڕۆن و ئەوەی تۆ نەتبینیوە دەیبینن». ئینجا سەیری ئێمەی کرد و گووتی «هەر کەسێک قووڵ لە غەزەلێک بڕوانێت و لەگەڵیدا بژی، دەگاتە ئەم باغە». هەموو دیوانەکانی خۆی و مەلای سوختەی بە نهێنی لەو باغەدا هەڵگرتبوو. غەزەلنوس گووتی «گەیشتن بە باغێکی قەشەنگ ئامانجی هەرە گەورەی مرۆڤ بووە... ژیان لە باغێکی وەها

جوانـدا كۆنترين خەونـى مرۆڤـە، بەهەشـت بريتييـە لـە پەيوەنـدى خـودا و مـرۆڤ كاتێـك ئـەو پەيوەندييـە شـێوەى باغێـك وەردەگرێـت. پادشـا كۆنەكان باغـى خەياڵـى و گەورەيـان دروسـتدەكرد بـۆ ئـەوەى سـوڵتان و هێـزى خۆيـان بەسـەر جوانيـدا نيشـانبدەن، پادشـاكان هەميشـە ويسـتويانە بەسـەر جوانيشـەوە پادشـابن، زۆربـەى پادشـاكانى دونيـا دەيانەوێـت شـوێنى وەهـا جـوان دروسـتبكەن و باغـى وەهـا بڕازێننـەوە بتوانێـت خەيـاڵ بشـكێنێت و بێبەهـاى بـكات. زۆربـەى پادشـاكان بـۆ كوشـتنى خرۆشـى خەيـاڵ نـەوەك بـۆ ئاسـوودەيى مـرۆڤ، باغـى جوانيـان لەسـەر زەوى دروسـتكردوە. ئـەو باغانـە لـە باغـى شـاعيرە كۆنـەكان جياوازن كـە ديوانەكانـى خۆيـان بـە بـاغ و لالـەزار و گوڵسـتان ناودەنـا، چونكـە شـيعر لـە خـەو هەسـتانى ڕۆحـە و باغيش هـەر لـە خـەو هەستانى ڕۆحـە. گرنـگ نييـە مـرۆڤ خەياڵـى هەبێـت، گرنـگ ئەوەيـە خەيـاڵ بيهێنێـت بـۆ باغچـە... غـەزەل بيهێنێـت بـۆ باغچـە... مرۆڤـى تـەواو مەخلوقێكـە شـتەكان بـەرەو باغچـە ڕادەكێشـێت. ڕۆحـى مـرۆڤ لـە خـەو هەسـتێنە هەمـوو باغەكانـى دونيـا لەگەڵيـدا لـە خـەو هەڵدەسـتن... هەمـوو شـاعيرەكان دواجـار دەگەنـە باغێـك كـە لـە هيـچ باغێكـى دى ناچێـت... دوو جـۆر بـە هەشـت لـە دونيـادا هەيـە، بەهەشـتێك كـە خـودا دەيبەخشـێتە مـرۆڤ و بەهەشـتێكيش كـە مـرۆڤ دەيبەخشـێتە خـودا... ئـەو مرۆڤـەى نەتوانێت بەهەشـت ببەخشـێت، ناتوانێت وەريبگرێـت». لەگەڕانەوەدا ماجەلانـى ڕاسـتەقينە لێيپرسـى «غەزەلنـوس، بـۆ ئـەم ديوانانـە نادەيتـە كتێبخانـەى گشـتى شـار؟ بـۆ لـە شـوێنێكدا داينانێيـت هەمـوو خەڵـك دەسـتى بيانگاتـێ؟». غەزەلنـوس گـوتـى «ماجـەلان ئـەم كتێبانـە لـە هەمـوو شـوێنێكن، ئـەم باغـە دەرگاى لەسـەر هەمـوو كوچەيـەك هەيـە، هـەر كتێبێكى جوانـى دونيـا بكەيتـەوە دەتهێنێتـەوە بـۆ نـاو ئـەم گوڵـزارە... هێنـد هەيـە مـرۆڤ دەبێـت بـۆى بگەڕێـت... مـن كتێبەكانـم ناشـارمەوە، مـن كـەى غەزەلى خـۆم شـاردۆتەوە؟ هێندەيـە بـۆ ئەوانـەى هەڵدەگـرم كـە بـۆى دەگەڕێـن.

کتێبی جوان مرۆڤ سەرەتا لە ڕۆحی خۆیدا دەیدۆزێتەوە، دواتر دەیخوێنێتەوە... من دوای ئەم هەموو ساڵە، نهێنییەکتان پێدەڵێم، نهێنییەک کە ڕەنگە دوا نهێنی گەورەی ژیانی من بێت، من دوای ئەو هەموو ساڵانەی لە خوێندنەوەی غەزەل و نوسینی غەزەلدا بردمە سەر، گەیشتمە ئەو بڕوایەی ڕۆژی هەشتەم کە لە چیرۆکی خەلیقەتدا هەندێجار باسدەکرێت، خودا بۆ دروستکردنی کتێبە جوانەکانی دونیادا تەرخانیکردوە، ئەو گفتوگۆ دێرینەی عاریفان کە ئایا کتێبەکانی خودا ئەزەلییە یان دروستکراوە... گفتوگۆیەکی بێسوودە... لەبەرئەوەی خودا ڕۆژی هەشتەمی خەلقی بۆ دروستکرنی کتێب تەرخانکرد، بەلام کێ دەزانێت ڕۆژی هەشتەم چەندە؟ کێ دەزانێت؟ پێتان سەیر نەبێت گەر بڵێم ئێمە ئێستا لە ڕۆژی هەشتەمداین... ڕۆژی هەشتەم ئەو ڕۆژەیە کە هەرگیز کۆتایی نایەت، خودا هەموو حەقیقەتی گەردونی لە حەوت ڕۆژدا دروستکرد و پشووشیدا، خودا دوای پشوویەکی کورت، بیری لە دروستکردنی شتێک کردەوە کە هەرگیز کۆتایی نەیەت، خودا خالیقە و خالیق ناتوانێت بەبێ خەلقکردن دانیشێت، گەورەترین کوفرێک کە دەیکەن ئەوەیە کە دەڵێن خودا خەلقی لە حەوت ڕۆژدا تەواوکردوە... هیچ خالقێک نییە هەموو خەلق لە حەوت ڕۆژدا تەواوبکات و ئیتر تا ئەبەد بێئیش دانیشێت، لە حەوت ڕۆژی یەکەمدا یەزدان تەنیا حەقیقەتی دروستکرد، تەنیا حەقیقەت و هیچی تر... حەقیقەت دیوە سادە و ناکامڵ و سەرەتاییەکەی وجودە. خودا لە ڕۆژی هەشتەمدا کتێبی دروستکرد، بۆ ئەوەی کتێبیش دروستبکات دەبایە خەیاڵ دروستبکات... یەزدانی گەورە سەیری لێهات، کە دروستکردنی ئینسان ئیشێکی سادە و کۆتابین بوو، دروستکردنی باڵندە و زەوی و ئاو و تافگە هەموو ئاسان تەواوبوون، سەیری لێهات کە چەند زوو ڕۆژی دروستکردنی فریشتەکان و بیناکردنی مەلەکوت و ئاوەدانکردنەوەی خاک زووبەزوو هەموو شتێک

تەواوبوو، هەموو شتێک سادە و ئاسان ڕۆیشت و تێپەڕی ڕۆژی هەشتەم نەبێت. لە ڕۆژی هەشتەمدا کە خودا خەیاڵ و کتێبی دروستکرد بەر دیوە ناکۆتا و جاویدانەکەی خۆی کەوت، ڕۆژی هەشتەم ڕۆژێکە هەرگیز تەواو نابێت، خودای گەورە بۆ ئەوەی زوو ڕۆژی هەشتەم تەواوبێت دەبایە ئادەم و فریشتەکانی خۆی بخاتە ئیشەوە، خودا لە ڕۆژی هەشتەمدا ئەمری بە ئادەم کرد و گووتی لە درەختی زانین بخۆ... تێدەگەن، خودا ڕۆژێک لەڕۆژان خواردنی بەری ئەو درەختەی حەرام نەکردوە، ساڵەهای ساڵە مرۆڤ چیرۆکەکە بە هەڵە دەگێڕێتەوە، ساڵەهای ساڵە مرۆڤ چیرۆکەکە پێچەوانە دەکاتەوە... درەختی زانین هیچ نییە جگە لە درەختی خەیاڵ... ئەو میوەیەی کە ئادەم لە بەهەشت دەیخوات، میوەی زانین نییە بەو مانایەی ئێمە ئەمڕۆ لە زانین تێدەگەین، درەختی ماتماتیک و فیزیا نییە، بەڵکو درەختی خەیاڵە... مرۆڤ دێتە سەر زەوی بۆ ئەوەی فێری خەیاڵ بێت و فێری نوسینی کتێب بێت. یەزدانی گەورە ئومێدی وەهابوو، چۆن مرۆڤ لە دوا شێوەی خۆیدا قاڵبی گرتووە و چۆن ئەستێرە و خۆر لە شوێنی خۆیاندا ڕاوەستاون و چۆن گیانلەبەران و باڵندە و درەختەکان شێوەی کامڵی خۆیان گرتووە، کتێبیش دواجار لە ڕستەبەندییەک و لە چێوەیەکدا بەندبێت و بگاتە کۆتایی، بەڵام یەزدان سەیریکرد لەگەڵ هەموو کتێبێکدا خەلیقەت دەگەڕێتەوە بۆ سەعاتی یەکەمی ڕۆژی هەشتەم. سەیریکرد ئەو باغە خەیاڵی و بوونەوەرە سەیرانەی مرۆڤ لە خەیاڵ و کتێب و خەوندا دروستیاندەکات ناگەنە کۆتایی. یەزدان هەستیکرد خەیاڵ تاکە شتێکە کە نهێنی ناکۆتابوونی خەلیقەتی تێدا پارێزراوە، لەو ڕۆژەوە خودا کۆمەک بە مرۆڤ و مرۆڤ کۆمەک بە خودا دەکات تا هەتاهەتایە لەڕێگای خەیاڵ و کتێبەوە خەلیقەت بەردەوامبێت، دەبێت بە قووڵترین و جوانترین و سیحراویترین شێوەش بەردەوامبێت. ئا لێرەدا شەیتان دێتە

ناو گەمەکەوە، شـەیتان هـەروا بـە خۆڕا سوژدە بـۆ ئادەم نابات، شـەیتان ئـەو بوونەوەرەیـە بـە پێچەوانـەی ئیـرادەی مـرۆڤ و ئیـرادەی ئیلاهییـەوە دەیەوێت ڕۆژی هەشتەم تەواوبێت، ئـەو دەزانێت قیامـەت ئـەو ڕۆژەیـە کـە مـرۆڤ چیدی ناتوانێت کتێبـی پـڕ خەیـاڵ بنوسێت، ئـەو دەیەوێت خەلـق بگاتـە کۆتایـی و بـڕوات و پشـوویدات و بخەوێـت. هەمـوو ئـەو شـەڕ و شـۆڕانەی شـەیتان دەیـکات، ئـەو تاعـوون و ئافاتانـەی ئـەو لەسـەر زەوی بڵاویاندەکاتـەوە، بـۆ ئـەوە نییـە سـەرپێچیبکات، بـۆ ئەوەیـە خەلیقـەت تـەواو بێت. ئـەوە شـەیتانە کـە کتێبـی بـەد دەنوسێت، ئـەو کتێبانـەی ئامـاژەن بـۆ مردنـی خەیـاڵ، ئـەوە شـەیتانە کـە کتێبـەکان دەسـووتێنێت، ناشـیرینیان دەکات، بێبەهایـان دەکات، دەیانخاتـە بەردەسـتی ئەوانـەی لـە مانـا ڕاسـتەقینەکانی تێناگـەن، خەیاڵیـان لێدادەماڵێـت و دەیانـکات بـە کۆیلـەی خـەون و خولیـای بچـوک، شـەیتان بوونەوەرێکـە جوانی و سـیحر لـە کتێبەکان دادەماڵێـت و بێنـرخ فڕێیاندەداتـە سـەر شۆسـتەکان، وەهـا تێکـەڵاوی ئـەم دونیـا کـۆن و دووبـارە و سـادەیەیان دەکات، ئەوانیـش سـادە و کـۆن و دووبـارە دەردەکـەون. وەک ئـەوەی بەشـێک بـن لـە قـاپ و قاچـاغ، بەشـێک بـن لـە کاڵا و میوەجـات، وەک ئـەوەی تفەنگێـک بـن لـە تفەنگەکانـی شـەڕ و تەورێـک بـن لـە تـەوری جەنـگاوەران. شـەیتان دێـت و یـاری دیکـە بـۆ کتێبـەکان دەدۆزێتـەوە، دەیانخاتـە نـاو پلانـی ترسـناکەوە، دەیەوێـت لـە بیرمـان بچێتـەوە ئـەم دونیایـە چ ترسـناکە، دەیەوێـت حەقیقەتمـان بیربچێتـەوە، کـە حەقیقەتمـان بیرچـووەوە کـە بەختـەوەر و ڕازیبوویـن لەسـەر زەوی ئیتـر بـۆ باغـی دیکـە ناگەڕێیـن، دوای جوانـی خەیـاڵ ناکەویـن... بـەڵام «مرۆڤـی تـەواو» هەمیشـە خەیاڵـی لای درێژکردنـەوەی خەلقـە، خەیاڵـی لای درێژکردنـەوەی ڕۆژی هەشـتەمە، هێنـدەی حەقیقەتـی بیرچووەوە شـەیتانەکان ئیفلیجیدەکـەن و ناهێڵـن بیـر لـە گوڵـە پەژمـوردەکان بکاتـەوە، هێنـدەی خەیاڵیشـی لـە یادکـرد لـە باغچـە دەیکەنـەدەرێ. شـەیتان دوژمنـی خەیـاڵ

نییە، بەڵكو مەخلوقێكە دەیەوێت خەیاڵ بكاتە كۆتایی، دەیەوێت دونیامان بە فریو و درۆ لە پێشچاو جوانبكات، تا بڵێین خودایە كە زەمین وەها جوانە خەیاڵمان بۆ چییە... شەیتان ئەو مەخلوقەیە كە كتێبی مردنی لەَ ئێمە دزی، یەكێكە گەمارۆمان دەدات تا پیسی دونیامان بیربچێتەوە، ئەو مەخلوقەیە كە دەیەوێت ئەم غەزەلانە ببات و لە مانایان دەركات و سیحریان پوچەڵبكاتەوە تا لەو غەزەلنوسە ڕاستەقینانە حەرامبێت كە سبەی لە دایكدەبن... ماجەلانی ڕاستەقینە، سوپاس بۆ ئاسمان و ئەستێرەكان كە تۆیان تا ئێرە هێنا ئەم باغە ببینیت، هەر كەسێك بیەوێت درێژە بە وجود و خەلق بدات دەگاتە ئەم باغە... تەنیا مرۆڤی تەواو دەگاتە ئێرە. هەر كەسێك بیەوێت ببێتە خاوەنی هێزی ئەم غەزەلانە دەتوانێت ببێت، هیچ غەزەلنوسێكی ڕاستەقینە غەزەل داگیرناكات، بەڵكو دەبێت غەزەل داگیربكات تا بگاتە ئێرە... دەبێت خەیاڵ داگیربكات و باغ داگیربكات... غەزەل پەیمانێكە مرۆڤ لە نێوان خۆی و باغەكانی ژیاندا مۆریدەكات».

بۆچوونەكانی غەزەلنوس بۆ من نوێبوون. بێئەوەی هیچ بڵێم تا كۆتایی بیرم لە قسەكانی دەكردەوە. ئێستا تێدەگەیشتم بۆ خەیاڵاتی ئەو هەمیشە لە باغێكدا تەواو دەبێت و خەیاڵاتی من هێشتا پڕە لە كونج و كەلێنی تاریك، بۆ خەیاڵی ئەو پڕە لە گوڵزار و خەیاڵی من پڕە لە هێزی نادیار و كەلێنی پڕ مەترسی و دەرگای داخراو. بۆ ئەو هەمیشە بە باغدا دەڕۆی و من بە جەنگەڵ و تاریكی و ترسدا سەفەردەكەم، بۆ من تەنیا منداڵی كوێر لەگەڵ خۆمدا دەگێڕم و ئەو هەموو دونیا. من كە سەیری چاویم دەكرد، كە گوێم لە دەنگی دەگرت، كە لە وشەكانی ڕادەمام، دەمزانی من هەرگیز ناتوانم خەیاڵی خۆم لەو هەموو تاریكی و جەنگەڵ و ڕێگا سەیر و نادیارانە پاكبكەمەوە. غەزەلنوس عاشقێكی پەتی بوو، عەشقی بە هەموو سەرئێشە و دەردەكانەوە قەبوڵبوو، من عاشق

نەبووم و نەمدەتوانی بەیتێک غەزەلیش بنوسم. خەیاڵی ئەو گەلەک ڕۆشن و سادە هاتە بەرچاوم، لە کاتێکدا خەیاڵ لای من سەخت و ئاڵۆز و ماتماتیکی و نەخشەدار بوو. ماوەیەکی درێژ هەمووان بێدەنگ ڕۆیشتین، دواتر گفتوگۆیەکی درێژ لە نێوان ماجەلانی ڕاستەقینە و غەزەلنوسدا دەربارەی گرنگی جەستە لە گەیشتن بە جەوهەری خەلقدا ڕوویدا. من بە ئەندازەیەک لە خەیاڵ و بیرەکانی خۆمدا نوقمبووم ئاگام لە هیچ نەبوو. شەو درەنگ کە گەیشتینەوە لای غەزەلنوس، ئەو خاتوونەی دایەنی منداڵە خەیاڵییەکان بوو، هەموو بەچەکانی خەواندبوو، پێکەوە هەر چوارمان بە ژوورەکانیاندا گەڕاین و سەیرمانکردن... منداڵەکان وەها جوان و پاک و فریشتە ڕووبوون، یەکەیەکە ماچمانکردن و هەموو دڵنیابووین خەیاڵ تەنیا ڕێگای ڕاستەقینەی بەردەوامبوونی خەلیقەتە. ئەو شەوە بۆ یەکەمجار هەستمکرد بۆنی منداڵەکان و بۆنی گوڵەکان وەکو یەکە، جوانی غەزەلەکان و جوانی ئەم فریشتە پاک و خەوتووانە وەکو یەکە.

بەرلەوەی ماڵاواییبکەین و بڕۆین، لە نێوانماندا بوو بە جەنگ و جەدەل: کێ بچێت بۆ نوێمیران و لاشەی باران شوکور بهێنێت و بەرەو قووڵایی باغەکانی خەیاڵی بەرێت؟. حەسەنی پیزۆ بەوەدا وایدەبینی کە ڕۆحی نەوجەوانی چینی جۆتە جەستەی، خۆی بە خاوەنی ئەو مافە و خۆشی بە پەیداکەری کلیلی باغەکانی مورتەزا دەزانی. ماجەلانی ڕاستەقینە خاڵی باران بوو، ئەو خۆی بە تاکە کەسێک حیسابدەکرد کە لەوسەری زەمینەوە بەدوای باراندا هاتۆتەوە و دەبێت ئەو بڕوات و لاشەی خوشکەزا غەمگینەکەی دەربهێنێت. غەزەلنوس خۆی بە عاشقی باران دەزانی و گووتی «لە سەرەتاوە من هەموو ئەم گێژەنەم دروستکردوە، غەیری من هیچ کەسێکی دی خۆی ناخاتە مەترسییەوە». منیش گووتم

«مـن تاکـە کەسـێکم ئاسـان دەتوانـم هاتوچـۆی نوێمیـران بکـەم و جگـە لـە مـن هیـچ کـەس ناتوانێـت وەهـا کارێکبـکات، لەبەرئـەوە مـن خـۆم بـەو ئیشـە هەڵدەسـتم و هیـچ ئادەمیزادێکـی دی نایـکات». مـن سـووربووم لەسـەر ئـەوەی تەنیـا کەسـم دەتوانێـت ئـەو کارەبـکات، بردنـی هـەر یەکێکـی دی لـەوان ئاسـان نەبـوو، مەترسـی ئاشکرابوونیشـی دەیانجـار گەورەتـر دەکـرد. مـن لـەو ماوەیـەدا شـارەزای نوێمیـران بووبـووم، بـۆ دەرهێنانـی لاشـەکەش نەخشـەیەک لـە خەیاڵمـدا بـوو، تەنیـا پێویسـتیم بـە دەرسـیم تاهیـر هەبوو لە هەڵکۆڵینـی گۆڕەکـەدا کۆمەکمبـکات. دوای شـەوێکی پـڕ دەنگەدەنـگ و هـەرا و زویربـوون، مـن گووتـم «برایـان، ئەمـەی ئێمـە دەیکەیـن زۆر ترسـناکە... تێدەگـەن... ئێـوە وەک مـن جیهانـی بارۆنـەکان ناناسـن، مـن ئـەم مـاوە کورتـە فێریکـردوم ئـەم ئیشـەی ئێمـە کارێکـی پـڕ مەترسییە، دەبێـت گـوێ لـە دەنگـی عەقـڵ بگـرن و دوای عاتیفـە نەکـەون، مـن دەزانـم حەسـەنی پیـرۆ نەبایـە کـەس نەیدەتوانـی بگاتـە سـەر لاشـەکەی بـاران شـوکور، ئـەو نەبایـە کـەس کلیلـی ئـەو باغـەی بـۆ پەیـدا نەدەکـرا و نەدەگەیشـتە شـوێنی ئـەو گـۆڕە. دەزانـم غەزەلنـوس خـۆی بـە خاوەنـی ئـەو هەقـە دەزانێـت کـە تـا کۆتایـی خـۆی بـەو کارە هەسـتێت، چونکـە پەیوەسـتێکی وەهـا نهێنـی بـەو دوو دڵـدارەوە هەیـە بـە ئێمـە تەفسـیرناکرێت، بەڕێـز زوهـدی شـازەمانیش لەوسـەری جیهانـەوە هاتۆتـەوە و دەیەوێـت مانایـەک بـە هەمـوو گەشـتەکەی و گەڕانـەوە غەمگیـن و تاڵەکـەی خـۆی ببەخشـێت، بـەڵام مـن تاکـە کەسـێکم دەتوانـم ئـەم کارەبکـەم... تاکـە کەسـێکم دەتوانـم ئـەو لاشـەیە لـە نوێمیـران دەربهێنـم. دوو شـەوی تـر زەماوەنـدی کچـی بارۆنـی گەنـم و جۆیـە بـۆ کـوڕی بارۆنـی دیجیتـاڵ... زەماوەندێکـی زۆر زۆر گەورەیـە هەرچـی میـر و ئاغـا و بارۆنـی ئـەم دەڤەرەیـە داوەتکـراون، لـە شـارەکانی دەوروبـەر و شـارەکانی تریشـەوە خەڵـک دێـت، دەڵێـن هەندێـک کەسایەتی نـاو هەیئەتـی حوکمیـش لـەوێ دەبـن. مـن داوەتکـراوم و دەتوانـم دوو کەسـی دیـش لەگـەڵ

خۆمدا ببەم. ئەو شەوە تاکە فرسەتێکە دەرسیم تاهیر بگۆڕم و بیبەم بۆ نوێمیران و ئەو مەستی و سەرخۆشییە بەکاربهێنم و بگەمە ئەو باغە. برایان ئەوە تاکە هەلی ئێمەیە، لەبەرئەوە بە دەنگەدەنگ و هەراوهوریای بەتاڵ مەیشێوێنن و لە دەستی مەدەن. من ئەو دوو ڕۆژە هەموو ئەگەرەکان و پلانەکان تاقیدەکەمەوە، ئێوارەی دوو سبەی بەر لەوەی من و دەرسیم بڕۆین بۆ نوێمیران لێرە کۆدەبینەوە، تا ئەو کاتە دەبێت ئێوە ماشێنێک پەیدابکەن چونکە دڵنیام بۆ گواستنەوەی لاشەکە پێویستیمان بە ماشێنێک دەبێت».

قسەکانم عاقڵانە دیاربوون. لەڕاستیدا ئەوەم بە دوا ڕێگا و دوا دەرفەت دەزانی بکرێت لەو وەرزەدا ئەو لاشەیە دەربهێنین. گەر ئەو ڕێکەوتە لە دەست بچووبایە نەمدەزانی چۆن دەتوانم بگەمە ئەو باغە و لاشەکە دەربهێنم. یەکەم شت دەبایە مسۆگەری بکەم مانگ بوو، گەر مانگەشەو بایە لەوانەبوو هیچم بۆ نەکرێت، بەڵام لە ڕێگای سەیرکردنی ئاسمان و تەقویمە عەرەبییەکانەوە تێگەیشتم کە ئەو شەوە مانگ لە کزترین تینی خۆی و تریفە لەلاوازترین شەوقی خۆیدا دەبێت، ئەوە هەواڵێکی دڵڕفێن بوو، مانگ لەوەها شەوێکدا بۆ خەیاڵم باش نەبوو. بۆ ڕۆژی دوایی بەپێی ئەو نەخشانەی مورتەزا دابوویە حەسەنی پیزۆ، باغی مورتەزام لە نوێمیران دۆزییەوە، دیوارێکی سپی بەرزی هەبوو، گەر کلیلەکەمان پێنەبووایە سەرکەوتن بەسەریدا ئەستەمبوو. من بێئەوەی بەندوباوی عاتیفە بمبات، پلانێکی ڕاستەقینەم داڕشت. باغی مورتەزا لە باکووری نوێمیران بوو، دوو دەرگای هەبوو، یەکێکیان دەکەوتە پشتەوە، لەو دەرگایەوە دەبایە دوو سەد مەتر بە پشتی کۆمەڵێک کۆشکی گەورەدا بڕۆیت تا دەگەیتە تەلبەندە دەرەکییەکانی ئەو گەڕەکە، دەبایە لە پشتەوە تەلبەندێک بپچڕێنیت و بەژێریدا بە خێرایی بەرەو دەرەوەی نوێمیران هەڵبێیت، ئیشەکە بە کەمێک شانس و وریایی دەشیا ڕێک و

سەلامەت بەڕێوەبڕوات و بەسەربچێت، بەڵام خاڵیش نەبوو لە مەترسی. نەمدەزانی گەر بەو لاشەیەوە بمگرن چیم بەسەر دێت، بەڵام هیچ شتێکم بۆ گرنگ نەبوو... هیچ شتێک.

ئەوە یەکەمجارم بوو لە ژیانمدا هەستبکەم، شتێکی ڕاستەقینە دەکەم، شتێک بۆنی ژیان و مەترسی لێدێت. شتێک هەستبکەم بەڕاستی نیشتەجێی ئەم سەر زەمینە ترسناکەم کە پڕە لەو مرۆڤانەی ڕۆژانە ڕوو بەڕووی مردن دەبنەوە. لە ڕاستیدا هەستێکی تراژیدی زۆر ترسناک بوو، من لەم شارە زیاتر لە هیچ جێگایەکی دیکە نەژیابووم، بەڵام خۆشم وەها نامۆ و نەناس هەست پێدەکرد، مەپرسن. گەر مرۆڤ لە نێو کۆمەڵێک شاردا بژی و لە هەندێکیاندا هەست بە نامۆیی بکات، ئاساییە. بەڵام هەموو ژیانت لە یەک شاردا ژیابیت و لەوێدا هەست بە نامۆیی بکەیت ئەوە بەڵایەکی گەورەیە. بەوەدا ئەم شارە شاری مەترسیبوو، دواجار هەر کەسێک بیەوێت لێرەدا نامۆ نەبێت دەبایە بەڕاستی لە مەترسیدا بژی... من دەمویست جارێک ڕوو بەڕوو سەیری مردن بکەم... ئەو ساڵانەی تێیدا کتێبی مەرگم دەنوسییەوە و سەیری ئەو فلیمە بیبیانیانەم دەکرد، پڕ بەدڵ خواستی ئەوەم هەبوو جارێک وەک ئەوانەی لە بەحری ئیجەدا خنکان، یان وەک ئەو کچانەی بۆ عەشق خۆیان سووتان، یاخود هیچ نەبێت وەک تۆم کروز یان بڕۆس ویلز یان ویل سمس یاخود تۆمی لی جۆنز ڕووبەڕووی هێزێکی ترسناک و گەورە ببمەوە. غەزەلنوس دوور و نزیک لەوە تێنەدەگەیشت من چەندە پێویستیم بە جۆرە کارێکی وەهایە. هەموو مرۆڤێک بۆ ئەوەی لە مانای ژیان تێبگات، پێویستی بەوەیە جارێک ڕاستەوڕاست ڕوو بەڕووی مەترسییەکی گەورە ببێتەوە... لەوە تێنەدەگەیشت.

# یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

لە ماوەی هەفتەیەکدا دووجاری دی لەگەڵ ئەو مەخلوقە خەیاڵیانەدا دانیشتم. هەر دووجارەکە بە دوو نائومێدی گەورەوە هاتمەدەرێ. جاری یەکەم تێگەیشتم کە جیاکردنەوەی خەیاڵ لە شیعر ئەستەمە و جاری دووەمیش تێگەیشتم، هەموو بوونەوەرێکی خەیاڵی لەهەر لق و کایەو بەشێکی ژیاندا ئیشبکات، دەبێت مەرجەعییەتێکی لای شاعیر هەبێت... گرنگ نییە مرۆڤ سیاسییە، ئەندازیارە، فیزیکناسە، دزە یاخود عاشق، گرنگ ئەوەیە بۆ ئەوەی شتێکی نوێ دروستبکات پێویستی بە سەردانی ماڵی شاعیر هەیە. ئەگەر دەنگی شاعیر لە ڕۆحی مرۆڤدا کپبوو، ئیدی ناتوانێت شتێکی نوێ بهێنێتە دونیاوە... بۆ یەکێکی وەک من کە خولیای هەرە گەورەم دەستەمۆکردنی شاعیرەکانە، کردنیانە بە فەرمانبەری گوێڕایەڵ، سەوزکردنیانە بەجۆرێک نامۆنەبن و بە نامۆیی و غەریبی خۆیان مەترسی لەسەر دونیا دروست نەکەن، ئەوە دەرەنجامێکی غەمگین و دڵشکێن بوو. هەرکات من بمزانیبایە شاعیران لە ئێمە بەهێزترن، تووشی جۆرە ئالۆشێکی ڕۆحی و زیهنی دەبووم، ئەو ڕۆژە توڕەبوونێکی بێجڵەو دایدەگرتم و دەبوومە مەخلوقێکی ترسناک و بێحیساب. مرۆڤ تا زۆر زۆر نائومێد و غەمگین نەبێت نابێتە بوونەوەرێکی ترسناک. ئەوەی لە شاعیراندا من دەترسێنێت، تەنیا هێزی گەورەیان بەسەر خاک و ئاوی خەیاڵدا نییە، بەڵکو ئەو بێباکی و کەمتەرخەمییەیە کە سەیری دوژمنی پێدەکەن. دەمزانی غەزەلنوس لە دوورەوە ئاگادارە، واخەریکە هێدی هێدی سوپاکەی دەکرم و جەنگاوەرەکانی دەبەم بۆ خۆم، بەڵام گەلەک بێباک سەیری هەموو شتێکی دەکرد. زۆر لە سۆراغی ئەوەدابووم تێبگەم

ئاخۆ غەزەلنوس کەس لە هاوڕێ و یاوەرانی خۆی پەشیماندەکاتەوە، کەس بانگدەکات و دەرهەق بە کارکردن لە شاری خەونەکاندا هۆشیاریان بداتێ، بەڵام هەرچی زانیارییەکم لە تەرخونچی و ئەوانی دییەوە بۆ دەهات، پێیان دەگووتم ئەو باکی بە جۆرە کارێکی وەها نییە. نا... غەزەلنوس لە جەنگاوەرێکی خەواڵوو دەچوو کە جگە لە خولیاکانی ناو سەری خۆی هیچی دی بۆ گرنگ نەبوو. گەلەک بێباک و کەمتەرخەم دەجەنگی، وەک ئەوەی دڵنیابێت، لە هەر جێگایەکی ئەو شارەدا مرۆڤ بیر لە خەیاڵبکاتەوە ناچارە ڕووبکاتە ماڵی ئەو. دەبایە دوا هەوڵی خۆم بدەم و هەموو هێزی خۆم بخەمە کار تا غەزەلنوس و غەزەلەکان بێنە ناو ئەو نەخشە گەورەیەی منەوە، کە لە ڕاستیدا نەخشەی تاک و تەنیای من نییە... من تەنیا خزمەتکارێکی ئەو نەخشەیەم و هیچی تر، وەک چۆن ئەو خزمەتکارێکی گەورەی ئەو غەزەلانەیە. ئەو شەوە کە چووم بۆ لای غەزەلنوس بە دڵی پاک و میهری یەکێکەوە چووم کە جگە لە خۆشکردنی ئەم ژیانە و بەهێزکردنی ئەم میللەتە و جوانکردنی ئەم شارە ئومێدێکی تری نییە. نەمدەویست چیتر چاوشارکێی لەگەڵدابکەم، بەڵکو دەمویست تێبگات بوونی ئەو چەند بۆ ئەم شارە گرنگە، تێبگات کە خەونەکان بەبێ شاعیر گەر بێنەدی دەبن بە مۆتەکەی سامناک. ئەو تەنیا کەسێک بوو دەیتوانی نەهێڵێت خولیاو خەیاڵەکانم ببن بە مۆتەکە و میردەزمەی سینەتاسێن. بەبێ هیچ نیازێکی بەد چووم، هەموو ڕۆحم گەشبینی و ئومێد بوو، کە گەیشتمە بەردەرگا جۆرە هەستێکی قووڵم بە ئازادی و جۆرە بڕوایەکی بێسنوورم بە خۆم هەبوو. لەدەرگامدا و پیرێژنێکی چکۆلانە کە خزمەتی منداڵەکانی دەکرد بەرەو ژووری ئیشکردنی غەزەلنوس پێشمکەوت. کە بینیم هەمان قووڵی و پەشۆکان و تەنیایی بێسنووری جارانم لە ڕوخساریدا بینییەوە. من لەو چەند ساڵەدا

پشکنینی دوور و درێژیشم لەسەر ڕوخساری شاعیران ئەنجامدابوو، تەنیا لە ڕوخساری غەزەلنوس وردنەدەبوومەوە، بەڵکو زۆرجار دەچووم بۆ چایخانەی شاعیران و لە کونجێکدا دادەنیشتم و بێدەنگ سەیری ڕوخساری ئەو قەسیدەنوسە گەنج و پیرانەم دەکرد کە پێکڕا لە کۆمەڵێک مەخلوقاتی وندەچوون کە بەدوای شتێکی نادیاردا بگەڕێن. لەو چەند ساڵەدا بەراوردی نیگاری سەدان شاعیری جیاواز جیاوازی دونیام کردبوو، لە ڕامبۆ و لۆتریامۆن و بۆدلێر و مالارمێ و بایرۆنەوە تا دەگاتە سەر هەموو شاعیرە گەورەکانی سەدەی بیست وەک ئالیوت و دیریک ویلکۆت و ئەکتاڤیۆ پاز. هەموویان پێدەچێت شتێکیان لە هەوادا لێ ونبووبێت، یان سەیری چۆلەکەیەکی فڕیوبکەن کە ئێمە نایبینین، بەراوردی نیگاکانی پۆشکین و دیلان تۆماسم کردبوو، بەراوردی نیگاکانی سوهرابی سپهری و بەدر شاکر سەیابم کردبوو، بەراوردی زەردەخەنەکەی گۆران و زەردەخەنەکەی نازم حیکمەتم کردبوو، هەموویان یەک شت بوون، هەموویان سەیری چۆلەکەیەکی فڕیویان دەکرد کە ئێمە نایبینین. کە چووم بۆ لای غەزەلنوسیش ڕاستەو ڕاست ئەو نیگایەم تیا بینییەوە، نیگای پیاوێک کە لە هەوادا سەیری باڵندەیەکی دوور دەکات کە ئێمە نایبینین. من بەسەرسامییەوە پرسیم «غەزەلنوس بۆ هەموو شاعیران لە هەوادا سەیری شتێکی نادیار دەکەن، وەک ئەوەی سەیری پاسارییەک یان کۆترێکی فڕیوبکەن؟ بۆ ڕاستەوخۆ چاو نابڕنە چاوی ژیان؟ بۆ». غەزەلنوس داوەتی سەر مێزێکی بچوکی کردم کە بە هەندێک گوڵی پاییزەی قەشەنگ ڕازابووەوە، بە زەردەخەنەیەکی غەمگین و پڕخولیاوە گوتی «لەبەرئەوەی ژیان ڕاستەوخۆ مانای خۆیمان پێنابەخشێت... نا عەزیزم، کاک جەواهیری دۆستم، شاعیران سەیری هیچ پاسارییەکی فڕیوناکەن، بەڵکو لە ونبوونی ڕۆحی خۆیان ڕادەمێنن... من ڕاموایە

هەرکەسێک بیەوێت سەیری ئەودیوی زەمان بکات، دەبێت خیانەت لە شوێنی خۆی و نیشتەجێی خۆی بکات. شاعیران هەمیشە سەیری مەنفاکانیان دەکەن، هەر وەخت لە نیگای وێڵی شاعیرێک رامایت، بزانە سەیری کۆتری فریو ناکات، بەڵکو نوقمە لە سەیری مەنفاکانی خۆی دا... ». هەستمکرد ئەو ڕستانە بۆ دەست پێکردنی وەها شەوێکی گرنگ کوشندەن. من لەسەر مێزەکە دانیشتم و بە عەشقێکی زۆرەوە بۆنی یەکێک لە گوڵە پاییزیەکانم کرد و ئیحساسم وابوو هەموو ماڵەکە بۆنێکی سیحراوی پاییزی لێدێت، هەستمکرد لە باغێکی پاییزانەی گەورەدا دانیشتووم و خەزان بە قەشەنگی لە چواردەورم گەڵاڕێزانێتی. ڕەنگێکی زەردی مات و کاڵ بەسەر هەموو شتەکانی ئەو ژوورەدا کشابوو. من لە بڕوا و ئیمانێکی قووڵەوە گووتم «شاعیران خۆیان مەنفای خۆیان دروستدەکەن. لە کاتێکدا شار پێویستی پێیانە، هەمووان لە شارەکانی خۆیاندا ئیشدەکەن، فەرمانبەران ئیشدەکەن، سیاسەتمەداران ئیشدەکەن، پزیشک و ئەندازیاران ئیشدەکەن، تەنیا شاعیرانن مەنفایەکی دەستکرد دروستدەکەن و دەچنە ناوی...تەنیا شاعیرانن». غەزەلنوس وەک ئەوەی چاوەڕوانی ئەم قسانەم لێبکات گووتی «وەزیفەی شاعیران ئەوەیە بڕۆن بۆ مەنفا و لەوێوە سەیری ژیان بکەن... ئەوە وەزیفەکەیانە». من بە هێمنی پێکەنیم و گووتم «غەزەلنوس من دەمەوێت بتهێنمەوە و لێرەوە سەیری ژیان بکەیت». بە غەمەوە گووتی «کاک جەواهیری برام، شتێک هەیە تۆ حیسابت بۆ نەکردوە، کە یەکجار چوویت بۆ مەنفا ئیدی تا هەتاهەتایە لە مەنفایت». من بەجیدییەتێکەوە سەیرمکرد و گووتم «ئەم شارە وەزیفەیەکی گەورەی بۆ تۆ هەیە، ئێمە پێویستیمان بە جوانی غەزەلەکانتە. من قسەیەکی مەردانەت لەگەڵ دەکەم، من ماندووبووم، غەزەلنوس، من لە مێژە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێم کە خەیاڵ لەم شارەدا سەوزبکەم،

وابکەم خەیال نەڕوات بۆ مەنفا، وابکەم ئەوانەی ڕۆحلەبەری پڕ خەیالن ئیشبکەن... بەشێکبن لە ژیان و دونیای ئێمە... من ڕاستیت پێدەڵێم، غەزەلنوس، من ناوم جەواهیر سەرفراز نییە، هەموو ئەم حیکایەتە درۆیە کە بۆم کردویت، من بارۆنی خەیالم... تێدەگەیت، منم کە ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانی تۆ دەکڕمەوە، من دەبێت لە ماوەیەکی کەمدا دەست بەدروستکردنی شاری خەونەکان بکەم، سەرۆک و ئەمریکییەکانیش منیان ڕاسپاردوە، بەلام ئەوە خەونی خۆشمە... تێدەگەیت، ئەوە خەونی خۆمە، گەر خەونی خۆم نەبایە بەلامەوە گرنگ نەبوو ئەو ئەمریکییە حیزانە دەڵێن چی... ئێستا گەر تۆ لەگەڵمدا نەیەیت، دەبێت دەست لە هەموو پرۆژەکە بکێشمەوە، دەبێت تەواوی نەخشەکانم بسوتێنم... دەبێت هەموو بودجەکە بگێڕمەوە بۆ خەزێنەی دەولەت. ئیشەکە بسپێرم بە کۆمەڵێک ئەندازیار کە واتێدەگەن شاری خەونەکان ئەوەیە خانووەکانی ئاودەستخانەی زۆر و ئاوی سارد و گەرمی تیابێت، دەبێت بیدەمە ئەو ئەندازیارانەی وا تێگەیشتوون شاری خەونەکان ئەو جێگایەیە کە مرۆڤ تیا زۆر دەخوات و زۆر گوو دەکات. غەزەلنوس گەر تۆ لەگەڵمدا نەیەیت، من دەبێت هەموو ئەو بودجە خەیاڵییە بخەمە بندەستی ئەو پیاوانەی کە دەستێک بە ناشیرینی ئەم شارەدا دەهێنن و بە بەهای نوێ پێمانی دەفرۆشن... غەزەلنوس، جوانییەک و هارمۆنیایەک لە نێوان ڕۆحی مرۆڤ و شوێنەکاندا هەیە، گەر تۆ یارمەتیم نەدەیت، بۆم ناکرێت... تێدەگەیت... من شارێک دروستدەکەم شاعیرەکانی نەچن بۆ مەنفا...». بۆ یەکەمجار زۆر بە جیدی سەیریکردم و گووتی «گرنگ نییە تۆ کێیت... گرنگ نییە؟ گرنگ نییە دەتەوێت ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان بکڕیت یان نا. مرۆڤەکان کەسیان مولکی من نین، هەندێکیان هاوڕێمن و هەندێکیان دۆستم، لەبەر دلم گران نییە ئیش بۆ تۆبکەن. بەلام بارۆنی بەڕێز هەر

شارێکی دونیا سەرەتا کە دروستدەکرێت بە نیازی شارێکی خەیاڵی دروستدەکرێت... مرۆڤ لەم سەر زەمینە هەر شارێکی ئاوەدانکردۆتەوە بە نیازی دروستکردنی شارێکی خەیاڵی ئاوەدانیکردۆتەوە. هیچ شارێک نییە دواتریش لە مێژووی خۆیدا خەڵکانێک نەهاتبن بیانەوێت بیگۆڕن بۆ شاری خەیاڵی... هەموو میللەتێک کە تروسکەیەکی هیوای بۆ دەردەکەوێت، خەڵکانێک دێن و دەیانەوێت ئەو تروسکەیە بگۆڕن بۆ جۆرە ئاوەدانییەکی گەورە. گوێبگرە جەنابی بارۆن ئەو شارەی تۆ دروستیدەکەیت، پەیوەندی بە خەیاڵەوە نییە، ئەو شارەی تۆ یان ترس لە مردن یاخود هەستی سەرکەوتن دروستیکردوە، تۆ و بارۆنەکانی تر دەتانەوێت هەستبکەن کە سەرکەوتوون، لەکاتێکدا خەیال، خەیاڵی قووڵ بریتییە لە تێڕامان لە ئازار. جەنابی بارۆن... خەیاڵ هەمیشە دەیەوێت لە ئازارە گەورەکانی مرۆڤەوە نزیک بێت. تۆ دەتەوێت خەیاڵێکی ئاهەنگگێڕ و جوانیساز بدۆزیتەوە تا شوێنێک دروستبکەیت لە گەڕەکەکانی تری ئەم شارە نەچێت... گرنگترین شت لای تۆ و بارۆنەکان ئەوەیە کە گەڕەکێک دروستبکەن لەگەڕەکانی تر نەچێت... وانییە جەنابی بارۆن؟ وانییە؟. بەڵام من نامەوێت گەڕەکی وەها دروستبکەم، دەمەوێت بزانم مرۆڤی ئەم شارە بۆ وا غەمگینن، دەمەوێت بزانم دەرگای باغەکانی ڕۆحیان لە کوێوەیە، بزانم کە مرۆڤە جوانەکان دەمرن شارە خەیاڵییەکانیان بەرەو کوێ نوقمدەبێت؟ کە دەسووتێن چ جۆرە گوڵێک لەگەڵیاندا بۆ هەتاهەتایە دەسوتێت و چ باغێک لە خۆڵەمێشەکەیاندایە؟. جەنابی بارۆن ئەو شارەی تۆ دروستیدەکەیت، لەبری ئەو خەیاڵانەیە کە بارۆنەکانی دیکە دەیکوژن، لەبری ئەو خەوانەیە کە ڕۆژانە لە دڵماندا نغرۆدەبێت، ئەو باغانەی تۆ دەتەوێت سەوزیانبکەیت لەبری ئەو باغانەیە کە هەموو شەوێک لەم شارەدا دەژاکێن و پەشموردە دەکەون، ئەو عاشقانەی کە تۆ

دەتەوێت لەسەر شەقامەکانی ئەو شارە خەیاڵییەی تۆ بسوڕێنەوە، لەبری ئەو عاشقانەن کە دەبێت لەم شارەدا بسووتێن و بمرن و غەم و ڕیسوایی بیانکوژێت، ئەو غەزەلانەی تۆ دەتەوێت لەو شارە خەیاڵییەدا جوانی و خەیاڵ سەوزبکەن، لەبری ئەو غەزەلانەیە کە دەبێت لێرە و لەناو ڕۆحە بریندارەکاندا بیخوێنینەوە. بارۆن تۆ ڕۆحلەبەرێکی سەیریت؟ من تێتناگەم؟ بارۆن، خەیاڵ هیچ نییە جگە لە حەقیقەتێکی کوژراو، ئەوەی خەیاڵ دروستدەکات ئەوانەن کە حەقیقەت دەکوژن. ژیان خۆی گەورەترین و جوانترین خەیاڵە... ژیان خۆی ڕێکبخەرەوە دەبێتە شارێکی خەیاڵی». غەزەلنوس بەو دێڕانەی ڕۆحی بەدی هەموو شاعیرانی دونیای دەخستە بەردەستی من. ئەو ڕۆحەی هەموو هەڵە گەورەکانی ئادەمیزاد لە ئادەم و حەواوە دەخەنە ملی سیاسییەکانی سەردەمی خۆیان، هەموو تاوانەکانی بەشەرییەت لە هابیل و قابیلەوە دەکەنە گەردنی پیاوە دەسەڵاتدارەکانی نزیک خۆیان. بەڵام من نەمدەویست وا زوو توڕەیبکەم و زویرییبکەم، گووتم «غەزەلنوس، وادانێ من ئەوەی هەموو ئەوانەم کە زەمینیان تێکداوە، وادانێ من یەکێکم لە وەچەکانی شەیتان. بەڵام سەیرمکە ئێستا دەمەوێت ژیان ڕێکبخەمەوە، ئەو شتە ناشیرینانەی ڕوویانداوە لە بیریان بەرمەوە و سەر لە نوێ دەست پێبکەمەوە. من بۆ ئەوەی سەر لە نوێ دەست پێبکەمەوە، پێویستیم بە تۆیە... بەبێ تۆ هیچ ناکرێت...». قسەکەی پێبڕیم و گووتی «هەموو ئەم شارە بووە بە خەرابستانێکی گەورە، بارۆن گەورەترین موسیبەتی تۆ ئەوەیە دەتەوێت لەم شارە بڕۆیتەدەرێ و کۆمەڵێک نهۆمی نوێ و بینای گەورەی جوان و شەقامی پان دروستبکەیت و ناوی بنێیت شاری خەیاڵ، شاری خەیاڵ ئەوە نییە لێرە ڕابکەیت، بەڵکو ئەوەیە حەقیقەتە خەوتووەکانی ئەم شوێنە خەبەربکەیتەوە، جوانییە خەوتووەکانی ئەم

شوێنە لە خەو هەستێنیت. بارۆن سەیرمکە... خەیال سەیرانگایەک نییە لە تەنیشت شارەوە دروستیبکەین. بەڵکو هەر ژیانی خۆمانە کە تێدەکەین چی لە ناودا کوژراوە. هەر کەسێک نەتوانێت تەحەمولی راستی بکات، ناتوانێت تەحەمولی خەیالیش بکات. ئەم شارە خەیاڵییەی تۆ لای من نرخێکی نییە، ئەو کۆشک و ئەندازیارانەی تۆ هیچ شتێک بە ڕۆحی من نابەخشن... تۆ و سەرۆکەکان و بارۆنەکانت بۆیە وەها شارێک دروستدەکەن، چونکە ناتوانن سەیری ئەم شارە ڕاستەقینەیە بکەن... منیش بۆیە دەتوانم بگەمە باغەکانی خەیاڵ چونکە دەوێرم سەیری ئەم هەموو غەمە بکەم. ئێوە ناتوانن سەیری کوچەی ناشیرین و مرۆڤە بیمارەکانی ناو ئەو کوچەیە بکەن... ناتوانن سەیری باغی پەژمووردە و گوڵە مردووەکانی بکەن. جەنابی بارۆن، من پێویستیم بەو شارە خەیاڵییەی تۆ نییە، من شاری خەیاڵی خۆمم هەیە... من باغی خەیاڵی خۆمم هەیە... من سی ساڵە لەم شارەدا دێم و دەچم، هەموو گۆشە خەیاڵییەکانی دەناسم و هەموو مەخلوقە خەیاڵییەکانی دەناسم... ئەمە شاری خەیاڵی منە. جەنابی بارۆن بۆ ئەوەی لە خەیاڵی خەڵکی ئەم شارە تێبگەیت، بۆ ئەوەی بگەیتە بنی بێقەراری ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان، دەبێت بزانیت چ شتێک لە ڕۆحیاندا کوژراوە، بزانیت کێ کوشتوویەتی. گەر دەتەوێت بگەیتە ئەو شارە خەیاڵییە دەبێت بتوانیت ئەو شارە ڕاستەقینەیە ببینیت کە لە بەردەمتدایە... لە ناو ڕۆحی هەموو مرۆڤێکی مەحرومی ئەم کوچە وێرانانەدا باغێکی گەورە هەیە، ئەم باغە کاتێک دەکرێتەوە کە تێیبگەیت. بەبێ بینینی حەقیقەت ناتوانیت خەیاڵی هیچ ئادەمیزادێک ببینیت... بەڵام جەنابی بارۆن تۆ ناوێریت ئەوەبکەیت... تۆ بەو ڕاکردنەی خۆت دەڵێیت خەیاڵ، تۆ بە ترسی خۆت لە حەقیقەت دەڵێیت خەیاڵ... هەر تۆ وانیت، بەشی هەرە زۆری ڕۆحلەبەرە پاک و خەیاڵییەکانیش وان...

دەزانی جەنابی بارۆن بۆ مرۆڤی ئەم شارە بە لێشاو ڕادەکەن؟ لەبەرئەوەی ناتوانن تەحەمولی جوانی ناو خۆیان بکەن و ناوی دەنێن خەیال... دەزانیت بۆ کچانی ئەم شارە ئاوەها بە کۆمەڵ خۆیان دەسوتێنن، چونکە تەحەمولی ئەو باغە جوانانەی ناو ڕۆحی خۆیان ناکەن و ناوی دەنێن خەیال... مرۆڤ بە جوانی کوژراوی ناو خۆی دەڵێت خەیال». قسەکانی بۆ من کوشندەبوون، وەک کۆمەڵێک خەنجەر وەهابوون لە ڕۆحمدا بیچەقێنێت، دڵڕەق و تاریک هاتە بەرچاوم. بە دوو نیگای ئاگرین سەیرمکرد و گووتم «کەواتە جەنابی غەزەلنوس، بۆیە دەتویست حیکایەتەکانی مردن کۆبکەیتەوە. خەیاڵی تۆ تەنیا کاتێک ئیشدەکات کە لووت بژەنیتە ناو چارەنوسی ئادەمیزادەکانی ترەوە؟ ها تەنیا ئەو کاتە ئیشدەکات، کە ئەم شارە وەک خەرابستان و گۆڕستانێکی گەورە نیشانبدەیت؟ خەیاڵت تەنیا کاتێک ئیشدەکات کە هەموو حیکایەتەکانی مردنت لە بەر دەستدا بێت، خەیال لای تۆ ئەوەیە لە تەماشاکردنی کارەساتدا کارامەبیت، ها وایە؟ خەیال لای تۆ ئەوەیە تێبگەیت چی باغێک کوژراوە، چی گوڵێک کوژراوە، چی شتێک ژاکاوە؟ ها... ئەو کاتە ئیدی بەباشی دەتوانیت خەیال دروستبکەیت».

لەوە زیرەکتربوو تێمنەگات، سەیریکردم و گووتی «جەنابی بارۆن، دەزانم تۆ کتێبە گەورەکەی ئێمەت برد... دەزانم... ئەو کتێبە سوودی بۆ تۆ نییە، ئێمە ماندووبووین لەگەڵیدا... ئەوانەی کە دوای ئێمە دێن دەبێت تێبگەن خەڵکی ئەم شارە چۆن ژیاون و چۆن مردوون... دەبێت ئەوە بزانن... ئەو کتێبەم بدەرەوە... دەزانم تۆ بردوتە».

کە وایگووت ئیتر هەستمکرد لەگەڵ غەزەلنوسدا گەیشتوومەتە کۆتایی، تا هەتاهەتایە ڕقی لێمدەبێت و تا هەتاهەتایە ڕقم لێیدەبێت. بە پێکەنینەوە گووتم «ئادەمیزادان لە هەموو شوێنێک و وڵاتێکی سەر زەمین دەمرن و دەکوژرێن و دەخنکێن و دەسووتێن... ج عەجەب

تۆ دەتەوێت بڵێیت لەگەڵ هەموو مردوویەكدا زەوییەك نوقمدەبێت و باغێك لە بەیندەچێت، لەبری ئەوەی خەیاڵ ئەو هێزەبێت كە ئەم دونیایەی پێ جوانبكەیت، خەیاڵ لای تۆ وەك پیاسەیەكی دووروودرێژ وەهایە بە سەرقەبرانێكدا...».

بە نیگەرانییەوە سەیریكردم و گووتی « خەیاڵ گرێدراوی خۆشەویستی و ڕێزە بۆ خەلیقەت... عاشقێكی گەورە لە ناو مرۆڤدایە، خەیاڵ لەسەر ئەو عاشقە گەورەی ناو ڕۆحی ئینسان ئیشدەكات، لەسەر ئەو هونەرمەندە شێتەی ناو دڵمان، لەسەر ئەو موسافیرە نەسرەوتەی كە هەرگیز ناگاتە ماڵ. من تەنیا دەتوانم هەوڵبدەم غەزەلەكانی ناو ڕۆحی مرۆڤ بپارێزم... چەند ساڵە دەگەڕێم و دێم و دەچم وغەزەلدەنوسم، تاكە هیوام ئەوەیە نەهێڵم غەزەل لە دڵماندا بمرێت... لە خەڵوەتی هەموو مرۆڤە پڕ عەزابەكانی ئەم شارەدا ئامادەبووم، تەنیا ئیشم ئەوەبووە غەزەلنوسێك لە ڕۆحی هەموو یەكێكماندایە نەهێڵم بمرێت... ئیشی من ئەوە نییە لە بەهەشتدا دانیشم، ئیشی من ئەوەیە نەهێڵم لە جەهەنەمدا خۆشەویستی بمرێت... لەبەرئەوە بارۆن من ناتوانم ئەو یارییەی تۆ بكەم... ناتوانم».

من شێتبووم و هەڵچووم، بە تووڕەییەوە گووتم «خەیاڵ لای تۆ ئەوەیە مرۆڤ دەستەمۆنەبێت... لەگەڵ دونیادا ناتەبابێت، وابزانێت ئاگرێكی ترسناك لە ماڵی بەربووە و دەبێت ڕابكات... تۆفانێكی ترسناك هەڵیكردوە و دەبێت هەڵبێت؟ ئەوەیە خەیاڵ لای تۆ».

هیچی نەگووت... ئیستێكی درێژی كرد و هەناسەیەكی غەمگینی هەڵكێشاو بێئەوەی سەیرمبكات گووتی «خەیاڵ شتێكە و درۆ شتێكی ترە... هەزاران ساڵە مرۆڤ خەیاڵ و درۆ تێكەڵدەكات».

ئەوە دوا قسەی بوو، وەك ئەوە بوو بەو قسانە دەرمبكات. من ڕوومەتەكانم سوور هەڵگەڕابوون و تووڕەبووم... تێگەیشتم تاكە شتێك

لە نێوان من و غەزەلنوسدا مابێت مەرگە. گووتم «گەر خەڵک مردن لە بیرنەکات، ناتوانێت بەختەوەربێت، گەر خەیاڵ یارمەتی مرۆڤەکان نەدات شتیان بیربچێتەوە ناتوانن بە شادی بژین... بۆ ناتەوێت خەڵک مردنیان بیربچێتەوە؟ بۆ ژیانی خۆت بۆ نوسینەوەی مردن تەرخانکردوە؟».

هەستایە سەرپێ و بێئەوەی سەیرمبکات گووتی «بارۆن ئەم شارە لە دەریاچەیەک دەچێت پڕبێت لە دڕەماسی و دزی دەریا، تەنیا کەشتییەک بتوانێت بەم دەریاچەیەدا بڕوات، جۆرە کەشتییەکە مرۆڤ بە غەزەل و خەیاڵ دروستیکردبێت. بەڵام هێندەی کەشتییەکی وا ڕوودەکاتە ناو ئەو دەریاچەیە هەموو چەتەکانی سەرئاو و جانەوەرە زەبەلاحەکانی بنئاو خۆیانی پیادەدەن بۆ ئەوەی نووقمیبکەن، هەر هێندەی فریوتخوارد و لە کەشتییەکە دابەزیت ئیتر جارێکی تر ناتوانیت سەرکەویتەوە. بارۆن ڕەنگە تۆ پیاوێکی نیازپاک بیت، بەڵام دوای خەونێکی نەکردە کەوتوویت، ڕۆژێک لە ڕۆژان شاعیر و پادشا ناتوانن پێکەوە هەمان یاریبکەن... غەزەلنوسەکان و بارۆنەکان ناتوانن یەک خەون ببینن، ناتوانن یەک خولیا و یەک خەیاڵیان هەبێت... تۆ هەموو هێزی خۆت لەگەڵ بوونەوەرێکی لاوازی وەک مندا تاقیدەکەیتەوە... بارۆن من شتێکم نییە تۆ بتوانیت دەستەمۆییبکەیت، من نامۆم لەم شارەی تۆدا، من غەمگینم، ناتوانم هیچت بۆبکەم...».

دەمتوانی لەو کاتەدا بیکوژم، دەسکەوانێکی کۆن لە یەکێک لە تاقەکاندا دانرابوو، دەمتوانی بە هەموو هێزی خۆم بیدەم بە کەللەیدا و بیکوژم، بەڵام دانم بە خۆمدا گرت و گووتم «تۆ بڕیارتداوە تا کۆتایی مرۆڤێکی بێڕەگ و ڕیشەبیت... شانازی بەم نامۆبوونەی خۆتەوە بکەیت». وەک ئەوەی تەواو گەیشتبێتە تینی و دوا قسەی خۆی بکات گووتی «ئەو شارەی تۆ دروستیدەکەیت، دەبێت بەحەوزێکی تری پڕ

چەتە و درەماسی، ڕۆحلەبەرە خەیاڵییە ڕاستەقینەكان لە دەروەی ئەو شارە و لە قەراغەكانیدا لە حەسرەتدا دەمرن، ئەوێ دەبێت بەشارێك ئەوانە تیادەژین كە خەیاڵ و خەونیان نییە... مرۆڤی تەواو نایەتە ئەو شارەوە، مرۆڤی تەواو خیانەت لە حەقیقەت ناكات».

تێگەیشتم من لەبەردەم ڕۆحێكی بێچارەدام. ئەو شەوە بە غەمگینی لە ماڵی ئەو هاتمەدەرێ و ڕووم لە ماڵی جەعفەری مەغۆلی كرد... كە لە زەنگی ماڵی مەغۆلیم دا كاتژمێر یەكی شەو بوو.

## ئاهەنگ و لاشە
## شەوی یازدەی تشرینی یەكەمی ٢٠٠٤

شەوی یازدەی دەی ساڵی دووهەزاروچوار ماجیدی گوڵ سۆلاف و دەرسیم تاهیر چوون بۆ نوێمیران. ئەوە شەوی تاكبوونەوەی ژمارەكان و ڕۆحەكان بوو. ئاهەنگێكی گەورەبوو، دەنگی مۆسیقا و هەناسە پێكەوە ئەو ساڵۆنە گەورەیەیان هێنابووە جۆش. دەرسیم تاهیر لە هەمو شتێك دەترسا، پێشتر نە مۆسیقای وا بەرز و نە جۆرە خەڵكی وەهای بینیبوو. بۆ ئەوەی زۆر نەكەوێتە بەرچاوان، ماجید بەهێمنی لە نێوان كورسییەكان و جەنجاڵی بێوێنەی منداڵان و تێكەڵاوبوونی چەندین خێزاندا ونیكرد. ئەم شەو ئاهەنگەكە وەها گەورەبوو، ساڵۆنەكە بە جۆرێك پڕبوو، ئاسان كەس كەسی نەدەدۆزییەوە. لێدە ئەی مۆسیقا... لێدە ئەی دڵ... سەمابكە ئەی جەستە... هەڵپەڕن ئەی قاچە غەمگینەكان و هەڵتەكێ ئەی سینەی پڕ لە حەسرەت. ماجید كە وەك جۆنی دێپ لە فلیمی بلۆدا قژی بە جۆرێكی ئێجگار قەشەنگ بۆ سەرەوە داهێنابوو، هەستی بە نامۆییەك كرد وەختەبوو تەواوی پلانەكە تێكبدات و لە سەرەتاوە ڕێ

بشـێوێنێت. حەزیدەکـرد لـەو ساتـەدا بـڕوات بـۆ لای منداڵـە کوێـرەکان و سـوار کەشـتییەکەی بێـت... بکرێـرەوە ئـەی ئـاو... بکرێـرەوە ئـەی زوڵمەتـی بێبنـی خەیـاڵ... بکرێـرەوە ئـەی نەخشـە سـەخت و داخراوەکانـی نـاو ڕۆح... لەگـەڵ ئـەو منداڵانـەدا بـڕوات و هەرگیـز نەگەڕێتـەوە. سـەرتاپای هۆڵەکـەی وەک بازاڕێکـی ساردی جەسـتە و عاتیفـە و خەیـاڵ هاتـە بەرچـاو. سـەیری لێهات لـە پێنـاوی لاشـەی ژنێکدا کـە نەیبینیـوە و نازانێـت کێیـە خـۆی لـە شـوێنێکی وەهـادا دەبینێتـەوە. ئێسـتا هەمـوو مانـای ژیانـی خـۆی لـەوەدا دەبینـی شـتێک بـۆ مـردووەکان بـکات، کـە سـەیری ئـەو هـەوا و بەزەمـەی دەکـرد، کـە بۆنـی ئـەو هەمـوو عەتـرەی دەکـرد، کـە ئـەو هەمـوو ژن و کچـەی دەبینـی بـە نیـگای ناپاکـەوە سـەیری بـاڵا و قـژ و چـاوی دەکـەن، دڵنیابـوو ئـەو تەنیـا لەگـەڵ مردووەکانـدا دەتوانێـت پەیوەندییەکـی قـووڵ ببەسـتێت. هـەر لـەو ساتـەوە کـە چـووە نـاو هۆڵەکـە هەسـتیکرد بوونـی بۆتـە مایـەی شـتێکی نائاسایی، هەسـتیکرد شـەپۆلێکی گـەورەی چرپـە چرپـی لـە نێـوان ژنانـی نوێمیرانـدا دروسـتکردوە، گوێـی لێبـوو دەیانگـووت خۆیەتـی... خۆیەتـی. چەندیـن جـار نـاوی نەوجەوانـی چینـی لـە گوێیـدا زرینگایـەوە. هەندێکیـان وەک بترسـن خۆیـان لـێ لادەدا و هەندێکی دیکەشـیان دەیانویسـت بـە حەسرەتەوە پەلامـاری بـدەن. چـی وایدەکرد واتێبگـەن ئـەو نەوجەوانـی چینییـە، چـی؟. لـەو شـەوەوەی لاشـەکەی بینیبـوو هەسـتیدەکرد لاشـەی ئـەو کـوژراوە لاشـەی خۆیەتـی، ئێسـتا ئـەم نیـگا و چرپەچرپـە سـەیرانە کـە لەسـەریدا دەنـگ دەدەدەنـەوە، ئـەو تەماشـاکردنە ترسـاوانەی وەک ئـەوەی هەمـووان تارماییەکیـان بینیبێـت، وەک ئـەوەی جوانـی لـە نـاکاوی ئـەو هەمـوو هۆڵەکـەی تێکدابێـت... بـە تەنیـا لەسـەر مێزێـک دانیشـت، هەسـتیکرد ژنانـی نوێمیـران یـەک یـەک بەبەردەمیـدا دەڕۆن و سـەیریدەکەن، یـەک یـەک دەیانەوێـت دڵنیابـن ئـەوەی دەیبینـن نەوجەوانـی چینییـە یاخـود نـا. گوێـی لێبـوو دەڵێـن «نەکـوژراوە... درۆیـە نەکـوژراوە». ماجیـدی گـوڵ سـۆلاف

سەرسام لە خۆی پرسی «تۆ چ یارییەکم لەگەڵدا دەکەیت... ئەی تارمایی؟ چ یارییەک». یەکەمجاربوو هەستیدەکرد ئەو مردووە بەڕاستی لێوەی نزیکە و لەگەڵیایەتی. هەموو بەبەردەمیدا دەڕۆیشتن و سەیریاندەکرد و دەیانچپاند. چرپەچرپەکان بە شێوەیەکی سەیر لەسەریدا دەنگیاندەدایەوە، وەک بێهۆشیێکی لێهاتبوو، هەستیکرد لە هەموو ئەو دونیایە دابڕاوە، هەستیکرد دەنگی مۆسیقا و دەنگی منداڵان و فسکەفسکی ژنان و کەمتەرخەمی پیاوان هەمووی خەونە، هەستیکرد لە جێگایەکی باریکدا لە نێوان ژیان و مەرگدا گیری خواردوە و ناتوانێت بگەڕێتەوە دواوە. دووجار چووە تەوالێتەکان و لەبەر ئاوێنەکانیدا وەستا و گوتی «من نەوجەوانی چینی نیم... من ئەو نیم... من ماجیدی گوڵ سۆلاڤم». بەڵام هەستیکرد هەموو ژیانی حەزیکردوە یەکێکی دیکەبێت، ویستوێتی کەسێکی دیکە بێت. دەیزانی هەر جارێک سوار ئەو کەشتییە دەبێت، ڕۆژێکی ڕاستەقینەی ژیانی بە هەدەر دەڕوات. ئەو کەشتییە هیچ نییە جگە لە کەشتی دوورکەوتنەوەی بەردەوامی لە خۆی. دەکرا ئەویش وەک نەوجەوانی چینی بژی... دەکرا. ئەویش بە هەمان ئەندازەی ئەو جوان و سەرەنجڕاکێش و پڕ سیحرە. ئێستا کە لە ئاوێنەکەدا سەیری خۆی دەکرد دڵنیابوو نەوجەوانی چینی نیوە کوژراوەکەی خۆیەتی، وەک چۆن نیوە کوژراوەکەی غەزەلنوسیشە، وەک چۆن نیوە کوژراوەکەی هەموو مەخلوقاتە خەیاڵییەکانە، بەڵام چیدی کاتی گەڕانەوە نەمابوو، دەبایە تامردن وەک ماجەلانی خەیاڵی بژی... وەک ناخودایەک کە تەنیا بە خەیاڵ سوار کەشتی دەبێت و زەوییە خەیاڵی و ڕووبارە خەیاڵییەکان تەیدەکات. کە گەڕایەوە بۆ ئاهەنگەکە، دێڕێکی غەزەلنوسی هاتەوە یاد کە دەیگووت «دڵ لە ئەودا کە غەریبە پەرۆشی تۆیەتی — وادەزانێت میهربازان سەراپا مەعشوقەی خۆیەتی». ئەم ژنە کوژراوە لە ناکاو بووبوو بە مەعشوقەی خۆی. بە ناو ئاهەنگگێڕاندا تێپەڕی و دڵنیابوو

گەر بەو ڕۆحەوە نەبێت، ناگاتە سەر گۆڕی ئەو خانمەی لە بنی جەهەنەمێکی گەورەدا نێژرابوو. دابەزینی خۆی بۆ ئەم شارە وەک دابەزینی پاڵەوانی ئەفسانە یۆنانییەکان بۆ سەر زەمینی هادەس، بۆ دونیای ژێرەوە هاتەبەرچاو... کە بەناو بۆنی عەتری ژنان و نیگا سەیر و برسییەکانیاندا تێپەڕی، وایدەزانی بە ڕیواقێکی درێژی جەهەنەمدا بەرەو خوار، بەرەو بنکی بێقەراری سەقەر دەڕوات، تا لەوێوە نهێنییەک لە دەست پاسەوانە جەهەنەمییەکان و ڕۆحە گومڕاکان ڕزگاربکات و بیهێنێتەوە سەرێ. بەجۆرێک غەریببوو دەیویست شەو زۆر زوو بەسەرچێت و تێپەڕێت. نەیدەتوانی بیر لە باران شوکور نەکاتەوە، بیر لەوە نەکاتەوە گەر نەکوژرابایە ئێستا ئەویش لێرەبوو، لە ناو ئەمانەدابوو کە ئاهەنگ دەکەن و هەڵدەپەڕن. لە کاتژمێری دەدا ئاهەنگەکە دەگەیشتە ترۆپکی خۆی. لەوێدا دەبایە لەگەڵ دەرسیمدا بە جیا لە هۆڵەکە بڕۆنەدەرێ و لە دەرەوە بە بیانووی دۆزینەوەی جێگایەک بۆ گۆڕینی دەرسیم کە دەبوو خۆی پیسبکات، لە کوچەکانی نوێمیراندا خۆیان ونبکەن. لە پێش کاتژمێر دەدا دەرسیم شتێکی بە جلەکانی خۆیدا ڕشت و ماجیدی گوڵ سۆلاف لەگەڵیدا هاتەدەرێ، شەو ساف و بێدەنگ و غەمگین بوو. کە دەنگەدەنگی ئاهەنگەکە و ژاوەژاوی هەڵپەرکێکەران لە سەریدا کوژانەوە، بێدەنگی دونیا سەرسامیکرد. سەیری ئاسمان و ئەستێرەکانی کرد، هەستیکرد هەموو شتە گەورە و مەزنەکانی گەردون بە ویقار و هێمن و بێدەنگن. دڵنیابوو ناو ئەم هێمنی و خامۆشییە ماڵی ڕاستەقینەی ئەوە... وا هاتە خەیاڵی هەموو نوێمیران لە ئاهەنگەکەبێت. وەک پەلی برایەکی خۆی بگرێت، پەلی دەرسیمی گرت و دوو بە دوو لە کوچەکانی نوێمیراندا کەوتنەڕێ. کزەبایەکی پاییزەی دڵتەزێن بە ناو کۆشک و باغچە زەردەکاندا هەڵیدەکرد، دەرسیم بێئەوەی بیر لە هیچ بکاتەوە یان بترسێت لە پێشەوە دەڕۆیشت. تا گەیشتنە نزیک باغی مورتەزا تەنیا

سەیری ناو تاریکیان دەکرد. ماجید ئەمشەو ئارەزوویەکی وەهای نەبوو گاڵتە بە لووتی دەرسیم بکات، دەرسیمیش لەو ڕۆحلەبەرانەبوو خۆبەخۆ نەدەهاتە قسە. کەلە باغی مورتەزا نزیکبوونەوە ئەو ناوە زیاتر لە هەرجێگایەکی دی نوقمی زوڵمەت بوو. چرای کۆشکەکانی دەورووبەر سەرتاپا خامۆشبوون، وەک دوو کەس ترس و دوودڵیان نەبێت بە هێمنی دەرگای پشتەوەی باغچەکەیان کردەوە. باغ بوو، باغێکی ڕاستەقینە، هیچ ئاسەوارێک نەبوو کە لە ژێر ئەم درەخت و گوڵانەوە ئەو هەموو مردنە هەبێت. بەڵام دەرسیم وەک لووتی شتێکی نهێنی پێبڵێت ڕاچڵەکی، بە هەست تێگەیشت چوار دەوری و ژێر پێی سەرتاپا لاشەی مردووانە، سەرسام لەباغەکەی ڕوانی و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. دەبایە لە بازنەی سێهەمی باغەکەدا، لەو جێگایەدا کە سەرروویەکی بەرز ڕواوە، بەدەستی چەپدا دوو مەتر دوور لەو درەختەوە، زەویەکە هەڵکەنن و باران دەربهێنن. دیاربوو هاوینی ڕابوردوو دەستێک گوڵی جۆراوجۆری لەسەر گڵکۆکەی باران سەوزکردوە، لەگەڵ ئەوەی دونیا ماڵاوایی لە دواهەمین گەڵا وەریوەکانی خەزان دەکرد، هێشتا هەندێک گوڵیچکەی ورد لەسەر گۆڕەکە مابوون. دەرسیم بە خێراییەکی سەیر زەوییەکەی هەڵکۆڵی. لە ماوەیەکی کەمدا گەیشتە سەر کراسە سپییەکەی باران... بە خێراییەکی ئەفسوناوی کە نیشانەی شارەزایی و هێزبوو نەوەک نیشانەی ترس و شپرزەیی هەموو لاشەکەی دەرهێنا. خودایە لەگەڵ تێپەڕینی شەش مانگیشدا جەستەی باران ساغ بوو، وەک ئەوەبوو دوێنێ نێژرابێت، بۆنێکی سەیری گوڵزاری لێهەڵدەستا... بۆنی باغی لێدەهات. دەرسیم بەو لووتە زلەی خۆیەوە ئەو بۆنە مەستیکرد و بە چپەوە گووتی «خۆشە... زۆر خۆشە». بە هەردووکیان خۆڵەکەیان دایەوە بەسەر ئەو جێگایەدا، بەڵام شوێنەواری هەڵکەندنەکان وەها دیاربوون بە هیچ دانەدەپۆشرا. نزیکی یازدەی شەو، پێکەوە دەرگای پشتەوەی باغەکەیان

کردەوە و بەرەو سنووری دەرەوەی نوێمیران ڕۆیشتن. هەمووشتێک ئاسان تێپەڕی، هیچ ڕۆحلەبەرێک تووشی گومان و دوودڵی و ترسی نەکردن. ماجیدی گوڵ سۆلاف لاشەکەی بارانی دابوو بە شانیدا و بە تاریکی ئەنگوستەچاوی پاییزدا دەڕۆیشت، پێدەشتێکی ڕێک و تاریک و بێبەربەست بوو. گوڵ سۆلاف خۆشحاڵ بوو، خۆی وەک کەسێک دەهاتە پێشچاو کە لە بنی بێقەراری سەقەرەوە بەرەو سەر زەمینی ڕوناکی دەگەڕێتەوە. لە نزیک تەلبەندەکانی نوێمیران دەرسیم هەموو تەلەکانی قرتاند و پێکەوە لاشەکەیان گەیاندە دەرەوە. ماجەلانی ڕاستەقینە و حەسەنی پیرۆ لە پیکابێکی ڕەشدا چاوەڕوانیاندەکردن... ماجەلانی ڕاستەقینە لە بێدەنگی و تاریکی لا ڕێیەکی باریکی شەودا، لاشەی خوشکەزاکەی لە ماجید وەرگرت و هەستیکرد بۆنی ئەو گوڵە خەیاڵیانەی لێدێت کە لە قەسیدەکانی غەزەلنوسدا بۆنیکردبوون. حەسەن تۆفان بەسەرسامییەکی گەورەوە سەیرێکی دەموچاوی مردووەکەی کرد کە هێشتا لە ئامێزی زوهدی شازەماندا بوو، بە چرپەوە گووتی «باری تەعالا، فەخری کائینات... چەند لە سەبری دەچێت». شازەمان پرسی «سەبری کێیە... حەسەنی پیرۆ، سەبری کێیە؟». حەسەن بە هەمان سەرسامییەوە گووتی «ئەو مەعشوقەیەی غەزەلنوس لە هەزارباغ دەیبینێت». لەو کاتەدا ماجەلانی ڕاستەقینە تەرمەکەی دانا و قژی لەسەرچاوی لابرد و بۆ یەکەمجار باران شوکوری لەبەر ڕوناکی لایتێکی دەستیدا بە ڕۆشنی بینی. ئاهێکی خنکاو لە گەرووی هاتەدەرێ، هەستیکرد هەردوو دەستی دەلەرزێت. سەری خستە ناو دەستی و بە حەسرەتەوە گووتی «زۆر گەنج بوو... زۆر». ماجیدی گوڵ سۆلاف لەو شەوەزەنگەدا دووبارە لایتەکەی لە ڕوخساری باران نزیککردەوە و بە وردی سەیریکرد و لە دڵی خۆیدا گووتی «خوای گەورە... خوای گەورە... زۆر گەنج بوو... زۆر».

## دووهەمین و دواهەمین چیرۆکی من بۆ تیشکان
## ماجیدی گوڵ سۆلاف دوانزە و سیانزەی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤

لاشەکەی بارانمان لە ناو باغێکی خەیاڵی گەورەدا لە تەنیشت نەوجەوانی چینییەوە ناشت. باغێک لەسەری ئەو سەری دەریایەک لە غەزەلدا. هەر چوارمان باغ بە باغ و غەزەل بە غەزەل ئەو لاشەیەمان هەڵگرت. لە ناوەڕاستی ئەو کتێبخانە گەورەیەدا کە ڕەفەکانی سەرتاپا دیوانی بێشوماری غەزەلبوون، بارانمان بەخاک سپارد. غەزەلنوس لەسەر گۆڕەکەی گووتی «غەزەل وەک چۆن ڕێگای لە دایکبوونە ئاوهاش ڕێگای مردنە، هەندێک بە غەزەلدا دێن بۆ ژیان، بەڵام ناتوانن بە غەزەلدا بگەڕێنەوە، هەندێکیش بە غەزەلدا نایەن و بە غەزەلدا دەگەڕێنەوە... هەموو ڕۆحلەبەرێکی خەیاڵی کە لەدایکدەبێت دێڕێک شیعر لەسەر سینەیەتی، دواتر ئەو مرۆڤانە لە تەواوی زیندەگیدا ئیشیان ئەوەیە ئەودێڕە تەواوبکەن و بیکەن بە قەسیدەیەک... بەڵام کەمن ئەوانەی دەتوانن لەگەڵ ئەو دێڕەدا بژین و قەسیدەکە تەواوبکەن». دواتر بە ئێمەی گووت «نەخشەی ڕاستەقینەی ئەم باغە لای ئێوەیە، نهێنییەکەی لە دڵی خۆتاندا هەڵگرن». ئێمە نەوجەوانی چینی و بارانمان لەو باغەدا بۆ هەتاهەتایە بەجێهێشت و دڵنیابووین لە ناو ئەو بەحری غەزەلەدا ئاسوودە دەژین. من وام هەستکرد لەوێدا چیرۆکەکەمان تەواوبووە، هەستمکرد ئێمە بەشێکی چکۆلانەی جەنگێکی گەورەمان بردۆتەوە، لە دڵی خۆمدا دەمگووت گەر ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم چیرۆکە ببێت بە کتێب، خەڵکانی پاشەڕۆژ و ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکانی داهاتوو شانازی بە منەوە دەکەن، بە ماجیدی گوڵ سۆلافەوە کە لەسەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکدا لاشەی ژنێکی عاشقم لە باغێکی ناو سەرزەمینی

دوژمنەوە دەرهێناو بەرەو باغێکی خەیاڵی هەڵمگرت و وەک قارەمانێکی ڕاستەقینە لە هیچ شتێک نەترسام. دڵنیابووم لە پاشەڕۆژدا دەچمە ناو کتێبەکانەوە، هەستمدەکرد مانای ئەو ئیشەی من کردومە، لە زۆر جەنگی گەورە و شەڕی ڕاستەقینە ڕوونتر و قووڵترە. مرۆڤ لە مێژووی خۆیدا هەزاران جەنگی ترسناک و گەورەی کردوە، بێئەوەی بزانێت بۆ، بەلام من دەمزانی چەند گرنگە، ئەو لاشە جوانەی باران لە باغێکی ناچیز و یادکراو و تاریکەوە بەرەو باغێکی خەیاڵی و پڕ غەزەل بگوازینەوە.

بەلام ئەو هەستە مەزنەی سەروەری و سەرفرازی هەستێکی کورت و کەم خایەنبوو، بۆ ڕۆژی دوایی کە بە ئاگاهاتم و تیشکان تاهیرم لە بەردەرگای ژوورەکەی خۆمدا بینی، هەستمکرد دەنگێک لە ناخەوە پێمدەڵێت «گوڵ سۆلاف لە خۆتەوە قسەی زیادمەکە و زۆر مەڕۆ... لە خۆتەوە پەلەمەکە، شەڕ هێشتا تەواو نەبووە». تیشکان بە تەنوورەیەکی کەمێک کورتەوە لە بەر دەرگای ژوورەکەمدا وەستابوو و گووتی «کووری باش پێتناخۆش نییە، بێمە ژووری». منیش بە دەم باوێشکێکی درێژەوە گووتم «تیشکان گەر بۆ کوشتنیشم هاتبیت، پێم ناخۆش نییە... وەرە ژووری». بە گلەییەوە گووتی «دوێنێ شەو سەیرت نەکردم... تێناگەم بە درێژایی ئاهەنگەکە سەیری منت نەکرد... بۆ؟ کووری باش، لە پرزێکیشا ونبوویت». من گووتم «ها دوێنێ شەو، دوێنێ شەو، دوێنێ شەو». لە ڕاستیدا نەمدەزانی بڵێم چی، من بە درێژایی هەموو شەو تیشکانم بە خەیاڵدا نەهاتبوو. گووتم «دوێنێ شەو بە جۆرێک دڵتەنگبووم ترسام بەم دڵتەنگییەی خۆم جوانی تۆ بژاکێنم... کە دڵتەنگدەبم حەزناکەم کەسانی خۆشەویستی خۆم ئەزییەتبدەم». بە مەکرێکەوە لە تەنیشتمەوە دانیشت و گووتی «کورری باش، بیری حیکایەتەکانت دەکەم، حیکایەتەکەی ئەو ڕۆژەت زۆر خۆشبوو، زۆر زۆر. من بیری حیکایەتەکانت دەکەم...». زانیم درۆدەکات، بەلام نەمویست بزانم بۆ درۆدەکات. لە جێگاکەمدا ڕاکشا، کە

پاڵکەوت تەنوورەکەی بەجۆرێک هەڵکشا ئیتر شەرممدەکرد سەیریبکەم. بۆ ئەوەی ڕانە سپی و باریک و بڵندەکەی نەبینم، لە تەنیشتییەوە دانیشتم و دەستم بەقژە زەردەکەیدا هێنا و گووتم «بەڕاست حەزت لە حیکایەتی منە؟». گووتی «زۆر، باوەڕبکە کووری باش، زۆر». چاوانی وەها جوانبوون ئێستاش کە بیر لە نیگاکانی دەکەمەوە حەسرەتیان بۆ هەڵدەکێشم. لێمپرسی «حەزت لە چ حیکایەتێکە؟». بە ئەسپایی چاوی لێکنا و گووتی «بەحەزی خۆت». منیش هەناسەیەکم هەڵکێشا و گووتم «گوێبگرە تیشکان... ئەمڕۆ حیکایەتێکی غەمگینت بۆ دەگێڕمەوە، کە نابێت قەت لەیادیبکەیت». لەسەرەخۆ گووتی «قەت لە یادی ناکەم». گووتم «ئەگەر ڕۆژێک مردم، ئەم حیکایەتەت بیرنەچێتەوە». گووتی «بیرم ناچێتەوە». نەمدەزانی بۆ وا دەڵێم، بەڵام هەستێکی منداڵانەم تیابوو کە دەمکوژن. گووتم «هەبوو نەبوو لە شارێکی ئەم دونیا گەورەیەدا ئەسپناسێکی زۆر شارەزا هەبوو، حەزیدەکرد هەموو ئەسپی جوانی دونیا هی خۆی بن، بەوەدا زۆر لە دەستەمۆکردنی ئەسپی کێویدا شارەزابوو، دەیتوانی کێویترین ئەسپ ڕامبکات و جڵەوی بکاتە مل، ئەو ئەسپبازە بە جۆرێک شارەزابوو، بەجۆرێک لە هونەری جڵەوکردندا لێزان بوو، هیچ کەس لە دونیادا نەیدەوێرا گومان لە توانای بکات، هەر کەسێک گومانی هەبووایە ئەو دەیگووت برۆ کێویترین و ناڕامترین ئەسپی دونیام بۆ بهێنە تا بۆتی دەستەمۆبکەم. هەر کەسێک ئەسپی زۆر سرکی هەبایە کە هەرگیز دەستەمۆنابێت، دەینارد بە دوای ئەو مامۆستایەدا. ئەسپێکیش چییە لە دونیادا لە دەستی دەرنەچووبوو. ڕۆژێک ئەسپناسێکی دیکەی وەک خۆی و مەیتەرێکی دۆستی هاتە لای و هەواڵی ئەسپێکی لە کێڵگەی یەکێک لە ئەسپدارە ناودارەکانی وڵاتەوە بۆهێنا، ئەسپێک بە هیچ مەیتەر و ڕامچییەک دەستەمۆ ناکرێت و ڕاناگیرێت و سمکۆڵانی هێور ناکرێتەوە. مامۆستای گەورەی ڕامکردن

کە تا ئەو کات جڵەوی لە ملی هەزاران ئەسپ کردبوو، ئەم هەواڵە دڵخۆشیکرد. مامۆستا پێیوابوو هەلێکی گەورەی دەستکەوتووە هونەری خۆی تاقیبکاتەوە و توانای خۆی بەڕاستی بسەلمێنێ. بەرەو کێڵگەی ئەو ئەسپە کێوییە ڕۆیشت و بەتەمابوو هەر زوو بە خۆی و مەدالیایەکی دیکەی دەستەمۆکردنەوە بگەڕێتەوە... مامۆستا کە دەگاتە شوێنی نیازی خۆی و لەوێ تەماشادەکات، ئەسپێکی سپی سەرکەش دەبینێت کە یاڵێکی چڕ و ئاوریشمینی هەیە. ئەسپێک هێند بۆنی مەیتەر و هەناسەی مرۆڤی بەسەردا دەچێت، وەک شێت دەکەوێتە سمکۆڵان و کوڕژن و بازبازێن و جووتە. ئەسپبازی شارەزا کە واحیسابدەکات هیچ ئەسپێک لەسەر زەویدا نییە ئەو نەتوانێت ڕامیبکات، چەند ڕۆژ و چەند هەفتە دەکەوێتە هەوڵی نەرمکردن و هێورکردنەوەی ئەو ئەسپە شێتە و سوودی نییە. سەختی ئیشەکە و جوانی ئەسپەکە وەها دەچنە دڵی ڕامچییەکەوە بڕیاردەدات ژیانی خۆی بۆ دەستەمۆکردنی ئەو ئەسپە تەرخانبکات، بە نرخێکی بەرز ئەسپەکە لە خاوەنی دەکڕێت و بە فەلاکەت بەرەو ماڵ و کێڵگەی خۆی دەیگوازێتەوە و لە سەر زەوی و مەزرای خۆی بەرەڵایدەکات. ڕۆژان دێن و ڕۆژان دەڕۆن، مانگان و ساڵان تێدەپەڕن و ئەو پیاوە هەموو هونەری خۆی و هونەری ئەسپبازانی تر بەکاردەهێنێت و ئەو ئەسپەی بۆ دەستەمۆ ناکرێت... دوای چەند ساڵ ئیش دەگاتە ئەو بڕوایەی هەندێک ئەسپ هەن هەرگیز دەستەمۆنابن، مرۆڤێک نییە بتوانێت زینیان بکات و جڵەویان ئاسان ڕاکێشێت و بەو ڕێگایەدا بیانبات کە ئەو دەیەوێت، ئیدی تفەنگەکەی هەڵدەگرێت و لە گەرمەی نائومێدیدا ئەو ئەسپە سپییە دەکوژێت... مەیتەرچی شارەزا کە عەشقێکی زۆری ئەسپی لە دڵدایە، پێیوایە تاکە ڕێگایەک بۆ ئەوەی خۆی بژی و ڕەنجی مانای هەبێت، ئەوەیە ئەو ئەسپە بکوژێت. هەموو ئەو ئەسپانەی کە دەستەمۆنابن دەبێت بکوژرێن...».

تیشکان تاهیر بێئەوەی هیچ لە حیکایەتەکەم تێبگات. دوای سەرخەوێکی کورت لە جێگاکەمدا هەستاو بەبێدەنگی ڕۆیشت، دڵنیابووم دەچێت بۆ لای یەکێک لە بارۆنەکان. دوای ڕۆیشتنی ئەو من دڵتەنگبووم... دڵنیابووم جارێکیَ دی تا هەتاهەتایە نایەتەوە ئەم ژووره بۆلام. دڵنیابووم بەیەکجار و تا هەتاهەتایە خانمی جێسیکەم لە دەست خۆمداوە.

ئەو بەیانییە کە چووم بۆ ناو منداڵە نابیناکان، بە دڵنیاییەوە دەمزانی ئەوە دواهەمین ڕۆژمانە پێکەوە، بێ هیچ هۆیەکی دیاریکراو پێمگووتن «ئەمڕۆ پێکەوە سوار کەشتییەکە نابین... ئەمڕۆ تەنیا هەندێک قسەتان بۆدەکەم. من ڕۆژێک لە ڕۆژان بەجێتاندەهێڵم... دەزانم ئەم نەخشەیەی ئێمە لەسەری دەڕۆین تا ژیان و گەردون هەبێت تەواونابێت، سەفەرێکە بەشی هەموو مرۆڤەکان دەکات، ئێستا هەر یەکێک لە ئێوە نەخشەیەکی وەها خەیاڵی لە ڕۆحتاندایە، دەتوانن سەیری تاریکی ناو بینایی خۆتان بکەن و درێژە بەسەفەرەکە بدەن. ئێستا هەر یەکێک لە ئێوە بووە بە ماجەلانێکی چکۆلەی خەیاڵی کە دەتوانێت خاکی سەیر و عاجباتی لە دڵی خۆیدا بدۆزێتەوە، هەر یەکەتان کەشتییەکتان هەیە کە دەتوانن بە ڕوباری سەخت و ئاوی خوڕ و زەوی پڕ مەترسیدا ئاڕاستەیبکەن. ڕۆژێک لە ڕۆژان کە هەستتانکرد ژیانتان زۆر ناخۆشە، هەستتانکرد دەبێت بڕۆن بۆ دونیایەکی تر و بۆ سەر زەمینێکی تر، سەیری قووڵایی ناو ڕۆح و جوانییەکانی ناو دڵتان بکەن، لەوێدا زۆر نەخشەی لەوەی من قووڵتر و سەیرتر و جوانتر دەدۆزنەوە. زۆر خاکی لەوەی من سیحراویتر دەبینن. ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر یەکێکتان گەیشتە ئەوپەڕی جوانی، گەیشتە ئەوپەڕی خەیاڵ، گەیشتە خاکێک کە خۆی پێیوایە سەر زەمینی خەونەکانێتی. لەوێدا باغچەیەکی چکۆلانە دروستبکەن و ناوی بنێن «باغی سەرداریاشی گوڵ سۆلاف» یان ناوی بنێن «باغی ماجەلانی خەیاڵی» ». ئەو ڕۆژە منداڵە نابیناکان بە تەواوی غەمگین بوون، بەڵام چارێکم نەبوو،

دڵنیابووم دەبێت خۆم بۆ سەردەمێکی تر و ڕۆژگارێکی تر ئامادەبکەم. دەبایە منداڵە نابیناکان فێربن خۆیان نەخشەی خۆیان دروستبکەن و تەنها بە خەیاڵی خۆیاندا سەفەربکەن و کیشوەرە شاردراوە و نغرۆکانی ناو ڕۆحی خۆیان بدۆزنەوە... چاری دیکە نەبوو.

## یاداشتەکان بارۆنی خەیاڵ

من میری پۆرسەلان هەواڵەکەی دامێ، پێشتر وەها شپرزە نەمبینیبوو. بارۆن مۆدێلی جۆرە پیاوێک بوو کە لە سەدەی بیستدا نمونەیان زۆر زۆربوو، چەشنە پیاوێکی کەمزە، بەلام لە هەمانکاتدا ئازا و چاونەترس، لەو کەسانەی دەسەلات تەنیا بە هەیبەت و ترس تێگەیوون. من لەو کاتەوەی لە ئەنجومەنی میراندا ئەندامبووم ئەوم دەناسی. چەند ساڵێک بوو وازم لەوە هێنابوو لەگەڵ کەسانی وەک میری پۆرسەلاندا بچمە گفتوگۆوە، بەلام هەردەم کاروباری حیزب و وردەکارییەکانی ژیانی سیاسی کۆیدەکردینەوە. گەرچی هاوڕێ نەبووین بەلام ڕێزی یەکدیمان دەگرت و حورمەتی یەکترمان لابوو. دووساڵ لەمەوبەر کە سەرۆک خوماری پاشەڕۆژی سیاسی خۆی بوو، دەیویست خۆی بۆ قۆناغی تازە ئامادەبکات. زۆربەی کاروبارەکانی دابەشکرد و لە زۆر وردە ئیش کە تا ئەوکات خۆی بە ئیرادەی خۆی ڕاییدەکردن دەستی کێشایەوە. بەوەدا سەرۆک منی وەک کوڕی خۆی تەماشادەکرد، لوتفی نواند و بڕێکی زۆر وردە ئیشی دا بەسەرمدا کە زۆربەیان تەنیا سەرئێشەی ڕووتبوون و هیچی تر. ڕۆژێک من و بارۆنی پۆرسەلان و بارۆنی ماستاو و بارۆنی تورکی بانگکرد و گوتی «ئێوە هەر چوارتان کوڕی شیرینی

منن و دەبێت لەمەولا زۆر شت هەیە ئێوە بۆم ئەنجامبدەن». هەر جەنابیشی وایکرد لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی باڵای میراندا، کە خەڵکانێک ناویاننابوو دەستەی باڵای بارۆنەکان، ئێمە دەرچین. کە من و بارۆنی پۆرسەلان پێکەوە لە ئەنجوومەنی باڵای میراندا دانراین و بە کۆی دەنگیش کراین بە بەرپرسی راستەوخۆی ئارامی و ئاسایش لە ناوچەی نوێمیران، شەوێکیان بارۆنی پۆرسەلان چیرۆکی ئەو باغەی باکووری نوێمیرانی بۆ گێڕامەوە کە ژێرەکەی پڕە لە تەرمی جۆراوجۆر، کە لە سەردەمی جیاواز و لە بۆنەی جیاواز و بە بەهانەی جیاواز کوژراون. مەسەلەکە ئەو کاتە هاتە پێش کە من ویستم ئەو پارچە زەوییە جوان و گەورە و دانسقەیە هەڵدەمەوە و خۆشییکەم و لەوێدا مۆنمێنتێکی گەورە بۆ کچانی ئەنفالکراو بەرزبکەمەوە. من ئەو پرۆژەیەم زۆر بەڕاست و جیدی وەرگرتبوو، دروستکردنی مۆنمێنتێکی وەهام بە نیشانەی حورمەتی دەسەلاتی ئێمە بۆ ئافرەت دەزانی. رۆژێک بەر لەوەی شۆفڵەکان بهێنم، بارۆنی پۆرسەلان خۆی هات و بە هێمنی هەموو شتێکی تێگەیاندم. بە زەردەخەنەی پیاوێکی خۆشبەخت و ڕازییەوە لە دونیا گووتی «ئەم شارە هەمیشە لاشەیەکی هەیە بیشارێتەوە، ئەمە مێژووی ئەم شارە بووە، لە کۆنەوە هەروابووە و هەر واش دەبێت. لەبەرئەوە بارۆن دەست لەو مەسەلەیە هەڵگرە. بەس خوا دەزانێت، گەر دەمە شۆفڵێک لەو عەردە بدەیت چەند مردووی پێوە دەبن، لەبەرئەوە بەقسەی برای خۆت بکە و واز لەو حیکایەتە بهێنە... ئەوێ پڕە لە لاشە، هەتا تەرمی عەبدولقادری نیاش لەوێیە، گەر لە یادت مابێت... خاوەنی کارخانەی مافوورەکە. لەبەر ئەوە جەنابی بارۆن لێگەڕێ و دەرگای جەهەنەممان لێمەخەرە سەرپشت». بێئەوەی ئارەزووی ئەوەم هەبێت بچمە بنج و بناوانی شوناسی مردووەکان،

گووتم «بارۆنی پۆرسەلان، بوونی گۆڕستانێکی وەها لە ناوەڕاستی نۆیمیراندا، وامان لێدەکات هەمیشە چاوکراوەبین و نهێنییەکەی بپارێزین، دەبێت چیرۆکەکەی لە نێو ئێمەدا دەرنەچێت، چیرۆکێکی وەها بڕواتە دەرەوە بۆ هەموومان ئابڕووچوونێکی گەورەیە ». بارۆنی پۆرسەلان گووتی «ئەوەی بەرپرسی گۆڕستانەکەیە، بەحریێکی کپە و تا مردن نهێنییەکەی دەپارێزێت». کە بارۆن منی وەها ئاسوودەکرد، خۆشحالانە کەوتمەوە سەروکاری دەردەکانی خۆم. ئەو سالانە کە هەوالی دلدارییەکانی نەوجەوانی چینی لە نۆیمیران کەوتبووە سەر هەموو زارێک، من پتر خەریکی خوێندنەوەی دیوانەکانی شیعر و لێکۆلینەوە لە ماهییەتی بەدکاری شاعیران بووم، خەریکی تێگەیشتن بووم لە سیحری بێبنی شیعر و هێزی بێبنی خەیالاتی شاعیرانە لەسەر ئادەمیزاد، هەرجارێک سەرۆکم دەبینی بەڕێزیان دەیگووت «هێیی میری خەیال، خەریکی چیت و کاروباری تۆ چۆن دەڕوات؟». من دەمگووت «میری میران و سەروەری هەموو بارۆنەکان، خەریکی بیرکردنەوەم لەوەی چۆن شاعیران دەستەمۆبکەم و وابکەم لە بیناکردنی مەملەکەتدا بەشدارمانبن». بەوەدا سەرۆک شتێکی ئەوتۆی لە هێزی شاعیرییەت و ڕۆلی ترسناکی خەیال لە مێژوودا نەدەزانی، جەنابیان هەمووجار زەردەخەنەیەکی پانی بۆدەگرتم و دەیگووت «ئەو ڕەنجەی تۆ لەگەل شاعیراندا دەیدەیت، لەو ڕەنجەی من دەچێت کە لەگەل ئەمریکییەکاندا دەیدەم». ڕۆژێک بۆ ئەوەی سەرۆک بزانێت شتەکان چەند ترسناکن، ئەو خاولییە گەورەیەم برد و پیشانمدا. سەیرم لێهات کە سەرۆک بە پێکەنینەوە سەیرێکی وردی خاولییەکەی کرد و گووتی «کوڕم، تۆ هەموو حکایەتەکە لنگەوقوچ حالیبوویت، ئەوەی تۆی تێگەیاندوە خراپ تێیگەیاندویت. ئەم دیوە سادە و بێڕەنگ و بێڕۆحەی خاولییەکە ئەمە حیکایەتی شاعیرەکەیە،

شاعیران خەڵکی سەرفەقیر و بێرزقن، دونیای خۆیان فەقیر و بێڕەنگ و بێخێردەبینن... شاعیر مەگەر خۆی نەجیبزادەبووبێت، ئەگینا کوا کوڕم ئەوەندە کەرەمدیدەن تێبگەن چییان بۆ دەکرێت و چییان بۆ کراوە، شاعیر خودا وەهای خەڵقکردوە قەت خێر و بێری دەوروبەری خۆی نابینێت. شاعیرت بینیوە شاری خۆی و دونیای خۆی ئاوها ڕەنگاوڕەنگ ببینێت؟ ها شاعیران کەی وا گەشبینبوون و دونیایان بەڕەنگەوە بینیوە؟ ئەوە پادشایە شاری خۆی ئاوها جوان و ڕازاوە و ڕەنگاوڕەنگ دەبینێت، بارۆن گیان تۆ چۆن لە خاولییەکی وا دەترسیت، ئەوەی لێرەدا گرەوەکەی بردۆتەوە ئێمەین، ئەوەی سەری پەڕیوە شاعیرە بەستەزمانەکەیە. شاعیران جنسێکن هەر ئافەت و دەرد و تاعوون دەبینن و قەت خێروبێر نابینن». سەرۆک وەک باوکێکی دڵنەرم دەستی خستە سەرشانم و گووتی «شاعیران شتێک نین لێیان بترسین. من لە زەردەواڵە و شەنگەسوورە زیاتر دەترسم وەک لەوان». هەڵبەت بۆچوونەکانی سەرۆک کەمتەرخەمییەکی ترسناکی پێوەبوو، من بە درێژیی ڕیشەی ترسەکەی خۆم بۆ ڕوونکردەوە و گووتم «جەنابی سەرۆک، شاعیران مەخلوقاتێکی دەمامک دارن، زۆرجار بوونەوەری حەرباوی ترسناکن، لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسیدا کەسانی وەکو ڕۆسۆ و ڤۆلتێر شێوەشاعیربوون و بەخشکەیی عەرشی پاشاییان ڕوخان، پۆشکین و لێرمنتۆڤ بنی حوکمڕانی قەیسەرییان بۆشکرد، شاعیران لەسەرەتادا ڕژێمەکان ڕیسوادەکەن و دواتر خەڵکی تر دێن و بە پاڵێکی بچوک، سووک و ئاسان دەیانڕوخێنن... هەر لە پاڵ خۆماندا نمونەی زەق و زۆپ هەیە. شای ئێران ئەو ڕۆژە ڕوخا کە خەسرەوی گولسورخی خنکان، هەر سیستمێک شاعیران دانی پیانەنێن ڕیسوادەبێت، سەیری مێژووبکە، گەورەم، مێژوو دواجار هێندەی گوێ لە شاعیران دەگرێت گوێ لە

جەماوەر و لە سەرۆکەکان تاگرێت، موسیبەتەکەش ئەوەیە خۆیان بۆ ئەوەی بە جوانی و پاکی بمێننەوە قەت بەشداری لە یارییەکەدا ناکەن». سەرۆک پیاوێکی زۆر گەشبین بوو، زەردەخەنەیەکی ویقاری گرت و گووتی «ڕۆژێک بزانم مەترسیان هەیە، گوونی هەموویانت بۆدەکەمە یەک تورەکەوە و بیدە بە کۆڵتا و بیبە و ڕێکەرە کام دەریاچەوە کە کەیفت دەیگرێت». تۆزێک وەستا و بە پێکەنینێکی نەرمەوە گووتی «بۆ شاعیرە ژنەکانیش حیسابێکیان هەر بۆدەکەین». من سەیری دەموچاویم کرد و تێگەیشتم کە پیاوێکی وەها دڵپاک و سادەیە لە هیچ شتێکی ئەم دونیایە تێناگات.

ئەو ڕۆژە بارۆنی پۆرسەلان بە شپرزەیی هات و بەچپەوە گووتی «میر سەحەر، شتێکی ترسناک ڕوویداوە، دوێنێ بارۆنی کولەکە چووە بۆ سەر گلکۆی ژنەکەی لە باغی مورتەزا، بەستەزمانە هەر گەیشتۆتە سەر شوێنەکە، سەرەنجی ئەوەی داوە کە گۆڕی ژنەکەی هەڵدراوەتەوە و مەیتەکەی دەرهێنراوە... پێشتر شتی وا لە نوێمیران ڕووینەداوە. بارۆنی کولەکەی بەستەزمان حاڵی نا حاڵە، لە دۆخێکی زۆر سەخت و دژواردایە... ». من شتێکی کەمم لەسەر حیکایەتی ژنەکەی بارۆن دەزانی، لە دەمی زۆربەی چاوەدێر و هەواڵهێنەکان بیستبووم کە لە هەلومەرجێکی نادیاردا بارۆنی کولەکە ژنەکەی خۆی کوشتوە، بەڵام حیکایەتەکەم پێ شتێکی گرنگ و بایەخدار نەبوو. ئەو ڕۆژە لە کاتێکدا لە نێوان مەکتەبی کاروباری ئابووری و مەکتەبی کاروباری مەدەنیدا بە ڕێگاوەبووین بارۆنی پۆرسەلان حیکایەتی بارۆنی کولەکە و ژنەکەی بە تەواوەتی بۆگێڕامەوە. بارۆنی پۆرسەلان تەواو لە بەسەرهاتەکە تورەبوو، گووتی هەر کەسێک بێت ئەوەی ئەو کارەیکردوە دەبێت بکوژرێت، نهێنی ئەو باغە بچێتەدەرەوە بەس خودا دەزانێت چی ڕوودەدات. من لە تورەیی

بارۆنی پۆرسەلان تێدەگەیشتم، چاوی بە چەشنێک سووربووبوو من لێی تۆقیبووم. گووتی «نهێنی هەموو ئەم شارە، نیوەی نهێنی میرەکان و دۆستەکانی حیزب لەوێدایە... هەندێکی کێشەی شەخسی و هەندێکی کێشەی سیاسی و هەندێکی دیکەشیان گرفتی عەشایەری گەورە دەخولقێنن... ئەوەی سەری ئەو باغە هەڵبداتەوە واتە سەری ئەم پازدە ساڵەی ڕابووردوو هەڵدەداتەوە... بارۆن من و تۆ بەرپرسی ئاسایشین دەبێت بزانیت ئەم مەسەلەیە بڕواتەدەرێ، یەکەم کەس ملی من و تۆی پێوەدەبێت». کە بارۆنی پۆرسەلان وایگووت من ئیستێکمکرد و گووتم «جەنابی بارۆن، ڕەنگە من بزانم کێ ئەوەی کردوە. ڕەنگە بزانم». بەسەرسامییەوە سەیریکردم و گووتی «کێیە جەنابی میر؟» بێئەوەی بە وردی بیربکەمەوە گووتم «ئەگەر پەیمانم بدەیتێ نەیکوژیت و بیبەخشیت بە من، پێتدەڵێم». بارۆن بە شێوەی قسەکردنم سەرسامبوو. گووتی «جەنابی میر تێناگەم، مانای چی بیبەخشم بە تۆ؟ خۆت دەزانی ئەمە مەسەلەیەک نییە گاڵتەی لە گەڵدابکرێت». گووتم « سزاکەی بدەرە دەست من، سوێندم بۆ بخۆ کە سزاکەی دەدەیتە دەست من». بارۆن بە دووردڵییەوە گووتی « دەیدەمە دەست تۆ، بارۆن دەیدەمە دەست تۆ... بەڵام پێمبڵێ کێیە؟». لەسەرەخۆ گووتم «تاکە کەسێک بیەوێت سەری مردووەکان هەڵبداتەوە غەزەلنوس و هاوڕێکانیتی، ئەوەی ئاسوودەگی ئەو مردووەی شێواندوە، ماجیدی گول سۆلاڤە، ماجیدی گول سۆلاڤ... ئەو حیکایەتخوانەی شەوان چیرۆک بۆ منداڵانی نوێمیران دەگێڕێتەوە».

ئەوە باشترین سات و گونجاوترین چرکەی ژیانم بوو، ڕۆحلەبەرە خەیاڵییەکان بهێنمە سەر چۆک. دڵنیابووم تا غەزەلنوس مابێت، تا ئەم دەستەیە لە مەخلوقاتی خەیاڵی ئازادبن، مرۆڤێک دروستدەکەن

هەمیشە لە شوێنی تردا بۆ جوانی دەگەڕێت. ترسناکن ئەو مەخلوقانەی لە شوێنی تردا بۆ جوانی دەگەڕێن، ترسناکن. چەند ڕۆژبوو ئاوها لە بنی پڕ غەمی ڕۆحمدا هاوارمدەکرد. لەو ساتەدا کە لە تەنیشت بارۆنەوە دانیشتبووم و حیکایەتی ژنەکەی بارۆنی کولەکەی بۆ دەگێڕامەوە، هەموو ئەو ڕاپۆرتانەم هاتەوەیاد کە پیاوە دڵسۆزەکانم بۆیان نوسیبووم، دەربارەی بوونی پەیوەندییەکی نهێنی لە نێوان نەوجەوانی چینی و غەزەلنوسدا، بەلام ئەودەم هەواڵی نەوجەوانی چینیم بە پروپوچترین شتی دونیا دەزانی و ئارەزوویەکم نەبوو دوای دەنگوباسی ئابڕووی ژنی خەڵک بکەوم. بەلام ئێستا شتەکان هەموو سەرەوژووربوون. ئەمڕۆ کە گوێم لە حیکایەتی نەوجەوانی چینی و پەیوەندییە بێشومارەکانی لەگەڵ کچان و ژنانی بەستەزمانی نوێمیراندا دەگرت، دڵنیابووم نەوجەوانی چینی ڕەوانەکراوێکی ئەوە تا خەیال لە دڵی خانمەکانی نوێمیراندا سەوزبکات، تا ئاسوودەگی ناو دڵی خانمە بەحورمەتەکانی ئەم گەڕەکە بشێوێنێت کە بەختەوەر لە ماڵ و مێردی خۆیاندا دەژین. ئەو ڕۆژە دەستی بارۆنی پۆرسەلانم گرت و تا بەردەرکی ژوورە تایبەتییەکەی خۆم لە یانەی مرواری بەرم نەدا، بە چەند تەلەفونێک و لە ماوەی چەند سەعاتێکدا چەندین فلیمی ڤیدیۆی ئاهەنگەکەی ئەو شەوەمان کۆکردەوە، فلیم بە فلیم و لە هەموو گۆشەکانەوە سەیری ماجیدی گوڵ سۆلاقمان کرد، بینیمان لەگەڵ مەخلوقێکی چکۆلانە و گۆشتن و لووتزلدا خۆی دەکات بە هۆڵەکەدا، پەشۆکان و گێژی و دوو دڵییەکانیمان بینی، تێبینی ئەوەمان کرد کە گەنجە لووتزلەکەی هاوڕێی لە ناو حەشامات و جەنجاڵی بێسنووری ئەو شەوەدا دەشارێتەوە، بینیمان لە ناوەڕاستی ئاهەنگەکەدا ئەو مەخلوقە لووتزلە قوتیەک کۆلا بە خۆیدا دەڕێژێت و هەردووکیان پێکەوە ئاهەنگەکە بۆ شوێنێکی نادیار

بەجێدەهێڵن. هەر ئەو شەوە پاسەوانەکانی بەر دەرگای سەرەکیمان بانگکرد و ئەوان پێیانگووتین لە وەها ئان و ساتێکدا مامۆستای حیکایەتیان نەبینیوە نوێمیران بەجێبهێڵێت. بە هێمنی ڕوومان لە شوێنی ڕوداوەکە کرد، ئەو دەروازە و دەلاقەیەمان بینی کە لە تەلبەندی دەرەوەی نوێمیراندا دروستیانکردبوو، ئاسەوار و شوێن پێی دوو کەسمان لەسەر خۆڵە پاییزییە شێدار و نەرمەکەی ئەو دیو تەلبەندەکە بینی. بۆ ڕۆژی دوایی هەواڵدۆز و خەبەرگرەکانمان ڕاسپارد ڕاستی ئەو لووت سەلکەزوڕنایەمان بۆ بدۆزنەوە، بۆ ئێواری عەتار بە خۆی و لووتە ئاونگدارەکەیەوە هات و بەمنی گووت «ئەوە دەرسیم تاهیرە، پسپۆری دۆزینەوە و هەڵدانەوەی گۆڕە، کەس نییە لە دونیادا وەک ئەو خێرا گۆڕ هەڵباتەوە، چەند ساڵێک لە مەوبەر خۆم بەدەستی خۆم تەسلیمی غەزەلنوسم کرد. لەو دەمەوە لە ماڵی ئەودا و لەگەڵ منداڵەکانی ئەودا دەژی». دوای ئەو ڕوونکردنەوە بەنرخەی عەتار هەموو شتێک ئاشکرابوو. لووتی زلی ئەو مەخلوقە ناشیرینە، بوو بە کلیلی حەقیقەت بۆ ئێمە. بارۆنی پۆرسەلان کە هێشتا لە زۆر شت حاڵی نەبوو، گووتی «جەنابی بارۆن، لێمگەڕێ بیکوژم... ئەم مەسەلەیە شتێکی سادە نییە». دەستمخستە سەر شانی بارۆن و گووتم «کوشتنی ماجیدی گوڵ سۆلاف گرنگ نییە... دەبێت ئاگاداربیت، کوشتنی گوڵ سۆلاف مەسەلەی بارۆنی کولەکە و ژنەکەشی زیندوودەکاتەوە، چ حیزب و چ نوێمیرانیش دەکەونە بەر بای حەیاچوونێکی گەورەوە. گوڵ سۆلاف بە تەنیا نییە. خۆت دەزانی برایانی حیزبی «نیستیمانی دیموکرات» لە سەنگەردان بۆمان، هاوڕێکانی خۆمان لە باڵی «پاکیکە و چاکیکە» بۆ هەواڵێکی وادەگەڕێن، لە هەموو کوچەو بازاڕ و ڕێکخراوە حیزبییەکاندا دەم لە گەورەمان دەکەنەوە و ناوی دەزڕێنن. بارۆنی پەپولە لە باڵی

«بەسەبر بیخۆ» مەسەلەکە دەکات بە بنێشتەخۆشە تا لە دەڤەری خۆرئاوا لە هەڵبژاردنەکاندا کاندیدی تەکەتولەکەی خۆی پۆستەکان بۆ خۆیان بەرن. میری شەوپەڕ لە باڵی «نایخۆیت تا دەیخۆم» دێتە ناو یارییەکە و خوا دەزانێت بە چەند دەفتەر بێدەنگ دەبێت. بارۆنی هێستر لە باڵی «هەر دەیخۆین زوو بیخۆین» بە هەڵەداوان خۆی دەکات بە مەسەلەکەدا و دەڵێت «برادەران ئەی بەشی من؟». ماجیدی گوڵ سۆلاف مەخلوقێکی چکۆلەی لاوازە. تۆ لە حیزبدا گەورەبوویت، خۆت دەزانی بۆ بێدەنگکردنی ئەو جۆرە مەخلوقاتانە مرۆڤ دەبێت ڕێگای تر بگرێتەبەر». بارۆنی پۆرسەلان دەستی خستە سەرشانم و گووتی «لەبەر ئەو عەقڵە جوانەتە سەرۆک ئاوها تۆی خۆشدەوێت... بەڵام میری خەیاڵ دەتەوێت چی لێبکەیت؟». بە شانازییەوە گووتم «بارۆن مەترسە... سبەی شەو پێتدەڵێم چی لە گوڵ سۆلاف دەکەم».

وامگووت و سەیرێکی بارۆنی پۆرسەلانم کرد. بارۆن دەموچاوێکی پانی ئەسمەری مەیلەو شەرابی هەبوو، سەرێکی زل و چەناگەیەکی پان و قژێکی ماش و برنجی زۆر لوول، گەر لەسەر سەفەری دوبەی نەبووایە ڕانک و چۆغەیەکی سورباوی توکنی لەبەردەکرد، ئەو ڕۆژە بە پشتێنێکی توند ورگی وەها قوماتەکردبوو لەرەی بۆ نەدەکرد. سەیرمکرد و لە دڵی خۆمدا گووتم «ئاه سەرۆک، چۆن ناتوانێت جیاوازی نێوان من و ئەم گەمژەیە ببینیت... چۆن؟ چۆن من و ئەم حەیوانە لای تۆ لەیەک پلەداین؟... چۆن؟». بارۆن خۆشحاڵ بوو کە زوو گەیشتووینەتە دەرەنجام. من پێمگووت «بارۆنی پۆرسەلان، سبەی کتێبێکی زۆر ترسناکت نیشاندەدەم، تێدەگەیت، کتێبێکی زۆر گەورە کە پەیوەندی بەم چیرۆکەوە هەیە».

# تەفسیری من بۆ چیرۆکی پادشا و شاعیر
# ماجیدی گوڵ سۆلاڤ ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤

ئەو ئێوارەیە وەک ئێوارەکانی دی چووم بۆ نوێمیران، لە ڕۆژانی دی پتر خۆم ڕازاندەوە، ئاسایی و پڕ ویقار ڕۆیشتم. نەکەس هاتە ڕێگام و نە هەستمکرد کەسێک چاوەدێریمدەکات. چیرۆکی تۆپێکی ئەفسوناویم بۆ کوڕەکەی بارۆنی غەم گێڕایەوە کە دەبێت بە هاوڕێی منداڵێکی چکۆلانە و وادەکات هیچ یارییەک نەدۆڕێنێت. بۆ کچە خرپنەکەی بارۆنی بەزودوگ حیکایەتی کیژێکی ژیکەڵەم دروستکرد کە شەوان لەگەڵ مانگدا قسەدەکات و باسی ئەو چۆلەکانەی لێدەپرسێت کە لەسەر ئەستێرەکانی تر دەژین. کاتێک لە گەشتەکەمدا گەیشتمە ماڵی بارۆنی مەدەنی لەبری سێوانی چکۆلانە تیشکان لە ژوورەکەی ئەودا لەسەر جێگای خەوتنەکەی ئەو دانیشتبوو. هەستمکرد بەر لە گەیشتنی من تیشکان گریاوە، لە چاوە سیحراوی و کاڵەکانیدا شتێکی تاریک و ناسروشتیم خوێندەوە. ماکسییەکی تەنکی سەوزی لەبەردابوو، یەخەی ماکسییەکەی وەها کرابووەوە بەشێکی زۆری ستیانەکەی دیاربوو، وەک بە ئەنقەست بڕیبێتی و ترنجاندبێتی وەهابوو. بە ئەسپایی گوتی «حەزمدەکرد نەهاتبایتایە». بێئەوەی لە هیچ تێبگەم بە هێمنی پرسیم «بۆ؟ چی بووە؟ ئەی سێوان لە کوێیە؟». من ئەو منداڵانەم لە هەموو کەسی دونیا خۆشتردەویست. تیشکان زۆر بە ئەسپایی گوتی «کوڕی باش دەمبووریت؟». وایگووت و بێئەوەی بواری هیچ قسەیەکی تر بدات، بەدەنگێکی کچانەی تیژ کەوتە هاوارکردن، هاوارێکی درێژ و بەرز و زیقن و نەبڕاوە، هاواری ئافرەتێک یەکێک پەلاماریبدات، من وەک بت لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستام و سەیرمدەکرد، نەمدەزانی دەبێت چی بکەم یان چی بڵێم.

ئەو دەستی بە گوێچکەکانی خۆیەوە گرتبوو و دەیقیژاند. دەیقیژاند و سەیریدەکردم، دەیقیژاند و تینی دەدایە خۆی تا دەنگی بەرزتر دەربێت. هەستمکرد هاوارەکانی لە هەموو نوێمیراندا دەنگدەدەنەوە، قریشکەکانی لە قریشکەی گیاندارێکی بریندارەدەچوو بە دارستانێکی تاریکدا ڕابکات، وەک بیەوێت باشتر و جوانتر شتەکان ببەزمێنێت بە دەم هاوار و زریکەوە دەستیبرد و زیاتر یەخەی کراسەکەی دادڕی. من تا چەندین هەفتە دواتریش لەسەر دەنگی ئەو قریشکە ترسناکەی ئەو بە ئاگادەهاتمەوە کە شەو و ڕۆژ لە گوێمدا دەزرنگایەوە. هاورێ لەگەڵ دەنگی هاوارەکانی ئەودا گوێم لە دەنگی چەند پیاوێک بوو لە پلەکانەوە سەرکەوتن... خەڵکێک بە تەپەتەپ و هەنگاوە خێراکانیاندا دیاربوو دەیانەوێت بەدەم قریشکەکانەوە بێن. لە شوێنی خۆم وەستام و زەردەخەنەیەکم گرت و گووتم «عەزیزم ئەگەر تۆزێک سووکتریش بقیژێنێت هەر گوێیان لێتە».

لەو ساتەدا دەرگاکە کرایەوە و بارۆنی مەدەنی و میری گەنمەشامی هاتنە ژوورێ، دوو پاسەوانیشیان لەگەڵدابوو. هەر دوو بارۆنەکە ویستیان خۆیان واپیشانبدەن کە پەشۆکاون، تیشکان وەک شەرەفی خۆی داپۆشێت، بەرۆکی داپۆشیو و خۆی گرمۆڵەکرد و بە دەنگێکی نوسا و گڕ گووتی « پەلامارمدەدات... ئەو کوررە پەلامارمدەدات... ئەو». بارۆنی مەدەنی یەکەم زلەی لێدام و گووتی «سەگ»، پاڵێکی دی پێوەنام و گووتی «سەگ کوڕی سەگ».

ئەو چەند سەعاتەی دواتر تاریکترین ساتەکانی ژیانی من بوون. پاسەوانەکانی بارۆن لە ناو ژوورەکەدا چەندجارێک بە تفەنگەکانیان کێشایان بەسەرمدا، چەندجارێک کەوتم و هەستامەوە، بارۆنی گەنمەشامی قژی ڕاکێشام و لەسەریەک چەندین جار سەری دام بە دیوارەکاندا، دووجار بارۆنی مەدەنی شەقی لە ئەژنۆم هەڵدا، دواتر پەلبەستیانکردم و بە قۆڵ بەستراوی منیان برد بۆ ئاسایشی نوێمیران. لە ڕێگا، بە

زامـداری و سـیپاڵی خوێناوییـەوە بـە کێشـیانکردم، گێـژ و بریـنـدار قـژم هاتبـووە سـەرچاوم و دەمنرکانـد. هەسـتمکرد هەمـوو منداڵانـی نوێمیـران لـە پەنجەرەکانـەوە سـەیرمدەکەن، هەسـتمکرد ژنانـی نوێمیـران لەبـەر دەرگاکان سـەیرمدەکەن و دەڵێـن «خۆیەتـی... نەوجەوانـی چینییـە... ئـەوە...». لـەو ماوەیـەدا هیچـم نەگـووت، دڵنیابـووم بەجۆرێـک لـە گەمـارۆدام دەربـازم نییـە. شـەوی یەکـەم لـە ئاسایشـی نوێمیـران بەسـەرو ڕوخسـاری خوێناوییـەوە لەسـەر بەتانییەکـی تەنـک خەوتـم و خـەوم بـەوەوە بینـی کـە ئیتـر هەمـوو ڕۆژێـک بەیانیـان دەمکـوژن و شـەو بـەر لـە خەوتـن زیندوومدەکەنـەوە، دەمکـوژن و زیندوومدەکەنـەوە، دەمکـوژن و زیندوومدەکەنـەوە. خەومبینـی بارۆنێـک کـە ڕوخسـاری هەمـوو بارۆنەکانـی تێدابـوو سـەیری نێوچاوانـم دەکات و خەونەکانـم دەنوسـێتەوە، یەکەیەکـە شـارە خەیاڵییەکانـی ناو سـەرم دەنوسـێتەوە، دەمویسـت شـتێکبکەم بـارۆن شـارە خەیاڵییەکانـی نـاو سـەرم نەبینێـت، بەدرێژایـی شـەو خەبـەرم دەبـووەوە و هێنـدەی چـاوم لێکدەنـا ئـەو خەونـەم دەبینییـەوە.

لـە بەیانیـدا بەرچاییەکـی بچوکیـان دامـێ و کەمێـک دەموچاویـان بـۆ سـڕیم و پـاش دوو سـەعات منیـان بـرد بـۆ ژوورێکـی دی لـە نهۆمـی سـەرەوە، بارۆنـی خەیـاڵ لـەوێ چاوەڕوانیدەکـردم. بـارۆن بەسەرزەنشـتێکەوە سـەیریکردم و گووتـی «بـۆ ماجیـدی گـوڵ سـۆلاف، بـۆ... چـۆن ئاوهـا ئاسـان دەسـت بـۆ ناموسـی خەڵـک دەبەیـت، چـۆن دەسـت بـۆ جوانییـەک دەبەیـت کـە موڵکـی تـۆ نییـە». بینینـی بارۆنـی خەیـاڵ کەمێـک ئارامیکردمـەوە، پێموابـوو لەگـەڵ بارۆنـدا دەتوانـم ڕوون و ڕاسـتەوخۆتر قسـەبکەم. لەسـەر کورسـییەکی چکۆلانـەی ئاسـن دانیشـتم و گووتـم «بارۆن، مـن دەسـتم بـۆ هیـچ شـتێک نەبـردوە، تـۆ خـۆت بـاش دەزانیـت کـە هەمـوو شـتێک بەپێـی ئـەو نەخشـەیە دەڕوات کـە بەڕێزتـان داتاننـاوە... تـۆ یـان هـەر یەکێکـی دی لـە میـرەکان لـە پشـت کـۆی پیلانەکەوەن...ئێـوە ئـەو

کچەتـان ناچارکـرد وابـکات... بـۆ بـارۆن... بـۆ؟ بـۆ ڕێگایەکـی تۆزێـک جوانتـر و شـەریفانەترت نەگـرت؟». سـەیریکردم و بـە خەنـدەی پیاوێکـەوە لـە هێـزی خـۆی دڵنیابێـت گـوتـی «گـوڵ سـۆلاف، مـن پیاوێکـی درۆزن نیـم، لـە حیزبـدا دوو قوتابخانـە هەیـە، یەکێکیـان بـاوەڕی بـە کوشـتنی بێدەنگـە، بـاوەڕی بەوەیـە بـە بێدەنگـی نێچیـری خـۆی بکوژێـت و خـۆی نـەکات بـە سـاحێبی، گـەر بۆیکـرا تـا دەتوانێـت لەسـەر جەنازەکەشـی دەگـری، ئـەوی تریـان بـاوەڕی بەوەیـە ئابـڕووی قوربانییەکانـی بەرێـت و لێیانگـەڕێ بـە سەرشـۆڕی بژیـن و تـا مـاون بـە عەیـب و عارێکـەوە بتلێنـەوە کـە لـە دەسـتی دەربازنابـن، تـازە تـۆ بـۆ هـەر کوێیـەک بڕۆیـت، بچیتـە سـەر هـەر ئیشـێک، ژنبهێنیـت و منداڵیشـت بێـت، خەڵکـی کاتێـک ناوت دەهێنن باسـی ئەمشـەوی ڕیسـوابوونەت دەکـەن. حیـزب بەلایـەوە گرنگـە ئابـڕوی کـەس لـە ئابـڕوی ئـەو پاکترنەبێـت، ئەمـە قانونـە، هـەر گەمژەیـەک لـەم وڵاتـەدا بـژی و لەمـە تێنـەگات ئیشـی ئاڵـۆز و کاری بەگرێیـە... مـن تاکـە کەسـێکم لـە حیزبـدا خـۆم تـەواو سـاغ نەکردۆتـەوە، جارێـک سـەر بـەم قوتابخانەیـەم و جارێکـی دیـش سـەر بـەوی تریانـم. نازانـم گـوڵ سـۆلاف، بەڕاسـتی حەزدەکـەم تـۆ بژیـت، تـۆ گەنجیـت، زۆر لـە مـن و غەزەلنـوس گەنجتریـت... گـەر نەچنـە بنکڵێشـەی سـەرۆک، گـەر خەڵکانـی لـە مـن بەرزتـر و کاریگەتـر قسـە لـە مەسـەلەکەدا نەکـەن ناهێڵـم بتکـوژن، مـن حەزدەکـەم تـۆ بژیـت، پیاوێکـی بێئابـڕوو لـە پیاوێکـی مـردوو باشـترە». قسـەکانی تێکەڵەیەکبـوون لـە گاڵتـە پێکـردن و ئازاردان، لـە ڕوونکردنـەوە و ترسـاندن. ئێسـتێکی کـرد و کەمێـک دەموچـاوی گـۆڕاو هەناسـەیەکی غەمگینـی هەڵکێشـا و گـوتـی « بـە یاسـای پاراسـتنی نامـوس و بـە تۆمەتـی دەسـتدرێژی بـۆ سـەر شـەرەف حوکمتـدەدەن... سـاڵانێکی دووردرێـژ لـە بەندیخانەدەبیـت، بـە هەرحـاڵ هێشـتا خۆشـبەختیت، ئێسـتا بەندیخانـەکان وەک جـاران نەمـاون، پاکتـر و باشـترن. بـەڵام ئاسـان نییـە، دەزانـم زۆر بیـری منداڵـە کوێـرەکان دەکەیت...

زۆر». بەلایەکی چاو سەیریکردم و گووتی «بارۆنەکان لێت نابوورن... قەت لێت نابوورن». بە ئەسپایی گووتم «دەتوانم بزانم بارۆنەکان لە چی تورەن؟». بەسەرسامییەوە سەیریکردم و گووتی «پێتوایە بتوانیت لە ناوەڕاستی نوێمیراندا لاشەیەک دەربهێنیت و بیدەیت بە کۆڵتدا و بیبەیتە دەرەوە و کەس نەزانێت؟ تۆ چۆن بیردەکەیتەوە؟». من سەیرمکرد و گووتم «بەڵام تۆ لەسەر ئەوە لە من زویرنیت، دڵنیام... ئەو لاشەیە پەیوەندی بە تۆوە نییە». کەمێک بێدەنگبوو و وەک یەکێک پرسیارێکی ئاسایی لە دۆستێکی خۆی بکات گووتی «ماجیدی گوڵ سۆلاف، ئەو لاشەیەت بۆچی بوو؟». بە بێباکی و بێئەوەی سەیریبکەم گووتم «بۆ ئەوەی لەگەڵ نەوجەوانی چینیدا لە تەنیشت یەکەوە بیاننێژم». بە دەنگێکی پڕ فزوڵ و سەرسامییەوە پرسی «بەڵام تۆ کارت بە نەوجەوانی چینی چییە؟ تۆ چ کارت بە جۆرە کەسێکی وەها ژنباز و سەرەڕۆ هەیە؟ تێناگەم؟ تۆ کەی لەو جۆرە کوڕانەیت». سەیرمکرد و گووتم «جەنابی بارۆن نزیکی هەشت مانگ لەوەوبەر کە لاشەکەی موراد جەمیلم لە قەراغ شار دۆزییەوە بڕیارمدا شتێک بۆ ئەو مردووە بکەم... مردووەکان خەڵکی بێکەسن، ویستم شتێک بکەم دڵی خۆشبێت و هەست بە بێکەسی نەکات». بارۆن وەک تکا لە هاوڕێیەکی بکات گووتی «ماجید لاشەکەتان لە کوێ ناشت، حەزدەکەم بمبەیتە سەر لاشەکان». گووتم «بارۆن ناتوانیت بچیتە سەر لاشەکان، تا دونیادونیابێت ناتوانیت بچیتە سەر لاشەکان، لەبەرئەوەی لە باغێکی دووردان، باغێک تەنیا غەزەل دەرگاکانی دەکاتەوە... هیچ شتێک جگە لە غەزەل دەرگاکانی ناکاتەوە، جگە لە غەزەل کلیلی تری نییە... مرۆڤ دەبێت بتوانێت بە ناو گوڵزار و لالەزارەکانی شیعردا بڕوات ئەوسا دەگاتە ئەوێ». بە تووڕەییەوە سەیریکردم و گووتی «دواجار ئەوە ئومێدی تۆ و غەزەلنوسە باغێکتان هەبێت بە ئێمە نەگیرێت... وانییە... ئەوە ئومێدی ئێوەیە».

دەستێکی نازکم بەسەر جێ برینەکانمدا هێنا و گووتم «هەندێک باغ هەیە خۆی ناگیرێت، کلیلی خۆی هەیە، کلیلی هیچ باغێک بۆ ئەوی دی نابێت، جەنابی بارۆن باغەکانی دونیا لە یەک ناچن، بەڵام تۆ دەتەوێت کلیلێک بدۆزیتەوە بۆ هەموو باغێک دەستبدات... دەتەوێت باغی حەوشەکەی خۆتان و باغەکانی غەزەلیش وەک یەک تەماشابکەیت، ئەوە نابێت». بە ئارامییەوە بەرابەرم دانیشت و گووتی «تا گوێم لەو چیرۆکانەت نەبوو کە بۆ تیشکانت کردبوو، نەمدەزانی چ پیاوێکی ترسناکیت، دوێنێ شەو بەوردی گوێم لە هەر دوو چیرۆکەکەت گرتەوە، گوێم لە هەر دوو چیرۆکەکەت گرتەوە، هەستدەکەم تۆ ترسناکترین پیاوێکی ڕووی لە نوێمیران کردبێت. هەتا لە نەوجەوانی چینیش ترسناکتریت... زۆر لەو ترسناکتریت». بەزەردەخەنەی پیاوێکی دۆڕاوەوە گووتم «ئەها هەتا چیرۆکەکانی منیشتان تۆمارکردوە... پێدەچێت زۆر ورد و باش ئیشبکەیت بارۆن؟»». گووتی «بەس خودا دەزانێت تۆ چەند حیکایەتی ترسناکت بۆ منداڵانی نوێمیران کردوە، لەو جۆرە حیکایەتانەی تا هەتاهەتایە لە خەیاڵیاندا دەمێنێتەوە، حیکایەتی ئەو پادشا و ئەمیر و سوڵتانانەی ناتوانن مەخلوقاتە خەیاڵییەکان دەستەمۆبکەن... من لە یەکەم ڕۆژەوە دەمزانی تۆ بە نیازێکی پاک نەهاتوویت، بەڵام نەمدەزانی چی دەکەیت، زۆر درەنگ تێگەیشتم... حیکایەتەکانی تۆ لە حیکایەتی سەر ئەو خاولییە نەگریسە بەدترن، ئەو حیکایەتەی ژیانی منی تێکداوە، ئەو حیکایەتەی ناگەمە دوا مانای». بارۆن خاولییەکی ئاوریشمی لە دۆڵابێکی تایبەتی دەرهێنا و خستییە بەردەمم، شاکارێکی سەیر و بێوێنە بوو، بە هێمنی و بە وردی چیرۆکی نەخش و نیگارەکانی گێڕایەوە و گووتی «گوڵ سۆلاف... تۆ چۆن لەم حیکایەتە تێدەگەیت؟»». بەوردی سەیری هەردوو دیوی خاولییەکەم کرد، شاکارێکی ئێجگار قەشەنگی چنین و نیگار و خەیاڵ بوو. گووتم «بڵێم چی، جەنابی بارۆن، من لەم

شتانەدا زۆر زیرەک و کارامە نیم... ئەمە دەستکردی خەیاڵچنێک و نەقاشێکی بلیمەتە کە بەس خودا خۆی دەزانێت لە چ سەردەمێکدا ژیاوە... نازانم بڵێم چی... واتێدەگەم ئەم دوو نیگارە، وێنەی دوو دونیای جیاوازن، من کۆی حیکایەتەکە بە جۆرێکی تر دەبینم، پێموایە پادشای سەرەفراز لە بنەڕەتدا نەهاتووە بۆ داگیرکردنی ئەو شارە ڕاستەقینەیە، لابردنی پادشا لەسەر عەرشەکەی نیاز و مەبەستی ئەو نەبووە، بەڵکو تەواوی لەشکرکێشییەکەی بۆ داگیرکردنی شاری خەیاڵی ناو ڕۆحی شاعیرەکەیە. من وادەزانم کە پادشاهی مەنسور و سەروەر کاتێک چۆتە ناو شاری پادشاوە گەلەک سارد و خۆڵەمێشی و بێڕەنگ بینیوێتی. لە ڕۆحی خۆیدا گووتوویێتی مرۆڤ گەر پادشای جۆرە شارێکی وەها بێ خەیاڵ و بێ جوانیش بێت چییە؟. ئیدی گووتوویێتی ئەی شاعیری برام، من لە دوورەوە، بەسەر هەزاران گوند و کێڵگە و باغی ڕاستەقینەدا هاتووم، بۆ ئەوەی بگەمە ئەم شارە خەیاڵییەی ناو ڕۆحی تۆ، بەلەشکری گەورەی خۆم، ئەم شورا بەردین و دیوارە بەرزانەم شکاند بۆ ئەوەی بگەمە بەر دەرگای ئەم باغە خەیاڵییەی تۆ، ئێستا گەر تۆ دەرگای خەیاڵی خۆتم بۆبکەیتەوە واز لەم شارە دەهێنم، واز لەم کوچە و کۆڵانە ناچیز و غەمگینانە دەهێنم، با پادشا بڕوات و هەر پادشای ئەو عەرشە سارد و سڕ و بێڕۆحەی خۆی بێت. پێموایە شاعیر دەرگای باغە خەیاڵییەکەی خۆی کردۆتەوە، هەر دوو شاعیرەکە پێکەوە چوونەتە ناو ئەو باغە و ئیدی نەهاتوونەتە دەرێ... حیکایەتی خاولییەکە وا دەڵێت... ئەم دیوەیان گەشتی پادشایە لە شاری بێڕۆحی پادشاکاندا، ئەم دیوەشیان گەشتی پادشایە لە شاری پڕ ڕەنگی شاعیراندا». بارۆن بە تێڕامانێکی سەیرەوە سەیری چاوی کردم و گووتی «تەفسیرێکی سەیرە... لە هیچ یەک لە تەفسیرەکانی تر ناچێت، بەڵام گوڵ سۆلاف پێمبڵێ بەڕای تۆ بۆ ئەم پادشایە توانیوێتی بچێتە ناو ئەم دونیا

جوانەی ناو خەیاڵی شاعیرە دیلەکەوە، بەڵام ئەو کچە میرزادەیەی ناو حیکایەتەکەی تۆ کە دەیویست ئەو بولبولە خەیاڵییە دەنگخۆشە بگرێت، ئەو مەیتەرە شارەزایەی دەیویست ئەو ئەسپە سپییە خەیاڵییە دەستەمۆبکات نەیانتوانی؟ پێمبڵێ بۆ؟». من کەمێک وەستام و گووتم «لەبەرئەوەی پادشای سەرکەوتوو خۆی شاعیربوو، کۆی ئەم خاولییە حیکایەتی شەڕێکی ناو خەیاڵی پادشا خۆیەتی... ئەمە سەرکەوتنی شاعیرە بەسەر پادشای ناو پادشادا، پادشا دەتوانێت بە ئاسانی بچێتە ناو باغی شاعیرەوە چونکە پادشای لە خۆیدا کوشت، مرۆڤ ناتوانێت لە یەککاتدا پادشاش بێت و شاعیریش بێت، پادشا لەڕاستیدا پادشای غەریم و دوژمنی نەکوشتووە، بەڵکو پادشاکەی ناو ڕۆحی خۆی کوشتووە... ئەوەیە حیکایەتەکە... من وا تێیدەگەم... سەیرکە جەنابی بارۆن ئەم هەموو باغ و ڕەنگ و نیگارەی لە دیوی دووەمی خاولییەکەدا هەیە، ئەم هەموو جوانییەی کە دەیبینیت، تەنیا ئەوانە دەیگەنێ کە شاعیر لە ڕۆحیاندا بەسەر پادشادا سەردەکەوێت». نەمدەزانی بەو تەفسیرەم جارێکی تر شتەکان هێندەی تر دەشێوێنم و ئاشووبێکی کوشندە دەنێمەوە. بارۆن وەک پیاوێک بیر لە شتێکی زۆر ترسناک بکاتەوە، دەستی گرتبوو بە دەمییەوە و گووتی «کەواتە تۆ لەو باوەڕەدایت لەم چیرۆکەدا شاعیر پادشای کوشتووە، قەناعەتت وایە کە دواجار شاعیران سەرکەوتوون... وانییە؟». نیگایەکی سادە و بێگوناهم لە خاولییە سەیرەکە گرت و گووتم «بەڵێ، جەنابی بارۆن». گووتی «واتێدەگەیت کە شاعیر و پادشاش ناتوانن پێکەوە بژین؟». بێئەوەی بزانم بارۆن مەبەستی چییە گووتم «بەڵێ، جەنابی بارۆن واتێدەگەم. ڕەنگە بتوانن بەیەکەوە بژین، بەڵام ناتوانن بەیەکەوە بچنە یەک باغەوە». بە ژوورەکەدا هەندێک ئەمسەرەوسەری کرد و گووتی «هم، ناشتوانن پێکەوە یەک خەو ببینن؟». گووتم «هەرگیز، جەنابی بارۆن...

هەرگیز... ناتوانن یەک خەو ببینن، هەر یەکەیان تا کۆتایی خەونێکی جیاواز دەبینێت». تۆزێک زیاتر وەستاو گووتی « وەک ئەو کیژەمیرزادەیەی کە هەرگیز ناتوانێت دەستی بگاتە ئەو باڵندە دەنگخۆشە خەیاڵییە؟». چۆن وەڵامی منداڵەکانی نوێمیرانم دەدایەوە، سووک و سادە گووتم «بەڵێ جەنابی بارۆن وەکو ئەو کیژەمیرە دەستی ناگاتە باڵندە دەنگ خۆشەکە». بە غەمگینییەوە گووتی «تۆ پێتوایە ئەو دوو جیهانە، دوو جیهانی تەواو جیاوازن و بەیەک ناگەن؟». گووتم «دوو جیهانی جیاوازن و بەیەک ناگەن».

«هەرگیز»

«جەنابی بارۆن هەرگیز».

بە ترسێکەوە سەیریکردم و گووتی «ماجیدی گوڵ سۆلاف، ئەی بۆ ئەو ئەسپبازە بەدبەختە لە چیرۆکەکەی تۆدا دواجار ئەو ئەسپەی کوشت؟ بۆ؟». گووتم «لەبەرئەوەی نەیتوانی دەستەمۆیبکات، نەشیدەتوانی لە خولیاو خەیاڵی خۆی دەریبکات. دەبوو یان خۆی بکوشتبایە یان ئەو ئەسپە». بە حەسرەتەوە لێیپرسیم «ئەی بۆ لێنەگەڕایت ئەو ئەسپە سپییە سەرکەوێت، بۆ لێنەگەڕایت؟». دەستێکم خستە سەر برینەکەی ناوچاوانم و گووتم «ئاخ... لەبەرئەوەی زۆربەی ئەو مرۆڤانەی دەگەنە پلەیەکی باڵا لە هێز و شکۆ و جەلال هەر کەسێکیان بۆ دەستەمۆنەکرێت دەیکوژن... هەندێک هەن وەک ئەمیرە ناسک و نازوکییەکە لێدەگەڕێن بمرن و دەست بۆ وێرانکردنی ژیانی خەڵکی تر نابەن، هەندێکی دیکەش وەک ئەو مەیتەرە لێزان و ئەسپناسە بەرگەی شکست ناگرن و بە مردن چیرۆکەکە لە خەیاڵی خۆیان و خەڵکیدا دەسڕنەوە». لە ناکاو بە نیگایەکی توند و نائاساییەوە سەیریکردم و گووتی «ئەو کاتەی ئەو دوو چیرۆکەت بۆ تیشکان گێڕایەوە، دەتزانی ئەو چیرۆکانە دەگەنەوە لای من؟». سەرو ڕوخساری بارۆنم گەلەک گەرم و نائاسایی هاتە بەرچاو،

پێدەچوو بارۆن تایەکی قورسی هەبێت گووتم «جەنابی بارۆن دەمزانی دەگاتە بارۆنەکان، بەڵام نەمدەزانی دەگاتە کێ». بە تووڕەییەوە گووتی «ویستت بڵێیت ناتوانین ئەو باغە خەیاڵیانە ببینین کە لە ڕۆحتدایە، ناتوانین دەستەمۆتبکەین، ناتوانین لە جیهانی تۆ نزیکببینەوە، تۆ لە دونیایەک و ئێمە لە دونیایەکی تردایـن؟»». بێئەوەی دوودڵبم گووتم «ئەگەرچی من باغی خەیاڵیم نییە وەک جەنابتان دەفەرموون. بەڵام بەڵێ، جەنابی بارۆن... بەڵێ، ویستم وابڵێم».

## مافوورێك قەشەنگتر لە هەموو مافوورەکانی دونیا
## هەژدەو نۆزدەی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤

لە شەوی هەژدەی یانزدەدا کۆمەڵێک چەکدار بە کۆمەکی شەهرەیاری شوشە کە ئەودیو بەربەستەکانی دەبینی پەناگای یاقووتی مەمەدیان دۆزییەوە. ئەو شەوەش وەک شەوانی دی، عەتاریان لەگەڵدابوو. سەعات دەی شەو نزیکی دە چەکداری بێڕەحم لە دڵڕەقترین پیاوانی سپیرەز بەدوای یاقووتی مەمەددا خۆیان کرد بە ماڵی تریفە یابەحریدا. عەتار دوای ماندووبوونێکی زۆر، دوای لەیەکدانی تۆڕێکی ئاڵۆز لە زانیاری گەیشتە ئەو بڕوایەی ئەم ماڵە شوێنی نیشتەجێ و خۆشاردنەوەی یاقووتی مەمەدە. پیاوەکانی سپیرەز وەها خۆیان پڕچەک کردبوو، لە ڕەنگی فیشەک و لە بریقەی چەکی قورسدا دەبریسکانەوە، هەر کەس بیدیبانایە دەیگووت ئەمانە دەچن بۆ داگیرکردنی شارێکی عاسی کە پێشتر بە گەلەک قارەمانی گەورە نەگیراوە. بەر لەوەی بچنە ژوورێ، کوڕە چاو جوانەکە گووتی لەوێن، من دەیانبینم. کوڕانی سپیرەز بێئەوەی لە دەرگا بدەن بەسەر دیوارەکاندا بازیاندا و چوونە

حەوشـەکەوە. دە چەکـداری بـە قیافـەت بـوون، هەمـوو ماڵەکـە ژوور بـە ژوور گـەڕان، دەرگای ژێـر زەمینەکەیـان شـکاند و چوونـە خـوارێ، قاتـی سـەرەوە گـەڕان و چوونـە هەورەبانەکـە بـەڵام کەسـیان نەبینـی. ماڵێکـی چۆڵبـوو، خاڵـی لـە هـەر ڕۆحلەبەرێـک. وسـوو ئاغـا کـە سەردەسـتەی چەکدارەکان بـوو، گەڕایـەوە بـۆ لای عەتـار و کوڕە چاوشوشـەکەی و گووتـی «عەتـار تـۆ ئێمـەت هێناوەتـە سـەر ماڵێکـی خاڵـی، ماڵێـک بەشـەری تێـدا نییە. ئێمـەت خسـتۆتە سـەر کەڵکەڵەیەکـی بـۆش و بـەم شـەوە بـە خـۆڕا فریوتداویـن». شـەهرەیار جارێکـی دی لـە تاریکیـدا نیـگای تیژکـرد و گووتـی «لەوێـن، جەنابـی وسـوو ئاغـا لەوێـن، مـن دەیانبینـم خەریکـی چنینـن». وسـوو ئاغـا دیسـان گەڕایـەوە نێـو ماڵەکـە و ژوور بـە ژوور و نهـۆم نهـۆم سـەرتاپای پشـکنی، نـە سـێبەری ئادەمیزادێکـی بینـی و نەسـرتە و ورتـەی مەخلوقێکیـش، بێدەنگییەکـی قـووڵ و سـیحراوی و سـەنگین نەبێـت هیـچ شـتێکی دی نەبـوو، بێدەنگییـەک وسـوو ئاغـا و چەکـدارە نائومێدەکانـی ترسـاند. ئەمجـارە بـە توڕەییـەوە گەڕایـەوە و گووتـی «هـا شـەهرەیاری شوشـە، وسـوو ئاغـا کەسـێک نییـە تـۆ قەشـمەری پێبکەیـت، ئـەو ماڵـە چـۆڵ و هۆڵـە...وەرە خـۆت ببینـە، وەرەو خـۆت پێمبڵـێ کامـەن ئـەو ژنانـەی تـۆ دەیانبینیـت؟». کوڕەکـە لـە ماشـێنەکەی عەتـار دابـەزی و لەگـەڵ وسـوو ئاغـادا ڕۆیشـت. سـەرەتا هەمـوو شـتێک ئاساییبوو، بـەڵام کاتێـک پێـی خسـتە نـاو ماڵەکـەوە هەسـتیکرد شـنەبایەکی فێنـک بـەرەو ڕووی دێـت، هەسـتی بەبـۆ گـوڵاوی لالەزارێکـی بەهـار کـرد لەگەڵیـدا، گوێـی لـە دەنگـی گۆرانییەکـی خـۆش بـوو لـە هەمـوو ژوورەکانـدا دەبیسـترا، گۆرانییەکـی کـز وەک دەنگـی فریشـتەیەک بێـت و لـە شـوێنێکی زۆر دووری مەلەکوتـەوە دابەزێتەخـوارێ، هەسـتیکرد سـێبەری گـەڵای سـەوز دەبینێـت و بـۆی گوڵـی گەورەگـەورە دەچێـت بەسـەریدا. هەسـتیکرد وسـوو ئاغـا و چەکدارەکانـی نـە بۆنـی ئـەو باغەدەکـەن و نـە دەنگـی گۆرانییەکـەش دەبیسـتن. کوڕەکـە

وەک ئەو بۆن لالەزارە گێژیکردبێت، دەستی خستە سەر ناوچاوانی و کەمێک پاڵیدا بە یەکێک لە دیوارەکانەوە. لە ناکاو تووشی جۆرە خرۆشانێکی ڕۆح و مەستییەکی کتوپڕ هاتبوو. کەمێک وەستا و سەیرێکی وسوو ئاغاو چەکدارەکانی کرد و بە دەنگێکی نەخۆش و ماندوو گووتی بابڕۆین. بە چەند هەنگاوێکی خاو بردنی بۆ هەورەبانەکە، لەوێش هەمان بۆن و هەمان شنەبای فێنکی هەست پێکرد، چەند جارێک ئەو بۆنەی هەڵمژی و ڕووی بۆ ئەو شنەبا فێنکە بەرزکردەوە و لە دوای هەمووانەوە بەرەو ژێرزەمینی گەورەی ئەو ماڵە دابەزی. لەوێدا ئەو دیمەنە سەیر و سیحراوییەی بینی کە ئیدی تامردن لە یادی ناچێتەوە و لە خەیاڵیدا دەژی، دیمەنی باغێکی ئەفسوناوی کە کۆمەڵێک خانمی ئێجگار جوان لە ناوەڕاستیدا خەریکی چنینی مافوورێکی گەورەن، مافوورێک لە هەزارەها ڕەنگی نەبینراو و تاڵی ورشەداری خەیاڵ دەچنرا، مافوورێک هەر ساتە و بە ڕەنگێک و هەر چرکەیەی بە نەخشێک دەدرەوشایەوە، لە هەموو بستێکیدا نیگاری باغی بەرین و وێنەی باڵندەی وەها ڕەنگین دەبینرا کە پێشتر ئەو کوڕە چاوشوشەیە لە خەونیشدا نەیبینیبوون. هەستیکرد باڵندەکانی سەر ئەو مافوورە دەفڕن، ئەسپسوارەکانی غاردەدەن، گوڵەکانی دەمدەکەنەوە و دەبنەوە بە شکۆفە، بینی خۆرەکانی سەر ئەو فەرشە هەڵدێن و ئاوادەبن، مانگەکانی گەورەدەبن و بچوکدەبنەوە، هەورەکانی دێن و تێدەپەڕن و دەبارن، بینی با هەڵدەکات و گەردەلوول یاری بە درەختەکانی سەر مافوورەکە دەکات. هەزاران باغ و کێڵگەی لەسەر ئەو فەرشەبینی، هەزاران تاووس، کۆتر، ئادەمیزاد، کەروێشک. ئەو فریشتە شینانەی بینی کە لەسەر ڕۆخی دەریاچەکان سەیری گوڵ دەکەن، ئەو منداڵە پاکانەی لە جۆلانێی گەلادا خەوتوون، بای بینی بەرەو ڕووی دێت، ڕۆشنی و شەبەنگی ئەو شاعیرانەی بینی کە لە ناو فەرشەکەدا بیریاندەکردەوە، ئەو ئەندازیارە بچوکانەی بینی شاری

خەیاڵی و نەبینراویان دروستدەکرد. ئەو کڵێسە گەورانەی کە نوقمی نورن و ئەو منارە بەرزانەی ستونی ڕۆشناین. شەهریاری شوشە پێشتر لە ژیانیدا شتێکی وەها سەیر و سیحراوی نەبینیبوو، نەیدەزانی سەیری چیبکات و سەیری کوێ بکات. بۆ ئێستێک چاوی لە فەرشەکەوە بەرەو قاڵیچنە نەشمیلەکان گواستەوە، هەستیکرد ژنەکان هەموو سەیریدەکەن و زەردەخەنەی بۆ دەگرن. جوانترین کۆمەڵە ژنێکی دونیابوون، مەخلوقاتی سپی و ڕوون و تەنک وەک سەرتاپای وجودیان لە تەمێکی تەنک بێت، ئێستا دڵنیابوو ئەو نەبێت هیچ یەک لە وسووئاغا و چەکدارەکانی ئەو تەونە ئەفسوناوییە گەورەیە نابینن. شەهرەیار نەیزانی چیبکات، بە ئەسپایی گەڕایە دواوە و گووتی «وسوو ئاغا بمبورە... بمبورە... من بە هەڵەداچووم... شتێک لە چاومدا، شتێک لە خەیاڵمدا تەواو نییە». بە چەند هەنگاوێکی سووک پاشەوپاش گەڕایە دواوە. لەسەر پلەکان وەک تلیاکی خواردبێت و ئەفیونی کێشابێت، گێژ و خەستە وەستا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، چەند ساڵ بوو لەگەڵ عەتاردا کاریدەکرد و پێشتر جۆرەهەستی وەها نەژیابوو. وسوو ئاغا وەک سوسەی شتێکی نائاسایی کردبێت، گووتی «ها شوشە. بۆ وا گێژیت... ها... بڵێ... نەکا شتێک ببینیت کە ئێمە نایبینین». شوشە دەستێکی خستە سەرنێوچاوانی و گووتی «نا ئاغام... هێند هەیە، هەموو ساڵێک لەم وەرزەدا، کاتێک زستان نزیکدەبێتەوە، خەیاڵاتی خراپم بۆ دێت، شتەکان بە ڕێک و ڕاستی نابینم». وسوو ئاغا بە خۆی و جامانە زلەکەیەوە سەری بادا و بۆڵەیەکی کرد و لەگەڵ چەکدارەکانیدا سەرکەوتەوە بۆ سەرێ. ئەوە دواهەمین شەوی شەهرەیار بوو لەگەڵ عەتاردا. بینینی ئەو فەرشە ئەفسوناوییە کە وێنەیەکی بچووککراوەی هەموو جوانییەکانی دونیابوو، ژیانی ئەو کوڕەی بۆ هەتاهەتایە گۆڕی. من کاتێک بۆ کۆکردنەوەی زانیاری زیاتر لەسەر ئەم چیرۆکە کەوتمە سۆراغی شەهرەیار، بیستم

دوای هەڵهاتنی لە عەتار، ڕۆیشتووە بۆ باشووری عێراق و لەوێ لەگەڵ ئەمریکییەکاندا کاریکردوە، یەکێک بووە لەوانەی لە تیپی تایبەتی گەڕان و پشکنیندا بەدوای زەرقاوی و ئەبو عومەری بەغدادیدا زۆر چالاک بووە، تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی ئاواتی ئەوەی هەبووە جارێکی تر بگەڕێتەوە و ئەو فەرشە ببینێتەوە، بەڵام لە سەرەتای ساڵی دوو هەزار و شەشدا بەرێکەوت دەکەوێتە ناو کەمینێکی تیرۆریستە سوننەکانەوە و دەستبەجێ لە دوای گرتنی سەریدەبڕن و سەرەکەی لەگەڵ کۆمەڵێک کەللەسەری دیکەدا لە ناو یەکێک لە بێستانە سووتاو و زەردەکانی ناوچەی بەلەددا فڕێدەدەن.

ئەمڕۆ کە سەیری مێژووی شتەکان دەکەین، دەزانین کە سەری بڕدراوی ئەو کوڕە، یەکەم سەرە ئەو مافوورە خەیاڵییەی بینیبێت.

***

ئێوارەی ڕۆژی دوایی تریفە یابەحری بە کراسێکی سپی ناسکەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی غەزەلنوس، کراسێکی وەها قەشەنگ و نەبینراوە پێدەچێت بە خەیاڵ چنرابێت. یەکەمجار لە ژووری منداڵەکاندا دەرکەوت و یەکەیەکە هەموویانی ماچکرد و تێر بە سنگی خۆیەوە نوساندنی، دواتر چوو بۆ لای غەزەلنوس کە لەگەڵ خەیاڵوانی کوڕە گەورەیدا لەسەر تەفسیری بەیتێک شیعر قسەیاندەکرد، خەیاڵوان ئەو کات شازدە ساڵ بوو، منداڵێکی شەرمن و بێدەنگ بوو کە کەس بەتەواوی نەیدەزانی چۆن سەیری جیهان دەکات و چۆن بیر لە دونیا دەکاتەوە. تریفە ماچیکرد و گوتی «خەیاڵوانی گوڵ، من کۆمەڵێک قسەم لەگەڵ غەزەلنوسدا هەیە، مۆڵەتێکی چکۆلەم بدە». کە خەیاڵوان ژوورەکەی چۆڵکرد، غەزەلنوس لە ئازاری فیراقێکی دووردا خەریکبوو دەگریا. تریفە ئەو ڕۆژە لە هەرکاتێکی دیکەی ژیانی خەیاڵیتر و دوورە دەستتر دەردەکەوت،

پێشتر غەزەلنوس وەها ڕۆشن ئەو جوانییە گەورەیەی تیا نەبینیبوو، قژێکی ڕەشی قەترانی و دوو گلێنەی پاک کە پڕبوون لە ڕۆشناییەکی قووڵ. لەو ماوەیەی دوایدا بەدەگمەن قسەیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد، بەڵام پتر یەکتریان خۆشدەویست. جیاواز لە هەر کاتێکی تر دەنگی تریفە یابەحری لەرەیەکی مەلەکوتی و زرینگەیەکی ئاسمانی تێدابوو. غەزەلنوس بە کورتی دوا هەواڵەکانی ماجیدی گوڵ سۆلاقی لە بەندیخانە بۆ گێڕایەوە. تریفە بە دەنگێکی ناسک گووتی «ئەو بارۆنە شێتە... ئەو لە پشت زۆربەی نەگبەتییەکانی ئێمەوەیە، بەڵام غەزەلنوس من بۆیە لێرەم بۆ ئەوەی پێتبڵێم، منیش دەڕۆم. دوێنێ شەو دەبایە هەموو بمرین، ئەوانەی بۆ یاقووتی مەمەد دەگەڕێن، ماڵی ئێمەیان دۆزییەوە، شوێنی یاقووتیان دۆزییەوە. ئیتر من و ژنە بێکەسەکان ناتوانین لەو ماڵەدا بین، بڕیارمانداوە ئاوارەبین، سەرزەمین بگەڕێین، ئەم شارە بگەڕێین. دونیا بگەڕێین. عەتار و مێردە حەسوودەکان و برا دڵپیسەکان لێناگەڕێن بژین». غەزەلنوس وەک گوێی لە قسەکانی ئەو نەبێت گووتی «تریفە بۆ من و تۆ هەرگیز بەیەک ناگەین. بۆ؟». تریفە دەستی خستە سەر دەستی غەزەلنوس و گووتی «غەزەلنوس زۆری ویست تا بگەمە ئەو شوێنەی کە تۆ دەتەوێت، زۆری ویست. من ئێستا لە باغەکانی خەیاڵدام... لەو جێگایەدام کە تۆ دەتەوێت، ئەو شوێنەی هەموو عاشقەکانی تۆ ڕووی تێدەکەن، ئەو شوێنەی هەر مەخلوقێک نەگاتە ئەوێ، ناگاتە قووڵایی دڵی تۆش. عەزیزم من لەوێم... لەو باغە ئەبەدییەدا چاوەڕێتدەکەم. لەو باغانەدا دەتوانین تا هەتاهەتایە پێکەوەبین، غەزەلنوس ئێستا من مافوورێکی خەیاڵی دەچنم کە وەک غەزەلەکانی تۆ جوان و بێسنوورن، باغێکم هەیە لە ڕۆحی من و ڕۆحی ئەو ژنە پەژموردانە چنراوە... ئەو ژنانەی دڵیان پڕە لە نەخشی مردوو، لە بەحری خنکاو، لە نیگاری سیحراوی. غەزەلنوس ئێمە لەو گوڵە

خەوتووانەی ناو دڵمان، لەو باڵندە خەوتووانەی ناو ڕۆحمان مافوورێکی خەیاڵی دەچنین کە هەرگیز تەواو نابێت... مافووری ئەو دونیایەیە کە هەمیشە خەونمان پێوە بینیوە و قەت تیا نەژیاوین». غەزەلنوس دەستی تریفەی گرت و گوتی « تریفە، بۆ وا سارد و دووریت، بۆ کە دەتبینم واهەستدەکەم تارماییەک دەبینم؟ خۆت و ژنە غەمگینەکانت دەتانەوێت بچن بۆ کوێ؟... تریفە دەترسم ڕۆژێک بێت جگە لە باغەکانی خەیاڵ هیچ شوێنێکی تر نەمێنێت مرۆڤ خۆی تیابشارێتەوە». تریفە گوتی «غەزەلنوس، گرنگ ئەوەیە مافوورێک بچنین بتوانین بە ناویدا سەفەربکەین، مافوورێک پڕ بێت لە ڕێگای پێچاو پێچ و باغی بەرین و ئەستیرەی پڕ ڕۆشنایی، گرنگ ئەوەیە شتێک بچنین کە بتوانین لە ناویدا ونبین... من خۆشەویستی تۆ وای لێکردم بمەوێت بگەمە ئەو جێگایە... بەرەو بنی بێقەراری ئەو بەحرە بڕۆم کە بوونم لەگەڵ بوونی ئادەمیزادەکانی تر و باڵندەکان و گوڵەکان و ئەستێرەکاندا تێکەڵدەبێت... ڕۆژ بە ڕۆژ کە لە خۆشەویستی تۆدا نوقمدەبم هەستدەکەم لە دونیادا نوقمدەبم، لەناو ڕۆحی برینداری گوڵ و منداڵ و ژنەکاندا، کاتێک لە تۆدا دەتوێمەوە لە جیهاندا دەتوێمەوە. خەیاڵ ئەوەیە لە تۆدا ونببم... بۆ ئەوەی لە تۆشدا فەنابیم دەبێت پێشوەخت ببمە باغەوانی ئەستێرەکان، ببمە ڕێبوارێک خۆی ڕێگاکان دروستدەکات، دەبێت وەک تۆ ببمە گوڵساز و بە شکۆفەدروستکەر».

غەزلنوس گوتی «تریفە تۆ لە هەر کوێیەکی دونیابیت، لە هەر باغێکدا بیت، من لەوێم... هەر وەختێک غەزەلێک بنوسم بیر لە تۆ دەکەمەوە، لە هەر جێگایەکی دونیا ببم بە باغەوان وادەزانم بۆ تۆ وەستاوم و لە پێناوی تۆدا تەماشای گوڵ دەکەم... تا لە دەست و جەستەم دووردەکەویتەوە، زیاتر لە بەحری غەزەلەکان و لە سیحری قافییەکانمدا دەتبینمەوە».

تریفە دەستیگرت و گووتی « من ئێستا هیچ نیم جگە لە ئاهێکی قووڵی ئیشتیاق... سێبەرێکم لەسەر مافوورێکی خەیاڵی... من دەبێت بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووم، بۆ ئەو جێگایەی دایکی من و دایکی تۆ لێوەی هاتوون... بۆ ناو باغەکانی ئیشتیاق... بۆ ناو ئەو لالەزارانەی حەسرەت و نائومێدی سەوزیکردون... من و تۆ منداڵی نائومێدیین و دەگەڕێینەوە بۆ ئەو زەوییە خەیاڵییەی نائومێدی دروستیدەکات... ئەو مافوورانەی دەیچنم ڕێگای درێژ و نەبڕاوەی منن، ئەوانە غەزەلی منن، هیچ مافوورێکم نەچنیوە و بیرم لای ئەو غەزەلانەی تۆ نەبێت و خەیاڵم لای ئەو باغانەی تۆ نەبێت...».

غەزەلنوس سەیری چاوە فریشتەییە پاکەکانی کرد و گووتی « تریفە من و تۆ وەک عاشقانی تری دونیا بەیەک ناگەین، تا باغ هەبێت من و تۆ لە شکۆفەکانیدا، لە بۆنیدا، لە خەیاڵی باغەوانەکانیدا بەیەکدەگەین... تریفە تۆ خەونی من نیت بەتەنیا، بەڵکو تۆ ئەو خەونەی کە هەموو باغەکان و هەموو باغەوانە خەیاڵییەکان دەتبینن».

تریفە گووتی «غەزەلنوس دەبێت بڕۆم، دەبێت بڕۆم. من هیچ نیم جگە لە ئیشتیاقێکی قووڵ و هەمیشەیی بۆ تۆ... لە هەر کوێیەکی دونیا بم... هەر ئەو ئیشتیاقە ئەبەدییەم... ».

ئەو ڕۆژە تریفە و غەزەلنوس بەسەر هەموو یادگارییەکانی خۆیاندا چوونەوە، باسی ئەو شەوەیان کرد کە بۆ یەکەمجار لەماڵی سەیفەدین مارۆ یەکتریان بینی، هەر دووکیان هەموو شتێکیان لە بیر بوو، لە ڕەنگی پەردە و گوڵدانەکانەوە تا بۆنی ئەو عەترەی مەهناز دابووی لە خۆی، پێکەوە چاویان لێکدەنا و وەک ئەوەی زەمەن هیچ نەبێت جگە لە درۆیەکی دووبارە، جارێکی دی خۆیان لە ساڵۆنە قەشەنگەکەی خانمی شەمسدا بینییەوە، جارێکی دی بەسەر یادگاری مەهناز و نەجۆ ئەشکانیدا تێپەڕین و گریان. هەنگاو هەنگاو بە یادی ئازارەکانی خۆیان و خەڵکدا

هاتن، لە هەر کات زیاتر دڵنیابوون کە عەشق ئەم بیرکردن و سووتان و پێکنەگەیشتنە ئەبەدییەیە. تریفە ئەو ڕۆژە لە بەرچاوی غەزەلنوس و منداڵەکان، هەموو ماڵەکە گەڕا، هەموو ژوورەکان، هەموو کونج و گۆشەیەکی بەسەرکردەوە، ژوورەکەی خۆی گەڕا، چووە کتێبخانەکە، چووە ژووری خەوتنەکەی خۆی کە چەند ساڵ تێیدا بە تەنیا دەخەوت... بۆنی هەندێک دەستنوسی کۆنی غەزەلی کرد، بۆنی جلی منداڵەکان و کتێبە بچوکەکانیانی کرد، بەسەر هەندێک یادگاری وردا گریا، بەسەر کەلوپەلی وردی چێشتخانەکە و گوڵدانە سپییە چکۆلەکاندا گریا. دواجار بەرلەوەی لە دەرگای ماڵ بچێت بەودیودا گووتی «غەزەلنوس ئەم ماڵە گەورەترین باغێک بوو، تۆ پێشکەشی منت کرد... من لێرەدا جوانترین مەخلوقاتەکانی دونیا و غەمگینترین چیرۆکەکانی ئەم شارەم بیست، سوپاس بۆ ئەو هەموو کەرەمەی لە دڵی تۆ دەتکێت». غەزەلنوس بە غەمگینی سەیریکرد وهیچی نەگووت. ئەوە دوا قسەی نێوان غەزەلنوس و تریفە یابەحری بوو.

ئێوارەی هەمان ڕۆژ، دوای ڕۆیشتنی تریفە یابەحری بە چەند سەعاتێک حەسەنی تۆفان هەواڵێکی سەیری هێنا. لە شەقامێکی نزیک ماڵی تریفە یابەحرییەوە پۆلیس لاشەی چواردە ژنی کوژراویان دۆزیوەتەوە کە بە هۆی شێواندنێکی زۆرەوە مەیتی هیچیان ناناسرێنەوە، عەسری ئەو ڕۆژە غەزەلنوس و حەسەنی پیرۆ وەک زۆر خەڵکی دیکەی شار بە پەلە و شپرزەیی چوون بۆ سەیری مەیتەکان، چواردەژن بوون کە بە شێوەیەکی دڕندانە کوژرابوون، هەر چواردەیان جلی سپییان لەبەردابوو، هەر چواردەیان ڕوخسارییان شێوێنرابوو. پۆلیس دەرفەتی نەدەدا کەس دەست لەلاشەکان بدات. هەوڵی زۆری حەسەن تۆفان و غەزەلنوس بۆ ئەوەی بچنە سەر کوژراوەکان بێسوودبوو. دوای چاوەڕوانییەکی درێژ و بێبەرهەم، هەمان ئەو ئێوارەیە چوون بۆ ماڵە نهێنییەکەی تریفە

یابەحری، سەیریانکرد دەرگاکان شکاون و پەنجەرەکان لەسەر پشتن، کە چوونە ژوورەوە باغێکی بێسنوور و سەوز و ناکۆتایان بینی... سەرتاپای ماڵەکە چڕستانێکی سەوزی گەڵا و درەخت و باڵندە بوو، باغێکی ناکۆتا بوو بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگی گەورەوە، باغێک بە ناو ژوورەکاندا دەکشا، لە ژێر زەمینەکەوە تا ئەوسەری زەوی و لە هەورەبانەکەوە تا کۆتایی ئاسمان درێژدەبووەوە... دەریایەکی بێسنوور و نەبڕاوەی خەیاڵ و گوڵ بوو... دەریایەکی بێسنوور.

غەزەلنوس وەک لە هەموو شتێک تێگەیشتبێت توند دەستی حەسەن تۆفانی گرت و لەو باغە هاتەدەرێ. بەپێ بە هەموو شەقامە بەرینەکانی شاردا گەڕانەوە، ئێوارەیەکی قەرەباڵغ و ساردبوو. لە نزیکی مەیدانی سەرەکی شاردا خەڵکانێک لە باغێکی چکۆلەدا کۆبووبوونەوە و قسەیان لە موعجیزەیەک دەکرد. گوڵبەڕۆژە فرۆشێک پێیگووتن «کۆمەڵێک ژنی زۆرجوان کە لە فریشتە دەچن لەو باغەدا لەسەر تەونێکی گەورە مافووردەچنن». کۆمەڵێک ژنی قەشەنگ کە هێند تەنک و ڕوونبوون، مرۆڤ دەیتوانی لە پشتیانەوە هەموو باغەکە بە ڕۆشنی ببینێت، هەر چواردەیان وەک لە زیکرێکی قووڵدابن مافوورێکی ئێجگار گەورەیان دەچنی، مافوورێک وەک ئەوەی لە ئاسمانەوە بەرەو زەوی شۆڕبووبێتەوە وەها بوو. تا ئەوکات نە خەیاڵ نە عەقڵی ئادەمیزاد شتی وەها قەشەنگی نەبینیبوو. غەزەلنوس تریفە یابەحری لە ناوەڕاستی قاڵیچنەکاندا ناسییەوە، مافوورەکە لە تاریکی ئەو ئێوارەیەدا بە شێوەیەکی سیحراوی دەدرەوشایەوە، ئەو حەشاماتەی لە دەوریان کۆبووبوونەوە پێکڕا خوماری بینینی ئەو قاڵییە سەیرەبوون کە هەر ساتەی بە نیگارێکی خەیاڵی قەشەنگ دەدرەوشایەوە، قاڵییەک پڕبوو لە نیگاری ئاسک کە ڕایاندەکرد، لە نەورەس کە لەپاڵ کەشتییەکاندا دەفڕین، لە ئەستێرە کە لە بازنەی گەورەگەورەدا دەسوڕانەوە، لە باغ کە گوڵەکانی مرۆڤیان

بانگدەکرد، لە ژنانی عاشق کە لەسەر سەکۆی باغچەیەک سەیری ئاسۆی دوور و نەبڕاوەی ژیانیان دەکرد. غەزەلنوس منداڵە خەیاڵییەکانی خۆی لەسەر ئەو مافوورە بینییەوە، کەشتییە خەیاڵی و گەورەکەی ماجیدی گوڵ سۆلاڤی بینی کۆمەڵێک نابینا بەرەو ڕۆشنایی دەبات، ماجەلانی ڕاستەقینە و ئەفسانەی بینی بە ڕێگایەکی بەهارەدا دەهاتنە خوارێ، حەسەن تۆفانی بینی لە ناو ژنە ڕەشپۆشەکاندا، لە ناو لالەزاری ئەبەدی دایکایەتیدا سەیری گوڵەکان دەکات. خودایە... خۆی و سەبری بینییەوە لە باغێکی بەرین و بێسنووردا، لە بەرابەری یەک دانیشتوون و پێکەوە سەیری کتێبێکی غەزەل دەکەن. دەفتەردارەکانی بینی سەریان بەسەر کتێبێکی گەورەدا شۆڕکردۆتەوە و لە نهێنی مردن ورددەبنەوە.

حەشاماتێکی زۆر لە دەوری ئەو ژنە سێبەر و خەیاڵیانە کۆبووبوونەوە، هەموو ئەوانەی دەیانتوانی ئەو فەرشچنانە ببینن، بە جۆرێک خومار و مەستی ئەو مافوورەبووبوون نەیاندەتوانی بجوڵێن و چاوی لێبتروکێنن. بەڵام وەک ئەوەی سەرتاپا لە خەوێکی قووڵدابن و ڕابچڵەکن لە چاو تروکانیکدا بەئاگادەهاتنەوە و دەیانبینی ئەو فەرشە و ئەو مافوورچنە خەیاڵیانە نەماون. ئەو شەوە تا بەیانی و ڕۆژانی دواتریش سەرتاپای شار باسیان لە حیکایەتی ئەو تەونە گەورە و سیحراوییەی دەکرد کە کۆمەڵێک ژنی سپی پۆش لەسەری دانیشتوون و تا ناکۆتا جۆلاییدەکەن و هەرگیز تەواو نابن، هەر کەسێک سەیری ئەو مافوورەی دەکرد بەشێک لە چیرۆکی ژیانی خۆی تیادەبینییەوە. لەو ڕۆژە بەدواوە، زوو زوو خەڵکانێک لە باغێکی شاردا یان لە کوچەیەکی دووردا یاخود لەسەر فولکەیەکدا کۆدەبوونەوە و دەیانگووت مافوورچنە خەیاڵییەکانیان بینیوە.

لەو ئێوارەوە تا ماوەیەکی دوورودرێژ چیرۆکی ئەو مافوورە گەڕۆکە کە هەرجارەی لە شوێنێکەوە دەردەکەوێت، ژیانی خەڵکی شار داگیردەکات. خەڵکانێکی زۆر سەرتاپای چیرۆکەکە بە وڕێنەیەکی ڕووت

لە قەڵەمدەدەن کە خەیاڵی هەندێ وڕێنەباز دروستکیردوە و خەڵکانێکی دیش وەها شەیدای ئەو مافوورە دەبن، وەک شێت دەکەونە گەڕان بە شاردا، بەڵکو لە جێگایەکی دیکە و لە ڕۆژێکی دیکەدا ڕێکەوتیبکەنەوە. چیرۆکی مافوورچنەکان و مافوورە ئەفسوناوییەکان پاش ماوەیەکی کەم دەگاتە شار و شارۆچکەکانی دی و بە هەموو وڵاتدا بڵاودەبێتەوە. ئەوانەی کە دەڵێن بەڕاستی مافوورەکەیان بینیوە تا ئەمڕۆ لە چنگی ئەو گوشارەزۆرەی خەیاڵ ئازادنابن کە دیتنی ئەو جیهانە بێمەودا و گەورەیە لەو مافوورە چکۆلەیەدا تووشیکردون.

ئەو شەوە غەزەلنوس لە دۆخێکی ڕۆحی سەیردا بوو تێکەڵەیەک بوو لە شادومانی و غەم. بە حەسەنی گووت «من بەدرێژایی ژیانم هەوڵمداوە هەموو گەردون لە یەک غەزەلدا کۆبکەمەوە بەڵام نەمتوانیوە. ئەو مافوورە ئەوەیە... حەسەن، تریفە بۆ هەتاهەتایە ئازادبووە، هیچ شتێک ناتوانێت ئیدی سنوور بۆ خەیاڵی ئەو دابنێت، ئەوە ئەو خەیاڵەیە کە هەرگیز کۆتایی نایەت، ئەو خەیاڵەیە کە هیچ کەس ناتوانێت دەستی تێبخات و یاری بە پاکێتییەکەی بکات... دڵنیام تریفە ئێستا لە هیچ ئەهریمەن و جانەوەرێک ناترسێت».

ئەو شەوە حەسەن تۆفان و غەزەلنوس بێئۆقرەبوون. دووبارەوە چوون بۆ بیمارستان و ویستیان سەیری تەرمی ژنە کوژراوەکان بکەن، بەڵام پزیشک و پۆلیس و فەرمانبەرە دڵڕەقەکان نەیانهێشت، وەک دوو شێت کە ئۆقرەیان نەبێت و شوێن بە خۆیان نەگرن، چوون بۆ باغی مەهناز، لەوێ سەیری گوڵە سیحراوییەکانیان کردەوە. لە ناو گوڵەکاندا غەزەلنوس بە حەسەن تۆفانی گووت «حەسەنی پیرۆ ژنان لەشی خۆیان نەبەخشی بە من، بەڵام باغەکانی ناو ڕۆحی خۆیان پێ بەخشیم، وەرە و پێکەوە بەو باغانەدا بگەڕێین». چەندین سەعات بە باغی مەهنازدا گەڕان و بۆنی گوڵیانکرد... دواتر هەردووکیان بەرەو باغی تریفەیابەحری و خوشکەکانی

کەوتنە ڕێ. باغێکی سەوز و نوێ کە پڕبوو لە دڵۆپە شەونمی گەورە و لە بولبولی وەها دەنگخۆش، لە هیچ باغ و دارستانێکی دونیادا نەبوون. لە ناو سەوزایی و گەڵای تازەدا حەسەنی پیزۆ بە غەزەلنوسی گووت «تۆ پیاوێکی بەختەوەریت، ژنان بە دەگمەن باغەکانی ناو ڕۆحیان دەبەخشن بە کەس... تۆ بەختەوەرترین پیاوی دونیایت». غەزەلنوس بە حەسرەتەوە گووتی « بەڵام لەشی ئافرەتیش باغێکی سیحراوییە، شەوانێکی دووردرێژ نەوجەوانی چینی باسی سیحر و جوانی لەشی ئافرەتی بۆ دەکردم، دەزانم لەشی ئافرەتیش وەک ئەم باغانەی ڕۆحیان وایە، تا مرۆڤ خۆی دەست لە غونچەکانی نەدات نازانێت چییە». حەسەنی پیزۆ گوڵێکی لێکردەوە و گووتی «لە کۆتاییدا لەشی ئافرەت هەر وەکو ڕۆحی بە باغێکی سیحراوی و ئەفسوناوی تەواو دەبێت... من لەوە دڵنیام ».

ئەو شەوە تا بەیانی لە باغی تریفەدا سوڕانەوە... باغێک بوو گەورە و بێسنوور... ڕەها و بێئەندازە وەک هەزارباغ.

## یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

**یەکەمین جار تیشکان تاهیرم لە یەکێک لە خراپخانەکانی پایتەختدا بینی، کچێکی گەنجی جوان بوو، هەر کەسێک ببیینیایە شەیدای ئەو قژە زەردە لوول و بریسکەدار و ئەو چاوە گەش و ڕووخسارە باریکەی دەبوو. کە لەگەڵیدا خەوتم و تەواوبووم، لەو ساتەدا کە بەدەستەسڕێکی سپی خەریکی پاکردنەوەی خۆی بوو، پێمگووت تیشکان بۆ لەگەڵمدا نایەیت بۆ باکوور، لەوێماڵێکت بۆ دەگرم و دەتخەمە زانکۆ و دەتوانیت بۆ خۆت شتێک بخوێنیت، دەترسم لەم**

جەهەنەمەی باشووردا تیا بچیت. کە وامگووت دەمزانی بەم کچە جوانە دەتوانم قەڵای زۆر قایم و سەخت بگرم، دەمزانی لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆمدا وەک هەموو سیاسییەکانی تری سەر ئەم ئەستێرەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان پێویستیم بە سۆزانییەک دەبێت، دەشمزانی لە تەنگانە گەورەکاندا سۆزانییەکی دڵسۆز لە سەد دۆستی ناو سیاسەت باشتر فریای مرۆڤ دەکەوێت. جگە لەوەی لەو دەمەدا زۆربەی بارۆنەکان سۆزانی تایبەتی خۆیان هەبوو، من لەو ڕووەوە لە هەمووان داماوتر و بێبەهرەتربووم، بارۆنەکانی تر هێندەیان سۆزانی هەبوو، وەها زێدەرەویاندەکرد، جارێکیان سەرۆک لەکۆنفرانسێکی گەورەدا، هەڕەشەی لەهەندێکیان کرد، کەدەرپێی ئاسنیان بۆدەکات و قفڵیان دەدات و کلیلەکانیش لای خۆی هەڵدەگرێت... من لەحیزبدا بەحەیاو حورمەت بەناوبانگ بووم، لە مەجلیسی بارۆنەکاندا بۆ ئەوەی تورەمبکەن پێیاندەگووتم «بارۆنی ئەخلاق». لەڕاستیدا ئەو وێنەیەتەواو بێزاریدەکردم و کەمێکیش هەستم بەبچوکی و نزمی دەکرد. ئەو ڕۆژە تیشکان وەک خۆی بداتە دەست قەدەر، سەیریکی چاوی کردم و بێئەوەی بیربکاتەوە گووتی «بارۆن، گەر بمبەیت لەگەڵتدا دێم». ڕازیبوونی خێرا و بێکێشەی لەبری ئەوەی بمخاتە گومانەوە، دڵی خۆشکردم و خۆشەویستیکرد لەلام. سەرەتا ماڵێکی چکۆلانەم لەگەڵ کچێکی دیکەدا بۆ گرت کە ئەویش سۆزانییەکی چکۆلانەی چاوشین بوو، بارۆنی مەدەنی لە شارێکی دیکەوە هێنابووی. لە هاوینی هەمان ساڵدا دوای چەند تەلەفونێک لە یەکێک لە کۆلێژەکاندا قەبووڵێکم بۆ سەند و کردم بە قوتابی زانکۆ. زۆر شەو کە خەیاڵات وەڕزیدەکردم و لە بیرکردنەوەی دوورودرێژ دەربارەی چارەنوسی ئەم نیشتیمانە بێزاردەبووم، دەچووم بۆ لای تیشکان و ئەو لەشە سپی و باریکەی ئازاری ئەم دونیایەی لە بیردەبردمەوە. ئێوارەیەک

چووم بۆ لای تیشکان، بەڵام لە ماڵ نەبوو، لەبری ئەو کچە سۆزانییە چاوشینە چکۆلانەکەی بارۆنی مەدەنی لەوێبوو. شەیتان ئەوەی خستە خەیاڵمەوە داوای لێبکەم لەگەڵمدا بخەوێت، بەوەدا ئەویش خانمێکی عەیار و فرسەتگیربوو بێ هیچ سێ و دوویەک ڕازیبوو. من دەمزانی هەندێک لە بارۆنەکان سۆزانییەکانی خۆیان وەک مولکییەتی تایبەتی سەیردەکەن و قەهر دەیانگرێت بزانن کەسی دی لەگەڵیاندا دەخەوێت، بارۆنی مەدەنیش لەوانەبوو. بەر لەوەی بارۆنی مەدەنی بە حیکایەتی من و سۆزانییە چکۆلانەکە بزانێت، چەندجارێکی دی لەگەڵیدا خەوتم و خۆشحاڵبووم کە لە پشتەوە بارۆنی مەدەنی دەخەڵەتێنم. کە لە ئەنجومەنی بارۆنەکاندا بەرامبەرم دادەنیشت، بە زەردەخەنەی پیاوێکی فێڵبازەوە سەیرمدەکرد و لە دڵی خۆمدا دەمگووت، بەستەزمان ئاگات لە چییە و چوزانیت تا ئێستا من چەند جار لەگەڵ سۆزانییە چاوشینە چکۆلەکەتدا خەوتووم. دواجار بارۆن ئەو نهێنییەی لە سۆزانییەکەی دەرهێنا و خراپ لە من توڕەبوو، وەها زویر و شێتگیربوو مەپرسن. شەوێکیان من لە یانەی مرواری لە ژوورەکەی خۆمدا شتێکم لەسەر شارە نفرۆکانی دونیا دەخوێندەوە، بارۆن بە توڕەیییەوە خۆی کرد بە ژووردا و گووتی «بارۆن بە هیچ شتێک لێت خۆشنابم... بە هیچ شتێک... قەسەم بە برایەتیمان گەر ئاوها بە نهێنی ئەو کارە دزێوەی خۆت نەکردایە پێم ناخۆش نەبوو، بەڵام ئێستا تەنیا خودا خۆی دەزانێت چەند لە دڵم گرانە و چەند هەست بە برینداری دەکەم. مەگەر هەر ئێستا تیشکانم پێشکەشبکەیت... قەسەم بە خودا ئەوە تاکە شتێکە من بتوانم زویری خۆمی پێ ئارامبکەمەوە و دڵی بریندارمی پێ مەرهەمبکەم». من دەمزانی بارۆن کە کەڵکەڵەی ژنێکی کەوتەسەر گەر هەموو سامانی خۆشی دانابێت تا کێشی نەکاتە ناو جێگای خۆی دەست بەرداری نابێت، دڵنیابووم بمەوێت و نەمەوێت تیشکان لە

دەستم دەردەهێنێت، لەبەرئەوە ویستم بە کەمترین زەرەر لەو یارییە دەرچم، گووتم بارۆن تیشکان بۆ تۆ، بەمەرجێک هەر کاتێک کارم پێیبوو بمدەیتەوە. بارۆن بە شەرتە چکۆلانەکەم ڕازیبوو. کە بارۆن تیشکانی هێنا بۆ نوێمیران، کەس ئەو چیرۆکە دووردودرێژەی نێوان من و ئەو خانمەی نەدەزانی. تیشکان زۆر لە دڵی گران بوو کە من بە بارۆنی مەدەنیم بەخشی، بەلام سوێندم بۆ خوارد هەموو شتێک دەکەم تا بەزووترین کات لە بارۆنی وەربگرمەوە. من ئەو ماوەیە کە تیشکان لای بارۆن بوو هەر پەیوەندیم لەگەڵیدا هەبوو، بارۆنی مەدەنی بە ناوی کچی برادەرێکی خۆیەوە بە نوێمیرانی ناساند، بەلام هەموو دەیانزانی درۆدەکات. لە ڕاستیدا لە نوێمیران کەس بەلایەوە گرنگ نەبوو کێ درۆدەکات و چی درۆیەک دەکات، ئەوەیان بەلاوە گرنگ بوو ژیان هەر وەکو خۆی بڕوات. کە یەکەمجار هەواڵی هاتنی ماجیدی گوڵ سۆلاڤم بیست، زانیم ئەو کوڕە لەوە بێدەنگتر و قووڵترە بە ڕێگای ئاسایی و بە قسەی پیاوانە بگیرێت. هەر لە شەوی یەکەمەوە لەگەڵ بارۆنی مەدەنیدا ڕێکەوتین تیشکانی لە ڕێگادا سەوزبکەین. تیشکان لە گرتنی گوڵ سۆلاڤدا سوودێکی گەورەی هەبوو، بەلام کچە بەستەزمانەکە زۆر غەمگین بوو، هەستیدەکرد زوڵمێکی گەورەی بەرابەر گوڵ سۆلاڤ کردوە کە بە جوانترین کوڕی دونیای دەزانی... من سوێندم بۆ خوارد کە هیچ شتێک لە گوڵ سۆلاڤ ناکەم و ناشهێڵم بیکوژن یان زۆر زیندانییکەن. دە جار سوێندم بە قژ و چاو و نیگا جوانەکانی خۆی خوارد تا باوەڕی پێکردم. من دەمویست تێبگەم گوڵ سۆلاڤ چۆن بیردەکاتەوە، من بووم تیشکانم فێرکرد داوای لێبکات حیکایەتی بۆ بگێڕێتەوە، هەموو شتەکان لەسەر ئەو نەخشە وردە دەڕۆیشتن کە من کێشابووم. من تیشکانم لە شەوی ئاهەنگەکەدا خستە سەرڕێی ماجیدی گوڵ سۆلاڤ.

دواتر کە شریتی هەر دوو چیرۆکەکەی بۆ هێنامەوە هەستمکرد ئەو پیاوە چ ترسناکە، من جارێک و دووجار و دە جار گوێم لەو دوو چیرۆکە گرتەوە... هەموو جارێک زیاتر هەستم بە ترس دەکرد. کە گوێم لێبوو تێگەیشتم سەروکارم لەگەڵ چ شەیتانێکدایە، تێگەیشتم ئەو گەنجە لە ڕێگای تیشکانەوە چ نامەیەکی نهێنیم بۆدەنێرێت. تیشکان هیچ لەو شفرە ترسناکانە تێنەدەگەیشت کە لە پشت چیرۆکەکانی گوڵ سۆلاڤەوەیە، من دڵنیابووم ئەو وەک غەزەلنوسی هاوڕێی خەون بە دەسەلاتێکەوە دەبینێت گەورەتر لە دەسەلاتی پادشاکان، وەک پیاوە سەرکەش و یاخییەکانی جاران، خەون بە قەلایەکی قایمەوە دەبینێت، قەلایەک یاخییەکانی سەردەمی زوو لە سەر ترۆپکێکی عاسی یان لە قوولایی جەنگەلێکی تاریکدا دروستیاندەکرد، بەلام یاخییەکانی ئەمڕۆ ئەو قەلایەیان بردۆتە جێگایەکی دووردەست و سەخت کە کەس دەستی پیاناگات، بردویانەتە ناو عەقڵەوە، ناو خەیاڵ و خەونەوە. گەر زەمانی سولتانەکان و پادشا کۆنەکان بایە، لەشکرێکم کۆدەکردەوە و دەگەیشتمە ئەو قەلا و بورجە سەختانە، بەلام کە یاخییەکان یاخیبوونیان بردە ناو باغەکانی خەیاڵەوە من لەوێدا دەستەوەستانم و هیچم بۆ ناکرێت... تاکە چارەم ئەوەیە ڕۆحەکان تەسخیرکەم و دڵە سەرسەختەکان ئازاربدەم، تا نەهێڵم جەستەیان لە مەملەکەتی مندا ئاسوودەبێت. هەستمکرد بە دزینی ئەو لاشەیە ئازارمدەدەن و پێمدەڵێن بەسەر حەقیقەت و خەیاڵیشدا پادشاین. ترسناکترین شت لە مەخلوقێکی خەیاڵیدا ئەوەیە بە تەنیا مەخلوقێکی خەیالی نەبێت. هەموو ئەو مەخلوقە خەیاڵیانەی من کڕیمن و پەیمانم لەگەڵدا مۆرکردن پێمگووتن ئێوە بۆتان نییە حەقیقەت تەفسیربکەن، تەفسیری حەقیقەت لای خەڵکی دیکەیە و لای ئێوە نییە.

کە بارۆنی پۆرسەلان کتێبی مردنی بینی، شێتبوو. من لاپەڕە

لاپەڕە کتێبەکەم پیشاندا، هەزاران حیکایەتی مردن بە وردەکاری زۆر و بە نهێنی وردەوە. بە ئەنقەست هەندێک لاپەڕەم بۆ خوێندەوە. بە ئەنقەست وشە بە وشە بۆم تەفسیرکرد، بە بارۆنم گووت «عەزیزم ئێمە خەوتووین ئەوان هەموو شتێک دەزانن، تێدەگەیت، جەنابی بارۆن هەموو شتێک لەسەر ئەم دونیایە دەزانن، وەها ئاسان نین کە وەک تۆ تێیان گەیشتویت... عەزیزم ئەو گۆڕستانە مەلعونەی تۆش کلیلەکەی لای ئەوانە... دەزانن کە ئەوێ پڕە لە مەیتی دیکە، هەموو شتێک دەزانن باشتر لە هەموو بارۆنە گێژ و گەمژەکانی نوێمیران».
گووتی «بارۆن تۆ نامێڵیت بیانکوژم... تۆ نامێڵیت... دەزانیت ئەوە چەند ترسناکە؟». من بەسەرسامییەوە گووتم «من نامێڵم ؟ من؟ من تەنیا بۆ ماجیدی گوڵ سۆلاف قسەم لەگەڵدا کردویت... بەڵام بۆ غەزەلنوس نا... من دەزانم غەزەلنوس و باغە خەیاڵییەکانی چەند ترسناکن... دەزانم». بە چرپەیەکی ئەفسوناوی، چرپەیەک بگاتە ناو ڕۆحی و لە خەیاڵیدا دەنگبداتەوە، گووتم « ئەوەی لە پشت ئەم کتێبەوە وەستاوە غەزەلنوسە. ئەوەی پلانی بردنی لاشەکەی داناوە غەزلنوسە. ئەو مەلعونەیە.. هەر ئەو لاشەکەی بردوە و لە جێگایەکی نهێنیدا شاردوێتییەوە. ئێمە نامانەوێت خەڵک بکوژین، ماجیدی گوڵ سۆلاف لە بەردەست خۆماندایە، زنجیری ئێمەی لەدەستدایە... هەرچییەک بڵێت کەس بڕوای پێناکات... بارۆن... ئەگەر بۆ گوناهبار دەگەڕییت... گوناهبار دیارە... من ئەم کتێبەم بە عەزاب و ئازار و ترس و لەرزێکی بێوێنە دەستکەوت... ئەم کتێبەم لە ماڵی ئەو هێنایە دەرێ». دەموچاوە شەرابییەکەی بارۆن هێدی هێدی ئاگریدەگرت. بارۆن پیاوێکی بێسەبر بوو کە هەستی بە مەترسی بکردبایە دەهێندە دڕتردەبوو. بەترسەوە سەیریکردم و گووتی «بارۆنی خەیاڵ شەو لەگەڵماندا وەرە و ڕێگاکەمان پیشانبدە». گووتم «عەزیزم غەم مەخۆ، من دەیهێنمە

دەرەوە... پێیدەڵێم، هاوڕێم وەرە سەیری ئەستێرە دەکەین... هەموو شاعیرە حیزەکانی دونیا حەزیان لەسەیری ئەستێرەیە».

بۆ ڕۆژی دوایی بەردەوام سێبەری ئەهریمەن و ڕۆحلەبەری تاریک و سیمای ترسناکم دەبینی. سەر لە بەیانییەکەی لە ماڵ نەچوومە دەرێ، سەرم پڕبوو لە دەنگی سەیر و واژەواژی دوور. وەک ئەوەبوو لە دونیایەکی ترەوە قسەم لەگەڵدابکەن. هەستمدەکرد پێویستیم بە شتێکە ڕۆحم سافبکات و دەرونم سازگاربکاتەوە، دەستمبرد شیعرێکم لەو چەند غەزەلە کەمەی غەزەلنوس دەرهێنا و خوێندمەوە. تا دەمخوێندەوە هەستمدەکرد پتر لەو پیاوە دووردەکەومەوە، بەیتێک دەیوەستانم کە دەڵێت :

شارێکە غەریقە لە خوێن و لە گوڵدا
دۆزەخە زاهیری و جەنەتە لە دڵدا
مەحزونە گوزەری و ماتەمە و پڕ لە داخ
ناو ڕۆحی گوڵزارە و نیهانی پڕ لە باغ

هەستمدەکرد ئەو باغانەی ئەو باسیدەکات گەلێک لە من دوورن، دەمگووت خودایە بۆ ئەو باغەکان دەبینێت و من نایبینم. هەستمکرد غەزەلنوس هەزار باغی شاردراوەی لەم شارەدا هەیە کە من ناتوانم بیانبینم، ناتوانم بچمە ناوی؟ دوای نیوەڕۆ وەک شێت سوار ماشێنەکەم بووم و کەوتمە گەشتێکی دووردرێژ بە شاردا... وَیستم بۆ دواجار بە دوای باغە جوانەکانی ئەودا بگەڕێم، ئەو باغانەی ئەو لە غەزەلەکانیدا باسیاندەکات. بەلام نەمبینی، جگە لە شەقامی پیسوپۆخڵ و مرۆڤی چلکن کەسی ترم نەبینی. سەیرم لێهات کە ئەو کوچە و کۆلانە خەیاڵییەکانی خۆی لەم پیس و پۆخڵییەدا دەدۆزێتەوە و لەگەڵ مندا

نایەت سەر لەنوێ دوور لەم هەموو مێش و مەگەز و پیسییە شارێکی دی دروستبکەین. دەبووایە بەر لەوەی بمکوژێت بیکوژم... بەدرێژایی شەوی ڕابوردوو خەوم بەو ئەسپە سپییە کوژراوەی ناو حیکایەتەکەی ماجیدی گوڵ سۆلاڤەوە دەبینی، لەو ڕۆژەوە تا ئێستاش، تا ئەم ساتە کە ئەم قسانە دەکەم هەموو شەوێک ئەسپێکی سپی لە خەونمدا غاردەدات و من دەیکوژم. هەموو شەوێک.

کاتێک چووم بۆ لای غەزەلنوس شەوێکی پاییزی پڕ ئەستێرەبوو، پێشتر هەموو شتێکم لەگەڵ بارۆنی پۆرسەلان و جەعفەری مەغۆلیدا بڕییەوە. کە بینیم ڕۆشن و خەیاڵی دەینواند، بەسەر کتێبێکی غەزەلدا نوشتابووەوە. وەک ئەوەی چاوەڕوانمبکات سەیریکردم و هیچی نەگووت. بە هێمنی چوومە ژوورەکەیەوە و گووتم «ئاه، غەزەلنوس... غەزەلێک لە غەزەلەکانی تۆ بۆ ئێرەی هێنام. لە بەیانییەوە وەک شێت بەم شارەدا دەسوڕێمەوە و دەڵێم ئەو جوانییەی لە باغەکانی شیعردا هەیە بۆ لە باغەکانی ژیاندا نییە؟». یەکەمجاربوو ببینم چاویلکەکەی داکەنێت، ئەو چاویلکە چکۆلانە جوانەی کە ئێستاش بۆ یادگار هەڵمگرتووە، کەمێک دەستی بە ڕیشیدا هێنا و گووتی «بارۆن تۆ هەڵەیت، جوانی شیعر لە جوانی ژیانەوە ئاو دەخواتەوە...». من بۆ قسەکردن نەهاتبووم، لە نیهانی خۆمدا گووتم ڕۆژی قسەکردن بەسەرچوو ئەی دڵ. گووتم «غەزەلنوس ئێستا لە دەرەوە بووم، زۆر حەزدەکەم پێکەوە لە شەوێکی ئاوهادا پیاسەبکەین... حەزدەکەم پێکەوە کەمێک سەیری ئەستێرە بکەین». کە ناوی ئەستێرەم هێنا وەک هەموو شاعیرە لاوازەکانی دونیا ئەژنۆکانی شلبوون و ئیرادەی پێنەما. سوێنددەخۆم هیچ شاعیرێک لە دونیادا نییە ناوی ئەستێرەی لابەریت و ئەژنۆکانی شل نەبێت، وشەی سۆزانی چ کاریگەرییەکی سیحری لەسەر بارۆنەکان هەیە، وشەی ئەستێرەش ئاوها کاریگەرییەکی بێمانای لەسەر ئەم شاعیرە مەلعونانە

هەیە. بێئەوەی هیچ بڵێت چاویلکەکەی کردە چاوی و دەستی گرتم و گووتی «بارۆنی خەیاڵ، وەرە بابڕۆین بۆ سەیری ئەستێرە». لە بەختی ئەودا دەتگووت ئاسمان ملیۆنەها ئەستێرەی لە باری تەعالا بۆ ئەمشەو قەرزکردوە. من بۆ دواجار پێمگووت «غەزەلنوس بۆ نامبەیت بۆ باغێک لە باغەکانی خۆت... هەر باغێکیان بێت گرنگ نییە، بمبە بۆ بچوکترین باغیان، گرنگ نییە». غەزەلنوس گووتی «بارۆن ئەی تۆ بۆ نامبەیتە سەر شوێنی خۆم لە نەخشەکەدا... شوێنی ڕاستەقینەی خۆم، منیش لەسەر نەخشەکانی تۆدا جێگایەکم هەیە». من بە غەمەوە گووتم «غەزەلنوس تۆ چیدی شوێنت لە نەخشەکەدا نییە، تەنیا هاوڕێکانت شوێنیان لە نەخشەکەدا هەیە، ئەوانەی پەیمانم لەگەڵدا مۆرکردون... ئەوانەی ئیشم بۆ دەکەن». بۆ ئەوەی زیاتر غەمی بدەمێ گووتم « زۆر لە پیاو و ژنە خەیاڵییەکانی تۆم لە دونیای خۆمدا خستۆتە سەرکار، پێکەوە شارێکی جوان دروستدەکەین». وەک غەم لە شتێک بخوات و نەیەوێت ئاشکرایبکات گووتی «ئەی برایانی دولبەرت لەگەڵدایە؟» بە پێکەنینەوە گووتم «هەفتەی پێشوو بۆیەکەمجار بردمن بۆ نوێمیران، بڕیارە لەوێ باغێکی گەورەمان بۆ دروستبکەن، لە چواردەوری نوێمیران سەوزایی بڕوێنن... دوو کوڕی سەیرن، دەتوانن لە ناو تاریکی و سێبەریشدا درەختی جوان سەوزبکەن... لە زوڵمەتی ڕەهادا باغ دروستبکەن». غەزەلنوس سەیریکردم و گووتی «بەڵێ دوو کوڕی سەیرن». هەستمکرد زۆر خۆشیدەوێن. ماوەیەکی درێژ بە بێدەنگ پیاسەمانکرد، دیاربوو سەرمای پاییز ئازاری دەدات، قەمسەڵەیەکی زەیتونی تەنکی لەبەردابوو. گووتم «غەزەلنوس ڕات چییە بە مردن ؟». دەمزانی تێدەگات بۆ ئەو پرسیارەی لێدەکەم، زەردەخەنەیەکی گرت و گووتی «مرۆڤ تەواو دەبێت و باغ تەواو نابێت... مردن و غونچە دوو شتی ئەبەدین». پاش کەمێک تێفکرینی ورد گووتم «بارۆنی

شیعر، گەر ئەمشەو بمریت، چی بەجێدەهێڵیت...». سەیری لێهات کە پێیدەڵێم «بارۆنی شیعر» کەمێک سەیری ئاسمانی کرد و گووتی «هەر کاتێک بمرم، باغێک بۆ منداڵە خەیاڵییەکانم بەجێدەهێڵم، باغێک کە گەورەبوون دەتوانن بیدۆزنەوە و بچنە ناوی». بەدڵێکی پڕەوە گووتم «غەزەلنوس تۆ و هاوڕێکانت زوڵمی گەورەتان لە من کرد... شەرتە بمبەیت بۆ باغێک لەو باغانە لێتخۆشبم... قەسەم بە هەر شتێک تۆ دەتەوێت لێتخۆش دەبم، بەڵام بمبە بۆ باغێک لە باغەکانی خۆت، یەکجار بمبە بۆ باغێک و هەموو شتێک لە نێوان من و تۆدا چاکدەبێت». بە خەندەیەکی بەدەوە، لەو خەندانەی شاعیران بەڕووی دونیاوە دەیگرن گووتی «بارۆن چوون و نەچوونی تۆ بۆ باغەکان لە دەستی مندا نییە، لەدەستی باغەکاندایە... ». دەمزانی بەو چەشنە وەڵاممدەداتەوە. من پێمداگرت و گووتم «غەزەلنوس دیوانەکانی خۆتم بدەرێ، کتێبەکانی غەزەلم بدەرێ، هەموو ژیانم لەسەریان دادەنیشم تا ئەو شیفرەیە دەدۆزمەوە کە بەرەو فیردەوسەکانی خەیاڵ دەمبات... شەرتە وابکەم... غەزەلنوس لەمە زیاتر ناتوانم بێمە پێشێ و خۆمت لە پێشدەمدا نزمبکەمەوە... ناتوانم». دەستێکی پڕ تێڕامانی هێنا بە ڕیشیدا و گووتی «بارۆن هەر کاتێک لە نوێمیران هاتیتە دەرێ، هەر کاتێک وازت لەو خەونە هێنا کە خەیاڵ دەستەمۆبکەیت... باغەکان خۆیان دەرگات بۆ دەکەنەوە، غەزەلەکان نهێنی خۆیان نابەخشن بە پیاوێک بیەوێت خەیاڵ دەستەمۆبکات... هەرکەسێک بیەوێت خەیاڵ دەستەمۆبکات، واتە دەیەوێت خەیاڵ بکوژێت. لە ڕیزی بارۆنەکان وەرە دەرێ و دەبینی ڕەنگی جیهان خۆی لە بەرچاوت دەگۆڕێت... ئەوکات دەتوانم هەموو غەزەلی خۆمت بدەمێ». ئەوە تەنیا داوایەک بوو نەمدەتوانی جێبەجێبکەم. گووتم «ئەگەر بارۆن نەبم. چۆن دەتوانم شاری خەونەکان دروستبکەم؟ کێ دەرگام لێدەکاتەوە؟ کێ ڕێزم

دەگریت؟... سەرۆک نرخی تاکێک پێلاویشم بۆ دانانێت». بە ئارامی پێیبڕیم و بە دەنگێک کە دوودڵی و گومان هەڵناگرێت گووتی « ئەوەی شفرەی ناو غەزەلەکانی من و مەلای سوختەی بوێت، دەبێت جگە لە غەزەل، جگە لە عەشق، جگە لە باغ بیر لە هیچی تر نەکاتەوە... «مرۆڤی تەواو» تەنیا بیر لە باغ دەکاتەوە، بیر لە ڕۆشنایی ناو لالەزار و بۆنی بێبڕانەوەی گوڵاو دەکاتەوە... بارۆن... بارۆن... تۆ ناتوانیت دۆزەخ بدەیت بە مرۆڤ و باغچە بدەیت بە شار».

من و غەزەلنوس بەیەک نەدەگەیشتین. کاتێک بەرابەری وەستابووم و گوێم لێدەگرت، خەیاڵم لای ئەوەبوو کە ئەگەر ئەم پیاوە زیندووبێت چەند کەسی دیکەی وەک خۆی دەخاتە سەر ئەو کەلکەڵەیەی خەیاڵی خۆیان بگۆڕن بۆ قەلایەکی سەخت کە بە هیچ هێزێک ناگیرێت، چەند کەس ناچاردەکات بەدوای جوانی خەیاڵدا پشت لە نوێمیران و لەم وڵاتە هەڵکەن؟... من هەموو هەوڵی خۆم لەگەڵدا، خودا شاهیدە تا دوا سنوور ڕۆیشتم... ئامادەبووم بە یەک گەشت لە یەکێک لە باغە خەیاڵییەکانی خۆیدا لێیببورم... لە ماجیدی گوڵ سوڵاڤیش ببورم... هەموویان ئازادبکەم... بەڵام لەگەڵمدا نەهات... ئێستا کە قووڵ بەسەر هەموو شتێکدا دەچمەوە دڵنیام کە دەیویست بمرێت. هەستیدەکرد کە سوڕێکی گەورەی بە خەیاڵ و حەقیقەتدا کردوە و ئیدی کاتی ئەوە هاتووە بۆ هەتاهەتایە بخەوێت.

لەسەری ئەو گوزەرەدا کە ڕێگایەکی دووردرێژ بە ئاراستەی زانکۆ دەست پێدەکات، پۆلیسێکی هاتوچۆ لە ژێر چەترەکەی خۆیدا خەوتبوو، ئا لەوێدا سەموونخانەیەکی گەورە و سەرتاشخانەیەکی کۆن و سەوزەفرۆشێکی لاواز و نەخۆش هەیە. بارۆنی پۆرسەلان و جەعفەری مەغۆلی و مورتەزای شەیتان لە ماشێنێکی بەرز و بریقەداردا لە پێچی دوای فولکەکەدا چاوەڕوانیاندەکردین... گووتم «غەزەلنوس لەگەڵمدا

سەرکەوە، ئەوە ماشێنی هاوڕێیەکمە، کەمێک بە شەودا دەمانگێڕێت... لەشەوی وەها سارد و پڕ ئەستێرەدا پیاسەیەکی خێرای ئوتومبیل بەدەوری شاردا ناخۆش نییە».

دڵنیام لەو ساتەوە بەتەواوی تێگەیشت بۆ کوێی دەبەین. وەک هەموو شتێکی ببینێت، گووتی «ئەو ماشێنە بارۆنی پۆرسەلان و مورتەزای شەیتان و جەعفەری مەغۆلی تێدایە... وانییە، ئەوانی تێدایە؟». من سەیرمکرد و گووتم «غەزەلنوس تۆ چۆزانیت... ئەو ماشێنە کێی تێدایە؟». سەیریکردم و گووتی «بارۆن تۆ لە بیرتچووەوە ئەمە دووەمجارە دەمکوژن». ئەوکات تێنەگەیشتم مەبەستی چییە. تێنەگەیشتم، بەڵام دەستمگرت و گووتم «غەزەلنوس گەر وانەبێت، تادەمرم ڕقم لە خۆم دەبێت... تادەمرم چاوەڕوانی شتێک دەبم کە نایگەمێ، بیر لە سەفەرێک دەکەمەوە کە ناتوانم ڕێگاکانی تەیکەم، بیر لە باغێک دەکەمەوە ناتوانم بچمە ناوی. بەس خودا خۆی دەزانێت چ کارەسات و ئاشووبێک هەڵدەکات گەر شاعیران پادشاکان ببەزێنن. گەر پادشاکان بمرن و شاعیرەکان زیندووبن. گەر وانەبێت... گەر وانەبێت... تادەمرم بارۆنەکان ڕقیان لێمدەبێت، تادەمرم هەموو خەونێک لەسەرمدا، هەموو خەیاڵێک لە دڵمدا دەمگێڕێتەوە بەر قاپی تۆ و دەمکاتە کۆیلەی سیحری تۆ... غەزەلنوس دواجار من و تۆ دوو تۆپی بلیاردین بەریەک دەکەوین و هەر یەکەمان قەدەرێتی ئەوی دی بە ڕێگایەک و ئاڕاستەیەک بجوڵێنێت کە نایەوێت».

هەستمکرد غەزەلنوس هێشتا تەواو لە قسەکانم تێناگات، هەستمکرد زۆر حەزی لە ژیانە. کە سوار ماشێنە گەورەکەی بارۆنی پۆرسەلان بوو، بێدەنگبوو، سەیرێکی منی کرد و گووتی «گەر نەوجەوانی چینی نەبایە نەدەهاتم». ئەو ڕستەیەی وایکرد من دواتر بکەومە خولیای *تێگەیشتن لە هەموو ژیانی، ئەو ڕستەیە منی خستە کێژەنێکی ئاڵۆزەوە...*

وام هەستکرد بەڕاستی هیچ لە ڕۆحی ڕاستەقینەی ئەم پیاوە نازانم... نازانم کێیە... لە کوێوە هاتووە... چییە و دەیەوێت بۆ کوێ بچێت؟. ئەو هەستە قووڵەی غوربەت کە لەوساتەدا کەوتە نێوانمان هێندەی دی تووڕە و نیگەرانی کردم، بەڵام دواتر هەر ئەو هەستە کۆمەکی پێکردم بگەڕێم و بەوردی بکەومە دوای چیرۆکی ژیان و منداڵی ئەو. دوای چەند هەفتە لەو شەوە جەنابی سەرۆک بانگیکردم بۆ ئەوەی سەرزەنشتم بکات، داوای لێکردم زانیاری تەواو لەسەر ئەم پیاوە کۆبکەمەوە. سەرۆک ئەو جۆرە قسانەی زۆربوو، هەر بابەتێکی لە کن دەورووژا، فەرمانیدەدا زانیاری تەواوی لەسەر کۆبکرێتەوە، بڕێکی زۆری دەزگاکانی هەواڵ و شانە حیزبییەکان خەریکی کۆکردنەوەی هەواڵی بێسوودبوون لەسەر خەڵکی، کە دواتر کەس نەیدەزانی دەچێتە کوێ و کێ دەیخوێنێتەوە. من فەرمانەکانی ئەوم وەک پردێک بۆ گەیشتن بە خەونەکانی خۆم بەکاردەهێنا. بەڵام ئەو شەوە تێنەگەیشتم بۆ ئەو ڕستەیە لە ناکاو کردی بە پیاوێکی وەها غەریب و دوژمن. لە ماشێنەکەدا غەمێکی قووڵ دایگرت، هەمووومان بێدەنگبووین. جار جار مورتەزای شەیتان بە بارۆنی پۆرسەلانی دەگووت «قەسەم بەم شەوە جوانە، بارۆن تۆ زۆر خێرا لێدەخوڕیت... زۆر خێرا». هەمووومان پەشۆکابووین، هەتا مەغۆلیش کە هەرگیز نەدەپەشۆکا، ئەویش شپرزە و بێڕۆح دیاربوو. بارۆن سوڕێکی گەورەی بەدەوری شاردا کرد و چەند جارێک لە هەندێک پێدەشت و چۆڵەوانی کەنار نزیک بووەوە و بە خێراییەکی سەیر ماشێنەکەی بەرەو دەرەوەی شار ئاژووت. نزیکی نیو کیلۆمەتر لە جێگایەکەوە کە پڕبوو لە خانووی بچوک و تەواونەکراوی فەرمانبەرانی بچوک و بێپارە، لە نزیک کەندێکی گەورەوە وەستاین، شەو بۆنی قەوزەی کەنار چەمەکانی لێدەهات. لەوێ ئەوان دابەزین و من بە تەنیا لە ماشێنەکەدا مامەوە. نەمدەتوانی دابەزم... لە

ناو ماشێنەکەوە گوێم لێبوو مورتەزای شەیتان دەیگووت «قەسەم بە هەموو غەزەلە جوانەکان، قەت شەوی وەهام نەبینیوە، بارۆن سەیرکە لەو شەوە خۆشترە کە تۆ تیا زەماوەندت کرد... هەوا پاکە... پاک... شار لێرەوە تێکەڵ بەسروشت دەبێتەوە... عەجەب شەوێکە ئاغام... عەجەب شەوێک». گوێی خۆم دەگرت بۆ ئەوەی گوێم لە دەنگی مورتەزا نەبێت، سەرم دەخستە سەر کوشنەکە و نەمدەویست هیچ ببینم... دڵنیابووم ئێستا هەست بە ترسێکی گەورەدەکات، نەمدەویست پێش مردن چاومان بەرچاوی یەک بکەوێت، دەمزانی گەر ئەو دواهەمین نیگایەی ببینم، ئیدی تامردن بەدوامەوە دەبێت. خۆم کپکرد و کەوتمە ژماردنی هەندێک گوڵی خەیاڵی کە لە باغێکی خەیاڵیدا دەمبینین، بەڵام لە ناکاو پچڕام، خۆم کپکرد و کەوتمە ژماردنی پۆلێک پاساری گەورە کە بە خەیاڵ بەسەر سەرمدا دەفڕین، بەڵام سوودی نەبوو. بۆ ئەوەی غەزەلنوس لە بیر خۆم بەرمەوە، کەوتمە بیرکردنەوە لە لەشی ئەو ژنانەی تا ئەوکات لەگەڵیاندا خەوتبووم، بە خۆم گووت هیچیان جوانی و ڕێکی و سیحری لەشی تیشکانیان نییە. خەریکبوو بە هێمنی هەموو وردەکارییەکانی لەشی تیشکانم دەهێنایەوە پێشچاوی خۆم، لەگەردنییەوە تابەری پێی، خەریکبوو خۆم لە خەیاڵێکی ئیرۆتیکی ڕووتدا نوقمدەکرد، لە ناکاو دەنگی یەکەم گوللە و یەکەمناڵەی غەزەلنوس لە جێگای خۆم بەرزیکردمەوە و ڕایچڵەکاندم. هەناسەی خۆم گرت و وەک یەکێک تەقەی لێبکەن توندتر خۆم بە کوشنەکەوە نوساند و توندتر هەر دوو گوێی خۆم گرت. پاش بێدەنگییەکی قووڵ کە لەوانەیە لە حیساباتی ڕۆحدا دەیان ساڵی بردبێت، گوێم لە ناڵەی فیشەکی دووەم بوو. پاش ئەوە بێدەنگییەکی دووروودرێژ باڵی بەسەر شەودا کێشا، ئیتر هەستم بەبێهۆشییەکی قووڵ کرد، وەک ئیفلیج بووبێتم بە کورسییەکەوە نوسام، بە جۆرێک خۆم بە کورسییەکەوە

نوساند نەمدەتوانی خۆمی لێجیابکەمەوە. ئاگاداربووم کە بارۆن دەرگای ماشێنەکەی کردەوە و منی بانگکرد، بەڵام من جوڵەم بۆ نەکرد. بارۆنی پۆرسەلان گووتی «جەنابی بارۆن ئەو خۆ گرمۆڵەکردنە لەگەڵ ویقارتدا ناگونجێت». بەڵام من گوێم پێنەدا، بارۆن چەند جارێک منی بانگکرد و سوودی نەبوو، دواتر ئەو و جەعفەری مەغۆلی کە هیچ لە حاڵم تێنەدەگەیشتن، بە ڕەنجێکی زۆر منیان لە ماشێنەکە ڕاکێشایە دەرێ، هەندێک ئاویان کرد بە دەموچاومدا و منیان هەستانەسەرپێ. مورتەزای شەیتان دەستی گرتم و منی بردە سەر مردووەکە و گووتی «بارۆن تەماشاکە... مردنێکی جوان مردوە». غەزەلنوس لە ناو گۆمێک خوێندا نوقمبوو، شتێکی تایبەتی یان خوداییم لە ڕوخساریدا نەبینی، بە قەمسەڵە خوێناوی و زەیتونییەکەی بەرییەوە، بەڕیشە زۆرەکەیەوە لە دەروێشێکی مردوو دەچوو. من کەمێک سەرم ڕاوەشاند و تۆزێک هۆشم هاتەوە خۆم، بینیم جەعفەری مەغۆلی دەستەسرێکی گەورە لە خوێنی غەزەلنوس هەڵدەکێشێت و دەیخاتە قوتویەکی تایبەتییەوە. کە ئەوەم بینی منیش لە سندوقی پشتەوەی ماشێنەکەی بارۆندا، لە زەرفێکی تایبەتیدا خاولییەکەم دەرهێنا... ئەو خاولییەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان پارەیەکی خەیاڵیم پێدابوو، چاویلکەکەم لە چاوی غەزەلنوس داکەند و خستمە گیرفانم، خاولییەکەم توند تێوەپێچاو گووتم «لێرەدا بینێژن». بارۆنی پۆرسەلان و مورتەزا ویستیان لاشەکە ببەنەوە بۆ نوێمیران. مورتەزا گووتی «گوناهە بارۆنی گەورەم، مەحرومکەیت لەوەی لاشەیەکی وەها گرنگ و جوان لە ناو ئەو کۆمەڵە لاشەیەدا نەبێت کە من لە گۆڕستانە نهێنییەکەی خۆمدا کۆمکردونەتەوە... ». من هەستم بەسەر ئێشەیەکی گەورە دەکرد. گووتم «گەر ئەم لاشەیە بێتەوە بۆ نوێمیران خەوم لێناکەوێت، ناتوانم لەوێ بژیم... تێدەگەن؟». وەها توندو تورە قسەمکرد دڵم دەلەرزی. کە زانیان سەرچەوتم و

**بێسوودە هیچیان نەگووت. مورتەزا بەبێدەنگ دەستیکرد بە هەڵکەندنی چاڵێکی گەورە... من گەڕامەوە بۆ ناو ئوتومبێلە بەرزەکەی بارزن و لەوێوە گوێم لە دەنگی ئەو پاچە بوو کە مورتەزا دەیدا بە زەویدا، زرمەکەی بەسەرتاسەری شەودا دەڕۆیشت، بە سەر شاردا تێدەپەڕی، بەسەر گۆڕستانە دوورەکاندا تێدەپەڕی و لە جێگایەکی نادیاردا خامۆشدەبوو.**

## جەعفەری مەغۆلی و گوڵاوی پیزۆ
## «حەسەن تۆفان ــ کۆتایی پاییزی ٢٠٠٤»

دە ڕۆژ بۆ لاشەکەی غەزەلنوس گەڕاین تا دۆزیمانەوە، دەڕۆژ من و ماجەلانی ڕاستەقینە و دەرسیم تاهیر هەموو ڕۆژێک بەیانی زوو دەردەچووین و شەو درەنگ دەگەڕاینەوە، بست بە بستی کێڵگەکانی دەوروبەری شار گەڕاین، لاشەی ژنێکی کوژراو و دوو کۆرپەمان دۆزییەوە، دەرسیم هەموو ئەو پێدەشت و بنگرد و چاڵ و کەندانەی دەوروبەری شاری بۆندەکرد. تا دواجار دەرسیم لە نزیک شوێن ئاوەڕۆیەکی کۆنەوە بەدەم گریانەوە لاشەکەی دەرهێنا. ماجەلانی ڕاستەقینە وەکو من غەمگین و کەساس بوو، بەدرێژایی دە ڕۆژە وەک بەسەر عەردێکی ئەفسانەییدا بگەڕێت و لە کیشوەرێکی دیکەدا ونبووبێت، بێپشوو کۆمەکی بە من و دەرسیم دەکرد. بەردەوام باسی گەشتە دووروردرێژەکانی خۆی بۆ دەکردین، بۆ ئەوەی ماندوونەبین. هەستمدەکرد ڕۆژ بە ڕۆژ بالای بەرزتردەبێت، من و دەرسیم لە بەردەمیدا دوو مەخلوقی بچوکبووین. کە بە هەر سێکمان تەرمەکەمان دەرهێنا، کە تۆزمان لێتەکاند و ڕوخساریمان پاککردەوە، سیما قەشەنگ و دەروێش ئاساکەیمان ناسییەوە کە هێشتا بە دوو چاوی گەش و کراوەوە

سەیری ئەستێرەی دەکرد. خاولییەکی ئاوریشمی ئێجگار قەشەنگیان تێوە پێچابوو، خاولییەکە لە زۆر شوێنەوە بە خوێنی غەزەلنوس سووربووبوو. خاولییەکەم لێکردەوە و بەوردی مەیتەکەم ئەمدیوەودیو کرد، جێگای دوو گوولـلە زیاتر هیچی دی پێوە نەبوو، ئەو دوو گوولـلە دێرین و یەکرەنگەی مەغۆلی دەینان بە نێچیرەکانییەوە. لە ژێر مانگەشەوی پاییزدا سەری غەزەلنوسم خستە سەر ڕانم و سەیری ئاسمانم کرد و سوێندم خوارد کە تۆڵەیدەکەمەوە. لە نیهانی خۆمدا گووتم «باغ و غەزەل سوودیان چییە گەر ئاوها نامەردانە بکوژرێین». ئەو شەوە ماجەلانی ڕاستەقینە لاشەکەی غەزەلنوسی دا بە کۆڵیدا و تا بەرماڵ داینەنا، من و دەرسیم لە دوایەوە دەڕۆیشتین و دەگریاین. لە ڕۆژی دواتردا پرسەمان بۆ غەزەلنوس ڕاگەیاند، جگە لە هەندێک ڕۆحلەبەری خەیاڵیی و ژمارەیەک باغەوان و دوو سێ کتێبفرۆش کەسی دی نەهات بۆ پرسەی پیاوان. بەڵام لە پرسەی ژناندا خانمانی پەژمووردە و دایکە ڕەشپۆشەکان تەواو حەوش و داڵانی ماڵی غەزەلنوسیان پڕکردبوو. منداڵان سوێندیان خوارد تریفە یابەحریان لە پرسەکەدا بینیوە. تا هەفتەیەک من و منداڵە خەیاڵییەکان و ماجەلانی ڕاستەقینە هەموو بەیانییەک خۆمان دەگۆڕی و زوو دەچووینە سەر گۆڕەکەی غەزەلنوس. لەوێ حورمەت و خۆشەویستی خۆمان پیشاندەدا و دەگەڕاینەوە. لەو ماوەیەدا شەوان ژنە ڕەشپۆشەکانی هەزارباغ هێندەیان گوڵ بۆ سەر گۆڕەکەی غەزەلنوس دەهێنا، سەراپای گۆڕستانەکە خەریک بوو لە گوڵدا نوقمدەبوو، دەریایەکی بێسنووربوو لەو گوڵە گەورە و خەیاڵیانەی لە باغی جۆراوجۆرەوە دەهاتن و جوانییەکی بێوێنەیان بەو گۆڕە سادە و ساکارەی غەزەلنوس دەبەخشی، کە لە گۆڕستانێکی بچوک و نوێ و چەپەکدا ناشتمان. ئێستاش کە خەون بەسەر گۆڕەکەی ئەوەوە دەبینم هەر لە ناو ئۆقیانوسێکی بێسنووری گوڵدا دێتەوە بەرچاوم.

ڕۆژانی دواتر من پلانی کوشتنی جەعفەری مەغۆلیم دارشت. ئەوە تاکە

ڕێگا و دوا ڕێگا بوو بیگرمەبەر. بە كۆمەكی شبر ناو و ناونیشانی ماڵی مەغۆلیم لە نوێمیران پەیداكرد. شەوێک بەر لەوەی بچم بۆ كوشتنی جەعفەر هەموو كلیلەكانم هەڵگرت و ڕۆیشتم بۆ هەزارباغ. ئەو شەوە باغەكان زۆر لە بەرچاوم گۆڕابوون، هەستمكرد لالەزارەكان بەرینتر و گوڵستانەكان فراوانتربوون. بەدرێژایی شەو دەرگا بە دەرگا هەموو باغەكانم والاكرد و هەموو دەروازەكانم خستە سەر پشت. هەموو گوڵە ناسكەكانم بەسەركردەوە، هەموو گوڵە پەژموردەكانم ئاودا... هەرگیز هەزارباغم وا بەرین و بێسنوور نەبینیبوو. ئەو شەوە زۆر ناو گوڵەكان بۆ سەبری گەڕام و نەمدۆزییەوە، وەک ئەوەی بوون و نەبوونی ئەو بە خەیاڵی غەزەلنوسەوە گرێدرابێت، وەک ئەوەی گوڵێک بێت تەنیا فەنتازیا و خولیاكانی غەزەلنوس چنیبێتی و دواتر لەگەڵ ئەودا مردبێت و بەرەو جیهانێکی دی كۆچیكردبێت. لە كۆتایی ئەو شەوەدا تێگەیشتم كە چەند ساڵە، من و غەزەلنوس بە خەیاڵی یەكدا سەفەردەكەین، باغەكانمان لە جێگایەكدا تێكەڵاوی یەک بووبوو. ئێستا غەزەلنوس دوای مردنی خۆی باغەكانی بۆ من جێهێشتبوو، بۆ هاوڕێ بێكەس و تەنهاكەی خۆی كە جگە لەم باغانە خۆشی دیكە لە ژیانیدا نەبوو. ئەو شەوە تا توانیم تێر سەیری گوڵی قەشەنگ و گیای خەیالاویم كرد و بە غەمەوە لە باغەكان هاتمەدەرێ. ڕۆژی دواترم سەرتاپا لەگەڵ شبردا بردەسەر، كە ئێستا بە جۆرێک دەیخواردەوە لە توانا و تاقەتی لەشە چكۆلانەكەی زۆرتربوو. شبر لەو ماوەیەدا ئەو خەیاڵەشی لەسەری خۆی دەركرد، ئەو كیژە چاو جوانە بكاتە خێزانی خۆی كە ڕۆژێک لەسەرەی وەرگرتنی موچەی كەمئەندامانىدا بینیبووی، ئەوە پتر تووشی مەراق و غەم و تووڕەیی كردبوو. شەو بەر لەوەی شبر بەجێبهێڵم خاولییە خوێناوییەكەی سەر لەشی غەزەلنوسم دایە و گووتم «پێشمەرگە شەریف و غەمگینەكەی نیشتیمان، ئەم پارچە ئاوریشمە تا هەتاهەتایە بەو خوێنەوە هەڵگرە»،

کلیلی باغەکانی خەیاڵیشم خستە بەردەستی و گووتم « ئەم کلیلانەش لای خۆت قایمبکە و تا هەتاهەتایە نەیدەیت بە کەس، ئەمانە کلیلی کۆمەڵێک باغی خەیاڵین، شەوێک لە شەوان کۆمەڵێک پیرێژنی ڕەشپۆش دێنە بەر ماڵت و پێتدەڵێن شبری قژزەرد، غەمگینترین کۆنە جەنگاوەری دونیا، گوڵەکان وەختە سیسدەبن و کاتی ئاودانیان هاتووە. ئەوکات تۆ دەبێت بچیت و دەرگاکانیان بۆ بکەیتەوە»... شبر کلیلەکانی لێوەرگرتم و گووتی «گەر ئاوها ئیفلیج نەبوومایە، نەمدەهێشت تۆ بڕۆیت، خۆم دەمکوشت». یەکدیمان ماچکرد و ماڵاوایمان لە یەکدی کرد و بەخۆم و دەمانچەکەمەوە بەرەو نوێمیران کەوتمە ڕێ.

کە لە ژێر تەلبەندەکانەوە خۆم کرد بە نوێمیراندا، باران دەباری. وەک دەستێکی نهێنی بمبات، دوای ئەو نەخشە وردە کەوتم کە شبر لە هاوڕێیەکی دێرینی خۆی وەریگرتبوو. جەعفەری مەغۆلی لە ناو حیزب و دەرەوەی حیزبیشدا دوژمنی زۆربوو، بەڵام بە حوکمی ئەوەی ساڵەها بوو لە ئارامیدا نوقمبوو، کەس هەڕەشەی لە ماڵ و ژیانی ئەو نەدەکرد، بە چەشنێک دڵنیا و خاترجەم بوو وەک پیاوێکی ئەمین و بێترس دەژیا. سەعات نۆی شەو من لە زەنگی ماڵەکەیانم دا، یەکێک لە پاسەوانە تایبەتییەکانی کردییەوە. پاسەوانێکی منداڵکار بوو، لە تەمەنی ئەوسای من و مەغۆلیدا دەبوو کە پێش بیست و پێنج ساڵ چووینە ناو شانەکانی ئیغتیالاتەوە. بەو گەنجەم گووت «بە مەغۆلی بڵێ حەسەن تۆفانی هاوڕێت هاتۆتە میوانیت... خۆی دەمناسێت». سیازدە ساڵ بوو مەغۆلیم نەبینیبوو. کە هاتە دەرێ وەک جاری جاران چکۆلانە و لچ ئەستوور و لووت پلیشاوە و ناشیرین بوو. دونیا زۆر گۆڕابوو، کەچی مەغۆلی هەر وەکو خۆی بوو، تەنیا کەمێک لەجاران قەڵەوتر و دەستخڕتر و بازوو قەویتر هاتەبەرچاوم، لەوە بترازێت نیگای هەمان نیگا و دەنگی هەمان دەنگ و ڕۆحی هەمان ڕۆح بوو. ویستی ڕوخۆش و ئێسک سووک

دەربکەوێت، بەڵام لەبەر ڕوناکی گلۆپە کزەکەی بەردەرگادا ناڕەحەت و دوودڵییەکی زۆریشم لە سیمایدا خوێندەوە. پێی شەرمبوو نەمباتە ژوورێ، بەڵام دڵنیابووم لە ناخدا گرژ و لە دڵدا پڕ گومانە. سەرەتای وایدەزانی بۆ جێبەجێکردنێ کارێک یان بۆ تکایەک چوومەتە لای. بەخێرهاتنی کردم و گووتی «حەسەن تۆفان، بێت و نەبێت دوای ئەم هەموو ساڵە بۆ کارێک یان واسیتەیەک ڕووت لە قاپی مـن کردوە... گەر وەهایە بێئەوەی لێم زویربیت، هیچم بەدەست نییە و ناتوانم هیچت بۆ بکەم». من هێشتا لە تەماشای چلچرا و گڵۆپ و گوڵدانی ژوورە ڕازاوەکەی ئەودا نوقمبووم، خۆشحاڵبووم کە گەیشتومەتە بەردەمی. ویستم بەر لەوەی دەمانچەکەم دەربهێنم و لە دوورەوە بەدەستووری جاران گوللەکانم لە تۆڵەی نەوجەوانی چینی و غەزەلنوس و هەموو ئەوانی دیکەدا بنێم بە سنگییەوە، کەمێک لە نزیکەوە تەماشایبکەم. گووتم «جەعفەری مەغۆلی مەترسە، بۆ هیچ کارێک نەهاتوومەتە لات، دەزانم تۆ تەنیا خەڵکت پێدەکوژن، لەوەزیاتر بە کەڵکی هیچی تر نایەیت». قسەکانم وەک سەرەتا ڕەقبوون، دەمزانی چ پیاوێکی ترسناکە، بەڵام بە دەنگە خۆشەکەی گووتی «کەوایە بۆ هاتوویت؟». بە هێمنی سەیرمکرد و گووتم «جەعفەر بۆ غەزەلنوست کوشت؟». سەیرێکیکردم و گووتی «هاوڕێت بوو؟». وەختبوو وەڵامیبدەمەوە، وەختبوو بکەومە قسە و گۆڕینەوەی مانا لەگەڵیدا، بەڵام دەستێکی قووڵ لە ناوەوە گەرووی گرتم و نەیهێشت. ئەو دوو جیهانەی کە بۆ هەتاهەتایە لێکدابڕابوون، نە دەبوو بەریەک بکەونەوە. مەغۆلی تارماییەکی ترسناکی خۆم بوو، ئەو نیوەیەی من بوو کە باغەکان کوشتبوویان، ئەو نیوە سامناکە بوو کە هوشیاری و ویژدان و غەزەل بۆ هەتاهەتایە خەواندبوویان. نیوەیەک بوو لە دەرەوەی من و دوور لە من و دوژمن بە من. دەبوو تا هەتاهەتایە هەروا دوور و نادیار و بێدەنگ بمێنێتەوە، ئارەزوویەکم نەبوو قسەم بۆ بکات و گوێبگرم... دەنگی ئەو

نە دەگەیشتە گوێی من، ئەو لە کۆشکەکانی نوێمیران و من لە باغەکانی خەیاڵدا دەژیام... کە سەیری کورسی و مێز و چلچرا گرانبەهاکانی ئەوم کرد، دڵنیابووم هەموو ئەوەی ئەو لە ژیانیدا بەدەستیهێناوە، هەموو ئەم کۆمەڵە مێز و تەپڵەک و چلچرایەی حیزب بۆی ڕەخساندوە، یەک غونچەی باغەکانی من ناهێنێت. سەیرمکرد و دڵنیابووم نامەوێت هیچ سفرەیەک جگە لە مەرگ کۆمانبکاتەوە. ئەوەی باغ و غەزەل لێکیان جیادەکاتەوە هیچ شتێک نایانتێتەوە بەیەکەوە. کە سەیرمدەکرد تارماییەکی پیر و لەشقورس هاتەبەرچاوم، جانەوەرێکی چڵکن و دێز کە چەند ساڵ لەمەوبەر لەدەستی من بەربووە و هێدی هێدی بۆتە ئەم دڕندە ناشیرین و دزێوە. دەبوو تا هەتاهەتایە بێدەنگ بێت، دەبوو وەک سێبەرێکی قورس و سەنگین هەرگیز نەیەتە زمان و قسەنەکات. بێئەوەی وەلامیبدەمەوە هەستام و دەمانچەکەم دەرهێنا، ساتێکی سەیربوو، سیازدە ساڵ بوو، لەدوای کوشتنی ئەو ژنە بێگوناهەوە دەمانچەم لە ڕووی کەسدا بەرزنەکردبووەوە، ویستم وەک جاری جاران نێچیرەکەم فریای دوودڵی و گومان و ترس نەکەوێت، ویستم ئەو ماوەیەی پێنەبەخشم بتوانێت بیر لە مردن بکاتەوە. بەلام لەو کاتەوەی دەستم بەر دەسکی دەمانچەکە کەوت، لەو ساتەوەی دەستم بە ئاڕاستەی مەغۆلی بەرزکردەوە، وەک موچڕکێکی سامناک بمهەژێنێت، وەک هەموو گوڵەکانی دونیا پەلامارمبدەن، وەک کۆمەڵێک دەنگ لە دوورەوە هاوارم لێبکەن، ژاوەژاوێکی ترسناک لە ڕۆحمدا دروستبوو، شتێک بوو وەک ئەو دۆخەی چەند ساڵێک لە مەوبەر لە یانەی پیاوکوژە بێئیشەکاندا تووشم هات. لە ناکاو سەرم پڕبوو لە دەنگی تەقەی کۆن، لە یادگاری ئەو ناڵە و شریخانەی لە یادەوەریمدا کپ بووبوون، هەناسەم پڕبوو لە بۆنی باروت، باروتی ئەو فیشەکانەی من و مەغۆلی پێکەوە تەقاندبوومان، سەیری دەستی خۆمم کرد و هەڵمی زەمانێکی مردوو و هالاوی قەڕنێکی خوێناویم لە نێوان پەنجەکانمدا بینی، لەترێکم بۆ پێشەوە دا و وەختبوو

بەسەر مێزەکاندا بکەوم. ویستم پەنجە بنێم بە پەلەپیتکەی دەمانچەکەدا و بە ئاگابێمەوە، بەڵام ئەو بۆنی گوڵاوە وەک لێشاو دەهات بەسەرمدا، ئەو بۆنی گوڵاوەی پیرۆز بەردەوام لە دوورەوە بانگیدەکردم، دەیبردم، منی شێتانە ڕادەکێشا، وەک دوای ئەفسونێک کەوتبم چاوم لێکنا و بەرەو مەغۆلی ڕۆیشتم. دەمویست دەست ڕاستبکەمەوە و فیشەکەکان بتەقێنم، بەڵام لەبری ئەوە پێچم خوارد و بەلادا هاتم و کەوتم...

کە دوای چەند سەعات بە ئاگاهاتمەوە، لە ئاسایشی نوێمیران بارۆنی خەیاڵ لەسەرسەرم پێدەکەنی.

## دوا وێستگە
## زستانی ساڵی ٢٠٠٧

کاتێک ماجەلانی ڕاستەقینەیان هێنا بۆ زیندان جگە لەو ئەتڵەسە کۆنەی دونیا هیچی دیکەی پێنەبوو. کاتێک بەو قژە درێژ و باڵا بەرزەیەوە لە دەرگای زیندانەکە هات بەودیودا سامێکی وەها گەورەی هەبوو تەواوی دیلەکان ماوەیەکی درێژ بێدەنگبوون و سەیریاندەکرد، لە سەرکردەیەکی گەورە دەچوو کە لە جەنگدا بەزیبێت و ئێستا بە دیلی هاتبێتە شوێنێک کە شایستەی پادشاکان نییە. لە یەکەم ساتەوە منی خاترجەمکرد و گوتی هەموو منداڵە خەیاڵییەکانی سپاردووە بە ئەفسانە و دڵنیایە لە دەستێکی ئەمیندان. من بە گەرمی هەواڵی شالووتۆفم لێپرسی و گوتی «ئەفسانە سوێندی خواردوە هەر شتێک کە بکرێت و ئەو کوڕە بەختەوەربکات، درێغی ناکات». من و حەسەن زۆر غەمی سەرگەردانبوونی منداڵەکانمان بوو، بەڵام ئەو هەردەم لە دڵسۆزی ئەفسانە و دڵ گەورەیی ئەو خانمە دڵنیای دەکردینەوە. کە یەکەمجار

سەیری دیوارەکانی زیندانیکرد و بە ترسەوە دەستی لێدان بە منی گووت «ماجیدی هاوڕێم بە درێژایی ژیانم لەم دیوارانە هەڵهاتووم، چەند ساڵە لەم دیوارانە هەڵدێم، بەڵام مرۆڤ کە مەحکوم بوو، چەندە هەڵبێت و چەندە دوور بڕوات دێت، هەر دێت و لە هەر دەور و زەمانێکدا بووە، حوکمی خۆی تەواودەکات». پێدەچوو هەموو ژیانی ترسێکی وەها لە دووی بووبێت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دووبارە دەکەوێتەوە وەها زیندانێکەوە. گووتی «سەرتاپا عومرم ئازاد و لە ژێر ئاسمانی پڕ ئەستێرەدا گەڕاوم، تا گەر کەوتمەوە بەندی و بوومەوە دیل، بەرگەی دیوارەکان بگرم...». ئەو ماوەیەی کە پێکەوە لە زیندان بووین، هەیبەت و خۆشەویستی ماجەلانی ڕاستەقینە بەردەوام لە بەرچاوم زیادیدەکرد.

ماجەلانی ڕاستەقینە لە قاوشی سێ بە تۆمەتی کوشتنی غەزەلنوس و حەسەنی پیرۆز لە قاوشی پێنج بە تۆمەتی هەوڵدان بۆ کوشتنی جەعفەری مەغۆلی و من لە قاوشی یازدە بە تۆمەتی دەستدرێژی بۆ ناموس گیرابووین. من و حەسەن گوناهێکی دیشمان لەئەستۆبوو کە تۆمەتی بەشداریکردن بوو لە نوسینی کتێبکدا شەرەفی وڵات و پاکی دەوڵەت لکەداردەکات. ڕۆژێک داوەری گشتی بانگیکردم و کتێبە دزراوەکەی مەرگی پیشاندام و گووتی «ماجید عەبدولڕەحمان گوڵ سۆلاف، تۆ سەروکارێکت بەم کتێبەوە هەیە؟». من بێئەوەی سەیری کتێبەکە بکەم گووتم «بەڕێزی، ئەو کتێبە گەورەیەی جەنابت دەیبینی لاپەڕە لاپەڕە بە دەستوخەتی من نوسراوەتەوە». داوەر هەموو قسەکانی منی تۆمارکرد و گووتی «حەیف بۆ تۆ کوڕم... تا ئێستا تاوانباری وەک تۆ گەمژەم نەبینیوە، وای بەحاڵت کوڕم کە خراپ تێوەگلاویت، بەڕاستی دڵم بە جوانیت دەسوتێت».

ئەگەرچی من خراپ تێوەگلابووم، بەڵام هاتنی حەسەنی پیرۆز و ماجەلانی ڕاستەقینە بۆ زیندان کەمێک لەو دەردەی کەمکردبوومەوە.

ماجەلان لە شەوی یەکەمەوە نەخشەکەی دەرهێنا و دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی گەشتەکانی خۆی بۆ زیندانییەکان. حیکایەتی گەشتەکانی ماجەلانی ڕاستەقینە هێز و تینی دایە منیش بکەومە گێڕانەوەی سەفەرە خەیاڵییەکانی خۆم. ئیدی وای لێهات شەو تەواوی زیندانەکە بە نۆرە گوێی لە چیرۆکی گەشتەکانی من و ئەو دەگرت. گەشتەکانی ئەو چەند گەشتی ڕاستیبوون هێندەش سەفەرێکی درێژبوون بە خەیاڵدا، سەفەرەکانی منیش چەند گەشتی خەیاڵیبوون ئەوەندەش سەرشاربوون بە حەقیقەت، من و ئەو دوو دیوی یەک مەخلوقبووین، دابەشبوونی یەک دونیابووین بەسەر دوو نیوەدا. لە زیندان کەس ناوی ڕاستەقینەی ئێمەی نەدەزانی، هەردووکمان ماجەلان بووین، یەکێکمان ڕاستەقینە و ئەویدیمان خەیاڵی، بەڵام پێکەوە یەک وێنەی جیهانمان بۆ ئەو دیلانە دروستدەکرد کە لە زیندانی تاڵ و تاریکی خۆیاندا دوور لە خەیاڵ و لە حەقیقەت دەژیان. لەو زیندانەدا دەیەها شەوی قەشەنگمان بە گێڕانەوەی چیرۆک و باسکردنی جیهانی جیاواز و ڕەنگاو ڕەنگەوە بەسەربرد. بۆیەکەمجار لەو زیندانەدا و لە چیرۆکەکانی ئێمەدا خەیاڵ و حەقیقەت بەڕاستی ئاشتدەبوونەوە و پێکەوە دەژیان... شەوێک ماجەلانی ڕاستەقینە دەستی بە قژیدا هێنا و پێیگووتم «گوڵ سۆلاف، تەنیا مرۆڤی دیل یان کەسانێک کە بەڕاستی ئازادن دەتوانن خەیاڵ و حەقیقەت پێکەوە ئاشتبکاتەوە، هیچ ژیانێک لە ژیانی مرۆڤی نیوە دیل و نیوە ئازاد ناخۆشتر نییە». دەستی خستە سەرشانم و گووتی «ماجیدی گوڵ سۆلاف، گەر مردم ئەوە لە بیرمەکە... یان بە تەواوەتی دیل بە وەک ئەمرۆ، یان بەڕاستی ئازاد بە... لەوە زیاتر هیچی دی قەبووڵ مەکە». ئێستا زۆر بیری ئەو شەوانە دەکەم... کە تاریک دادەهات سەراپای زیندانەکە بە پاسەوان و بەڕێوەبەری زیندانیشەوە لە دەورمان کۆدەبوونەوە و ئێمە باسی گەشتە ئەفسوناوییەکانی خۆمان بۆ

دەکـردن. بەڕێوەبـەری زیندانەکـە کوڕێکـی دەموچاوپـڕ و ئەسـمەر و دەم بـە خەنـدە بـوو، گەرچـی ئێمـە چاوپێکەوتنمـان نەبـوو، بـەڵام ئـەو جارێـک ڕێـگای بـە ئەفسـانەدا بێـت بـۆ لای ماجەلانـی ڕاسـتەقینە. کـە ئەفسـانە هـات بـە چپـە ئەفسـوناوییەکانی نیـوەی زیندانەکـەی شـێتکرد، دواجـار وازی لـە مێردەکـەی هێنابـوو، بـۆ ئـەوەی شـوو بـە ماجـەلان بـکات. ئـەو هەواڵـی منداڵـە خەیاڵییەکانـی بـۆ هێنایـن و گووتـی بـە کۆمەکـی نەورەسـی خۆشـکت و هەندێـک ژنـی دیکـە هەمـوو باشـن و لـە هیچیـان کـەم نییـە. لـەو ماوەیـەدا دووجـار بارۆنـی بوکەشوشـە سـەردانیکردم، بـارۆن یەکەمجـار زۆر سەرزەنشـتیکردم و گووتـی «پێمگووتـی نوێمیـران دەریایـە. سـەرتاپای شـەپۆلی نهێنییـە. گـەر دڵۆپێـک نهێنیـش دەربهێنیـت هیـچ لـەو دەریایـە تێناگەیـت... تـۆ چ بـێ مێشـکێکیت دەسـتدەبەیت گۆڕێـک هەڵدەدەیتـەوە و لاشـەیەک دەبەیـت... کـێ هەیـە بـە تێگەیشـتن لـە یـەک لاشـە لـەم مەملەکەتـە تێبـگات؟». دواتـر بـە قووڵـی باسـی گوناهـی منـی کـرد. بـەو زمانـە تایبەتـەی خـۆی، تێکسـتێکی درێـژی لەسـەر هێزێکـی گەردونـی بـۆ خوێندمـەوە کـە وادەکات مـن ماجیـدی گـوڵ سـۆلاف بـم، دیلبـم، بـێ پاشـەڕۆژبم، ئەویـش بارۆنـی بوکەشوشـە بێـت، پـڕ شـکۆ بێـت، ئـازاد بێـت و بەختـەوەر بێـت. بـەڕای بـارۆن مـن گـەر لـە سـەرەتاوە گوێـم لـە ڕێنمایـی و قسـەکانی ئـەو بگرتبایـە، تووشـی بەختێکـی وەهـا سـیا و ڕۆژێکـی وەهـا ڕەش نەدەهاتـم. مـن گووتـم «بـارۆن جەنابـت ڕاسـتدەکەیت... مـن تـەواو لـە قسـەکانی ئێـوە تێنەگەیشـتم و ئێسـتا دەبێـت ئـەو سـزایەم قەبـووڵ بێـت کـە ئەنجامـی سـەرەڕۆیی خۆمـە». دەسـتێکی بەڕیشـە سـپییە بریقەدارەکەیـدا هێنـاو بـە چرپـەوە پێیگووتـم «مـن پێمگووتـی، ئـەم شـارە وەک تیبـە نییـە... پێمگووتـی. ئـەو دێـوەی لەبـەردەرگای نوێمیـران وەسـتاوە ئەوانـە دەکوژێـت کـە مەتەڵەکـە دەزانـن، نـەوەک ئەوانـەی کـە نایزانـن. لـە نوێمیـران ئـەوەی مەتەڵەکـە هەڵبهێنێـت دەکوژرێـت. بیرتچـووە وە یـان چـی؟ مـن

یەکەم ڕۆژ ئەوەم پێگووتی... یەکەم ڕۆژ. تۆش بەشێکی مەتەڵەکەت هەڵهێنا... ئەوە بەسە تا دەمریت ڕیسوا و بەدبەختبیت. هەموو وڵاتەکە بە هەڵە دەڕوات. ئەستێرەش بە ڕاستی بەسەر ئەم شارەدا ڕانابورێت، مانگیش خوار تریفەی دەگرێتە ئەم شارە مەلعونە... بەڵام پێمگووتی هیچ بارۆنێک نییە یارییەکەی تۆ قەبووڵبکات، منیش قەبووڵی ناکەم، تۆ منت ڕوو زەرد کرد و پەشیمانیت بۆ هێنام». بارۆن بەڕاستی لە غەمی مندا بوو، وەلێ من دەمزانی هیچی بۆ ناکرێت و ناشوێرێت هیچ بکات، ئەوانی دی زۆر لەو بەهێزتر و بەدەسەڵاتتر بوون. جاری دووەم کە هات بۆلام نامەیەکی تیشکان تامیری پێبوو، گووتی «زۆر بە نهێنی داویەتی بە من. ئاگات لێبێت و دەری نەخەیت». نامەیەکی چکۆلانەبوو، چەند دێڕێکی کورتبوون، گووتبووی من بەڕاستی تۆم خۆشویست. تۆ لە هیچ یەک لەو پیاوانە نەدەچوویت کە من بینیوومن، تۆ لە بارۆنەکان ناچیت، حیکایەتەکانت زۆر خۆشبوون، تۆ زۆر کووری باشیت، تۆ زۆر کوری قۆزیت. بەڵام گەر وام نەکردایە بارۆنی خەیاڵ و بارۆنی مەدەنی لە زانکۆ دەریاندەهێنام و دەریاندەکردم... من یەک ئومێدم هەیە کە بمبوریت و ڕقت لێم نەبێت.

دەمزانی قسەکانی تیشکان لەو درۆ ئەبەدیانەیە کە کچان دوای هەڵە گەورەکانی خۆیان دەینوسن، لەبەر ئەو جۆرە درۆیانەش بوو نەمدەویست بکەومە ئەڤینەوە. ڕۆژێکی باران بوو، نامەکەی تیشکانم لە حەوشی زیندانەکەدا دڕی و بەجێمهێشت لێزمە و ڕەهێڵەی زستان لەگەڵ خۆیدا بیبات. کە بەسەر و ڕوخساری تەڕەوە گەڕامەوە بۆ ژوورەوە دیمەنی فلیمەکەی جێسیکە لانگم هاتەوە یاد، جوانی کوشندەی ئەو کچەم هاتەوە یاد کە نەمدەزانی کێیە و لە کوێوە هاتووە و بۆ دەرهەق بە من ئاوەها بەدبوو.

هەموو زستانی ساڵی دووهەزاروپێنج لەو زیندانەبووین، هیچ هەواڵێک

لــە دادگایکردنمــان نەبــوو. لــە ســەرەتای بەهــاردا سەروفەســاڵی بارۆنــی خەیــاڵ دەرکەوتــەوە. ڕۆژێــک لــە نیســانی ســاڵی دووهەزاروپێنجــدا، بــارۆن هــەر ســێکمانی بانگکــرد بــۆ ژوورێکــی تایبەتــی لــە زینــدان و گووتــی گــەر بمانبەنــە بــەر دادگا حوکمەکانمــان زۆر قــورس دەبێــت، لەبەرئــەوە لــە ئەنجومەنــی بارۆنــەکان و لای جەنابــی ســەرۆک تــکاو پێشــنیاریکردوە بمانبەخشــن بــەو. ئــەو بــە درێژیــی باســی ئــەوەی بــۆ کردیــن کــە چیتــر وازی لــەوە هێنــاوە شــارێکی خەیاڵــی دروســتبکات، گووتــی ئەمــڕۆ خولیــای وەهــای نییــە و جــۆرە ئومێــدی وا پــەروەردە نــاکات، ئێســتا گوندێکــی دێریــن و ڕوخــاوی خــۆی و باپیرانــی هەیــە، گوندێکــی چەپەکــە لەوســەری دونیــا، لــە نــاو چیــا عاســییەکاندا، لــە گۆشــەیەکی ســەختدا کــە چیاکانــی ئــەم دەڤــەرە تێیــدا بەیەکدەگــەن. ئــا لــەو دەڤــەرەدا کــە پشــتی پــادگای گــەورە گــەورەی ســوپای تورکییــە، خۆرهەڵاتــی کۆمەڵێــک بنکــەی گــەورەی پاســدارانە، لەوێــدا دەیەوێــت گوندێکــی چکۆلانــەی بــۆ دروســتبکەین. بــارۆن مانــدوو و بێســەبر هاتــە پێشــچاوم، پێشــتر لــە لێپرســینەوەی هــەر ســێکماندا بەشــداریکردبوو، بــەڵام دوای ئــەو ماوەیــە لەڕتــر و بێکەیفتــر دەمبینــی. هــەر ســێکمان ڕقمــان لێیبــوو، دەمانزانــی ئــەو لــە پشــت کوشــتنی غەزەلنوســەوەیە. ئــەو بەســەرێک دەیویســت لــە هەمــوو دونیامــان دووربخاتــەوە، لــە چیرۆکــە خەیاڵییەکانــی ئێمــە دەترســا کــە شــەوان زیندانــی دەهێنایــە جــۆش، دەترســا ســبەی لەشــکرێک لــە ڕۆحلەبــەری خەیاڵــی لــەم بەندیخانەیــەوە بێنــەدەرێ و بــە هیــچ نەگیرێنــەوە، بەســەرێکیش دەیویســت تــا هەتاهەتایــە لــە ژێــر چاوەدێــری خۆیــدا بیــن. حەســەنیش ڕای وابــوو بــارۆن بــە هــەر نرخێــک بــووە دەیەوێــت بمانــکات بــە کرێــکاری خــۆی... بڕیاریدابــوو بــەو جــۆرە خەیاڵمــان بکوژێــت. یەکێــک لــە بارۆنەکانــی دۆســتی پێشــنیاری ئــەوەی بــۆ کردبــوو بمانخاتــە ژێــر کار، چونکــە گــەر مــرۆڤ بــازوو و جەســتەی ماندووبــوو، ئیــدی خەیاڵاتــی دەمرێــت. قســەکانی بــارۆن بــۆ ئــەوە نەبــوو پرســمان پێبــکات، بەڵکــو بــۆ

ئەوە بوو ئەو بڕیارەمان پێ ڕابگەیێنێت. بەر لەوەی بڕوات کاغەزێکی دەرهێنا و بڕیاری لایەنە باڵاکانی پیشاندایین کە ئێمەیان خستۆتە ژێر ڕەحمەت و بەر ئاموزشی ئەو تا کۆمەکمانبکات ببینەوە بە هاوڵاتی باش. گووتی «سەرۆک خۆشحاڵ دەبێت ببیستێت ئێوە بوونەتەوە بە هاوڵاتی دڵسۆز و نیشتیمانپەروەر».

دوو هەفتە دوای ئەوە، دەمەو بەیانێکی زوو، خۆی و شەش پاسەوان هاتن و ئێمەیان برد بۆ ناو چیا دوورەکان. کات وەها زوو بوو نەدەکرا خواحافیزی لە زۆربەی برا دیلەکانمان بکەین. چوار سەعات بە ئۆتومبیلێکی سەربازی ڕۆیشتین و دواتر لە جێگایەک پیادەبووین و لەوێوە بە پێ نۆ سەعات بە چیایەکی سەختدا سەرکەوتین، ئەوە یەکەمجاربوو لە ژیانمدا دەرەوەی شار ببینم، ئەگەرچی دیلبووم، بەڵام خوماری بینینی سروشت ومەستی بینینی ئەو هەموو چیا گەورەیە بووم. دواجار دەمە و ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە ئەم گوندە، پێدەچوو بارۆن زۆر بیریکردبێتەوە تا گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی ئێمە ڕەوانەی ئەم گۆشە عاسییە بکات کە هیچ مەخلوقێک نەیدەتوانی بە ئاسانی لێی هەڵبێت. ناو کەند و بەردەڵانێکی سامناک بوو، چواردەورمان سەرتاپا لوتکەی وەها سەرکەش و شاخی وەها ساف و بەردەڵانی وەها سەختبوو، هیچ چیابەزێنێکی چاپوک ئاودیویان نەدەبوو، ئەملولامان کەرتە شاخی وەها سەیربوو من ئێستاش کە سەیریاندەکەم لە نیگایان دەترسم. بنکەیەکی پۆلیس لەسەر دەروازەی ئەو تەنیا ڕێگایەدا بوو کە ئێمەی بە دونیاوە گرێدەدا. بارۆن هیچی لەو بارۆنەی جاران نەدەچوو، ئێستا پیاوێکی ڕیش هاتووی ماندوو و نائومێد دەهاتە پێشچاوم، شتێک لە ڕوخساریدا بوو غەزەلنوسی یاد دەهێنامەوە. وەک ئەوەی نیوە بێخەیاڵ و بەدەکەی غەزەلنوس بێت و بەسەر زەویدا وێڵ و ئاوارەبووبێت. ئەو ئێوارەیە لە نزیکەوە سەیرمکرد و گووتم « خوای گەورە، چۆن ئەو هەموو ماوەیە، ئەو لێکچوونەم لە

نێوان ڕوخساری ئەو و غەزەلنوسدا نەبینیوە، چۆن نەمبینیوە؟»․ لەو ساتەدا وەک شێت هەموو ئادەمیزادەکانم بە زنجیرەیەک وێنەی ئاوێنەیی یەکدی دەبینی، مرۆڤم وەک کۆمەڵێک مەخلوقات دەهاتە پێشچاو کە یەک نیوەی دژ و تەواوکاری یەکن، واهاتە بەرچاوم وەک ئەوەی مرۆڤ سەرەتا نوتفەیەکی چکۆلانەبووبێت و تەقینەوەیەکی گەورە کردبێتی بە ملیۆنەها بەشەوە، هەر وەک چۆن ڕۆژێک لە ڕۆژان تەقینەوەیەکی مەزن گەردونی لە پنتێکی چکۆلەی ناو عەدەمەوە کردوە بە ملیونەها ئەستێرە․ مرۆڤم وەک بوونەوەرێکی مەیموننناسا هاتەبەرچاو کە بەردەوام لە ئاوێنەیەکەوە بەرەو ئاوێنەیەکی دی بازدەدات و لە هەر ئاوێنەیەکدا بەشێکی ژیان تاقیدەکاتەوە․ بارۆنی خەیاڵ بێخەبەر لە خەیاڵی من بە غەمەوە گووتی «ئەمە شوێن گوندێکی کۆنە، مەڵبەندێکی دێرینی باب و باپیرانی منە․ هەر کاتێک لە ئاوەدانکردنەوەی ئەم گوندە بوونەوە ئیدی ئازادن․ ئیشبکەن و ماندووبن... شەو و ڕۆژ بنێنە سەر یەک و تەواوی هێز و تێفکرینی خۆتان بنێنە سەر ئیش․ تا ڕۆژێک زۆرتر ئیشبکەن، ڕۆژێک زووتر ئازاددەبن․ تا جوانتر و قەشەنگتر ئیشبکەن، دڵنەرمتر و کراوەتر و بەڕەحمتر دەبم․ گەر خەیاڵی هەڵهاتنیش کەوتە سەرتان ئەوێ سنووری تورکیا و ئەوێش سنووری وڵاتی عەجەمانە... زۆرم بۆ گرنگ نییە گەر لەوێوە هەڵبێن، ڕاکردن لە نیشتیمانیش جۆرێکە لە مردن․ من چیدی باکم بە مردنی خۆشم نییە... هەموو مانگێک چی شتێکتان پێویستە بینوسن و بیدەن بە پاسەوانەکان․ هەموو شتێک دابیندەبێت تەنیا خەیاڵ نەبێت»․

ئیدی لەو ئێوارەیەوە ئێمە بارۆنمان نەبینییەوە․ پاسەوانەکان دەڵێن هەندێجار دێت و لە دوورەوە سەیرێکی ئیشەکانمان دەکات․ دەڵێن بە چەند مانگێک جارێک لەسەر قوتەیەکی چکۆلانەوە بە دووربین لێمان دەڕوانێت... بەڵام لەو کاتەوە ئێمە ڕووبەڕوو بارۆنی خەیاڵمان نەبینیوەتەوە․

ئێستا شەو ورۆژ لەم گوندەدا ئیشدەکەین، سێ پیاوی ڕیشن و تۆزاوین. هەندێجار نەورەسی خوشکم و خانمی چرپە ئەفسووناوییەکان نامەمان بۆ دەنێرن، هەر نامەیەک ئێمە بینوسین و ئەوان بینێرن وشە بە وشە دەخوێنرێتەوە. نامەکانمان جگە لە سڵاو و هەواڵ پرسینی ئاسایی زیاتر هیچی دیکەی تێدا نییە. چەند مانگی یەکەم بەر لەوەی یەکەمین خانوو بۆ خۆمان تەواوبکەین، لە چادرێکی چکۆلانەدا دەژیاین، ئەو ڕۆژەی تەرخونچی هات ئێمە دوازدە خانوومان تەواوکردبوو، گەر بەم خێراییە کاربکەین سالی دووهەزارونۆ بەشێکی زۆری ئەو نەخشە سەرەتایی و چکۆلەیە تەواودەکەین کە بارۆنی خەیاڵ لەسەرەتای کاردا بە پاسەوانەکاندا بۆی ناردین، گرنگترین شت لای بارۆن ئەوەیە لەسەر نەخشەکە ئیشبکەین و خەیاڵی خۆمان بەکارنەهێنین. ماجەلانی ڕاستەقینە وەستای گەورەمانە، ئەو پیاوەی بەدرێژایی ژیانی لە دیوارەکان دەترسا ئێستا کە تەماشایدەکەم دەزانم چ دەست ڕەنگین و چ وردەکار و چ ڕێک تەنافێکە. بەیانیان سەعات هەشت دەچینە سەرکار و شەوان سەعات هەشت دەست هەڵدەگرین، لە نێواندا دوو سەعات بە جیاجیا پشوودەدەین، لەم ماوەیەدا کە پێکەوە دەژین توانایەکی گەورەمان تیا دروستبووە خەیاڵی یەکتر بخوێنینەوە، بە ئەندازەیەک خولیا و خەونەکانمان تێکەڵبوون زۆرجار خەونی یەکتر دەبینین، زۆر شەو کە ماندوودەبین و شەکەت لە سەر جێگاکانمان دەکەوین، من بە خەیاڵ سوار کەشتییەکەی جارانم دەبمەوە و بە ڕوباردا دەڕۆم... زۆر شەو هێندە بیری منداڵە نابیناکان دەکەم، لە ژێر بەتانییەکەمەوە دەگریم. شەوێک زۆر بە کوڵ بۆ منداڵە نابیناکان دەگریام، هەستمکرد حەسەنی پیرۆزیش لەگەڵمدا دەگری. گووتم حەسەنی پیرۆز بۆ دەگریت، گووتی لەبەر ئەوەی وەک تۆ، بیری منداڵە کوێرەکان دەکەم. ئەوکات دڵنیابووم من هەست بە هەرچییەک بکەم ئەوانی دیش هەستی پێدەکەن. دەزانم

ماجەلانی ڕاستەقینە زۆر بیری ئەفسانە دەکات... بەردەوام بیر لە لەشی ئەو ژنە دەکاتەوە، کە سەیریدەکەم دەتوانم هەموو جەستەی خانمی چرپە ئەفسوناوییەکان بە ڕووتی لە خەیاڵیدا ببینم، زۆر شەو تا بەیانی بە خەیاڵ لەگەڵ ئەودا دەخەوێت، هەندێجاریش سوار ئەو ماتۆڕە خێرا و تیژ و بێتورمزە دەبێت، بە هەندێک زەوی و شار و کێڵگەدا سەفەردەکات کە هەندێجار قەشەنگ و هەندێجار زۆر غەمگینن، ئێستا باشتر تێدەگات کوردبوون مانای ئەوەیە تا هەتاهەتایە خەریکی دروستکردنی دیواربیت، ئەو ڕۆژەی لە ماتۆڕەکەی دابەزی و لە دوورەوە بەرەو ئەم شارە گەڕایەوە، دەیزانی دەکەوێتەوە ناو ئەم گەمارۆ گەورەیەی دیوارەکان، بەردەوام کە ئیشدەکات یەک ڕستەی سەیر دەڵێتەوە کە من تێیناگەم، زۆرجار شەویش بە دەم خەوەوە هەمان ڕستە دەڵێت «ئەی دڵ چ بازێکی قووڵت دا بۆ ناو تاریکی... چ بازێک»، کە ماندوودەبێت و جەستەی دەکەوێت هاوار بەخۆی دەڵێت «بێدەنگ... هەر دەبایە بێیتەوە و دیواری زیندانەکەی خۆت دروستبکەیت... ناتوانیت تا قیامەت ڕابکەیت... ناتوانیت». ئەو زۆر لەبەر خۆیەوە قسەدەکات، بەڵام هۆشی هەمیشە تیژ و زیرەکی هەمیشە چالاکە. من هێندە لە ناو خەیاڵەکانی ئەودا سەفەرمکردوە، بە زۆر لەو وڵات و زەمین و ئافرەتانە ئاشنابووم کە ئەو بینیونی، هەستدەکەم ئەویش هێندە بە خەونەکانی مندا سەفەریکردوە بست بە بستی ئەو نەخشە خەیاڵییە گەورەیەی لەبەرە کە لەسەری مندایە. حەسەنی پیزۆ کەمتر بیر لە ژن و سەفەر دەکاتەوە، گەر بمەوێت بۆنی گوڵبکەم دەچم بۆ ناو خەونەکانی ئەو، بەردەوام لەگەڵ کۆمەڵێک پیرێژنی ڕەشپۆشدا لە باغێکی گەورەدایە کە نە مەودای هەیە و نە سنوور، ئەو باغە تاکە نیشتیمانی ڕاستەقینەی ئەوە، لەو باغە زیاتر هیچ شتێکی دیکە لە ژیانیدا نییە. ئەوەتەی لێرەین شبر دووجار نامەی بۆ حەسەنی پیزۆ ناردوە، بەڵام ئەو دەڵێت «بۆ ئەوەی چیدی بیر لە من نەکاتەوە وەڵامی بۆ نانوسمەوە».

هەمیشە پێیدەڵێم ئەوە کارێکی باش نییە، بەڵام ئەو دەڵێت «پێویستە بۆ خۆی بژی و من لە بیربکات». هەموو شەوێک هەر سێکمان لە یەک کاتدا بۆ ماوەیەکی درێژ بیر لە تریفە یابەحری دەکەینەوە، هەر سێکمان لەسەر ئەوە تەبایین کە ئەم گوندە ناو بنێین گوندی تریفە. نەورەسی خوشکم لە نامەیەکیدا نوسیبووی تریفە و کچە مافوورچنەکانی بە چاوی خۆی بینیوە، بەڵام لەبەرئەوەی نامەکانمان وشە بە وشە دەخوێنرێنەوە، نەیتوانیوە هیچی زیاترمان بۆ بنوسێت. من هەندێجار بیر لە تیشکانیش دەکەمەوە و دەڵێم ئاخۆ ئێستا چی بکات؟ بەڵام نا... زۆر بیر لە تیشکان ناکەمەوە، لە بەرئەوەی بیرکردنەوەی زۆر لەو کچە بۆ خەیاڵم باش نییە. کەسمان ناتوانین بیر لە ڕاکردن بکەینەوە، هەر کەسێکمان ڕابکات تەمەنی دیلێتی ئەوانی دی درێژدەکاتەوە. حەسەنی پیرۆز نایەوێت ئەم وڵاتە بەجێبهێڵێت، ماجەلانی ڕاستەقینە دەیەوێت دوا ساڵەکانی ژیانی لەگەڵ ئەفسانەدا بباتە سەر، منیش ناتوانم بە تەنیا هەڵبێم... سەرەتا زۆر بیرم لە هەڵهاتن دەکردەوە، بەڵام هێدی هێدی وازم لەو بیرۆکەیە هێنا و کەوتمە سەر کار. زۆر شەو حەسەنی پیرۆز بە دەنگە ناخۆشەکەی هەندێک لە غەزەلەکانی غەزەلنوسمان بە خراپی بۆ دەخوێنێتەوە... من هەموو هەڵەکانی ئەو بە خەیاڵ ڕاستدەکەمەوە... ئێستا ئێمە شەو و ڕۆژ ئیشدەکەین، گەر وا بڕوات لە چەند ساڵێکی تردا هەموو شتێک تەواو دەبێت. گەر توانیمان ساڵی دووهەزاروده یان یازدە لەم گوندە بێینەدەرێ، ئەوکات نازانم خەیاڵمان چی بەسەر دێت... بەڵام لە ڕاستیدا کەسمان بە تەواوی نازانین کەی لەم گوندە دێینەدەرێ، پێموایە لە پاشەڕۆژدا ئەم گوندە دەبێتە نیشتەجێی بارۆنی خەیاڵ و پاسەوانەکانی... ئێستا ئیشەکانمان زۆر سەختە، هەفتەی دوو ڕۆژ ئیشمان ئەوەیە بە هێسترەکان کەلوپەل سەرخەین، ئەوە سەختترین ڕۆژی کارکردنمانە، خۆشترین کاتی ئیشکردنیشمان ئەو کاتەیە کە هەر سێکمان پێکەوە

هێسترەکان دەبەین و ئاویان دەدەین. هێدی هێدی هەستدەکەم ئیشی زۆر بۆ خەیاڵم خراپە... بەڵام دەبێت ئیشبکەم... لەو ڕۆژەوەی چیرۆکی خۆمان بۆ تەرخونچی دەگێڕمەوە کەمێک هەست بە ئاسوودەیی دەکەم. هەر سێکمان دەزانین تەرخونچی بۆچی هاتووە، شەوێک هەر سێکمان تەرخونچیمان دانا و پێمانگووت تەرخونچی تۆ بۆ ئەوە هاتوویت، نهێنی دیوانەکانی غەزەل و باغە خەیاڵییەکان لە ئێمە دەربهێنیت... بەڵام تا مردن هیچ شتێک لە ئێمە نابیستیت... پێمانگووت، تەرخونچی دێڕ بە دێڕ قسەکانمان و یادگارییەکانمان بنوسەوە، نهێنی باغەکان و کلیلەکانی، شوێنی دیوانەکانی غەزەل و ڕێگای گەیشتن بە کتێبخانە خەیاڵییەکان لە نێوان دێڕ و وشەی چیرۆکەکانماندایە. ئەو پیاوێکی درێژ و باریک و فرەڕووە، هەموو جارێک پێیدەڵێم «تەرخونچی، ئەهریمەن بتبینێت دڵی خۆشدەبێت کە کوڕی وەکو تۆی هەیە و شانازیت پێوەدەکات». ئەو پیاوێکی لەوە بێشەرمترە قسەی بەد و سووکایەتی ئازاربیدەن. لەگەڵ ئەو هەموو خراپەیەی ئەودا، ئێستا بەردەوام چیرۆکی ژیانی خۆمانی بۆ دەگێڕینەوە، ئەوە تاکە ئومێدمانە حیکایەتی ئێمە بە شێوەیەک لە شێوەکان بڕوات و بگاتەوە گوێی خەڵکی ئەم وڵاتە. ئەو وەک سەگێکی بەوەفا بۆ ئاغاکەی، دێڕ دێڕ هەموو شتێک دەنوسێت. من بەردەوام پێیدەڵێم تەرخونچی بەوردی هەموو شتێک بنوسەوە، تیژ و دووربین بیخوێنەوە، دواتر تێدەگەیت باغەکانی خەیاڵ لە کوێن، دەتوانیت بزانیت مرۆڤ چۆن دەتوانێت دەروازەی ئەو باغانە بدۆزێتەوە. من بە ڕاستمە و درۆناکەم، دڵنیام ئەوەی ئەم چیرۆکە بە قووڵی بخوێنێتەوە، دواتر دەتوانێت بگاتە باغەکانی خەیاڵ... جارێک، دووان، سیان، بیخوێنەوە و سەیری ناو ڕۆحی خۆت بکە، لە گوڵە نهێنییەکانی خۆت وردبەرەوە، سەیری ناو لالەزارە شاردراوەکانی دڵی خۆت بکە و تێدەگەیت هێدی هێدی چ دەرگایەکت لێدەکرێتەوە.

بەڕۆژ ئێمە بەردەوام ئێشدەکەین و تەرخونچی سەیرماندەکات. ئەو هەموو فێڵ و مەکرێک بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی بە ئاسانی بگاتە قووڵایی نهێنییەکان، تێکەڵەیەکە لە ماتماتیکناس و پۆلیس. من بەردەوام پێیدەڵێم تەرخونچی بە هەموو فریوەکانی تۆ ڕاهاتووم، بەڵام ئەو بەو زەردەخەنە سەیر و تێکەڵاوەوە، زەردەخەنەی پیاوێک کە دەتوانێت گرفتەکانی سیاسەت و پرسیاری قورسی بیرکاریش شیبکاتەوە، سەیرمدەکات و پێدەکەنێت. ئێستا هەر سێکمان هەموو شتێک لەسەر تەرخونچی دەزانین کە دەیەوێت ڕۆحی ئێمە بپشکنێ و قووڵایی دڵمان بخوێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر سێکمان حەزدەکەین ئەو باغەکانی ناو دڵی خۆی بدۆزێتەوە. ئەو زۆرجار دەکەوێتە قسەکردن لە سەر جوانییە پەنهان و شاردراوەکانی نێو ڕۆحی خۆی. ئێمەش هەر سێکمان باوەڕی پێدەکەین، چونکە هەر سێکمان دەزانین کە مرۆڤ هەمیشە باغێکی جوانی هەیە گەر بیەوێت دەتوانێت بیدۆزێتەوە. بەڵام من هەمیشە گومانێکی قووڵم لەو پیاوانە هەیە کە زۆر سەرقاڵی ماتماتیکن، ڕەنگە هەڵەبم، بەڵام پێموایە دەیانەوێت بە ڕێگایەکی پڕ حیسابات و لە ڕێگای شیکردنەوەی کۆمەڵێک هاوکێشەوە بگەنە بەر دەروازەکانی خەیاڵ. زۆرجار شەوان دەیبینم خەریکی شیکردنەوەی کۆمەڵێک هاوکێشەی دووورودرێژی ماتماتیکە. حەسەنی پیزۆ خۆشی ناوێت، زەردەخەنە و فریو و یاریکردنە سەیرەکانی وادەکەن مرۆڤ هەمیشە بە گومانەوە سەیریبکات، بەڵام من ڕقم لێی نییە... من بەردەوام دایدەنێم و دەڵێم تەرخونچی بنوسە... بنوسە... تەنیا لە ڕێگای ئەم لاپەڕانەوە، لە ڕێگای تێگەیشتنی قووڵەوە لەم پیت و وشە و چیرۆکانە دەتوانیت بگەیتە باغەکان... بنوسە تەرخونچی... بنوسە... بنوسە... بنوسە... تەرخونچی.. بنوسە. ئەوە تەنیا ڕێگامانە... نوسین تەنیا ڕێگای ئێمەیە بۆ نەگەیشتن بە مەرگ... نوسین تەنیا ڕێگای ڕۆژە بۆ نەگەیشتن بە شەو.

# دواهەمین قسەی ناو یاداشتەکانی بارۆنی خەیاڵ

چیرۆکی سەر ئەو خاولییە مەلعونە چیرۆکی من بوو. من بووم لە قووڵایی دڵمدا لە نێوان شاعیر و پادشادا دابەشبووبووم... ئێستا ئەو شاعیرە مەلعونەی ناو ڕۆحی خۆمم کوشت و دەتوانم ئاسوودەبم. ئەو ڕۆژەی لەگەڵ هەندێک یاوەری سەرۆکدا چووین بۆ سەیری ئەو پارچە زەوییە تازانەی شارەوانی بۆ دروستکردنی شاری خەونەکان تەرخانیکردبوون، تێگەیشتم بۆ هەتاهەتایە شاعیر لە ڕۆحی مندا مردوە. لەدوای کوشتنی غەزەلنوسەوە هەستدەکەم ئاسوودەبوونێکی بێبن، بەلام بۆشاییەکی سامناکیش ڕووی لە ژیانم کردوە. ماوەیەکی درێژ ڕۆحم ئاسوودەبوو، هەمووشتێک لە گیانمدا لەزەتی لە خەفەبوونی دێوەزمەی شاعیران دەبینی. دوای کوشتنی غەزەلنوس سێ مانگ چووم بۆ ئەوروپا، ئەمریکییەکان ڤیزەیەکی کراوەیان بۆ وەرگرتم و گەشتێکی شاهانەم بە شارە جوانەکانی دونیادا کرد، چووم بۆ ستۆکهۆڵم، کۆبنهاگن، هامبورگ، بەرشلۆنە، پراگ... کاتێک لەو شارە قەشەنگ و جوانانەدا سەرمدەخستە سەرسەرین وەها خۆشحاڵبووم تەفسیرم بۆ ئەو هەموو بەختەوەرییەم نەبوو. هیچ لەزەتێک لەوە شاهانەتر نییە، لە ناو دڵتدا شاعیرێک نەبێت شەوان بتخاتە سەر ڕاڕایی و بەئاگات بهێنێتەوە. لەو ساتەوەی غەزەلنوسم کوشت و حەسەن تۆفان و زوهدی شازەمانم گرت، بڕیارمدا وەک پادشاکان بژیم. هەستمکرد شەڕ تەواوبووە و شاعیران و خەیاڵکاران دۆڕاون و سزای غروری خۆیان وەردەگرن. کە گەڕامەوە بڕیارمدا هەر سێ زیندانییەکەی خۆم بنێرم بۆ جێگایەک، ئیش و دەرد هێدی هێدی

خەیالاتیان لە بیربەریتەوە. ڕۆژ دوای ڕۆژ دلڕەقتر دەبووم، بڕیارمدا بەپێی ئەو نەخشەیەی خۆم شارێک دروستبکەم خالی بێت لە خەیال، بەڵکو پڕبێت لە شکۆ و جاموجەلالی شاهانە، شارێک پڕبێت لە جادەی درێژ و باڵەخانەی بەرزی فرەنهۆم کە مرۆڤ لە پەنجەرەکانییەوە بتوانێت تەنیا دیواری باڵەخانەکانی دی ببینێت. ئەندازیار و وەستا و کرێکارە پڕ خەیاڵەکانم ناچارکرد بەیانی تا نیوەشەو بەرد بکێشن. برایانی دولبەرم ناچارکرد دەیان دۆنم زەوی، بۆمن و بارۆنەکانی دۆستم درەخت لەدوای درەخت سەوزبکەن. شتەکانم وامەحکەم چنیبوو، هەتا حیزبە نەیارەکان و ڕۆژنامەنوسە بزێوەکانیش سوسەی هیچیان نەکرد. خەڵکانێکم دامەزراند ئیشیان تەنیا ئەوەبوو ئەو گولانە کۆبکەنەوە کە بەشێوەیەکی سەیر و نائاسایی بەشەو لەسەر گۆڕەکەی غەزەلنوس دەباری. هەموو شتێکم خۆش و بێغەم هاتە بەرچاو تا ئەو ئێوارەیەی بە تەنیا لە ماشینەکەمدا لە نێوان مەکتەبی کاروباری ئاوەدانی و ماڵەوەدا بە ڕێگاوە بووم، لە ناکاو ئەو دیمەنەم بینی کەسەر لەنوێ منی خستەوە سەر کەڵکەڵەی خەیال. دەڕۆیشتم و لە باغێکی چکۆلە و پەژمووردەدا ئەو خانمە مافوورچنانەم بینی کە فەرشێکی ئاسمانیان دەڕست، بینیم هەندێ گەنج و کوڕوکاڵ لە نزیکەوە سەراسیمە سەیریاندەکەن. سەرەتا بە ڕێشکەوپێشکەی چاو تێکەیشتم و وامدەزانی هەندێ گەمەی ماندوێتییە، بەلام لە نزیکەوە دەستەیەک خاتوونی تەنک و ڕوون و قەشەنگم بینی کە لەسەر تەونێکی گەورە فەرشێکی خوداییان دەچنی. هەر کەسێک ئەو مافوورەی دیبێت وایزانیوە لە قوولایی مەلەکوتەوە هاتۆتە خوار، مافوورێک هەموو سیحرێکی ئەم دونیایە و هەموو جوانییەکی ئەم گەردونەی تێدابوو... پڕبوو لە کۆتری زێڕین و کەوی وەنەوشەیی، پۆڕی تەلا و نەورەسی بلورین، ئاسکی ڕاکردوو بە هەردەکاندا و درەختی بلند تا ئەندازەی

مانگ. هیچ وشەیەک و هیچ هێزێک نییە بتوانێت جوانی ئەو مافوورە و قوولایی ئەو خەیالە و دووری ئەو خەونە باسبکات. من لەوێدا تریفە یابەحریم بینییەوە... لەوێدا تێگەیشتم هیچ وەخت نەمتوانیوە خەیال بکوژم... ئەوەی کوشتوومە تەنیا ئەو نیوە شاعیرەی ناو ڕۆحی خۆمە کە لە منداڵییەوە ڕاومدەنێت. ئەو ڕۆژە و ڕۆژانی دواتر وەک شێتم لێهات، کوچە بە دوای کوچە شار دەگەڕام و گەڕەک بە دوای گەڕەک دەسوڕامەوە، تەنیا ئومێدم ئەوەبوو جارێکی تر لە سەر شەقامێک و لە کوچەیەکی تردا ئەو مافوورە خەیاڵییە ببینمەوە، بەڵام بێسوودبوو. هەستمکرد بینینی ئەو مافوورە هەموو غرورر و شکۆمی شکاند و تێکەڵ بە خاک و خۆڵی کرد. تەنیا چەند ساتێکی کورت لەبەردەم ئەو فەرشەدا بەسبوو بۆ ئەوەی تێبگەم چەند دۆڕاوم، چ سەرکەوتنێکی بچوک و ناچیزن ئەوانەی من تۆمارمکردون. لەو ڕۆژەوە دەستمکرد بە خواردنەوەیەکی بێمانا و شێتانە. شەوێکیان ناردم بە دوای تەرخونچیدا و پێمگووت بڕۆ و نهێنی ئەو باغانەم بۆ بهێنەوە. یەک ساڵی ڕێک ناردم بۆ ئەو چیا دوورانە، لەوێ گەلێک نهێنی گەورەی بۆ ئاشکراکردم، لە ماوەی ئەو ساڵەدا بەردەوام هەموو وشە و هەموو گوزارە و هەموو چیرۆکێکی بۆ دەنوسیمەوە. هەزاران لاپەڕەی بۆ هێنام بیخوێنمەوە، دەیگووت نهێنی و کلیلی باغەکان لە ناو ئەم چیرۆک و خەیاڵ و سەربوردانەدایە، دەیان شەو تابەیانی دانیشتم تا یادگار و یاداشتەکانی حەسەنی پیزۆ و ماجەلانی ڕاستەقینە و ماجیدی گوڵ سۆلاف بخوێنمەوە... بەڵام هەرگیز پەییم بە کلیلی ئەو باغانە نەبرد کە دەبوو وەک شفرەیەکی نهێنی لە ناو ئەو چیرۆکانەدا خەوتبێت. کۆمەکم لە حەکیمەکان خواست و هانام بۆ عاریفەکان برد و سوودی نەبوو، لەگەڵ چەندە پسپۆڕی کلاسیکیات و ئەدەبیاتی نوێ و باغناسی شارەزادا دانیشتم و بەهیچ نەگەیشتین، لەگەڵ مامۆستاکانی

فیزیک و ماتماتیکدا لە زانکۆ هەموو شتێکم تاووتوێکرد و نەگەیشتینە ئەنجام. کەوتمە ناو بەحری کلاسیکیات و کتێبی «حدائق السحر فی دقائق الشعر»ی ڕەشیدەدینی وەتواتم سەرلەبەر خوێندەوە و کارێکی بەدەردی منەوە نەبوو، بە کۆمەکی فارسیزانێکی بلیمەت چەندین هەفتە سەرقاڵی وردبوونەوە و خوێندنەوەی کتێبەکەی شەرەفەدینی رامی «حقائق الحدائق» بووم، بەوەوە نەوەستام کتێبی« انیس العشاق» ـەکەشیم خوێندەوە کە لە شاری مەراغە نوسیوویتی، وەلێ شتێکم دەستنەکەوت دوور و نزیک بمباتەوە بۆ سەر ئەم باغانەی غەزەلنوس. هەتا تێشنەگەیشتم وشەی باغ لە ڕاستیدا چ مانایەکی هەیە. ئەوە هێندەی دی تورەیکردم و لە دەردی خزانم. لە زەمانی بابلەوە چی شتێک لەسەر باغ نوسراوە پەیدامکرد و سوودی نەبوو... من دڵنیابووم نازانم وشەی باغ مانای چی... ئەوە دەردی من بوو هاوڕێم... ئەوە دەردی من بوو... من ئێستاش نازانم باغ مانای چی... نازانم و ئەوە دەردم سەختتر و ژانم قووڵتر دەکات. ماوەیەکە خراپ خۆمداوەتە مەستی، هەندێجار کە سەتەلایتی حیزب بانگمدەکات بڕۆم و سیاسەتی جیهان بۆ بینەران شیبکەمەوە، بە مەستی دەچم. مەستی و غەم وایانکرد دڵم بۆ هەموو کەسێک بکەمەوە، وەک شێت بە هەموو کەسێکم دەگووت من غەزەلنوسم کوشت. دەیانجار لە نوکەوە هەموو حیکایەتەکەم دەگێڕایەوە و دڵنیابووم دوژمنەکانم و نەیارە سەرسەختەکانم لە حیزبدا وشە بە وشە هەمووی تۆماردەکەن. سەرەتای بەهاری ساڵی دووهەزاروحەوت تەرخونچی بێحاسڵ لە چیا هاتەخوارێ و ئیدی نەگەڕایەوە بۆ ئەوێ... من لە پاداشتی ماندووبوونیدا کردم بە سەرنوسەری یەکێک لە ڕۆژنامەکان تا لەوێوە درێژە بە خزمەت و ستایش و دڵسۆزی خۆی بدات بۆ من و بارۆنەکان. ئێستا لەگەڵ هەموو بەدمەستی و ڕەفتارچەوتیمدا گۆڕانکارییەکانی ناو حیزب

ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر و زیاتر دەمبەنە پێشێ. سەرکردە مەزنەکانی ئەم نەتەوە جاویدە حەزیان لەوەیە ئەو پیاوانە بەرزبکەنەوە کە لە هەموو لایەکەوە دەڕوخێن. بەڵام من توند لە ژێر چەتری سەرۆک خۆیدام، وەک کوڕی خۆی و منداڵی بە ئەمەکی خۆی سەیرمدەکات. کەچی لەگەڵ هەموو ویقار و پلەوپایەیەکدا من هەر خەیاڵم لای ئەوانە... وەک ئەوەی هەرگیز ئەو ئەسپە سپییە نەکوژرابێت... وەک ئەوەی بەردەوام لە بەردەم ماڵەکەی مندا سمکوڵانبکات و لە دیدی من دوورنەکەوێتەوە. ئەو چیرۆک و یاداشتانەی تەرخونچی لە چیا هێنایە خوارێ، لەسەر زۆر نهێنی چاویانکردمەوە کە پێشتر نەمدەزانی. بە کاریگەری ئەو چیرۆکانەبوو وریابوومەوە و وەک فیرعەونێکی خەوالوو لە خەو ڕاچلەکیم. هەوالگر و چاوە نهێنییەکانی خۆمم ڕاسپارد هەر منداڵێک بە دێڕێک شیعرەوە لەسەر سینەی لە دایکبوو بۆم بهێنن، گەر ئەو یاداشتانە نەبایە من دەرکم بە بنی ئەم نهێنییە نەدەکرد. عەتارم ڕاسپارد بۆ ئەو منداڵانە بگەڕێت کە بە دێڕێک غەزەلەوە دێنە دونیا. دوای هەفتەیەک منداڵێکیان بۆ هێنام، هەوالگرێک لە خەستەخانەی منداڵان بینیبووی. کچێکی چکۆلانەبوو. کەبینیم سەرەتا باوەڕم نەکرد و دوو چاوانی خۆم بە درۆخستەوە و گووتم ئەی بینایی خەتاکار کوێربە و درۆی وام لەگەڵ مەکە. کوڕپەکە ئاشکرا دوو بەیتی قەشەنگ لەسەر سینەی نوسرابوو، کە هەرگیز لە یادیان ناکەم:

پەریزادەی سەر بەحر و بەڕ، ئەی کیژی خەیاڵ و خەتەر
هەڵگری موعجیزەی عەشق، زادەی ناو گوڵدانی قەدەر
دڵت غەمگین و موسافیر، نیگات پڕە لە ئەشکی تەڕ
غەزەل بتپارێزێت لە بەد، خەیاڵ بتپارێزێت لە شەڕ

بەسەرسامی ئەو مەلۆتکەیەم هەلگرت و چووم بۆ لای سەرۆک. بێپرس وەک شێت خۆم کرد بە دەربارێدا و پێمگووت نەوەیەک لەم خەیاڵزادانە لەدایکدەبن، نەوەیەک لەم مەخلوقاتە ترسناکانە ڕۆژ بە ڕۆژ دێنە دونیاوە و تۆ خەوتوویت، هەر دەسەلات و حوکمڕانێک بێت و بڕوات ئەمانە بە خەیاڵ و شیعر و غەزەل ماندوویدەکەن. مەلۆتکە کچەکەم بۆ کردەوە و پیشانمدا. سەرۆک وەک هەمیشە گەشبین و خۆشبین دەیڕوانی، گووتی یانی چی بارۆن تۆ لە دێڕێک شیعر لە سەر سینەی مەلۆتکەیەکی سێ ڕۆژە دەترسیت؟ شێتبوویت یان عەقڵت سەنتەری نەماوە؟ من حیساب بۆ دە کتێبی شیعریش ناکەم، تۆ لە دێڕێک شیعری سەر سنگی کۆرپەیەک زیرەتکردوە... خەریکە پیاوەتی و جوامێری خۆت لەدەست دەدەیت، ئاگاداربە.

دڵنیابووم سەرۆک نازانێت من باسی چیدەکەم... دڵنیابووم.

بێئەوەی گوێبدەمە بێباکی ئەو، گەڕامەوە و خەلکە دڵسۆزەکانی خۆم ڕاسپارد هەر منداڵێکی وەهایان بینی، هەر کۆرپەیەک بە نیشانەیەکی لەو جۆرەوە لە دایکبوو، لەسەر سجلەکانی نفوس دیارییبکەن و ناویم بە ڕەنگێکی دی بۆ بنوسن. دەبوو خزمەتێک بەوانەبکەم کە دوای من دێن و دەچنە شەڕی ئەم ڕۆحلەبەرە خەیاڵییانەوە... دواجار پادشاکان ئەگەر لەگەڵ یەکدا دوژمنیش بن، هێشتا بەرابەر بە شاعیران هەر بران.

لەگەڵ هەموو ئەو ڕوداوانەشدا هەرگیز ئەو وەسوەسەیەم تیا نامرێت کە بگەمە باغەکانی خەیاڵ. ئێستا شەو و ڕۆژ لە جەنگی ئەوەدام ئەو خەیالەم بیربچێتەوە. هەموو ڕۆژێک دەچمە سەر شوێنی شاری خەونەکان و بە ئەندازیارەکان دەلێم پەنجەرەکان بچوکتربکەنەوە... ڕووبەری باغەکان بچوکتر بکەنەوە... پێیاندەلێم جێگایەکی قایمم بۆ دروستبکەن، جێگایەک خەیال نەیگاتێت... دوێنێ شەو بەمەستی هەموو ئەندازیارەکانم کۆکردەوە و پێمگوتن دەبێت کۆشکێکم بۆ دروستبکەن

**لە شوێنێکی سەختدا، لە ناوەڕاستی شارێکی کۆنکرێتی گەورەدا کە خەیاڵ دەستی پیانەگات و وەسوەسەی نەگاتە ئەوێ. شوێنێک کاتێک بە ڕێگا و ڕیواقیدا پیاسەدەکەم، غەزەلەکانم بە بیردا نەیەت و مافوورە سیحراوییەکانم نەکەونەوە بیر...**

**خودای بالانشین کۆمەک بە ڕۆحم بکە، لە چاکە و لە گوناهدا یارمەتیدەرم بە... لە پیسی و پاکیدا دەستم لێبەرمەدە... حیسابی چاکە و خراپەم بۆ مەکە... بە گەورەیی و حیکمەتی خۆت تێمبگە.**

## کۆتایی

ئێستا کە هەموو شتێک تەواو بوو، کە گەیشتینە دواهەمین لاپەڕەی ئەم کتێبە، لە کاتێکدا دەمەوێت بە هێمنی بەجێتان بهێڵم، کۆمەڵێک ڕاستی هەیە دەبێت بیزانن و لە نزیکەوە ئاگاداریبن. چیرۆکی ڕاستەقینەی من لەگەڵ ئەم کتێبەدا ئەو ڕۆژە دەستی پێکرد کە چووم بۆ لای خاوەن ئوتێلەکە تا لە چاوەدێری ژنەکەیدا کۆمەکی پێبکەم. ئەو کات بێکاربووم و هەر کەسێک کارێکی پێبسپاردمایە لە ناچاریدا دەمکرد. ئەوەبوو ڕۆژێک لە ڕۆژانی ئەیلولی ساڵی دووهەزاروچوار، کەسێکی سیاسەتمەداری گەورە کە بە خزمایەتییەکی دوور دەمانگاتێ، منی بە عەتار ناساند و پێیگووت من کوڕێکی وریام و دەتوانێت لە کار و چاوەدێریدا ئیشی سەختم پێ بسپێرێت. عەتاریش منی نارد بۆ لای ئەو خاوەن ئوتێلە و گووتی «بزانە ژنەکەی چ دەردێتی». لەسەرەتادا ئیشکەرێکی چکۆلانەی عەتاربووم، یەکێکبووم لە لەشکرە گەورەکەی ئەو. لە یەکەم ڕۆژەوە بە وریایی دوای خانمی ئەفسانە کەوتم... لە هاتن و لە چوونیدا بە دوایەوەبووم. زۆر زوو گەیشتمە ئەو ڕاستییەی، ئەفسانە لەگەڵ پیاوێکی باڵابەرزی قژ درێژدا

خیانەت لە مێردەکەی دەکات. بەڵام شتێک لە ناخمدا پێیگوتم کە نابێت ئەو نهێنییە بدرکێنم. من چەند جار خانمی ئەفسانەم دەبینی وەها قەشەنگ و پڕ ئەفسون بوو، نەمدەتوانی ئازاریبدەم. بەڵام نەشمدەتوانی دەست لە هەڵکۆڵینی ژیان و پشکنینی ئەو دیوە تاریک و نهێنییەی پەیوەندییەکانی هەڵگرم. لەزەتێکی زۆرم لەوە دەبینی کەئاوها لە نزیکەوە ئاگاداری ورد و درشتی ئەو پەیوەندییە حەرامەی ئەو بووم. لێتان ناشارمەوە کە هەڵکۆڵین و تێڕامان لە پەیوەندییە حەرامەکانی مرۆڤ هەمیشە یەکێک لە خولیا هەرە گەورەکانم بووە. عەتار لەشکرێک لە کەسانی وەکو منی هەبوو کە ئیشمان تەنیا سەیرکردن و هەڵدانەوەی نهێنییەکانی ژیانی خەڵک بوو. ڕۆژێک دوای خوێندنەوەی شیعرێک، عەتارم وەکو پیاوێکی پیس و ئەو یارییەشم زۆر چەپەڵ هاتە پێشچاو، ناچار چوومە بەردەمی ئەو ژنە قەشەنگە و پێمگووت «خانمی ئەفسانە چەند وەختە مێردەکەت منی خستۆتە دوای تۆ، من یەکێکم لە بەردەستەکانی عەتار و زۆر شت لە سەر پەیوەندی تۆ و ئەو پیاوە دەزانم. بیکە بە خاتری جوانی خۆت و ئاگادارییە، من لەمڕۆوە ئەو ئیشەناکەم، بەڵام دڵنیام مێردە گولەکەت کەسێکی دی دەخاتە دوات کە هەر خوا دەزانێت کێیە و چۆنە». خانم بەو دەنگە سیحراوییەی خۆی سوپاسیکردم و گووتی هەرگیز ئەو چاکەیەی منی بیرناچێت. دواتر ئەو ئاگادارییەی من بەهانەیەکی گەورەبوو تا خانمی ئەفسانە تەواو لە مێردەکەی جیاببێتەوە. لەو بەینەدا سیمای ئەو گەڕیدە گەردونییەش کە ئەفسانە خۆشیدەویست ئێجگار سەرەنجی ڕاکێشابووم. وەک چۆن کەوتمە دوای ئەفسانە کەوتمە دوای ئەو پیاوەش، پاش ماوەیەکی لە چاوەدێری، لە هەلومەرجێکی ئاڵۆزدا لە هەمان ئەو ماڵەدا کە دۆستەکەی خانمی ئەفسانە تیا دەژیا غەزەلنوس کوژرا و ئەو پیاوە قژدرێژەیان بە تاوانی کوشتنی ئەو دەستگیرکرد. من دەمزانی سەرجەمی حیکایەتەکە هەڵبەستە و ئەو پیاوە بێگوناهە. جارێک بە ناوی سەردانی

هاوڕێیەکمەوە چووم بۆ بەندیخانە و لەوێ بینیم، بەڵام خۆم ئاشکرانەکرد و تەنیا وەک نەناسێک سڵاوم لێکرد. فزوولی زۆرم بۆ تێگەیشتن و سەلماندنی پاکی زوهدی شازەمان وایانکرد زۆر لە خانمی ئەفسانە نزیکببمەوە و ببم بە یاریدەدەرێکی خۆبەخشی لە سەرپەرشتیکردنی ماڵی منداڵە خەیاڵییەکاندا.
لە زستانی ساڵی دووهەزاروپێنجەوە لەو ماڵە کۆنەی غەزەلنوسدا لەگەڵ خانمی ئەفسانەدا کاردەکەم. ماڵەکە بۆنێکی تێکەڵاوی لە بۆنی گوڵ و کتێب هەیە... مرۆڤ گەر چاو بنوقێنێت و بڕوات هەندێجار واهەستدەکات بە ناو باغێکی نهێنیدا دەڕوات، هەندێجاریش بۆنی دەستنوسی کۆن و بەیازی قەدیم لە هەموو شتێک دێت. ئەوەی لە خانمی ئەفسانەوە نزیکم و هاوکاریدەکەم، لەهەمانکاتیشدا پێیناگەم و ناتوانم دەستم بە جوانییە سیحراوییەکەیدا ڕابگات، جۆرە ئیشتیاقێکی ڕۆحی تایبەتی بۆ دروستکردوم، ئەوە وادەکات ئیشەکەی خۆم خۆشتربوێت. ئەوکاتانەی ئەو کاری هەیە من ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی منداڵەکان دەکەم. خەیاڵوان ئەمساڵ دەچێت بۆ زانکۆ، کوڕێکی بێدەنگە کە بە دزییەوە شیعر دەنوسێت. زۆرجار دەبینم دیوانی کۆنی شیعری بەدەستەوەیە کە نازانم لە کوێیان دەهێنێت. لێیناپرسم ئەو دیوانانە لە کوێوە دەهێنیت... چونکە دەزانم پێم ناڵێت.
لەو دوو ساڵەدا خانمی ئەفسانە زۆرجار دامدەنێت و باسی جەمعییەتی ژنانی سەرگەردانم بۆ دەکات، باسی ئەوەم بۆ دەکات کە ئێستاش هەمیشە کۆدەبنەوە، دەگرین و سەمادەکەن، باسی ئومێد و بێئومێدی ژنە غەمگینەکانی ئەم شارە دەکەن، ئەوان ئێستاش بەردەوام گوڵ دەبەنە سەر گۆڕی غەزەلنوس. جارجار خانم مەلۆتکەیەکی نوێ دەهێنێت و من و ئەو پێکەوە لە قوماتەی دەردەهێنین و هەر دووکمان سەرسامانە ئەو دێڕە غەزەلانەی سەر سنگیان دەخوێنینەوە. لەوحێکی گەورەمان لە ژوورە دێرینەکەی غەزەلنوس هەڵواسیوە، هەر منداڵێکی نوێ کە دێتە ئەم ماڵەوە، بە خەتێکی قەشەنگ ناوی خۆی و غەزەلەکەی سەر سینەی و

ڕۆژی هاتنــی لەوێــدا تۆماردەکەیــن. ئەفســانە دەڵێــت زۆربــەی جەمعییەتــە خەیاڵییــەکان بــەرەو مــردن دەڕۆن، تەنیــا جەمعییەتــی ژنانــی پەژمــوردە و غەمگیــن نەبێــت کــە هەمیشــە گەورەدەبێت. مــن بەرابەری دادەنیشــم و بەردەوام گــوێ لــە چپــە ئەفســوناوییەکانی دەگــرم. گوێدەگرم و هەرگیــز لە بیســتنی ئەو چرپــە ســیحراوییەی بێزارنابــم. زۆر شــەو کــە پێکــەوە دادەنیشــین باســی خۆشەویســتی خــۆی بــۆ زوهــدی شــازەمان دەکات، ئــەو پیــاوەی کــە بــە بــڕوای ئــەو بۆنــی بــەرد و درەخــت و دەریاکانــی ســەر ئــەم ئەســتێرەیەی لێدێــت. مــن هەمیشــە گوێــی لێدەگــرم و وەڕزنابــم. یەکەمجــار شــبر مســتەفاشــم لــە ڕێــگای خانمــی ئەفســانەوە ناســی، شــبر جارجــار دەهــات بــۆ ئــەوەی هەواڵــی حەســەنی پیــزۆ لــە خانمــی ئەفســانە بپرســێت، ئــەو بــۆ یەکەمجــار ئەرشــیفی یاداشــت وچیرۆکەکانــی خســتە بەردەســتی مــن و گووتــی « ســەر و دەر لــەم هەمــوو کاغــەزە دەرناکــەم و پێویســتیم بــە کۆمەکــی تــۆ هەیــە». هەمــوو ئــەو یاداشــتانەی تەرخونچــی لــە مــاوەی ســاڵێکدا لــە چیــاکان بــۆ بارۆنــی خەیاڵــی کۆکردبــووەوە، لەگــەڵ چەندەهــا کاســێتی بچوکــدا کە تــەواوی قســەکانی بارۆنی خەیاڵــی تێدابــوو، یەکێــک بــە مەبەســت و بــۆ شــکاندنی باڵــی تەکەتولــی گەورە لــە حیزبــدا لــە بارۆنــی خەیاڵــی دزیبــوو. تــەواوی فایلــەکان گەیشــتبوونە بەردەمــی مێــزی بەڕێوەبــەری ئاسایشــی کــۆن، ئەویــش بــۆ ئــەوەی شــەڕی باڵەکانــی نــاو حیــزب گــەرم نــەکات و خۆشــی نەخاتــە بــەر تەقــەی ئاشــکرا، هەموویانــی لــە ژێــر زەمینێکــی تایبەتــدا هەڵگرتبــوو. دواتــر کــە گۆڕانــکاری لــە پۆســتەکاندا ڕوویانــدا و بەڕێوەبــەری ئاســایش گوازرایــەوە بــۆ شــوێنێکی تر، یار و یاوەرێکــی نزیکــی ئــەو کــە ئاگاداربــوو جەنابــی بەڕێوەبــەر لــە غەمــی خــۆی هەمــوو شــتێکی بیرچۆتــەوە، ئــەو فایلــە و هەندێــک فایلــی دیکــەی زۆر گرنــگ دەردەهێنێــت و لــە شــوێنێکی نەزانــراو قایمیاندەکات. ڕۆژێــک فــزوڵ هەڵیدەگرێت و دەکەوێتــە تەماشــاکردنی فایلــەکان. لــە نێــو یەکێکیانــدا کۆمەڵێــک وێنــە دەدۆزێتــەوە کــە پێدەچێــت هەموویــان بــە کامێــرای ڕەشــید تەرخونچــی گیرابــن،

وێنەی سێ کرێکاری ڕیشهاتووی تۆزاوی کە لە ناو کۆمەڵێک چیای عاسی و لووتکەی بەفراوی و سەختدا لەسەرمای زستاندا بەدەستکێشی ئەستوورەوە خەریکی بەستنی شیشی سەقفی بینایەکن، سەرەنجی ڕادەکێشێت. کابرا حەسەن تۆفان لە وێنەکەدا دەناسێتەوە، پێشمەرگە ئازا و بێکەسەکەی نیشتیمان، ئەو کوڕە غەمگین و تەنیایەی بەردەوام پاڵی بە عەرەبانەکەی شبری قژ زەردەوە دەنا. ئەو کوڕە ڕاستە و ڕاست تەواوی فایلەکە لە کارتۆنێکی گەورەدا هەڵدەگرێت و دەیبات بۆ لای شبر. من و شبر بەدرێژایی پێنج مانگی تەواو خەریکی نوسینەوە و چاکردن و ڕێککردنەوەی ڕستەکانی ئەو چیرۆکە بووین... لەو ماوەیەدا کە خەریکی پێداچوونەوە و داڕشتنەوەبووین زۆر هەوڵمدا بگەمە نوێمیران و لەوێ بەچاوی خۆم ئەو کتێبە گەورەیەی مردن ببینم کە دەڵێن بارۆنی خەیاڵ لە خەزنەیەکی تایبەتیدا هەڵیگرتووە و قفڵیداوە. بەڵام من نە ئەو توانایە و نە ئەو ئازایەتییەشم هەیە کە کەسانی قارەمانی وەک ماجیدی گوڵ سۆلاف هەیانبوو، ئەوەندەم پێکرا شەوێک بە بیانووی گەڕان بۆ هاوڕێیەکی نزیک چووم بۆ یانەی پیاوکوژە بێئیشەکان و لەوێ مورتەزای شەیتانم بینی لەسەر مێزێک دەیخواردەوە و سەمایدەکرد. هێند مەستبوو نەدەکرا هیچی لەگەڵدا بڵێم. من و ئەفسانە زۆر هەوڵماندا بگەینە بارۆنی خەیاڵ و تکای تیابکەین ڕێگامان بدات بۆ چەند سەعاتێک دیلەکان ببینین، بەڵام بارۆن بە یەکێک لە یاوەرەکانیدا وەڵامی بۆ ناردین کە بیر لە کاری وا نەکەینەوە و دەست لە خولیای وا هەڵگرین. چەند ڕۆژێک لەمەوبەر کۆمەڵێک ڕۆح و ڕوخساری سەیر هاتن بۆ لای من و ئەفسانە و گوتیان ئێمە «دەفتەردارەکانین»، داوایان لە من و خانمی ئەفسانە کرد یارمەتیانبدەین دەست بە نوسینەوەی ئەو کتێبە گەورە و ناکۆتایەی مردن بکەنەوە. من و خانمی ئەفسانە سەیری یەکدیمان کرد و نەمانزانی چییان وەڵامبدەینەوە، من گوتم کە دەبێت بیرێکی وردی لێبکەینەوە... ئێستا من و ئەفسانە زۆر

بیـر لـه دەفتـەردارەکان دەکەینـەوە... شـەو و ڕۆژ بیریـان لێدەکەینـەوە، بێئـەوەی بتوانیـن بڕیاری وەهـا بدەیـن. ئێسـتا جارجـار دەچـم بـۆ لای شـبر، بەهێمنـی پـاڵ بـە عەرەبانەکەیـەوە دەنێـم و بـە شـەقام و کوچـە و گوزەرەکانـی شـاردا دەیگێـڕم، هەندێجـار پێکـەوە ئـەو خاولییـە خوێناوییـە دەردەهێنیـن و سـەیریدەکەین، هەردووکمـان هەستدەکەین ئێسـتاش بۆنـی خوێنێکـی گـەرم و نوێـی لێدێـت. شـبر ئێسـتا زۆر لـە جـاران ئارامتـرە، هەندێـک شـەو کـە دێـت بۆ لام هەستدەکەم بۆنـی باغێکـی گـەورە و بێسـنووری لێدێـت. کـە دێـت بـۆ ماڵـە کۆنەکـەی غەزەلنـوس منداڵـەکان دەچنـە باوەشـی و پـاڵ بـە عەرەبانەکەیـەوە دەنێـن، ئەویـش چیرۆکیـان بـۆ دەگێڕێتـەوە... چیـرۆک لـە دوای چیـرۆک، تـا هەمـوو لـە باوەشـیدا شـەکەتدەبن و لـە دەوری کورسـییەکەی خەویـان لێدەکەوێـت. ئەمـڕۆ ئێمـە هەمـوو شـتێکمان تەواوکـردوە، بـەڵام شـبر دەڵێـت دەبێـت ئـەم کتێبـە لـە جێگایەکدا هەڵگریـن نەگاتـە دەسـت بارۆنـەکان، منیش سـەیری ئـەو منداڵـە بچوکانـە دەکـەم کـە لـەدەوری شـبر خەوتـوون و دەڵێـم دەبێـت ئـەم چیرۆکـە لـە جێگایـەک هەڵگریـن نەگاتـە دەسـت ئـەوان. منیـش وا دەڵێـم و ئەفسـانەش وا دەڵێـت. تـۆش ئـەی ئـەوەی هاتوویتـە نـاو باغـی کتێبـەوە، بـە هـەر ڕێگایـەک ئـەم کتێبـەت کەوتۆتـە دەسـت، گرنگ نییـە، بەڵام کۆمەکێکـی بچوکمـان پێبکـە و مەهێڵـە ئـەم کتێبـە بگاتە دەسـت بارۆنـەکان... تکایـە مەهێڵـە... مەهێڵـە بگاتـە دەسـتیان. چونکـە ئاسـوودەیی هەموومـان ئێسـتا لەوەدایـە ئـەم کتێبـە نەگاتە دەسـت بارۆنەکان... با نەگاتە دەسـتیان... تکایە... با نەگات.

**تەواو**

# کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

| ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|
| ١. بنەڕەتەکانی فەلسەفە | د. حەمید عەزیز | |
| ٢. کورد لەدیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە | د. فەرهاد پیرباڵ | |
| ٣. ڕێبازە ئەدەبییەکان | د. فەرهاد پیرباڵ | |
| ٤. نەتەوەی زێرابەکان | جەبار جەمال غەریب | |
| ٥. ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی | د. جەعفەر عەلی | |
| ٦. سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی... | د. جەعفەر عەلی | |
| ٧. مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و ... | د. ئەحمەدی مەلا | |
| ٨. نهێنییەکانی ژیان | ئۆشۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٩. کورتیلەیەک لە مێژووی کات | ستیڤن هۆوکینگ<br>لیۆنارد ملۆدیتۆ | حوسەین حوسەینی<br>د. هیوا عومەر |
| ١٠. کۆشک | فرانتس کافکا | عەتا نەهایی |
| ١١. فەصلول مەقال | ئیبن ڕوشد | مەریوان عەبدول |
| ١٢. شۆڕشی ئەیلوول لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا | وریا ڕەحمانی | |

۱۳. دەسەڵات و جیاوازی مەریوان وریا قانیع
١٤. لە چ ئێستایەکدا دەژین مەریوان وریا قانیع
١٥. شوناس و ئاڵۆزی مەریوان وریا قانیع
١٦. دین و دونیا مەریوان وریا قانیع
١٧. سیاسەت و دونیا مەریوان وریا قانیع
١٨. کتێب و دونیا مەریوان وریا قانیع
١٩. دواهەمین هەناری دونیا بەختیار عەلی
٢٠. ئێوارەی پەروانە بەختیار عەلی
٢١. جەمشید خانی مامم بەختیار عەلی
٢٢. مەرگی تاقانەی دووەم بەختیار عەلی
٢٣. کەشتی فریشتەکان (١) بەختیار عەلی
٢٤. کەشتی فریشتەکان (٢) بەختیار عەلی
٢٥.شاری موسیقارە سپییەکان بەختیار عەلی
٢٦. سێوی سێهەم بەختیار عەلی
٢٧. لە دیارەوە بۆ نادیار بەختیار عەلی
٢٨. وەک باڵندەی ناو
جەنگەڵە ترسناکەکان بەختیار عەلی
٢٩. چێژی مەرگدۆستی بەختیار عەلی
٣٠. ئەی بەندەری دۆست،
ئەی کەشتی دوژمن بەختیار عەلی
٣١. مەعریفە و ئیمان بەختیار عەلی
هێمن قەرەداخی
٣٢. دۆزی کورد لە بازنەی
پەیوەندییەکانی ئەمریکاو... گۆران ئیبراهیم صاڵح
٣٣. سەمەرقەند (چ٢) ئەمین مەعلوف د. ئەحمەدی مەلا

| ناونیشان | نووسەر | وەرگێڕ |
|---|---|---|
| ٣٤. وێستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی | فاروق ڕەفیق | |
| ٣٥. ئەخلاقناسی | تەحسین حەمە غریب | |
| ٣٦. گەشەسەندنی ڕامیاری... | د. ک. پێسچانی | د. ئارام عەلی |
| ٣٧. مێژووی کۆنی کورد (چ٢) | د. جەمال ڕەشید<br>د. فەوزیە ڕەشید | ملکۆ کەلاری |
| ٣٨. منداڵانی گەڕەک | هیوا قادر | |
| ٣٩. مرۆڤی یاخی | ئەلبێر کامۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٤٠. پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێم و دەوڵەتانی... | هێرش جەوهەر مەجید | |
| ٤١. مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی... (چ٢) | فریشتە نورائی | هەورامان فەریق کەریم |
| ٤٢. سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨) | توانا ڕەشید کەریم | |
| ٤٣. شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨) | هەوراز جەوهەر مەجید | |
| ٤٤. کتێبی پەراوێزنووسان | عەتا محەمەد | |
| ٤٥. فیکر و دونیا (بەرگی ١) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٦. فیکر و دونیا (بەرگی ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٧. دین و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٨. کتێب و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٩. کۆمەڵگەی ڕەش | د. عادل باخەوان | |
| ٥٠. زستانێکی درێژ | کولم تویبێن | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥١. فرانسیسکۆس قەدیسی من | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥٢. ئاهەنگی تەگەکە | ماریۆ بارگاس یۆسا | جەلیل کاکەوەیس |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٣. شەوی لیشبۆنە | ئێریش ماریا ڕیمارک | کەریم پەڕەنگ |
| ٥٤. من و ئەو | ئەلبێرتۆ مۆرافیا | کارزان عەلی |
| ٥٥. میرنامە | جان دۆست | سەباح ئیسماعیل |
| ٥٦. ڕوخسارە بەندکراوەکەم | لەتیفە | ڕووناک شوانی |
| ٥٧. قەپێلک | مستەفا خەلیفە | هەورامان وریا قانع |
| ٥٨. خەونی پیاوە ئێرانییەکان کەوتنی بۆرە قەڵا | ماردین ئیبراهیم | |
| ٥٩. گرگن | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٦٠. ١٩٨٤ | جۆرج ئۆروێل | حەکیم کاکەوەیس |
| ٦١. سوور و ڕەش | ستانداڵ | سیامەند شاسواری |
| ٦٢. دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٦٣. جادەی مێخەک (١) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٤. جادەی مێخەک (٢) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٥. ئێوارستان | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٦٦. دارستانی نەرویجی | هاروکی موراکامی | تارا شێخ عوسمان |
| ٦٧. ئێوارەی پەروانە (چ٦) | بەختیار عەلی | |
| ٦٨. شاری مۆسیقارە سپییەکان (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٩. مەرگی تاقانەی دووەم (چ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٠. کۆشکی باڵندە غەمگینەکان (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٧١. تا ماتەمی گوڵ... تا خوێنی فریشتە (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٢. سێوی سێهەم (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٣. ئاورەکەی ئۆرفیۆس | بەختیار عەلی | |
| ٧٤. غەزەلنوس و باغەکانی خەیاڵ (چ٢) | بەختیار عەلی | |

| ناو | نووسەر | وەرگێڕ |
| --- | --- | --- |
| ٧٥. ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٧٦. دواهەمین هەناری دونیا (چ ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٧. ئێمەی پەنابەر | کۆمەڵێ نووسەر | |
| ٧٨. گرەوی بەختی هەڵاڵە (چ٢) | عەتا نەهایی | |
| ٧٩. عێراقییەک لە پاریس | سەموئێل شەمعون | سەباح ئیسماعیل |
| ٨٠. جیهانی سۆفیا و فەرهەنگی سۆفیا (چ٤) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨١. کچەی پرتەقاڵ (چ٣) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٢. لە ئاوێنەیەکدا، لە نهێنییەکدا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٣. کچی بەڕێوەبەری سێرک (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٤. نهێنی یاری کاغەز (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٥. مایا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٦. ئینسایکلۆپیدیایەکی مێژوویی وێنەدار | کۆمەڵێ نووسەر | هەورامان وریا قانع |
| ٨٧. کێشەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا | د. حامد مەحمود عیسا | زرار عەلی |
| ٨٨. دوالیزمی دژیەک لە هۆنراوەلیریکییەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی دا | لهۆن قادر | |
| ٨٩. فەلسەفەی ئایین (چ٢) | ئازاد قەزاز | |
| ٩٠. سایکۆپۆلیتیک (چ٢) | ئازاد قەزاز | |
| ٩١. خۆت بناسە | ئازاد قەزاز | |
| ٩٢. مەسیح لە خاچ دەدەنەوە (چ٢) | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |

٩٣. قەدەغەشکێنی (چ٢) مەولود ئیبراهیم حەسەن

٩٤. گەڕان بەدوای نەمرییدا (چ٢) مەولود ئیبراهیم حەسەن

٩٥. پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی (چ٢) مەولود ئیبراهیم حەسەن

٩٦. فەلسەفەی بوون د. محەمەد کەمال

٩٧. وەک ڕووبارە بەخوورەکە پاولۆکۆیلۆ سیروان مەحم

